


دانراوی: مامۆستا شێخ مەنصور عەلی ناصف

وەرگێڕانی: نوری فارس حەمە خان

محمود أحمد محمد

پێیدا چۆتەوەو سەرپەرشتی لە چاپدانی کردووە

بەرگی پێنجەم - چاپی چوارەم

دار المعرفة
بيروت . لبنان

بسم الله الرحمن الرحيم

# التاجُ الجامِعُ للأصُول


- وەرگێڕانی: نوری فارس حمە خان
- پێداچونەوەو سەرپەرشتی لەچاپدانی: محمود أحمد محمد
- چاپ: چوارەم
- ساڵی چاپ : ٢٠٠٨
- تایپ‌و دیزاین: کەژاڵ حسین/کۆمپیوتەری شانیا
- تیراژ: ٢٠٠٠ دانە
- ژمارەی سپاردن:
- هەڵەگری: لاڤە هۆشیار محمد علی - کچەزای م.نوری فارس



- ژمارە سپاردنی (٢٣٩٧) ی ساڵی ٢٠٠٨ی پێدراوە

ئـەم پـەڕاوە پـیرۆزە لەسـەر فەرمایشتی دانەرەکـەی پوختـەی حەدیثەکانی ئەم پەڕاوە پیرۆزانەیە :

١ ) صحيح البخاری

٢ ) صحيح مسلم

٣ ) سنن أبی دَاوُدَ

٤ ) جامِعُ الترمذي

٥ ) المُجْتَبی لِلنَّسَائِیِّ

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی ڕەوشت (ئەخلاق)و کردەوەی چاکە

(ئەم باسە سێ باس و دوا وتارێکە)

## ١) باسی یەکەم: باسی جۆرەکانی کردەوەی چاکە

## القسم الرابع: في الأخلاق والسمعيات

## كتاب البر والأخلاق. وفيه ثلاثة أبواب وخاتمة: الباب الأول: في أنواع البر

٤٦٥٠- عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ فَقَالَ: الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ. رواه مسلم والترمذي[1]:

نەوواسی کوڕی سەمعانی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەبارەی چاکەو خراپەوە پرسیم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: چاکە برێتییە لە خووی شیرین و ڕەفتاری بەرزو ڕەوشتی جوان، خراپەیش برێتییە لەوە کە لێی دوو دڵ بیت و دڵ ئاوی پێ نەخواتەوەو لەهەمان کاتیشدا حەزنەکەیت کە کەس پێی بزانێ! (م/ت=موسلیم و تیرمیذی. ڕەحمەتی خودایان لێ بێ).

## ٢) گەورەترین چاکە چاکە کردنە لەگەڵ باب و داک: (أعظمه بر الوالدين)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيمًا - ١٧/٢٣}.

واتە: خودای مەزن دەفەرموێ: یەزدانی مەزن کە خودای تۆیە فەرمانی داوە بە هەموو کەسێ، بە فریشتە، بە ئادەمیزاد، بە پەری، کە تەنیا عیبادەت و طاعەت و بەندەیی و خودا پەرستی بەس بۆخۆی بکرێ و بۆ کەسی تر نەکرێ، هەروەها فەرمانی داوە کە منداڵ باش بن بۆ باوک و دایکیان و، وەچە خاس بن بۆ بنەچەیان، لەهەموو کات و شوێنێکا دڵیان ڕابگرن، بە

[1] مسلم. بر وصلة. ٦٤٦٤، ٦٤٦٣. ترمذي. زهد: ٢٣٨٩، ٢٣٨٩م. تحفة الأشراف: ١١٧١٢.

تایبەت لەکاتی پیرییاندا، قەت دڵیان مەیەشێنن‌و بەپێی ئەوانا یارمەتییان بدەن‌و قسەی ڕەقیان لەڕوودا مەکەن‌و پیایاندا هەڵ مەشاخێن‌و تەنانەت ئۆف چییە پێیان مەڵێن، وە زمانتان شیرین بێ لە گەڵیاندا.

٤٦٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَنْ أَحَقُّ النَّاسِ بِحُسْنِ صَحَابَتِي؟ قَالَ: أُمُّكَ. قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أُمُّكَ. قَالَ: ثُمَّ مَنْ قَالَ: ثُمَّ أُمُّكَ. قَالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: ثُمَّ أَبُوكَ. رواه الشيخان[1]:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ ڕەواترین کەسە بەوە کە زۆر بەجوانی هاوڕێتی‌و گوزەرانی لەگەڵدا بکەم! فەرمووی: دایکت، گوتی: دوا ئەو کێی تر؟ فەرمووی: دیسان دایکت، گوتی: ئەوجا کێی تر؟ فەرمووی: دیسانەوە هەر دایکت، گوتی: ئەوسا کێی تر؟ فەرمووی: ئینجا باوکت (ش).

٤٦٥٢- وَعَنْهُ قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَحَقُّ بِحُسْنِ الصُّحْبَةِ؟ قَالَ: أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ ثُمَّ أُمُّكَ ثُمَّ أَبُوكَ ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ. رواه مسلم[2]:

دیسان فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ شایستەترین کەسە کە بەجوانی ڕەفتاری لەگەڵدا بکرێ؟ فەرمووی: یەکەم جار دایکت، دووەم جار هەر دایکت، سێیەم جار هەر دایکت، ئەمجار باوکت، ئەوجا خزم‌و کەسوکارت بەپێی نزیکی‌و دوورییان لێتەوە! (م).

٤٦٥٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَغِمَ أَنْفُهُ ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُهُ. قِيلَ مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مَنْ أَدْرَكَ وَالِدَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ. رواه مسلم والترمذي[3]:

---

[1] بخاري. آداب. ٥٩٧١. مسلم. بر وصلة: ٦٤٤٧. ابن ماجه. وصايا: ٢٧٠٦. تحفة الأشراف: ١٤٩٠٥. تجريد/٥. رقم: ١٩١٤ = ٥٩٧١ فتح.

[2] مسلم. بر وصلة. ٦٤٤٨، ٦٤٤٧.

[3] مسلم بر وصلة. ٦٤٥٧-٦٤٥٩.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی لووتی بەقوڕداچێ و دووبارەو سێ بارە لووتی بە قوڕداچێ و لووتی بتەوسێتەوە! گوترا: كێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: لووتی ئەو كەسەی كە باوك و دایكی پیر دەبن، كەچی لەوكاتی پیرییەدا، بەبێ بەهانەیەكی ڕەوا ئەوەندە خزمەتیان ناكا كە پێی بچێتە بەهەشت، ئیتر خوا بكا بە هەردوكیاندا یان بگا بە یەكێكیاندا (م/ت = موسلیم و تیرمیذی).

٤٦٥٤- وَقَالَتْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): قَدِمَتْ أُمِّي وَهْيَ مُشْرِكَةٌ فِي عَهْدِ قُرَيْشٍ وَمُدَّتِهِمْ ، إِذْ عَاهَدُوا رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ أَبِيهَا ، فَاستَفْتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ وَهْيَ رَاغِبَةٌ { أَفَأَصِلُهَا؟ قَالَ: نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ. رواه الشيخان[٤]:

ئەسماء (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەو سەردەمەدا كە ناموسوڵمانەكانی هۆزی قورەیش پەیمانی ئاشتییان لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەستبوو، دایكم لەوماوەدا هاتبوو بۆلام، هێشتا موسوڵمان نەبوو بوو، لەگەڵ باوكیدا هاتبوو، لە پێغەمبەرم پرسی گوتم: دایكم هاتووە بۆ لام و موسوڵمانیش نییە و بەتەمایشە كەمن دەسگیرۆیی بكەم، جا ئایا تۆ ڕەوای دەبینی كە سیلەی ڕەحمی و مافی خوێشایەتی ئەو بەجێ بێنم یانا؟ فەرمووی: ئا، سیلەی ڕەحمی دایكت بەجێ بێنە. (ش = بوخاری و موسلیم).

٤٦٥٥- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: أُمَّكَ ثُمَّ أُمَّكَ ثُمَّ أُمَّكَ ثُمَّ أَبَاكَ ثُمَّ الأَقْرَبَ فَالأَقْرَبَ، لاَ يَسْأَلُ رَجُلٌ مَوْلاَهُ مِنْ فَضْلٍ هُوَ عِنْدَهُ فَيَمْنَعُهُ إِيَّاهُ إِلاَّ دُعِيَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَضْلُهُ الَّذِى مَنَعَهُ شُجَاعًا أَقْرَعَ. رواه أبو داود والترمذي[٥]:

بەهزی كوڕی حەكیم فەرمووی: باوكم فەرمووی: باپیرم (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ كێ باش بم؟ فەرمووی (دروودی

[٤] بخاري. هبة. ٢٦٢٠، ٣٠٨٣، ٥٩٧٨، ٥٩٧٩. مسلم. زكاة. ٢٣٢١، ٢٣٢٢. ابو داود. زكاة. ١٦٦٨. تحفة الأشراف: ١٥٧٢٤.

[٥] بسند حسن (شرحه).

خودای لەسەر بێ): هەتا پێت دەکرێ لەپێش پێشدا بۆ دایکت زۆر زۆر باشبە، ئەوجا لەدوا ئەو بۆ باوکت زۆر زۆر باشبە، ئینجا لەدوا ئەوان لەگەڵ خزم‌و خوێش زۆر باشبە، بەپێی دووری‌و نزیکییان. هەر کەسێ داوای شتێ لە کەسێکی خۆی بکاو خزمەکەی ئەو شتەی هەبێ‌و لەخۆی زیاد بێ، بەڵام نەیداتێ، ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا ئەو شتەی بۆ دەکرێ بە حەفیانێکی سەر گەڕی فرە زەهراوی. (د/ت – سەنەد حەسەن).

٤٦٥٦– وَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ: أُمَّكَ وَأَبَاكَ وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ وَمَوْلَاكَ الَّذِي يَلِي ذَاكَ حَقٌّ وَاجِبٌ وَرَحِمٌ مَوْصُولَةٌ. رواه أبو داود[٦]:

عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرا: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ کێ باشبم؟ فەرمووی: باشبە لەگەڵ دایك‌و باوك‌و خوشك‌و برای خۆت‌و لەگەڵ ئەو خزمانەیشتا کە بەهۆی ئەمانەوە دەبن بە خزمت، ئەمەیش کە دەیڵێین قسەیەکی ڕەوایە‌و مافی خزمایەتی هەقە‌و پێویستە جێ بەجێ بکرێ‌و هەمیشە گشت خزم‌و خوێشێ بەپێی تەوانا دەبێ بەسەر بکرێنەوە (د– سەنەد صالح).

٤٦٥٧– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَجُلاً مِنَ الأَعْرَابِ لَقِيَهُ بِطَرِيقِ مَكَّةَ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ وَحَمَلَهُ عَلَى حِمَارٍ كَانَ يَرْكَبُهُ وَأَعْطَاهُ عِمَامَةً كَانَتْ عَلَى رَأْسِهِ فَقَالَ ابْنُ دِينَارٍ: أَصْلَحَكَ اللَّهُ إِنَّهُمُ الأَعْرَابُ وَإِنَّهُمْ يَرْضَوْنَ بِالْيَسِيرِ. فَقَالَ: عَبْدُ اللَّهِ: إِنَّ أَبَا هَذَا كَانَ وُدًّا لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ أَبَرَّ الْبِرِّ صِلَةُ الْوَلَدِ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٧]:

لەڕێگەی مەککە عەرەبێکی دەشتەکی تووشی ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەبێ، ئیبنو عومەر چاك‌و چۆنی لەگەل دەکاو گوێدرێژەکەی ژێر خۆیی دەداتێ‌و مێزەرەکەی سەری خۆیشی دەداتێ. ئیبنو دیناریش پێی دەڵێ:

---

[٦] بسند صالح (شرحه).

[٧] مسلم. بر وصلة. ٦٤٦٠. ترمذي. بر وصلة: ١٩٠٣. تحفة الأشراف: ٧٢٥٩.

خودا باشت بۆ بکا، ئەمانە دەشتەکێن، بە کەمیش قاییل دەبن (کەواتە: بۆچی ولاخی ژێر خۆتو مێزەری سەری خۆتی دەدەیتێ!) ئیبنو عومەریش (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: کاتی خۆی باوکی ئەم پیاوە دۆستی باوکم بوو، وە من بۆ خۆشم بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە، کە لەم بارەیەوە دەیفەرموو: چاکترین کردەوەی چاکە ئەوەیە کە منالو وەچە کەسوکارو ئاشناو دۆستو برادەری باوکو بنەچەی خۆی بەسەر بکاتەوە! (م/د/ت) هەروا بەسەر کردنەوەی ئاشناو ڕۆشنای دایکو نەنکو باپیرو براو خوشکو خزمی ترو پیرانی طەریقەتو مامۆستایانی شەریعەتو مێردو ژنیش سوننەتە. (تەماشای شەرحی صەحیحی موسلیمو اقتران النيرين بفەرموو. (وەرگێڕ)

٤٦٥٨- ـه (ب – ٣ ز – ٦٤ ل – ١٥٧ چاپی یەکەم ف – ٢)[٨].

واتە: ئەم فەرموودەیە لەم شوێنەدا رابوورد: بەرگی سێیەم، زنجیرەی شەستو چوار، لاپەڕە سەدو پەنجاو حەوت، چاپی یەکەم، فەرموودەی ژمارە دوو.

٤٦٥٩- وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي سَلِمَةَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ بَقِيَ مِنْ بِرِّ أَبَوَيَّ شَيْءٌ أَبَرُّهُمَا بِهِ بَعْدَ مَوْتِهِمَا؟ قَالَ: نَعَمِ الصَّلاَةُ عَلَيْهِمَا وَالاِسْتِغْفَارُ لَهُمَا وَإِنْفَاذُ عَهْدِهِمَا مِنْ بَعْدِهِمَا وَصِلَةُ الرَّحِمِ الَّتِي لاَ تُوصَلُ إِلاَّ بِهِمَا وَإِكْرَامُ صَدِيقِهِمَا. رواه ابو داود والبيهقي[٩]:

پیاوێکی بەنی سەلەمەیی هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا باوکو دایکم لەپاش مردنیان هیچ چاکەو هەقێکیان لەسەرم دەمێنێ کە لەپاش مردنیان بۆیان بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ دەمێنێ، دووعای خێریان بۆ بکەو نوێژی مردوویان لەسەر بکەو بۆیان بپاڕێرەوەو لەپاش خۆیان بەڵێنو راسپێرییان جێبەجێ بکەو قەدرو ڕێزی ئەو خزمانەت رابگرە کە بەهۆی ئەوانەوە دەبن بە خزمت (وەك مامو میمكو لالەو پوورو منالی ئەمانە) وە هەروەها قەدرو ڕێزی ئاشناو ڕۆشنایان بگرە (د/ بەیهەقی – س/صالح).

---

[٨] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/٦٤. ص/١٥٧. ط/١. رقم: ٢٢٣٣.

[٩] بسند صالح (شرحه).

٤٦٦٠- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقْسِمُ لَحمًا بِالْجِعِرَّانَةِ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ أَحْمِلُ عَظْمَ الْجَزُورِ، إِذْ أَقْبَلَتِ امْرَأَةٌ حَتَّى دَنَتْ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَامَ اليها فَبَسَطَ لَهَا رِدَاءَهُ فَجَلَسَتْ عَلَيْهِ فَقُلْتُ مَنْ هِيَ فَقَالُوا هَذِهِ أُمُّهُ الَّتِي أَرْضَعَتْهُ. رواه ابو داود[10]:

ئەبو طوفەیل (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە جەعرانە پێغەمبەرم دی، گۆشتی دابەش دەکرد، ئەوکاتە من تووڵەك بووم دەمتوانی ئێسکی وشترێ هەڵبگرم، لەوکاتەدا ژنێ هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لێی نزیك بۆوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسا چوو بە پیریەوەو عاباکەی خۆیی بۆ ڕاخست. ژنەکەیش لەسەی دانیشت. گوتم: ئەم ژنە کێیە؟ گوتیان: ئەمە دایەنەکەیەتی کە بە منداڵی مەمکی پێداوە ئەمە حەلیمەی سەعدی یە. (د- س/صالح).

٤٦٦١- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَقَالَ: إِنَّ لِي امْرَأَةً وَإِنَّ أُمِّي تَأْمُرُنِي بِطَلاَقِهَا. قَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ فَإِنْ شِئْتَ فَأَضِعْ ذَلِكَ الْبَابَ أَوِ احْفَظْهُ[11]:

پیاوێ دەچێ بۆ خزمەتی ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) عەرزی دەکا: ژنێکم هەیە دایکم پێم دەڵێ کە تەڵاقی بدەم، ئەبو دەرداش دەفەرموێ: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): باوكو دایك دەرگا هەرە باشەکەی بەهەشتن!. ئیتر تۆیش ئارەزووی خۆتە: ئەگەر حەزدەکەی ئەو دەرگایە لەکیس خۆت بدە، ئەگەر حەزیش دەکەی دەردەستی بکە بۆ خۆت!. ئەمە کاتێ وایە: کە دایکەکە لەسەر حەق بێ. (ت- س/ص).

٤٦٦٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: رِضَا الرَّبِّ فِي رِضَا الْوَالِدِ وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ[12]:

---

[10] بسند صالح (شرحه).

[11] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ڕەزامەندیی خودا بەندە بە ڕەزامەندیی باوك‌و دایکەوە، هەروەها نارەزایی خودایش بەندە بە نارەزایی باوك‌و دایکەوە! (ت- س/ص).

٤٦٦٣- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ[١٣]:

لە بەرائەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): پوور واتە: خوشکی دایك لەجێگەی دایکە بۆ قەدرو ڕێزو دڵڕاگرتن، نەك بۆ میرات (ت- س/ص).

٤٦٦٤- وَجَاءَ رَجُل إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ ذَنْبًا عَظِيمًا فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٍ؟ قَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: هَلْ لَكَ مِنْ خَالَةٍ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَبِرَّهَا. روى هذه الأربعة الترمذي[١٤]:

پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! تووشی گوناهێکی زل بووم ئایا تەوبەو پەشیمانیم بۆ هەیە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئایا دایکت ماوە؟ گوتی: نەء، فەرمووی: ئەی پوورت هەیە؟ گوتی: بەڵێ هەمە، فەرمووی: دەباشبە بۆی، ئیتر ئەوە بڕێتی گوناهەکەت دەکەوێ (ت- س/ص).

## ٣) چاکە کردن لەگەڵ منداڵدا: (ومنه بر الأبناء)

٤٦٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَبَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ وَعِنْدَهُ الأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ التَّمِيمِيُّ جَالِسًا. فَقَالَ: الأَقْرَعُ إِنَّ لِي عَشَرَةً مِنَ الْوَلَدِ مَا قَبَّلْتُ مِنْهُمْ أَحَدًا . فَنَظَرَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَالَ: مَنْ لاَ يَرْحَمُ لاَ يُرْحَمُ. رواه البخاري وأبو داود والترمذي[١]:

---

[١٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] بخاري. آداب. ٥٩٩٧. مسلم. فضائل/٥٩٨٢. أبو داود. آداب: ٥٢١٨. ترمذي. بر وصلة: ١٩١١. تحفة الأشراف: ١٥١٤٦.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبوو، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کرد، کە کچەزای پێغەمبەرە، ئەقرەع گوتی: دەکوڕم هەیە هێشتا کەسیانم ماچ نەکردووە! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەیرێکی کردو فەرمووی: ئەوەی ڕەحم بە بەندەگانی خودا نەکا خودایش ڕەحم بەو ناکا (ب/د/ت).

٤٦٦٦- وَقَالَ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأخُذُنِي فَيُقْعِدُنِي عَلَى فَخِذِهِ ، وَيُقْعِدُ الْحَسَنَ عَلَى فَخِذِهِ الأُخْرَى ، ثُمَّ يَضُمُّهُمَا ثُمَّ يَقُولُ: اللّٰهُمَّ ارْحَمْهُمَا فَإِنِّي أَرْحَمُهُمَا. واه البخاري[٢]:

ئوسامەی کوڕی زەید (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) منی هەڵ دەگرتو دایدەنام لەسەر ڕانی خۆیو حەسەنی کچەزایشی هەڵ دەگرتو دایدەنا لەسەر ئەو ڕانەکەی تریو جا هەردوو ڕانی خۆی دەنووساندن بەیەکەوەو دەیفەرموو: خودایە! ڕەحم بەم دوو منداڵە بکە، بەڕاستی من زۆر ڕەحم بەم دووانە دەکەم (ب).

٤٦٦٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) قَالَتْ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَتُقَبِّلُونَ الصِّبْيَانَ فَمَا نُقَبِّلُهُمْ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَوَأَمْلِكُ لَكَ أَنْ نَزَعَ اللّٰهُ مِنْ قَلْبِكَ الرَّحْمَةَ. رواه الشيخان[٣]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هاتەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەدیی ئەوە ئێوە منداڵ ماچ دەکەن! سا ئێمە ماچیان ناکەین! پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەدیی تۆ وا دەڵێیت، تۆ پێی کە خودا ڕەحمو میهرەبانی لەناو دڵتا سڕیوەتەوە، من دەتوانم چیت لێ بکەم، کەواتە: تۆ خودای گەورە خۆی بەشی نەداوی لە ڕەحم، ئیتر من چۆن دەتوانم بەشت بدەم (ش- ڕمزای خودایان لێ بێ).

---

[٢] تجريد/١٦١/٤. رقم/١٤٧١ = ٣٧٣٥، ٣٧٤٧، ٦٠٠٣.

[٣] بخاري. آداب. ٥٩٩٨ = تجريد/٢٠٤/٥. رقم/١٩٢٠. مسلم. فضائل: ٥٩٨١.

٤٦٦٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ تَسْأَلُنِي ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ ، فَأَعْطَيْتُهَا ، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا ، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَدَّثْتُهُ فَقَالَ: مَنْ يَلِي مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ شَيْئًا فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ. رواه الشيخان والترمذي[٤]:

دیسان عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ژنێ دوو کچی خۆی پێ بوو، هاتە لام سواڵی لێکردم، منیش تاقە دەنکێ خورمام هەبوو دام پێی، ئەویش لەتی کرد بۆ هەردوو کچەکەی‌و خۆی لێی نەخوارد، ئینجا هەڵسا و ڕۆیشت، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتەوە ئەمەم بۆی گێڕایەوە، فەرمووی: کەسێ دووچاری دەستی کچ بێ‌و خودا بیەوێ بەهۆی کچەوە تاقی بکاتەوە، وەباش بێ بۆیان، ئیتر یەك بن یا پتر، خودا لەڕۆژی قیامەتدا بەهۆی ئەو کچانەوە ڕزگاری دەکا لە ئاگری دۆزەخ (ش/ت).

٤٦٦٩- ولمسلم والترمذي: مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تُدْرِكَا دَخَلَت أَنَا وَهُوَ الجنة كهاتين[٥]:

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ دوو کچۆڵە بەخێو بکا هەتا لە خەم دەرەخسێن، من‌و ئەو وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا جووت پێکەوە دەچینە ناو بەهەشت! (م/ت).

٤٦٧٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ أَوْ ثَلَاثُ أَخَوَاتٍ أَوِ ابْنَتَانِ أَوْ أُخْتَانِ فَأَحْسَنَ صُحْبَتَهُنَّ وَاتَّقَى اللَّهَ فِيهِنَّ فَلَهُ الْجَنَّةُ. رواه الترمذي وأبو داود[٦]:

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ سێ کچ، یا سێ خوشك، یا دوو کچ، یا دوو

---

[٤] تجريد/٢ ل/١٠٥. رقم: ٦٧٩ = ١٤١٨، ٥٩٩٥. مسلم. بر وصلة: ٦٦٢٦، ٦٦٣٧. ترمذي. بر وصلة: ١٩١٥. تحفة/١٦٣٥٠.

[٥] مسلم. بر وصلة: ٦٦٣٨. تحفة الأشراف. ١٠٨٤.

[٦] سكت عن درجته الشارح.

خوشکی هەبێ، وە بەجوانی ڕەفتارو گوزەرانیان لەگەڵدا بکاو لەترسی خودا ناهەقییان لێ نەکا، ئەوە ئەو کەسە بەهەشتییە! (ت/د).

٤٦٧١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ أُنْثَى فَلَمْ يَئِدْهَا وَلَمْ يُهِنْهَا وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ عَلَيْهَا - قَالَ يَعْنِي الذُّكُورَ - أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ. رواه أبو داود[٧]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ مێیینەی هەبێو زیندە بەچاڵی نەکاو سووکو ترۆی نەکاو نازی کوڕی نەدا بەسەردا، ئەوە خودا دەیباتە بەهەشت (د- س/صالح).

٤٦٧٢- عَنِ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: زَعَمَتِ الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ خَوْلَةُ بِنْتُ حَكِيمٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ ذَاتَ يَوْمٍ وَهُوَ مُحْتَضِنٌ أَحَدَ ابْنَي ابْنَتِهِ وَهُوَ يَقُولُ: إِنَّكُمْ لَتُبَخِّلُونَ وَتُجَبِّنُونَ وَتُجَهِّلُونَ وَإِنَّكُمْ لَمِنْ رَيْحَانِ اللَّهِ[٨]:

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئافرەتە باشەکە خەولەی کچی حەکیم دەڵێ: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵ دەرچوو، حەسەن (یا حوسەین)ی بە باوەشەوە بوو، کە هەردووکیان کوڕی فاتیمەی کچی پێغەمبەرن، دەیفەرموو: بەڕاستی ئێوە ئەی جگەر گۆشەکان! پیاو هەم چرووك دەکەن، هەم ترسنۆك دەکەن، هەم نەفامو نادان دەکەن! چونکە لەبەر ئێوە حەز ناکا شت ببەخشێو هەر کۆی دەکاتەوەو دەڵێ: با منداڵەکانم ڕەشو ڕووت نەکەون، ئەوا دەبێ بە چرووك، وە لەبەر ئێوە لە شەڕدا باش تێ ناکۆشێ نەبادا ئێوە هەتیو بکەون، ئەوا دەبێ بە ترسنۆك، وە لەبەر ئێوە گەلێ جار لە ئاستی هەق خۆی گێل دەکا ئەوا دەبێ بە نادانو نەفام، وە لەهەمان کاتدا ئێوە ڕزقو ڕۆژییەکی چاکن ئەگەر خودا بە ڕەحمەت بتاندا بە کەسێ (ت).

---

[٧] بسند صالح (شرحه).

[٨] سكت عن درجته الشارح.

٤٦٧٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لأَنْ يُؤَدِّبَ الرَّجُلُ وَلَدَهُ خَيْرٌ مِنْ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِصَاعٍ[٩]:

جابیری کوڕی سەمووره (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پیاو گشت جارێ کە تەمێ و تەسکینی منداڵی خۆی دەکا لەوە باشترە کە مەنێ شت بکا بە خێرو بیبەخشێتەوە (ت).

٤٦٧٤- عَنْ أَيُّوبُ بْنُ مُوسَى عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا نَحَلَ وَالِدٌ وَلَدًا مِنْ نَحْلٍ أَفْضَلَ مِنْ أَدَبٍ حَسَنٍ. روى هذه الثلاثة الترمذي[١٠]:

لە ئەییوبی کوڕی مووساوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: وێڵو تەمێ و تەسکینی جوان باشترین خەڵاتو بەخششی باوكو دایكە بۆ منداڵ! (ت).

## ٤) بەسەرکردنەوەی خزمو کەسوکار پێویستە، دەنگ دابڕینو پێ لێدابڕین لەگەڵ خزما ناڕەوایە : (تجب صلة الرحم ويحرم قطعها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا – ٢٦/٧٠}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: خزمو خوێشو هەژارو داماوو ڕێبوار هەر کەسەیان هەقی خۆیی بدەرێ، وە ماڵی خۆت بە ناحەق خەرج مەکەو دەست بڵاوو دەست بە قرپ مەبە.

٤٦٧٥- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الْجَنَّةَ . فَقَالَ الْقَوم: مَا لَهُ مَا لَهُ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَرَبٌ مَالَهُ ،

---

[٩] سكت عن درجته الشارح.

[١٠] سكت عن درجته الشارح.

تَعْبُدُ اللَّهَ ، وَلاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا ، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ ، وَتَصِلُ الرَّحِمَ. ذرها كأنه كان على راحلته. رواه الشيخان[1]:

**ئەبو ئەییوب** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **بە سواریی وشترێ بوو، پیاوێ هات جڵەوی ولاخەکەی گرتو ڕایوەستانو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کارێکم پێ بفەرموو کە بمباتە بەهەشت، یارانیش گوتیان: چی چی! پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: مەبەستی هەیە بۆ قسەکەیتان پێ سەیرە. ئەوجا بە پیاوەکەی فەرموو: خودا بپەرستەو هیچ هاوبەشی بۆ دامەنێو نوێژ بکەو زەکات بدەو پەیوەندی بە خزمو خوێشەوە بکەو بۆیان باشبەو بەپێی حاڵ پێیان لێ مەبڕەو یارمەتییان بدە، ئینجا پێی فەرموو: دە ئینجا بەری ولاخەکە بەردە با بڕوا لەڕێگەی خۆیەوە.**

٤٦٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ ، وَأَنْ يُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ. رواه الثلاثة[2]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە خۆشەویستەوە** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە حەز دەکا ڕزقو ڕۆژیی زۆربێو تەمەنی درێژبێ با خزم دۆست بێو سیلەی ڕەحمی بەجێ بهێنێ (ش/د= بوخاریو موسلیمو ئەبو داوود.** ڕەزای خودایان لێ بێ).

٤٦٧٧- وللبخاري وأبي داود والترمذي: لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ ، وَلَكِنِ الْوَاصِلُ الَّذِي إِذَا قَطَعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا[3]:

**حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: بەو کەسە ناگوترێ خزم دۆست کە بەدەستیاو خزم بەسەر بکاتەوە، بەڵام ئەو کەسە خزم دۆستە کە**

---

[1] تجريد/٢/٩٢ رقم/٦٦٧ = ١٣٩٦، ٥٩٨٢، ٥٩٨٣. مسلم. إيمان: ١٠٦. نسائي. صلاة: ٤٦٧. تحفة: ٣٤٩١.

[2] بخاري. بيوع: ٢٠٦٧. مسلم. بر وصلة: ٦٤٧٠. أبو داود. زكاة: ١٦٩٣.

[3] بخاري. آداب. ٥٩٩١.

خزمەکانی پشتی تێ دەکەنو ڕشتەی خزمایەتیی دەبڕن، بەڵام ئەو هەر بەسەریان دەکاتەوەو پشتییان تێ ناکا (ب/د/ت).

٤٦٧٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الرَّحِمَ شُجْنَةٌ مِنَ الرَّحْمَنِ فَقَالَ اللهُ: مَنْ وَصَلَكِ وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَكِ قَطَعْتُهُ. رواه البخاري والترمذي[٤]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕەحم (بە کوردی واتە: خزمایەتی) چڵێکە لە پەلوپۆی ڕەحمانو گورزەیێ ڕەگو ڕیشەی تێك ئاڵاوە، هەموو دەچنەوە سەر ڕەحمەتی ڕەحمانو ناوەکەی لەناوی ڕەحمان دروست کراوە، کە ناوی خودای گەورەیەو بەواتا میهرەبانو خاوەن بەزەییە. خودا بۆخۆی فەرموویەتی پێی: ئەی ڕەحم! ئەوەی دۆستی تۆ بێو تۆی بوێ، ئەوە دۆستی منیشەو منیش ئەوم دەوێ، وە ئەوەی تۆی نەوێ منیش ئەوم ناوێ! (ب/ت).

٤٦٧٩- ← (ب - ٧ز - ٣٠ ل - ١٤٣ف - ٢)[٥].

واتە: ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لەم شوێنەدا ڕابورد: بەرگی حەوتەم، زنجیرەی سیی، لاپەڕە (١٤٣) فەرموودەی ژمارە دوو.

٤٦٨٠- وَعَنْهُ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ لِي قَرَابَةً أَصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونِي وَأُحْسِنُ إِلَيْهِمْ وَيُسِيئُونَ إِلَيَّ وَأَحْلُمُ عَنْهُمْ وَيَجْهَلُونَ عَلَيَّ. فَقَالَ: لَئِنْ كُنْتَ كَمَا قُلْتَ فَكَأَنَّمَا تُسِفُّهُمُ الْمَلَّ وَلاَ يَزَالُ مَعَكَ مِنَ اللَّهِ ظَهِيرٌ عَلَيْهِمْ مَا دُمْتَ عَلَى ذَلِكَ[٦]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەندێ خزمم هەن، من دڵی ئەوان ڕاگیر دەکەم، بەڵام ئەوان دڵی من دەرەنجێنن، وە من چاکەیان لەگەڵ دەکەم بەڵام ئەوان خراپەم لەگەڵ

---

[٤] بخاري. آداب: ٥٩٨٩ (تجريد/٥/٢٠١ رقم/١٩١٧).

[٥] تقدم في مجلد سابع تسلسل/٣٠ رقم/٤٠٩٩.

[٦] مسلم. آداب. ٦٤٧٢.

دەکەن، وە من چاو پۆشییان لێ دەکەم کەچی ئەوان ناپیاویم لەگەل دەکەن، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەگەر وەك خۆت دەڵێیت وابی تۆ بە پاداشتی باشی خۆت دەکەیت، بەڵام ئەوان وەك تۆ ژیلە مۆیان دەرخوارد بدەیت وایە، چونکە لەسەر ئەوەی کە تۆڵەی چاکەی تۆ بە خراپە دەدەنەوە خودا ئازاریان دەدا، وە هەتا تۆیش ئەمە ڕەفتارت بێو وابی لەگەڵیانا خودا هەر پشتیوانی تۆیەو سەرت دەخا بەسەریاندا (م).

٤٦٨١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الرَّحِمُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَقُولُ مَنْ وَصَلَنِي وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَنِي قَطَعَهُ اللَّهُ. رواهما مسلم[٧]:

لە عائیشەی هاوسەری حەزەتەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): خزمایەتی دامێنی بارەگای خودای گرتووەو دەڵێ: ئەوەی منی دەوێو بەسەرم دەکاتەوە، خودایش ئەوی بوێو بەسەری بکاتەوە، وە ئەوەی منی نەوێ خودایش ئەوی نەوێ! (م).

٤٦٨٢- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ[٨]:

جوبەیری کوڕی موطعیم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی ڕشتەی خزمایەتی بپسێنێو سیلەی ڕەحم ببڕی پێی ناچێتە ناو بەهەشت! (ش/د/ت= بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تیرمیذی).

٤٦٨٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ أَنْ يَلْعَنَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ » . قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ يَلْعَنُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ قَالَ: يَسُبُّ الرَّجُلُ أَبَا الرَّجُلِ ، فَيَسُبُّ أَبَاهُ ، وَيَسُبُّ أُمَّهُ. رواهما الأربعة[٩]:

---

[٧] مسلم. آداب: ٦٤٦٦. بخاري. آداب: ٥٩٨٩.

[٨] بخاري. آداب: ٥٩٨٤ = تجريد/٥/٢٠١. رقم/١٩١٦. مسلم. أدب: ٦٤٦٧. أبو داود. زكاة: ١٦٩٦. ترمذي. بر وصلة: ١٩٠٩. تحفة/٣١٩٠.

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: تاوانێکی گەلێ گەورەیەکە پیاو لەعنەتو نەفرین لە باوکو دایکی خۆی بکا! یاران فەرموویان: قوربان! جا چۆن چۆنی پیاو نەفرین لە باوکو دایکی خۆی دەکا، بۆچی شتی وا دەبێ؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): مەرج نییە کە خۆی ڕاستەو خۆی ئەوە بکا، بەڵام دەچێ جنێو بە باوکو دایکی کابرایەکی تر دەداو کابراکەیش جمێن دەداتەوە بە باوکو دایکی ئەو! (ش/د/ت).

شێخی عەینی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەسەردەمی حەزرەتدا یاران بە لایانەوە ستەم بووە، کە پیاوی وا هەبێ ڕاستەوخۆ جمێن بە باوکو دایکی خۆی بدا، وەلێ لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا نامەردی وا پەیدابووە لێشیان دەدا، چەن کەسێ گێڕایانەوە کە هەیە باوکی خۆی وەك کار سەربڕیوە، ئەم وەی و بەڵایە لە وڵاتی میسردا پەرەی سەندووە! من کە وەرگێڕی ئەم تاجە پیرۆزەم لە ساڵی ١٩٩١دا چوومە سەر تەعزییەی حاجییەکی قورئان خوێنی بەدین، لە شاری سلێمانی، لە گەڕەکی چوارباخ، کە کوڕەکەی خۆی بە خوتو خۆڕایی بەناهەق کوشتبووی!. (وەرگێڕ)

٤٦٨٤- عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَـلّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) يَقُولُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: أَنَا اللّٰهُ وَأَنَا الرَّحْمَنُ خَلَقْتُ الرَّحِمَ وَشَقَقْتُ لَهَا مِـنَ اسْـمِي فَمَـنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ وَمَنْ قَطَعَهَا بَتَتُّهُ. رواه الترمذي وأبو داود[10]:

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: من هەم ناوم ئەڵلایەو هەم ناوم ڕەحمانە، کە ڕەحمم دروست کرد، لە ڕەحمانی ناوی خۆم ناوم بۆی داتاشیوە، جا هەر کەسێ بەینی هەبێ لەگەڵ ڕەحمداو مەیانەی

---

[9] بخاري. أدب: ٥٦٢٨. مسلم. إيمان: ٢٥٩. أبو داود. أدب: ٥١٤٢. ترمذي. بر وصلة: ١٩٠٢. تحفة/٨٩١٨.

[10] بسند صحيح (شرحه).

خۆش بێ لەگەڵ خزمدا ئەوا منیش بەینم دەبێ لەگەل ئەوو مەیانەم خۆش دەبێ لەگەڵیدا، وە ئەو کەسەیشی بەینی نەبێ لەگەڵ ڕەحمو خزمدا منیش بەینم نابێ لەگەل ئەودا (ت/د– س/ص= تیرمیذی، ئەبو داوود سەنەد صەحیح).

٤٦٨٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَعَلَّمُوا مِنْ أَنْسَابِكُمْ مَا تَصِلُونَ بِهِ أَرْحَامَكُمْ فَإِنَّ صِلَةَ الرَّحِمِ مَحَبَّةٌ فِي الأَهْلِ مَثْرَاةٌ فِي الْمَالِ مَنْسَأَةٌ فِي الأَثَرِ. رواه الترمذي وأحمد والحاكم. نسأل الله التوفيق. آمين[11]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: فێری ڕەسەنو بنەچەی خۆتان بن، تاکوو خزمانی خۆتان بەسەر بکەنەوەو پەیوەندییان پێوە بکەن، چونکە خزم دۆستیو خزمەتی خزم دەبێ بەهۆی خۆشەویستی لەناو کەسوکارداو دەبێ بە مایەی دەوڵەمەندیو تەمەنی دوورو درێژ (ت/ ئەحمەد/ حاکم– س/ص).

## ٥) چاکە کردن لەگەڵ دەستو پێوەندا: (ومنه بر الأتباع)

٤٦٨٦– (ب– ٤ز– ١١٠ل– ٣٥١ف– ١)[1].

٤٦٨٧– عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَضْرِبُ غُلاَمًا لِي بِالسَّوْطِ فَسَمِعْتُ صَوْتًا مِنْ خَلْفِي: اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ. مَرَّتَيْنِ لَلَّهُ أَقْدَرُ عَلَيْكَ مِنْكَ عَلَيْهِ. فَالْتَفَتُّ فَإِذَا هُوَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ هُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ. قَالَ: أَمَا إِنَّكَ لَوْ لَمْ تَفْعَلْ لَلَفَعَتْكَ النَّارُ أَوْ لَمَسَّتْكَ النَّارُ[2]:

ئەبو مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لە خولامێکی خۆمم دەدا گوێم لێبوو یەکێ لەدوامەوە دەیگوت: بزانە ئەی ئەبو مەسعود! کە خودا

---

[11] بسند صحيح (شرحه).

[1] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/١١٠ رقم/٣١٨٥.

[2] بسند صحيح (شرحه).

باشتر دەسەڵاتی بەسەر تۆدا دەشکێ هەتا تۆ بەسەر ئەو خوڵامەدا، کە ئاوڕم دایەوە ڕوانیم ئەوە پێغەمبەرە وا دەفەرموێ، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! وا لەبەر ڕەزای خودا ئازادم کرد، فەرمووی: دەبزانە ئەگەر ئازادیت نەکردایە ئاگری دۆزەخ چزەی لێ هەڵ دەستاندیت! یا فەرمووی: هەڵی دەپڕووزاندیت. (د/ت- س/ص).

٤٦٨٨- ـ (ب- ٣ز- ٩٥ل- ٢٥٠ف- ٣)[٣].

٤٦٨٩- عَنْ ابْنَ عَمْرٍ (رَضي اللّهُ عَنهُمَا) قالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ كَمْ نَعْفُو عَنِ الْخَادِمِ فَصَمَتَ ثُمَّ أَعَادَ عَلَيْهِ الْكَلاَمَ فَصَمَتَ فَلَمَّا كَانَ فِي الثَّالِثَةِ قَالَ: اعْفُوا عَنْهُ فِي كُلِّ يَوْمٍ سَبْعِينَ مَرَّةً. روى هذه الثلاثة أبو داود والترمذي[٤].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕۆژی چەندجار لە خزمەتکارو نۆکەری خۆمان چاو پۆشی بکەین؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ دەنگی نەکرد کابراکە دیسان قسەکەی دووبارە کردەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دیسان دەنگی نەکردەوە تا لەجاری سێیەمدا فەرمووی: ڕۆژی حەفتا جار (د/ت- س/ح = ئەبو داوودو تیرمیذی سەنەد حەسەن).

٤٦٩٠- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مَنْ لاَءَمَكُمْ مِنْ مَمْلُوكِيكُمْ فَأَطْعِمُوهُ مِمَّا تَأْكُلُونَ وَاكْسُوهُ مِمَّا تَكْتَسُونَ وَمَنْ لَمْ يُلاَئِمْكُمْ مِنْهُمْ فَبِيعُوهُ وَلاَ تُعَذِّبُوا خَلْقَ اللّٰهِ تَعَالَى[٥]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی، خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خۆتان چی جۆرە خواردەمەنییەك دەخۆن لەهەمان شت

---

[٣] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/٩٥. رقم/٢٣٧٠.

[٤] بسند حسن (شرحه).

[٥] بسند صلح (شرحه). تقدم في مجلد ثالث تسلسل/٢١ رقم/٢٠٢٩.

دەرخـواردی ئـەو بەنـدەو خولامانەشـتان بـدەن کـە بـە دەردتـان دەخـۆن، وە هـەروەها بـۆ جل و بـەرگیش، ئەوانەشـیان کـە بـەدەردی ئێـوە نـاخۆن بیـان فرۆشن و مەبن بەهۆی ئێش و ئازار بۆ دروستکراوانی خـودای گـەورەو مـەزن! (د- س/صالح) ◄ (ب- ٣ز- ٢١ل- ٤٤ف- ٤).

٤٦٩١- عن رافع بن مكيث (رضي الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قـالَ: حسن الخلق يمن وسوء الخلق شؤم. رواهما أبو داود [٦]:

رافیعـی کوڕی مـەکیـث (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: ڕەفتـاری جوان لەگـەڵ دەسـت و پێوەنـدا مایـەی پیـت و بەرەکەتـە، بـەدخوویی و بـەد ڕەفتـاریش هـۆی بـەد فـەڕی و نەگبەتییـە! (د- س/صالح).

٤٦٩٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ نَشَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَأَدْخَلَهُ جَنَّتَهُ رِفْقٌ بِالضَّعِيفِ وَشَفَقَةٌ عَلَـى الْوَالِـدَيْنِ وَإِحْسَانٌ إِلَـى الْمَمْلُوكِ[٧]:

جـابیر (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفـەرموێ: ئـەم سـێ ڕەوشـە باشـە لەهـەر کەسـێکدا هـەبن لـە ڕۆژی قیامەتـدا خودا لە سایەی خۆیدا پەنای دەداو دەیباتە بەهەشت.

یەکەم: دڵسووتان بەزەبوون،

دووەم: میهرەبانی و دڵسۆزی لەگەڵ باب و داکدا، سێیەم: چاکە کـردن لەگەڵ بەندەو کۆیلەدا (ت- س/ح).

٤٦٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَـنِ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: نِعِمَّـا لأَحَدِهِمْ أَنْ يُطِيعَ رَبَّهُ وَيُؤَدِّيَ حَقَّ سَيِّدِهِ [٨]:

---

[٦] بسند صالح (شرحه).

[٧] بسند صالح (شرحه).

[٨] بسند حسن (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئافەریم بۆ ئەو بەندەو دەست و پێوەندەی کە هەم فەرمانی خودای خۆی بەجێ بێنێ و هەم مافی ئاغای خۆی بەرێك و پێکی جێبەجێ بکا. (ت-س/ص).

٤٦٩٤-وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا ضَرَبَ أَحَدُكُمْ خَادِمَهُ فَذَكَرَ اللَّهَ فَارْفَعُوا أَيْدِيَكُمْ [9]:

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەگەر لە نۆکەری خۆتان داو ناوی خودای هێنا و هانای بردە بەر خودا، وەك ئەوە گوتی: توخوا بەسە، ئیتر دەستی لێ هەڵگرن و لەبەر خاتری ناوی خودا لێی مەدەن (ت).

٤٦٩٥- ـ (ب - ١ ز - ١٢٦ ل - ٣٨٣ ف - ٦)[10].

٤٦٩٦- ـ (ب - ٣ ز - ١٦ ل - ٣٣ ف- ١ + ٢ + ٣ +٤ +٥ +٦ + ٧) + (ب - ٣ ز - ١٧ ل - ٣٧ ف - ١ + ٢ + ٣)[11].

## ٦) بەزەیی هاتنەوەو دڵسووتان بە هەتیوو بێوەژن و ئافرەتی بێ دەرەتان ومنه رحمة اليتيم والأرملة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ وَأَمَّا السَّائِلَ فَلَا تَنْهَرْ وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ - ٩٣/٩-١١}.

واتە: کەواتە تۆش لە هەتیوو تووڕە مەبەو دڵی مەشکێنەو ناهەقی لێ مەکە، هەروەها لەو کەسەیش تووڕە مەبە کە پرسیاری شتێکت لێ دەکا،

---

[9] سكت عن درجته الشارح.

[10] تقدم في مجلد أول. تسلسل/١٢٦ ل/٣٨٣ رقم/٧٦٢.

[11] راجع مجلد ثالث. تسلسل/١٦- أرقام/ ٢٠٠٩، ٢٠١٠، ٢٠١١، ٢٠١٢، ٢٠١٣، ٢٠١٤، ٢٠١٥ + مجلد/٣ تسلسل/١٧ رقم/٢٠١٦ و ٢٠١٧ و ٢٠١٨.

یاخود داوای شتێکت لێ دەکا، وەباسی نیعمەتی خودا بکە کە بەکەرەمی خۆی بەخشیویێتی بە تۆو سوپاسی بکە لەسەر ئەوەو قەت مەکوروزێرەوەو هەمیشە بەرچاو تێربەو دەست کراوەبەو هەموو حەڵێ بە پیاوەتی کردنو دەستی هەژار گرتن دەوڵەتو دارایی خۆت بەزیادەوە دەربخە!

٤٦٩٧- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا. وَقَالَ بِإِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى. رواه الأرلابعة[1]:

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەی شایەتمانیو پەنجەی ناوەڕاستی هەڵبڕیو کەمێ بڵاوی کردنەوەو فەرمووی: منو داڵدەی هەتیو لەبەهەشتا وەکوو ئەم دوو پەنجەیە ئاوا پایەمان لەیەکەوە نزیکە، واتە: ئەو کەسەی کە بەخێوی دەکا تالەخەم دەرەخسێ لە بەهەشتا لە نزیك پێغەمبەرەوە دەبێ (ش/د/ت).

٤٦٩٨- ولمسلم: كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ. وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى[2]:

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەی دۆشاو مژەو هەڵمەقووتە ئاماژەی کردو فەرمووی: منو سەرپەرشت (کافیل)ی هەتیوو لەبەهەشتا وەك ئەم دوو پەنجەیە ئاوا لەیەکەوە نێزیکین، ئیتر گریمان ئەو هەتیوە هی خۆی بێو خۆی هەقداری بێ، وەك ئەوە هەتیوەکە هی خزمو کەسوکاری خۆی بێ، یا هی بێگانەیێ بێ جیاوازیی نییە. (م.هەژار ڕەحمەتی لێ بێ).

٤٦٩٩- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا وَامْرَأَةٌ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ كَهَاتَيْنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَأَوْمَأَ يَزِيدُ بِالْوُسْطَى وَالسَّبَّابَةِ امْرَأَةٌ آمَتْ مِنْ زَوْجِهَا ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ حَبَسَتْ نَفْسَهَا عَلَى يَتَامَاهَا حَتَّى بَانُوا أَوْ مَاتُوا. رواه أبو داود[3]:

---

[1] تجريد/٦٧/٥/ رقم/ ١٧٩٣ = ٥٣٠٤، ٦٠٠٥ فتح.

[2] مسلم. زهد: ٧٣٩٤.

[3] بسند صحيح (شرحه).

عەوفی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پەنجەی شایەتمانو پەنجەی ناوەڕاست ئاوای کردوو فەرمووی: ئەو ئافرەتانەی کە بەگەنجیو شۆخی بێوەژن دەکەونو بەرەبەرە دەموو چاویان هەڵدەقرچێ ئەوەندە بێوژنکۆشی دەکەنو بەسەر هەتیوەکانیانەوە هەڵ دەترووشکێن، وە شوو ناکەنەوە هەتا هەتیوەکانیان لە هەتیووی دەرەچنو لەخەم دەرەخسێن یاخود دەمرن، منو ئەم جۆرە بێوەژنانە لە ڕۆژی قیامەتدا وەك ئەم دوو پەنجەیە واین (د- س/صالح).

٤٧٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: مَنْ قَبَضَ يَتِيمًا بَيْنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَى طَعَامِهِ وَشَرَابِهِ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ الْبَتَّةَ إِلاَّ أَنْ يَعْمَلَ ذَنْبًا لا يُغْفَرُ لَهُ. رواه الترمذي[٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی هەتیوێ بگرێتە لای خۆی، کە لە دوو موسوڵمان بووبێ، وە بەنانو ئاوی خۆی بەخێوی بکا، مسۆگەر خودا دەیباتە بەهەشت، مەگەر ئەو گوناهە بکا کە لێخۆشبوونی بۆ نییە! (ت- س/ضەعیف = تیرمیذی بەسەنەدێکی ضەعیف ئەم حەدیثەی ریوایەت کردووە).

٤٧٠١- عَنْ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ، أَوْ كَالَّذِي يَصُومُ النَّهَارَ وَيَقُومُ اللَّيْلَ. رواه الشيخان والترمذي. نسأل الله التوفيق آمين[٥]:

صەفوانی کوڕی سولەیم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ تێ بکۆشێ لە پێناوی ژنی بێ مێردو مرۆڤی هەژارداو ساخ لەبەر ڕەزای خودای گەورە بەخێویان بکاو خزمەتیان بکاو مەسرەفیان بکێشێ، ئەوە بەقەد ئەو خەباتکێرە کە لە ڕێگەی خودادا خەبات

---

[٤] بسند ضعيف (شرحه).

[٥] بخاري. نفقات: ٥٣٥٣، ٦٠٠٦م، ٦٠٠٧. مسلم. زهد: ٧٣٩٣. ترمذي. بر وصلة: ١٩٦٩م. نسائي. زكاة: ٢٥٧٦. ابن ماجه تجارات: ٢١٤٠. تحفة/١٣٩١٤.

دەگێڕێ و غەزا دەكا خێرو پاداشی بۆ هەیە، یان فەرمووی: وەك ئەو كەسە وایە كە بەرۆژ هەر بەرۆژوو بێ و بە شەویش هەر شەونوێژ بكا! (ش/ت).

### ٧) مافەكانی هاوسێ : (ومنه حقوق الجار)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ – ٣٦/٤}.

واتە: ئەی ئادەمیزادەكان! عیبادەت و بەندەگی ساخی خودا بكەن و هاوڕێی بۆ بڕیار مەدەن و چاكە بكەن، بە تایبەتی لەگەڵ باوك و دایكتانا و لەگەڵ خزم و كەسوكاری خۆتاندا و لەگەڵ منداڵی بێ بابدا و لەگەڵ هەژارو گەداكاندا و لەگەڵ دراوسێدا، خوا خزم بێ خوا بێگانە بێ، وە چاكە بكەن لەگەڵ ئەو كەسانەدا كە هاوڕێی دەرەوەتانن، وەك هاوكارو هاو دوكان و هاو گوزەرو هاو فێرگەو هاوڕێ، هەروەها چاكە بكەن لەگەڵ ژنی خۆتاندا و لەزەگەڵ هاوسەرتاندا و لەگەڵ رێبوارداو لەگەڵ دەست و پێوەند و بەندەو نۆكەری خۆتاندا، چ پیاو بن چ ژن.

٤٧٠٢– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا زَالَ يُوصِينِي جِبْرِيلُ بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ. رواه الأربعة[1]:

عائیشەی هاوسەری حەزرەت (دروودی خودای گەورە لەسەر پێغەمبەر بێ و ڕەزای خودا لەو) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جوبرائیل (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوەندەی ئامۆژگاری كردم لە بارەی دراوسێوە تاوام زانی كە دراوسێ لە یەكتری كەلەپوور دەگرن (ش/د/ت– خودایان لێ رازی بێ).

٤٧٠٣– هـ (ب – ٢ ز – ١٧٦ ل – ٣٦٧ ف – ٢ + ٤)[2].

---

[1] بخاري. أدب. ٦٠١٤، ٦٠١٥. مسلم. أدب: ٦٦٣٠، ٦٦٢٨. ابوداود. أدب: ٥١٥١. ترمذي. بر وصلة: ١٩٤٢. ابن ماجه. أدب: ٣٦٧٣. تحفة/١٧٩٤٧. تجريد/٥ رقم/١٩٢٨.

[2] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/١٧٦ رقم/١٩٢٥ و ١٩٢٧.

لێرەدا دەڵێ: بوخاریو ئەبو داوود ئەم فەرموودەیەیان ریوایەت کردووە، بەڵام گفت (لەفظ)ی ئەبو داوود ئاوایە: گوتی: من دوو دراوسێم هەیە بۆ دیاریو دەسەنەو پیاوەتیو چاودێری کامیان پێش بخەم؟ فەرمووی: ئەوەیان کە دەرگاکەی نێزیکترە.

٤٧٠٤– عَنْ أَبِى شُرَيْحٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَاللّٰهِ لاَ يُؤْمِنُ ، وَاللّٰهِ لاَ يُؤْمِنُ ، وَاللّٰهِ لاَ يُؤْمِنُ. قِيلَ وَمَنْ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: الَّذِى لاَ يَأْمَنُ جَارُهُ بَوَايِقَهُ. رواه البخاري ومسلم ولفظه: لا يدخل الجنة من لا يأمن جاره بوائقه[٣]:

ئەبو شورەیح (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (سڵاوی خوای لەسەر بێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: بەخودا باوەڕو ئیمانی نییە! عەرزیان کرد: کێ؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: کەسێ کە هاوسێ لە زیانو وەزەنی بترسێ! (ش) گفتەی (م): دراوسێی زیانە خرۆو نا ئەمین ناچێتە بەهەشت.

٤٧٠٥– عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا أَبَا ذَرٍّ إِذَا طَبَخْتَ مَرَقَةً فَأَكْثِرْ مَاءَهَا وَتَعَاهَدْ جِيرَانَكَ[٤]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: کە مەرگەت لێنا، هەندێ ئاوی زیاتری تێ کەو ئاگات لە هاوسێکانت بێو بێ بەشیان مەکە (م).

٤٧٠٦– وَذَبَحَ فِي بَيْت عَبدِ اللّٰهِ ابْنِ عُمْرُو (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) شَاةً فَقَالَ: أَهْدَيْتُمْ لِجَارِى الْيَهُودِىِّ فَإِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِى بِالْجَارِ حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ. رواه أبو داود والترمذي[٥]:

ماڵی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) مەڕێکیان سەربڕی عەبدوڵڵا فەرمووی: ئەری بەشتان لێی برد بۆ جولەکەکەی دراوسێم، چونکی

---

[٣] تجريد/٥ ل/٢٠٨ قم/١٩٢٩ = ٦٠١٧ + رقم/١٠٥٩ = ٢٥٦٦ = بەرگی/٣ ل/١٨٦. مسلم. إيمان: ١٧٠.

[٤] مسلم. أدب: ٦٦٣١. ترمذي. أطعمة: ١٨٣٣. ابن ماجه. اطعمة: ٣٣٦٢. تحفة/١١٩٥١.

[٥] بسند حسن (شرحه).

من لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): جوبرائیل ئەوەندەی ئامۆژگاری خێری کردم دەربارەی هاوسێ، تەنانەت گومانم بۆ ئەوە چوو: کە هاوسێ میرات و کەلەپوور دەگرێ لە هاوسێ! (د/ت – س/ح).

٤٧٠٧– وَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَشْكُو جَارَهُ فَقَالَ: اذْهَبْ فَاصْبِرْ. فَأَتَاهُ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا فَقَالَ: اذْهَبْ فَاطْرَحْ مَتَاعَكَ فِي الطَّرِيقِ. فَطَرَحَ مَتَاعَهُ فِي الطَّرِيقِ فَجَعَلَ النَّاسُ يَسْأَلُونَهُ فَيُخْبِرُهُمْ خَبَرَهُ فَجَعَلَ النَّاسُ يَلْعَنُونَهُ فَعَلَ اللَّهُ بِهِ وَفَعَلَ وَفَعَلَ فَجَاءَ إِلَيْهِ جَارُهُ فَقَالَ لَهُ ارْجِعْ لاَ تَرَى مِنِّي شَيْئًا تَكْرَهُهُ. رواه أبو داود[٦]:

پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) شکات و سکاڵای لەدەستی هاوسێکەی کرد، فەرمووی: بچۆ ددان بە خۆتدا بگرەو صەبرکە، جا پیاوەکە دووجار یا سێ جاری تریش دیسان هاتەوە بۆ خزمەتی بۆ سکاڵاکردن، ئەوجا فەرمووی: دەبڕۆ کەلوپەلەکەت لەسەر چەقی ڕێگەکەدا فڕێدە، ئەویش چوو وای کرد، جا خەڵك لێیان دەپرسی: ئەمە چییە؟ ئەویش باسەکەی بۆ باس دەکردن! ئەوانیش نەحلەت و نەفرینیان لە کابرا دەکردو دەیانگوت: سادەی خودا واوای لێ بکا بۆ خۆی و ڕەفتاری ناهەمواری! جا هاوسێکەی چوو بۆلای و گوتی: وەرەوە ئیتر لەمەولا هیچ ئازارێ لەمن نابینیت (د– س/صالح).

٤٧٠٨– وللترمذي: خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ وَخَيْرُ الْجِيرَانِ عِنْدَ اللَّهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ. والله أعلم[٧]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: باشترین هاوڕێ (لەلای خودا) ئەو کەسەیە کە باش بێ بۆ هاوڕێی خۆی باشترین دراوسێش لەلای خودا ئەو دراوسێیەیە کە زۆر باشە بۆ دراوسێکانی (ت– س/ح).

---

[٦] بسند صالح (شرحه).

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

## ٨) مافەکانی موسوڵمان لەسەر برای موسوڵمانی : (حقوق المسلم على المسلم)

٤٧٠٩- ـ (ب – ١ ز – ٢٠٠ ل – ٥٣٨ ف – ١) + (ب – ١ ز – ٢١٨ ل – ٥٦٧ ف – ١)[١].

٤٧١٠- وللترمذيّ: لِلْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ سِتٌّ بِالْمَعْرُوفِ يُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِذَا لَقِيَهُ وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ وَيَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ وَيَتْبَعُ جَنَازَتَهُ إِذَا مَاتَ وَيُحِبُّ لَهُ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ. نسأل الله مودة خَلْقِهِ. آمين[٢]ك

حەزرەت (سلاوی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەفەرموێ: بە یاسای شەرع موسوڵمان ئەم شەش هەقەی لەسەر موسوڵمان هەیە:

یەکەم: کاتێ تووشی دەبێ سلاوو رۆژ باشی لێ بکا،

دووەم: ئەگەر خوڵکی کرد بچێ بۆسەر بانگهێشتنەکەی،

سێیەم: کاتێ دەپژمێ دووعای خێری بۆ بکا،

چوارەم: کاتێ نەخۆش دەکەوێ سەری لێ بدات،

پێنجەم: کاتێ دەمرێ شوێن تەرمەکەی بکەوێ،

شەشەم: بە شێوەیەکی گشتی هەرچی پێخۆشە بۆ خۆی بۆ ئەویش ئەوەی پێ خۆش بێ (ت). بەپێی فەرموودەی یەکەمی ئەم باسە ئەم هەقەیشی لەسەری هەیە: ئەگەر داوای ئامۆژگاریو راوێژی لێکرد دەبێ ئامۆژگاری خێری بکا. (وەرگێڕ)

## ٩) میهرەبانیو بەزەیی دەربارەی دروسکراوانی خودای گەورە پێویستە الرحمة واجبة لخلق الله تعالى

٤٧١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ فَأَمْسَكَ عِنْدَهُ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ ، وَأَنْزَلَ فِي الأَرْضِ

---

[١] تقدم في مجلد اول. تسلسل/٢٠٠ رقم/١٠٥٢ + مجلد أول تسلسل/٢١٨ رقم/١١١٥.

[٢] سكت عن درجته الشارح.

جُزْءاً وَاحِداً ، فَمِنْ ذَلِكَ الْجُزْءِ يَتَرَاحَمُ الْخَلْقُ حَتَّى تَرْفَعَ الْفَرَسُ حَافِرَهَا عَنْ وَلَدِهَا خَشْيَةَ أَنْ تُصِيبَهُ. رواه الشيخان[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بیستم لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: خودا ڕەحمەتو میهرەبانی کردووە بەسەد بەشەوە، نەوەدو نۆ بەشیانی لای خۆی هێشتۆتەوە، وە تاقە یەك بەشیانی ناردۆتە خوارەوە بۆسەر زەوی، ئیتر ئەمەی کە دەیبینن مەخلووقات ڕەحم بەیەکتری دەکەنو لەناو خۆیاندا بەزەییان بەیەکتریی دێتەوە ئەمە هەمووی بەشێکە لەو تاقە بەشە، تەنانەت ئەوەیشە کە ماین (لەبەرهۆیی) سمی خۆی هەڵ دەبڕێ نەبادا بەر بەچکەکەی بکەوێ! (ش).

٤٧١٢- ـه (ب - ٩ ز - ٣ ل - ١٠ ف - ١)[٢].

چاکەکردن لەگەڵ منداڵدا.

٤٧١٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ ارْحَمُوا أَهْلَ الأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السَّمَاءِ[٣]:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: میهرەبانان خودای میهرەبان بۆخۆی میهریان لەگەڵ دەنوێنێ، ڕەحم بەخەڵکی سەر زەوی بکەن تا خودا کەوا لە ئاسمان ڕەحمتان پێ بکا (ت- س/ص).

٤٧١٤- وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ صَاحِبَ هَذِهِ الْحُجْرَةِ يَقُولُ: لاَ تُنْزَعُ الرَّحْمَةُ إِلاَّ مِنْ شَقِيٍّ[٤]:

---

[١] تجرید/٥ ل/٢٠٥ رقم/١٩٢٢ = ٦٠٠٠، ٦٤٦٩ فتح. مسلم. توبة: ٦٩٠٦.

[٢] تقدم في مجلد تاسع. تسلسل٠٣ رقم/٤٦٦٥.

[٣] رواه الترمذي بسند صحسح (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە حەزرەتی ئەبولقاسم (واتە: لە خاوەنی ئەم گۆڕە پیرۆزە کە پێغەمبەری ڕاستو دروستە) دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەوەی بەدبەخت نەبێ میهرو بەزەیی و ڕوحم لە دڵی داناڕنرێ! (د/ت– س/ح).

٤٧١٥– وَجَاءَ شَيْخٌ يُرِيدُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَبْطَأَ الْقَوْمُ عَنْهُ أَنْ يُوَسِّعُوا لَهُ، فَقَالَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا. روى هذه الثلاثة أبو داود والترمذي[٥]:

پیاوێکی پیر دەهات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاوڕێیان کەمێ درەنگ مەودایان دا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کەسەی ڕوحم بە بچووکمان نەکاو قەدری گەورەمان نەگرێ لە ئێمە نییە! (د/ت– س/غەریب).

٤٧١٦– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا وَيَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ[٦]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای گەورەیان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی بەزەیی نەیەتەوە بە بچووکماناو قەدری گەورەمان نەزانێ و فەرمان نەکا بە چاکەو نەهی نەکا لە خراپە ئەوە لەئێمە نییە! (ت– س/ح).

٤٧١٧– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَكْرَمَ شَابٌّ شَيْخًا لِسِنِّهِ إِلاَّ قَيَّضَ اللّٰهُ لَهُ مَنْ يُكْرِمُهُ عِنْدَ سِنِّهِ. رواهما الترمذي[٧]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): هەر لاوێ ڕێزی پیرێ بگرێ لەبەر تەمەنی، مسۆگەر خوداش کەسێ بۆ ئەو دەرەخسێنێ کە لەکاتی پیریدا ڕێزی بگرێ (ت– س/ح).

---

[٥] بسند غريب (شرحه).

[٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٤٧١٨- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ الْمُؤْمِنِينَ فِي تَوَادِّهِمْ وَتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ مَثَلُ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الْجَسَدِ بِالسَّهَرِ وَالْحُمَّى. رواه الشيخان[٨]:

نوعمانی کوڕی بەشیر (خودایان لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: موسولمانان لەناو خۆیاندا دەبێ وەك براین‌و دۆستو دلسۆزی یەکتری بن‌و لەگەڵ یەکتری بە ڕوحم‌و میهرەبان بن، نموونەی بالاو سەر مەشقێکی جوان بن بۆ بەتەنگەوە بوونی یەکتری، وەك چۆن جەستەیێ ئەگەر ئەندامێکی بێتەژان، وەك ئەوە چاوی ژان بکا، ئیتر هەموو گیانی وەك یەك دێتە ژان‌و هەموو ئەندامەکانی تری شەونخوونی لەگەڵ دەکێشن‌و لە تاوی ئازاری ئەو ئەوانیش تایان لێ دێ، دەبێ موسولمانانیش لەگەڵ یەکتری ئاوا بن! (ش).

٤٧١٩- ولمسلم: الْمُؤْمِنُونَ كَرَجُلٍ وَاحِدٍ إِنِ اشْتَكَى رَأْسُهُ اشْتَكَى كُلُّهُ وَإِنِ اشْتَكَى عَيْنُهُ اشْتَكَى كُلُّهُ[٩]:

حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: موسولمانان وەك یەك كەس وان، دەبێ هەست بەخۆشی‌و ناخۆشی یەکتری بکەن، وەك چۆن کاتێ پیاوێ چاوی هاتە ئێش هەموو گیانی لەتاوی دەداتە ژان ئاوا، یا سەری هاتە ژان هەموو جەستەی دەداتە ئێش دەبێ ئەوانیش لەگەڵ یەکتریدا ئاوا هاوهەست بن (م).

٤٧٢٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ ، يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا. ثُمَّ شَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسًا إِذْ جَاءَ رَجُلٌ يَسْأَلُ أَوْ طَالِبُ حَاجَةٍ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا ، وَلْيَقْضِ اللَّهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا شَاءَ. رواه الأربعة[١٠]:

---

[٨] تجريد/٥ ل/٢٠٧ رقم/١٩٢٥ = ٦٠١١ فتح الباري. مسلم. أدب: ٦٥٢٩. تحفة الأشراف/١١٦٢٧.

[٩] مسلم. ادب. ٦٥٣٢.

[١٠] بخاري. صلاة: ٤٨١، ٢٤٤٦، ٦٠٢٦. مسلم. أدب: ترمذي. بر وصلة: ١٩٢٨. نسائي. زكاة: ٢٥٥٩. تحفة الأشراف: ٩٠٤٠. تجريد/١ ل/٢٩٩ رقم/٢٩٢.

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): موسوڵمان قەڵایە بۆ موسوڵمان و وەك چینی دیوار چنگ دەدەنە یەك! ئینجا پەنجەکانی هەردوو دەستی خۆی تێك ئالاند بەیەکدا تا بەتەواوی نیشانیان بدا کە دەبێ ئاوا پشتی یەکتری بگرن، قسەبەر (ڕاوی) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبوو لەوکاتەدا پیاوێ هات دەرووزەی دەکرد، یا کارێکی تری هەبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕووی کردە ئێمەو فەرمووی: تکای باش بکەن، بۆ داماوان و نیازمەندان، تا ئەجرو پاداشی باشی لەسەر وەربگرن، ئەوەیشی بڕیاری خودای گەورەی لەسەربێ و خودا خۆی بەچاکی بزانێ لەسەر زمانی پێغەمبەری خۆی جێبەجێی دەکا، ئیتر بوونی ئەو شتە بێ یا نەبوونی بێ (ش/د/ت- خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٧٢١- وَكَانَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سفر مَعَهُ فَأَخَذَ بَعْضُهُمْ مِنْ أَخِيهِ حبلا وهو نَائِمٌ فاستيقظ فَفَزِعَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يُرَوِّعَ مُسْلِمًا. واه أبو داود في المزاح[11]:

لەسەفەرێکا یاران لە خزمەتی حەزرەتدا بوون، یەکێکیان دەخەوێ، برادەرێکی بۆ گاڵتە گوریسێکی دەبا، جا کەپیاوەکە لە خەوەکەی خەبەری دەبێتەوە دا دەچڵەکێ و بۆ گوریسەکەی دەشەڵەژێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بەم حاڵە دەزانێ دەفەرموێ: دروست نییە بۆ موسوڵمان کە موسوڵمان داچڵەکێنێ، با بۆ سوعبەتیش بێ (د- س/صالح).

٤٧٢٢- ـه (ب - ٢ ز - ١٧٧ ل - ٣٦٨ ف - ٣)[12].

٤٧٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَانْطَلَقَ لِحَاجَتِهِ فَرَأَيْنَا حُمَّرَةً مَعَهَا فَرْخَانِ فَأَخَذْنَا فَرْخَيْهَا فَجَاءَتِ الْحُمَّرَةُ فَجَعَلَتْ تَفْرُشُ، فَجَاءَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَنْ فَجَعَ هَذِهِ بِوَلَدِهَا رُدُّوا وَلَدَهَا إِلَيْهَا. وَرَأَى

---

[11] بسند صالح (شرحه).

[12] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/١٧٧ رقم/١٩٣٠.

قَرْيَةَ نَمْلٍ قَدْ حَرَّقْنَاهَا فَقَالَ: مَنْ حَرَّقَ هَذِهِ. قُلْنَا نَحْنُ. قَالَ: إِنَّهُ لاَ يَنْبَغِي أَنْ يُعَذِّبَ بِالنَّارِ إِلاَّ رَبُّ النَّارِ. رواه أبو داود. نعوذ بالله من النَّارِ ونسأله رضاه والجنة آمين[١٣].

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا بووین، چووم بۆ ئیشێکی خۆم، کڵاو کوورەیەکم دی دوو بەچکەی لەبەربوو، بەچکەکانیم گرت، دایکەکەیان بە باڵە کوورە دوامان کەوتو بە باڵە تەپێ بەسەرماندا لەتاو بەچکەکانی دەهاتو دەچوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات فەرمووی: ئەوەکێ جەرگی ئەم مەلەی سووتاندووەو کۆستی خستووەو بەچکەکانی بردووە؟ بەچکەکانی پێ بدەنەوە! تەماشای کرد شارە میروولەیەکیشمان سووتاندبوو، فەرمووی: ئەی کێ ئەم شارە میروولەی سووتاندووە؟ گوتمان: ئێمە، فەرمووی: شتی وامەکەن، لە ڕاستیدا بۆکەس نەهاتووە کە بەئاگر سزاو ئازاری هیچ شتێ بدا مەگەر بۆ خودا خۆیو بەس! (د).

٤٧٢٤- لەشەرحەکەدا دەفەرموێ (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودای گەورە بێ) لە کیتابی جیهاددا لەسەر باسی ئەسرادا ئەم فەرموودەیە ڕابوورد کە دەفەرموێ: هەر کەسێ دایكو بەچکە لەیەك جیابکاتەوە، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا لە خۆشەویستانی خۆیی دادەبڕێ! (ت- س/ح)[١٤].

٤٧٢٥- ـه (ب - ٤ ز- ٤ ل - ١٥ ف- ١) + (ب - ٤ ز - ٤ ل - ١٦ ف - ٣ + ٤ + ٥ + ٦) + (ب - ٤ ز - ٥ ل - ١٩ ف - ١ + ٢ + ٣) + (ب - ٤ ز - ٩ ف- ٣ ل - ٢٨) + (ب - ٣ ز - ٨٢ ل - ٢١٢ ف - ٤)[١٥].

---

[١٣] رواه أبو داود، وسكت الشارح عن درجته.

[١٤] رواه الترمذي بسند حسن. راجع مجلد ثامن تسلسل/٧٠ رقم/٤٥٤٠.

[١٥] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/٤ رقم/٢٥٧٤ و ٢٥٧٦ و ٢٥٧٧ و ٢٥٧٨ و ٢٥٧٩ و تسلسل/٥ رقم/٢٥٨٤، ٢٥٨٥ و٢٥٨٦ وتسلسل/٩ رقم/٢٦٠٢ ومجلد ثالث. تسلسل/٨٢ رقم/٢٣٠٥.

## ١٠) باسی دووەم: باسی جۆرەکانی کردەوەی خراپە خراپترین خراپە زۆرو ستەمو زیاندانە لە مەخلووق

## الباب الثاني: في أنواع الأثم. أعظمه الظلم وإضرار الخلق

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَارُ - سورة إبراهيم - ١٤/٤٢}.

واتە: هەرگیز تۆ وا گوومان نەبەی کە خودا بێ ئاگابێ لە کارو کردەوەی ناهەمواری ستەمکارو لە ستەمو زوڵمو زۆری زۆردار، کە گەلێ جار وەك گورگی هار بەردەبێتە گیانی دروسکراوانی خودا، با خودا زۆر باش ئاگای لێیەتی، وە لەبەر حیکمەتێ کە خۆی دەیزانێ ماوەیێ مەودایان دەداو جڵەویان بۆ شل دەکاو تۆڵەیان دوا دەخا، ئیتر نەزان وادەزانێ کە تاسەر زوڵمو زۆر لەسەرەوە دەبێ، خودایێ نییە کە هەقو ناهەق بپرسێ، وەلێ رۆژی رەشی زۆردار زۆر نزیکە، خودا تۆڵەیان دوادەخاو هەڵیان دەگرێ بۆ حەسیر مەیدانی رۆژی رەشیان، کە لەو ڕۆژەدا چاویان ئەبلەق دەبێو رەق رادەوەستێ لەترسی قارو سزای خودای گەورە.

٤٧٢٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضي اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الظُّلْمُ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): زۆرو ستەم تەمو مژو تاریکی زۆرن، لە رۆژی قیامەتدا زۆر دارەکە دەکەوێتە ناویانو وەك کوێری مزمەعیل بەهیچ لایەکا سەردەرناکا (ش/ت).

٤٧٢٧-وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَخَذَ مِنَ الأَرْضِ شَيْئًا بِغَيْرِ حَقِّهِ خُسِفَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ. وفي رواية: مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنَ الأَرْضِ ظُلْمًا فَإِنَّهُ يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ. رواه الشيخان وأحمد[2]:

---

[1] بخاري.مظالم. ٢٤٤٧ = تجريد/٣ ل/١٥٥ رقم/١٠٦١. مسلم.أدب: ٦٥٢٠. ترمذي: بر وصلة: ٢٠٣٠. تحفة/٧٢٠٩.

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): هەرکەسێ بەناڕەوا پارچەیێ زەوی زەوت بکا، ڕۆژی قیامەت هەتا حەوت تەبەقەی زەوی ڕۆدەچێ بەناخیدا لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەسێ بە زۆرو ستەم بستێ زەوی داگیر بکا، لە ڕۆژی قیامەتا بەهەر حەوت چینەی زەمینەوە وەك کەڵەمە لە ملی گادا ئاوا دەکرێ بە تەوقو دەکرێتە ئەستۆی (ش/ ئەحمەد).

٤٧٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ مَظْلَمَةٌ لأَحَدٍ مِنْ عِرْضِهِ أَوْ شَيْءٍ فَلْيَتَحَلَّلْهُ مِنْهُ الْيَوْمَ ، قَبْلَ أَنْ لاَ يَكُونَ دِينَارٌ وَلاَ دِرْهَمٌ ، إِنْ كَانَ لَهُ عَمَلٌ صَالِحٌ أُخِذَ مِنْهُ بِقَدْرِ مَظْلَمَتِهِ ، وَإِنْ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَاتٌ أُخِذَ مِنْ سَيِّئَاتِ صَاحِبِهِ فَحُمِلَ عَلَيْهِ. رواه البخاري.[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): هەر کەسێ ناڕەواییەکی لەکەسێ کردبێ، یا هەقێکی کەسێکی تری لەسەر بێ، خوا هی ناموس بێ، خوا هی شتێکی تر بێ، با ئەمڕۆ لەم جیهانەدا گەردنی خۆیی پێ ئازاد بکا لەو هەقە، یا لەو ناڕەواییە، یا بەهەر شێوەیێ دەتوانێ بە پێی شەرع ڕەزای بکا لە خۆی، بەرلەوەی کە بمرێو بچێ بۆ ئەو دنیاو حەقەکە بکەوێتە ڕۆژێکەوە کە لەو ڕۆژەدا دینارو درەمو پارەو پوول نامێنێو بە دەرد ناخوا، ئەگینا ئەگەر وانەکا ئەوە حاڵ لەم دوو خاڵە بەدەر نییە: ئەگەر کردەوەی باشی هەبێ بە قەد ئەو هەقە لە کردەوە باشەکەی دەدرێ بە خاوەن هەقەکە، خۆ ئەگەر گریمان کردەوەی باشی نەبوو ئەوا خراپتر، چونکە لە خراپەی برادەرەکەی کە هەقەکەی لەسەریەتی هەڵ دەگیرێو فڕێ دەدرێتە سەر ئەو (ب- ڕەحمەت لە گۆڕی).

٤٧٢٩- ← (ب - ١ ز- ١٤ ل- ٧٩ ف - ٣)[٤].

---

[٢] تجريد = مختصر صحيح البخاري بالكوردي. مجلد ثالث ل/١٥٧ رقم/١٠٦٤ = ٢٤٥٤، ٣١٩٦. فتح الباري. مسلم. بيوع: ٤١٠٩.

[٣] تجريد = مختصر صحيح البخاري بالكوردي. مجلد ثالث ل/١٥٥. رقم/١٠٦٢ = ٢٤٤٩، ٦٥٣٤ فتح الباري.

[٤] تقدم في مجلد أول. تسلسل/١٤ رقم/١٠٠.

لێرەدا لە سەرەتاوە ئاوایە: موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو زۆرداریی لێ بکا، یا تووشی سەختی و سەر تیاچوونی بکا، یا پشتی لەزەوی بدا.

٤٧٣٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اتَّقُوا الظُّلْمَ فَإِنَّ الظُّلْمَ ظُلُمَاتٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاتَّقُوا الشُّحَّ فَإِنَّ الشُّحَّ أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حَمَلَهُمْ عَلَى أَنْ سَفَكُوا دِمَاءَهُمْ وَاسْتَحَلُّوا مَحَارِمَهُمْ. رواه مسلم[٥]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): خۆتان لە زۆرو ستەم بپارێزن، بەڕاستی زۆرو ستەم تەم و مژو تاریکی زۆرن، لە ڕۆژی قیامەتا گەمارۆی زۆردارەکە دەدەن، وەك کوێری مزمەعیل دەکەوێتە ناویان، دەوری ئەوەندە تاریك و نوتەکە بەهیچ لایەکا سەر دەرناکا، هەروەها خۆشتان لە پیسکەیی و چرووکی بپارێزن، چونکە چرووکی و پیسکەیی بوون بەهۆی لەناوچوونی میلەتەکانی پێش ئێوە، بەرەبەرە وای لێکردن کە لەسەر ماڵی دنیا و سامانی جیهان خوێنی یەکتری بڕێژن و حەڵاڵ و حەرام نەزانن و ناڕەوا بەڕەوا دابنێن (م).

٤٧٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ؟ قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ وَلاَ مَتَاعَ. فَقَالَ: إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاَةٍ وَصِيَامٍ وَزَكَاةٍ وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا وَأَكَلَ مَالَ هَذَا وَسَفَكَ دَمَ هَذَا وَضَرَبَ هَذَا فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ[٦]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (سەرو ماڵ و مناڵ و روح و گیان و هەست و نەست هەمووی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ و صەڵات و سەلام و درورد و ڕەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ)

---

[٥] مسلم. أدب: ٦٥١٩.

[٦] مسلم. أدب. ٦٥٢٢.

فەرمووی: ئەرێ ئێوە دەزانن کە نابووت کێیە؟ گوتیان: لەناو ئێمەدا نابووت ئەو کەسەیە کە پارەو ماڵی نەبێ، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): بەڵام نابووتی ئومەتی من ئەو کەسەیە، کە لە ڕۆژی قیامەتا دێ بۆ دیوانی خودا بۆ لێپرسینەوە، لە لایەکەوە نوێژی کردووەو ڕۆژووی گرتووەو زەکاتی داوەو بەشی خۆی چاکەی هەیە، لەلایەکی تریشەوە جنێوی بەمو بەو داوە، یا بوختانی بۆ کەسێ کردووە، یا ماڵی ئەمو ئەوی بە ناڕەوا خواردووە، یا خوێنی خەڵکی بە ناهەق ڕشتووە، یا لە خەڵکی داوە، یا خراپەی تری کردووە، جا لەبەرئەوە ئەم چاکەیەی دەدرێ بەمو ئەو چاکەیەی تری دەدرێ بەوی تر، لە جیاتی هەقی خۆیان، جا ئەگەر چاکەکانی هەموو تەواو بوون‌و بەشی دانەوەی ئەو هەقانەیان نەکرد کەوان لەسەری ئەوا ئەوجا لە گوناهو تاوانەکانی ئەو خاوەن هەقانە دێنن‌و فڕەیان دەدەنەسەر ئەم، ئەوسا کلکی دەگرن‌و بەبێ نرخی تووڕی دەدەنە ناو دۆزەخ! (م/ت– ڕەزای خودای لێ بێ).

٤٧٣٢– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنَ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ. رواهما مسلم والترمذي[٧]:

دیسان لە حەزرەتەوە دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): لە ڕۆژی قیامەتا هەموو خاوەن مافێ مافی خۆی وەردەگرێ‌و مافی کەس لەسەر کەس نامێنێ، تەنانەت تۆڵەی بزنی کوڵ لە بزنی شاخدار دەسەنرێ بۆی! (م/ت– خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٧٣٣– ﮬ (ب – ٣ ز – ٨٧ ل – ٢٢٧ ف – ٤)[٨].

٤٧٣٤– عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللّٰهُ تَعَالَى لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا – مَعَ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الآخِرَةِ – مِثْلُ الْبَغْيِ وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ. رواه أبو داود والترمذي (رضوان الله عليهما)[٩]:

---

[٧] مسلم. أدب. ٦٥٢٣.

[٨] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/٨٧ رقم/٢٣٣٣.

[٩] بسند صحيح (شرحه).

ئەبو بەکرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هیچ تاوانێ وەك زوڵم و زۆرو پشت هەڵکردن لە خزم و کەسوکار شایانی ئەوە نییە کە خودای گەورە لە جیهاندا زۆر بە زوویی تۆڵە لە خاوەنەکەی بستێنێ، ئەمە سەرەڕای ئەو هەموو سزاو ئازارەیش کە لەو جیهان بۆی دانراوەو ئامادەکراوە بۆی! (د/ت – س/ص).

٤٧٣٥– وَمَرَّ هِشَامِ بْنِ حَكِيمٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) بِالشَّامِ عَلَى أُنَاسٍ وَقَدْ أُقِيمُوا فِي الشَّمْسِ وَصُبَّ عَلَى رُءُوسِهِمُ الزَّيْتُ فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قِيلَ: يُعَذَّبُونَ فِي الْخَرَاجِ. فَقَالَ هِشَامٍ: أَشهد لَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يُعَذِّبُ الَّذِينَ يُعَذِّبُونَ النَّاسَ فِي الدُّنْيَا. رواه مسلم[١٠]:

هیشامی کوڕی حەکیم (خودایان لێ رازی بێ) لە شام، لەلای چەن وەرزێڕێکەوە ڕەت دەبێ، دەڕوانێ ڕۆنی داخکراوە بەسەر سەریانداو لەبەر هەتاوی سوور ڕاگیر کراون! دەفەرموێ: ئەمە چییە ئەمانە بۆ وایان لێ دەکرێ؟ گوتیان: ئەوە لەسەر باج و سەرانە ئەم ئازارو ئەشکەنجەیە دەدرێن! هیشامیش فەرمووی: شایەتی دەدەم کە زۆر باش بە کوێی خۆم ژنەوتم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: خوا سزاو ئازاری ئەوانە دەدات کە لە جیهاندا سزاو ئازاری خەڵك دەدەن! (م).

٤٧٣٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دَخَلَتِ امْرَأَةٌ النَّارَ مِنْ جَرَّاءِ هِرَّةٍ لَهَا – أَوْ هِرّ – رَبَطَتْهَا فَلاَ هِيَ أَطْعَمَتْهَا وَلاَ هِيَ أَرْسَلَتْهَا تُرَمِّمُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ حَتَّى مَاتَتْ هَزْلاً. رواه الشيخان[١١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): ژنێ چووەتە ناو ئاگری دۆزەخەوە. بەهۆی پشیلەیەکی خۆیەوە، چونکە دەیبەستێتەوە هەتا لە برسانا دەمرێ، نەخۆی خواردنی دەداتێ و نە

---

[١٠] مسلم. أدب: ٦٦٠٠-٦٦٠٣.

[١١] بخاري. احاديث الأنبياء: ٣٤٨٢، ٣٣١٨. مسلم. حيوان: ٥٨١٩، مسلم. أدب: ٦٦٢٠.

بەرەڵڵاشی دەکا، تا بۆخۆی لە جڕو جانەوەری زەوی ملۆمووشێ بکا (ش-ڕەزای خودایان لێ بێ).

٤٧٣٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَشَارَ إِلَى أَخِيهِ بِحَدِيدَةٍ فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَلْعَنُهُ حَتَّى وَإِنْ كَانَ أَخَاهُ لأَبِيهِ وَأُمِّهِ. رواه مسلم والترمذي[١٢]:

دیسان ئەو فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی کە بۆ تۆقاندنو ترساندن بە پارچە ئاسنێ، یا بەهەر شتێکی تر، هەڕەشە لە برای ئایینی خۆی بکا، لەو ماوەیەدا خۆش خۆش فریشتەکان نەحلەتو نەفرینی لێ دەکەن، هەتا واز لەوکارە دەهێنێ، گریمان ئەو هەڕەشە لێکراوە برای باوكو دایکیشی بێ کە گومانی خراپی لێ ناکرێ هەروەهایە (م/ت).

٤٧٣٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلاَحِ ، فَإِنَّهُ لاَ يَدْرِى لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِى يَدِهِ ، فَيَقَعُ فِى حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ[١٣]:

دیسان لەوەوە، لەحەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): ئەی موسوڵمانینە! نە بەڕاستو نە بەدرۆ، کەستان رووی چەك مەکەنە برای ئایینی خۆتان، چونکە ڕێی تێ ددەچێ کەشەیتان هەڵەیەکی پێ بکاو، لەدەستی دەربچێو براکەی بپێکێو بەهۆی ئەوەوە رەهەنەی ناوئاگری دۆزەخ ببێ! (م-خ-).

٤٧٣٩- ـ (ب - ٣ ز - - ١٠٦ ل - ٢٨٥ ف - ٢)[١٤].

وەلێ لێرەدا ئاوایە: لە نەخۆشینی سەرەمەرگدا، عوبەیدوڵڵای کوڕی زیاد چوو بۆ لای مەعقیلی کوڕی یەسار (خودایان لێ رازی بێ) بۆ سەرخۆشی لێکردنیو هەواڵپرسینیو، بۆ مەسەلەیێ پرسیاری لێیکرد، مەعقیل

---

[١٢] مسلم. أدب. ٦٦٠٩.

[١٣] تجريد البخاري - مختصر صحيح البخاري بالكوردي، مجلد/٥ ل/٣٥٦ ط/١ رقم/٢٠٩٦ = ٧٠٧٢ فتح الباري.

[١٤] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل-١٠٦ رقم/٢٤٣٢.

فەرمووی: بە تەمای ژیانی خۆم نەماوم دەنا ئەم فەرموودەیەم بۆت نەدەگێڕایەوە، بۆ خۆم لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): هەر بەندەیێ خودا بیکا بەسەر گەورەی کۆمەڵێ و گزیو ناپاییان لێ بکا لەسەر ئەو حاڵە دەوام بکا تا دەمرێ ئەوە بێگومان کە خودا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکا، لە گێڕانەوەیەکی تردا: هەر میرێ ببێ بەسەرگەورەی کاروباری موسوڵمانان، بەڵام بەباشی تێنەکۆشێ بۆیان و بەدڵسۆزی ئامۆژگاری خێریان نەکاو لەم لایەنەوە دریغییان لەگەڵدا بکا، بێگومان کە ئەو ئەمیرە لە قیامەتدا لەوان جوێ دەکرێتەوە، کە ئەوان دەچنە بەهەشت ئەویان لەگەڵ دا نابێ عەبدوڵڵا گوتی: ئەی بۆ هەتا ئێستا ئەم فەرموودەیەت بۆم نەگێڕاوەتەوە، فەرمووی: بۆیە بۆم نەگێڕایتەوە...

٤٧٤٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ خَبَّبَ زَوْجَةَ امْرِئٍ أَوْ مَمْلُوكَهُ فَلَيْسَ مِنَّا. رواه أبو داود والنسائي[١٥]:

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): ئەو کەسەی ژنی کەسێکی تر، یا بەندەی کەسێکی تر هەڵبگێڕێتەوە لێی، ئەوە ئەو کەسە لەسەر ئایینی ئێمە نییە، کە دژی کاری وا ناڕەواو نا پەسەندە. (د/ن – س/ح).

٤٧٤١- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَكُونُوا إِمَّعَةً تَقُولُونَ إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا وَإِنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنَا وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا وَإِنْ أَسَاءُوا فَلاَ تَظْلِمُوا[١٦]:

حوزەیفە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: مەبن بە کلکی ئەمو ئەوو بە چاکو بەخراپ لاسایی خەڵکی تر بکەنەوەو هەمیشە بیکەن بە دروشمو بڵێن: خەڵکی چی بکەن منیش ئەوە

---

[١٥] بسند حسن (شرحه).

[١٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

دەکەمو چاو لەوان دەکەم، ئیتر چاك بێ یا خراپ، بەڵکوو خۆتان سەر بەخۆبنو بڕواتان بەخۆتان هەبێو سووربن لەسەر ئەم بڕیارە. ئەگەر خەڵك چاکەیان کرد ئێوەیش لەوان جێ مەمێننو وەکوو ئەوان چاکە بکەن، بەڵام ئەگەر خەڵك خراپەیان کرد ئێوە مەیکەنو لە کردنی خراپەدا چاو لەکەس مەکەن (ت- س/ح).

٤٧٤٢- عَنْ أَبِي صِرْمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ ضَارَّ أَضَرَّ اللَّهُ بِهِ وَمَنْ شَاقَّ شَاقَّ اللَّهُ عَلَيْهِ[١٧]:

ئەبو صیرمە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی زیانبەخشە خودا زیانی لێ بدا، ئەوەی زەبرو زەنگ دەنوێنێ خودا پێی بنوێنێ! (ت- س/ح).

٤٧٤٣- عَنْ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَلْعُونٌ مَنْ ضَارَّ مُؤْمِنًا أَوْ مَكَرَ بِهِ. روى الترمذي هذه الثلاثة[١٨]:

ئەبو بەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): نەحلەت لێکراوە ئەوەی زیان بگەیەنێ بە موسوڵمانێ یا فێڵو تەڵەکە بازیی لێ بکا (ت- سەنەد غەریب).

٤٧٤٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُبْشِيٍّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَطَعَ سِدْرَةً صَوَّبَ اللَّهُ رَأْسَهُ فِي النَّارِ. رواه أبو داود والنسائي[١٩]:

عەبدوڵلای کوڕی حوبشی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەوەی دارمۆردێ دەبڕێ خودا سەرەنگرێ بکا لەناو ئاگردا (ئەبو داوود بە سەنەدێکی موضطەریب ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، وەلێ نەسائی بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتەوە).

---

[١٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٨] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١٩] رواه النسائي بسند صحيح (شرحه).

## ١١) ستەمکار ترین کەس ئەو کەسەیە کە خۆی زۆرو ستەم لەخۆی بکا
## أظلم الناس من يظلم نفسه

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا – سورة النساء – ٢٩/٤}. ← (ب– ١ز– ٤٠ل– ١٧٥).

٤٧٤٥– عَنِ الْحَسَنِ (رضي الله عنه) حَدَّثَنَا جُنْدُبُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ ، وَمَا نَسِينَا مُنْذُ حَدَّثَنَا ، وَمَا نَخْشَى أَنْ يَكُونَ جُنْدُبٌ كَذَبَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ ، فَجَزِعَ فَأَخَذَ سِكِّينًا فَحَزَّ بِهَا يَدَهُ ، فَمَا رَقَأَ الدَّمُ حَتَّى مَاتَ[1]:

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ ، حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ. رواه البخاري في آخر بدء الخلق: نسأل الله الستر والسلامة آمين.

حەسەن (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەم مزگەوتەی بەصرەدا جوندوبی کوڕی عەبدوڵلا بۆمانی گێڕایەوە، لەوساوە نەخۆم لەبیرم چووەتەوەو نەترسی ئەوەشم هەیە کە خوانە خواستە جوندوبی هاوڕێی حەزرەت درۆ بەدەم پێغەمبەرەوە بکا، جوندوب فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەنەتەوەکانی پێش ئێوە کابرایێ دەبێ، زامار دەبێ، جا ئارامی لێ هەڵ دەگیرێ و چەقۆیێ دێنێ و دەستی خۆیی پێ لە لە دەکا، ئیتر خوێنەکەی ناگیرسێتەوە تاکوو دەمرێ، خودای گەورەیش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەم دەست پێشکەری لێ کردم پەلەی لە مردنی خۆی کردو ئارامی نەگرت، وا منیش لەسەر ئەوە بەهەشتم لەو حەرام کرد! (ب– ڕەحمەت لە گۆڕی نازداری).

## ١٢) باسی دوو زمانی : (ومنه النميمة)

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {هَمَّازٍ مَّشَّاء بِنَمِيمٍ مَنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ – سورة القلم – ٦٨/١٠–١٢}.

---

[1] تجريد/٢ ل/٧١ رقم/٦٤٨ = ١٣٦٤، ٣٤٦٣ فتح.

واتە: هەرگیز پەیڕەوی‌و فەرمانبەری زۆر سوێند خۆری درۆزنی بێ نرخی ڕیسوای وا مەکە کە زۆر تانە لە خەڵك دەداو بەناو خەڵکدا وەك سەگی پێ سووتاو هەردەگەڕێ بۆ دووزمانی‌و ئاژاوە نانەوە، هەم خۆی خێرنەکەرەو هەم ڕێگەی خێری خێرەومەندان نادات، شەڕ فرۆش‌و لەڕێگە دەرچوو و زۆر زۆر تاوانبارە.

٤٧٤٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا حَدَّثَ الرَّجُلُ بِالْحَدِيثِ ثُمَّ الْتَفَتَ فَهِيَ أَمَانَةٌ. رواه أبو داود والترمذي[١]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ لەکاتی قسەکردندا لای کردەوە بەم لاولادا هەتا بزانێ کەسی تر گوێی لێیانە یانا، ئەوە ئەو قسەیە ئەمانەت‌و سپاردەیەو دروست نییە گوێگر بەبێ ڕەزای خاوەنەکەی بۆ کەسی تری بگێڕێتەوە (د/ت - س/ح).

٤٧٤٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمَجَالِسُ بِالأَمَانَةِ إِلاَّ ثَلاَثَةَ مَجَالِسَ سَفْكُ دَمٍ حَرَامٍ أَوْ فَرْجٌ حَرَامٌ أَوِ اقْتِطَاعُ مَالٍ بِغَيْرِ حَقٍّ. رواه أبو داود[٢]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: گشت قسەو باسێکی ناو مەجلیس‌و ناو کۆڕی دانیشتوان سپاردەو ئەمانەتەو گێڕانەوەیان لەسەر شێوەی تێچاندن‌و دوو زمانی دروست نییە، تەنیا ئەم سێ جۆرە قسەیە نەبێ:

**یەکەم**: باسکردنی پیلان گێڕانی خوێنڕشتنی ناڕەوا.

**دووەم**: گێڕانەوەی باسی داوێن پیسی‌و دەستدرێژیکردن لە ناموسی خەڵك.

**سێیەم**: باسی زەوت کردنی ماڵی خەڵك بەناڕەوا (د- س/ح).

---

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٢] رواه أبوداود بسند حسن (شرحه).

٤٧٤٨- عَنْ هَمَّامٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ حُذَيْفَةَ فَقِيلَ لَهُ إِنَّ رَجُلاً يَرْفَعُ الْحَدِيثَ إِلَى عُثْمَانَ(رَضِي اللهُ عَنهُ) فَقَالَ حُذَيْفَةُ (رَضِي اللهُ عَنهُ): سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَتَّاتٌ[٣].

هەممام (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لەلای حوزەیفە بووین پێیان گوت: ئەو پیاوە قسە دەباتەوە بۆ عوسمان (خودای لێ ڕازی بێ) حەزەیفەیش (خودای لێ ڕازی بێ) بە کابرای گوت: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: دوو زمان دوو پێی ناچێتە بەهەشتەوە (ش/د/ت).

٤٧٤٩- ← (ب - ٣ ز - ١٠٨ ل- ٢٩٣ ف - ٣) [٤].

٤٧٥٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِيَّاكُمْ وَسُوءَ ذَاتِ الْبَيْنِ فَإِنَّهَا الْحَالِقَةُ. رواه الترميذي[٥]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): نەکەن نێوانی خەڵکی تێك بدەن، چونکە لە ڕاستیدا کاری وا پاکۆی دین دەداو دین بەرباد دەکا! (ت- س/ص).

٤٧٥١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: إِنَّ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ مَا الْعَضْهُ هِيَ النَّمِيمَةُ الْقَالَةُ بَيْنَ النَّاسِ. واه مسلم[٦]:

عەبدوڵڵای (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: موحەممەد (دروودو سڵاوی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: ئاگاداربن با پێتان بڵێم کە هەلاتو بوختیانی زۆر گەورەی ناڕەوای وا کە بۆنی خوێنی لێ دێ کامەیە؟ بڕێتییە لە دوو زمانیو زۆر بڵێی کەدەبێ بە هەوێنی تێکدانی نێوانی مەردومو سەر دەکێشێ بۆ خوێنڕێژی؟ (م).

---

[٣] تجريد/٥ ل/٢١٤ رقم/١٩٣٩ = ٦٠٥٦، ٥٧٠٩. مسلم. إيمان: ٢٨٦، ٢٨٧، ٢٨٨. أبوداود. ادب: ٤٨٧١. ترمذي. بر وصلة: ٢٠٢٦. تحفة الأشراف: ٣٣٨٦.

[٤] تقدم في مجلد ثالث تسلسل/١٠٨ رقم/٢٤٥١ ل/٢٩٣ ط/١.

[٥] مسلم. ادب: ٦٥٧٩.

[٦] مسلم. أدب. ٦٥٧٩.

٤٧٥٢- عَنْ عَمَّارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ كَانَ لَهُ وَجْهَانِ فِي الدُّنْيَا كَانَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِسَانَانِ مِنْ نَارٍ. رواه أبو داود[٧]:

عەمار (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە لەم جیهانەدا دوو ڕووبێ لەو جیهان دووزمانی ئاگرینی دەبێ! (د- سند صالح).

## ١٣) غەیبەت و لەپاش ملە باسی خەڵك كردن بەخراپە : (ومنه الغيبة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة الحجرات - ١٢/٤٩}.

غەیبەتی یەکتری مەکەن و لەپاش ملە بە خراپی باسی یەکتری مەکەن، کێ پێی خۆشە کە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بجوێ و بیخوا، دیارە کە کەس ئەوەی پێ خۆش نییە، دەبزانن کە غەیبەت و قسەی پاش ملە بەخراپی ڕێك وەك ئەوە وایە کە گۆشتی برای مردووی خۆتان بخۆن، کەواتە: لە خودا بترسن و فەرمانی مەشکێنن، دڵنیابن هەر کاتێ ئێوە بەلای خوادا با بدەنەوە و لە گوناهـو تاوانی خۆتان بەراستی نەك هەر بەدەم، پەشیمان ببنەوە خودا تەوبە و پەشیمانیتان گیرا دەکا، چونکە خودا خودایەکی میهرەبانە...

٤٧٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ. قَالُوا: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ، قِيلَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدِ اغْتَبْتَهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[١]:

---

[٧] بسند صالح (شرحه).

[١] مسلم. أدب: ٦٥٣٦.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەری دەزانن غەیبەتو پاشملەیی چییە؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن! فەرمووی: ئەوەیە کە باسی برای دینیت بە جۆرێکی وا بکەی کە خۆی پێی ناخۆش بێ! عەرزی کرا: ئەی ئەگەر ئەو قسەیەی دەیکەم لە براکەما هەبوو ئەوە چۆنە ئەویش هەر غەیبەتو پاشملەییە؟ فەرمووی: غەیبەت ئەوەیە کە ئەو نەنگەی تۆ دەیڵێی تیادا هەبێ، دەنا ئەگەر نەیبێ ئەوە ڕێك بوختانی پێ دەکەی. (م/ت– هەزار ڕەحمەتیان لێ بێ).

٤٧٥٤– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَسْبُكَ مِنْ صَفِيَّةَ كَذَا وَكَذَا، تَعْنِي قَصِيرَةً. فَقَالَ: لَقَدْ قُلْتِ كَلِمَةً لَوْ مُزِجَتْ بِمَاءِ الْبَحْرِ لَمَزَجَتْهُ. قَالَتْ: وَحَكَيْتُ لَهُ إِنسَانًا فَقَالَ: مَا أُحِبُّ أَنِّي حَكَيْتُ إِنسَانًا وَأَنَّ لِي كَذَا وَكَذَا[٢]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە صەفییە ئەوەت بەسە کە ئەوەی وایە، عائیشە مەبەستی ئەوەبوو کە صەفییە (خودای لێ ڕازی بێ) کورتە باڵابووە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بێ گومان ئەم قسە غەیبەتەی تۆ گوتت ئەوەندە تاوانێکی گەورەیە ئەگەر ئامێتەی هەموو ئاوی دەریاکان بکرێ هەمووی لیخنو بۆگەن دەکا؟ عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێکیش لاسکایی مرۆڤێکم کردەوە بۆی، فەرمووی: ئەگەر بە ماڵو سامانێکی زۆریش بووە حەز ناکەم لاسکایی کەس بکەمەوە! (د/ت – س/ص).

٤٧٥٥– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُبَلِّغْنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِي عَنْ أَحَدٍ شَيْئًا فَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَخْرُجَ إِلَيْكُمْ وَأَنَا سَلِيمُ الصَّدْرِ. رواهما أبو داود والترمذي[٣]:

---

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٣] سكت عن درجته الشارح.

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرمویٚ** (درودی خودای لەسەر بێ):
**کەس لە هاوڕێیانی خۆم قسەی هاوڕێیەکی تری خۆمم بۆ نەهێنێ، چونکە من هەمیشە حەزدەکەم کە بە دڵێکی بێ گەردو سینەیەکی سافەوە بێم بۆ ناوتان (د/ت).**

٤٧٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ أَكْبَرِ الْكَبَائِرِ اسْتِطَالَةَ الْمَرْءِ فِي عِرْضِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ بِغَيْرِ حَقٍّ وَمِنَ الْكَبَائِرِ السَّبَّتَانِ بِالسَّبَّةِ[٤]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ)
**فەرمووی: دەم تێوەژەندن لە ناموسی پیاوی موسوڵمان بە ناڕەوا یەکێکە لە گوناهە هەرە گەورەکان! دوو جنێویش لە باتی یەك جنێو ئەویش یەکێکە لە گوناهە هەرە گەورەکان (د- س/ صالح).**

٤٧٥٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا عُرِجَ بِي مَرَرْتُ بِقَوْمٍ لَهُمْ أَظْفَارٌ مِنْ نُحَاسٍ يَخْمِشُونَ وُجُوهَهُمْ وَصُدُورَهُمْ فَقُلْتُ مَنْ هَؤُلَاءِ يَا جِبْرِيلُ قَالَ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ لُحُومَ النَّاسِ وَيَقَعُونَ فِي أَعْرَاضِهِمْ[٥]:

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ)
**فەرمووی: کە چووم بۆ میعراج تاقمێکم دی ناخونی مسینیان هەبوو، خۆش خۆش ڕوومەتو سینگی خۆیانیان پێ دڕنی! گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەمانە کێن؟ فەرمووی: ئەمانە ئەوانەن کە غەیبەت دەکەنو گۆشتی خەڵك بەزیندوویی دەجوونو دەم دەژەندنە ناموسیانو بە غەیبەتو بوختیان ئێش بە دڵیان دەگەیەنن، وەك بە قەپ گۆشت لە لەشیان بپچڕن ئاوا! (د- س/ص).**

٤٧٥٨- عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَكَلَ بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ أَكْلَةً فَإِنَّ اللَّهَ يُطْعِمُهُ مِثْلَهَا مِنْ جَهَنَّمَ وَمَنْ كُسِيَ ثَوْبًا بِرَجُلٍ مُسْلِمٍ فَإِنَّ اللَّهَ

---

[٤] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).
[٥] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

يَكْسُوهُ مِثْلَهُ مِنْ جَهَنَّمَ وَمَنْ قَامَ بِرَجُلٍ مَقَامَ سُمْعَةٍ وَرِيَاءٍ فَإِنَّ اللَّهَ يَقُومُ بِهِ مَقَامَ سُمْعَةٍ وَرِيَاءٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. روى هذه الثلاثة أبو داود[٦]:

موستەورید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەس بەهۆی تێچاندنەوە بۆ پیاوێکی موسوڵمان پارووێ بخوا، خودا لە دۆزەخدا پاروویەکی وەك ئەوەی لە ئاگر دەرخوارد دەداتەوە، هەر کەسەیش بەهۆی تێچاندنەوە بۆ پیاوێکی موسوڵمان جلێ لەبەر بکا خودا لە دۆزەخدا جلێکی وەك ئەوەی لە ئاگر لەبەر دەکا، هەر کەسەیش بۆ ناوبانگ و شۆرەت و ڕووپامایی خۆی بکا بە پیاوی باش و خۆی لە پیاوێ بباتە پێشەوە لەبەر تەماعی دنیایی، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا ناوبانگی ئەو ڕیابازە دەزڕێنێ و ڕیسواو تەریقی دەکاتەوە! (د- س/ صالح).

## ١٤) غەیبەتی بەدکار (فاسق) دروستە : (لا غيبة في فاسق)

٤٧٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتِ اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ائْذَنُوا لَهُ بِئْسَ ، أَخُو الْعَشِيرَةِ أَوِ ابْنُ الْعَشِيرَةِ. فَلَمَّا دَخَلَ أَلاَنَ لَهُ الْكَلاَمَ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قُلْتَ الَّذِي قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ الْكَلاَمَ قَالَ: أَيْ عَائِشَةُ ، إِنَّ شَرَّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ - أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ - اتِّقَاءَ فُحْشِهِ. رواه الأربعة[١]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ داوای ڕێگادانی کرد کە بێ بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ڕێگەی بدەن بابێ، کابرایەکی زۆر بەدە! یا فەرمووی: کابرایەکی زۆر خراپە، بەڵام کاتێ کابرا هاتە خزمەتی پێغەمبەر ڕووی خۆش بوو لە گەڵیا منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ لە پێشدا قسەیەکی ئاوات فەرموو، کەچی لە پاشدا قسەت نەرم بوو لەگەڵیدا! فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): ئەی عائیشە!

---

[٦] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] مسلم. أدب: ٦٥٣٩، بخاري. أدب: ٦٠٥٤، ٣١٣٢. أبوداود. أدب: ٤٧٩١. ترمذي. بر وصلة: ١٩٩٦. تحفة/١٦٧٥٤.

بێ گومان بەدترین کەس ئەو کەسەیە کە خەڵك لەترسی بەدگۆیی و بەدزمانی و زمانی پیسی، خۆیانی لێ لادەدەن، یا فەرمووی: خۆیانی لێ دەپارێزن (ش/د/ت- خودایان لێ رازی بێت).

٤٧٦٠- وَعَنْهَا قَالَتْ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا أَظُنُّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا يَعْرِفَانِ مِنْ دِينِنَا شَيْئًا. رواه البخاري[٢]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گومان نابەم کە فیسارەکەس و ئەو فیسارە کەس، هیچ لەم ئایینەی ئێمە بزانن! (ب- رەحمەت لە گۆڕی نازداری).

٤٧٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: كُلُّ أُمَّتِي مُعَافًى إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ ، وَإِنَّ مِنَ الْمُجَاهَرَةِ أَنْ يَعْمَلَ الرَّجُلُ بِاللَّيْلِ عَمَلاً ، ثُمَّ يُصْبِحَ وَقَدْ سَتَرَهُ اللهُ ، فَيَقُولَ يَا فُلاَنُ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا ، وَقَدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللهِ عَنْهُ. رواه الشيخان[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: گەلی من سەرجەم بەر عەفوو لێبووردنی خودا دەکەون، مەگەر ئەوانەی کەخۆ کەشف کەرن و لای ئەم و ئەو بەبێ بەهانەیەکی رەوا سڕی خۆیان هەڵ دەماڵن و راستی لە خۆیان دەڵێن، وەك ئەوە کابرایێ بەشەو کارێکی ناشیرین دەکا، لەگەڵ ئەوەشا خودا بۆی دەپۆشێ، کەچی بۆ بەیانی دەچێ تاوانی خۆی ئاشکرا دەکا و لای ئەم و ئەو دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەی فیسار! من دوێ شەو ئیشێکی وا وام کرد، تەماشاکەن ئەو کابرایەخودا بەشەو پەردەی بۆ تاوانەکەی کردووە و سڕی پۆشیوە، کەچی خۆی دەچێ بە رۆژ پەردەی خودا لەسەر خۆی هەڵ دەداتەوە! (ش- رەزای خودایان لێ بێ).

---

[٢] تجريد البخاري بالكوردي/٥ ل/٢١٦ رقم/١٩٤٣ = ٦٠٦٧، ٦٠٦٨.

[٣] تجريد = مختصر صحيح البخاري. مجلد خامس ص ٢١٦ رقم/ ١٩٤٤ = ٦٠٦٩. مسلم. زهد/٧٤١٠. تحفة الأشراف/ ١٢٩١١.

٤٧٦٢- وَجَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَأَنَاخَ رَاحِلَتَهُ ثُمَّ عَقَلَهَا ثُمَّ دَخَلَ الْمَسْجِدَ فَصَلَّى خَلْفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ أَتَى رَاحِلَتَهُ فَأَطْلَقَهَا ثُمَّ رَكِبَ ثُمَّ نَادَى اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا وَلاَ تُشْرِكْ فِي رَحْمَتِنَا أَحَدًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَقُولُونَ هُوَ أَضَلُّ أَمْ بَعِيرُهُ أَلَمْ تَسْمَعُوا إِلَى مَا قَالَ؟ قَالُوا: بَلَى. رواه الخمسة[٤]:

عاربێکی دەشتەکی هات، وشترەکەیی پیخ داو ئەشکێلی کردو ئەوجا ڕۆیشت لە مزگەوت لە پشت پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی بە جەماعەت کرد، ئینجا چووە بۆ لای وشترەکەی و ئەژنۆی کردەوەو سواری پشتی بوو، لە دوایدا ئەم بانگەوازەی هەڵداو گوتی: خودایە! ڕەحمەت بڕێژە بەسەر منو موحەممەددا، کەسێ تر مەکە بە هاوبەشمان لەو ڕەحمەتەدا! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەرێ ئێوە چی دەڵێن، ئەم کابرایە خۆی پەتەریترە یا وڵاخەکەی! خۆ گوێتان لێیەتی دەڵێ چی؟ گوتیان: ئا ئێمەیش باش باش گوێمان لە گوتەکەیەتی (ش/د/ت/ن- ڕەمزای خودایان لێ بێ) لە گێڕانەوەیەکی شەرحەکەدا: حەزرەت پێی فەرموو: ئەی برالەی عەرەب! ڕەحمەتی خودا گەڵێ گەورەیە تۆ بۆ وا تەسك و بچووکی دەکەیتەوە!.

ئەم گێڕانەوە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەم عارەبە بەدکارو فاسق نەبووە، بەڵام نەزان بوە، وە لەبەرئەوە غەیبەتی دروستە، نەك لەبەر فیسق و نیفاق، مەبەست لەم جۆرە غەیبەتە عیبرەتە نەك غەیبەتی ڕووت ئەم فەرموودەیەم بۆ دایکی سەلاح خوێندەوە دەڵێ: خۆزگەم بەم پیاوە بە چاوی خۆی حەزرەتی دیوەو قسەی لەگەڵ کردووە ئەم کابرایە، بەس نییە بەهەشتییە. (وەرگێڕ)

## ١٥) نامووس کردن بە خێر خێرە : (التصدق بالعرض حسن)

٤٧٦٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَجْلاَنَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيَعْجَزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكُونَ مِثْلَ أَبِي ضَمْضَمٍ؟ قالوا: وَمَنْ أَبُو ضَمْضَمٍ؟ قَالَ: رَجُلٌ

[٤] تجريد = مختصر صحيح البخاري. مجلد خامس ص٢٠٦ رقم/١٩٢٤ = ٦٠١٠.

فِيمَنْ كَانَ مِنْ قَبْلِكُمْ. كَانَ إِذَا أَصْبَحَ قَالَ اللَّهُمَّ إِنِّى قَدْ جَعَلْتُ عِرْضِي لِمَنْ شتني. رواه أبو داود[1]:

ئەوڕەحمانی کوڕی عەجلان (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (درוودی خودای لەسەر بیٚ) فەرمووی: ئەریٚ دەتوانن کە ئیٚوەیش وەکوو ئەبو ضەم ضەم بکەن، عەرزیان کرد: ئەبو ضەم ضەم کیٚیە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بیٚ): پیاویٚ بوو لە نەوەکانی پیٚش ئیٚوە، هەموو سەر لەبەیانیانیٚ دەیگوت: خودایە! بەشایەتی تۆ هەرکەسیٚ بە ناڕەوا جنیٚو بە نامووسم دەدا گەردنی ئازادبیٚ! (د- س/صالح) لەشەرحەکەدا دەفەرمویٚ (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) ئەوەی سەر لەبەیانی ئاوا بلیٚ، کار بەم ئایەتە دەکا کە دەفەرمویٚ:

{وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ - سورة الشورى - ٤٠/٤٢}. (ب- ٣ز- ١٠٠ل- ٢٦٠= چاپی یەکەم).

## ١٦) باسی دلٚپیسیو بەدگومانیو کینە کیٚشانو حەسوودیو بەخیلی بەیەکتری بردن : (ومنه ظن السوء والحقد والحسد)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيرًا مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - ١٢/٤٩}.

واتە: ئەی موسوڵمانەکان! ئەی پەیڕەوانی قورئان! قورئان داواتان لیٚ دەکا کە خۆتان لەگەلیٚ گومان بپاریٚزن، هەر لە خۆتانەوە بەبیٚ هۆیەکی ئاشکرا گومانی خراپ بەخەڵك مەبەن، هەتا بۆتان دەکریٚ شت بەلای باشدا پاساوبکەن چونکە هەندیٚ گومان سەردەکیٚشیٚ بۆ گوناح، هەروا سیخوڕیو جاسووسی مەکەنو شویٚن عەیبو عاری خەڵکی مەکەونو بەناهەق پەردەی خودا لەسەر نەنگی بەندەی خودا هەڵ مەدەنەوە، وەلیٚ لەهەمان کاتدا ساویلکەیش مەبنو لە بەدکاریش زۆر ئەمین مەبن.

---

[1] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

٤٧٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ ، فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ ، وَلاَ تَحَسَّسُوا ، وَلاَ تَجَسَّسُوا ، وَلاَ تَنَاجَشُوا ، وَلاَ تَحَاسَدُوا ، وَلاَ تَبَاغَضُوا ، وَلاَ تَدَابَرُوا ، وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. رواه الأربعة[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دووربن لە گومان، چونکە گومانی خراپ دەق وەك قسەی درۆ وایەو وەکوو درۆ تاوانێکی گەورەیە، هەستیش هەڵ مەگرن و بەشوێن عەیب و نەنگی خەڵکدا مەگەڕێن و سیخوڕی و جاسووسی مەکەن و بەربەرەکانێ و قینەبەری مەکەن و بەخیلی بە یەکتری مەبەن و کینەو دەغەز لەیەکتری مەکێشن و پشت مەکەنە یەکتری و لە یەکتری لووتەلا مەبن! ئەی بەندەگانی خودا! وەك برا بەندەی خودابن و پشتی یەکتری بگرن و پشتی یەکتری بەرمەدەن! (ش/د/ت- خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٧٦٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالْحَسَدَ فَإِنَّ الْحَسَدَ يَأْكُلُ الْحَسَنَاتِ كَمَا تَأْكُلُ النَّارُ الْحَطَبَ. أَوْ قَالَ: الْعُشْبَ. رواه ابو داود وابن ماجة[٢]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دووربن لە حەسوودی و بەخیلی، چونکە حەسوودی و بەخیلی و کردەوەی چاکە وەکوو ئاگرو چیلکە وان، یا فەرمووی: وەك ئاگرو پووش وان، چۆن ئاگر خێرا چیلکەو پووش و پەڵاش لووش دەدا، بەخیلیش ئاوا خێرو چاکەی مرۆڤ دەماشێتەوە! (د/ماجە).

٤٧٦٦- عَنْ الزُّبَيْرَ بْنَ الْعَوَّامِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دَبَّ إِلَيْكُمْ دَاءُ الأُمَمِ قَبْلَكُمُ الْحَسَدُ وَالْبَغْضَاءُ هِيَ الْحَالِقَةُ لاَ أَقُولُ تَحْلِقُ الشَّعْرَ وَلَكِنْ تَحْلِقُ الدِّينَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَفَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِمَا يُثَبِّتُ ذَاكُمْ لَكُمْ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ. رواه الترمذي في الرقاق[٣]:

---

[١] تجريد - مختصر صحيح البخاري/٥ رقم/١٩٤٢ = ٦٠٦٤، ٥١٤٣، ٦٠٦٦، ٦٧٢٤.

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[٣] سكت عن درجته الشارح.

زوبەیری کوڕی عەوام (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەردی میللەتەکانی پێشتان واکشان کشان بەخشەخش هات بۆ ناوتان! واتە: نەخۆشینی بەخیلی و ڕق و کینەو دەغەن، کە ئەم دەردانە چەقۆی سەرتاشن و داسی لا لاموو کەرن، وەلێ مەبەستم ئەوە نییە کە موو و قژەسەر دەتاشن، بەڵام دین لە کۆتەرە دەدەن و ئایین بەرباد دەکەن!

بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە دوو پێتان ناچێتە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن و باوەڕ بەخوداو پێغەمبەری خودا نەکەن، ئیمان و باوەڕی ساخیش ناهێنن و بیرو باوەڕتان بەتەواوی دانامەزرێ هەتا لەناو خۆتاندا یەکتریتان خۆش نەوێ، ئەدی با پێشتان بڵێم کە بەچی ئەمە بۆ خۆتان مسۆگەر دەکەن، بەوە کە سڵاوو ڕۆژباشی و چاکو چۆنی لەناو خۆتانا پەخش بکەنەوەو هەمیشە ئاشت و تەبابن و لە یەکتری ئەمین بن (ت– ڕەزای خودای لێ بێ).

### ١٧) باسی شوێنکەوتنی عەیبەی مەردوم : (ومنه تتبع العورات)

٤٧٦٧– عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا مَعْشَرَ مَنْ آمَنَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يَدْخُلِ الإِيمَانُ قَلْبَهُ لاَ تَغْتَابُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنِ اتَّبَعَ عَوْرَاتِهِمْ يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ وَمَنْ يَتَّبِعِ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ فِي بَيْتِهِ. رواه أبو داود والترمذي. لفظه: صَعِدَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمِنْبَرَ فَنَادَى بِصَوْتٍ رَفِيعٍ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ مَنْ قَدْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ لاَ تُؤْذُوا الْمُسْلِمِينَ وَلاَ تُعَيِّرُوهُمْ وَلاَ تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ[1]:

ئەبو برزەی ئەسلەمی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی بە زمان موسوڵمان و بەدڵ نا موسوڵمان! غەیبەتی موسوڵمانان مەکەن و شوێن عەیبەیان مەکەون، چونکە ئەوەی شوێن

[1] بسند حسن (شرحه).

عەیبەیان بکەوێ خوداش شوێن عەیبەی ئەو دەکەوێ، ئەو کەسەشی خودا شوێن عەیبەی بکەوێ لەناو کونی ماڵی خۆشیابێ هەر سووکو ڕیسوای دەکاو عەیبەی هەڵ دەماڵێ! (د/ت- س/ح) گفتەی (ت) ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرکەوتە سەر دوانگەو بە دەنگی بەرز فەرمووی: ئەی کۆمەڵەی بە دەم موسوڵمانو بەدڵ ناموسوڵمان! ئازاری موسوڵمانان مەدەنو نەنگو شوورەیی یان لێ مەگرنو تانووتیان لێ مەدەنو شوێن عەیبەیان مەکەونو ناموسیان مەبەن، چونکە ئەوەی شوێن عەیبەی برای موسوڵمانی خۆی بکەوێو بڵاوی بکاتەوەو ناموسی ببا خوداش شوێن عەیبەی ئەو دەکەوێو عەیبەی بڵاو دەکاتەوەو لەناو کونی ژوورەوەیشی دابێ ناموسی دەبا.

٤٧٦٨- وَنَظَرَ ابْنُ عُمَرَ يَوْمًا إِلَى الْكَعْبَةِ فَقَالَ: مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ وَالْمُؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَ اللَّهِ مِنْكِ[٢]:

ڕۆژێ ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) سەرنجی خانووی کابەی داو فەرمووی: ئەی کاعبە! بە ڕاستی تۆ زۆر گەورەیتو زۆر بەڕێزو قەدریت، هەم لەلای خوداو هەم لەلای بەندەگانی خودا، بەڵام قەدرو ڕێزی موسوڵمان لەلای خودا لە قەدرو ڕێزی تۆیش مەزنترە. واتە: کەسێ بێ ڕێزیی بە موسوڵمانێ بکا گوناهی لەوە زیاترە کە بێ ڕێزیی بە کابەی پیرۆز بکا. (د- س/صالح).

٤٧٦٩- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّكَ إِنِ اتَّبَعْتَ عَوْرَاتِ النَّاسِ أَفْسَدْتَهُمْ أَوْ كِدْتَ أَنْ تُفْسِدَهُمْ. فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: كَلِمَةٌ سَمِعَهَا مُعَاوِيَةُ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَفَعَهُ اللَّهُ تَعَالَى بِهَا[٣]:

موعاوییە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دیارە تۆ ئەگەر شوێن نەنگو شوورەیی خەڵك بکەوی دەبێ بە هۆی خراپ بوونیان، یا فەرمووی: نزیکە ببێ بەهۆی خراپ بوونیان (چونکە

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] بسند صالح (شرحه).

خاوەن نەنگو عەیب کەزانی هەموو کەس بە عەیبەکەی دەزانیو نامووسی چووەو ناوی بە بەدیو خراپی زڕاوە، ئیتر دەربەست نایەتو کۆ لەعەیبەو خراپە ناکاتەوەو بەرەبەرە دەبی بەسەر مەشقێکی بەدو خەڵکی تریش چاوی لێ دەکەن، سەرەنجام کۆمەڵ گشتی سەر دەکاتە خراپە) ئەبو دەرداء (خودای لێ رازی بێ) دەیگوت: موعاوییە (خودای لێ رازی بێ) لەم وشە پیرۆزەیە، کە بە گوێی خۆی لە زاری حەزرەتی بیستبوو، لە سایەی خوداوە سوودێکی باشی لێ وەرگرتبوو (د- س/صالح).

٤٧٧٠- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الأَمِيرَ إِذَا ابْتَغَى الرِّيبَةَ فِي النَّاسِ أَفْسَدَهُمْ[٤].

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): فەرمانڕەوا (ئەمیر= کاربەدەستی میری) ئەگەر دڵ لە خەڵك پیس بکاو لێیان بەشك بێ ئەوە بە دەستی خۆی خراپیان دەکاو تۆوی دوو دڵیو بەد گومانی دەنێژێ بەناویاندا (د- س/ صالح).

٤٧٧١- وَقِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): هَذَا فُلاَنٌ تَقْطُرُ لِحْيَتُهُ خَمْرًا فَقَالَ: إِنَّا قَدْ نُهِينَا عَنِ التَّجَسُّسِ وَلَكِنْ إِنْ يَظْهَرْ لَنَا شَيْءٌ نَأْخُذْ بِهِ. وى هذه الثلاثة أبو داود[٥].

گوتیان بە عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ): قوربان! ئەوە ئەو کابرایەیە چۆڕاوگەی ئارەق لە ریشی دەتکێ؟ وادیارە ئارەقێکی زۆری خواردبێتەوە عەبدوڵڵا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئێمەی یاساخ کردووە کە کوڵ هەڵبگرینو هەست هەڵخەینو جاسووسی بەسەر خەڵکەوە بکەین، لەم بارەیەوە کەمێ خۆتان بێ ئاگاکەنو لە حاڵی وادا تەغافولو خۆکێل کردن باشترە لە گوێ قوتکردنەوەو گوێ قولاخ بوون، بەڵام ئەگەر شتێ بە بەڵگەو شایەت روون بۆوە بۆمان ئەو کاتە ئەوەی بەپێی شەریعەت پێویست بێ دەیکەین! (د- س/صالح).

---

[٤] بسند صالح (شرحه).

[٥] بسند صالح (شرحه).

**١٨) باسی فیزو دەعیەو لەخۆبایی بوون : (ومنه الكبر والاختيال)**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة لقمان -١٨/٣١}.

واتە: هەرگیز لەبەر فیزو دەمار رووی خۆت لە خەڵك هەڵ مەچەرخێنەو بەپێی پێویست لەگەل خەڵکا رووت خۆش بێ و قسەت شیرین بێ و رەفتارت جوان بێ، قەت نەکەی بەکەش و فش و بە لەنجەو لارەوە بەسەر زەویدا بڕۆیت و لەخۆت بایی ببی، چونکە خودا مرۆی بەفیزو بە دەعیەو دەماری خۆش ناوێ!

٤٧٧٢- ـ (ب - ٧ ز - ٥١ ل - ٢١١ ف - ٢) [١].

٤٧٧٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِى وَالْعَظَمَةُ إِزَارِى فَمَنْ نَازَعَنِى وَاحِدًا مِنْهُمَا قَذَفْتُهُ فِى النَّارِ. رواه أبو داود ومسلم[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: خودای گەورە دەفەرموێ: گەورەیی و مەزناهی عاباو کەوای خۆمن، ئەوەی گەڕو تەشقەڵەم پێ بکا لەسەر یەکێ لەم دوانە تووڕی دەدەمە ناو ئاگری دۆزەخەوە! (د/م).

٤٧٧٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ وَلاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ أَحَدٌ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرِيَاءَ[٣]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بەقەی سەنگی دەنکێ خەرتەلەیێ ئیمان و باوەڕ لە

[١] تقدم في مجلد سابع. تسلسل:٥١ ل/٢١١ ط/١ رقم/٤١٨٣.

[٢] مسلم. ادب: ٦٦٢٣.

[٣] مسلم. إيمان: ٢٦٢. أبوداود. لباس: ٤٠٩١.

دڵیابێ ناچێتە ناو دۆزەخ، هەر كەسێكیش بەقەی سەنگی دانەی خەرتەلەیێ دەعیەو فیزو دەمار لەناو دڵیابێ ناچێتە ناو بەهەشت (م/ت).

٤٧٧٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ. قَالَ رَجُلٌ: إِنَّ الرَّجُلَ يُحِبُّ أَنْ يَكُونَ ثَوْبُهُ حَسَنًا وَنَعْلُهُ حَسَنَةً. قَالَ: إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ الْكِبْرُ بَطَرُ الْحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ. رواهما مسلم والترمذي[٤]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر كەسێ تۆسقاڵی فیزو دەعیەو دەمار لە دڵیابێ ناچێتە بەهەشتەوە، پیاوێ عەرزی كرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پیاو هەیە حەزدەكا بەرگی جوان بێ و پێڵاوی جوان بێ ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: لە راستیدا خودا خۆی جوانەو جوانیی پێ خۆشەو كالاو بەرگ و پێڵاوی جوان ئەگەر بۆ فیزو دەعیەو دەمار نەبێ قەیناكاو شتێكی جوانەو خودا پێی خۆشە، بەڵام فیزو دەعیە ئەوەیە كە حەق بەحەق نەزانی و حەق پێ شێل كەیت و بەچاوی سووك تەماشای خەڵك بكەیت و تانەو توانجیان تێ بگری (م/ت).

٤٧٧٦- ـ (ب - ٣ ز- ١٠٦ ل - ٢٨٦ ف - ٤)[٥]:

٤٧٧٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُحْشَرُ الْمُتَكَبِّرُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَمْثَالَ الذَّرِّ فِي صُوَرِ الرِّجَالِ يَغْشَاهُمُ الذُّلُّ مِنْ كُلِّ مَكَانٍ فَيُسَاقُونَ إِلَى سِجْنٍ فِي جَهَنَّمَ يُسَمَّى بُولَسَ تَعْلُوهُمْ نَارُ الأَنْيَارِ يُسْقَوْنَ مِنْ عُصَارَةِ أَهْلِ النَّارِ طِينَةِ الْخَبَالِ[٦]:

لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە لە باپیری باوكیەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا فیزن و دەعیە زلەكان كاتێ حەشر دەكرێن هەریەكەی بەقەد وردە

---

[٤] ترمذي. بر وصلة: ١٩٩٨. ابن ماجه. مقدمة: ٥٩. تحفة/٩٤٢١.

[٥] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/١٠٦ رقم/٢٤٣٤.

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

میروولـە سـوورەیی دەبـن، بـەڵام شـێوەیان شـێوەی ئـادەمیزادە، لەهـەموو لایەکـەوە کەساسـی و سـەر شۆڕی دەورەی داون، زینـدانێ لـە دۆزەخـدا هەیـە ناوی بولیسە جا بەرەو ئەو زیندانە لێیان دەخوڕن، لەوێ دەکەونـە بن ئاگری شای ئاگرانەوە! وە لە لیتـەو چڵپاوی کەللـەیی بوون (کـە جـەرە تـاوی لەشـی دۆزەخییەکانـە) لـەباتی ئـاو دەیـان دەنـێ! (ت- س/ص). عـەمری کـوڕی شوعەیبی کوڕی موحەممەدی کـوڕی عەبدوڵڵای کـوڕی عـەمری کـوڕی عـاص، تابیعی بووە، لەهەر شوێنێ کە دەفەرموێ: عن عمروبن شعیب عن ابیە عن جدە. واتـە: عـەمر دەگێڕێتـەوە لـە شـوعەیبەوە شـوعەیب دەگێڕێتـەوە لـە باپیرەی خۆیەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاصە (وەرگێڕ).

٤٧٧٨- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: تَقُولُونَ لِي فِيَّ التِّيهُ وَقَـدْ رَكِبْـتُ الْحِمَارَ وَلَبِسْتُ الشَّمْلَةَ وَقَدْ حَلَبْتُ الشَّاةَ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ فَعَلَ هَذَا فَلَيْسَ فِيهِ مِنَ الْكِبْرِ شَيْءٌ[٧]:

جوبەیری کـوڕی مـوطعیم (خودای لێ ڕازی بێ) فـەرمووی: ئێـوە بـە مـن دەڵێن گوایـە هەواو دەعیەم هەیە، بەڵام کەسێ هەوای بێ چۆن ئەم ئیشانە دەکا کە مـن دەیانکەم: مـن سـواری گوێدرێـژ دەبمو سـەردەریو فـەرەنجی لەبەردەکـەمو مـەڕ دەدۆشـمو وردە ئیشی تـری ناومـاڵ دەکـەم، پێغەمبـەریش (درودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: کەسـێ ئـەم جۆرە شتانە بکا فڕی بەسەر فیزو هەواوە نییە (ت- س/ص).

٤٧٧٩- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُـولُ اللّٰـهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ يَزَالُ الرَّجُلُ يَذْهَبُ بِنَفْسِهِ حَتَّى يُكْتَبَ فِي الْجَبَّارِينَ فَيُصِيبُهُ مَا أَصَـابَهُمْ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٨]:

سـەلەمەی کـوڕی ئـەکوەع (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتـەوە لـە حەزرەتـەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پیاوی وا هەیە ئەوەنـدە خـۆی بـەزل دەگرێو

---

[٧] بسند صحيح (شرحه).

[٨] بسند حسن (شرحه).

خەڵکی تر بەسووك تەماشا دەکا هەتا لەلای خودا لەناو ڕیزی ستەمگەرو زۆرداره ملهوڕەکاندا لە قەڵەم دەدرێ! (ت- س/ح).

٤٧٨٠- وَجَاءَ رَجُل إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي رَجُلٌ حُبِّبَ إِلَيَّ الْجَمَالُ وَأُعْطِيتُ مِنْهُ مَا تَرَى حَتَّى مَا أُحِبُّ أَنْ يَفُوقَنِي أَحَدٌ - إِمَّا قَالَ بِشِرَاكِ نَعْلِي. وَإِمَّا قَالَ بِشِسْعِ نَعْلِي - أَفَمِنَ الْكِبْرِ ذَلِكَ قَالَ: لاَ وَلَكِنَّ الْكِبْرَ مَنْ بَطَرَ الْحَقَّ وَغَمَطَ النَّاسَ. رواه أبو داود في اللباس[٩]:

پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! من پیاوێکم دەستوورم وایە حەزم لە جوانییە، بە ڕەنگێکی وا کە حەزدەکەم لەهەموو شتێکا خۆم سەر کوڵبم، تەنانەت حەزناکەم کە کەس بەنی پێڵاوەکانی یا قەیتانی سۆڵەکانی لەهی من قۆزتر بێ، بۆ جوانیو قۆزیو تەرپۆشیش ئەمەم کەوام لە بەرچاوت جا ئایا ئەمەی من دەیکەم بە دەمارو دەعیە دادەنرێ یا نا؟ فەرمووی: نەء، بەڵام دەمارو دەعیە هەق پێشێلکردنەو خەڵك بە سووك دانانە! (ئەبو داوود. ڕەزای خودای لێ بێ).

## ١٩) باسی زمان لووسیو دەمتەڕیو هەڵنانی زۆر : (ومنه الإطراء في المدح)

٤٧٨١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً يُثْنِي عَلَى رَجُلٍ وَيُطْرِيهِ فِي الْمِدْحَةِ فَقَالَ: أَهْلَكْتُمْ - أَوْ قَطَعْتُمْ - ظَهْرَ الرَّجُلِ. رواه الشيخان[١]:

ئەبو موسا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرگوێی کەوت پیاوی وەسفی پیاوێکی تری دەدایەوەو بەتانیا دەهات لەبەرئەوە فەرمووی: پیاوەکەتان بەم پیاهەڵدانە کوشت، یا فەرمووی: پشتی پیاوەکەتان شکان (چونکە هەڵنانی زۆر ملی پیاو دەشکێنێ) (ش- خودایان لێ

---

[٩] سكت عن درجته الشارح.

[١] بخاري. شهادات: ٢٦٦٣، ٦٠٦٠. مسلم. زهد/٧٤٢٩. تحفة الأشراف: ٩٠٥٦.

ڕازی بێ) لە شەرحەکەدا دەفەرموێ (خودای لێ ڕازی بێ): حەدیثیکی طەبەرانی‌و حاکم هەیە دەفەرموێ: اذا مدح المؤمن في وجهه ربا الأيمان في قبله: کاتێ لەڕوو مەتح‌و تاریفی جوانی موسوڵمانی ساخ دەکرێ بەوە نووری ئیمان لەناو دڵیا دەگەشێتەوە. (وەرگێڕ).

٤٧٨٢- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذُكِرَ رَجُل عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَثْنَى عَلَيْهِ رَجُلٌ خَيْرًا ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَيْحَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ - يَقُولُهُ مِرَارًا - إِنْ كَانَ أَحَدُكُمْ مَادِحًا لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ كَذَا وَكَذَا . إِنْ كَانَ يُرَى أَنَّهُ كَذَلِكَ ، وَحَسِيبُهُ اللَّهُ ، وَلاَ يُزَكِّى عَلَى اللَّهِ أَحَدًا. رواه الثلاثة[٢]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی پیاوێ کرا، پیاوێکی تریش وەسفی چاکی‌و باشیی ئەوی کرد. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هاوار بۆ تۆ ئەستۆی هاوڕێکەتت شکاند! وەچەن جار لەسەر یەك ئەم وشەی دووبارە کردەوە، ئەوجا فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان هەرچاری نەبوو کەویستی وەسفی کەسێ بکا با جەزمی پیا نەنێ‌و بەڵکو بڵێ؟ وا دەزانم ئەو پیاوە وا وایە، ئەمەیش بەمەرجێ کە ئەو کابرایە ڕێی تێ بچێ کە وەك دەڵێ وابێ، ئیتر خودا بۆخۆی ئاگای لە دڵیەتی‌و بەپێی نیازی دڵی پاداشی دەداتەوە، بەڵام بە هیچ جۆر نابێ بڕیار بداو بڵێ فیسارە کەس لەلای خودا پاکە، چونکە شتی وا بەس خودا بۆ خۆی دەیزانێ! (ش/د).

٤٧٨٣- وَجَاءَ رَجُلٌ فَأَثْنَى عَلَى عُثْمَانَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فِي وَجْهِهِ فَأَخَذَ الْمِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ تُرَابًا فَحَثَا فِي وَجْهِهِ وَقَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذَا لَقِيتُمُ الْمَدَّاحِينَ فَاحْثُوا فِي وُجُوهِهِمُ التُّرَابَ. رواه أبو داود ومسلم والترمذي[٣]:

---

[٢] تجريد/٢ ل/٢٢٨ ط/١ رقم/١١٢٢ = ٢٦٦٢، ٦٠٦١، ٦٠٦٢، مسلم. زهد: ٧٤٢٦. أبوداود. ادب: ٤٨٠٥. ابن ماجه. أدب. ٣٧٤٤. تحفة/١١٦٧٨.

[٣] مسلم. زهد: ٧٤٣٠. ترمذي. زهد/٢٣٩٣. ابن ماجه. ادب: ٣٧٤٢. تحفة الأشراف: ١١٥٤٥.

پیاوێ هات لە روو، دەستی کرد بە تاریفکردنی عوسمان (خودای لێ رازی بێ) میقدادی کوڕی ئەسوەدیش تۆزێ خۆڵی هەڵگرت و وەشاندی بەرووی کابرادا، عوسمان پێی فەرمووی: بۆچی وا دەکەی لێی؟ میقداد فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرمووین: کاتێ دەگەن بە ستایش خوێنان (مەدداحین) خۆڵ بکەن بەدەموو چاویاندا! (د/م/ت- خودایان لێ رازی بێ).

٤٧٨٤- وَجَاءَ وَفْدِ بَنِي عَامِرٍ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: أَنْتَ سَيِّدُنَا. فَقَالَ: السَّيِّدُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى. قالُوا: وَأَفْضَلُنَا فَضْلاً وَأَعْظَمُنَا طَوْلاً. فَقَالَ: قُولُوا: بِقَوْلِكُمْ أَوْ بَعْضِ قَوْلِكُمْ وَلاَ يَسْتَجْرِيَنَّكُمُ الشَّيْطَانُ. رواه أبو داوۆد والإمام أحمد[٤]:

نوێنەرەکانی هۆزی بەنی عامیر کە هاتنە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) گوتیان: تۆ گەورەی ئێمەیت، فەرمووی: گەورەی هەموو لایێ هەر خودایە! گوتیان: وە بۆ پیاوەتیش گەورەو سەروەرمانیت و بۆ بەخشش و دەسەنەیش هەر خۆت ئاغامانیت؟ فەرمووی: ئەم قسەیەتان رێی تێ دەچێ یا فەرمووی: قەیناکالەم بابەتە بڵێن، بەڵام ئاگاتان لەخۆتان بێ شەیتان نەتانکا بەپێ کوڕەی خۆی و بەرەبەرە پێی لێ هەڵبڕن و لەرادەی دەربکەن (د/ ئەحمەد).

## ٢٠) باسی جمێن و جنێو: (ومنه السب والقذف)

٤٧٨٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيُّمَا امْرِئٍ قَالَ لأَخِيهِ يَا كَافِرُ. فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا إِنْ كَانَ كَمَا قَالَ وَإِلاَّ رَجَعَتْ عَلَيْهِ. رواه الأربعة[١]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی بەبرای موسوڵمانی خۆی بڵێ: ئەی ناموسوڵمان!

---

[٤] سكت عن درجته الشارح.

[١] تجريد/٥ ل/٢١٣ رقم/١٩٣٧ = ٦٠٤٥ = ١٣٩٥ تجريد = ٣٥٠٨ فتح - مجلد رابع ص٨٣. مسلم. إيمان: ٢١٣.

ئەی خودا نەناس! ئەوە ئەو قسەیە بەر یەکێکیان هەر دەکەوێ، جا ئەگەر جمێن پێی دراوەکە شایانی جمێنەکەبێ ئەوا جمێنەکە بەر ئەو دەکەوێ، ئەگینا ئەگەر وانەبێ ئەوا جمێنەکە بۆ جنێو دەرەکە دەگەڕێتەوە. (ش/د/ت).

٤٧٨٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لاَ يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالْفُسُوقِ ، وَلاَ يَرْمِيهِ بِالْكُفْرِ ، إِلاَّ ارْتَدَّتْ عَلَيْهِ ، إِنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذَلِكَ. رواه الشيخان[٢]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): هەرکەسێ نیسبەتی گاووری (ناموسوڵمانی) یا بەدکاری (فاسقی) لە کەسێکی تر بداو کابرای برادەریشی وانەبێ وەك ئەو دەڵێ ئەوە ئەو بوختیانە دەچێتەوە بۆ خۆیو ئەو خۆی (لە جیاتی ئەو) گاوور دەبێ، یا بەدکار دەبێ. (ش- خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٧٨٧- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: جوێندان بە موسوڵمان فیسقو لە دین دەرچوونەو شەڕ لەگەڵ کردنیشی کوفرو بێ دینییە (مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ دەفەرموێ خودای لێ ڕازی بێ: یەعنی لە کوفرەوە نزیکە ئەوەندە گوناهێکی گەورەیە) (ش/ت). (وەرگێڕ)

٤٧٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُسْتَبَّانِ مَا قَالاَ فَعَلَى الْبَادِي مِنْهُمَا مَا لَمْ يَعْتَدِ الْمَظْلُومُ. رواه ابو داود ومسلم والترمذي[٤]:

---

[٢] بخاري. مناقب: ٣٣١٧، ٥٦٩٨. مسلم. إيمان/٢١٤.

[٣] بخاري. إيمان: ٤٨، ٦٠٤٤، ٧٠٧٦ = تجريد/١ ل/٦٨ رقم/٤٥. مسلم. إيمان: ٢١٨. ترمذي. إيمان: ٢٦٣٥، ١٩٨٣. نسائي. تحريم: ٤١٢٠، ٤١٢١. تحفة/٩٢٤٣.

[٤] مسلم. أدب: ٦٥٣٤.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرموی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو دوو کەسەی شەڕە جنێو دەکەن گوناهی جنێوەکانیان بەملی ئەوەیانە کە لەپێشدا جنێوەکە دەدا، بەمەرجێ ناهەقی لێ کراوەکە دەسدرێژی نەکاو زیاد لەهەقی خۆی جنێو نەدا (م/ت).

٤٧٨٩- ← (ب – ١ ز- ١٩٥ ل- ٥٢٥ ف – ٣)[٥].

لێرەدا ئاوایە: ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): ئەم دوو خووە خووی کافرو بێ بڕواکانن:

یەکەم: تانەو تانووتدان لە رەسەنو بنەچەی مەردوم.

دووەم: شیوەن کردن لەسەر مردوو.

٤٧٩٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَالَ الرَّجُلُ هَلَكَ النَّاسُ . فَهُوَ أَهْلَكُهُمْ. رواه مسلم وأبو داود[٦]:

دیسان ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): ئەو پیاوەی دەڵێ خەڵك خراپ بوون، ئەوە خۆی لە هەموویان خراپترە! (م/د).

٤٧٩١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا مَاتَ صَاحِبُكُمْ فَدَعُوهُ لاَ تَقَعُوا فِيهِ. واه أبو داود. نسأل الله حفظ اللسان آمين[٧]:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەر بێو رەزای خوداش لەوبێ) فەرموی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ کەسێکتان دەمرێ ئیتر دەستی لێ هەڵبگرنو بەخراپە باسی مەکەن! (د- س/ صالح). لە شەرحەکەدا دەفەرموێ: (پڕ گۆڕی لە نووری خودا بێ) حەدیثێکی تیرمیذی هەیە دەفەرموێ: جنێو بە مردووەکان مەدەن، چونکە ئازار بە زیندووەکانیان دەگەیەنێ.

---

[٥] تقدم في مجلد اول. تسلسل/١٩٥ ل/٥٢٥ ج/١ رقم/١٠٢٨/٣/١.

[٦] مسلم. أدب/٦٦٢٦. ابوداود. أدب: ٤٩٨٣. تحفة/١٢٦٢٣.

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

## ٢١) باسی نەحلەتکردنو زمان پیسی : (ومنه اللعن والفحش)

٤٧٩٢- ← (ب/٣ ز/١٢٤ ل/٣٢٥ ف/٣) + (ز/١٣٢ ل/٣٤٠ ف/٤)[1].

٤٧٩٣- وَقَالَ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ): لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاحِشًا وَلاَ لَعَّانًا وَلاَ سَبَّابًا ، كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْمَعْتَبَةِ مَا لَهُ ، تَرِبَ جَبِينُهُ. رواه البخاري[2]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر زمان پاك بوو، پیاوێکی هەرزەگۆو زمان پیسو نەفرینکەرو جنێو فرۆش نەبوو، کاتێ گلەیی لە یەکێکمان دەکرد زۆر بە ناسکی دەیفەرموو: ئەوە چییەتیبۆ وادەکا، ناوچاوانی خۆڵاوی بێ (دوور نییە کە مەبەست لەم وشەیە نزای باش بێ ئەوکاتە: واتە: بە سەجدەی زۆر تەوێڵی خۆڵاوی ببێ!) (ب).

٤٧٩٤- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّعَّانِينَ لاَ يَكُونُونَ شُهَدَاءَ وَلاَ شُفَعَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه مسلم وأبو داود[3]:

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: نەفرین کەران (لە ڕۆژی ڕەستا خیزدا) نە پایەی شەهیدانو نە پایەی تکاکاریان پێ نادرێ! (م/د).

٤٧٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَنْبَغِي لِصِدِّيقٍ أَنْ يَكُونَ لَعَّانًا. رواه مسلم والترمذي[4]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پیاو چاكو لەعنەت فرۆشیان نەگوتووە! (م/ت).

---

[1] تقدم في مجلد ثالث تسلسل/١٢٤ ل/٣٢٥ ط/١ رقم/٢٥٠٤/٣ + تسلسل/١٣٢ ل/٣٤٠ ط/١ رقم/٢٥٣٢/٤.

[2] تجريد (مختصر صحيح البخاري) مجلد/٥ ص/٢١٢ رقم/١٩٣٤ = ٦٠٣١، ٦٠٤٦.

[3] مسلم. بر وصلة (أدب): ٦٥٥١، ٦٥٥٢، ٦٥٥٣. أبو داود. أدب: ٤٩٠٧. تحفة/١٠٩٨٠.

[4] مسلم. بر وصلة (أدب): ٦٥٥١.

٤٧٩٦- وَعَنْهُ قِيلَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ ادْعُ عَلَى الْمُشْرِكِينَ قَالَ: إِنِّي لَمْ أُبْعَثْ لَعَّانًا وَإِنَّمَا بُعِثْتُ رَحْمَةً. رواه مسلم[٥]:

دیسان دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! نزای شەڕ لە بتپەرسەکان بکە، فەرمووی: من لەلایەنی خوداوە بۆ ئەوە نەهاتووم کە نەفرینو نەحلەت لەمو لەو بکەم، بەڵکوو بە پێچەوانەوە من بۆیە هاتووم کەببم بەمایەی میهرەبانیو مەرحەمەت (م- پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ).

٤٧٩٧- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تَلاَعَنُوا بِلَعْنَةِ اللّٰهِ وَلاَ بِغَضَبِ اللّٰهِ وَلاَ بِالنَّارِ[٦]:

سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بە یەکتری مەڵێن لەعنەتی خودات لێ بێ، یا بەر قارو غەزەبی خودا کەوی، یا بەر ئاگر کەوی! (د/ت- س/ص).

٤٧٩٨- وَنَازَعَتِ الرِّيحُ رَجُلاً رِدَاءَهُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَعَنَهَا - فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ تَلْعَنْهَا فَإِنَّهَا مَأْمُورَةٌ وَإِنَّهُ مَنْ لَعَنَ شَيْئًا لَيْسَ لَهُ بِأَهْلٍ رَجَعَتِ اللَّعْنَةُ عَلَيْهِ. رواهما أبو داود والترمذي[٧]:

لە خزەتی حەزرەتدا کابرایێ، با خۆش خۆش کەواکەی هەڵ دەدایەوەو لەشی دەردەخست، لە ئەنجامدا کابراکە گوتی بە بایەکە: بە لەعنەت بیت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وامەڵێ، لەعنەتی لێ مەکە، ئەم بایە بە فەرمانی خودا هەڵ دەکاو دەوەزێ! ئەمە لەلایێ، لە لایەکی تریشەوە بڕیاری خودایە: ئەو کەسەی لەعنەتو نەفرین لە شتێك بکاو ئەو شتە شایانی ئەو لەعنەتە نەبێ، لەعنەتەکەی خۆی دەگەڕێتەوە بۆ سەرخۆی! (د/ت - س/ح).

---

[٥] مسلم. بر وصلة (ادب): ٦٥٥٦.

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٤٧٩٩- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا لَعَنَ شَيْئًا صَعِدَتِ اللَّعْنَةُ إِلَى السَّمَاءِ فَتُغْلَقُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ دُونَهَا ثُمَّ تَهْبِطُ إِلَى الأَرْضِ فَتُغْلَقُ أَبْوَابُهَا دُونَهَا ثُمَّ تَأْخُذُ يَمِينًا وَشِمَالاً، فَإِذَا لَمْ تَجِدْ مَسَاغًا رَجَعَتْ إِلَى الَّذِي لُعِنَ فَإِنْ كَانَ لِذَلِكَ أَهْلاً وَإِلاَّ رَجَعَتْ إِلَى قَائِلِهَا. رواه أبو داود[٨]:

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەندەی خودا کاتێ نەحلەت لە شتێ دەکا، ئەو نەحلەتە بەرەو ئاسمان بەرزەوە دەبێ، بەڵام دەرگاکانی ئاسمانی لێ دادەخرێ، ئەوجا دیسان دێتەوە خوارێ بۆ زەوی، دەرگاکانی ئەوێشی لێ دادەخرێ، ئەوجا بەراستو بە چەپا دەگەڕێ وەلێ دەربازگەی دەست ناکەوێ، ئەوسا بەرەو نەحلەت لێکراوەکە دەڕوا، جا ئەگەر نەفرین لێکراوەکە شایەنی ئەو نەفرینە بوو ئەوا دەنووسێ بە کوڵکیەوە، دەنا دەگەڕێتەوە بۆ سەر نەفرینکەرەکە (د- س/صالح). ئەمەیە لە کوردیدا دەڵێن: ماڵی قەڵب دەگەڕێتەوە سەر خاوەنی.

٤٨٠٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ وَلاَ اللَّعَّانِ وَلاَ الْفَاحِشِ وَلاَ الْبَذِيءِ. رواه الترمذي. نسأل الله حسن الأخلاق آمين[٩]:

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بۆ موسوڵمان ناشی کە توانجدەرو نەفرینکەرو هەرزەکۆو زمان پیس بێ (ت- س/ح).

---

[٨] رواه الترمذي بسند صالح (شرحه).

[٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

## ٢٢) باسی قسە دابڕین لە موسوڵمانو بەچاوی سووك تەماشا كردنی موسوڵمان : (ومنه إحتقار المسلم وهجره)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْـرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْـرًا مِّنهُنَّ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة الحجرات - ٤٩/١١}.

واتە: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان بە خوداو پێغەمبەری خودا كردووە! ئەی موسوڵمانینە! چ پیاوتان چ ژنتان تیزو تەڵفیزیو لاقرتیو گەمەو گاڵتە بە یەكتری مەكەن، لەوانەیە كە گاڵتە پێكراوەكان لەلای خودا لە گاڵتە كەرەكان پێیان باشتربن...

٤٨٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَنَاجَشُوا وَلاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَدَابَرُوا وَلاَ يَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا. الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ لاَ يَظْلِمُهُ وَلاَ يَخْذُلُهُ وَلاَ يَحْقِرُهُ. التَّقْوَى هَا هُنَا. وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ دَمُهُ وَمَالُهُ وَعِرْضُهُ. رواه الأربعة[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: حەسوودیو بەخیلی بە یەكتری مەبەنو، كۆستە لە یەكتری مەكەنو، كینەو دەغەز لە یەكتری مەكێشنو، پشت لە یەكتری مەكەنو لە یەكتری لووتەلا مەبنو، كڕیار یا فرۆشیار لە یەكتری هەڵ مەگێڕنەوە، وە وەك برا بەندەی خودا بنو لەناو خۆتانا ڕێكو تەبابنو ببن بەبرای یەكتری، موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێ زۆرو ناهەقی لێ بكا، نابێ بە چاوی سووك تەماشای بكا، نابێ پشتی لە زەوی بداو دەستە شكێنی بكا، بە پێی تەوانا دەبێ لەسەری بكاتەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ

---

[1] تجريد (مختصر صحيح البخاري)/٥ ل/٢١٥ رقم/١٩٤١ = ٦٠٦٥، ٦٠٧٦. فتح. مسلم. بر وصلة: ٦٤٧٣-٦٤٧٧. أبو داود. أدب/٤٩١١. ترمذي. بر وصلة/١٩٣٢. تحفة/٣٤٧٩.

جار دەستی نایە سەر دڵی و فەرمووی: تەقواو ترسی خودا وا لێرەدا: لەناو دڵدا، بەسە بۆ خراپی موسوڵمان کە بە چاوی سووك تەماشای برای موسوڵمانی خۆی بکا! هەموو شتێکی موسوڵمان بە موسوڵمانێکی تر حەرامە: خوێنی/ ماڵو سامانی، شەرەفو ئابروو ناموسی (ش/د/ت. رمزای خودایان لێ بێ) .

٤٨٠٢- فەرموودەی (رب أشعث مدفوع...) لە بەرگی هەشتەما رابوورد لە باسی (الأستنصار بالضعفاء)دا لە کتابی جیهاددا [٢].

٤٨٠٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تُفْتَحُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ رَجُلاً كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ فَيُقَالُ أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا أَنْظِرُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٣]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو ڕۆژێکی دوو شەمان و پێنج شەمان دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو خودا لە هەموو بەندەیێ خۆش دەبێ کە هاوڕێ بۆ خودا دانەنێ، تەنیا لەو دوو کەسە نەبێ کە لەناو خۆیاندا ناکۆکن و قینیان لە یەکترە، یەزدان سێ جار دەفەرموێ بە فریشتەکان: ئەم دوو کەسە جارێ با بمێنن تا لەناو خۆیاندا ئاشت دەبنەوە ئەوجا قەڵەمی لێبووردن بێنن بەسەر گوناهەکانیان دا. (م/د/ت).

٤٨٠٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تُعْرَضُ أَعْمَالُ النَّاسِ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّتَيْنِ: يَوْمَ الاِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ إِلاَّ عَبْدًا بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ فَيُقَالُ اتْرُكُوا - أَوِ ارْكُوا - هَذَيْنِ حَتَّى يَفِيئَا. رواه مسلم[٤]:

---

[٢] تقدم في مجلد ثامن. تسلسل/٣٥ ل/١٠٨ ط/١ رقم/٣/٤٤٣٧.

[٣] مسلم. بر وصلة (أدب): ٦٤٩٠-٦٤٩٣. ترمذي: بر وصلة: ٢٠٢٣. تحفة/١٢٧٠٢.

[٤] مسلم. بر وصلة (أدب): ٦٤٩٢-٦٤٩٣.

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: هەموو هەفتەیێ دوو جار کردەوەکانی ئادەمیزادەکان لە حوزووری خودادا رادەنوێنرێن، جارێ لە رۆژی دوو شەممەداو جارێ لە رۆژی پێنج شەممەدا، وە خودا لە هەموو بەندەیەکی موسوڵمان خۆش دەبێ تەنیا لەو بەندەیە خۆش نابێ کە لەگەڵ برای موسوڵمانیدا قینیان لەیەکتربێ، خودا بە فریشتەکان دەفەرموێ: جارێ با ئەم دوو کەسە بمێنن، یا فەرمووی: دەفەرموێ جارێ واز لەم دوانە بهێنن قەڵەمی عەفوو (بنووسی لێبووردن) بەسەر کردەوەی خراپیاندا مەهێننو دوایان بخەن هەتا کاتێ لەناو خۆیاندا ئاشت دەبنەوە! (م).**

٤٨٠٥- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأنصاري (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ ، يَلْتَقِيَانِ فَيَصُدُّ هَذَا ، وَيَصُدُّ هَذَا ، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ. رواه الأربعة[٥]:

**ئەبو ئەییوبی ئەنصاری** (خودای لێ رازی بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ** (دروودی خودای لەسەر بێ): **دروست نییە بۆ پیاوی موسوڵمان کە زیاتر لە سێ شەو قسە دابڕێ لە برای موسوڵمانیو قسەی لەگەڵدا نەکا، گریمان ئەگەر لەملاو لا تووشی یەك بوون ئەمیان بەم لاداو ئەویان بەولادا روو وەرگێڕێ! باشی ئەم دوو موسوڵمانەیش ئەوەیانە کە لەپێشدا رۆژ باشیو سڵاو لەوی تریان بکا. (ش/د/ت/ن).**

٤٨٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِمُؤْمِنٍ أَنْ يَهْجُرَ مُؤْمِنًا فَوْقَ ثَلاَثٍ فَإِنْ مَرَّتْ بِهِ ثَلاَثٌ فَلْيَلْقَهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ فَإِنْ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ فَقَدِ اشْتَرَكَا فِي الأَجْرِ وَإِنْ لَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ فَقَدْ بَاءَ بِالإِثْمِ وَخَرَجَ الْمُسَلِّمُ مِنَ الْهِجْرَةِ[٦]:

---

[٥] بخاري. ادب: ٦٠٧٧، ٦٢٣٧ = تجريد/٥ ل/٢١٧ رقم/١٩٤٥. مسلم. بر وصلة: ٦٤٧٨-٦٤٨١.

[٦] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دروس نییە بۆ موسوڵمان کەپتر لە سێ ڕۆژ قسەنەکا لەگەڵ موسوڵماندا، جا ئەگەر هەتا سێ ڕۆژ قسەی نەکرد با ئەو بچێ بۆلای‌و سڵاوی لێ بکا، جا ئەگەر وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە ئەوا دەبێ بە هاوبەشی پاداشەکە، ئەگینا هەموو گوناهەکە دەچێ بۆ ئەو، وە سڵاوکەرەکە لە ئۆباڵی قسە دابڕینەکە دەردەچێ! (د- س/صالح).

٤٨٠٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثٍ فَمَنْ هَجَرَ فَوْقَ ثَلاَثٍ فَمَاتَ دَخَلَ النَّارَ[٧]:

دیسان ئەو لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دروست نییە بۆ موسوڵمان کە زیاتر لە سێ شەو قسە دابڕێ لە برای موسوڵمانی، ئەوەی لە سێ شەو زیاتر قسە دابڕێ‌و لەسەر ئەو حاڵە پێش ئاشتبوونەوە بمرێ دەچێتە دۆزەخ (د- س/ صالح).

٤٨٠٨- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) اعْتَلَّ بَعِيرٌ لِصَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيٍّ وَعِنْدَ زَيْنَبَ فَضْلُ ظَهْرٍ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِزَيْنَبَ: أَعْطِيهَا بَعِيرًا، فَقَالَتْ: أَنَا أُعْطِي تِلْكَ الْيَهُودِيَّةَ فَغَضِبَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَهَجَرَهَا ذَا الْحِجَّةَ وَالْمُحَرَّمَ وَبَعْضَ صَفَرٍ[٨]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە سەفەرێکا حوشترەکەی ژێر صەفییەی هاوسەری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نەخۆش کەوت، زەینەبی خێزانی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) حوشتری لەخۆی زیادی هەبوو، پێغەمبەر پێی فەرموو: زەینەب! وشترێ بدە بە صەفییە، زەینەبیش گوتی: من وشتر بدەم بەو ژنە جوولەکەیە! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) تووڕە بوو سەرا سەر مانگی قوربان‌و مانگی موحەڕەم‌و هەندێکیش لە مانگی سەفەر، لەسەر ئەوە، قسەی لەگەڵ زەینەب نەرکرد! (د- س/ صالح).

---

[٧] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[٨] رواه أبو داود في السنة (شرحه).

**٤٨٠٩- وهجر عبد الله بن عمر** (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) **ولـده إلى أن مـات. روى هـذه الأربعة أبو داود**[٩]:

**عەبـدوڵڵای كـوڕی عومـەریش** (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) **تـا مـرد قسەی لەگـەڵ كوڕێكی خۆیدا نەكرد (د- س/ صالح).**

## ٢٣) باسی دەمبازیو مشتومڕ: (ومنه الجدل والمراء)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَـيْءٍ جَـدَلًا} سـورة الكهـف - ⟵(ب-١ز- ١٨١ل- ٤٩٥).

**٤٨١٠- عَنِ السَّائِبِ** (رَضِي اللّهُ عَنهُ) **قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَجَعَلُوا يُثْنُونَ عَلَيَّ وَيَذْكُرُونِي فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَنَا أَعْلَمُكُمْ يَعْنِي بِهِ. قُلْـتُ: صَـدَقْتَ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي كُنْتَ شَرِيكِي فَنِعْمَ الشَّرِيكُ كُنْتَ لاَ تُدَارِي وَلاَ تُمَارِي. رواه ابو داود والنسائي**[١]:

**سـائیب** (خودای لێ ڕازی بێ) **فـەرمووی: چـووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هاوڕێیان** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **دەستیان كـر بـە وەسف كردنـی منو باسكردنی من بەچاكە، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فـەرمووی: مـن لـە ئێوە باشـتری دەناسـم. منـیش گـوتم: ڕاسـت دەفـەرمووی ئـەی پێغەمبـەری خـودا! باوكو دایكم بە قوربانت بن، تۆ كاتێ هاوبەشو شەریكی من بووی بەڕاستی هاوبەشێكی چـاك بـووی، نەتەشـقەڵەو كـەڕو كێچەڵت دەكـردو نـە لامنجـیو هـاوردو بـردت دەكـرد، بەڕاسـتی ڕەفتـارت شیرینو مامەڵـە خـۆش بـووی (د- س/ صالح- ن).**

---

[٩] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[١] سند أبي داود صالح. قالَ مُصنِّفُ التاج في مقدمَة شرحه على التـاج الجـامع (المجتبـى للنسائي كلّه صحيح) فهُوَ لهذا الذي بأيدينا – راجع مجلد أوّل ص١٦ هامش رقم: ٢ من الأصل العربي.

(المترجم)

٤٨١١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَهُوَ بَاطِلٌ بُنِيَ لَهُ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ وَمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَهُوَ مُحِقٌّ بُنِيَ لَهُ فِي وَسَطِهَا وَمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ بُنِيَ لَهُ فِي أَعْلاَهَا. رواه الترمذي وأبو داود. ولفظه: أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ لِمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ[٢]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوەی واز لە درۆی هیچو پووچی بێ سوود بێنی، بە فەرمانی خودا لەناو حەوشەی بەهەشتا خانوویەکی بۆ دروست دەکرێ، وە ئەوەی واز لە دەمبازیو هاوردو برد بێنێ (هەرچەند لەسەر هەقیش بێ) ئەوە بە فەرمانی خودا لە ناوەڕاستی بەهەشتا خانویەکی بۆ دروست دەکرێ، وە ئەوەی خووی جوان بێو ڕەفتاری شیرین بێ بە فەرمانی خودا لەلای ژووروی بەهەشتەوە کۆشکێکی بۆ دروست دەکرێ (ت- س/ح-د) گفتەی (د): من دەبم بە کەفیلی کۆشکێ لە ناوەڕاستی بەهەشتا بۆ ئەو کەسەی واز لەدرۆ بێنێ بابەگاڵتەشەوە بێ، وە دەبم بە کەفیلی کۆشکێ لە چڵە پۆپەی بەهەشتا بۆ ئەو کەسەی ڕەوشتو ڕەفتاری جوان بێ!

٤٨١٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تُمَارِ أَخَاكَ وَلاَ تُمَازِحْهُ وَلاَ تَعِدْهُ مَوْعِدَةً فَتُخْلِفَهُ[٣]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: دەمبازیو گاڵتەی زۆر لەگەڵ برای موسوڵمانتا مەکەو بەڵێنی وایشی مەدەرێ کە نەیبەیتە سەر بۆی (ت- س/ح).

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٤٨١٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَفَى بِكَ إِثْمًا أَنْ لاَ تَزَالَ مُخَاصِمًا. رواهما الترمذي:

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: تاوانی ئەوەندەت بەسە کە هەمیشە شەڕانی بی! (ت- س/غریب).**

## ٢٤) باسی پیسکەیی‌و بەدخوویی : (ومنه البخل وسوء الخلق)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة المنافقون - ٦٣ /١٠}.

(ب- ٢ز- ٢٣ل- ٥٨)

٤٨١٤- عَنْ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ خِبٌّ وَلاَ مَنَّانٌ وَلاَ بَخِيلٌ[١]:

**ئەبو بەکر** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: نەرمە بڕو منەتکەرو پیسکە ناچنە بەهەشت! (ت- س/ح).**

٤٨١٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَصْلَتَانِ لاَ تَجْتَمِعَانِ فِي مُؤْمِنٍ الْبُخْلُ وَسُوءُ الْخُلُقِ. رواهما الترمذي[٢]:

**ئەبو سەعید** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: ئەم دوو ڕەوشتە بەدە لە دڵی موسوڵمانا کۆنابنەوە: چرووکی‌و بەدخوویی! (ت- س/غریب).**

٤٨١٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤْمِنُ غِرٌّ كَرِيمٌ وَالْفَاجِرُ خِبٌّ لَئِيمٌ. واه الترمذي وأبو داود[٣]:

---

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: موسوڵمان دڵ سافو نازدارو بە قەدرو بەڕێزە، فاجرو بەدکاریش نەرمە بڕو نامەردو فریوبازە! (ت- س/ح-د).

٤٨١٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَتَقَارَبُ الزَّمَانُ ، وَيَنْقُصُ الْعَمَلُ ، وَيُلْقَى الشُّحُّ ، وَتَظْهَرُ الْفِتَنُ ، وَيَكْثُرُ الْهَرْجُ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّمَ هُوَ؟ قَالَ: الْقَتْلُ الْقَتْلُ[٤]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتو زەمان تەنگ دەبێ (واتە: پیتو بەرەکەت نامێنێ، خراپە پەرە دەستێنێ، تەمەن کورت دەبێ) وە کردەوەی چاکە کەم دەبێو، ڕژدیو چرووکی ڕەگ دادەکوتێو فەرتەنە گەلێ بەرپا دەبنو بگرەو بەردە زۆر دەبێ!

یاران فەرموویان: مەبەست لەم بگرەو بەردەیە چییە؟ فەرمووی: مەبەست بکوژو ببڕو کوشتو بڕینە! (ش/د/ت).

## ٢٥) تەنیا لە سێ شتدا درۆ دروستە : (يحرم الكذب إلا في ثلاث)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّمَا يَفْتَرِي الْكَذِبَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَاذِبُونَ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة النحل -١٦/١٠٥}.

واتە: درۆ هەڵبەستنو بوختان کردن تەنیا کارو پیشەی ئەو کەسانەیە کە باوەڕ بە قورئانو ئایەتەکانی خودا ناکەن، بەڕاستی ئەوانە درۆزنیتەواون!

٤٨١٨- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عِند جِده (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَيْلٌ لِلَّذِى يُحَدِّثُ فَيَكْذِبُ لِيُضْحِكَ بِهِ الْقَوْمَ وَيْلٌ لَهُ وَيْلٌ لَهُ. رواه أصحاب السنن[١]:

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] بخاري. أدب: ٦٠٣٧، ٧٠٦١ تعليقا. أبو داود. فتن: ٤٢٥٥ تحفة الأشراف: ١٢٢٨٢.

بەهزی کوڕی حەکیم لە باوکیەوە لە باپیریەوە (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەد بەخت ئەو کەسەی کە بە قسەی درۆ خەڵك دێنێتە پێکەنین، بەد بەخت خۆی، دیسان بەد بەخت خۆی! (د/ت/ن- س/ص).

٤٨١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعَ. رواه ابو داود مسلم[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بەسە بۆ گوناهباری پیاو کە هەرچی ببیسێت گشتی بەبێ پاکو پیسکردن بگێڕێتەوە (د/م).

٤٨٢٠- عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَسِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَبُرَتْ خِيَانَةً أَنْ تُحَدِّثَ أَخَاكَ حَدِيثًا هُوَ لَكَ بِهِ مُصَدِّقٌ وَأَنْتَ لَهُ بِهِ كَاذِبٌ. رواه أبو داود والإمام أحمد[٣]:

سوفیانی کوڕی ئوسەید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ناپاکیو بەد نمەکییەکی زۆر گەورەیە کە تۆ قسەیێ بکەی بۆ برای خۆت کە ئەو بەڕاستی بزانێ وە تۆ بە درۆ بۆی بکەی! (د- س/ضعیف- ئەحمەد).

٤٨٢١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: مَا كَانَ خُلُقٌ أَبْغَضَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الْكَذِبِ وَلَقَدْ كَانَ الرَّجُلُ يُحَدِّثُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْكِذْبَةِ فَمَا يَزَالُ فِي نَفْسِهِ حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّهُ قَدْ أَحْدَثَ مِنْهَا تَوْبَةً[٤]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕقی گەورەی لە سوێندی درۆ بوو، جاری وا دەبوو کابرایێ درۆیەکی لە خزەتی حەزرەتدا

---

[١] بسند صحيح (شرحه).

[٢] مسلم. مقدمة:٧.

[٣] رواه أبوداود بسند ضعيف.

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

دەکرد، ئیتر حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دڵی لێی پاك نەدەبۆوە تا بۆی روون دەبۆوە کە تەوبەی کردووەو لەو درۆیە پەشیمان بۆتەوە! (ت- س/ح).

٤٨٢٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَذَبَ الْعَبْدُ تَبَاعَدَ عَنْهُ الْمَلَكُ مِيلاً مِنْ نَتْنِ مَا جَاءَ بِهِ. رواهما الترمذي[٥].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ کە بەندەیێ درۆیێ دەکا فریشتە میلێ لێی دوور دەکەوێتەوە، لەتاو بۆگەنی درۆکەی! (ت- س/ح).

٤٨٢٣- ← (ب - ٣ ز - ١٢٢ ل - ٣٢١ ف - ٣) [٦].

لەگێڕانەوەی ئێرەدا دەفەرموێ: ئوممو کولثوومی کچی عوقبە (خودای لێ رازی بێ) کە یەکێ بوو لە ژنە کۆچکارە پێشنەکان، لەوانەیان کە بەیعەت و پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەستبوو فەرمووی: بە گوێی خۆم گوێم لێبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: بەو کەسە ناگوترێ درۆزن کە میانەی خەڵك رێك دەخا و قسەی باش لە نێوانیانا دێنێ و دەبا، با ئەو قسەیەش کە دەیکا لەو بەینەدا خۆی دروستی بکا!. ئوممو کولثووم فەرمووی: گوێم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەبووە کە رێگەی دەمە تەقێ و قسەو باسی ئەو خەڵکە بدا، لەوەی کە بۆنی درۆی لێ بێ، مەگەر بۆ یەکێ لەم سێ شتە:

بۆ جەنگ و بۆ ناوبژی و ئاشت کردنەوەی مەردوم لەنا و خۆیانا، بۆ قسەی خۆشی ژن و مێرد کە بۆ رابواردن و دەمە تەقێ لەنێوانی خۆیاندا دەیکەن (ش/د/ت) گفت (لەفظ)ی ئەبو داوود ئاوایە: نەیشم بیستووە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە رێگەی هیچ درۆیێ بدا جگە لەم سێ شتە، هەمیشە دەیفەرموو: من ئەم سێ شتە بە درۆ دانانێم:

---

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٦] تقدم في مجلد ثالث تسلسل/١٢٢ ل/٣٢١ ط/١ رقم/٢٥٩٦.

**یەکەم: ئەو پیاوەی ناو بژی مەردوم بکاو قسەی ڕاستو درۆ بکا، بەلام مەبەستی ڕێك خستنو ئاشت کردنەوە بێ لەو قسەیە.**

**دووەم: ئەو پیاوەیش کە لە جەنگ دەدوێ.**

**سێیەم: دەمە تەقێو گفتوگۆی نێوانی ژنو مێرد کە قسەی خۆش بۆ یەکتری دەکەن!.**

## ٢٦) باسی دوو ڕوویی‌و ناپاکی : (ومنه النفاق)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا – سورة النساء – ٤/١٤٥}.

**بێ گومان مونافقو ناپاکەکان وان لەبن بنی ئاگری دۆزەخداو هان لە قاتی هەرە خوارەوەی جەهەننەمدا، وەقەت نابینی کە کەسێ ببێ بە کۆمەکیانو لەو ئاگرە ڕزگاریان بکا.**

٤٨٢٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاَثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ[1]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ** (دروودی خودای لەسەر بێ): **نیشانەی ناپاك ئەم سێ ڕەوشتەیە. لە کاتی قسە کردندا درۆ دەکا، لە کاتی پەیمان داندا دەیشکێنێو نایباتە سەر، گزیو دەسپیسی لە ئەمانەتو سپاردە دەکات** (ش/د/ت).

٤٨٢٥– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْبَعٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا ، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ. رواهما الأربعة[2]:

---

[1] تجرید/١ ل/٥٣ رقم/٣١ = ٣٣، ٢٦٨٢، ٢٧٤٩، ٦٠٩٥. مسلم. إيمان: ٢٠٨. ترمذي: إيمان: ٢٦٣١م. نسائي. إيمان: ٥٠٣٦. تحفة: ١٤٣٤١.

[2] تجرید/١ ل/٥٣ رقم/٣٢ = ٣٤، ٢٤٥٩، ٣١٧٨. مسلم. إيمان: ٢٠٧. ابوداود. السنة: ٤٦٨٨. ترمذي. إيمان: ٢٦٣٢. تحفة/٨٩٣١.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ خوو بگرێ بەم چوار شتەوە ئەوە منافق و ناپاکی تەواوە، ئەوەی خوو بگرێ بە یەکێ لەم چوارەوە ئەوە ڕەگێکی موونافقیو ناپاکیی تیادایە تاوازی لێ دێنێ:

یەکەم: کاتێ قسە دەکا درۆی ناڕەوا بکا بە پیشە.

دووەم: کاتێ پەیمان دەدا بیشکێنێو نەیباتە سەرو هەموو دەم بێ پەیمان دەرچێ.

سێیەم: وەعدو بەڵێن نەباتەسەرو بێ ویژدانو سەر چەوت بێ.

چوارەم: لەکاتی ناکۆکیو هاوداوایی‌دا ناهەقی بکاو بەهەق ڕازی نەبێ (ش/د/ت- خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٨٢٦- ـ (ب- ٧ز- ٤٦ل- ٢٠٢ف- ٥) [٣].

٤٨٢٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ بَعَثَهُ اللَّهُ فِي أُمَّةٍ قَبْلِي إِلاَّ كَانَ لَهُ مِنْ أُمَّتِهِ حَوَارِيُّونَ وَأَصْحَابٌ يَأْخُذُونَ بِسُنَّتِهِ وَيَقْتَدُونَ بِأَمْرِهِ ثُمَّ إِنَّهَا تَخْلُفُ مِنْ بَعْدِهِمْ خُلُوفٌ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ وَيَفْعَلُونَ مَا لاَ يُؤْمَرُونَ فَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِيَدِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِلِسَانِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَمَنْ جَاهَدَهُمْ بِقَلْبِهِ فَهُوَ مُؤْمِنٌ وَلَيْسَ وَرَاءَ ذَلِكَ مِنَ الإِيمَانِ حَبَّةُ خَرْدَلٍ. رواهما مسلم[٤]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەموو پێغەمبەرێ کە خودا لە پێش مندا ناردوویەتی بۆ ناو میللەتێ، ئەو پێغەمبەرە لە نەتەوەکەی خۆی چەن دەستە برایەکی بووە، کە هاوڕێی گیانی بە گیانیی بوونو ئەو پێغەمبەرەیان کردووە بەسەر مەشقی خۆیانو ڕەوشتە جوانەکانی ئەویان گرتووەو ڕەفتاریان بە ڕەفتاری ئەو کردووە، جا بەرە بەرە لەپاش ئەوان لە نەوەو وەچەی چەرخەکانی دوا ئەوان

---

[٣] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/٤٦ ل/٢٠٢ ط/١ رقم/٤١٧٣.

[٤] مسلم. إيمان: ١٧٧.

چەن چینێکی پاشە بەرەی نابار پەیدا دەبن و دەبن بە جێگە داری ئەوان و، حاڵیان وا دەبێ کە قسەو کاریان یەك نابێ و کردارو ڕەفتاریان ناشیرینەو قسەیان قوتە! بەبێ فەرمانی خودا لە خۆیانەوە شت دادەتاشن و دەیکەن، جا هەر کەسێ بەدەست و بە کردەوە بەر پەرچیان بداتەوەو بچێ بە گژیاندا ئەوە موسوڵمانی چاکە، هەر کەسێ بە زمان لە دژیان بێ هەروەها، ئاخر شت ئەوەیە کە بەدڵ حەزیان لێ نەکاو لە دڵەوە ڕقی لێیان بێ، ئیتر لەمە بترازێ بەقەی دەنکە خەرتەلەیێ ئیسلامەتی نامێنێ! (موسلیم. پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) لە فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەدا دەڵێ: دەستەبرا: دۆستی خۆشەویستی پیاوبۆ پیاو. (وەرگێڕ)

٤٨٢٨- ـ (ب – ٢ ز – ١٤٧ ل – ٣٠١ ف – ٥) + (ب – ٨ ز – ٥٥ ل – ١٣٣ ف – ٣)[٥].

## ٢٧) ڕەگەز پەرستی ڕەوشتێکی سەردەمی نەزانییە
## العصبية من وصف الجاهلية

٤٨٢٩- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ دَعَا إِلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ قَاتَلَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ وَلَيْسَ مِنَّا مَنْ مَاتَ عَلَى عَصَبِيَّةٍ[١]:

جوبەیری کوڕی موطعیم (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی ڕەگەز پەست بێ لە ئێمە نییە، وە ئەو کەسەی لە پێناوی ڕەگەز پەرستیدا جەنگ بکا لە ئێمە نییە، وە ئەو کەسەی لەسەر ڕەگەز پەرستی دەمرێ لە ئێمە نییە! (د– س/ صالح).

٤٨٣٠- عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْعَصَبِيَّةُ قَالَ: أَنْ تُعِينَ قَوْمَكَ عَلَى الظُّلْمِ[٢]:

---

[٥] تقدم في المجلد ثاني تسلسل/١٤٧ ل/٣٠١ ط/١ رقم/١٧٧٢.

[١] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

وائیلەی کوڕی ئەسقەع (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! رەگەز پەرستی کامەیە کە شەرع نەهی لێ دەکا؟ فەرمووی: ئەوەیە کە تۆ بەناڕەوا یاریدەی خزمو هۆزی خۆت بدەیو کوێرانە بەهەقو ناهەق لەسەریان بکەیتەوە! (د- س/صالح).

٤٨٣١- عَنْ سُرَاقَةَ بْنِ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمِ الْمُدْلِجِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: خَيْرُكُمُ الْمُدَافِعُ عَنْ عَشِيرَتِهِ مَا لَمْ يَأْثَمْ[٣]:

سوراقەی کوڕی مالیکی جوعشوومی مودلیجی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دوانێکی بۆماندا فەرمووی: چاکترینی ئێوە ئەو کەسەیە کە خزم دۆست بێو بەهەق لەسەر خزمو هۆزی خۆی بکاتەوە، بەمەرجێ خۆی تووشی گوناه نەکاو لەسەر کردنەوەکەی کوێرانە نەبێ. (د- س/ ضعیف).

٤٨٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَصَرَ قَوْمَهُ عَلَى غَيْرِ الْحَقِّ فَهُوَ كَالْبَعِيرِ الَّذِي رُدِّيَ فَهُوَ يُنْزَعُ بِذَنَبِهِ. روى هذه الأربعة أبو داود. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى. آمين[٤]:

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی بە ناڕەوا یارمەتی خزمو کەسوکارو هۆزی خۆی دەدا ئەوە وەك حوشتری بەرەوەبوو وایە، کە کەوتبێتەناو چاڵێکەوەو بەکلك هەڵی بکێشنەوە! (د- س/صالح).

---

[٢] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

[٣] رواه أبوداود بسند ضعيف (شرحه).

[٤] رواه أبوداود بسند ضعيف (شرحه).

## ٢٨) باسی سێیەم: باسی ڕەوشتی بەرز
## الباب الثالث: في مكارم الأخلاق

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ – سورة الحجرات}. ← (ب- ٥ز- ٦٦ل- ٢٣٥).

## ٢٩) بەرزترین ڕەووشتی بەرز ڕق خواردنەوەو تووڕە نەبوون و حەوسەڵەیە
## أعظمها كظم الغيظ وعدم الغضب

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ – صَدَقَ اللهُ العَظِيم – سورة آل عمران – ٣/١٣٤}

واتە: نیشانەی ئەو خاوەن تەقوایانەی کە ئەو بەهەشتە پان و بەرینەیان بۆ ئامادەکراوە ئەم شتانەیە:

یەکەم: لەهەموو کاتێکا لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا، ماڵی خۆیان لە ڕێگەی خودادا بەخت دەکەن.

دووەم: بەحیلم و حەوسەڵەن و ڕقی خۆیان دەخۆنەوە.

سێیەم: لە هەڵەی خەڵك دەبوورێن، دیارە ئەم کارانە زۆرجوان و چاکن و خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە ئەم کارە باشانە دەکەن.

٤٨٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَيْسَ الشَّدِيدُ بِالصُّرَعَةِ ، إِنَّمَا الشَّدِيدُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ. رواه الثلاثة[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەیە ئازا نییە کە پاڵەوانی چاکەو کەس لە زۆرانبازیدا دەرەقەتی نایەت، بەڵام ئازاو دلێر ئەو کەسەیە کە لەکاتی تووڕەییدا خۆی پێ دەگیرێ و ڕقی خۆی دەخواتەوە! (ش/د).

---

[1] تجريد = مختصر صحيح البخاري/٥ ل/٢١٩ رقم/١٩٤٨ = ٦١١٤. مسلم. بر وصلة (أدب): ٦٥٨٦. تحفة/١٣٢٣٨.

٤٨٣٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا تَعُدُّونَ الرَّقُوبَ فِيكُمْ؟ قُلْنَا: الَّذِي لاَ يُولَدُ لَهُ. قَالَ: لَيْسَ ذَاكَ بِالرَّقُوبِ وَلَكِنَّهُ الرَّجُلُ الَّذِي لَمْ يُقَدِّمْ مِنْ وَلَدِهِ شَيْئًا، قَالَ: فَمَا تَعُدُّونَ الصُّرَعَةَ فِيكُمْ؟ قُلْنَا: الَّذِي لاَ يَصْرَعُهُ الرِّجَالُ. قَالَ: لَيْسَ بِذَلِكَ وَلَكِنَّهُ الَّذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الْغَضَبِ رواه مسلم وأبو داود[٢]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێوە لەناو خۆتاندا کێ بەوەجاخ کوێر دادەنێن؟. گوتمان: ئەوەی منداڵی نابێ، فەرمووی: ئەوە وەجاخ کوێر نییە، بەڵام ئەو پیاوە وەجاخ کوێرە کە کەس لە منداڵەکانی لەپێش خۆیدا نامرن، فەرمووشی: ئەی کێ بە پاڵەوانوئازاو زۆرانباز دادەنێن؟. عەرزمان کرد: ئەو کەسەی کەس نەیدا بە زەویداو دەرەقەتی نەیێ! فەرمووی: ئەمیش ئەوە نییە، بەڵام پاڵەوان ئەوەیە کە لەکاتی ڕق هەستانو تووڕە بووندا خۆی پێ ڕادەگیرێو ڕقی خۆی دەخواتەوە (م/د).

٤٨٣٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمَّا صَوَّرَ اللَّهُ آدَمَ فِي الْجَنَّةِ تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَتْرُكَهُ فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ يَنْظُرُ مَا هُوَ فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقًا لاَ يَتَمَالَكُ. رواه مسلم[٣]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کاتێ خودا لە بەهەشتا وێنەی ئادەمی کێشا، چەندە خودا ئارەزووی لێ بوو ئەوەندە هێشتیەوە، جا شەیتان دەستی کرد بە چەرخە کردنو گڕخواردن بە دەوریداو هەر سەرنجیدەدا تا تەماشای کرد کە هڵوڵەو ناوسکی چۆڵە، ئیتر زانی بۆشو کلۆرەو وا دروست کراوە خۆی پێ ناگیرێ!(م).

٤٨٣٦- عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَظَمَ غَيْظًا - وَهُوَ قَادِرٌ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ - دَعَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رُءُوسِ الْخَلاَئِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُخَيِّرَهُ اللَّهُ مِنَ الْحُورِ مَا شَاءَ. رواه أبو داود والترمذي[٤]:

---

[٢] مسلم. بر وصلة (ادب): ٦٥٨٤.

[٣] مسلم. بر وصلة (ادب): ٦٥٩٢.

سەهلی کوڕی موعاز (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەو کەسەی بتوانێ رقی خۆی بە یەکێ بڕێژێ بەڵام رقەکەی بخواتەوەو پێی نەرێژێ، ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا (لەبەر چاوی ئەو هەموو عەشاماتە) دەستی ڕێزی لێ دەنێ و بانگی دەکاو دەیکا بەسەر پشك کە بە ئارەزووی‌خۆی لە حۆری و پەریە چاو جوانەکانی بەهەشت هەڵبژێرێ بۆ خۆی! (د/ت– س/ح).

٤٨٣٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: عَلِّمْنِي شَيْئًا وَلاَ تُكْثِرْ عَلَيَّ لَعَلِّي أَعِيهِ. قَالَ: لاَ تَغْضَبْ. فَرَدَّدَ ذَلِكَ مِرَارًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ تَغْضَبْ.رواه الترمذي والبخاري واحمد[٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: شتێکی وام فێربکە کە تێی بگەم بەڵام زۆرنا! فەرمووی پێی: تووڕە مەبە، جا پیاوەکە چەند جارێ ئەم قسەیەی دووبارە کردەوەو پێی دەگوت: شتێکم فێربکە بەڵام زۆرنا با تێی بگەم، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) هەر بەمە وەڵامی دەدایەوەو دەیفەرموو: تووڕە مەبە! (ت/ب/ئەحمەد).

٤٨٣٨– ـه (ب – ١ ز – ١٠ ل – ٦٣ ف – ٥) + (ب – ٤ ز – ٩٠ ل – ٢٧٦ ف – ١٨) [٦].

٤٨٣٩– وَعَنْهُمَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا بَلَغَهُ عَنِ الرَّجُلِ الشَّيْءُ لَمْ يَقُلْ مَا بَالُ فُلاَنٍ يَقُولُ وَلَكِنْ يَقُولُ: مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَقُولُونَ كَذَا وَكَذَاز رواه أبو داود. نسأل الله الحلم ومكارم الاخلاق آمين[٧]:

---

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٥] تجريد/مختصر صحيح البخاري/٥ ل/٢٢٠ رقم/١٩٤٩ = ٦١١٦.

[٦] تقدم في مجلد أول. تسلسل/١٠ ل/٦٣ رقم/٨٠.

[٧] سكت عن درجته الشارح.

**دیسان عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **وابوو کاتێ شتێکی لەبارەی پیاوێکەوە پێ بگەیشتایەتەوە نەیدەفەرموو بۆ ئەو پیاوە واوا دەڵێ: بەڵام دەیفەرموو: ئەوە بۆچی هەندێ کەس واوا دەڵێن! (د- خودای لێ ڕازی بێ).**

## ٣٠) باسی صەبرو ئارامو لێبوردنو بە حەوسەڵەییو ئازار کێشی ومنها الصبر والعفو وتحمل الأذى

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ - سورة الشورى - ٤٢/٤٢}.

**بەڕاستی کەسێ خاوەنی صەبرو ئارام بێو هەروەها خاوەنی لێبووردنو چاو پۆشی بێ، دوو صیفەتی گەورەی نایابی بۆ خۆی مسۆگەر کردووە، کە ئەو صیفەتانەو وێنەی ئەو صیفەتانە لە شەریعەتدا زۆر پەسەندو گەلێ نایابن.**

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: { إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ - سورة الزمر - ١٠/٣٩}.

**واتە: ئەوانەی بە پشوونو صەبرو ئارام دەگرن لەسەر فەرمانبەریی خوداو لە ژێر باری خودادا، بەڕاستی پاداشتی بێ شومار کە لە کێشانەو پێوانە نەیە بۆ ئەوانەیە.**

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة السجدة - ٢٣/٣٢}:

**واتە: نەوەی ئیسرائیل هەتا خاوەنی حەوسەڵەو صەبر بوون، چەندین پێشەوای سەر مەشقی گەورە گەورەمان لەناویانا هەڵخست، بە فەرمانی خۆمان ڕێگەی ڕاستی دینو شەریعەتیان بەو خەڵکە نیشان دەداو ڕێنموونی یان دەکردن، لەهەمان کاتدا باوەڕی تەواویان بە فەرمایشتی نامەکانی خودا هەبوو.**

٤٨٤٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: مَا أَحَدٌ أَصْبَرَ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ مِنَ اللّهِ عَزَّ وَجَلَّ يَدْعُونَ لَهُ وَلَداً وَيُعَافِيهِمْ ويرزقُهُمْ. رواه الشيخان[1]:

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: کەس نییە کە ئاوا وەك خودای گەورە بە ئارامو بە حەوسەڵە بێ، لەسەر ئەو ئازارەی کە بۆ خۆی دەیبیسێ ئەوەتانێ بتپەرستەکان بڕیاری هاوتاو منداڵی بۆ دەدەنو دەڵێن: خودا منداڵی هەیە، خودا شەریكو هاوبەشی هەیە کەچی لەگەڵ ئەم ناماقوولییەدا خودا رزقو ڕۆژییان دەداو ساغڵەمیان دەکا! (ش).

٤٨٤١- ← (ب – ٨ ز- ٦٥ ل- ١٥٦ ف – ٣) [2].

٤٨٤٢- ← (ب – ٢ ز- ٢٠ ل- ٤٨ ف – ١) [3].

٤٨٤٣- وَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): الْمُسْلِمَ إِذَا كَانَ مُخَالِطًا النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنَ الْمُسْلِمِ الَّذِي لاَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَلاَ يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ. رواه الترمذي[4]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەو موسوڵمانەی تێکەڵیی خەڵکی بکاو لەهەمان کاتدا چاو بقووچێنێ لە هەڵەو ئێشو ئازاریانو بە حەوسەڵەبێ لە گەڵیاندا گەلێ لەو موسوڵمانە باشترە کە تێکەڵییان نەکاو چاوپۆشی لە هەڵەو ئێشو ئازاریان نەکا (ت- رەزای خودای لێ بێ).

٤٨٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ وَمَا زَادَ اللّهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلاَّ عِزًّا وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلّهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللّهُ. رواه مسلم والترمذي[5]:

---

[1] تجريد/٥ ل/٢١٩ رقم/١٩٤٧ = ٦٠٩٩، ٧٣٧٨. مسلم. صفات المنافقين: ٧٠١١. تحفة/٧٠١١.

[2] تقدم في مجلد ثامن. تسلسل/٦٥ ل/١٥٦ ط/١.

[3] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/٢٠ ل/٤٨ ط/١ رقم/١٢٦٠.

[4] سكت عن درجته الشارح.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەگێڕێتەوە: دەفەرموێ: ماڵ بە بەخشین و خێرکردن کەم ناکا، بەندەیش (بە چاو پۆشی و لێبووردن) خودا زیاتر پلەو پایەی بەرزەوە دەکا، هەر کەسێکیش ساخ لەبەر ڕەزای خودا خاکی و بێ هەوا بێ و خۆی بەکەم بگرێ مسۆگەر کە خودا زیاتر پایە بەرزی دەکا (م/ت).

٤٨٤٥- وَعَنْهُ اَنَّ رَجُلاً كَانَ يسب أبا بكر (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) بحضرة النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَصْحَابُهُ فَصَمَتَ عنه أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ آذَاهُ الثَّانِيَةَ فَصَمَتَ عَنْهُ أَبُو بَكْرٍ ثُمَّ آذَاهُ الثَّالِثَةَ فَانْتَصَرَ مِنْهُ أَبُو بَكْرٍ فَقَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَوَجَدْتَ عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَقَالَ: نَزَلَ مَلَكٌ مِنَ السَّمَاءِ يُكَذِّبُهُ بِمَا قَالَ لَكَ فَلَمَّا انْتَصَرْتَ وَقَعَ الشَّيْطَانُ فَلَمْ أَكُنْ لأَجْلِسَ إِذْ وَقَعَ الشَّيْطَانُ. رواه ابو داود. والله أعلم[٦].

دیسان فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەرو یارانیدا جارێ پیاوێ جنێوی بە ئەبو بەکردا، ئەبو بەکر (خودای لێ ڕازی بێ) لە جاری یەکەم و دووەمدا قسەی نەکرد، بەڵام لەسەری جاری سێیەمدا وەڵامی جنێوەکەی دایەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) هەستا کە بڕەوات، ئەبو بەکریش (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ لەوە لەمن دڵگیر نەبووی کە وەڵامم دایەوە؟ فەرمووی: لە ئاسمانەوە فریشتەیێ هاتە خوارەوە ئەو قسانەی بەدرۆ دەخستەوە کە ئەو بەتۆی دەگوتن، بەڵام کەتۆ وەڵامی جنێوەکەیت دایەوە ئیتر فریشتەکە فڕی و شەیتان داباری، بۆ منیش ناشێ لە جێگەیێ دانیشم کە شەیتانی لێ بێ! (د- س/ص).

---

[٥] مسلم. بر وصلة (أدب)؛ ٦٥٣٥. تحفة الأشراف/١٤٠٠٢. رياض/٢ تسلسل/٦٠ رقم/٥٥٦/١٣ ل/١١٢.

[٦] رواه أبو داود بسند صحيح (شرحه).

## ٣١) چارەی ڕق هەڵسان: (دواء الغضب)

٤٨٤٥م- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنَ صُرَدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَبَّ رَجُلاَنِ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَعَلَ أَحَدُهُمَا تَحْمَرُّ عَيْنَاهُ وَتَنْتَفِخُ أَوْدَاجُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي لأَعْرِفُ كَلِمَةً لَوْ قَالَهَا هَذَا لَذَهَبَ عَنْهُ الَّذِي يَجِدُ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ. فَقَالَ الرَّجُلُ هَلْ تَرَى بِي مِنْ جُنُونٍ. رواه الأربعة[1]:

**سولەیمانی کوڕی صورەد (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: لە خزمەتی حەزرەتدا (درودی خودای لەسەر بێ) بووین، دوو پیاو بوو بەشەڕە جنێویان، یەکێکیان چاوی سوور هەڵگەڕاو ڕەگی لاملی هەڵسا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من وشەیێ دەزانم ئەگەر ئەم کابرایە بیڵێ ڕقەکەی دەنیشێتەوە، ئەو فەرموودەیە ئەمەیە: {أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ}: پەنا دەگرم بەخودا لە شەڕی شەیتانی دوور لە ڕەحمەتی خودا، کەچی کە ئەم فەرمایشتەی حەزرەتیان بەکابرا گوت، کابرا گوتی: بۆ لە تۆوایە من شێت بووم (ش/د/ت).**

٤٨٤٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَنَا: إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قَائِمٌ فَلْيَجْلِسْ فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ وَإِلاَّ فَلْيَضْطَجِعْ. رواه ابو داود وأحمد[2]:

**ئەبو زەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێمان: ئەگەر کەسێکتان ڕقی هەڵسا ئەگەر بە پێوە بوو با دانیشێت، جا ئەگەر ڕقەکەی دامردەوە باشە دەنا با ڕاکشێ (د- ڕەزای خودای لێ بێ).**

٤٨٤٧- عَنْ عَطِيَّةَ السَّعْدِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ الْغَضَبَ مِنَ الشَّيْطَانِ وَإِنَّ الشَّيْطَانَ خُلِقَ مِنَ النَّارِ وَإِنَّمَا تُطْفَأُ النَّارُ بِالْمَاءِ فَإِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَتَوَضَّأْ. رواه أبو داودز نسأل الله التوفيق[3]:

---

[1] تجريد/٣ ل/٤٥٢ رقم/١٣٢٥ = ٣٢٨٢، ٦٠٤٨، ٦١١٥. مسلم. بر وصلة/٦٥٨٩. أبوداود. أدب: ٤٧٨١. تحفة/٤٥٦٦.

[2] سكت عنه الشارح.

عەطییەی ئەل- سەعدی (خودای لێ رازی بێ) فەرموی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: تووڕەیی لە شەیتانەوەیەو، شەیتانیش لە ئاگر دروست کراوەو، ئاگریش بەئاو دەکوژێتەوە، جا کاتی کەسێکتان رقی هەستاو تووڕە بوو با دەست نوێژ بگرێ! (د- س/صالح).

## ٣٢) باسی یاریدەدانی موسوڵمان و داپۆشینی عەیبەو سڕی و لەسەر کردنەوەی بەهەق : (ومنها نصر المسلم وستره والذب عنه)

٤٨٤٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَلِيَنْصُرِ الرَّجُلُ أَخَاهُ ظَالِماً أَوْ مَظْلُوماً ، فَإِنْ كَانَ ظَالِماً فَلْيَنْهَهُ فَإِنَّهُ لَهُ نُصْرَةٌ ، وَإِنْ كَانَ مَظْلُوماً فَلْيَنْصُرْهُ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: دەشێ پیاو لە هەموو حاڵێکدا یاریدەی برای موسوڵمانی خۆی بدا، خوا زاڵم و ستەمکار بێ، خوا مەزڵووم و ستەمباربێ! واتە: ئەگەر زاڵم و زۆرداربوو نەیهێڵێ کە زۆرو ستەمەکە بکا، بەمەعنا یاریدەی دەدا، خۆ ئەگەر مەزڵووم و زۆر لێکراویش بوو ئەوە دەبێ یاریدەی بداو زوڵم و زۆرەکەی لە کۆڵ بخا (ش/ت).

٤٨٤٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ رَأَى عَوْرَةً فَسَتَرَهَا كَانَ كَمَنْ أَحْيَا مَوْءُودَةً. رواه أبو داود والنسائي[2]:

عوقبەی کوڕی عایر (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لەشی رووتێ بپۆشێ، یا شەرم و عەیب و سڕی کەسێ بپۆشێ بەقەی ئەو کەسە خێری دەگا کە کچێکی زیندە بەچاڵ لە گۆڕ دەربێنێ و لەسەر ئەو حاڵە لە مردن رزگاری بکا (د/ن- رەزای خودایان لێ بێ).

---

[٣] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[١] تجريد/٣ ل/١٥٤ رقم/١٠٦٠ = ٢٤٤٤، ٢٤٤٣، ٦٩٥٢.

[٢] سكت عن درجته الشارح.

٤٨٥٠- عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ حَمَى مُؤْمِنًا مِنْ مُنَافِقٍ ». أُرَاهُ قَالَ « بَعَثَ اللَّهُ مَلَكًا يَحْمِي لَحْمَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ وَمَنْ رَمَى مُسْلِمًا بِشَيْءٍ يُرِيدُ شَيْنَهُ بِهِ حَبَسَهُ اللَّهُ عَلَى جِسْرِ جَهَنَّمَ حَتَّى يَخْرُجَ مِمَّا قَالَ[٣]:

**موعازی کوڕی ئەنەسی جوهەنی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر کەسێ موسوڵمانێ لە زمانی بەد گۆیێ بپارێزێ لە ڕۆژی قیامەتدا خودا فریشتەیێ دەنێرێ لەشی لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ. هەر کەسێ درۆیێ هەڵبەستێ بۆ موسوڵمانێ وە مەبەستی ئەوە بێ کە ئەو موسوڵمانەی پێ زەدەدارو شکست بکا، لە ڕۆژی قیامەتدا خودا لەسەر پردەکەی سەر پشتی جەهەننەم ڕایدەگرێ هەتا لە ئۆباڵی ئەو قسەیەی دەردەچێ! (د- س/صالح).**

٤٨٥١- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنِ امْرِئٍ يَخْذُلُ امْرَأً مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ تُنْتَهَكُ فِيهِ حُرْمَتُهُ وَيُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ إِلاَّ خَذَلَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ فِيهِ نُصْرَتَهُ وَمَا مِنِ امْرِئٍ يَنْصُرُ مُسْلِمًا فِي مَوْضِعٍ يُنْتَقَصُ فِيهِ مِنْ عِرْضِهِ وَيُنْتَهَكُ فِيهِ مِنْ حُرْمَتِهِ إِلاَّ نَصَرَهُ اللَّهُ فِي مَوْطِنٍ يُحِبُّ نُصْرَتَهُ. رواهما أبو داود[٤]:

**جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: موسوڵمانێ ئەگەر دی وا موسوڵمانێ لەسەر شتێ، کەسێ دەیەوێ سووکی بکا و ئابرووی ببا دەبێ لەسەری بکاتەوەو پشتی بگرێ، دەنا خودایش لەسەر ئەو ناکاتەوەو پشتی ناگرێ، بەتایبەتی لەو کاتە ناسکانەدا کە پڕ بەدڵ حەز دەکا خودا یارمەتی بدا، بەڵام ئەگەر لەکاتی وادا لەسەری بکاتەوەو پشتی بگرێ و نەهێڵێ ناموسی بچێ ئەوا خودایش لەکاتی تەنگانەدا، لەهەردوو جیهاندا، فریای ئو دەکەوێ! (د- س/صالح).**

---

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٤] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

٤٨٥٢- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ رَدَّ اللَّهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه الترمذي واحمد[٥]:

**ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کەسێ پاسی ناموسی برای ئایینی خۆی بکاو بەر پەرچی ئەوانە بداتەوە کە لەپاش ملە بە خراپە باسی دەکەن، لە ڕۆژی قیامەتدا خودا لە ئاگری دۆزەخ تەواو دووری دەخاتەوە (ت/ ئەحمەد).**

٤٨٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ يَكُفُّ عَلَيْهِ ضَيْعَتَهُ وَيَحُوطُهُ مِنْ وَرَائِهِ. رواه ابو داود والترمذي ولفظه: إِنَّ أَحَدَكُمْ مِرْآةُ أَخِيهِ فَإِنْ رَأَى بِهِ أَذًى فَلْيُمِطْهُ عَنْهُ[٦]:

**ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): موسوڵمان ئاوێنەی موسوڵمانەو، دەبێ ئاوبەناو پرسیاری لێ بکا، نەبادا هەڵەیەکی هەبی‌و خۆی هەستی پێ نەکا، هەتا ئەو وەك ئاوێنە هەڵەکەیی بۆ دەربخا، موسوڵمان برای موسوڵمانە، دەشێ پاسی سەرو ماڵی برای موسوڵمانی خۆی بکاو لەڕوو و لەپاش ملەیش پشتی بگرێ‌و لەسەری بکاتەوە (د-س/صالح-ت) گفتەی (ت): هەموو یەکێ لە ئێوە ئاوێنەی برای موسوڵمانیەتی، جا ئەگەر چڵکێ، یا ئازارێکی پێوە دی با لێی بکاتەوە!**

## ٣٣) گەورەیی تکاکاری (شەفاعەت) : (ومنها الشفاعة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {مَّن يَشْفَعْ شَفَاعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُ نَصِيبٌ مِّنْهَا وَمَن يَشْفَعْ شَفَاعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُ كِفْلٌ مِّنْهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ مُّقِيتًا - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة النساء - ٤/٨٥}.

---

[٥] سكت عنه الشارح.

[٦] رواه أبوداود بسند صالح.

واتـە: هـەر کەسـێ بـەپێی شـەرع تکـا لـە کەسـێ بکـاو کـارێکی ڕەوای موسوڵمانێکی پی ڕایی بکا، ئەوە خودا پێی خۆشەو لەباتی ئەوە تۆڵەی چاکی بۆ دەکاتەوە، هەروەها هەر کەسێ بە ناڕەوا تکایێ لە کەسێ بکاو ناهەقییەکی پێ بکا بەهەق ئەوە ئەویش هاوبەشە لە تاوانی ئەو ناڕەواییەدا، لە ڕاستیدا خودای گەورە ئاگای لەهەموو شتێ هەیەو دەستەڵاتی بەسەریدا دەڕوا.

٤٨٥٤- حەدیثی (المؤمن للمؤمن کالبنیان) لە پێشەوە ڕابوورد لەسەر باسی (الرحمة واجبة لخلق الله) [١].

٤٨٥٥- عَنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا فَإِنِّي لأُرِيدُ الأَمْرَ فَأُؤَخِّرُهُ كَيْمَا تَشْفَعُوا فَتُؤْجَرُوا فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا. رواه أبو داود والنسائي[٢]:

موعاوییە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: تکای باش بۆ شایستەکان بکەن، پاداشی باشی لەسەر وەردەگرن، من بەش بەحاڵی خۆم گەلێ جار وادەبێ دەمەوێ کارێ ئەنجام بدەم، بەڵام هەندێ دوای دەخەم تاکوو ئێوە بێن تکام لەلا بکەن لەو بارەیەوە، سا بەشکوو پاداشی باشتان دەست بکەوێ! چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: تکای ڕەوا بکەن پاداشی باشی لەسەر وەردەگرن! (د/ن- ڕەزای خودایان لێ بێ).

## ٣٤) باسی ڕاستگۆیی : (ومنها الصدق)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ - سورة التوبة - ٩/١١٩}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! ترسی خوداتان هەبێ، تەقوای خودا بکەن، خۆتان بپارێزن لەبێ فەرمانی ئەو خودا مەزنە، وە هەوو کاتێ بەدەم و بەدڵ لەگەڵ پیاو ڕاستاندا بن.

---

[١] تقدم في مجلد التاسع تسلسل/٩ رقم/٤٧٢٠.

[٢] سكت عن درجته الشارح.

٤٨٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ صِدِّيقًا وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللَّهِ كَذَّابًا. رواه الأربعة[١]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە ڕاستی ڕەحمەت دەبارێ، هەمیشە ڕاستی بکەن بە پیشە، چونکە ڕاستی ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی چاکە، کردەوەی چاکەیش ئادەمیزاد دەخاتە سەر ڕێگەی بەهەشت! پیاوی وا هەیەئەوەندە ڕاستگۆیەو ئەوەندە سۆراخی ڕاستی دەکاو ئەوەندە عەودالی ڕاستییە هەتا لەلای خودا بە پیاوی ڕاستو ڕاستاڵ لە قەڵەم دەدرێو لە دیوانی خوادا ناوی بە ڕاستگۆو ڕاستاڵ دەنووسرێ، وە نەکەن درۆبکەن، چونکە درۆ پیاو دەخاتە سەر ڕێگەی ئاگری دۆزەخ، پیاوی وا هەیە ئەوەندە زۆر درۆ ەکاو ئەوەندە منەیی درۆ دەکا هەتا لەلای خودا بە درۆزن دەنووسرێ. (ش/د/ت- ڕەزای خودایان لێ بێ).

٤٨٥٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْمَعَارِيضِ لَمَنْدُوحَةً عَنِ الْكَذِبِ. رواه ابن عدي والبيهقي بسند حسن[٢]:

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: مرۆڤ دەتوانێ بە پێچو پەنا بە قسەی بەمەعنا خۆی لە درۆ بپەرێنێتەوە. (ئیبنو عەدیو بەیهەقی ئەم فەرموودەیەیان بە ڕشتەیەکی شیرین گێڕاوەتەوە).

---

[١] تجريد/٥ ل/٢١٨ رقم/١٩٤٦ = ٦٠٩٤. تحفة/٩٣٠١. مسلم. بر وصلة/٦٥٨٠، ٦٥٨١، ٦٥٨٢. أبوداود. أدب: ٤٩٨٩. ترمذي. بروصلة: ١٩٧١.

[٢] بسند حسن.

واتە: مرۆڤ دەتوانێ قسەیێ بکا دوو واتا هەڵبگرێ، یەکێ نزیك، یەکێ دوور، بەدیمەن مەبەستی نزیکەکەیان بێ، بەڵام شوێنەونێ بکاو لە دڵەوە مەبەستی دوورەکەیان بێ. وەك ئەوە تۆبەدیمەن بەم شیعرانەی دواوە، دووعای شیرین بوونو بەرزەوە بوون بۆ ئاغایێ بکەی کە ستەم گەربێ، وەلێ لە دڵەوە مەبەستت نزای شەڕبێ و لە خودا داوا بکەی کە وەك گوڵی بەهار تەمەنی کورت بێ و بە مردنی خودا نەمرێ و بەزوویی لە سێدارە بدرێ و بەپێی خۆی بچێتە سەر داری قەنارەو مژدەی کوشتنی بەهەموو لایەکا بڵاو ببێتەوە. دەڵێن: لیت للزهور عمر النسور: خۆزگا گوڵ بەقەد هەڵۆ تەمەنی درێژ دەبوو. وا مەشهورە کە حەزرەتی عیسا (دروودی خودای لەسەر بێ) و ئیمامی شافیعی (خودای لێ ڕازی بێ) و گەلێ لە زاناکان ئەم جۆرە قسەی دوو مەعنا دارەیەیان بەکار هێناوە، جارێ حەججاج بە صەحابەیێ دەڵێ: رات چۆنە دەربارەی من؟ صەحابەکە پێی دەفەرموێ: أنت القاسط العادل! خەڵکەکە گوتیان: وا پەسنی جوانی کردی، گوتی: نەء، مەبەستی لەم قسەیەو لە وشەی (القاسط) ئەوە نییە کە من عادلو بەدادم وەك ئێوە تێی دەگەن، مەبەستی ئاماژەیە بۆ مەعنای (القاسطون) لەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ:

{وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا – سورة جين – ١٥/٨٢}.

واتە: کۆمەڵەی لە ڕێگە دەرچووەکان دەبن بەگزرەداری سووتەمەنی نێو دۆزەخ. ئەمەیش شیعرەکانە کە بەدیمەن پەسنی صەدامەو لەدڵەوە نزای شەڕە لێ ی:

ئاغا! خوا بتکا بە گوڵی بەهار

بەزوویی ببیە سەروەری سەردار[⊗]

---

[⊗] دروستە گوڵ بە گول بنووسرێ، ئەویش جۆرێکی ترە. (وەرگێڕ)

**نـــاوو شـــۆرەتت بـــڕوا شـــارەو شـــار**

**دووربـــی لـــە مـــردن، نـــەبی دەردە دار**⊕

(وەرگێڕ) - ١٩٩١/١٠/١

## ٣٥) سوعبەت دروستە : (يجوز المزاح)

**٤٨٥٨- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ احْمِلْنِي. فَقَالَ إِنَّا حَامِلُوكَ عَلَى وَلَدِ نَاقَةٍ. قَالَ: وَمَا أَصْنَعُ بِوَلَدِ النَّاقَةِ فَقَالَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَهَلْ تَلِدُ الإِبِلَ إِلاَّ النُّوقُ**[1]:

**ئەنەس** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ولاخێکی سواریم بدەرێ کە پێم لە زەوی بـبڕێ، فـەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ)**: بەچـکە وشـترێکت دەدەمـێ بـۆ خـۆت سـواری بـە! کـابرا گـوتی: جاچـی لـە بەچـکە حوشـتر بکـەم! لـەکوێ بەچـکەی حوشـتر بەکـەڵکی سـواری دێ! پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) **فـەرمووی: بۆچـی هـەموو حوشترێ لـە بنەڕەتـدا بەچکەی حوشـتر نییـە! ئـەی بەچکەی چییە! (د/ت- س/ص).**

---

⊕ سوبحانەڵڵا، لەبەرەکەتی ئەم تاجە پیرۆزە، ئەم دووعایە لەصەدام گیرابوو، وەلەشیعرەکانا چۆن گوتراوە، ئاوا بەچاوی خۆمان دیمان.. (بەتەمەن کورتی، بەپێی خۆی برایە بەرداری قەنارەو ملی کرا بەپەتی سێدارەوەو، مژدەی لەسێدارەدانی بەهەمموولایەکا بلاو بۆوە). دووعا ئەگەر لەکاتو شوێنی خۆیدا بکرێ ڕەت بوونەوەی نییە وەهەر لەم شوێنە پیرۆزەدا ئەم نزایەش دەکەم، بەئومێدی گیرابوونی: (خوایە! ئەو مارە سڕانەی کەئێستا لەبەغداو لەکەرکوك، چاوڕێی ئەوەن کەسڕیی لەشیان دەرچێو پەلاماری ئەم کوردە کەساسە بێ کەسەبدەنو وەك کوڵەوەیباب پێوەی بدەن، خودایە! هەتا دی باشترو زیاتر سڕیان بکەی، جارێ تر کورد نەخەیتەوە ژێر چەپۆڵەی ئەو مارە سڕانە). ئامین. وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٨/١٢

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٤٨٥٩- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا ذَا الأُذُنَيْنِ. رواهما أبو داود والترمذي[٢]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو پێم: ئەی خاوەنی دوو گوێ! (د/ت- س/ص).

٤٨٦٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْخُلُ عَلَيْنَا وَلِي أَخٌ صَغِيرٌ يُكْنَى أَبَا عُمَيْرٍ وَكَانَ لَهُ نُغَرٌ يَلْعَبُ بِهِ فَمَاتَ فَدَخَلَ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَآهُ حَزِينًا فَقَالَ: مَا شَأْنُهُ. قَالُوا: مَاتَ نُغَرُهُ، فَقَالَ: يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ. رواه الأربعة[٣]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لە ئێمە جیا نەدەکردەوە، تەواو تێکەڵاوی دەکردین، ئەوەندە بێ دەمارو بێ فیزو دەعیە بوو گاڵتەو سوعبەتی لەگەڵمان دەکرد، تەنانەت برایەکی بچکۆلەم هەبوو، کە ناوی ئەبو عومەیر بوو، پێیان دەگوت باوکی عومەیر، کێشکەیەکی هەبوو گەمەی پێی دەکرد، ڕۆژێ کێشکەکە مرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆ ماڵمان، تەماشای کرد ئەبو عومەیر خەمبارە، فەرمووی: ئەوە چییەتی؟ عەرزیان کرد: مەلیچکەکەی مردووە! فەرمووی: ئەی باوکی عومەیر! مەلیچکەکەت چی بەسەر هات! (ش/د/ت).

٤٨٦١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا. قَالَ: إِنِّي لاَ أَقُولُ إِلاَّ حَقًّا. رواه الترمذي[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا! جاروبار تۆ گاڵتەو سوعبەتمان لەگەڵ دەکەی. فەرمووی: ئەمە ڕاستە، بەلام من لەهەموو حاڵێکا ئەوەی ڕاستو دروست نەبێ بەدەما نایێ (ت- س/ص).

---

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[٣] تجريد/٥ ل/٢٢١ رقم/١٩٥٢ = ٦١٢٩، ٦٢٠٣. مسلم. آداب: ٥٥٨٧. أبوداود. ادب. ٤٩٦٤. ترمذي. أدب: ٢٨٣١. تحفة الأشراف: ٥١٤.

[٤] بسند صحيح (شرحه).

## ٣٦) باسی پەیمان بەجێ هێنان : (ومنها الوفاء بالوعد)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا - سورة مريم - ١٩/٥٤}.

واتە: وە باس و یادی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیم لە قورئاندا بکە، هەتا موسوڵمانان ڕەفتارە جوانەکانی بکەن بەسەر مەشق، بەڕاستی پیاوێکی خاوەن پەیمان و پەیمان ڕاست و وەعدە بەجێ هاوەر بوو، هەروەها فروستادەی خودا بوو، وەخاوەنی پایەی پێغەمبەری بوو.

٤٨٦٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي الْحَمْسَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَايَعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِبَيْعٍ قَبْلَ أَنْ يُبْعَثَ وَبَقِيَتْ لَهُ بَقِيَّةٌ فَوَعَدْتُهُ أَنْ آتِيَهُ بِهَا فِي مَكَانِهِ فَنَسِيتُ ثُمَّ ذَكَرْتُ بَعْدَ ثَلَاثٍ فَجِئْتُ فَإِذَا هُوَ فِي مَكَانِهِ فَقَالَ: يَا فَتَى لَقَدْ شَقَقْتَ عَلَيَّ أَنَا هَا هُنَا مُنْذُ ثَلَاثٍ أَنْتَظِرُكَ. رواه أبو داود[1]:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبولحەمساء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەپێش ئەوەدا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بکرێ بە پێغەمبەر شتێکم لێی کڕی، هەندێ لە بەهاکەی مابوو لەسەرم، بەڵێنم دایە کە بۆی ببەم بۆ ئەو شوێنەی، بەڵام لە یادم چوو، لەپاش سێ شەو بیرم کەوتەوە، کە چووم حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لەوێ بوو، فەرمووی: ئەی کوڕی لاو! بەڕاستی تووشی سەخڵەتی و زەحمەتت کردم، ئەمە سێ شەوە من لێرە چاوەڕوانت دەکەم. (د- س/صالح).

٤٨٦٣- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا وَعَدَ الرَّجُلُ أَخَاهُ - وَمِنْ نِيَّتِهِ أَنْ يَفِيَ لَهُ - فَلَمْ يَفِ وَلَمْ يَجِئْ لِلْمِيعَادِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ. رواه أبو داود والترمذي[2]:

زەیدی کوڕی ئەرقەم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەگەر پیاوێ بەڵێنێکی دا بە برادەرێکی خۆی و لە دڵەوە

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

[2] بسند صالح (شرحه).

نیازی وابوو کە بەجێی بێنێ بەڵام لەکاتی خۆیا لەبەر بەهانەیەکی ڕەوا بۆی جێبەجێ نەکرا ئەوە گوناهی ناگا! (د/ت – س/صالح).

٣٧) باسی نەرمو نیانیو هێمنیو شێنەیی : (ومنه الرفق والتاني)

٤٨٦٤– عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا عَائِشَةُ: إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ وَمَا لاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ. رواه الأربعة[1]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی عائیشە! خودا بۆ خۆی نەرمو نیانەو لەهەموو شتێکا نەرمو نیانیی پێ خۆشە ئەو پاداشو خەڵاتو بەخششەی خودا دەیدا بە بەندەی خۆی لە پاداشی نەرمونیانی دا لەسەر هیچی تر پاداشی وا باشی ناداتێ، نە لە پاداشی توندو تیژیداو نە لە پاداشی هیچی تردا! (ش/د/ت).

٤٨٦٥– وَعَنْهَا سُئِلَتْ عَنِ الْبَدَاوَةِ فَقَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَبْدُو إِلَى هَذِهِ التِّلاَعِ، وَإِنَّهُ أَرَادَ الْبَدَاوَةَ مَرَّةً فَأَرْسَلَ إِلَيَّ نَاقَةً مُحَرَّمَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ فَقَالَ لِي: يَا عَائِشَةُ ارْفُقِي فَإِنَّ الرِّفْقَ لَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ زَانَهُ وَلاَ نُزِعَ مِنْ شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ شَانَهُ. رواه أبو داود ومسلم[2]:

لە بابەت چوون بۆ سەیرانو دەرچوون بۆ هەوار لە دەشتو دەر، پرسیار کرا لە عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ سەیرانو هەوار هەڵدان جاروبار دەرۆیشتە سەر ئەم سەرچاوە بەرزانە. جارێ ویستی بچێ بۆ سەیران وشترێکی تۆری نەگیراوی بۆ من نارد، لە وشتری زەکات، پێی فەرمووم: ئەی عائیشە! بە نەرمی بجووڵێرەوە

---

[1] تجرید/٥ ل/٢١١ رقم/١٩٣٢ = ٦٠٣٤ + رقم/١٣٠٥ = ٢٩٣٥ فتح الباري شرح صحيح البخاري. مسلم. سلام: ٥٦٢١.

[2] رياض الصالحين/٢ تسلسل/٧٤ رقم/٦٣٥/٤. مسلم. بر وصلة: ٦٥٤٥.

لەگەڵیا، چونکە نەرمی لەهەر شتێکا هەبێ جوانی دەکا، وە نەرمی لەهەر شتێکا نەبێ ناشیرینی دەکا (د/م).

٤٨٦٦- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ. رواه الترمذي وأبو داود ومسلم[٣]:

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بەشە نەرم‌و نیانیی خۆیی پێ درابێ ئەوە بەشە خێری خۆیی دەسگیر بووە، وەە هەرکەسێ لە بەشە نەرم‌و نیانیی خۆی بێ بەش بووبێ ئەوە لە بەشە خێری خۆی بێ بەشبووە! (ت/د/م).

٤٨٦٧- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِي اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: التُّؤَدَةُ فِي كُلِّ شَيْءٍ خَيْرٌ إِلاَّ فِي عَمَلِ الآخِرَةِ. رواه أبو داود والحاكم[٤]:

لە موصعەبی کوڕی سەعدەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە باوکیەوە، لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): شێنەیی و لەسەر خۆیی لەهەموو شتێکا باشە، مەگەر لە ئیش‌و کاری قیامەتدا لەودا دەست‌و برد باشە. (د/حاکم-(خودایان لێ ڕازی بێ- س/ص).

٤٨٦٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الأَنَاةُ مِنَ اللَّهِ وَالْعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ. رواه الترمذي والبيهقي. نسأل الله اللطف والرحمة آمين[٥]:

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: شێنەیی و هێواشی لە خوداوەیە، وە پەلە پەل‌و هەڵەشەیی لە شەیتانەوەیە (ت- سند غریب- بەیهەقی).

---

[٣] مسلم. بر وصلة: ٦٥٤٢.

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ٣٨) باسی شەرمو شکۆ : (ومنها الحياء)

٤٨٦٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْحَيَاءُ لاَ يَأْتِي إِلاَّ بِخَيْرٍ. فَقَالَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ: مَكْتُوبٌ فِي الْحِكْمَةِ إِنَّ مِنَ الْحَيَاءِ وَقَارًا ، وَإِنَّ مِنَ الْحَيَاءِ سَكِينَةً . فَقَالَ لَهُ عِمْرَانُ أُحَدِّثُكَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتُحَدِّثُنِي عَنْ صَحِيفَتِكَ. رواه الثلاثة[1]:

**عیمڕانی کوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: شەرمو حەیا هەر خێر دێنێ! بوشەیری کوڕی کەعبیش گوتی: لە کتێبەکانی حیکمەتیشدا نووسراوە: حەیاو شەرم سەرچاوەی سەلاریو مایەی ئارامییە! عیمڕانیش پێی گوت: من پێت دەڵێم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا دەفەرموێ، کەچی تۆ قسەی دەفتەرە شڕەکەی خۆتم بۆ دەکەی! (ش/د).**

٤٨٧٠- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا) مَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يُعَاتِبُ فِي الْحَيَاءِ يَقُولُ: إِنَّكَ لَتَسْتَحْيِي . حَتَّى كَأَنَّهُ يَقُولُ قَدْ أَضَرَّ بِكَ . فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): دَعْهُ فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيمَانِ. رواه الأربعة[2]:

**ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەلای پیاوێکا ڕەت بوو، برادەرێکی لەسەر شەرمنی گلەیی لێ دەکرد پێی دەگوت: تۆ زۆر شەرم دەکەی/ وەك ئاوای پی بڵێ وابوو: کە شەرم کردنی زۆر زیانی پێ گەیاندووی! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وازی لێ بێنە چونکە شەرمو حەیا بەشێکە لە باوەڕو ئیمان! (ش/د/ت).**

٤٨٧١- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلاَمِ النُّبُوَّةِ ، إِذَا لَمْ تَسْتَحِي فَافْعَلْ مَا شِئْتَ. رواه البخاري وأبو داود وأحمد[3]:

---

[1] تجريد/٥ ل/٢٢١ رقم/١٩٥١ = ٦١١٧، ٥٧٦٦، فتح الباري. مسلم. إيمان. ١٥٥. تحفة الأشراف: ١٠٨٧٧.

[2] {رياض/٢ ل/٢٠٠ رقم/٦٨١/١ – بوخاري/٢٤. مسلم/٣٦}. تجريد/١ رقم/٢٣ = ٢٣ فتح. مسلم. إيمان: ١٥٣.

[3] تجريد/٥ ل/٢٢٠ رقم/١٩٥٠ = ٩١٢٠ فتح.

ئەبو مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەر بێ): ئەو فەرمایشتە جوانەی کە دەفەرموێ: ئەگەر شەرم ناکەی چی دەکەی بیکە، لە فەرمایشتی پێغەمبەرە پێشینەکانە کە هەتا ئێستایش ماوەو دەماو دەم گەیشتۆتەوە بەم خەڵکە! (ب/د/ئەحمەد).

٤٨٧٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اسْتَحْيُوا مِنَ اللّٰهِ حَقَّ الْحَيَاءِ. قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّا لَنَسْتَحْيِي وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ. قَالَ: لَيْسَ ذَاكَ وَلَكِنَّ الِاسْتِحْيَاءَ مِنَ اللّٰهِ حَقَّ الْحَيَاءِ أَنْ تَحْفَظَ الرَّأْسَ وَمَا وَعَى وَتَحْفَظَ الْبَطْنَ وَمَا حَوَى وَتَتَذَكَّرَ الْمَوْتَ وَالْبِلَى وَمَنْ أَرَادَ الآخِرَةَ تَرَكَ زِينَةَ الدُّنْيَا فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدِ اسْتَحْيَا مِنَ اللّٰهِ حَقَّ الْحَيَاءِ. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[٤]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: شەرمو شکۆ لە خودا بکەن، شەرمو شکۆی ڕاستو دروست. ئێمەش عەرزیمان کرد: قوربان! سوپاس بۆ خودا لە سایەی خوداوە ئێمە بە شەرمینو شەرمو شکۆ دەکەین. فەرمووی: شەرم ئەوە نییە کە سەرکز کەیتو کەم ڕووبیتو بەس، وەك ئێوە تێی دەگەن، بەڵام شەرم کردنی بەڕاستی لە خودا ئەوەیە: کە سەر خۆیو دەزگاکانی، وەسك خۆیو دەزگاکانی لە حەرام بپارێزێ، وە هەمیشە مردن لەبەر چاوت بێو بیری ئەو ڕۆژەت بی کە دەڕزیو دەبی بەسوتوو! وە ئەو کەسەی کە ڕۆژی دوایی مەبەست بێ دەست بەرداری خۆشیو ڕابواردنی دنیا دەبێو دەربەستی خۆش گوزەرانی نییە، ئیتر ئەو کەسەی کە ئەمە بکا ئەوجا شەرمی بەڕاستی لە خودای خۆی دەکا! (ت/ ئە/حاکم). ئەو دەزگایانەی کەوان لەناو سەردا ئەم چوار ئەندامەن: چاوو گوێو لووتو زمان. مەبەستیش لە پاراستنی دەزگای سك لە حەرام ئەوەیە داوێنپاك بیو حەڵاڵ خۆربیو دڵپاك بیو دڵ پیسو بوغزاوی نەبی. (وەرگێڕ)

---

[٤] بسند صحيح (شرحه).

٤٨٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ وَالإِيمَانُ فِي الْجَنَّةِ وَالْبَذَاءُ مِنَ الْجَفَاءِ وَالْجَفَاءُ فِي النَّارِ[٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خاوەنی شەرمو شکۆ خاوەنی باوەڕو ئیمانن، ئەهلی ئیمانیش ئەهلی بەهەشتن، زمان پیسیو بێ ویژلیش نیشانەی دڵ ڕەقیو کەللە بۆشییە، مرۆڤی دڵ ڕەقو کەللە بۆشیش دەستە چیلەی دۆزەخە! (ت- س/ص).

٤٨٧٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ -(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْحَيَاءُ وَالْعِيُّ شُعْبَتَانِ مِنَ الإِيمَانِ وَالْبَذَاءُ وَالْبَيَانُ شُعْبَتَانِ مِنَ النِّفَاقِ. رواهما الترمذي واله أعلم[٦]:

ئەبو ئومامە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: شەرمو بی دەموپلی دوو چڵن لە پەلوپۆی درەختی ئیمان، دەمپیسیو دەمتەڕیو زمان لووسیش دوو تەڵن لە لقوپۆپی درەختی نیفاقو ناپاکی (ت- س/ح).

## ٣٩) باسی خۆ بەکەم گرتن (تەواضوع) : (ومنها التواضع)

٤٨٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ أَذْهَبَ عَنكُمْ عُبِّيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ وَفَخْرَهَا بِالآبَاءِ مُؤْمِنٌ تَقِيٌّ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ أَنْتُمْ بَنُو آدَمَ وَآدَمُ مِنْ تُرَابٍ لَيَدَعَنَّ رِجَالٌ فَخْرَهُمْ بِأَقْوَامٍ إِنَّمَا هُمْ فَحْمٌ مِنْ فَحْمِ جَهَنَّمَ أَوْ لَيَكُونُنَّ أَهْوَنَ عَلَى اللَّهِ مِنَ الْجِعْلاَنِ الَّتِي تَدْفَعُ بِأَنْفِهَا النَّتْنَ. رواه أبو داود والترمذي:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: خودا قەدەغەی کردووە لە ئێوە کە وەك سەردەمی نەفامیو

---

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

نەزانی بە ئێسكو پروسكی باوو باپیرەوە بنازنو، خۆتانیان پێوە هەڵكێشنو كەشو فشیان پێوە بكەن! لە ئایینی ئیسلامی پیرۆزدا شتی وا نییە، بەڵكوو هەموو ئادەمیزادێ خۆی لەخۆیا یەكێكە لەم دوو كەسە یا موسوڵمانەو لە خوداترسە، یا بەدكارەو بەد بەختو چارە ڕەشە! ئێوە لە ڕەگەزەوە جیاییتان نییە چونكە هەمووتان نەوەی ئادەمنو ئادەمیش لە خۆڵە! جا ئەوانەی كە شانازی دەكەن بەو هۆزە بەدكارانەوە كە بوون بە خەڵووزی دۆزەخ حاڵ لەم دوو حاڵە بەدەر نییە: یا دەبێ واز لەوە بێنن، یا دەبێ ئەوە بزانن كە بەوە لەلای خودا قورسو گران نابن، بەڵكوو بەهۆی ئەوەوە لەلای خودا بێ فەڕو سووكتر دەبن لەو قاڵونچانەی كە بە لووت پیسایی خڕ هەڵ دەدەنو دەیبەن بۆ خواردن! (د/ت – س/ص).

٤٨٧٦- عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لاَ يَبْغِيَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ وَلاَ يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ[٢]:

عییاضی كوڕی حیمار (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: خودا وەحیی بۆ من كردووە: كە تا دەتوانن بێ هەواو بێ دەعیە بنو خۆتان بەكەم بگرن بە جۆرێكی وا كەس زۆرو ستەم لە كەس نەكاو كەس خۆی لەكەس بەگەورەتر نەزانێ و كەس بەسەر كەسا شانازی نەكا (د/م).

٤٨٧٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ. قَالَهَا ثَلاَثًا. رواهما أبو داود ومسلم[٣]:

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ جار لەسەر یەك. فەرمووی: ئەوانەی شت زۆر قووڵ دەكەنەوە سەریان تیا دەچێ! (د/م).

---

[٢] {ریاض/٢ ل/١٥٥ تسلسل/٧١. مسلم/٢٨٦٥} . مسلم. بر وصلة: ٦٥٣٥.

[٣] مسلم. علم: ٦٧٢٥. أبوداود. سنة: ٤٦٠٨. تحفة الأشراف: ٩٣١٧.

## ٤٠) ڕەوشی جوان ڕەوشە گەورەکەی خودا خۆیەتی
## حُسن الخُلق خُلُقُ اللهِ الأعظمِ

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ – سورة القلم – ٦٨/٤}.

واتە: ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری ڕەوشت جوانو خۆشەویست! بەراستی تۆ لەسەر ڕەوشتێکی گەلێ گەورەو مەزنیت.

وَقَالَ تَعَالَى: {خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ – سورة الأعراف – ٦٨/٤}.

واتە: تۆ لەسەر یاسای ڕەسای خودا قەرار داوی خۆت بژیو چاوپۆشیو سەرفی نەزەر بکە بەپیشە بۆ خۆتو هەر خزمەتێ کە ئاسانەو بۆ ئەوان دەکرێ لێیان وەربگرەو داوای شتی گرانو باری ناباریان لێ مەکەو فەرمانیان پێ بدە بە هەموو شتێکی جوانو باش، وە خۆت دوور بگرە لە ئادەمیزادی نەفامی بێ دەماخ.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ – سورة فصلت – ٤١/٣٤}.

واتە: هەرگیز چاکەو خراپە نابن بەیەك، چاکە هەر چاکەیەو خراپە هەر خراپەیە، بەکاری زۆر جوانو بەرەوەشتی زۆر بەرز شتی خراپ لەناودا مەهێڵە، ئەگەر واتکرد دەبینی ناحەزو دوژمنت دەبن بەخزمی نزیكو دۆستی گیانی بەگیانیت، بەڵام ناگات بەم پایە باشە مەگەر ئەو کەسانەی کە بەحەوسەڵەو بەصەبرن، بەراستی ئەو بەختەوەرانەی دەگەن بەم پایە پیرۆزەیە خودا پێداوی چاکن!

٤٨٧٨– عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا شَيْءٌ أَثْقَلُ فِي مِيزَانِ الْمُؤْمِنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ خُلُقٍ حَسَنٍ وَإِنَّ اللَّهَ لَيَبْغَضُ الْفَاحِشَ الْبَذِيءَ. رواه الترمذي وأبو داود[1]:

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

ئـەبو دەرداء (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرمویٚ: لـە ڕۆژی ژینـەوەدا هیچ شتێ وەك ڕەوشـتی جوان قورسو گـران نییـە لـەتای تـەرازووی چـاکەی موسـوڵمانـدا، بەراستی خـودا زۆر ڕقـی لـە هەرزەگۆی زمانپیسە (ت/د-س/ص).

٤٨٧٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَتْ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُـولُ: إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ. رواه أبو داود والترمذي وابـن حبـان والحاكم[٢]:

عائيـشە (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: لەپێغەمبـەرم بیـست (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەیفـەرموو : (موسـوڵمان بـەهۆی خـووی جوانـەوە دەتوانـێ بگـا بـە پایـەی ڕۆژووەوانو شـەونوێژکەر). (د/ت/ ئیبنـو حـەببان/حـاکم – سەنەدەکەیان صەحیحە).

٤٨٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَـنْ أَكْثَرِ مَا يُدْخِلُ النَّاسَ الْجَنَّةَ فَقَالَ: تَقْوَى اللَّهِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ. وَسُئِلَ عَنْ أَكْثَرِ مَـا يُـدْخِلُ النَّاسَ النَّارَ فَقَالَ: الْفَمُ وَالْفَرْجُ[٣]:

ئەبوهورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسـەربێ) پرسـیارکرا: زۆرتـر چـی دەبـێ بـەهۆی چـوونە بەهەشـتی خـەڵك؟ فـەرمووی: تەقواو لەخودا ترسیو خووی جوان! وە پرسیاریشی لێ کرا: ئەی زۆرتر چی دەبـێ بـەهۆی چـوونە نـاو دۆزەخـی خـەڵك؟ فـەرمووی: دەمو دامـەن! (ت-س/ص).

٤٨٨١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اتَّـقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ[٤]:

---

[٢] بأسانيد صحيحة (شرحه).

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند صحيح (شرحه).

ئەبو زەڕ (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: لە هەموو شوێنێ و لەسەر هەموو حاڵێ ترسی خودات هەبێ و بێ فەرمانی مەکە، بزانن کە یاسایەکی خوداییە کە کردەوەی باش و کاری چاکە هەمیشە کردەوەی خراپ و تاوان لا دەبەن، لەگەڵ هەموو کەسێکا ڕەفتارو گوتارو کردارتان شیرین و جوان بێ (ت-س/ص).

٤٨٨٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ وَأَمْرُكَ بِالْمَعْرُوفِ وَنَهْيُكَ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلَالِ لَكَ صَدَقَةٌ وَبَصَرُكَ لِلرَّجُلِ الرَّدِيءِ الْبَصَرِ لَكَ صَدَقَةٌ وَإِمَاطَتُكَ الْحَجَرَ وَالشَّوْكَةَ وَالْعَظْمَ عَنِ الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٥]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕووت خۆش بێ لەگەڵ برای موسوڵمانتا دادەنرێ بە خێرێ بۆت، فەرمانێ بکەی بەچاکەیێ، یا نەهێ بکەی لە خراپەیێ دادەنرێ بە خێرێ بۆت، شارەزایی پیاوێ بکەی کە ڕێگەی هەڵەکردبێ دادەنرێ بەخێری بۆت، چاوساغیی پیاوێکی چاوکز بکەی دادەنرێ بەخێرێ بۆت، بەردێ، دڕکێ، ئێسقانێ لە ڕێگە دوور بخەیتەوە دادەنرێ بە خێرێ بۆت، تەنانەت ئەگەر چۆڕێ ئاو لە سەتڵەکەی خۆت بکەیتە سەتڵی برایەکی موسوڵمانتەوە دادەنرێ بەخێرێ بۆت! (ت-س/ح).

٤٨٨٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ أَخْلَاقًا. رواه الترمذي ومسلم والبخاي ولفظه: ان من أخيركم أحسنكم خلقا[٦]:

---

[٥] بسند حسن (شرحه).

[٦] تجريد/٤ ل/١٠٧ رقم/١٤٢٢ = ٢٥٥٩، ٣٧٥٩، ٦٠٣٥، ٦٠٢٩. مسلم. فضائل: ٥٩٨٧. ترمذي: بر وصلة: ١٩٧٥. تحفة/٨٩٣٣.

لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە (ڕەزای خودایان لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: شازی ئێوە ئەوانەتانن کە ڕەفتاریان زۆر جوانە! (ت/م/ب) گفت (لەفظ)ی بوخاری ئاوایە: ئەوانەتان کە ڕەفتاریان زۆر شیرینە لە باشترینەکانی ئێوەن.

٤٨٨٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ وَإِنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ وَأَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَاءِ أَخِيكَ. رواه الأربعة[٧]:

لە جابیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): هەموو چاکەیێ خێرێکە، ئەوەی شەریعەت پەسەندی بکا بە چاکە دادەنرێ، وەك ئەوە کاتێ دەگەی بە برای ئاییینیت ڕووت خۆش بێ لەگەڵیا، یا وەك ئەوە لە سەتڵەکەی خۆت جامێ ئاو بدەی بە برادەرێکت (ش/د/ت).

٤٨٨٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لاَ حَلِيمَ إِلاَّ ذُو عَثْرَةٍ وَلاَ حَكِيمَ إِلاَّ ذُو تَجْرِبَةٍ. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[٨]:

ئەبو سەعید لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): سەلار تا نەگلێ نابێ بەسەلار، دانایش کەسێکە کە خاوەن بەراورد بێ (ت/ئە/حاکم - اسانید صحیحە).

٤٨٨٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَحَاسِنَكُمْ أَخْلاَقًا وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ الثَّرْثَارُونَ وَالْمُتَشَدِّقُونَ وَالْمُتَفَيْهِقُونَ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّهِ قَدْ عَلِمْنَا الثَّرْثَارُونَ وَالْمُتَشَدِّقُونَ فَمَا الْمُتَفَيْهِقُونَ؟ قَالَ: الْمُتَكَبِّرُونَ. رواه الترمذي[٩]:

---

[٧] تجرید/٥ ل/٢٠٩ رقم/١٩٢١ = ٦٠٢١ فتح. مسلم. زكاة. ٢٣٢٥. أبوداود. ادب: ٤٩٤٧. مسلم. بر وصلة: ٦٦٣٣.

[٨] بأسانيد صحيحة (شرحه).

[٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو کەسانەتان کەرەوشتیان زۆر جوانە بەشێکن لەو کەسانەتان کە لە ڕۆژی قیامەتدا زۆر خۆشەویستن لەلای من لەم مەڵبەندانەدا: لە ڕۆژی حەشرو لەکاتی کێشانی خێرو شەڕو لەسەر حەوزی کەوسەرو لە بەهەشتدا زۆر نزیکن لە دیوانی منەوەَ! وە سازندەو دەمەوەرو دەمهەراش و قسە زلەکانیش هەندێکن لەو کەسانەتان کە لە ڕۆژی ژینەوەدا زۆر رقم لێیانەو زۆرم دەدزێنو زۆر دوورن لە دیوەخانی منەوە. عەرزیانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەزانین کەسازندەر دەمەوەرو دەمهەراشەکان کێنو مانایان چییە، بەڵام ئەی مەبەست لە قسەزولەکان کێیە؟ فەرمووی: مەبەست فیز زلەکانن (ت–س/ح).

٤٨٨٧– عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا. فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ؟ قَالَ: لِمَنْ أَطَابَ الْكَلاَمَ وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ وَأَدَامَ الصِّيَامَ وَصَلَّى لِلّٰهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. رواه الترمذي وأحمد وابن حبان[١٠]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەندێ کۆشکی وا لەناو بەهەشتدا هەیە دەرەوەی لەناوەوەو ناوەوەی لە دەرەوە دیارە. عارەبێکی دەشتەکی هەڵسا گوتی: ئەوە هی کێیە؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: هی ئەو کەسەیە کە قسەی خۆش بێو زبانی شیرین بێو نانبدەبێو هەمیشە بەڕۆژ بەڕۆژوو بێو بەشەویش ساخ لەبەر ڕەزای خودا شەونوێژ بکا، لەوکاتەدا کە خەو خۆش دەبێو خەڵکانی تر سەری تێ دەکەنو زووربەیان دەخەون! (ت/ئە/ئیبنو حەببان – س/ص).

٤٨٨٨– عَنْ أُمِّ أَبَانَ بِنْتُ الْوَازِعِ بْنِ زَارِعٍ عَنْ جَدِّهَا زَارِعٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمْ) وَكَانَ فِي وَفْدِ عَبْدِ الْقَيْسِ قَالَ لَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَجَعَلْنَا نَتَبَادَرُ مِنْ رَوَاحِلِنَا فَنُقَبِّلُ يَدَ النَّبِيِّ (صَلَّى

[١٠] بسند صحيح (شرحه).

اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرِجْلَهُ وَانْتَظَرَ الْمُنْذِرُ الأَشَجُّ حَتَّى أَتَى عَيْبَتَهُ فَلَبِسَ ثَوْبَيْهِ ثُمَّ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ: إِنَّ فِيكَ خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَا أَتَخَلَّقُ بِهِمَا أَمِ اللَّهُ جَبَلَنِي عَلَيْهِمَا قَالَ: بَلِ اللَّهُ جَبَلَكَ عَلَيْهِمَا. قَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خَلَّتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللَّهُ وَرَسُولُهُ. رواه أبو داود والترمذي (نص هذه الرواية جاءت في مبحث ومنها تقبيل اليد والرجل، في كتاب الأدب ذكرناها هنا اختصارا)[١١]:

ئوممو ئەبانی کچی وازیعی کوڕی زاریع (ڕەزای خودای لێبێ) لە زاریعی باپیرەیەوە – کە خۆی یەکێك بووە لە وەفدەکەی هۆزی عەبدولقەیس کە چواردەکەس بوون هاتبوون بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) – زاریع فەرمووی: کاتێ گەیشتینە مەدینە بە پەلە پەل لە وڵاخەکانمان دا بەزین و چووین بۆ لای پێغەمبەرو پەلاماری دەست و پێیمان داو دەستمان کرد بە ماچکردنی دەست و پای، وەلێ مونزیری ئەشەجج هیچ خۆی تێك نەداو بەشێنەیی چوو بەلای بوخچەکەیەوەو جلەکانی دەرهێنان و دەستێ جلی باشی لەبەرکرد، ئەوجا هات بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: بەڕاستی دوو ڕەوشتی باش لەتۆدا هەن خودا حەزیان لێ دەکا، کە بریتین لە هێمنی و لەسەر خۆیی ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم خووم پێوە گرتوون یاخود خودا کردن و خودا داونی پێم؟ فەرمووی: خەیر، بەڵکوو خوداکردن و خودا داونی پێت. گوتی: سوپاس بۆ خودا کە دوو ڕەووشتی وای داومەتێ کە خوداو پێغەمبەری خودا خۆشیانیان دەوێ (د/ت – س/ص).

٤٨٨٩– قال في الشرح: وقال رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كاد الحليم أن يكون نبيا. رواه الخطيب[١٢]:

لە شەرحەکەدا دەفەرموێ: خەتیب دەگێڕێتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پیاوی بەحەوسەڵەو هێمن چەپی لە پێغەمبەر کەمترە.

---

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] سكت عن درجته الشارح.

٤٨٩٠- وقال فيه أيضا: وقال رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): الحليم سيد في الدنيا وسيد في الآخرة. رواه الخطيب والله أعلم[١٣]:

**دیسان لە شەرحەکەدا** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەفەرموێ: خەتیب** (خودای لێ ڕازی بێ) **دەگێڕێتەوە: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: حەلیم (واتە: پیاوی بەحەوسەڵەو هێمن) لە هەردوو جیهاندا ئاغاو گەورە پیاوە!**

## ٤١) بەشێ لە ڕەوشتە جوانەکانی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر

## بعض أخلاق النبي ﷺ

٤٨٩١- سُئِلَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا): مَا كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصْنَعُ فِي أَهْلِهِ؟ قَالَتْ: كَانَ فِي مِهْنَةِ أَهْلِهِ ، فَإِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ. رواه البخاري[١]:

**لە عائیشە** (خودای لێ ڕازی بێ) **پرسیارکرا: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەماڵەوە خەریکی چی بوو؟ فەرمووی: خەریکی خزمەتی خێزانەکەی بوو (چێشتی دەکرد، گسکی دەدا، حوشتری دەدۆشی، مەڕوبزنی دەدۆشی، ئالیکی دەدا بە ئاژەڵ، دروومانی دەکرد، پێڵاوی دەدوورییەوە!) کاتێکیش نوێژ دەبوو دەچوو بەلای نوێژەوە. (ب).**

٤٨٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا فَقُمْنَا حِينَ قَامَ فَنَظَرْنَا إِلَى أَعْرَابِيٍّ قَدْ أَدْرَكَهُ فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ فَحَمَّرَ رَقَبَتَهُ وَكَانَ رِدَاءً خَشِنًا، فَالْتَفَتَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ: الأَعْرَابِيُّ احْمِلْ لِي عَلَى بَعِيرَيَّ هَذَيْنِ فَإِنَّكَ لاَ تَحْمِلُ لِي مِنْ مَالِكَ وَلاَ مِنْ مَال أَبِيكَ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ لاَ وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ لاَ وَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ لاَ أَحْمِلُ لَكَ حَتَّى تُقِيدَنِي مِنْ جَبْذَتِكَ الَّتِي جَبَذْتَنِي، فَكُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ لَهُ الأَعْرَابِيُّ وَاللَّهِ لاَ أُقِيدُكَهَا. فَلَمَّا سَمِعْنَا قول الأعرابي أقبلنا إِلَيهِ سِراعاً،

---

[١٣] سكت عن درجته الشارح.

[١] {رياض/٢ ل/١٥٦ تسلسل/٧١ رقم/٦٠٦/٥. بخاري/٦٧٦ = تجريد/١ ل/٣٧١ رقم/٢٨١}.

فالتَفَتَ إلينا النبيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فقال: عَزَمْتُ عَلَى مَنْ سَمِعَ كَلاَمِي أَلا يَبْرَحَ مَكَانَهُ حَتَّى آذَنَ لَهُ، ثُمَّ دَعَا رَجُلاً فَقَالَ لَهُ: احْمِلْ لَهُ عَلَى بَعِيرَيْهِ هَذَيْنِ عَلَى بَعِيرٍ شَعِيرًا وَعَلَى الآخَرِ تَمْرًا. ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيْنَا فَقَالَ: انْصَرِفُوا عَلَى بَرَكَةِ اللَّهِ تَعَالَى. رواه أبو داود والشيخان نسأل الله مكارم الاخلاق. آمين[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قسەی بۆ دەکردین لە پاشا هەڵسا کە بڕوا، ئێمەیش هەڵساین کە بڕۆین، هەر ئەوەندەمان زانی عارەبێکی دەشتەکیی لێ تایین بوو، کردی بە لەشپۆشەکەیداو یەخەی توندگرتو جەڕاندیو ڕایکێشا بۆ خۆی! لەشپۆشەکە ئەوەندە زبربوو لاملی پێغەمبەری سوورکردەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەو پیرۆزی لەسەربێ) ئاوڕی لێ دایەوە! کابرای تایەن پێی گوت: ئەم دوو وشترەی من دەبینی دەمەوێ هەردوکیانم بۆ باربکەی لەشمەك، خۆ لەماڵی خۆت یا لە ماڵی باوکت بۆم بارناکەی! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: نەخەیر لەماڵی خۆم باریان ناکەمو داوای لێبوردن لە خودا دەکەم ئەگەر ئەم کارە وانەبێ. ئەوجا فەرمووی: بارەکانت نادەمێ هەتا نەهێڵێ کە تۆڵەی ئەم کێش کردنەت لێ بستێنم!. کابراکەیش هەموو جارێ دەیگوت: بەخودا نایەڵم کەتۆڵەی ئەوەم لێ بکەیتەوە، جا کە ئەم مشتومڕەمان ژنەوت هەڵمان کوتایە سەرکابرا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: داوا لەو کەسانە دەکەم کە گوێیان لەم قسەیەی منە لە شوێنی خۆیان نەبزوێن تا خۆم پێیان دەڵێم. ئەوجا پیاوێکی بانگ کردو پێی فەرموو: هەردوو وشترەکەیی بۆ بارکە، حوشترێکیانی لە جۆ ئەو حوشترەکەی تری لە خورما! ئینجا ڕووی کردەوە ئێمەو فەرمووی: بڕۆن بەلای کاری خۆتانەوە بەتەمای بەرەکەتی خودا (د/ش).

---

[٢] بخاري. فرض الخمس: ٣١٤٩، ٥٨٠٩، ٦٠٨٨ = تجريد/٣ ل/٣٩٨ رقم/١٢٧٣ = ٣١٤٩. مسلم. زكاة: ٢٤٢٦. ابن ماجه/لباس: ٣٥٥٣. تحفة/٢٠٥.

٤٨٩٣- ـ (ب/٤ ز/٩٠ ل/٢٦٧ ف/١ + ٢ + ٣ + ٤ + ٥ + ٦ + ٧ + ٨ + ٩ + ١٠ + ١١ + ١٢ + ١٣ + ١٤ - ١٥ + ١٦ + ١٧ + ١٨)[٣].

**٤٢) باسی ڕێنموونی باش : (ومنها الهدى الصالح)**

٤٨٩٤- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) أَنَّ نَبِيَّ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: إِنَّ الْهَدْيَ الصَّالِحَ وَالسَّمْتَ الصَّالِحَ وَالِاقْتِصَادَ جُزْءٌ مِنْ خَمْسَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ. رواه أبو داود والترمذي ولفظه: السَّمْتُ الْحَسَنُ وَالتُّؤَدَةُ وَالِاقْتِصَادُ جُزْءٌ مِنْ أَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ[١]:

**ئبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرموویەتی: ڕێ پێ نیشاندانی خەڵك بەجوانیو، شێوەو قەڵافەتی ڕێكوپێكو میانەڕەوی (ئیقتیصاد) لەكاردا بەشێكن لە بیستو پێنج بەش لە پێغەمبەرایەتی (د/ت/س/ح) گفتەی (ت) ئاوایە: ڕەزای سووكو شێنەییو لەسەرخۆییو میانە ڕەوی بەشێكن لە بیستو چوار بەش لە پێغەمبەرایەتی.**

**٤٣) باسی صەخاوەتو بەخشندەییو پیاوەتی : (ومنها السخاء والكرم)**

٤٨٩٥- ـ (ب - ٤ ز - ٩٠ ل - ٢٧٠ف - ٧)[١].

٤٨٩٦- ← (ب - ٤ ز - ٩٠ ل - ٢٦٩ ف -٤)[٢].

٤٨٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: السَّخِيُّ قَرِيبٌ مِنَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْجَنَّةِ قَرِيبٌ مِنَ النَّاسِ بَعِيدٌ مِنَ النَّارِ وَالْبَخِيلُ بَعِيدٌ مِنَ اللَّهِ بَعِيدٌ

---

[٣] تقدم في مجلد رابع تسلسل/٩٠ ل/٢٦٧ ط/١ رقم/٣١١٦ هەتا (٣١٣٣).

[١] بسند حسن (شرحه).

[١] تقدم في مجلد رابع تسلسل/٩٠ ل/٢٧٠ ط/١ رقم/٣١٢٢.

[٢] تقدم في مجلد رابع تسلسل/٩٠ ل/٢٦٩ ط/١ رقم/٣١١٩.

مِنَ الْجَنَّةِ بَعِيدٌ مِنَ النَّاسِ قَرِيبٌ مِنَ النَّارِ وَلَجَاهِلٌ سَخِيٌّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ عَابِدٍ بَخِيلٍ. رواه الترمذي والبيهقي والطبراني[٣]:

لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پیاوی سەخی و بەخشندە نزیکە لە ڕەحمەتی خوداوەو نزیکە لە بەهەشتەوەو نزیکە لە خەڵکەوە، وە دوورە لە دۆزەخەوە! پیاوی پیسکەو چرووکیش دوورە لە ڕەحمەتی خوداو دوورە لە بەهەشت و دوورە لە خەڵك، وە نزیکە لە دۆزەخەوە! تەنانەت پیاوێکی نەزانی نەفام – بەڵام سەخی و جەوامێرو بەخشندە – لەلای خودای گەورەو سەروەر خۆشەویسترە لە سۆفیلکەیەکی خودا پەرستی ڕەزیل و پیسکە. (ت- سەنەد ضەعیف / بەیهەقی / طەبەرانی).

٤٨٩٨- ← (ب – ٢ ز – ٢٣ ل – ٦١ ف – ٥)[٤].

٤٨٩٩- عَنْ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ مَنَحَ مَنِيحَةَ لَبَنٍ أَوْ وَرِقٍ أَوْ هَدَى زُقَاقًا كَانَ لَهُ مِثْلُ عِتْقِ رَقَبَةٍ. رواه أحمد والترمذي بسند صحيح. نسأل الله صحة القول والفعل والاعتقاد آمين[٥]:

بەرای کوڕی عازیب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە دەمی پێغەمبەر خۆیم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): کەسێ ئاژەڵێ بدا بە کەسێ تا شیرو دۆکەی بخوا بۆ خۆی، یا پارەیێ، یا شتێ بدا بە قەرز بە کەسێ، یا کۆڵانێ، یا ڕێگەیێ نیشانی نەشارەزایێ یا کوێرێ بدا، ئەوە وەك ئەوە وایە کە ساخ بۆ ڕەزای خودا بەندەیێ ئازادبکا (ئە/ت-س/ص).

---

[٣] بسند ضعيف للترمذي (شرحه).

[٤] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/٢٣ ل/٦١ ط/١ رقم/١١٨٧.

[٥] سنده صحيح عند الترمذي.

## ٤٤) باسی سوپاسکردن لە سەرچاکەو پیاوەتی : (ومنها الشكر على المعروف)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {هَلْ جَزَاء الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ – سورة الرحمن – ٥٥/٦٠-٦١}.

**پاداشی چاکە هەر چاکەیەو بەس، دەی نابێ بەهیچ جۆرێ لە نیعمەتی خودا لووتە لابنو باوەڕیان پێ نەکەن.**

٤٩٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لاَ يَشْكُرُ اللَّهَ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ. رواه أبو داود والترمذي ولفظه: مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللَّهَ[١]:

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو کەسەی کە سوپاسی خودا نەکا سوپاسی مەردوومیش ناکا. (د/ت-س/ص) گفتەی (ت): ئەوەی چاکەی خەڵکی لەبەر چاو نەبێ چاکەی خوداشی لەبەر چاو نییە!**

٤٩٠١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أُعْطِيَ عَطَاءً فَوَجَدَ فَلْيَجْزِ بِهِ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيُثْنِ بِهِ فَمَنْ أَثْنَى بِهِ فَقَدْ شَكَرَهُ وَمَنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ. رواه الترمذي وأبو داود وابن حبان[٢]:

**جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): کاتێ کەسێ بەخششێکی دەدەنێ ئەگەر هەیبوو با تۆڵەی بکاتەوە بۆ خاوەن بەخششەکە، ئەگەر نەیبوو بانزای باشی بۆ بکا، چونکە نزای باش بەو پەڕی سوپاس حلێبە، وە شاردنەوەی پیاوەتیو حەشاردانی چاکەی خەڵكو پێنەزانینی پیاوەتی دادەنرێ بە سپڵەییو بەدنمەکی! (ت/د/ئیبنو حەببان).**

٤٩٠٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ أَتَاهُ الْمُهَاجِرُونَ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا رَأَيْنَا قَوْمًا أَبْذَلَ مِنْ كَثِيرٍ وَلاَ أَحْسَنَ مُوَاسَاةً مِنْ قَلِيلٍ

---

[١] بسند صحيح (شرحه).

[٢] بسند صحيح (شرحه).

مِنْ قَوْمٍ نَزَلْنَا بَيْنَ أَظْهُرِهِمْ لَقَدْ كَفَوْنَا الْمُؤْنَةَ وَأَشْرَكُونَا فِي الْمَهْنَإِ حَتَّى خِفْنَا أَنْ يَذْهَبُوا بِالأَجْرِ كُلِّهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ مَا دَعَوْتُمُ اللَّهَ لَهُمْ وَأَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِمْ. رواه الترمذي وأبو داود[٣]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە، کۆچکاران هاتنە خزمەتی، گوتیان، ئەی پێغەمبەری خودا! هێشتا کەسی وامان نەدیوە، کە وەك ئەم کۆمەڵەی یاریدەدەرانە کەوا ئێمە هاتووینەتە ناویانو کۆچمان کردووە بۆلایان، کەسمان نەدیوە کە وەك ئەمان ئاوا بەخشندەو ئەوەندە بەوێڵو ماریفەت بن، ئەمانە لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆیان دەستیان کورتە کەچی ئەرکی ئێمەش دەکێشنو ژنمان پێ دەدەنو دەمان کەن بەهاوبەشی هەموو خێرو خۆشییەکی خۆیان، تا ئەو ڕادەیە مەترسی دەکەین کە هەرچی پاداشی باشە هەمووی بۆ ئەوان بێ! پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرمووی: نەء، مەترسی ئەوەتان نەبێ، بەمەرجی ئەوە کە ئێوەیش لە خودا بپاڕێنەوە بۆ ئەوانو سوپاسیان بکەنو پێ بزانن بە چاکەیان! (ت-س/ص-د).

٤٩٠٣- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ فَقَالَ لِفَاعِلِهِ جَزَاكَ اللَّهُ خَيْرًا فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ. رواه الترمذي وابن حبان بسندصحيح[٤]:

ئوسامەی کوڕی زەید (خودایان لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو کەسەی چاکەی لەگەڵ بکرێو بە چاکەکەرەکە بڵێ: خودا تۆڵەیەکی چاکت بداتەوە، خودا پاداشی باشت بداتەوە ئەوە بەمەعنا ئەوپەڕی سوپاسو ستایشی دەکا. (ت/ئیبنو حەببان - س/ص).

---

[٣] رواه الترمذي في الرقاق بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند صحيح لأبن حبان.

## ٤٥) خۆپاراستنو پارێز لە قاری خوداو لە نازاری خەڵك
## الحزر من الله والناس

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَيُحَذِّرُكُمُ اللّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللّهِ الْمَصِيرُ – سورة آل عمران – ٢٨/٣}.

واتە: هەر لە ئێستەوە کە مەودای گەڕانەوەتان هەیە بۆ لای خوداو بەر لەوەی کار لە کار بترازێ خودا ئێوە دەترسێنێ لە سزاو قاری خۆی، ڕاستە کە خودا هەمیشە بەچاوی ڕەحمەت تەماشای بەندە باشەکانی خۆی دەکا، بەڵام لەهەمان کاتدا سەختگیریشە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ – سورة البقرة – ٢٢٣}.

واتە: بزانن کە خودای گەوە ئاگای لە نیازو چەکەرەی ناو دڵو دەروونتانە! هیچ شتێ – چاك یا خراپ – لە خودا ون نابێ! تا دەتوانن پارێز لە قاری خودا بکەنو بەهۆی نیازی پیسی ناو دڵتانەوە خۆتان دووچاری قاری خودا مەکەن، بزانن هەمیشە خودا خاوەنی ڕەحمەتە، ئەگەر تەوبە بکەن بە ڕەحمەتی خۆی تەوبەتان لێ گیرا دەکا، حیلمو حەوسەڵەی خودا بۆ پیاوی دانا مەودایەکی لەبارە بۆ بیرکردنەوەو پەشیمان بوونەوە، بەڵام بۆ مرۆڤی نادانی نەفام داوو تەڵەیەو دەسخەڕۆی دەکا هەتا لەپڕ ملی دەبێ بەتەڵەکەوە!.

٤٩٠٤– ← (ب – ٦ ز – ١٢ ل – ٢٤٢ ف – ٤)[1].

٤٩٠٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُلْدَغُ الْمُؤْمِنُ مِنْ جُحْرٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ. رواه الثلاثة[2]:

---

[1] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/١٢ ل/٢٤٢ ط/١ رقم/٣٩٢٢.

[2] تجريد/٥ ل/٢٢٢ رقم/١٩٥٣ = ٦١٣٣ فتح. مسلم. زهد ورقاق/٧٤٢٣. أبوداود. أدب: ٤٨٦٢. ابن ماجه. فتن: ٣٩٨٢. تحفة الأشراف: ١٣٢٠٥.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـە حەزرەتـەوە (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان دەبێ وریاو هۆشیاربێ لەیەك كونەوە دوو جار شت پێوەی نەدا. (ش/د).

٤٩٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَجِدُونَ النَّاسَ كَإِبِلٍ مِائَةٍ لاَ يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً. واه الشيخان والترمذي[٣]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ‌ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): دەبینن ئەو خەڵكە بۆ باشی و خراپی وەك وشتری باری وان، پیاو لە سەدیاندا تاقە ولاخێكی سواری باشی دەستگیر نابێ. (ش/ت).

ولاخی بەرزە كە باری بێ بەكەڵكی سواری نایێ، چونكە لەژێربارا ڕەوتی لێ تێك دەچێ و كەشخەییەكەی نامێنێ، بۆیە بەئەسپی ژێر عەرەبانە دەڵێن: بارگیر. (وەرگێڕ)

٤٩٠٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ الفَغْوَاءِ الْخُزَاعِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: دَعَانِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ أَرَادَ أَنْ يَبْعَثَنِي بِمَالٍ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ يَقْسِمُهُ فِي قُرَيْشٍ بِمَكَّةَ بَعْدَ الْفَتْحِ فَقَالَ: الْتَمِسْ صَاحِبًا. قَالَ: فَجَاءَنِي عَمْرُو بْنُ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيُّ فَقَالَ: بَلَغَنِي أَنَّكَ تُرِيدُ الْخُرُوجَ وَتَلْتَمِسُ صَاحِبًا. قُلْتُ أَجَلْ . قَالَ: فَأَنَا لَكَ صَاحِبٌ. قَالَ: فَجِئْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْتُ: قَدْ وَجَدْتُ صَاحِبًا. فَقَالَ: مَنْ؟ قُلْتُ: عَمْرَو بْنَ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيَّ. قَالَ: إِذَا هَبَطْتَ بِلاَدَ قَوْمِهِ فَاحْذَرْهُ فَإِنَّهُ قَدْ قَالَ الْقَائِلُ أَخُوكَ الْبِكْرِيُّ وَلاَ تَأْمَنْهُ. فَخَرَجْنَا حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِالأَبْوَاءِ قَالَ: إِنِّي أُرِيدُ حَاجَةً إِلَى قَوْمِي بِوَدَّانَ فَتَلْبَثُ لِي قُلْتُ رَاشِدًا فَلَمَّا وَلَّى ذَكَرْتُ قَوْلَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَشَدَدْتُ عَلَى بَعِيرِي حَتَّى خَرَجْتُ أُوضِعُهُ حَتَّى إِذَا كُنْتُ بِالأَصَافِرِ إِذَا هُوَ يُعَارِضُنِي فِي رَهْطٍ قَالَ وَأَوْضَعْتُ فَسَبَقْتُهُ فَلَمَّا رَآنِي قَدْ فُتُّهُ انْصَرَفُوا وَجَاءَنِي فَقَالَ: كَانَتْ لِي إِلَى قَوْمِي حَاجَةٌ . قُلْتُ: أَجَلْ وَمَضَيْنَا حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ فَدَفَعْتُ الْمَالَ إِلَى أَبِي سُفْيَانَ. رواه أبو داود. والله تعالى أعلم[٤]:

---

[٣] تجريد/٥ ل/٢٧٨ ط/١ رقم/٢٠٢١ = ٦٤٩٤. مسلم. فضائل/الصحابة/٦٤٤٦.

[٤] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

عەمری کوڕی غەفوای خوزاعی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەباش گرتنی مەککە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ویستی کە هەندێ ماڵ بنێرێ بۆ ئەبو سوفیان تا دابەشی بکا بەسەر موسوڵمانەکانی قوڕەیشدا، جا پێغەمبەر منی بانگ کردو فەرمووی: هاو سەفەرێ بۆ خۆت پەیداکەو بەخێرێ بکەوەرە ڕێ. عەمری کوڕی ئومەییەی زەمری هاتە لام گوتی: بیستوومە دەتەوێ بچی بۆ سەفەرو منەی هاوڕێ دەکەی؟ گوتم: ئا نیازم وایە، گوتی: دەمن دەبم بە هاوڕات، گوتی: منیش چوومەوە بۆ لای پێغەمبەرو گوتم: هاوڕام دەست کەوت، فەرمووی: کێیە؟ گوتم: عەمری کوڕی ئومەییەی زەمرییە، فەرمووی: باشە، بەڵام ئاگات لەخۆت بێ کە گەیشتیتە گوزەری وڵاتی هۆزەکەی مەترسی لێ بکە، چونکە پێشینان گوتویانە: لەبرای باوكو دایکی خۆت ئەمین مەبە! ئەنجا پێکەوە کەوتینە ڕێ ڕۆیشتین تا گەیشتینە ئەبواء، دەبینم لەوێ گوتی: لەوە ددان کەمێ ئیشم هەیە بەخزمەکانم، تۆ لێرە چاوەڕێم بکە تا دێمەوە بۆ لات، گوتم: بڕۆ بەخۆشی بچیو بێیتەوە، جا کە ڕۆیشت یادی فەرمایشتەکەی پێغەمبەرم کەوتەوە، لەبەر ئەوە نەوەستام لەسەری بەڵکوو حوشتەکەمم تەواو توند کردەوەو خێرا لێم خوڕی تا لە ئەبواء دەرچووم، کە چوومە ئەصافیر دەڕوانم وا لەوێ لەگەڵ تاقمێکا بەرنگارم بوون، منیش خێرا لێم خوڕیو پێشیان کەوتم، جا کە ڕوانی وا من لە کیسی چووم ئیتر ئەوان گەڕانەوەو خۆی هات بۆلام، گوتی: کەمێ ئیشم بە خزمەکانم هەبوو بۆیە چووم، منیش گوتم: بەڵێ وانییە بەڵام باوابێ! ئینجا ڕۆیشتین تا چووینە مەکە لەوێ ماڵەکەم دا بە ئەبو سوفیان (د-س/صالح).

## ٤٦) گومانی باش هەم بەخوداو هەم بە خەڵك پەسەندە

## حسن الظن بالله والناس

٤٩٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ اللَّهُ أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي. رواه الشيخان والترمذي[1]:

[1] تجريد/٥ ل/٣٨١ رقم/٢١٢٩ = ٧٤٠٥، ٧٥٠٥، ٧٥٣٧. مسلم. الذكر والدعاء: ٦٧٤٦. ترمذي. دعوات: ٣٦٠٢.

ئـەبو هـورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرمویٚ: خودای تەواناو سەروەر دەفەرمویٚ: بەندەی من گومـانی چۆن بـێ بەمن من وا دەبم لەگەڵیدا (ش/ت).

٤٩٠٩– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حُسْنُ الظَّنِّ مِنْ حُسْنِ الْعِبَـادَةِ. رواه ابو داود. نسأل الله الظن الحسن وكامل التوكل. آمين[٢].

دیـسان فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرمویٚ: گومـانی باش عادەتێکی باشە (د–س/صالح).

## ٤٧) ئایین بریتییە لە تەمێو ئامۆژگاری باش : (كمال الدين في النصيحة)

٤٩١٠– ← (ب – ١ ز – ٢ ل – ٢٣ ف – ٩)[١].

٤٩١١– ← (ب – ١ ز – ٨ ل – ٤٨ ف – ٢ + ٤ + ٥)[٢].

## ٤٨) ڕاوێژکەر ئەمیندارە : (المستشار أمين)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ – سورة آل عمران – ١٥٩/٣}.

واتـە: لـە هـەموو کاروبـارێکی گرنگدا داوای ڕاوێـژ لـە یارانـت بکـە، جـا دوا ئەوە کاتێ عەزمت جەزم بوو لەسەکردنی ئیشێ و بڕیاری ئێجگاریت دا کە بیکەی ئیتر واز لـە ڕاڕایی بێنـەو پشت بەخودا ببەستەو دەست بکە بەکار، دڵنیـابە کـە خودای گەوەو مەزن ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە پشتیان بە خودا قایمە.

٤٩١٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ. رواه اصحاب سنن[١].

---

[٢] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[١] تقدم في مجلد أول تسلسل/٢ ل/٢٣ ط/١ رقم/١١.

[٢] تقدم في مجلد أول تسلسل/٨ ل/٤٨ ط/١ رقم/٥٦ و ٥٨ و ٥٩.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): ڕاوێژکار ئەمیندارەو دەبێ ئەوەی باشە نیشانی ڕاوێژ خوازی بدا، ئەگینا ناپاك و گزیكار دەردەچێ! (د/ت/ن–س/ح).

٤٩١٣– وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَفْتَى بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ. زَادَ فِي رواية: وَمَنْ أَشَارَ عَلَى أَخِيهِ بِأَمْرٍ يَعْلَمُ أَنَّ الرُّشْدَ فِي غَيْرِهِ فَقَدْ خَانَهُ. رواه أبو داود والحاكم. نسأل الله حسن الرواية وكمال الدارية آمين[٢]:

دیسان فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ بەنەزانی فەتوای بۆ بدرێ گوناهەکەی بە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە ئەو فەتوا غەڵەتەی بۆ داوە. لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی پترکردووە: وە ئەو کەسەی شتێ نیشانی برای موسوڵمانی خۆی بدا کە بیکا یا نەیکا، لە هەمان کاتدا بشزانێ کە ئەو شتە بە پێچەوانەوە باشترە ئەوە گزی و ناپاکیی لێ دەکا (د/حاکم–س/ص).

## ٤٩) کەسێ خێرێ نیشانی کەسێ بدا وەك خۆی ئەو خێرە بکات وایە
## الدال على الخير كفاعله

٤٩١٤– ← (ب – ١ ز – ١٥ ل – ٨٧ ف – ٨)[١].

تەماشای (فضل اعانة الغازی) فەرموودەی یەکەم بکە.

## ٥٠) شادبوون بە پایە هەرە بڵندەکان بەوە دەبێ کە مرۆڤ کاروباری موسوڵمانا ڕایی بکاو خزمەتگوزاری مەردوم بێ
## الدرجات العلا في حوائج الناس

٤٩١٥– ← (ب – ١ ز – ١٤ ل – ٧٩ ف – ٣).

---

[١] بسند حسن (شرحه).

[٢] بسند صحيح (شرحه).

[١] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٥ ل/٨٧ ط/١ رقم/١١٧.

٤٩١٦- عَنْ حُصَيْنٌ (رَضي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ سَائِلٌ لابْنَ عَبَّاسٍ فَسَأَلَ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَتَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ قَالَ نَعَمْ. قَالَ أَتَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ قَالَ نَعَمْ. قَالَ وَتَصُومُ رَمَضَانَ قَالَ نَعَمْ. قَالَ سَأَلْتَ وَلِلسَّائِلِ حَقٌّ إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْنَا أَنْ نَصِلَكَ. فَأَعْطَاهُ ثَوْبًا ثُمَّ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ كَسَا مُسْلِمًا ثَوْبًا إِلاَّ كَانَ فِي حِفْظِ اللّهِ مَا دَامَ مِنْهُ عَلَيْهِ خِرْقَةٌ. رواه الترمذي في الرقاق[٢]:

حوصەین (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: سواڵکەرێ هاتە لای ئیبنو عەبباس سواڵی لێ کرد، ئیبنو عەبباسیش فەرمووی: ئایا شایەتی دەدەی کە هەریەزادن خودایەو بەس؟ گوتی: ئا، فەرمووی: ئەی شایەتی دەدەی کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە؟ گوتی: ئا. فەرمووی: ڕۆژووی ڕەمەزانیش دەگری؟ گوتی: بەڵێ: فەرمووی: هاتووی دەرووزە دەکەی، دەرووزەکەر مافی هەیە، پێویستە لەسەرمان کە بێ بەشت نەکەین، ئەو جاجلکێکی پێدا و فەرمووی: خۆم ژنەوتم لە حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ پارچەیێ جل بدا بە موسوڵمانێ تا پرزۆڵەیەکی ئەو جلە بە بەریەوە بمێنێ ئەو موسوڵمانە لە ئاگاداریی خودادا دەبێ! (ت).

٤٩١٧- ← (ب – ٣ ز – ٣٠٧ ل – ٣٤٤ ف – ٧ )[٣].

## ٥١) عەداڵەت و داد بناغەی پاشایەتی و دەوڵەتە : (العدل أساس الملك)

قَالَ اللّهُ تَعَالَى: {إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ – سورة النحل – ١٦/٩٠}.

٤٩١٨- ← (ب – ١ ز – ١١٤ ل – ٣٤٤ ف – ٧)[١].

٤٩١٩- عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ الْمُجَاشِعِيِّ (رَضي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ذَاتَ يَوْمٍ فِي خُطْبَتِهِ: أَلاَ إِنَّ رَبِّي أَوْ إِنَّ رَبِّي أَمَرَنِي أَنْ أُعَلِّمَكُمْ مَا جَهِلْتُمْ مِمَّا

---

[٢] تقدم في مجلد اول تسلسل/١٤ ل/٧٩.

[٣] تقدم في مجلد ثالث تسلسل/٣٠٧ رقم/٢٥٩٧.

[١] تقدم في مجلد أول تسلسل/١١٤ رقم/٦٨١.

عَلَّمَنِي يَوْمِي هَذَا. كُلُّ مَالٍ نَحَلْتُهُ عَبْدًا حَلاَلٌ وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ وَأَمَرَتْهُمْ أَنْ يُشْرِكُوا بِي مَا لَمْ أُنْزِلْ بِهِ سُلْطَانًا وَإِنَّ اللَّهَ نَظَرَ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ فَمَقَتَهُمْ عَرَبَهُمْ وَعَجَمَهُمْ إِلاَّ بَقَايَا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَقَالَ إِنَّمَا بَعَثْتُكَ لأَبْتَلِيَكَ وَأَبْتَلِيَ بِكَ وَأَنْزَلْتُ عَلَيْكَ كِتَابًا لاَ يَغْسِلُهُ الْمَاءُ تَقْرَؤُهُ نَائِمًا وَيَقْظَانَ وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَنِي أَنْ أُحَرِّقَ قُرَيْشًا فَقُلْتُ: رَبِّ إِذًا يَثْلَغُوا رَأْسِي فَيَدَعُوهُ خُبْزَةً قَالَ اسْتَخْرِجْهُمْ كَمَا اسْتَخْرَجُوكَ وَاغْزُهُمْ نُغْزِكَ وَأَنْفِقْ فَسَنُنْفِقَ عَلَيْكَ وَابْعَثْ جَيْشًا نَبْعَثْ خَمْسَةً مِثْلَهُ وَقَاتِلْ بِمَنْ أَطَاعَكَ مَنْ عَصَاكَ. قَالَ: وَأَهْلُ الْجَنَّةِ ثَلاَثَةٌ ذُو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ وَرَجُلٌ رَحِيمٌ رَقِيقُ الْقَلْبِ لِكُلِّ ذِي قُرْبَى وَمُسْلِمٍ وَعَفِيفٌ مُتَعَفِّفٌ ذُو عِيَالٍ - قَالَ - وَأَهْلُ النَّارِ خَمْسَةٌ الضَّعِيفُ الَّذِي لاَ زَبْرَ لَهُ الَّذِينَ هُمْ فِيكُمْ تَبَعًا لاَ يَتْبَعُونَ أَهْلاً وَلاَ مَالاً وَالْخَائِنُ الَّذِي لاَ يَخْفَى لَهُ طَمَعٌ وَإِنْ دَقَّ إِلاَّ خَانَهُ وَرَجُلٌ لاَ يُصْبِحُ وَلاَ يُمْسِي إِلاَّ وَهُوَ يُخَادِعُكَ عَنْ أَهْلِكَ وَمَالِكَ . وَذَكَرَ الْبُخْلَ أَوِ الْكَذِبَ وَالشِّنْظِيرُ الْفَحَّاشُ. رواه مسلم في صفة الجنة[٢]:

**عییازی کوڕی حیماری موجاشیعی (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە وتاردا فەرمووی: بزانن کە خودا فەرمانی پێکردووم کە لەو زانستەی خودا ئەمڕۆ فێری خۆمی کردووەو ئێوە نایزانن، لەو زانستەتان فێربکەم، خودا فەرمووی: هەرماڵێ خۆم بیدەم بە بەندەیێ لە ڕێگەیەکی ڕەواوە ئەو ماڵە حەڵاڵە، وە من لە بنەڕەتدا بەسروشت بەندەکانی خۆمم لەسەر پاکیو هەق وەرگرتن دروست کردووە، گشتیان بە سروشت ئامادەن بۆ وەرگرتنی هەق، بەڵام لە پاشان شەیتانەکان گریان دەدەنو لە ئایین وەریان دەگێڕنو ئەوەی من حەڵاڵم کردووە بۆیان ئەوان لێیان حەرام دەکەن، وە پێشیان دەڵێن کە بەساختەو ساختەکاری هاوبەشی درۆ بۆ من دابنێنو ئەوانیش بە گوێیان دەکەن. لەپێش ڕەوانەکردنی مندا خودای گەورە سەرنجێکی دانیشتوانی سەرزەوی دەدا، لە عەرەبو ناعەرەبیان دەڕەنجێو لێیان بێزار دەبێ، تەنیا لە چەند دەستەیێ**

[٢] مسلم. جنة ونعيمها: ٧١٣٦.

نەبێ لە خاوەن نامەکان کە لەسەر هەق مابوون، وە خودای گەورە بەمنی فەرمووو: بۆیە من تۆم کردووە بە پێغەمبەرو ڕەوانەم کردووی بۆ سەر مەردوم تا خۆت تاقی بکەمەوەو خەڵکیش بەهۆی تۆوە تاقی بکەمەوە نامەیەکیشم بۆت ناردووە ئاو نایشۆرێتەوە، چونکە لە سینگی موسوڵماناندایەو هەموو کاتێ لەبەر دەیخوێننەوە، چ بە خەبەربیو چ خەوتووبی دەوری دەکەیتەوە، وە خودا فەرمانی پێ کردووم کە قورەیش بە نووری ئەم قورئانە بسووتێنم، وەك برووسکە وابێ لە گوێیاندا. گوتم: ئەی خودای من! ئاخر سەرم وەك کولێرەی شکاو دەشکێنن، من کەمو ئەوان زۆر مەگەر خۆت فریام بکەوی. فەرمووی: چۆن ئەوان تۆیان دەرکرد تۆیش ئاوا ئەوان دەربکە، وە بچۆرە سەریان بۆ جەنگ ئێمە تۆ سەردەخەین بەسەریاندا، وە ماڵو دارایی بەخت بکە، ماڵو داراییت دەدەینێ، وە تۆیەك سوپابنێرە ئێمە خۆمان پێنج سووپای تر لە هێزی ئاسمانی دەنێرین بۆ یاریدەیان. بیکە بە دەستوور بە لەشکری ئیسلام شەڕ بکە لەگەڵ لەشکری ئیسلامدا. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دانیشتوانی بەهەشت یەکێکن لەم سێ کەسەو لەم سێ گرۆیە بەدەرنین: یا کاربەدەستی داد پەروەری خێرکەری بەخشندەی خاوەن تەوفیقەو لەخوداوە سەکەوتووە، یا پیاوی بەرەحمی بە بەزەیی دڵنەرمە، کە لەگەڵ هەموو خزمو خۆیشو موسوڵمانێکا دڵنەرمو بەرەحمە، یا هەژاری دەسو دەمو دڵو داوێن پاکی خاوەن خێزانەکە بۆ خۆی ڕەنج دەداو بەڕەنجی شانی خۆی بەبێ سکاڵا خێزانی خۆی بەخێو دەکاو، چاوی لەدەستی خلەو بلەو خەڵکەوە نییە. فەرمووی: خەڵکی دۆزەخیش لەم پێنج گرۆیە بەدەرنین: گرۆی ئەوگێلو گەلحۆو بێفەڕانەی کە خۆیان بە ئێوەدا هەڵ دەواسنو ماڵو حاڵێکیان نییەو خەمی ماڵو منداڵ ناخۆنو نە بۆ دینو نە بۆ دنیا هەوڵ نادەن، گرۆی ئەو ناپاکە نەوسنو چڵێسو ماڵپەرستانەی کە لەهەرلا گوێچکەی تەماعیان بۆ دەربکەوێ خۆیانی بۆ دەکوتنو کلکە لەقێی بۆ دەکەن! گرۆی ئەو پیاوە فێلاوییانەی کە شەوو ڕۆژ بە دەورتا دێنو بۆ هەل دەگەڕێن کە فێڵو گزیو ناپاکی لەخۆتو ماڵو منداڵو ناموست

بکەن! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) باسی کرۆیەکی تریشی کرد کە دۆزەخین، یا باسی گرۆی ڕەزیلی و ڕژدیی کرد، یا باسی گرۆی درۆی کرد، کە ئەوانیش دۆزەخین، فەرمووی: گریەکی تریشیان مرۆی سەر سەری بەدگۆی بەدکرداری بەدرەفتارە! (م — خودای لێ ڕازی بێ).

## ٥٢) پایانێ (خاتمەیێ) باسی خۆشەویستی شیرازەی ئاییندای خۆشەویستیی خوداو پێغەمبەرە دروودی خودای لەسەر

## خاتمة في المحبة ملاك الدين في محبة الله تعالَى ورسوله ﷺ

← (ب — ١ ز — ٩ ل — ٥١ ئایەتی سێیەم).

٤٩٢٠ — ← (ب — ١ ز — ٢ ل — ٢١ ف —٣)[1].

٤٩٢١ — ← (ب — ١ ز — ٢ ل — ٢٤ ف — ١١)[2].

٤٩٢٢ — عَنْ أَبِي ذَرّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَفْضَلُ الأَعْمَالِ الْحُبُّ فِي اللّٰهِ وَالْبُغْضُ فِي اللّٰهِ. رواه ابو داود[3]:

ئەبوزەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گەورەترین کردەوەی بەندە خۆشەویستییە کە ساخ لەبەر ڕەزای خودابێ، هەروەها ڕق لەشت بوونە کە ساخ لەبەر ڕەزای خودا ڕقی لەو شتەبێ. (د— (ڕەزای خوای لێبێ)).

## ٥٣) کەسێ بەڕاستی خودای خۆش بوێ خودا ڕەزای سووك دەکاو خوداو بەندەکانیش ئەویان خۆش دەوێ : (من أحب الله أحبه الله والعباد)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا — سورة مريم}. ← (ب — ٧ ز — ٢ ل — ٢٥ ف — ٨).

---

[1] تقدم في مجلد أول تسلسل/٢ ل/٥١ ط/١ رقم/٥.

[2] تقدم في مجلد أول تسلسل/٢ ل/٢٤ ط/١ رقم/١٣.

[3] سكت عن درجه الشارح.

٤٩٢٣- ← (ب – ٧ ز – ٢ ل – ٢٥ ف – ٨)[1].

٤٩٢٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرَأَيْتَ الرَّجُلَ يَعْمَلُ الْعَمَلَ مِنَ الْخَيْرِ وَيَحْمَدُهُ النَّاسُ عَلَيْهِ قَالَ: تِلْكَ عَاجِلُ بُشْرَى الْمُؤْمِنِ. رواه مسلم. نسأل الله فعل الخيرات وترك المنكرات آمين[2]:

ئەبو زەڕ (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) كرا: قوربان: ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو هەندێ كەس هەندێ كاری باش دەكەن‌و خەڵكی تر لە كارەكەیان ڕازین‌و لەسەر ئەوە وەسپی جوانیان دەكەن، جا ئایا ئەوە زیانی نابێ بۆی؟ فەرمووی: نەء، بەڵكوو ئەو شۆرەتە جوان‌و پەسنە باشە نۆبەرەی مزگێنی موسوڵمانە، لە جیهانا ناوو شۆرەتی جوان‌و لەژینەوەدا پاداشی باش، دەی چی لەوە باشتر دەبێ، وەك خودا دەفەرموێ: {لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَياةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ ← (ب – ٦ ز– ١١ ل – ٢٣٦ ف – ٢) (م).

## ٥٤) كەسێ كەسێكی خۆش بوێ ساخ بۆ ڕەزای خودا حەشری لەگەڵ حەشری ئەودا دەبێ : (من أحب قوما حشر معهم)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا – سورة النساء}. ← (ب/٤ ز/١١٤ ل/٣٧٣ ف/٢).

٤٩٢٥- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ الْمُرَادِيَّ فَقُلْتُ: هَلْ حَفِظْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الهَوَى شَيْئًا؟ قَالَ: نَعَمْ كُنَّا مَعَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فَنَادَاهُ رَجُلٌ أَعْرَابِيٌّ جَافٍ جِلْفٌ كَانَ فِي آخِرِ الْقَوْمِ بِصَوْتٍ جَهْوَرِيّ: يَا مُحَمَّدُ يَا مُحَمَّدُ. فَقَالَ لَهُ الْقَوْمُ: مَهْ إِنَّكَ قَدْ نُهِيتَ عَنْ

---

[1] تقدم في مجلد سابع تسلسل/٢ ل/٢٥ ط/١ رقم/٣٩٩٠.

[2] راجع مجلد سادس. تسلسل/١١ رقم/٣٩١٧.

هَذَا، فَأَجَابَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَحْوًا مِنْ صَوْتِهِ هَاؤُمُ فَقَالَ: الرَّجُلُ يُحِبُّ الْقَوْمَ وَلَمَّا يَلْحَقْ بِهِمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ. قَالَ زِرٌّ: فَمَا بَرِحَ يُحَدِّثُنِي حَتَّى حَدَّثَنِي أَنَّ اللَّهَ جَعَلَ بِالْمَغْرِبِ بَابًا عَرْضُهُ مَسِيرَةُ سَبْعِينَ عَامًا لِلتَّوْبَةِ لاَ يُغْلَقُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ قِبَلِهِ وَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا). رواه الترمذي (ورد نص هذا الحديث في مبحث (وقت التوبة) قدمناه الى هنا للاختصار المترجم)[1]:

زیڕی کوڕی حوبەیش (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: چوومە خزمەتی صەفوانی کوڕی عەسسالی موورادی (خودای لێ ڕازی بێ) عەرزیم کرد: ئایا لەبارەی خۆشەویستی ڕەواوە هیچت لەیاد ماوە کە لە پێغەمبەر خۆیت بیستبێ؟ فەرمووی: بەڵێ، لەسەفەرێکا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی لووتو شکی کەللە بۆش، کە لە دوای خەڵکەکەوە بوو، لەلای خۆیەوە بە دەنگێکی گڕی گەورەی بەرز بانگی حەزرەتی کرد گوتی: هۆ موحەممەد! هۆ موحەممەد! ئێمەیش تێمان خوڕی: خانە خراپ شتی وا مەکە، دەنگ بەرز مەکەرەوە، تۆ لە خزمەتی پێغەمبەردای، شتی وا لە خزمەتی ئەو زاتەدابێ وێڵییەو قەدەغەیە، دەبێ بەڕێزو بەقەدرەوە بانگی حەزرەت بکرێ! کەچی گوتی: بەخودا دەنگم نەرم ناکەمەوە، حەزرەتیش (دروودو سەلامو صەڵاتی خودای لەسەربێ) لەسەر شێوەی دەنگی کابرا وەڵامی دایەوەو فەرمووی: ئادەی بڵێ گوێم لێتە! جا پیاوەکە گوتی: پیاوی وا هەیە کۆمەڵێکی خۆش دەوێ بەڵام بە کردەوەی باش بەوانا ناگا ئایا پایەی ئەم پیاوە چییە؟ ئایا سوود لەو خۆشەویستتییە وەردەگرێ؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاو لە قیامەتا، لە هەموو مەڵبەندەکانا لەگەڵ خۆشەویستی خۆیدا دەبێ. ئیتر صەفوان گەلێ فەرموودەی حەزرەتی گێڕایەوە بۆمان، هەتا هەتە سەر ئەو فەرموودەیە کە

---

[1] بخاري. فضائل الصحابة: ٣٦٨٨. مسلم. بر وصلة: ٦٦٥٥.

دەفەرموێ: خودا لە ڕۆژئاوادا دەرگایەکی دروست کردووە بۆ تەوبە، حەفتا ساڵ ڕێ پانە، ئەو دەرگایە داناخرێ هەتا هەتاو لە خۆرئاواوە هەڵنەیێ، ئەم ئایەتە ئیشارەتە بۆ کاتی داخستنی ئەم دەرگایە کە خودای باڵا دەستو خاوەن شکۆ دەفەرموێ: {يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا - سورة الأنعام}. ـ (ب - ٦ ز - ٧ ل - ١٦٥). (ت-س/ص).

٤٩٢٦- عَنْ أَنَسٍ (رضي الله عنه) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم): مَتَّى السَّاعَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟ قَالَ: مَا أَعْدَدْتُ لَهَا مِنْ كَثِيرِ صَلاَةٍ وَلاَ صَوْمٍ وَلاَ صَدَقَةٍ، وَلَكِنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. قَالَ: أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ. زاد في رواية: وَنَحْنُ كَذَلِكَ. قَالَ: نَعَمْ. فَفَرِحْنَا يَوْمَئِذٍ فَرَحًا شَدِيدًا. رواه الشيخان والترمذي والله أعلم[٢].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی لە پێغەمبەری پرسی: کەی قیامەتە؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: باشە چیت بۆی ئامادەکردووە؟ گوتی: وەنەبێ لە نوێژو ڕۆژووو خێرو صەدەقە زۆرم ئامادەکردبێ بۆی، بەڵام دەستمایەی دەستم ئەوەیە کە خوداو پێغەمبەری خودام خۆش دەوێ! فەرمووی: دەمژدەت لێبێ تۆ لە مەڵبەندەکانی قیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبی کە خۆشت دەوێن.

لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی پترە: ئێمەیش پرسیمان: باشە ئەمە بۆ ئێمەیش هەروایە؟ فەرمووی: بەڵێ، هەموو کەسێ لە ئێستگاکانی قیامەتدا، لە بەهەشتدا، لە هەموو مەڵبەندەکانی تردا لەگەڵ خۆشەویستی خۆیدا دەبێ. ئیتر ئەو ڕۆژە لەهۆی ئەم مژدە خۆشەوە شادیو خۆشییەکی فرە گەورەمان تێ کەوت! (ش/ت).

---

[٢] مسلم. بر وصلة: ٦٦٥٢.

**٥٥) خۆشەویستی پیاو چاکانو دینیو دیداریانو دانیشتن لەگەڵیاندا بەهرەیەکی زۆر گەورەیە : (محبة الصالحین وزیارتهم ومجالستهم غنیمة کبری)**

٤٩٢٧- ← (ب – ٥ ز – ٦٦ ل – ٢٣٧ ف – ٢)[١].

لەم باسەدا لەدواوە ئاوایە:

(والا رواح جنود مجندة فما تعارف منها ائتلف وما تَنَاكَرَ منها اختلف):

لە ئەزەلدا گیانگەلیش لەناو خۆیاندا وەك چەن کۆمەڵە سەربازێکی قاڵبوو وان، کە هەر کۆمەڵەی جۆرە مەشقێکی تایبەتییان کردبێ، خودا کردوونی بەچەن چەشنی جیا جیا، جا بۆیە ئێستا لە عالەمی دنیادا دەق نموونەیەکن لە عالەمی ئەزەلیان، ئەوانەیان کە هاوتەحرو هاولفی یەکن هۆگری یەك دەبنو دۆستایەتی لەگەڵ یەك دەبەستن، ئەوانەشیان کە لەیەك جوداوازن نامۆیی لەیەك دەکەنو دژی یەك دەوەستن! (ش/د)ز

٤٩٢٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِـهِ فَلْيَنْظُـرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ. رواه أبوة داود والترمذي[٢]:

دیسان لەوەوە (خودای لێ رازی بێ) حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بنیادەم لەسەر ئایینو کێشی دۆستو برادەری خۆیەتی، کەوایە با باش باش وورد ببێتەوە کە کێ دەگرێ بە دۆستو ئاشنای خۆی! (د/ت–ش/ح).

٤٩٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ[٣]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): تەنیا هاوڕێتی موسوڵمانی خاوەن باوەڕ بکەو بەس، وە نانو ئاویشت با تەنیا موسوڵمانی لەخودا ترس بیخواتو بەس! (د/ت/ئە/حاکم–س/ص).

---

[١] تقدم في مجلد ثاني تسلسل/٦٦ ط/١ رقم/٣٥٣٩.

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] بسند صحيح (شرحه).

٤٩٣٠- عَنِ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ. رواهما أبو داود والترمذي وأحمد والحاكم[٤].

میقدادی کوڕی مەعدیکەریب (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ پیاوێ برادەرێکی خۆی خۆشویست با ئاگاداری بکاتەوە کە خۆشی دەوێ. (د/ت/ئە/حاکم-س/ص).

٤٩٣١- وَقَالَ أَنَس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): كَانَ رَجُل عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَرَّ بِهِ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّ هَذَا. قَالَ: أَعْلَمْتَهُ. قَالَ: لاَ قَالَ: أَعْلِمْهُ. قَالَ: فَلَحِقَهُ فَقَالَ إِنِّي أُحِبُّكَ فِي اللَّهِ. فَقَالَ أَحَبَّكَ الَّذِي أَحْبَبْتَنِي لَهُ. رواه ابو داود[٥].

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ لەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەت بوو، پیاوێکی دیکەیش لەوێ بوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئەم پیاوەم خۆش دەوێ. فەرمووی: ئاگادارت کردۆتەوە؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دە ئاگاداری بکەرەوە. پیاوەکەش دوای کەوتو گرتیەوەو پێی گوت: من لەبەر خاتری خودا تۆم خۆش دەوێ. ئەویش پێی گوت: ئەو کەسەی کە تۆ لەبەر خاتری ئەو منت خۆش دەوێ تۆی خۆش بوێ! (د-خودای لێ ڕازی بێ).

٤٩٣٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالسَّوْءِ كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً ، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً. رواه الثلاثة[٦].

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هاوڕێو هاونشینی باش وەك میسك فرۆش وایە، هاوڕێو

---

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] سكت عن درجته الشارح.

[٦] تجريد البخاري/٥ ل/١٣٢ رقم/١٨٣٦ = ٥٥٣٤، ٣١٠١. مسلم. بر وصلة: ٦٦٣٥. رياض/١ ل/٢٨٨ رقم/٣٦٣. تحفة الأشراف: ٩٠٥٤.

هـاودەمی خـراپ وەك مووشـە دەمەچـی وایـە، میـسك فـرۆش یـا خـۆت لێـی دەکڕی، یـا خـۆی بەشـت دەدا، یـا هـەر هـیچ نـەبێ بـۆ نەخۆشـەکەی دەچـێ بەسەرتا، بەڵام مووشەدەمەچی واتـە: ئاسنگەر یا جلەکانت دەسووتێنێ، یا هیچ نەبێ بۆ چرووکێکی پیس دەێت بەسەرتا (ش/د- خودایان لێ ڕازی بێ).

٤٩٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى فَأَرْصَدَ اللَّهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكًا فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ قَالَ أُرِيدُ أَخًا لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ. قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا قَالَ: لاَ غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. قَالَ فَإِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكَ بِأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ. رواه مسلم[٧]:

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: پیـاوێ دەچـێ بـۆ گونـدێ بـۆ دیـدەنی برادەرێکـی خـۆی، خـودا فریشتەیێ دەنێرێتە سەر ڕێگەکەی، کە دەگاتە لای پێـی دەفـەرموێ: بـۆ کوێ دەچیێ؟ دەڵێ: دەچم بۆ لای برادەرێکم لەم گوندە. فریشتەکە دەفـەرموێ: ئایا هیچ نیازێکت پێی هەیە؟ دەڵێ: خەیر، تەنیا ئەوە نەبێ کە ساخ لەبەر خاتری ڕەزای خودای گەورە ئەوم خۆش دەوێ، دەفەرموێ: دە من فرستادەی خودام منی ناردووە بۆ لای تۆ کە پێت بڵێم: کە خودایش تۆی خۆش دەوێ، چونکە تۆ ئەوت لەبەر خودا خۆش دەوێ (م).

٤٩٣٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ عَادَ مَرِيضًا أَوْ زَارَ أَخًا لَهُ فِي اللَّهِ نَادَاهُ مُنَادٍ أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلاً. رواه الترمذي بسند حسن[٨]:

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەر کەسێ سەر لە نەخۆشێ بدا، یا دیـنی برادەرێکی ئایینی خـۆی بکـا، فریشتەیێ لـە غەیبـەوە لەلایـەنی خـوداوە بـانگی دەکـا: هـەی خـۆش بیـت و بەخۆشـی ئـوغر بکەیت و لە بەهەشتا هەوار هەڵ دەیت! (ت-س/ح).

---

[٧] مسلم. بر وصلة: ٦٤٩٥.

[٨] سنده حسن عند الترمذي.

## ٥٦) دۆست و ئاشناو دەستەبراکان لە ڕۆژی قیامەتا لە سێبەری بارەگای خودادا دەبن : (المتحابون في ظل العرش يوم القيامة)

٤٩٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَيْنَ الْمُتَحَابُّونَ بِجَلاَلِي الْيَوْمَ أُظِلُّهُمْ فِي ظِلِّي يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلِّي. رواه مسلم والترمذي. ولفظه: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الْمُتَحَابُّونَ فِي جَلاَلِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): لە ڕۆژی ژینەوەدا خودای گەورە دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کە لەبەر خاتری شکۆمەندیی من یەکترییان خۆش دەویست لە کوێن؟ با بێن ئەمڕۆ چاکەیان دەدەمەوە لە سێبەری خۆما دایان دەنێم، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە جگە لە سێبەری ڕەحمەتی من هیچ سێبەرێ نییە (م/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەو کەسانەی کە لەبەر خاتری مەزناهی و شکۆمەندی من یەکیان خۆش دەوێ وان بەسەر مینبەری نوورەوە، پێغەمبەران و شەهیدا خۆزگەیان پێ دەخوازن!

٤٩٣٦- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ لأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ وَلاَ شُهَدَاءَ يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى. قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ. قَالَ: هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللَّهِ عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ وَلاَ أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا فَوَاللَّهِ إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ لاَ يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ وَلاَ يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ. وَقَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ (أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ). رواه أبو داود نسأل الله كمال الامن والايمان واليقين آمين[2]:

عومەر (خۆشنوودیی خودای مەزنی لێبێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): لەناو بەندە باشەکانی خودادا کەسانێکی وا باش هەن،

---

[1] مسلم. بر وصلة: ٦٤٩٣.

[2] رواه أبوداود في الرهن في البيع بسند صالح (شرحه).

نە لە پێغەمبەرانن‌و نە لە شەهیدانن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پایەو پلەیان ئەوەندە بەرزو خۆش‌و نازدارە لە ڕۆژی ژیانەوەدا پێغەمبەرەکان‌و شەهیدەکان خۆزگەیان پێ دەبەن، چونکە ئەوەندە خاوەن خاترن لەلای خودا. یاران (ڕەزای خودایان لێبێ) گوتیان: قوربان! پێمان نافەرمووی کە ئەوانە کێن؟ فەرمووی: کەسانێکن – کە لەبەر خۆشەویستیی خوداو لەهۆی ڕەحمەتی ئەوەوە – یەکرتیان خۆش دەوێ، نە خزم‌و خوێشی یەکترین، نە نیازی پارەو پوولیان بە یەکتری هەیە، دەی سوێند بە خودای گەورە ڕوویان یەك پارچە نوورەو وان لەسەر پایەی نوور! لەو کاتانەدا کە مەردوم دەکەونە ترس‌و بیمەوەو سەریان لێ دێتە یەك ئەوان باکیان لە هیچ نییە، وە کاتێ مەردوم خەم‌و پەژارە دایان دەگرێ، ئەوان ئاسودەو بێ خەمن، ئەوجا حەزرەت بۆ پشتگیری ئەم باسە ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ – سورة يونس}. ← (ب/٦ ز/١١ ل/٢٣٥ ف/١).

٥٧) **خۆشەویستی دەبێ مامناوەندی بێ : (التوسط في الحب مطلوب)**

٤٩٣٧– عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حُبُّكَ الشَّيْءَ يُعْمِي وَيُصِمُّ. رواه ابو داود والإمام أحمد[1]:

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) کە تۆ شتێکت خۆشویست لە ئاستی کوێرو کەڕ دەبیت‌و هەست بەخراپەی ناکەی (د/ئە–س/ح).

٤٩٣٨– عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَحْبِبْ حَبِيبَكَ هَوْنًا مَا عَسَى أَنْ يَكُونَ بَغِيضَكَ يَوْمًا مَا وَأَبْغِضْ بَغِيضَكَ هَوْنًا مَا عَسَى أَنْ يَكُونَ حَبِيبَكَ يَوْمًا مَا. رواه الترمذي والبيهقي والطبراني. والله أعلى وأعلم[2]:

---

[1] بسند حسن (شرحه).

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تۆ کە خۆشەویستێکت خۆشویست چکێکی تیادا بهێڵەرەوە، مەبادا ڕۆژێ لە ڕۆژان ببێ بەناحەزت، هەروەها کە ڕقیشت لە ناحەزێ بوو بەشی کاتی ئاشتی تیادا بهێڵەرەوە نەوەکا ڕۆژێ لە ڕۆژان ئاشت ببنەوەو ببێ بە دۆستت!.

ئەم فەرموودە پیرۆزەیە ئەم پێشەوایانە گێڕاویانەتەوە: (ئیمامی تیرمذیو ئیمامی بەیهەقیو ئیمامی طەبەرانی (ڕەزای خودای گەورەیان لێبێ).

عدد أحادیث کتاب البر والاخلاق مئتان وخمسة وسبعون حدیثا فقط:

مامۆستای زاناو دانا، دانەری ئەم تاجە پیرۆزەیە لێرەدا دەفەرموێ: (ژمارەی فەرموودەکانی نامەی ڕەوشتو کردەوەی چاکە تەنیا دوو سەدو حەفتاو پێنج فەرموودەیەو بەس).

پایانی میسکە بۆ نامەی چاکە

نامەی یادی خوا کەوا هات کاکە!

زیکری سەرزمان بۆ چاوی دڵمان

کلەو، بۆزامی مەڵهەمەو دەرمان

ئەگەر وانە بوو سووچی گوڵ چییە

کە گوڵکارەکەی هەر چیو پەرچییە

چاکە بێ ئیمان، زیکری بێ تەقوا

وەک شیعری نوێیە، نەکێش، نەسەروا

ئەم جۆرە شیعرەش کۆنە یا نوێیە

وەک چەمسووتەکەی بێ تامو خوێیە!

کەڕو دەنگی دوور؟ کوێرو ڕەنگی نوور؟

کوجا مەرحەبا عەرەبو تەمبوور!ۋ

---

(٢) سکت عن درجته الشارح.

بسمل باسم ربه الشكور
عابده الموسوم ملا نوري
حمدل باسم ربه الغفور
عُبَيْدُهُ المذنب عبد النور!
صلى على رسوله الوقور
خادمه المخلص كاكا نوري
يا سائلي عن آية الابرار
مثلهم على لساني جاري:
لسانهم رطب بذكر الباري
قبلة قلبهم هوى الغفار!،،
قَمُهُمُ المكثار بالاذكار
كأنه فُوجَوْنَةِ العطار!
اذا غدا العبد من الاخيار
يسبح في خزائن الاسرار
فالروح في لألآة الانوار
سابحة كالفلك في الانهار
الذكر بالعشي والابكار
من شيمة اليقظان بالاسحار
يا من سئمت العيش في الديجور
آذاك بوم بيتك المهجور
ان رمت خوضا في بحار النور
بادر الى بدر الدجى المشهور
ان رمت رتعا في رياض النور
فالزم سلوك الذاكر المذكور

كالنحل من مجاجة الزهور

تجمع أريا بيع بالشذور

اجمع من الذكر شذا الثغور

يشتر منك تاجر العطور!

الى متى تبقى على الجسور

يغشاك زيغ عالم الكدور؟

يعشيك طيف هالة البدور

ترضى من الصحاح بالكسور؟

هيا الى لآلي البحور

سَارِعْ الى مشاهد الحضور

ادفع مقدما مهور الحور

أعرس على ذرى جبال الطور!

اجعل سنا لسانك الذكور

سفير نور قلبك الطهور!

انزع من القلب هوى الشرور

ازرع به من خيرة البذور

بِأصغريه المرء في المشهور

هما قوام بيته المعمور!!

من لازم الاوراد والاذكارا

سيقطف الورود والازهارا

من عاشر الابرار والاخيارا

وهجر الفجار والاشرارا

واجتنب الآثام والاوزارا

سَيَقْطِفُ الاثمار والانوارا!

قتُبْ إلى إلهكَ ياعَبْدَهُ
وَاجْعَلْ دُمُوعَكَ الشَّفِيعَ عِنْدَهُ
يا طالباً لاسلم المغانم
وآملا في أحسن الخواتم!
فاخفض جناح الذل عند العالم
وكن له في الطاعة كالخادم
وللمشايخ ذوي المكارم
كن عبدهم تكن من الاكارم
وكن مع القوم على التفاهم
ولا تكن في عون واش واهم

**إيضاح بعض الجمل والكلمات في القصيدة:**

١- فوجونة العطار. فو: الفم. جونة العطار: محفظة العطور عند العطارين يعني من بركة كثرة ذكر الله يتعطر فم الذاكر مثل قنينة العطور. (مثل المؤمن يقرأ القرآن مثل الاترجة ريحها طيب وطعمها طيب) راجع فضائل القرآن.

٢- يا من سئمت العيش في الديجور: كناية عن تولي زمن الشباب وعدم الإستفادة منه، كأنه من شدة اليأس منه قد مَلَّهُ، وجه الشبه بين الامرين: سواد شعر الشباب يشبه ظلام الديجور. البيت المهجور: القلب الخالي من ذكر الله، وبومه: الشيخ الأَشْمَطُ الغافل عن طاعة الله، يشبه راسه الاشمط. الغراب الابقع والبوم الآلف للخرائب!

٣- بدر الدجى: كلام الله تعالى، فانه نور وضياء، قد أَخْرَجْنَا من الظلمات الى النور، وتلاوة القرآن الكريم من افضل الأذكار وأزكاها.

٤- الرتع: الذكر والتسبيح، ورياض النور: مجالس الذكر ومجالس العبادات والمساجد وحلق الذكر، الذاكر المذكور: العبد الذاكر، الكونه يذكر ربه فهو ذاكر ولكونه يذكره ربه فهو مذكور.

٥- تاجر العطور: المقصود به الله تبارك وتعالى، قال تعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ. تؤمنون بالله. وقال تعالى: إِنَّ اللَّهَ اشْتَرَى مِنَ الْمُؤْمِنِينَ أَنفُسَهُمْ وَأَمْوَالَهُم بِأَنَّ لَهُمُ الْجَنَّةَ}.

٦- مهور الحور: عبارة عن الإيمان، ثم المواظبة على الطاعات والاوراد ورياضة النفس، حتى يصل العبد الى مرتبة المكاشفات والكرامات والتجليات الربانية، كما تجلى ربنا لسيدنا موسى فوق جبل الطور.

٧- قوام بيته المعمور: اشارة الى الحديث الشريف: مثل البيت الذي يذكر الله فيه والبيت الذي لا يذكر الله فيه مثل الحي والميت، والى الحديث الآخر: ان الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب.

٨- فاخفض جناح الذل: أي ان كنت صادقا في طلبك، تعلم الشريعة من العلماء الكرام، قبل كل شيء، ولا تكثر عليهم من الاسئلة الغير الضرورية ثم خذ السلوك من مشايخ الطريقة، لتكون من الذاكرين الله كثيرا والذاكرات، فالشريعة والطريقة كالعين والسَّمْع الاولى نور العين والثانية نور القلب.

٩- وكن مع القوم: أي دع ما يَقُولُهُ المبطلون من الطعن المغرض في العلماء والمشاريخ، فرجال الشريعة أسمى من أن ينال منهم عواء السفهاء، وكبار رجال الصوفية أعظم من أن ينزلهم من عليائهم سخف السخفاءِ.

(المترجم)

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی زیکرو یادی خودای گەورەو دوعاو نزاو پاڕانەوەو تەوبەکردنو پەشیمانی لە گوناه

(ئەم نامەیە پێنج باسو پایانێکە)

## ٥٨) باسی یەکەم: باسی گەورەییو یادو زیکری خوداو پایەبەرزیی زیکرکارانی خودای گەورە

**كتاب الاذكار والأدعية والإستغفار والتوبة : (وفيه خمسة أبواب وخاتمة)**

**الباب الأول: في فضائل الذكر والذاكرين**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّـهَ ذِكْـرًا كَثِيرًا، وَسَبِّحُوهُ بُكْـرَةً وَأَصِيلًا – سورة الأحزاب – ٣٣/٤١-٤٢}.

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان بە ئیسلامی پیرۆز هەیە! یادی خودا بکەن، لە زیکرو فیکری یەزدان قەت بێ ئاگا مەبن، یادی خودا ئارامی گیانە، هۆی سەربەرزی هەر دوو ژیانە، کەواتە بەزۆری ذیکری ئەو زاتە مەزنە بەکەن، بەتایبەتی لە بەیانی و ئێوارەدا تەسبیحات بکەن.

وَقَالَ تَعَالَى: {فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُواْ لِي وَلاَ تَكْفُرُونِ – سورة البقـرة – ١٥٢/٢}.

واتە: ئەی بەندەکانم! ئێوە یادی من بکەن، لەناو نوێژدا، لەناو گشت تاعەتێکا، بەتەنیا، بەکۆمەڵ، لەناو کۆڕی زیکردا، بەدەم، بەزمان، بە دەست، بە قەڵەم، بە کردار، بەگفتار، لە خۆشی دا، لە ناخۆشیدا، بە هەموو بۆنەیەکی ڕەواوە، لەسەر هەموو حاڵێ، لە هەموو بارۆدۆخێکا، تا بەرە بەرە زیکری خودا دەبێ بەویردی سەرزمانتانو بەخۆراکی گیانتان، لە حاڵی وادا منیش یادی ئێوە دەکەمو لەناو ئەنجومەنی هەرە باڵادا باسی باشیتان دەکەمو لەناو فریشتەکاندا شانازیتان پێوە دەکەمو پاداشی فرە باشتان دەدەمێ. لەهەمان کاتدا سوپاسی نازو نیعمەتو بەهرەکانی من بکەن، کە خۆتان دەزانن چەندە چاکەم هەیە بەسەرتانەوە، ئەوەتا بە بەرچاوەوە نیعمەتانی خودا لە ژمارە نایەنو مشەو بێ شومارەن، لە خواردن، لە نۆشین، لە پۆشاك، لە خۆشی

دەروونیو ئاسایشی گیانی، لە بەهرەی ماڵو منداڵو خێزانو کەسوکار، لە هاوسەرایەتی، لە ئەندامی ڕێکوپێکی ناسکی نازدار، وەك چاو، گوێ، لووت، هەست، دەست، دەم، زمان، پێ، پەنجە، ناخون، برژانگ، پێستی ناسكو نازدار، لەشولاری خنجیلەو نەشمیلە، زینهار سەد زینهار نەکەن بە نادانی لەباتی سوپاسی خودا ناسوپاسیی بکەنو چاکەی ئەوتان لەبەر چاو نەبێ[1].

---

(١)

غـــذاك ربـــك الجـــواد بـــالمنن
أعطـــاك مـــا منهـــا بـــدا ومـــا بَطـــنْ
منحـــت أعْـــضَاءً أجـــادت المهـــن
فـــلا يقـــدرن بـــأبْهَظِ الـــثَّمَنْ!
ومـــن يبـــع أصـــغرها بـــألف مـــن
مـــن عَـــسْجَدٍ يظهـــر لـــهُ بخـــس الـــثَّمَنْ
ومـــن يبيـــع بـــصره بـــألف طـــنْ
مـــن ذهـــب يَـــبِنْ لـــهُ كـــل الغـــبن!
يـــا غارقـــا في الـــنعم الى الـــذَّقَنْ
أعلـــم أمامـــك الكـــروب والفـــتن
كيـــف تكـــون أن وقعـــت في المحـــن
وقلـــب الـــدهر لـــك ظهـــر المِجَـــنْ
حـــشرجة المَـــوْتِ سَـــرَتْ فيـــك كمـــن
دب علـــى شـــجرة للحـــس مـــن
كـــالفرخ في البَـــيْضِ درجـــت في الكفـــن
ثُـــمَّ حـــشرت بـــين أضْـــيَقِ الـــسكن!
كيـــف يكـــون الحـــال في آتـــى الـــزمن
حيـــثُ تنـــادى: يـــا فـــلان بـــن فـــلان!:
يـــا قادمـــا مـــن وطـــنِ الى وطـــنِ!
قـــبض الجنـــان مـــن هنـــا أيـــن الـــثَّمن؟

(المترجم)

وَقَالَ تَعَالَى: {وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا}. ← (ب – ١ ز – ١٨١ ل – ٤٩٦ ف – ١١).

٤٩٣٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي. وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ وَإِنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: بەندەی من گومانی چۆن بێ بەمن من وا دەبم لەگەڵیدا. لەو دەمەدا کە ئەو ناوی من دەباو یادی من دەکا خۆم وام لەگەڵیدا، جا ئەگەر ئەو بەتەنیا هەرخۆی یادو زیکری من بکا ئەوا منیش هەر خۆم بەنهێنیێ یادی ئەو دەکەم ئەگەر ئەو لەناو دەستەیەکا یادو زیکری من بکا ئەوا منیش بە ئاشکرا لەناو دەستەیەکی باشتردا یادی ئەو دەکەم، ئەگەر بەندە بستێ لەمن نزیك ببێتەوە من باڵێ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر ئەو باڵێ لەمن نزیك بێتەوە من دوو باڵ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر ئەو بە رۆیشتنی ئاسایی بێ بۆلای من، من بەلۆقە دەچم بەپیریەوە، واتە: تا بەندە بەتاعەت خۆی لەمن نزیك بکاتەوە من رەحمەتی خۆم زیاتر لەو نزیك دەکەمەوە (ش/ت. خۆشنوودیی خودایان لێبێ).

من وا دەزانم کە ئەم فەرموودە پیرۆزە دەرگا ناخاتە سەر پشت بۆ ئاواتی هیچ و پووچ و گومانی باش بە بەلاش، گەرچی بۆنی ئەوەی لێ دێ کە لایەنی هیوا بەرەحمەتی خودا قەویتربێ باشترە، هەروەك دەرگای رەشبینی و بەدبینی بەبێ هۆی رەوا لەدڵی بەندەدا دادەخات.

وەك خودای میهرەبان لەم فەرموودەیەدا، کە حەدیسێکی قودسی و فەرموودەیەکی پیرۆزی رەببانییە، بەنەزاکەت گلەیی لەو خوا ناسانە بکات کە

[1] تجرید/٥ ل/٣٨١ رقم/٢١٢٩ = ٧٤٠٥، ٧٥٠٥، ٧٥٣٧. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٤٦.

هەمیشە خەیاڵی ئەمو مژو دووکەڵی دۆزەخ بووە بە پارچەیێ هەوری رەش‌و بەرچاوی گرتوون‌و نایەڵێ رۆژی رووناکی رەحمەتی خودا ببینن! گریمان ئەگەربیشی بینن تەماوی دەیبینن، وەك بەمانە بفەرموێ: ئەی بەندە ئازیزەکانی من! گوایا من پادشایەکی ئەوەندە ناعەدڵ‌و بێ بەزەییم، هەروا لەخۆمەوە بەبێ هۆیەکی رەوا ئێش‌و ئازارو سزای ئازیزانی خۆم بدەم، دەبا بەس بێ رەشبینی‌و نائومێدی! ئەوەندە ژیانی چەند رۆژەی جیهانتان لەناو دەریای فرمێسك‌و دڵە لەرزەدا مەبەنە سەر، بەڵکوو ئومێدتان بە رەحمەتی خودا قەوی بێ، چونکە رەحمەتی من خەڵاتی ئێوەمانانە.

سەرزەنشتی ئەوانەیش دەکا کە بەد رەفتارو بەدکردارو کە چ رەفتارن، وەك پێیان بفەرموێ: ئەی بەندەی تاوانبار! من خۆت دەکەم بە سەرپشك‌و حەکەم، ئایا تۆ خۆت بەهەشت بەخۆت رەوا دەبینی، تا من پێتی رەوا ببینم! گوایا من پادشایەکی ئەوەندە نەزانم کە ئەوەندەی تۆی نەزانیشی لێ نەزانم! کەواتە: ئەی بەندەی بەدین! ئەی بەدکاری بێ دین!

{فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعْدُ بِالدِّينِ، أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَحْكَمِ الْحَاكِمِينَ، بَلى وَأَنَا عَلَى ذَلِكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ الشَّاكِرين}. (وەرگێڕ)

٤٩٤٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِلَّهِ مَلاَئِكَةً يَطُوفُونَ فِي الطُّرُقِ ، يَلْتَمِسُونَ أَهْلَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا قَوْمًا يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَنَادَوْا هَلُمُّوا إِلَى حَاجَتِكُمْ . قَالَ: فَيَحُفُّونَهُمْ بِأَجْنِحَتِهِمْ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا . قَالَ: فَيَسْأَلُهُمْ رَبُّهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ مِنْهُمْ مَا يَقُولُ عِبَادِي قَالُوا يَقُولُونَ يُسَبِّحُونَكَ ، وَيُكَبِّرُونَكَ ، وَيَحْمَدُونَكَ وَيُمَجِّدُونَكَ . قَالَ: فَيَقُولُ هَلْ رَأَوْنِي قَالَ فَيَقُولُونَ لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَوْكَ . قَالَ فَيَقُولُ وَكَيْفَ لَوْ رَأَوْنِي قَالَ: يَقُولُونَ لَوْ رَأَوْكَ كَانُوا أَشَدَّ لَكَ عِبَادَةً ، وَأَشَدَّ لَكَ تَمْجِيدًا ، وَأَكْثَرَ لَكَ تَسْبِيحًا . قَالَ يَقُولُ فَمَا يَسْأَلُونِي قَالَ يَسْأَلُونَكَ الْجَنَّةَ . قَالَ يَقُولُ وَهَلْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لاَ وَاللَّهِ يَا رَبِّ مَا رَأَوْهَا . قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لَوْ أَنَّهُمْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ عَلَيْهَا حِرْصًا ، وَأَشَدَّ لَهَا طَلَبًا ، وَأَعْظَمَ فِيهَا رَغْبَةً . قَالَ فَمِمَّ يَتَعَوَّذُونَ قَالَ يَقُولُونَ مِنَ النَّارِ . قَالَ يَقُولُ وَهَلْ رَأَوْهَا قَالَ يَقُولُونَ لاَ وَاللَّهِ مَا رَأَوْهَا . قَالَ يَقُولُ فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْهَا

قَالَ يَقُولُونَ لَوْ رَأَوْهَا كَانُوا أَشَدَّ مِنهَا فِرَارًا ، وَأَشَدَّ لَهَا مَخَافَةً . قَالَ فَيَقُولُ فَأُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ . قَالَ يَقُولُ مَلَكٌ مِنَ الْمَلاَئِكَةِ فِيهِمْ فُلاَنٌ لَيْسَ مِنْهُمْ إِنَّمَا جَاءَ لِحَاجَةٍ . قَالَ هُمُ الْجُلَسَاءُ لاَ يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ. رواه الشيخان والترمذي[٢]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودو سڵاوو سەلامو صەڵەواتو ڕەحمەتی خودای گەورەو سەروەی لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نیست بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) دەفەرموێ: خودا چەنە فریشتەیەکی گەڕۆکی هەیە ئیشیان ئەوەیە بەڕێو بانانا دەسووڕێنەوە، بەشوێن ئەهلی زیکردا دەگەڕێن، کاتێ کۆڕێکی زیکریان دۆزییەوەو دییان وا کۆمەڵێ لە شوێنێکا یادی خودا دەکەن قاو لەیەکتری دەکەنو یەکتری بانگ دەکەن: وەرن بەلای کاری خۆتانەوە، ئەمە ئەوەیە کە ئێوە بۆی دەگەڕێن، فەرمووی: ئیتر دێن هەتا ئاسمانی یەکەم بە باڵیان دەورەیان دەدەنو لەسەریەك هەتا بن ئاسمان کەڵەکە دەبەستن! فەرمووی: کە کۆڕی زیکرەکە تەواو دەبێ، فریشتەکان دەچن بۆ ئاسمان، خودای گەورە لێیان دەپرسێ – گەرچی خۆی زۆر باش لە حاڵەکە دەزانێ – لەکوێ بوون؟ عەرزی دەکەن: لەلای بازێ بەندەی باشی تۆ بووین دەفەرموێ: چیان دەکردو چیان دەگوت؟ دەفەرموون: (سبحان الله) دەکەنو تۆ بەپاكو پیرۆزو بێخەوش دەزاننو (الحمد لله) دەکەنو، سوپاسو ستایشی تۆ دەکەنو (الله اکبر) دەکەنو خودای خۆیان بەگەورە دەگرنو بەشانو شکۆی تۆدا هەڵ دەدەن دەفەرموێ: منیان دیوە؟ دەڵێن: خەیر، نە بەخودا نەیان دیوی، دەفەرموێ: ئەی ئەگەر بم بینن چۆن دەبن؟ دەفەرموێ: ئەگەر بتبینن باشتر بەندەییت دەکەنو زیاتر سوپاسو ستایشت دەکەنو پتر بەپاكو پیرۆزت دەزانن دەفەرموێ: ئەی داوای چیم لێ دەکەن؟ دەفەرمون: داوای بەهەشتت لێ دەکەن. دەفەرموێ: بەهەشتیان دیوە؟ دەفەرمون: نەبەخوا – ئەی خودایا! – نەیان دیوە. دەفەرمون: ئەگەر بیبینن چۆن دەبن؟

---

[٢] تجرید/٥ ل/٢٥٥ رقم/١٩٩٦ = ٦٤٠٨. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٠. تحفة الأشراف: ١٢٧٥٤.

دەفەرموون: ئەگەر بیبینن باشتر سووردەبن لەسەری‌و پتر هەڵپەی بۆ دەکەن‌و زیاتر حەزی لێ دەکەن. دەفەرموێ: ئەی لەچی دەترسن‌و خۆیانی لێ دەپارێزن؟ دەفەرموون: لە ئاگری جەهەننەم. دەفەرموێ: ئایا دیویانە؟ عەرزی دەکەن: نە بەخودا نەیان دیوە. دەفەرموێ: ئەگەر بیبینن چۆن دەبن؟ عەرزی دەکەن: ئەگەر بیبینن زیاتر لەدەستی هەڵ دێن‌و باشتر کۆی لێ دەکەنەوە. فەرمووی: ئەوجا خودا دەفەرموێ: دە ئێوە بەشایەت بن ئەوا بەتەواوی لێیان خۆش بووم. فریشتەیێ لە فریشتەکان عەرزی خودا دەکا: فیسارە کەسیشیان لەناودا بوو لەوان نییە پیاوێکی گوناهکارە بۆ زیکری خودا نەهاتبوو بۆ ئیشێکی خۆی هاتبوو، بەرێکەوت لەوێوە ڕەت بوو لەگەڵیان دانیشت. دەفەرموێ: مەجلیس مەجلیس زکرە، ئەوەی لێی دابنیشێ لەپیت‌و فەڕی بێ بەش نابێ، ئەوا لەویش خۆش بووم، کۆمەڵی کوڕی وا هاونشینیشیان لەبەر خاتری ئەوان لەبەد بەختی ڕزگاری دەبێ‌و بەهۆی ئەوانەوە ئەویش خۆش بەخت دەبێ! (ش/ت).

مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان (ڕەحمەتی خودای لێبێ) لەم شوێنەدا استسهاد بەم شیعرانەی سەعدی دەکا، کە ئەمە وەرگەڕاوەکەیەتی بەکوردی:

گولێکی بۆن خۆش ڕۆژێ لە شۆستێ
گەیشت بە دەستم لە دەستی دۆستێ
گوتم: تۆ گولی یا مسکو عەبیر
هەستت مەست کردم دڵت کرد یەخسیر
فەرمووی: من گلێ بێ فەڕ بووم بەڵام
ڕۆژێ دانیشتم لەگەڵ گول ئەندام
جوانیی هاونشین منی کرد بەگوڵ
بووم بەهاو دەمی جریوەی بولبول!!

بەهۆی گۆڕینی ڕێنووسەوە ئەم شیعرە فارسیە بە هەڵە نووسراوە ڕاستەکەی ئاوایە:

بگفتـا مـن گلـی ناچـیز بـوودم

ولـیکن مـدتی بـاگول نشـستم

چونكە خۆی گلی ناچیزە واتە گڵی بێ فەڕ، نەك گوڵی ناچیز، واتە: گوڵی بێ فەڕ، چونكی گڵ كەبوو بەگوڵ ئیتر بەفەڕە نەك بێ فەڕ.

(وەرگێڕ) - ١٩٩٢/١/٨

٤٩٤١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ الْبَيْتِ الَّذِي يُذْكَرُ اللَّهُ فِيهِ وَالْبَيْتِ الَّذِي لاَ يُذْكَرُ اللَّهُ فِيهِ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ. رواه الشيخان[٣]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ماڵێ كە یادی خودای تیا بكرێ وەك دڵی زیندوو وایە پڕە لە خێرو بێرو پیتو فەڕ، ماڵێ كە یادی خودای تیا نەكرێ وەك لەشی مردوو وایە تاریكو نوتەكو بێ هەستو سامناكە (ش — خودایان لێ رازی بێ).

٤٩٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ. كَانَتْ لَهُ عَدْلَ عَشْرِ رِقَابٍ وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حَسَنَةٍ وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ وَكَانَتْ لَهُ حِرْزًا مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِيَ وَلَمْ يَأْتِ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ أَحَدٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ. وَمَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ حُطَّتْ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ. رواه الشيخان والترمذي[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) ف پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ هەر ڕۆژێ سەدجار بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. ـ (ب — ١ ز — ١٠٨ ف— ٣). ئەوەندەی

---

[٣] تجرید/٥ ل/٢٥٥ رقم/١٩٩٥ = ٦٤٠٧. مسلم. بر وصلة: ١٨٢٠. تحفة الأشراف: ٩٠٦٤.

[٤] تجرید/٥ ل/٢٥٢ رقم/١٩٩٢ = ٦٤٠٣، ٣٢٩٣ فتح. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٣. ترمذي. دعوات: ٣٤٦٨. ابن ماجه. ادب: ٣٧٩٨.

ئـازادکردنی دەبەنـدەی زەڕخرِیـدە خێـری دەگـا، سـەد چـاکەی تریـشی بـۆ دەنووسـرێ، سەدخراپەیـشی بـۆ دەکوژێنرێتـەوە، ئـەو ڕۆژەیـش تـا ئێـواریێ گوتنی ئەم زیکرە دەبێ بەقەڵای قایم بۆیو لەشەیتان دەیپارێزێ! وە کەسێ نییە کە کارێکی وای کردبێ لەمە باشتربێ مەگەر کەسێ کە ئەو زۆر تری لـەم زیکرە کردبێ. هەر کەسێکیش – لـە ڕۆژێکا – سـەد جـار بڵـێ: (سُبْحَانَ اللّـهِ وَبِحَمْدِهِ). ئەوە هەرچی گوناهی پێوە هەیە هـەمووی هـەڵ دەوەرێ، ئەگـەرچی بەقەی کەفی دەریاش زۆربێ (ش/ت).

٤٩٤٣- ولمسلم والترمذي: مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّـهُ وَحْـدَهُ لاَ شَـرِيكَ لَـهُ لَـهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ عَشْرَ مَرَّاتٍ كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَ رِقَابٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ[٥]:

موسلیمو تیرمزی (ڕەزای خودایان لێبـێ) دەگێڕنـەوە: حـەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: هـەر کەسـێ دەجار بەکوڵی دڵو بە سینەیێ سـاف بڵـێ: لاَ إِلَهَ إِلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. ئەوە بەقەد ئەو کەسەیە پاداشی بۆ هەیە کە چوار کـەس لەنـەوەی ئیسماعیل کوڕی ئیبراهیم ئازاد بکا. (م/ت).

٤٩٤٤- ← (ب – ١ ز – ١٤ ل – ٧٩ ف – ٣)[٦].

٤٩٤٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: سَبَقَ الْمُفَـرِّدُونَ. قَـالُوا: وَمَـا الْمُفَرِّدُونَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ[٧]:

دیـسان ئـەبو هـورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (درووودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: خەڵوەکێـشەکان وە پێـشکەوتنو بردیانـەوە! یـاران

---

[٥] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٥. بخاري. دعوات: ٦٤٠٤. ترمذي. دعوات: ٣٥٥٣. تحفة: ٣٤٧١. تجريـد/٥ ل/٢٥٣ رقم/١٩٩٣.

[٦] تقـدم في مجلـد أول تسلـسل/٢ ل/٥١ ط/١ رقـم/٥. مجلـد أول. تسلـسل/١٤ ل/٧٩ ط/١ رقم/١٠٠.

[٧] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٤٩.

گوتیان: قوربان! خەڵوەكێشەكان چین؟ فەرمووی: ئەو چلەكێشانەی كە لە كۆڕی هیچ‌و پووچی مەردوم كەناردەركن‌و یادو زیكرێكی زۆری خودا دەكەن، واتە: ئەو ژن‌و پیاوانەن كە خودای گەورە بەم ئایەتە پەسن‌و تاریفیان دەكا دەفەرمویٚ: {وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا} ـ (ب – ١ ز – ١٨١ ل – ٤٩٦ ف – ١١) (م/ت).

٤٩٤٦– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى حَلْقَةٍ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ مَا أَجْلَسَكُمْ قَالُوا جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ. قَالَ آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ قَالُوا وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ وَمَا كَانَ أَحَدٌ بِمَنْزِلَتِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقَلَّ عَنْهُ حَدِيثًا مِنِّي وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ عَلَى حَلْقَةٍ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ « مَا أَجْلَسَكُمْ ». قَالُوا جَلَسْنَا نَذْكُرُ اللَّهَ وَنَحْمَدُهُ عَلَى مَا هَدَانَا لِلإِسْلاَمِ وَمَنَّ بِهِ عَلَيْنَا. قَالَ: آللَّهِ مَا أَجْلَسَكُمْ إِلاَّ ذَاكَ. قَالُوا: وَاللَّهِ مَا أَجْلَسَنَا إِلاَّ ذَاكَ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمَةً لَكُمْ وَلَكِنَّهُ أَتَانِي جِبْرِيلُ فَأَخْبَرَنِي أَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبَاهِي بِكُمُ الْمَلاَئِكَةَ. روى الثلاثة مسلم والترمذي[8]:

ئەبو سەعید (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: موعاوییە چوو بەسەر كۆڕێكی زیكردا لەناو مزگەوتدا ئەڵقەیان دابوو، فەرمووی: بۆچی دانیشتوون؟ فەرموویان: دانیشتووین یادو زیكری خودا دەكەین، فەرمووی: توخوا هەر بۆ ئەوە دانیشتوون‌و بەس؟ فەموویان: بەڵیٚ بەخودا هەر بۆ ئەوە دانیشتووین‌و بەس. فەرمووی: دەبزانن كە من لەبەر ئەوە ئێوەم سوێند نەدا كە باوەڕتان پیٚ نەكەم، بەڵكوو باوەڕم بەقسەكەتان هەیە بەلاٌم لەبەر شتێكی تر ئێوەم سوێندا كە ئێستا بۆتانی باس دەكەم، لەلایەكی تریشەوە كەس نییە وەك من پایەی لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربیٚ) نزیك بوو بیٚ و لەگەڵ ئەوەشدا وەك من ئاوا فەرموودەو فەرمایشتی ئەو زاتە كەم بگێڕێتەوە. چونكە من ژن برای پێغەمبەر بووم‌و نووسەری سرووشی بووم‌و زۆریش لە خزمەتیدا بووم،

---

[8] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٩٧. ترمذي. دعاء/٣٣٧٩. نسائي. آداب القضاة: ٥٤٤١. تحفة/١١٤١٦.

**بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا فەرموودەیێ تا نەچمە بنج و بنەوانی و بەباشی لێم روون نەبێ نایگێڕمەوە ئینجا موعاوییە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچوو، ڕۆیشت بۆ مزگەوت، لەوێ چوو بەسەر دەستەیێ لە هاوڕێیانیدا، بە ئەڵقە کۆڕی زیکریان دابەستبوو، فەرمووی: بۆچی دانیشتوون؟ فەرموویان: دانیشتووین یادو زیکری خودا دەکەین، حەمدو سوپاسی خودا دەکەین لەسەر ئەوە کە شارەزای کردووین بۆ ئایینی ئیسلام و ئەم بەهرە گەورەیەی پێمان بەخشیوە. فەرمووی: توخوا هەر ئەوەیە هۆی دانیشتنەکەتان؟ فەرموویان: ئەرێ بەخودا هەر بۆ ئەوە دانیشتووین و بەس. فەرمووی: دەبزانن من لەبەر ئەوە سوێندم نەدان کە باوەڕتان پێ نەکەم، بەڵکوو رێ خۆش کردنە بۆ ئەم مژدە خۆشەیە: جوبرائیل تەشریفی هات بۆلام، فەرمووی پێم: کە خودای گەورەو سەروەر شانازیتان پێوە دەکا بەسەر فریشتەکاندا (م/ت).**

٤٩٤٧- عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) وَكَانَ مِنْ كُتَّابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَافَقَ حَنْظَلَةُ. قَالَ: وَمَا ذَاكَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ نَكُونُ عِنْدَكَ تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالْجَنَّةِ حَتَّى كَأَنَّا رَأْيَ عَيْنٍ فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِنْدِكَ عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلاَدَ وَالضَّيْعَاتِ نَسِينَا كَثِيرًا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنْ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِنْدِي وَفِي الذِّكْرِ لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ وَلَكِنْ يَا حَنْظَلَةُ سَاعَةً وَسَاعَةً. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. رواه مسلم والترمذي في الرقاق ولفظه الأخير: لَوْ تَدُومُونَ عَلَى الْحَالِ الَّذِي تَقُومُونَ بِهَا مِنْ عِنْدِي لَصَافَحَتْكُمُ الْمَلاَئِكَةُ فِي مَجَالِسِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ وَعَلَى فُرُشِكُمْ وَلَكِنْ يَا حَنْظَلَةُ سَاعَةً وَسَاعَةً وَسَاعَةً[٩]:

**حەنظەلەی ئەل-ئوسەیدی، کە میرزایەکی باش بوو، وە یەکێک بوو لە نووسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەربێ و رەزای خوداش لەو)**

[٩] مسلم. توبة: ٦٩٠٠. ترمذي. صفة القيامة/٢٤٥٢، ٢٥١٤. ابن ماجه. زهد/٤٢٣٩. تحفة/٣٤٤٨.

فەرمووی: جارێ ئەبو بەکرم پێ گەیشت فەرمووی: تۆ چۆنیت ئەی حەنظەلە؟! گوتم: حەنظەلە ناپاکی سەری لێ هەڵداوە! فەرمووی: سوبحانەڵڵا! ئەوە دەڵێی چی؟ گوتم: کە دەچین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) باسی بەهەشت و دۆزەخمان بۆ دەکا، دڵ دادەهێنین و وامان لێ دێ دەڵێی بەچاوی خۆمان تەماشایان دەکەین و وان بە بەرچاومانەوە، بەڵام کە لای حەزرەتمان چۆڵ کردو چووینەوە ناومالّ و منالّ و پلکاین بە خاوو خێزانەوەو مشووری مەڕو مالات و خەلەو خەرمان و گوزەرانمان خوارد ئیتر دەچینە حالێکی ترەوەو زۆرمان لە ئامۆژگارییەکانی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەبیر دەچێ! دەی ئەگەر ئەمە دوو ڕوویی و مونافقی نییە ئەی چییە؟ ئەبوبەکر فەرمووی: خۆ ئەگەر بۆ ئەمەبڵێی دەسا بەخودا هەموومان هەروایـن! ئیتر من و ئەبو بەکر چووین بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! حەنظەلە دوو ڕوویی سەری لێ هەڵداوە! فەرمووی: ئادەی چۆن؟ چیم عەرزی ئەبو بەکر کرد عەرزی ئەویشم کرد، فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەگەر دەوام بکەن لەسەر ئەو حالی دڵگەرمییەی کە لەلای من هەتانە، وە بەردەوام سەرگەرمی یادوزیکری خودا بن، پەردە لە نێوانی ئێوەو فریشتەکاندا هەڵدەگیرێ، ئیتر لە هەموو جێیێ، تەنانەت لەسەر نوێن و لەرێگەو بانیش فریشتەکان چاکوچۆنی و تەوقەیان لەگەڵ دەکرن! ئینجا فەرمووی: ئەی حەنظەلە! ئەوە قەیناکاو، ئەوە نیفاق و دوو ڕوویی نییە، چونکە ژیانەکە خۆی وایە: تاوێ بۆ خوداو تاوێ بۆ پەیداکردنی گوزەران و تاوێکیش بۆوچان و پشوو! (م).

٤٩٤٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ فِيهِ وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ إِلاَّ كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ[١٠].

---

[١٠] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) هەر گۆمەڵەیێ لە کۆڕێکا دابنیشن، بەڵام یادی خودای تیانەکەن، وە سەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خۆیان نەدەن، دڵنیابن کە ئەو دانیشتنە دەبێ بەداخ و خەفەت بۆیان، ئیتر لەوەدوا خودا خۆی ئارەزوو بکا لەسەر ئەوە سزایان دەدا، ئارەزووش بکا لێیان خۆش دەبێ لەوە (ت–س/ص).

٤٩٤٩– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا قَالَ عَبْدٌ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ قَـطُّ مُخْلِصًا إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ حَتَّى تُفْضِيَ إِلَى الْعَرْشِ مَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ[١١]:

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کاتێ هەر بەندەیێ – بەدڵێکی پاك، بەسۆزو کوڵی دڵ – بڵێ: لا الـه الا الله، ئیتر گشت دەرگاکانی ئاسمان دەکرێنەوە بۆ ئەم وشە پیرۆزەیە، ئەوجا سەردەکەوێ و دەڕوا تا خۆی دەگەیەنێتە لای بارەگا (عەش)ی خودا، وە لەوێ شایەتی بۆ خاوەنەکەی دەداو تکای بۆ دەکاو خودا لێی خۆش دەبێ، بەمەرجێ ئەو بەندەیە خۆی لە گوناهە گەورەکان دوور بگرێ! (ت–س/ص).

٤٩٥٠– ← (ب – ١ ز – ١١٤ ل – ٣٤٨ ف – ١٥)[١٢].

لێرەدا ئاوایە: لە ئەنەسەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر گەیشتنە باخەکانی بەهەشت دەمیان تێ ژەنن و خۆتان مەست بکەن! یاران فەرموویان: قوربان! باخەکانی بەهەشت چین؟ فەرمووی: ئەڵقەکانی کۆڕی زیکرن! (ت–س/ح).

٤٩٥١– وَقَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَذْكُرُ اللَّهَ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ[١٣]:

عائیشە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەخۆی و ڕەزای خودا لە هاوسەرە پاکیزەکانی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر هەموو حاڵێ یادی خودای دەکرد (ت–س/ح).

---

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] تقدم في مجلد أول تسلسل/١١٤ ل/٣٤٨ ط/١ رقم/٦٨٩.

[١٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٤٩٥٢- عَنْ جَابِرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ[١٤].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: گەورەترین ذیکر کە لیمەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ)یە. وە گەورەترین نزاو پاڕانەوەیش وشەی پیرۆزی (الْحَمْدُ لِلّٰهِ)یە (ت-س/ح).

٤٩٥٣- وَقَالَ رَجُل: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ شَرَائِعَ الإِسْلاَمِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ. قَالَ: لاَ يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللّٰهِ[١٥].

پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەراستی دەستوورو یاساکانی ئیسلام زۆر بوونو بە هەموویاندا پێ ڕاناگەم کەواتە شتێکی وام پێ بفەرموو کە بتوانم بەرۆکی بەرنەدەمو بەدەمو دەست بیگرم، فەرمووی: هەمیشە زمانت پاراوبێ بەیادی خودا. (ت-س/ح).

٤٩٥٤- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلاَ أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ. قَالُوا: بَلَى. يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: ذِكْرُ اللّٰهِ تَعَالَى[١٦].

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هۆشیارەوە بن با پێتان بڵێم کە باشترین کردەوەی خێری ئێوە چییە؟ کە لەلای پادشای هەرە گەورەتان، کە خودای گەورەو مەزنە، باشتربێ بۆ ئێوە لە بەخشینەوەی زێڕو زیو کە باشتربێ لەوەیش کە لە ریزی شەڕدا تووشی دوژمنی دینتان بێنو شەڕێکی گەرمی وا بقەومێ لە نێوانتاندا ئێوەو ئەوان بەشیرو تیر بدەن لە گەردنییەكو بەربینە یەكتری. یاران فەرموویان:

[١٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ئادەی فەرموو پێمان بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەوە زیکرو یادی خودای گەورەیە (ت-س/ح).

٤٩٥٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الْعِبَادِ أَفْضَلُ دَرَجَةً عِنْدَ اللّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: الذَّاكِرُونَ اللّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتُ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ وَمِنَ الْغَازِى فِي سَبِيلِ اللّهِ؟ قَالَ: لَوْ ضَرَبَ بِسَيْفِهِ فِي الْكُفَّارِ وَالْمُشْرِكِينَ حَتَّى يَنْكَسِرَ وَيَخْتَضِبَ دَمًا لَكَانَ الذَّاكِرُونَ اللّهَ كَثِيرًا أَفْضَلَ مِنْهُ دَرَجَةً[١٧].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: لە ڕۆژی ژیانەوەدا کام خودا پەرستی و بەندەگییە دەبێ بەهۆی پایەی فرە گەورە لەلای خودای گەورە؟ فەرمووی: پایەی ئەو کەسانە زۆر گەورەیە کە زۆر ذیکرو یادی خودا دەکەن، ئیتر چ پیاوبن و چ ژن بن. منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! هەتا لەپایەی ئەو کەسەیش گەورەترە کە غەزا دەکاو خەبات دەگێڕێ لە ڕێی خودادا؟ فەرمووی: غەزاکەر ئەگەر بەشیرەکەی لە کافران و هاوبەشپەیدا کەران بدا تا شیرەکەی دەشکێ و خوێناوی دەبێ هێشتا پایەی ئەو کەسانە گەورەترە لە زیکری خودایان کردووە بە پیشە! (ت- سەنەد غەریب).

٤٩٥٦- عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: مَنْ قَالَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ إِلَهًا وَاحِدًا أَحَدًا صَمَدًا لَمْ يَتَّخِذْ صَاحِبَةً وَلاَ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ عَشْرَ مَرَّاتٍ كَتَبَ اللّهُ لَهُ أَرْبَعِينَ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ[١٨].

تەمیمی داری (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ دەجار بڵێ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ إِلَهًا وَاحِدًا أَحَدًا صَمَدًا لَمْ يَتَّخِذْ صَاحِبَةً وَلاَ وَلَدًا وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ: ← (ب – ٧ ز –

---

[١٧] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١٨] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٩٠ ل – ٢١ ف – ١) هەر كەسێ دەجار ئاوا بڵێ، خودا چل هەزار چاكەی بۆ دەنووسێ (ت– سەند غەریب).

٤٩٥٧– عَنْ عَلِي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ إِذَا قُلْتَهُنَّ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ وَإِنْ كُنْتَ مَغْفُورًا لَكَ. قَالَ: قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ. روى هذه العَشَرَةَ الترمذي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ)[١٩]:

عەلی (خۆشنوودیی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست و نازدار (درودی خودای گەورەومەزنی لەسەربێ) پێی فەرمووم: گوێ بگرە با ئەم چەن وشەیەت فێربکەم، ئەگەر بیان لێیت خودا لێت خۆش دەبێ، هەر چەند کە تۆ خودا لێت خۆش بووە، ئەوجا فەرمووی: بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: هیچ خودایێ نییە خودای گەورەو مەزن نەبێ، هیچ خودایێ نییە یەزدانی پاك نەبێ كەخودایەكی حەلیم و هێمن و بەحەوسەڵەو نازدارە، یەزدانی مەزن هەر خودای ڕاست و دروستە، خودای گەورەی خۆم بەپاك و بێ نەنگ دەزانم، خاوەنی تەخت و بارەگای مەزنە، سوپاس و ستایش هەر بۆ خودای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە. (ت–س/غەریب).

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

یادی تۆ خوایە! ئارامی گیانە
مایەی سرەوتی دڵی مەردانە
تیشكی زێڕینی دای لە هەردڵێ
بڵێسەی نووری لێ هەڵ دەقوڵێ

[١٩] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

شووشەی بەتاڵت نووری! هەتاکەی

لە یادو زیکری خودا پڕناکەی؟

بووی بە دێزەی ڕەش، دێزو ڕەش‌وپیس!

لەکن خۆت مەڵای ئەی بەدی ئەگریس!

زرکە تاڵەکەت تاکەی ناگەیێ؟

کەشیر بزرکا ئیتر نامەیێ

کەللەت لە دڵت ڕەقترو بۆشتر

دەمت لە دەستت شڕترو ڕەشتر!

گووژاڵکی کاڵە بێ ڕەنگ و بۆیە

شەرا بردووەو عەمارە پۆیە

سیاسەتبازی ڕێک وەکوو ئەوان

درووت کرد بەتیر، دەمت بە کەوان

هەرڕۆ بە درۆ سەد تەوبە دەکەی

لەوکش تەوبەیێ تەوبەیێ ناکەی

وەرە تا زووە ڕوو لە خوواکە

دۆست کامەران و دوژمن ڕیسواکە

بە فرمێسکی چاو ژەنگی دڵی ڕەش

پاک پاک بشۆرە تا دەبێ گەش

ئەوجا مل کەچکەو سەر کزکەو چاو تەڕ

دەمو دەس و دڵ پڕکە لە گەوهەر!

لە میوەی باخی بەهەشتی باڵا

لە یادی خودا، لە ئەشقی ئەڵڵا!

لە دەوری قورئان، لە ئەڵڵا ئەڵڵا

لە سەڵاواتدان، لە سوبحانەڵڵا

لە حەمدو سەناو ئەڵڵاهو ئەکبەر

لە خۆشەویستی جەنابی رەهبەر

ناوی جوانی خوا هەموو بکە بەر

تەوبەیێ جوانیش بکە هەتا سەر

بەڵکوو میهرەبان گش تاوانی تۆی

بسڕێ بە خامەی لێبووردنی خۆی

گوێگری ئازیز! عیبرەت لە نووری

بگرە، براکەم! ئەگەر تۆ ژیری

دەنا تۆش وەک ئەو بۆ تۆزێ چڵکاو،

ئەوس دەتکاتە کۆڵەوژی سووتاو

دنیا سەد چەندان خۆش و نازاربێ

تەمەنت بە ساڵ هەزار بێ

تا ماوی بەختت سەرا سەر یاربێ

بەبێ یادی خوا بەزەهری ماربێ!!

خوێنەری هێژا! دڵت لەلامە

دڵ بەرە قسەم چامە بە چامە

گوێ مەدە بەوەی شیعرەکەم خامە

سەیری دڵم کە زام لەبان زامە

لە تاوی نێوە شین و هەرامە

دەنا وەک قومری چار دەورم دامە

بــەدەس خــۆم نییــە نێــوەم خــۆش دەوێ

دەمــرم، گــەر یــەكتان لێ نــەخۆش كــەوێ

خوێنــەر! یــا كــوێكر! پــەیڕەوی قورئــان!

گەرچــی بــە خزمــەت نەكــەیوم قوربــان!

لەبــــەر چــاوەمە شــیێوەی شــیرینت

دڵــم چــاوی وا لــە ڕووی نوورینــت!

چــاوم چــاوی وا لــە دووعــای خێــرت

دووعایــێ بكــە بــەخێرو وێــرت!

(وەرگێڕ – ۱۹۹۲/۱/۱۰)

## ٥٩) ناوە جوانەكانی خودا : (أسماء الله الحسنى)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلِلّـهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا - سورة الأعراف – ۱۸۰/۷}.

واتە: یەزدانی پاك، خودای گەورە، گەلێ ناوی جوان حوانی هەیە، كەواتە بەو ناوانە بانگی بكەن و بڵێن: یا الله، یا رحمان، یا رحیم یا عظیم ، یا حلیم) هەروەها بەهۆی ناو هێنانی بەو ناوانەوە بەندەیی بۆ بكەن، وەك ئەوە بڵێن: سبحان الله، بسم الله الرحمن الرحيم. الحمد لله رب العالمين. الرحمن الرحيم. مالك يوم الدين.

وَقَالَ تَعَالَى: {هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ، هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ - سورة الحشر – ۵۹/۲۳-۲٤}.

لــە فــەرموودەی دووەمــی ئــەم باســەدا مــەعنای ئــەم نــاوە جوانانــەی خودادێ. (وەرگێڕ)

٤٩٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا ، مِائَةً غَيْرَ وَاحِدٍ ، مَنْ حَفِظَهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ ، وَهُوَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیّ رازی بیّ) فەرمووی: پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) فەرمووی: خودا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، لەسەدیەكیّ كەم، هەركەسیّ لەبەریان بكاو رەفتو كار بەچەمكو مەبەستیان بكا دەچیّتە بەهەشت، خودا خۆی تاقەو حەز لەتاق دەكا (ش/ت- خۆشنوودی خودای لیّبیّ).

٤٩٥٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِلَّهِ تَعَالَى تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً غَيْرَ وَاحِدَةٍ مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ السَّلاَمُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ الْغَفَّارُ الْقَهَّارُ الْوَهَّابُ الرَّزَّاقُ الْفَتَّاحُ الْعَلِيمُ الْقَابِضُ الْبَاسِطُ الْخَافِضُ الرَّافِعُ الْمُعِزُّ الْمُذِلُّ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ الْحَكَمُ الْعَدْلُ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ الْحَلِيمُ الْعَظِيمُ الْغَفُورُ الشَّكُورُ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ الْحَفِيظُ الْمُقِيتُ الْحَسِيبُ الْجَلِيلُ الْكَرِيمُ الرَّقِيبُ الْمُجِيبُ الْوَاسِعُ الْحَكِيمُ الْوَدُودُ الْمَجِيدُ الْبَاعِثُ الشَّهِيدُ الْحَقُّ الْوَكِيلُ الْقَوِيُّ الْمَتِينُ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ الْمُحْصِي الْمُبْدِئُ الْمُعِيدُ الْمُحْيِي الْمُمِيتُ الْحَيُّ الْقَيُّومُ الْوَاجِدُ الْمَاجِدُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ الْقَادِرُ الْمُقْتَدِرُ الْمُقَدِّمُ الْمُؤَخِّرُ الأَوَّلُ الآخِرُ الظَّاهِرُ الْبَاطِنُ الْوَالِي الْمُتَعَالِي الْبَرُّ التَّوَّابُ الْمُنْتَقِمُ الْعَفُوُّ الرَّؤُوفُ مَالِكُ الْمُلْكِ ذُو الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ الْمُقْسِطُ الْجَامِعُ الْغَنِيُّ الْمُغْنِي الْمَانِعُ الضَّارُّ النَّافِعُ النُّورُ الْهَادِي الْبَدِيعُ الْبَاقِي الْوَارِثُ الرَّشِيدُ الصَّبُورُ. رواه الترمذي وابن حبان والحاكم (بسند غريب للترمذي، ولغيره بسند صحيح – شرحه)[2]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لیّ رازی بیّ) فەرمووی: پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) فەرمووی: خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە، سەت یەك كەم، هەر كەسیّ سەرژمیّریان بكا دەچیّتە بەهەشت، ئەو ناوانە ئەمانەن:

---

[1] بخاري. دعوات: ٦٤١٠. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٥٠. ترمذي. دعوات: ٣٥٠٨. تحفة: ١٣٦٧٤.

[2] رواه الترمذي بسند غريب، ورواه ابن حبان والحاكم بسند صحيح (شرحه).

١) ئەڵڵا: یەزدان، خودا. ٢) ڕەحمان: بەخشندە. ٣) ڕەحیم: میهرەبان: بەرەحم: بەبەزەی. ٤) مەلیك: پادشاه. ٥) قوددووس: پاك: خاوێن: تەمیز. ٦) سەلام: ساخ، خۆشبەخش. ٧) موئمین: دڵنیاکەرەوە: هێمن بەخش. ٨) موهەیمین: چاودێر. ٩) العزیز: زاڵ، باڵا دەست. ١٠) جەببار: بەجیر: بەزەبرو زەنگ. ١١) موتەکەبیر: گەورەترین کەس: هەرە گەورە. ١٢) خالیق: دورستکەر. ١٣) باریء: هێنەرەروو: کردگار. ١٤) موصەووير: وێنەبەخش: وێنەکێش: نەخشبەند. ١٥) غەففار: تاوانبەخش. ١٦) قەههار: خاوەن قار: هەرە باڵا دەست. ١٧) وەههاب: بەخشندە. ١٨) ڕەززاق: ڕۆژیدەر. ١٩) فەتتاح: گرێکەرەوە: کارگوزار. ٢٠) عەلیم: زانا. ٢١) قابیض: گیانکێش. ٢٢) باسیگ: گیانبەخش، خاوەن دەروو. ٢٣) خافِض: نەویکەرەوە. ٢٤) ڕافیع: بەرزکەرەوە. ٢٥) موعیزز: سەربەزکەر، پیرۆزی بەخش. ٢٦) موزیلل: سەرکزکەر. ٢٧) سەمیع: بیسەر: ژنەوا: شنەوا. ٢٨) بصیر: بینا. ٢٩) حەکەم: فەرمانڕەوا. ٣٠) عەدل: دادپەروەر. ٣١) لەطیف: لەتیف: نازك:ناسك. ٣٢) خەبیر: ئاگادار. ٣٣) حەلیم: لەسەرخۆ: بەحەوسەڵە. ٣٤) عەظیم: مەزن. ٣٥) غەفوور: لێخۆشبوو: تاوانپۆش: لەگوناهخۆشبوو. ٣٦) شەکوور: سوپاسگوزار. ٣٧) عەلی: پایەبڵند. ٣٨) کەبیر: گەورە. ٣٩) حەفیظ: نیگاهبان: پاسەوان. ٤٠) موقیت: زادبەخش. ٤١) حەسیب: بەس. ٤٢) جەلیل: بەقەدر. ٤٣) کەریم: دەهەندە: پیرۆز. ٤٤) ڕەقیب: تەماشاکار: چاودێر. ٤٥) موجیب: فریارەس: هانا، فریا. ٤٦) واسیع: ڕەحمەت گوشاد: بێ سنوور. ٤٧) حەکیم: دانا: کاردروست. ٤٨) وەدوود: خۆشەویست: میهرەبان: خاوەن مۆبەت. ٤٩) مەجید: بەشکۆ: گەورە: سەروەر. ٥٠) باعیپ: مایە: هۆ. ٥١) شەهید: بینەر: ئاگادار. ٥٢) حەق ڕاست: دروست. ٥٣) وەکیل: پەنا، پشت و پەنا: پشتیوان. ٥٤) قەوی: بەهێز: تەوانا. ٥٥) مەتین: پشتدار: قایم. ٥٦) وەلی: دۆست. ٥٧) حەمید: سوپاسکراو: شایستەی ستایش. ٥٨) موحصی: سەرژمێر.

٥٩) موبـــدی: داهێنـــەر. ٦٠) موعیـــد: زیندووکـــەرەوە: داهێنـــەرەوە. ٦١) مـــوحیی: زیندووکـــەروە: ژێینـــەر. ٦٢) مومیـــت: مرێنـــەر. ٦٣) حەیی: زیندوو. ٦٤) قەییووم: راگر: راگری عالەم. ٦٥) واجید: دارا. ٦٦) ماجید: خاوەن شکۆ. ٦٧) واحید: تاك: تەنیا: تاق: تاقی تەنیا. ٦٨) صـــەمەد: جێـــی هیـــواو ئومێـــد. ٦٩) قـــادیر: توانـــا. ٧٠) موقتەدیر: تەوانا. ٧١) موقەددیم: پێشخەر. ٧٢) موئەخیر: دواخەر: پاشخەر. ٧٣) ئەووەل: یەکەمین کەس: یەکەم: یەکەمین. ٧٤) ئاخیر: دواهەمین کەس: دواهەمین. ٧٥) ظاهیر ئاشکرا. ٧٦) باطین: ون: پەنهان. ٧٧) والی: خاوەن. ٧٨) موتەعالی: هەرە پایەبەرز. ٧٩) بەرر: باش: چاك، خاس: خێرخوا. ٨٠) تەوواب: تەوبـەوەرگر: گیراکـەری پەشـیمانی. ٨١) مونتەقیم: تۆڵەسێن. ٨٢) عەفووو: چاوپۆش. ٨٣) رەئووف: بەبەزەیی: زۆر میهرەبـــان. ٨٤) مالیکولمولـــك: خـــاوەنی مولـــكو دارایـــی. ٨٥) ذولجەلالی وەلئیکرام: خاوەنی بێ باکیو بێ نیازیو خاوەنی نیعمەتی گشتی. ٨٦) موقسیط: دادگەر: بەداد: دادپەروەر. ٨٧) جامیع: کۆکەرەوە: گردکـــەرەوە. ٨٨) غـــەنی: بـــێ نیـــاز: بـــێ بـــاك: دەوڵەمەنـــد. ٨٩) موغنی: دارایی بەخش. ٩٠) مانیع: نەهێڵ: قەدەغەکەر: مەنعکەر. ٩١) ضـــارر: زیانبـــەخش. ٩٢) نـــافیع: ســـوودبەخش. ٩٣) نـــوور: روونـــاکی: رۆشـــنایی: بینـــایی. ٩٤) هـــادی: رێنـــوێن: رەهنومـــا: رێ نیـــشاندەر. ٩٥) بەدیع: داهێنەر: دروستکەری هەموو شتێ لە نەبوونەوە بەبێ وێنە. ٩٦) باقی: نەمر پایەدار. ٩٧) واریث: ماو، میراتگر: میراتبەر. ٩٨) رەشید: دەستگیر: رابەر. ٩٩) صەبوور: بەصەبر: پشوودرێژ: بەئارام[1]. (ت–سەند غەریب / ئیبنو حەببان / حاکم – س/ص).

---

[1] بسم الله الرحمن الرحیم. ئێمە کە موسوڵمانین دەبێ ئەمە بسەلمێنین کە زمانی عەرەبی زمانی دینەکەمانە، لەبەر ئەوە دەبێ لەگەڵ شوێنو کاتدا وشەی عەرەبی، یا جوملەو رستەی عەرەبی بەکاربێنین، هەتا عیبادەتو تاعەتو نزاو دووعاو پاڕانەوەکەمان لەسەر شێوەیەکی جوانو

ڕێكو پێكو ڕەساو دامەزراوبێو دووربێ لە قالوقیلو وتی وتی ئەمو ئەو چونكە دینو عیبادەت دەبێ دووربێ لە تەعەصصوبو ڕەگەز پەرستیو شەڕە گەڕەكی نێوان نەتەوەگەرایەتی.

لە ڕاستیدا مەبەستی سەرەكی لە عیبادەتو تاعەت جێبەجێكردنی فەرمانەكەی خودایە لەسەر ئەو شێوەیەی كە خودا نەخشەی بۆیكێشاوە، دەنا مەبەست هەڵسانی رووت نییە بەو تاعەتە، بۆ وێنە ئەگەر لەشەریعەتدا زاناكان فەرموویان: دەبێ لە نوێژدا سوورەتی فاتیحا بخوێنی دەنا نوێژەكەت دروست نییە، ئەگەر تۆ بڵێی: من بەزمانی خۆم دەیخوێنمو بەعەرەبی نایخوێنم، ئەوە مەعنای وایە كە تۆ ئەمرەكەی خودا دەشكێنیو بەبیانوویەكی بێ مەعنا. بەڵام داخی گرانم لە كۆنو نۆدا ئەم لایەنە ئایینیە پەتییە ئیستغلال كراوە بۆ پڕو پاگەندەی نەتەوایەتیو ڕەگەز پەرستی، تۆ دەڵێی زمانەكەی من لە زمانەكەی تۆ باشترە، بۆیە نوێژ هەر بەو دروستە، من دەڵێم: ئەی گوایە زمانەكەی من چییەتی؟ من نوێژ بەزمانی خۆم دەكەم.. تاد.

با ئەم لایەنە جارێ بەركەناربێ، وەلێ لە هەمان كاتدا تا بۆمان دەكرێ دەبێ خۆمان لە تووتی جیا بكەینەوە، واتە: دەبێ واتاو مانای عیبادەتو زیكری خۆمان بزانین، تا بزانین دەڵێین چی. لێرەدا ئەوەی شایانی باسە ئەمەیە: ئایا تەرجەمەی ئەم ناوە جوانانەی خودا، بە كوردی یا بە فارسی، یا بەتوركی، یا بەهەر زمانێكی تر، دادەنرێ بەیەكێ لەناوە جوانەكانی خودا یانا؟ لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم باسە زۆر دوورو درێژە، لێرەدا جێی نابێتەوە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سەر وەڵامی ئەم پرسیارە: ئایا تەرجەمەی قورئانی پیرۆز دادەنرێ بە قورئان یانا؟ وە نوێژی پێ دەكرێ یانا، وە سوێندی پێ دەخورێ یانا.. تاد.، بەڵام ئەوەندە هەیە كە جێی گومان نییە خودا لە هەموو زمانێكا ناوی جوان جوانی هەیە، كە لەدێرین ساڵەوە ئەو ناوانە بوون بە ناوی خودا، بگرە هەر لەسەردەمی حەزرەتی ئادەمەوە (دروودو سڵاوی خودای لێبێ) ئەو ناوانە فێری ئادەم (دروودی خودای لەسەربێ) كراونو بوون بە ناوی خودا، بەپێی ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ: (وعلم آدم الاسماء كلها): ئەسماء یانی لۆغات.

لە تەفسیری نامی زێرپیندا دەفەرموێ: لەسەر ظاهیری ئایەتەكە دەبێ لۆغات تەوقیفی بن، یانی. هەموو زمانێ لەلایەنی خودای تەعالاوە نیشان دراوَن بە ئادەم وە ئەمە بیری زوربەی زانایانی ئوصووله. (تەفسیری نامی). لەلایەكی تریشەوە خودا دەفەرموێ: (ولله الاسماء الحسنى). دەی بەتەوفیق لە نێوانی ئەم دوو ئەسمایەدا چەند ناوێكی جوان بۆ خودا لە هەموو زمانێكا ئیسپات دەبێ هەر بۆیەش لە هەموو زەمانو لە هەموو زمانێكا سوێندو نەزرو پەیمانو نیازو (نییەت)و خێرو حوكمی شەرعی تر بەهۆی ئەو ناوانەوە دادەمەزرێن. سەرەڕای ئەمەیش

## ٦٠) ناوە هەرە گەورەکەی خودا (ئیسمی ئەعظەم) : (الإسم الأعظم)

**٤٩٦٠-** عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَمِعَ رَجُلاً يَقُولُ: اللّٰهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ أَنِّى أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللّٰهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِى لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ. فَقَالَ: لَقَدْ سَأَلْتَ اللّٰهَ بِالإِسْمِ الَّذِى إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ. رواه أصحاب السنن[1].

**عەبدوڵڵای کوڕی بورەیدە (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پیاوێ گوتی: اللّٰهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ أَنِّى أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللّٰهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِى لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ: خودایە! بۆیە داوا لە تۆ دەکەم چونکە شایەتی دەدەم کە هیچ خودای تر نییە تۆنەبێ، هەر خۆت خودای ڕاستو دروستیتو بەس، تۆ تاکو تەنیای پشتو پەنای، نە کەس لەتۆ بووەو نە تۆ لەکەس بووی، کەسیش هاوتای تۆ ناکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوێی لەقسەکەی بوو فەرمووی: دڵنیابە کە بەو ناوە لە خودا پاڕایتەوە کە هەر کەسێ بەو ناوەی ئاوا داوای لێ بکا نائومێدی ناکاو دەچێ بەدەنگییەوە (د/ت/ن-س/ح).**

**دڵنیام هەر کەسێ دیمەنو دەروونی خۆی پاکو خاوێن ڕابگرێو حەلاڵخۆربێ و موسوڵمانێکی بەراستی بێ و نیازی پاك بێ و پشت بە کەرەمی خودا ببەستێ، ئەم جۆرە نزایانەی گیرا دەبێ، مەگەر چۆنەها.(وەرگێڕ)**

---

فەرموودەی ڕاستتر ئەوەیە کە ناوەکانی خودا زۆر زۆرنو حەسرنین لەم نەوەدو نۆیەدا، بەس ئەوەندە هەیە مەرجە ناوێ کەناوی خودابێ، بەهەر زمانێ بێ دەبێ ناوێکی جوانو پەسەندبێو ئیسم عەلاموسەممابێو پڕ بە بەری بێ، نابێ ناوێکی ناشیرینو ناقۆلابێ باش وایە داتاشراویش نەبێو ڕەگو ڕیشەی لەناو کلتورو کەلەپوری زماندا هەبێ، مەبەست ئەمەیە کە شێخی بەیزاوی (خودای لێ ڕازی بێ) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: {وَلِلَّهِ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ} دەفەرموێ: (واتركوا تسيمة الزائفين فيها اللذين يسمونه بما لا توقيف فيه إذ ربما يوهم معنى فاسدا كقولهم يا أبا المكارم يا أبيَضَ الوجه). تەفسیری سوورەتی ئەعراف - ١٨٠/٧ - ١٩٨٦/٣/٢٠. (وەرگێڕ)

[1] بسند حسن (شرحه).

← (ب – ١ ز – ٩٣ ل – ٢٩٢ ف – ٤).

٤٩٦١- ← (ب – ٦ ز – ٣ ل – ٢٩ ف – ٢١)[٢].

٤٩٦٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسًا وَرَجُلٌ يُصَلِّي ثُمَّ دَعَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْمَنَّانُ بَدِيعُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَقَدْ دَعَا اللَّهَ بِاسْمِهِ الْعَظِيمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى. رواه أبو داود والترمذي[٣]:

ئەنەس (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لە مزگەوت دانیشتبووین. لەو کاتەدا پیاوێ نوێژی دەکرد، لە دواییدا نزای کردو فەرمووی: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْمَنَّانُ بَدِيعُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ: خودایا! واهانام هێنایە بەرتۆ، چونکە سوپاس هەر بۆ تۆیە، هیچ خودایێ نییە تۆنەبێ، بەخشندەو خاوەن چاکەی، دورستکەری ئاسمانەکانو زەویت لە نەبوونەوە بەبێ وێنە، ئەی خاوەنی شانو شکۆ! ئەی خاوەنی خەلاتو بەهرەو نازو نیعمەتی گشتی! ئەی زیندووی نەمر! ئەی راگری بوونەوەر! کەوای گوت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەراستی ئەم پیاوە بەو ناوە گەورەیەی خودا لێی پاڕایەوە کە هەر کەسێ بەو ناوە لێی بپاڕێتەوە دەچێ بەهاواریەوە، وە هەر کەسێ بەو ناوە داوای شتی لێ بکا بەشی دەدات! (د/ت–س/غەریب).

---

[٢] تقدم في مجلد سادس تسلسل/٣ ل/٢٩ ط/١ رقم/٣٧١٠.

[٣] بسند غريب (شرحه).

## ٦١) باسی دووەم: باسی گەورەیی (سبحان الله)و (الحمد لله)و (الله أكبر)و (لا اله الا الله)کردن

## الباب الثاني: في فضل التسبيح والتحميد والتكبير والتهليل

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ – سورة الحشر – ١/٥٩}.

واتە: هەرچی وا لە ئاسمانەکان و زەویدا، بەزمانی قاڵ و بەزمانی حاڵ تەسبیح و تەنزیهی خودا دەکەن و بەپاك و خاوێن و بێ نەنگی دەزانن و بە دووری دەگرن لە هەموو ناتەواوییەك، خودا خودایەکی زاڵەو هیچ شتێ لە چنگی قوتار نابێ، خودایەکی کار دروست و کردار جوانەو هیچ ئیشێکی بەبێ دانایی نییە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدَهِ وَلَكِن لاَّ تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا – سورة الإسراء – ٤٤/١٧}.

واتە: هەموو شتێ لەم بوونەوەرەدا بەبێ جیاوازیی تەسبیحاتی خودا دەکەن و سوپاس و ستایشی ئەو دەکەن، بەڵام ئێوە لە تەسبیحاتەکانیان تێ ناگەن، بەراستی خودا لەسەر خۆو بەحەوسەڵەو تاوانپۆشە.

وَقَالَ تَعَالَى: {الْحَمْدُ لِلّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِم يَعْدِلُونَ – سورة الأنعام – ٦}.

واتە: هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ زاتی ئەو خودایە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی لەنەبوون دروست کردووە، وە هەروەها تاریکی و رووناکی دروست کردووە، کەچی لەگەڵ ئەم بەڵگە روونەشدا لەسەر خودایی خوداو یەکتایی ئەو، کافرەکان لە فەرمانی خودا لادەدەن و مانەندی بۆ دادەنێن.

٤٩٦٣– عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ ، سُبْحَانَ اللّٰهِ الْعَظِيمِ ، سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ. رواه الشيخان والترمذي(١):

---

(١) تجريد/٥ ل/٣٨٥ رقم/٢١٣٤ = ٦٤٠٦، ٧٥٦٣. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٦. ترمذي. دعوات: ٣٤٦٧.

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: ئەم دوو وشەیە: سُبْحَانَ اللّٰهِ الْعَظِيمِ ، سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ) سووکن لەسەر زمان‌و قورسن لەکاتی کێشان‌و خۆشەویستن لەلای خودای میهرەبان! (ش/ت).

٤٩٦٤- ← (ب – ١ ز – ١١٤ ل – ٣٤٨ ف – ١٥) + (ب – ٩ ز – ٥٨ ل – ١٤٦ ف – ١٢)[٢].

٤٩٦٥- عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ كُلَّ يَوْمٍ أَلْفَ حَسَنَةٍ. فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ قَالَ: يُسَبِّحُ مِائَةَ تَسْبِيحَةٍ فَيُكْتَبُ لَهُ أَلْفُ حَسَنَةٍ أَوْ يُحَطُّ عَنْهُ أَلْفُ خَطِيئَةٍ[٣].

موصعەبی کوڕی سەعد (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: باوکم (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستدا بووین (درووودو سلاوو رەحمەتی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کامتان دەتوانن هەموو رۆژێ هەزار چاکە پەیدا بکەن؟ یەکێ لە دانیشتووەکانی حزمەتی عەرزیکرد: قوربان! چۆنی چۆنی هەزار چاکە پەیدا بکەین؟ فەرمووی: هەرکەسێ، لەسەر هەر شوێوەیێ، بەهەر گوتەیێ سەدجار تەسبیحات بکا هەزار چاکەی بۆ دەنووسرێ‌و، هەزار گوناهیشی لێ هەڵ دەوەرێ! (م/ت).

٤٩٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لأَنْ أَقُولَ سُبْحَانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ. رواهما مسلم والترمذي[٤].

لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: تاقە یەکجار بڵێم: سُبْحَانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ: ئەوەم پێ خۆشترە لە هەموو جیهان (م/ت).

---

[٢] تقدم في مجلد أول تسلسل/١١٤ ل/٣٤٨ رقم/٦٨٩ + مجلد تاسع تسلسل/٥٨ ل/١٤٦ ط/١ رقم/٤٩٥٠.

[٣] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٩٢. ترمذي. دعوات: ٣٤٦٣. تحفة/٣٩٣٣.

[٤] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٧. ترمذي. دعوات: ٣٥٩٧. تحفة الأشراف/١٢٥١٢.

٤٩٦٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلاَ أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللّٰهِ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَخْبِرْنِي بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللّٰهِ. فَقَالَ: إِنَّ أَحَبَّ الْكَلاَمِ إِلَى اللّٰهِ سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ. رواه مسلم والترمذي. ولفظه: أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللّٰهِ عَزَّ وَجَلَّ مَا اصْطَفَى اللّٰهُ لِمَلاَئِكَتِهِ: سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ[٥]:

**ئەبو زەڕ** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هۆشیاربە تا خۆشەویستترین گوتار لەلای خودا چییە پێتی بڵێم؟ گوتم: بفەرموو، فەرمووی: سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ: خۆشەویستترین گوتارە لەلای خودا.** (م/ت) **گفتی** (ت): **باشترین گوتار لەلای خودای گەورەو سەروەر ئەم وشەیەیە کە هەڵی بژاردووە بۆ تەسبیحاتی فریشتەکانی، کە ئەمەیە: سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ رَبِّي وَبِحَمْدِهِ.**

٤٩٦٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ سُبْحَانَ اللّٰهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ. غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّةِ[٦]:

**جابیر** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ یەکجار بڵێ: سُبْحَانَ اللّٰهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ: لە بەهەشتا دار خورمایەکی بۆ دەچەقێنن! (ت-س/ص).**

٤٩٦٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي فَقَالَ يَا مُحَمَّدُ أَقْرِئْ أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلاَمَ وَأَخْبِرْهُمْ أَنَّ الْجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّرْبَةِ عَذْبَةُ الْمَاءِ وَأَنَّهَا قِيعَانٌ وَأَنَّ غِرَاسَهَا سُبْحَانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ[٧]:

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (دروودی خودای لەسەربێ): **ئەو شەوەی کە چووم بۆ میعراج، تووشی ئیبراهیم** (دروودی خودای لەسەربێ) **بووم**

---

[٥] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٦٢، ٦٨٦٣. ترمذي. دعوات: ٣٥٩٣. تحفة/١١٩٤٩.

[٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٧] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

فەرمووی: ئەی موحەممەد! لە زمانی منەوە سڵاو لە ئوممەتت بکە، پێشیان بفەرموو کە خاکی بەهەشت خاکێکی پاك‌و بەپیزەو ئاوەکەی شیرین‌و سازگارەو زەوییەکەی دەشتایی‌و نەرماییە! هەر خودا دایناوە بۆ ناشتنی نەمانی ئەم زیکرە پیرۆزە: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ: خودا پیرۆزو پاکەو بەدوورە لە هەموو نەنگ‌و کەمو کووڕی‌و ناتەواوییەك، سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودایە، خودا نەبێ خودای تر نییە، خودا لە هەموو کەس گەورەترە (ت-س/ح).

٤٩٧٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ لأَصْحَابِهِ: قُولُوا سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ مَنْ قَالَهَا مَرَّةً كُتِبَتْ لَهُ عَشْرًا وَمَنْ قَالَهَا عَشْرًا كُتِبَتْ لَهُ مِائَةً وَمَنْ قَالَهَا مِائَةً كُتِبَتْ لَهُ أَلْفًا وَمَنْ زَادَ زَادَهُ اللَّهُ وَمَنِ اسْتَغْفَرَ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٨]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە یارانی خۆی فەرموو: بڵێن: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ) سەد جار سوبحانەڵڵاهی وە بیحەمدیهی. ئەوەی یەك جار ئەمە بڵێ بەدە بۆی دەنووسرێ، ئەوەی دەجار بیڵێ بەسەد بۆی دەنووسرێ، ئەوەی سەد جار بیڵێ بە هەزار بۆی دەنووسرێ، ئەوەی زیاتر بیڵێ خودا زیاتری دەداتێ، وە ئەوەی داوای لێخۆشبوون لە خودا بکا خودا لێی خۆش دەبێ! (ت-س/ح).

## ٦٢) ژماردنی تەسبیحات‌و ویردو سەرچاوەی تەزبیح لە چییەوەو چۆن پەیدابووە : (عد التسبيح وأصل السبحة)

٤٩٧١- عَنْ يُسَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَرَهُنَّ أَنْ يُرَاعِينَ بِالتَّكْبِيرِ وَالتَّقْدِيسِ وَالتَّهْلِيلِ وَأَنْ يَعْقِدْنَ بِالأَنَامِلِ فَإِنَّهُنَّ مَسْئُولاَتٌ مُسْتَنْطَقَاتٌ[١]:

---

[٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١] رواه أصحاب السنن بسند صالح (شرحه).

یوسەیره (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی دا بە ئافرەتان کە ئاگاداری تەکبیرو تەقدیسو تەهلیلایکردن بنو بەگرێی پەنجە بیان ژمێرن. چونکە ئەو جمگە پەنجانە لە ڕۆژی قیامەتدا خودا پرسیاریان لێ دەکاو دەیان هێنێتە قسە کە بۆچی بەکارهێنراون، دیارە کە زیکریان بێ کرابێ دەڵێن زیکرمان پێ کراوە. (د/ت/ن-س/صالح) تەکبیر: گوتنی (الله أكبر). تەقدیس: گوتنی (سبحان الملك القدوس) یا گوتنی (سبوح قدوس رب الملائكة والروح) تەهلیل: تەلیلە: گوتنی (لا اله الا الله).

(وەرگێڕ)

٤٩٧٢- وَقَالَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْقِدُ التَّسْبِيحَ - بِيَمِينِهِ. رواهما أصحاب السنن[٢]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەربێ) بە پەنجەو جمگەکانی دەستی ڕاستی ژمارەی ویردو تەسبیحاتی خۆیی دەژمارد. (د/ت/ن-س/ح).

٤٩٧٣- ← (ب - ١ ز - ١٠٨ ل - ٣٢١ف - ٧)[٣].

٤٩٧٤- وَدَخَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى امْرَأَةٍ وَبَيْنَ يَدَيْهَا نَوًى أَوْ حَصًى تُسَبِّحُ بِهِ فَقَالَ: أُخْبِرُكِ بِمَا هُوَ أَيْسَرُ عَلَيْكِ مِنْ هَذَا أَوْ أَفْضَلُ. سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي السَّمَاءِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي الأَرْضِ وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ بَيْنَ ذَلِكَ وَسُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ وَاللَّهُ أَكْبَرُ مِثْلُ ذَلِكَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ مِثْلُ ذَلِكَ. وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مِثْلُ ذَلِكَ. وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ مِثْلُ ذَلِكَ. رواه أصحاب السنن[٤]:

جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ لای ئافرەتێ لە کەسوکاری خۆی، ژنەکە هەندێ ناوکە خورمای لەبەردەستدا بوو، یا بازێ وردە بەردی

---

[٢] رواه أصحاب السنن بسند صالح (شرحه).

[٣] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٠٨ ل/٣٢١ ط/١ رقم/٦٣٠.

[٤] سكت عن درجته الشارح.

لەبەردەمدا بوو تەسبیحاتی دەکردو بەوناوکە خورمایە دەیژمارد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: شتێکت پێ دەڵێم لەمە ئاسانترە بۆ تۆ، یا فەرمووی: لەمە باشترە بۆ تۆ کە ئەویش گوتنی ئەم یادەیە: سُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي السَّمَاءِ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ فِي الأَرْضِ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا خَلَقَ بَيْنَ ذَلِكَ وَسُبْحَانَ اللّٰهِ عَدَدَ مَا هُوَ خَالِقٌ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ مِثْلُ ذَلِكَ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ مِثْلُ ذَلِكَ. وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ مِثْلُ ذَلِكَ. وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ مِثْلُ ذَلِكَ: بە ژمارەی ئەوەی کە خودا دروستی کردووە لە ئاسمانو زەویو نێوانی ئەم دوانەدا هەتا ئێستا، وە بە ژمارەی ئەوەیش کە لەمەولا خودا دروستی دەکا لەناو ئەم دوانەدا سوبحانەڵلابێ، هەروا ئەڵلاهو ئەکبەربێ، هەروا ئەلحەمدو لیلابێ، هەروا لائیلاهە ئیلەڵلابێ، هەروا لاحەولە وەلا قوەتە ئیللا بیللابێ (د/ت/ن).

## ٦٣) زیکری (لاَ حَوْلَ وَلاَ قوة إلا بالله) گەنجیکە لە گەنجینەکانی بەهەشت
## لا حول ولا قوة إلا بالله من كنوز الجنة

٤٩٧٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي عَقَبَةٍ - أَوْ قَالَ فِي ثَنِيَّةٍ ، قَالَ: فَلَمَّا عَلاَ عَلَيْهَا رَجُلٌ نَادَى فَرَفَعَ صَوْتَهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ . قَالَ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى بَغْلَتِهِ قَالَ: فَإِنَّكُمْ لاَ تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلاَ غَائِبًا. ثُمَّ قَالَ: يَا أَبَا مُوسَى - أَوْ يَا عَبْدَ اللّٰهِ أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزِ الْجَنَّةِ. قُلْتُ: بَلَى. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ. رواه الأربعة[1]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆیو یارانی لە هەورازێکەوە سەردەکەوتن، یا گوتی: بە پێچپێچێکا سەردەکەوتن گشت جارێ کە سەردەکەوتنە سەرملەیێ پیاوێ بەدەنگی بەرز بانگەوازی هەڵ دەداو دەیگوت: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ: گوتی: پێغەمبەر

---

[1] بخاري. مغازي: ٤٢٠٥، ٦٣٨٤، ٦٤٠٩، ٦٦١٠، ٧٣٨٦. تجريد/٥ ل/٣٥٠ رقم/١٢٢٥ = ٢٩٩٢، ٤٢٠٥، ٦٣٨٤، ٦٤٠٩، ٦٦١٠، ٧٣٨٦. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٠٢ - ٦٨٠٢، ترمذي. دعوات: ٣٤٦١. ابن ماجه. ادب: ٣٨٢٤. تحفة الأشراف/٩٠١٧.

(دروودی خودای لەسەربێ) بە سواری هێسترە ماچەیەکی خۆی بوو، فەرمووی: ئەوە خۆ ئێوە بانگی کەسێ ناکەن کە کەڕبێ، یا بزربێ. ئێوە بانگی خودا دەکەن، خودا لە هەموو شوێنێ هەیە، وە گوێی لە هەموو دەنگێ هەیە، کەواتە ئەم هاتو هاوارەی پێ ناوێ. ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی ئەبو مووسا! یا فەرمووی: ئەی عەبدوڵلا! هۆشیارەوەبە با وشەیەکت پێ نیشان بدەم کە یەکێکە لە گەنجەکانی بەهەشت؟ گوتم: فەرموو، فەرمووی: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. (ش/د/ت).

٤٩٧٦- وللترمذي: مَا عَلَى الأَرْضِ أَحَدٌ يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. إِلاَّ كُفِّرَتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ وَلَوْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ[٢]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمویٚ: لەسەر رووی زەوی هەر کەسی بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ: ئیتر لە هەموو گوناهی پاك دەبێتەوە، با بەقەدکەفی دەریایش گوناهی زۆربن! (ت-س/ح).

٤٩٧٧- عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ أَبَاهُ دَفَعَهُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْدُمُهُ. قَالَ: فَمَرَّ بِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ صَلَّيْتُ فَضَرَبَنِي بِرِجْلِهِ وَقَالَ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ. قُلْتُ بَلَى. قَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ[٣]:

قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبادە (رەزای خودا لەخۆی و بابی) فەرمووی: باوکم ناردمیە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە خزمەتی بکەم. فەرمووی: جارێ نوێژم کردو راکشام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە هات قاچێکی تێمەوەژەندو ئاگاداری کردمەوەو فەرمووی: ئەدی! بایەکێ لە دەرگاکانی بەهەشتت پێ نیشان بدەم، سەعد فەرمووی: گوتم: بفەرموو قوربان! فەرمووی: : لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ: کەسێ دەوامی لەسەر بکا دەیگەیەنێتە ناوبەهەشت.

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٤٩٧٨- وَقَالَ صَفْوَانَ بْنِ سُلَيْمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): مَا نَهَضَ مَلَكٌ مِنَ الأَرْضِ حَتَّى قَالَ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ[٤]:

**صەفوانی کوڕی سولەیم** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: هیچ فریشتەیێ لە زەوی بەرزەوە نابێ بۆ ئاسمان هەتا بۆ مووفەڕکی نەڵێ: : لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ. (ت).**

٤٩٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكْثِرْ مِنْ قَوْلِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ فَإِنَّهَا كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ[٥]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێی فەرمووم: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ: زۆربکە، چونکە ئەمە گەنجێکە لە گەنجەکانی بەهەشت (ت).**

٤٩٨٠- وَقَالَ مَكْحُولِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَمَنْ قَالَ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ وَلاَ مَنْجَا مِنَ اللّٰهِ إِلاَّ إِلَيْهِ. كَشَفَ عَنْهُ سَبْعِينَ بَابًا مِنَ الضُّرِّ أَدْنَاهُنَّ الْفَقْرُ. روى هذه الثلاثة الترمذي (والاول بسند صحيح -شرحه)[٦].

**مەکحوولیش دەڵێ: هەر کەسێ بڵێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ وَلاَ مَنْجَا مِنَ اللّٰهِ إِلاَّ إِلَيْهِ): پارێز لە تاوان‌و توانایی خودا پەرستی هەر بە دەستی خودا خۆیەتی، پەناو پاساریش هەر لەلای خودا خۆیەتی) مەکحوولیش دەڵێ: هەر کەسێ ئەم زیکرە بڵێ خودا دەرگای حەفتا تەنگانەی لێ دەکاتەوە، کە هەرە بچکۆلەکەیان هەژاریی بێ. (ت).**

## ٦٤) ویردی پاش نوێژ: (الذكر والتسبيح عقب الصلاة)

٤٩٨١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ فِي دُبُرِ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَهُوَ ثَانِي رِجْلَيْهِ قَبْلَ أَنْ يَتَكَلَّمَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ

---

[٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٥] مسكوت عنه.

[٦] مسكوت عنه.

الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ عَشْرَ مَرَّاتٍ كُتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ وَمُحِيَ عَنْهُ عَشْرُ سَيِّئَاتٍ وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ وَكَانَ يَوْمَهُ ذَلِكَ فِي حِرْزٍ مِنْ كُلِّ مَكْرُوهٍ وَحَرْسٍ مِنَ الشَّيْطَانِ وَلَمْ يَنْبَغِ لِذَنْبٍ أَنْ يُدْرِكَهُ فِي ذَلِكَ الْيَوْمِ إِلاَّ الشِّرْكَ بِاللَّهِ تَعَالَى[1]:

ئەبو زەڕ (خوداى لێ ڕازى بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەپاش نوێژی بەیانی لەسەر چۆك دانیشێ و بەرلەوەی قسەی دنیایی بکا دەجار بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ): دە چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە دە خراپەی بۆ دەسڕێتەوە، وە پایەیشی دە پلە بەرز دەبێتەوە، وە ئەو ڕۆژەیش تا سەر تووشی هیچ ناخۆشییەك نابێ، وە خودا دەیپارێزێ لە شەیتان وە ئەو ڕۆژە هیچ گوناهێکی بۆ نانووسرێ، مەگەر شەریك و هاوبەش دابنێ بۆ خودای گەورە. (ت-س/ص).

٤٩٨٢- عَنْ عُمَارَةَ بْنِ شَبِيبٍ السَّبَئِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. عَشْرَ مَرَّاتٍ عَلَى إِثْرِ الْمَغْرِبِ بَعَثَ اللَّهُ لَهُ مَسْلَحَةً يَحْفَظُونَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُصْبِحَ وَكَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ مُوجِبَاتٍ وَمَحَا عَنْهُ عَشْرَ سَيِّئَاتٍ مُوبِقَاتٍ وَكَانَتْ لَهُ بِعَدْلِ عَشْرِ رِقَابٍ مُؤْمِنَاتٍ. رواهما الترمذي[2]:

عومارەی کوڕی شوبەیبی سەبەئی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی لەپاش نوێژی شێوان دەجار بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) خودا قۆڵێ حەسحەسی بۆ دەنێرێ تابەیانی ئێشکی دەگرن و ئاگاداریی دەکەن لە شەیتان، سەرەڕای ئەوەیش خودا دەچاکەی وای بۆدەنووسێ کە

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[2] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ببن بەهۆی چوونە بەهەشت دەخراپەی وەهایشی بۆ دەسڕێتەوە کە لەوانەن پیاو دەبەن بۆ قوڕداو ماڵ وێرانی دەکەن، لە هەمان کاتدا هاوتای خێری ئازاد کردنی دەبەندەی موسوڵمانیش خێری دەگا. (ت-س/ح).

٤٩٨٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَصْلَتَانِ أَوْ خَلَّتَانِ لاَ يُحَافِظُ عَلَيْهِمَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ يُسَبِّحُ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ عَشْرًا وَيَحْمَدُ عَشْرًا وَيُكَبِّرُ عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسُونَ وَمِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ وَخَمْسُمِائَةٍ فِي الْمِيزَانِ وَيُكَبِّرُ أَرْبَعًا وَثَلاَثِينَ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ وَيَحْمَدُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَيُسَبِّحُ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ فَذَلِكَ مِائَةٌ بِاللِّسَانِ وَأَلْفٌ فِي الْمِيزَانِ. فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعْقِدُهَا بِيَدِهِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ هُمَا يَسِيرٌ وَمَنْ يَعْمَلُ بِهِمَا قَلِيلٌ قَالَ: يَأْتِي أَحَدَكُمْ - يَعْنِي الشَّيْطَانَ - فِي مَنَامِهِ فَيُنَوِّمُهُ قَبْلَ أَنْ يَقُولَهُ وَيَأْتِيهِ فِي صَلاَتِهِ فَيُذَكِّرُهُ حَاجَةً قَبْلَ أَنْ يَقُولَهَا. رواه أصحاب السنن[٣].

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (ڕەزای خودا لەخۆی و باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دوو خووی جوان هەن. یا فەرمووی: دوو ڕەوش هەن، هەر بەندەیەکی موسوڵمان ئاگادارییان بکا، مسۆگەر دەچێتە بەهەشت، خۆیان ئاسانن بەڵام ئەوانەی کە ڕەفتاریان پێ دەکەن کە من، یەکەم ئەوەیە کە لەپاش هەموو نوێژێکی فەرزەوە دەجار بڵێ: (سبحان الله) وە دەجار بڵێ (الحمد لله) وە دەجار بڵێ: (الله أكبر) ژمارەی ئەم وشانەیش بەگوتن و بەزمان دەکاتە سەت و پەنجا بەڵام بەکێشانی تەرازووی خێر دەکاتە هەزارو پێنج سەدچاکە، دوەمیش ئەمەیە: کە لەکاتی خەوتنیشدا سیی و چوار (الله أكبر) و سیی و سێ (الحمد لله) و سیی و سێ (سبحان الله) بکا، کە بە گوتنی زمان دەکاتە سەد، وە بەکێشانی تەرازووی خێر دەکاتە هەزار. عەبدوڵلا فەرمووی: خۆم بەچاوی خۆم پێغەمبەرم (دروودی خودای لەسەربێ) دیوە بە دەستی، بە پەنجەکانی، ئەم ویردانەی دەژمارد. یاران فەرموویان: قوربان! ئەی

[٣] بسند صحيح (شرحه).

پێغەمبەری خودا! چۆن خۆیان ئاسانن، کەچی کەم کەس کاریان پێ دەکەن! فەرمووی: لەکاتی نووستندا شەیتان دێ بەلای هەندێکتانەوەو بەر لەوەی ئەمانە بڵێ دەیخەوێنێ، لە نوێژیشدا دەچێ بەلایەوەو کارێکی خۆیی وەبیر دەخاتەوە بەر لەوەی کە ئەمانە بخوێنێ. (د/ت/ن-س/ص).

## ٦٥) یادخوێندنو ویردخوێندنی بەیانیانو ئێواران
## التسبيح والذكر في الصباح والمساء

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَسُبْحَانَ اللّٰهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ - سورة الروم- ٣٠/١٧-١٨}.

واتە: نیشانەو بەڵگەو گەورەییو پیرۆزی خودا لە ئێوارانو بەیانیانو نیوەڕۆیاندا زۆرباش روونو ئاشکرایە، هەروەها لەکاتی زەردەپەڕدا، لەسەراسەری ئاسمانەکانو زەویدا ئەم بەڵگەو نیشانانە دەبن بەهۆی تەسبیحاتو سوپاسی خودا.

٤٩٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ. لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَيْهِن. رواه الخمسة الا البخاري[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ سەر لەبەیانیو سەر لەئێوارێ سەدجار بڵێ: سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ: لە رۆژی ژینەوەدا کەسێتر کردەوەی وانایاب نایەنێ بۆ مەیدانی حیساب، مەگەر کەسێ کە ئەویش ئەمەی گوتبێ یا لەوە پتری کردبێ! (م/د/ت/ن).

٤٩٨٥- عَنْ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) إِنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مُرْنِي بِكَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ إِذَا أَصْبَحْتُ وَإِذَا أَمْسَيْتُ. قَالَ: قُلِ اللّٰهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ

---

[1] {ریاض/٣ ل/٣٠٨ ط/٢ رقم:١٤٥١ - مسلم:٢٦٩٢}. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٤. أبوداود. أدب: ٥٠٩١. ترمذي. دعوات/٣٤٦٩.

وَالشَّهَادَةِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ. قَالَ: قُلْهَا إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ وَإِذَا أَخَذْتَ مَضْجَعَكَ[٢]:

**ئەبو بەکر** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! چەن وشەیەکم پێ بفەرموو، کە لەکاتی بەیانیو کاتی ئێوارەدا بیانڵێم، فەرمووی: بڵێ: (اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَشَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ) خودایە! ئەی دروستکەری ئاسمانەکانو زەوی! ئەی زانا بە هەموو نهێنیو ئاشکرایە؟ ئەی پەروەردگاری هەموو شتێ! ئەی پادشای هەموان! شایەتی دەدەم کە هیچ خودایێ نییە تۆ نەبێ، پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕی دەروونی خۆم، هەروەها لەشەڕی شەیتانو شیرکی شەیتان. فەرمووی: کاتی بەیانیو کاتی ئێوارێو کاتی خەوتن ئەمە بڵێ (د/ت/ن-س/ص).**

٤٩٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ إِذَا أَصْبَحَ: اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ. وَإِذَا أَمْسَى قَالَ: اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ[٣]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **بەیانیان دەیفەرموو: اللَّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنَا وَبِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا وَبِكَ نَمُوتُ وَإِلَيْكَ النُّشُورُ.**

**ئەی خودایە! بە پشتی تۆ وا رۆژمان کردەوە، بە پشتی تۆ شەو دەکەینەوە، لەسایەی تۆوە دەژینو بەفەرمانی تۆ دەمرین، کاتێ زیندوو دەبینەوە دەگەڕێینەوە بۆلای خۆت. ئێوارانیش دەیفەرموو: اللَّهُمَّ بِكَ أَمْسَيْنَا وَبِكَ نَحْيَا.. تاد. (د/ت/س/ص).**

---

[٢] رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

[٣] رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

٤٩٨٧- عَنْ ثُوبَان (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قَالَ: مَنْ قَالَ إذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى: رَضِينَا بِاللّٰهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، إلاَّ كَانَ حَقًّا عَلَى اللّٰهِ أَنْ يُرْضِيَهُ[٤]:

تەوبان (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ کاتی بەیانی و کاتی ئێواری بڵێ: (رَضِينَا بِاللّٰهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً) یەزدانمان بەخودا قەبووڵەو ئیسلاممان بە ئایین قەبووڵەو موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە. هەر کەسێ لەم دوو کاتەدا ئەمە بڵێ دەبێ بەهەق لەسەر خودا کە ئەو کەسە ڕازی بکا! (د/ت/ن-س/ح).

٤٩٨٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّم) قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ اللّٰهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلاَئِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ أَنَّكَ أَنْتَ اللّٰهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا أَصَابَ فِي يَوْمِهِ ذَلِكَ مِنْ ذَنْبٍ وَإِنْ قَالَهَا حِينَ يُمْسِي غُفِرَ لَهُ مَا أَصَابَ تِلْكَ اللَّيْلَةَ[٥]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ سەر لە بەیانیان بڵێ: (اللّٰهُمَّ إِنِّي أَصْبَحْتُ أُشْهِدُكَ وَأُشْهِدُ حَمَلَةَ عَرْشِكَ وَمَلاَئِكَتَكَ وَجَمِيعَ خَلْقِكَ أَنَّكَ أَنْتَ اللّٰهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ): خودایە! لەم دەمە دەمی بەیانییەدا هەم خۆت دەکەم بە شایەت و هەم ئەو فریشتە هەڵکرانەی کە تەخت و بارەگای پیرۆزی تۆ هەڵدەگرن و مەشهوورن بە حەمەلەتولعەرش و هەم گشت فریشتەکانی تری تۆو، هەم هەموو دروستکراوانی تۆ، هەمووتان دەکەم بەشایەت لەسەر ئەمە: من شایەتی دەدەم کە هەر تۆ خودای ڕاست و دروستیت و بەس، تۆ نەبێ خودای تر نییە، تاق و تەنیای، هاوەڵ و هاوبەشت نییە، هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری تۆیە. هەر کەسێ سەر لەبانی ئاوا

---

[٤] رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

[٥] رواه أصحاب السنن بسند غريب (شرحه).

بڵێ ئیتر بێگومان کە خودا خۆش دەبێ لەو گوناهانەی کە لەو ڕۆژەدا دەبن بەتووشیەوە، ئەگەر سەر لەئێوارێ ئاوا بڵێ خودا خۆش دەبێ لەو گوناهانەی کە لەو شەوەدا دەبن بە تووشیەوە، بە مەرجێ خۆی لە گوناهە گەورەکان بپارێزێ‌و ناهەقی لە بەندەگەل نەکا (د/ت/ن-سەند غەریب).

٤٩٨٩- ← (ب - ٥ ز - ٩٠ ل - ٣٢٠ ف - ٩)[٦].

٤٩٩٠- عَنْ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ قَالَ بِسْمِ اللَّهِ الَّذِى لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَىْءٌ فِى الأَرْضِ وَلاَ فِى السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُصْبِحَ وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُمْسِيَ. قَالَ: فَأَصَابَ أَبَانَ بْنَ عُثْمَانَ الْفَالِجُ فَجَعَلَ الرَّجُلُ الَّذِى سَمِعَ مِنْهُ الْحَدِيثَ يَنْظُرُ إِلَيْهِ فَقَالَ: لَهُ مَا لَكَ تَنْظُرُ إِلَيَّ فَوَاللَّهِ مَا كَذَبْتُ عَلَى عُثْمَانَ وَلاَ كَذَبَ عُثْمَانُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَكِنَّ الْيَوْمَ الَّذِى أَصَابَنِى فِيهِ مَا أَصَابَنِى غَضِبْتُ فَنَسِيتُ أَنْ أَقُولَهَا. وى هذه الستة أصحاب السنن[٧].

ئەبانی کوڕی عوسمان (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو: هەر کەسێ (لەفظی تیرمذی: هەر عەبدێ هەموو ڕۆژێ بەیانی و ئێوارێ) سێ جار بڵێ: (بِسْمِ اللَّهِ الَّذِى لاَ يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَىْءٌ فِى الأَرْضِ وَلاَ فِى السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) بە پیرۆزی ناوی خودا دووعا بۆ خۆم دەکەم‌و پەنا دەگرم بەناوی پیرۆزی ئەو خودایە کە هیچ شتێ لە ئاسمان‌و زەویدا لەگەڵ ناوی پیرۆزی ئەودا زیانی نابێ، دڵنیام کە خودا ئاگای لە خشەی مارو مێرووەو گشت شتێ زۆرباش دەزانێ. ئیتر ئەو ڕۆژە تا ئێوارێ تووشی بەڵای ناکەهان نابێ. گوتی: جا کاتێ ئەبان ئیفلیج بوو، ئەو پیاوەی کە ئەم فەرموودەیەی لێ بیستبوو خێسەی لێدەکرد!

ئەبان فەرمووی: ئەوە بۆ لێم مۆڕدەبیتەوە، دەسا بەخودا نە من درۆم بەدەم عوسمانەوە کردووەو نە عوسمانیش درۆی بەدەم پێغەمبەرەوە

---

[٦] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/٩٠ ل/٣٢٠ ط/١ رقم/٣٦٦٨.

[٧] رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

کردووە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە وام لێ هات تووڕە بوو بووم، وە لە بیرم نەما کە ئەمە بڵێم (د/ت/ن-س/ص).

٤٩٩١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَمْسَى قَالَ: أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَمِنْ سُوءِ الْكِبَرِ أَوِ الْكُفْرِ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ. وَإِذَا أَصْبَحَ قَالَ ذَلِكَ أَيْضًا أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ. رواه الخمسة الا البخاري[8]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو ئێواران دەیفەرموو: (أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَهَا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي هَذِهِ اللَّيْلَةِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهَا رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَمِنْ سُوءِ الْكِبَرِ أَوِ الْكُفْرِ رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ): ئەوا ئێوارە داهات، هەموو بەردەوام موڵکی خوداین، سوپاس بۆ خودا، هەر خودا خودایەو بەس، خودایەکی تاقی تەنیایە، بێ هاوڕێیە، موڵك هەر موڵکی ئەوە، سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە، ئەو زاتە پیرۆزەیە تەوانای هەموو شتێکی هەیە، ئەی پەروەردگارم! داوای ئەو چاکەیەت لێ دەکەم کەوا لەم شەوەداو داوای ئەو چاکەیەشت لێ دەکەم کەوا لە دوایەوە، پەنادەگرم بە تۆ لەو شەڕەی کەوا لەم شەوەداو لەو شەڕەی کەوا لە دوایەوە، پەروەردگارا!. پەنادەگرم بەتۆ لە تەوزەلی و تەمەڵی و لە ئیفتادەیی.

پەروەردگارا! پەنادەگرم بەتۆ لە سزای دۆزەخ و لە سزای گۆڕ. گوتی: بەیانیانیش هەروای دەفەرموو: بەڵام لەجیاتی (أَمْسَيْنَا وَأَمْسَى الْمُلْكُ لِلَّهِ) دەیفەرموو: (أَصْبَحْنَا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ ...تاد). (م/د/ت/ن).

---

(٨) {رياض/٣ ل/٣١٠ رقم/١٤٥٥ = مسلم: ٢٧٢٣}=٦٨٤٦. أبوداود. أدب: ٥٠٧١. ترمذي. دعوات: ٣٣٩.

٤٩٩٢- ولمسلم: كَانَ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ ، أَعَزَّ جُنْدَهُ ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَغَلَبَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ، فَلاَ شَيْءَ بَعْدَهُ[٩]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو دەیفەرموو: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ ، أَعَزَّ جُنْدَهُ ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَغَلَبَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ، فَلاَ شَيْءَ بَعْدَهُ) هەر خودا خودایە! تاقو تەنیایە، لەشکری خۆی زاڵ کردو سوپای خۆی سەرخستو بەندەکەی خۆی کە موحەممەدە سەرخستو هەر خۆی بەتەنیا لەشکری گەلە کۆمەی کافرەکانی – لە شەڕی غەزای خەندەکا – تێك شکاند، ئەوەی ڕاستو دروست بێ هەر خۆیەتیو لەخۆی بەولاوە هەموو شتێ هیچو پووچو بێ بەقایە (م).

٤٩٩٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ غَنَّامٍ الْبَيَاضِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ اللَّهُمَّ مَا أَصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ فَلَكَ الْحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ. فَقَدْ أَدَّى شُكْرَ يَوْمِهِ وَمَنْ قَالَ مِثْلَ ذَلِكَ حِينَ يُمْسِي فَقَدْ أَدَّى شُكْرَ لَيْلَتِهِ[١٠]:

عەبدوڵڵای کوڕی غەننامی بەیازی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی سەر لەبەیانی بڵێ: (اللَّهُمَّ مَا أَصْبَحَ بِي مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنْكَ وَحْدَكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ فَلَكَ الْحَمْدُ وَلَكَ الشُّكْرُ): خودایە! هەرچی نازو نیعمەتم هەیە هەموو لەسایەی تۆوەیەو بەس! هەر خۆتی بۆ خۆت، هاوڕێت نییە، هاوبەشت نییە، سوپاسی بەڕاستی هەر بۆ تۆیە، ستایشی بەڕاستی هەر بۆ تۆیە. ئەوەی سەر لەبەیانی ئەمە بڵێ ئیتر ئەوە ئەدای سوپاسی ئەو ڕۆژەی کردووە، وە ئەوەی سەر لە ئێوارێ ئەمە بڵێ ئیتر ئەوە ئەدای سوپاسی ئەو شەوەی کردووە!. (د-س/صالح).

٤٩٩٤- وَقَالَ ابْنَ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) لَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَعُ هَؤُلاَءِ الدَّعَوَاتِ حِينَ يُمْسِي وَحِينَ يُصْبِحُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ والْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا

---

[٩] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٤٨. بخاري. مغازي: ١٤١٤.

[١٠] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

وَالآخِرَةِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَتِي. وَآمِنْ رَوْعَاتِي اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَمِنْ فَوْقِي وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي[11]:

ئیبنو عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) دەیفەرموو: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وا بوو ئێواریو بەیانی ئەم دوعایەی فەرامۆش نەدەکرد، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَتِي. وَآمِنْ رَوْعَاتِي اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَمِنْ فَوْقِي وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي): خودایە! داوای لێخۆشبوونو خۆشی هەردوو جیهانت لێ دەکەم، خودایە! داوای لێبوردنو خۆشحاڵیت لێ دەکەم، بۆ دینم، بۆ دنیام بۆ خۆم، بۆ ماڵو منداڵم، خودایە! ئابڕوو ناموسم بپارێزەو هەموو عەیبەو نەنگێکم بپۆشە، وە ترسم بڕەوێنەوەو دڵم ئەمین بکەرەوە، خودایە! ئاگات لێم بێ، ئاگات لەلای بەردەمم بێ، ئاگات لەلای پشم بێ، ئاگات لەلای ڕاستو لەلای چەپم بێ، ئاگات لە ژوور سەرم بێ، پەنادەگرم بە گەورەیی تۆ کە لەناکاو بەبێ ئاگا ڕۆبچم بەناخی زەویدا. (د-س/صالح).

٤٩٩٥- عَنْ مُسْلِمِ بْنِ الْحَارِثِ التَّمِيمِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: أَسَرَّ الِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِذَا انْصَرَفْتَ مِنْ صَلَاةِ الْمَغْرِبِ فَقُلِ اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّارِ. سَبْعَ مَرَّاتٍ فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ ثُمَّ مِتَّ فِي لَيْلَتِكَ كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا وَإِذَا صَلَّيْتَ الصُّبْحَ فَقُلْ كَذَلِكَ فَإِنَّكَ إِنْ مِتَّ فِي يَوْمِكَ كُتِبَ لَكَ جِوَارٌ مِنْهَا[12]:

موسلیمی کوڕی حاریسی تەمیمی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەنهێنی قسەیەکی لەلا درکانم فەرمووی: کاتێ سڵاوی نوێژی شێوانت دایەوە ( لە گێڕانەوەیەکا: بەر لەوە قسە لەگەڵ کەسێ بکەی)

---

[11] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[12] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

حەوت جار بڵێ: (اللَّهُمَّ أَجِرْنِي مِنَ النَّارِ): خودایە ئامانم بدە لە ئاگری دۆزەخ، چونکە هەر شەوێ ئەمە بخوێنێت و لەو شەوەدا بمریت پسووڵەی ئامانت لەئاگر بۆ دەنووسرێ، وە کاتێ نوێژی بەیانی دەکەی هەمان شت بڵێ، چونکە هەر رۆژێ ئەمە بخوێنی و لەو رۆژەدا بمریت ئیتر پسووڵەی ئامانت لەئاگر بۆ دەنووسرێ (د-س/صالح).

٤٩٩٦- وَقَالَ أَبُوالدَّرْدَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ وَإِذَا أَمْسَى حَسْبِيَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ سَبْعَ مَرَّاتٍ كَفَاهُ اللَّهُ مَا أَهَمَّهُ صَادِقًا كَانَ بِهَا أَوْ كَاذِبًا[١٣]:

ئەبو دارداء (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: هەر کەسێ بەیانی و ئێواری حەوت جار بڵێ: {فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ اللّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ - سورة التوبة - ٩/١٢٩}.

واتە: بۆ هەموو کارو فرمانێکم یەزدانم بەسە خودایەکی هەق و تاق و تەنهایە، پشت و پەنایە، پەروەردگای تەخت و بارەگای گەورەیە. بەرداء فەرمووی: هەر کەسێ وا بکا خودا هەموو اواتێکی دێنێتە دی، ئیتر خواه بەراستی بێ یا بەدرۆ! (د-س/صالح).

٤٩٩٧- وَكَانَ النَّبِيُّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) يُعَلِّمُ بَعْضَ بَنَاتِهُ فَيَقُولُ: قُولِي حِينَ تُصْبِحِينَ سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ مَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا فَإِنَّهُ مَنْ قَالَهُنَّ حِينَ يُصْبِحُ حُفِظَ حَتَّى يُمْسِيَ وَمَنْ قَالَهُنَّ حِينَ يُمْسِي حُفِظَ حَتَّى يُصْبِحَ[١٤]:

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەی فێری کچێکی خۆی دەکردو پێی دەفەرموو: کاتێ بەیانی دەکەیتەوە بڵێ: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ لاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ مَا شَاءَ اللَّهُ كَانَ وَمَا لَمْ يَشَأْ لَمْ يَكُنْ أَعْلَمُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ

---

[١٣] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[١٤] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

اللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَيْءٍ عِلْمًا): تەسبیح و تەنزیهی خودا دەكەم و سوپاس و ستایشی دەكەم، هێز ئەوەیە كە لەلای خودابێ، هەرچی خواست و مەیلی خودای لەسەربێ دەبێ ببێ، وە هەرچی خواست و مەیلی خودای لەسەر نەبێ نابێ، ئەوەی خودا بیەوێ دەبێ، وە ئەوەی خودا نەیەوێ نابێ، باوەڕو یەقینم هەیە كە خودا دەسەڵاتی هەموو شتێكی هەیە، وە خودا زۆر بەرووردی ئاگایەكی زۆرباشی لە هەموو شتێ هەیە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: چونكە ئەوەی كاتێ بەیانی دەكاتەوە ئەم نزایە بڵێ ئیتر هەتا ئێوارە خودا دەیپارێزێ، وە ئەوەی كاتێ ئێوارە ئەمە بڵێ ئیتر هەتا كاتی بەیانی خودا دەیپارێزێ. (د–س/صالح).

٤٩٩٨– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ (فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ) إِلَى (وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ) أَدْرَكَ مَا فَاتَهُ فِي يَوْمِهِ ذَلِكَ وَمَنْ قَالَهُنَّ حِينَ يُمْسِي أَدْرَكَ مَا فَاتَهُ فِي لَيْلَتِهِ[١٥]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی سەر لەبەیانی بڵێ: {فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ، {يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ – سورة الروم – ٣٠/١٧-١٩}.

دەی بۆ یادی ئەو خودایە، وە بۆ حوضووری ئەو خاوەن هێزو دەستەڵاتە تەسبیحی بكەو بە دووری بگرە لە گشت كەمییەك و بەیانی و ئێوارە تەسبیحاتی بكەو بەپاك و پیرۆزی بزانە، دڵنیابە كە سوپاس و ستایش هەر بۆ ئەوە، لە ئاسمانەكان و لە زەویدا، لە هەموو كاتێكدا، بەتایبەتی لەكاتی سەر لەئێواری و نیوەڕۆدا، دەستەڵاتی خودا بێ سنووە، ئەوەتا لە

[١٥] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

مردوو زیندوو دوست دەکا، وەك ئادەمیزاد لەتۆ ماوو باڵندە لە هێلکە، وەك لە ماددەی خاكو خۆڵی بێگیان گیانلەبەرانو گیاو گوڵو مەلو مۆرو زیندەوەرانی تر دروست دەکا، وە لە زیندوو مردوو دروست دەکا، وەك تۆماو لە گیانلەبەرو هێلکە لە باڵندە، وەك مردنی دوا ژیانو ژیانی پاش مردن، ئەوەتا لەلایەکی ترەوە ئەو زەوییە ڕەقو تەقو وشكو برینگە، کە لە وەرزی هاویندا دەڵێی کەوڵە رەقیو شکەوە بووە لەکاتی پەڵەدا نەرم دەبێتەوەو بەرە بەرە زیت دەبێتەوەو گیاو گوژەو گوڵو دارو رووەك — وەك مردوویێ لەناو گۆڕەوە سەر دەردێنێ — لەژێر خاکەوە سەر دەردەهێننو چووزو چووزەرەی سەوزو هەمە رەنگ کفنی زەرد بووی خاك ەدڕن! ئاوا بە بەرچاو تانەوە خودا هەموو ساڵی ئەم زەوییە لە پایزدا دەمرێنێو لە بەهاردا زیندووی دەکاتەوە. هەتا پیشانتان بدا، کە ئێوەیش ئاوەها زیندوو دەبنەوەو لەناو گۆڕەوە هەڵ دەڕژێنەوە سەر ڕووی زەوی!.

فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەی سەر لەبەیانی ئەمە بڵێ ئەو ڕۆژە بەرهەچییەکا نەگا ئەمە بریتی دەکەوێ، ئەوەی سەر لەئێوارێ ئەمە بڵێ هەروەها (د–س/صالح).

٤٩٩٩– عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِى بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ لأَبِيهِ: يَا أَبَتِ إِنِّى أَسْمَعُكَ تَدْعُو كُلَّ غَدَاةٍ. اللَّهُمَّ عَافِنِى فِى بَدَنِى اللَّهُمَّ عَافِنِى فِى سَمْعِى اللَّهُمَّ عَافِنِى فِى بَصَرِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. تُعِيدُهَا ثَلاَثاً حِينَ تُصْبِحُ وَثَلاَثاً حِينَ تُمْسِى وَتَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. تُعِيدُهَا حِينَ تُصْبِحُ ثَلاَثاً وَثَلاَثاً حِينَ تُمْسِى. قَالَ نَعَمْ يَا بُنَىَّ إِنِّى سَمِعْتُ النَّبِىَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْعُو بِهِنَّ فَأُحِبُّ أَنْ أَسْتَنَّ بِسُنَّتِهِ. رَوى هذه السبعة أبو داود[١٦]:

لە عەبدوڵڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرەوە (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: عەرزی باوکمم کرد گوتم: بابە! گوێم لێتە هەموو ڕۆژێ بەیانیان

[١٦] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

**سێ جارو ئێواران سێ جا ئەم نزایەیە دەخوێنی: (اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ): ئەی خودایە! لەشم ساخکەو گوێم ساخکەو چاوم ساخکە، خودای ترنییە تۆ نەبێ. باوکم فەرمووی: خۆم لەزاری حەزرەتم ژنەوتووە ئەم نزایانەی دەخوێند (درودی خودای لەسەربێ) بۆیە منیش حەزدەکەم ڕەفتار بە ڕەفتارو سوننەتی ئەو بکەم (د-س/صالح).**

## ٦٦) باسی سێیەم: باسی دووعاو نزایە، کەوریی نزاو دووعا

**٥٠٠٠- ← (ب - ٧ ز - ٢٣ ل - ١٢٨ ف - ٢)[1].**

**٥٠٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى مِنَ الدُّعَاءِ. رواه الترمذي والإمام أحمد والحاكم[2]:**

**لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): هیچ شتێ وەك نزاو پاڕانەوە نازدارو بەڕێز نییە لەلای خودا (ت/ئە/حاکم-س/ص).**

**٥٠٠٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الدُّعَاءُ مُخُّ الْعِبَادَةِ[3]:**

**ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نزاکردن و پاڕانەوە لەخودا کورۆکی خودا پەرستی و مۆخی عیبادەتی ساخە. (ت-س/غەریب).**

**٥٠٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللَّهَ يَغْضَبْ عَلَيْهِ[4]:**

---

[1] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/٢٣ ل/١٢٨ ط/١ رقم/٤٠٨٠.

[2] بسند صحيح (شرحه).

[3] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو کەسەی داوا لە خودا نەکا خودا ڕقی لێ دەگرێ (ت).

٥٠٠٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَسْتَجِيبَ اللَّهُ لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَالْكُرَبِ فَلْيُكْثِرِ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ[٥]:

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: هەر کەسێ حەز دەکا کە خودا لەکاتی تەنگانەدا زوو بێ بەهاوارییەوەو لەکاتی ناخۆشیدا زوو فریای بکەوێ با لە کاتی خۆشیو ئاسوودەیی دا زۆر لە خودا بپاڕێتەوە! (ت-س/غەریب) لەسەر فەرمایشتی شەرحەکە: لە گێڕانەوەیەکی ئیمامی ئەحمەددا (ڕەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لەکاتی خۆشییدا خودا بناسە، تا لەکاتی تەنگانەدا خودا بتناسێتەوە!

٥٠٠٥- عَنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا عَلَى الأَرْضِ مُسْلِمٌ يَدْعُو اللَّهَ بِدَعْوَةٍ إِلاَّ آتَاهُ اللَّهُ إِيَّاهَا أَوْ صَرَفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا مَا لَمْ يَدْعُ بِمَأْثَمٍ أَوْ قَطِيعَةِ رَحِمٍ. فَقَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ إِذًا نُكْثِرَ. قَالَ: اللَّهُ أَكْثَرُ:

عوبادەی کوڕی صامیت (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ - لەم جیهانەدا - داوای هەرشتێ لە خودا بکا، بێگومان کە خودا یا ئەو شتەی دەداتێ، یا بەقەد ئەوە خراپەی لێ لادەدا، بە مەرجێ کە داوای شتێکی گوناه نەکا، یا نزای خراپو دووعای شەڕ لە کەسوکاری نەکا.

پیاوێکیش لە کۆمەڵ گوتی: کەواتە لە دووعادا داوای زۆر شت دەکەین! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا زۆرتری لەدەست دێ بۆ خودا چی تێ دەچێ! (ت).

٥٠٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ فُتِحَ لَهُ مِنْكُمْ بَابُ الدُّعَاءِ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الرَّحْمَةِ وَمَا سُئِلَ اللَّهُ شَيْئًا يَعْنِى أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ أَنْ يُسْأَلَ الْعَافِيَةَ:

---

[٤] سكت عن درجته الشارح.

[٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ لە ئێوە دەرگای نزاو پاڕانەوەی بۆ بکرێتەوە ئەوە بەڕاستی هەموو دەرگاکانی رەحمەتی لێ کراوەتەوە، خودا هیچ بەخشیشێکی وەك ئەوە پێ خۆش نییە کە بەندە داوای خۆشیی لەش و ئاسوودەیی گیان و ئاسایشی دەروونی لێ بکاو ئەویش بیداتێ (ت).**

٥٠٠٧– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الدُّعَاءَ يَنْفَعُ مِمَّا نَزَلَ وَمِمَّا لَمْ يَنْزِلْ فَعَلَيْكُمْ عِبَادَ اللَّهِ بِالدُّعَاءِ[٨]:

**دیسان لەوەوە لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ** (درودی خودای لەسەربێ)**: نزاو پاڕانەوە سوودی هەیە بۆ هەموو دەردو بەلایێ، خۆ ئەو بەلایە هاتبێ یا بەڕێوەبێ! کەواتە ئەی بەندەکانی خودا! یەخەی دووعاو نزاو پاڕانەوە بەرمەدەن! (ت).**

٥٠٠٨– عَنْ سَلْمَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَرُدُّ الْقَضَاءَ إِلاَّ الدُّعَاءُ وَلاَ يَزِيدُ فِي الْعُمُرِ إِلاَّ الْبِرُّ[٩]:

**سەلمان** (رەزای خودای گەورەی لەسەربێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: دووعاو پاڕانەوەی لێ دەرچێ هیچی تر چارەنووس رەت ناکاتەوە! وە باشی بۆ کەسوکارو کردەوەی چاکەی لێ دەرچێ هیچی تر تەمەن درێژ ناکا (ت).**

٥٠٠٩– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُحِبُّ أَنْ يُسْأَلَ وَأَفْضَلُ الْعِبَادَةِ انْتِظَارُ الْفَرَجِ. روى هذه الثمانية الترمذي[١٠]:

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: داوا بکەن لە خودا کە لە بەخشش و زیادەکەرەمی خۆی بەشی**

---

[٨] سکت عن درجته الشارح.

[٩] رواه الترمضي بسند حسن (شرحه).

[١٠] سکت عن درجته الشارح.

باشتان پێ بدا. چونکە خودای گەورەو سەروەر حەز دەکا کە عەبدی خۆی داوای بەخشیشی لێ بکا. گەورەترین خودا پەرستیش ئەوەیە کە بەندە چاوەنواڕی دەرەتان و دەڕوولێ کردنەوەبێ! (ت).

## ٦٧) دەستووروو یاسای نزاو پاڕانەوە : (آداب الدُعاء)

٥٠١٠- ☜ (ب – ١ ز – ١٧٣ ل – ٤٧٢ ف – ٢ + ٣ + ٤ + ١)[١].

٥٠١١- وَقَالَ أَبُو مُوسَى (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): دَعَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ ، وَرَأَيْتُ بَيَاضَ إِبْطَيْهِ. رواهما البخاري[٢]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دووعای دەکرد، لە پاشا هەردوو دەستی بەرز دەکردەوە، جارێ لەکاتی دووعا کردندا ئەوەندە زۆر باڵی بەرزەوە کرد چاوم بەسپییدەی هەردوو بنباڵی کەوت. (ب) ☜ (ب – ١ ز – ١٣ ل – ٤٧٣ ف – ٤).

٥٠١٢- عَنْ سَلْمَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ رَبَّكُمْ تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا[٣]:

سەلمان (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پەروەردگارتان زۆر بەشەرم و بەڕێزە، هەر بەندەیێ لە پاڕانەوەدا دەستی هەڵ ببڕێ بۆلای خودا، خودا شەرم دەکا کە بەخاڵی رەتیان بکاتەوە!. (د/ت–س/ح).

٥٠١٣- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ فِي الدُّعَاءِ لَمْ يَحُطَّهُمَا حَتَّى يَمْسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ[٤]:

---

[١] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٧٣ ل/٤٧٢ رقم/٩٣٦ و٩٣٧ و٩٣٨ و٩٣٥.

[٢] راجع تجريد/١ ل/٢٦٠ رقم/٢٤٨ = ٣٩٠، ٨٠٧، ٣٥٦٤. مسلم. صلاة الاستقاء: ٢٠٧١، ٢٠٧٢.

[٣] بسند حسن.

[٤] بسند ضعيف (شرحه).

عومـەر (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسەربێ) وابوو لە پاڕانەوەدا کە دەستەکانی هەڵ دەبڕی، هەتا نەیانی هێنایە بە دەموچاویدا دایانی نەدەنایەوە. (د/ت-س/ضعیف).

٥٠١٤- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: مَرَّ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا أَدْعُو بِأُصْبُعَيَّ فَقَالَ: أَحِّدْ أَحِّدْ. وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ. روى هذه الثلاثة أبو داود والترمذي[5]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ خەریك بووم دەپاڕامەوەو بەدوو پەنجە ئیشارەتم دەکرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەو حەلەدا تەشریفی هات بۆ لام فەرمووی: بەیەك پەنجە بەیەك پەنجە!. وە بە پەنجەی شایەتمانی ئاماژەی کرد کە بەو پەنجەیە لە نزاکەما ئاماژە بکەم (د/ت-س/ح).

٥٠١٥- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَسْتُرُوا الْجُدُرَ مَنْ نَظَرَ فِي كِتَابِ أَخِيهِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ فَإِنَّمَا يَنْظُرُ فِي النَّارِ، سَلُوا اللَّهَ بِبُطُونِ أَكُفِّكُمْ وَلاَ تَسْأَلُوهُ بِظُهُورِهَا فَإِذَا فَرَغْتُمْ فَامْسَحُوا بِهَا وُجُوهَكُمْ. رواه أبو داود[6]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پەردە بۆ دارو دیوار مەکەن (چونکە زیادە ڕەوییەو خووی خۆ بەزل زانەکانە) هەر کەسێکیش نامەی برادەری خۆی بخوێنێتەوە بەبێ ڕەزای خۆی ئەوە ئاگری سوور دەخوێنێتەوە، کاتێکیش دەپاڕێنەوە بە بەری دەستتان لەخودا بپاڕێنەوەو لەپ لە خودا پان بکەنەوەو بە پشتی دەست مەپاڕێنەوە پشتی دەستتان مەکەنە ئاسمان، کە لێشبوونەوە لە پاڕانەوە بەری دەستتان بهێنن بەرووی خۆتاندا. (د-س/ضەعیف).

٥٠١٦- عَنْ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً يَدْعُو فِي صَلاَتِهِ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فقال: عَجِلَ هَذَا. ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ

---

[5] بسند حسن (شرحه).

[6] بسند ضعيف (شرحه).

لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبْدَأْ بِتَحْمِيدِ اللَّهِ وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ ثُمَّ لِيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ لِيَدْعُ بَعْدُ بِمَا شَاءَ. رواه أصحاب السنن[٧].

فەضالەی کوڕی عوبەید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوێی لێ بوو پیاوێ لە نوێژدا دەپاڕایەوە، سەڵاواتی لە دیاری پێغەمبەر نەدا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەمە بەپەلەیە، ئینجا کابراکەی بانگ کردو بەویش و بەخەڵکەکەی تریشی فەرموو: کە نوێژ دەکەن لە پێشا سوپاس و ستایشی خودا بکەن، ئەوجا درووود بنێرن بۆ گیانی پێغەمبەرو سەڵەواتی لەسەر بدەن (دروودی خودای لەسەربێ) ئینجا لەپاش ئەوە هەر نزایەك ئارەزوو دەکەن بیکەن بۆ خۆتان (د/ن/ت-س/ص).

٥٠١٧- وَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عَجِلْتَ أَيُّهَا الْمُصَلِّي إِذَا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ فَاحْمَدِ اللَّهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ وَصَلِّ عَلَيَّ ثُمَّ ادْعُهُ. قَالَ: ثُمَّ صَلَّى رَجُلٌ آخَرُ بَعْدَ ذَلِكَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَصَلَّى عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّهَا الْمُصَلِّي ادْعُ تُجَبْ[٨].

پیاوێکیش هاتە ژوورەوە نوێژی کردو گوتی: خودایە! لێم خۆش بەو ڕەحمم پێ بکە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی نوێژکەر! پەلەتکرد، کە نوێژ دەکەی دابنیشە، سوپاسێکی وا کە شایانی خودابێ بیکەو صەڵاوات بدە لەسەرمن، ئەوجا لەخودا بپاڕێرەوە. گوتی: جا لە پاش ئەو پیاوێکی تر نوێژی کردو سوپاسی خودای کردو سەڵاواتی لە پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئەی نوێژکەر! نزا بکە نزات گیرایە!. (ت-س/ح).

٥٠١٨- وَقَالَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) كُنْتُ أُصَلِّي وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ مَعَهُ فَلَمَّا جَلَسْتُ بَدَأْتُ بِالثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ ثُمَّ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ دَعَوْتُ لِنَفْسِي فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَلْ تُعْطَهْ سَلْ تُعْطَهْ. رواهما الترمذي[٩].

---

[٧] بسند صحيح (شرحه).

[٨] بسند حسن (شرحه).

[٩] بسند صحيح (شرحه).

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ نوێژم دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەبو بەکرو عومەرم لەگەڵ بوون، کە دانیشتم لە پێشدا وەسپ و سوپاسی خودام کردو دروودم نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و ئینجا پاڕامەوە بۆ خۆم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێستا داوا لە خودا بکە، هەرچی لێ داوا بکەی دەیداپێت (ت-س/ص).

٥٠١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ، اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي ، إِنْ شِئْتَ . لِيَعْزِمِ الْمَسْأَلَةَ ، فَإِنَّهُ لاَ مُكْرِهَ لَهُ[١٠]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەڵێن: خودایە! ئەگەر خۆت ئارەزوو دەکەی لێم خۆشبە! خودایە! ئەگەر خۆت مەیلت هەیە ڕەحمم پێ بکە، داواکەتان یەکلایی بکەنەوەو سووربن لەسەری و بەجەخت داوا لە خودا بکەن و ئەگەر مەگەر لە دووعاو پاڕانەوەدا مەکەن چونکە کەس زۆری لەسەر خودا نییە (تۆ بڵێیت و نەڵێیت خودا ئەگەر مەیلی لەسەر نەبێ نایکا) (ش/د/ت).

٥٠٢٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ يَقُولُ دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي. رَواهُمَا الأربعة[١١]:

دیسان دەگێڕێتەوە لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرچی دووعایێ بکەن گشتی گیرا دەبێ بە مەرجێ پەلە پەل نەکەن وەك ئەوە بڵێن هەر دووعا دەکەم هەر گیرا نەبوو! (ش/د/ت).

٥٠٢١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ادْعُوا اللَّهَ وَأَنْتُمْ مُوقِنُونَ بِالإِجَابَةِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ لاَ يَسْتَجِيبُ دُعَاءً مِنْ قَلْبٍ غَافِلٍ لاَهٍ. واه الترمذي والحاكم[١٢]:

---

[١٠] تجريد/٥ ل/١٤٧ رقم/١٩٨٣ = ٦٣٣٩، ٧٤٧٧. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٥٢.

[١١] تجريد/٥ ل/٢٤٨ رقم/١٩٨٤ = ٦٣٤٠. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٦٩، ٦٨٧٠، ٦٨٧١.

[١٢] بسند غريب للترمذي، وسند صحيح للحاكم (شرحه).

دیسان دەگێڕێتەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ لەخوا دەپاڕێنەوە حاڵتان وابێ کە باوەڕتان قایم بێ کە نزاکەتان گیرا دەبێ لەلای خودا، باش باش بزانن کە خودا دووعاو نزای وا گیرا ناکا کە لە دڵێکی کاسی بێ ئاگاوەبێ!

٥٠٢٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَوْلاَدِكُمْ وَلاَ تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكُمْ وَلاَ تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ لاَ تُوَافِقُوا مِنَ اللّٰهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى سَاعَةَ نَيْلٍ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ. رواه أبو داود ومسلم[١٣]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تووكو نزای خراپ نە لە خۆتانو نە لەماڵو منداڵو نۆکەرو دەستوپێی خۆتان مەکەن، نەوەکا رێکەوتی ئەو کاژێرە بکەن کە خودا هەموو نزایەکی تیا گیرادەکاو دووعا شەڕەکەتان گیرابێو دوایی پەشیمان ببنەوەو ئەو کاتەیش پەشیمانی دادناخوا (د/م- رەزای خودایان لێبێ).

٥٠٢٣- لە باسی (گەوەیی نزاو دووعا)دا ڕابورد. فەرموودەی شەشەم[١٤].

٥٠٢٤- عَنِ ابْنٍ لِسَعْدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: سَمِعَنِي أَبِي وَأَنَا أَقُولُ اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَنَعِيمَهَا وَبَهْجَتَهَا وَكَذَا وَكَذَا وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ وَسَلاَسِلِهَا وَأَغْلاَلِهَا وَكَذَا وَكَذَا فَقَالَ: يَا بُنَيَّ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدُّعَاءِ. فَإِيَّاكَ أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ إِنْ أُعْطِيتَ الْجَنَّةَ أُعْطِيتَهَا وَمَا فِيهَا مِنَ الْخَيْرِ وَإِنْ أُعِذْتَ مِنَ النَّارِ أُعِذْتَ مِنْهَا وَمَا فِيهَا مِنَ الشَّرِّ[١٥]:

کوڕێکی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: باوکم گوێی لێبوو گوتم: خودایە! داوای بەهەشتت لێ دەکەمو داوای ئەو نازو

[١٣] راجع مسلم. جنائز: ٢١٢٧.

[١٤] تقدم في مجلد تاسع تسلسل/٦٦ رقم/٥٠٠٥.

[١٥] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

خۆشییەت لێ دەکەم کە لە بەهەشتا هەیەو داوای ئەمەو ئەوەی بەهەشتت لێ دەکەم، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە ئاگری دۆزەخ و لەکۆت و زنجیرو ئەم جۆرە شتانەی! جا باوکم فەرمووی: ئەی کوڕی خۆم! بەگوێی خۆم گوێم لێ بوو لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: هۆزێ پەیدا دەبن، پێ لە پاڕانەوەو دووعاو نزا هەڵ دەبڕن. ئەوجا باوکم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەی کوڕی شیرینم! قەت نەکەی ببیت بە یەکێك لەم هۆزە، بزانە ئەگەر بەهەشت ببێ بەنصیبت ئەوا بە خۆی و ئەو نازو نیعمەتەیەوە کە تیایەتی دەبێ بەنصیبت، وە ئەگەر خودایش ئامانت بدا لە دۆزەخ ئەوا ئامانت دەدا لە خۆی و لەو سزایەی کە تیایەتی! (د-س/صالح).

٥٠٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُعْجِبُهُ أَنْ يَدْعُوَ ثَلاثًا وَيَسْتَغْفِرَ ثَلاثًا. رواهما أبو داود[١٦]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) حەزی لەوە بوو کە دووعایەکی دەکرد سێ جار دوو بارەی بکاتەوە کە ئیستیغفاری دەکرد سێ جار دوو باەی بکاتەوە (د-س/صالح).

٥٠٢٦- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا ذَكَرَ أَحَدًا فَدَعَا لَهُ بَدَأَ بِنَفْسِهِ[١٧]:

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو، کە باسی یەکێکی دەکردو نزای بۆی دەکرد، لە پێشا دووعای بۆ خۆی دەکرد ئەوجا بۆ ئەو (ت-س/ص).

٥٠٢٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ دَعَا عَلَى مَنْ ظَلَمَهُ فَقَدِ انْتَصَرَ. رواهما الترمذي[١٨]:

---

[١٦] رواه أبوداود بسند صالح (شرحه).

[١٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٨] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

عائیشە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ دووعاو تووک بکا لەو کەسەی کە زۆررو ستەمی لێ دەکا ئەوە هەقی خۆی لێ وەرگرتووە! (ت-سند ضعیف).

## ٦٨) نزای گیراو نزای پەسەند : (الدُّعاء المقبول)

٥٠٢٨- ← (ب - ١ ز - ١٨١ ل - ٤٩١ ف - ١)[١].

٥٠٢٩- عَنْ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الرَّبُّ مِنَ الْعَبْدِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ الآخِرِ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللَّهَ فِي تِلْكَ السَّاعَةِ فَكُنْ[٢].

عەمری کوڕی عەبسە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: لە سێیەکی دوایی شەودا خودا لە بەندەی خۆی تەواو نزیك دەبێتەوە، دەی ئەگەر بۆت دەلووێ ئەوا لەم کاتەدا خەریکی یادی خودابە! (ت - س/ص).

٥٠٣٠- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ الدُّعَاءِ أَسْمَعُ قَالَ: جَوْفُ اللَّيْلِ الآخِرُ وَدُبُرَ الصَّلَوَاتِ الْمَكْتُوبَاتِ. رواهما الترمذي[٣].

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! کام نزایە گیراترە؟ فەرمووی: دووعای سێیەکی دوایی شەوو دووعای دوا نوێژە فەرزەکان (ت-س/ح).

٥٠٣١- ← (ب - ١ ز - ٨٦ ل - ٢٧٩ ف - ١)[٤].

٥٠٣٢- عَنْ صَفْوَانَ ابْنُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمْتُ الشَّامَ فَأَتَيْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ فِي مَنْزِلِهِ فَلَمْ أَجِدْهُ وَوَجَدْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ فَقَالَتْ أَتُرِيدُ الْحَجَّ الْعَامَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ.

---

[١] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٨١ رقم/٩٦٥.

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] تقدم في مجلد أول تسلسل/٨٦ ل/٢٧٩ رقم/٥٤٠.

قَالَتْ: فَادْعُ اللَّهَ لَنَا بِخَيْرٍ فَإِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: دَعْوَةُ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ عِنْدَ رَأْسِهِ مَلَكٌ مُوَكَّلٌ كُلَّمَا دَعَا لأَخِيهِ بِخَيْرٍ قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ آمِينَ وَلَكَ بِمِثْلٍ قَالَ: فَخَرَجْتُ إِلَى السُّوقِ فَأَلْقَى أَبَا الدَّرْدَاءِ فَقَالَ لِي مِثْلَ ذَلِكَ يَأْثِرُهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه مسلم وأبو داود[٥]:

صەفوانی کوڕی عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: چوومە شام، چووم بۆ لای ئەبو دەرداء، خۆی لەماڵ نەبوو، ئوممو دەردای ژنی لەماڵ بوو، ئوممو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەم ساڵ دەچیت بۆ حەج؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: نزای باشمان بۆ بکە لەلای خودا، چونکە گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: نزای موسوڵمان بۆ برای موسوڵمانی لە پاشملە گیرایە، لە راسەری فریشتەیێ هەیە راسپێرراوە، هەر چەند موسوڵمان نزای باش بۆ برادەری خۆی دەکا ئەو فریشتەیەش دەڵێ: ئامین، وێنەی نزاکەی خۆت بۆ تۆش بێ.

صەفوان فەرمووی: جا چووم بۆ بازاڕ، لەوێ تووشی ئەبو دەردا بووم، ئەویش هەمان فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ گێڕامەوە (م/د).

٥٠٣٣- ولأبي داود والترمذي: إِنَّ أَسْرَعَ الدُّعَاءِ إِجَابَةً دَعْوَةُ غَائِبٍ لِغَائِبٍ[٦]:

دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): خێراترین نزا لە گیرابووندا نزای نادیارە بۆ نادیار، واتە نزای موسوڵمانە بۆ موسوڵمان لە پاشملە. (د/ت-س/صالح).

٥٠٣٤- ← (ب - ١ ز - ١٧٨ ل - ٤٨٤ ف - ٤)[٧].

٥٠٣٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لاَ شَكَّ فِيهِنَّ دَعْوَةُ الْوَالِدِ وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ[٨]:

---

[٥] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٦٦. ابن ماجه. حج: ٢٨٩٥.

[٦] بسند صالح (شرحه).

[٧] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٧٨ ل/٤٨٤ ط/١ رقم/٩٥٢.

لــە ئــەبو هــورەیرەوە (خــودای لێ ڕازی بــێ) حــەزرەت (دروودی خــودای لەســەربێ) دەفەرموێ: ئەم سێ نزایە بەبێ گومان گیرادەبن:

**یەکەم**: نزای باوكو دایك (چ باش چ خراپ) بۆ منالی خۆیان، یا لەمنالی خۆیان.

**دووەم**: نزای ڕێبوار.

**سێیەم**: نزای زۆر لێ کراوی ستەم دیدە (دووعای مەزلووم!). (د/ئە/ت-س/ح).

٥٠٣٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ تُرَدُّ دَعْوَتُهُمْ: الصَّائِمُ حَتَّى يُفْطِرَ، وَالإِمَامُ الْعَادِلُ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ يَرْفَعُهَا اللَّهُ فَوْقَ الْغَمَامِ وَيَفْتَحُ لَهَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ وَيَقُولُ الرَّبُّ: وَعِزَّتِي لأَنْصُرَنَّكَ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ[٩].

دیــسان فــەرمووی: خۆشەویــست (دروودی خــودای لەســەربێ) فــەرمووی: نــزاو سکالای ئەم سێ کەسە لای خودا گیرایەو نادرێتە دواوە.

**یەکەم**: ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوە.

**دووەم**: پێشەوای دادپەروەر (ئیمامی عادڵ).

**سێیەم**: نزای ستەمبار. دووعاو نزای ستەمدیدەی زۆرلێکراو، خودای گەورە بــۆ خــۆی ژوور هــەوری دەخــاو دەرگاکــانی ئاسمــانی بــۆ دەکاتــەوەو ئــەو پــەروەردگارە نــازدارە بۆ خــۆی پێــی دەفــەرموێ: بــە گــەورەیی خــۆم زوو یــا درەنگ هەر سەرت دەخەمو دێم بەهاوارتەوە، گەرچی ماوەیەکیشی پــێ بچێ! (ت-س/ح).

٥٠٣٧- عَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوتِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ. فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ اسْتَجَابَ اللَّهُ لَهُ. رواهما الترمذي[١٠].

---

[٨] بسند حسن (شرحه).

[٩] بسند حسن (شرحه).

[١٠] سكت عن درجته الشارح.

سەعد (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دووعاکەی یوونس پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە لەناو سکی نەهەنگەکەدا هاواری لێ هەڵساو پاڕایەوە فەرمووی: (لَا إِلَـهَ إِلاَّ أَنْـتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ). پەروەردگارا! کەس خودا نییە تۆ نەبێ، تۆ پاك‌و پیرۆزو بەدووری لە هەموو نەنگێ، بێگومان من ستەمم لەخۆم کردووەو بووم بە یەکێ لە ستەمکارەکان. هەر کاتێ ئەو دووعایە هەر موسوڵمانێ بەجۆش‌و کوڵی دڵ لەگەڵ باوەڕی تەواوا ئەم نزایە بەنیازی هەر شتێ بکا، بەنیازێکی پاك، بێگومان خودا نزاکەی گیرا دەکا. (تیرمذی گێڕاویەتەوە — رەزای خودای لێبێ).

من خۆم لەکاتی تەنگانەو سەخڵەتیدا دەوامم لەسەر ئەم نزایەی حەزرەتی یوونس (دروودی خودای لەسەربێ) کردووە، خودا بە کەرەمی خۆی دەرووی رەحمەتی لێ کردوومەتەوە، دیارە ئادەمیزاد لەکاتی تەنگانەدا بە کوڵی دڵ‌و بەجۆشی سینە، وەك سواڵکەری پریادی بەردەرگا بەخودا دەگرێ. بەڵام ئێستا تەعەجوبم لە حاڵی خۆم دێ، کە چ زوو وا باری غەفڵەت سواری کۆڵم بووەوە! دیسان چوومەوە سەرباری بەرە بۆری، دەڵێی نەبام دیوەونە بۆران، خودا دەفەرموێ:

{وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ فَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمَا يَجْحَدُ بِآيَاتِنَا إِلَّا كُلُّ خَتَّارٍ كَفُورٍ – سورة لقمان – ٣٢/٣١}.

دووعاو نزاو پاڕانەوە خۆی لەخۆیا خودا پەرستییەکی پەسەندوپیرۆزە، کەم تا زۆر نزای هەموو کەسێ بەپێی حاڵ گیرا دەبێ، خەڵاتی خودا جۆری زۆرە، بەرابەر هەر نیعمەتێکی ماددی بەهرەیەکی گیانی هەیە، لەگەڵ ئەم بارودۆخە گشتییەدا مەرجی سەرەکی گیرابوونی نزا ئەم خاڵانەیە:

١– نزا خوێن ئەهلی ذیکرو تەقوابێ، وا باشە قاڵب‌و ڕستەو صیغەی نزاکە مەئثوورو بیستراو بێ، لەکاتی خوێندنیا بەباشی دڵی لەلای بێ.

٢– بە نیازی پاك‌و بە باوەڕی تەواوەبێ، بۆ تەجرەبەو تاقیکردنەوە نەبێ، ئەگەر گیرابوو سوپاسی خودای لەسەربکا، ئەگەر گیراش نەبوو نا سوپاس نەبێ.

٣- منەی کاتی باش‌و جێگەی پیرۆز بکا. وەك ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی هەینی‌و کاژێری گیرابوون‌و ناومالّی مزگەوت‌و شوێنە پیرۆزەکانی ترو کاتە باشەکانی تر، وەك پاش نوێژەکان.

٤- بۆ بازرگانی‌و دنیا پەرستی نەبێ.

٥- داوای شتی محالّ‌و کاری نەکردەنی نەبێ، مەبەست ئەمەیە کە پێشینان فەرموویانە: ئەگەر بە دووعا دەبوو پشقل بەخورما دەبوو!. (وەرگێڕ)

٦٩) پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئۆمەتی : (دعوة النبي ﷺ لأمته)

٥٠٣٨- → (ب - ٤ ز - ٩١ ل - ٢٧٧ ف - ١)[1].

٥٠٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَتَّخِذُ عِنْدَكَ عَهْدًا لَنْ تُخْلِفَنِيهِ فَإِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ فَأَيُّ الْمُؤْمِنِينَ آذَيْتُهُ شَتَمْتُهُ لَعَنْتُهُ جَلَدْتُهُ فَاجْعَلْهَا لَهُ صَلَاةً وَزَكَاةً وَقُرْبَةً تُقَرِّبُهُ بِهَا إِلَيْكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رواه الشيخان[2].

ئەبو هورەیرە (خودای لیّ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پەروەردگاری نازدارم! بەڵێن بێ لەتۆی وەردەگرم، تۆ قەت لە بەڵێنی خۆت لانادەیت، تۆ خۆت باش دەزانیت کە منیش هەر بەشەرو ئادەمیزادم، گەلێ جار تووڕە دەبم‌و لەسەر تووڕەیی نزای خراپ لەیەکێ لە گەلی خۆم دەکەم، یا ئازارێکی دەدەم، جا داوات لێ دەکەم کە بەڵێنم بدەیتێ: ئەگەر من جارێ ئازارێکی موسوڵمانێکمدا، یا جنێوێکم پێی دا، یانەفرین‌و لەعنەتێکم لێی کرد، یا جەڵدەم لێیدا، وە ئەو موسوڵمانە شایستەی ئەوە نەبوو، ئەوا ئەو ئازاردان‌و قسەیەی منەی بۆ بکە بە نوێژو زەکات‌و پاکەوەکەرو بیکە بەهۆی نزیکبوونەوەی لە رەحمەتی خۆتەوە، وە بەوە لە ڕۆژی ژیانەوەدا لە خۆتی نزیك بکەرەوە (ش = ب + م = بوخاری‌و موسلیم – رمزای خودایان لێبێ).

---

[1] تقدم في مجلد رابع تسلسل/٩١ ل/٢٧٧ ط/١ رقم/٣١٣٤.

[2] تجريد/٥ ل/٢٤٩ رقم/١٩٨٧ = ٩٣٦١. مسلم. بر وصلة: ٦٥٥٧ – ٦٥٦٥.

### ٧٠) نزایێ کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تیا بێ نزای پڕ واتا: جوامع الدعاء

٥٠٤٠- ← (ب – ٦ ز – ٣ ل – ٣٩ ف – ٣٩)[1].

٥٠٤١- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَادَ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ قَدْ خَفَتَ فَصَارَ مِثْلَ الفَرْخِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ كُنتَ تَدْعُو بِشَيْءٍ أَوْ تَسْأَلُهُ إِيَّاهُ. قَالَ: نَعَمْ كُنتُ أَقُولُ اللَّهُمَّ مَا كُنتَ مُعَاقِبِي بِهِ فِي الآخِرَةِ فَعَجِّلْهُ لِي فِي الدُّنْيَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): سُبْحَانَ اللَّهِ لاَ تُطِيقُهُ – أَوْ لاَ تَسْتَطِيعُهُ – أَفَلاَ قُلْتَ: اللَّهُمَّ آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ. قَالَ: فَدَعَا اللَّهَ لَهُ فَشَفَاهُ. رواه مسلم والترمذي[2]:

دیسان ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەشریفی برد بۆ هەواڵپرسی پیاوێکی موسوڵمان، کە نەخۆش بوو وەك بەچکەی مەل ئاوەرووت بکرێ ئاوا داماڵابوو، دەتگوت چیلکەی رەق و تەقە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئایا هیچ نزایەك دەکەی یا داوای شتێکت لە خودا دەکرد لەمەپێش؟. گوتی: بەڵێ قوربان! هەر دەمگوت: خودایە! تۆڵەی ئەو جیهانیشم لەم جیهانەدا لێ بسێنە! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سوبحانەڵڵا لەم کارە سەیرە! بەرگەی ئەوە ناگری، یا فەرمووی: تەواناى ئەوەت نییە، دەبوو بتگوتبایە: اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ . گوتی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە خودا پاڕایەوە بۆی و خودا چاکی کردەوە!. (م/ت) ← (ب – ٦ ز – ٣ ل – ٣٩ ف – ٣٩).

٥٠٤٢- عَنِ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ يَدْعُو بِهَذَا الدُّعَاءِ: رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ

---

[1] تقدم في مجلد أول تسلسل/٣ ل/٣٩ ط/١ رقم/٣٧٢٨.

[2] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٧٦. ترمذي. دعوات: ٣٤٨٧.

مِنِّي ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي ، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. رواه الشيخان[٣]:

**ئەبو مووسا** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **گەلێ جار ئەم نزایەی دەکرد دەیفەرموو:** رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي وَجَهْلِي وَإِسْرَافِي فِي أَمْرِي كُلِّهِ ، وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي خَطَايَايَ وَعَمْدِي وَجَهْلِي وَهَزْلِي ، وَكُلُّ ذَلِكَ عِنْدِي ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ ، وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ ، وَأَنْتَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: **پەروەردگارم! لێم خۆشبە خۆشبە لە تاوانم، لە نادانیو نەفامیم، لە زیادە ڕەویم لە هەموو کارێکما، لەوەی کە تۆ باشتری دەزانی لەمن، ئەی خودایە! تاوانەکانم هەموو بپۆشە، چ بەعمدو ئەنقەست بن چ بەزانیی بن، چ بەگاڵتەوەبن! وە ئەم جۆرە تاوانەشم هەموو هەن! خودایە! تاوانی کۆنو نوێم بپۆشە، تاوانی نهێنیو ئاشکرام بپۆشە، پێشخستنو پاشخستن بە دەستی تۆیە: پێشخەرو پاشخەر هەرتۆی! وە هەموو شتێ بۆ تۆ ئاسانە. تۆ دەستەڵاتی هەموو شتێکت هەیە!** (ش).

٥٠٤٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى[٤]:

**عەبدوڵڵا** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەربێ) **زۆرجار دەیفەرموو:** اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتُّقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى: **ئەی خودایە من! داخوازی ئەم خەڵاتانەت لێ دەکەم: ڕێگەی ڕاستم پێ نیشان بدە، لە خودا ترسیم پێ خەڵات بفەرموو، ڕووسووریم پێ خەڵاتکە، داراییو دەوڵەمەندی دڵو دەروونو ماڵم پێ خەڵات بکە** (م/ت).

---

[٣] تجريد/٥ ل/٢٥٢ رقم/١٩٩١ = ٦٣٨٩ فتح + رقم: ١٦٤١ تجريد = ٤٥٢٢ فتح = بەرگی/٤ ل/٤١٨. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٣٩.

[٤] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٤٢. ترمذي. دعوات: ٣٤٨٩. ابن ماجه. دعاء: ٣٨٣٢ تحفة/٩٥٠٧.

٥٠٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللّٰهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِيَ الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَرٍّ[٥]:

لە ئەبو هورەیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم نزایەی دەخوێند اللّٰهُمَّ أَصْلِحْ لِي دِينِيَ الَّذِي هُوَ عِصْمَةُ أَمْرِي وَأَصْلِحْ لِي دُنْيَايَ الَّتِي فِيهَا مَعَاشِي وَأَصْلِحْ لِي آخِرَتِي الَّتِي فِيهَا مَعَادِي وَاجْعَلِ الْحَيَاةَ زِيَادَةً لِي فِي كُلِّ خَيْرٍ وَاجْعَلِ الْمَوْتَ رَاحَةً لِي مِنْ كُلِّ شَر: ئەی خودای من! دینەکەم - کە مایەی خۆشی و باشیی هەموو کارو بارێکمە - ڕێك و پێکی بخە بۆم، دنیاکەم - کە تیا دەژیم و کوزەرانی تیا دەکەم - سازی بکە بۆم، دوا ڕۆژم - کە تیادا زیندوو دەبمەوە - باشی بکە بۆم، خودایە! ژیانی ئەم جیهانەم بۆ بکە بەهۆی هەموو زیادە خێرێ، مردنیشم بۆ بکە بە مایەی سەرفرازیو حەسانەوە لە دەستی هەموو شەڕێ (م/ت).

٥٠٤٥- ← (ب - ٨ ز - ٨ ل - ٢٦ ف - ٦)[٦].

٥٠٤٦- عَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يا رسول الله عَلِّمْنِي كَلَامًا أَقُولُهُ قَالَ: «قُلْ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللّٰهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ اللّٰهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ كَثِيرًا سُبْحَانَ اللّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللّٰهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ». قَالَ: فَهَؤُلَاءِ لِرَبِّي فَمَا لِي قَالَ: قُلِ اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي[٧]:

سەعد (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: عارەبێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! وتارێکم

[٥] مسلم. ذكر ودعاء: ٦١٤١.

[٦] تقدم في مجلد ثامن تسلسل/٨ ل/٢٦ ط/١ رقم/٤٢٧٥.

[٧] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٨٨.

فێربكە كە بۆ خۆم بیڵێم. فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بڵێ: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ. عارەبەكە عەرزیكرد: ئەم ستایشانە بۆ پەسنی پەروەردگارمە، ئەی چی بۆ خۆم بڵێم؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بڵێ: اللهم اغفر لی وارحمنی واهدنی وارزقنی: خودایە! لێم خۆشبەو رەحمم پێبكەو رێگەی هەقم پێ نیشان بدەو رۆژیم بدە (م).

٥٠٤٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ اللَّهُـمَّ إِنِّـي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي أَنْـتَ الْحَـيُّ الَّـذِي لاَ يَمُـوتُ وَالْجِـنُّ وَالإِنْـسُ يَمُوتُونَ. رواهما مسلم[٨]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ وَبِكَ خَاصَمْتُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِعِزَّتِكَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَنْ تُضِلَّنِي أَنْتَ الْحَيُّ الَّـذِي لاَ يَمُـوتُ وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ يَمُوتُونَ (م).

← (ب – ١ ز – ١٨٤ ل – ٥٠١ ف – ١)[م٨].

٥٠٤٨- وَعَنْهُ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: رَبِّ أَعِنِّي وَلاَ تُعِـنْ عَلَـيَّ وَانْصُرْنِي وَلاَ تَنْصُرْ عَلَيَّ وَامْكُرْ لِي وَلاَ تَمْكُرْ عَلَيَّ وَاهْدِنِي وَيَسِّرِ الْهُدَى لِي وَانْـصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكَّارًا لَكَ ذَكَّارًا لَكَ رَهَّابًا لَكَ مِطْوَاعًا لَكَ مُخْبِتًـا إِلَيْكَ أَوَّاهًا مُنِيبًا رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي وَاغْسِلْ حَوْبَتِي وَأَجِبْ دَعْوَتِي وَثَبِّـتْ حُجَّتِـي وَسَـدِّدْ لِسَانِي وَاهْدِ قَلْبِي وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ صَدْرِي. رواه الترمذي وأبو داود[٩]:

---

[٨] تجريد/٥ ل/٣٨٠ رقم/٢١٢٧ = ٧٣٨٤ (٧٣٨٣) فتح. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٣٧.

[م٨] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٨٤ ل/٥٠١ ط/١ رقم/٩٨٦.

[٩] بسند صحيح (شرحه).

**دیسان فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **نزای دەکرد دەیفەرموو:** رَبِّ أَعِنِّي وَلاَ تُعِنْ عَلَيَّ وَانْصُرْنِي وَلاَ تَنْصُرْ عَلَيَّ وَامْكُرْ لِي وَلاَ تَمْكُرْ عَلَيَّ وَاهْدِنِي وَيَسِّرِ الْهُدَى لِي وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، رَبِّ اجْعَلْنِي لَكَ شَكَّارًا لَكَ ذَكَّارًا لَكَ رَهَّابًا لَكَ مِطْوَاعًا لَكَ مُخْبِتًا إِلَيْكَ أَوَّاهًا مُنِيبًا رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي وَاغْسِلْ حَوْبَتِي وَأَجِبْ دَعْوَتِي وَثَبِّتْ حُجَّتِي وَسَدِّدْ لِسَانِي وَاهْدِ قَلْبِي وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ صَدْرِي: **پەروەردگارم! ئەی خودای نازدارم! یاریدەم بدەو مەمکە بە ژێرەوە، سەرم خەو ژێرم مەخە، ببە بە پشتیوانی منو مەبە بە پشتیوانی دوژمنم، ڕێنموونیم بکەو ڕێگەی ڕاستم بە ئاسانی پێ نیشاندە، ئەوەی زۆرو ستەمم لێدەکا زاڵمبکە بەسەریدا، پەروەردگاری خۆم! وام لێ بکە کە زۆر سوپاسی تۆ بکەمو زۆر ذیکری تۆ بکەمو یادگۆیەکی باشی تۆبمو هەمیشە بە ئەدەبو بە تەوازوع بم لە خزمەتی تۆداو، ئەسەفخۆربم لەسەر تاوانو زۆرو زوو بابدەمەوە بۆ لای تۆ. ئەی خودای من! تەوبەم قبوول بکەو پەشیمانیم گیرابکەو لە گوناهم خۆش بەو تاوانم بشۆرەوەو نزام گیراکەو دەلیلو بەڵگەم جێگیرو مەحکەم کەو زمانم ڕەهاکەو دڵم شارەزاکەو کینەو دەغەزی سینەم دەرکەو دڵم سافو بێگەرد کە** (ت/د-س/ص).

٥٠٤٩- عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَلَّمَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُومُ مِنْ مَجْلِسٍ حَتَّى يَدْعُوَ بِهَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ لأَصْحَابِهِ: اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا وَلاَ تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا وَلاَ تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا وَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لاَ يَرْحَمُنَا[١٠]:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودا لەخۆیو لە باوکی) **فەرمووی: کەم وا دەبوو کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **لە کۆڕێ هەڵسێ، هەتا ئەم دوعاو نزایانەی بۆ هاوڕێیانی**

---

[١٠] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

نەكردبایە: اللَّهُمَّ اقْسِمْ لَنَا مِنْ خَشْيَتِكَ مَا يَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعَاصِيكَ وَمِنْ طَاعَتِكَ مَا تُبَلِّغُنَا بِهِ جَنَّتَكَ وَمِنَ الْيَقِينِ مَا تُهَوِّنُ بِهِ عَلَيْنَا مُصِيبَاتِ الدُّنْيَا وَمَتِّعْنَا بِأَسْمَاعِنَا وَأَبْصَارِنَا وَقُوَّتِنَا مَا أَحْيَيْتَنَا وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنَّا وَاجْعَلْ ثَأْرَنَا عَلَى مَنْ ظَلَمَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى مَنْ عَادَانَا وَلاَ تَجْعَلْ مُصِيبَتَنَا فِي دِينِنَا وَلاَ تَجْعَلِ الدُّنْيَا أَكْبَرَ هَمِّنَا وَلاَ مَبْلَغَ عِلْمِنَا وَلاَ تُسَلِّطْ عَلَيْنَا مَنْ لاَ يَرْحَمُنَا: ئەی خودایە! ئەوەندەمان بەش بۆ دابنێ لە ترس و سامی خۆت كە دوورمان بخاتەوە لە بێگوێیی و نافەرمانیی تۆ، لە تاعەت و فەرمانبەری خۆشت ئەوەندەمان بەش پێبدە كە پێی بگەینە بەهەشتی تۆ، لە یەقین و دڵنیایی و متمانەیش ئەوەندەمان بەش پێ بدە كە گوێ بەوەی و چورتم و قۆڕتی جیهان نەدەین، گوێمان و چاومان و هێزمان هەتا سەر پێ ڕەوا ببینەو لەپاش مردنیشمان بیانكە بەمایەی سوودو قازانج بۆمان، هەركەس زۆرو ستەم و ناهەقیمان لێ دەكا تۆڵەی ئێمەی لێ بستێنە، هەركەسێ دوشمنایەتیمان تێ دەبەستێ سەرمان بخە بەسەریدا، ئایین و دینمان گرفتاری وەی و موصیبەت مەكە، دنیا مەكە بە هۆمێدی هەرە گەورەمان و بە ئەو پەڕی ئاواتمان! ئەو كەسانەشمان بەسەردا زاڵ مەكە كە بەزییان نایەتەوە پیاماندا. (ت-س/ح).

٥٠٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي وَزِدْنِي عِلْمًا الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ حَالِ أَهْلِ النَّارِ[١١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ انْفَعْنِي بِمَا عَلَّمْتَنِي وَعَلِّمْنِي مَا يَنْفَعُنِي وَزِدْنِي عِلْمًا الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ وَأَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ حَالِ أَهْلِ النَّارِ. خودایا! ئەوەی فێری منت كردووە بیكە بە مایەی قازانج بۆم، وە ئەوەم فێركە كە سوودی هەبێ بۆم، وە پەستا پەستا عیلم و زانستی بەسوود بڕژێنە بەسەرمدا، سوپاس بۆ خودا لەسەر هەموو حاڵێ، پەنا دەگرم بەرەحمەتی خودا لەحاڵی دانیشتوانی دۆزەخ! (ت-س/ح).

[١١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥٠٥١- وَقَالَ شَهْرُ بْنُ حَوْشَبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) لأُمِّ سَلَمَةَ: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ مَا كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ عِنْدَكِ؟ قَالَتْ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَائِهِ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَكْثَرِ دُعَائِكَ بِهَذَا قَالَ: يَا أُمَّ سَلَمَةَ إِنَّهُ لَيْسَ آدَمِيٌّ إِلاَّ وَقَلْبُهُ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللَّهِ فَمَنْ شَاءَ أَقَامَ وَمَنْ شَاءَ أَزَاغَ[١٢]:

شەهری کوڕی حەوشەب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم بە ئوممو سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە ئوممو سەلەمە): ئەی دایکی موسوڵمانان! جاران حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کە لەلای تۆ دەبوو بەزۆری دووعاو پاڕانەوەی چی بوو؟ فەرمووی: بەزۆری دووعاو نزای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەمەبوو: يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ: ئەی هەڵسووڕێنەری دڵان! دڵم ڕاگرە لەسەر ئایینی خۆت، منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەتبینم بەزۆری ئەم نزایە دەخوێنی فەرمووی: ئەی ئوممو سەلەمە! بۆیە وا دەکەم چونکە دڵی هەموو ئادەمیزادێ وا لە نێوانی دوو پەنجەدا لە پەنجەکانی خودا، ئیتر هەرکەسێ خواستی خودای لەسەربێ ڕایدەگرێ لەسەر ئیمانو باوەڕ، ئەو کەسەیشی کە خواستی خۆی لەسەر نەبێ لەڕێی دەردەکا. (ت-س/ح).

٥٠٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي جَسَدِي وَعَافِنِي فِي بَصَرِي وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ[١٣]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەموو: اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي جَسَدِي وَعَافِنِي فِي بَصَرِي وَاجْعَلْهُ الْوَارِثَ مِنِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: (ت-س/ح).

---

[١٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[١٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥٠٥٣- وَعَنْهَا قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمْتُ أَيُّ لَيْلَةٍ لَيْلَةُ الْقَدْرِ مَا أَقُولُ فِيهَا قَالَ: قُولِي اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ كَرِيمٌ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي[١٤]:

**دیسان عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو ئەگەر زانیم چ شەوێ شەوی لەیلەتولقەدرە چی تیا بڵێم؟ فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ كَرِيمٌ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي: خودایە! دڵنیام کە تۆ هەم تاوان بەخش و هەم خەڵات بەخشی، تۆ بەخشەرو بەخشندەی، تۆ بەخشین و لێبووردنت پێ خۆشە، سادەی بەمیهرەبانی خۆت بمبەخشە! (ت-س/ص).**

٥٠٥٤- عَنِ الْعَبَّاسِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَسْأَلُهُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ. قَالَ: سَلِ اللَّهَ الْعَافِيَةَ. فَمَكَثْتُ أَيَّامًا ثُمَّ سَأَلْتُهُ ثَانِيًا فَقَالَ لِي: يَا عَبَّاسُ يَا عَمَّ رَسُولِ اللَّهِ: سَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ[١٥]:

**عەبباس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! شتێکی وام فێرکە لە خودای گەورەو سەروەر داوای بکەم، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): داوای لەش ساغی و بێوەیی لەخودا بکە. فەرمووی: لەپاش چەند ڕۆژێکی تریش دیسان هەمان پرسیارو داوام لێ کردەوە، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ) ئەی عەبباس! ئەی مامەی پێغەمبەری خودا! داوای لەش ساخی و بێوەیی هەردوو جیهان لەخودا بکەن (ت-س/ص).**

٥٠٥٥- وَسَأَلَ رَجُل رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الدُّعَاءِ أَفْضَلُ قَالَ: سَلْ رَبَّكَ الْعَافِيَةَ وَالْمُعَافَاةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ. ثُمَّ سَأَلَهُ فِي الْيَوْمِ الثَّانِي فَقَالَ: مِثْلَ ذَلِكَ ثُمَّ سَأَلَهُ فِي الْيَوْمِ الثَّالِثِ فَقَالَ: لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ. قَالَ: إِذَا أُعْطِيتَ الْعَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَأُعْطِيتَهَا فِي الآخِرَةِ فَقَدْ أَفْلَحْتَ[١٦]:

---

[١٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: کام نزایە زۆر گەورەیە؟ فەرمووی: داوای ساخی و خۆشی هەردوو جیهان لە خودا بکە. جا بۆ سبەینێش هەمان پرسیاری لێکردەوە، حەزرەتیش هەمان وەڵامی پێشووی دایەوە، بۆ دوو سبەینێیش هەروەها، ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ساخی و خۆشیی هەردوو جیهانت دەست کەوێ ئیتر هەتایە سەرفراز دەبیت! (ت-س/ح).

٥٠٥٦- وَقَامَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَلَى الْمِنْبَرِ ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الأَوَّلِ عَلَى الْمِنْبَرِ ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: سَلُوا اللَّهَ الْعَفْوَ وَالْعَافِيَةَ فَإِنَّ أَحَدًا لَمْ يُعْطَ بَعْدَ الْيَقِينِ خَيْرًا مِنَ الْعَافِيَةِ[١٧]:

جارێ ئەبو بەکری صدیق (ڕەزای خودای لێبێ) سەرکەوتە سەر دوانگەو لەوێ ڕاوەستاو دوانێکی داو ئەوجا دڵی گەرم بوو دەستیکرد بە گریان و فەرمووی: پێرار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سەرکەوتە سەرمینبەرو دووانێکی شیرینی داو دڵی پڕبوو دەستیکرد بە گریان و فەرمووی: لەیەزدانی پاك داوای چاوپۆشی و لەش ساخی و بێوەیی بکەن، چونکە یەقین و باوەڕی تەواوی دڵی لێ دەرچێ هیچ خەڵاتێکی خودایی ناگات بە عافییەت و ئاسوودەیی و بێوەیی!. (ت-سەند غەریب).

٥٠٥٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَعَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِدُعَاءٍ كَثِيرٍ لَمْ نَحْفَظْ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ دَعَوْتَ بِدُعَاءٍ كَثِيرٍ لَمْ نَحْفَظْ مِنْهُ شَيْئًا. فَقَالَ: أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَجْمَعُ ذَلِكَ كُلَّهُ تَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ بِكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ وَعَلَيْكَ الْبَلاَغُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ[١٨]:

ئەبو ئومامە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نزاو پاڕانەوەیەکی زۆریکرد، بۆمان لەبەر نەکرا، گوتمان: قوربان! ئەی پێغەمبەری

---

[١٧] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١٨] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

خــودا! نزایــەکی زۆرت خوێنــد، هیــچمان لێــی لەبەرنــەکرد. فــەرمووی: هۆشـیارەوە بـن! بـا نزایـەکی واتـان پێـێ نیـشان بـدەم کـە ئـەوە هـەمووی بگرێتەوە. ئەی نزا خوێن! بڵێ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا سَأَلَكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا اسْتَعَاذَ بِكَ مِنْهُ نَبِيُّكَ مُحَمَّدٌ وَأَنْتَ الْمُسْتَعَانُ وَعَلَيْـكَ الْـبَلاَغُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّـهِ: ئەی خودایە! داوات لێ دەکەین کە بەشمان بدەی لەو خێرو خۆشییانەی کە موحەممەدی پێغەمبەری تۆ داوای کردوون لەتۆ. وە پەنا دەگرین بەتۆ لە شەڕی ئەوشتە خراپانەی کە موحەممەدی پێغەمبەری تۆ پـەنای گرتـووە بـەتۆ لەشـەڕیان، خودایـە! پـشتیوان هـەرتۆی، پـشت و پـەنا هەرتۆی، جێگەی ئومێدو گەیشتن بە ئاوات هەرتۆی، پارێز لە تاوان و تاقەتی تاعەت و خودا پەرستی هەر بەدەستی خودا خۆیەتی (تیرمذی (رەزای خودای لێ بێ) بەڕشتەیەکی جوان).

٥٠٥٨- عَنْ شَدَّادَ بْنَ أَوْسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَلِّمُنَا أَنْ نَقُولَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الأَمْرِ وَأَسْأَلُكَ عَزِيمَةَ الرُّشْدِ وَأَسْأَلُكَ شُكْرَ نِعْمَتِكَ وَحُسْنَ عِبَادَتِكَ وَأَسْأَلُكَ لِسَانًا صَادِقًا وَقَلْبًا سَلِيمًا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَـا تَعْلَـمُ وَأَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا تَعْلَمُ وَأَسْتَغْفِرُكَ مِمَّا تَعْلَمُ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ[١٩].

شەدادی کوڕی ئەوس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فێری دەکردین کە بڵێین: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الثَّبَاتَ فِي الأَمْرِ وَأَسْأَلُكَ عَزِيمَةَ الرُّشْدِ وَأَسْأَلُكَ شُكْرَ نِعْمَتِكَ وَحُسْنَ عِبَادَتِكَ وَأَسْأَلُكَ لِسَانًا صَادِقًا وَقَلْبًا سَلِيمًا وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا تَعْلَمُ وَأَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِ مَا تَعْلَمُ وَأَسْتَغْفِرُكَ مِمَّا تَعْلَمُ إِنَّكَ أَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُـوبِ: هـەی یـەزدانی پـاك! لـەتۆ داوا دەكـەم كـە فرسـەتم بـدەی لەسـەر پایەداریی لەسەر هەق و تەقوای خۆت. لەتۆ داخوازی دەکەم کە فرسەتم بدەی لەسەر سوپاسی نازو نیعمەتی خۆت، وە لەسەر عیبادەتێکی جوانی خۆت، داوای زمانێکی ڕاستگۆو دڵێکی پاك و بێگەردو سینەیەکی سافت لێ دەکەم،

[١٩] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

وە پەنادەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەوەی کە خۆت دەیزانی، داوا دەکەم لەتۆ کە بەشم بدەی لەو خێرو خۆشییەی کە خۆت دەیزانی لەتۆ داوا دەکەم کە ئەو تاوانانەم بپۆشی کە خۆت دەیانزانی بەراستی هەر تۆ هەموو پەنهانییەکان زۆرباش دەزانی و بەهەموو نهێنییەك زانای (ت-س/ح).

٥٠٥٩- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ مِنْ دُعَاءِ دَاوُدَ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ وَالْعَمَلَ الَّذِي يُبَلِّغُنِي حُبَّكَ اللَّهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي وَمِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ. قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا ذَكَرَ دَاوُدَ يُحَدِّثُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ أَعْبَدَ الْبَشَرِ[٢٠].

ئەبو دەرداء (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: یەکێ لە پاڕانەوەکانی داوود ئەمەبوو: اللَّهُمَّ اجْعَلْ حُبَّكَ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسِي وَأَهْلِي وَمِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ: خودایە! من داوای خۆشەویستیی خۆتت لێ دەکەم، خۆشەویستی ئەو کەسەیش کە تۆی خۆش دەوێ، هەروەها داوات لێدەکەم کە فرسەتم بدەی لەسەرکردنی ئەو کارە باشانەی کە دەبن بە مایەی خۆشەویستیی تۆ، پەروەردگاری نازدارم! ئەی خودای کردگارم! خۆشەویستیی خۆت بکە بە گەورەترین ئاواتم، کە زیاتر لە خۆم و کەسوکارم لەلام شیرینتربێ، هەروەها لەئاوی ساردیش لەلام شیرینتربێ. فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە باسی داوودی دەکردو هەواڵی ئەوی دەگێڕایەوە دەیفەرموو: لە نەوەی ئادەم خودا پەرستترین کەس داوود پێغەمبەر بوو (ت-س/ح).

٥٠٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ يَزِيدَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يَنْفَعُنِي حُبُّهُ عِنْدَكَ، اللَّهُمَّ مَا رَزَقْتَنِي مِمَّا أُحِبُّ فَاجْعَلْهُ قُوَّةً لِي فِيمَا تُحِبُّ اللَّهُمَّ وَمَا زَوَيْتَ عَنِّي مِمَّا أُحِبُّ فَاجْعَلْهُ لِي فَرَاغًا فِيمَا تُحِبُّ[٢١].

---

[٢٠] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٢١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

عەبدوڵلای کوڕی یەزید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گەلێ جار حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە پاڕانەوەیدا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ ارْزُقْنِي حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يَنْفَعُنِي حُبُّهُ عِنْدَكَ اللَّهُمَّ مَا رَزَقْتَنِي مِمَّا أُحِبُّ فَاجْعَلْهُ قُوَّةً لِي فِيمَا تُحِبُّ: ئەی خودایە! خۆشەویستیی خۆت بکە بە نصیبم خۆشەویستیی ئەو کەسەیش کە خۆشەویستیی ئەو سوودی دەبێ بۆم لەلای تۆ، خودایە! ئەوەی خۆم خۆشم دەوێ و دەیکەی بە نصیبم بیکە بە دەسمایەی خۆشەویستیی تۆ،، خودایە! ئەوەیشی خۆم حەزم لێیەتی بەڵام تۆ نایکەی بەنصیبم دیسان بیکە بە دەستمایەی خۆشەویستیی خۆت. (ت-س/ح).

٥٠٦١- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قُلِ اللَّهُمَّ اجْعَلْ سَرِيرَتِي خَيْرًا مِنْ عَلاَنِيَتِي وَاجْعَلْ عَلاَنِيَتِي صَالِحَةً اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ صَالِحِ مَا تُؤْتِي النَّاسَ مِنَ الْمَالِ وَالأَهْلِ وَالْوَلَدِ غَيْرِ الضَّالِّ وَلاَ الْمُضِلِّ. روى الترمذي الثلاثة عشر[٢٢]:

عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)ئەمەی فێرکردم فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ سَرِيرَتِي خَيْرًا مِنْ عَلاَنِيَتِي وَاجْعَلْ عَلاَنِيَتِي صَالِحَةً اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ صَالِحِ مَا تُؤْتِي النَّاسَ مِنَ الْمَالِ وَالأَهْلِ وَالْوَلَدِ غَيْرِ الضَّالِّ وَلاَ الْمُضِلِّ: خودایە! کارێکی وا بفەرموو کە پەنامەکیم لە ئاشکرام باشتر بێ، لە هەمان کاتدا ئاشکرایشم هەرباشبێ، پەروەردگارا! داوات لێدەکەم کە بەشی منیش بدەی لەو بەشە باش و خاسانەی کە دەیدەی بەم خەڵکە، واتە لەماڵ و حاڵ و خێزان و منداڵ، کە ماڵ و حاڵ و منداڵی ڕەحمەت بن و لەڕێ دەرنەچن و نەبن بە مایەی لە ڕێدەرچوونی خەڵکی تریش! (ت-س/غەریب).

---

[٢٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ٧١) ئەو گوتە حەدیسییانەی کە بەکار دەهێنرێن بە پەناگرتن بەخودای گەورە : (ما ورد في كلمات الاستعاذة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ – سورة المؤمنون – ٢٣/٩٧-٩٨}.

ئەی موحەممەد! ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! کاتێ دەتەوێ لەشەڕی شتێ ڕزگارت ببێ، بەتایبەت لە شەڕی پەری‌و شەیاتینی، بەنیازی نزا، بەزمانێکی پاك، بە دڵێکی بەسۆز بفەرموو: {رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ، وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ}. پەروەردگاری خۆم! تۆ خودای منی، من بەندەی تۆم! پەنادەگرم بەتۆ لەوەسوەسەو خوتووراتی شەیتانەکان، کە وەك سەرەسیخورمە لە پەنامەکییەوە دنەی دڵ‌و دەروون دەدەن‌و هانی مرۆڤ دەدەن لەسەر کردنی خراپەو گوناه، هەروەها پەنادەگرم بەتۆ لەوە کە شەیاتینی لەلای من حازربن‌و بۆختەدان لەسەر ئاشووب گرم بدەن‌و بە دەورمابێن.

٥٠٦٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَعَوَّذُ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ. رواه الشيخان والنسائي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەنای دەگرت بەخودا دەیفەرموو: اللهم أني أعوذ بِكَ مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ ، وَدَرَكِ الشَّقَاءِ ، وَسُوءِ الْقَضَاءِ ، وَشَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ. خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە بەڵای بڕس بڕو لەتووشبوونی نەگبەتی‌و لە یەخەگرتنی چارەڕەشی‌و لە چارەنووسی خراپ‌و لە پێخۆشبوون‌و شادەکامی دوشمنان! (ش/ن – خودایان لێ ڕازی بێ).

---

[1] تجريد/٥ ل/٢٤٩ رقم/١٩٨٦ = ٦٣٤٧، ٦٦١٦. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨١٦. نسائي. إستعاذة: ٥٥٠٧ تحفة/١٢٥٥٧.

٥٠٦٣- عَنْ أَنَس (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ[٢]:

ئەنەس (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: گەلێ جار حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ و گیان بەقوربانی بێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ ، وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ ، وَضَلَعِ الدَّيْنِ ، وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ: ئەی خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەخەم و خەفەت و لە کۆڵەواری و بێکارەیی و لەتەمبەڵی و تەوەزەلی و لەترسنۆکی و لە ڕەزیلی و ڕژدی و چرووکی و لە کەڵەکەبوونی قەرزو بوون بەژێر باری قەرزەوەو لە بوون بەژێر پێی دوشمنانەوە. (ش/د/ت/ن — ڕەزای خودایان لێبێ).

٥٠٦٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْفَقْرِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ عَنِّي خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا ، كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ[٣]:

عائیشە (ڕەزای خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای مەزنی لەسەربێ) زۆر جاران دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَالْهَرَمِ ، وَالْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ ، وَمِنْ فِتْنَةِ النَّارِ وَعَذَابِ النَّارِ ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ الْغِنَى ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْفَقْرِ ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ، اللَّهُمَّ اغْسِلْ عَنِّي خَطَايَايَ بِمَاءِ الثَّلْجِ وَالْبَرَدِ ، وَنَقِّ قَلْبِي مِنَ الْخَطَايَا ، كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ ، وَبَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ:

---

[٢] بخاري. جهاد: ٢٨٢٣، ٦٣٦٧. أبوداود. صلاة: ١٥٤٠. نسائي. استعاذة/٥٤٦٧.

[٣] تجريد/٥ ل/٢٥٠ رقم/١٩٨٩ = ٦٣٧٧، ٨٣٢. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨١٠.

ئەی خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لە تەمەڵی و تەوەزەلی و، لە ئیفتادەیی و، لە گوناهباری و تاوانباری و، لە قەرزاری و قەرزکوێری و، لە ئاژاوەو فەرتەنەی ناو گۆڕو، لە سزای گۆڕو، لە گفتاری ئاگری دۆزەخ و، لەسزای ئاگری دۆزەخ و، لە شەڕی ئاشووبی دەوڵەمەندی و ماڵی غەزەب، هەروەها پەنادەگرم بەتۆ لە گرفتاری هەژاری کە مرۆڤ تووشی ئاژاوە دەکا، پەنا دەگرم بەتۆ لە فەرتەنەی جەجاڵە کوێرە.

خودایە لەباتی من بەرەحمەتی خۆت گوناهەکانم بە ئاوی بەفرو تەرزە بشۆرەرەوە، وەك چۆن شتێ بەئاوو بە ئاوی بەفرو تەرزە بشۆردرێ تەواو پاك دەبێتەوە ئاوا، دڵم لە تاوان پاك بکەرەوە وەك بلووری بێگەردو بلووریی سپی، هەروەها لە گوناه دوورم بخەرەوە وەك دووریی خۆرهەڵات و خۆر ئاوا لە یەکتری (ش/د/ت/ن – خودایان لێ رازی بێ).

٥٠٦٥– عَنْ سَعْد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: تعوذوا بكلمات كَانَ النَّبِيٌّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتعوذ بهن: اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ. رواه البخاري والترمذي والنسائي[٤]:

سەعد (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پەنابگرن بەخودا بەهۆی گوتنی ئەم وشانەوە، وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی ئەمەی دەکرد، اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە ترسنۆکی و لەچرووکی و رەزیلی و، لە تەمەنی کەسیفی و ئیفتادەیی و کەفتەکاری و، لە گرفتاربوون و گیرۆدەبوون بەدەستی دنیاوەو، لە ئازارو سزای ناو گۆڕ (ب/ت/ن– خودایان لێ رازی بێ).

٥٠٦٦– عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لاَ أَقُولُ لَكُمْ إِلاَّ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ

---

[٤] تجريد/٥ ل/٢٥٠ رقم/١٩٨٨ = ٦٣٧٠، ٢٨٢٢، ٦٣٦٥، ٦٣٧٤، ٦٣٩٠ + {رياض/٢ ل/٢٨٥ رقم/١٤٢١/١٤}.

وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا. رواه الخمسة الا البخاري[٥]:

زەیدی کوڕی ئەرقەم (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی ئەم نزایەی چۆن دەخوێند منیش ئاوا بۆتان دەخوێنم: دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَالْهَرَمِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلاَهَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلْمٍ لاَ يَنْفَعُ وَمِنْ قَلْبٍ لاَ يَخْشَعُ وَمِنْ نَفْسٍ لاَ تَشْبَعُ وَمِنْ دَعْوَةٍ لاَ يُسْتَجَابُ لَهَا: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لەبێکارەیی و تەوەزەلی و ترسنۆکی و چرووکی و ئیفتادەیی و ئازاری گۆڕ، خودایە! ترسی خۆت بخەرە ناو دڵمەوەو دەروونم بکە بە خاوەن تەقواو پاکو تەمیز رایبگرە، چونکە تۆ لە هەموو کەسێ باشتر پاکو خاوێنی دەکەیتەوە، تۆ خۆت لە راستیدا هەم گەورەی منو هەم خاوەنی خودی منیت، خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لە زانستی بێ سوودو، لەدڵی بێ ئاگاو، لە دەروونی چاوبرسیو، لە دووعاو نزایێ کە گیرانەبێ. (م/د/ت/ن – رەزای خودایان لێبێ).

٥٠٦٧– وَسَئلت عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) عَمَّا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْعُو بِهِ قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ[٦]:

لە عائیشە پرسیارکرا (خودای لێ ڕازی بێ): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چۆن دەپاڕایەوە لە خوداو چی دەفەرموو؟ فەرمووی: زۆر جاران دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لەشەڕی هەموو کردەوەیەکی خۆمو لەشەڕی کردەوەی کەسێکی تریش (م/د– رەحمەتی خودایان لێبێ).

---

[٥] مسلم. ذكرودعاء: ٦٨٤٤. نسائي. إستعاذة: ٥٤٧٣.

[٦] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٣٣. نسائي. سهو: ١٣٠٦.

٥٠٦٨- وَقَالَ بْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) كَانَ مِنْ دُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ وَجَمِيعِ سَخَطِكَ:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لەخۆی و لەبابی) فەرمووی: زۆر جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم دووعایەشی دەکرد: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوَالِ نِعْمَتِكَ وَتَحَوُّلِ عَافِيَتِكَ وَفُجَاءَةِ نِقْمَتِكَ وَجَمِيعِ سَخَطِكَ: ئەی یەزادنی پاك پەنا دەگرم بەتۆ لەوە كە خوا نەخواستە بەهرەو نازو نیعمەتی تۆ پشتم تێبكەن، لەوەیش كە ئەو ئاسوودەییەی داوتەپێم لێم بسەنیتەوەو تووشی دەردو مەینەتی و سەخڵەتی ببم، هەروەها پەنادەگرم بەتۆ لەوەی كە لەپڕ لەناكاودا ئاوقەدی تۆڵەی سەختی ناكەهانی تۆببم، پەنادەگرم بەتۆ لە هەرچی شتێ دەبێ بەهۆی نارەزایی و تووڕەیی تۆ! (م/د – خۆشنوودیی خودایان لێبێ).

٥٠٦٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُهُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ يَقُولُ: اللَّهُمَّ أَنِي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ[٨]:

ئیبنو عەبباس (خۆشنوودیی خودا لەسەر خۆیی و بابی) فەرمووی: كاتێ خۆی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سوورەتی قورئانی چۆن فێری یارانی دەكرد، بەو شێوەیش ئەم نزایەی فێر دەكردن، دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە سزای دۆزەخ، پەنادەگرم بەتۆ لە سزای گۆڕ، پەنادەگرم بەتۆ لە فەرتەنەی ججاڵە كوێر، پەنادەگرم بەتۆ لە فەرتەنەو ئاژاوەی ژیان و مردن! (د/ت/ن – س/ح).

٥٠٧٠- عَنْ شَكَلِ بْنِ حُمَيْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي تعوذا أتعوذ به قَالَ: فَأخذ بكتفي فَالَ: قُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ

---

[٨] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٧٩. أبوداود. صلاة: ١٥٤٥.

بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي. رواهما أصحاب السنن[٩]:

شەكەلی كوڕی حومەید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزیمكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! نووشتەیەكم فێربكە كە بیخوێنمو پەنای پێبگرم بەخودا لە شەڕووەیو وەزەنی شتی خراپ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) هەردوو دەستی خستە سەر هەردوو سەرشانمو فەرمووی: بڵێ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ سَمْعِي وَمِنْ شَرِّ بَصَرِي وَمِنْ شَرِّ لِسَانِي وَمِنْ شَرِّ قَلْبِي وَمِنْ شَرِّ مَنِيِّي: ئەی یەزدانی پاك! پەنادەگرم بەپەنای تۆ لەشەڕی ئەم ئەندامانەی خۆم: لە شەڕی گوێم، لە شەڕی چاوم، لە شەڕی زمانم، لە شەڕی دڵم، لە شەڕی دامەنو تۆماوی خۆم!. (د/ت/ن-س/ح).

شەڕی گوێ وەك بیستنی ناڕەوا، شەڕی چاو وەك نەزەرو تەماشاكردنی نادروست، شەڕی زمان وەك درۆو غەیبەتو بوختانو قسەی بێ شەرعی، شەڕی دڵ وەك فیزو دەعیەو نەخۆشینە دەروونییەكانی تر، شەڕی دامەنو تۆماو وەك دامەنپیسیو خۆ ڕەحەتكردنی ناڕەوا. (وەرگێڕ)

٥٠٧١- عَنْ أَبِي الْيَسَرِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَدْعُو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَدْمِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْغَرَقِ وَالْحَرَقِ وَالْهَرَمِ وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِرًا وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغًا[١٠]:

ئەبو لیەسەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم نزایەی دەكرد: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَدْمِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ التَّرَدِّي وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْغَرَقِ وَالْحَرَقِ وَالْهَرَمِ وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ يَتَخَبَّطَنِي الشَّيْطَانُ عِنْدَ الْمَوْتِ وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ فِي سَبِيلِكَ مُدْبِرًا وَأَعُوذُ بِكَ أَنْ أَمُوتَ لَدِيغًا: پەزدانی پاك

---

[٩] بسند حسن (شرحه).

[١٠] رواه أبوداود بسند صالح ورواه النسائي بسند صحيح (شرحه).

پـەنادەگرم بـەتۆ لـە هـەرەس و رووخـان و لەهەڵـدێران و بەربوونـەوەو، لـە خنکـان و، لـە سـووتان و، لـە ئیفتـادەیی و، لـەوەیش کـە لـەکاتی سـەرەمەرگا شەیتان دەستم لێ بوەشێنێ و، لەوەیش کە لەکاتی غەزادا پشت هەڵکەم و لەو کاتی پشت هەڵکردنەدا بمرم و، لەوەیش کە بەپێوەدانی مارو میروو گەزەندە بمرم. (د-س/صالح-ن-س/ص).

٥٠٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُـولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ وَالْقِلَّةِ وَالذِّلَّةِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ[١١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْفَقْرِ وَالْقِلَّةِ وَالذِّلَّةِ وَأَعُـوذُ بِـكَ مِـنْ أَنْ أَظْلِـمَ أَوْ أُظْلَـمَ: خودایـە! ئـەمن پـەنادەگرم بە پـەنای تـۆ لـە هـەژاری و، لـەبێ خێری و، لە کەساسی و، لەوەی کە زۆرو ستەم لە کەسێ بکەم، یا کەسێ زۆرو ستەمم لێ بکا (د-س/صالح-ن-س/ص).

٥٠٧٣- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِـنَ الشِّقَاقِ وَالنِّفَاقِ وَسُوءِ الأَخْلَاقِ[١٢].

دیسان فەرمووی: جاران خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الشِّقَاقِ وَالنِّفَاقِ وَسُوءِ الأَخْلَاقِ: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە دووبـەرەکی و نـاکۆکی و دووڕوویـی و ناپـاکی و بـەدخویی (د-س/صـالح-ن-س/ص).

٥٠٧٤- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِـنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ[١٣].

---

[١١] رواه أبوداود بسند صالح ورواه النسائي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] رواه أبوداود بسند صالح والنسائي بسند صحيح (شرحه).

[١٣] رواه أبوداود بسند صالح والنسائي بسند صحيح (شرحه).

دیسان فەرمووی: زۆرجار خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُوعِ فَإِنَّهُ بِئْسَ الضَّجِيعُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخِيَانَةِ فَإِنَّهَا بِئْسَتِ الْبِطَانَةُ: ئەی یەزدانی پاك: پەنا دەگرم بەتۆ لە برسێتی، چونکە لەراستی دا هەژاری بەراستی خۆیەتی، پەنادەگرم بەتۆ لە گزێتی و ناپاکێتی، چونکە بەراستی کینەو دەغەز خۆیەتی. (د-س/صالح-س/ص).

٥٠٧٥- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَرَصِ وَالْجُنُونِ وَالْجُذَامِ وَمِنْ سَيِّئِ الأَسْقَامِ. روى هذه الخمسة أبو داود والنسائي[١٤]:

گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَرَصِ وَالْجُنُونِ وَالْجُذَامِ وَمِنْ سَيِّئِ الأَسْقَامِ: خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لەبەڵەکی و، لەشێتی و، لەگولی و، لەگشت دەردێکی پیس! (د-س/صالح-ن-س/ص).

٥٠٧٦- عن عائشة (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) قالت: كنت نائمة الى جنب النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ففقدته من. ← (ب - ١ ز - ٨٦ ل - ٢٨٠ ف - ٣)[١٥]:

٥٠٧٧- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الأَخْلاَقِ وَالأَعْمَالِ وَالأَهْوَاءِ. رواه الترمذي بسند حسن. نسأل الله حسن الحال آمين[١٦]:

گەلێ جار حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ مُنْكَرَاتِ الأَخْلاَقِ وَالأَعْمَالِ وَالأَهْوَاءِ: پەروەردگاری خۆم! پەنادەگرم بەتۆ لە رەفتاری ناپەسەندو لەکرداری گەندو لە ئارەووبازی!. (ت-س/ح).

---

[١٤] رواه أبوداود بسند صالح والنسائي بسند صحيح (شرحه).

[١٥] تقدم في مجلد أول تسلسل/٨٦ ل/٢٨٠ رقم/٥٤٢.

[١٦] بسند حسن عند الترمذي.

## باسی چوارەم: باسی چەند نزایەکی تایبەتی

## ٧٢) نزاکانی مەینەتبار (دعوات المكروب)

## الباب الرابع: في أدعية مخصوصة دعوات المكروب

٥٠٧٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ ، وَرَبُّ الأَرْضِ ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ. رواه الشيخان والترمذي[١]:

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەکاتی سەخڵەتی و لێقەوماندا دەیفەرموو: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيمُ ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ، لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ رَبُّ السَّمَوَاتِ ، وَرَبُّ الأَرْضِ ، وَرَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ. (ش+ت — خودایان لێ ڕازی بێ).**

٥٠٧٩- عَنْ أَبِي بكرة (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) دَعَوَاتُ الْمَكْرُوبِ: اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو فَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. رواه أبو داود وابن حبان[٢]:

**ئەبو بەکرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەیفەرموو: نزاو پاڕانەوەی پیاوی پەرێشانی گیرۆدە ئەمەیە: اللَّهُمَّ رَحْمَتَكَ أَرْجُو فَلاَ تَكِلْنِي إِلَى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنْتَ: خودایە! هومێدیهەرە گەورەم بە مەرحەمەتی تۆیە، کەواتە بەقەد چاوترووکانێکیش چییە مەم سپێرە بەهێزو باهووی خۆم، بەڵکوو هەرچی کاروبارم هەیە خۆت چارەسەریان بکە بۆم، لەتۆ بەولاوە خودای ترنییە (د/ئیبنو حەببان -/ص).**

---

[١] بخاري. دعوات: ٦٣٤٥، ٦٣٤٦، ٧٤٢٦، ٧٤٣١. ترمذي. دعوات: ٣٤٣٥. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٥٨. تجريد/٥ ل/٢٤٨ رقم/١٩٨٥.

[٢] بسند صحيح (شرحه).

٥٠٨٠- وَقَالَتْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيْسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلا أعلمك كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ، اللَّهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً[٣]:

ئەسمائی کچی عومەیس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئاگادارەوە بە باچەند وشەیەکی پاڕانەوەت فێربکەم تا لەکاتی پەرێشانیدا بیانڵێیت، یا فەرمووی: لەکاتی تەنگانەدا بیانڵێ: اللهُ اللَّهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً: هەر خودا پەروەردگاری منە هیچ هاوبەشی بۆ پەیدا ناکەم. (د/ن-س/ص).

٥٠٨١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَافَ قَوْمًا قَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ. رواهما أبو داود والنسائي[٤]:

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ ترسی لە هۆزێ ببوایە، دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ: خودایە! تۆ دەکەین بە بەرۆکیانەوەو پەنادەگرین بەتۆ لە شەڕیان! (د/ن-س/ص).

٥٠٨٢- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً يَدْعُو يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ تَمَامَ النِّعْمَةِ. فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ تَمَامُ النِّعْمَةِ. قَالَ: دَعْوَةٌ دَعَوْتُ بِهَا أَرْجُو بِهَا الْخَيْرَ. قَالَ: فَإِنَّ مِنْ تَمَامِ النِّعْمَةِ دُخُولَ الْجَنَّةِ وَالْفَوْزَ مِنَ النَّارِ. وَسَمِعَ رَجُلاً وَهُوَ يَقُولُ: يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ فَقَالَ « قَدِ اسْتُجِيبَ لَكَ فَسَلْ. وَسَمِعَ رَجُلاً وَهُوَ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الصَّبْرَ. فَقَالَ: سَأَلْتَ اللَّهَ الْبَلاَءَ فَسَلْهُ الْعَافِيَةَ[٥]:

موعازی کوڕی جەبەل (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەرگوێی کەوت پیاوێ دەپاڕایەوە دەیگوت: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ تَمَامَ

---

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] بسند حسن (شرحه).

النِّعْمَـةِ: خودایـە! لـە ڕەحـمەتت داوا دەكـەم كـە بـەهرەی تـەواوم پـێ ببەخـشە. فەرمووی: نیعمەتی تەواو دەزانی چییە؟ پیاوەكە گوتی: مەبەستم لەم نزایە ئومێدی خێرو خۆشییە. فـەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): دەبزانـە كـە چوونـە بەهەشـتو سـەرفرازبوون لـە ئـاگری دۆزەخ بەشـێكە لـە نیعمـەتی تـەواو. حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گـوێی لێ بـوو پیـاوێ دەیگـوت: يَـا ذَا الْجَـلاَلِ وَالإِكْـرَامِ: ئـەی خـاوەن شانوشكۆو قـەدر! فـەرمووی: نزاكـەت گیرا بـوو، دەی مرازت عەرزی خوداكە. گوێی لە پیـاوێكی تربـوو دەیگـوت: اللَّهُـمَّ إِنِّـى أَسْـأَلُكَ الـصَّبْرَ: خودایـە! لـەتۆ داوا دەكـەم كـە صـەبرو خـۆگرتنم پـێ ببەخـشی. فەرمووی: لەخودا داوای بەڵات كرد، كەواتە داوای سەرفرازیو عافییەتیشی لێبكە. (ت-س/ح).

٥٠٨٣- عَنْ أَنَس (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَهَمَّهُ الأَمْرُ قَالَ: يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ برحمتك استغيث[٦]:

ئەنەس (خۆشنوودیی خـودای لێبـێ) فـەرمووی: دەسـتووری پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو، ئەگەر كارێ سەخڵەتی بكردایە دەیفـەرموو: يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أستغيث: ئەی زینـدووی نـەمر! ئـەی مایـەی بـوونو مـانی هـەمو شتێ! ئەی ڕاگری بوونەوەر! پـەنام هێنایە بەر پـەناو مەرحەمـەتو میهرەبـانی تۆ (ت-س/غ).

٥٠٨٤- حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِى شَيْبَةَ وَابْنُ نُمَيْرٍ قَالاَ حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ عَنْ عَاصِمٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَارِثِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ -صلى الله عليه وسلم- إِذَا سَلَّمَ لَمْ يَقْعُدْ إِلاَّ مِقْدَارَ مَا يَقُولُ « اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ تَبَارَكْتَ ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ ». وَفِى رِوَايَةِ ابْنِ نُمَيْرٍ « يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ»[٧].

---

[٦] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٧] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خووبگرن بەم یادە پیرۆزەوەو هەمیشە بیکەن بەویردی سەرزمانتان بەکوڵ و بەدڵ هاواربکەن و بڵێن: ذَا الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ: ئەی خودای من! لەراستیدا هەرخۆت خاوەنی شان و شکۆو قەدرو ڕێزی، ئەی خودای پیرۆزی نازدار! (ت-س/غ).

٥٠٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَهَمَّهُ الأَمْرُ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ. وَإِذَا اجْتَهَدَ فِي الدُّعَاءِ قَالَ: يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ. روى هذه الأربعة الترمذي[8]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی خودای مەزنی لەسەربێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (صەڵات و سەلامی خودای گەورەی لەسەربێ) عادەتی وابوو کاتێ بەتەنگی کارێکەوە دەهات سەری هەڵ دەبڕی بۆ ئاسمان و دەیفەرموو: يَا حَيُّ يَا قَيُّومُ: ئەی خودای هەمیشە زیندوو، ئەی خودای مایەی بوون و مانی هەموو شتێ. (ت-س/ح).

## ٧٣) نزای سەفەرو هاتنەوە لە سەفەر : (دعاء السفر والرجوع منه)

٥٠٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَافَرَ قَالَ: اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَسُوء المنظر في الأهل والمالِ اللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الأَرْضَ وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ دەچوو بۆ سەفەر، لەکاتی دەرچووندا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي

---

[8] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[1] مسلم. حج: ٣٢٦٢. ابوداود. جهاد: ٢٥٩٩. ترمذي. دعوات: ٣٤٤٧ {رياض/٣ ل/٢٥ تسلسل/١٧٠ رقم/٩٧٢}.

السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ وَسُوءِ المنظر في الأَهْلِ والمالِ اللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الأَرْضَ وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ: خودایە! خۆت هاوڕێی لە سەفەرداو خۆت چاودێری کە سوکارمانی، خودایە! پەنادەگرم بەتۆ لە ڕەنج و مەینەتی ڕێگەو بان و سەفەر، لەوە کە خوانەخواستە بە پەستی و دڵتەنگی لەم سەفەرەم بگەڕێمەوەو، لەوەیش کە بچمەوە بەسەر دیمەنی خراپ و حاڵی ناخۆشی ماڵ و منداڵ و خێزاندا، خودایە! تەنگی زەویمان بۆ بکێشەو ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بفەرموو (م/د/ت/ن- خودایان لێ ڕازی بێ).

٥٠٨٧- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ كَبَّرَ ثَلاثًا ثُمَّ قَالَ: سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ وَالأَهْلِ. وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ. وَزَادَ فِيهِنَّ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ. رواهما الخمسة إلا البخاري[٢]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای گەورەیان لێبێ) فەرمووی: عادەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) وابوو، کاتێ دەچوو بۆ سەفەرێ کە بەباشی لە سەرپشتی وشترەکەی جێی خۆی دەگرت ئەوجا سێ جار لەسەر یەك ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، ئەوسا دەیفەرموو: سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ⊗ اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ

---

[٢] مسلم. حج: ٣٣٦٢. ابوداود. جهاد: ٢٥٩٩. ترمذي. دعوات: ٣٤٤٧. رياض/٣ ل/٢٥ رقم/٩٧٢.

⊗ سورەتی زوخروف — ٤٣ / ١٣ — ١٤).

فِي الْمَالِ وَالأَهْلِ: ئەو خودایە پاك‌و پیرۆزە كە ئەم ولاخەی بۆ ئێمە رام كردووە ئەگەر لەسایەی مەرحەمەتی ئەوەوە نەبوایە زەوتكردنی ئەمە لە وزەی ئێمەدا نەبوو، ئەوەشمان لەیاد نەچێ كە زوو یا درەنگ گەورەترین سەفەرو گەڕانەوەمان ئەوەیە كە دەچینەوە بەردەستی خودا، ئەی خودایە! ئێمە لەم سەفەرەمانا لە رەحمەتی تۆ داوا دەكەین كە لە چاكەو تەقوا بەشی باشمان پێ خەلات بفەرمووی، ئەو كاروئیشە جوانانە بكەین كە دەبن بە مایەی خۆشنوودی‌و رەزامەندیی تۆ، ئەی خودایە! ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بفەرموو، دوورییەكەیمان بۆ نزیك بكەرەوە. ئەی خودایە! خۆت هاوڕێیت لە سەفەرداو، خۆت چاودێری كەسوكارمانی، ئەی خودایە! من پەنادەگرم بە پەنای تۆ لە رەنج‌و مەینەتی رێگەوبان‌و زەحمەتی سەفەر، لەوە كە خوانە خواستە، بە پەستی‌و دڵتەنگی لەم سەفەرەم بگەڕێمەوە، لەوەیش كە بچمەوە بەسەر دیمەنی خراپ‌و حاڵی ناخۆشی ماڵ‌و منداڵ‌و خێزاندا. كاتێكیش لە سەفەرەكە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەم نزایەی بەتەواوی دووبارە دەكردەوەو ئەم چەند وشەیەی لە دواوە لێ پتر دەكرد: (ئایبون تائبون عابدون لربنا حامدون) (م/د/ت/ن).

٥٠٨٨- قَالَ عَلِيُّ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ شَهِدْتُ عَلِيًّا (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أُتِيَ بِدَابَّةٍ لِيَرْكَبَهَا فَلَمَّا وَضَعَ رِجْلَهُ فِي الرِّكَابِ قَالَ بِسْمِ اللَّهِ ثَلاَثًا فَلَمَّا اسْتَوَى عَلَى ظَهْرِهَا قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ ثُمَّ قَالَ (سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ) ثُمَّ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ ثَلاَثًا وَاللَّهُ أَكْبَرُ ثَلاَثًا سُبْحَانَكَ إِنِّي قَدْ ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ. ثُمَّ ضَحِكَ. فَقُلْتُ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ قَالَ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَنَعَ كَمَا صَنَعْتُ ثُمَّ ضَحِكَ، فَقُلْتُ مِنْ أَيِّ شَيْءٍ ضَحِكْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنَّ رَبَّكَ لَيَعْجَبُ مِنْ عَبْدِهِ إِذَا قَالَ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرُكَ. رواه الترمذي وأبو داود[٣]:

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

**عەلی کوڕی ڕەبیعە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: بە دیارەوە بووم وڵاخەکەی عەلییان هێنا بۆی کە سواری بێ، کاتێ پێی نایێ ئاو زەنگی سێ جار فەرمووی: باسم الله: بە پیرۆزیی ناوی خودا. کاتێکیش ڕێك لەسەر پشتی وڵاخەکە دانیشت فەرمووی: الحَمد للهِ، سُبْحَانَ الَّذِی سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ: ئەنجا سێ جار فەرمووی: الحمد الله، سێ جاریش فەرمووی: اللهُ اكبر، ئەوجا فەرمووی: سُبْحَانَكَ إِنِّي قَدْ ظَلَمْتُ نَفْسِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ: ئەوجا زەردەخەنەیەکی کرد، منیش عەرزیمکرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! بۆچی پێدەکەنی؟ فەرمووی: جارێ پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست (دروودو صەڵاتو سەلامی لەسەربێ) هەمان شتی کرد، کەمن ئێستا کردمو ئینجا پێکەنی، منیش عەزیم کرد: قوربان! بۆچی پێکەنیت؟ فەرمووی: چونکە خودای تۆ زۆر خۆشی دێ بەوە کە بەندەی خۆی بلێ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ غَيْرُكَ: پەروەردگاری نازدارم! لە تاوانەکانم ببورە، گوناهەکانم بپۆشە، تۆنەبێ کێ رادەی دەکەوێ کە لە گوناهان خۆش بێ، (ت-س/ص-د).**

**٥٠٨٩- وَقَالَ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَفَلَ مِنَ الْجُيُوشِ أَوِ السَّرَايَا أَوِ الْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ إِذَا أَوْفَى عَلَى ثَنِيَّةٍ أَوْ فَدْفَدٍ كَبَّرَ ثَلاَثًا ثُمَّ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ. واه الشيخان. والله أعلم[٤]:**

**ئیبنو عومەر (خۆشنوودیی خودایان لێبێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە غەزا، یا لە حەج، یا لە عەمرە دەگەڕایەوە کاتێ سەردەکەوتە سەر لاشانێ، یا سەر لاپاڵێ سێ جار ئەڵلاهو ئەکبەری دەکردو ئەوجا دەیفەرموو: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ. (ش).**

---

[٤] مسلم. حج: ٣٢٦٥ {رياض/٣ ل/٢٧ تسلسل/١٧٠ رقم/٩٧٤. ابوداود: ٢٦٠٢ وترمذي: ٣٤٤٣}.

## ٧٤) نزای ڕێبوار بەڕێکردن : (دعاء الوداع)

٥٠٩٠- ← لە بەرگی هەشتەمدا رابورد، باسی (توديع الغزاه واستقبالهم). لێرەدا دەفەرموێ: هەر پیاوێ کە دەیویست بچێ بۆ سەفەر، ئیبنو عومەر (خودایان لێ ازی بێ) پێی دەفەرموو: لەمن نزیک بەرەوە، با بەرێت بکەم وەك چۆن پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئێمەی لەسەفەردا بەڕێ دەکرد، دەیفەرموو: (استودع الله دينك وامانتك وخواتم عملك). (د/ت/ن-س/ص).

٥٠٩١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ سَفَرًا فَزَوِّدْنِي. قَالَ: زَوَّدَكَ اللَّهُ التَّقْوَى. قَالَ: زِدْنِي. قَالَ: وَغَفَرَ ذَنْبَكَ. قَالَ: زِدْنِي بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي. قَالَ: وَيَسَّرَ لَكَ الْخَيْرَ حَيْثُمَا كُنْتَ. رواه الترمذي والحاكم[٢].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! نیازی رێبواریم هەیە، دەمەوێ بچم بۆ سەفەرێ، بفەرموو توێشوویەکم بدەرێ، فەرمووی: زَوَّدَكَ اللَّهُ التَّقْوَى: خودا توێشووی تەقواو لەخودا ترسینت پێ خەڵات بفەرمووێ. گوتی: قوربان! دووعایەکی تریشم بۆ بکە، فەرمووی: خودا لە گوناهیشت خۆش بێ: وَغَفَرَ ذَنْبَكَ: گوتی: باوك و دایکم بەقوربانت بن نزایەکی تریشم بۆ بکە، فەرمووی: وَيَسَّرَ لَكَ الْخَيْرَ حَيْثُمَا كُنْتَ: خودایە! ئەم بەندەی تۆیە لە هەرکوێ بێ باشی بۆ بکەو کاری خێری بۆ ئاسان بفەرموو. (ت/حاکم-س/ح). واتە: سوننەتە رێبوار داوای دووعای خێر لە پیاو چاکان و مامۆستا ئایینیەکان بکا، چونکە ئەم زاتە نازدارانە جێنشینی پێغەمبەرن و چرای رۆشنی رێبازی شەریعەتن، ئەوانیش بەم نزایە نزای بۆ بکەن و بڵێن: « زَوَّدَكَ اللَّهُ التَّقْوَى وَغَفَرَ ذَنْبَكَ وَيَسَّرَ لَكَ الْخَيْرَ حَيْثُمَا كُنْتَ. (وەرگێڕ)

٥٠٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُسَافِرَ فَأَوْصِنِي. قَالَ: عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالتَّكْبِيرِ عَلَى كُلِّ شَرَفٍ. فَلَمَّا أَنْ وَلَّى الرَّجُلُ قَالَ: اللَّهُمَّ اطْوِ لَهُ الأَرْضَ وَهَوِّنْ عَلَيْهِ السَّفَرَ. رواه الترمذي بسند حسن. والله أعلم[٣].

---

[٢] بسند حسن (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دەمەوێ سەفەر بکەم، بفەرموو پەندم دادەو ئامۆژگاریم بفەرموو فەرمووی: هەمیشە ترسی خودات لە دڵدابێ و لە تەقوای خودا بێ ئاگا مەبە، وە لەسەر هەموو جێگایەکی بەرزیش ئەڵڵاهو ئەکبەر بکە. کاتێکیش پیاوەکە ڕۆیشت فەرمووی** (درودی خودای لەسەربێ): **اللّٰهُمَّ اطْوِ لَه الأَرْضَ وَهَوِّنْ عَلَيْـه السَّفَرَ: خودایە! تەنگی زەوی بۆ بکێشەو ڕێی دووری بۆ نزیک بکەرەوەو سەفەرەکەیشی بۆ ئاسان بکە (ت-س/ح).**

## ٧٥) نزای چوونە هەواری نوێ : (دعاء النزول في أي منزل)

**٥٠٩٣- عَنْ خَوْلَةَ بِنْتَ حَكِيم (رَضِيَ اللّٰهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً ثُمَّ قَالَ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ. لَمْ يَضُرُّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ. رواه الترمذي[١]:**

**خەولەی کچی حەکیم** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر کەسێ کاتێ دەچێتە جێگەیێ بڵێ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللّٰهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ: پەنا دەگرم بە پیرۆزیی وشە تەواوەکانیخودا لە شەڕی هەموو دروسکراوانی خودا، ئیتر هیچ شتێ زیانی پێ ناگەیەنێ هەتا لەو شوێنو هەوارە دەگوێزێتەوە. (ت-س/ص)[١].**

---

[١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] لە ١٩٨٧/٦/١٦دا ئەم چەند دێڕەم لەسەر ئەم فەرموودەیە نووسیوە: (ئێستاکە لە یارەوڵی هاتمەوە، یەکێکیان تیادا بوو بەرۆژوو بوو، گوتم: خودایە! تەفائول دەکەم بەم حەدیسانەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەواری نوێی ئەم پیاوە کۆچکردووەم پێ نیشان بدە، سبحان الله کە کتێبەکەم کردەوە ئەم باسەو ئەم حەدیسەی بۆ نیازەکەم دەرچوو. (وەرگێڕ)

★ ڕوونکردنەوە:

یارەوڵی مەیدان! ڕەمییەکی سەربازی بوو، لەنزیک باروتخانەوە لە خۆرهەڵاتی کەرکوکەوە، زۆرینەی سەربازو پۆلیسێ ئەفسەرو پێشمەرگەو ئەمانە، کە إعدام دەکران، لەوێ گوللە باران دەکران، کۆمەڵێ روداوی ڕاستەقینەی فیعلیم لەم جۆرە بابەتە تۆمار کردبوو، زۆر بەنرخ

٥٠٩٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَافَرَ فَأَقْبَلَ اللَّيْلُ قَالَ: يَا أَرْضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللّٰهُ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ وَمِنْ شَرِّ مَا يَدِبُّ عَلَيْكِ وَأَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ وَمِنَ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ وَمِنْ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ. واه ابو داود والنسائي[٢]:

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **کە دەچوو بۆ سەفەر، کە شەو دادەهات لە جێگەیێ، دەیفەرموو:** يَا أَرْضُ رَبِّي وَرَبُّكِ اللّٰهُ أَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شَرِّكِ وَشَرِّ مَا فِيكِ وَشَرِّ مَا خُلِقَ فِيكِ وَمِنْ شَرِّ مَا يَدِبُّ عَلَيْكِ وَأَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ أَسَدٍ وَأَسْوَدَ وَمِنَ الْحَيَّةِ وَالْعَقْرَبِ وَمِنْ سَاكِنِ الْبَلَدِ وَمِنْ وَالِدٍ وَمَا وَلَدَ: **ئەی زەوییەکە! خودای منو تۆیە کە، کە یەزدانی پاکە، پەنا دەگرم بە پەنای خودا لە شەڕو زیانی تۆو لە، شەڕی ئەوەی کە لەناو تۆدا هەیەو، لەو شەڕەی کە دروست کراوە لەناو تۆداو، لە شەڕی ئەو جانەوەرانەی کە لەسەر پشتی تۆ دەخشێو دەڕوا، پەنادەگرم بەخودا لە زیانو شەڕی شێروورە شمارو، لەشەڕی مارو دووپشکو، لە خێوی وڵاتو، لە شەڕی شەیتانو، لە شەڕی وەچەی شەیتان (د-س/صالح-ن-س/ص).**

---

بوون، چونکە هەر هیچ نەبێ هەموو وەقائعو حەقایق بوو، وەمن خۆم بەسیفەتی پیاوی ئایینی شایەتی حاڵم، وە موبالەغەو درۆو دەلەسەی تیادا نەبوو، بەڵام بەداخەوە ئەم بارودۆخەی ئێستای کوردستان، کە جگە لەبادەو یارو پارەو تەلارو قومار، هیچی تر بایەخی نییە، ئەم بارو دۆخە سەپاوە وای لێ کردووین کەبڵێین:

(ئەمڕۆ ڕۆژی پولو پارەو مەیو یارو تەلارە، کێ تاقەتی خوێندنەوەی دەفتەرە شڕی ژیانی پڕ لەناسۆرو مەینەتی خۆبەختکردنی پێشمەرگەی دێرینی هەیە، کەواتە هەتا زووە لێفە شڕێکی پیادە.....).

بەهەر حاڵ ئەم إعدام کراوە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) سەربازی ڕاکردوو بوو، لەسەر ئەوە گوللە باران کرا کەلەحاڵەتی حەربا، لەخزمەتی عەسکەری ڕایکردووە، بەڕۆژوو بوو، دوای کردنی دوو ڕکات نوێژی صەلاتی صەبر، بەزمانی بەڕۆژووەوە گوللە بارانیان کرد، وەهەزار ڕەحمەت لەگیانی پاکی.

وەرگێڕ ٢٠٠٨/٨/٢٦

[٢] بسند صالح لأبي داود وسند صحيح للنسائي (شرحه).

## ٧٦) نزای هەستان لە کۆڕی دانیشتن : (دعاء القيام من المجلس)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ، وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَارَ النُّجُومِ – سورة الطور – ٥٢//٤٨-٤٩}.

**واتە: کاتێ ویستت لە کۆڕێ، یا لە شوێنێ هەستیت، یا لە خەو راست ببیتەوە بڵێ (سبحان الله وبحمده) بە شەویش بەهۆی عیبادەتو نوێژەوە تەسبیحو زیکری خودا بکە، هەروەها لەپاش ئاوابوونی ئەستێرەکانەوە تەسبیحی خودا بکە. تەماشای ئەم شوێنە بکە ← (ب – ٧ ز – ٣٥ ل – ١٦٢ ف – ٢).**

٥٠٩٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي اللهُ عنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ. إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ. رواه أصحاب السنن. ولفظ أبي داود: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ: مِنَ الْمَجْلِسِ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ ». فَقَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّكَ لَتَقُولُ قَوْلاً مَا كُنْتَ تَقُولُهُ فِيمَا مَضَى. قَالَ « كَفَّارَةٌ لِمَا يَكُونُ فِي الْمَجْلِسِ[1]:

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ لە کۆڕێکا دابنیشێو گاڵەگاڵی زۆربکا، بەڵام بەر لە هەستان لە کۆڕەکە بڵێ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ: ئیتر خودا خۆش دەبێ لێی لەوەی لەو مەجلیسەدا بووە! (د/ت/ن–س/ص).**

**گفتەی ئەبو داوود: جاران حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کاتێ دەیویست لە کۆڕی دانیشتن هەڵبسێ دەیفەرموو: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم**

[1] بسند صحيح رواه أبوداود في الأدب (شرحه).

فەرمایشتەی کە ئێستا دەیفەرمووی: لەمەوپێش ئەمەت نەدەفەرموو؟ فەرمووی: هەرچی لەناو ئەم کۆڕانەدا روودەدا گوتنی ئەم گوتارە پیرۆزە دەبێ بە کەففارەتی.

## ٧٧) گوتەی کاتی خوێندنی کەڵەبابو کاتی زەڕینی گوێدرێژ
## القول عند صياح الديكة ونهيق الحمار

٥٠٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ فَاسْأَلُوا اللَّهَ مِنْ فَضْلِهِ ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكًا ، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ ، فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَانًا. رواه الخمسة[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ گوێتان لە قووقەی کەڵەشێر بوو داوای بەهرەو بەخشش لە خودا بکەن، چونکە ئەوە بۆیە دەخوێنێ فریشتەی بینیوە، کاتێ گوێتان لە زەڕەی کەریش بوو پەنابگرن بەخودا لە شەڕی شەیتان بڵێن: أعوذ بالله من الشيطان: چونکە ئەوە شەیتانی دیوە! (ش/د/ت/ن – رەزای خودایان لێبێ).

٥٠٩٧- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَسُبُّوا الدِّيكَ فَإِنَّهُ يُوقِظُ لِلصَّلاَةِ. رواه أبو داود والنسائي بسند صحيح[2]:

زەیدی کوڕی خالید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جنێو بە کەڵەباب مەدەن، چونکە خەڵك خەبەر دەکاتەوە بۆ نوێژ. (د/ن–س/ص).

لە شەرحەکەدا دەفەرموێ: لە گێڕانەوەیەکی فەرموودەی یەکەمی ئەم باسەدا دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): کاتێ گوێتان لە حەپەو لوورەی

---

[1] تجريد/٢ ل/٤٥٧ رقم/١٣٣٢ = ٣٣٠٢. مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٥٧. أبوداود. أدب: ٥١٠٣. ترمذي. دعوات: ٣٤٥٩.

[2] حديث صحيح.

صەگەڵو، لە زەڕەی کەرگەل بوو بڵێن: أعوذ بالله من الشیطان: چونکە ئەوانە شتی وا دەبینن کە بەئێوە نابینرێ وەك شەیاتینیو بەڵاو موصیبەت کە لە ئاسمانەوە دادەبارن. (وەرگێڕ)

## ٧٨) نزای هاتوچۆ بۆ ماڵ : (دعاء الخروج من البیت ودخوله)

٥٠٩٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ قَالَ: بِسْمِ اللّٰهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّٰهِ اللّٰهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ نَزِلَّ أَوْ نَضِلَّ أَوْ نَظْلِمَ أَوْ نُظْلَمَ أَوْ نَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيْنَا[1]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: دەستووی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو کە لەماڵ دەردە چوو دەیفەرموو: بِسْمِ اللّٰهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّٰهِ اللّٰهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ نَزِلَّ أَوْ نَضِلَّ أَوْ نَظْلِمَ أَوْ نُظْلَمَ أَوْ نَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيْنَا: بە پیرۆزی ناوی خودا، بە پشتیوانی خودا، خودا گیان! پەنا دەگرم بەتۆ لەوەی کە لەڕێ دەرچین، یا ڕێگەی ڕاست گوم بکەینو لە ڕێگەی هەق هەڵەیین، یاخود زۆرو ستەمو ناهەقی لە کەسێ بکەین، یاخود کەسێ بەناڕەوا زۆرو ستەمو ناهەقیمان لێبکا، یاخود ناپیاوی لە کەسێ بکەین، یا کەسێ نامەردانە ناپیاویمان لێ بکا. (د/ت/ن-س/صالح).

٥٠٩٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فَقَالَ بِسْمِ اللّٰهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللّٰهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ. قَالَ: يُقَالُ حِينَئِذٍ هُدِيتَ وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ فَتَتَنَحَّى لَهُ الشَّيَاطِينُ فَيَقُولُ لَهُ شَيْطَانٌ آخَرُ كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ. رواهما أصحاب السنن[2]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ ئەو دەمەی لەماڵ دەردەچێ بڵێ: بِسْمِ اللّٰهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى

---

[1] بسند صالح (شرحه).

[2] بسند صالح (شرحه).

اللّٰهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ: بە پیرۆزی ناوی خوداو بە پشتی خودا وا لەماڵ دەردەچم، هێزو تەوانایی هەر بە دەستی خودا خۆیەتی و بەس. فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەو حەلە فریشتە پێی دەفەرموێ: هدیت وکفیت ووقیت: هەقت پێ ناسرا، بەشی باشی خۆتت وەرگرت بەشێکی وا کە بەست بکا، لە خوداوە پارازرایت. جا شەیتانێ دەچێ بۆ پارێزی، شەیتانێکی تریێی دەڵێ: ئەم پیاوە هیدایەت دراوەو بێ نیاز کراوەو لە خوداوە پارێزراوە ئیتر تۆ دەتوانی چی لێ بکەی. تا زووە لە کوڵی بەرەوە. (د/ت/ن-س/صالح).

٥١٠٠- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذَا وَلَجَ الرَّجُلُ فِي بَيْتِهِ فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَوْلِجِ وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ بِسْمِ اللّٰهِ وَلَجْنَا وَبِسْمِ اللّٰهِ خَرَجْنَا وَعَلَى اللّٰهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا ثُمَّ لْيُسَلِّمْ عَلَى أَهْلِهِ. رواه أبو داود بسند صالح[٣]:

ئەبو مالیکی ئەشعەری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ پیاو دەچێتەوە ناو ماڵی خۆی با بڵێ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَ الْمَوْلِجِ وَخَيْرَ الْمَخْرَجِ بِسْمِ اللّٰهِ وَلَجْنَا وَبِسْمِ اللّٰهِ خَرَجْنَا وَعَلَى اللّٰهِ رَبِّنَا تَوَكَّلْنَا: ئەی خودا گیان! بەدڵ و بەگیان لەتۆ داوا دەکەم کە بەخێرو خۆشی هاموشۆو هاتو چۆ بکەین و بێین و بچین، بەپیرۆزیی ناوی خودا دێین و دەچین، هەروەها بە پشتی خودای پەروەردگاری خۆمان. فەرمووی: ئەوجا لەپاش ئەوە سڵاو لە خێزانی بکا (د-س/صالح).

### ٧٩) نزای کاتی بارانو باو هەورەگرمە : (الدعاء في المطر والريح والرعد)

٥١٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الرِّيحُ مِنْ رَوْحِ اللّٰهِ تَأْتِي بِالرَّحْمَةِ وَتَأْتِي بِالْعَذَابِ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهَا فَلاَ تَسُبُّوهَا وَسَلُوا اللّٰهَ خَيْرَهَا وَاسْتَعِيذُوا بِاللّٰهِ مِنْ شَرِّهَا. رواه أبو داود والترمذي هنا ومسلم في الصلاة ولفظه: كَانَ

[٣] سنده صالح.

النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَأَى الرِّيحَ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا وَخَيْرِ مَا فِيهَا وَخَيْرِ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: با بەشیٚكە لە رەحمەتی خوداو مایەی ئاسایشو یارمەتییە، گەلیٚ جار رەحمەتو خۆشی دیٚنیٚ، وەك بایێ كە هەوری باران بیٚنیٚ، وەك بای داراوس، هەندیٚ جاریش سزاو بەلاّ دیٚنیٚ (وەك لە پیٚشەوە لە سوورەتی ئەحقافو زارییاتدا رابورد) جا كەواتە كاتیٚ با هەلّدەكا، جنیٚوی پیٚ مەدەن، بەلّكوو لە خودا بپاریٚنەوە كە لەخیٚری ئەو بایە بەشتان بدا، هەروەها پەنابگرن بەخودا كە لە شەڕو زیانی ئەو بایە بتانپاریٚزیٚ! (د/ت/م).

گفتەی (م): جاران پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) كەبای دەدی دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهَا وَخَيْرِ مَا فِيهَا وَخَيْرِ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ: خودا گیان! منی بەندەی تۆ بە كولّو بەدلّو بەگیان داوات لیٚ دەكەم كە لە خیٚری ئەم بایەو لەو خیٚرەی وا لەم بایەداو لەو خیٚرەیش كە ئەم بایەی بۆ رەوانەكراوە. ← (ب – ١ ز – ١٧٦ ل – ٤٨٠ ف – ٥).

٥١٠٢– ← (ب – ١ ز – ١٧٦ ل – ٤٨٧ ف – ١) گیٚرانەوەی ئیٚرە دەفەرمویٚ: عائیشە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: جاران پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) كە هەوری بە ئاسۆی ئاسمانەوە دەدی دەستی لەكار هەلّ دەگرت – تەنانەت ئەگەر لەناو نویٚژیشدا بوایە، كە سلاّوی لەو نویٚژە دەدایەوە، نویٚژی تری لە دواوە نەدەكرد – ئەوجا دەیفەرموو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا: خودایە! ئەی پەروەردگار خۆم! من پەنادەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەمە. كاتیٚكیش دەباری دەیفەرموو: اللهم صيبا هنيئا: خودایە! بارانیٚكی لیزمەی بەخوڕی خۆشی باشمان بۆ ببارێنە (د/ن).

[1] {رياض/٤ تسلسل/٣٢٣ رقم/١٧٢٧} تقدم في مجلد اول تسلسل/١٧٦ رقم/٩٤٧.

٥١٠٣- ← (ب – ١ ز – ١٧٧ ل – ٤٨١ ف – ١)[٣].

٥١٠٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا سَمِعَ صَوْتَ الرَّعْدِ وَالصَّوَاعِقِ قَالَ: اللَّهُمَّ لاَ تَقْتُلْنَا بِغَضَبِكَ وَلاَ تُهْلِكْنَا بِعَذَابِكَ وَعَافِنَا قَبْلَ ذَلِكَ. رواه الترمذي بسند غريب. اللهم آمن غربتنا وآنس وحدتنا. آمين[٤]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای گەورەیان لێبێ) دەفەرموێ: جاران یاسای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وابوو کاتێ دەنگی هەورەگرمەو هەورە تریشقەی دەبیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): اللَّهُمَّ لاَ تَقْتُلْنَا بِغَضَبِكَ وَلاَ تُهْلِكْنَا بِعَذَابِكَ وَعَافِنَا قَبْلَ ذَلِكَ: خودایە! بەقارو خەشمو ڕقی خۆت مەمانکوژەو، بە سزاو عەزابی خۆت لەناومان مەبەو لە پێش هەموو شتێکا باشمان بۆ بکەو هەمیشە ئاسایشمان پێ ببەخشە. (ت–س/غەریب).

## ٨٠) نزای کاتی دیتنی مانگی نوێ : (الدعاء لرؤية الهلال)

٥١٠٥- عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلاَلَ قَالَ: اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالْيُمْنِ وَالإِيمَانِ وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ[١]:

لە طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵاوە (خودای لێ ڕازی بێ) دەگێڕنەوە دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە مانگی نوێی دەدی دەیفەرموو: اللَّهُمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالْيُمْنِ وَالإِيمَانِ وَالسَّلاَمَةِ وَالإِسْلاَمِ رَبِّي وَرَبُّكَ اللَّهُ: خودایە! بەخێرو خۆشیو لەسەر ئیمان و ئەمان و ئیسلامەتی هەمیشە مانگمان بۆ نوێ بکەرەوە، ئەی مانگ! تۆیش وەك ئێمە دروسکراوی خودای، خودای من و خودای تۆو خودای هەموو شتێ هەر یەکە، کە یەزدانی پاکە (ت–س/ح).

---

[٣] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٧٧ ل/٤٨١ ط/١ رقم/٩٤٨.

[٤] حديث غريب (شرحه).

[١] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥١٠٦- عَنْ قَتَادَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا رَأَى الْهِلَالَ قَالَ: هِلَالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ هِلَالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ هِلَالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ آمَنْتُ بِالَّذِي خَلَقَكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ يَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي ذَهَبَ بِشَهْرِ كَذَا وَجَاءَ بِشَهْرِ كَذَا. رواه أبو داود[٢]:

قەتادە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە مانگی نوێی دەدی دەیفەرموو: هِلَالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ هِلَالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ هِلَالُ خَيْرٍ وَرُشْدٍ آمَنْتُ بِالَّذِي خَلَقَكَ: خودایە! بیکەی بە مانگی نوێی خێرو خۆشی، ئەی مانگەکە! باوەڕم هەیە بەو کەسە کە تۆی دروست کردووە، کە خودای گەورەیە. ئەوجا دەشی فەرموو: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي ذَهَبَ بِشَهْرِ كَذَا وَجَاءَ بِشَهْرِ كَذَا: سوپاس بۆ خودا، کەوا فیسارە مانگی ڕەت کردو فیسارە مانگی داهێنا (د-س/مورسەل).

## ٨١) نزای چاوپێکەوتنی نۆبەرەی میوەهات
## الدعاء لرؤية الباكورة من الثمر

٥١٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ النَّاسُ إِذَا رَأَوْا أَوَّلَ الثَّمَرِ جَاءُوا بِهِ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِذَا أَخَذَهُ قَالَ: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي ثِمَارِنَا وَبَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِنَا وَمُدِّنَا اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ عَبْدُكَ وَخَلِيلُكَ وَنَبِيُّكَ وَإِنِّي عَبْدُكَ وَنَبِيُّكَ وَإِنَّهُ دَعَاكَ لِمَكَّةَ وَأَنَا أَدْعُوكَ لِلْمَدِينَةِ بِمِثْلِ مَا دَعَاكَ بِهِ لِمَكَّةَ وَمِثْلِهِ مَعَهُ ». ثُمَّ يَدْعُو أَصْغَرَ وَلِيدٍ يَرَاهُ فَيُعْطِيهِ ذَلِكَ الثَّمَرَ. رواه الترمذي. نسأل الله البركة في كل شيء. آمين[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جاران موسوڵمانان کە نۆبەرەی میوەهات دەردەچوو دەیانهێنا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەویش وەری دەگرت و دەیفەرموو: اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِي مَدِينَتِنَا وَفِي ثِمَارِنَا وَفِي مُدِّنَا وَفِي صَاعِنَا:

---

[٢] رواه أبوداود بسند مرسل (شرحه).

[١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

خودایـە! پیـتو فـەڕو پیرۆزیـی بڕێـژە بەسـەر میوەهاتمانـدا، بەسـەر شارەکەماندا، بەسەر مەنو ئەیارەماندا[١] پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر نزا پیرۆزەکەی دەڕۆیشتو دەیفەرموو: خودایە! ئیبراهیم بەندەو دۆستو پێغەمبەری تۆیە، منیش بەندەو پێغەمبەری تۆم، ئەو زاتە لەتۆ پاڕاوەتەوە بۆ مەککە، منیش دەپاڕێمەوە بۆ مەدینە، کە دوو قاتی مەککە خێرو خۆشیو پیتو فەڕو پیرۆزی بڕژێنی بەسەر مەدینەدا. ئەوجا بچکۆلەترین منداڵ کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) چاوی لێی بوو بانگی دەکردو ئەو نۆبەرەیەی دەدایە (ت-س/ص).

### ٨٢) نزای ترس شکاندنو خەوزڕان : (دعاء منع الفزع والارق)

٥١٠٨- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضي اللهُ عَنهُم) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِذَا فَزِعَ أَحَدُكُمْ فِي النَّوْمِ فَلْيَقُلْ أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ. فَإِنَّهَا لَنْ تَضُرَّهُ. قَالَ وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو يُلَقِّنُهَا مَنْ بَلَغَ مِنْ وَلَدِهِ وَمَنْ لَمْ يَبْلُغْ مِنْهُمْ كَتَبَهَا فِي صَكٍّ ثُمَّ عَلَّقَهَا فِي عُنُقِهِ. رواه أصحاب السنن[١]:

لـە عـەمری کـوڕی شـوعیبەوە، لەباوکییـەوە، لـە باپیرییـەوە (ڕەزای خودایان لێبێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ) هـەرکێ لـە ئێوە کاتێ خەوی لێ دەشەڵەژێو لەخەودا ترسی لێ دەنیشێ با بڵێ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ: پەنا دەگرم بە فەرمووده تەواوەکانی خودا، لەقارو تووڕەیی خودا، هەروەها لـە تۆڵەسـەندنی خـودا، هـەروەها لـە شـەڕی بەنـدەکانی خـودا، بەتایبـەتی لەوەسوەسـەو خوتـووراتی شـەیتانەکان، کـە وەك سەرەسـیخۆرمە لـە

---

[١] خوێندنی ئەم نزایە بۆ ئێمە تا ئێرە سوننەتە، چونکە مەنـدەی نزاکە هەر بۆ پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) دەست دەدا. (وەرگێڕ)

[١] بسند حسن (شرحه).

پەنامەکییەوە دنەی دڵ و دەروون دەدەن و هانی خەڵك دەدەن لەسەرکردنی خراپەو گوناه، هەروەها پەنادەگرم بەتۆ لەوە کە شەیاتینی لەلای من حازر بن و بۆ ختەدان لەسەر ئاشوب گڕم بدەن و بەدەورمدا بێن. ئیتر لەناو خەودا شەیاتینی زیانی پێ ناگەیەنن.

فەرمووی: ئیبنو عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) دەستووری وا بوو هەرکام لە منداڵەکانی ڕەسیدە دەبوو ئەم نزایەی فێردەکرد، تا بۆ خۆی لەپێش خەوتندا بیخوێنێ بۆ ئەم مەبەستە، ئەوانەشیان کە هێشتا ڕەسیدە نەبوو بوون ئەم نزایەی لە کاغەزێك دەنووسی و دەیکردە ملیان (د/ت/ن-س/ح).

لە چەشنی ئەو نوشتانەی کە مەلاو مامۆستا ئایینییەکان لەم چەرخەی ئێمەدا دەینووسن بۆ موسوڵمانان. منداڵ بووم، قورئانم خەتم نەکردبوو، نەخۆش کەتم، تەواو بێ ڕەنگ و بێ هێزی کردم، وەك چیلکەی ڕەق و وشکم لێ هات، یەکێ دەیگوت ترساوە، یەکێ دەیگوت گرفتی کردووە.. تاد. ئەو ڕۆژگارە داوو دەرمان و دوکتۆر، یا هەر نەبوو، یا هێشتا نەگەیشتبوونە لای ئێمە، باوکم - لەگەڵ مردووی خوێنە روگوێگردا (ڕەحمەتی خودای لێبێ) لە برایماوەوە بردمی بۆ خزمەتی شێخ مەحموودی حەفید لە داریکەلی (ڕەزای خودای لێبێ) حاڵەکەی عەرزی شێخ کرد، لە یادمە شێخ فەرمووی: ئێمە لەگەڵ جنۆکەکاندا خزمین ناتوانم ئازاریان بدەم، بەڵام دووعایەکی بۆ دەنووسم، وەلێ دەبێ ئەم منداڵە ماوەی دوو حەفتە لەژێر چاودێری خۆمدا بێ، پوورە وەنەوشم (ڕەحمەتی خودای لێبێ) لە داریکەلی بوو، لەلای ئەو مامەوە، شێخ (خودای لێ ڕازی بێ) پوورمی بانگ کرد، هەندێ برنج و هەندێ هەنجیرە زەردەی وشك و هەندێ هەڵووژەرەشەی وشکی دایەو پێی فەرموو: بەیانیان حەوت دەنك لەم هەجیرە لەناو شیردا شل شل بکوڵێنەو دوایی بە پارچەیێ کەتان بیپاڵێوەو بیگوشەو تڵپەکەی فڕێ دەو باشیراوی هەنجیرەکە بخوات و ئیتر تا نیوەڕۆ هیچ نەخوات، نیوەڕۆش شۆربایەکی برنجی ترنگی بۆ بکەو شەش حەوت دەنك لەم هەڵووژە ڕەشەیەی تێکەو کە تەواو تەواو کوڵا بیدەرێ، ئێوارەیش هەروەها، وە نەهێڵی هیچی تر بخوات، شێخ (خودای لێ ڕازی بێ) یەکەم ژەم خۆی

سەرپەرشتی چێشتەکەی کرد، ئەندازەی برنج و شیرەکەی نیشان دەداو جار جار دەیفەرموو: با تۆزێ تریش بکوڵێ، یا خەست ببێتەوە.. تاد. لە سایەی خوداوە بەرە بەرە تەواو چاك بوومەوە. ئەو نووشتەیەی شێخم تا درەنگ مابوو، فاتمەی خوشکم دەڵێ: ئەو نووشتەیە کەوتەلای عائیشەی خوشکم. بەهەر حاڵ خودا بە رەحمەتی خۆی ڕەحم بە حاڵی هەموو لایەکمان بکا. ئامین[1].

وەك خەون ئەم یادگارانەی ئەو حەلەی شێخم لەیادماوە:

١- بەیانیان لەسەر بانیژەیێ نوێژی بەیانی دەکرد، ئیتر لەسەر بەرماڵەکە هەڵنەدەسا، تا نزیکی خۆر کەوتن، هەردەمی دەجووڵاو خەریکی زیکرو ویردو دووعا خوێندن بوو کەسیش لەو ماوەیەدا هەقی نەبوو بەسەریەوەو ئەو حاڵەتە رۆحییەی لێ تێك نەدەدا.

٢- رۆژێ دیم شێخ (خودای لێ رازی بێ) کووڕ بوو بوو، وەك نەخۆش بێ وابوو جبەیەکی کۆنی کورتی مەیلەوسەوزی کاڵەوە بووی لەبەردابوو، وا دەزانم یا شێخ جافربوو، یا مامۆستا مەلا شێخ قادری گڵە زەردەیی بوو، چووتێ کەوشی کۆنی مەیلەوزەردی کەمێ بچکۆلەی پێ بوو، جار جارە بەتاکێ لەو کەوشانە سووك سووك کۆڵنجی شێخی پێ دەکوتا. کە بۆ ئەم دیمەنە سەیرە لە پوورم پرسی، گوتی: ئەوە حەزرەتی شێخ لەشەڕدا گوللەیەکی بەرکەوتووە، گوللەکە هێشتا هەرماوە لە پشتیدا، ناوبەناو دەخزێو شوێنەکەی دێتەوە سوێ، ئیتر شێخ ئەو جبەیە لەبەر دەکاو بەو کەوشە شوێنی گوللەکە دەکوتن بۆی، ئیتر خودا فەرامۆشی دەداو ژانی پشتی دەشکێ، پوورم گوتی: ئەو جبەیەو ئەو کەوشە هی حەزرەت حاجی کاك ئەحمەدی شێخە (قدس الله سره العزيز). (وەرگێڕ)

---

[1] لەکاتی هەڵە بژێری لەم شوێنەدا عائیشەی خوشکم ئەمری خودای کرد، بەر رەحمەتی خودا کەوێ. وەرگێڕ - ١٩٩٧/٥/٣٠

٥١٠٩- وَشَكَا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ (رضي الله عنه) إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَنَامُ اللَّيْلَ مِنَ الأَرَقِ. فَقَالَ: إِذَا أَوَيْتَ إِلَى فِرَاشِكَ فَقُلِ اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظَلَّتْ وَرَبَّ الأَرَضِينَ وَمَا أَقَلَّتْ وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضَلَّتْ كُنْ لِي جَارًا مِنْ شَرِّ خَلْقِكَ كُلِّهِمْ جَمِيعًا أَنْ يَفْرُطَ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَوْ أَنْ يَبْغِيَ عَلَيَّ عَزَّ جَارُكَ وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. رواه الترمذي، والله أعلم[٢]:

**خالیدی کوڕی وەلید** (خودای لێ ڕازی بێ) **هاواری بردە بەر پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەشەو خەوم لێ دەزڕێو لەتاو بێ خەوی ناخەوم! فەرمووی: کاتێ دەچیتە سەر نوێنی نوستنەکەت بڵێ: اللَّهُمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ السَّبْعِ وَمَا أَظَلَّتْ وَرَبَّ الأَرَضِينَ وَمَا أَقَلَّتْ وَرَبَّ الشَّيَاطِينِ وَمَا أَضَلَّتْ كُنْ لِي جَارًا مِنْ شَرِّ خَلْقِكَ كُلِّهِمْ جَمِيعًا أَنْ يَفْرُطَ عَلَيَّ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَوْ أَنْ يَبْغِيَ عَلَيَّ عَزَّ جَارُكَ وَجَلَّ ثَنَاؤُكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ: خودایە! ئەی پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکانو ئەوەی لەسەر پشتیان هەیە! ئەی پەروەردگاری هەموو شەیتانەکانو ئەوانەی کە گومڕایان دەکەن! ئەی خودایە! پەنادەگرم بەتۆ، خۆت پەنام بدە لە شەڕی هەموو دروسکراوانی خۆت سەراپا، پەنام بدە لەوەی کە یەکێ شاڵاوم بۆ بێنێ، یاخود دەسدرێژیم لێبکا، ئەوەی کە لە پەنای تۆدابێ هەمیشە سەری بەرزە، سوپاسو ستایشی تۆ بێ پایانەو زۆر شکۆمەندو گەورەیە، لەتۆ بەولاوە خودای تر نییە، دڵنیام کە هەر خۆت خودای راستو دروستیت (ت).**

## ٨٣) نزای قەرزدانەوە : (دعاء قضاء الدين)

٥١١٠- عَنْ عَلِيٍّ (رضي الله عنه) أَنَّ مُكَاتَبًا جَاءَهُ فَقَالَ: إِنِّي قَدْ عَجَزْتُ عَنْ كِتَابَتِي فَأَعِنِّي. قَالَ: أَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ عَلَّمَنِيهِنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَوْ كَانَ عَلَيْكَ مِثْلُ جَبَلِ صِيرٍ دَيْنًا أَدَّاهُ اللَّهُ عَنْكَ، قُلِ: اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلاَلِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ. رواه الترمذي[١]:

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[١] بسند حسن (شرحه).

بەندەیەکی کاغەز پێ دراو (موکاتەب) هاتە خزمەتی عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) گوتی: تەوانام نییە کەسەر قەبڵانەکەم بدەم (واتە: ناتوانم قیستەکەی سەرم لەکاتی خۆیدا بدەم) کەواتە بار بوویەکم بۆ ئەوە بدەرێ عەلیش (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: هۆشیاربە، با ئەم چەند وشەیەت فێربکەم، کە کاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فێری خۆمی کردوون، ئەگەر گریمان بەقەد چیای ثەبریش قەرزت لەسەربێ، خودا بۆتی دەداتەوە، بڵێ: اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ: خودایە! بە حەڵاڵی خۆت بێ نیازم بکە لە حەرامی خۆت، هەروەها لە سایەی خۆشتەوە داماوی دەستی کەسی ترم مەکە! (ت-س/ح).

٥١١١- وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ ذَاتَ يَوْمٍ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ أَبُو أُمَامَةَ فَقَالَ: يَا أَبَا أُمَامَةَ مَا لِي أَرَاكَ جَالِسًا فِي الْمَسْجِدِ فِي غَيْرِ وَقْتِ الصَّلاَةِ. قَالَ: هُمُومٌ لَزِمَتْنِي وَدُيُونٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: أَفَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلاَمًا إِذَا أَنْتَ قُلْتَهُ أَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَمَّكَ وَقَضَى عَنْكَ دَيْنَكَ. قَالَ: قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: قُلْ إِذَا أَصْبَحْتَ وَإِذَا أَمْسَيْتَ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجَالِ. قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ فَأَذْهَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَمِّي وَقَضَى عَنِّي دَيْنِي. رواه أبو داود. نسأل العفو والعافية. آمين[٢]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ڕۆژێ حەزرەت (صەڵات و سەلامی خودای لێبێ) دەچێ بۆ مزگەوت، دەڕوانێ وا پیاوێ لە مزگەوتە، لە یاریدەدەرانە، ناوی ئەبو ئومامەیە، دەفەرموێ: ئەی ئەبو ئومامە! خێرەکە وا لەم دەمەدا دەتبینم لە مزگەوتا دانیشتووی، ئێستا کاتی نوێژ نییە دیارە کارێکی ترت هەیە؟. دەڵێ قوربان؟ بووم بەژێر خەم و خەفەتەوە بەهۆی کەڵەکە بوونی قەرزارییەوە. دەفەرموێ: دە هۆشیاربە با گوتارێکت فێر بکەم کە گوتت خودا هەم خەم و خەفەتەکەت دەڕەوێنێتەوە، هەم قەرزەکەشت بۆ

[٢] سكت عن درجته الشارح.

دەداتەوە. ئەبو ئومامە گوتی: گوتم: فەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! دڵم لە لاتە، فەرمووی: بەیانیان و ئێواران بڵێ: اللهمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْهَمِّ وَالْحَزَنِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ الْجُبْنِ وَالْبُخْلِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ غَلَبَةِ الدَّيْنِ وَقَهْرِ الرِّجَالِ: ئەبو ئومامە فەرمووی: ئیتر منیش وەهام کرد، خودایش هەم خەمەکەی ڕەواندمەوە، هەم قەرزەکەی سەرمی بۆ جێبەجێ کردم. (د).

## ٨٤) نزای کاتی دیتنی گرفتاریی بە دەردێ : (الدعاء لرؤية المبتلى)

٥١١٢- عَنْ أَبِي هُرَيرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ رَأَى صَاحِبَ بَلَاءٍ فَقَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً إِلاَّ عُوفِيَ مِنْ ذَلِكَ الْبَلَاءِ. رواه الترمذي بسند غريب. نسأل الله السلامة والتوفيق[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ کاتێ گیرۆدەیێ دەبینێ بڵێ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە منی ڕزگارکردووە لەم دەردەی کە تۆی پێ دووچار کردووە، لەزۆر لاوە ئەو خودا گەورەیە بەهرەی زۆری ڕژاندووە بەسەر مندا، کە ئەو بەهرانەی بە گەلێ کەسی تر لە دروسکراوانی خۆی نەداوە!. کاتێ کەسێ گیرۆدەیێ دەبینێ، لەژێر لێوەوە یا بەدزی ئەو گیرۆدەیەوە ئەم نزا پیرۆزە بخوێنێ ئیتر لە ماوەی ژیانیدا دووچاری ئەو دەردە نابێ! (ت-س/غەریب).

## ٨٥) نزای نەخۆش : (دعاء المرض)

٥١١٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. صَدَّقَهُ رَبُّهُ فَقَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَأَنَا أَكْبَرُ.

---

[1] سنده غريب.

وَإِذَا قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ. قَالَ يَقُولُ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَأَنَا وَحْدِى. وَإِذَا قَالَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ. قَالَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَحْدِى لاَ شَرِيكَ لِى. وَإِذَا قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ. قَالَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا لِىَ الْمُلْكُ وَلِىَ الْحَمْدُ. وَإِذَا قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. قَالَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِى. وَكَانَ يَقُولُ مَنْ قَالَهَا فِى مَرَضِهِ ثُمَّ مَاتَ لَمْ تَطْعَمْهُ النَّارُ. رواه الترمذي بسند حسن[1]:

**ئەبو سەعیدو ئەبو هورەیەر (ڕەزای خودایان لێبێ) گوتیان: شایەتی دەدەین کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بڵێ: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ: خودای پەروەردگار بۆی مۆر دەکاو دەفەرموێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَأَنَا أَكْبَرُ: ڕاستە، لەمن زیاتر خودای تر نییە، وە من لە هەموو کەسێ گەورەترم کاتێ دەڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ: خودا بۆی مۆردەکاو دەفەرموێ: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ أَنَـا وَحْدِى: کاتێ دەڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ: خودایش دەفەرموێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَحْدِى لاَ شَرِيكَ لِى: ڕاستە، من خودای تاكو تەنیامو هاوەڵم بۆ نییە. کاتێ دەڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ: خودایش دەفەرموێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا لِىَ الْمُلْكُ وَلِىَ الْحَمْدُ: ڕاستە، خودای تر نییە، بێجگە لەمن، سامانو دارایی و پاشایی و سوپاسو ستایش لە ڕاستیدا هەرهی منەو بەس. کاتێ دەڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ: خودایش دەفەرموێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنَا وَلاَ حَـوْلَ وَلاَ قُـوَّةَ إِلاَّ بِـى: ڕاستە، لەخۆم بەولاوە خودای ترنیە هێزو توانایی بەس بەدەستی خۆمە. حەزرەت (صەلاتو سەلامی خودای لێبێ) فەرمووی: هەر کەسێ کاتێ نەخۆش دەکەوێ ئەمە بخوێنێ ئەگەر لەو نەخۆشینەیدا بمرێ ئاگر چەشکەی ناکا! (ت-س/ح).**

## ٨٦) یادو ذیکری کاتی چوونە بازاڕ : (الذكر عند دخول السوق)

٥١١٤- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِىِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِى وَيُمِيتُ وَهُوَ حَـىٌّ لاَ

[1] حسن عند الترمذي.

يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ. وَفي رواية: بَدَلَ (وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ. وَبَنَى لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ). رواه الترمذي. نسأل الله الجنة ونعوذ به من النار آمين[1]:

**عومەر** (ڕەزای خودای گەورەی لێبێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لەسەربێ) **فەرمووی: كەسێ كە دەچێتە بازاڕ بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: خودا هەزار هەزا چاكەی بۆ دەنووسێ و هەزار هەزار خراپەی بۆ دەسڕێتەوەو هەزار هەزار پلەو پایەی بەرزەوە دەكا! لە گێڕانەوەیەكدا لە جیاتی: هەزار هەزار پلەو پایەی بەرزەوە دەكات، ئەمەیە: تەلارێكی لە بەهەشتا بۆ دروست دەكا (بۆ خودا چی تێ دەچێ - وەرگێڕ). (ت-س/غريب).**

## ٨٧) نزای كاتی شت لەبەركردن (دووعای حیفظ) : (دعاء الحفظ)

**٥١١٥-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ جَاءَهُ عَلِيٌّ فَقَالَ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يا رَسُلَ الله تَفَلَّتَ هَذَا الْقُرْآنُ مِنْ صَدْرِي فَمَا أَجِدُنِي أَقْدِرُ عَلَيْهِ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا أَبَا الْحَسَنِ أَفَلاَ أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللَّهُ بِهِنَّ وَيَنْفَعُ بِهِنَّ مَنْ عَلَّمْتَهُ وَيُثَبِّتُ مَا تَعَلَّمْتَ فِي صَدْرِكَ. قَالَ: أَجَلْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَعَلِّمْنِي. قَالَ: إِذَا كَانَ لَيْلَةُ الْجُمُعَةِ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تَقُومَ فِي ثُلُثِ اللَّيْلِ الآخِرِ فَإِنَّهَا سَاعَةٌ مَشْهُودَةٌ وَالدُّعَاءُ فِيهَا مُسْتَجَابٌ وَقَدْ قَالَ أَخِي يَعْقُوبُ لِبَنِيهِ (سَوْفَ أَسْتَغْفِرُ لَكُمْ رَبِّي) يَقُولُ حَتَّى تَأْتِيَ لَيْلَةُ الْجُمُعَةِ فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقُمْ فِي وَسَطِهَا فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقُمْ فِي أَوَّلِهَا فَصَلِّ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةِ يس وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَ(حم) الدُّخَانَ وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّالِثَةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَالم تَنْزِيلُ السَّجْدَةَ وَفِي الرَّكْعَةِ الرَّابِعَةِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَتَبَارَكَ الْمُفَصَّلَ فَإِذَا

---

[1] بسند غريب.

فَرَغْتَ مِنَ التَّشَهُّدِ فَاحْمَدِ اللَّهَ وَأَحْسِنِ الثَّنَاءَ عَلَى اللَّهِ وَصَلِّ عَلَيَّ وَأَحْسِنْ وَعَلَى سَائِرِ النَّبِيِّينَ وَاسْتَغْفِرْ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَلإِخْوَانِكَ الَّذِينَ سَبَقُوكَ بِالإِيمَانِ ثُمَّ قُلْ فِي آخِرِ ذَلِكَ اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي بِتَرْكِ الْمَعَاصِي أَبَدًا مَا أَبْقَيْتَنِي وَارْحَمْنِي أَنْ أَتَكَلَّفَ مَا لاَ يَعْنِينِي وَارْزُقْنِي حُسْنَ النَّظَرِ فِيمَا يُرْضِيكَ عَنِّي اللَّهُمَّ بَدِيعَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ وَالْعِزَّةِ الَّتِي لاَ تُرَامُ أَسْأَلُكَ يَا اللَّهُ يَا رَحْمَنُ بِجَلاَلِكَ وَنُورِ وَجْهِكَ أَنْ تُلْزِمَ قَلْبِي حِفْظَ كِتَابِكَ كَمَا عَلَّمْتَنِي وَارْزُقْنِي أَنْ أَتْلُوَهُ عَلَى النَّحْوِ الَّذِي يُرْضِيكَ عَنِّي اللَّهُمَّ بَدِيعَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ وَالْعِزَّةِ الَّتِي لاَ تُرَامُ أَسْأَلُكَ يَا اللَّهُ يَا رَحْمَنُ بِجَلاَلِكَ وَنُورِ وَجْهِكَ أَنْ تُنَوِّرَ بِكِتَابِكَ بَصَرِي وَأَنْ تُطْلِقَ بِهِ لِسَانِي وَأَنْ تُفَرِّجَ بِهِ عَنْ قَلْبِي وَأَنْ تَشْرَحَ بِهِ صَدْرِي وَأَنْ تَغْسِلَ بِهِ بَدَنِي لأَنَّهُ لاَ يُعِينُنِي عَلَى الْحَقِّ غَيْرُكَ وَلاَ يُؤْتِيهِ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ الْعَلِيِّ الْعَظِيمِ يَا أَبَا الْحَسَنِ تَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاَثَ جُمَعٍ أَوْ خَمْسَ أَوْ سَبْعَ تُجَابُ بِإِذْنِ اللَّهِ وَالَّذِي بَعَثَنِي بِالْحَقِّ مَا أَخْطَأَ مُؤْمِنًا قَطُّ. قَالَ ابْنُ عَبَّاس (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): فَوَاللَّهِ مَا لَبِثَ عَلِيٌّ إِلاَّ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا حَتَّى جَاءَ عَلِيٌّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مِثْلِ ذَلِكَ الْمَجْلِسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي كُنْتُ فِيمَا خَلاَ لاَ آخُذُ إِلاَّ أَرْبَعَ آيَاتٍ أَوْ نَحْوَهُنَّ وَإِذَا قَرَأْتُهُنَّ عَلَى نَفْسِي تَفَلَّتْنَ وَأَنَا أَتَعَلَّمُ الْيَوْمَ أَرْبَعِينَ آيَةً أَوْ نَحْوَهَا وَإِذَا قَرَأْتُهَا عَلَى نَفْسِي فَكَأَنَّمَا كِتَابُ اللَّهِ بَيْنَ عَيْنَيَّ وَلَقَدْ كُنْتُ أَسْمَعُ الْحَدِيثَ فَإِذَا رَدَّدْتُهُ تَفَلَّتَ وَأَنَا الْيَوْمَ أَسْمَعُ الأَحَادِيثَ فَإِذَا تَحَدَّثْتُ بِهَا لَمْ أَخْرِمْ مِنْهَا حَرْفًا. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ ذَلِكَ: مُؤْمِنٌ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ يَا أَبَا الْحَسَنِ. رواه الترمذي[1]:

**ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) بووین، لەوەدەمەدا عەلی (خودای لێ رازی بێ) هات بۆ خزمەتی، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوكو دایكم بەقوربانت بن، ئەم قورئانە لە سینگما بەندنابێو بۆم زەوت ناكرێ، دەی بفەرموو: چارێكم بفەرموو: پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی باوكی حەسەن!**

---

[1] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

دەی دڵت لەلام بێ با چەن وشەیەکت فێر بکەم، خودا ئەو وشانە دەکا بەمایەی سوودو قازانج هەم بۆ تۆو هەم بۆ ئەو کەسانەیش کە لە تۆوە فێریان دەبن، هەروەها فێری هەرچیش ببی بە پاشی چەسپی دەکا لەناو دڵتا. عەلی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئادەی بفەرموو فێرم بکە ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: کەبوو بە شەوی هەینی، ئەگەر دەتوانی لە سێیەکی دوایی شەودا هەڵسە بۆ شەو نوێژ، چونکە ئەم وەختە هەر عیبادەتێکی تیادا بکرێ فریشتە دێنە دیاری تەماشای دەکەن، وە نزاو پاڕانەوەی تیادا گیرایە، ئەوەیش کە یەعقووب پێغەمبەری برام کاتێ شادبوونەوە بە یوسفی کوڕی، کوڕەکانی تری کە کاتی خۆی بوو بوون بەهۆی دەربەدەر بونی یووسف، داوایان لێی کرد کە داوای لێبووردنیان لەخودا بۆ بکا، ئەویش فەرمووی: سوف أستغفر لکم: خودا حەزکا بەم زوانە لەخودای تاوانبەخش و میهەبانی خۆم داوای لێخرشبوونتان بۆ دەکەم.

وە مەبەستی یەعقووب لەم دواخستنی دووعایە ئەوە بووە کە چاوەنواڕی بکا هەتا شەوی هەینی دێ، تا لەو شەوە پیرۆزەدا داوای لێبووردنیان بۆ بکا، ئەی عەلی! ئەگەر لەو کاتەشدا ناتوانی نیوەشەوی هەینی هەڵسە، ئەگەر هەر نەت توانی لەسەرەتای شەوی جومعەوە هەڵسەو چوار رکات نوێژی سوننەتی حیفظو زەینرۆشنی لەسەر ئەم شێوەیە بکە: لە رکاتی یەکەمدا سوورەتی فاتیحا و سوورەتی یاسین دەخوێنێت و، لە رکاتی دووەمدا سوورەتی فاتیحاو سوورەتی حامیمی دوخان دەخوێنێت و، لە رکاتی سێیەمدا سوورەتی فاتیحاو سوورەتی (الم تنزيل السجده) دەخوێنێت و، لە رکاتی چوارەمدا سوورەتی فاتیحاو سوورەتی (تبارك الذي بيده الملك) دەخوێنێت، کە ئەم سوورەتە لەناو قورئاندا، وا لەناو سوورەتەکانی بەشی موفەصصەلدا، جا کاتێ لە تەحیاتی دوایی لێ بوویتەوە لەپێش سڵاودانەوەدا، یا لەپاش سڵاودانەوە سوپاس و ستایشی خودا زۆر بەجوانی بکەو بەجوانی صەڵاوات لەسەرمن بدەو هەوەها سەڵەوات لەسەر پێغەمبەرەکانی تریش بدە، ئەوجا بۆ هەموو موسوڵمانان بپاڕێرەوە، بە پیاوو

ژنیانەوە، هەروا بۆ ئەو برایانەیشت کە لەپێش تۆدا لەسەر ئیمان مردوون بپاڕێرەوەو ئەوجا ئەم دووعایە بخوێنە لەسەر ئەم شێوەیە:

الحمد لله رب العالمين، الحمد لله الذى خلق السموات والأرض وجعل الظلمات والنور، الحمد لله الذى أنزل على عبده الكتاب، سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر، ولا حول ولا قوة الا بالله العلى العظيم، سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم اللهم صل وسلم وبارك على سيدنا محمد وعلى آله، عدد كمال الله وكما يليق بكماله، اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على ابراهيم وآل أبراهيم، وبارك على محمد وآل محمد كما باركت على ابراهيم وآل ابراهيم إنك حميد مجيد، اللهم وبارك على سيدنا محمد وعلى سائر اخوانه النبيين والمرسلين عدد خلقك ورضا نفسك وزنة عرشك ومداد كلماتك ما دام ملك الله تعالى، ربنا اغفر لنا ولاخواننا الذين سبقونا بالإيمان ولا تجعل في قلوبنا غلا للذين آمنوا ربنا أنك رؤف رحيم، اللهم أرحمنى بترك المعاصى. هەتا: (بالله العلى العظيم).

ئەی باوکی حەسەن! سێ شەوی هەینی، یا پێنج شەوی هەینی، یا حەوت شەوی هەینی ئەم نوێژو نزایە ئاوا بکە، ئیتر بەفارمانی خودا نیازت گیرا دەبێ و خودا مرازت دەدا، بەو کەسەی کە منی کردووە بە پێغەمبەری خۆی و لەگەڵ ئایینی راست و دروستی خۆیدا رەوانەی کردووم بۆ سەر مرۆڤ و پەری، ئەم نزایە بۆ موسوڵمانی راست هەرگیز هەڵەی نییە، بەمەرجێ بە جۆش و بەکوڵ و بەسۆزی دڵ بێ.

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) دەیفەرموو: جا بەخودا، یا لە پاش پێنج هەینی یا حەوت هەینی عەلی هاتەوە بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ هەمان شوێن و کۆڕو مەجلیس، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەمەوپێش یا چوار ئایەت یا دەوری چوار ئایەتم لەبەر دەکرد، کە لەوەدوا دەورم دەکردنەوە لەبەرم نەمابوون، بەلام ئێستا هەرکاتێ بمەوێ دەوری چل ئایەت لەبەردەکەم، لەوەدوا کە دەوری دەکەمەوە دەڵێی قورئانەکە وا لەبەر چاوم و لەناو قورئاندا دەیان خوێنم، جاران کە فەرموودەکەم دەبیست و لەبەرم

دەکرد، لەوە دوا کە دەمویست دەوری بکەمەوە سەیرم دەکرد لەبەر نەماوە، وەلێ ئێستا چەن فەرموودەیەیێ دەبیستم و گشتیان لەبەر دەکەم، لەپاشا هەرکاتێ بمەوێ بیانگێڕمەوە دەوریان دەکەمەوە بە تەواوی، یەك پیتیان لێ نابوێرم!

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عەلی! ئەی ئەبولحەسەن! ئەی باوکی حەسە! بەخودای کەعبە، کە یەزدانی پاکە، دەرکەوت کە تۆ موسوڵمانیت! (ت-س/ح).

## ٨٨) صەڵاواتدان لە دیاری پێغەمبەر (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) الصلاة على النبي (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {إِنَّ اللّٰهَ وَمَلَائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى النَّبِيِّ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا - سورة الأحزاب - ٥٦/٣٣}.

← راڤەی ئەم ئایەتە لەم شوێنەدا رابورد: بەرگی حەوتەم، لاپەڕە/١٠٠، چاپی یەکەم.

٥١١٦- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيُّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُمْ قَالُوا يَا رَسُولَ اللّٰهِ كَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا: اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. رواه الثلاثة[1]:

ئەبو حومەیدی ساعیدی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! چۆن صەڵاوات لە دیاری تۆ بدەین! فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بڵێن: اللّٰهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ

[1] تجريد/٤ ل/٤١ رقم/١٣٥٣ = ٣٣٦٥، ٦٣٦٠ فتح الباري. مسلم. صلاة: ٩١٠. أبوداود. صلاة: ٩٧٩. ابن ماجه. إقامة الصلاة:٩٠٥. تحفة: ١١٨٩٩.

إِبْرَاهِيمَ ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَأَزْوَاجِهِ وَذُرِّيَّتِهِ ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. (ش/د).

٥١١٧ ← (ب – ١ ز – ٧٢ ل – ٢٥٣ ف – ١٣)[٢].

٥١١٨– ← (ب – ٧ ز – ١٦ ل – ١٠٠ ف – ١٨)[٣].

٥١١٩– ← (ب – ٧ ز – ١٦ ل – ١٠٠ ف – ١٨)[٤].

٥١٢٠– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ هَذَا السَّلامُ عَلَيْكَ، فَكَيْفَ نُصَلِّي عَلَيْكَ؟ قَالَ: قُولُوا اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ. رواه البخاري[٥]:

**ئەبو سەعید** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: گوتمان: قوربان! سەلامکردن لە تۆ ئەمەیە کە لەتەحیاتا فێرت کردووین، ئەی چۆن صەلاواتت لەسەر بدەین؟ فەرمووی: بڵێن:** اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ: (ب).

٥١٢١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَكْتَالَ بِالْمِكْيَالِ الأَوْفَى إِذَا صَلَّى عَلَيْنَا أَهْلَ الْبَيْتِ فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ وَأَزْوَاجِهِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ وَذُرِّيَّتِهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ. رواه أبو داود والنسائي[٦]:

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ** (دروودی خودای لەسەربێ)**: هەر کەسێ حەزدەکا بە ئەیارەی قەڵا پەچن خێر بۆ خۆی بپێوێ با**

---

[٢] تقدم في مجلد أول تسلسل/٧٢ رقم/٤٨١.

[٣] تقدم في مجلد سابع تسلسل/١٦ = ٤٠٥٣ = مجلد أول تسلسل/٤٨ رقم/٤٨٨.

[٤] تقدم في مجلد سابع تسلسل/١٦ ل/١٠٠ رقم/٤٠٥٣.

[٥] تجريد/٤ ل/٤٧٩ رقم/١٦٨٥ = ٤٧٩٨، ٦٣٥٨.

[٦] بسند صحيح (شرحه).

کاتێ صەلاوات لەسەر ئێمە دەدا – کە ئەهلی بەیتی نوبو وەتین – با ئاوا بڵێ: للّٰهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ النَّبِيِّ وَأَزْوَاجِهِ أُمَّهَاتِ الْمُؤْمِنِينَ وَذُرِّيَّتِهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ: خوداگیان! خێرو بێرو میهرەبانی و رەحمەتی خۆت پەیتا پەیتا بڕژێنە بەسەر موحەممەدا، کە پێغەمبەری تۆیە، بەسەر خۆی و هاوسەرەکانیدا، کە دایکانی موسوڵمانانن، هەروا بەسەر وەچەو نەوەیدا هەروا بەسەر کسوکاریدا دەق وەك ئەو خێرو رەحمەتەی کە رژاندووتە بەسەر ئیبراهیم و کەس و کارو بنەماڵەو خانەوادەی ئیبراهیمدا، دڵنیام ئەی پەروەردگاری نازدارم! شایستەی هەموو ستایش و سوپاسێکیت و خودایەکی گەلێ گەورەو پیرۆزیت (د/ن-/س/ص).

٥١٢٢- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٧].

دیسان ئەو لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ) هەر کەسێ یەك صەلاوات لەسەر من بدا خودا دە صەلاوات لەسەر ئەو دەدا. (م/د/ت).

٥١٢٣- عَنْ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْبَخِيلُ الَّذِى مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ[٨].

ئیمامی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی (رەزای خودا لەخۆی و باوکی) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رەزیل و بەخیل ئەو کەسەیە کە ناوی من دەبرێ لەلای کەچی صەلاواتم لەسەر نادات (ت-س/ص).

٥١٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ دَخَلَ عَلَيْهِ رَمَضَانُ ثُمَّ انْسَلَخَ قَبْلَ أَنْ يُغْفَرَ لَهُ وَرَغِمَ أَنْفُ رَجُلٍ أَدْرَكَ عِنْدَهُ أَبَوَاهُ الْكِبَرَ فَلَمْ يُدْخِلاَهُ الْجَنَّةَ[٩].

---

[٧] مسلم. صلاة: ٩١١. أبوداود. صلاة: ١٥٣٠. ترمذي. صلاة:٤٨٥. نسائي. سهو: ١٢٩٥. تحفة الأشراف: ١٣٩٧٤.

[٨] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لووتی ئەو پیاوە بە قوڕدا چێ و لووتی بتەوسێتەوە کە من باسدەکرێم لەکنی و صەڵاواتم لەسەرنادا، یا کە رەمەزان دێ ئەوەندە گوێی پێ ناداو ئەوەندە کاری باش ناکا هەتا لە پێش تەواو بوونی رەمەزاندا خودا لێی خۆش بێ، یا باوك و دایکی، یا یەکێکیان بەپیری دەکەونە لای و ئەوەندە بەدڵ و بەگیان خزمەتیان ناکات کە ببن بە مایەی رەحمەت بۆی و بەهۆی خزمەتی ئەوانەوە خودا بیباتە ناو بەهەشت! (ت-س/ح).

٥١٢٥- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا ذَهَبَ ثُلُثَا اللَّيْلِ قَامَ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ اذْكُرُوا اللَّهَ اذْكُرُوا اللَّهَ جَاءَتِ الرَّاجِفَةُ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ جَاءَ الْمَوْتُ بِمَا فِيهِ جَاءَ الْمَوْتُ بِمَا فِيهِ جَاءَ الْمَوْتِ بِمَا فِيهِ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُكْثِرُ الصَّلاَةَ عَلَيْكَ فَكَمْ أَجْعَلُ لَكَ مِنْ صَلاَتِي قَالَ: مَا شِئْتَ. قُلْتُ: الرُّبُعَ. قَالَ: مَا شِئْتَ فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قُلْتُ: النِّصْفَ قَالَ: مَا شِئْتَ فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قُلْتُ: فَالثُّلُثَيْنِ. قَالَ: مَا شِئْتَ فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ. قُلْتُ: أَجْعَلُ لَكَ صَلاَتِي كُلَّهَا. قَالَ: إِذًا تُكْفَى هَمَّكَ وَيُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ. روى هذه الثلاثة الترمذي[10].

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەحاڵی ژیانیدا عادەتی وابوو، کاتێ دوو سێیەکی شەو دەڕۆیشت گەلێ جار هەڵ دەساو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! ئەی ئادەمیزادینە! هەستن زیکرو یادی خودا بکەن، هەستن زیکرو یادی خودا بکەن، ئای واهات نەفخەی یەکەم، واهات ئەو دەمەی کە ئیسرافیل فوو دەکا بە کەڕەناکەداو جیهان سەرتاپا دێنێتە لەرزەو تەکان و جم و جووڵ و وەك بێشکەی شەق و شڕ رایدەوەشێنێ، وا هات بە شوێنیدا نەفخەی دووەم کە هەموو مردوویێ پێی زیندوو دەبێتەوەو ئاسمان بەخۆی و مانگ و ئەستێرەیەوە گشتیان وەك زەوی دەکەونە جووڵە جووڵ و هەموو بەردەبنەوەو دەکەونە خوارەوە، ئەی خەڵکە! واهات مردن بەخۆی و کێشمە کێشیەوە! گوتم: قوربان! من صەڵاوات زۆر دەدەم لە دیداری تۆ، کاتێ دەستم

[9] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[10] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

کرد بە تاعەتو شەونوێژ چەندێ لەوکاتی خۆمە دابنێم بۆ صەڵاوات دان لەسەر تۆ؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە، لەوا کاتی تایبەتی خۆتدا، کە داتناوە بۆ تاعەت چەندە خۆت ئارەزوو دەکەی ئەوەندەی لێ تەرخان بکە بۆ درووود دان لە دیداری من. گوتم: کەواتە چواریەکی وەختە تایبەتییەکەم صەڵاوات لەسەر تۆ دەدەم، فەرمووی: (دروودو صەڵاتو سەلامو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێو، سەرو ماڵو رۆحو هەستو نەست گشتی بەقوربانی گەردی گۆڕی پیرۆزی بێ) ئارەزووی خۆتە، حەزدەکەی زیاتر بکە، ئەوە خێری پترە بۆ تۆ گوتم: دە نیوەی؟ فەرمووی: مەیلی خۆتە، حەز دەکەی زیاتری بکە، ئەوە بۆ تۆ باشترە، گوتم: دە دوو سێیەکی؟ فەرمووی (درورودی خودای لەسەربێ): ئارەزووی خۆتە، حەزدەکەی زیاتری بکە، ئەوە چاکترە بۆ تۆ گوتم: دەکاتی تاعەتکردنەکەم هەمووی تەرخان دەکەم بۆ صەڵاوات دان لەسەر تۆ، فەرمووی (درورودی خودای لەسەربێ): کەوابێ خەمی هیچت نەبێ، هەموو مرازێکی دنیات دێتەدیو خودا لە هەموو گوناهەکانیشت خۆش دەبێو صەڵاواتو دورورودی زۆر لەسەر پێغەمبەری خودا دەبێ بەمایەی خێرو خۆشی هەردوو جیهان. (ت–س/ص) بۆ تێگەیشتنی تەواو لە نەفخەتین سەیری ئەم شوێنە بکە: ☚ (ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٥ ف – ٨ + ٩ + ١٠).

٥١٢٦.م– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَوْلَى النَّاسِ بِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَكْثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلاَةً. رواه الترمذي وابن حبان بسند صحيح. وسبق بضع أحاديث فيها في باب صلاة الجمة[1].

عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێبێ) لە خۆشەویستەوە (درورودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە رۆژی قیامەتدا لە پێشترین کەس بەمن ئەو کەسانەن کە درووودو صەڵاوات زۆرتر لەسەر من دەدەن! (ت/ئیبنو حەببان – س/ص).

☚ (ب – ز – ١٥١ ل – ٤٤٠ ف – ١ + ٢ + ٣) + (ب – ٣ ز – ١٤٤ ل – ٢٩٣ ف – ١ + ٢ + ٣ + ٤).

---

[1] بسند صحيح.

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

چۆن جومعە حەجی کەلی هەژارە
جەژنێکی گشتی گش بڕوا دارە،،
زیکریش قورئانی نەخوێندەوارە
بۆ خوێندەواریش شەوقی روخسارە
بیکە بە پیشەت زیکرو صەڵاوات
قەسەم بەخودا دەکەی بە ئاوات!
بەڵام بزانە ئەی هاوڕێی خەبات!
خۆشکی هاودینم! برای هاو وڵات!
گەر دڵ لەگەڵ دەم هاوکاری نەکات
زیکری دەمی رووت هیچ دادێ نادات!
راستە زیکری خوا هۆراکی گیانە
چرای رۆشنی هەردوو ژیانە
بۆ نەخۆشەکەی چەشنی ریحانە
شەو چەرەی کۆڕی خودا ناسانە
گوڵاوی لێوو دەمو زمانە
بۆ ئۆمی وێنەی دەوری قورئانە
راستە لەناستی جوانی ناوی خوا
فێڵو فەرەجی شەیتان باوی کوا؟
راستە ئیمانو حەجو تەوبەی جوان
خەرمانی کۆنی تاوانی رووخان!!
راستە ئیستیغفار لەگەڵ صەڵاوات

وەک دووعاو نزا مرازت دەدات

راستە شەفاعەت لە بۆ موسوڵمان

دەبێ بەمایەی بەخشینی تاوان!

ئەمانە هەمووراستو ڕەوانن

جێگەی باوەڕن، نەوەک گومانن

بەڵام بزانە برای ئازیزم!

دادەی موسوڵمان! خوشکی بەڕێزم!

مەبەست لەم باسە تەنیا ئەم ڕشتە

ئیمان کلیلی دەرگای بەهەشتە

واتە: بۆ بەندە دەروویی ڕەحمەت

گەلێ زۆرترە لە دەرەی زەحمەت

نەوەک بەتەمای تەوبەو شەفاعەت

تاوان تێکوشین، دووربین لە تاعەت

دەق وێنەی کێلێ ماری ئەو دەشتە

بکاتە کۆشی بەپشتی نووشتە!

مەبەست ئەمە بوو کە عەرزتکرا

بەبێ زیادو کەم ئەی کاکە برا!!

دەنا ڕووزەردیو سەر شۆڕی مەحشەر

قەڵا پەچن بێ لە تاوان دەفتەر

نقەنق بکەین لەژێر باری شەڕ

وەک کەرێ چەقیو لەناو هەڕکی تەڕ!

لەلایێ بزنی دوێتی بە کۆڵ

ڕوو لەسەری بێ ساجێ تۆزو خۆڵ
لەلایی نالآی غەدرو زوڵمو زۆر
بۆت هەڵکرابێو پیاتابنێ مۆر!!
لەلایێ ناوی بەدی سەر زەمین
لەلایێ کۆری چاڵی ناگرین!
سەرپرای ڕووزەدریو چاوشۆڕیی خۆمان
پیاو چاکانیشمان خەم بخۆن بۆمان
باشا دەکامیش لەوێ بوەستێ
کەشەیتان بەفێڵ دەستت دەبەستێ
نا ئەوە لەکوێو نا ئەمە لە کوێ
کاری چاکەی خۆت چەتری سەرت بێ
نووری قورئانیش زریەی بەرت بێ
سایەی عەرشی خوا بە سێبەرت بێ!
فریشتەی خودا تۆ پێشوازی کا
هەم خودا ڕازیو هەم تۆ ڕازی کا
کەرچی هەرچی هات لەلای خوداوە
خەڵاتی خوایە جێکەی سەرچاوە
بەڵام دانایان وایان داناوە
خوشی لەو کەسەی خوا ناسی ناوە[1]

---

[1] خواناس: کەسێکە خوا باش بناسێو لە فەرمانی دەرنەچێ (فەرهەنگی خاڵ – خودا لە شێخی خاڵی خاوەنی خۆش بێ). مەبەست لەم ڕوونکردنەوەی فەرهەنگییە ئەوەیە کە بەرە بەرە خوێنەری کتێبی کوردی واز لە زاراوەی ناوچەیی خۆی بێنێو سەر بۆ مەبەستی وشەی فەرهەنگی دابنەوێنێ.

## ٨٩) باسی پێنجەم: باسی پاڕانەوەو پەشیمانی واتە: ئیستغفارو تەوبە
## الباب الخامس: في الإستغفار والتوبة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا، يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِدْرَارًا – سورة نوح – ٧١/ ١٠ – ١٢}.

واتە: نووح پێغەمبەر (سلاوی خودای لێبێ) فەرمووی: پاش ئەم هەموو تەمێ و ئامۆژگاریی و بانگەوازە پێشیانم گوت: لە خودای خۆتان بپاڕێنەوەو داوای لێبوردن و تاوانبەخشیی لێ بکەن، چونکە بەراستی خودا خودایەکی تاوانبەخش و گوناهپۆشە، دەی ئەگەر ئێوە وا بکەن و فەرمانبەرداریی خودا بکەن خودا سەرەڕای ئەوە کە لێتان خۆش دەبێ دەرگای ڕەحمەت و پیت و فەڕتان لە هەموو لایەکەوە بۆ دەکاتەوەو ڕێژنەی بارانتان لە ئاسمانەوە بۆ دەنێرێ و، ماڵ و داراییی و نەوەو وەچەو منداڵتان پێ دەبەخشێ و، گەلێ باخ و بۆلاخی خۆش و باشتان پێ دەداو، گەلێ کارێزو کانیاو چۆم و جۆباری جۆراو جۆرتان بۆ دەردەکاو دەیانکا بە مایەی ئاسایشی ژیانتان و هۆی ئارایشی جیهانتان!

٥١٢٧.م– عَنْ شَدَّادُ بْنُ أَوْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَيِّدُ الاِسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّى ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي ، فَاغْفِرْ لِي ، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ. قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِنًا بِهَا ، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا ، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ.رواه الخمسة الا مسلما[1]:

شەددادی کوڕی ئەوس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئاغای لالانەوەو پاڕانەوەی هەرە گەورە ئەوەیە کە بڵێیت: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّى ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا

---

[1] تجريد/٥ ل/٢٣٩ رقم/١٩٧٦ = ٦٣٠٦، ٦٣٢٣.

استَطَعْتُ ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ بِذَنْبِي ، اغْفِرْ لِي ، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ: خوداوەند! هەر تۆ پەروەردگاری منیت، لەتۆ زیاتر خودای تر نییە، من بەندەو عەبدی تۆم، تۆ منت دروستکردووە لە نەبوون، تابتوانم پەیمان و بەڵێنی تۆ ناشکێنم، پەنادەگرم بە پەنای تۆ لە شەڕی کردەوەی بەدی خۆم، هەمیشە چاکەو بەهرەی تۆم لەبەرچاوەو پێ دەنێم لە گوناهباریی خۆم، کەواتە: لێم خۆشبە، دڵنیام بەس تۆ دەتوانی لە گوناه خۆشبی، کەسی تر رادەی ناکەوێ لافی پایەی وا بۆ خۆی لێ بدا. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ – لە ڕۆژدا – ئەمە بڵێ، بەمەرجێ بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، ئەگەر لەو ڕۆژەدا فەرمانی خودا بەجێ بێنێ و بەر لەهاتنی شەو ئەمری خودا بکا ئەوە بەهەشتییە، وە هەرکەسێ – لە شەودا – ئەمە بڵێ، دیسان بەمەرجێ بەدڵ باوەڕی پێی هەبێ، ئەگەر لەو شەوەدا ئەمری خودا بکاو بەر لە داهاتنی ڕۆژ بمرێ ئەوە دیسان بەهەشتییە! (ب/د/ت/ن).

٥١٢٨.م– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً. رواه البخاري[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خودای لەسەربێ): بەخودا، بە یەزدانی پاك من بەش بەحاڵی خۆم زۆر زۆر لەخودا دەپاڕێمەوە، ڕۆژی وا هەیە پتر لە حەفتا جار لەخودا دەپاڕێمەوەو داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەمو تەوبەی لە خزمەتدا نوێ دەکەمەوە، نەبادا بەهەڵە هەڵەیەکی کردبێ، یا لە کردنی ئەرکی سەرشانی خۆمدا درێغیم کردبێ. (بوخاری. پڕ گۆڕەکەی لە نووربێ).

٥١٢٩.م– عن الاغر المزني (رَضي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّهُ ليغان على قلبي وَإِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً. رواه مسلم وأبو داود[٣]:

---

[٢] تجريد/٥ ل/٢٤١ رقم/١٩٧٧ = ٦٣٠٧.

[٣] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٩٩. ابوداود. صلاة: ١٥١٥. تحفة/١٦٢.

ئەغەڕی موزەنی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەراستیدا منیش هەندێ جار گەرد لەدڵم دەنیشێ، جا بۆیە هەموو ڕۆژێ سەدجار، یا زیاتریش، لەخودا دەپاڕێمەوەو داوای لێبووردنی لێ دەکەم! (م/ت).

٥١٣٠.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ. رواه مسلم والترمذي[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) بەو کەسە کە گیانی منی وا لە دەستا ئەگەر گریمان ئێوە گوناهتان نەکردایە خودا ئێوەی لادەبردو جۆرە هۆزێکی تری دەهێنا کە گوناه بکەن و لەخودا بپاڕێنەوە تا خودا بەو بەهانەیەوە لێتان خۆش بێ (م/ت).

٥١٣١.م- ـ (ب - ١ ز - ١٠٨ ل - ٣١٦ ف - ٢)[٥].

٥١٣٢.م- عَنْ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أَصَرَّ مَنِ اسْتَغْفَرَ وَإِنْ عَادَ فِي الْيَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً[٦]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): ئەو کەسەی لە خودا داوای تاوانپۆشی بکا گریمان ڕۆژی حەفتا جاریش تێ هەڵچێتەوە بەسوورو پێداگر لەسەر تاوان دانانرێ. (د/ت- س/صالح).

٥١٣٣.م- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةَ مَرَّةٍ، رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ. روى هذِهِ الثلاثة أبوداود والترمذي.[٧]:

---

[٤] مسلم. توبة: ٦٨٩٧. ترمذي. دعوات: ٣٥٣٩.

[٥] تقدم في مجلد أول تسلسل/١٠٨ رقم/٦٢٥.

[٦] بسند صالح (شرحه).

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گەلێ جار لەیەك كۆڕی دانیشتندا سەدجارمان دەژمارد كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ: خوداوەندا! لێم خۆشبەو تەوبەو پەشیمانیم لێ گیراكە، چونكە هەرخۆت گیراكەری پەشیمانی و میهرەبانیت (د/ت-س/ص).

٥١٣٤.م- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا رَوَى عَنِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَّهُ قَالَ: يَا عِبَادِي إِنِّي حَرَّمْتُ الظُّلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَّمًا فَلاَ تَظَالَمُوا يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ ضَالٌّ إِلاَّ مَنْ هَدَيْتُهُ فَاسْتَهْدُونِي أَهْدِكُمْ يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ جَائِعٌ إِلاَّ مَنْ أَطْعَمْتُهُ فَاسْتَطْعِمُونِي أُطْعِمْكُمْ يَا عِبَادِي كُلُّكُمْ عَارٍ إِلاَّ مَنْ كَسَوْتُهُ فَاسْتَكْسُونِي أَكْسُكُمْ يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ تُخْطِئُونَ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَأَنَا أَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا فَاسْتَغْفِرُونِي أَغْفِرْ لَكُمْ يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي فَأَعْطَيْتُ كُلَّ إِنْسَانٍ مَسْأَلَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلاَّ كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ يَا عِبَادِي إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدِ اللَّهَ وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلاَ يَلُومَنَّ إِلاَّ نَفْسَهُ. رواه مسلم في كتاب البر والترمذي في الرقاق[8]:

ئەبو زەڕ (خۆشنوودیی خودای لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) لە فەرموودەیەكی پیرۆز (حەدیسێكی قودسی)دا، كە لە پەروەردگاری گەورەو پیرۆزی خۆیەوە دەیگێڕێتەوە فەرمووی: خودای پیرۆزو گەورە دەفەرموێ: ئەی عەبدەكانم! ئەی بەندەكانم! من زوڵم و زۆرو ستەمم لەسەر خۆم حەرام كردووەو

---

[7] بسند صحيح (شرحه).
[8] مسلم. بر وصلة: ٦٥١٧.

لەناو ئێوەشا حەرامم کردووە، کەواتە ئێوە بەهیچ جۆرێ زۆرو ستەم لە یەکتری مەکەن، ئەی بەندەکانم! ئێوە هەمووتان سەر لێشێواوو گومڕان، مەگەر ئەوانەتان کە من خۆم بیانخەمە سەر رێگەی راستو رێی هەقیان پێ نیشان بدەم، کەوایە داوای رێنموونی هەر لە خۆم بکەن هەتا رێنموونیتان بکەم، ئەی بەندەکانم! هەمووتان رەشورووتو رووتو قووتو تینوو برسین، ئەوانەتان نەبن کە خۆم نانو ئاوو بەرگو پۆشاکیان پێ بدەم، کەواتە داوای ئەم شتانە هەر لەخۆم بکەن، هەتا بیاندەم پێتان، ئەی بەندەکانم! ئێوە بەشەوو بە رۆژ سەرتان کردۆتە گوناهو گوناه دەکەن، وەلحاڵ بەس من لە دەستم دێ کە لە هەموو گوناهێ خۆش ببم، کەوابوو داوای لێخۆشبوون هەر لەخۆم بکەن، ئەی بەندەکانم، ئێوە ناگەنە ئەو دارەتو رادەیە کە بتوانن زیانێ، یاسوودێ، بەمن بگەیەنن، کەواتە مەبەست لەم پەندو تەمێو ئامۆژە سوود، یا زیانی، ئێوەیە، نەك سوودو زیانی من، ئەی بەندەکانم! ئەگەر ئێوە لەیەکەم کەستانەوە بیگری، هەتا دواکەستان، بە ئادەمیزادو پەریتانەوە، بەخاسو خراپتانەوە، یەك بەیەکتان پیاوی باشو لەخودا ترسبن، وەك لە خودا ترسترین کەستان کە موحەممەدە، بەوە هیچ لە سامانو موڵكو گەورەیی من زیاد ناکات، هەروەها ئەگەر لە یەکەم کەستانەوە بیگری هەتا دواکەستان، بە ئادەمیزادو پەریو جنۆکەتانەوە، بەخاسو خراپتانەوە، یەك بەیەکتان پیاوی خراپ بن وەك لە خودا دوورترین کەستان، کە ئیبلیسی نەحلەتییە، بەوە هیچ لەسامانو گەورەیی من کەم نابێتەوە، واتە: بوونو نەبوونی ئێوە بۆ خوایەتی من یەکسانەو چون یەکە، ئەی بەندەکانم! ئەگەر بێتوو لەیەکەم کەستانەوە تا دواکەستان، بە ئادەمیزادو جنۆکەتانەوە لە دەشتێکا بوەستنو لەیەك دەما، هەر کەسەتان داوای شتێکم لێ بکا، وە لەیەك هەناسەدا هەر کەسەیەتان دڵخوازی خۆیی پێ بدەم، بەوە هیچ لە گەنجینەی من کەم نابێتەوە، چۆن دەرزییەك بژەنی بە ئاوی دەریایەکا ئاوا، لەڵکوو دەرزییەکە تۆزقاڵێ لە ئاوی دەریاکە کەم دەکاتەوە، بەڵام بەخشینی دڵخوازەکانی ئێوە هیچ لە گەنجینەی من کەم ناکاتەوە!

**ئەی بەندەکانم! هەرچی دێتە ڕێتان کردەوەی خۆتانە، من زۆر بەوردی سەرژمێریان دەکەمو ژمارەو چەنیو چۆنییان رادەگرمو دوایی بە تەواویی دەیاندەمەوە پێتان!**

**جا هەرچی هاتەوە ڕێتان کردەوەی خۆتانە ئەگەر باش بوو ئەوا سوپاسی خودای لەسەر بکەن، خۆ ئەگەر بە جۆرێکی تریش بوو ئەوا سەرزەنشتی خۆتان بکەنو بەس، کە ئەوکارە بەدەتان لەکاتی خۆیدا کردووە، وە گلەیی لە کەسی تر مەکەن! (م/ت).**

**٥١٣٥.م– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَزِمَ الاِسْتِغْفَارَ جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا وَمِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجًا وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لاَ يَحْتَسِبُ. رواه أبو داود والنسائي بسند صحيح[٩]:**

**ئیبنو عەبباس (خوودایان لێ رازی بێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ خوو بگرێ بە ئیستغفارو پاڕانەوەوەو، داوای لێخۆشبوون لە خودا بکا بە پیشەی هەمیشەی، خودا لە هەموو تەنگانەیەکدا دەرووی لێ دەکاتەوەو هەموو خەمێکی دەڕەوێنێتەوەو، لەلایەکی واشەوە رزقو رۆزیی بۆ دەنێرێ کە خۆی خەیاڵی بەلای ئەوێدا نەچێ (د/ن–س/ص).**

## ٩٠) گەورەیی تەوبەو پەشیمانی : (التوبة وفضلها)

**قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَى رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ – سورة التحريم – ٨/٦٦}.**

**واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بەخودا، خودا داواتان لێ دەکا، فەرمانتان پێدەکا کە تەوبەیەکی راستو دروستی ئێجگاری لەسەر دەستی خودادا بکەن، هیوا وایە کە خودای ئێوە لە گوناە پاکتان بکاتەوەو خراپەو**

---

[٩] حديث صحيح.

گوناهتـان بپۆشـێ و بتانخاتـە چـەن بەهەشـتێکی وەهـاوە کـە جۆبـاری زۆر لەژێریانەوە لە هەموو لایەکەوە ڕەوان دەبێ!

٥١٣٦.م- عَنْ أَنَسُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَلّٰـهُ أَشَـدُّ فَرَحًا بِتَوْبَةِ عَبْدِهِ حِينَ يَتُوبُ إِلَيْهِ مِنْ أَحَدِكُمْ كَانَ عَلَى رَاحِلَتِهِ بِأَرْضِ فَلَاةٍ فَانْفَلَتَتْ مِنْـهُ وَعَلَيْهَا طَعَامُهُ وَشَرَابُهُ فَأَيِسَ مِنْهَا فَأَتَى شَجَرَةً فَاضْطَجَعَ فِي ظِلِّهَا قَدْ أَيِسَ مِـنْ رَاحِلَتِـهِ فَبَيْنَا هُوَ كَذَلِكَ إِذَا هُوَ بِهَا قَائِمَةً عِنْدَهُ فَأَخَذَ بِخِطَامِهَا ثُمَّ قَالَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ اللّٰهُمَّ أَنْتَ عَبْدِي وَأَنَا رَبُّكَ. أَخْطَأَ مِنْ شِدَّةِ الْفَرَحِ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

ئەنـەس (خودای لێ ڕازی بێ) لـە پێغەمبەرەوە دەفـەرموێ: خـودا پتر شـادمان دەبێ بـە تەوبـەی بەنـدەی خـۆی کـە پەشیمان دەبێتـەوەو دەگەڕێتـەوە بۆلای خودا، هەتا ئەو کەسەتان کە لە بیابانێکا بە سواری وڵاخەکەی ڕێ دەکا، لەپڕ ناگەهان وڵاخەکەی بەلەسە دەبێ و نان و ئاوەکەیشی دەفڕێنـێ، جا کاتـێ کـە لێی نائومێد دەبێ دەچێتە بن درەختێ، بە نائومێدی لـە سێبەرەکەیدا پـاڵ دەکەوێ، جا لەم حاڵی لێقەومان و نائومێدییەدا لەپڕ کابرا تەماشا دەکا کـەوا وڵاخەکـەی، بـەنان و ئاوەکەیـەوە، لـەلایا بەدیاریـەوە ڕاوەسـتاوە! ئـەویش پەلاماری جڵەوەکەی بداو جڵەوەکەی بگرێ و لەخۆشیانا بپەشۆکێ و لـەباتی ئەوەی بڵێ خودایە! تۆ خودای منـی و من بەنـدەی تـۆم کەچـی بڵـێ: خودایـە! تۆ بەندەی منی و من خودای تۆم (ش/ت).

٥١٣٧.م- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْها) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ تُوبُوا إِلَى اللّٰهِ فَإِنِّي أَتُوبُ فِي الْيَوْمِ إِلَيْهِ مِائَةَ مَرَّةٍ. رواه مسلم والترمذي[2]:

ئیبنـو عومـەر (خودایـان لێ ڕازی بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: ئەی خەڵکە! بگەڕێنەوە بۆلای خوداو لەلای خـودا تـەوبـە بکـەن و لـە

---

[1] مسلم. توبة: ٦٨٩٥. تجريد/٥ ل/٢٤٢ رقم/١٩٧٨ = ٦٣٠٨. مسلم. توبة: ٦٨٩٠ — ٦٨٩٦.

[2] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٩٨.

گوناهەکانتان پەشیمان ببنەوە، لەراستیدا من بەش بەحاڵی خۆم لە رۆژێکا سەدجار لە خزمەت خودادا تەوبە نوێ دەکەمەوە (م/ت).

٥١٣٨.م- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ. رواه الترمذي وأحمد والحاكم بسند صحيح[٣]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەموو ئادەمیزادێ بەپێی لەبارابوونی سورشتی ئامادەیە بۆ خەتاباریی زۆر، بەڵام چاترینی خەتاباران ئەو کەسانەن کە زوو زوو تەوبە لە هەڵەی خۆیان دەکەن. (ت/ئەحمەد/حاکم-س/ص).

## ٩١) کاتی تەوبەکردن : (وقت التوبة)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَلَيْسَتِ التَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ حَتَّى إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ الآنَ وَلاَ الَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا - سورة النساء - ٤/١٨}.

واتە: تەوبەو پەشیمانی ئەو بەدکاران و تاوانبارانە قەبووڵ ناکرێ، کە تا دەکەونە گیانەڵڵاو دێنە سەر مردن هەر کردەوەی خراپ دەکەن، هەروەها ئیمان و تەوبەی ئەو کافرانە گیرا نابێ کە لەکاتی گیانەڵادا تەوبە لە کفردەکەن و ئیعلانی ئیمان دەکەن، وەك ئەوە هەندێ کە لە ژیان نائومێد دەبن و سوور دەزانن کەوا دەچن بەسەر ئاگری سووردا، لەم کاتی تۆقینەدا دەڵێن: دەی وا ئێستا تەوبە دەکەم، دەی وا ئێستا باوەڕ بەخودا دەکەم، بەڵێ تەوبەو باوەڕهێنانی وا هیچ بایەخێکی نییە، وەك چۆن کەسێ لەسەر کفر مردبێ تازە ئیمانهێنان هیچ سوودی نییە، لەپاش مردن.

١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[١]:

---

[٣] بسند صحيح.

**ئیبنو عومەر** (خوودایان لێ رازی بێ) **لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ** (درروودی خودای لەسەربێ): **خودا تەوبەو پەشیمانی بەندە گیرا دەکا، بەمەرجێ نەکەوێتە حاڵی گیانەڵا.** (ت/ئە/حاکم–س/ح).

**لە ١٩٨٧/٢/١٦دا ئەم تێبینیەم لەسەر ئەم ئایەتەو ئەم فەرموودەیە نوسیوە: ئەوەی کە گوتی یا جماعە احملکم امانە سلمونی علی فلان.. ئەم شوێنەی بۆ دەرچوو بۆ تێگەیشتن لەم مەتەڵە سەرنجێکی وردی باسی (نزای چوونە هەواری نوێ) بدە: (ب – ز – ٧٥ ل – ٢٢٥).**

**سەروقنکی (عد) کیراوەتە مۆم**

**دەڵێ مەولوی من موعەممای تۆم!**

**کوڵاڵە سوورەم لە چۆڵ رواوم**

**دە لە نۆم دەرچێ شەهدێ تەواوم**

**(شەهد) هەنگوینە، مەبەست یەکەمە**

**دڵم لەم باسە خەڵتانی خەمە**

**تەفائول دورستە یا ردوست نییە، ئەوە مەسەلەیەکی ترە، من مەبەستم ئەم لایەنە نییە، بەڵام ئەوەی کە گومانی تیادا نییە نوقڵانەی باش فرەباشە، لەم لایەنەوە تەماشای ئەم شوێنە بکە ← (ب/٤ ز/٧٨ ل/٢٣٢ –١+٢+٦).**

**وەکی تریش:**

**زۆر سەرکز هەیە بەدڵ وریایە**

**بەدیمەن بێ دەنگ وەکتر کۆیایە**

**من لەو بابەتەم وەها مەزانە:**

**کۆنە پەرستم، یاخۆ دێوانە!**

---

[١] بسند حسن (شرحە).

کوشتەی چەپاڵەی رەشی رۆژگارم

کوردم، نەکینا خەیلیٚ هۆشیارم

زەرگی دەرویٚشیٚ جەرگی کون کردم:

فەرمووی: ئەی مەلا لەبەرت مردم

بۆ لالۆیٚچیٚ خویٚن شەرەف مەفرۆشن

ئیٚوە کەوھەرسیٚن نەک خۆفرۆشن![1]

بەڵێ وەکی تریش بەندە ئەوەندە سافیلکەو خۆشباوەڕنیم کە گوێ بۆ فاڵچی شل کەمو دوای خەیاڵپلاو بکەوم گەرچی زۆر باش دەزانم کە پەیڕەویکردنی یاسا سروشتییەکانی خودا، بۆچارەسەرکردنی کێشە ژیانیو ڕەوانیو دەروونییەکانی ئادەمیزاد باشترین ڕێبازەو جوانترین دەرمانە بۆ هەموو دەردو گیروگرفتیکمان، لەبەر ئەوە زانا ئاینییەکان دەشێ زۆر بە حەکیمانەو زۆر بە لێزانانە رابەریی ئەو جەماوەرە موسوڵمانە چاوکراوەیە بکەن، تا بەرە بەرە پاکۆی بیروباوەڕی پڕو پووچ لەناو کۆمەڵدا دەکرێ، وە لە شوێنی خار گوڵ دەنێژرێ، هەتا سەر لەنوێ گیانێکی خاوێنی نوێ لەناو مەزرای دڵو دەروونی موسوڵماناندا، لەبەر تیشکی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانو فەرمووده نازدارە ساغەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەڕوێ!

هەتا عیلمو زانستو ئایینی ساخو دانایيو بەرنامە ڕێژی جیهانیو ئایینی جوان، جێ بەجەهلو نەزانیو ئەفسانەو تەمەڵیو خەیاڵپلاوی لەق دەکەنو خۆیان لەجێی ئەوان شەتڵ دەکەن.

گەرچی من ئەم لایەنە زۆر باش دەزانم، بەڵام من قەت لەگەڵ ئەو راهەڵەیانە نیم کە لایەنە گیانیو مەعنەوییەکان پشت گوێ بخرێن، دڵنیام بەرابەر گشت بەهرەیەکی ئاشکرا بەهرەیەکی نهێنی خودایی هەیە، خودا

---

[1] خۆفرۆشی : بەخێ ، پابەجیم. (وەرگێڕ)

دەفەرموێ: (وأسبغ عليكم نعمه ظاهرة وباطنة): کەواتە تەوەککولو پشتبەخودا بەستنو تەسلیم بوون بە چارەنووسو ئارامگرتنو دووعاو نزاو نووشتەو بێ هەوارییو زوهدو دنیا نەویستیو ساچانو قنیاتکردن بە بەشی خوداییو سۆفێتیو دەروێشیو خەڵوەکێشانو لێبڕان بۆ خوداو تەرکی دنیاوشتی تری لەم بابەتە لەزاتی خۆیاندا شتێکی هەقو راستن، هەر کەسێ بەپێی شەرع کاریان پێ بکا، بێگومان دەگات بە ئاواتی خۆی، وەلێ نابێ لە هەندێکیان بەهەڵە تێبگەین، وەك تەمبەڵیو تەوەزەلی ناوبنێین تەوەکوولو دەست بکەین بە قوڕگی شێرداو ناوی بنێین چارەنووسو قەزاو قەدەر، یا سەرجەم گەلی ئیسلام سەربکەنە تەرکی دنیا، بەڵێ تاكو تەرا پیاو خاسی وا هەن، لەم دنیایەدا وەك میوان دەژین، یا دەڵێی رێبوارن، ملی رێگەی رەهبەریان گرتووە، بە موولێی لانا دەن، دەڵێی بەپەلە لەسەر مەزراوە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە، ئەم خودا پێداوانە نابێ سەربکرێتە سەریانو ئاسایشی رەوانی یان لێ تێك بدرێ، جیهان دەریایە، هەروەها گەلی ئیسلام دەریایەکی بێ پەیە، لە بەرئەوە کۆمەڵگەی ئیسلام دەبێ جێگەی مەلاو شێخو سۆفیو دەروێشو فەیلەسووفو داناو زاناو خوێندەوارن نەخوێندەواری تیادا ببێتەوە.

ئەوانەی کە دەیانەوێ بەفەتوایەکی دوو دێڕی، یا بە قسەیەکی بێ سەرو بەری خۆیان غەسل دەماغێ بۆ زوربەی موسوڵمانان بکەن، ئەوانە لە گوێی گادا نووستوون، راستە بەرنامەی ئایین دەشێ روونو ئاشکراو عەمەلی بێ، من لە ئاستی ئەم راستیە لاریم نییە، بەڵام ئێمە بمانەوێو نەمانەوێ رەشە خەڵکەکە لەکۆنو نۆدا لەسەر ئومێدو خەیاڵو حەزی دەروونو گوێ شلکردن بۆ هەندێ شتی ئەفسانەییو ساویلکەییو خۆشباوەڕی دەژین، لەبەر ئەوە نابێ مەلاو زانا هەر مەلاو زانای خاصصەبنو واز لە عاممە بهێنن، لەم لایەنەوە دەبێ ئەم خاڵە رەچاو بکرێ: بەرنامەی ئایین دەبێ نەرمونیانو جێروبەکێش بێ، نابێ توندو تیژو تورت بێو وەك پۆڵا وا بێ کە بەحاڵ بیچەمێنیتەوە دەپەڕێ!

دەبێ لە سێبەری ئاییندا دەروێش و فەیلەسووف وەك دوو برای ئاشتی دڵسۆزو تەبا پێکەوە بسازێن و بژین!

چونکە کۆمەڵگەی ئیسلامی تێکلاوێکی هەرەمەیە، وەك مزە ئاش وایە، لە گەنمە قەندە هارییەوە بیگرە تا زورات و گاڵ و هەرزنی تێیدایە، بەلام گرنگ ئەوەیە کە ئەمیش وەك ئەو شۆراوەو پاك و پۆخت بێ، جیاوازیی ماددی و مەعنەوی لەناو تاکە تاکەو چینەکانی ئادەمیزاددا دیاردەیەکی سروشتییە، هەتا مرۆڤ لەسەر ئەم بارو دۆخەی ئێستابێ ئەو جیاییە هەر دەمێنێ و لەسەددا نەوەدیشی مایەی رەحمەتە دیارە ئەم بەرنامە نەرمە گشتییە کە بۆ جۆشدانی گشت چین و بەرەو لایەنەکانی کۆمەڵگا رەنگرێژی کراوە، ئەم بەرنامەیە دەبێ هەڵێنجرابێ لە دەستووره سەرەکییەکەی ئیسلام، کە ئەمەیان بەس زانا پسپۆڕەکان سەری لێ دەردەکەون و مافی ئەوەیان هەیە لێی بکۆڵنەوە، کەواتە مەسئەلەکانی فەلسەفەو کێشەکانی کە هەنووت و لاهووت و ناسووت و، مەسئەلەی وەك (لاهـو لاغـيرة!) یا (الـشء هـو هـو!) یا (قەضای موبرەم و قەضای موعەللەق) یاخود مەسئەلەکانی وەك: ئیعتیزال و سەلەفی و مەزهەب گەڕایەتی و صۆفی گەرێتی و شتی ئەفسانەیی و خورافات و ئیسرائیلییان، کەواتە ئەم جۆرە مەسئەلانەو ئەم چەشنە کێشانە بوارو مەوداو ناوەندی تایبەتی خۆیان هەیە، دەبێ بە شێنەیی بەرە بەرە بیروباوەڕە چەوتە کۆنەکان پاکۆبدرێن و بژار بکرێن و، بیروباوەڕی ساخی راستی دامەزراو لەبەرتیشکی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزو، بەپێی دەقی فەرمووده ساغە رۆشنەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پەخش و بلاوببنەوە، وە ئەم کارە پیرۆزەیش ماوەیەکی گەرەکە، ئەرك کێشانێکی زۆری دەوێ، حەوسەڵەو هێمنی و لێزانی و لێبووردن و پشوویەکی دوورو درێژی دەوێ، سەرفی نەزەری دەوێ، چاوپۆشینی لەهەڵەی نەزانان دەوێ، شت قەت بەشەڕە جنێوو لاقرتی و تانەو تەشەرو تەوس لێدان سەرناگری!

وەلێ ئەوەی کە گومانی تیادا نییە، تەعلیلی هەموو مەسئەلەیێ بە تەعلیلیکی ماددی رووت غەڵەتە، یا لە دیندا هەموو شتێ مەحکوومی عەقڵ

بێ و عەقڵ حاکمی موتلەق بێ ئەویش غەڵەتە، واباشە کۆمەڵگای موسوڵمانان زەغتی زۆری لەسەر نەبێ، بەشی خۆی سەربەستی کاری هەبێ، لەناو شووورای پۆلایینی بقەو کخەدا نەژی، ڕیزی تەقالیدە جوانەکانی بگیرێ، کۆت و زنجیری زۆری لە ئەستۆو مل و دەست و پێ نەکرێ!

هەتا بۆ خۆی لە سنووری ڕەوادا بای باڵی خۆی بدا، هەست بەخۆشی بەهرەی جیهانی بکا، لەززەت لەبەهرە ڕۆحی و ڕەوانییەکان وەربگرێ، لە سێبەری مەزجی خەیاڵ و واقیعدا بژی، بۆ نموونە دەبێ سەردان لە گۆڕ چی زیانێ لە قەڵای ئایین بدا هەتا ئێمە بیکەین بە موشکیلەیەکی گەورەی ئوصوولی و فیقهی، یا دەبێ تەکیەو خانەقا چ موشکیلەیەکی ئایینی بۆ ئێمە دروست بکا، تا ئێمە موحارەبەیان بکەین، براله! ڕاستترین قسە ئەم فەرمایشتەیە: (ما رآه المسلمون حسنا فهو عند الله حسن). دەی لەسەددا نەوەدو نۆی عادات و داب و نەریتی ئێستامان کلتووروو کەلەپووری چەسپاوی بەجێماوی چواردە سەدەی لەمەو پێشمانە، ئیتر چۆن گاڵتەی پێ بکەین.

بەڵگەیەکی گەلێ گەورە لەسەر ئەوە کە بەهرەی ڕەوانی و نیعمەتی مەعنەوی بایەخی تایبەتی خۆی هەیە، لەدڵ و دەروونی جەماوەردا ئەم دروشمە پیرۆزەیە کە خوێندکارەکانی زانکۆکانی جەزائیر لەم ڕۆژانەدا هەڵیانکردووە، کە وەك گەورەترین بورکان لە گێتیدا دەنگی داوەتەوە: مرۆڤ هەر بەنان ناژی!

سوبحانەڵڵا! لە دەی دووەمی سەدەی پازدەهەمی کۆچیدا، لە دەی دوایی چەرخی بیسەمدا، گەورەترین شۆڕشی ڕۆحی لە جیهاندا، لە جەزائیری قارەکانی ملیۆن شەهیدەوە سەر هەڵ دەداو بەشی هەرە گەورەی ڕابەرەکانی مامۆستاو زاناو ڕۆشنبیرەکانی زانکۆکانن و، پڕبەدەم هاوار دەکەن: نەفرەت لە ئارەزوو پەرستی، نەفرەت لە ورگ لەوەڕاندن، بژی ڕۆحانییەت و مەعنەوییەت، بمرێ ماددیەت و ئاژەڵێتی، کە هەوێنی ئەم هەموو کێشەو بەرەو بگرەو بەردەو کوشت و بڕو کوشتن و کوشتارەیە لەناو

خەڵکانی سەر رووی زەویدا، بژی برایەتی و ئاشتی لەژێر سێبەری چڕو خستی ئایینی راست و دروستدا.

کاکی بڕای جەماوەری موسوڵمان هەمیشە رۆحانیەت و مەعنەوییەت وەك داری بەری دەیهەژێنێ، ئاگری جەرگ و ئاواتی دڵ – بەر لە ئیقناعی هۆش و سوودی ماددی – هەڵی دەگرێ و بەرەو کوێی بوێ دەیبات!

ئەم ئێوارەیە بەفروباو باران و زریانێکی وابووماڵەو ماڵ نەدەکرا، خەریکبووم نەچم بۆ جەماعەتی شێوان، کەچی کە چووم – بە پێچەوانەی بۆچوونی منەوە – ماشەڵڵا مزگەت جمەی دەهات لە ئامادەبوان، مامۆستا مەلا عەبدوڵڵا خۆی لەو دوور دوورەوە بەسەر دووگەڕەکدا هاتبوو تابەر نوێژییەکەمان بۆ بکا، لەکاتی نوێژ دابەستندا لە هەمولایەکی حەرەمی مزگەوتەوە دەنگ بەرز بۆوەو دەیانگوت: رەحمەتتان لێبێ کەمێ تەکە تەکە بکەن و تۆزێ بچنە پێشەوە مزگەوتەکە زۆر قەرەباڵغە جێ نابێتەوە!

باشە ئەو هەمکە بەفەرە بۆ نەبوو بە مانیعێکی ماددی و بەری رێی ئەو دافیع و هاندەرە مەعنەوییە پیرۆزەی نەگرت کە پاڵی بەو خەڵکەوە نابوو، بەسەر ئەو حەمکە بەفرو شەختەیەدا بە کێشی کردبوون و هێنابوونی بۆ مزگەوت!؟

ئەی مزگەوتی ئەبو بەکری صەدیق! یاخوا هەر ئاوەدان بێ، یاخوا هەمیشە ئاوا پڕ لەمەلاو نوێژکەری موسوڵمانی کوردی مەردی پاکی چاك بێ، یاخوا هەمیشە ئاوا پڕ لە وەعظ و ئامۆژگاری و نەصیحەت و خودا پەرستی راست و دروستبێ ئامین خودایە بۆنی مزگەوتی ئیبراهیم بەگی کەرکووکم ناوە بەتۆوە بۆیە دەڵێم:

کەردی بەرماڵت سورمەی چاومە
مەوعیظەی مەلات نان و ناومە!
کەرچی بێ نوورم، نووری ناومە،
لێ نووری ناوت نووری چاومە!!

٥١٤٠.م- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا. رواهما مسلم[٢]:

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا لەشەودا دەستی خۆی ڕادەهێڵێ بۆ ئەو خراپکارانەی کە لە ڕۆژدا خراپەیان کردووە، هەتا تەوبە بکەن و لەسەر دەستی خودادا لە تاوانەکەیان پەشیمان ببنەوە، هەروەها لە ڕۆژدا دەستی خۆی درێژدەکا، بۆ ئەو خراپکارانەی کە لە شەودا خراپەیان کردووە، هەتا لەسەر دەستی خودادا تەوبە بکەن و لەتاوانەکەیان پەشیمان ببنەوە، ئەم ڕەحمەت و قەبووڵی تەوبەیە هەروا بەردەوام دەبێ هەتا ئەو کاتەی کە ڕۆژ دەگەڕێتەوەو لەباتی ئەوەی وەك هەموو جارێ خۆر لە خۆر هەڵاتەوە هەڵبێ، کەچی لە ڕۆژئاواوە هەڵ دێ، ئیتر لەو ڕۆژە بەدواوە دەرگای تەوبە دادەخرێ! (م).

٥١٤١.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ. واهما مسلم[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەر کەسێ لە پێش ئەو کاتەدا کە خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێ تەوبەبکا خودا تەوبەی گیرا دەکا (م).

٥١٤٢.م- ـ (ب - ٦ ز - ٧ ل - ١٦٦ ف - ١٣)[٤].

٥١٤٣.م- ـ لەسەرباسی (من أحب قوما حشر معهم)دا رابورد، فەرموودەی یەکەم.

---

[٢] مسلم. توبة: ٦٩٢١.

[٣] مسلم. توبة: ٦٨٠١.

[٤] تقدم في مجلد سادس تسلسل/٧ ل/١٦٦ ط/١ رقم/٣٨٦٤.

## ٩٢) هەر چەندیٚ بەندە لە رادە بەدەر تاوانی هەبیٚ وەلیٚ هەرکاتیٚ تەوبەی بەڕاستی بکا تەوبەی گیرا دەبیٚ

## يقبل الله توبة عبده وان أسرف

قَالَ اللهُ تَعَالَ: {إِنَّ اللَّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء ... الآية ـ (ب – ٦ ز – ٥ ل – ١٠٥)}.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ – سورة الشورى – ٤٢/٢٥}.

واتە: خودای گەورە خودایەکی بە بەزەیی وایە تەوبەو گەڕانەوە لە بەندەکانی خۆی وەردەگریٚو بە بەخشش‌و میهرەبانیی خۆی لە خراپەکانیان – بازۆریش بن – دەبووریٚ، خودای ئیٚوە خودایەکی داناو زانایە ئاگای لە خشەی مارو میٚروو هەیە، هیچی لیٚ ون نابیٚ، کاری چاک‌و خراپی ئیٚوەی ئاگالیٚیە.

٥١٤٤.م– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ. ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ فَقَالَ أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي. فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ وَاعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ[1].

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (درودو سلاٚوو سۆزو ڕەحمەت‌و بەزەیی خودای گەورەو سەروەری لیٚبیٚ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بیٚ – لە فەرموودەیەکی پیرۆزدا، واتە: لە حەدیسیٚکی پیرۆزدا، واتە: لە حەدیسیٚکی قودسیدا، لە خودای پەروەردگاری گەورەو سەروەری خۆیەوە دەگیٚڕیٚتەوە، خودا

---

[1] تجريد/٥ ل/٣٨٢ رقم/٢١٣١ = ٧٥٠٧ فتح الباري. مسلم. توبة: ٦٩١٩.

دەفەرموێ: بەندەیێ گوناهێ دەکا، لە پاشالێی پەشیمان دەبێتەوەو تەوبەی بەراستی لێ دەکاو دەڵێ: خودایە! لە گوناهم خۆشبە، خودای پیرۆزو فەڕدارو گەورەیش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من وەك ئەم گوناهە دەكا دەیشزانێ کە خودایەکی وای هەیە دەتوانێ لەو گوناهە خۆش بێ، هەر وەك دەتوانێ لەسەر ئەو گوناهە جەزرەبەی بدا، دیسان ئەو بەندەیە گوناهێکی تر دەکاتەوەو لەسەر شێوەی پێشوو لەخودا دەپاڕێتەوە کە لێی خۆش بێ، خودایش هەمان فەرمایشتی بەرو دەفەرموێتەوە، دیسانەوە ئەو بەندەیە گوناهێکی تر دەکاتەوەو دەڵێتەوە: خودایە! لێم خۆش بە، خودای گەورەو فەڕدارو پیرۆزیش دەفەرموێتەوە: ئەم بەندەیەی من وەك ئەم گوناهانە دەکا، لە هەمان کاتدا باوەڕی بەمن هەیەو دەزانێ کە من خودای ئەوەمو خودایەکی وام کە وەك دەتوانم لە تاوانو گوناه خۆش بم، دەیشتوانم خاوەنی تاوانو گوناه سزاو ئەشکەنجە بدەم، دەی هەتا تۆ ئەمە حاڵت بێ کە گوناهێکت لێ قەوما تەوبەی لێ بکەی منیش گشت جارێ لێت خۆش دەبم (ش).

٥١٤٥.م- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لَمْ يَعْمَلْ حَسَنَةً قَطُّ لأَهْلِهِ إِذَا مَاتَ فَحَرِّقُوهُ ثُمَّ اذْرُوا نِصْفَهُ فِي الْبَرِّ وَنِصْفَهُ فِي الْبَحْرِ فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ اللَّهُ عَلَيْهِ لَيُعَذِّبَنَّهُ عَذَابًا لاَ يُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ فَلَمَّا مَاتَ الرَّجُلُ فَعَلُوا مَا أَمَرَهُمْ فَأَمَرَ اللَّهُ الْبَرَّ فَجَمَعَ مَا فِيهِ وَأَمَرَ الْبَحْرَ فَجَمَعَ مَا فِيهِ ثُمَّ قَالَ: لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: مِنْ خَشْيَتِكَ يَا رَبِّ وَأَنْتَ أَعْلَمُ. فَغَفَرَ اللَّهُ لَهُ[٢]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوێ بووە هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردووە، هەتا لە سەرەمەرگا بەکەسوکارەکەی دەڵێ: کە من مردم لەشەکەم بسوتێننو لە ناودنگدا ورد ورد بم هاڕنو بمکەن بە ئاردو لە ڕۆژێکی ڕەشەبادا نیوەم بچێنن بە دەشتو دەرداو ئەو نیوەکەی تریشم بچێنن بەناو دەریادا، چونکە بەو خودایە ئەگەر خودا دەستی لێم گیر ببێ سزایەکی وام دەدا کە سزای

---

[٢] تجرید/٤ ل/٦١ رقم/١٣٧٦ = ٣٤٥٢، ٣٤٧٩، ٦٤٨٠. مسلم. توبة: ٦٩١٧.

کەسی تر وا بەسەختی نادا، جا کە پیاوەکە دەمرێ کەسوکارەکەی وەسێتەکەی بەجێ دەهێنن، ئەوسا خودا ئاردوتۆزەکەی، چ لەسەر رووی خاكو چ لەناو دەریادا هەمووی کۆ دەکاتەوەو سەرلەنوێ زیندووی دەکاتەوەو دەیکاتەوە بە پیاوەکەی جارانو پێی دەفەرموێ: لەبەرچی وات لەخۆت کرد؟ دەڵێ: لە ترسی تۆ ئەی خودایە! وەخۆشت باشتر ئاگات لە نیازی دڵم هەیە ئیتر خودا لێی خۆش دەبێ (ش).

٥١٤٦.م- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ فَأَتَاهُ فَقَالَ إِنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ نَفْسًا فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ فَقَالَ لاَ. فَقَتَلَهُ فَكَمَّلَ بِهِ مِائَةً ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرْضِ فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ فَقَالَ إِنَّهُ قَتَلَ مِائَةَ نَفْسٍ فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ فَقَالَ نَعَمْ وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ التَّوْبَةِ انْطَلِقْ إِلَى أَرْضِ كَذَا وَكَذَا فَإِنَّ بِهَا أُنَاسًا يَعْبُدُونَ اللَّهَ فَاعْبُدِ اللَّهَ مَعَهُمْ وَلاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرْضُ سَوْءٍ. فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ فَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ جَاءَ تَائِبًا مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللَّهِ. وَقَالَتْ مَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ إِنَّهُ لَمْ يَعْمَلْ خَيْرًا قَطُّ. فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الأَرْضَيْنِ فَإِلَى أَيَّتِهِمَا كَانَ أَدْنَى فَهُوَ لَهُ. فَقَاسُوهُ فَوَجَدُوهُ أَدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ فَقَبَضَتْهُ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ. روى هذه الثلاثة الشيخان[٣]:

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ رازی بێ) فەرموی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوێ لە میلەتە پێشینەکان نەوەدو نۆکەس دەکوژێ، ئینجا دەپرسێ: کێ زاناترین کەسە لەوڵاتدا، دەڵێن: فیسارە سۆفیلکە، جا کابراکە دەچێ بۆلایو پێی دەڵێ: من نەوەدو نۆ کەسم بە دەستی خۆم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ خودا ناسکە دەڵێ: نەء، جا کابرا ئەویش دەکوژێو دەیکا بەسەدی تەواو، جا دیسان دەست دەکاتەوە بە پرسیارو

[٣] تجريد/٤ ل/٧٠ رقم/١٣٨٣ = ٣٤٧٠. مسلم. توبة: ٦٩٣٩.

دەڵێ: کێ زاناترین کەسە لە وڵاتدا؟ ئەمجارە پیاوێکی زانای پێ نیشان دەدەن، جا دەچێ‌بۆلای‌و پێی دەڵێ: من سەد کەسم کوشتووە، ئایا تەوبەم بۆ هەیە؟ زاناکە دەڵێ: بەڵێ، وە کەس ناتوانێ رێگەی تەوبەت لێ بگرێ، تەوبە هەموو کاتێ لە هەموو کەسێ قەبووڵ دەکرێ، بەڵام لێرە مەمێنەو بڕۆ بۆ فیسارە وڵات لەوێ تاقمەیێ خواناسی باشی لێیە، خەریکی خودا پەرستی‌و عیبادەتکردنن، بڕۆ لەوێ تۆیش لەگەڵ ئەواندا خواناسی بکەو مەچۆرەوە بۆ وڵاتی خۆت، چونکە خاکێکی شوومەو بەدە، پیاوەیش دەکەوێتە رێ بۆ ئەو وڵاتە، دەڕوا تا دەگاتە نیوەی رێ، لەوێ دەمرێ!

جا فریشتەی رەحمەت‌و فریشتەی عەزاب لەسەر تەرمەکەی حازر دەبن‌و لەسەری دەبێ بە کێشمە کێشمییان: فریشتەی رەحمەت دەڵێن: ئەمە بۆ تەوبە هاتووەو بەکوڵی دڵ رووی لە خودای گەورە بووە، کەواتە ئەمە دیاری دەستی ئێمەیەو دەیبەین بۆ بەهەشت! فریشتەی سزایش دەڵێن: ئەمە هەرگیز کردەوەی چاکەی نەکردووە، کەواتە نێچیری خومانەو دەیبەین بۆ دۆزەخ!

جا بە فەرمانی خودا، فریشتەیێ لە شێوەی ئادەمیزاددا دەچێ بۆ لایان، هەردوولا ئەو فریشتەیە دەکەن بەحەکەم‌و فەرمانڕەوا، حەکەمەکە دەفەرموێ: نێوانی هەردوو شوێنەکە بپێون، وڵاتەکەی خۆی‌و وڵاتەکەی کە بۆی دەچوو، جا لەکام لایانەوە نزیکتر بوو هی ئەوەیانە، کە دەیپێون دەڕوانن لەو جێگەیەوە نزویکتر دەبێ کە بۆی دەچێ، ئیتر فریشتەی رەحمەت وەری دەگرن! (ش).

٥١٤٧.م– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُقُولُ حَدِيثًا أَكْثَرَ مِنْ سَبْعَ مَرَّاتٍ أَسْمَعُهُ يَقُولُ: كَانَ الْكِفْلُ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ لاَ يَتَوَرَّعُ مِنْ ذَنْبٍ عَمِلَهُ فَأَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَأَعْطَاهَا سِتِّينَ دِينَارًا عَلَى أَنْ يَطَأَهَا فَلَمَّا قَعَدَ مِنْهَا مَقْعَدَ الرَّجُلِ مِنَ امْرَأَتِهِ أُرْعِدَتْ وَبَكَتْ فَقَالَ مَا يُبْكِيكِ أَأَكْرَهْتُكِ؟ قَالَتْ: لاَ وَلَكِنَّهُ عَمَلٌ مَا عَمِلْتُهُ قَطُّ وَمَا حَمَلَنِي عَلَيْهِ إِلاَّ الْحَاجَةُ، فَقَالَ: تَفْعَلِينَ أَنْتِ هَذَا وَمَا فَعَلْتِهِ اذْهَبِي فَهِيَ لَكِ. وَقَالَ: لاَ

وَاللَّهِ لاَ أَعْصِي اللَّهَ بَعْدَهَا أَبَدًا. فَمَاتَ مِنْ لَيْلَتِهِ فَأَصْبَحَ مَكْتُوبًا عَلَى بَابِهِ إِنَّ اللَّهَ قَدْ غَفَرَ لِلْكِفْلِ. رواه الترمذي[٤]:

ئیبنو عومەر (خۆشنوودیی خودا لەخۆی و بابی) فەرمووی: زیاتر لە حەوت جار ئەم فەرمایشتەم لە زاری پیرۆزی خۆشەویست خۆی (درودو سڵاو بەزەیی خودای لێبێ) بەگوێی خۆم ژنەوتووە دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): پیاوێ بوو لە نەوەی ئیسرائیل ناوی کیفل بوو، کۆی لە گوناه نەدەکردەوە، جارێ ژنێکی داماو دەهێنێتە لای، شەست لیرەی زێڕی دەداتێ لە جیاتی ئەوەی کەلاقەی بکا، جا کاتێ وەك ژن و مێرد لەبەر کۆشیدا دادەنیشێ بۆ کردنی ئیشی بێ شەرعی، ژنەکە وەك شوڕەبی لە ترسی خودا هەڵ دەلەرزێ و وەك لەرزو تا دار هەڵ دەچۆقێ و دەداتە پرمەی گریان! کیفلیش پێی دەڵێ: بۆ دەگری، خۆ من زۆرم لێ نەکردوویت؟ دەڵێ: خەیر، بەڵام من هەرگیز ئەم کارەم نەکردووەو ئێستاش کە دەیکەم لەتاو ناچارییە، کیفل دەڵێ: من هێشتا هیچم نەکردووە تۆ لەسەر ئەم حاڵی ناچارییەی خۆتدا ئەمە حاڵتەو ئاوا لەخودا دەترسی، ئەی من کە ئەم هەموو گوناهانەم هەیەو هەتا ئێستا هیچ چاکەیەکم نییە بۆ لە خودا نەترسم و بیرێ لە بەرژەوەندی خۆم نەکەمەوەو بەزەییم بە حاڵی خراپی خۆمدا نەیەتەوە؟ دەی بڕۆ هیچم ناوێ لێت، لەبەر ڕەزای خودا پارەکەیش بۆ خۆت. ئیتر لەخوداوەکیفل بەری چاوی دڵی ڕۆشن دەبێتەوەو دەڵێ: ئیتر با بەس بێ، نائیتر ناگەڕێمەوە بۆ سەر باری تاوان، بەخودا ئیتر لەپاش ئەمە هەتا هەتایە لە فەرمانی خودا دەرناچم و بێ فەرمانی خودا ناکەم، جا هەر ئەو شەوە کیفل دەمرێ، وە بۆ بەیانی لە غەیبەوە لەبان سەدەرگاکەی دەنووسرێ، بەراستی خودا لە کیفل خۆش بوو! (ت-س/ح) ئەم کیفلە ئەو زولکیفلە ناودارە نییە، کە لە سوورەتی ئەنبیادا باس کراوە، کە گەڵێ لە موفەسسیرو راڤە زانەکان دەفەرموون: زولکیفل ئیلیاس پێغەمبەرە کە لە سوورەتی ئەنعامدا باس کراوە. (وەرگێڕ)

---

[٤] في الرقائق بسند حسن (شرحه).

## ٩٣) پایانێ: باسی گوشادیو بێ سنووریی ڕەحمەتو میهرەبانی خودای گەورە : (خاتمة في سعة رحمة الله تعالى)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِنَا يُؤْمِنُونَ – سورة الأعراف – ١٥٦/٧}.

ڕاڤەکەی لەم باسەدا ڕابورد: ← (ب – ٦ ز – ٨ ل – ١٧١ ف – ٦).

وَقَالَ تَعَالَى: {قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ – سورة الزمر – الآية ← (ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٢ ف – ٢).

٥١٤٨.م– ← (ب – ١ ز – ٦ ل – ٣٧ ف – ١)[١].

٥١٤٩.م– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الْعُقُوبَةِ مَا طَمِعَ بِجَنَّتِهِ أَحَدٌ. وَلَوْ يَعْلَمُ الْكَافِرُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنِطَ مِنْ جَنَّتِهِ أَحَدٌ[٢]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر موسوڵمان دەیزانی کە خودا چەنێ سزاو تۆڵەی زۆری لەلا هەیە کەس بەتەمای بەهەشت نەدەبوو، هەروەها ئەگەر کافروبێ باوەڕیش دەیزانی کە خودا چەنێ ڕەحمەتی زۆرە کەس لە بەهەشت نائومێد نەدەبوو (ش/ت).

٥١٥٠.م– فەرموودەی: (جَعَلَ اللَّهُ الرَّحْمَةَ مِائَةَ جُزْءٍ) لە باسی (الرحمة واجبة لخلق الله تعالى)دا ڕابورد فەرموودەی یەکەم[٣].

٥١٥١.م– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِلَّهِ مِائَةَ رَحْمَةٍ أَنْزَلَ مِنْهَا رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ الْجِنِّ وَالإِنْسِ وَالْبَهَائِمِ وَالْهَوَامِّ فَبِهَا يَتَعَاطَفُونَ وَبِهَا يَتَرَاحَمُونَ وَبِهَا

---

[١] تقدم في مجلد أول تسلسل/٦ ل/٣٧ رقم/٣٧.

[٢] تجريد/٥ ل/٢٧١ رقم/٢٠١٢ = ٦٤٦٩، ٦٠٠٠. مسلم. توبة: ٦٩١٣.

[٣] تقدم في مجلد تاسع تسلسل/٩ رقم/٤٧١١.

تَعْطِفُ الْوَحْشُ عَلَى وَلَدِهَا وَأَخَّرَ اللَّهُ تِسْعًا وَتِسْعِينَ رَحْمَةً يَرْحَمُ بِهَا عِبَادَهُ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ. روى هذه الأربعة الشيخان والترمذي[٤]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا سەد ڕەحمەتی هەیە، یەك ڕەحمەتی لەو سەد ڕەحمەتە ناردۆتە خوارەوە بۆ ناو پەری و ئادەمیزادو گیانلەبەران و جانەوەرو مارو مێروو، جا بەهۆی ئەم تاقە ڕەحمەتەوەیە کە ئەمانە لەناو خۆیاندا ڕەحم بە یەکتری دەکەن و بەزەییان بە یەکتردا دێتەوە، تەنانەت ئەوەیش کە دڕندە بەزەیی بە بەچکەی خۆیدا دێتەوە هەر بەهۆی ئەم تاقە ڕەحمەتەوەیە، ئەو نەوەدو نۆ ڕەحمەتەکەی تریشی هەڵگرتووە، لە ڕۆژی ژینەوەدا ڕەحمیان پێ دەکا بە بەندەکانی خۆی! (ش/ت).

٥١٥٢.م- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ دَفَعَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى كُلِّ مُسْلِمٍ يَهُودِيًّا أَوْ نَصْرَانِيًّا فَيَقُولُ هَذَا فَكَاكُكَ مِنَ النَّارِ[٥]:

ئەبو مووسا (خودای لێ ڕازی بێ) لە خۆشەویستتەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): کاتێ ڕۆژی ژیانەوە هات خودای بالا دەست و خاوەن شکۆ گشت موسوڵمانێ یا جوولەکەیێ یا گاورێ دەداتە دەستی و پێی دەفەرموێ: ئەوا تۆم بەخشی و لە جیاتی تۆ بەم کابرایە جێگەکەی ناو درزەخی تۆ پڕ دەکەمەوە!. (م).

قورئان دەفەرموێ: {وَلَـا تَـزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْـرَى}. هیچ کەسێ - با گونەباریش بێ - گوناەو کۆڵی کەسێکی تر هەڵناگرێ، هەموو کەسێ گوناهی خۆی لە ئەستۆی خۆیەتی. فەلسەفەی ئەم فەرموودەیە ئەمەیە: خودا لە ئەزەلدا، بۆ هەموو کەسێ دوو جێگەی دروستکردووە، جێگەیێ لە بەهەشتاو جێگەیێ لە دۆزەخا، جا هەموو کەسێ لە ژیانی دنیای خۆیدا،

---

[٤] تجريد = مختصر صحيح البخاري/٥ ل/٢٠٥ رقم/١٩٢٢. مسلم. توبة: ٦٩٠٦-٦٩١١.

[٥] مسلم. توبة: ٦٩٤٢.

بەهۆی ئیمانەوە، یا بەهۆی کوفرەوە، یەکێ لەم دوو جێگەیە بۆ خۆی مسۆگەر دەکا، وە جێگەکەی تری زوو یا درەنگ بە چۆڵی دەمێنێتەوە!

جا خودا بۆ دەستی قەدرنان لە موسوڵمانان بە لوتفی خۆی، جێ و شوێنی جوولەکەو گاورەکانیش لە بەهەشتا خەڵات دەکا بە موسوڵمانان، هەتا بە چۆڵی نەمێننەوە، چونکە خۆیان بە دەستی خۆیان ئەو جێگانانەیان لە کیسی خۆیان داوەو جێگەی خۆیانیان لەناو دۆزەخا بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە، هەروەها خودا جێ و شوێنی موسوڵمانەکانیش لە دۆزەخدا دەدا بە کافرەکان هەتا بەچۆڵی نەمێننەوە، تا ئەو بەڵێنەی خودا کە داویەتی بە بەهەشت و دۆزەخ بێتەدی، کە فەرموویەتی پێیان: ولكليكما على ملءُها: ئەوەی کە لەسەر منە هەردوو لاتان، هەر کەسەتان لە ئەهلی خۆی پڕبکەم. جا ئەم بە دیمەن ئاڵوگۆڕە دەبێ بەهۆی دڵنیابوونی تەواوی موسوڵمانانەکان و، بەهۆی نائومێد بوونی تەواوی دۆزەخییەکان!

مەبەستی سەرەکیم لەم روونکردنەوەیە ئەم خاڵە گرنگەیە: لەم رۆژگارەی ئێمەدا سێ بەڵای گەورەی ماڵوێرانکەر رووی کردۆتە دینە پیرۆزەکەمان:

**یەکەم**: زوربەی رووناکبیرەکانمان غەربزەدەن و گوڵی موستەشریقەکانیان خواردووە.

**دووەم**: زوربەی زۆری موسوڵمانان لە کورۆك و ناوەڕۆکی ساخی ئیسلام باش تێنەگەیشتوون، شەڕە گەڕەکی نێوانیان لەسەر شتی لاوەکی دوژمن زۆر لێزانانە گەرمی دەکا بەتایبەتی شەڕەبیدعەتی نێوانی کۆن و نوێ.

**سێیەم**: پەڕۆبەسەری بێتەقوای زۆر پەیدا بوون، بۆ پارەو پوول خوشك لە برا مارە دەکەن، بازرگانی بە ئایینەوە دەکەن، بۆ نەگبەتی هەندێکیان وەك شەیتان زۆرزانن، بگرە مامۆستای شەیتانن، دوژمنیش لە خودای دەوێ کە درەختی پتەوی سەختی گەورەی داربەروو بە تەورێ ببڕێتەوە کە کلکەکەی لە خۆی بێ.

ئەم مەلا نامەلایانە مانیعیان نییە کە بە پارووێ چەور تەئویلی وا دوورو نالەبار بۆ ئایەتەکانی قورئان بکەن کە لە تەحریف و دەسکاری و گۆڕانکاری گەلێ خراپتربێ، هەتا بەوە زەیدو عەمر لە خۆیان رازی بکەن، یاخود مانیعیان نییە کە زوربەی سوننەتی حەزرەت و ڕێگەی رەهبەر بە درۆو دەلەسەو قسەی پڕو پووچ و ئەفسانەو فەرموودەی دەسهەڵبەس و حەدیسی مەوزووع دابنێن، تا بلێن: نوێخوازن!

وەلێ حاڵی موسوڵمانان هەر چۆنێ بێ (لەبەر ئەوەی کە ئیسلام تاقە ئایینی ساخی خودایە) خودا لەناویاندا دینی خۆی لەسەر شێوەیەکی راست و دروست هەتا نزیکی قیامەت ئاگاداریی دەکاو لە تەحریف و دەسکاری دەیپارێزێ و، مەلای لە خودا ترس و زانای دانای دڵسۆزی بۆ دەسازێنێ، رۆژێ لەناو عەرەبدا، رۆژێ لەناو کورددا، رۆژێ لەناو تورکدا، رۆژێ لە ئێران، رۆژێ لە میسر، رۆژێ لە ئەندەنووسیا، رۆژێ لە ئەلبانیا، رۆژێ لە بوخارا.. تاد، جا بەندەیش وەك دڵسۆزێکی ئێوەی موسوڵمان عەرزتان دەکەم:

(عینوانی گەورە گەورەی ناو کتێبە نوێکان فریوتان نەدا، بە تایبەتی گوێ بۆ پیاوی بێ تەقوا شل مەکەن، با بە دیمەن دەم لە بابەتە ئایینییەکانیش بکوتن! بۆ نموونە حەدیسی صەحیحی موسلیم و صەحیحی بوخاری کەم نین، دەبێ زۆر بەرێزو قەدرەوە تەماشا بکرێن. دەتوانم عەرزتان بکەم هەر کەس بەرێزێکی زۆرەوە تەماشای فەرموودە ساخەکانی حەزرەت نەکا ئەوە جێگەی باوەڕ نییە، بالافی ئەوەیشە لێبدا کە ئیمامی ئەعزەمی سەردەمی خۆیەتی، هەڵسەنگاندن و ساخکردنەوەی فەرموودەی حەزرەت پیاوانی خۆی هەیە، شوێنی خۆی هەیە، کتێبی خۆی هەیە، قسەلێکردنی بەبێ ڕێگەو جێگەی خۆی نیشانەی بێ تەقوایی و کەمتەرخەمییە!.

من نازانم هەندێ لەم مەلا نامەلایانە بۆ ئەوەندە پەرۆشن بۆ ئیسلام"! شەوو رۆژ خەوبەوەوە دەبینن ئیسلام لە ئەفسانەو پڕو پووچ و فێڵ و فەرەجی شێخە

دەسبڕەکانو مەلا کۆنە پەرستەکان پاك بکەنەوەو بیبەنەوە سەر ئیسلامە ساخو راستەکەی سەردەمی حەزرەتو یارانی کەچی کە دەیانجوولێنێ دەبینی ئامانجی سەرەکییان ئەوەیە کە سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گشتی فت کەنو قورئان - بەناوی تەئویلەوە - دەسکاری بکەن، لە جێگەی شەریعەتی خوداو پێغەمبەر بە یاسا دەسکردەکانی ئەورووپا کار بکەن، گوایە بەمە خۆمان دەبەینە ریزی پێشکەوتوانی جیهان!. (وەرگێڕ)

٥١٥٣.م- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَمُوتُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ إِلاَّ أَدْخَلَ اللَّهُ مَكَانَهُ النَّارَ يَهُودِيًّا أَوْ نَصْرَانِيًّا[٦]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو موسوڵمانێ کە دەمرێ خودا لە شوێنی ئەو جوولەکەیێ، یا گاورێ دەخاتە دۆزەخەوە (م).

٥١٥٤.م- عَنْ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ وَاللَّهِ لاَ يَغْفِرُ اللَّهُ لِفُلاَنٍ وَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَالَ: مَنْ ذَا الَّذِى يَتَأَلَّى عَلَيَّ أَنْ لاَ أَغْفِرَ لِفُلاَنٍ فَإِنِّى قَدْ غَفَرْتُ لِفُلاَنٍ وَأَحْبَطْتُ عَمَلَكَ. أَوْ كَمَا قَالَ: وفي رواية: لاَ يَسْتُرُ اللَّهُ عَلَى عَبْدٍ فِى الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوى هذه الثلاثة مسلم[٧]:

جوندوب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوێ دەڵێ بەخودا خودا لە فیسارەکەس خۆش نابێ، خودای گەورەیش دەفەرموێ: ئەوە کێیە کە سوێندم لێ دەخوا کە نابێ لە فیسارەکەس خۆشبم، دەسا وا لەو کەسە کە تۆ دەڵێی لیی خۆش نابم خۆش بووم، کردەوەی تۆشم - ئەی سوێند خۆر! - پووچو بەتاڵ کردەوە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یارێك ئاوای فەرموو، یا هەمان واتای بە لەبزێکی تر فەرموو لە گێڕانەوەیەکا: هەر بەندێ خودا لەم جیهانەدا پەردەی

---

[٦] مسلم. توبة: ٦٩٤٣.

[٧] مسلم. توبة: ٦٦٢٤.

لەسەر هەڵ نەداتەوەو گوناەو نەنگی بپۆشێ، مسۆگەر کە لەو جیهانیشدا پەردە لەسەر خراپەکانی هەڵ ناداتەوەو گوناەو نەنگی وەك دنیا بۆ دەپۆشێ(م).

٥١٥٥.م- عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: قَدِمَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِسَبْيٍ فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ السَّبْيِ تَبْتَغِي إِذَا وَجَدَتْ صَبِيًّا فِي السَّبْيِ أَخَذَتْهُ فَأَلْصَقَتْهُ بِبَطْنِهَا وَأَرْضَعَتْهُ. فَقَالَ: لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَرَوْنَ هَذِهِ الْمَرْأَةَ طَارِحَةً وَلَدَهَا فِي النَّارِ؟ قُلْنَا لاَ وَاللَّهِ وَهِيَ تَقْدِرُ عَلَى أَنْ لاَ تَطْرَحَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَلَّهُ أَرْحَمُ بِعِبَادِهِ مِنْ هَذِهِ بِوَلَدِهَا. رواه الشيخان[٨]:

عومەری کوڕی خەتتاب (خۆشنوودیی خودای گەورەو مەزنی لێبێ) فەرمووی: جارێ بڕکەیێ دیلیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ژنێکی منداڵ بە بەریان تیادا بوو، منداڵەکەی خۆیی لێ بەجێمابوو، لە عەزرەت بەچکەکەی هەر گڕی دەخوارد، بەناو ژنە دیلەکاندا، لە کوێ کۆرپەیەکی مەمکە خۆرەی دەست دەکەوت هەڵی دەگرتو دینووسان بە سینگو بەرۆکی خۆیەوەو مەمکی پێی دەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئێمەی فەرموو: ئایا بەرای ئێوە ئەم ژنە ئەگەر ساواکەی خۆی دەست بکەوێتەوە فڕەی دەداتە ناو ئاگرەوە؟. گوتمان: نەخێر، نە بەخوا هەتا بتوانێ شتی وا ناکا، هەرگیز لەو جگەر گۆشەیەی کە ئێستا ئاوا پەرۆشە بۆی تووڕ نادات! فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) دەسا زۆر باش بزانن کە خودا گەلێ بەرەحمترە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا هەتا ئەم ژنە لەگەڵ بەچکەکەی خۆیدا! (ش).

٥١٥٦.م- عَنْ أَبِي ذَرٍّ الْغَفَارِي (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: مَنْ جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَأَزِيدُ وَمَنْ جَاءَ بِالسَّيِّئَةِ فَجَزَاؤُهُ سَيِّئَةٌ مِثْلُهَا أَوْ أَغْفِرُ وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ ذِرَاعًا وَمَنْ تَقَرَّبَ مِنِّي

---

[٨] تجريد/٥ ل/٢٠٤ رقم/١٩٢١ = ٥٩٩٩ فتح. مسلم. توبة: ٦٩١٢. تحفة الأشراف: ١٠٣٨٨.

ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ مِنْهُ بَاعًا وَمَنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً وَمَنْ لَقِيَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطِيئَةً لاَ يُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَقِيتُهُ بِمِثْلِهَا مَغْفِرَةً. رواه مسلم والترمذي ولفظه: قَالَ اللَّهُ يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي غفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ وَلاَ أُبَالِي يَا ابْنَ آدَمَ لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غفَرْتُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي يَا ابْنَ آدَمَ إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الأَرْضِ خَطَايَا ثُمَّ لَقِيتَنِي لاَ تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً. نسأل الله واسع المغفرة آمين والحمد لله رب العالمين[٩]:

عدد أحاديث كتاب الأذكار والأدعية والاستغفار ثلاثة عشر ومائتان (٢١٣) فقط.

ئەبو زەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای سەردارو سەروەر دەفەرموێ: هەر کەسێ چاکەیێ بکا یەك بەدە پاداشی دەدەمەوە یاز یاتریش، وە هەر کەسێ خراپەیێ بکا یەك بەیەك پاداشی دەدەمەوە، یالێی خۆش دەبم، وە هەر کەسێ بستێ لەمن نزیك ببێتەوە من باڵێ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر کەسێ باڵێ لەمن نزیك ببێتەوە من دوو شاباڵ لەو نزیك دەبمەوە، ئەگەر کەسێ بەڕۆیشتنی ئاسایی بێ بۆ لام، من بە هەڕاکردن دەچم بۆلای. هەرکەسێ نزیك بە پڕی زەوی بە گوناهەوە بێ بۆ مەیدانی هەق‌و حیسابی من (بەو مەرجە کەس نەکا بە هاوبەشم) هیچ مانیعێ نییە کە بەقەد گوناهەکانی بەلێبووردنەوە بچم بەپیریەوەو، مادەم هاوبەش بۆ من دانەنێ دەتوانم لێی خۆش ببم. (م/ت) گفتەی (ت): خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد!هەتا تۆ لەمن بپاڕێیتەوەو هیوات بەمن هەبێ‌و، خۆت بە بەندەی من بزانی‌و من بەخودای خۆت بزانی، منیش لە تۆ خۆش دەبم، ئیتر کردەوەت هەرچۆن بێ‌و هەرچی بێ دەربەستی ئەوە نیم‌و هەرباکیشم نییە، ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر بێتو تۆ بەپڕ نزیکی زەوی تاوانەوە بێیت بۆ دیوانی من (بەو مەرجە هاوەڵت بۆمن بڕیار نەدابێ) ئەوا منیش بەنزیکی پڕزەوی لێخۆشبوونەوە دێم بەپیرتەوە!. تەماشای فەرموودەی یەکەمی نامەی یادو زیکری خودا بکە ماموستای ماموستایان مەلارەشید

[٩] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٧٧٤. ابن ماجه. أدب: ٣٢١. تحفة الأشراف: ١١٩٨٤.

بەگی بابان لە کۆتایی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (خودای لێ رازی بێ) بۆ چ عەبدێکی ئەوەندە خراپم؟! بە موقابیلی ئەم هەموو مەرحەمەتەی دا، بەو ئیقتیدارەی کەبێ نیهایەتە، چ جەسارەت و بێ حەیاییە کە لەگەڵ ئەم هەموو بێ دەسەڵاتی و زەبوونییە کە هەمە گوناه ئەکەم و کوفرانی نیعمەتیی بێ پایانی = ئەکەم = !! خوا رەحممان پێبکا، ئامین!.

سوبحانەڵڵا! ئەم پیاوە چۆن پیاو خاسێك و چۆن زمانزانێ بووە، ئەگەر من ئەم دەقەم بنووسیبایە رەنگ بێ ئاوابم نووسیبایە: بۆچی ئەوەندە عەبدێکی خراپم، لە موقابیلی ئەو هەموو مەرحەمەتەی ئەوەوە، لەگەڵ ئەم هەموو بێ دەستەڵاتی و زەبوونیی یە کە هەمە، دەچم گوناه و کوفرانی نیعمەتی بێ پایانی ئەو دەکەم، لەگەڵ ئەو ئیقتیدارەبێ نیهایەتەی کە هەیەتی، ئەمە چ جەسارەت و بێ حەیاییێکە.

وەلێ دەقە ئەصڵەکە تا بڵێی رەوانبێژە، زمانێکی پاراوی رەسەن، دوورە لە رەشۆکێتی و رەمەکێتی، هەر لەبەر ئەوەیشە مرۆی رەشۆکی چەژی لێ وەرناگرێ. لەو باوەڕەدام مامۆستای بابان لەسەر ئاماژەی مامۆستا مەلا حوسەینی پیسکەندی (رەزای خودایان لێبێ) کە ئەم کتێبەی ناوناوە (اقتران النيرين في مجمع البحرين: بەرابەر وەستانی خۆرو مانگ لە جەمسەری دوو دەریادا) بە باوەڕی من لە دانانی ئەم ناوەدا، هەم خۆی هەم مامۆستا مەلا حسێن لەو موحەددەسە مولهەمانەن کە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لە شانیاندا دەفەرموێ: (قد كان في الأمم قبلكم محدثون فإن يكن في أمتي منهم أحد فان عمر بن الخطاب منهم: قال ابن وهب: تفسير محدثون ملهمون ـه (ب(٥ ز/٤ ل/٢١ ف/٣).

لە راستی دا ئەم کتێبە لە زۆرلاوە دوو چرای رۆشن و دوو دەریای هاوسنوورە، کۆی بوخاری و موسلیمە، عەرەبی و کوردییە، دین و دنیایە، ئایین و زمانەوانییە، کۆن و نوێیە، مەجمەعی حەدیسە موتتەفەقو عەلەیهییەکانی بوخاری و موسلیمە، مەجمەعی (ما انفرد به البخاري وما أنفرد به مسلم)ە، بە ئیعتیبارێکی تر پەیوەندیی نێوانی ئوممەتە لەگەڵ حەزرەتدا،

گەرچی مامۆستا موحەممەد عەلی قەرەداغی، لە راژەو خزمەتی ئەم کتێبەدا کۆتایی نەکردووە، گەڵ بەجوانی، بەپێی حاڵو تەوانا لەسەری نووسیوەو هەڵە بژێریو بژاری کردووە، وەلێ کتێبەکە ئەوەندە فرە لایەنە بە تاقە کەسێ زەوت ناکرێ، بۆیە دەڵێم: بە باوەڕی من ئەم زیادەیە - ئەکەم = زیادەو پێویست نییە، مامۆستا محمد علی قەرەداغی زیادی کردووە لەسەر ئەصڵەکە، چونکە ئەمە فارسی ئامێزە، لە چەشنی ئەم شیعرەی سەعدییە (خودای لێ رازی بێ) کە دەفەرموێ:

کرم بین ولطف خداوندگار

گنه بندە کردە استو أوشرمسار

لەم شیعرەدا فیعلی (بین) لە کۆتایی نیوەی یەکەم کرتاوە، هەتا دوو بارە نەبێتەوە، هەروەها (کردە) لە کۆتایی نیوەی دووەم کرتاوە، ئەم جۆرە تەعبیرە هەتا ئێستا هەر باوە. وەك ئیقباڵنامە دەفەرموێ:

چارم ناچارە خەلاقی نەکبەر

منی کرد بە سەگ، نەتۆش بە بەشەر

خۆزگەم ئەم یادگارە شاکارە جوانە بەم سێ شێوەیە لە چاپ دەدرایەوە:

١- کوردییەکەی بە تەنیا، کوردییەکی پەتی پتەوی رەسەنی جوانی رێکوپێکی رەوانبێژ، ئەمەش قەیدی نییەو دروستە، نەدەبێ بە تەحریفو گۆڕانکاریو نە دەبێ بە ناهەقی کردن لە دانەر، چونکە دەقی ئەصڵەکەی ئەو بەچاپی یەکەم دەپارێزرێو جێگەی خۆی دەگرێ، هەروەك چۆن شیعرەکانی خانیو عوریانو مەولوی لە بادینانیو لوڕیو هەورامییەوە، بۆ سوودی گشتی کراون بەزاری سۆرانی ئەمیش ئاوا بەڵام نابێ لە مەبەستی مامۆستای بابان لابدرێ، مەگەر بۆ ئەمەیان ئاماژە بگرێ، وەلێ گۆڕینی وشەو شێوازو دارشتن ئاماژەی ناوێ.

٢- عەرەبییەکەی بەتەنیا. بەڵام لەگەڵ لێکۆڵینەوەو تەحقیق و تەدقیقێکی چاك و جواندا، هەتا ببێ بە کتێبێکی عومدەی ئیسلامی، کە جاماعی هەموو حەدیسەکانی بوخاری و موسلیم بێ، تەنانەت ئەگەر سەهۆی، بەسەرچوونێ، هەڵەیێ، تێکەڵی و پێکەڵییەك هەبێ، گشتی چاك بکرێ و لەبەر سەرچاوەو نوسخەی باوەڕپێکراوی صەحیحەین - وەك جەلالەین - بەناوی دوو کەسەوە بڵاو بکرێتەوە. ئەوجا لەسەر شێوەیەکی لایەق و شیاو لە چاپخانەیەکی چاکدا ئەگەر لوا چاپ بکرێ. وەڵێ ئەمە بە هەموو کەسێ ناکرێ، زانایەکی گەورەی فەرموودەزانی دەوێ!

٣- عەرەبییەکی یوختەکراوی لەگەڵ کوردییەکی پەتی پتەوی هاوچەرخدا، بەڵام لەحاڵی وادا بۆنی کتێبی کوردی لێ دێ، لەبەر ئەوە کەسی تر کڕیاری نییەو کاری پێی نییە، خەڵکی وەکی ئێمە نین کە تاهی خەڵك وەستابێ هی خۆمان ناخوێننەوە!

لەبەر ئەمە لەم حاڵەدا کاری بەشەرحی عەرەبی نییە، ئەگەر بە کوردی پەراوێزو ڕاڤەی لەسەر بکرێ قەیدی نییە!

هەندێ کەسی لە گوێی گادا نووستوو وا دەزانێ کەمن زۆر بایەخ دەدەم بەلایەنی کوردایەتی، ئەمانە لەگیانی ئەم چەرخەوە دوورن، هێشتا لە چەرخی دەقائیقول ئەخباردا دەژین، بەخودا ئێمەی مەلا لە هەموو کەسێکی تر بەر پرسیارترین، ئەگەر خوانە خواستە گەلی کوردپشتی کردە ئایین و ڕووی کردە شتی تر، چونکە پەندو ئامۆژگاری کاتێ کار دەکا کە گوێگرو خوێنەر چەژی لێ وەربگرێ، نەوەك ئەوەندە لێی بێگانەبێ کە گەمەی پێی بێ، بەڵێ ئەگەر ئێمەی مەلای کورد لەسەر ئەم ئەقڵەی ئێستامان بین و دینە پیرۆزەکەمان بە زمانێکی کوردی شیرینی پەتی ڕوون نەکەینەوە بۆ براکوردە موسوڵمانەکانمان، کاتێکمان زانی مەلا ژنیش نوێژمان لە پشتەوە ناکا، چجای ڕۆشنبیرەکانمان، دەستم بەهیچ لایەکی تردا ناگا، تا هەندێ سەرنجی خۆم لەسەر ئەم شاکارە جوانە بنووسم، بۆیە جارو بار لەبەر خۆمەوە لەمێدا

ئاوڕێکی بۆ دەدەمەوە، بەڵام داخەکەم ئێمەی کورد کە باوەڕو بتمانەمان بە خۆمان نییە، ئەگەر توێژینەوەیەکی وا لەسەر باس وخواسێ بنووسین، دەڵێن: ئەها کردی بە چێشتی مجێور![⊗]

کەچی وەکی تریش هەزار باس و خواسی لاوەکی لەناو کتێباندا بە زمانی تر، دەخوێنینەوەو خۆش خۆش دەڵێین: دەم و دەس خۆش، لاباسی لە سەرباسی خۆشترە سەیر دەکەین جەلالەین چەندە کورت و پوختە، لەگەڵ ئەوەشدا، پڕە لە لاباسی نەحوو صەرف و زمانەوانی، تەنانەت هەقایەتیشی تیادایە، هەزار رەحمەت لە گۆڕی ئایەتوڵڵای مەردۆخ کە دەفەرموێ:

لەم خەوگای چەرخا منی شەیدانی
چاوێکم کردەوە لە بۆ بینانی
هەرچەنم کۆشا کەس خەوەرەو نەو
لە تەنیانیا منیچ چووەمە خەو!

دانەر لێرەدا دەفەرموێ: (خودای لێ رازی بێ) ژمارەی فەرموودەکانی نامەی زیکرو نزاو پاڕانەوە تەنیا (٢١٣) دووسەدو سیازدە فەرموودەیەو بەس.

---

[⊗] نموونەی خۆ بەبچووک زانینمان و خەڵك بەگەورە تەماشاکردن: (لەپاش دەرکردنی پۆستاڵی ڕەشی بەعثی لەخاکی پاکی کوردستان، سەدام دەستەیەکی نارد بوو بۆ گوفتوگۆ لەگەڵ سەرکردە کوردەکاندا، بەسەرۆکایەتی عەمیدێکی عەسکەری عەرەب. سەیر لەوەدا بوو، ئەو هەموو بەرپرس و ئەفسەرو گەورە پیاوە کوردانە، خۆش خۆش بەو عەرەبە بەعثییەیان دەگوت: (سیدي) واو (سیدي) وانا. ئەمە لەکاتێکا کەلەناو بنکەو پێگاکانی خۆیانا بوون ئاوابوون، ئەی دەبێ لەبەغدا چۆن بن). وەرگێڕ – ٢٠٠٨/٨/٦

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی زوهدو دنیا نەویستیو گوێ بە دنیانەدانو دڵ لاوێنەکان (الرقاق)

(ئەم نامەیە حەوت باسو پایانێکە)

## ٩٤) بەشی یەکەم: باسی هەڕەشەکردن لە دەستەشکێنبوون بەخۆشی جیهانەوە

## كتاب الزهد والرقائق (وفيه سبعة فصول وخاتمة)

## الفصل الأول: في التحذير من الدنيا

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ مَتَاعُ الْغُرُورِ - سورة آل عمران - ١٨٥/٣}. ← (ب ٦ ز - ٤ ل - ٩٤ ف - ٣٦).

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَاللَّهُ عِنْدَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ}سورة التغابن. ١٥/٦٤.

واتە: بزانن ماڵو منداڵ، کە دوو بەهرەی خۆشەویستن لەلای ئێوە، گەرچی مایەی ئاسایشو هۆی ئارایشی ژیانی جیهانن و بۆ خواپێداوانیش گەلێ جار ماڵی ڕەحمەتو منداڵی ڕەحمەتن، بەڵام لە بنەڕەتدا هۆی تاقیکردنەوەی ئێوەن، ئەوەی خۆشەویستیی خوداو پێغەمبەری خودا بگۆڕێتەوە بە خۆشەویستیی ماڵو منداڵ ئەوە تووشی ئاژاوەیەکی گەورە بووەو لەو پاداشە گەورەیە بێ بەشە کە لەکن خودا هەیە.

٥١٥٧.م- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَنْكِبِي فَقَالَ: كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ ، أَوْ عَابِرُ سَبِيلٍ، وَعُدَّ نَفْسَكَ فِي أَهْلِ الْقُبُورِ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: إِذَا أَمْسَيْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الصَّبَاحَ ، وَإِذَا أَصْبَحْتَ فَلاَ تَنْتَظِرِ الْمَسَاءَ ، وَخُذْ مِنْ صِحَّتِكَ لِمَرَضِكَ ، وَمِنْ حَيَاتِكَ لِمَوْتِكَ[1].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سەرشانی گرتمو فەرمووی: لەم جیهانەدا خۆت بە ئاوارە دابنێ، یا خۆت بە

[1] تجريد/٥ ل/٢٥٩ رقم/١٩٩٨ = ٦٤١٦. {رياض/٢ ل/١٣٣ رقم/٥٧٤ تسلسل/٦٥ + ٤٧١ ز/٥٥ بەرگی/٢}.

ڕێبوارو ڕەفتەنی بزانە! بەڵکوو لەوە پتریش، وای دانێ کە مردووی ناو گۆڕستانی، کەواتە: لەم کاوانسەرایەدا پشتی لێ مەکەرەوەو بەماڵی خۆتی مەزانە! ئیبنو عومەر خۆشی دەیفەرموو: ئێواریێ بەتەمای بەیانی مەبە، بەیانی بەتەمای ئێواریێ مەبە، کاتێ لەشت ساخە هەوڵ بدە بۆ کاتی نەساغیت، ژیانت بەهەل بزانەو هەوڵو کۆششی تیا بدە بۆ پاش مردنت! (ب).

٥١٥٨.م- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ ، الصِّحَّةُ وَالْفَرَاغُ. رواه البخاري والترمذي[٢]:

ئیبنوعەبباس (خودایان لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دوو بەهرەی گەورەو گرانبەها هەن، زۆر کەس لەو دوو بەهرەیەدا بە هەڵەدا چوونو هەرزان فرۆشیان کردوون، وەك کەسێ لە سەودایە کاتێ بشکێ ئاوا:

یەکەمیان: تەندروستییە،

دووەمیان: دەست بەتاڵییە، کەسێ لەشی ساخو دەستی بەتاڵ بێو تێنەکۆشێ بۆرەزای خودا ئەوە ئەو دوو نیعمەتەی تالانفرۆش کردووە! (ب/ت).

٥١٥٩.م- فەرموودەی (قدم ابو عبیدة (رَضِي اللهُ عَنهُ) بمال من البحرین)[٣].

لەم شوێنەدا رابورد: کیتابی جیهاد باسی جزیە. بەرگی هەشتەم.

٥١٦٠.م- ولمسلم: إِنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ وَإِنَّ اللَّـهَ مُسْتَخْلِفُكُمْ فِيهَا فَيَنْظُرُ كَيْفَ تَعْمَلُونَ فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ فَإِنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ[٤]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕاستە کە دنیاو ماڵی دنیا میوەیەکی سەوزی دڵگیری شیرینو خۆشە، وەلێ بەلاشو حەلاش نییەو

---

[٢] تجريد = مختصر صحيح البخاري/٥ ل/٢٥٩ رقم/١٩٩٧.

[٣] تقدم في مجلد ثامن تسلسل/٦٦ رقم/٤٥٢٣.

[٤] مسلم. ذكر ودعاء: ٦٨٨٣.

لێپرسینەوەی هەیە، چونکە خودا چین لەدوا چین ئێوە دەکا بە جێگەداری پێشینان تیادا، تا بڕوانێ کە کردارو ڕەفتارتان چۆنە، کەواتە پارێز لە دنیا بکەن، هەروەها ئاگاداری خۆتان بکەن لە داوی ژنان، بەتایبەتی هاوسەرەکانتان، چونکە یەکەم ئاژاوەیێ کە نەوەی ئیسرائیل دووچاری بوون ئەوە بوو کەوتنە داوی ژنانەوە (م).

٥١٦١.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الْكَافِرِ[٥]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جیهان زیندانی موسوڵمانەو بەهەشتی کافرانە (م/ت).

٥١٦٢.م- عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ بْنِ شَدَّادٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ الرَّكْبِ الَّذِينَ وَقَفُوا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى السَّخْلَةِ الْمَيِّتَةِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَتَرَوْنَ هَذِهِ هَانَتْ عَلَى أَهْلِهَا حِينَ أَلْقَوْهَا. قَالُوا: مِنْ هَوَانِهَا أَلْقَوْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَالدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ عَلَى أَهْلِهَا. رواهما مسلم والترمذي[٦]:

موستەویدی کوڕی شەدداد (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆم یەکێك بووم لەو دەستە سوارە کە لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر کەلاکی کارژەڵە مردارەکە ڕاوەستاین، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کردی بەنموونە بۆ سووکیی دنیا لەلای خوداو فەرمووی: ئایا ئێوە لەو باوەڕەدان کە خاوەنی ئەم کەلاکە لەبەر سووکیو هیچو پووچی تووڕیان داوە. گوتیان: بەڵێ. ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە لەبەر ئەوە برکیان داوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سا ئەم دنیایە لەلای خودا سووکترو هیچو پووچترە هەتا ئەم کەلاکە لەلای خاوەنەکەی! (م/ت).

٥١٦٣.م- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ[٧]:

---

[٥] مسلم. زهد ورقاق: ٧٣٤٣.

[٦] مسلم. زهد ورقاق: ٧٣٤٤.

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

سەهلی کوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ئەم جیهانە لەلای خودا بایەخی باڵی مێشوولەیەکی ببوایە، یەك قوم ئاو چییە خودا لەم دنیایە نەیدەدا بە هیچ بێ باوەڕێ! (ت-س/ص).

٥١٦٤.م- عَنْ مُسْتَوْرِدًا أَخِي بَنِي فِهْرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا الدُّنْيَا فِي الآخِرَةِ إِلاَّ مِثْلُ مَا يَجْعَلُ أَحَدُكُمْ إِصْبَعَهُ فِي الْيَمِّ فَلْيَنْظُرْ بِمَاذَا يَرْجِعُ[٨]:

موستەوریدی کاکەی بەنی فیهری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم جیهانە لەچاو ئەو جیهاندا وەك ئەوە وایە کە یەکێکتان پەنجەیەکی خۆی بژەنێ بە دەریادا، جا باش سرنج بدەن دەبێ پەنجەی چەنێ ئاو هەڵبگرێ! واتە: ئەو تەڕییەی کە بە پەنجەیەوە دەنووسێ لە ئاوی دەریاکە، ئەوە نموونەی دنیایە، مەندەی ئاوی ناو دەریاکەیش نموونەی ئەو جیهانە (ت-س/ص) ئەم فەموودەیە ئیمامی موسلیمیش (ڕەزای خودای لێبێ) گێڕاویەتەوە تەماشای (كتاب الجنة وصفة نعيمها) بکە، باسی (باب فناء الدنيا وبيان الحشر يوم القيامه).

٥١٦٥.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلاَ إِنَّ الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ، مَلْعُونٌ مَا فِيهَا إِلاَّ ذِكْرَ اللَّهِ وَمَا وَالاَهُ وَعَالِمًا أَوْ مُتَعَلِّمًا[٩]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): بزانن کە دنیاو هەرچی وا لە دنیادا هەمووی نەحلەتیو نەفرین لێکراوە، تەنیا ئەم دووشتە نەبێ:

یەکەم: یادو زیکری خوداو ئەوەی دەبێ بە مایەی ڕەزای خودای گەورە.

دووەم: مامۆستاو فەقێ! (ت-س/ح).

---

[٨] مسلم. جنة ونعيمها: ٧١٢٦. ترمذي. زهد: ٢٣٢٣. ابن ماجه. زهد: ٤١٠٨.

[٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥١٦٦.م- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الزَّهَادَةُ فِي الدُّنْيَا لَيْسَتْ بِتَحْرِيمِ الْحَلَالِ وَلاَ إِضَاعَةِ الْمَالِ وَلَكِنَّ الزَّهَادَةَ فِي الدُّنْيَا أَنْ لاَ تَكُونَ بِمَا فِي يَدَيْكَ أَوْثَقَ مِمَّا فِي يَدَيِ اللّٰهِ وَأَنْ تَكُونَ فِي ثَوَابِ الْمُصِيبَةِ إِذَا أَنْتَ أُصِبْتَ بِهَا أَرْغَبَ فِيهَا لَوْ أَنَّهَا أُبْقِيَتْ لَكَ[١٠]:

ئەبو زەڕ (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) لە حەزرەتەوە (درودو سۆزو بەزەیی خودای لێبێ) دەفەرموێ: نەویستیو تەرکی دنیا بەوە نابێ کە حەڵاڵ لە خۆت حەرام بکەی، یا ماڵی خۆت بەفیڕۆ بدەی بەمو بەو، بەڵام دنیا لەبەرچاوکەوتنو گوێ پێ نەدان بەدنیا ئەوەیە کە چاوت لە خێرو خێرات نەترسێ، هەمیشە پشتت بەخودا قەوی بێ، بە ئومێدی ئەو خێرو خۆشییەی کەوا لە دەستی خودادا گوێ بەوە نەدەی کەوا لە دەستی تۆداو چاوت نەترسێو خەرجی بکەی بۆخودا،ئەمە لەلایێ، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر تووشی وەیێ، قۆرتێ، موصیبەتێ بووی، دەشێ ئەوەت لەبەرچاوبێ: مادام ڕەزابە فەزای خودا دەبێ بەمایەی پاداشی باشی خودا بەو موصیبەتە ڕازی بیتو ڕوودانەکەیت پێ باشتربێ هەتا ئەوە کە ئەو موصیبەتە نەقەومایە (ت-س/غریب).

٥١٦٧.م- عَنْ كَعْبِ بْنِ عِيَاضٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ أُمَّةٍ فِتْنَةً وَفِتْنَةُ أُمَّتِي الْمَالُ[١١]:

کەعبی کوڕی عییاض (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر گەلێ فیتنەیێ، فیتنەی گەلی منیش ماڵە (ت-س/ص).

٥١٦٨.م- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَتَّخِذُوا الضَّيْعَةَ فَتَرْغَبُوا فِي الدُّنْيَا. روى هذه الستة الترمذي[١٢]:

---

[١٠] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ماڵ پەرست مەبن مەبادا دنیا ببێ بە ئاواتی هەرە گەورەتان! (ت- س/ح).

٥١٦٩.م- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْمُكْثِرِينَ هُمُ الْمُقِلُّونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، إِلاَّ مَنْ أَعْطَاهُ اللَّهُ خَيْرًا ، فَنَفَحَ فِيهِ يَمِينَهُ وَشِمَالَهُ وَبَيْنَ يَدَيْهِ وَوَرَاءَهُ ، وَعَمِلَ فِيهِ خَيْرًا. رواه البخاري[١٣]:

ئەبو زەڕ (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: شەوێ لە شەوان دەرچووم، کە تەماشام کرد وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە تاقی تەنیا لە خڕەبەرداوییەکەی مەدینە دەڕواو کەسی تری لەگەڵ نییە، زەینم بۆ ئەوەچوو کە حەزناکا کەسی تری لەگەڵ بڕوا، لەبەر ئەوە دوورو نزیك لە سێبەری ئەو شوێنانەوە کە مانگە شەوەکە نەیدەگرتەوە شوێنی کەوتم، بەنیازی ئەبو ئەگەر شتێ رووی دا لێیەوە نزیك بم، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوڕی دایەوەو منی دیو فەرمووی: ئەوە کێیە؟ عەرزیم کرد: منم ئەو زەڕم خودا بمکا بە قوربانت. فەرمووی: (وەرە) تاوێ لە خزمەتیدا رۆیشتم فەرمووی: لە راستیدا لە رۆژی ژیانەوەدا داراکان نەدارانو لە دنیادا کێ دەوڵەمەندترە لە قیامەتدا لە هەموو کەسێ هەژارترە، مەگەر کەسێ کە خودا ماڵی باشی پێ بدا، ئەویش بەهەر چوارلادا داغانی بکا، بەراستو بەچەپا لە رێگەی خودادا بیدا بەمو بەوو بیبەخشێتەوەو بۆ کاری خێر درێغی نەکا. ئەوجا تاوێکی تر لە خزمەتیدا رۆیشتم.

فەرمووی: تۆ لێرە دانیشە لە شوێنێکی تەختانیدا دانیشانم، کە دەورپشتی بەردانی بوو، فەرمووی: ئا لێرەدا دانیشەی هەتا خۆم دەگەڕێمەوە بۆلات، ئەوجا خۆی لەبەر دەلانەکەوە رۆیشت، تا لەبەر چاوم گوم بوو، زۆری خایاند هەر نەهاتەوە، لە دواییدا کە هاتەوە گوێم لێی بوو بەدەم رێوە

---

[١٣] تجريد/٥ ل/٣٠٨ رقم/٢٠٥١ = ٦٦٣٨، ١٤٦٠. {مسلم. زكاة. باب تغليظ عقوبة من لايؤدى الزكاة رقم/٩٩٠ — هامش التجريد رقم/٢٠٥١}

دەیفەرموو: بازیناییش بکاو بادزیش بکا! کە گەیشتەوە لای من خۆم پێ ڕانەگیرا گوتم: قوربان! خودا بمکا بە بالاگەردانت، ئەوە لە قەراخی بەردەلانەکەدا قسەت لەگەڵ کێ دەکرد، گوێم لێ نەبوو کەسێ گوفتو گۆت لەگەڵدا بکا، فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو، لە تەنیشتی بەردەلانەکەدا خۆی پێ نیشان دام‌و فەرمووی: پێم: ئەی موحەممەد! مژدە بدە بە گەلی ئیسلامی خۆت: کە هەر کەسێ لەسەر موسوڵمانەتی بمرێ، زوو یا درەنگ دچێتە بەهەشت، دیارە هەر کەسێ لەسەر موسوڵمانەتی بمرێ لەسەر فرەخوایی‌و بێ بڕوایی نامرێ، منیش گوتم: ئەی جوبرائیل! ئەوەی لەسەر موسوڵمانەتی بمرێ با دزی‌و حیزیش بکا هەر دەچێتە بەهەشت؟ فەرمووی: ئا، دیسان گوتمەوە: بادزی‌و حیزیش بکا؟ فەرموویەوە: ئا، بادزی‌و حیزیش بکا سەرەنجام هەر دەچێتە بەهەشت، دیسان لەخۆشی ئەم مژدەگەورەیە بۆ دڵنیا بوونی تەواوی لێم پرسییەوە: هەرکەسێ بە موسوڵمانی بمرێ، بادزی‌و حیزیش بکا هەر دەچێتە بەهەشت، فەرمووی: بەڵێ، با ئەرەقیش بخواتەوە (ش).

٥١٧٠.م- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ كَانَ لابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لاَبْتَغَى ثَالِثًا ، وَلاَ يَمْلأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ[١٤]:

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گریمان ئادەمیزاد پڕ دوو شیو زێڕی هەبێ هەوڵ‌و تەقەللا دەدا بۆ پڕشیوێ تریش! ئادەمیزاد بەهیچ تێر ناخوا، هەر هەڵپە دەکا بۆ پڕوپیتی دنیا تا دەمرێ‌و چاوی پڕ دەبێ لە گڵی گۆڕ، هەر کەسێکیش لەهەر گوناهێ تەوبە بکا - وەك ئەوە تەوبە لە چاوچوویی‌و چاوچنۆکی بکا - خودا تەوبەی لێ گیرا دەکا (ش/ت).

٥١٧١.م- وَخَطب ابْنَ الزُّبَيْرِ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) عَلَى الْمِنبَرِ بِمَكَّةَ فِي خُطْبَتِهِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ ابْنَ آدَمَ أُعْطِيَ وَادِيًا مَلآنَ مِنْ

---

[١٤] تجريد/٥ ل/٢٦٥ رقم/٢٠٠٦ = ٦٤٣٨، ٦٤٣٦، ٦٤٣٧. مسلم. زكاة: ٢٤١٢ — ٢٤١٥.

ذَهَبٍ أَحَبَّ إِلَيْهِ ثَانِيًا ، وَلَوْ أُعْطِيَ ثَانِيًا أَحَبَّ إِلَيْهِ ثَالِثًا ، وَلاَ يَسُدُّ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ. رواهما الشيخا والترمذي[١٥]:

ئیبنو زوبەیر (خودایان لێ رازی بێ) سەرکەوتە سەر مینبەرکەی مەککە دوانێکی دا، فەرمووی: ئەی خەڵکینە! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەم ئادەمیزادە ئەوەندە چاوچنۆكو بەتەماحە ئەگەر پڕ بە شیوێ زێڕی هەبێ تێری پێ ناخوا، بەڵکوو حەزدەکا کە بیکا بە دوو شیو، هەروەها ئەگەر دوو شیوی هەبێ حەز دەکا کە بیکا بەسێ شیو، وە هەروەها هەتا پتری هەبێ هەوڵو هەڵپە بۆ پتردەدا، ئیتر مەگەر گڵ چاوی ئادەمیزاد پڕبکا، وەلێ خودا بەڕەحمە لەبەر ئەوە هەرکەسێ رووی لە خودابێو لە گوناه پەشیمان ببێتەوە خودا پەشیمانییەکەی گیرا دەکا (ش/ت).

٥١٧٢.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ وَالْقَطِيفَةِ وَالْخَمِيصَةِ ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ لَمْ يَرْضَ[١٦]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پیاوی پارە پەرستو پولەکی داوەشێو عەمری نەمێنێ، هەر خەریکی چڵکاو خواردنو شرە خۆرییە، بەندەیی خودای لەبیرنییە، دەڵێی نۆکەری ئەڵقە بەگوێی گوورووونیە، هەر چاوی لە بەرژەوەندی خۆیی یە، گوێ لە مشتی نەوسنییە، بەشی بدرێ مەمنوونییە، بەشی نەدرێ لەگەڵ دوژمنییە (بوخاری – رەحمەت لە گۆڕی نازای).

٥١٧٣.م- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: لَوْ كَانَ لِي مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَبًا لَسَرَّنِي أَنْ لاَ تَمُرَّ عَلَيَّ ثَلاَثُ لَيَالٍ وَعِنْدِي مِنْهُ شَيْءٌ ، إِلاَّ شَيْئًا أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ. رواهما البخاري[١٧]:

---

[١٥] مسلم. زكاة: ٢٤١٤. بخاري. رقاق: ٦٤٣٦.

[١٦] تجريد/٣ ل/٣١٤ رقم/١١٨٨ = ٢٨٨٧، ٢٨٨٦، ٦٤٣٥ (من المتفق عليه ما قرره العسقلاني في خاتمة كتاب الجهاد – المترجم).

[١٧] تجريد/٣ ل/١٤٠ رقم/١٠٤٧ = ٢٣٨٨ فتح.

دیسان لەوەوە حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: گریمان بەقەی کێوی ئوحود زێرم هەبێ، حەز دەکەم لەماوەی سێ شەودا گشتی دابەش بکەم لە رێگەی خودادا، وە هیچی لەلای من نەمێنێ، مەگەر ئەو چەردەیەی کە هەڵیبگرم بۆ دانەوەی قەرزێ، یا بۆ جێبەجێکردنی مافێکی رەوا! (ب).

٥١٧٤.م– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَلْبُ الشَّيْخِ شَابٌّ عَلَى حُبِّ اثْنَتَيْنِ طُولُ الْحَيَاةِ وَحُبُّ الْمَالِ. رواه الشيخان والترمذي[١٨]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رۆژ بەرۆژ دڵی پیر بۆ خۆشەویستیی ئەم دوو شتە تادێ گەنج دەبێتەوە: بۆ تەمەنی درێژو، بۆ ماڵی زۆر. (ش/ت) لە گێڕانەوەیەکی تری شەیخەیندا: بۆ خۆشەویستیی جیهانو، بۆ هیوای دوورو درێژ.

٥١٧٥.م– ـ (ب – ٧ ز – ٨٤ ل – ٢٦٢ ف – ١)[١٩].

لێرەدا دەفەرموێ: گفتەی (لەفظ)ی موسلیم (رەزای خودای لێبێ) ئاوایە: بەندە هەر دەکوڕوزێتەوەو دەڵێ: ماڵەکەم واو ماڵەکەم وا، ئاخر ماڵەکەی کامەی هی ئەوە ئەم سێ شتەی لێ بترازێ:

یەکەم: ئەوەی کە دەیخواو لەناوی دەبا.

دووەم: ئەوەی کە دەیپۆشێو کۆنی دەکاو دەیدڕێ.

سێیەم: ئەوەی کە دەیبەخشێو دەیکا بە چاکەو پاشەکەوتی دەکا بۆ رۆژی پاشە رۆژی، ئیتر هەرچی لەم سێ شتە بترازێ ئەوە لەماڵی ئەو دەردەچێو کە دەمرێ بەجێی دەهێڵێو دەبێ بەهی کەسێکی تر، میراتبەر دەیبا بۆ خۆی.

٥١٧٦.م– عَنْ عَبْدُ اللّهِ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيُّكُمْ مَالُ وَارِثِهِ أَحَبُّ إِلَيْهِ مِنْ مَالِهِ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّهِ مَا مِنَّا أَحَدٌ إِلاَّ مَالُهُ أَحَبُّ إِلَيْهِ. قَالَ: فَإِنَّ مَالَهُ مَا قَدَّمَ ، وَمَالُ وَارِثِهِ مَا أَخَّرَ. رواه البخاري[٢٠]:

---

[١٨] تجريد/٥ ل/٢٦٢ رقم/٢٠٠٢ = ٦٤٢٠. مسلم. زكاة: ٢٤٠٧.

[١٩] تقدم في مجلد سابع تسلسل/٨٤ ل/٢٦٢ ط/١ رقم/٤٢٢٤.

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کامتان ماڵی میراتبەرەکەی لە ماڵی خۆی خۆشتر دەوێ؟ عەرزیانکرد: قوربان! هەموومان ماڵی خۆمانمان خۆشتر دەوێ لە ماڵی میراتبەرەکانمان. فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): دە بزانن ماڵی ئادەمیزاد ئەو ماڵەیەتی کە لەپێش خۆیەوە ڕەتی دەکاو ڕەوانەی دەکا بۆ ئەو جیهان، ماڵی میراتبەرەکانیشی ئەوەیە کە بەچنگەکرێ هەرکۆی دەکاتەوە تا لەپڕ خۆی دەمرێو ماڵەکەی لەپاشی بەجێ دەمێنێ! (ب- ڕەحمەت لەگۆڕی نازداری).

٥١٧٧.م- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَكْثَرَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ مَا يُخْرِجُ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ بَرَكَاتِ الأَرْضِ قِيلَ وَمَا بَرَكَاتُ الأَرْضِ؟ قَالَ: زَهْرَةُ الدُّنْيَا. فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: هَلْ يَأْتِي الْخَيْرُ بِالشَّرِّ فَصَمَتَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ يُنْزَلُ عَلَيْهِ ، ثُمَّ جَعَلَ يَمْسَحُ عَنْ جَبِينِهِ فَقَالَ: أَيْنَ السَّائِلُ؟ قَالَ: أَنَا. قَالَ: لاَ يَأْتِي الْخَيْرُ إِلاَّ بِالْخَيْرِ ، إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ ، وَإِنَّ كُلَّ مَا أَنْبَتَ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ ، إِلاَّ آكِلَةَ الْخَضِرَةِ ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَدَّتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ ، فَاجْتَرَّتْ وَثَلَطَتْ وَبَالَتْ ، ثُمَّ عَادَتْ فَأَكَلَتْ ، وَإِنَّ هَذَا الْمَالَ حُلْوَةٌ ، مَنْ أَخَذَهُ بِحَقِّهِ وَوَضَعَهُ فِي حَقِّهِ ، فَنِعْمَ الْمَعُونَةُ هُوَ ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِغَيْرِ حَقِّهِ ، كَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ. رواه الشيخان[٢١]:

ئەبو سەعید خودری (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: زۆرتر لەوە مەترسیتان لێ دەکەم کە خودا لە پیتو فەڕی زەوی دەری دەهێنێ بۆتان. گوترا: پیتو فەڕی زەوی مەبەست لێی چییە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە دەبێ بە مایەی ئارایشتو ڕەونەقی ژیانی جیهان وەك زێڕو زیوو سامانی تر. پیاوێ عەرزی کرد: قوربان! بۆچی شتی وا دەبێ کە ئەم خێرو خۆشییە ببێ بەهۆی خراپەو شەڕ!

---

[٢٠] {ریاض/٢ ل/١٠٨ تسلسل/٦٠ رقم/٥٤٥ = بخاري: ٦٤٤٢ = تجريد/٥ ل/٢٦٥ رقم/٢٠٠٧}.

[٢١] تجريد/٢ ل/١٢٥ رقم/٧٠٣ = ١٤٦٥. مسلم. زكاة: ٢٤١٩، ٢٤٢٠.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تاماوەیێ راماو ماتو خامۆش بوو، هەتا زەینمان بۆ ئەوە چوو کە لەم بارەیەوە سرووشی بۆ دێ، پاش ماوەیێ ئارەقی ناوچاوانی خۆی سڕیو فەرمووی: پرسیارکەرەکە کوانێ؟ گوتی: قوربان! ئەمەتام، فەرمووی: خێر هەر خێر دێنێو چاکە هەر دەبێ بەهۆی چاکە، بەڵام ماڵی دنیا میوەیەکی شیرینو خۆشە، وەك سەوزەگیای بەهار ناسكو نازدارە، هەموو کەسێ کەم تا زۆر حەزی لێ دەکا، جا ئەوەی کە بەشێوەیەکی ڕەوا پەیدای بکاو لەسەر شێوەیەکی ڕەوا جێگەی بکاتەوە ئەوە کۆمەكو دەستگیرێکی فرە چاکە بۆی، وەلێ ئەوەی بەشێوەیەکی ناڕەوا پەیدای بکا ئەوە وەك سکەڕۆو ژەمەنبووردە وایە هەردەخواو هەر تێر ناخوا، دەق ماڵیش وەك سەوزەو گژو گیای بەهار وایە، ئێوە دەڵێن: گوایە گژو گیای بەهار شتی چاکەو ئاژەڵی پێ دەژی، بەڵام ئەم قسەیە گشت کاتێ وانییە، چونکە گەلێ گژو گیای بەهار ئاژەڵ ئەگەر هەر بیماشێتەوەو زیادە خۆری تیا بکا تورخەو کاپێچی پێ دەکاو دەیکوژێ، یا زۆری نامێنێ کە بیکوژێ، بەڵام ئاژەڵی گیاخۆر کە بەدەمو جەم دیخوا تا کەلەکەی هەڵ دێ ئەوجا خۆی دەدا بەخۆرو دەست دەکا بە کاوێژو بەئاسایی ڕیخو کمیزی خۆی دەکاو لە پاشدا هەمیشە لەسەر ئەم ئاواو دەستوورە تێ هەڵ دەچێتەوە لە گیاخواردنو وچانگرتنی خۆی، ئەو ئاژەڵە هیچی لێ نایەت (ش:بوخاریو موسلیم).

## ٩٥) پتر لە پێویست خانوبەرە دروستکردن ناپەسەندە
## البناء لغير حاجة مذموم

٥١٧٨.م- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: رَأَيْتُنِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) بَنَيْتُ بِيَدِي بَيْتًا ، يُكِنُّنِي مِنَ الْمَطَرِ ، وَيُظِلُّنِي مِنَ الشَّمْسِ ، مَا أَعَانَنِي عَلَيْهِ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ تَعَالَى[1]:

---

[1] تجريد/٥ ل/٢٧٣ رقم/١٩٧٤ = ٦٣٠٢.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) بەدەستی خۆم خانۆچکەیەکم دروست کرد بۆ خۆم، لەزستاندا پەنای لە باران دەدام‌و لە هاویندا سێبەری لێ دەگرتم‌و هەتاو لێی نەدەدام، خۆم نەبێ کەسێکی تر لە دروسکراوانی خودای گەورە یاریدەی نەدام (ب).

٥١٧٩.م- وَعَنْهُ قَالَ: وَاللَّهِ مَا وَضَعْتُ لَبِنَةً عَلَى لَبِنَةٍ ، وَلاَ غَرَسْتُ نَخْلَةً ، مُنْذُ قُبِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواهما البخاري في الاستئذان[٢]:

دیسان فەرمووی: ئەوەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) مەرگی هەقی بەجێ هێناوە، بەخودا وەها ئەم دنیایەم لەبەر چاو کەوتووە هێشتا خشتێکم نەناوەتە سەر خشتێ، نەمامە خورمایێ چییە نەم ناشتووە! (ب- رەزای خودای لێ بێ).

٥١٨٠.م- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا أُطَيِّنُ حَائِطًا لِي أَنَا وَأُمِّي فَقَالَ: مَا هَذَا يَا عَبْدَ اللَّهِ؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ شَيْءٌ أُصْلِحُهُ، قَالَ: الأَمْرُ أَسْرَعُ مِنْ ذَاكَ[٣]:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (خودایان لێ ازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەلامەوە رابورد، لادیوارێکم هەبوو، خۆم‌و دایکم خەریك بووین سواغمان دەدا، فەرمووی: ئەی عەبدوڵلا! ئەوە خەریکی چیت؟ عەرزیم کرد: قوربان! خەریکی ئەم لا دیوارەم چاکی دەکەمەوە! فەرمووی: کێ دەڵێ کە فریای ئەم کارە دەکەوی‌و مەرگ بەرلەوە یەخەت ناگرێ. (د/ت-س/ص).

٥١٨١.م- وَعَنْهُ قَالَ: مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ نُعَالِجُ خُصًّا لَنَا فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقُلْنَا قَدْ وَهَى فَنَحْنُ نُصْلِحُهُ. فَقَالَ: مَا أَرَى الأَمْرَ إِلاَّ أَعْجَلَ مِنْ ذَلِكَ. رواهما أبو داود والترمذي[٤]:

---

[٢] بخاري. استئذان: ٦٣٠٣.

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٤] بسند صحيح (شرحه).

دیسان فەرمووی: زنجێکمان هەبوو پەڕپووت بوو بوو خەریکبووین بیرازمان دەکردەوە، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەلامانەوە ڕەت بوو فەرمووی: ئەوە خەریکی چین؟ گوتمان: قوربان! زنجەکەمان شلۆق بووە چاکی دەکەینەوە، فەرمووی: کێ دەڵێ کە ئێوە ئەوەندە دەژین هەتا ئەم کۆخە دەرووخێ! لە باوەڕی منا تەمەن ئەوەندەی بە بەرەوە نییەو دوور نییە کە هێرشی مەرگ زووتر نەکاتە سەرتان! (د/ت-س/ص).

٥١٨٢.م- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى قُبَّةً مُشْرِفَةً فَقَالَ: مَا هَذِهِ؟ قَالُوا: لِفُلاَنِ الأَنْصَارِ فَسَكَتَ وَحَمَلَهَا فِي نَفْسِهِ حَتَّى إِذَا جَاءَ صَاحِبُهَا فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَعْرَضَ عَنْهُ، صَنَعَ ذَلِكَ مِرَارًا حَتَّى عَرَفَ الرَّجُلُ الْغَضَبَ فِيهِ وَالإِعْرَاضَ عَنْهُ فَشَكَا ذَلِكَ إِلَى بعض أَصْحَابِهِ فَأَخْبَرَهُ بِأَمْرِ الْقُبَّةِ فَرَجَعَ فَهَدَمَهَا، فَقَالَ: أَمَا إِنَّ كُلَّ بِنَاءٍ وَبَالٌ عَلَى صَاحِبِهِ إِلاَّ مَا لاَ، إِلاَّ مَا لاَ، يَعْنِي مَا لاَ بُدَّ مِنْهُ. رواه أبو داود[٥].

ئەنەس (ڕەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) جارێ چاوی بە باڵەخانەیەکی بەرز کەوت، فەرمووی: ئەمە چییە؟ گوتیان: هی فیسارە پیاوی ئەنصارییە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئەو کاتە دەنگی نەکرد، بەڵام گرتیە دڵ، هەتا ڕۆژێ خاوەنی ئەو باڵەخانەیێ هات بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کاتێ سڵاوی لێ کرد پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پشتی تێکردو رووی لێ وەرگێڕا، پیاوەکە چەن جارێ وای کرد، هەموو جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) رووی نەدەدایێ، جا تێگەیشت کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە بەرشتێ لێی دڵگیرە، دەچێ سکالای حاڵی خۆی لەلای هەندێ لە یاران دەکا، ئەوانیش باسی باڵەخانەکەی بۆ دەگێڕنەوە، ئەویش دەچێ دەیرووخێنێو تەختی دەکاو متی دەکا لەگەڵ زەویدا، هەتا ڕۆژێ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) تەشریفی لەوێوە دەڕوا سەیردەکا باڵەخانەکە نەماوە، کە هۆی ئەوە دەپرسێ دەڵێن: خاوەنەکەی کە زانی تۆ لەبەر ئەم باڵەخانەیە رووی پێ نادەی، ئەویش چوو ڕووخانی. حەزرەت (درودی خودای

---

[٥] بسند صالح (شرحه).

لەسەربێ) فەرمووی: دەی باش باش بزانن کە هەموو خانوویێ، ئەگەر بۆ ڕەزای خودا نەبێ، لە ڕۆژی ژیانەوەدا دەبێ بەئوباڵو بارگرانی بۆ خاوەنەکەی، وەلێ ئەوەی کە ناچاری بێو بۆ ڕەزای خودا بێ ئەوە قەیناکا، واتە: ئەوەی کە بەپێی کاتو شوێن بوونی پێویست بی ئەوە قەیدی نییە (د-س/صالح).

٥١٨٣.م- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: النَّفَقَةُ كُلُّهَا فِي سَبِيلِ اللَّـهِ إِلاَّ الْبِنَاءَ فَلاَ خَيْرَ فِيهِ[٦]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ماڵ خەرجکردن گشتی بەخێر حلێبەو لە ڕێگەی خودادایە، مەگەر ئەوەی کە بۆ خانوو دروستکردن بێ، ئەوە هیچ خێرێکی تیا نییە (ت-س/ح).

٥١٨٤.م- وَقَالَ إبراهيم النخعي: البناء كُلُّهُ وَبَالٌ، قِيلَ لَهُ: أَرَأَيْتَ مَالاَ بُدَّ منه؟ قَالَ: لاَ أَجْرَ وَلاَ وِزْرَ. رواهما الترمذي[٧].

ئیبراهمی نەخەعی دەیگوت: خانوو هەمووی ئۆباڵو تۆڵەو سزایە پێیان گوت: ئەدی باشە پێمان بفەرموو ئەوەی کە ناچاری بێ چۆنە؟ گوتی: ئەوەیان نەخێرە هەتا پاداشی لەسەر وەربگرێو نە گوناەو تاوانە هەتا لەسەری سزا بدرێ! (ت).

## ٩٦) دەوڵەمەندی لە قنیات دایە : (الغني في القناعة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَوَجَدَكَ عَائِلًا فَأَغْنَى - سورة الضحى - ٩٣-٨}.

واتە: هەروەها ئاگای لە حاڵی تۆ بوو کە لەبەر خێزانداری نەدارا بووی، تا خودا بەهۆی کەسابەتی حەڵاڵو بازرگانیو تالانی زۆری ناموسوڵمانەکانەوە دارایی ڕژاند بەسەرتاو دەوڵەمەندی کردیتو بێ نیازی کردی لە جیهان، هەروەها کردیتی بە بەندەیەکی بەرچاو تێرو بە بەشی خودا قنیاتت کرد.

---

[٦] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٧] سكت عن درجته الشارح.

٥١٨٥.م- ← (ب – ٢ ز – ٢٠ ل – ٤٩ ف – ٤٩)[١].

٥١٨٦.م- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا نَظَرَ أَحَدُكُمْ إِلَى مَنْ فُضِّلَ عَلَيْهِ فِي الْمَالِ وَالْخَلْقِ ، فَلْيَنْظُرْ إِلَى مَنْ هُوَ أَسْفَلَ مِنْهُ[٢]:

دیسان لەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر یەکێك لەئێوە چاوی بەکەسێ کەوت کە بەماڵو منداڵو رەنگو روو لە خۆی باشتربوو، بەتەماشای خوار خۆشیەوە بکا، نەبادا دڵ لەدڵ بداو سوپاسی بەهرەی خودا نەکاو خۆی بەهەرە خواروو بزانێ. (ش/ت).

٥١٨٧.م- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: انْظُرُوا إِلَى مَنْ أَسْفَلَ مِنْكُمْ وَلاَ تَنْظُرُوا إِلَى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ فَهُوَ أَجْدَرُ أَنْ لاَ تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللّٰهِ عَلَيْكُمْ. روى الثلاثة الشيخان والترمذي[٣]:

دیسان لەوەوە لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی:

تەماشای لە خۆتان خوارتر بکەن، تەماشای لە خۆتان بەرەو ژوورتر مەکەن، چونکی ئەوە باشترە بۆ ئەوەی کە بەبەشی خودا شوکر بنو، ئەو بەهرانەی کە خودا داونی پێتان بەکەمو زۆری قنیات بکەنو لەبەر چاوتان نەکەوێو بەکەمی نەزانن، دەنا بە پێچەوانەوە لەوانەیە بەخیلی بەوانە بەرن کە لە ئێوە زیاتریان هەیە (ش/ت).

٥١٨٨.م- وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَنْ يَأْخُذُ عَنِّي هَؤُلاَءِ الْكَلِمَاتِ فَيَعْمَلُ بِهِنَّ أَوْ يُعَلِّمُ مَنْ يَعْمَلُ بِهِنَّ. قُلْتُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَأَخَذَ بِيَدِي فَعَدَّ خَمْسًا وَقَالَ: اتَّقِ الْمَحَارِمَ تَكُنْ أَعْبَدَ النَّاسِ، وَارْضَ بِمَا قَسَمَ اللّٰهُ لَكَ تَكُنْ أَغْنَى النَّاسِ، وَأَحْسِنْ إِلَى جَارِكَ تَكُنْ مُؤْمِنًا وَأَحِبَّ لِلنَّاسِ مَا تُحِبُّ لِنَفْسِكَ تَكُنْ مُسْلِمًا وَلاَ تُكْثِرِ الضَّحِكَ فَإِنَّ كَثْرَةَ الضَّحِكِ تُمِيتُ الْقَلْبَ. رواه الترمذي والامام أحمد[٤]:

---

[١] تقدم في مجلد ثاني تسلسل/٢٠ ل/٤٩ ط/١ رقم/١٣٦١.

[٢] مسلم. زهد: ٧٣٥٤ – ٧٣٥٦. ترمذي. زهد: ٢٥١٣. ابن ماجه. زهد: ٤١٤٢. تحفة/١٢٤٦٧، ١٢٥١٤.

[٣] مسلم. زهد: ٧٣٥٦. ترمذي. زهد: ٢٥١٣.

[٤] بسند حسن (شرحه).

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کێ ئەم وشانەم لێ وەردەگرێ تا خۆی رەفتاریان پێ بکا، یا فێری کەسێکی تریان بکا کە رەفتاریان پێ بکا، گوتم: من، ئەی پێغەمبەری خودا! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی گرتمو هەتا پێنجی ژماردو فەرمووی: خۆت لە حەرامو ناڕەواییەکان بپارێزە خودا ناسترین کەس خۆتی، بە بەشی خودا رازیبە دەوڵەمەنترین کەس خۆتی! بۆ هاوسێ باشو خاسبە خاوەن ئیمانو بڕواداری فرەخاس خۆتی، هەرچیت بۆ خۆت پێ خۆشە بۆ خەڵکی تریش پێت خۆش بێ موسوڵمانی تەواو خۆتی،زۆریش پێ مەکەنە، چونکە پێکەنینی زۆر دڵو دەروون دەمرێنێ! بەڵام رووخۆشیو زەردەخەنە بۆ پیاو یا بۆ ژن لەگەڵ ژندا یا لەگەڵ خۆیی دا قەیناکا (ت/ئەحمەد-س/خ).

٥١٨٩.م- عَنْ مِقْدَامِ بْنِ مَعْدِيكَرِبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مَلأَ آدَمِيٌّ وِعَاءً شَرًّا مِنْ بَطْنِهِ بِحَسْبِ ابْنِ آدَمَ أُكُلاَتٌ يُقِمْنَ صُلْبَهُ فَإِنْ كَانَ لاَ مَحَالَةَ فَثُلُثٌ لِطَعَامِهِ وَثُلُثٌ لِشَرَابِهِ وَثُلُثٌ لِنَفَسِهِ[٥]:

مقدامی کوڕی مەعدیکە ریبە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خراپترین جەواڵێ کە ئادەمیزاد پڕی بکا ورگێتی، ورگ پڕکردن زۆر خراپە، لە راستیدا ئادەمیزاد چەن پاروویێ سەرو زیادیەتی، ئەوەندەی بەسە کە بەری دڵی بگرێ، وەلێ ئەگەر هەر چاری نەبوو ویستی زۆر بخوا با پەیڕەوی ئەم یاسایە بکا. سکی بکا بە سێ بەشەوە، بەشێکی بۆ خواردنی، بەشێکی بۆ خواردنەوەی، بەشێکی بۆ هەناسەدانی! (ت/ئە/حاکم-س/ص).

٥١٩٠.م- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ لِابْنِ آدَمَ حَقٌّ فِي سِوَى هَذِهِ الْخِصَالِ: بَيْتٌ يَسْكُنُهُ، وَثَوْبٌ يُوَارِي عَوْرَتَهُ، وَجِلْفُ الْخُبْزِ وَالْمَاءِ. رواهما الترمذي وأحمد والحاكم[٦]:

---

[٥] بسند صحيح (شرحه).

[٦] بسند صحيح (شرحه).

عوسمـــان (خـوداى لىٚ رازى بـىٚ) فــەرمووى: پێغەمبـــەر (درودى خـوداى لەسـەربێ) فەرمووى: بنیادەم تەنیا مافی ئەم چەن شتەی هەیەو بەس: خانوویێ تیادا دابنیشێت. جلكێ شەرمو عەورەتی بشارێتەوە، نانی وشكو ئاوو بەس! (ت/ئە/حاكم-س/ص).

٥١٩١.م- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ مِحْصَنٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا. رواه الترمذي[٧]:

عوبەیدوڵلای كوڕی موحصین لە باوكیەوە (ڕەزای خودایان لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كامێكتان لە خۆی ئەمین بێو مەترسی لە گیانی خۆی نەبێو لەشی ساخبێو، نانو ئاوی سەرو بەری ڕۆژانەی هەبێ، ئیتر وەكوو هەموو جیهان هی ئەو بێ وایە (ت-س/ح).

## ٩٧) زینهار خۆتان بپارێزن لەچاو برسێتی (حیرص)و هیوای دوورو درێژ إياك والحرص وطول الأمل

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {ذَرْهُمْ يَأْكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلْهِهِمُ الأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ - سورة الحجر - ١٥/٣}.

واتە: وازیان لێبێنە با وەك ئاژەڵ پڕبە ورگیان بخۆنو رابوێرنو دوای هیوای هیچو پووچو دوورو درێژ بكەونو ئاواتی بێ بنیات دەسخەڕۆیان بكا تا لەپاشە ڕۆژدا دەزانن كە چ پەندو كەتنو تەڕنێكیان بەخۆیان داوە.

٥١٩٢.م- فەمودەی (لا يزال قلب الكبير شابا في أثنتين) لە دووباس پێش ئەم باسەدا رابورد. ف -١٨. [١]

٥١٩٣.م- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ وَتَشِبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ وَالْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ. رواهما الشيخان والترمذي[٢]:

---

[٧] رواه الترمذي بسند حسن.

[١] تقدم في مجلد تاسع تسلسل/٩٤ رقم/٥١٧٤.

لــە ئنەســەوە (خــودای لێ رازی بــێ) لــە پێغەمبــەرەوە (دروودی خــودای لەســەربێ) دەفەرموێ: ئادەمیزاد تا پیرتربێ ئەم دوو رەوشەی تیادا گەنجتر دەبێتەوە: سوور بوون لەسەر ماڵو سووربوون لەسەر تەمەنی درێژ (ش/ت).

٥١٩٤.م- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: مَـا ذِئْبَانِ جَائِعَانِ أُرْسِلاَ فِي غَنَمٍ بِأَفْسَدَ لَهَا مِنْ حِرْصِ الْمَرْءِ عَلَى الْمَـالِ وَالـشَّرَفِ لِدِينِـهِ. رواه الترمذي والإمام أحمد[٣]:

كــەعبی كــوڕی مالیــك (خــودای لێ رازی بــێ) لــە خۆشەویــستەوە (دروودی خــودای لەسەربێ) دەفــەرموێ: دوو گــورگی برســی بكەونــە نــاو رانــێ ئەوەنــدەی ئــەم دوو شــتە زیــان بــە ئــایینی مــرۆڤ دەگەیــەنن ئــەو دوو گورگــە ئەوەنــدە زیــان بەوڕانــە ناگەیەنن:

یەكەم: حەریصیو سوور بوون لەسەر دارایی.

دووەم: حەریسبوون لەسەر پایە بەرزی دنیابی! (ت/ئە-س/ص).

٥١٩٥.م- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ خَطَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَطًّا مُرَبَّعًا ، وَخَطَّ خَطًّا فِي الْوَسَطِ خَارِجًا مِنْهُ ، وَخَطَّ خُطُطًا صِغَارًا إِلَى هَذَا الَّذِي فِي الْوَسَطِ ، مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي فِي الْوَسَطِ وَقَالَ: هَذَا الإِنْسَانُ ، وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ - أَوْ قَدْ أَحَاطَ بِهِ - وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ ، وَهَذِهِ الْخُطُطُ الصِّغَارُ الأَعْرَاضُ ، فَإِنْ أَخْطَـأَهُ هَـذَا نَهَـشَهُ هَذَا ، وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا. رواه البخاری والترمذي[٤]:

عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خــودای لەســەربێ) خــەتێكی چــوار گۆشــەی كێــشا، لــەناو خەتــە چــوار گۆشــەكەوە خــەتێكی تــری درێــژی راكێــشا تــا دەرەوە، ئنجــا لــە دیــوی نــاوەوە چــەن خــەتێكی وردەڵــەی لــە تەنیــشت خەتەكــەی نــاو چــوار گۆشــەكەوە كێــشا، ئــەوجا فــەرمووی: ئەمــە وێنــەی مــرۆڤو ئاكــامو هیوایــەتی ئــەم خەتــەیان كــەوا لــەناو خەتــە چوارگۆشــەكەداو خەتــە وردەكــانی لەســەرە ئەمــەیان وێنــەی

---

[٢] بخاري. رقاق: ٦٤٢١ راجع تجريد/٥ ل/٢٦٢ رقم/٢٠٠٢ = ٦٤٢٠. مسلم. زكاة: ٢٤١١.

[٣] بسند صحيح (شرحه).

[٤] تجريد/٥ ل/٢٦٠ رقم/١٩٩٩ = ٦٤١٧ فتح.

ئادەمیزادە، ئەم خەتە چوار گۆشەشیان وێنەی ئاکامەکەیەتی، ئەوەتانێ لەهەر چوار لاوە ئابلۆقەی داوە، یا فەرمووی: گەمارۆی داوەو دەوری گرتووە، ئەم خەتەیشیان کە دەرچووەتە دەرەوە هیواکەیەتی، ئەم خەتو کێرە وردیلانەیش دەردو بەڵاو مەینەتن، گریمان لە هەندێ لەم دەردو ئازارانەیش قوتاری بوو لە هەندێکی تریان قوتاری نابێ، سەرەنجام پێش ئەوەی بگا بە ئاواتی خۆی یەکێ لەم دەردو بەڵایانە وەك مار دەیگەزێ! (ب/ت)[1].

٥١٩٦.م- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: هَذَا ابْنُ آدَمَ وَهَذَا أَجَلُهُ. وَوَضَعَ يَدَهُ عِنْدَ قَفَاهُ ثُمَّ بَسَطَهَا فَقَالَ: وَثَمَّ أَمَلُهُ وَثَمَّ أَمَلُهُ وَثَمَّ أَمَلُهُ[٥]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە ئادەمیزادە لەم بن دەستەدا ئەمەیش ئاکامەکەیەتی لە بناگوێیدا، ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەستی لە سەرپشتملی خۆی داناو لەپاشا درێژی کرد بۆ دوورو فەرمووی: کەچی هیواکەی وا لەوێ لەو دوور دوورە! (ت-س/ص).

٥١٩٧.م- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ ابْنِ آدَمَ وَإِلَى جَنْبِهِ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ مَنِيَّةً إِنْ أَخْطَأَتْهُ الْمَنَايَا وَقَعَ فِي الْهَرَمِ[٦]:

عەبدوڵڵا کوڕی شەخخیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئادەمیزاد کە بەسەدان دەردو مەینەت لە چوار دەوری هەڵیان داوە گریمان لەوانەیش رزگاری بێ لە پیریی رزگاری نابێ - چونکە پیری دەردی بێ دەرمانە - (ت-س/ص).

---

[1] ئەم شەکڵەیش ئەو وێنەیە:-




[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٥١٩٨.م- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ. قَالَ: فَأَيُّ النَّاسِ شَرٌّ قَالَ: مَنْ طَالَ عُمُرُهُ وَسَاءَ عَمَلُهُ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٧]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ عەزی حەزرەتی کرد: قوربان! ئەی رەوانەکراوی یەزدان! چ کەسێ باشە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە تەمەنی درێژبێو کاری جوان بێ! گوتی: ئەی چ کەسێ خراپە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کەتەمەنی درێژبێو کاری خراپ بێ. (ت-س/ص).

٥١٩٩.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَعْذَرَ اللَّهُ إِلَى امْرِئٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتَّى بَلَّغَهُ سِتِّينَ سَنَةً[٨]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی خودا ئاکامی دوابخا هەتا تەمەنی دەگاتە شەست ساڵ ئیتر ئەوە خودا بیانووی ئەو کەسەی بڕیوەو بەهانەی ئەوەی نەماوە کە بڵێ: ئەگەر تەمەن بە بەریەوە هەبێ فەرمانەکانی خودا بەجێ دەهێنمو تەوبە دەکەم!. (ب- رەزای خوای لێبێ).

رەحمەت لە مەولەوی کە دەفەرموێ:

**ئەم تەفرەی تەوبەی حەقیقی تاکەی**

**عەمر سۆزی کوا نەسۆزی دەخەی!**

٥٢٠٠.م- وَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): ارْتَحَلَتِ الدُّنْيَا مُدْبِرَةً ، وَارْتَحَلَتِ الآخِرَةُ مُقْبِلَةً ، وَلِكُلٍّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا بَنُونَ ، فَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الآخِرَةِ ، وَلاَ تَكُونُوا مِنْ أَبْنَاءِ الدُّنْيَا ، فَإِنَّ الْيَوْمَ عَمَلٌ وَلاَ حِسَابَ ، وَغَدًا حِسَابٌ وَلاَ عَمَلَ. رواهما البخاري. نسأل الله التوفيق لما يحبه ويرضاه[٩]:

---

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٨] تجريد - مختصر صحيح البخاري بالكوردي/٥ ل/٢٦٢ رقم/٢٠٠١ = ٦٤١٩ فتح الباري.

[٩] رواه البخاري تعليقاً بين الرقم: ٦٤١٧ و ٦٤١٨.

ئیمامی عەلی (خۆشنودی خودای لێبێ) دەفەرموێ: جیهان باروبنەی خۆی پێچاوەتەوەو لەسەر کۆچ کردنەو هاکا تەواو بوو، قیامەتیش ملی پێوەناوەو هاکا سەری هەڵ دا، ئەم دووەیش کە وەك دوو هەوێ وەهان هەر یەکەیان رۆڵەی خۆی هەیە، هەیە پیاوی دنیایە، هەیە پیاوی قیامەتە، جا ئێوە کوڕی قیامەت بن، کوڕی دنیا مەبن، چونکە هەموو منالێ شوێنی دایکی خۆی دەکەوێ، ئەمڕۆیش رۆژ رۆژی هەوڵ و تێکۆشانەو لێپرسینەوە نییە، بەڵام سبەینێ رۆژ رۆژی لێپرسینەوەیە رۆژی هەوڵ و تێکۆشان نییە (ب- خودای لێ رازی بێ)[1].

## ٩٨) بەشی دووەم: باسی بەهرەو گەورەیی هەژاریو هەژاران

## الفصل الثاني: في فضل الفقر والفقراء

٥٢٠١.م- عَنْ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سِتَّةَ نَفَرٍ فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اطْرُدْ هَؤُلاَءِ لاَ يَجْتَرِئُونَ عَلَيْنَا. قَالَ وَكُنْتُ أَنَا وَابْنُ مَسْعُودٍ وَرَجُلٌ مِنْ هُذَيْلٍ وَبِلاَلٌ وَرَجُلاَنِ لَسْتُ أُسَمِّيهِمَا فَوَقَعَ فِي نَفْسِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقَعَ فَحَدَّثَ نَفْسَهُ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ (وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِمْ مِنْ شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ). رواه مسلم[1]:

سەعد (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: شەش کەس بووین لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، منو ئیبنو مەسعوودو پیاوێکی هوزەیلیو بیلالو دوو پیاوی تربووین. کە نامەوێ ناویان بێنم، هاوبەشپەیداکەرەکان بە پێغەمبەریان گوت: ئێمە پێشنیارێکمان هەیە: ئەم هەژارانە دەربکە، تا ئێمەیش هاموشۆت بکەین، باسامیان لێمان نەشکێو زات نەکەن بەسەرمانا. پێغەمبەریش (درودی

---

[1] دنیا باوەژن قیامەت داکە

دوو هەوێن، رۆڵەی کامیان کاکە (وەرگێڕ)

[1] مسلم، فضائل الصحابة: ٦١٩٠، ٦١٩١.

خودای لەسەربێ) لەم لایەنەوە ئەوەی خودا لە چارەی نووسیبوو هات بەدڵیاو دڵی چەکەرەی کرد! جا خودا ئەم ئایەتەی نارده خواروە:

{وَلاَ تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ الظَّالِمِينَ – سورة الأنعام – ٦/ ٥٢}.

واتە: ئەی خۆشەویست! تۆ پێغەمبەری خودای، نەك پیاوی دنیایی و سیاسەتباز، کەواتە نەکەی دڵی ئەو هەژارانە بشکێنی و لە مەجلیسی خۆت بەقسەی ئەو بتپەرستانە دەریان بکەی، ئەوانە بە رۆژو بەشەو هەمیشە سەر گەرمی عیبادەت و بەندەیی ساغ و دروستن بۆ رەزای خودا، حسێب و لێکۆڵینەوە لە ئیمان و رازی دڵی ئەو هەژانە لەسەر تۆ نییە، تۆ نابێ باوەڕی ساغی ئەم موسوڵمانە ساغە باشانە بەرابەر بە کەسبی مەیلی ئەو ناموسوڵمانە بە گزادانە بخەیتە سەر سەوداو، بەتامای ئیمانهێنانی ئەو دارایانە دڵی پاکی ئەو موسوڵمانە هەژارانە بشکێنی، چونکە هەڵ دەگرێ ئیمانی ئەم هەژارە دڵسۆزانە لەلای خودا گەلێ مەزنتربێ لە ئیمانی ئەوبێ بڕوایانە لە فەرزی ئیمانهێنانیاندا، بەڵێ گشت کەسێ حسێبی خۆی لەسەر خۆیەتی، تەنانەت ئەم مەسەلەیە ئەوەندە روون و ئاشکراو بەڵگەنەویستە تۆو ئەوان تێیدا چون یەکن، هەر وەك حسێبی ئەوان بە دەست تۆ نییە حسێبی تۆیش بەدەست ئەوان نییە، کەواتە بۆ دەریان دەکەی! ئەی خۆشەویست! ئەگەر پاش ئەم روونکردنەوەیە، کە گرێی دڵی کردنەوەو، دەفعی ئیشکالی کردن شتی وا بکەی ئەوا تۆ بەزۆردارو ستەمگەر حسێب دەکرێیت، دیارە کە لەمەولا تۆ شتی واناکەی، بەڵام ئەم روونکردنەوەیە پایەی بەرزی هەژاری باوەڕداری ساغ لەلای خودا دەردەخاو هەڕەشەیەکی توندە لەو کەسانەی کە لەمەولا پێشنیاری وا ناهەق بۆ تۆ دەکەن! ٠ئیمامی موسلیم. هەزار رەحمەت لە گۆڕی پیرۆزی بێ).

ئەم رشتەیە: (ورجلان لست أسميهما)، دەلیولفایحینیش (رەزای خودا لە خاوەنەکەی) دەفەرموێ: كأنه يعنى ابا بكر وعليا (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) ولعل وجه أبهامه لهما أستبعاد القوم (أى المسلمين المخاطبين) طلب أشراف الكفار لِطَرْدهما فانهما كانا من أعيان قريش ومشاهيرهم ولعل طلب طردهما – أن كان – فلمخالفتهما لهم في الاسلام فأرادوا بذلك التعريض إلى حقارتهم، ولا يطفئ أنوار الله أَفْرَادُ أعدائه.

جا بۆیە منیش بەپێی ئەم دوو سەرچاوەیەو لەبەر رووناکی ئەم شەرحە ئەم رستەیەم تەرجەمە کرد، رەنگ بێ لەتاجەکەدا یا ریوایەتێ تربێ، کە ئەمەیان گەلێ دوورە، یا هەڵەی نووسیارو چاپ بێ بەندە گرنگیو بایەخێکی گەلێ تەواو وشیاوم بەم تەرجەمەیە داوە، بەڵام داخەکەم بەهۆی چاپەوەو بەهۆی خاڵبەندیو شتی واوە هەندێ کەموکووڕی تێکەوتووە، خودا یاربێ لە ئاییندەدا ئەو هەڵانە هەموو بەسەر دەگرمەوەو راستیان دەکەمەوە وەلێ لەچاو حاڵا هەڵەکان زۆر کەمن. (وەرگێڕ)

٥٢٠٢.م– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ. فَقَالَ: انْظُرْ مَاذَا تَقُولُ. قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ. فَقَالَ: انْظُرْ مَاذَا تَقُولُ. قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأُحِبُّكَ. ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ تُحِبُّنِي فَأَعِدَّ لِلْفَقْرِ تِجْفَافًا فَإِنَّ الْفَقْرَ أَسْرَعُ إِلَى مَنْ يُحِبُّنِي مِنَ السَّيْلِ إِلَى مُنْتَهَاهُ[٢]:

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) پێی گوت: قوربان! بەخودا من تۆم زۆر خۆش دەوێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تا سێ جار لەسەر ئەم شێوەیە ئەمەی لێ دووپات دەکردەوە پێی دەفەرموو: ئاخر باش وردبەرەوە کە قسەکەت کوێ دەگرێتەوە! ئەویش هەر سێ جارەکە هەر دەیگوت: بەخودا من تۆم زۆر خۆش دەوێ، لەپێناوی خۆشەویستیی تۆدا هەرچیم بەسەربێ پێی رازیم. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەی ئەگەر بەراستی تۆ

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

منت خۆش دەوێ ئەوا پەلاسو ئارەقگیر بۆ خۆت ئامادە بکەو، بیکەرە بەرت، چونکە شاسواری هەژاری بە زوویی سواری کۆڵت دەبێ، لە راستیدا هەژاری خێراتر دەگاتە سەر ئەو کەسەی کە منی خۆش دەوێ، هەتا لافاوی سەرەو خوارکە کە بە خوڕ دەڕژێتە ناو ئاوەرۆکە! (ت-س/ح).

٣- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَرَضَ عَلَيَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ لِيَجْعَلَ لِي بَطْحَاءَ مَكَّةَ ذَهَباً فَقُلْتُ لاَ يَا رَبِّ وَلَكِنْ أَشْبَعُ يَوْماً وَأَجُوعُ يَوْماً او قال ثلاثاً- أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ - فَإِذَا جُعْتُ تَضَرَّعْتُ إِلَيْكَ وَذَكَرْتُكَ وَإِذَا شَبِعْتُ حَمِدْتُكَ وَشَكَرْتُكَ[٣]:

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پەروەردگارم پێی فەرمووم: ئەگەر حەز دەکەی کێوەکانی مەککەت بۆ دەکەم بەزێڕ، گوتم: نەء، نامەوێ ئەی پەروەردگارم! بەلام دەمەوێ رۆژێ تێربمو رۆژێ برسی، یا فەرمووی: بەلام دەمەوێ رۆژێ تێربمو سێ رۆژ برسی، یا شتێکی لەم بابەتەی فەرموو، ئەوجا فەرمووی: هەتا کە برسیم بوو لەتۆ دەپاڕێمەوەو دەلالێمەوە لێت، کە تێریش بووم سوپاسو ستایشی تۆ دەکەم! (ت-س/ح).

٥٢٠٤.م- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَغْبَطَ أَوْلِيَائِي عِنْدِي لَمُؤْمِنٌ خَفِيفُ الْحَاذِ ذُو حَظٍّ مِنَ الصَّلاَةِ أَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ وَأَطَاعَهُ فِي السِّرِّ وَكَانَ غَامِضًا فِي النَّاسِ لاَ يُشَارُ إِلَيْهِ بِالأَصَابِعِ وَكَانَ رِزْقُهُ كَفَافًا فَصَبَرَ عَلَى ذَلِكَ. ثُمَّ نَفَضَ بِيَدِهِ فَقَالَ: عُجِّلَتْ مَنِيَّتُهُ قَلَّتْ بَوَاكِيهِ قَلَّ تُرَاثُهُ. رَوى الترمذي هذه الثلاثة[٤]:

دیسان ئەو لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەناو یارانو دۆستانی خۆمدا زیاتر خۆزگە بەو موسوڵمانە دەخوازم کە باری سووک بێو ماڵو منالی کەم بێ، بەلام نوێژکەری چاک بێ، خودا پەرستی باش بێ،

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

لەپەنایەکا بەجوانی فەرمانبەردا ڕێی خودای خۆی بکا، نەناسراوبێ لەناو خەڵکا ناودارو بەناو بانگ نەبێ، ڕزقو ڕۆژی سەرو بەربێو، ژێواری بەقەی حاڵ بێ، ئیتر بۆ خۆی لەسەر ئەم حاڵە ئارام بگرێو بە بەشی خودا ڕازی بێ، هەتا لە هەلێکا ئاوا لە مەینەتی جیهان ڕزگاری ببێ. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ ڕوونکردنەوەی ئاماژەکەی دەستی فەرمووی: واتە: زوو بەزوو بمرێو بەبێ چەرمەسەرێ مەرگ بگاتە فریای. لە هەمانکاتا شیوەنکەری کەم بێ، میراتو پاشماگەی کەم بێ! (ت-س/ح).

٥٢٠٥.م- ← (ب - ٣ ز - ٢٥ ل - ٥٨ ف- ١)[٥].

٥٢٠٦.م- عَنْ مِرْدَاسٍ الأَسْلَمِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَذْهَبُ الصَّالِحُونَ الأَوَّلُ فَالأَوَّلُ ، وَيَبْقَى حُفَالَةٌ كَحُفَالَةِ الشَّعِيرِ أَوِ التَّمْرِ ، لاَ يُبَالِيهِمُ اللَّهُ بَالَةً. رواهما البخاري[٦]:

میرداسی ئەسلەمی (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): پیاوچاکان یەك لە شوێنی یەك بەرودوا لە دنیا دەردەچن، تا دەمێنێتەوە خوێڕیو سەرسەرییەکان، کە وەك سەرکۆزەری جۆ وان، یا فەرمووی: کە وەك بنبێژنگو بنبۆڵی خورمای پووچەڵ وان، یەك تۆسقاڵ چییە خودا دەربەستیان نایەت! (ب).

٥٢٠٧.م- وَقِيلُ لعبد الله بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): أَلَسْنَا مِنْ فُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ فَقَالَ: أَلَكَ امْرَأَةٌ تَأْوِي إِلَيْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَلَكَ مَسْكَنٌ تَسْكُنُهُ، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَنْتَ مِنَ الأَغْنِيَاءِ، قَالَ: فَإِنَّ لِي خَادِمًا قَالَ فَأَنْتَ مِنَ الْمُلُوكِ. رواه مسلم[٧]:

پیاوێ بە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری گوت: ئەی باشە کەوایە ئێمە لە هەژارانی کۆچکاران نین؟ عەبدوڵڵا پێی گوت: ژنت هەیە کە لەلای بحەسێیتەوە؟ گوتی: بەڵێ هەمە، فەرمووی: ئەی ماڵێکت هەیە کە سرەوتی تیا بکەیو لەناویا

---

[٥] تقدم في مجلد ثالث تسلسل/٢٥ ل/٥٨ ط/١ رقم/٢٠٥٩.

[٦] تجريد = مختصر صحيح البخاري/٥ ل/٢٦٤ رقم/٢٠٠٥ = ٦٤٣٤، ٤١٥٦.

[٧] مسلم. زهد: ٧٣٨٨.

بحەوێیتەوە؟ گوتی: بەڵێ خانووشم هەیە، فەرمووی: دەتۆ لە دەوڵەمەندەکانیت، کابرا، گوتی: سا نۆکەریشم هەیە. فەرمووی: کەوابێ تۆ پاشای (م).

٥٢٠٨.م– ← (ب – ٢ ز – ٢٠ ل – ٤٩ ف – ٢)[٨].

٥٢٠٩.م– ← (ب – ٢ ز – ٢٠ ل – ٤٩ ف – ٢)[٩].

لێرەدا لە دواوە ئەمەی پترە: خۆشی لەو کەسەی کە لە رەحمەتی خوداوە ملی رێگەی راستی ئیسلامەتی دەگرێو گوزەرانیشی سەرو بەردەری دێنێو بەحاڵی خۆی قنیات دەکا.

٥٢١٠.م– عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اطَّلَعْتُ فِي الْجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الْفُقَرَاءَ ، وَاطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ. رواه الشيخان والترمذي[١٠]:

عیمرانی کوڕی حوصەین (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): سەرنجی ناو بەهەشتم دا تەماشام کرد زوربەی خەڵکەکەی هەژاران بوون، سەرنجی ناو دۆزەخیشم دا روانیم زۆربەی خەڵکەکەی ناوی ژنان بوون (ش/ت).

٥٢١١.م– عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قُمْتُ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا الْمَسَاكِينُ وَإِذَا أَصْحَابُ الْجَدِّ مَحْبُوسُونَ إِلاَّ أَصْحَابَ النَّارِ فَقَدْ أُمِرَ بِهِمْ إِلَى النَّارِ وَقُمْتُ عَلَى بَابِ النَّارِ فَإِذَا عَامَّةُ مَنْ دَخَلَهَا النِّسَاءُ. رواه الشيخان[١١]:

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودا لە خۆیو باوکی) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە دەرگای بەهەشتا راوەستام کە سەرنجم دا

---

[٨] تقدم في مجلد ثاني تسلسل/٢٠ ل/٤٩ ط/١ رقم/١٢٦١.

[٩] تقدم في مجلد ثاني تسلسل/٢٠ ل/٤٩ ط/١ رقم/١٢٦١.

[١٠] تجريد/٣ ل/٤٤٠ رقم/١٣١٠ = ٣٢٤١، ٥١٩٨، ٦٤٤٩، ٦٥٤٦.

[١١] بخاري. نكاح: ٥١٩٦ = ١٧٧٥ تجريد البخاري + (رياض/١ ز/٣٢ ل/٢٢٥ رقم/٢٥٨). مسلم. رقائق: ٦٨٧٢.

وا زورمەی ئەوانەی کە چوونەتە ناو بەهەشتەوە هەژاران بوون، دەوڵەمەندو خاوەن پایەکان هێشتا هەر حەپس بوونو چاوەڕوانی ئاگامی لێپرسینەوەیان دەکرد، بەڵام دۆزەخییەکان بڕیاریان دەرچوو بوو کە بیانبەن بۆ دۆزەخ، لە دەرگای دۆزەخیشدا راوەستام کە سەرنجمدا وا زورمەی ئەوانەی کە چوونەتە ناوی، ژنان بوون! (ش).

٥٢١٢.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَدْخُلُ فُقَرَاءُ الْمُسْلِمِينَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِنِصْفِ يَوْمٍ وَهُوَ خَمْسُمِائَةِ عَامٍ[١٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەژارانی موسوڵمانان بەنیو رۆژ - کە دەکاتە پێنج سەد ساڵ - لەپێش دەوڵەمەندەکانیانەوە دەچنە بەهەشت! (ت- س/ص).

٥٢١٣.م- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مِسْكِينًا وَأَمِتْنِي مِسْكِينًا وَاحْشُرْنِي فِي زُمْرَةِ الْمَسَاكِينِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. فَقَالَتْ: عَائِشَةُ لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: إِنَّهُمْ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِمْ بِأَرْبَعِينَ خَرِيفًا يَا عَائِشَةُ لاَ تَرُدِّي الْمِسْكِينَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ يَا عَائِشَةُ أَحِبِّي الْمَسَاكِينَ وَقَرِّبِيهِمْ فَإِنَّ اللَّهَ يُقَرِّبُكِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[١٣].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودایە! بەهەژاری بمژێنەو بەهەژاری بم مرێنەو لە رۆژی ژیانەوەدا لەگەڵ دەستەی هەژاراندا حەشرم بکە! عائیشەیش (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەبەرچی وا دەفەرمووی ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: چونکە هەژاران بەچل ساڵ بەر لە دەوڵەمەندەکانیان دەچنە بەهەشت، ئەی عائیشە! هەرگیز دەست مەنێ بە رووی هەژارانەوە، گریمان لەتی دەنکە خورمایەکت داونەتێ بێ بەشیان مەکە، ئەی عائیشە! هەژارانت خۆش بوێو نازیان بگرە، جا خودایش لە رۆژی ژیانەوەدا نازی تۆ دەگرێ (ت-س/غەریب).

---

[١٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٥٢١٤.م- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَ: لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) يَا عَائِشَةَ إِنْ أَرَدْتِ اللُّحُوقَ بِي فَلْيَكْفِيكِ مِنَ الدُّنْيَا كَزَادِ الرَّاكِبِ وَإِيَّاكِ وَمُجَالَسَةَ الأَغْنِيَاءِ وَلاَ تَسْتَخْلِقِي ثَوْبًا حَتَّى تُرَقِّعِيهِ. روى هذه الثلاثة الترمذي[١٤]:

عائیشە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی عائیشە! ئەگەر دەتەوێ لەمن جیانەبیتەوەو بەمندابگەی ئەوا بەقەی توێشووی سوارێکی ڕەفتەنی لە دنیا بەست بێ، نەکەی دنیا بگری بە کۆڵتەوە دەنا لە هاوڕێتیی من بەجێ دەمێنی، نەکەی هاونشینیی دەوڵەمەندان بکەی! جلو بەرگیشت تاپیبنە نەکەی بە کۆنەی دامەنێ! (ت-س/غەریب).

## ٩٩) بەشی سێیەم: باسی گوزەرانی پێغەمبەر دروودی خودای لەسەر
## الفصل الثالث: في معيشة النبي (صَلَّى اللهُ وَآلِه وصَحْبِه وَسَلَّمَ)

٥٢١٥.م- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) مُنْذُ قَدِمَ الْمَدِينَةَ مِنْ طَعَامِ الْبُرِّ ثَلاَثَ لَيَالٍ تِبَاعًا ، حَتَّى قُبِضَ[١]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەو کاتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کۆچی کرد بۆ مەدینە تا ئەو ڕۆژەی کە خودا بەرەحمەت بردیەوە بۆ لای خۆی خێزانەکەی سێ شەو لەسەر یەك تێرسکی خۆیانیان لەنانی گەنم نەخواردووە! (ش/ت).

٥٢١٦.م- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: تُوُفِّيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) وَمَا فِي بَيْتِي مِنْ شَيْءٍ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ ، إِلاَّ شَطْرُ شَعِيرٍ فِي رَفٍّ لِي ، فَأَكَلْتُ مِنْهُ حَتَّى طَالَ عَلَيَّ ، فَكِلْتُهُ فَفَنِيَ[٢]:

دیسان عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەفاتی کرد ئەوەی گیانلەبەر پێی بژی لە ڕەفەکەما نەبوو، هەنێ جۆ

---

[١٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١] تجريد/٥ ل/٨٤ رقم/١٨١١ = ٥٤١١ (٥٤١٦)، ٦٤٥٤. مسلم. زهد: ٧٣٦٩.

[٢] بخاري. فرض الخمس: ٣٠٩٧، ٦٤٥١. مسلم. زهد: ٧٣٧٧.

نەبێ، جا هەر لێیم دەخواردو هەر تەواو نەدەبوو تا ماوەیەکی زۆری خایاند، لە پاشدا چووم پێوام، ئیتر پیتو بەرەکەتەکەی نەماو تەواو بوو. (ش/ت).

٥٢١٧.م- ولمسلم والترمذي: مَا شَبِعَ آلُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ خُبْزِ شَعِيرٍ يَوْمَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ حَتَّى قُبِضَ[٣]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خێزانی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا مەحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) وەفاتی کرد دوو رۆژ لەسەر یەك تێر سکی خۆیان نانی جۆیان نەخواردووە (م/ت).

٥٢١٨.م- ولمسلم: لَقَدْ مَاتَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَا شَبِعَ مِنْ خُبْزٍ وَزَيْتٍ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ مَرَّتَيْنِ[٤]:

دیسان عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) هەتا مرد نەبووە لە یەك رۆژدا دوو ژەم لە نانو ڕۆن زەیتون تێر بخوا (م - خودای لێ رازی بێ).

٥٢١٩.م- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ يَأْتِي عَلَيْنَا الشَّهْرُ مَا نُوقِدُ فِيهِ نَارًا ، إِنَّمَا هُوَ التَّمْرُ وَالْمَاءُ ، إِلاَّ أَنْ نُؤْتَى بِاللُّحَيْمِ[٥]:

دیسان فەرمووی: جاری وا بووە مانگێکی رەبەق دەرۆیشت ئاگر لە ماڵماندا نەدەکرایەوە بۆ چێشتو نان! خۆراکمان لەو ماوەیەدا تەنیا خورماو ئاوبوو، مەگەر کەمێ گۆشتمان بۆ بهاتبایە، ئەوسا ئاگرمان دەکردەوە (ش/ت).

٥٢٢٠.م- وَعَنْهَا أَنَّهَا قَالَتْ لِعُرْوَةَ: يَا ابْنَ أُخْتِي ، إِنْ كُنَّا لَنَنْظُرُ إِلَى الْهِلاَلِ ثُمَّ الْهِلاَلِ ، ثَلاَثَةَ أَهِلَّةٍ فِي شَهْرَيْنِ ، وَمَا أُوقِدَتْ فِي أَبْيَاتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَارٌ. فقلتُ: مَا كَانَ يُعِيشُكُمْ؟ قَالَتِ: الأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالْمَاءُ ، إِلاَّ أَنَّهُ قَدْ كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ

[٣] مسلم. زهد: ٧٣٧١.

[٤] مسلم. زهد: ٧٣٧٩.

[٥] مسلم. زهد: ٧٣٧٦.

(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جِيرَانٌ مِنَ الأَنْصَارِ كَانَتْ لَهُمْ مَنَائِحُ ، وَكَانُوا يَمْنَحُونَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَلْبَانِهِمْ ، فَيَسْقِينَاهُ. رواهما الشيخان والترمذي[٦]:

**دیسان عائیشە** (خودای لێ رازی بێ) **بە عوروەی فەرموو: ئەی خوشکەزای خۆم! جاری وا بووە سێ مانگی یەك شەوەمان لە سەریەك دەدی، کە دەق دەکاتە دوو مانگی رێك، لەماوەی ئەو دوو مانگەیەدا ئاگر لە ماڵەکانی خێزانەکانی پێغەمبەردا** (درودی خودای لەسەربێ) **نەدەکرایەوە، عوروە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: منیش گوتم: پووری! ئەی باشە بەچی دەژیان؟ فەرمووی: تەنیا بەخورماو ئاوی رووت و بەس! بەڵام چەند ماڵێکی ئەنصاری هاوسای پێغەمبەر بوون، ئاژەڵی بەشیریان هەبوو لە شیری ئەوانە بەشی پێغەمبەریان دەدا، ئەویش ئەو شیرەی دەرخواردی ئێمە دەدا. (ش/ت).**

**٥٢٢١.م- ــ (ب – ٤ ز – ١٩ ل – ٦٥ ف – ٥)[٧].**

**لێرەدا ئاوایە قەتادە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: گەلێ جار کە دەچووین بۆ خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیك ئاشپەزەکەی لەوێ دەوەستا، خۆشی دەیفەرموو: بفەرموون بخۆن. من ئاگام لێبێ پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **هەتا گەیشتەوە بە حوزوری یەزدانی پاك قەت بەچاوی خۆی نەنانی تیری دیبوو، وە نە بەرخی بریانی دیبوو (ب).**

**٥٢٢٢.م- عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ** (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) **قَالَ: أَلَسْتُمْ فِي طَعَامٍ وَشَرَابٍ مَا شِئْتُمْ لَقَدْ رَأَيْتُ نَبِيَّكُمْ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَمَا يَجِدُ مِنَ الدَّقَلِ مَا يَمْلأُ بِهِ بَطْنَهُ. رواه الترمذي ومسلم[٨]:**

**نوعمانی کوڕی بەشیر** (رەزای خودایانی لێبێ) **فەرمووی: ئەوەتانێ ئێستاکە لە خواردنو خوادنەوە چیتان دەوێ هەیە، بەڵام من بەچاوی خۆم پێغەمبەرم**

---

[٦] بخاري. هبة: ٢٥٦٧ = تجريد/٢ ل/١٨٦ رقم/١٠٩٦ = ٢٥٦٧، ٦٤٥٨، ٦٤٥٩. مسلم. زهد: ٧٣٧٨.

[٧] تقدم في مجلد رابع تسلسل/١٩ ل/٦٥ ط/١ رقم/٢٦٩٠.

[٨] مسلم. زهد: ٧٣٨٥. ترمذي. زهد: ٢٣٧٢. تحفة/١١٦٢١.

(درودی خودای لەسەربێ) دیوە پڕ بەسکی خۆی خورمای قەسپی دەسگیر نەدەبوو هەتا بیخوات (ت/م- ڕەزای خودایان لێبێ).

م.٥٢٢٣.م- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَبِيتُ اللَّيَالِيَ الْمُتَتَابِعَةَ طَاوِيًا وَأَهْلُهُ لاَ يَجِدُونَ عَشَاءً وَكَانَ أَكْثَرُ خُبْزِهِمْ خُبْزَ الشَّعِيرِ[٩]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێبێ) دەفەرموێ: گەلێ جار وا دەبوو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆیو خێزانی چەند شەوێ لە سەریەك بەسکی خاڵی سکیان هەڵ دەگوشیو، بە برسێتی بەبێ شێو سەریان دەنایەوە، بە زۆری نانیشیان نانی جۆ پێغەمبەریلە بوو (ت-س/ص).

٥٢٢٢.م- عَنْ أَبِي طَلْحَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: شَكَوْنَا إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْجُوعَ وَرَفَعْنَا عَنْ بُطُونِنَا عَنْ حَجَرٍ حَجَرٍ فَرَفَعَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ حَجَرَيْنِ[١٠]:

ئەبو تەلحە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سکاڵای حاڵی خۆمانمان کرد لە دەست برسێتی، هەر یەکی سەرو بەردمان بەستبوو بە سکمانەوە تا لەباتی خواردن سەبووریمان پێی بێ، جا ئەو بەردەمان هەڵماڵیو نیشانی حەزرەتمان دا تا بزانێ کە لەتاو برسێتی حاڵمان پەرێشانە کەچی تەماشامان کرد پێغەمبەر خۆی (درودی خودای لەسەربێ) دوو بەردی دەرهێنا لەسەر سکی! (ت-س/غەریب).

م.٥٢٢٠.م- عَنْ مُحَمَّدِ بن سِيرِين (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَلَيْهِ ثَوْبَانِ مُمَشَّقَانِ مِنْ كَتَّانٍ فَتَمَخَّطَ فَقَالَ: بَخْ بَخْ أَبُو هُرَيْرَةَ يَتَمَخَّطُ فِي الْكَتَّانِ، لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لأَخِرُّ فِيمَا بَيْنَ مِنْبَرِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَحُجْرَةِ عَائِشَةَ مَغْشِيًّا عَلَيَّ ، فَيَجِيءُ الْجَائِي فَيَضَعُ رِجْلَهُ عَلَى عُنُقِي ، وَيُرَى أَنِّي مَجْنُونٌ ، وَمَا بِي مِنْ جُنُونٍ ، مَا بِي إِلاَّ الْجُوعُ[١١]:

---

[٩] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٠] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[١١] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

موحەممەدی کوڕی شیرین (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێکیان لەلای ئەبو هورەیەرە بووین، دوو پارچە کەتانی لەبەردا بوون، بە گڵەبەرانە، کە گڵێکی سوورە، ڕەنگ کرا بوون، هنگی کردە ناو دوو توێی یەکێکیانەوەو فەرمووی: بەه بەه! ئەبو هورەیەرە وای لێ هاتووە بەکەتان لووت دەسڕێ! ڕۆژێکیش بوو لە بەینی مینبەرەکەی پێغەمبەرو هۆدەکەی عائیشەی هاوسەری حەزرەتدا دەکەوتمو دەبوورامەوە، هاتۆچۆکەریش دەهات پێی دەنا بەلاملمدا لەو وایە کەفێم لەگەڵ دایە وە هیچ فێشم لەگەڵدا نەبوو، بەڵام لەبرسانا لەسەر خۆم چوو بووم. (ت-س/ص).

٥٢٢٣.م- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رضي الله عنه) قَالَ: نَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى حَصِيرٍ فَقَامَ وَقَدْ أَثَّرَ فِي جَنْبِهِ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ لَوِ اتَّخَذْنَا لَكَ (أي فراشا لينا) وِطَاءً. فَقَالَ: مَا لِي وَمَا لِلدُّنْيَا مَا أَنَا فِي الدُّنْيَا إِلاَّ كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا. روى هذه الأربعة الترمذي[١٢]:

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەسەر حەسیرێ نوستبوو کە هەڵسا حەسیرەکە چەقیبووە تەنشتیو جێگەکەی چاڵ بوو بوو، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! بریا ڕایەخێکی نەرممان بۆ دروست دەکردی! فەرمووی: من لەکوێو دنیا لەکوێ! من لەم جیهانەدا وەك سوارێکی ڕێبوار وام کە لەژێر سێبەری درەختێکا وچانێ بگرێو لەپاش کەمێ هەڵسێ بڕواو بەجێی بێڵێ! (ت-س/ص).

٥٢٢٣.م- عَنْ سَعْدَ بْنَ مَالِكٍ (رضي الله عنه) قَالَ: إِنِّي أَوَّلُ رَجُلٍ مِنَ الْعَرَبِ رَمَى بِسَهْمٍ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ وَلَقَدْ رَأَيْتُنَا نَغْزُو مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صلى الله عليه وسلم) وَمَا لَنَا طَعَامٌ إِلاَّ الْحُبْلَةَ وَهَذَا السَّمُرَ حَتَّى إِنَّ أَحَدَنَا لَيَضَعُ كَمَا تَضَعُ الشَّاةُ، ثُمَّ أَصْبَحَتْ بَنُو أَسَدٍ يُعَزِّرُونِي فِي الدِّينِ لَقَدْ خِبْتُ إِذًا وَضَلَّ عَمَلِي. رواه الترمذي والبخاري[١٣]:

---

[١٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١٣] مسلم. زهد: ٧٣٦١ – ٧٣٦٣. ترمذي. صفة جهنم: ٢٥٧٥. ابن ماجه. زهد: ٤١٥٦.

سەعدی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: من یەکەم پیاو بووم لە عەرب کە یەکەم تیری هاویشت لە ڕێگەی خودادا، ئەوسا حاڵمان گەلێ پەرپووت بوو گەلێ جار لە خزمەتی حەزرەتدا کە دەچووین بۆ غەزا خۆراکمان تەنیا بەرو گەڵای داری ئەو بیابانە بوو، کە لە ناچاریدا نەبێ ناخورێ، تەنانەت وامان لێ هاتبوو کە سەراومان دەکرد وەك پشقلی مەڕو بزن وابوو، یەکی نە دەگرت، کوڵۆ کوڵۆ دەوەستا، من ئاوا لەگەڵ گەشەکردنی ئیسلامدا پەروەردە بووم کەچی ئێستا بەنی سەعد لەسەر ئایینداری سەر زەنشتی من دەکەن، تەنانەت نەفامەکانیان دەڵێن سەعد نوێژیش بەجوانی نازانێ! بەراستی ئەگەر قسەی ئەوان ڕاست بێو سەرزەنشتەکەیان لەسەر هەق بێ مەعنای وایە کە من نائومێد دەرچوومو ڕەنجم با بردوویەتی! (ت/ب).

٥٢٢٤.م- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَاعَةٍ لاَ يَخْرُجُ فِيهَا وَلاَ يَلْقَاهُ فِيهَا أَحَدٌ فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا أَبَا بَكْرٍ. فَقَالَ: خَرَجْتُ أَلْقَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنْظُرُ فِي وَجْهِهِ وَالتَّسْلِيمَ عَلَيْهِ. فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ عُمَرُ فَقَالَ: مَا جَاءَ بِكَ يَا عُمَرُ. قَالَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا قَدْ وَجَدْتُ بَعْضَ ذَلِكَ. فَانْطَلَقُوا إِلَى مَنْزِلِ أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ التَّيِّهَانِ الأَنْصَارِيِّ وَكَانَ رَجُلاً كَثِيرَ النَّخْلِ وَالشَّاءِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ خَدَمٌ فَلَمْ يَجِدُوهُ فَقَالُوا لاِمْرَأَتِهِ أَيْنَ صَاحِبُكِ فَقَالَتِ انْطَلَقَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا الْمَاءَ. فَلَمْ يَلْبَثُوا أَنْ جَاءَ أَبُو الْهَيْثَمِ بِقِرْبَةٍ يَزْعَبُهَا فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَاءَ يَلْتَزِمُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَيُفَدِّيهِ بِأَبِيهِ وَأُمِّهِ ثُمَّ انْطَلَقَ بِهِمْ إِلَى حَدِيقَتِهِ فَبَسَطَ لَهُمْ بِسَاطًا ثُمَّ انْطَلَقَ إِلَى نَخْلَةٍ فَجَاءَ بِقِنْوٍ فَوَضَعَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفَلاَ تَنَقَّيْتَ لَنَا مِنْ رُطَبِهِ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَرَدْتُ أَنْ تَخْتَارُوا أَوْ قَالَ تَخَيَّرُوا مِنْ رُطَبِهِ وَبُسْرِهِ. فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا مِنْ ذَلِكَ الْمَاءِ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ظِلٌّ بَارِدٌ وَرُطَبٌ طَيِّبٌ وَمَاءٌ بَارِدٌ. فَانْطَلَقَ أَبُو الْهَيْثَمِ لِيَصْنَعَ لَهُمْ طَعَامًا فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تَذْبَحَنَّ ذَاتَ دَرٍّ. قَالَ: فَذَبَحَ لَهُمْ عَنَاقًا أَوْ جَدْيًا فَأَتَاهُمْ بِهَا فَأَكَلُوا فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ لَكَ خَادِمٌ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: فَإِذَا أَتَانَا سَبْىٌ فَأْتِنَا. فَأُتِيَ النَّبِيُّ

(صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): بِرَأْسَيْنِ لَيْسَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ فَأَتَاهُ أَبُو الْهَيْثَمِ فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اخْتَرْ مِنْهُمَا. فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللّٰهِ اخْتَرْ لِي. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ الْمُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ خُذْ هَذَا فَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي وَاسْتَوْصِ بِهِ مَعْرُوفًا. فَانْطَلَقَ أَبُو الْهَيْثَمِ إِلَى امْرَأَتِهِ فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: مَا أَنْتَ بِبَالِغٍ مَا قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى تَعْتِقَهُ فَقَالَ هُوَ عَتِيقٌ. فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ اللّٰهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا وَلاَ خَلِيفَةً إِلاَّ وَلَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ الْمُنْكَرِ وَبِطَانَةٌ لاَ تَأْلُوهُ خَبَالاً وَمَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ[١٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە کاتێکی وادا لەماڵدەردەچێ کە عادەتی نابێ لەو کاتەدا لەماڵ دەربچێ، یا کەس لەوکاتەدا بچێ بۆلای، جا ئەبو بەکر هات بۆلای، فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر! چی تۆی هێنا؟ گوتی: هاتووم دێنی پێغەمبەری خودا دەکەمو تێر تەماشای روخساری نازداری دەکەم جا زۆری نەخایاند کە عومەریش هات فەرمووی: ئەی عومەر! چی تۆی هێنا؟ فەرمووی: برسێتی! ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: بەراستی منیش هەست بە شتێکی وا دەکەم ئینجا چوون بۆ ماڵی ئەبو هەیسەمی کوڕی تەییهانی ئەنصاری، ئەم پیاوە باخە خورماو رانە مەڕی زۆری هەبوو، بەڵام نۆکەری نەبوو، کە چوون خۆی لەماڵ نەبوو، گوتیان بەژنەکەی: مێردەکەت کوا لە کوێیە؟ گوتی: چووە ئاوی خواردنەوەمان بوبێنێ زۆری پێ نەچوو کە ئەبو هەیسەم هاتەوە، کوندەیەکی بەکۆڵەوە بوو، کوندەکەی داناو هات دەستی کردە مل پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)و خۆشو چۆنی لەگەڵ کردو خۆش خۆش پێی دەگوت: باوكو دایکم بەقوربانت بن، ئنجا بردیانی بۆناو باخەکەیو لەوێ رایەخێکی بۆ راخستنو چوو هێشوویێ خورمای هێناو داینا بۆیان. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەبا لە روتابەکەی هەندێکت هەڵبژاردایە بۆمان. گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەستم ئەوە بوو کە بۆ خۆتان هەم لە روتابە

---

[١٤] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

شیرینەکەیو هەم لەهاڵە مزرەکەی هەڵبژێرنو بیخۆن، ئیتر لەو خورمایەیان خواردو لە ئاوی کوندەکەیان کرد بەسەریدا. جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی من وا لە دەستیدا، کە یەزدانی پاکە، ئەمە لەو نازو نیعمەتانەیە کە لەرۆژی قیامەتدا پرسیارتان لێ دەکرێ لە بارەیانەوەو موحاسەبە دەکرێن لە سەریان، سێبەری فێنکو تەڕە خومای خۆشو ئاوی سارد (نازو بەهرە لەمە باشترو خۆشتر دەبێ چیبێ، کەواتە ئەمە بەر ئەو ئایەتە پیرۆزەیە دەکەوێ کە دەفەرموێ:

{ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ – سورة التكاثر – ١٠٢/٨}.

واتە: سوێند بەخودای مەزن لەپاش ئەم روونکردنەوەی ناو دنیا رۆژێ دەبێ خودا یەکە یەکە پرسیارتان لێ دەکا لەو نازو بەهرەو خۆشیو خۆشگوزەرانییەی کە لە دنیادا بووتانە، ئایا مافی ئەو نیعمەتانەتان بەجێ هێناوەیانا، سوپاستان لە سەریان کردووەیانا، کردووتانن بەمایەو هۆی تاعەتی خودا یانا).

ئەوجا ئەبو هەیسەم پەلامای دا کە نانیان بۆ دورست بکا چەقۆیەکی هەڵگرت ئاژەڵێ سەربڕێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ماڵاتی شیردار سەرمەبڕە، ئەوسا گێسکە مێیەکی سەربڕی بۆیان، یا فەرمووی: گێسکە نێرێکی سەربڕی بۆیانو دروستی کردو هێنای داینا بۆیان کە نانیان نۆش فەرمووو لە نانخواردن بوونەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئایا نۆکەرت هەیە؟ گوتی: نەء، فەرمووی: کە دیلمان بۆ هات وەرە بۆلام. جا وارێکەوت تەنیا تاقە دوو سەر بەندەیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زیاترنا، ئەبو هەیسەم هاتە خزمەتی، فەرمووی پێی: یەکێ لەم دوانە بۆ خۆت هەڵبژێرە، گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بۆمی هەڵبژێرە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە راستیدا کەسێ راوێژی پێ بکرێ دەبێ ئەمیندارو دڵسۆزبێ، کەواتە ئەمەیان بۆ خۆت ببە، چونکە دیم ئەمەیان نوێژی دەکرد، وە ئامۆژگاری خێزانیشت بکە کە بۆی باش بن. جا ئەبو

هەیسەم گەڕایەوە بۆلای ژنەکەیو فەرمایشتەکەی پێغەمبەری بۆیگێڕایەوە، ژنەکەیشی فەرمووی: ئەگەر تۆ زۆر زۆریش بۆی باش بیت هەتا ئازادی نەکەی ئامۆژگاییەکەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە بارەیەوە بە تەواوی جێبەجێ ناکەی ئەبو هەیسەمیش دەڵێ: ئەوا ئازادم کردو ئەو ئازادە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا هەر پێغەمبەرو فروستادەیەکی ناردبێ دوو دەستە راوێژکەری هەبووە: دەستەیەکیان هانی دەدا لەسە کردنی چاکەو دەیگێڕێتەوە لە خراپە، ئەو دەستەکەی تریان بۆ گیرە شێوێنی درێغی لێ ناکات، وە ئەوەی خۆی لادا لە دەستوپێوەندی خراپ خودا دەیپارێزێو بەڕاستی پارێزراوی بەڕاستی خۆیەتی!. (ت-س/ص).

٥٢٢٤.م- وَعَنْهُ أَنَّهُم أَصَابَهُمْ جُوعٌ فَأَعْطَاهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَمْرَةً تَمْرَةً[١٥]:

دیسان فەرمووی: تووشی برسێتییەکی وا بووین پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەنکە دەنکە خومای دەدا پێمان. (ت - خودای لێ رازی بێ).

٥٢٢٥.م- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَقَدْ أُخِفْتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُخَافُ أَحَدٌ وَلَقَدْ أُوذِيتُ فِي اللَّهِ وَمَا يُؤْذَى أَحَدٌ وَلَقَدْ أَتَتْ عَلَيَّ ثَلاَثُونَ مِنْ بَيْنِ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ وَمَا لِي وَلِبِلاَلٍ طَعَامٌ يَأْكُلُهُ ذُو كَبِدٍ إِلاَّ شَيْءٌ يُوَارِيهِ إِبْطُ بِلاَلٍ[١٦]:

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودو صەلاتو سەلامو رەحمەتی خودای لەسەربێو سەرو ماڵو رۆحو ماڵو منداڵو هەستو نەست بەقوربانی خاکی بەردەرگای گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: رۆژێ بوو لە پێناوی ئایینی خودادا تووشی گەورەترین ترسو بیم بووم، لەو رۆژانەدا کەس وەك من ئاوا مەترسی لە خۆی نەبوو، رۆژێکیش بوو لە پێناوی ئیسلامەتیدا تووشی ئازارو ئەشکەنجەیەکی وا دەبووم کە نەبێتەوە وەسیی

---

[١٥] سكت عنه الشارح.

[١٦] سكت عنه الشارح.

ڕۆژو سیی شەوی ڕەبەقم ژماردووە کە هەرچی گیانلەبەر پێی بژی منو بیلال نەمان بووە بیخۆین، تۆزێ خۆراك نەبێ کە ئەوەندە کەم بوو لەبن باڵی بیلادا بوو! (ت– مەزار ڕەحمەت لە گۆڕی پیرۆزی)

٥٢٢٥.م– وَقِيْل لِسَهْلٍ (رَضي اللهُ عَنْهُ): أَكَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّقِيَّ يَعْنِي الْحُوَّارَى؟ فقال: مَارَأَى رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّبِيَّ حَتَّى لَقِيَ اللهَ. فَقِيلَ لَهُ: هَلْ كَانَتْ لَكُمْ مَنَاخِلُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: مَا كَانَتْ لَنَا مَنَاخِلُ. قِيلَ: فَكَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ بِالشَّعِيرِ قَالَ: كُنَّا نَنْفُخُهُ فَيَطِيرُ مِنْهُ مَا طَارَ ثُمَّ نُثَرِّيهِ فَنَعْجِنُهُ. روى هذه الأربعة الترمذي. نسأل الله تمام القناعة وارضا. آمين[١٧].

گوترا بەسەهل، ئایا پێغەمبەر (درودو سڵاوو صەلەواتو ڕەحمەتو بەرەکەتی خودای گەورەی لەسەربێ) نانی تیریی ئاردە سپی خواردووە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تا ئەو ڕۆژەی چووە وەدیداری خودا چاوی بەنانی سپی نەکەوتووە!

پێشیان گوت: ئەی باشە بەسەرینیی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هێڵەکتان بۆ ئارد بێژانەوە هەبوو؟ فەرمووی: نەء، نەمان بوو گوتیان: ئەی ئاردی جۆتان چۆن چار دەکرد؟ فەرمووی: فوومان لێی دەکرد، جا ئەوەی با دەیبرد دەیبردو ئەوەیشی دەمایەوە بەئاو تەڕمان دەکردو دەمان گرتەوەو دەمان شێلاو دەمان کرد بە هەویر (ت/ب).

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

مەبەستی سەرەکی لەم باسی زوهدو دنیا نەویستیو دڵ نەرم کەرانە ئەم دوو شتەیە:-

**یەکەم**: لە هەموو ڕۆژگارێکا دەستەیێ خواناسی خاسی بۆ خودا لێبڕوا هەن، کاریان بەدنیاو خۆشی دنیا نەماوە، بادەی عیشقی خودایی مەستی کردوون،

---

[١٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه). {تجريد/٥ ل/٨٣ رقم/١٨٠٨ = ٥٤١٠، ٥٤١٣}.

عیبادەتیخودایان کردووە بەپیشەی هەمیشەی خۆیان، لەزەزمەتو خۆشی لە پەیڕەویکردنی شەرعی خودا وەردەگرن، ئەمانە بەموو لە ڕێگەی ڕەهبەرو لەشەریعەتی خودا لانادەن، هەنگاو بە هەنگاو، بست بەبست پەیڕەوی سوننەتی پێغەمبەر دەکەن، سەریان بچێ سوننەتێکیان ناچێ، بۆ هەموو شتێ، کەم یا زۆر، گەورە یا بچوك، ئاسان یا گران، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەکەن بە سەرمەشقو، چاو لە کردارو رەفتاری بەرزی ئەو دەکەن، هەتا بۆیان بکرێ بەموو لە شەریعەتی خوداو لە سوونەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لانادەن، لەجلو بەرگا، لە هەڵسانو دانیشتندا، لە قسەو گوفتوگۆو شێوەی ئاخاوتندا، لە خواردنو خواردنەوەدا، لە چۆنێتیو چەندێتی تاعەتدا، تەنانەت لە لفکەی مێزەرو لە قۆڵی کراسو لە چۆنێتی سۆڵو پێڵاوو، لە ڕەنگی جلو بەرگدا، هەتا لە دەستووری سەراوکردندا چاو لە ڕێبازی جوانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەکەن بەراستی ئەم خودا پێداوانە عیبادو رەحمانی هەموو سەردەمو زەمانێکن، گەرچی بەژمارە کەمن بەڵام لەسایەی خوداوە لە هەموو لایێ هەن، خۆشی لەو وڵاتو شوێنەی یەکێ دوانی لەم دۆستانی خودایە تیادا هەیە ئەمانە (أخص الخواص)ن، مەدحیان بە من نانووسرێ، لەکاتی ناوهێنانیاندا نوورو ڕەحمەت دەبارێ.

**دووەم**: ڕاکێشانی دڵی تێکرای موسوڵمانانە بۆلای خۆشەویستی بەهرەکانی ئایین، پتر لە خۆشەویستی نازو نیعمەتی جیهان، هەتا موسوڵمان بەهیچ جۆرێ بەخۆشیو نازو نیعمەتی دنیا نەگۆڕێ، وەك نەفامو لەڕێ دەرچووەکان نەبێ، کە بەدەنگێ حۆ دەزاڕن، بەڵکوو موسوڵمان دەبێ هێمنو داناو زاناو ژیرو هۆشیاربێ، هەمیشە ئەوەی لەبەرچاوبێ کە جیهان مەزرای دوا ڕۆژە، کە دنیا لەچاو قیامەتدا پێنجو دوو ڕۆژێکە، کە خودا ئادەمیزادو چنۆکەی بۆ پەرستنی خۆی دەروست کردووە، نەك بۆ ورگ لەوەڕاندنو ئارەزوو بازی، کە خودای گەورە بەهۆی زینەتو جوانی ناوجیهانەوە بەندەی خۆی تاقی دەکاتەوە، هەر کەسەی بەپێی تواناو لە بارابوونی خۆی، تاك بەپێی خۆی، کۆمەڵ بەپێی خۆیان، گوندو شارو لادێو وڵات بەپێی خۆیان، زاناو دانایان بەپێی خۆیان، ئۆمیو نەخوێندەواران بەپێی خۆیان، داراو دەوڵەمەندان بەپێی خۆیان، دەروێشانو هەژارانو لازمبوونان

بەپێی خۆیان، واتە: کورت‌و پوخت ژین تاقێگەیە، جیهان ئەزمونگەیەو، جا هەر کەسەی لەم ژیانەدا، بەحیکمەتی خودایی، نەك بە ئازاریی خۆی دەورێکی تایبەتی پێ سپێردراوە، هەیە فێرکارو مامۆستایە، هەیە فەقێ‌و خوێندکارە، وەك قورئان دەفەرموێ: هەموو کەسێ جێگەو ڕێگەی دوا ڕۆژی بەپێی هەڵسان بەئەرکی سەرشانی خۆی دیاری دەکرێ قورئان دەفەرموێ:

{إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا، وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا – سورة الكهف – ١٨/٧-٨}.

دیسان دەفەرموێ: {الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ – سورة الملك}.

دیسان دەفەرموێ: {كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِالشَّرِّ وَالْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ – سورة الأنبياء – ٢١/٣٥}.

واتە: خودا بە پێغەمبەری خۆی دەفەرموێ: ئەی خۆشەویست! دڵ نەدەی لەدڵ! خۆشی جیهان بێ بەقایە، کەفوکولێکە، پشتی پێ نابەسترێ، دنیا پێنج‌و دوو ڕۆژێکە، دەی لەم لایەنەوە سەبووری خۆت بدەو، دڵت لەلای بەهرەی نابەکام‌و خۆشی نیوە ناچل نەبێ، بزانن کە ئێمە – بەحیکمەتی خۆمان – کۆڵ‌و باری سەرپشتی زەویمان کردووە بەخشڵێکی نازداری جوان بۆی، وەك بووکی ڕازاوە ڕوخساری زەویمان پێی ئارایشت داوە، لە هەمان کاتدا لەبەرچاوی خەڵکی جیهانمان جوان کردووە، هەتا بەم بەرکوڵە تاقییان بکەینەوە، دوو چاری خۆشی‌و ناخۆشییان بکەین، وەك هەژاری‌و دارایی‌و لەشساخی‌و نەخۆشی، هەتا بزانین کاری کامیان زۆر جوانە، کێ ڕەفتارو کردارو گوفتاری زۆر پەسەندە، مەبەست لە ژیانی جیهان‌و مردن لەزاتی خۆیاندا ئەم تاقیکردنەوەیە، بزانن ماوەی هۆڵی تاقیکردنەوە کورتە، ڕۆژێ دێ، بەفەرمانی ئێمە دەور دەگۆڕێ، شتی بێ بەقا بایەخی نامێنێ، ئیتر زەوی کۆڵ‌و بارەکەی سەرپشتی فڕێ دەدا، خشڵەکەی دادەنێ، وەك تازە بووکێکی تەڵاقدراوی ڕووتەوە کراوی بێیاری بێ ناز لەومەیدانەدا ڕووت‌و قووت لێی دەکەوێ، سەرانسەر گۆی زەوی دەبێ بە

بیابـانێکی گـاکی بـەکاکی کرکـایکرکی چۆڵو هـۆڵی وشـكو بـرینگ. جـوانیو خشڵەکەی بەری دەبێتەوە بەخاكو خۆڵ!

کەواتە: چۆنێتیی ژیانی جیهان قیسمەتو نەسیبە خۆی لە خۆیدا نیشانەی باشیو بـەرێزیی نییـە، یـا نیـشانەی خراپـیو بـەدی نییـە، بـەڵکوو ڕەزا بەقـەزاو قنیات کردن بە بەشی خودا، چ کەم چ زۆر، چ خۆش چ ناخۆش، لەگەڵ عیبـادەتی سـاغی خـودادا، ئـەوە نیـشانەی چـاکییەو بەڵگـەی دەرچـوونو سـەرکەوتنە لـە ئەزموونو تاقیکردنەوەی خوداییدا!

وەکی تریش لە خۆبایی بوونو لەخۆ گۆڕانو خۆپەرستیو پـارێزکردن لـە خوداپەرستیو دڵرەقیو بـێخیریو فیـزو دەعیـەو زوڵـمو زۆرو ستەمو ناهـەقیو ڕەزیلـیو چـرووکی، ئـەو خـووە بەدانـەیش دەبـن بـەهۆی دەستەشـکێنیو مـاڵ وێرانیو سەرتیا چوونو دەستەخەڕۆ بوونو تەفرە خواردن! ریاکاریش بۆ کاری چاکە وەك قۆپیەوایە!

جا لەسەر ئەم یاسایە کە ژیـان مەزرایـە، مـردن خـەرمانو کۆگایـە، جیهـان فێرگایـە، دیـن چـرایە، خوانەناسـی بەڵایـە، مـرۆڤ لـەکرداری خـۆی بەرپرسـیارە، مەحکەمەی دەکرێ لەسەری لە پاش ئەم ڕۆژگارە، جا لەسەر ئەم یاساو بنیاتە، وە بۆ ئەم دوو مەبەسـتە ڕاسـتو دروسـتە وا باشـە کـە ناوبـەناو، بـۆ ڕامبـوونی دڵو هەناو، فەرمایشتی دڵ لاوێن، ئامۆژگاری جـوانی هەسـت هـەژێن، داسـتانی هەسـت بزوێن، سـەر گوزەشـتەی پێـشینان، قـسەی نەسـتەقی پاشـینان، هەقایـەتو بـاسو خواسی خواناسان، فەرموودەو فەرمایشتو باسـی ڕەوشـتی پیـاو خاسـان، ئەمانـەو وێنـەی ئەمانـە بکـرێن بـە شەوچـەرەو خـۆراكو چـراوگی دڵو دەروونو مێـشکی موسوڵمانان، بە دانایانەو لێزانانە ئەم پەندو ئامۆژو داستانە جوان جوانو خـاس خاسانە، لە هەلو باری گونجاوی جوانا بـدرێن بـەگوێی دڵـی ئادەمیزادەکانـا، ئـیتر بەفەرمانی خودا، وەك بیـستراوەو بینـراوە، لـە کـۆنو نـوێدا، بـەرە بـەرە مـرۆڤ دڵ دادەهێنێ، سەر بۆ حـەق دادەنـەوێنێ، لـەخودا نزیـك دەبێتـەوە لـە شـەیتان دوور دەکەوێتەوە، بەزەیی بە دروسکراوی خودادا دێتەوە، گیانی برایەتیو خزمایەتیو

بڕیار دراوەو لە مێژەوە بۆیان بڕاوەتەوە، ئیتر ناتوانن لەو خەتە دەربچن! قورئان – کە نامەی پیرۆزی خودای خاوەن شکۆو بالادەستە – بەڵگەی ڕاستو دروستیی ئەم قسەیە کە دەفەرموێ لەم بارەیەوە:

{وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا – سورة الشمس – ٩١/٧–٨}.

واتە: (خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سورەتی (والشمس) دا کە ژمارەکەی لە ناو سورەتەکانی قورئاندا سوورەتی ژمارە نەوەدو یەکە لە ئایەتی حەوتەمو هەشتەمی ئەم سوورەتەدا دەفەرموێ: سوێند بە دەروونی پڕ ئەفسوونی ئادەمیزاد، هەروا سوێند بەو زاتە کردگارە داناو زاناو ئاگادارەی کە ئەو دەروونە سەیرەی لە نەبوون دروست کردووە، بە سروشت (بە فیطرە ت) ڕێگەی خراپەو ڕێگەی چاکەی پێ نیشان داوە. (م/ ت – ڕەزای خودایان لێ بێ).

٥١٦٢– عَنْ عَبْدُ الْوَاحِدِ بْنُ سُلَيْمٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: قَدِمْتُ مَكَّةَ فَلَقِيتُ عَطَاءَ بْنَ أَبِي رَبَاحٍ فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُحَمَّدٍ إِنَّ أَهْلَ الْبَصْرَةِ يَقُولُونَ فِي الْقَدَرِ. قَالَ: يَا بُنَيَّ أَتَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: فَاقْرَإِ الزُّخْرُفَ. قَالَ فَقَرَأْتُ: (حم وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ. إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ) فَقَالَ أَتَدْرِى مَا أُمُّ الْكِتَابِ قُلْتُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ فَإِنَّهُ كِتَابٌ كَتَبَهُ اللَّهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَقَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ الأَرْضَ فِيهِ إِنَّ فِرْعَوْنَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَفِيهِ (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ) قَالَ عَطَاءٌ فَلَقِيتُ الْوَلِيدَ بْنَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ صَاحِبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلْتُهُ: مَا كَانَ وَصِيَّةُ أَبِيكَ عِنْدَ الْمَوْتِ؟ قَالَ: دَعَانِي أَبِي فَقَالَ لِي يَا بُنَيَّ اتَّقِ اللَّهَ وَاعْلَمْ أَنَّكَ لَنْ تَتَّقِيَ اللَّهَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِاللَّهِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ كُلِّهِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ فَإِنْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا دَخَلْتَ النَّارَ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ فَقَالَ اكْتُبْ. فَقَالَ: مَا أَكْتُبُ قَالَ اكْتُبِ الْقَدَرَ مَا كَانَ وَمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى الأَبَدِ. رواه الترمذي وأبو داود[٦]:

---

[٦] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه) راجع مجلد اول تسلسل/ ٦ رقم/ ١٠/ ٤٦.

عەبدولواحیدی کوڕی سولەیم (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: چووم بۆ مەککە، چوومە خزمەتی عەطای کوڕی رە باح، عەرزیم کرد: ئەی ئەبو موحەممەد! خەڵکی بەصرە دەم لە مەسەلەی چارەنووس (قەدەر) دەکوتن‌و هەندێکیان دەڵێن: گوایە چارەنووس نییە. عەطا، (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ڕۆڵەکەم! قورئانخوێنی یانا؟ گوتم:بەڵێ، قورئان خوێنم، فەرمووی: ئادەی سوورەتی زوخرروف بخوێنە منیش دەستم کرد بە خوێندنەوە:

{حم. وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ، إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ، وَإِنَّهُ فِي أُمِّ الْكِتَابِ لَدَيْنَا لَعَلِيٌّ حَكِيمٌ - سورة الزخرف - ٤٣ / ١ - ٤}.

ئینجا فەرمووی: ئایا دەزانی (أُمِّ الْكِتَابِ) چییە؟ گوتم: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری دەزانن، واتە: ئەمە بەس ئەهلی تەفسیرو ئەهلی حەدیث دەیزانن، عەطا- کە خۆی زانایەکی گەورەی تابیعین بوو، وەلە ناو فەرمووده زاناکاندا لە پایەی یەکەم دابوو- فەرمووی: دەی بزانە کە مەبەست لە ئوممولکیتاب لەم ئایەتەدا لەو حولمەحفووظە، کە ئەو نامەیەیە کە خودا لە پێش دروست کردنی ئاسمانەکان‌و زەویدا نووسیویەتی، بەوردی رووداو و حاڵ‌و چۆنێتی گشت شتێکی تیادا نووسراوە، بۆ وێنە تێیدا نووسراوە: فیرعەون گومانی تیادا نییە کە خەڵکی دۆزەخە، تەنانەت دەقی ئەم ئایەتە - کە باسی - سەر تیاچوونی ئەبو لەهەب دەکا - لەو نامەیەدا وەك خۆی ئاوا نووسراوە: تبت يدا أبي لهب! (واتە: هەموو شتێ لەو نامەیەدا بەر لە روودانی، کات‌و شوێن‌و چەندێتی‌و چۆنێتیی دیاری کراوەو، لە پێش دروستبوونی ئەم جیهانەدا بە دروودو درێژی هەرچی کە پەیوەندیی بە بوون‌و پەیدابوون‌و بەسەرهات‌و چارەنووسی ئەو شتەوە هەبێ نووسراوە) عەطا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: بۆ خۆم چاوم بە وەلیدی کوڕی عوبادەی کوڕی صامیت کەوت، کە عوبادەی باوکی هاوڕێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بوو، لێیم پرسی: ئەی وەلید! لەکاتی سەرەمەرگدا ڕاسپێری باوکت چی بوو، ئایا لە باسی سەرنویشت‌و چارەنووسە وە هیچی نەفەرموو؟ وەلید (خودای لێ رازی بێ)

فەرمووی: باوکم بانگی کردم، فەرمووی: کوڕی شیرینم! هەمیشە لە ترسی خودا بێ ئاگامەبەو لە خودای خۆت بترسە، بشزانە هەتا باوەڕنەکەی بە خوداو باوەڕنەکەی بە چارەنووس بە هەمووی، بە چاکو بە خراپی، ئەوە هێشتا بە تەواوی لە خودا ناترسی، خۆ خوا نەخواستە ئەگەر بێتو لەسەر غەیری ئەم بیروباوەڕە بمریتو، باوەڕت بە چارەنووسی خودایی نەبێ ئەوە دەچیتە ناو ئاگری دۆزەخەوە! چونکە بۆ خۆم لە زاری پیرۆزی حەزرەتم بیست دەیفەرموو: یەکەم شت کە خودا دروستی کرد قەڵەم بوو، پێی فەرموو: بنووسە خامە فەرمووی: ئەی خودای خۆم چی بنووسم؟ فەرمووی: سەر نویشتو بە سەرهاتی هەموو شتێ بەدوورو درێژی بنووسە لە بنەڕەتەوە هەتا هەتایە! (ت – س/غەریب – د).

← (ب – ١ ز – ٦ ل – ٤٣ ف – رقم/١٠/٤٦).

٥١٦٣– وَقَالَ عَبْد اللهِ بن فيروز الديلمي: أَتَيْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ فَقُلْتُ لَهُ: وَقَعَ فِي نَفْسِي شَيْءٌ مِنَ الْقَدَرِ فَحَدِّثْنِي بِشَيء لعل الله تَعَالَى أن يذهبه من قلبي، فَقَالَ: لَوْ إِنَّ اللَّهَ عَذَّبَ أَهْلَ سَمَوَاتِهِ وَأَهْلَ أَرْضِهِ لَعَذَّبَهُمْ وَهُوَ غَيْرُ ظَالِمٍ لَهُمْ وَلَوْ رَحِمَهُمْ لَكَانَتْ رَحْمَتُهُ خَيْرًا لَهُمْ مِنْ أَعْمَالِهِمْ. وَلَوْ كَانَ لَكَ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ ذَهَبًا أَوْ مِثْلُ جَبَلِ أُحُدٍ تُنْفِقُهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا قُبِلَ مِنْكَ حَتَّى تُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ. فَتَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ وَأَنَّ مَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ. وَأَنَّكَ إِنْ مُتَّ عَلَى غَيْرِ هَذَا دَخَلْتَ النَّارَ وَلاَ عَلَيْكَ أَنْ تَأْتِيَ أَخِي عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ فَتَسْأَلَهُ. فَأَتَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ فَسَأَلْتُهُ فَذَكَرَ مِثْلَ مَا قَالَ أُبَيٌّ وَقَالَ لِي وَلاَ عَلَيْكَ أَنْ تَأْتِيَ حُذَيْفَةَ. فَأَتَيْتُ حُذَيْفَةَ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ مِثْلَ مَا قَالاَ وَقَالَ ائْتِ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فَاسْأَلْهُ. فَأَتَيْتُ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بمثل ذلك. رواه أبو داود[٧]:

عەبدوڵلای کوڕی فەیرۆزی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: چووم بۆ لای نوبەییەی کوڕی کەعب پێیم گوت: لەبارەی چارەنووسەوە دڵم کەمێ چەکەرە

---

[٧] سکت عن درجته الشارح.

دەکاو چکێ دوو دڵم، بفەرموو قسەیەکم لەم بارەیەوە بۆ بکەو، فەرموودەیەکم بۆ بگێڕەوە سا بەشکوو خودای گەورە دڵم ساف بکاو ئەو دڵە ڕاوکێیەم نەمێنێ، فەرمووی: سەرچاوەی ئەم دڵە ڕاوکەی تۆیە لەم ریزە پرسیارو وەڵامەوە دێ: ئەگەر بڵێین چارەنووس ڕاستەو هەیە، دەبێ بڵێین خودا لە ئەزەلدا بڕیاری داوە، باشە شتێ کە خودا بەر لە دروستبوونی بەندە لەسەری نووسیبێ کە دەبێ ئەو بەندەیە ئەو کارە بکا ئیتر چۆن چۆنی سەرزەنشت دەکرێ لەسەر کردنی ئەو کارە، ئایا لەبارو دۆخی ئاواواییدا بەندە تاوانی چییە؟ کەواتە لە سەرکردنی تاوان ئەگەر خودا ئازارو سزای بەندە بدا ئەوە زۆرو ستەم نییە؟ وەلێ بزانە دەقی ئایەتی قورئان‌و فەرمایشتی ڕاست‌و دروستی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەم جۆرە دڵە ڕاوکێ و خەیاڵانە تەعتیل ناکرێن. چونکە بوونی چارەنووس لە دەقی رۆشنی ئایەت‌و حەیسدا چەسپ‌و ثابیتە کەواتە، گریمان خودای گەورە هەموو دانیشتوانی ئاسمانەکان‌و هەموو دانیشتووانی زەوی چاک‌و خراپیان چون یەك سزاو ئازار بدابەوە نابێ بەزۆردارو ستەمگەر ( چونکە خۆی فەرمانداری دەستبەرەڵڵایەو هەر خۆی پادشای بێ مەرج‌و بەندەو کەس باڵا دەستی نییەو، هەرچی مەیل بکا دەیکاو، لێپرسینەوەی نییە) هەروەها ئەگەر رەحم بە گشتیشیان بکا ئەوە لە سایەی خۆیەوەیەو کەس مافی ئەوەی نییە کە رەخنە لەوە بگرێ‌و بڵێ: چۆن خاس‌و خراپ بە یەکچاو تەماشا دەکرێن، چونکە هەمیشە رەحمەتی خودا بۆ بەندەکانی لە کارو کردەوەی خۆیان باشترە بۆیان. جا کە ئەمەت زانی باش باش بزانە کە چارەنووس ڕاستەو دەبێ بڕوات پێی هەبێ، دەنا گریمان تۆ بە قەد چیای ئوحود زێڕ لەڕێگەی خودادا ببەخشیتەوە هەتا لەسەر ئەم شێوەیەی کەوا بۆت باس دەکەم باوەڕ بە چارەنووس نەکەی ئەوا خودا ئەوەت لێ قەبووڵ ناکا: دەبێ ئەمە بزانی: کە هەرچی تووشت دەبێ نەدەبوو کە نەیەتەڕێت‌و ئەوەشی تووشت نابێ ناگونجێ کە بێتەڕێت! خۆ ئەگەر بێت‌و لەسەر ئەم باوەڕە نەمری دەچیتە ئاگری دۆزەخەوە. عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە پاش دا بۆ دڵنیایی

تەواو چوومە خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ئەویش هەروای فەرموو: ئەوجا چوومە لای حوذەیفەی کوڕی یەمان، ئەویش هەروای فەرموو، ئەنجا چوومە خزمەتی زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودا لە گشتیان بێ) ئەویش هەمان فەرموودەی لە دەمی حەزرەت خۆیەوە (درودی خودای لەسەربێ) بۆ گێڕامەوە. (ئەبو داوود — ڕەزای خودای لێ بێ).

٥١٦٤- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ خَلَقَ خَلْقَهُ فِي ظُلْمَةٍ فَأَلْقَى عَلَيْهِمْ مِنْ نُورِهِ فَمَنْ أَصَابَهُ مِنْ ذَلِكَ النُّورِ اهْتَدَى وَمَنْ أَخْطَأَهُ ضَلَّ فَلِذَلِكَ أَقُولُ جَفَّ الْقَلَمُ عَلَى عِلْمِ اللّٰهِ تَعَالَى: رواه الترمذي في الإيمان بسند صحيح[٨].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بە گوێچکەی خۆم لە زاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ): خودا لە ناو تاریکیی سەرگەردانیدا دروسکراوانی خۆی دروست کرد، لە جیهانی ماکدا، واتە: لەو جیهانەدا کە ماکو هەوێنو سەرچاوەیە بۆ ئەم جیهانەی ئێستامان، گیانگەل سەریان بەهیچ لایەکدا دەر نەدەکرد، تا خودا هەندێ لە نووری خۆی تێ گرتن، ئیتر ئەوەی لەو نوورەی بەرکەوتبێ ڕێی ڕاست دەگرێ، وە ئەوەی لەو نوورەی بەرنەکەوتبێ سەری لێ دەشێوێو گومڕا دەبێ. حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جا بۆیە منیش دەڵێم: چارەنووسی هەموو شتێ هەر لە مێژەوە بڕا وەتەوەو ئەو قەڵەمەی کە قەزاو قەدەری پێ نووسراوە مەرەکەبەکەی لە مێژەوە وشك بۆتەوەو کاغەزو قەڵەم پێچڕاوەتەوەو هەڵگیراوە، گشت شتێ لە مێژ مێژەوە لە زانستی خودای گەورەدا دیا ری کراوە! (ت — س/ح) تاباش لەم باسەتێ بگەی تەماشای ئەم فەرموودا نەیش لەم شوێنانەدا بکە: ← (ب — ١ ز — ٦ ل — ٣٧ چاپی/١ ف — ١ + ٢ + ٣ + ٤ + ٥ + ٦ + ٧ + ٨ + ٩ + ١٠ + ١١ + ١٢) + (ز — ٧ ل — ٤٤ چاپی/١ ف — ١ + ٢ + ٣ + ٤ + ٥) + (ب — ٦ ز — ٨ ل — ١٧٢ چاپی/١ ف — ٧ + ٨).

---

[٨] صحيح عند الترمذي.

### ٧) ناشێ ویرە ویڕ لەسەر مەسەلەی خوا خواستو سەرنقیشتو قەزاو قەدەر بکرێ : (لا ينبغي التنازع في القدر)

٥١٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ نَتَنَازَعُ فِي الْقَدَرِ فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّ وَجْهُهُ حَتَّى كَأَنَّمَا فُقِئَ فِي وَجْنَتَيْهِ الرُّمَّانُ فَقَالَ: أَبِهَذَا أُمِرْتُمْ أَمْ بِهَذَا أُرْسِلْتُ إِلَيْكُمْ إِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حِينَ تَنَازَعُوا فِي هَذَا الأَمْرِ عَزَمْتُ عَلَيْكُمْ أَلاَّ تَتَنَازَعُوا فِيهِ[1]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵ دەرچوو، هات بۆ ناومان، لەو کاتەدا ئێمە لەناو خۆماندا لەسەر مەسەلەی چارەنووسو خوا نووس مشتومڕمان بوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەها تووڕە بوو، وەکوو هەنار تلیقابێ بە هەردوو سەر کوڵمیدا وەها ڕووی سوور سوورەوە بوو، ئەوجا فەرمووی: ئەمە چی حاڵێکە، کەی بەمە فەرمانتان پێ کراوە، یاکەی من بۆ ئەمە ڕەوانە کراوم بۆ سەرتان! نەتەوەکانی پێش ئێوە کاتێ لەسەر ئەم مەسەلە تووشی ئەم ویرە ویڕە بوون لە ناوچوون، بە جەختی دەمەوێ لە ئێوە، دیسان دووپاتی دەکەمەوە بۆ ئێوە کە جارێکی تر نابێ لەسەر ئەم مەسەلەیە ئەم ویرە ویڕەو گیرە گیڕە بکەن! (ت – س/غەریب).

٥١٦٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ. رواهما الترمذي (بسندين غريبين ولكنهما مؤيدان بكثير من الصحاح)[2]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەندە بە تەواوی باوەڕ ناهێنێ تا باوەڕ نەهێنێ بە چارەنووس،

---

(١) رواه الترمذي بسند غريب مؤيد. بكثير من الصحاح (شرحه).

(٢) رواه الترمذي بسند غريب مؤيد بكثيرٍ من الأحاديث الصحيحة (شرحه).

بە خێرو بە شەڕی، بە چاکو بە خرا پی، وە هەتا ئەمەیش نەزانێ کە هەرچی تووشی دەبێ نابێ کە تووشی نەبێ، ئەوەشی کە تووشی نەبێ ناگونجێ کە تووشی ببێ، واتە ئەوەی کەبێتەڕێی ناکرێ کە نەیەتەڕێی، وە ئەوەی کە نەیەتە ڕێی ناکرێ کە بێتەڕێی! (ت – س/غەریب).

٥١٦٧– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سِتَّةٌ لَعَنْتُهُمْ لَعَنَهُمُ اللَّهُ وَكُلُّ نَبِيٍّ كَانَ: الزَّائِدُ فِي كِتَابِ اللَّهِ، وَالْمُكَذِّبُ بِقَدَرِ اللَّهِ، وَالْمُتَسَلِّطُ بِالْجَبَرُوتِ لِيُعِزَّ بِذَلِكَ مَنْ أَذَلَّ اللَّهُ وَيُذِلَّ مَنْ أَعَزَّ اللَّهُ وَالْمُسْتَحِلُّ لِحَرَمِ اللَّهِ، وَالْمُسْتَحِلُّ مِنْ عِتْرَتِي مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَالتَّارِكُ لِسُنَّتِي. رواه الترمذي والحاكم بسند صحيح. نسأل الله صحة القول والفعل آمين[٣]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم شەش کەسەیە من نەفرەتم لێ کردون، خودا بۆ خۆی نەفرەتی لێ کردوون، هەموو پێغەمبەرێ لە مەوبەر بە دەمی خۆی لەعنەتی لێ کردوون: ئەوەی کە شتێ لە نامەیێ لە نامەکانی خودا زیاد بکا، ئەوەی باوەڕی بەخوا نووسو خوا کرد نەبێ، ئەوەی کە بەزۆرو بەزەبرو زەنگ خۆ بسەپێنێو خۆی بکا بە خاوەن دەستەڵات، هەتا ئەوەی کە خودا ژێری خستووە ئەو بە ناهەقی سەری بخاتو ئەوەی کە خودا سەری خستووە ئەو بەناڕەوا ژێری بخات، ئەوەی کە ڕێزی بەستی خودا بشکێنێو ناڕەوایی لە بەست – حەرەم – ی مەککەو مەدینەدا بکا، ئەوەی زۆرو ناهەقی لە کەسوکاری من بکاو، ئەو دەستی قەدرو ڕێزە بشکێنێ کە خودا ناویەتی لەوان، هەروەها ئەوەی کە پشت لە ڕێبازو سوننەتی من بکا. ← (ت / حاکم – س/ص) (ب – ٧ ز – ٢٥ ل – ١٢٣ چ/١ ف – ٣).

---

[٣] بسند صحيح

## ٨) ئاکامو رزقو رۆزیی هەر لە سەرەتاوە دیاریکراونو سنووریان بۆ دانراوە الأجال والأرزاق محدودة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَإِذَا جَاء أَجَلُهُمْ لاَ يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلاَ يَسْتَقْدِمُونَ - سورة الأعراف - ٧ / ٣٤}.

**واتە: کاتێ کە رۆژو ماوەیان تەواو بوو وە ئاکامیان هات ئیتر یەك دەم چییە ئاکامیان پێشو پاش، یاکەمو زیاد ناکا.**

٥١٦٨- قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها): اللَّهُمَّ مَتِّعْنِي بِزَوْجِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِأَبِي أَبِي سُفْيَانَ وَبِأَخِي مُعَاوِيَةَ. فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّكِ سَأَلْتِ اللَّهَ لآجَالٍ مَضْرُوبَةٍ وَآثَارٍ مَوْطُوءَةٍ وَأَرْزَاقٍ مَقْسُومَةٍ لاَ يُعَجِّلُ شَيْئًا مِنْهَا قَبْلَ حِلِّهِ وَلاَ يُؤَخِّرُ مِنْهَا شَيْئًا بَعْدَ حِلِّهِ، وَلَوْ سَأَلْتِ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَكِ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ لَكَانَ خَيْرًا لَكِ، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الْقِرَدَةُ وَالْخَنَازِيرُ هِيَ مِمَّا مُسِخَ، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يُهْلِكْ قَوْمًا أَوْ يُعَذِّبْ قَوْمًا فَيَجْعَلَ لَهُمْ نَسْلاً وَإِنَّ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ. رواه مسلم[١].

**ئوممو حەبیبە (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: خودایە! هەتا سەر ئەمانەم پێ ڕەوا ببینە: پێغەمبەری هاوسەرمو، ئەبو سوفیانی باوکمو، موعاوییەی برام، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئەمانەی کە تۆ لە خودا داوایان دەکەی ئاکامو ماوەیان بۆ دیا ری کراوەو ڕۆژو کاتیان بۆ دانراوەو، لە مێژەوە ڕێگەو شوێنیان بۆ نیشانە کراوەو، رزقو ڕۆزیی یان بە پێی چارەنووسی خودایی بۆ بڕاوەتەوەو، تۆ بڵێیتو نەڵێیت هەتا کاتی هاتنی خۆیان نەبێت خودا هیچیان پێش ناخات، کاتێ کاتی هاتنی خۆشیان هات خودا هیچیان دوا ناخات، کەواتە داوای ئەوە لە خودا بکە کە لە سزای ئاگرو لەسزای گۆڕ بت پارێزێ، ئەمە بۆ تۆ زۆر باشترە.**

---

[١] مسلم. قدر: ٦٧١٤.

پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم مەیموونو بەرازانەی کە ئێستا هەن ئایا ئەمانە لە وەچەی ئەو ئادەمیزادانەن کە خودا لەکاتی خۆیدا کردوونی بە جانەوەر؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): خودای گەورەو سەروەر هەر هۆزێکی فەوتان بێ، یا فەرمووی: هەر هۆزێکی سزا دابێ بنەبڕی کردوونو وەچەی لێ نەخستوونەتەوە، سەرەڕای ئەوەش مەیموونو بەراز لەوە پێشیش هەر بوون (م).

٥١٦٩- وَقَالَ خَالِدِ الْحَذَّاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ لِلْحَسَنِ: يَا أَبَا سَعِيدٍ أَخْبِرْنِي عَنْ آدَمَ – عَلَيه السَلام – أَلِلسَّمَاءِ خُلِقَ أَمْ لِلأَرْضِ؟؟ قَالَ: لاَ بَلْ لِلأَرْضِ. قُلْتُ: أَرَأَيْتَ لَوِ اعْتَصَمَ فَلَمْ يَأْكُلْ مِنَ الشَّجَرَةِ؟ قَالَ: لَمْ يَكُنْ لَهُ مِنْهُ بُدٌّ. قُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى: ( مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ إِلاَّ مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ) قَالَ: إِنَّ الشَّيَاطِينَ لاَ يَفْتِنُونَ بِضَلاَلَتِهِمْ إِلاَّ مَنْ أَوْجَبَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْجَحِيمَ. وَسَأَلَهُ عَنْ قَوْلِهِ تَعَالَى (وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ) قَالَ: خَلَقَ هَؤُلاَءِ لِهَذِهِ وَهَؤُلاَءِ لِهَذِهِ. رواهما أبو داود[٢]:

خالیدی حەذذاء (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گوتم بە شێخ حەسەنی بەصری (خودای لێ رازی بێ): ئەی باوکی سەعید! پێم بڵێ: ئایا باوە ئادەم – دروودی خودای لێ بێ– بۆ ژیان لە سەر ئاسمان دروست کرابوو، یا بۆ ژیان لەسەر زەوی؟ فەرمووی: نەء، بۆ ژیان لە سەر زەوی دروست کرابوو، عەرزیم کرد: قوربان! پێم بڵێ گریمان باوە ئادەم مانی بگرتایەو لەو درەختەی نەخواردایە کە بوو بە هۆی دەرچوونی لە بەهەشتو هاتنە خوارەوەی بۆ سەر رووی زەوی چی دەبوو؟ فەرمووی: چاری نەبوو هەردەبوو لێی بخواردایێ. گوتم: پێم بڵێ ئەم ئایەتە واتەی چییە کە دەفەرموێ:

{مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ، إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ – سورة الصافات – ٣٧/ ١٦٢ – ١٦٣}.

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

فەرمووی واتە: شەیاتین و جنۆکەکان ناتوانن کەس بەد خوو بکەن و کەس لە خشتە ببەن مەگەر یەکێ کەلە زانستی خودادا رابوور دبێ کە دەبێ داخڵی دۆزەخ ببێ و خودا لە سەرەتاوە لە ئەزەڵدا ئاگری دۆزەخی بۆ بڕیار دابێ. لە بارەی ئەم فەرمایشتەی خودای گەورەیشەوە لێیم پرسی کە دەفەرموێ:

{وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ – سورة هود – ١١ -١١٩}.

فەرمووی واتە: بە هەشتییەکانی بۆ بەهەشت دروست کردووەو دۆزەخییەکانیش بۆ دۆزەخ. (ئەبو داوود – رەزای خوای لێ بێ).

### ٩) جڵەوی دڵ لە دەستی خودا دایە : (القلوب في قبضة الرحمن)

٥١٧٠- ← ( لە کیتابی ئەزکاردا، لەباسی (جوامع الدعاء) دا رابورد، فەرموودەی دوازدەهەم لێرەدا لە ئەنەسەوەیە لە پاش رستەی (ثبت قلبي على دينك)ەوە دەفەرموێ: گوتمان: قوربان! ئەی رەوانە کراوی خودا! ئێمە بە خۆت و بە دینەکەت باوەڕمان هێناوە، جا ئایا لە مەدوا مەترسی لە ڕێدەر چوونمان لێ دەکەی؟ فەرمووی: بەڵێ، چونکە لە ڕاستیدا جڵەوی دڵ وا لە دەستی خودادا، خۆی چۆن ئارەزوو بکا ئاوا هەڵی دەسوڕێنێ! (ت/م) گفتەی (م): لە ڕاستیدا هەرچی دڵی بەرەی ئادەمیزاد هەیە سەرجەم وان لە نێوانی دوو پەنجە لە پەنجەکانی خودای میهرەباندا، وەك تاقەیەك دڵ چۆن لە نێوانی دوو پەنجەدا بە ئاسانی هەڵ دەسووڕێ، خودایش بە ئارەزووی خۆی ئاوا بەئاسانی بۆ کوێ خواستی لێ بێ دڵان بەرەو ئەوێ هەڵ دەسوڕێنێ[1].

---

[1] تقدم فی مجلد تاسع. تسلسل/٧٠ رقم/٥٠٥١/١٢.

## ١٠) ئەوەی لە بارەی منداڵی ناموسوڵمانەکانەوە لە ئاییندا روونکراوەتەوە ماورد في أطفال الكفار

٥١٧١- (ب - ١ ز - ٦ ل - ٣٧ ف - ٢)[١].

٥١٧٢- ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە لە باسی الفصل الثاني فيما رآة النبي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): رابوورد، فەرموودەی یەکەم بەڵام لە گێڕانەوەیەکی بوخاریدا کە لەم شوێنەدا بەیان کراوە، لە باتی: پیرەمێردەکەی بن درەختەکەیش ئیبراهیم بوو. ئەمەیە: پیاوە باڵا بەرزەکەیش کە لە ناو باخەکەدا بوو ئیبراهیم بوو، دروودی لێ بێ، منداڵەکانی دەوریشی هەموو ئەو منداڵانە بوون کە لەسەر سروشتی خودا کرد مردوون.بازێ لە مووسوڵمانەکان عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا منداڵانی هاوبەشپەیدا کەرو ناموسوڵمانەکانیش لە بەهەشتدا لەگەڵ ئیبارهیم دا دەبن؟ فەرمووی: بەڵێ ئەوانیش لە بەهەشتدا لەگەڵ ئیبراهیمدا دەبن[٢].

٥١٧٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُئِلَ عَنْ ذَرَارِيِّ الْمُشْرِكِينَ فَقَالَ: اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ. رواه الثلاثة[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەبارەی منداڵانی هاوبەش پەیداکەرەکانەوە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پرسیار کرا: ئایا منداڵی ئەمانە کە بەمنداڵی دەمرن بەهەشتین یادۆزەخین؟ فەرمووی: خودا خۆی باش دەزانێ ئەو منداڵانە ئەگەر گەورە ببوونایەو تەکلیفیان لەسەر بوایە کارو کردەوەیان چی دەبوو، بەڵام مادەم لە پێش رەسیدەبووندا مردوون ئەوە ئەرکو تەکلیفیان لەسەر نییە، کەواتە بەهەشتین. (ش/د).

---

(١) تقدم فی مجلد أول. تسلسل/ ٦ رقم/ ٢ /٣٨.

(٢) تقدم فی مجلد ثامن. تسلسل/٤ رقم/١/٤٢٥٠.

(٣) بخاری. جنائز: ١٣٨٤، ٦٥٩٨. مسلم. قدر: ٦٧٠٤. نسائی. جنائز: ١٩٤٨. تحفة الأشراف: ١٤٢١٢. تجرید/٧٩/٢/ رقم: ٦٥٩ = ١٣٨٢، ٣٢٥٥، ٦١٩٥.

٥١٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) قَالَتْ: تُوُفِّيَ صَبِيٌّ فَقُلْتُ: طُوبَى لَهُ عُصْفُورٌ مِنْ عَصَافِيرِ الْجَنَّةِ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَوَلاَ تَدْرِينَ أَنَّ اللّٰهَ خَلَقَ الْجَنَّةَ وَخَلَقَ النَّارَ فَخَلَقَ لِهَذِهِ أَهْلاً وَلِهَذِهِ أَهْلاً. وفي رواية: إِنَّ اللّٰهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلاً خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلاَبِ آبَائِهِمْ. رواه مسلم وأبو داود[٤]:

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ منداڵێ مرد، عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم منداڵە خۆشی لە خۆی چۆلەکەی بەهەشتە، چونکە بێ گوناهە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): چۆن وا دەڵێیت تۆ خۆت دەزانی کە خودا هەم بەهەشتی دروست کردووەو، هەم دۆزەخی دروست کردووە، هەروا دەستەیەکی دروست کردووە بۆ بەهەشتو دەستەیەکی تری دروست کردووە بۆ دۆزەخ ( کەواتە: ئەی عائیشە! لە خۆتەوە بەبێ بەڵگەیەکی روون لە شتی وا غەیبیو پەنهانیدا پەلە لە بڕیاردان مەکە). لە گێڕا نەوەیەکا: خودا کە سانێکی دروست کردووە بۆ بەهەشت، هەر لەپشتی باوکیاندا بۆ ئەوێی دروست کردوون، وە کەسانێکی تری دروست کردووە بۆ ئاگری دۆزەخ هەر لە پشتی باوکیاندا بۆ ئەوێی دروست کردوون. (م/د).

٥١٧٥- وَعَنْهَا قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ ذَرَارِيُّ الْمُؤْمِنِينَ، قَالَ: هُمْ مِنْ آبَائِهِمْ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ بِلاَ عَمَلٍ قَالَ: اللّٰهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَذَرَارِيُّ الْمُشْرِكِينَ قَالَ: مِنْ آبَائِهِمْ. قُلْتُ: بِلاَ عَمَلٍ قَالَ: اللّٰهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ. رواه أبو داود بسند صالح[٥]:

دیسان فەرمووی (خودای لێ رازی بێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! حوکمی منداڵانی موسوڵمانان – کە بەمنداڵی لە پێش رەسیدە بووندا دەمرن –

---

[٤] مسلم. قدر: ٦٧١٠. أبو داود. سنة: ٤٧١٣. نسائي. جنائز: ١٩٤٦. ابن ماجه. قدر: ٨٢. تحفة: ١٧٨٧٣.

[٥] بسند صالح لأبي داود.

چییە؟ بە هەشتین یا دۆزەخین؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): حاڵی ئەوانیش وەك حاڵی بابیانەو، حوکمیان حوکمی بابیانە. گوتم: دیارە بەبێ کردەوە؟ فەرمووی: خودا بۆ خۆی باش دەزانێ کە ئەو منداڵانە ئەگەر گەورەبێن کردەوەیان چی دەبێ. گوتم: قوربان! ئەی منداڵانی هاوبەشپەیداکەران کەلە پێش رەسیدەبووندا بمرن حوکمیان چییە، بە هەشتی دەبن یا دۆزەخی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەوانیش حوکمیان حوکمی بابیانە. گوتم: دیارە بەبێ کردەوە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): خوا بۆ خۆی باش دەزانێ کە ئەو منداڵانە ئەگەر گەورەبێن کردەوەیان چی دەبێ (د–س/صالح).

## ١١) ئەوەی لە بارەی خەڵکانی سەردەمی پێغەمبەر گەردانیەوە هاتووە ماورد في أهل الفترة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً – سورة الإسراء – ١٥/١٧}.

واتە: ئێمە بە خوتوخۆڕایی کەس سزا نادەین لە سەرکردەوەو بیرو باوەڕی، چ خاس بن چ خراپ، هەتا پێغەمبەرێ دەنێرین، ڕێگەی چاکەو ڕێگەی خراپەیان بۆ روون دەکاتەوە، بەبەڵگەی رۆشنو بە موعجیزەی گەورە مەهانەیان ناهێڵێو بیانوویان دەبڕێو بۆ ڕیان دەدا.

٥١٧٦– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَيْنَ أَبِي؟ قَالَ: أَبُوكَ فِي النَّارِ. فَلَمَّا قَفَّى (أي ذهب) قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ[1]:

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوکم لە سەردەمی بێ پەیامیو پێغەمبەرگەردانی دا مردووە، دەبێ جێگەی کوێبێ؟ ئا یا جێگەی بە هەشتە یا دۆزەخە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ):

---

[1] مسلم. إيمان: ٤٩٩. أبو داود سنة: ٤٧١٨. تحفة الأشراف: ٣٢٧

باوکت لە ناو ئاگردایە کاتێ پیاوەکە ویستی بگەڕێتەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ زێدە ڕوونکردنەوەو زێدە هاندانیان لە وەرگرتنی ئایینی ئیسلامی پیرۆزو، بۆ پتر بێزو قێز کردنەوە لە بیرو باوەڕی کۆنی سەردەمی نەزانی، فەرمووی: باوکی منو باوکی تۆ ئێستا وان لە ناو ئاگردا. (د-س/ص).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

حەزرەت (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) گەلێ جار لە فەرمایشتە ڕوونکەرەوەکانیدا، بۆ دەربڕینی هاودەردیو هاوسەنگیی سەرجەمی موسوڵمانان لە ناو خۆیاندا، لە خێرو لە شەڕدا، وەهای پیشان داوە کە ئەویش وەك ئەوان بەندەیەکی بەرپرسیاری بەرفەرمانە، هەروا بنەچەو وەچەکەی ئەویش - لەبەردەم عەداڵەتی دادگای خودای گەورەو بێ باکدا- حاڵیان وەك حاڵی بنەچەو وەچەی ئەو خەڵکەی تر وایە، لەم لایەنەوە بۆ ئەم مەبەستە پەروەردەی یە، نەخۆی لە خۆیانو نەبنەچەو وەچەی لە بنەچە ووەچەی ئەوان جیانەکردۆتەوە، بە تایبەتی لە سەرەتای دامەزراندنی ئیسلامەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە تۆندو تیژی داکۆکی لەسەر ئامانجە سەرەکییەکانی بەرنامەکەی قورئان دەکرد، وەك: یەکێتیی خودا، بێچوونیی خودا، نیشانە پەسەندەکانی خودا، وەك یەکسانیو چونیەکی بەندەکانی خودا، کە هەموو لە ئادەمنو ئادەمیش لە گڵە، پایەو پلەو ڕێزیان لەلای خودا تەنیا بە تەقوایەو بەس، نەك بە بنەچەو وەچە، یابەشێوەی جوان یا بەزۆری سامان، بەڵام کاتێ کە یاساو بەرنامەکانی ئیسلام بەتەواوی جێ گیربوونو، عەقیدەو بیروباوەڕی ساغی ئیسلامەتی لەسەر شێوەیەکی جوانو پتەو لە ناو دڵو دەروونی جەماوەری گەلی ئیسلامدا بەباشی ڕەگو ریشەیان داکوتاو، مەترسی ئەوە نەما کە ئیتر دەسکاری بنەماکانی ئیسلام بکرێ، یابتپەرستیو شتی وا لە ناو موسوڵماناندا سەر هەڵ بداتەوە، واتە کاتێ کە بتپەرستیو فرە خوایی بنەبڕبوون وە بەرنامەی ئیسلام بەباشی سەری گرت،

ئیتر حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بەجڵەوکێشیی سرووش بەرە بەرە دەستی کرد بەبـژارکردنی مـەزرای پـیرۆزی ئیـسلامو، گـەڵێ لـەو کێـشەو بـەرەو ئیشکالانەی چارەسەر کرد کە لەوە پێش- بەهۆی فرە بۆنەی جیا جیاوە – پەیدابوو بوون، وەك ئەوە کە دەفەرموێ: لە مەوپێش جاران نەهیم لێ دەکردن لـە دیدەنی گۆڕستان، بەڵام ئەوا ڕێگـەی مـن دراوە کـە دیـدەنی گـۆڕی دایکم بکەم، کە وابوو ئێوەیش لە مەودوا دیـدەنی گـۆڕستان بکـەن، چونکە دیمـەنی گـۆڕو گـۆڕستان یـادی قیامـەت تـازە دەکاتـەوە.هۆیـەکی گرنگـی ئـەو کێـشەو ئیشکالانە دەگەڕێتەوە بۆ چەند خاڵێ: وەك جیایی مەعنای لۆغەوی ووشە لـە مـەعنای ئیـستیلاحی هـەمان ووشـە خـۆی، لـە سـەرەتاوە ئـەم زاراوە شـەرعی یانەی کە ئێستا وا باوو ناسراون ئاوا واتا ڕۆشنو مەبەست زانـراو نـەبوون، مەبەستو چەمکی بێژەو گفتەو عیبارەتو رستە بە پێی شوێنو حاڵو کات دەگـۆڕان، وەك ئـەوە پلـەی ڕۆشـنبیری لـە نـاو کۆمەڵـدا نـزم بـوو، بـاو بـاوی ئۆمێتیو بێ سەوادی یی بوو، خەڵك لەبەر شـەڕو شـۆڕو مەشـق کـردن لەسـەر شیرو تیرو فێربوونی رمبازیو جلیتبـازیو خـەمی نـان نـەیان دەپەرژایـە سـەر خوێندەواری، تەنانەت ئـەو تەقەلایـەی کـە ئیسلام دەیـدا بـۆ پەخـشی زانـست هێشتا سەرەتای بوو، لەبەر ئەوە زاناو مەلاو فەقێ کەم بوون، ئـەوەیش لـەوێ بوەستێ کە زۆربەی نۆ موسوڵمانەکان ماکی دینە کۆنەکـەی خۆیـان لـە نـاخی دەروونیانـدا هـەرمابوو، هەڕەمەیـەکی ئێجگـار زۆر لـە بـیرو بـاوەڕو عـادەتو نەریتی جوولەکەو گاورو بتپەرستو فرە خـواو ئاگر پەرست بەهۆی ئەم نۆ موسوڵمانانەوە بەناو خەڵکە موسوڵمانەکەدا بڵاو بوو بۆوە.

جا لەهەلو مەرجێکی ئاوادا فرە بیری نیوە چڵو زۆر باوەڕی نابەکامو زۆر کێـشەو بـەرەی زەقو رەق سـەرهەڵ دەدەن، وەلێ لـە سـایەی خـوداوە، بەتەوقیفی خودایی، سوورو جێـزی پـاكو پـوختی خـەرمانی گوڵو گوڵزاری ئیسلام لەو حەمکە دڕكو داڵو کـاو کۆتـەڵو پووچـەڵو کـۆزەرە جیـا وەکرا. ئـەم پوختـە کردنـەش بەکۆشـشی بـێ ووچـانی حـەزرەت خـۆیو یـارانیو

زانایانی ئاینی سەری گرت، بگرە ئەم هەوڵە پیرۆزە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە، چونکە هێشتا ماکی بیری چەوت لەناومانا هەرماوە.

جا پاش ئەم سەرنجە عەرزی ئێوەی ئازیزی بەڕێز دەکەم: زۆربەی ئەو بە دیمەن جیاوازی یەی کەلە نێوان چەند حەدیسێکدا رەچاو دەکرێن دەگەڕێنەوە بۆ ئەم جۆرە هۆیانە، لەبەر ئەوە زانا گەورەکان چونکە شارەزای‌یەکی باشیان هەیە لە هۆو ماکی کێشەکاندا، گەلێ بە جوانیو زۆر بەهاسانی دەتوانن چارەسەریان بۆ بدۆزنەوە، وەهەتا بۆیان بکرێ حەدیسی ساغ بە زەعیف یا بەمەنسوخ دانانێنو، ئەگەر بۆرە دژایەتی‌یەك لە بەینی دوو فەرموودەی ساغدا هەبوو تەئویلیان دەکەن، وەلێ نیمچە مەلاو کۆلکە خوینەوارەکان تادەبێ کێشەکە گەورەتر دەکەنو بە سادەترین جیاوازی فەرتەنەیێ بەرپا دەکەن.

بۆ نموونە دوو رای جیا جیا لە بارەی جێگەی ئەو جیهانی باوكو دایکی پێغەمبەرەوە هەن، ئایا بەهەشتین یانا؟ چەند فەرموودەیێ دەفەرموێ بەهەشتین، فەرموودەی تر هەیە دەفەرموێ: بە هەشتی نین. ئەم فەرموودەیەی ئێرە گەلێ تەئویل هەڵ دەگرێ، وەك ئەوە مەبەست لەم فەرموودەیەی ئێرە ئەوەبێ کە عەبدوڵڵای باوکی پێغەمبەر لە کاتی ئەو پرسیارو وەڵامەدا، لەناو گۆڕدا، لەناو ئاگردا بووبێ، لەبەر گوناەو شتی وا، نەوەك لەسەر بێ باوەڕیو شتیوا، بەڵام لەوەدوا لەبەر خاتری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) یالەبەر هەرهۆیەکی تر ڕزگاری بووبێو بچێتە بەهەشتەوە. بەزەینم حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەسەرەتاوە کەوای فەرمووە مەبەستی چەند شت بووە: قێزاویکردنو تەبشیعی بیرو باوەڕە کۆنەکان، هەتا لەبەر چاوی موسوڵمانان بکەون، دڵدانەوەی کابرای پرسیارکەر؟ گەیاندنی ئەو هەواڵە بە خەڵك تا بەبنەچەو وەچەی خۆیان دەست خەڕۆ نەبنو، هەرکەس خۆی بۆ خۆی هەوڵ بدا. تکایە بۆ پتر بەهرەمەندی لەم باسە تەماشای بەرگی شەشەمی تاج، لاپەڕە (٢١٣) فەرموودەی/٢٢ چ/١ ژمارە:٣٩١٣ چاپی/٢، بفەرموون.

خوێنەری ئازیز! ئەمەی نووسیمان لەسەر ئەم فەرموودەیە نمونەیەکە لە شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی فەرموودەکان، ئەمەیش کاتو کۆششو مەودای خۆی دەوێ، کەواتە من هەقمە کە بەتەرجەمەی حەدیسەکان ئیکتیفادەکەم، لە بەخشندەیی خودای گەورەش ئومێد دەکەم کەلەمەولا، لاوو مەلاو زانا خواناسەکانمان نرخو سەنگی ئەم جۆرە تەرجەمەو وەرگێڕانە بزانن بایەخی پێ بدەن، هەتاکەی هەر بڵێین: خۆ کوردییەو خۆکردییە!! ڕاستە کەبەندە – وەك مامۆستا مەلا ڕەشید بەگ (خودای لێ ڕازی بێ) – گوتوومە: ئەمە شتێکە بۆ عەوامو نائاشنا بەعولومی عەرەبی یە کراوە، عولەما ئیحتیاجیان پێی نییە، وەلێ ئێستا وەك ئیقتیباسێ لەم باسە تەئویلی ئەو قەولە قەردیمەتان بۆ دەکەم بەم قولە جەدیدە: ئەو زاناو مامۆستاو مەلایانەی کە هەست بەناسکیو نازداریو شیرینی ی زمانەکەی خۆیان ناکەنو، تامو چێژو چەشنی زمانی شیرینی کوردییان نەکردووە، بە زمانێکی تر گۆش کراون ئەوانە کاریان بەم جۆرە شاکارانە نییە، ئەوانە ددانیان پێی ئاڵ دەبێتەوە، وەلێ نەوەی نوێ بەم جۆرە کارە جوانە ڕچە شکێنانە چاوو دڵو دەروونیان گەشو ڕۆشن دەبێتەوە!

٥١٧٧- عَنْ عَامِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْوَائِدَةُ وَالْمَوْءُودَةُ فِي النَّارِ. رواهما أبو داود[٢]:

لە عامیرەوە (خودای لێ ڕازی بێ) عەرزی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کرا: ژنێ کچێکی خۆی زیندە بەچاڵ کردووە، حوکمی چییە؟ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: زیندە بەچاڵکەرەکەو زیندە بە چاڵکراوەکە – واتە: دایكو کچەکەی هەردوکیان وان لە ناو ئاگردا (د – سەنەد صالح).

٥١٧٨- ← (ب – ١ ز – ٢٢٤ ل – ٥٨٥ ف – ٩)[٣].

---

[٢] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٣] تقدم فی مجلد أول. تسلسل/ ٢٢٤ رقم/١١٥٣/٩/٩

لێرەدا دەفەرموێ: زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) جارێ بەسواری قاترێکی خۆی بوو، لەناو باخە خورمایەکی بەنی نەججارەکاندا بوو، ئێمەیش لە خزمەتیدا بووین، لەپڕ هێسترەکەی هەڵ سڵەمییەوە، وەختەبوو بەری بداتەوە، کە تەماشامان کرد وا پێنج – شەش گۆڕێ دەرکەوتن، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): کێ خاوەنی ئەم گۆڕانە دەناسێ؟ پیاوێ گوتی: من، فەرمووی: ئەمانە کەنگێ مردوون؟ گوتی: کۆنن خاوەنەکانیان لە سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام دا مردوون، لەکاتی باوی فرە خوایی (ئیشراك) دا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەم میللەتی موحەممەدەیش لەگۆڕەکانیندا تاقی دەکرێنەوەو دووچاری پرسیارو ئەزموون‌و جەڕە بابەدان‌و کێشەو بەرە دەبن، مەبادا لاشەی یەکتری نەنێژن‌و، ئەرکی سەرشانی خۆتان لەم لایەنەوە بەجێ نەهێنن، ئەگەر سزای ناو گۆڕ بەگوێی خۆتان ببیستن، دەنا داوام لە خودا دەکرد کە کارێکی وای بکردایە کە ئێوەیش وەك ئێستای من گوێتان لە سزاو ئازاری ناو گۆڕ بوایە. لە پاشا رووی کردە ئێمەو فەرمووی: لە سزای ئاگر پەنا بە خودا بگرن.

یاران فەرموویان: نعوذ بالله من عذاب النار: لە سزای ئاگر پەنا بە خودا دەگرین. فەرمووی: لەسزای گۆڕ پەنا بەخوا بگرن. فەرموویان: نعوذ بالله من عذاب القبر: لە سزای گۆڕ پەنا بە خودا دەگرین، فەرمووی: لە ئاژاوەو فەرتەنە پەنا بە خوا بگرن، لە دیارو نادیاری. فەرموویان: نعوذ بالله من الفتن ماظهر منها وما بطن: پەنا دەگرین بە خودا لە ئاژاوەو لە دیاریو لە نادیاری. (م/ن). دەقی وەڵامەکانی یاران دادەنرێن بەرستەی نزای پەسەندی حەدیثی، لەم شوێنانەدا، چونکی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پەسەندی کردوون‌و پێیان رازی بووە، بۆیە منیش عەرەبییەکەیم نووسی. (وەرگێڕ)

## ١٢) کردەوە بەپێی سەرئەنجامیەتی : (الأعمال بالخواتيم)

**٥١٧٩- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَعْظَمِ الْمُسْلِمِينَ غَنَاءً عَنِ الْمُسْلِمِينَ فِي غَزْوَةٍ غَزَاهَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَظَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَهُ فَقَالَ: مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى هَذَا. فَاتَّبَعَهُ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ، وَهُوَ عَلَى تِلْكَ الْحَالِ مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ عَلَى الْمُشْرِكِينَ، حَتَّى جُرِحَ فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَجَعَلَ ذُبَابَةَ سَيْفِهِ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ حَتَّى خَرَجَ مِنْ بَيْنِ كَتِفَيْهِ فَأَقْبَلَ الرَّجُلُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُسْرِعًا فَقَالَ أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ.فَقَالَ: وَمَا ذَاكَ؟. قَالَ: قُلْتَ عَلَى فلاَنٍ، مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَلْيَنْظُرْ إِلَيْهِ. وَكَانَ مِنْ أَعْظَمِنَا غَنَاءً عَنِ الْمُسْلِمِينَ، فَعَرَفْتُ أَنَّهُ لاَ يَمُوتُ عَلَى ذَلِكَ فَلَمَّا جُرِحَ اسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَقَتَلَ نَفْسَهُ.فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ ذَلِكَ: إِنَّ الْعَبْدَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالْخَوَاتِيمِ.**
**رواه البخاري[1]:**

**سەهل (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێکی موسوڵمان لە غەزایەکا لەگەڵ پێغەمبەردا بوو، زۆرباش لەو شەڕەدا فریای موسوڵمانەکان کەوت، کەچی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سەرنجێکی ئەو پیاوەی داو فەرمووی: هەرکەسێ حەزدەکا کە لە جیهاندا پیاوێکی دۆزەخی ببینێ با تەماشای ئەم پیاوە بکا. پیاوێ لە موسوڵمانان، دوورو نزیک شوێن ئەو پیاوە ئازایە دەکەوێ، تابزانێ هۆی چییە کەوا دۆزەخی یە، دەڕوانێ دەم بە دەم پیاوەکە باشتر ناموسوڵمانەکان بەرباد دەکا تا خۆشی زامار دەکرێ، کەچی کە زامار دەکرێ ئۆقرە ناگرێ، بەڵکوو پەلە لە مردنی خۆی دەکاو، نووکی شمشێرەکەی خۆی لە نێوانی هەردوو گۆی مەمکیدا دادەنێو، بە هەموو**

---

[1] بخاری. جهاد: ٢٨٩٨، ٤٢٠٢، ٤٧٠٧، ٦٤٩٣، ٦٦٠٧. تجریدی بخاری/٤ /٣١١ رقم/ ١٥٧١ = ٤٢٠٣، ٤٢٠٢، ٤٢٠٧، ٦٤٩٣، ٦٦٠٢. مسلم. إيمان: ٣٠١ — ٣٠٤، ٦٦٨٣ تحفة الأشراف: ٤٧٨٠، ٤٧٨٧.

هێزی خۆی خۆی دەدا بەسەریدا، تا نووکەکەی لە ناو شانیەوە دەردەچێ و خۆی دەکوژێ، جا پیاوەکە خێرا هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی کرد: قوربان! شایەتی دەدەم کە بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خودایت، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): بۆچی چی بووە؟ گوتی: پێشبینی یەکەت ڕاست دەچوو، ئەوە بوو کە تۆ لەبارەی ئەو زەلامەوە واوات فەرموو، کە دۆزەخی یە، بەڵێ ئەم کابرایە هەرچەند خۆی زۆر باش فریای موسوڵمانان کەوت، بەلاّم کە تۆ وات فەرموو من زانیم کە ئەو کابرایە لەسەر ئیسلامەتی نامرێ لەبەر ئەوە شوێنی کەوتم، تابریندار بوو، ئیتر پەلەی لە مەرگی خۆی کردو خۆی کوشت، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: بەندەی وا هەیە کردەوەی بە دیمەن کردەوەی دۆزەخییە، بەلاّم خۆی لە عیلمی خودادا بە بەهەشتی لە قەڵەم دراوە، بەندەی وایش هەیە بە پێچەوانەوە کردەوەی بە هەشتی یەو خۆی دۆزەخی یە، چونکە هەمووکارێ بە پێی سەرەنجامەکەیەتی کتێب بۆ ئاخری دەگێڕێتەوە! (ب).

٥١٨٠- ← (ب – ٧ ز – ٢٥ ل – ١٣٠ ف – ١)[٢].

٥١٨١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا اسْتَعْمَلَهُ. فَقِيلَ: كَيْفَ يَسْتَعْمِلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: يُوَفِّقُهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبْلَ الْمَوْتِ. رواهما الترمذي في القدر بسندين صحيحين. نسأل الله حسن الخاتمة. آمين[٣]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ خودا خواستی خێری بەهەر بەندەیێ هەبێ دەیخاتە کار، عەرزیان کرد: قوربان! چۆن چۆنی دەیخاتە کار؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): لە پێش مردندا کارێکی باشی بۆڕێك دەخات (ت – س/ص).

---

[٢] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/ ٢٥. رقم/١/٤٠٨٢.

[٣] بسند صحيح عند الترمذی

## ١٣) گەرەکە کاری چاك زوو بەزوو بکرێ : (تجب المبادرة بالعمل الصالح)

٥١٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا أَوْ يُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا. رواه مسلم والترمذي[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لەحەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە کردەوەی باش دەست پێشکەری لە قەومانی ئەو فەرتەنەو ئاشووبانە بکەن کە وەك شەوەزەنگ خەڵك دادەگرنو دنیا تاریك دەکەن، خەڵك وا سەریان لێ دەشێوێو ڕێیان لێ دەگۆڕێ، پیاو هەیە بەیانی موسوڵمانەو ئێوارە کافرە، ئێوارە موسوڵمانەو بەیانی کافرە، ئایینی خۆی دەفرۆشێ بۆ شڕەو پڕو پیتی جیهان (م/ت).

٥١٨٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ سَبْعًا هَلْ تَنْظُرُونَ إِلاَّ فَقْرًا مُنْسِيًا أَوْ غِنًى مُطْغِيًا أَوْ مَرَضًا مُفْسِدًا أَوْ هَرَمًا مُفَنِّدًا أَوْ مَوْتًا مُجْهِزًا، أَوِ الدَّجَّالَ فَشَرُّ غَائِبٍ يُنْتَظَرُ أَوِ السَّاعَةَ فَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ. رواه الترمذي وقال حديث حسن[٢]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): بە کردەوەی باش پێش دەستی لەم حەوت شتە بکەن: چی لە جیهان چاوەڕێ دەکەن، جگە لە یەخە گرتنی یەکێ لەم حەوت شتانە، کەلە پڕێکا پڕتان پیا بکاو بدا بە سەرتاندا: یەکەم هەژاری، کە هەموو شتێ لەبیر دەباتەوە، دووەم دەوڵەمەندی، کە پیاو یاخیو بایی دەکا، سێیەم نەخۆشین کە لەش تێك دەدا، چوارەم پیریی کە مرۆڤ دەخەڵەفێنێ، پێنجەم مردنی کوتوپڕی بڕسبڕ! شەشەم جەجاڵ کە خراپترینو بەدترین نادیار (غائیب)ێکە، کە چاوەڕوان دەکرێ، حەوتەم قیامەت کە ئەمەیان لە هەموان سامناکترو دیژوارترە! (ت/حاکم – س/ص)

---

[١] مسلم. إيمان: ٣٠٩

[٢] حسن عند الترمذي.

٥١٨٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ سِتًّا: طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا أَوِ الدُّخَانَ أَوِ الدَّجَّالَ أَوِ الدَّابَّةَ أَوْ خَاصَّةَ أَحَدِكُمْ أَوْ أَمْرَ الْعَامَّةِ. رواه مسلم والإمام أحمد[٣]:

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەکاری چاکە هەتا دەتوانن پێشدەستی لەم شەش کارەساتە سامناکانە بکەن: یەکەم لە کارەساتی هەڵهاتنی خۆر لە خۆر ئاواوە کە نیشانەیەکی گەورەی هاتنی قیامەتە، دووەم لەو دووکەڵەی کە سەراسەر جیهان دادەگرێ، وەچل ڕۆژ دەمێنێتەوە، ئەمیش لە پێش هەستانی قیامەتدا روو دەدات، سێیەم لە جەجاڵ، چوارەم لە دابیەتو لئەرض، پێنجەم لەمەرگ کەوەك مڵۆزم یەخەی یەك بەیەکتان دەگرێو کەستان لە چنگی قوتاری نابێ، شەشەم لە هاتنی ڕۆژی ڕەستاخێز، واتە: قیامەت، کە کارەساتێکی گشتی وایە هەموان وەك یەك دادەگرێ. ( م/ئەحمەد- بەر ڕەحمەتی خودا کەون)

بۆ زانیاری زیاتر تەماشای ئەم شوێنانە بکە: بەرگی حەوتەم، لاپەڕە حەفتاو شەشو تەفسیری سوورەتی نەمل، بەرگی شەشەم، لا پەڕە دووسەدو چلو هەشت، سوورەتی یووسف، فەرموودەی چوارەم، بەرگی شەشەم ل- ١٦٦ چ/١ ف – ٣. (وەرگێڕ)

## ١٤) ترسی خودای گەورە پیرۆزییە : (الخوف من الله تَعَالَى)

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ - سورة آل عمران – ٣ /١٧٥}

واتە: ئەگەر ئێوە بەڕاستی موسوڵمانی تەواونو خاوەنی باوەڕی پتەون هەر لەمن بترسن کە خودای هەموانم.

٥١٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً، وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا. رواه البخاري والترمذي[١]:

---

[٣] مسلم. فتن: ٧٣٢٣

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم لە بارەی سام‌و ترس‌و بیمی مەرگ‌و گۆڕو حەشرو سەختڵەتی و مەینەتەکانی ڕۆژی قیامەتەوە، ئەگەر ئێوە بیزانن کەم پێ دەکەنین‌و گەلێ زۆر دەگریان (ب/ت).

٥١٨٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حُجِبَتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ، وَحُجِبَتِ الْجَنَّةُ بِالْمَكَارِهِ. رواه الشيخان والترمذي[٢]:

دیسان لەوەوە لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پەردەو پەرژینی دۆزەخ هەوەسبازی‌و ئارەزوو بازی یە، پەردەو پەرژینی بەهەشتیش بۆ دڵی کردنی نەفسە. (ش/ت) واتە: بەجێ هێنانی ئارەزووەکانی دەروون وەك ئەوە وایە پەردەو پەرژینی دەوری دۆزەخ بە دەستی خۆت لادەیت، ئەوجا بە پێی خۆت بچیتە ناو دۆزەخەوە، هەروەها بەجێ هێنانی ئەرکە ئایینی‌یەکانیش - کە بەجێ هێنانیان زۆر ناخۆش‌و گرانە لەسەر شانی نەفس‌و دەروون - وەك ئەوە وایە پەردەو پەرژینی دەوری بەهەشت بە دەستی خۆت لادەیت‌و، ئەوجا بە هاسانی خۆت بکەی بەناو بەهەشتا. تەماشای بەرگی یەکەمی ( ریاض الصالحین لاپەڕە سەدو سی‌و پێنج، فەرموودەی حەوتەم بفەرموون، بۆ زانیاری زیاتر (وەرگێڕ).

٥١٨٧- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْجَنَّةُ أَقْرَبُ إِلَى أَحَدِكُمْ مِنْ شِرَاكِ نَعْلِهِ، وَالنَّارُ مِثْلُ ذَلِكَ. رواه البخاری والإمام أحمد[٣]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خودای لێ ڕازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): هەرکامێ لە ئێوە بگری بەهەشتی لێوە نزیکترە لە بەنپێڵاوی کەوشەکانی، دۆزەخیش هەروەها، واتە: کەس نازانێ کە خوا بەهۆی چییەوە

---

(١) بخاری. رقاق: ٦٤٨٦، ٦٤٨٥، ٦٦٣٧.

(٢) تجرید/٥/٢٧٤ رقم: ٢٠١٧ = ٦٤٨٧ فتح. مسلم. الجنة وصفة نعیمها: ٧٠٦١. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٥٩. تحفة/ ٣٢٩.

(٣) تجیرید/٥/٢٧٣ رقم/٢٠١٦ = ٦٤٨٨ فتح.

لێی خۆش دەبێ، یابەهۆی چییەوە لێی دەرەنجێ، کەواتە: مرۆڤ تادەتوانێ کاری خێر زۆر بکا، وەهەروەها تا دەتوانی لە خراپە، لە گەورەو لە بچووکی، لەکەمو لە زۆری، دووربێ (ب/ئەحمەد—رەحمەت لە گۆڕی نازاریان).

٥١٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ رِجَالٌ يَخْتِلُونَ الدُّنْيَا بِالدِّينِ يَلْبَسُونَ لِلنَّاسِ جُلُودَ الضَّأْنِ مِنَ اللِّينِ وَأَلْسِنَتُهُمْ أَحْلَى مِنَ السُّكَّرِ وَقُلُوبُهُمْ قُلُوبُ الذِّئَابِ يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَبِي يَغْتَرُّونَ أَمْ عَلَيَّ يَجْتَرِئُونَ فَبِي حَلَفْتُ لأَبْعَثَنَّ عَلَى أُولَئِكَ مِنْهُمْ فِتْنَةً تَدَعُ الْحَلِيمَ مِنْهُمْ حَيْرَانًا[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لە ئاخر زەمانا پیاوانێ پەیدا دەبن، بە فێڵو فڕ، بەناوی ئایینەوە هەوڵ بۆ خواردنی جیهان دەدەنو، دینی پیرۆز دەکەن بە ماشەو دەسمایەی دنیا، ئەمانە بەدیمەن لەبەر چاوی خەڵك وەك مەڕ هێمنن و بەزمانی لووس وەك شەکر شیریننو دەڵێی مەڕی پێغەمبەرو کەللەی شەکرن، بەڵام لە دڵەوە گورگنو کەوڵی مەڕیان پۆشیوە.

خودای گەورەو سەروەرو بالاَ دەست و خاوەن شانو شکۆ هەڕەشە لەمانە دەکاو دەفەرموێ: ئایا ئەمانە بە هۆی صەبرو حەوسەڵەی منەوە لە خۆبایی‌و دەسخەڕۆ دەبن، یاخود لەبەر سەرکەشی‌و گومڕایی خۆیان پڕ کێشی لەمن دەکەنو تا ئەم ڕادەیە بە سووکی تەماشای خودا دەکەن! دەی سوێندم بە گەورەیی خۆم ئەمەیان بە سەرەوە ناچێ، دەبێ تووشی فەرتەنەیەکی وایان بکەم. وەك کوێری مزمەعیل بە هیچ لایەکا سەردەرنەکەن، وەك ئەوە یەکێ لە خۆیان دەکەم بە مایەی ئاژاوەو دەیکەم بە کوڵکیانەوە، کامیان کە خۆی بە حەوسەڵەدارو هێمن دەزانی سەرگەردانو سەرلێشێواوی بکا. (ت — س/ح).

---

[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥١٨٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ أَحَدٍ يَمُوتُ إِلاَّ نَدِمَ، قَالُوا: وَمَا نَدَامَتُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنْ كَانَ مُحْسِنًا نَدِمَ لاَ يَكُونَ ازْدَادَ وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا نَدِمَ أَلاَ يَكُونَ نَزَعَ[٥]:

دیسان لەوەوە لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): هەموو کەسێ کە دەمرێ پەشیمان دەبێتەوە! یاران گوتیان: قوربان! لەبەرچی؟ فەرمووی: ئەگەر خۆی پیاوی باش بوو بێ لەبەر ئەوە پەشیمان دەبێتەوە بۆ زیاتر چاکەی نەکردووە، ئەگەر خۆی پیاوی خراپ بێ بۆ ئەوە پەشیمان دەبێتەوە کە بۆ لە خراپە وازی نەهێناوەو بە دەستی خۆی ئاگری ناوە بە ماڵی خۆیەوە (ت – س/ح).

٥١٩٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ خَافَ أَدْلَجَ وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللَّهِ غَالِيَةٌ أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللَّهِ الْجَنَّةُ[٦]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەسێ بترسێ و خەمی خۆی هەبێ شەو دەگرێ بە دەمەوەو شەو لەناو بۆی دەردەچێ، کەسێکیش ئاوا چالاك بێ و شەو بگرێ بەدەمەوەو شەو لە ناو بۆی دەرچێ هەر دەگاتە هەوارو بە ئاواتی خۆی دەگا، ئاگادار بن کاڵای خودا زۆر بەنرخ و گران بەهایە، هەتا خۆتانی پتر بۆ ماندوو بکەن کەمە، ئاگاداربن مەبەست لەکاڵای خودا بە هەشتی باڵایە خۆشی لەو کەسەی کەبە کۆششی بێ ووچان خۆی دەگەیەنێتی (ت – س/ح).

٥١٩١← فەرموودەی (لايَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللهِ) رابورد لەباسی (فضل الجهاد)یدا. (ب–٨ ز–١١ ل–٥٢ ض/١ ف–١٢)[٧].

٥١٩٢- ← (ب – ١ ز – ٢٢٤ ل – ٥٨٤ ف – ٧)[٨].

---

(٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(٦) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه)

(٧) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه). تقدم في مجلد/٨ تسلسل/١١ ل/٥٢ رقم/٤٢٠٨/١٢.

٥١٩٣- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي أَرَى مَا لاَ تَرَوْنَ وَأَسْمَعُ مَا لاَ تَسْمَعُونَ أَطَّتِ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلاَّ وَمَلَكٌ وَاضِعٌ جَبْهَتَهُ سَاجِدًا لِلَّهِ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا وَمَا تَلَذَّذْتُمْ بِالنِّسَاءِ عَلَى الْفُرُشِ وَلَخَرَجْتُمْ إِلَى الصُّعُدَاتِ تَجْأَرُونَ إِلَى اللَّهِ. لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ شَجَرَةً تُعْضَدُ. روى هذه الستة الترمذي[9].

ئەبو ذەڕ (خودای لیٚ ڕازی بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: هەندیٚ شت هەن من دەیانبینم بەلاٚم بۆ ئیٚوە نابینریٚن، هەندیٚ شتیش هەن من دەیانبیستم بەلاٚم بۆ ئیٚوە نابیستریٚن وەك سامناكیو چۆنیٚتی گۆڕی تەنگو تاریكو گەلیٚ لە حاڵو سەیرو سەمەرەی هەردوو جیهان، ئاسمان چرکە چرکیٚتی و هەقیشیٚتی کە بکەویٚتە چرکە چرکو قرچە قرچ، چونکە شویٚنی هەموو چوار پەنجەیەکی فریشتەییٚ تەویٚڵی خۆیی لەسەر داناوەو کوڕ نووش بۆ خودا دەبا، بە خودا ئەوەی من دەیزانم ئەگەر ئیٚوە بیزانن گەلیٚ کەم پیٚ دەکەنینو زۆر زۆر دەگریان، لەسەر نویٚنیش کەیفتان لەگەڵ ژن نەدەکرد، وەلە تاوانا دەردەپەڕین بۆ ڕیٚگەو بانەکانو هاوا ڕتان دەبردە بەر خودا کە پەناتان بدا، خۆزگەم من درەختیٚ دەبووم یەکیٚ دەیبڕیمو دەبڕامەوەو دەچوومەوە پەردەی نەبوونو ڕزگارم دەبوو لە چەندو چوونو لە بگرەو بەردەو لە کیٚشەو بەرەی هەردوو جیهان! (ت – س/ح).

## ١٥) پشت بە خودا بەستن : (التوكل على الله تَعَالَى)

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ - سورة الطلاق – ٣/٦٥}.

واتە: خودای مەزن دەفەرمویٚ: هەرکەسیٚ بەڕاستی پشت بە خودا ببەستیٚ، ئیتر بۆ هەموو شتیٚ تەنیا خودای بەسە.

---

[8] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه). تقدم فى مجلد/١ تسلسل/٢٢٤ رقم/١١٥١/٧/

[9] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥١٩٤- ← (ب - ٤ ز - ٨٠ ل - ٢٤٠ ف - ١)[1].

٥١٩٥- عَنْ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرُزِقْتُمْ كَمَا تُرْزَقُ الطَّيْرُ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[2]:

عومەر (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ئێوە بەڕاستی پشت بە خودا ببەستن، بەڵام پشت بەستنێکی بە ڕاستی تەواو، ئەوا خودا وەك چۆن رزقو ڕۆزی مەلو باڵندەکان بەڕێكو پێکی دەدا، ئاوا رزقو ڕۆزی ئێوەیش دەدا، ئەوە تانێ ئەو مەلو باڵندانە سەر لە بەیانەکی بەسکی چۆڵو برسی لەلانەو جێگەی خۆیان دەردەچن، بەبێ ئەوە توێشە بەرەیەکیان پێ بێ، یا عەمارێکیان هەبێ، کەچی سەر لە ئێوارێ بە تێرو تەسەلو بە جیقڵدانی پڕەوە دەگەڕێنەوە. (ت - س/ص - ئەحمەد/ حاکم).

٥١٩٦- عَنْ أَنَسَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ أَعْقِلُهَا وَأَتَوَكَّلُ أَوْ أُطْلِقُهَا وَأَتَوَكَّلُ قَالَ: اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ. رواه الترمذي في آخر كتابه[3]:

ئەنەس (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: پیاوێ بە سواری وشترێ هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە وشترەکەی دابەزیو هاتە پێشەوەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە پێشدا وشترەکەم ببەستمەوەو ئەوجا پشت بە خودا ببەستم کە شتێکی بەسەر نەیێ، یاخود پێویست بەبەستنەوە ناکا، بەڵکوو یەکسەر بەرەڵای بکەمو پشت بە خودا ببەستم؟ فەرمووی: لە پێشدا بیبەستەرەوە ئینجا پشت بە خودا ببەستە. واتە: رەفتو عەمەل بەهۆو سەبەب دژی تەوەککول نیە. (ت).

---

[1] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/ ٨٠ رقم/ ٣٠٦٣/١.

[2] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[3] سكت عَن درجته الشارح.

٥١٩٧- ← (ب - ٢ ز - ٢٠ ل - ٥٣ ف - ١٠)[٤].

٥١٩٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْـهُ) قَالَ: كَانَ أَخَوَانِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَ أَحَدُهُمَا يَأْتِي النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالآخَرُ يَحْتَرِفُ فَشَكَا الْمُحْتَرِفُ أَخَاهُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: لَعَلَّكَ تُرْزَقُ بِهِ[٥]:

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) دوو برا هەبوون، یەکێکیان دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە خزمەتیدا فێری زانستو ئایین دەبوو، ئەوی تریشیان کارو کەسابەتی دەکردو خۆشیو براکەیشی بە خێو دەکرد، ئیشکەرەکەیان لەلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سکاڵای لە دەست براکەی کرد، کە گوایە ئیشو کارێ بۆ گوزەرانی خۆی ناکا، فەرمووی: ڕەی تێ دەچێ کە خودا لەبەر خاتری ئەو رزقو ڕۆژی تۆیش بدا کەواتە: گلەیی ی لێ مەکە. (ت - س/ص).

٥١٩٩- وَكَتَبَ مُعَاوِيَةُ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنها) أَن اكْتُبِى لَيَّ كِتَابًا تُوصِينِى فِيهِ وَلاَ تُكْثِرِى عَلَيَّ. فَكَتَبَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها إِلَى مُعَاوِيَةَ: سَلاَمٌ عَلَيْكَ أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنِ الْتَمَسَ رِضَاءَ اللَّهِ بِسَخَطِ النَّاسِ كَفَاهُ اللَّهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ وَمَنِ الْتَمَسَ رِضَاءَ النَّاسِ بِسَخَطِ اللَّـهِ وَكَلَـهُ اللَّـهُ إِلَـى النَّاسِ. وَالسَّلاَمُ عَلَيْكَ. روى هذه الثلاثة الترمذي. نسأل الله حسن اليقين والتوكل عليه آمين[٦]:

مەعاوییە (خودای لێ ڕازی بێ) نامەیەکی بۆ عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) نووسی داوای لێ کرد: نامەیەکم بۆ بنووسە پەندم دادەو ئامۆژگاریم بکە، بەڵام باکورتو پوختو بەسوود بێ، ئەویش کاغەزێکی لەسەر ئەم شێوەیە بۆ نووسی: سڵاو لە تۆ، لە پاش سڵاو، بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو

---

[٤] تقدم في مجلد /٢. تسلسل/٢٠ رقم: ١٠/ ١٢٦٩.

[٥] واه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٦] سكت عن درجته الشارح.

(دروودی خودای لەسەربێ): کەسێ ڕەزای خودای مەبەست بێو هەوڵی بۆ بدا - ئەگەرچی بە هۆی ئەوەیشەوە خەڵك لە خۆی تووڕە بکا - ئەوە خودا لە پاداشی ئەوەدا لە زەحمەتو ئەرکو ئازاری خەڵك ڕزگاری دەکا، وەلێ کەسێ مەبەستی ڕەزامەندیی خەڵك بێو دەربەستی ئەوە نەیێ کە خودا بە هۆی ئەوەوە لێی دەڕەنجێ، ئەوە خودا دەیسپێرێ بە خەڵکەکەو لە پشتیوانیو عینایەتو چاوێریی خۆی بێ بەشی دەکا ئیتر دیسان سڵاو لەسەر تۆ (ت).

## ١٦) بەشی پێنجەم: باسی ئەو شتانەی کە دەبن بەهۆی دڵنەرم بوونو دڵسۆزیی

## الفصل الخامس: في الرقاق

٥٢٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إنَّ اللّٰهَ تَعَالَى قَالَ مَنْ عَادَى لِي وَلِيًّا فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ، وَمَا تَقَرَّبَ إِلَيَّ عَبْدِي بِشَيْءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِمَّا افْتَرَضْتُ عَلَيْهِ، وَمَا يَزَالُ عَبْدِي يَتقَرَّبُ إِلَيَّ بِالنَّوَافِلِ حَتَّى أُحِبَّهُ، فَإِذَا أَحْبَبْتُهُ كُنْتُ سَمْعَهُ الَّذِي يَسْمَعُ بِهِ، وَبَصَرَهُ الَّذِي يُبْصِرُ بِهِ، وَيَدَهُ الَّتِي يَبْطُشُ بِهَا وَرِجْلَهُ الَّتِي يَمْشِي بِهَا، وَإِنْ سَأَلَنِي لأُعْطِيَنَّهُ، وَلَئِنِ اسْتَعَاذَنِي لأُعِيذَنَّهُ، وَمَا تَرَدَّدْتُ عَنْ شَيْءٍ أَنَا فَاعِلُهُ تَرَدُّدِي عَنْ نَفْسِ الْمُؤْمِنِ، يَكْرَهُ الْمَوْتَ وَأَنَا أَكْرَهُ مَسَاءَتَهُ. رواه البخاري والإمام أحمد[1]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: کەسێ گەڕ بە خۆشەویستێکی من بکاو، دوشمنایەتی لەگەڵ دۆستێکی مندا بکا، ئەوە مەعنای وایە کە دوژمنایەتی لەگەڵ مندا دەبەستێ کەواتە با خۆی ئامادە بکا بۆ شەڕ کردن لەگەڵ خۆمدا، من خۆم شەڕی تێ دەبەستمو لە جیاتی ئەو دۆستە نازدارەم بۆی دەچمە مەیدانی نەبەرد بۆ ئەو ناحەزەی!

---

(١) ریاض/ ١/ ١٠٥ رقم/١/٩٥ تجرید البخاري/٥/٢٧٩ رقم/ ٢٠٢٣ = ٦٥٠٢ فتح.

وەعەبدو بەندەی من بە هیچ شتێکی خۆشەویست وەك ئەوە خۆی لە من نزیك ناكاتەوە، کە وەك بە کردنی ئەو شتانەی فەرزم کردووە لە سەری بەوە خۆی لە من نزیك بکاتەوە، بەرە بەرە بەندەی من، بەکردنی سوننەتەکان، خۆی لە من نزیك دەکاتەوەو خۆی دێنێتە پێشەوە، هەتا خۆشەویست دەبی لەلام، جا کاتێ بەندە گەیشتە ئەو پلەیە کە ببێ بە خۆشەویستو دۆستی من، ئیتر خۆم دەبم بە گوێو چاوو دەستو پێ بۆی! هەرچی بە دڵی من نەبێو بۆ رەزای من نەبێ نەگوێی پێ دەداو نەتەماشای دەکاو نەدەستی بۆ دەباو نەبۆی دەچێ! ئیتر منیش بێ دڵی ئەو ناکەمو دڵی ناشکێنم، هەرچیم لێ داوا بکا بەبان چاو دەیدەمێو بە دەستی خۆم دەیدەمێو بە پێی خۆم بۆی دەبەم، ئەگەر پەنام بۆ بێنێ پەنای دەدەم، لە کردنی هیچ شتێ وەك ئەوە سێو دوو ناکەمم وەك ئەوە کەلە کێشانی گیانی موسوڵماندا سێو دوو دەکەم، چونکە ئەو حەزی لە مردن نییە، وە منیش هەر چەند حەزم لە بێ دڵی ئەو نییە بەلأم مردنیش کارێکی ناچارییە هەردەبێ ببێ. (ب/ ئە – نوقمی لێشاوی میهری خودابن.

٥٢٠١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: إِذَا خَرَجَتْ رُوحُ الْمُؤْمِنِ تَلَقَّاهَا مَلَكَان يُصْعِدَانِهَا. قَالَ حَمَّادٌ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): فَذَكَرَ لَنَا مِنْ طِيبِ رِيحِهَا وَذَكَرَ الْمِسْكَ. وَيَقُولُ أَهْلُ السَّمَاءِ: رُوحٌ طَيِّبَةٌ جَاءَتْ مِنْ قِبَلِ الأَرْضِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى جَسَدٍ كُنْتِ تَعْمُرِينَهُ. فَيُنْطَلَقُ بِهِ إِلَى رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ ثُمَّ يَقُولُ انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى آخِرِ الأَجَلِ. قَالَ: وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا خَرَجَتْ رُوحُهُ.قَالَ حَمَّادٌ: وَذَكَرَ مِنْ نَتْنِهَا وَذَكَرَ لَعْنًا – وَيَقُولُ أَهْلُ السَّمَاءِ: رُوحٌ خَبِيثَةٌ جَاءَتْ مِنْ قِبَلِ الأَرْضِ. قَالَ فَيُقَالُ: انْطَلِقُوا بِهِ إِلَى آخِرِ الأَجَلِ. قَالَ: فَرَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَيْطَةً كَانَتْ عَلَيْهِ عَلَى أَنْفِهِ هَكَذَا. رواه مسلم[٢].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کاتێ کە گیانی بڕوا دارێ دەردەچێ دوو فریشتە دەیقۆزنەوەو سەرەو ژوور سەری دەخەن بۆ ئاسمان،

---

[٢] مسلم. الجنة ونعيمها: ٧١٥٠.

حەمماد فەرمووی: بودەیل، کە ئەم فەرموودەیەم لێ وەرگرتووە باسی ئەوەی بۆ کردین کە بۆنی لە بۆنی میسك خۆشترە، ئیتر دانیشتوانی ئاسمان دەفەرموون: واگیانێکی بۆنخۆشی پاك لەلای زەمینەوە هات. ئەی گیان! دروودو رەحمەتی خودا هەم لە خۆتو هەم لەو لەشەیش بێ کە تۆ ئاوەدانت کرد بۆوە! ئەوجا بە قەدرو رێزەوە دەیبەن بۆ خزمەت خودای گەورەو سەروەر. جا دەفەرموێ: بیبەن بۆ لای سیدرەتولمونتەها. فەرمووی: کاتێکیش گیانی ناموسوڵمان (کافر) دەردەچێ دەیبەن. حەمماد فەرمووی: بودیل باسی ئەوەی بۆ کردین کە بۆگەنی دێو نەفرینو لە عنەتی لێ دەکرێ. جا خەڵکی ئاسمان دەفەرموون: واگیانێکی چەپەڵی بۆ گەن لەلای زەمینەوە هات فەرمووی: ئەوجا دەگوترێ: بیبەن بۆ سەججین کە شوێنی موڵگەی دۆزەخی یەکانە. ( لەجەلالەیندا دەفەرموێ: هەندێ کەس دەڵێن: سەججین زیندانێکە والەبن هەر حەوت تەبەقەی عەردەوە، مۆڵگەی ئیبلیسو لە شکرەکانیەتی).

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودو سلاوو رەحمەتی خودای لەسەربێ) پارچەیێ شاڵی لەبەردا بوو، لەو کاتەدا کە باسی گەنیویو بۆ گەنی گیانی ناموسوڵمانەکانی دەکرد، ئاوا گرتی بە لووتی خۆیەوە ( وەك بفەرموێ: ئای لەو بۆگەنە دەبێ چەند خەستو پیس بێ!). (م).

٥٢٠٢- ← (ب - ١ ز - ٢٢٤ ل - ٥٨٠ چ/١ ف - ١ + ٢)[٣].

لێرەدا پتریی زۆرە، دەفەرموێ: بەرا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) لەگەڵ تەرمی پیاوێ لە یاریدەراندا چووین بۆ سەر قەبران، کە چووینە ئەوێ هێشتا ئەڵحەدەکە تەواو نەبوو بوو، حەزرەت ( دروودو رەحمەتو سلاوی یەزدانی مەزنی لەسەر بێ) دانیشتو

---

[٣] تقدم في المجلد الأول. تسلسل/ ٢٢٤ رقم/١/١١٤٥، رقم ٢/١١٤٦.

ئێمـەیش کـشو مـات لـە دەوری ئـەو دانیـشتین. چـرکەمان لـە خۆمـان بـڕی پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) دارێکـی بـە دەسـتەوە بـوو، خـۆش خـۆش دەیخـشاند لـە زەوییەکـە، ئینجـا سـەری هـەڵبڕی و دووجـار یاسـێ جـار لـە سەریەك فەرمووی: پەنا بگرن بە خودا لە سزاو ئازاری گۆڕ. ئەوجا فەرمووی: کاتـێ کـە تـەرمی موسـوڵمان لـە نـاو گـۆڕدا دادەنـرێو هاوڕێکـانی بـەرەو دوا دەگەڕێنـەوە، هێـشتا زۆر دوور ناکەونـەوەو مردووەکـە هێـشتا گـوێی لـە خـشپەی پێڵاوەکانیانـە، کـە دوو فریـشتە دەگەنـە سـەریو دایدەنیـشێنن بەقنگەوەو پێـی دەڵـێن: خـودای تـۆ کێیە؟ دەڵـێ: خـودای مـن یـەزدانی پاکـە، خـودای مـن ئەڵڵایـە، ئەوسا پێـی دەڵـێن: ئـەی لەسـەر چـی ئـاینێکی؟ دەڵـێ: موسـوڵمانم لەسـەر ئـاییني ئیـسلامم، ئـەوجا پێـی دەڵـێن: ئـەم پیـاوەی کـە رەوانـەکراوە بـۆ ناوتـان چییەو چـی نییـە؟ دەڵـێ: ئـەوە پێغەمبـەری خودایـە (درودی خودای لەسـەربێ) جـا دەڵـێن: چـۆن دەزانـی؟ دەڵـێ بـەوەدا دەزانم: قورئـانم خوێندووەو باوەڕم پێی هێناوەو بڕوام پێی کردووە، جا مەبەست لەم ئایەتە ئەم پرسیارو وەڵامەیە کە خودا لە قورئانا دەفەرموێ:

{يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ – سـورة إبراهيم – ٢٧/٢٤}.

واتە: خودای گەورە بەهۆی ئەم وتارە دامەزراوە جوانەوە کە وشـەی (لا الـه الا الله محمـد رسـول الله) یە، موسوڵمان لـە هـەردوو جیهانـدا رزگـار دەکـاو، دایدەمـەزرێنێ لەسـەر ئـاییني ڕاستو دروست، بە تایبـەتی بە پیرۆزی ئـەم وشەیە تەوقیفی دەدا کە وەڵامـی باشـی پرسیارەکانی نـەکیرو مونکـەر لـە نـاو گۆڕدا بە گوساخی بداتـەوە. ئـەوجا بـانگ کـەرێ لـە ئاسمانـەوە بـانگ دەکـاو دەفەرموێ: ئەدی وایە، قسەی بەندەکەم گەلێ ڕاستو دروستە، کەواتە ئـادەی جێگەی لە ناو بەهەشتا بۆ رابخـەنو بـەرگی بەهەشتی لەبـەر بکـەنو دەرگـای بەهەشـتی بـۆ بکەنـەوە.فـەرمووی: ئـیتر فێنکـیو خۆشـیو بـۆنو بەرامـەی بەهەشـت دەچـێ بەسـەریداو، هـەتا چـاوی بـڕ بکـا گـۆڕەکـەیی بـۆ گوشـاد

دەکرێو، گۆڕەکەی دەبێ بە باخی رازاوەی بەهەشت، ناموسوڵمانو ناپاکیش (واتە: کافرو مونافقیش) کاتێ لە ناو گۆڕدا دادەنرێ، گیانی دەچێتەوە ناو لە شەکەی، ئەوسا دوو فریشتە دەچنە سەریو، دەینێن بەقنگەوەو، پێی دەڵێن: خودای تۆ کێیە؟ ناموسوڵمانەکە، یاناپاکە کە دەڵێ: هاها: نازانم. ئەوجا پێی دەڵێن: ئایینت چییە؟ دەڵێ: هاها! نازانم. ئەوسا پێی دەڵێن: ئەم کابرایەی کە رەوانەکراوە بۆ ناوتان چییەو چی نییە، تۆ بەچی دەزانی پێغەمبەرە یانا؟ دیسان دەڵێ: ها ها نازانم!. فەرمووی: جا بانگکەرێ لە ئاسمانەوە بانگ دەکاو دەفەرموێ: درۆ دەکا، ئادەی لەناو ئاگردا جێگەی بۆ خۆش کەنو، سکڵو پشکۆو ئاگری سووری لە باتی دۆشەك بۆ راخەنو، بەرگی ئاگرینی دۆزەخی لەبەرکەنو دەرگایەکی بەرەو دۆزەخ بۆ بکەنەوە!

فەرمووی: جا شەراوهالاوی دۆزەخ دێ بەسەریداو گۆڕەکەی وا تەنگو تەسك دەبێتەوەو گوڕەوشارێکی وای دەدا پەراسووەکانی – وەك پەنجەکانی هەردوو دەست ئاوا – بەناو یەکتردا تێك دەپەڕن!

ئەوجا دەیدەنە دەست وەردیانێکی گوێرو کەڕو لاڵ، وەردیانێکی لەم رەنگە، لەم حاڵە، دەکەن بە کوڵکیەوە، هەتا بە هیچ جۆرێ رەحمی پێ نەکا، پیرە وەردیان گورزێکی ئاسنینی واپێ، لە کێوی بدا دەیکا بە تۆزو خاكو خۆڵ، هەرچەند بەو گورزەیەك تۆپزی لێ دەدا هەرچی لە نێوانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوادا هەیە دەنگی شەقەو زرمەکەی دەبیستێ، تەنیا ئادەمیزادو جندۆکەی لێ دەرچێ، ئیتر لەشی کابرا دەبێ بە خاكو خۆڵ، لە پاشا دیسان گیانی دەکرێتەوە بەبەردا و دیسان گورزێکی تری پیا دەکێشێو ئیتر هەتا سەر هەروا (د – س/ح – ن – رەحمەتی خودایان لێ بێ).

٥٢٠٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قُبِرَ الْمَيِّتُ أَوْ قَالَ أَحَدُكُمْ أَتَاهُ مَلَكَانِ أَسْوَدَانِ أَزْرَقَانِ يُقَالُ لأَحَدِهِمَا الْمُنْكَرُ وَالآخَرُ النَّكِيرُ فَيَقُولاَنِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ؟ فَيَقُولُ مَا كَانَ يَقُولُ: هُوَ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. فَيَقُولاَنِ قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ

تَقُولُ هَذَا. ثُمَّ يُفْسَحُ لَهُ فِي قَبْرِهِ سَبْعُونَ ذِرَاعًا فِي سَبْعِينَ ثُمَّ يُنَوَّرُ لَهُ فِيهِ ثُمَّ يُقَالُ لَهُ نَمْ. فَيَقُولُ: أَرْجِعُ إِلَى أَهْلِي فَأُخْبِرُهُمْ فَيَقُولاَنِ نَمْ كَنَوْمَةِ الْعَرُوسِ الَّذِى لاَ يُوقِظُهُ إِلاَّ أَحَبُّ أَهْلِهِ إِلَيْهِ. حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ. وَإِنْ كَانَ مُنَافِقًا قَالَ سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ: فَقُلْتُ مِثْلَهُ لاَ أَدْرِى. فَيَقُولاَنِ: قَدْ كُنَّا نَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُولُ ذَلِكَ. فَيُقَالُ لِلأَرْضِ الْتَئِمِي عَلَيْهِ. فَتَلْتَئِمُ عَلَيْهِ. فَتَخْتَلِفُ فِيهَا أَضْلاَعُهُ فَلاَ يَزَالُ فِيهَا مُعَذَّبًا حَتَّى يَبْعَثَهُ اللَّهُ مِنْ مَضْجَعِهِ ذَلِكَ»[٤].

ئەبو هەورەیرە (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودو رەحمەتو سڵاوی خودای گەورەو سەروەری لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ کە مردوو. یا فەرمووی: کاتێ کە یەکێ لە ئێوە سپێردرا بە خاك دوو فریشتەی ڕەشی شین دێنە لای، یەکێکیان ناوی مونکیرو ئەوی تریان ناوی نەکیرە، جا لێ ی دەپرسن: لە هۆی ئەم پیاوەوە چیت گوتووە؟ - واتە: دەڵێن: ئایا موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) بە پێغەمبەر دەزانی یانا؟ - ئەویش لە وەپێش چی گوتووە لە گۆڕیشا دیسان هەر ئەوە دەڵێتەوەو لەبەر ئەوە دەڵێ: ئەم پیاوە بەندەو پێغەمبەری خودایە، بە زمانێکی پاراو دەڵێ: اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا عبده ورسوله: شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو بەس خودای تر نییە، هەروا بە زمان دەڵێمو بەدڵ باوەڕ دەکەم کە موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری ئەوە. فریشتەکانیش دەفەرموون: خۆشمان هەر دەمانزانی کە تۆ وادەڵێیت، ئەوسا حەفتا گەز لە پانیو حەفتا گەز لە درێژی گۆڕەکەی بۆ گوشادو پانو پۆڕ دەکرێ، هەروەها گۆڕەکەی ڕووناك دەکرێتەوە بۆی وپڕ دەبێ لە نوورو، پێی دەڵێن: فەرموو بۆ خۆت بخەوە خەوی خۆشت بێ، دەڵێ: دەچمەوە بۆ لای کەسوکارم پێیان دەڵێم کەوا کەوتووم بەسەرچی خێرو خۆشییەکدا، دەڵێن: نەء، نابێ، بەلام فەرموو بخەوە، وەك زاوایەکی خەوتوو کە خۆشەویسترین کەسی خەبەری بکاتەوە

[٤] رواه الترمذي بسند حسن فى الجنازة (شرحه).

ئاوا، ئیتر هەروا لەوێ دەمێنێتەوە هەتا ئەو کاتە کە خودا لەو شوێنی نووستنەی زیندووی دەکاتەوە، ئەمە ئەگەر موسوڵمان بوو وا، بەڵام ئەگەر ناپاك بوو دەڵێ: موسوڵمانەکان قسەیەکی واوایان دەگوت، بەقسەی ئەوان بێ گوایە پێغەمبەرە، بەلام من لەترسی گیانی خۆم ئەو قسەیەیەم گوتووە، وەڵێ باوەڕم پێی نییە. ئەوانیش دەڵێن: خۆشمان هەر دەمانزانی کە تۆ ئەم ناماقوڵبیە دەکەی ئەوجا دەگوترێ بە خاك: بیگوشە، ئیتر خاك وای دەگوشێ پەراسووی راستو چەپی تێك دەپەڕێنێ، ئیتر هەتا رۆژی راستبوونەوە، کە خودا زیندووی دەکاتەوە لە وێدا ئەشکەنجە دەدرێ (ت – س/ح).

٥٢٠٤– عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ حَافِظَيْنِ رَفَعَا إِلَى اللَّهِ مَا حَفِظَا مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ فَيَجِدُ اللَّهُ فِي أَوَّلِ الصَّحِيفَةِ وَفِي آخِرِ الصَّحِيفَةِ خَيْرًا إِلاَّ قَالَ اللهُ تَعَالَى أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي مَا بَيْنَ طَرَفَيِ الصَّحِيفَةِ. رواهما الترمذي في الجنائز[٥]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گشت بەندەیێ بەشەو دوو فریشتەو، بە رۆژ دوو فریشتە چاودێری دەکەنو کردەوەکانی لە نامەیەکدا دەنووسن، هەموو ڕۆژێ کاتێ دوو فریشتەکانی شەو، یا دوو فریشتەکانی ڕۆژ نامەی کردەوەی بەندەیێ دەبەنەوە بۆ لای خودا، خودای گەورە ئەگەر لە سەرەتاو لە کۆتایی ئەو نامەیەدا شتی باش ببینێ دەفەرموێ: ئێوە بەشایەت بن کەوا من لەم پەڕ تا ئەو پەڕی ئەم نامەیە هەرچی تیادا نووسراوە لەم بەندەی خۆمە خۆش بووم (ت).

٥٢٠٥– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَتِ الآخِرَةُ هَمَّهُ جَعَلَ اللَّهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ جَعَلَ اللَّهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ[٦]:

---

[٥] سكت عن درجته الشارح.

[٦] سكت عن درجته الشارح.

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ بە تەنگی دوا ڕۆژەوەبێو مەبەستی خودابێ، خودا دڵی دەوڵەمەند دەکاو رشتەی کاروباری بۆ قایم دەکاو، جیهانیش بە پێی خۆی دێ بە پیریەوە، وە هەرکەسێ مەبەستی هەر جیهان بێو دنیا ئاواتی هەرە گەورەی بێ، خودا تووشی چاو برسێتی دەکاو، کۆمەڵەی لێ تێك دەداو گوڵوڵەی دەخاتە لێژی، لە هەمان کاتدا ئەوەیش چارەنووسی خۆی نەبێ، لە خۆشیی جیهان، پێی نابڕێ (ت).

٥٢٠٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ شَيْءٍ شِرَّةً وَلِكُلِّ شِرَّةٍ فَتْرَةً فَإِنْ كَانَ صَاحِبُهَا سَدَّدَ وَقَارَبَ فَارْجُوهُ وَإِنْ أُشِيرَ إِلَيْهِ بِالأَصَابِعِ فَلاَ تَعُدُّوهُ[7]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گشت شتێ هەڵچوونو هەڵکفانێکی هەیە، گشت هەڵکفانێکیش دامردنەوەیەکی هەیە. جا خاوەنی ئەو هەڵکفانو دامردنەوەیە ئەگەر لە کاری خۆیدا مام ناوەندی بوو، چ بۆ کاری دین، چ بۆ کاری دنیا، ئەوە ئومێدی چاکەتان پێی هەبێ، بەڵام ئەگەر لە رادەبەدەربوو، بە شێوەیەکی وا کە لە گشت لایەکەوە بە پەنجە دەست نیشانیان دەکرد، ئەوە بە هیچی دامەنێن، چونکە لە حاڵەتی وادا بەندە تووشی چاوەوریایی دەبێ! (ت – س/ح).

٥٢٠٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي أَمْلأْ صَدْرَكَ غِنًى وَأَسُدَّ فَقْرَكَ وَإِلاَّ تَفْعَلْ مَلأْتُ يَدَيْكَ شُغْلاً وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ. روى هذه الثلاثة الترمذي[8]:

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! ئەی ڕۆڵەی ئادەم! تۆ خۆت تەرخان کە بۆ

---

[7] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[8] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

بەندەیی من هەتا منیش ناو دڵت پڕ بکەم لە دەوڵەمەندیو، دەرگەی هەژاریت لێ دابخەم، ئەگینا بە ئیشو فرمانی زۆر سەرت جەنجاڵ دەکەمو، لەهەمان کاتدا دەرگەی هەژا ریشت لێ داناخەم! (ت- س/ح).

٥٢٠٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ بِمَنْزِلَةِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[٩]:

دیسان لەوەوە لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): ڕۆژیخۆری سوپاسگوزار لە پایەی ڕۆژووەوانی خاوەن صەبروو ئارام دایە. (ت/ ئە/ حاکم - س/ص).

٥٢٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كُنْتُ خَلْفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا فَقَالَ: يَا غُلَامُ إِنِّي أُعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوِ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ وَلَوِ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ رُفِعَتِ الأَقْلَامُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ. رواه الترمذي[١٠]:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: ڕۆژێ لە پاشکۆی پێغەمبەردا سواربوو بووم، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەی جوان! تۆ ئاگات لە مافەکانی خودا بێ خودایش چاوی خێری لە تۆ دەبێ، لە خودا بێ ئاگامەبە دەبینیت کە هەمیشە خودا فریات دەکەوێ، داوای شت هەر لە خودا خۆی بکە، داوای کۆمەکیش هەر لە خودا خۆی بکە، بشزانە ئەگەر ئەم خەڵکە هەموو کۆببنەوە بۆ ئەوەی کە سوودێ، یاخود زیانێ بە تۆ بگەیەنن، هەر شتێ، ئایا چاك، ئایا خراپ کە خودا لە چارەتی نەنووسیبێ تووشت نابێ، قەڵەمو کاغەز پێچراو نەتەوەو هەموو شت هەر لە سەرەتاوە بڕاوەتەوە (ت - س/ح).

---

[٩] بسند صحيح (شرحه).

[١٠] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥٢١٠- عَنْ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: دَعْ مَا يَرِيبُكَ إِلَى مَا لاَ يَرِيبُكَ فَإِنَّ الصِّدْقَ طُمَأْنِينَةٌ وَإِنَّ الْكَذِبَ رِيبَةٌ. رواه الترمذي وأحمد وابن حبان[١١]:

حەسەنی کوڕی عەلی (خۆشنوودیی خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی کە گومانی خراپەی لێ دەکرێ لێی گەڕێو دووربە لەوەی لێی بە گومانی، لەباتی شتی وا کارێ بکە کە دڵت ئاوی پێ دەخواتەوە، چونکە لە راستی دڵنیایی دەبارێو، بە درۆش دڵ گەرد دەگرێو سەری لێ دەشێوێ. (ت / ئە/ ئیبنو حەببان – س/ص).

٥٢١١- عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْكَيِّسُ مَنْ دَانَ نَفْسَهُ وَعَمِلَ لِمَا بَعْدَ الْمَوْتِ وَالْعَاجِزُ مَنْ أَتْبَعَ نَفْسَهُ هَوَاهَا ثُمَّ تَمَنَّى عَلَى اللّٰهِ الأماني. رواه الترمذي وأحمد والحاكم[١٢]:

شەددای کوڕی ئەوس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ژیرو هۆشیار ئەو کەسەیە کە مەحکەمەی خۆی بکا، دانا ئەو مەردەیە کە جڵەوی هەواو هەوەس بۆ نەفس بەرەڵلاَ نەکاو، نەفس ترشی بێو خۆشی بێ ڕێگەی چاکەی پێ بگرێو، تێ بکۆشێ بۆ ژیانی پاش مردن، وە هەرچی دەکا بیری دوا ڕۆژی هەبێو بزانێ کە مردن لە پێشە، خوێڕیو نەکارەیش ئەو لاژگەیە شوێن هەواو هەوەسو ئارەزووی خۆی دەکەوێو، کەچی خۆزگەی بەلاش لە خودا داوا دەکاو، ئاواتی هیچو پووچ لە خوای گەورە دەخوازێ. (ت/ئە/حاکم– س/ص).

٥٢١٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ يُحِبُّهُمُ اللّٰهُ وَثَلاَثَةٌ يَبْغَضُهُمُ اللّٰهُ فَأَمَّا الَّذِينَ يُحِبُّهُمُ اللّٰهُ فَرَجُلٌ أَتَى قَوْمًا فَسَأَلَهُمْ بِاللّٰهِ وَلَمْ يَسْأَلْهُمْ بِقَرَابَةٍ بَيْنَهُ وَبَيْنَهُمْ فَمَنَعُوهُ فَتَخَلَّفَ رَجُلٌ بِأَعْقَابِهِمْ فَأَعْطَاهُ سِرًّا لاَ يَعْلَمُ بِعَطِيَّتِهِ

---

[١١] بسند صحيح (شرحه).

[١٢] بسند صحيح (شرحه).

إِلاَّ اللَّهُ وَالَّذِى أَعْطَاهُ وَقَوْمٌ سَارُوا لَيْلَتَهُمْ حَتَّى إِذَا كَانَ النَّوْمُ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِمَّا يُعْدَلُ بِهِ نَزَلُوا فَوَضَعُوا رُءُوسَهُمْ فَقَامَ أَحَدُهُمْ يَتَمَلَّقُنِى وَيَتْلُو آيَاتِى وَرَجُلٌ كَانَ فِى سَرِيَّةٍ فَلَقِىَ الْعَدُوَّ فَهُزِمُوا وَأَقْبَلَ بِصَدْرِهِ حَتَّى يُقْتَلَ أَوْ يُفْتَحَ لَهُ. وَالثَّلاَثَةُ الَّذِينَ يَبْغَضُهُمُ اللَّهُ الشَّيْخُ الزَّانِى وَالْفَقِيرُ الْمُخْتَالُ وَالْغَنِىُّ الظَّلُومُ. رواه الترمذي وابن حبان والحاكم[١٣]:

ئەبو ذەڕ (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا سێ جۆرە كەسی خۆش دەوێ‌و، قینی لەسێ جۆرە كەسیشە، ئەو جۆرە كەسانەی كە خودا خۆشی دەوێن ئەمانەن: پیاوێ دەچێ بۆ ناو خزمانی، داوایان لێ دەكا كەلەبەر خودا – نەك لەبەر خزمایەتی – بەشی بدەن، ئەوانیش بەشی نادەنێ، بەلاّم پیاوێكیان بە دزی ئەوانەوە خۆی دەگرێتە دواوەو بە نهێنی بەشی دەدا، خودا نەبێ‌و ئەو پیاوەیش كە شتەكەی دەداتێ كەسێ تر بەمە نازانێ! كۆمەڵێكیش بە شەو دەكەونە رێ‌و، دەڕۆن تا خەو زۆریان بۆ دێنێ‌و، لە هەموو شتێكی تر خۆشتر دەبێ لە لایان، تەنانەت لە پوول‌و پارەیش، جا ئەو حەلە بە كفتی سەردەنێنەوەو دەخەون، لە پاشا یەكێكیان هەڵ دەسێ‌و مەرایی لەبەر من دەكاو دەست دەكا بە ذیكرو یادی من‌و قورئان دەخوێنێ، پیاوێكیش لە ناو لقێ سوپادا دەبێ، بەرەنگاری دوشمن دەبن، تاقمەكەی هەڵ دێن، بەلاّم ئەو ئازایانە سینگ دەباتە پێشەوەو شەڕ دەكا، هەتا لە كاتی هەڵمەتدا دەكوژرێ یاخودا سەری دەخاو شەڕەكە دەباتەوە.

ئەو سێ جۆرە كەسەیش كە خودا رقی لە چارەیانە ئەمانەن: یەكەم: پیری شەروالپیس، دووەم: هەژاری فیزن، سێیەم: دەوڵەمەندی ستەمكار. (ت/ ئیبنو حەببان/ حاكم – س/ص).

٥٢١٣– عَنْ أَبِى سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُصَلاَّهُ فَرَأَى نَاسًا كَأَنَّهُمْ يَكْتَشِرُونَ فَقَالَ: أَمَا إِنَّكُمْ لَوْ أَكْثَرْتُمْ ذِكْرَ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ

---

[١٣] بسند صحيح (شرحه).

لَشَغَلَكُمْ عَمَّا أَرَى فَأَكْثِرُوا مِنْ ذِكْرِ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ الْمَوْتِ فَإِنَّهُ لَمْ يَأْتِ عَلَى الْقَبْرِ يَوْمٌ إلاَّ تَكَلَّمَ فِيهِ فَيَقُولُ: أَنَا بَيْتُ الْغُرْبَةِ وَأَنَا بَيْتُ الْوَحْدَةِ وَأَنَا بَيْتُ التُّرَابِ وَأَنَا بَيْتُ الدُّودِ. فَإِذَا دُفِنَ الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ قَالَ لَهُ الْقَبْرُ: مَرْحَبًا وَأَهْلاً أَمَا إِنْ كُنْتَ لأَحَبَّ مَنْ يَمْشِي عَلَى ظَهْرِي إِلَيَّ فَإِذْ وُلِّيتُكَ الْيَوْمَ وَصِرْتَ إِلَيَّ فَسَتَرَى صَنِيعِي بِكَ. قَالَ فَيَتَّسِعُ لَهُ مَدَّ بَصَرِهِ وَيُفْتَحُ لَهُ بَابٌ إِلَى الْجَنَّةِ. وَإِذَا دُفِنَ الْعَبْدُ الْفَاجِرُ أَوِ الْكَافِرُ قَالَ لَهُ الْقَبْرُ: لاَ مَرْحَبًا وَلاَ أَهْلاً أَمَا إِنْ كُنْتَ لأَبْغَضَ مَنْ يَمْشِي عَلَى ظَهْرِي إِلَيَّ فَإِذْ وُلِّيتُكَ الْيَوْمَ وَصِرْتَ إِلَيَّ فَسَتَرَى صَنِيعِي بِكَ. قَالَ: فَيَلْتَئِمُ عَلَيْهِ حَتَّى تَلْتَقِيَ عَلَيْهِ وَتَخْتَلِفَ أَضْلاَعُهُ. قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِأَصَابِعِهِ فَأَدْخَلَ بَعْضَهَا فِي جَوْفِ بَعْضٍ قَالَ: وَيُقَيِّضُ اللَّهُ لَهُ سَبْعِينَ تِنِّينًا (ثعبانا) لَوْ أَنَّ وَاحِدًا مِنْهَا نَفَخَ فِي الأَرْضِ مَا أَنْبَتَتْ شَيْئًا مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا فَيَنْهَشْنَهُ وَيَخْدِشْنَهُ حَتَّى يُفْضَى بِهِ إِلَى الْحِسَابِ. قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّمَا الْقَبْرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النَّارِ. رواه الترمذي[١٤]:

ئەبو سەعيد (خۆشنوودیی خودای لێبێ) دەفەرموێ: ڕۆژێ حەزرەت (درودو ڕەحمەتو سلاوی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ) تەشریفی ڕۆیشت بۆ نوێژگاکەی خۆی، سەرنجی دا چەند کەسێ وەك ددان ڕیچ بکەنەوەو پێبکەنن وابوو، فەرمووی: (درودی خودای لەسەربێ): ئەدی! ئێوە ئەگەر زۆر بە وردی بیر بکنەوە لە خۆشی پسێنکە کە، کە گشت خۆشییەك تێك دەدا، ئەم پێکەنینەی لە بیر دەبردنەوە، کەواتە بە زۆری بیر لە خۆشی پسێنکەکە بکەنەوە، واتە: لە مردن، کە گشت خۆشیو لەززەتێ تێك دەدا، چونکە گشت ڕۆژێ گۆڕ بە خۆی دەڵێ: من خانەی ئاوارەییم، من خانەی غەریبیم، من خانەی تەنیاییم، من خانەی خاكو خۆڵم، من خانەی کرمو مارو مۆرم!

کاتێ کە موسوڵمان بە خاك دەسپێردرێ گۆڕ پێی دەڵێ: خانەی نوێت پیرۆزبێ، ماڵو حاڵی تازەت ئاواو ئاوەدان بێ، خۆش هاتی میوانێکی

---

[١٤] ریاض/١٣٨/٢ رقم/٦/ ٥٧٩ ترمیذی/٢٣٠٧ ز-٦٥.

ئازیزی لە ناو کە سوکاری خۆتدا، لە ڕاستیدا کاتێ کە تۆ لەسەر پشتی من بووی زۆر خۆشم دەویستیت، ئێستایش کە من بووم بە خانە خوێتو تۆ بوویت بە میوانی من بە چاوی خۆت دەبینیت کە چۆن نازێکت دەگرم!

فەرمووی: ئەوجا تا چاوی بڕ دەکا گۆڕەکەی بۆ گوشاد دەکرێو جێگەکەی فەرەحو پانو پۆڕ دەبێ، دەرگایەکیشی بەرەو بەهەشت بۆ دەکرێتەوە، ئیتر دڵو دەروونو گیانی مەست دەبن لە بۆنو بەرامەی بەهەشت! لەم نازو نیعمەت و خۆشییە گیانی یەدا دەبێ تا ڕۆژی ژیانەوە.

فەرمووی: کاتێ کە بەندەی بەدکار دەنێژرێ، یاکاتێ کە بەندەی ناموسوڵمان دەنێژرێ گۆڕ پێی دەڵێ: بەخێر نەیەیتو بێ کەس خۆت! بەڕاستی تۆ کاتێ لەسەر پشتی من بوویت دوژمنی من بوویت زۆر رقم لێت بوو، وا ئێستا چنگم لێت گیر بووەو کەوتوویتە بەر هەوێڵم خۆم دەزانم چۆن داخی دڵی خۆمت پێ دەڕێژم.

فەرمووی: ئنجا توند توند دەیگوشێ و وادەینووسێنێ بەیەکەوە پەراسووەکانی تێك دەپەڕن. فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پەنجەکانی هەردوو دەستی خۆی بەناویەکدا تێك پەڕاندو نیشانی دا کە ئاوا پەراسووی ڕاستو چەپی بەناو یەکتریدا تێك دەپەڕن.

فەرمووی: ئەوسا خودا حەفتا هەژدیهای وای دەکا بەکوڵکەوە گریمان ئەگەر تاقە یەکێکیان تاقە یەکجار لەسەر ڕووی زەوی بفیشکێنێ هەتا جیهان جیهان بێ ئیتر سەوزایی لێ شین نابێ! ئەوجا هەر حەفتاکەیان دەیگرنە ناوو دەیدەنە بە رگازو قەپی لێ دەگرنو قەپاڵی لێ دەدەن! ئیتر تا ئەو کاتەی بەلەش زیندوو دەکرێتەوەو گیان دەکرێتەوە بە بەریدا (کە ئەو کاتە حەشر دەکرێو دەیبەن بۆ لێپرسینەوەو دەیدەن بە دادگا) ئەمە حاڵیەتی!. قسە گێڕەوە فەرمووشی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووشی: گۆڕ یا باخێکە لە باخەکانی بە هەشت، یا چاڵە ئاگرێکە لە چاڵە ئاگرەکانی دۆزەخ! (ت – س/ح).

٥٢١٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَكَلَ طَيِّبًا وَعَمِلَ فِي سُنَّةٍ وَأَمِنَ النَّاسُ بَوَائِقَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ. فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا الْيَوْمَ فِي النَّاسِ لَكَثِيرٌ. قَالَ: وَسَيَكُونُ فِي قُرُونٍ بَعْدِي. رواه الترمذي والحاكم. والله أعلم[١٥].

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەس حەڵاڵخۆربێو، بە سوننەتی پێغەمبەی (دروودی خودای لەسەربێ) رەفتار بکاتو، مەردوم لە ئێشو ئازارو زیانی دڵنیابن دەچێتە بە هەشت! پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لە سایەی خوداوە ئەم جۆرە موسوڵمانە ئەمڕۆ لە ناو خەڵکا زۆر زۆرە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): لە پاش منیش ئەم جۆرە کەسانە لە چەن چەرخێکی تریش دا هەر دەبن! (ت/حا – سەنەد ضعیف).

## ١٧) چوونە بە هەشت لەسایەی خودای گەورەوەیە

## دخول الجنة بفضل الله تَعَالَى

٥٢١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَارِبُوا وَسَدِّدُوا وَاعْلَمُوا أَنَّهُ لَنْ يَنْجُوَ أَحَدٌ مِنكُمْ بِعَمَلِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ أَنْتَ؟ قَالَ: وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ بِرَحْمَةٍ مِنْهُ وَفَضْلٍ. وفي رواية: لَا يُدْخِلَ أَحَدًا مِنكُمْ عَمَلُهُ الْجَنَّةَ. وَلَايُجِيرُهُ من النَّارِ وَلاَ أَنَا إِلاَّ أَنْ يَتَغَمَّدَنِيَ اللَّهُ مِنْهُ بِفَضْلٍ وَرَحْمَةٍ مِنَ اللهِ[١].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەوڵ و تەقەڵلایەکی مام ناوەندیو ڕێكو پێك بدەنو، لە کاری خێردا درێغی مەکەن، بشزانن کە کەستان بە هۆی کردەوەی خۆیەوە ڕزگاری نابێ. گوتیان: قوربان! هەتا تۆیش؟ فەرمووی: بەڵێ منیش هەروا، مەگەر خودای گەورە بە رەحمەتو میهری خۆی دام بگرێو نوقمی رەحمەتی خۆیم

---

[١٥] بسند ضعيف (شرحه).

[١] مسلم. صفات المنافقين/ ٧٠٤٨ – ٧٠٥٤.

بکا. لە گێڕانەوەیەکا: کەستان بە کردەوەی خۆی نەدەچێتە بەهەشتو، نە قوتاری دەبی لە ئاگری دۆزەخ، تەنانەت خۆشم هەروا، مەگەر بەرەحمەتی خودا لە دۆزەخ رزگارم ببێو بە هەشتم بەنصیب ببێ (ش/ن).

٥٢١٦- ← (ب – ١ ز – ١٠ ل – ٦٢ ف – ٤ + ٧)[٢].

## ١٨) سپاردە هەڵ دەگیرێ (ئەمانەت نامێنێ) : (رفع الأمانة)

٥٢١٧- عَنْ حُذَيْفَةُ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدِيثَيْنِ رَأَيْتُ أَحَدَهُمَا وَأَنَا أَنْتَظِرُ الآخَرَ، حَدَّثَنَا أَنَّ الأَمَانَةَ نَزَلَتْ فِي جَذْرِ قُلُوبِ الرِّجَالِ، ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ عَلِمُوا مِنَ السُّنَّةِ. وَحَدَّثَنَا عَنْ رَفْعِهَا قَالَ: يَنَامُ الرَّجُلُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ الأَمَانَةُ مِنْ قَلْبِهِ، فَيَظَلُّ أَثَرُهَا مِثْلَ أَثَرِ الْوَكْتِ، ثُمَّ يَنَامُ النَّوْمَةَ فَتُقْبَضُ فَيَبْقَى أَثَرُهَا مِثْلَ الْمَجْلِ، كَجَمْرٍ دَحْرَجْتَهُ عَلَى رِجْلِكَ فَنَفِطَ، فَتَرَاهُ مُنْتَبِرًا، وَلَيْسَ فِيهِ شَيْءٌ، فَيُصْبِحُ النَّاسُ يَتَبَايَعُونَ فَلاَ يَكَادُ أَحَدٌ يُؤَدِّي الأَمَانَةَ، فَيُقَالُ إِنَّ فِي بَنِي فُلاَنٍ رَجُلاً أَمِينًا. وَيُقَالُ لِلرَّجُلِ مَا أَعْقَلَهُ وَمَا أَظْرَفَهُ وَمَا أَجْلَدَهُ. وَمَا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، وَلَقَدْ أَتَى عَلَيَّ زَمَانٌ وَمَا أُبَالِي أَيَّكُمْ بَايَعْتُ لَئِنْ كَانَ مُسْلِمًا رَدَّهُ الإِسْلاَمُ، وَإِنْ كَانَ نَصْرَانِيًّا أَوْ يَهُودِيًّا رَدَّهُ عَلَيَّ سَاعِيهِ، فَأَمَّا الْيَوْمَ فَمَا كُنْتُ أُبَايِعُ إِلاَّ فُلاَنًا وَفُلاَنًا. رواه الشيخان والترمذي[١]:

حوذەیفەی کوڕی یەمان (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەربێ) دوو فەرمایشتی لە بارەی سپاردەوە پێمان فەرموو، یەکێکیانم بە چاوی خۆم دی هاتە دی، کە برێتی بوو لە هاتنی سپاردە، وە چاوە نواڕی ئەویتریشیانم کە بێتەدی، کە برێتی یە لەنەمانی ئەمانەت، فەرمایشتی یەکەم ئەوە بوو فەرمووی پێمان: ئەمانەت – واتە: سپاردە – کە هاتە خوارەوە لە ناخی دڵی پیاو چاکانا ڕەگو ریشەی داکوتاو جێگەی

---

[٢] تقدم فی مجلد أول. تسلسل/ ١٠ رقم/ ٤/ ٧٩، راجع رقم/٧/٨٢.

[١] بخاری. رقاق: ٦٤٩٧، ٧٠٨٩، ٧٢٧٦ = تجريد/٥/٢٧٦ رقم/٢٠٢٠

خۆی گرت، بەرە بەرە قورئانیش دەهاتە خوارەوە، ئیتر ئەوانیش بە فێربوونی قورئان‌و بە زانینی شەریعەت پەروەردەیان کرد. فەرمایشتی دووەم ئەوە بوو باسی ئەمانی ئەمانەتی بۆ کردین، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): کاتێ ئەمانەت هەڵ دەگیرێ بەرە بەرە نامێنی، پیاو دەبێ خەوی لێ دەکەوێ‌و سپاردە لە دڵی وەردەگیرێتەوە، بەرە بەرە شوێنەکەشی لە ناو دڵا کوێر دەبێتەوە!

یەکەمجار شوێنەکەی وەك نیتکەیەکی رەش دەمێنێتەوە، دووەمجار کە خەوی لێ دەکەوێ ئەوەشی ماوە لە دڵیا ئەوەیش دەڕواو هیچی نامێنێ، ئیتر شوێنەکەی وەك تلۆقی لێ دێ، نووری ئەمانەت، رووناکی ی سپاردە کە لەدڵ باردەکا، وەك ئەو پشکۆیە وایە کە بینێیت بە قاچی خۆتاو شوێنەکەی هەڵتۆقێ، سەیر دەکەیت قاچت بلۆق دەکاو بلۆقەکەو شوێن بلۆقەکە تاماوەیێ دەمێنن، بەڵام پشکۆکە نەماوەو سکڵەکە دیار نییە، ئەمانەتیش کە لەدڵ باری کرد ئاوایە.

ئەوجا بۆ روون کردنەوەی مەبەستەکە پتر، چەوێکی هەڵگرت‌و تلانیەوە بەسەر قاچی خۆیاو، نیشانی دا کە پشکۆکە ئاوا بنێ بە قاچی خۆیا. فەرمووی: ئیتر بەرە بەرە کەس متمانە بەکەس ناکا، تاوای لێ دێ خەڵك مامەڵەو سەودا لەگەڵ یەکتری دەکەن بەڵام خەریك دەبێ کەکەس ئەمانەت بەجێ نەهێنێ تاوای لێ دێ پیاوی ئەمین‌و دەسپاك واکەم دەبێ دەڵێن: لە ناو فیسارە خێڵدا پیاوێکی دەسپاکی ئەمین ماوە! وای لێ دێ دەبێ بە پاشاگەردانییەکی وا قسەو گوتاریان بایەخی نامێنێ، پیاوی واپەیدا دەبێ سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ چییە، باوەڕو ئیمان لە دڵیا نییە، کەچی پێی دەڵێن: ئای لەم شا پیاوە، چەندە ژیرو هۆشیارە، یا چەندە سەلارو ناسك‌و نازدارە، یا چەندە بە جەرگ‌و ئازایە!.

حوذەیفە (خودای لێ رازی بێ) دەیفەرموو: ئەو سەردەمە نەماوە کە من دەربەست نەبووم کە لەگەڵ هەر کامێکتانا مامەڵەو سەودام بکردایە ترسم

نەبوایـە، چـونکە مامەڵـە کەرەکـە ئەگـەر خـۆی موسـوڵمان بوایـە، ئـایینو دینەکـەی نەیـدە هێـشت کـە گـزیو ناپـاکیم لێ بکـا، خـۆ ئەگـەر گـاورو جوولەکەیش بوایە سەرکارەکەی سەری نەیدە هێشت کە گزیو ناپاکیم لێ بکا!

ولێ ئەمڕۆ مەگەر لەگەڵ فیسارەکەسو ئەو فیسارەکەسا بتوانم مامەڵەو سەودا بکەمو لێیان دڵنیام! (ش/ت).

## ١٩) بەشی شەشەم: باسی گەورەیی بەخششو خێرکردن
## الفصل السادس: فضل الصدقة

٥٢١٨- فەرموودەکەی ئەبو ذەڕ: ( خرجت ليلة من الليالي فإذا رسول الله (ص) يمشي وحدة...) لە باسی ( في التحذير من الدنيا) دا رابورد فەرموودەی سیازدەهەم. ← (ب-٩ ل-٢٩٠ ز-٩٤ ف-١٣)[1].

٥٢١٩- وَعَنْهُ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَرَّةِ الْمَدِينَةِ عِشَاءً وَنَحْنُ نَنْظُرُ إِلَى أُحُدٍ فَقَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ قُلْتُ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: مَا أُحِبُّ أَنَّ أُحُدًا ذَاكَ عِنْدِي ذَهَبٌ أَمْسَى ثَالِثَةً عِنْدِي مِنْهُ دِينَارٌ إِلاَّ دِينَارًا أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ إِلاَّ أَنْ أَقُولَ بِهِ فِي عِبَادِ اللَّهِ هَكَذَا - حَثَا بَيْنَ يَدَيْهِ - وَهَكَذَا - عَنْ يَمِينِهِ - وَهَكَذَا - عَنْ شِمَالِهِ. قَالَ: ثُمَّ مَشَيْنَا قَالَ: يَا أَبَا ذَرٍّ. مَكَانَكَ حَتَّى آتِيَكَ. فَانْطَلَقَ حَتَّى تَوَارَى عَنِّي - قَالَ - وَسَمِعْتُ لَغَطًا صَوْتًا فَقُلْتُ لَعَلَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عُرِضَ لَهُ فَهَمَمْتُ أَنْ أَتَّبِعَهُ قَالَ ثُمَّ ذَكَرْتُ قَوْلَهُ لاَ تَبْرَحْ مَكَانَكَ حَتَّى آتِيَكَ فَلَمَّا جَاءَ ذَكَرْتُ لَهُ الَّذِي سَمِعْتُ فَقَالَ: ذَاكَ جِبْرِيلُ أَتَانِي فَقَالَ: مَنْ مَاتَ مِنْ أُمَّتِكَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ. قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ. رواهما الشيخان[2].

---

(١) تقدم في مجلد تاسع. تسلسل/ ٩٤ رقم: ٥١٦٩/١٣.

(٢) تجريد/ ٣/ ١٤٠ رقم/ ١٠٤٧ = ٢٣٨٨، ٣٢٢٢، ٦٢٦٨، ٦٤٤٣، ٦٤٤٤، مسلم. زكاة: ٢٣٠١. ترمذي. إيمان: ٢٦٤٤. تحفة/ ١١٩١٥.

دیسان ئەبو ذەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: شێوان بوو لە خزمەتی پێغەمبەر دابووم، لەناو خڕە بەردەڵانییە ڕەشەکەی مەدینەدا دەڕۆیشتین سەیری چیای ئوحودمان دەکرد، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): (ئەبو ذەڕ!) گوتم! فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! واوام لە خزمەتدا. فەرمووی: ئەم کێوی ئوحودە ئەگەر زێڕ بێ‌و هی من بێ حەزدەکەم گشتی بە سێ شەو داغان بکەم‌و هەمووی بکەم بە خێرو بە پیاوەتی‌و، یەك دیناری لە لام نەمێنێ مەگەر ئەو دینارەی کە هەڵی بگرم بۆ دانەوەی قەرزێ.

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) وەك شت دابەش بکا مستی هاویت بۆ بەردەمی و بۆ لای ڕاستی‌و بۆ لای چەپی‌و، فەرمووی: حەزدەکەم ئاواو ئاوا بەسەر بەندەکانی خودادا دابەشی بکەم. لە پاشا ڕۆیشتین تا فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ! تۆ لێرە مە بزوێ تا خۆم دێمەوە بۆ لات. تەشریفی ڕۆیشت تا لەبەر چاوم وون بوو، لە پاشا گوێم لە غەڵبە غەڵب‌و دەنگە دەنگێ بوو، گوتم: دەترسم کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) شتێکی بەسەر بێ، تەمام بوو بە شوێنیا بچم بەڵام ئەوەم بیرکەوتەوە کە فەرمووی: لە جێی خۆت مەبزوو تا خۆم دێمەوە بۆ لات. جا چاوەنواریم کرد کە تەشریفی هاتەوە باسی ئەوەم بۆ یکرد کە بەرگوێم کەوت. فەرمووی: ئەوە جیبریل بوو، هاتبوو بۆ لام، پێی فەرمووم: ئەی موحەممەد! هەر کەسێ لە ئۆمەتی تۆ لە سەرەمەرگا لە سەر موسوڵمانەتی بمرێ‌و، لەسەر شیرك‌و فرە خوایی‌و ناموسوڵمانەتی نەمرێ دەچێتە بە هەشت! منیش گوتم: ئەی جوبرائیل! با داوێن پیسیش بکاو با دزیش بکا؟ فەرمووی: بەڵێ، با داوێن پیسیش بکاو با دزیش بکا. (ش — ڕەزای خوایان لێ بێ).

٥٢٢٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاثِمَائَةِ مَفْصِلٍ فَمَنْ كَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَ اللَّهَ وَهَلَّلَ اللَّهَ وَسَبَّحَ اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ اللَّهَ وَعَزَلَ حَجَرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلاثِمِائَةِ السُّلامَى فَإِنَّهُ يَمْشِي يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ. رواه مسلم وأبو داود[٣]:

---

[٢] مسلم. زكاة: ٢٣٢٧.

عائیشە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو کەسێ لە نەوەی ئادەم لە سەر سێ سەدو شەست ئەندام دروست کراوە، جا هەر کەسێ هەر ڕۆژێ بە قەد ژمارەی ئەو سێ سەدو شەست ئەندامە چاکە بکا ئیتر ئەو ڕۆژە ئەو کەسە خۆی دوور خستۆتەوە لە دۆزەخ، بۆ نموونەیش ئەڵلاهو ئەکبەر کردنێ چاکەیەکە، ئەلحەمەدو لیلا کردنێ چاکەیەکە، تەلیلە کردنێ چاکەیەکە، سوبحانەڵلا کردنێ چاکەیەکە ئەستەغفیروڵلا کردنێ چاکەیەکە، بەردێ یا دڕکێ یا ئێسکێ لەسەر ڕێی خەڵك دووربخەیتەوە چاکەیەکە، فەرمانکردنێ بە چاکەیێ چاکەیەکە، ڕێ گرتنێ لە خراپەیێ چاکەیەکە (م/د). ← (ب-١ز-١٧٩ل-٤٨٦ف-٥+٦)*.

٥٢٢١- عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَصَدَّقُوا فَيُوشِكُ الرَّجُلُ يَمْشِي بِصَدَقَتِهِ فَيَقُولُ الَّذِى أُعْطِيَهَا لَوْ جِئْتَنَا بِهَا بِالأَمْسِ قَبِلْتُهَا فَأَمَّا الآنَ فَلاَ حَاجَةَ لِي بِهَا. فَلاَ يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا[٤]:

حاریثەی کوڕی وەهب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خێر بکەنو ماڵ ببەخشنەوە، هاکا وای لێ هات پیاو بە ماڵی خێرەوە بەسەر خەڵکا بسوڕێتەوە بەڵام کە سێکی وای دەست نەکەوێ کە خێرەکەی لێ وەربگرێ، بەڵکوو ئەو کەسەی کە خێرەکەی دەداتێ پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بتهێنابایە لێم وەردەگرتی، وەلێ ئێستا کارم پێی نییەو وەری ناگرم! لەئەنجامدا کەسی دەست ناکەوێ خێرەکەی لێ وەربگرێ (ش - ڕەزای خودایان لێ بێ).

٥٢٢٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْمَالُ وَيَفِيضَ حَتَّى يَخْرُجَ الرَّجُلُ بِزَكَاةِ مَالِهِ فَلاَ يَجِدُ أَحَدًا يَقْبَلُهَا مِنْهُ وَحَتَّى تَعُودَ أَرْضُ الْعَرَبِ مُرُوجًا وَأَنْهَارًا. رواهما الشيخان[٥]:

---

* تقدم فی مجلد أول. تسلسل/ ١٧٩ رقم/٩٥٧/٥، ٩٥٨/٦.

[٤] بخاری. زكاة: ١٤١١، ١٤٢٤، ٧١٢٠ = تجرید/١٠١/٢ رقم/ ٦٧٤. مسلم. زكاة: ٢٣٣٤. نسائی. زكاة: ٢٥٥٤ تحفة الأشراف: ٣٢٨٦.

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسیٚ هەتا ماڵو سامان بەرادەیەکی وا زۆر دەبیٚ دەبیٚ بە لێشاو، تاوای لیٚ دیٚ پیاو بە زەکاتی ماڵی خۆیەوە دەسووڕێتەوە بە شوێن کەسێکی وادا کەلێی وەربگریٚ، بەلاّم کەسی وای دەست ناکەویٚ کە لێی وەربگریٚ قیامەت هەڵناسیٚ تا خاکی عەرەب نەبێتەوە بە مێرگو مێرغوزارو چەمو چایەر (ش). ئیمامی نەوەوی – رحمەتی خودای لیٚ بیٚ– دەفەرمویٚ: واتای وایە لەبەر شەڕو شۆڕو فەرتەنەی زۆر پیاوی ئیشکەر کەم دەبیٚو خەڵك بیٚ هیوا دەبنو نایانپەرژێتە سەر ماڵداری، لەبەر ئەوە زەوییەکە بە بەیاری دەمێنێتەوەو دەبیٚ بە مێرگو زەبەنو چایەر، رووبارو چۆمەکانیش بە بەلاش دەڕۆن بۆ ناو دەریا، کەس کشتو کاڵیان لەبەردا ناکا. (وەرگێڕ)

١٦ی رەمەزان ١٤٠٦ هـ – ١٩٨٦/٥/٢٤

٥٢٢٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَقِيءُ الأَرْضُ أَفْلاَذَ كَبِدِهَا أَمْثَالَ الأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قَتَلْتُ.وَيَجِيءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي. وَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قُطِعَتْ يَدِي ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلاَ يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا. رواه مسلم[٦].

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیٚ) دەفەرمویٚ: زەوی گەنجی ناوسکی خۆی پارچە پارچە یەق دەکاتەوە، شووشی زێڕو زیو – لە وێنەی پایەو کۆڵەکە – هەڵ دەڕێژێتە دەریٚ. پیاو کوژ دیٚ دەڵیٚ: من لە سەر ئەمە خەڵکم کوشتووە، ئەوی رشتەی خزمایەتی پساندووە دیٚ دەڵیٚ: من لەسەر ئەمە دەنگم لە خزمانی خۆم دابڕیوە، دزی دەست بڕاو دیٚ دەڵیٚ: من لەسەر ئەمە دە ستم بڕراوە، کەچی ئەو دەمە ئەم زەلامانە ئەو گەنجە بەجیٚ دەهێڵنو دەڕۆنو هیچی لیٚ نابەن (م/ت).

---

(٥) مسلم. زكاة: ٢٣٣٦.

(٦) مسلم. زةكاة: ٢٣٣٨. ترمذي. فتن: ٢٢٠٨ تحفة/ ١٣٤٢.

٥٢٢٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ رَجُلٌ لأَتَصَدَّقَنَّ اللَّيْلَةَ بِصَدَقَةٍ فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ زَانِيَةٍ فَأَصْبَحُوا يَتحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ. قَالَ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ غَنِيٍّ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ الليلةَ عَلَى غَنِيٍّ. قَالَ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى غَنِيٍّ لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِق فَأَصْبَحُوا يَتحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى سَارِق. فَقَالَ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ وَعَلَى غَنِيٍّ وَعَلَى سَارِق. فَأُتِيَ فَقِيلَ لَهُ أَمَّا صَدَقَتُكَ فَقَدْ قُبِلَتْ أَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا تَسْتَعِفُّ بِهَا عَنْ زِنَاهَا وَلَعَلَّ الْغَنِيَّ يَعْتَبِرُ فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ وَلَعَلَّ السَّارِقَ يَسْتَعِفُّ بِهَا عَنْ سَرِقَتِهِ[٧].

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوێ دەبێ لە نەوەی ئیسرائیل، دەڵێ: بە خودا دەبێ ئەم شەو خێرێ بکەم، شەو خێرەکەی دەباو دەێنێتە ناو دەستی ژنێکی داوێنپیسەوە، بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: زۆر سەیرە! ئیمشەو خێر بە ژنێکی داوێنپیس کراوە، خێر کەرەکە دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرە بەم ژنە ( چونکە ئەمە خواستی تۆی لەسەر بووە، خواستی تۆیش بێ دانایی نیە) دەبێ خێرێ تر بکەم، خێرەکەی دەباو دەینێتە ناو دەستی پیاوێکی دەوڵەمەندەوە، دیسان بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: ئیمشەو خێر بە دەوڵەمەندێ کراوە، پیاوەکە دەڵێ خودایە! سوپاس بۆ تۆ لە سەر ئەم خێرەیش بەم دەوڵەمەندە، دەبێ خێرێکی تر بکەم، خێرەکەی دەبا و دەینێتە ناو دەستی دزێکەوە، دیسان بۆ بەیانی خەڵکەکە دەڵێن: ئای چەند سەیرە خێر بە دزێ کراوە!

پیاوەکەیش دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر خێر بە ژنی خراپ‌و بە پیاوی دەوڵەمەندو بە پیاوی دز، شەو لە خەودا خەوی دی پێیان گوت: هەر سێ خێرەکانت گیرابوون، سا بەڵکوو ئەو ژنە سەلیتەیە بە هۆی ئەو خێرەی تۆوە دەست لەو ئیشە خراپە هەڵبگرێ، بە شکوو دەوڵەمەندەکەیش

---

(٧) تجريد/٢/١٠٦ رقم/ ٦٨٢ = ١٤٢١ فتح. مسلم. زكاة: ٢٣٥٩.

**پەند وەربگرێو شەرم لە خۆی بکاو، دەست بکا بە بەخششو خێرکردن لەو ماڵو سامانەی کە خودا پێی داوە، بەشکم دزەکەیش بە هۆی خێرەکەی تۆوە واز لە دزیکردن بهێنێ (ش).**

**٥٢٢٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ الْبَخِيلِ وَالْمُتَصَدِّقِ كَمَثَلِ رَجُلَيْنِ، عَلَيْهِمَا جُبَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ مِنْ ثُدِيِّهِمَا إِلَى تَرَاقِيهِمَا إِذَا هَمَّ الْمُتَصَدِّقُ تَقَلَّصَتْ اتَّسَعَتْ وَانْضَمَّتْ يَدَاهُ إِلَى تَرَاقِيهِ، وانضمَّتْ عَلَيْهِ حَتَّى تُعَفِّيَ أَثَرَهُ وَكُلَّمَا هَمَّ الْبَخِيلُ بِصَدَقَةٍ انْقَبَضَتْ عَلَيْهِ كُلُّ حَلْقَةٍ مِنْهَا إِلَى صَاحِبَتِهَا وَتَقَلَّصَتْ عَلَيْهِ. قَالَ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: فَيَجْهَدُ أَنْ يُوَسِّعَهَا فَلاَ تَتَّسِعُ. رواهما الشيخان[٨].**

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوی رەزیلو پیاوی بە خشندەو سەخی مانەندی دوو پیاو وان، کە یەکی سەرو زریەی ئاسنینی تەسکیان لەبەر دابێ، لە ئاستی مەمکیانەوە بێ تا چوڵەمەی خوار قورگیان، جار لەگەڵ جاردا بە خشندە کە شتێ دەبەخشێ زریەکەی کشی دێو گەورەو فەرەح دەبێ، هەتا بەرە بەرە وای لێ دێ لەبەر پێی دەخشێ!**

**بەڵام پیاوی رەزیلو چرووك هەر کاتێ ویستی خێرێ بکا زریەکەی دێتەوە یەكو زیاتر قوڵفەکانی تەسك دەبنەوە، تا بەرە بەرە هەردوو دەستی توند شەتەك دەدرێن بە بەربینیەوە!**

**فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: جا رەزیلەکە هەر هەوڵ و تەقەلا دەدات کە کشی بێنێو فەرەحی بکا بەڵام ناتوانێ (ش).**

**٥٢٢٦- عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى آبِي اللَّحْمِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَمَرَنِي مَوْلاَيَ أَنْ أُقَدِّدَ لَحْمًا فَجَاءَنِي مِسْكِينٌ فَأَطْعَمْتُهُ مِنْهُ فَعَلِمَ بِذَلِكَ مَوْلاَيَ فَضَرَبَنِي فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولَ الهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَدَعَاهُ. فَقَالَ: لِمَ ضَرَبْتَهُ. فَقَالَ: يُعْطِي طَعَامِي بِغَيْرِ إِذْنِي. فَقَالَ: الأَجْرُ بَيْنَكُمَا[٩].**

---

(٨) تجريد/ ١١٣/٢ رقم/٦٩٢ =١٤٤٣، ١٤٤٤، ٢٩١٧، ٥٢٩٩، ٥٧٩٧. مسلم. زكاة: ٢٣٥٧، ٢٣٥٨، ٢٣٣٠.

(٩) مسلم. زكاة: ٢٣٦٥. نسائي. زكاة: ٢٥٣٦. ابن ماجه: ٢٩٧، تحفة الأشراف: ١٠٨٩٩.

عومەیر – کە بەندەی ئابی لە حم بوو، رەزای خودایان لێ بێ – فەرمووی: ڕۆژێ ئاغام پێی گوتم گۆشت توێ بکەم، لەو کاتەدا هەژارێ هات، منیش لە گۆشتەکە بەشیم دا، کە ئاغام بەئەمەی زانی لێی دام، منیش ئەوەم عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) بانگی کردو پێی فەرموو: بۆچی لێت داوە؟ گوتی: بە بێ پرسی من خۆراکم دەدا بە خەڵك! فەرمووی (درووودی خودای لەسەربێ): پاداشەکەی بۆ هەر دوکتانە (م).

٥٢٢٧- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُا) قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْفِقِي - أَوِ انْضَحِي أَوِ انْفَحِي - وَلاَ تُحْصِي فَيُحْصِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ[١٠].

ئەسماء (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: خێر بکەو دەست مەگرەوەو شت ببەخشەرەوەو مەیکەرە کیسەو توورەکەو پریاسکەوەو پارەو پووڵی خۆت بە بێ سوود کەڵەکە مەکە، ئەگینا خودایش لە تۆی دەگرێتەوە! (م).

٥٢٢٨- وَكَانَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) فِي إِبِلِهِ فَجَاءَهُ ابْنُهُ عُمَرُ وَكَانَ رَاكِباً فَنَزَلَ فَقَالَ: لِأَبِيهِ: أَنَزَلْتَ فِي إِبِلِكَ وَغَنَمِكَ وَتَرَكْتَ النَّاسَ يَتَنَازَعُونَ الْمُلْكَ بَيْنَهُمْ فَضَرَبَ سَعْدٌ فِي صَدْرِهِ فَقَالَ اسْكُتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعَبْدَ التَّقِيَّ الْغَنِيَّ الْخَفِيَّ. رَوى هذه الثلاثة مسلم[١١].

جارێ سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص لە ناو رانە ووشترەکەیدا بوو، عومەری کوڕی بەسواری چوو بۆ لایو لە کنی دابەزیو پێی گوت: باوکە! تۆ لێرە وا خەریکی رانە وشترو گەلە مەڕیت، کەچی ئەو خەڵکەیش لەوێ لە ناو خۆیاندا لەسەر دەوڵەتو پادشایی کێشمە کێشمیانە! باوکیشی مالی بەسەر سینگیداو فەرمووی: کورە! ووسبە! بە گوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەرم

---

[١٠] تجريد// ١١٢ رقم/ ٦٨٨ = ١٤٣٤، ١٤٣٣، ٢٥٩٠. فتح. مسلم. زكاة: ٢٣٧٢. نسائي. زكاة: ٢٥٤٩. تحفة/ ١٥٧٤٨.

[١١] مسلم. زهد: ٧٣٥٨.

بیست دەیفەرموو: خودا بەندەی لە خودا ترسی دەوڵەمەندی گۆشە گیری خۆیی خۆش دەوێ بە تایبەت کە بەرچاوی نەبێ (م).

## ٢٠) بەشی حەوتەم: باسی فەرمانکردن بە چاکەو جڵەو گیریی لە خراپە

## الفصل السَّابِعُ: في الأمرِ بالمعرُوفِ والنَّهي عَنِ المنكرِ

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ – صدق الله العظيم – سورة آل عمران} ← (ب – ٥ ز – ٧٥ ل – ٥٦١) راڤەی ئایەتەکە لەم شوێنەدا رابورد.

٥٢٢٩- ← (ب – ١ ز – ٣ ل – ٢٦ ف – ١)[١].

٥٢٣٠- (ب – ٩ ز – ٢٦ ل – ٧٥ ف – ٤)[٢].

٥٢٣١- وَقِيلَ لأُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنهُمَا): أَلاَ تَدْخُلُ عَلَى عُثْمَانَ فَتُكَلِّمَهُ فَقَالَ: أَتَرَوْنَ أَنِّي لاَ أُكَلِّمُهُ إِلاَّ أُسْمِعُكُمْ وَاللَّهِ لَقَدْ كَلَّمْتُهُ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَهُ مَا دُونَ أَنْ أَفْتَتِحَ أَمْرًا لاَ أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ أَوَّلَ مَنْ فَتَحَهُ وَلاَ أَقُولُ لأَحَدٍ يَكُونُ عَلَيَّ أَمِيرًا إِنَّهُ خَيْرُ النَّاسِ. بَعْدَ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ: يَا فُلاَنُ مَا لَكَ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ فَيَقُولُ: بَلَى قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلاَ آتِيهِ وَأَنْهَى عَنِ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ. رواه الثلاثة[٣]:

بە ئوسامەی کوڕی زەیدیان (رەزای خودایان لێبێ) گوت: ئەوە بۆ ناچیت بۆ لای عوسمانو قسەی لەگەڵ دا بکەی سا بە ڵکوو خودا ئاوێ بکا بەم ئاگرەدا، فەرمووی: لە ئێوە وایە کە دەبێ هەر لە بەرچاوی ئێوە ئەم باسەی

---

(١) تقدم فی مجلد أول. تسلسل/ ٣ رقم/١٧/١

(٢) تقدم فی مجلد تاسع. تسلسل/ ٢٦. رقم/٤٨٢٧/٤ ل- ٧٥.

(٣) تجريد/٣/ ٤٤٨ رقم/ ١٣٢٠ = ٣٢٦٧، ٧٠٩٨. مسلم. زهد: ٧٤٠٨. تحفة الأشراف: ٩١.

لەگەڵ دا بکەم. بە خودا لەم بارەیەوە دوو بە دوو گەڵێ قسەم لە گەڵی دا کردووە، بەڵام خۆم نادەم لەو قەرەیە کە من یەکەم کەس بم ئاڵای نارەزایی هەڵکەمو ببم بە مایەی ئاژاوە بەرپا کردن!

لەهەمان کاتدا من بەهیچ فەرمانڕەوایەکی خۆشم ناڵێم: کە باشترین کەسە، لە سەر ئەم فەرمایشتەدا کە لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆیم بیستوە، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: لە ڕۆژی قیامەتدا بازێ پیاو دێننو تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە، ڕیخۆڵەکانی لە کۆمیەوە دەڕژێنە بەر پێیو فیچقە دەکەنە ناو ئاگرەکەوە، کابرا وەك گێرە بە دەوری خۆی دا دەخولێتەوە و ڕیخۆڵەکانی خۆی گێرە دەکا، دۆزەخیەکان لە دەوری کۆمەڵە دەکەنو پێی دەڵێن: ئای! فلان کەس! ئەمەخۆتی!؟ ئەوە تۆ بۆ؟ تۆ چیتە؟ تۆ چی دەکەی لێرە؟ خۆ تۆ لای خۆی ئامۆژگاری باشی ئێمەت دەکرد! ئەمەت لە چیو ئەوەت لەچی؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ وابووم بەڵام داخەکەم بۆ خۆم وا نەبووم، بە پێچەوانەوە بە ئێوەم دەگوت چاکە بکەنو خۆم نەیم دەکرد، بە ئێوەم دەگوت خراپە مەکەن، کەچی بۆ خۆم خراپەم دەکرد، ئەمەی دەیبینن سزای ئەو کەسانەیە کە ئەمە ڕەفتارو کرداریان بووە! (ش/د)

٥٢٣٢- ← (ب – ٣ ز – ١٠٨ ل – ٢٩٤ ف – ٥)[٤].

٥٢٣٣- ← (ب – ٦ ز – ٦ ل – ١٤٢ ف – ٢١)[٥].

٥٢٣٤- ← (ب – ٦ ز – ٦ ل – ١٣٦ ف – ٩)[٦].

٥٢٣٥- عَنْ جَرِيرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ يَكُونُ فِي قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِي يَقْدِرُونَ عَلَى أَنْ يُغَيِّرُوا عَلَيْهِ فَلاَ يُغَيِّرُوا إِلاَّ أَصَابَهُمُ اللَّهُ بِعَذَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَمُوتُوا[٧]:

---

(٤) تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ١٠٨ رقم/٥/ ٢٤٥٣.

(٥) تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٦ رقم/٢١/٣٨٤٦.

(٦) تقدم في مجلد سادس. تسلسل/٦ رقم/٩/٣٨٣٣.

جەریر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پیاوێ لە ناو هۆزێکا گوناهێ بکا، ئەو هۆزە بتوانن کە قەدەغەی بکەن لەو گوناهە بەلاّم قەدەغەی نەکەن ئەوە بەبێ گومان بەر لەوەی بمرن هەر لە جیهاندا خودا تۆڵەی ئەو قەدەغە نەکردنەیان لێ دەستێنێ! (د – سند صالح).

٥٢٣٦– عَنِ الْعُرْسِ الْكِنْدِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا عُمِلَتِ الْخَطِيئَةُ فِي الأَرْضِ كَانَ مَنْ شَهِدَهَا فَكَرِهَهَا. كَمَنْ غَابَ عَنْهَا وَمَنْ غَابَ عَنْهَا فَرَضِيَهَا كَانَ كَمَنْ شَهِدَهَا. رواهما أبو داود[٨]:

لە عورسی کیندی یەوە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ لە خاکێکا گوناهێ دەکرێ، ئەوەی لە وێیە مادام خۆشی لێ نایەو پێی ناخۆشەو خۆی لێی بە دوورە ئەوە وەك لەوێ نەبێ وایە، ئەو کەسەیشی کە لەوێ نەبێ بەلاّم رەزای لە سەریبێ ئەوە وەك خۆی ئەو گوناهە بکا وایە (د – س/ صالح).

٥٢٣٧– عن أبي هريرة (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: اذا خفيت الخطيئة لا تضرُّ الا صاحبها، وإذا ظهرت فلم تغير ضرت العامة. رواه الطبراني[٩]:

ئەبو هورەیرە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) گوناهو تاوان ئەگەر شاراوەبوون، ئەوە زیانیان تەنیا بۆ خاوەنەکەیانە، بەلاّم ئەگەر تاوان بە ئاشکرابوو وە جڵەوگیری لێ نەدەکرا ئەوە زیانی بۆ هەموانە! (گەبەرانی – س/ح).

٥٢٣٨– عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَأْمُرُنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلَتَنْهَوُنَّ عَنِ الْمُنْكَرِ أَوْ لَيُوشِكَنَّ اللَّهُ أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عِقَابًا مِنْهُ ثُمَّ تَدْعُونَهُ فَلاَ يُسْتَجَابُ لَكُمْ. رواه الترمذي والطبراني[١٠]:

---

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٨] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٩] بسند حسن (شرحه).

حوذەیفە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): بەو کەسە کە گیانی منی وا لە دەستا، دیارە کە خوای گەورەیە، حاڵ لەم دوو حاڵە بە دەرنیە: یا دەبێ زۆر بە باشی فەرمان بکەن بە چاکەو ڕێگەی ڕاست نیشانی خەڵك بدەنو جڵەو گیری بکەن لە خراپەو بێ شەرعی، یاخود بەزوویی خودای گەورە سزای سەختو تۆڵەی توندی دەنێرێتە سەرتان، جا ئەوجا هەزار هاتو هاوارو دووعاو نزاو پاڕانەوە بکەن خودا هیچی گیرا ناکا. (ت /طەبەرانی – س / ح).

٥٢٣٩- عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرِو (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ حَوْلَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ ذَكَرَ الْفِتْنَةَ فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ النَّاسَ قَدْ مَرِجَتْ عُهُودُهُمْ وَخَفَّتْ أَمَانَاتُهُمْ وَكَانُوا هَكَذَا. وَشَبَّكَ بَيْنَ أَصَابِعِهِ قَالَ فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ كَيْفَ أَفْعَلُ عِنْدَ ذَلِكَ جَعَلَنِي اللّٰهُ فِدَاكَ قَالَ: الْزَمْ بَيْتَكَ وَامْلِكْ عَلَيْكَ لِسَانَكَ وَخُذْ بِمَا تَعْرِفُ وَدَعْ مَا تُنْكِرُ وَعَلَيْكَ بِأَمْرِ خَاصَّةِ نَفْسِكَ وَدَعْ عَنْكَ أَمْرَ الْعَامَّةِ. رواه أبو داود والنسائي نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى آمين[11]:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێکیان لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەربێ) لەو کاتەدا باسی فیتنەو ئاژاوەکرا، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) هەر کاتێ دیتان کەوا ئەو خەڵکە بێ پەیمانو نا ئەمین بوونو، ئاوا وایان لێ هاتو تێکەڵو پێکەڵ بوونو بوون بە هەرچیو پەرچی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ بەیانی چۆنێتی ی ئەو تێکەڵو پێکەڵییە پەنجەکانی هەر دوو دەستی خۆی تێك ئاڵاند. منیش لە وێدا هەڵسامو چوومە خزمەتیو عەرزیم کرد: قوربان! خودا بمکا بە قوربانت ئەگەر ئەمە رووی دا چی بکەم؟ فەرمووی: لە ماڵی خۆتدا توێتکە بگرەو، زمانی خۆت زەوت کەو، لایەنی یاساى شەرع بگرەو، لایەنی بێ شەرعی بەردە، ئەوەیشی بە تایبەتی پەیوەندی بە دینو دنیای خۆتەوەیە بیگرەو بەری مەدە ئیتر هەقت نەبێ بەسەر کارو باری رەشە خەڵکەکەوە (د/ن).

---

[10] بسند حسن (شرحه).

[11] سكت عن درجته الشارح.

## ٢١) پایانی (خاتیمەیی)

## هەندێ دەنگوباسو باسو خواسی کۆمەڵێ لە پێشینان

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {كَذَلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاء مَا قَدْ سَبَقَ وَقَدْ آتَيْنَاكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا - سورة طـه - ٢٠/٩٩}.

واتە: چۆن داستانی جوانی موسوڵمانانم بۆ تۆ روون کردەوە لەم چەن ئایەتەی پێشەوەدا، ئاوەهایش داستانی پێشینانی تریشت بۆ روون دەکەینەوە، ئەمە لە کاتێکا کە ئێمە لە گەنجینەی نادیاری لە بن ئەهاتووی خۆمانەوە ئەم یادگارە نازدارە ناودارەمان بۆ تۆ نارد، کە بریتی یە لەم قورئانە پڕ لە یادگارو باسو خواسو فەرمایشتە بەرزانە، کە بوون بە مایەی گەورەترین شانازیی هەردوو ژیانی خۆتو گەلەکەت.

## ٢٢) داستانی بەڵەکێکو کەچەڵێکو کوێرێک

## قصة الأبرص والأقرع والأعمى

٥٢٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ ثَلاثَةً فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ أَبْرَصَ وَأَقْرَعَ وَأَعْمَى فَأَرَادَ اللَّهُ أَنْ يَبْتَلِيَهُمْ فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ مَلَكًا فَأَتَى الأَبْرَصَ فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّي الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ. قَالَ: فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ قَذَرُهُ وَأُعْطِيَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا قَالَ: فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الإِبِلُ - أَوْ: قَالَ الْبَقَرُ، شَكَّ إِسْحَاقُ - فِي الأَبْرَصِ أَوِ الأَقْرَعِ قَالَ أَحَدُهُمَا الإِبِلُ وَقَالَ الآخَرُ الْبَقَرُ، قَالَ: فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ فَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا قَالَ: فَأَتَى الأَقْرَعَ فَقَالَ أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: شَعَرٌ حَسَنٌ وَيَذْهَبُ عَنِّي هَذَا الَّذِي قَدْ قَذِرَنِي النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ عَنْهُ وَأُعْطِيَ شَعَرًا حَسَنًا - قَالَ - فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْبَقَرُ. فَأُعْطِيَ بَقَرَةً حَامِلاً فَقَالَ بَارَكَ اللَّهُ لَكَ فِيهَا - قَالَ - فَأَتَى الأَعْمَى فَقَالَ: أَيُّ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ أَنْ يَرُدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي فَأُبْصِرَ بِهِ النَّاسَ - قَالَ - فَمَسَحَهُ فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيْهِ بَصَرَهُ. قَالَ فَأَيُّ الْمَالِ أَحَبُّ إِلَيْكَ؟ قَالَ: الْغَنَمُ. فَأُعْطِيَ شَاةً وَالِدًا فَأُنْتِجَ هَذَانِ وَوَلَّدَ هَذَا، قَالَ: فَكَانَ

لِهَذَا وَادٍ مِنَ الإِبِلِ وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْبَقَرِ وَلِهَذَا وَادٍ مِنَ الْغَنَمِ. قَالَ ثُمَّ إِنَّهُ أَتَى الأَبْرَصَ فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ: رَجُلٌ مِسْكِينٌ قَدِ انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي فَلاَ بَلاَغَ لِيَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِي أَعْطَاكَ اللَّوْنَ الْحَسَنَ وَالْجِلْدَ الْحَسَنَ وَالْمَالَ بَعِيرًا أَتَبَلَّغُ عَلَيْهِ فِي سَفَرِي. فَقَالَ: الْحُقُوقُ كَثِيرَةٌ. فَقَالَ: لَهُ كَأَنِّي أَعْرِفُكَ أَلَمْ تَكُنْ أَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ فَقِيرًا فَأَعْطَاكَ اللَّهُ فَقَالَ إِنَّمَا وَرِثْتُ هَذَا الْمَالَ كَابِرًا عَنْ كَابِرٍ. فَقَالَ: إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الأَقْرَعَ فِي صُورَتِهِ فَقَالَ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِهَذَا وَرَدَّ عَلَيْهِ مِثْلَ مَا رَدَّ عَلَيْهِ هَذَا فَقَالَ إِنْ كُنْتَ كَاذِبًا فَصَيَّرَكَ اللَّهُ إِلَى مَا كُنْتَ. قَالَ وَأَتَى الأَعْمَى فِي صُورَتِهِ وَهَيْئَتِهِ فَقَالَ رَجُلٌ مِسْكِينٌ وَابْنُ سَبِيلٍ انْقَطَعَتْ بِيَ الْحِبَالُ فِي سَفَرِي فَلاَ بَلاَغَ لِيَ الْيَوْمَ إِلاَّ بِاللَّهِ ثُمَّ بِكَ أَسْأَلُكَ بِالَّذِي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً أَتَبَلَّغُ بِهَا فِي سَفَرِي فَقَالَ قَدْ كُنْتُ أَعْمَى فَرَدَّ اللَّهُ إِلَيَّ بَصَرِي فَخُذْ مَا شِئْتَ وَدَعْ مَا شِئْتَ فَوَاللَّهِ لاَ أَجْهَدُكَ الْيَوْمَ شَيْئًا أَخَذْتَهُ لِلَّهِ فَقَالَ أَمْسِكْ مَالَكَ فَإِنَّمَا ابْتُلِيتُمْ فَقَدْ رُضِيَ عَنْكَ وَسُخِطَ عَلَى صَاحِبَيْكَ. رواه مسلم هنا والبخاري في بدء الخلق[1]:

**ئەبو هوریرە** (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) **فەرمووی: بە گوێچکەی خۆم لە دەمی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (دروودی خودای مەزنی لە سەربێ) **دەیفەرموو: سێ کەس لە نەوەی ئیسرائیل، واتە: لە بەنی ئیسرائیل: بەڵەکێك‌و کەچەڵێك‌و کوێرێك، خودا دەیەوێ تاقییان بکاتەوە، جا فریشتەیێ لەسەر شێوەی پیاوێ دەنێرێ بۆ لایان، فریشتەکە دەچێتە لای بەڵەکەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لە چییە؟ دەڵێ: حەزم لە ڕەنگو بۆیەکی جوان‌و پێستێکی جوانەو ئەم بەڵەکییەشم نەمێنێ، کە بووە بە هۆی ئەوە کە خەڵك قێزو بێزم لێ دەکەنەوە، فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بەسەر جەستەیدا ئیتر دەنك چەپەڵییەکەی نامێنێ‌و، ڕەنگو بۆیەکی جوان‌و پێستێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئەوجا فریشتەکە پێی دەڵێ: حەزت لەچی جۆرەماڵێکە؟ پیاوەکە دەڵێ: حەزم لە ووشترە، یاخود دەڵێ: حەزم لە ڕەشە وولاخە. ئیسحاق - کە یەکێکە لە**

---

[1] بخاری. أحادیث الأنبیاء: ٣٤٦٤، ٦٦٥٣ = تجرید/٤/٦٧ رقم/١٣٨٢ راجع ریاض/١ ل- ٧٨ رقم/٦/٦٥ تسلسل/٥. مسلم. زهد: ٧٣٥٧.

ڕاوییەکانی ئەم حەدیثە - گومانی لە وەدا بۆ پەیدا بوو بوو کە بەڵەكو کە چەڵەکە کامیان داوای ووشترو کامیان داوای ڕەشە ووڵاخی کرد بوو، فەرمووی: جا وشترە مێیەکی هەراش ئاوسی لە سەرگوانی دایەو پێی گوت: خودا پیتو فەڕی تێ بخات بۆت، فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆ لای کە چەڵەکەو پێی دەڵێ: زیاتر حەزت لە چییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە قژێکی جوانەو ئەم کەچەڵییەشم نەمێنێ، کە بووە بە هۆی ئەوە خەڵك قێزو بێزم لێ بکەنەوە. فەرمووی: جا فریشتەکە دەستێ دەهێنێ بە سەریدا، ئیتر کە چەڵییەکەی دەڕواو قژێکی جوانیشی پێ دەدرێ، ئینجا پێی دەفەرموێ: حەز لە چی جۆرە ماڵێ دەکەی؟ دەڵێ: لە ڕەشە ووڵاخ، جا مانگایەکی ئاووسی دەداتێو پێی دەڵێ: خودا پیتو بەرەکەتی تێ بخات بۆت، فەرمووی: ئینجا فریشتەکە دەڕوا بۆ لای کوێرەکەو پێی دەفەرموێ: زیاتر حەزت لە چییە؟ دەڵێ: زیاتر حەزم لە دوو چاوی ساغو گەشە کە خودا بیداندات پێم تا ئەم خەڵکەیان پێ ببینم، فەرمووی: جا دەستێ دەهێنێ بە چاوەکانیاو خودا چاوەکانی دەداتەوە، جا پێی دەفەرموێ: ئەی حەز لە چی جۆرە سامانێ دەکەی؟ دەڵێ: لە مەڕ، جا مەڕێکی زاوی بەرخ بە بەری دەداتێ، ئیتر بەرە بەرە ئاژەڵەکان زاوزێ دەکەنو ئەوانیش بەرهەمیان دەهێنان، تاوا زۆر دەبن ئەمیان بوو بە خاوەنی پرشیوێ وشترو ئەویان بوو بە خاوەنی پڕ دۆڵێ ڕەشە ووڵاخو ئەوی تریشیان بوو بە خاوەنی پڕ شیوێ گەلە ڕان، فەرمووی: لە پاشدا فریشتەکە خۆی لێ گۆڕینو لە سەر شێوەو شەکڵی ئەوسای بەڵەکەکە خۆی هاتەوە بۆ لایو پێی گوت: پیاوێکی هەژاری داماوی ڕێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەکا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بە هۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێنو ڕێی خۆم، جا تویبیتو ئەو کەسەی کە ئەم شێوە جوانەو ئەم لەشە جوانەو ئەم ماڵە زۆرەی پێ داویت ووشترێکم بدەرێ، تا لەم سەفەرەمدا خۆمی پێ بگەیەنمە ماڵەوە، کابرا گوتی: خاوەن بەش زۆرن بەر تۆ ناکەوێ!

فریشتەکەیش فەرمووی: وەك من تۆ بناسم وایە، ئەرێ تۆ ئەو پیاوە بەڵەکە نیت کە خەڵك بێزی لێ دەکردیتەوە، وە ئەو هەژارە نیت کە خودا دەوڵەمەندی کردیت! گوتی: خەیر! من ئەمماڵو سامانەم لە باو باپیرمەوە بۆ بەجێماوە، ئەوانیش هەر بووە بوونو پشتاو پشت بەبەگزادەیی هاتوونەتە خوارەوە! فریشتەکەش دەڵێ ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاریجارانی خۆتت لێ بکاتەوە. فەرمووی: جا لە شێوەی شەکڵی پێشووی کە چەڵەکەدا چوو بۆ لای ئەویش، چی بە بەڵەکەکە گوت دیسان بە میشی واگوت، وە بەڵەکەکە چی بە فریشتەکە گوت دیسان کە چەڵەکەش ئەوەی پێ گوت، فریشتەکەش گوتی: ئەگەر درۆ دەکەی خودا وەك جاریجارانی خۆتت لێ بکاتەوە! فەرمووی: جا لە شێوەو شەکڵی پێشووی کوێرەکەیشدا هاتەوە بۆ لایو فەرمووی: پیاوێکی هەژاری داماوی رێبواری لێ قەوماوم، سەر بەهیچ لایەکدا دەرناکەم، سا مەگەر یەکەم بە پشتیوانی خوداو دووەم بە هۆی یارمەتی تۆوە بگەمەوە شوێنو رێگەی خۆم، جا توبییتو ئەو خودایە کە چاوەکانی چاك کردیتەوە مەرێکم بدەرێ بە شکوو لەم سەفەرەمدا پێی بگەیەمەوە ماڵەوە، پیاوە کوێرەکە دەڵێ: ئای! منیش وەك ئێستای تۆ کوێر بوومو دەزانم کوێر چەندە کۆڵەوارە، وە خودا چاوی چاك کردمەوە، سەرەڕای ئەوەیشە هەژاریش بوومو دەشزانم هەژا ری چەندە ناخۆشە، جا کەواتە بە ئارەزووی خۆت چی دەبەی بۆ خۆت بیبە، وەچی دەهێڵیتەوە بۆ من ئارەزووی خۆتە، بەو خودایە هەرچی ئەمرۆ تۆ بیبەیت بۆ خۆت لە رێگەی خودادا دەست نایەنمە رێگەت فریشتەکە گوتی: ماڵی خۆت بۆ خۆت، من فریشتەم هەوە جێم بە ماڵ نییە، لە ڕاستی دا رووداوەکە ئاوایە: ئێوە – واتە: تۆو بەڵەكو کەچەڵەکە – لە لایەن خودای گەورەوە تاقی کرانەوە، خودا لە تۆ رازییە، بەڵام لە هەردوو هاوڕێکەت نارازییە (ش).

## ٢٣) ئەو منداڵانەی کە لەناو بێشکەدا قسەیان کردووە
## الذين تكلموا في المهد

٥٢٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إِلاَّ ثَلاَثَةٌ عِيسَى، وَكَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، كَانَ يُصَلِّي، فَجَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ، فَقَالَ أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّي.فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجُوهَ الْمُومِسَاتِ.وَكَانَ جُرَيْجٌ فِي صَوْمَعَتِهِ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ امْرَأَةٌ وَكَلَّمَتْهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِيًا، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، فَقَالَتْ: مِنْ جُرَيْجٍ.فَأَتَوْهُ فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ، وَأَنْزَلُوهُ وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى ثُمَّ أَتَى الْغُلاَمَ فَقَالَ: مَنْ أَبُوكَ يَا غُلاَمُ قَالَ الرَّاعِي.قَالُوا نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ.قَالَ: لاَ إِلاَّ مِنْ طِينٍ.وَكَانَتِ امْرَأَةٌ تُرْضِعُ ابْنًا لَهَا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ رَاكِبٌ ذُو شَارَةٍ، فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ.فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، وَأَقْبَلَ عَلَى الرَّاكِبِ فَقَالَ اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ.ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهَا يَمَصُّهُ - قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمَصُّ إِصْبَعَهُ - ثُمَّ مُرَّ بِأَمَةٍ فَقَالَتِ: اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هَذِهِ.فَتَرَكَ ثَدْيَهَا فَقَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا.فَقَالَتْ لَهُ لِمَ ذَاكَ؟ فَقَالَ: الرَّاكِبُ جَبَّارٌ مِنَ الْجَبَابِرَةِ، وَهَذِهِ الأَمَةُ يَقُولُونَ لَهَا سَرَقْتِ زَنَيْتِ.وَلَمْ تَفْعَلْ. رواه البخاري وأحمد[١].

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لە سەربێ) فەرمووی: ئەم سێ کەسە نەبێ کەسی تر لە بێشکەدا قسەی نەکردووە: یەکەم عیسای کوڕی مەریەم، دووەم هاوڕێکەی جورەیج، پیاوێ دەبێ لە نەوی ئیسرائیل ناوی جورەیج دەبێ، سۆفیلکە دەبێ، خەڵوە خانەیێ بۆ خۆی دروست دەکاو لە ناو یا خواناسی دەکا، جارێ نوێژ دەکا لەو کاتەدا دایکی دێ بۆ لایو بانگی دەکا ئەی جورەیج! ئەویش لە دڵی خۆیدا دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە یا نوێژەکەم تەواو بکەم، لە پاشا وا بە باش دەزانێ کە نوێژەکەی تەواو بکاو وەڵامی دایکی نەداتەوە، دایکیشی دەگەڕێتەوە، بۆ سبەینێ کە دێتەوە بۆ

---

[١] تجريد/ ٥٣/٤ رقم/ ١٣٦٨ = ٣٤٣٦، ١٢٠٦، ٢٤٨٢، ٣٤٦٦.

لای دیسان جورەیج خەریکی نوێژ کردن دەبێ بانگی دەکاو دەڵێ: ئەی جورەیج! جورەیجیش دەفەرموێ: خودایە! نازانم وەڵامی دایکم بدەمەوە یا نوێژەکەم تەواو بکەم، لە پاشا وا بەباش دەزانێ کە نوێژەکەی تەواو بکا، دایکیشی دەڵێ: خودایە! نەیمرێنی تا رووی داوێنپیسانی پێ نیشان دەدەی. لەو لاشەوە نەوەی ئیسرائیل لە ناو خۆیانا باسی خواناسیی جورەیج دەکەن کە چۆن بۆ خودا لێ بڕاوە، ژنێکی سۆزانی دەبێ بۆ جوانی بێ وێنە دەبێ، دەڵێ: ئەگەر حەز دەکەن من دەچم لە خشتەی دەبەمو تووشی فەرتەنەی دەکەم، جا ژنەکە دەچێ بۆ لای، گەلێ خەریکی دەبێو دێ بەلایەوە کە ئەو ئیشەی لەگەڵدا بکا، بەڵام جورەیج مل ناداو ئاوڕی لێ ناداتەوە، جا ژنەکە دەچێ بۆ لای شوانێ، کە لە شەوکدا لە خەڵوە خانەکەی جورەیجا دەحەوایەوە، ئەو شوانە دەنێ لە خۆیو سکی پڕ دەبێ و کوڕێکی دەبێ، دەڵێ: ئەم مناڵە لە جورەیجە! ئەوانیش دەچن بۆ گیانی جورەیجو لە خەڵوە خانەکەی دەری دەهێننو خەڵوە خانەکەی دەرووخێننو خۆشی تێرو پڕ فەلاقە دەکەنو دەیدەنە بەرجمێن، ئەویش دەفەرموێ: ئەوە چیتانە بۆ وا لە من دەکەن، گوناهم چییە؟ دەڵێن: چونکە ئیشی بێ شەرعیت لەگەڵ ئەم قەحبەیەدا کردووەو ئەوەتانێ لە تۆ ئەم زۆڵەی بووە! دەفەرموێ: کوا مناڵەکە لە کوێیە؟ ئەوانیش دەیهێنن بۆی، دەفەرموێ: تۆزێ پشووم بدەن با نوێژێ بکەم، جا دەسنوێژ دەگرێو نوێژ دەکا، کە نوێژەکە تەواو دەکا دەڕوا بۆ لای کوڕە ساواکەو دەژەنێ بە سکیاو دەفەرموێ:ئەی کۆرپەی ساوا! کێ باوکتە؟ کوڕەکەش دێتە زمانو دەڵێ: باوکی من فیسارە شوانە!!

جا ئەوسا خەڵکەکە لە ڕاستی ی ڕووداوەکە تێ دەگەنو داوای لێ بووردن لە جورەیج دەکەنو پەلاماری دەدەنو دەست دەکەن بە ماچ کردنیو خۆیانی تێ هەڵدەسوون بۆ موفەڕك، وە دەڵێن: خەڵوە خانەکەت لە زێر بۆ دروست دەکەینەوە؟ دەفەرموێ: نەء، بەڵام لە قوڕ وەك جارانی خۆی بۆم دروست بکەنەوە، سێیەم جارێ ژنێ مەمکی دەدا بە کۆرپەکەی – کە لەنەوەی ئیسرائیل بوو – لەو کاتەدا سوارێکی قۆزی بە ناوبانگ بەلایا

رادەبـووری، بـە سـواری وولاّخێکـی کەشـخە، پایـەو نیـشانێکی زۆری پێـوە دەبێ، ژنەکە دەڵێ: خودایە! ئەم کوڕەی منیش بکەی بە سوار چاکێکی ئاوا قۆزو بە ناوبانگ! جا کوڕەکەی مەمکەکەی بەردەداو روو دەکاتە سوارەکەو تەماشایەکی دەکاو دەڵێ:

خودایـە! وەك ئـەوم لێ نەکـەی! ئنجـا دیـسان مەمکەکـەی دەگرێتـەوەو دەست دەکاتەوە بە مژینی.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەیفەرموو: دەڵێی وا لە بەر چاوم کە چۆن چۆنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پەنجەی دۆشاو مژەی خۆیی دەمژیو لاسکایی حاڵی مەمکخواردنی منداڵەکەی دەکردەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە پاشدا کەنیزەکێکیان هێنا، هێنا بوویانەی گیرو گازو لێیـان دەداو دەیـانگوت: حیـزیو دزیـت کـردووە، ئـەویش هـەر دەیگـوت: حسبی الله ونعم الوکیل: مـن هـەر خـودام هەیـە کـە کەسـم بـێو بەسم بـێ! بەڕاستی خـودا پـشتیوانی چاکە. جا دایکی منداڵەکە دەڵـێ: خودایـە! ئـەم کـوڕەی مـن وەك ئـەم کـچە بـەم دەردە نەبـەی، دیـسان کوڕەکـەی مەمکەکـەی دایکی بەردەداو تەماشایەکی کچەکەی کردو گوتی: خودایە! وەك ئـەم کچەم لێ بکە. جا لێرانەدا منداڵەکەو دایکی کەوتنە گوفتوگۆو رازو گلەیی، دایکی گـوتی: ئـەو پیـاوە شـێوە جوانـە رەت بـوو، مـن گـوتم: خودایـە! کوڕەکـەم پیـاوێکی وەك ئەمـەی لێ دەرچـێ کەچـی تـۆ گوتـت: خودایـە! نەمکـەی بـە پیاوێکی ئاوا، لـە پاشـا ئەم کە نیزەکەیان بە لێدانو تێهەڵدان هێناو پێـی دەڵێن: حیزیو دزیت کردووە، منیش گوتم: خودایە! کوڕەکەم وەك ئەمـەی لێ نەیێ، کەچی تۆ گوتت: خودایە! وەك ئەمەم لێ بکەی، ئەمە لەبەرچی؟ گوتی: چونکە سوارەکە زۆردارێکە لە زەبردارەکانو مَلهوڕێکە لـە ملهوڕەکان لەبەر ئەوە گوتم: خودایە! نەمکەی بە پیاوێکی ئاوا ستەمکار، بەڵام ئـەم کـەنیزەی کە پێی دەڵێن: دزیو حیزی کردووە، بێ تاوانو پاكو بێ گەردەو ستەمبارە، نەدزی کردووەو نە حیزی، لەبەر ئەوە گوتم: خودایـە! وەك ئـەم ستەمبارەم لێ بکەی (ب/ ئەحمەد).

٥٢٤٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إِلاَّ عِيسَى وَشَاهِدُ يُوسُفَ وَصَاحِبُ جُرَيْجٍ وَابْنُ مَاشِطَةِ فِرْعَوْنَ.. رواه الحاكم بسند صحيح. وتقدمت بقية القصص في مواضعها فقصة ابراهيم وولده اسماعيل وأمه – عليهم السلام – تقدمت فى تفسير البقرة وقصة وافد عاد سبقت في تفسير الذاريات، وقصة أصحاب الاخدود في تفسير والسماء ذات البروج، وقصة ذي الكفل في التوبة من كتاب الاذكار وقصة أصحاب الغار في كتاب النية والا خلاص[٢]:

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: جگە لەم زاتانە کەسی تر لە ناو بێشکەدا قسەی نەکردووە: عیسای کوڕی مەریەمو ئەو منداڵەی کە شایەتیی دا بۆ پاکیی یوسفو، ئەو منداڵەی کە شایەتیی دا لە سەرپاکیی جورەیجو کوڕی ژنە ئارایشکەرەکەی فیرعەون! (حاکم – س/ص). بڕوانە: (بەرگی/٦ ز-٣ ژمارە/١٢/ ٣٧٠١ وە بەرگی/٧ ز- ٣٤ ژ- ٤١٢٠/١ + ز-٦٨ ژ- ٤٢٠٩/٢ + بەرگی/٩ زنجیرە/ ٨٩ ژ- ٤ + بەرگی/١ ز- ١١ ژ- ٨٥/٣.

٥٢٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ بِأَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ، فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، فَلَمَّا حَلَّ أَجَلُهَا، خَرَجَ فِي الْبَحْرِ، فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَبًا، فَأَخَذَ خَشَبَةً فَنَقَرَهَا فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَارٍ، فَرَمَى بِهَا فِي الْبَحْرِ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ، فَإِذَا بِالْخَشَبَةِ فَأَخَذَهَا لأَهْلِهِ حَطَبًا فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ الْمَالَ. رواه البخاري. نسأل الله اليقين وحسن الثقة بالله تعالى آمين[٣]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پیاوێ (لە نەوەی ئیسرائیل) هەزار دیناری زێڕ لە پیاوێ قەرز دەکا، کە کاتی دانەوەی قەرزەکە دێت پیاوەکە دەچێ بۆ قەراخی دەریا بەڵام پاپۆری دەست ناکەوێ (تا سواربێو بچێ بۆ لای خاوەن

---

[٢] رواه الحاكم بسند صحيح.

[٣] تجريد/ ٢ ل- ١٤٣ رقم: ٧٣١ = ١٤٩٨، ٢٠٦٣، ٢٢٩١، ٢٤٠٤، ٢٤٣٠، ٢٧٢٤، ٦٢٦١.

قەرزەکەو قەرزەکەی بداتەوە). جا لەبەر ئەوە کۆتکە دارێ دەهێنێ و ناوەکەی هەڵ دەکۆڵێ و نامەیێ لە خۆیەوە بۆ هاوڕێکەی دەنووسێو تیادا دەنووسێ: لە فیسارە کەسەوە بۆ فیسارە کەس و دەیخاتە ناو کۆتکە دارەکەوەو هەروا هەزار دیناری زێڕی تێ دەخاو فڕێی دەداتە ناو دەریاکەوەو دەڵێ: خودایە! خۆت ئاگات لێ یەتی پایۆڕو کەشتی نییە، کاتی خۆشی ئەو پیاوە داوای شایەتو کە فیلی لێ کردم، منیش شایەتو کەفیلم نەبوو جگە لە تۆ، جا ئەوا من ئەم قەرزەی سەرخۆمم بەم دەریایەدا ناردەوە بۆی، ئیتر تۆیش ئارەزووی خۆتە من لە مە زیاترم لە دەست نایێ، لەو لایشەوە کابرای خاوەن قەرز دێ هەتا بزانێ برادەرەکەی پارەکەی بۆ دێنێ، بەلأم کەس دیار نابێ کە تەماشا دەکا کۆتکە دارەکە دەبینێ، جا دەڵێ: ئەمە دەبەمەوە بۆ سووتەمەنی ئەمەشەوی خێزانم، جاکە لە ماڵەوە کۆتەرە دارەکە دەقڵەشێنێ پارەکەو کاغەزەکە دەدۆزێتەوە! (ب – خودای لێ رازی بێ).

٥٢٤٤- ← (ب – ٦ ز – ٣ ل – ١٥ ف – ١٢)[٤].

٥٢٤٥- ← (ب – ٧ ز – ٣٤ ل – ١٥٩ ف – ١)[٥].

٥٢٤٦- ← (ب – ٧ ز – ٦٨ ل – ١٤٢ ف – ٢)[٦].

٥٢٤٧- ← (تەماشای باسی تەوبە بکە لە کیتابی ئەزکاردا، بەرگی نۆیەم لاپەڕە ٢٧٠، فەرموودەی سێیەم داستانی کابرای کەنەوەدو نۆ کەس دەکوژێ، فەرموودەی چوارەم داستانی کیفلو ژنە داماوەکە[٧].

٥٢٤٨- ← (ب – ١ ز – ١١ ل – ٦٦ ف – ٣)[٨].

---

(٤) تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/٣ رقم/ ١٢/ ٣٧٠١.

(٥) تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/ ٣٤ رقم/١/٤١٢٠.

(٦) تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/ ٣٠ رقم/ ٢/٤٠٩٩.

(٧) تقدم فی مجلد تاسع. تسلسل/٩٢ رقم/٢/٥١٤٦.

(٨) تقدم فی مجلد أول. تسلسل/١١ رقم/٣/٨٥.

٥٢٤٩- ← (ب – ٦ ز – ١٠ ل – ٢١٦ ف – ٢٤)[٩].

٥٢٥٠- ← (ب – ٧ ز – ٧ ل – ٤٩ ف – ٣)[١٠].

## ٢٤) باسی شەیتانو سوپای شەیتان : (أبليس وجنوده)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا إِنَّمَا يَدْعُو حِزْبَهُ لِيَكُونُوا مِنْ أَصْحَابِ السَّعِيرِ – صدق الله العظيم – سورة فاطر – ٦/٣٥}.

واتە: بێگومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە، دەی ئێوەش بیکەن بە دوژمنی یەکەمی خۆتان، نەکەن ببن بە پارتو کۆمەڵی شەیتان، دەنا دەبن بە هاودەمی ئاگری دۆزەخ، چونکە شەیتان کۆمەڵەی خۆی بانگ دەکا هەتا ببن بە هاوەڵانی ئاگری دۆزەخ.

٥٢٥١- ← (ب – ١ ز – ١١٨ ل – ٣٦٠ ف – ١٥)[١].

٥٢٥٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ أَيِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ فِي جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ[٢]:

لە جابیرەوە دەڵێ (خودای لێ رازی بێ): پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ): دەفەرموێ: شەیتان لەوە نائومێد بووە کە جارێکی تر لە ناو دانیشتوانی دوورگەی عەرەبدا نوێژ کەران بیپەرستنو بەندەییی بۆ بکەن، بەڵام هەوڵ دەدا کە لە ناو خۆیاندا تێکیان بەربدا لە یەکتریی (م – خودای لێ رازی بێ).

٥٢٥٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ إِبْلِيسَ يَضَعُ عَرْشَهُ عَلَى الْمَاءِ ثُمَّ يَبْعَثُ سَرَايَاهُ، فَأَدْنَاهُمْ مِنْهُ مَنْزِلَةً أَعْظَمُهُمْ فِتْنَةً يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا

---

(٩) تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/١٠ رقم/٣٩١٥/٢٤.

(١٠) تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٧ رقم/٤٠٠٨/٣.

(١) تقدم فی مجلد أول. تسلسل/١١٨ رقم/٧٢٢٨/١٥.

(٢) مسلم. توبة: ٧٠٣٦.

فَيَقُولُ: مَا صَنَعْتَ شَيْئًا، ثُمَّ يَجِيءُ أَحَدُهُمْ فَيَقُولُ: مَا تَرَكْتُهُ حَتَّى فَرَّقْتُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ. قَالَ: فَيُدْنِيهِ مِنْهُ وَيَقُولُ: نِعْمَ أَنْتَ:

دیسان جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودو سڵاوو رەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لە سەر بێ) فەرمووی: ئەهریمەن – واتە: ئیبلیس. واتە: شەیتان – تەختو بارەگای خۆی دوور لە ئاوەدانی، لەسەر رووی ئاوی دەریا هەڵ دەدا، ئەوجا لە شکرو دەستو پێوەندو پێکورەو وەچەی خۆی بەهەر چوار لادا، دەنێرێ، بۆ ئاژاوە نانەوەو خراپە بەرپاکردن، ئیتر کامەیان ئاژاوەی گەورە تر بەرپا بکا پایەی ئەوەیانە زیاتر لە خۆیەوە نزیک دەکاتەوە، جا یەکێ لە دەستەو بەستەکەی دەگەڕێتەوەو دێتەوە بۆ لایو پێی دەڵێ: من ئەم خراپەیەم بە فیسارە کەس کرد، شەیتان دەڵێ: جا ئەوە چییە وابێ هیچت نەکردووە! ئیتر هەروەها بەرو دوا دێنەوە بۆ لایو دەڵێن: ئەم خراپەیەو ئەو خراپەیەمان بەمو بەو کرد، بەڵام هیچی بە دڵی شەیتان نابێ، تا یەکێکیان دێتەوە دەڵێ: من لە کوڵکی ئەو پیاوە نەبوومەوە هەتا ژنە کەیم پێ تەڵاق دا.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیتر شەیتان ئەوەیان لە خۆی نزیک دەکاتەوەو دەڵێ: ئافەریم بۆ خۆت، تۆ زۆر باشیت! (م).

٥٢٥٤– عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) قَالَتْ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عِنْدِي لَيْلاً. قَالَتْ فَغِرْتُ عَلَيْهِ فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ فَقَالَ: مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ أَغِرْتِ؟ قُلْتُ: وَمَا لِي لاَ يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ، فَقَالَ: أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ؟ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَوَمَعِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: وَمَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ قَالَ: نَعَمْ. قُلْتُ: وَمَعَكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: نَعَمْ وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ[٤].

عائیشە (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: شەوێ نۆرە شەوی خۆم بوو، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لە لای من بوو لە شەودا دەرچووە دەرەوە،

---

[٤] مسلم. توبة: ٧٠٤١، ٧٠٣٩.

منیش ئەوەم لە بەر گران بوو، جا کە هاتەوەو زانی من لەبەرم گرانە فەرمووی: ئەی عائیشە! ئەوە چیتە؟ ئەوە ژار لە هەوێکانت دەکێشیت؟ گوتم: جا بۆ ئەگەر لەسەر تۆ ژاریشیان لێ بکێشم هەقی خۆم نییە، فەرمووی: ئەوە چیتە، شەیتانەکەت سەری لێ داویت؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی من شەیتانم لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: بەڵێ. گوتم: دیارە هەموو کەسێ شەیتانێکی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ وایە. گوتم: هەتا تۆیش شەیتانت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: بەڵێ، منیش شەیتانێکم هەبوو، بەلاّم من خودا زاڵی کردووم بە سەریداو شەیتانەکەم موسوڵمان بووە! ( م – رەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

٥٢٥٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ وَكَّلَ اللهُ بِهِ قَرِينَهُ مِنَ الْجِنِّ. قَالُوا: وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: وَإِيَّاىَ إِلاَّ أَنَّ اللَّهَ أَعَانَنِى عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ فَلاَ يَأْمُرُنِى إِلاَّ بِخَيْرٍ. روى هذه الأربعة مسلم فى صفة القيامة. نسأل الله السلامة آمين[٥]:

عەبدوڵلاّ (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەریەکێ لە ئێوە خودا سپاردوویەتی بە شەیتانێ لە جنۆکەو، کردوویەتی بە هاوڕێو هاو ملی. گوتیان: هەتا تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا!؟ فەرمووی: بەڵێ هەتا منیش بەلاّم من خودا زاڵی کردووم بەسەریدا، لەبەر ئەوە هەر ڕێگەی چاکەم پێ نیشان دەدا (م – خودای لێ رازی بێ).

## ٢٥) باسی فریشتە کە هەموویان نازدارن : (الملائكة الكرام)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكْرَى لِلْبَشَرِ – سورة المدثر – ٧٤ / ٣١}.

واتە: سوپاو لە شکری خودا لەبەر زۆریو لەبەر سەیریو گەورەیی جەستەو ئەندامیانو، لەبەر زۆریی چەشنو جۆرو تەوانایيان، کەس نازانێ چەشنو جۆرو ژمارەیان چۆنەو چەندە خودا خۆی نەبێ.

---

[٥] مسلم. توبة: ٧٠٣٩.

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ - صدق الله العظيم. سورة قيامةت - ١٨/٥٠}.

واتە: ئادەمیزاد هەر قسەو گوتەیەکی لە دەم دەردەچێ فریشتەیەکی ئامادەو وریا وا بەلایەوە یەکسەر گوتەکەی دەقۆزێتەوەو دەینووسێ.

٥٢٥٦- ← (ب - ١ ز - ٤٣ ل - ١٨٤ ف - ٦)[١].

٥٢٥٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُذِنَ لِي أَنْ أُحَدِّثَ عَنْ مَلَكٍ مِنْ مَلَائِكَةِ اللَّهِ تَعَالَى مِنْ حَمَلَةِ الْعَرْشِ إِنَّ مَا بَيْنَ شَحْمَةِ أُذُنِهِ إِلَى عَاتِقِهِ مَسِيرَةُ سَبْعِمِائَةِ عَامٍ. رواه أبو داود والضياء والبيهقي[٢]:

جابیر (خوای لێ خۆش نوودبێ) فەرمووی: پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست (درودو سلاوی خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕێگە بە من دراوە کە باسی فریشتەیێ لەو فریشتانەی خودای گەورەتان بۆ بکەم کە تەختو بارەگای خودایان هەڵگرتووەو پێیان دەگوترێ: هەڵگرانی تەختو بارەگای خوداوەند (حەمەلەتولعەرش) ئەو باسەیش ئەمەیە: یەکێ لەم هەڵگرانی بارەگایە لە نەرمەی گوێچکەیەوە هەتا سەر شانی حەوت سەد ساڵە ڕێیە! (د-س/ص - ضیاءو بەیهەقی - رەزای خودایان لێ بێ).

عدد أحاديث كتاب الزهد (٢١٠) مئتان وعشرة. نسأل الله العظيم أن تكون خالصة لوجهه الكريم وأن ينفع بها النفع العميم. انه على ما يشاء قدير. آمين والحمد لله رب العالمين:

دانەری ئەم تاجە پیرۆزە جەنابی مامۆستا مەلا مەنصوور عەلی ناصیف (رەحمەتی خودایان لێبێ) لێرەدا دەفەرموێ: ژمارەی فەرموودەکانی نامەی زوهد (٢١٠) تەنیا دوو سەدو دە فەرموودەنو بەس. دەیشفەرموێ: لە خودای گەورە داوا دەکەم کە ئەم کارەمان ساغ بۆ ڕەزامەندیی زاتی خودای نازداربێ،

---

[١] تقدم في مجلد أول. تسلسل/ ٤٣ رقم/ ٣٣٦/٦.

[٢] رواه أبو داود في لزوم السنة بسند صحيح (شرحه).

وە خودا بیکا بە مایەی خێرو خۆشی بۆ هەموولایێ، دڵنیام کە خودا تەوانای هەموو شتێکی هەیەو خواستی لەسەر هەرچی هەبێ دەیکا. آمین والحمد لله رب العالمین.

منیش (کە وەرگێڕی ئەم تاجە پیرۆزەم، کەلە سایەی خوداوە بووە بە مایەی شانازیی دین‌و دونیام) پڕ بە دەم‌و پڕ بەدڵ دەڵێم: ئامین خودایە.

خودایە! رووی رەحمەتت لەم گەلی کوردی پاکی موسوڵمانی ساغی تۆ پەرستەبێ، دەرووی رەحمەتی هەتا سەر لێ بکەرەوە، کۆتایی بە مەینەت‌و زەحمەتی بهێنە، بەدەستی رەحمەت دەستی قەدرو رێزی لێ بنێ‌و کۆتایی بە کۆتی پێی‌و بە زنجیری گەردنی بهێنە بەرەحمەتی خۆت نەك بە خاسی خۆمان ئێمەیش لەگەڵ هەموو موسوڵمانانا ندا لە ژێر ئالا بەرزەکەی حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازداردا (دروودو صەلات‌و سەلام‌و رەحمەتی خودای لێبێ) حەشر بکە. ئامین والحمد لله رب العالمین والصلاة والسلام علی حبیبنا وشفیعنا ومولانا محمد وآلة وصحبة أجمعین.

نووسەر نوێنەری چەرخی خۆیەتی

کۆنی هەی کۆن‌و نوێی هەی نۆیەتی

کۆمەڵەی ئادەمیزادی ئەم چەرخەی ئێمە کوشتەی دەستی ستەمە، لغاوی ستەمکارە ملهوڕەکانی لە ناو دەمە، مرۆڤی ستەمباری زۆر بۆ هاتوو بۆ هەلێ دەگەڕێ کە یەخەی خۆیی تیادا دادڕێ، نەفرەت لە باوە قوژەی شەڕ بکا، پێشوازی لە کۆتری ئاشتی بکا، ئەوەی کە بەڕاشکاوی بۆی ناگوترێ بە پێچ‌و پەنا بۆی بچێ، نە قەلەرەش خەبەر بکاتەوەو نە بولبول بتۆرێنێ!

جا وا لەم روانگەوە ئەم نزایە ئاراستەی بارەگای بەرزی پیرۆزی خودای گەورەو سەروەری خۆم دەکەم، داوایش لە موسوڵمانانی تر دەکەم کە بە دووعاو نزای باشی خۆیان هەمیشە ئەم گەلی کوردی سەرتۆپ موسوڵمانە بەسەر بکەنەوە، چونکە دڵنیام کە:

دەسنوێژو دووعا، خێر لە ماڵی پاک
سێ چەکی چاکن لە بۆ پیاوی چاک!
کەر نیازت پاک بێ نیشان دەپێکی
دەکەی بە ناوات بە رێکو پێکی!

سەرنجی ئەم نزا شیرینەی حەزرەت بدەن، کە چۆن لە ناو نزاکەدا هۆی کردنەکەی ڕۆشن دەبێتەوە، کە دەفەرموێ: {رحم الله حميرا افواههم سلام وأيديهم طعام وهم أهل أمن وأمان}: رەحمەتی خودا لە هۆزی حیمیەربێ، هەمیشە دەمیان بە سلاوەوەیە، بە راستی میللەتێکی نانبدەن، هەم بێ وەیو هەم ئاسایش پەروەرن، هەروەك خاوەنی باوەڕو بڕوانو، گەلێ بە دینن. ئایەتی قورئانی پیرۆزو فەرموودەی نازداری حەزرەت هەمووی پەندو حیکمەتو گەوهەرە، هەموو وشەیەکیان سەر مەشقێکە بۆ خۆی، گشت ئایەتێ سەر باسێکە بۆ خۆی، هەر واگشت رستەیەکی فەرموودەی نازداریش دەبێ بە سەر باسی بابەتێ لە یاساو دەستوورەکانی ژین! خودا پێداوی خۆشبەخت ئەو زانا دانایەیە کە بزانێ بە جوانی لەگەڵ ئەم دوو چرا رۆشنەدا رەفتار بکاو، سوودو بەهرەی هەمە جۆر لەم دوو مانگو خۆرە وەربگرێ!

مسۆگەر مرۆی ئاوا، بە ختیاریی هەر دوو جیهان بۆ خۆی مسۆگەر دەکا. برای موسوڵمانی پاکم! ئەی کوردی مەردی چاکم! لە رەحمەتی خودا نا ئومێد مەبن: خودا رەحمەتی گەورە گەورەی لە لایە، ڕاستە کە گەلەکەی خۆشمان تاكو تەرا پیاو خراپی تیادایە، بەلام لە خودا بەزیادبێ و لوتفو کەرەمو رەحمەتی تا سەربێ لە گەلماندا، زۆربەی گەلەکەمان موسوڵمانی باشنو بێ وەینو هەژاری ماڵی خۆیاننو، لە سایەی خوداوە رێ بەدێیی لە دیندا دەکەن، کەواتە جێگەی خۆیەتی کە ئێمەی مەلاو بەرپرسیاری ئایینی ئەم گەلە باشە هەمیشە دڵسۆزیی خۆمانیان بۆ دووپات بکەینەوەو، بە دووعاو نزای باشو بە ئامۆژگاری باش بە سەریان بکەینەوە، چاو لە بازێ هەڵەو نارێکیو خووی ناباشیان بپۆشین.

ئامان سەد ئامان بە هەڕەشەو گوڕەشەی زۆرو بە تانەو تەشەری ڕەقو زەقو، بە قسەی توندو ڕەق خەڵك لە دین مەتەکێننەوە، بە تایبەتی ئەوانەیان کە بەهۆی دەمو دووی دەرو دراوسێکانمانەوەو، بە هۆی هۆیڕەگەزیو نەتەوە گەرییەوە لە ئەهلی دین زویرو دڵگرانن، بەندە – پشت بەڕەحمەتی خودا (دڵنیام لەوە کە مەزڵوومییەتی گەلی کورد لەلای خودا شەفاعەتیان بۆ دەکاو، دەبێ بە هۆی کردنەوەی دەرووی ڕەحمەت. لە ئەنجامیشدا هەر ئەم دینی پیرۆزی موحەممەدە فریایان دەکەوێ، لە شەوە زەنگی کوفرو بێ دینی ڕەووشتی) کە لە سەرانسەری جیهان دا پەرەی سەندووە (ڕزگاریان دەکا، دنیا زۆری بە بەرەوە ماوە بەشی هەموو جۆرە بەراووردێ دەکا، وەك خودا) لە بارەی وەرگێڕو داگێڕ پێ کردنی شەوو ڕۆژەوە – دەفەرموێ:

{وَتِلْكَ الأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ – سورة آل عمران – ٣/١٤٠}.

هەروەك لە باوەڕی بەندەدا موسوڵمانەتی بەراستیو کوردایەتیو مەردایەتی هەرگیز دژی یەکتری نین، قەیدی چییە تۆ موسوڵمانێکی پاکی باش بەو، کوردێکی مەردی باشی چاکیش بە لەبەر ئەوە من گلەییم لەو موسوڵمانە وشکانە هەیە کە بە قەد بێگانەیێ دڵسۆزو دۆستی ئەدەبو وێژەو مێژووو زمانی کوردی نینو، تەنانەت مەدحی بە هەقی گەلی کوردیش دادەنێن بە (عصبیەتو قەومییەتو ڕەگەزو پەرستی) ئەمانە هەیانە – دەق وەك کوردە بێگانە پەرستەکان – ئەگەر بۆیان بلوێ بە کوردی قسە ناکەن، هەر لەبەر ئەم هۆیەیە ئەم جۆرە وشکە موسوڵمانانە بوون بە هۆی تەکینەوەی زۆر لە ڕۆشنبیرەکانمان لە کۆڕی ئایین. ئیتر باروو لە قاپی خودا کەینو، چەکی نزا ئاراستەی نیشانکەین:

هەر مەل لانەیێ، هەر مووری شارێ
تەنیا ئەم کوردە بێ لان ما جارێ!
خودا پێی بدەی پەناو پاسارێ:
لانەیێ ڕەحمەت، نووری لێ بارێ

بیکەی بە مەشخەڵ بۆ نووری قورئان
هەر کوردێ بگری بێ بە عوسمان
وەک ئەو دڵسۆزی قورئانی خوابێ
بۆ گەلی کوردم چرای هیوابێ!
نۆخەی کوردستان ناشت و ناوایە
ڕەحمەت بەم کوردە تاسەر بێ خوایە!
وەک خوا پێداوان بەڕەحمەتی خۆت
بەدەستی ڕەحمەت پێی بەردە لەکۆت
لەجێ هەواری جارانی زەحمەت
هەوار هەڵبدا خەرمانی ڕەحمەت
چۆن سێڵاوی نوح لافاوی ڕەحمەت
عێراق داپۆشێ وراماڵێ زەحمەت!
دانیشتوانی وەکو برا بن
دەردو بەلایان لۆ کابرابن!
کوردە! کوردستان جێی نەولیایە
هەرلایێ دەچی مەردێکی تیایە
کەرکوک گوڵێکە وا لەناو دڵا
بەڵکەم دانیالە کەوا لەقەڵا!
بەرزنجە زێدی ساداتی ساخە
سەیدی بەرزنجە وەک گوڵە باخە
واتە: کوردستان بۆ نەوەی حەزرەت
خودا کردویە بەپەنای ڕەحمەت
بۆ ئێمەش کەوا نومەتی نەوین
بەوە بەمایەی هەوێنی نەوین!

چـــاکەی کوردســـتان وا لەبەرچـــاوم

دوعـــای بـــۆ دەکـــەم هـــەتاکو مـــاوم

لەگـــەڵ دانیـــشتوی ئـــازیز! هەمیـــشە:

(چـــاکەی بـــێ تـــەما بکـــە بەپیـــشە)

هـــەتاکو مـــردن لـــەزەتی ئیحـــسان

دەمێنـــێ لـــەبن ددانـــی ئینـــسان!!

کـــوردە!کوردوســـتان گـــەلێ ڕەنگینـــە

تـــابلۆی بەهەشـــتی ســـەر ڕوی زەمینـــە

کـــوردە! بـــەکورتی وەســـفی کوردســـتان

(بـــوکی سروشـــتەو بەهەشـــتی جیهـــان!)

ئالـــەم بەهەشـــتە خـــودای میهرەبـــان!

لەبـــەر خـــاتری ســـێی جزمـــەی قوورئـــان:

گـــوڵێ خـــەڵات کـــە بەبەنـــدەی زاهیـــد

بـــۆ ڕەنگـــی زەردم بیـــێ بەشـــاهید

لەهـــەوری ڕەحمـــەت پـــاراو کرابـــێ

بـــۆ کوردســـتانی ســـەوزم چـــرابێ

پـــەیمانی بـــەینی جوتـــە برابـــێ

تاســـەر ئاشـــتییان، بـــەبێ هـــەرابێ

- وەرگێڕ - ١٩ /٥/١٩٩٢

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی ویڵو ئەدەب

(ئەم نامەیە حەوت بەشو پایانێکە)

## ٢٦) بەشی یەکەم: داوای ڕێ پێدان (أستئذان)

## كتاب الأدب: (وفيه سبعة فصول وخاتمة)

## الفصل الأول: في الإستئذان

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، {فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا هُوَ أَزْكَى لَكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ – صَدَقَ اللهُ العَظِيم – سورة النــور – ٢٤/٢٧-٢٨}.

واتە: ئەی کەسانێ باوەڕتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا! خود سەر لە خۆتانەوە مەڕۆنە ناو هیچماڵێکەوە بێجگە لە ماڵی خۆتان،هەتا ئیجازەیان لێ دەخوازن، لە پاش ڕێ پێدانیش کاتێ ڕۆیشتنە ماڵەوە سلاو لە دانیشتووەکان بکەن، ئەمە یاسایەکی زۆر باشە بۆ ئێوە، خودا ئەم جۆرە دەستوورە باشانەتان بۆ دەنێرێ هەتا بیربکەنەوەو کاریێ بکەن خێرو خۆشی هەموو لایەکی تیادابێ، ئەگەر دنیا بوو خانووەکە ئاوەدانی لێ نەبوو مەڕۆنە ناوی، هەتا کەسێ لە خەڵکی ئەو خانووە دێو ڕێگەتان پێ دەدا، ئەگەر ڕێگەیان پێ نەدان و گوتیان: مەیەنە ماڵەوەو بگەڕێنەوە مەیەنە ژوورەوەو بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆتان، ئەوە بۆ ئێوە لەوە با شترە کە هەر مل بنێنو بڕۆنە ناوی بزانن، کە خودا ئاگای لە هەموو کارو کردەوەیەکتانە.

٥٢٥٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا فِي مَجْلِسٍ مِنْ مَجَالِسِ الأَنْصَارِ فَجَاءَ أَبُو مُوسَى فَزِعًا، فَقُلْنَا: مَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: إِنَّ عُمَرَ أَرْسَلَ إِلَيَّ أَنْ آتِيَهُ فَأَتَيْتُ بَابَهُ فَسَلَّمْتُ ثَلَاثًا فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ أَحَدٌ فَرَجَعْتُ، ثُمَّ أرءسَلَ إِلَيَّ فَذَهَبْتُ فَقَالَ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تَأْتِيَنَا فَقُلْتُ إِنِّي أَتَيْتُكَ فَسَلَّمْتُ عَلَى بَابِكَ ثَلَاثًا فَلَمْ يَرُدُّوا عَلَيَّ أَحَدٌ فَرَجَعْتُ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَذَهبتُ وَقَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اسْتَأْذَنَ أَحَدُكُمْ

ثَلاَثًا فَلَمْ يُؤْذَنْ لَهُ فَلْيَرْجِعْ. فَقَالَ عُمَرُ: أَقِمْ عَلَيْهِ الْبَيِّنَةَ وَإِلاَّ أَوْجَعْتُكَ. فَقَالَ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: لاَ يَقُومُ مَعَهُ إِلاَّ أَصْغَرُ الْقَوْمِ. فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ قُلْتُ: أَنَا أَصْغَرُ الْقَوْمِ. قَالَ: فَاذْهَبْ بِهِ فقمت فأتيت عمر فقلت: قد سمعت النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ هَذَا. وفي ريواية: فَجَاءَه أُبَيٌّ فَشَهِدَ بِذَلِكَ وَقَالَ: يَا ابْنَ الْخَطَّابِ لاَ تَكُونَنَّ عَذَابًا عَلَى أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّمَا سَمِعْتُ شَيْئًا فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَثَبَّتَ. قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ إِنَّمَا سَمِعْتُ شَيْئًا فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَتَثَبَّتَ. رواه الأربعة[1].

ئەبو سەعیدی خودری (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: جارێ دانیشتبووم لە ناو كۆڕێ لە كۆڕەكانی یاریدەدەراندا تەماشام كرد وا ئەبو مووسا بە شڵەژاوی هات بەرەو ئێمە، گوتمان: ها خێرە وا پەشۆكاوی؟ گوتی: عومەر ناردبووی بە دواما، ڕۆیشتم بۆ لای، كە گەیشتمە بەر دەرگاكەی سێ جار سڵاوم كرد، بەڵام كەسێ وەڵامی نەدامەوە، ئیتر منیش گەڕامەوەو نەچوومە ژوورەوە، دیسان ناردیەوە بە شوێنما، كە چووم فەرمووی: بۆ نەهاتیت بۆ لام، گوتم: من هاتم بۆ لاتو سێ جار لەبەر دەرگاكەتدا سڵاوم كرد، كەس وەڵامی نەدامەوە ئیتر منیش گەڕامەوە، چونكە پێغەمبەر (درووری خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كامێكتان لە شوێنێ سێ جار داوای ڕێگادانی كرد بچێتە ماڵەوە بەڵام ڕێگەیان نەدا ئیتر بابگەڕێتەوە.ئێستایش عومەر پێم دەڵێ: بەڵگە ڕاست بكەرەوە لەسەر ئەم فەرموودەیەی كە دەیگێڕێتەوە ئەگینا ئێشت پێ دەگەیەنم! ئەوجا ئوبەیی كوڕی كەعب فەرمووی: دەبێ بچوكترینی ئەم كۆڕی دانیشتنە ئەم شایەتیەت بۆ بدا. ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: منیش گوتم: دەی من بچوكترین كەسم لەناوتاندا، فەرمووی: دەبیبە لەگەڵ خۆت، منیش هەڵسامو چووم بۆ لای عومەر گوتم: من ئەوەم لە پێغەمبەر (درووری خودای لەسەربێ) بیستووە. لە گێڕانەوەیەكا: جا ئوبەیی خۆی هات بۆ لای عومەرو ئەم شایەتیەی داو،

---

[1] تجرید/٣/١٤ رقم / ٩٣٩ = ٢٠٦٢، ٦٢٤٥، ٧٢٥٣. مسلم. أدب: ٥٥٩١ (رياض/٢/٣٢٥ رقم/٢/٨٧١ تسلسل/١٤٠).

گوتیشی: ئەی عومەر! ئەی کوڕی خەتتاب! مەبە بە ئێش‌و ئازار بۆ یارانی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) عومەریش (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: سوبحانەڵلا! چەند سەیرە! من تەنیا مەبەستم ئەوە بوو کە بچمە بنج‌و بنەوانی ئەم مەسەلەیەو بەس ( دەنا خوانە خواستە من چۆن بەخوت‌و خۆڕایی ئازاری هاوڕێیانی پێغەمبەر دەدەم. درودی خودا لە خۆی‌و رەزای خودا لە یارانی (ش/د/ت- رەزای خوایان لێ بێ).

٥٢٥٩- اسْتَأْذَنَ رَجُل عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي بَيْتٍ فَقَالَ: أَ أَلِجُ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِخَادِمِهِ: اخْرُجْ إِلَى هَذَا فَعَلِّمْهُ الإِسْتِئْذَانَ فَقُلْ لَهُ قُلِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ أَأَدْخُلُ. فَسَمِعَهُ الرَّجُلُ فَقَالَ: السَّلَامُ عليكُمْ أ أَدْخُلُ. فَأَذِنَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَدَخَلَ. رواه أصحاب السنن[٢]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەماڵەوە بوو، پیاوێ هات بۆ خزمەتی، داوای ڕێگاپێدانی کرد: گوتی: ئەرێ بێمە ژوورەوە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) بە نۆکەرەکەیی فەرموو: ئادەی بچۆ بەدەم ئەم کابرایەوە، فێری داوای اجازە وەرگرتنی بکە پێی بڵێ: کە بابڵێ: سلاوتان لێ بێ، ئەرێ بێمە ماڵەوە؟ پیاوەکە گوێی لێ بوو گوتی: سلاوتان لێ بێ ئەرێ بێمە ژوورەوە؟ ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی داو هاتە ژوورەوە (د/ت/ن- س/ح).

٥٢٦٠- وَقَالَ عُمَرُ: أستأذنت على النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثلاثا فأذن لي[٣]:

عومەر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ سێ جار داوای ڕێگادانم کرد کەبێمە ژووورەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ڕێگەی پێ دام‌و چوومە ژوورەوە (ت – س/ح).

٥٢٦١- (ب – ٣ ز ٤٧ ل – ١١٨ ط/١ ف – ٥ + ٦ + ٧)[٤].

---

[٢] سند حسن (شرحه) (رياض /٣٢٦/٢ رقم/٨٧٢/٣. أبو داود: ٥١٧٧ باسناد صحيح).

[٣] بسند حسن (شرحه).

لەگێڕانـەوەی ئێـرەدا: لـە ئـیبن عەبباسـەوە (خـودای لێ ڕازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نەهی دەکرد لە موسوڵمانان کە کاتێ لە سەفەر دەگەڕێنەوە لە ناکاو لەشەودا نەدەن بەسەر خێزانیان دا دوو پیاو لەپاش ئەم جڵـەو گیری‌یـە لەسـەفەر دەگەڕێنـەوەو لـە شـەودا لـە ناکـاوا دەدەن بەسـەر ژنەکانیانـدا، هـەر دووکیـان یـەکی سـەرو پیـاو دەگـرن بە سـەر ژنەکانیانـەوە! (ش– س/ص).

٥٢٦٢– (ب – ٤ ز – ١٠٦ ل – ٣٤٠ ف – ٢)[٥].

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کە باوکم مرد قەرزار بوو، لە بارەی ئەو قـەرزەوە چـووم بـۆ لای پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) کەلـە دەرگـەم دا،، فەرموی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) قسەکەی منـی دووبارە کردەوەو فەرمووی: منم منم! وەکوو ئەم جۆرە وەڵامـەی پـێ نـاخۆش بێ وابوو، چونکە لە حاڵی وادا نازانرێ کە کێ لەبەر دەرگایە (ش/د/ت/ن).

٥٢٦٣– وَجَاءَ رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَامَ عَلَـى الْبَابِ مُسْتَقْبِلَ الْبَابِ فَخَرَجَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَـالَ: هَكَـذَا عَنْـكَ أَوْ هَكَـذَا فَإِنَّمَـا الإِسْتِئْذَانُ مِنَ النَّظَرِ[٦]:

پیاوێ هات بۆ ماڵی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لەبەر دەرگاکەدا ڕوو بەرووی چەقی دەرگاکە وەستاو، ڕێخوازیی کرد کە بچێتە ژوورەوەپێغەمبەر (درودی خـودای لەسـەربێ) خـۆی هاتـە دەرەوە بـۆ لای و فـەرمووی: یـا لـەم لای دەرگاکەوە بوەستە یالەم لا یـەوە، چونکە ڕێخوازیی لەبەر چاو دانـراوە. (د– س/صالح).

---

[٤] تقدم فی مجلد ثالث. تسلسل/٤٧ رقم/٢١٦٢/٥، ٢١٦٣/٦، ٢١٦٤/٧.

[٥] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/ ١٠٦ رقم/ ٢/ ٣١٧٧.

[٦] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

٥٢٦٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ بُسْرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَتَى بَابَ قَوْمٍ لَمْ يَسْتَقْبِلِ الْبَابَ مِنْ تِلْقَاءِ وَجْهِهِ وَلَكِنْ مِنْ رُكْنِهِ الأَيْمَنِ أَوِ الأَيْسَرِ. رواهما أبو داود[٧]:

عەبدوڵلاّ كوڕی بیشر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو كە دەچوو بۆ ماڵێ، لەكاتی ڕێخوازیدا ڕووبەڕووی دەرگاكە نەدەوەستا، بەڵام یا لەلای ڕاستی دەرگاكەوە دەوەستا یا لەلای چەپیەوە دەوەستا، هەتا كاتێ خاوەن ماڵەكە فەرمووی لێ دەكردو، دەچووە ژوورەوە (د-س/ صالح).

## ٢٧) ڕێخوازیی لەبەر تەماشای چاو دانراوە : (الأذن لمنع النظر)

٥٢٦٥- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً اطَّلَعَ مِنْ جُحْرٍ فِي بَابِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِدْرًى يُرَجِّلُ بِهِ رَأْسَهُ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَوْ أَعْلَمُ أَنَّكَ تَنْظُرُ طَعَنْتُ بِهِ فِي عَيْنِكَ إِنَّمَا جَعَلَ اللّٰهُ الإِذْنَ مِنْ أَجْلِ الْبَصَرِ. وفي رواية: فَقَامَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمِشْقَصٍ فَكَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْتِلُ الرَّجُلَ لِيَطْعُنَهُ. رواه الأربعة[١]:

سەهلی كوڕی سەعد (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ لە درزی دەرگاكەی ماڵی پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) سەرەتاتكێی دەكرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شانەیەكی ئاسنی بەدەستەوە بوو، سەری خۆیی پێدا دەهێنا، بە كابرای فەرموو: ئەگەر دەمزانی كە تۆ تەماشای ناوەوە دەكەی، ئەم شانەیەم دەكردبەناو چاوتا، چونكە خودا لەبەر تەماشای چاو ڕێخوازیی داناوە. لە گێڕانەوەیەكا: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەڵسا

---

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] تجريد/٢٣٣/٥ رقم/١٩٦٦ = ٦٢٤١، ٥٩٢٤، ٦٩٠١. مسلم. أدب: ٥٦٠٣. نسائي. قسامة: ٤٨٧٤. تحفة الأشاف ٤٨٠٦ (رياض/٢/٣٢٥ تسلسل/١٤٠ رقم/٢/٨٧١.

بە پەیكانێكەوە چوو بۆ گیانی، ئێستایش هەر لەبەر چاومە كە چۆن چۆنی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەماتە مات چوو بۆی، تا لە پڕ بەرلەوەی بەئاگابێ بیكا بە چاویدا، وەڵێ فریا نەكەوت كابرا، ڕۆیشت. (ش/ د/ت – ڕەحمەتو ڕەزای خوایان لێ بێ ).

٥٢٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَسُولُ الرَّجُلِ إِلَى الرَّجُلِ إِذْنُهُ. رواه أبو داود والبخاري[٢]:

ئەبوو هورەیرە(خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودو ڕەحمەتو سەلامو صەلاتو بەرەكاتو پیرۆزیی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) فەرمووی: كەسێ فروستادەیێ بنێرێ بە شوێن كەسێكا كە بانگی بكا بۆ لای، كە هات ئیتر داوای ڕێگادانی پێ ناوی (د/ب).

٥٢٦٧- عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: نَزَلْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْبَرَ وَكَانَ صَاحِبُ خَيْبَرَ مَارِدًا مُنْكَرًا فَجَاءَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ أَلَكُمْ أَنْ تَذْبَحُوا حُمُرَنَا وَتَأْكُلُوا ثَمَرَنَا وَتَضْرِبُوا نِسَاءَنَا فَغَضِبَ يَعْنِي النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ: يَا ابْنَ عَوْفٍ ارْكَبْ فَرَسَكَ ثُمَّ نَادِ أَلاَ إِنَّ الْجَنَّةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لِمُؤْمِنٍ وَأَنِ اجْتَمِعُوا لِلصَّلاَةِ. قَالَ: فَاجْتَمَعُوا ثُمَّ صَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَامَ فَقَالَ: أَيَحْسَبُ أَحَدُكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ قَدْ يَظُنُّ أَنَّ اللَّهَ لَمْ يُحَرِّمْ شَيْئًا إِلاَّ مَا فِي هَذَا الْقُرْآنِ. أَلاَ وَإِنِّي وَاللَّهِ قَدْ وَعَظْتُ وَأَمَرْتُ وَنَهَيْتُ عَنْ أَشْيَاءَ إِنَّهَا لَمِثْلُ الْقُرْآنِ أَوْ أَكْثَرُ وَأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمْ يُحِلَّ لَكُمْ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتَ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ بِإِذْنٍ وَلاَ ضَرْبَ نِسَائِهِمْ وَلاَ أَكْلَ ثِمَارِهِمْ إِذَا أَعْطَوْكُمُ الَّذِي عَلَيْهِمْ. رواه أبو داود في الجزية[٣]:

عیرباضی كوڕی ساری یە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: كاتێ لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) چووینە ناو خەیبەرو قەڵای خەیبەرمان گرت،

---

[٢] بخاری. إستئذان: ٦٢٤٦.

[٣] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

خاوەنی خەیبەر – کە پیاوێکی سەرکەشی بەدرەزا بوو– هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) گوتی: ئەی موحەممەد! ئایا بۆ ئێوە رەوایە کە بەبێ پرس و رای ئێمە خود سەر لەخۆتانەوە گوێرێژەکانمان سەر ببڕنو گۆشتەکەیان بخۆنو، میوەهاتمان بخۆنو، سەرەڕای ئەوەیش لە ژنەکانیشمان بدەن!

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) تورە بوو فەرمووی: ئەی عەبدو رەحمانی کوڕی عەوف! سواری ئەسپەکەت بەو جاڕبدە: کە بەهەشت تەنیا بۆ موسوڵمان رەوایەو بەس، هەروەها بانگەوازیش بکە کە بۆ نوێژ کۆببنەوە. لە دواییدا مەردمەکە کۆبوونەوەو پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەرنوێژیی بۆ کردنو، لەپاشدا هەڵسایەوەو فەرمووی: رەنگ بێ لەناو ئێوەی ئومەتی مندا پیاوی وا وایپتان هەبێ کەلەسەر تەختو قەنەفەکەی پاڵی لێ بداتەوە ئیتر وا بزانێ کە حەلاڵو حەرام: رەواو ناڕەوا هەر ئەوەیە کە خودا لەم قورئانەدا باسی کردووەو بەس! باش باش ئاگادارین کە من – سوێندم بە خودای گەورە – لە وەعظو ئامۆژگاری و ئەمرو نەهی کۆتاییو درێغیم نەکردووە، وەگەلێ شتی وام پێ گوتوون کە بەوێنەی قورئانن، یا زیاتریش! (واتە: فەرموودەکانی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بەقەد قوئان دەبن، بگرە فەرموودە لە قورئان زۆرترە. (وەرگێڕ)

هۆشیارین! کە خودای گەورە رەوای لەسەر نییە کە ئێوە خۆسەر خۆتان بکەن بە ماڵی خاوەن نامەکاندا، مەگەر خۆیان بە خۆشیی خۆیان رێگەتان پێ بدەن، یابە نارەوا بەبێ هۆیەکی رەوا لە ژنیان بدەن، یاخود بەرو بوومو میوەهاتیان بخۆن، بەمەرجێ کە ئەرکی سەرشانی خۆیان بەرابەر بە ئێوە بەجێ بهێنن. (د– س/صالح) ← (ب – ١ ز – ٩ ل – ٥٨ چ/١ ف ١١).

٥٢٦٨– عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذْنُكَ عَلَيَّ أَنْ يُرْفَعَ الْحِجَابُ وَأَنْ تَسْتَمِعَ سِوَادِي حَتَّى أَنْهَاكَ. رواه مسلم. نسأل الله حسن الأدب آمين[٤]:

---

[٤] مسلم. آداب: ٥٦٣١.

عەبدوڵلا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نیشانەی ڕێگەدانی هاتنی تۆ بۆ لای من ئەوەبێ کە پەردەکە لادرابێو گوێت لە قسەو رازم بێ، ئەم بڕیارە لە بەنیماندا بێ، هەتا خۆم پێت دەڵێم کە ئیتر بەبێ ڕێخوازیی مەیە. (م).

## ٢٨) ئەوەی کەبەبێ ڕێدانی خاوەن ماڵ تەماشای ناوماڵی کەسێ بکا چاوی خوێنی نییە : (يهدر دم الناظر بغير إذن)

٥٢٦٩- ← (ب – ٣ ز – ٨٧ ل – ٢٢٧ چ/١ ف – ٣)[١].

لێرەدا ئاوایە: هەر کەسێ سەرەتاتکێ بکا بۆ ناو ماڵی کەسێ، بەبێ ڕەزاو ڕێدانی خۆی، ئەوە دروستە بۆی کە شتێ بکا بە چاوی داو چاوی دەرپۆقێنێ (م/د).

٥٢٧٠- ← (ب – ٣ ز – ٧ ل – ٢٢٧ ف – ٣)[٢].

٥٢٧١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَشَفَ سِتْرًا فَأَدْخَلَ بَصَرَهُ فِي الْبَيْتِ قَبْلَ أَنْ يُؤْذَنَ لَهُ فَرَأَى عَوْرَةَ أَهْلِهِ فَقَدْ أَتَى حَدًّا لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَأْتِيَهُ لَوْ أَنَّهُ حِينَ أَدْخَلَ بَصَرَهُ: اسْتَقْبَلَهُ رَجُلٌ فَفَقَأَ عَيْنَيْهِ مَا غَيَّرْتُ عَلَيْهِ وَإِنْ مَرَّ رَجُلٌ عَلَى بَابٍ لاَ سِتْرَ لَهُ غَيْرِ مُغْلَقٍ فَنَظَرَ فَلاَ خَطِيئَةَ عَلَيْهِ إِنَّمَا الْخَطِيئَةُ عَلَى أَهْلِ الْبَيْتِ. رواه الترمذي. نسأل الله كامل الأدب آمين[٣]:

ئەبو ذەڕ (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودو سڵاوو پیرۆزیی خودای گەورەی لەسەر بێ) فەرمووی: کەسێ پەردەی ماڵێ لابداو خۆسەر بەبێ ڕێ پێدان چاو بگێڕێ بەناو ماڵ داو، تەماشای شەرمو عەورەتو عەیبیان بکا، ئەوە گوناهێکی گەورەی وای

---

(١) تقدم في مجلد ثالث: تسلسل/٨٧ ل- ٢٧٧ رقم/٣/٢٣٣٢.

(٢) تقدم في مجلد ثالث: تسلسل/٨٧ رقم/٣/٢٢٩٥.

(٣) بسند ضعيف ولكن مؤيد بما قبله

كردووه كه شایانی حەددە، كەواتە ئەگەر لەو كاتەدا لە باتی حەدد، پیاوێ شتێ بكا بەناو چاویاو چاوی قەلپووچ بكا لێی ناگرمو بەتاوانباری دانانێم، بەڵام ئەگەر پیاوێ بەبەردەرگایەكا تێ پەڕێ، دەرگاكە پەردەی نەبوو، وە دانەخرابوو، لەم كاتەدا تەماشای ناو ماڵی كرد، ئەوە ئەو گوناهی لەسەر نییە، بەڵكوو لە حاڵی وادا گوناهەكەی لە ئەستۆی خاوەن ماڵە! (ت – س/ زەعیف).

## ٢٩) تەماشاكردنی بیانی لەبەر پێداویستی (بەقەی پێداویستی) دروستە یجوز النظر للحاجة

٥٢٧٢– عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ اسْتَأْذَنَتْ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْحِجَامَةِ فَأَمَرَ أَبَا طَيْبَةَ أَنْ يَحْجُمَهَا. قَالَ: حَسِبْتُ أَنَّهُ قَالَ كَانَ أَخَاهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ أَوْ غُلاَمًا لَمْ يَحْتَلِمْ[1]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) داوای لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كرد، كە ڕێگەی بدا هەتا كەڵەشاخ لە خۆی بگرێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی كرد بەئەبو تەیبە ئیتر ئەبو تەیبە (خودای لێ رازی بێ) كەڵەشاخی لە ئوممو سەلەمە گرت، گوتی: وادەزانم كە ئەبو تەیبە یابرای شیریی ئوممو سەلەمە بوو، یا ئەو كاتە مناڵكارێكی مێرد مناڵ بوو هێشتا رەسیدە ئەبوو بوو (د– س/صالح).

٥٢٧٣– عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَى فَاطِمَةَ بِعَبْدٍ قَدْ وَهَبَهُ لَهَا قَالَ: وَعَلَى فَاطِمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا ثَوْبٌ إِذَا قَنَّعَتْ بِهِ رَأْسَهَا لَمْ يَبْلُغْ رِجْلَيْهَا وَإِذَا غَطَّتْ بِهِ رِجْلَيْهَا لَمْ يَبْلُغْ رَأْسَهَا فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا تَلْقَى قَالَ: إِنَّهُ لَيْسَ عَلَيْكِ بَأْسٌ إِنَّمَا هُوَ أَبُوكِ وَغُلاَمُكِ. رواهما أبو داود في اللباس[2]:

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەندەیەکی بەخشی بە فاتیمەی کچی و بردی بۆی، لەو کاتەدا واڕێکەوت فاتیمە (خودای لێ رازی بێ) جلکێکی کەمو کووڕی وای لەبەردا بوو کە دەیدا بەسەر سەریدا قاچی دەردەکەوت و، کەدەیدا بەقاچیا بەسەریدا نەدەگەیشتەوە! جا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەستی کرد کەوا فاتیمە شەرم دەکاو هەست بە سەخڵەتی دەکا پێی فەرموو: بۆ وا خۆت سەخڵەت دەکەی، قەیدی نییە بۆ تۆ، ئاسایش لە خۆت تێك مەدە، جلەکانت ئاسایییە، چونکە منم باوکتم و ئەویشە بەندەی خۆتە لە حوکمی خۆیی و مەحرەم دایە. (د- س/صالح).

٥٢٧٤- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: كُنتُ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ مَيْمُونَةُ فَأَقْبَلَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ وَذَلِكَ بَعْدَ أَنْ أُمِرْنَا بِالْحِجَابِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): احْتَجِبَا مِنْهُ فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَيْسَ أَعْمَى لاَ يُبْصِرُنَا وَلاَ يَعْرِفُنَا فَقَالَ: أَفَعَمْيَاوَانِ أَنْتُمَا أَلَسْتُمَا تُبْصِرَانِهِ. رواه أبو داود والترمذي بسند صحيح[٣]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئێمەی هاوسەرانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە پێی ئایەتی حیجاب فەرمانمان پێ کرابوو بەپەردەگرتنەوە، جا جارێ منو مەیموونە - کە هەر دوکمان هاوسەری حەزرەت بووین - لەلای حەزرەت بووین لەو کاتەدا ئیبنو ئوممی مەکتوم هات بۆ خزمەتی، کە ئەو هات پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە ئێمەی فەرموو: پەردەی لێ بگرنەوە! گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! پەردە لە چی بگرینەوە! خۆ ئەمە کوێرە نەدەمان بینێ و نەدەمان ناسێ! فەرمووی: باشە خۆ ئەوا ئەو کوێرەو ئێوە نابینێ خۆ ئێوە کوێر نین، گوایە ئێوەیش ئەو نابینن! (د/ت -س/ص).

٥٢٧٥- عَنْ أَبِي أُسَيْدٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لِلنِّسَاءِ اسْتَأْخِرْنَ فَإِنَّهُ لَيْسَ لَكُنَّ أَنْ تَحْقُقْنَ الطَّرِيقَ عَلَيْكُنَّ بِحَافَاتِ الطَّرِيقِ. فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ تَلْتَصِقُ بِالْجِدَارِ حَتَّى إِنَّ ثَوْبَهَا لَيَتَعَلَّقُ بِالْجِدَارِ مِنْ لُصُوقِهَا بِهِ[٤]:

---

[٣] بسند صحيح عند الترمذي.

[٤] سكت الشارح عن درجته.

ئەبو ئوسەیدی ئەنصاری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە ژنانی دەفەرموو: کلاکەون، ئێوە نابێ لە ناو چەقو ناوەڕاستی ڕێگاوە بڕۆن، دەبێ ئێوە لە قەراخی ڕێگاوە بڕۆن فەرمووی: ئیتر لەوە دوا ژنان لە ڕێگەوبان خۆیان دەنووسان بە دیواری کۆڵانەکاندا، تەنانەت هەندێ جار ئەوەندە خۆیان دەنووسان بەدیوارەکەوە جلەکان یان دەگیرا لە گرنجی دیوارەکە. (د – خودای لێ رازی بێ).

٥٢٧٦- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُما) نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَمْشِيَ الرَّجُلَ بَيْنَ الْمَرْأَتَيْنِ. رواهما أبو داود[٥]:

ئیبنو عومەر (خۆشنوودیی خودای گەورەیان لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) ڕێگەی نەداوە کە پیاوێ لە نێوانی دوو ژندا بڕوا بەڕێدا، یالە نێوانیاندا دانیشێ یا پاڵکەوێ یا سەماو هەڵپەڕکێ بکا، یا شتێ وابکا (د – خودای لێ رازی بێ).

## ٣٠) فەرموودەیێ لەبابەتی گەرماو (حەمام)ەوە : (حديث في الحمام)

٥٢٧٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَدْخُلِ الْحَمَّامَ بِغَيْرِ إِزَارٍ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يُدْخِلْ حَلِيلَتَهُ الْحَمَّامَ وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللّٰهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلاَ يَجْلِسْ عَلَى مَائِدَةٍ يُدَارُ عَلَيْهَا بِالْخَمْرِ. رواه الترمذي والحاكم بسند حسن. نسأل الله حسن الحال آمين[١]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمووێ: ئەوەی باوەڕی تەواوی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە بابە بێ پەشتەماڵ نەچێتە ناو حەمامەوە، هەروا ئەوەی باوەڕی تەواوی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە بانەهێڵێ حەلاڵو هاوسەری بچێ بۆ حەمام، هەروا ئەوەی

---

[٥] سكت الشارح عن درجته

[١] بسند حسن.

باوەڕی تەواوی بە خوداو بە ڕۆژی دوایی هەیە نابێ دابنیشێ لەسەر ئەو مێزەی کە ئارەق و مەیی لەسەر دەگێڕن (ت / حاکم - س/ح).

## ٣١) بەشی دووەم: باسی سڵاو (سەلام)

## الفصل الثاني: في السلام

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذَا حُيِّيْتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّواْ بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا - سورة نيساء - ٨٦/٤}

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: هەر کاتێ سڵاوتان لێ کرا ئێوەش وەڵامی ئەو سڵاوە بە جوانتر لە خۆی بدەنەوە، یا هەر هیچ نەبێ وەکوو خۆی وەڵامی بدەنەوە، دڵنیابن کە خودا لەسەر هەموو شتێ نیگابانەو لە کەم و لە زۆر لێتان دەپرسێتەوە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَلَقَدْ جَاءتْ رُسُلُنَا إِبْرَاهِيمَ بِالْبُشْرَى قَالُواْ سَلاَمًا قَالَ سَلاَمٌ فَمَا لَبِثَ أَن جَاء بِعِجْلٍ حَنِيذٍ) هورد - ١١/-٦ }.

واتە: خوای گەورە دەفەرموێ: فریشتە فرستادەکانی من چوون بۆ لای ئیبراهیم، موژدەیان بۆ برد کە سارە خاتوونی خێزانی کوڕێکی دەبێ، کاتێ گەیشتنە بەرەوە سڵاویان لە ئیبراهیم کردو فەرموویان: (سڵاوی خودات لێ بێ)، ئەویش زۆر بە گەرمی وەڵامی سڵاوی سەندنەوە ئەوجا گورج، ڕۆیشت گوێرەکەیەکی قەڵەوی لەسەر تاتەبەرد برژاوی بۆ هێنان و لە بەردەمیاندا دایناو فەرمووی لێ کردن و فەرمووی دەی بیسمیلا بخۆن!

وَقَالَ تَعَالَى: {لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ سَلَامٌ قَوْلًا مِن رَّبٍ رَّحِيمٍ - صَدَقَ اللهُ العَظِيم - سورة ياسين - ٥٦/٣٦ }.

واتە: بەهەشتی یەکان لە بەهەشتا هەموو جۆرە میوەیەکیان هەیە، هەموو داوایەکیان جێ بە جێ دەکرێ، خودا خۆی بە زمانی پیرۆزی خۆی بۆ ڕێزلێنانیان سڵاویان لێ دەکاو دەفەرموێ: پێیان: سڵاو لە ئێوە.

٥٢٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَفَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ. رواه أبو داود والترمذي ومسلم[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ) بەو كەسە كە گیانی منی بەدەسە، كە دیارە ئەو كەسە خودای گەورەیە، تا ئیمانو باوەڕ نەهێنن دوو پێتان ناچێتە بەهەشت، تا یەكتریشتان خۆش نەوێ مەعنای وایەكە ئیمانتان نەهێناوە! جا با پێشتان بڵێم كە بە كردنی چی یەكتریتان خۆش دەوێ: لە ناو خۆتاندا سڵاوكردن بكەن بەباو (د/ت/م).

٥٢٧٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ. فَرَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ ثُمَّ جَلَسَ فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ) عَشْرٌ، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّهِ. فَرَدَّ عَلَيْهِ فَجَلَسَ فَقَالَ: عِشْرُونَ. ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّهِ وَبَرَكَاتُهُ. فَرَدَّ عَلَيْهِ فَجَلَسَ فَقَالَ: ثَلاَثُونَ[٢]:

عیمرانی كوڕی حوصەین (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گوتی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی دایەوە، پیاوەكە لە خزمەتیدا دانیشت، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم پیاوە لە پاداشی سڵاوەكەیدا دە چاكەی بۆ هەیە لە پاشدا پیاوێكی تر هات گوتی: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّهِ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی دایەوە،ئەوجا پیاوەكە لە خزمەتیدا دانیشت، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم پیاوەش لە پاداشی سڵاوەكەیدا

---

[١] مسلم. إیمان: ١٩٢. ابن ماجه، مقدمه: ٦٨. ریاض/٢/٣١٣ رقم: ٨٤٨/٤.

[٢] ریاض/٢ ل- ٣١٦ رقم/٨٥١/١ تسلسل/ ١٣٢ = أبو داود: ٥١٩٥. ترمذیی: ٢٦٩٠. قال النووی: رواه أبو داودوالترمذي وقال: حدیث حسن.

بیست چاکەی بۆ نووسرا، لە پاشدا پیاوێکی تریش هات گوتی: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ: سلاّوو رەحمەتو پیتو فەڕەکانی خوداتان لێ بێ. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەلاّمی سلاّوەکەی دایەوە، ئەوجا پیاوەکە دانیشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم پیاوەیش لەپاداشی سلاّوەکەیدا سیی چاکەی بۆ هەیە. (د/ت-س/ص).

٥٢٨٠- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِاللّٰهِ تَعَالَى مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلاَمِ. رواهما أبو داود والترمذي[٣]:

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شایانترین کەس بە چاودێری خودای گەورە ئەو کەسەیە کەلە پێشدا سلاّو لە خەڵك دەکا (د/ت – س/ح).

٥٢٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اعْبُدُوا الرَّحْمَنَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَأَفْشُوا السَّلاَمَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلاَمٍ. رواه الترمذي بسند حسن والله أعلم[٤]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەندەیی خودای میهرەبان بکەنو سلاّو بلاّو بکەنەوە، ئیتر بە خۆشی دەچنە ناو بەهەشتێ! (ت – س/ح).

## ٣٢) لە پێشدا سلاّوکردن ئنجا قسەکردن
## السلام قبل الكلام والسَّلامُ على الأهلِ

٥٢٨٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: السَّلاَمُ قَبْلَ الْكَلاَمِ.[١]:

---

[٣] بسند حسن (شرحه).
[٤] بسند حسن (شرحه).
[١] سند ضعيف (شرحه).

جابیر (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): لە پێشدا سڵاو ئەوجا قسەی ئاسایی (ت – سند ضعیف).

٥٢٨٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَدْعُوا أَحَدًا إِلَى الطَّعَامِ حَتَّى يُسَلِّمَ. رواهما الترمذي بسند واحد[٢]:

دیسان جابیر (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): کەس خوڵك مەکەن بۆ سەر نان هەتا سڵاو نەکا (ت – س/ ضعیف).

٥٢٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُسَلِّمُ الرَّاكِبُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ. رواه الأربعة[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): باسوار سڵاو لە پیادە بکا، پیادەیش سڵاو لە دانیشتوو بکا، هەروەها با کەم سڵاو لە کۆمەڵی زۆر بکاو بچووك لە گەورە! (ش/د/ت) ئەگەر سڵاو کردن بە پێچەوانەیشەوە بێ دروستە. (وەرگێڕ)

### ٣٣) سڵاو لە کەسوکار : (السَّلامُ عَلَى الأهْلِ)

٥٢٨٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا بُنَيَّ إِذَا دَخَلْتَ عَلَى أَهْلِكَ فَسَلِّمْ يَكُونُ بَرَكَةً عَلَيْكَ وَعَلَى أَهْلِ بَيْتِكَ. رواه الترمذي بسند حسن. نسأل الله حسن الحال آمين[١]:

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێم: ڕۆڵەکەم! کاتێ دەچێتەوە بۆ ماڵەوە کە چوویتە ژوورەوە سڵاو لە کەسوکارەکەت بکە، ئەو سڵاوە دەبێ بە مایەی پیتو فەرو بەرەکەتو پیرۆزیی، چ بۆ تۆ وەچ بۆ ئەوان! (ت – س/ح).

---

[٢] بسند ضعيف (شرحه).

[٣] تجريد البخاري: ٢٣٢/٥ رقم/ ١٩٦٤ = ٦٢٣١، ٦٢٣٢، ٦٢٣٤ فتح الباري. مسلم. سلام: ٥٦١١. ابو داود. أدب: ١٩٩ تحفة الأشراف: ١٢٢٢٦.

[١] حسن عند الترمذي.

## ٣٤) سڵاوكردن لە منداڵانو لە ژنان سوننەتە
## السلام على الصبيان والنساء

٥٢٨٦- عَنْ سَيَّارٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ فَمَرَّ بِصِبْيَان فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. وَقَالَ: كُنْت أَمْشِي مَعَ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) فَمَرَّ بِصِبْيَان فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. وَحَدَّثَ أَنَسٌ أَنَّهُ كَانَ يَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَرَّ بِصِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. رواه الخمسة[1]:

سەییار (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ لەگەڵ ثابیتی بونانیدا دەڕۆیشتم، لەلای تاقمێ منداڵەوە ڕەت بوو، سڵاوی لێ كردنو فەرمووی: جارێ لەگەڵ ئەنەسدا دەڕۆیشتم لەلای تاقمێ منداڵەوە ڕەت بوو، سڵاوی لێ كردنو، فەرمووی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەربێ) دەڕۆیشتم، لە لای تاقمێ منداڵەوە ڕەت بوو سڵاوی لێ كردن (ش/د/ت/ن- خودایان لێ رازی بێ).

٥٢٨٧- وَقَالَ أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): انْتَهَى إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) وَأَنَا غُلَامٌ فِي الْغِلْمَانِ فَسَلَّمَ عَلَيْنَا ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِي فَأَرْسَلَنِي بِرِسَالَةٍ وَقَعَدَ فِي ظِلِّ جِدَارٍ - أَوْ قَالَ إِلَى جِدَارٍ - حَتَّى رَجَعْتُ إِلَيْهِ. رواه أبو داود وابن ماجه[2]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ منداڵ بووم لە ناو منداڵاندا وازیم دەكرد، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هات تا گەیشتە لامان، ئەوجا سڵاوی لێ كردین، ئنجا دەستی منی گرت - یا گوتی گوێچكەی منی گرت - و ناردمی بۆ كارێ، خۆشی لە سێبەری دیوارێكدا دانیشت تا من هاتمەوە بۆ لای، یا گوتی: لە پاڵ دیوارێكا دانیشت تا من گەڕامەوە بۆ لای (د/ ئیبنو ماجە - س/صالح).

٥٢٨٨- قَالَتْ أَسْمَاءَ بِنْتَ يَزِيدَ (رَضِي اللهُ عَنْهَا): مَرَّ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْمَسْجِدِ يَوْمًا وَعُصْبَةٌ مِنَ النِّسَاءِ قُعُودٌ فَأَلْوَى بِيَدِهِ بِالتَّسْلِيمِ وَأَشَارَ عَبْدُ الْحَمِيدِ بِيَدِهِ. رواه الترمذي وأبو داود[3]:

---

[1] تجيد/٢٣٥/٥ رقم/ ١٩٦٨ = ٦٢٤٧. ترمذي. إستئذان: ٢٦٩٦. مسلم. آداب: ٥٦٢٩، ٥٦٣٠.

[2] بسند صالح لابن ماجه (شرحه).

ئـەسمای كـچی یەزیـد (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: ڕۆژێكیـان كۆمـەڵێ ئـافرەت بـووین، لـە مزگـەوت دانیـشتبوین، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەربێ) لـە لامانـەوە رەت بـوو، بەدەسـتی سـڵاوی لێ كـردین (ت – س/ح–د) گفتـەی (د) ئاوایە: چەن ژنێ بووین پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بـە سـەرماندا رەت بـوو، سڵاوی لێ كردین.

## ٣٥) ڕاگەیاندنی سڵاو : (تبليغ السلام)

٥٢٨٩- ← (ب – ٥ ز – ٣٧ ل – ١٥٤ ف – ٤)[١].

٥٢٩٠- عَنْ غَالِبٍ (رَضِي اللهُ عَنـهُ) قَالَ: إِنَّا لَجُلُوسٌ بِبَابِ الْحَسَنِ (رَضِي اللّـهُ عَنـهُ) إِذْ جَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ جَدِّي قَالَ: بَعَثَنِي أَبِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ائْتِهِ فَأَقْرِئْهُ السَّلاَمَ. قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: إِنَّ أَبِي يُقْرِئُكَ السَّلاَمَ. فَقَالَ: عَلَيْكَ وَعَلَى أَبِيكَ السَّلاَمُ. رواه أبو داود. نسأل الله التوفيق لما يحبه ويرضاه آمين[٢]:

غالیب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ لەبەر دەرگاكەی حەسەن (خودای لێ رازی بێ) دانیشتبووین، لە ناكاو پیاوێ هات ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە گوتی: باوكم بۆ یگێڕامـەوە لـە باپیرمـەوە فـەرمووی: بـاوكم نـاردمی بـۆ لای پێغەمبـەر (درودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی پـێم: بـڕۆرە لای عـەرزی بكـە، بـاوكم عـەرزی سڵاوی هەیە، منیش ڕۆیشتمە خزمەتیو عەرزیم كرد: باوكم سڵاوت لێ دەكا. فەرمووی: سڵاو لە خۆشتو لە باوكیشت (د).

## ٣٦) ئەوەی لە سڵاو كردندا ناپەسەندە : (ما يكره في السلام)

٥٢٩١- عَنْ أَبِي جُرَىٍّ الْهُجَيْمِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: عَلَيْكَ السَّلاَمُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ: لاَ تَقُلْ عَلَيْـكَ الـسَّلاَمُ فَـإِنَّ عَلَيْـكَ

---

(٢) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(١) تقدم فى مجلد خامس. تسلسل/ ٣٧ رقم/ ٣٤٣٤/٤.

(٢) بسند صحيح (شرحه).

السَّلَامُ تَحِيَّةُ الْمَوْتَى. رواه أصحاب السنن. وزاد الترمذي: ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيَّ فَقَالَ: إِذَا لَقِيَ الرَّجُلُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ فَلْيَقُلِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ[1]:

ئەبو جورەیی هوجەیمی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: چوومە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گوتم: عَلَيْكَ السَّلَامُ، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: مەڵێ: عەلەیکە سەلام، چونکە عەلەیکە سەلام سڵاوی لە مردووەکان پێ دەکرێ (د/ت/ن – س/ص).

تیرمیذی ئەمەیشی لێ پتر کردووە: ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ڕووی تێ کردمو فەرمووی: کاتێ موسوڵمان بەبرای موسوڵمانی دەگات بابڵێت: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ: سەلامو ڕەحمەتی خوداتان لەسەربێ: سڵاوو ڕەحمەتی خوداتان لەسەربێ: دروودو میهرەبانیی خوداتان لێ بێ.

٥٢٩٢- وَقَالَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) سَلَّم رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَبُولُ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ. رواه الترمذي وأبو داود[2]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) گمێزی دەکرد، لەو کاتەدا پیاوێ سڵاوی لێی کرد، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە (ت – س/ص).

٥٢٩٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ) قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ تَشَبَّهَ بِغَيْرِنَا لَا تَشَبَّهُوا بِالْيَهُودِ وَلَا بِالنَّصَارَى فَإِنَّ تَسْلِيمَ الْيَهُودِ الإِشَارَةُ بِالأَصَابِعِ وَتَسْلِيمَ النَّصَارَى الإِشَارَةُ بِالأَكُفِّ. رواه الترمذي بسند ضعيف[3]:

لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی چاو لە بێگانە بکا لە ئێمە نییە، کەوایە نەلاسایی جوولەکەو نەلاسایی گاور مەکەنەوە، بشزانن کە

---

[1] بسند صحيح (شرحه).

[2] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[3] بسند ضعيف.

سڵاو كردنی جوو ئاماژە كردنە بە پەنجە، وەسڵاوكردنی گاور ئاماژە كردنە بەلەپ! (ت – س/چ).

## ٣٧) سڵاوكردن لە خاوەن نامەكان (أهل الكتاب) : (السلام على أهل الكتاب)

٥٢٩٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَبْدَءُوا الْيَهُودَ وَلاَ النَّصَارَى بِالسَّلاَمِ فَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي طَرِيقٍ فَاضْطَرُّوهُ إِلَى أَضْيَقِهِ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەری خۆشەویست و نازدارەوە (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) دەفەرموێ: ئێوە لە پێشدا سڵاو لە جوولەكەو گاور مەكەن، ئەگەر لە رێگەیش تووشی یەكێكیان بوونو رێگەكە تەنگەبەر بوو ئەوا ناچاری بكەن كە ئەو بكەوێتە تەنگەبەریی یەكەوە (م/د/ت).

٥٢٩٥– وَقَالَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَهُ: يَا رَسُولُ اللهِ إِنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ يُسَلِّمُونَ عَلَيْنَا فَكَيْفَ نَرُدُّ عَلَيْهِمْ قَالَ: قُولُوا: وَعَلَيْكُمْ. رواه مسلم وأبو داود[2]:

هەندێ لە یارانی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خاوەن نامەكان واتە: ئەهلی كیتاب، كە ئەو میللەتانەن كە پەیڕەوی پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەكان دەكەن، وەك گاورو جوولەكە، خاوەن نامەكان سڵاومان لێ دەكەن چۆن سڵاوەكەیان بسەندینەوە؟ فەرمووی: ئێوەیش بڵێن: لە ئێوەیش (م/د).

٥٢٩٦– ← (ب – ٧ ز – ٤١ ل – ١٨٣ ف – ٢)[3].

---

(١) مسلم. آداب: ٥٦٢٦. ترمذي. سيد: ١٦٠٢، ٢٦٨٩ تحفة الأشراف: ١٢٧٠٤.

(٢) مسلم. آداب: ٥٦١٨. أبو داود. أدب: ٥٢٠٧ تحفة الأشراف: ١٢٦٠

(٣) تقدم في مجلد سابع. تسلسل/ ٤١ رقم/٢/٤١١٩.

٥٢٩٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: دَخَلَ رَهْطٌ مِنَ الْيَهُودِ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: السَّامُ عَلَيْكَ.فَفَهِمْتُهَا فَقُلْتُ: عَلَيْكُمُ السَّامُ وَاللَّعْنَةُ.فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَهْلاً يَا عَائِشَةُ، فَإِنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كُلِّهِ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا؟ قَالَ: فَقَدْ قُلْتُ وَعَلَيْكُمْ. رواه الشيخان والترمذي وفي رواية لمسلم: فَسَمِعَتْ عائشة فسبَّتهم فَقَالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مه يا عائشة، فَإِنَّ اللّٰهَ لاَ يُحِبُّ الْفُحْشَ وَلاَ التَّفَحُّشَ فَأَنْزَل اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: (واذا جاءوك حيوك بما لم يُحيك به الله) الأية[٤]:

عائیشه (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: تاقمێ جوو هاتن بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە هاتن لە باتی سلاو گوتیان: السام علیك: مردن بۆ تۆ! منیش تێی گەیشتمو گوتم: علیکم السام واللعنة: مەرگ بۆ ئێوە لەگەڵ نەفرەت و لە عنەتدا. پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عائیشە! هێواش هێواش لەسەرە خۆبە، لەڕاستیدا خودا نەرمیو نەرمونیانی لە هەموو شتێكدا پێ خۆشە! منیش گوتم: ئاخر ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ گوێت لێ نەبوو کە گوتیان چی؟ فەرمووی: ئاخر منیش گوتم: وعلیکم: بۆ ئێوەش! (ش/ت) لە گێڕانەوەیەكی موسلیمدا (خودای لێ ڕازی بێ): عائیشە گوێی لێ دەبێ جنێویان پێ دەدا، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: مەکە، ئەی عائیشە! چونکی خودا حەز لە هەرزەگۆیی وهەرزە بلێیی ناکا. جا خودای گەورەو سەروەر ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: واذا جاؤوك حیوك بما لم یحیك به الله: (ب – ٧ ز – ٤١ ل – ١٨٣ چاپی/١ ف – ٢).

٥٢٩٨- عَنْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرَّ بِمَجْلِسٍ وَفِيهِ أَخْلاَطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ. رواه البخاري والترمذي. نسأل الله التوفيق لما يحب ويرضى آمين[٥]:

---

[٤] تجرید/٣/٣٢٨ رقم/١٢٠٥ = ٢٩٣٥، ٦٠٢٤، ٦٠٣٠، ٦٢٥٦، ٦٣٩٥، ٦٤٠١، ٦٩٢٧. مسلم. آداب: ٥٦٢١. ترمذي. إستئذان: ٢٧٠١ تحفة الأشراف: ١٦٤٣٧.

[٥] بخاری. إستئذان: ٦٢٥٤.

ئوسامەی کوڕی زەید (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەلای کۆڕێکی دانیشتندا ڕۆیشت، کۆڕەکە تێکەڵ بوو لە موسوڵمانو لە جوولەکە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سڵاوی لێ کردن (ب/ت).

## ٣٨) حوکمی سڵاوکردنو حوکمی وەڵامی سڵاو : (حكم السلام ورده)

٥٢٩٩- ← (ب - ١ ز - ٢٠٠ ل - ٥٣٨ ف - ١)[1].

٥٣٠٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُجْزِئُ عَنِ الْجَمَاعَةِ إِذَا مَرُّوا أَنْ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمْ وَيُجْزِئُ عَنِ الْجُلُوسِ أَنْ يَرُدَّ أَحَدُهُمْ. رواه أبو داود[2]:

عەلی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لە شوێنێکەوە بڕۆن ئەگەر یەکێکیان سڵاو بکا برێتی ئەوانی تریش دەکەوێ، دانیشتوانیش ئەگەر یەکێکیان وەڵامی سڵاو بداتەوە برێتی ئەوانی دیکەیش دەکەوێ (د - س/ صالح).

٥٣٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَجْلِسِ فَلْيُسَلِّمْ فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَقُومَ فَلْيُسَلِّمْ فَلَيْسَتِ الأُولَى بِأَحَقَّ مِنَ الآخِرَةِ. رواه أصحاب السنن[3]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ کەسێ لە ئێوە دەگاتە ناو کۆڕی دانیشتن باسڵاو بکا، هەروەها کاتێ دەیەوێ بڕوا با دیسان سڵاو بکاتەوە، چونکە سڵاوی جاری یەکەم لە سڵاوی جاری دووەم بەجێتر نییە! (د/ت/ن - س/ح).

---

[1] تقدم مجلد اول. تسلسل/ ٢٠٠ رقم/١/١٠٥٢.

[2] بسند صالح (شرحه).

[3] بسند حسن (شرحه).

**٣٩) سلاو ناكرێ لە دەستەی ئارەزوو پەرست: (لاسلام على أهل الأهواء)**

٥٣٠٢- عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تُسَلِّمُوا عَلَى مَنْ يَشْرَبُ الْخَمْرِ وَلاَ تعودوهم إذا مرضوا ولا تصلوا عليهم اذا مَاتوا. رواه سعيد بن منصور هكذا والبخاري موقوفا ولكن وصله في الأدب. وسبق في تفسير سورة التوبة قول كعب بن مالك (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) لما تخلّف عن تبوك: ونهى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) المسلمين عن كلامنا[1]:

لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە (خودایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: سلاو مەكەن لە ئارە قخۆرو كە نەخۆشیش كەوتن سەریان لێ مەدەنو كەمردیشن نوێژیان لەسەر مەكەن! (بوخاری).

٥٣٠٣- ← (ب – ٦ ز – ١٠ ل – ٢١٦ ف – ٢٤)[2].

٥٣٠٤- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى أَهْلِي وَقَدْ تَشَقَّقَتْ يَدَايَ فَخَلَّقُونِي بِزَعْفَرَانٍ فَغَدَوْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ وَقَالَ: اذْهَبْ فَاغْسِلْ هَذَا عَنْكَ. رواه أبو داود في السنة[3]:

عەمماری كوڕی یاسیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەسەفەر گەڕامەوە دەستەكانم تەرەكیبوون، لەماڵەوە گوڵاوی زەعفەرانیان بۆم تێ گرت، كە جۆرە بۆنێكی تایبەتی یە بە ژنان، بۆ بەیانی كە چووم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) سلاوم لێ كرد، كەچی وەلامی نەدامەوە، وە فەرمووی: بڕۆ ئەم بۆنە ژنانەیە لە دەستت داشۆرە (د – س/صالح).

٥٣٠٥- وَمَرَّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ عَلَيْهِ ثَوْبَانِ أَحْمَرَانِ فَسَلَّمَ عَلَي النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ. رواه أبو داود والترمذي في اللباس[4]:

---

[1] بخاری. إستئذان: ٦٢٥٥. رواه موقوفاً على عبد الله بن عمرو قبل الرقم/ ٦٢٥٥ مباشرة.

[2] تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/ ١٠ ل- ٢١٦ رقم/ ٢٤/٣٩١٥.

[3] بسند صالح لأبی داود.

[4] بسند حسن لأبی داود (شرحه).

پیاوێ لەلای پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) ڕەت بوو، دوو پارچە جلی سووری لە بەردا بوو،کابرا سڵاوی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە! (ت– س/ح).

٤٠) نووسینو دەستوورەکانی نووسین : (الكتابة وآدابها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى:{اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ.عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ} – سورة علق – ٩٦/٣–٥ }.

واتە: بخوێنەو بزانەکە (خودای تۆ خودایەکی وایە کە میهرەبانیو بەخششی لە هەموو کەسێ پترترە، ئەو خودایە بە هۆی نووسینەوە بە خامە زانیاری پیشانی ئادەمیزاد داوەو ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیون.

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: منبئا عن كتاب سليمان – عليه السلام – لبلقيس ملكة سبإ {إِنَّهُ مِن سُلَيْمَانَ وَإِنَّهُ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، أَلَّا تَعْلُوا عَلَيَّ وَأْتُونِي مُسْلِمِينَ – سورة النمل – ٢٧/٣٠–٣١}.

واتە: بەلقیس، کەشاژنی وڵاتی سەبەء بوو، نامەکەی سولەیمانی خوێندەوە، لە پاشدا فەرمانی دا پیاو ماقووڵانی بەرزی بارەگا گرد بوونەوەو پێی گوتن:نامەیەکم بۆ هاتووە، نامەیەکی مۆرکراوی پیرۆزەو تیادا نووسراوە: ئەم کاغەزە لە لایەنی سولەیمانەوە نێرراوەو پیرۆزی دەکەین بەناوی خودای بە خشندەی میهرەبانو مەبەستمان لە نامەکە ئەمەیە: کە خۆتان بە زل مەگرن دەمارنەتان گرێو بێن بۆ لامانو دڵسۆزی دەربڕنو فەرمانبەری بگرنە گەردنو موسوڵمان بن.

٥٣٠٦– حەدیسی پیاوێ (لە نەوەی ئیسرائیل) هەزار دیناری زێڕ لە پیاوێ قەرز دەکا، لە پێشەوە رابوورد لەم شوێنەدا ئەو منداڵانەی کەلە ناو بێشکەدا قسەیان کردوە. فەرموودەی سێیەم[1].

---

[1] تقدم فی مجلد عاشر. تسلسل/ ٢٣ رقم/ ٣/٥٢٤٣.

٥٣٠٧- ← (ب – ٦ ز – ٤ ل – ٦٧ ف – ٧). داستانەكەی ئەبو سوفیانو هەرقەلی قەیصەری رووم[٢].

٥٣٠٨- عن زيد بن ثابت (رَضِي اللهُ عَنهُ) قال: دخلت على رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وبين يديه كاتب فسمعته يقول: ضع القلم على أذنك فإنه أذكر للمملي. رواه الترمذي[٣]:

زەید كوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ چووم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) نووسەرێ لەبەر دەستیدا بوو، گوێم لێ بوو دەیفەرمووپێی: قەڵەمەكە لەسەر گوێچكەت دانێ، چونكە ئەوە بیرو هۆشی نووسەر تیژتر دەكا (ت – س/ ضعيف).

٥٣٠٩- ← (ب – ٤ ز – ٣٥ ل – ١١٧ ف – ٤)[٤].

گێڕانەوەی ئەگرە ئەمەی پترە: دەڵێی هەر لەبەر چاومە كە چۆن لە لەپیدا سپێتی یەكەی دەچریسكایەوە (ت).

## ٤١) ئەوەی زمانی گەلێ فێربێ لە شەڕیان دڵنیا دەبێ:
## من تعلم لغة قوم أمن من شرهم

٥٣١٠- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) أَنْ أَتَعَلَّمَ لَهُ كِتَابَ يَهُودَ. قَالَ: إِنِّي وَاللَّهِ مَا آمَنُ يَهُودَ عَلَى كِتَابٍ. قَالَ: فَمَا مَرَّ بِي نِصْفُ شَهْرٍ حَتَّى تَعَلَّمْتُهُ لَهُ، فَلَمَّا تَعَلَّمْتُهُ كَانَ إِذَا كَتَبَ إِلَى يَهُودَ كَتَبْتُ إِلَيْهِمْ وَإِذَا كَتَبُوا إِلَيْهِ قَرَأْتُ لَهُ كِتَابَهُمْ. رواه الترمذي بسند صحيح والله أعلى وأعلم[١]:

---

[٢] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ٤ رقم/٧/٣٧٦٠.

[٣] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

[٤] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ٣٥ رقم/٤/٢٨١٢.

[١] بسند صحيح.

زەیدی کوڕی ثابیت (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردم کە فێری زمانو نووسینی جوولەکەکان ببم بۆی، فەرمووی: بە خودا بۆ نووسین لە جوولەکە هیچ ئەمین نیم. زەید فەرمووی: جانیومانگی نەبرد کە فێری بووم بۆی، ئیتر لەوە دوا وا فێر بووم کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نامەی بۆ جوولەکەکان دەنوسی من بۆیم دەنووسی، کە ئەوانیش نامەیان بۆ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەنووسی من دەیم خوێندەوە بۆی (ت – س/ص).

## ٤٢) بەشی سێیەم: ڕۆژ باشی کردنو چاکو چۆنی گەلێ جۆری هەیە. یەکێکیان هەڵسانە لەبەر پیاوی باشو خاوەن پایە

## الفصل الثالث: في أنواع التحية منها القيام لأهل الفضل

٥٣١١- ← (ب – ٥ ز – ٤٥ ل -١٧٥ ف – ٤)[1]:

لێرەدا گفتەی ئەبو داوود ئاوایە: سەعد (خودای لێ رازی بێ) بەسواریی کەرێکی سپی هات، کە نزیکەوە بوو لە نوێژگاکە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەیاریدەرانی فەرموو: هەڵسن لەبەر ئاغاکەتان!

٢- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا): مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَـانَ أَشْبَهَ سمتـا ودلاً وهـديا بِرَسُولِ اللّٰهِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) مِنْ فَاطِمَةَ كرَّم اللهِ وجهَهَا فَكَانَتْ إِذَا دَخَلَتْ عَلَيْهِ رَحَّبَ بِهَا وَقَامَ إِلَيْهَا فَأَخَذَ بِيَدِهَا فَقبَّلَهَا وَأَجْلَسَهَا فِي مَجْلِسِهِ وَكَانَ إِذَا دَخَلَ عَلَيْهَا قَامَـتْ اليـه فَأَخَذَتْ بِيَدِهِ فَقَبَّلَتْهُ وأجلسته في مجلسها. رواه أصحاب السنن[2]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کەسی ترم نەدیوە کە وەك فاطیمە ( خودا ڕوو سووری کا: كرَّم اللهِ وجهَهَا) بە شێوەو سەلاریو سەنگینیو ڕەفتار بەرزی ئاوا دەق لە پێغەمبەر بچێ (دروودی خودای لەسەربێ) لەم لایەنانەوە کوتومت

---

(١) تقدم في مجلد خامس. تسلسل/ ٤٥ ل- ١٧٥ رقم/٤/٣٤٦٩.

(٢) بسند حسن (شرحه).

دەتگوت پێغەمبەر خۆیەتی (دروودی خودای لەسەربێ): هەموو جا رێ کە فاتیمە دەچوو بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەری هەڵ دەساو دەستی دەگرتو ناو چەوانی یاسەری ماچ دەکردو لە جێگە دانیشتنەکەی خۆیدا دایدەنیشاند، کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) دەچوو بۆ لای فاتیمە، ئەویش لەبەری هەڵ دەستاو دەستی دەگرتو ماچی دەکردو لە شوێنەکەی خۆیدا دای دەنا (د/ت/ن – س/ح).

٥٣١٣- عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجَ مُعَاوِيَةُ عَلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ وَابْنِ عَامِرٍ فَقَامَ ابْنُ عَامِرٍ وَجَلَسَ ابْنُ الزُّبَيْرِ فَقَالَ مُعَاوِيَةُ لابْنِ عَامِرٍ: اجْلِسْ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَمْثُلَ لَهُ الرِّجَالُ قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. رواه أبو داود والترمذي ولفظه: مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتَمَثَّلَ لَهُ الرِّجَالُ قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ[٣]:

ئەبو میجلەز (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: موعاوییە هاتە دەرەوە، گەیشتە کن ئیبنو زوبەیرو ئیبنو عامیر دانیشتبوون، ئیبنو عامیر لەبەری هەڵسا، بەڵام ئیبنو زوبەیر لەبەری هەڵ نەسا، موعاوییە بە ئیبنو عامیری گوت: دانیشە، چونکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم گوێ لێ بوو دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): ئەوەی کە حەزدەکا کە پیاوان لە خزمەتیا بە پێوە رابوەستن ئەوە شوێنی خۆی لە دۆزەخ دا خۆش دەکا (د/ت – س/ح) گفتەی (ت): ئەو کەسەی شادمانە بەوە کە پیاو گەل لەبەری هەڵسن باجێ قنگی خۆی لە ئاگردا خۆش بکا!

٥٣١٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتَوَكِّئًا عَلَى عَصًا فَقُمْنَا إِلَيْهِ فَقَالَ: لاَ تَقُومُوا كَمَا تَقُومُ الأَعَاجِمُ يُعَظِّمُ بَعْضُهَا بَعْضًا. رواه أبو داود وابن ماجه[٤]:

---

[٣] بسند حسن (شرحه).

[٤] بسند ضعيف (شرحه).

ئەبو ئومامە (خودای لێ رازی بێ) فەرموی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هاتە دەرەوە بۆ ناومان، بە گۆچان دەڕۆیی، ئێمەیش لەبەری هەڵساین، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): هەڵ مەسن، وەك بێگانەكان مەكەن كە بۆ ڕێزو قەدر گرتن لەبەر یەكتری هەڵ دەستن! (د/ ئیبنو ماجە – س/ ضعیف).

٥٣١٥– عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهِيَتِهِ لِذَلِكَ. رواه الترمذي بسند صحيح. نسأل الله الصحة في القول والعمل آمين[٥]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: كەس وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوا خۆشەویستو نازدار نەبوو لەلای یارانی، لەگەڵ ئەوەیش دا كە تەشریفی دەهات بۆ ناویان لەبەری هەڵ نەدەستان، چونكە سوور دەیانزانی كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ئەوەی پێ ناخۆشە! (ت–س/ص).

## ٤٣) یەكێكی تریان: هەموو كەسێ بە پێی پایەو پلەی خۆی قەدرو ڕێزی لێدەگیرێ : (ومنها إنزال الناس منازلهم)

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {وَهُوَ الَّذِي جَعَلَكُمْ خَلاَئِفَ الأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ الْعِقَابِ وَإِنَّهُ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ – سورة أنعام – ١٦٥/٦}.

واتە: خودا ئەو خودایەیە كەئێوەی كردووە بە جێ نشینی یەكتری لەسەر رووی زەوی، ئەم چینە دەڕوا چینێ تر لە جێگەی دادەنیشێ، یا میللەتێ دەفەوتێو میللەتێ تر بە جێگەیان شاد دەبن، هەروەها بە چەند قات پایەو پلەی بازێكتانی بەرزتر كردۆتەوە لە پایەو پلەی بازێكی ترتان، بۆ ئەوە كە بەمە تاقیتان بكاتەوە، تا بزانێ دارا لەسەر دارایی خۆی سوپاسی خودا دەكاتو مافی خاوەن ماف بەجێ دەهێنێ یانا، یا زانا بە زانینیی خۆی كاردەكا یانا، یا هەژار لەسەر هەژاریی خۆی سەبر دەكا یانا، دڵنیابە كە

---

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

خودای تۆ ئەگەر خواستی لەسەر بێ بە گورجی تۆڵە دەستێنێ، ئاشكرایشە كە خودا تاوانپۆشو میهرەبانە.

٥٣١٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) أَنَّهَا مَرَّ بِهَا سَائِلٌ فَأَعْطَتْهُ كِسْرَةً وَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابٌ وَهَيْئَةٌ فَأَقْعَدَتْهُ فَأَكَلَ فَقِيلَ لَهَا فِي ذَلِكَ فَقَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَنْزِلُوا النَّاسَ مَنَازِلَهُمْ. رواه أبو داود ومسلم[1]:

جارێ سواڵكەرێ هات بۆ لای عائیشە (خودای لێ رازی بێ) لە تێ نانی داپێی، پیاوێكی پۆشتەو پەرداخی بەقەلافەتیش هات بۆ لای، عائیشە داینیشان هەتا نانی خوارد،كەلەم بارەیەوە لە عائیشە پرسیار كرا، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسەی بە پێی حاڵی خۆی و بەقەد پایەو پلەو جێو رێی خۆی قەدری بگرن. (د/م).

٥٣١٧- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ إِجْلَالِ اللَّهِ إِكْرَامَ ذِي الشَّيْبَةِ الْمُسْلِمِ، وَحَامِلِ الْقُرْآنِ غَيْرِ الْغَالِي فِيهِ وَالْجَافِي عَنْهُ، وَإِكْرَامَ ذِي السُّلْطَانِ الْمُقْسِطِ. رواه أبو داود بسند حسن[2]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ رێزی موسوڵمانی پیرو قورئانخوێنی قورئان لەبەرو كاربەدەستی دادگەر بگرێ بەمەعنا رێزو قەدری خودای گەورە دەگرێ، بەمەرجێ قورئانخوێنەكە پێی لێ هەڵنەبرێو زۆر قووڵی نەكاتەوەو بەرە بەرە بێزار نەبێ لە دەوركردنەوەو قورئانخوێندنەكەی (د – س/ح).

## ٤٤) یەكێ تریان دەست لەناو دەست نان و تەوقە كردنە: (ومنها المصافحة)

٥٣١٨- وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ): عَلَّمَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) التَّشَهُّدَ، وَكَفِّي بَيْنَ كَفَّيْهِ. رواه البخاري[1]:

---

[1] ذكره مسلم تعليقاً المقدمة ص١٦ مجلد أول تحقيق الشيخ خليل مأموت شيحا

[2] بسند حسن.

ئیبنو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: دەستم لە ناو هەردوو دەستی پێغەمبەردا بوو کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) تەحیاتی فێرکردم (ب).

٥٣١٩- وَقَالَ قَتَادَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ لأَنَسٍ: أَكَانَتِ الْمُصَافَحَةُ فِي أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: نَعَمْ. رواه البخاري والترمذي[٢]:

قەتادە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: عەرزی ئەنەسم کرد: ئایا تەوقە کردن لەناو یارانی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) هەبوو؟ فەرمووی: ئا، هەبوو (ب/ت).

٥٣٢٠- عَنِ الْبَرَاءِ بن عازب (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا. رواه أبو داود والترمذي[٣]:

بەڕای کوڕی عازیب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر دوو موسوڵمانێ کە بە یەکتر دەکەن ئەگەر تەوقە بکەن، بێ گومان بەر لەوە کەلەیەکتری جیاببنەوە خودا لە هەردوکیان خۆش دەبێ. (د/ت- س/ح).

٥٣٢١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ فَتَصَافَحَا وَحَمِدَا اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَاسْتَغْفَرَاهُ غُفِرَ لَهُمَا. رواه ابو داود وابن السني[٤]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ دوو موسوڵمان بەیەکتر دەگەن تەوقە لەگەڵ یەکا بکەنو سوپاسی خودا بکەنو، داوای لێخۆشبوونی لێ بکەن، ئیتر خودا لە هەردوکیان خۆش دەبێ ( د – س/صالح – ئیبنو سوننی).

٥٣٢٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا جَاءَ أَهْلُ الْيَمَنِ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ جَاءَكُمْ أَهْلُ الْيَمَنِ وَهُمْ أَوَّلُ مَنْ جَاءَ بِالْمُصَافَحَةِ. رواه أبو داود[٥]:

---

[١] بخاری. إستئذان: ٦٢٦٥.

[٢] بخاری. استئذان: ٦٢٦٣.

[٣] بسند حسن (شرحه).

[٤] بسند صالح (شرحه).

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کاتێ خەڵکی یەمەن هاتن بۆ مەدینە بۆ خزمەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خەڵکی یەمەن هاتوون بۆ لاتان، ئەوان یەکەم کەسن کە تەوقە کردنیان داهێناوە. (د–س/ص).

٥٣٢٣– وَعَنْهُ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ مِنَّا يَلْقَى أَخَاهُ أَوْ صَدِيقَهُ أَيَنْحَنِي لَهُ؟ قَالَ: لاَ. قَالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ قَالَ: لاَ. قَالَ: أَفَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ قَالَ: نَعَم[٦]:

دیسان فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کاتێ پیاوێ لە ئێمە بەبرادەرێکی خۆی دەگا، یابە دۆستێکی خۆی دەگا، ئایا بۆی بچەمێتەوە؟ فەرمووی: نەء. گوتی: ئەی دەست بکاتە ملی و ماچی بکا؟ فەرمووی: نەء. گوتی: ئەی دەست بخاتە ناو دەستی و تەوقەی لەگەڵ دا بکا؟ فەرمووی: ئا. (ت – س/ح).

٥٣٢٤– وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اسْتَقْبَلَهُ الرَّجُلُ فَصَافَحَهُ لاَ يَنْزِعُ يَدَهُ مِنْ يَدِهِ حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ الَّذِى يَنْزِعُ وَلاَ يَصْرِفُ وَجْهَهُ عَنْ وَجْهِهِ حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ هُوَ الَّذِى يَصْرِفُهُ وَلَمْ يُرَ مُقَدِّمًا رُكْبَتَيْهِ بَيْنَ يَدَىْ جَلِيسٍ لَهُ[٧]:

دیسان فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وابوو کە پیاوێ دەچوو بە پیریەوەو تەوقەی لەگەڵ دەکرد، دەستی لە ناو دەستی کابرا دەرنەدەهێنا تا پیاوەکە دەستی خۆی لە ناو دەستی ئەو دەردەهێنا، هەروەها رووی خۆشی لاوەرنەدەگێڕا تا پیاوەکە پشتی هەڵ دەکرد، کەسیش بە چاوی خۆی پێغەمبەری نەدیوە کە قاچ درێژ بکا لە ناو مەجلیسدا (ت – س/ غريب).

٥٣٢٥– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مِنْ تَمَامِ التَّحِيَّةِ الأَخْذُ بِالْيَدِ. روى هذه الثلاثة الترمذي. نسأل اله أن يأخذ بأيدينا جميعا آمين[٨]:

---

(٥) بسند صالح (شرحه)

(٦) بسند حسن (شرحه).

(٧) بسند غريب (شرحه).

لە عەبدوڵلاوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نیشانەی ڕۆژ باشی تەواو چاکو چۆنی چاك ئەوەیە کە چاکو چۆنی کەرەکان لەگەڵ یەکدا تەوقە بکەن! (ت – س/غریب).

## ٤٥) یەکێ تریان دەست لە گەردن کردنە : (ومنها المعانقة)

٥٣٢٦- قِيلَ لأَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) هَلْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَافِحُكُمْ إِذَا لَقِيتُمُوهُ؟ قَالَ: مَا لَقِيتُهُ قَطُّ إِلاَّ صَافَحَنِي وَبَعَثَ إِلَيَّ ذَاتَ يَوْمٍ وَلَمْ أَكُنْ فِي أَهْلِي فَلَمَّا جِئْتُ أُخْبِرْتُ أَنَّهُ أَرْسَلَ إِلَيَّ فَأَتَيْتُهُ وَهُوَ عَلَى سَرِيرِهِ فَالْتَزَمَنِي فَكَانَتْ تِلْكَ أَجْوَدَ وَأَجْوَدَ. رواه أبو داود والإمام أحمد[١]:

بەئەبو ذەڕیان گوت: کاتێ کە بە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەگەیشتن ئایا تەوقەی لە گەڵتان دەکرد؟ فەرمووی: من بەش بەحاڵی خۆم هەرچەن بە خزمەتی دەگەیشتم تەوقەی لەگەڵ دەکردم، ڕۆژێ دەنێری بەدواما، من لە ماڵ نابم، کە هاتمەوە پێیان گوتم: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ناردبووی بە دواتا، جاکە چوومە خزمەتی لەسەر چارپاکەی خۆی بوو، ئەمجارە دەستی کردە ملم، بەڕاستی ئەمەیان هەر زۆر زۆر دڵگیرو خۆشتر بوو. (د/ئە – س/ صالح).

٥٣٤٧- وَقَالَتْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا): قَدِمَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) الْمَدِينَةَ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِي فَأَتَاهُ فَقَرَعَ الْبَابَ فَقَامَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عُرْيَانًا يَجُرُّ ثَوْبَهُ وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُهُ عُرْيَانًا قَبْلَهُ وَلاَ بَعْدَهُ فَاعْتَنَقَهُ وَقَبَّلَهُ. رواه الترمذي بسند حسن[٢]:

---

(٨) بسند غريب (شرحه).

(١) بسند صالح (شرحه).

(٢) سند حسن (شرحه).

عائیشه (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: زەیدی کوڕی حاریثه (خودای لێ ڕازی بێ) لە سەفەرێ گەڕایەوەو هاتەوەبۆ مەدینە، کە هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەو کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ماڵی من بوو، زەید کە هات لە دەرگاکەی دا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە زانی ئەوە زەیدە لە خۆشیاندا بەرووتی چوو بە پیریەوە، بەڵام بەدەم ڕێوە جلەکەیی لەبەر کردەوە، بەو تاقە خودایە نە لەوەپێش و نە لەوەدوا جارێکی تر وا بەرووتی پێغەمبەرم نەدیوە. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستی کردە ملی زەیدو ماچی کرد. (ت – س/ح).

**٤٦) یەکێ تریان دەستو پێ ماچ کردنە : (ومنها تقبیل الید والرجل)**

٥٣٤٨– ←(ب – ٦ ز – ٢٢ ل – ٢٨١ ف – ٢٢)[١].

٥٣٤٩– ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە ڕابورد، لە باسی ڕەوشتی جوان ڕەوشتی هەرەگەورەی خودا خۆیەتی، لە گرەدا بەهرەی پتری تیادایە: دەفەرموێ:ئوممو ئەبانی کچی واریعی کوڕی زاریع – خودایان لێ ڕازی بێ – لە زاریعی باپیریەوە دەگێڕێتەوە – کە زاریع خۆی یەکێك بووە لەدەستەی نوێنەری خێڵی عەبدولقەیس – دەڵێ: باپیرم فەرمووی: کاتێ گەیشتینە مەدینە بەپەلە پەل لە ولاخەکانمان دابەزین و خێرا چووین دەستو پێی پێغەمبەرمان ماچ کرد، وەلێ مونذیری ئەشەجج چاوە نواڕی کرد، تا بەشێنەیی چوو بەلای بوخچەکەیەوە و جلەکانی دەرهێنان و لەبەری کردن، ئەوجا لەسەرەخۆ هات بۆ کن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو، تا کۆتایی فەرموو دەکە کەلە پێشەوە ڕابورد لە باسی: (حسن الخلق خلق الله العظیم)[٢].

---

(١) تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/ ٢٢ ل- ٢٨١ رقم/ ٣٩٧٢/٢٢.

(٢) تقدم فی مجلد تاسع. تسلسل/ ٤٠ ل- ١٠٣ رقم/ ٤٨٨٨/١١.

## ٤٧) یەکێ تریان ماچ کردنی لەش و نێو چاوانە
## ومنها قبلة الجسد وبين العينين

٥٣٥٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) كَانَ أُسَيْدِ بْنِ حُضَيْرٍ الأَنْصَارِيُّ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ وَيُضْحِكُهُمْ لِمِزَاحٍ كَانَ فِيه فَطَعَنَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي خَاصِرَتِهِ بِعُودٍ فَقَالَ: أَصْبِرْنِي يَا رَسُولِ اللهِ قَالَ: اصْطَبِرْ. قَالَ: إِنَّ عَلَيْكَ قَمِيصًا وَلَيْسَ عَلَيَّ قَمِيصٌ. فَرَفَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ قَمِيصِهِ فَاحْتَضَنَهُ وَجَعَلَ يُقَبِّلُ كَشْحَهُ وَقَالَ إِنَّمَا أَرَدْتُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ[1]:

عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئوسەیدی کوڕی حوضەیری ئەنصاری پیاوێکی گاڵتەچی بوو، هەندێ جار بە قسەی خۆش یارانی دەکردە پێکەنین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دارێکی ژەند بە کەلەکەیدا، ئوسەید فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆتم بۆ بگرە باهەقی خۆمت لێ بکەمەوە! فەرمووی: وا خۆم گرتووە دەی هەقی خۆتم لێ بکەرەوە! ئوسەید فەرمووی: قوربان! ئاخر من کراسم لەبەردا نەبوو، لەو کاتەدا قەبرغەم رووت بوو، بەڵام تۆ کراست لەبەردایە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) کراسەکەی خۆی هەڵماڵی، هەتا ئوسەید بە رووتی دارەکەی تێوە ژەندێتەوە، ئوسەیدیش باوەشی کرد بە پێغەمبەرداوقەبرخەی ماچ کردو گوتی: مەبەستم بەس ئەمە بوو کە جەستەی موبارەکی تۆ ماچ بکەم، ئەگینا مەبەستم تۆڵە سەندنەوە نەبوو، ئەی پێغەمبەری خودا! (د-س/صالح).

٥٣٥١- عَنِ الشَّعْبِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَلَقَّى جَعْفَرَ بْنَ أَبِي طَالِبٍ فَالْتَزَمَهُ وَقَبَّلَ مَا بَيْنَ عَيْنَيْهِ. رواهما أبو داود. نسأل الله حسن القبول آمين[2]:

شەعبی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەچێ بە پیر جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[2] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

پێـی دەگـا دەسـت دەكاتـە ملـیو نێـوانی هـەر دوو چـاوی مـاچ دەكـا (د-س/صالح).

## ٤٨) یەكێ تریان مەرحەبا لێ كردنو بە خێر هاتنە : (ومنها مرحبا بفلان)

٥٣٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهَا) قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِفَاطِمَـةَ - عَلَيْهَا السَّلاَمُ - مَرْحَبًا بِابْنَتِي:

عائیـشە (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فەرمووی: بە فاطیمەی كچی - (سلاوی خودای لێ بێ) مەرحەبا لە كچی خۆم (ب/ت)

٥٣٥٣- وَقالت أم هانيء (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ): جئت النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فقـال: مرحبا يا أمَّ هانيء. رواهما البخاري والترمذي[٢]:

ئوممـو هـانی (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: جـارێ چـووم بـۆ خزمـەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئوممو هانی! مەرحەبا: خۆشهاتی: بە خێر بێیت. (ب/ت).

٥٣٥٤- وَقَالَ عِكْرِمَةَ بْنِ أَبِي جَهْلٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ): جِئْتُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَرْحَبًا بِالرَّاكِبِ الْمُهَاجِرِ. رواه الترمذي بسند ضعيف. والله أعلم[٣]:

عیكریمەی كوڕی ئەبو جوهل (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: چوومە خزمـەت حـەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەرحـەبا لـە سـواری كۆچـكەر! (ت - س/ ضعیف).

## ٤٩) یەكێ تریان گوتنی (لبیك وسعدیك)ە : (ومنها لبيك وسعديك)

٥٣٥٥- عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ الْفِهْرِيَّ (رَضِي اللّٰهُ عَنـهُ) قَالَ: شَهِدْتُ مَـعَ رَسُـولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُنَيْنًا فَسِرْنَا فِي يَوْمٍ قَائِظٍ شَدِيدِ الْحَرِّ فَنَزَلْنَا تَحْتَ ظِلِّ الـشَّجَرَةِ

---

[٢] تجريد/١ ل- ٢٣٩ رقم/ ٢٢٤

[٣] بسند ضعيف.

فَلَمَّا زَالَتِ الشَّمْسُ لَبِسْتُ لأْمَتِي وَرَكِبْتُ فَرَسِي فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي فُسْطَاطِهِ فَقُلْتُ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ قَدْ حَانَ الرَّوَاحُ فَقَالَ: أَجَلْ. ثُمَّ قَالَ: يَا بِلاَلُ قُمْ. يَا بِلاَل قُمْ. فَثَارَ مِنْ تَحْتِ سَمُرَةٍ كَأَنَّ ظِلَّهُ ظِلُّ طَائِرٍ فَقَالَ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَأَنَا فِدَاؤُكَ. فَقَالَ: أَسْرِجْ لِي الْفَرَسَ. فَأَخْرَجَ سَرْجًا دَفَّتَاهُ مِنْ لِيفٍ لَيْسَ فِيهِمَا أَشَرٌ وَلاَ بَطَرٌ فَرَكِبَ وَرَكِبْنَا[١].

ئەبو عەبدو ڕەحمان فیهری (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی لە غەزای حونەیندا لە خزمەتی حەزرەتدا بووم (درودی خودای لەسەربێ) ڕۆژەکەی زۆر گەرم بوو، جا کەوتینە ڕێ هەتا لە قرچەی گەرمای نیوڕۆدا لامان دایە بن سێبەری دارو درەخت، وچانمان گرت هەتا خۆر لای داو هەتاو لار بۆوە، ئەوجا زریەکەمم لەبەر کردو سواری ماینەکەم بوومو، چووم بۆ لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە لەناو چاتۆڵەکەیدا بوو، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! (سڵاوو ڕەحمەتو بەرەکەتی خودات لێ بێ) واکاتی بارکردنەوەی لای ئیوارەیە، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): بەڵێ وایە ئینجا فەرمووی: بیلال! هەڵسە، بیلال! هەڵسە. بیلال لەبن شێخەڵێکەوە دەرپەڕی، بەقەی مەلێ سێبەری مابوو وا بە پرتاو هات، دەیفەرموو: لبيك وسعديك وأنا فداؤك: بفەرموو هەمیشە سەرم لە ڕێتایە، من بە قوربانی تۆبم!. فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ماینەکەمم بۆ زین کە. ئەوجا بیلال لە چادرەکە زینێکی ئاسایی دەرهێنا، تەکەڵتووەکەی لە ڕیشاڵی دار خورمابوو، هیچ بۆنی فیزو دەعیەی لێوە نەدەهات، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) خۆی سوار بووو ئێمەیش سوار بووینو هەموو پێکەوە کەوتینە ڕێ (د).

٥٣٥٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا أَبَا ذَرٍّ. فَقُلْتُ: لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَأَنَا فِدَاكَ أَوْ فِدَاؤُكَ. رواهما أبو داود[٢].

---

[١] سكت عن درجته الشارح

[٢] سكت عن درجته الشارح.

ئـەبو زەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێـی فەرمووم: ئەی ئەبو زەڕ! گوتم: لبيك وسعديك يارسول الله وانا فداك: بفەرموو هەمیشە کەمەربەستم بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی تۆ، ئەی پێغەمبەری خودا! سەرەڕای ئەوەیش گیانم دەکەم بەقوربانت (د).

**٥٠) یەکێ تریان (باوكو دایکم بەقوربانت) بێیە : (ومنها فداك أبي وأمي)**

٥٣٥٧- ← (ب – ٥ ز – ١٢ ل – ٨٦ ف – ١)[1].

٥٣٥٨- قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) لِلنَّبِـيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّمَ): فَـدَيْنَاكَ بِآبَائِنَـا وَأُمَّهَاتِنَا. رواه البخاري. نسأل الله التوفيق آمين:

ئـەبو بـەکر (خودای لێ ڕازی بێ) فـەرمووی بـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ): باوكو دایکمان دەکەین بەقوربانت (ب).

**٥١) یەکێ تریان (حفظك الله: خودا ئاگادارت بێ)یە : (ومنها حفظك الله)**

٥٣٥٩- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كَانَ فِي سَفَرٍ لَـهُ فَعَطِشُوا فَانْطَلَقَ سَرَعَانُ النَّاسِ فَلَزِمْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تِلْكَ اللَّيْلَةَ فَقَـالَ: حَفِظَكَ اللّٰهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّك. رواه أبو داود ومسلم. نـسأل الله كمـال حفظـه للارواح والاشباح آمين:

ئـەبو قـەتادە (خودای لێ ڕازی بێ) فـەرمووی: جـارێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسەربێ) لە سەفەرا بوو، یاران توونییان بوو، تیژڕۆکان بەپەلە وە پێش کەوتن، من خۆم ئەو شەوە مامەوە لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەنـك لێی جیا نەبوومەوە. فـەرمووی: حَفِظَكَ اللّٰهُ بِمَا حَفِظْتَ بِهِ نَبِيَّك: خـودا ئاگـادارت بێ وەك چۆن تۆ ئاگاداری پێغەمبەری خۆتت کرد! (د/م).

---

[1] تقدم فی مجلد خامس. تسلسل/ ١٢ ل- ٨٦ رقم/ ١/٣٣٢٦.

## ٥٢) یەكێ تریان (یاخوا هەمیشە پێكەنینی خێرت بێ)یە
## ومنها أضحك الله سنك

٥٣٦٠- عَنْ بْنِ عَبَّاسِ بْنِ مِرْدَاسٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: ضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ أَبُو بَكْرٍ أَوْ عُمَرُ: أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ. يَا رَسُولُ اللَّهِ. رواه أبو داود وابن ماجه[1]:

عەبباسی كوڕی میرداس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێكەنی، ئەبو بەكر – یا عومەر – پێی فەرموو: أَضْحَكَ اللَّهُ سِنَّكَ يَا رَسُولُ اللَّهِ: خودا بكا كە هەمیشە پێكەنینی خێرت بێ ئەی پێغەمبەری خودا! (د–س/صالح – ماجە).

## ٥٣) بەشی چوارەم: باسی نەریتو دەستووری كۆڕی دانیشتن
## الفصل الرابع: في آداب المجالس

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا فِي الْمَجَالِسِ فَافْسَحُوا يَفْسَحِ اللَّهُ لَكُمْ وَإِذَا قِيلَ انشُزُوا فَانشُزُوا يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ – ٥٨ / ١١}.

واتە: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان كردووە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا! كاتێ پێیان گوتن لە دانیشتگاكاندا تەكە تەكە بكەنو تۆزێ بڵاو دابنیشن با جێگەی خەڵكی تریش لە ئەڵقەی كۆڕەكەدا ببێتەوە بە گوێیان بكەن وتەكە تەكە بكەن، خودایش فەرەحی و خۆشیتان تێ دەخاو ڕێگەو جێگەتان لە هەردوو جیهاندا بۆ گوشاد دەكا، هەروەها هەركاتێ گوترا: ئادەی پەلامار دەن ئەو كارە، یا ئەو فرمانە ڕاپەڕێنن، ئێوەش بەبێ سستیو بە بێ بێزاری ڕاستەوەبنو كارەكە بە جوانی ئەنجام بدەن، چونكە دڵنیابن لەوە كە خودا پایەی ئەو موسوڵمانانە بەرزەوە دەكا كە فەرمانی خودا بەجێ دەهێننو، لە هەر دوو جیهان

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

دا سەریان بەرزدەكاتەوە! هەروەك لە هەر دوو ژیان دا خودا پایەو پلەی زانای كارا بەچەن قاتێ بڵند دەكاتەوە، لەوەیش دڵنیابن كە خودا ئاگای لە كارو كردەوەتانە، بە پێی مەبەستو نیازی دڵتان پاداشتان دەداتەوە!

٥٣٦١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِيَّاكُمْ وَالْجُلُوسَ بِالطُّرُقَاتِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا لَنَا بُدٌّ مِنْ مَجَالِسِنَا نَتَحَدَّثُ فِيهَا. قَالَ: فَإِذَا أَبَيْتُمْ إِلاَّ الْمَجْلِسَ فَأَعْطُوا الطَّرِيقَ حَقَّهُ. قَالُوا: وَمَا حَقُّهُ؟ قَالَ: غَضُّ الْبَصَرِ وَكَفُّ الأَذَى وَرَدُّ السَّلاَمِ وَالأَمْرُ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيُ عَنِ الْمُنْكَرِ[١].

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نەكەن لە سەرەڕێ دابنیشن! عەرزیان كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چارمان نیە، نیشتگەو جێ دانیشتنی ترمان نیە، ئەی لە گوێ دوو قسە بۆ خۆمان بكەین، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: وای لێ هات! كە وابوو مافی ڕێگەوبان بە جێ بهێنن گوتیان: مافی ڕێگەوبان چییە؟ فەرمووی: چاوی خۆتا لە تەماشای نارەوا بگرنو، ئازاری كەس مەدەنو مەبن بە باری ئازار بۆ هاتو چۆكەران، لە هەمان كاتدا وەلامی سلاو بدەنەوەو، فەرمان بە چاكە بكەنو، جڵەو گیریی لە خراپە بكەن (ش/د/ت).

٥٣٦٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُقِيمَنَّ أَحَدُكُمُ الرَّجُلَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ، وَلَكِنْ تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا. رواهما الأربعة. وزاد مسلم في رواية: وكان ابن عمر اذا قام له رجل من مجلسه لم يجلس فيه[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: كەس كەس لە جێگەی خۆی هەڵنەسێنێ بۆ ئەوەی كە خۆی لە

---

[١] تجرید/ ٣ ل – ١٦١ رقم/ ١٠٧٠ = ٢٤٦٥، ٦٢٢٩ فتح. مسلم. سلام: ٥٦١٣. (ریاض/١ ل – ١٧٥ ژ/٧/١٩٠).

[٢] مسلم آداب: ٥٦٤٧، ٥٦٤٨، ٥٦٤٩، ٥٦٥٠، ٥٦٥٢. ترمذی. استئذان: ٢٧٤٩ تحفة الأشراف: ٧٥٤١. بخاری. صلاة: ٩١١ تحفة: ٧٧٧٧.

جێگـەی ئـەو دانیـشێ، بـەڵام تەکـە تەکـە بکـەنو جێگـەی یـەکتر بکەنـەوە (ش/د/ت) لە گێڕانەوەیەکی موسلیم دا: دەستووری ئیبنو عومەر وابوو ئەگەر پیاوێ جێگەکەی خۆی بۆی چۆڵ بکردایە تیا دانەدەنیشت!

٣- عَنْ أَبِي هورةيرة (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَـنْ قَـامَ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ. رواه مسلم وأبو داود والترمذي[٣]:

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (درووودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: کەسێ لە جێگەیێ هەڵسا، لە پاشا گەڕایەوە بۆی خۆی لە پێشترە پێی تایەکێکی تر (م/د/ت).

٥٣٦٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنـهُ) قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهِي. رواه أصحاب السنن[٤]:

جابیری کوڕی سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: کە دەچووین بۆ لای پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) تەماشامان دەکرد ریز (صەف)ی کۆڕەکە تاکوێ گەیشتبوو لە وێدا دادەنیشتین (د/ت/ن-س/ح).

٥٣٦٥- وعنة قال: رأيت النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيـهِ وَسَلَّمَ) متكئـا علـى وسـادة علـى يساره. رواه الترمذي[٥]:

دیـسان فـەرمووی: پێغەمبـەرم دی پـاڵی دابـۆوەو شـانی چـەپی لـە سەرپشتی یەك دا دابوو (ت- س/ح).

٥٣٦٦- وعنه قال: كان النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إذا صلى الفجر تربع في مجلسه حتى تطلع الشمس حسناء. رواه أبو داود[٦]:

---

(٣) مسلم. آداب: ٥٦٥٣.

(٤) بسند حسن (شرحه).

(٥) بسند حسن (شرحه).

(٦) بسند حسن (شرحه).

دیسان فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كە نوێژی بەیانی دەكرد لە شوێنی خۆیدا چوار مشقی دادەنیشت هەتا خور بەجوانی دەردەكەوت ( لەو ماوەیەدا دەستی دەكرد بە قسەو گوفتوگۆ لەگەڵ هاوڕێ یانی دا)، (د- س/ صالح).

٥٣٦٧- وقال أبو سعيدٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ): كان رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) إذا جلس أحتبى بيديه. رواه أبو داود والبزار[٧]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ناو بە ناو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە چیچكانەوە دادەنیشتو، دەستی دەگرت بەبەر ئەژنۆی خۆیەوە. (د – س/ ضعیف – بەززار).

٥٣٦٨- عن عبدالله بن عمرو (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أن رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قال: لايحل لرجل أن يفرق بين أثنين الا بإذنهما. رواه ابو داود والترمذي[٨]:

عەبدوڵلای كوڕی عەمر (رەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دروست نییە كە پیاو دوو كەس لە یەكتر جیا بكاتەوەو خۆی لە نێوانیادا دابنیشێت مەگەر بە رەزامەندیی خۆیان. (د/ت- س/ح).

٥٣٦٩- ← (ب – ١ ز – ١٢٦ ل – ٣٨١ چاپی/ ١ ف – ٣)[٩].

## ٥٤) ئەڵقەدانو گەورەیی كۆڕی دانیشتن : (التحلق وسعة المجلس)

٥٣٧١- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ وَهُمْ حِلَقٌ فَقَالَ: مَا لِي أَرَاكُمْ عِزِينَ. رواه أبو داود ومسلم[١]:

---

[٧] رواه أبو داود بسند ضعيف (شرحه).

[٨] بسند حسن (شرحه).

[٩] تقدم في المجلد الأوّل تسلسل/ ١٢٦ ژ/ ٧٥٩/٣.

[١] مسلم. صلاة:

جابیری كوڕی سەمووره (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) چوو بۆ مزگەوت، تەماشای كرد یاران ئەڵقە ئەڵقەو تاقم تاقم دانیشتوون فەرمووی: ئەوە بۆچی وا كۆمەڵ كۆمەڵ دەتانبینم دانیشتون! (د/م).

٥٣٧١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ الْمَجَالِسِ أَوْسَعُهَا. رواه أبو داود[٢]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كۆڕی دانیشتن تا گەورەتربێ باشتره (د - س/صالح).

٥٣٧٢- عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) أَنَّ رَجُلاً جَلَسَ وَسْطَ حَلْقَةِ قَوْمٍ فَقَالَ حُذَيْفَةُ: مَلْعُونٌ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) مَنْ قَعد وَسْطَ الْحَلْقَةِ. رواه الترمذي وأبو داود. نسأل اله حسن الأدب آمين[٣]:

ئەبو میجلەز (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هات لە ناوەڕاستی ئەڵقەی كۆڕەكەدا دانیشت، حوزەیفەیش فەرمووی: لەسەر زمانی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) نەفرەت و لە عنەت لەو كەسە كراوە كەلە ناوەڕاستی ئەڵقەدا دادەنیشێت، یا فەرمووی: خودا - لەسەر زمانی موحەممەد - نەفرەتی لەو كەسە كردووە كەلە ناوەڕاستی ئەڵقەدا دادەنیشێت. (ت - (س) /ص - د).

## ٥٥) جۆرە دانیشتنێكی ناشیرین : (الجلسة المكروهة)

٥٣٧٣- عَنْ الشَّرِيدِ بْنِ سُوَيْدٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) قَالَ: مَرَّ بِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا جَالِسٌ هَكَذَا وَقَدْ وَضَعْتُ يَدِيَ الْيُسْرَى خَلْفَ ظَهْرِي وَاتَّكَأْتُ عَلَى أَلْيَةِ يَدِي فَقَالَ: أَتَقْعُدُ قِعْدَةَ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ[١]:

---

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

شەریدی كوڕی سووەید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) لە لامەوە ڕەت بوو، منیش لەسەر ئەم شێوەیە دانیشتبووم: دەستی چەپمم لە پشتمەوە دانا بوو، خۆم دابوو بەسەرقنگە پاژنەی دەستمدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: چۆن ئاوا وەك كەسانێ دادەنیشیت كە بەر قارو قینی خودا كەوتوون (د – س/صالح).

٥٣٧٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الْفَيْءِ. فَقَلَصَ عَنْهُ الظِّلُّ وَصَارَ بَعْضُهُ فِي الشَّمْسِ وَبَعْضُهُ فِي الظِّلِّ فَلْيَقُمْ. رواهما أبو داود. نسأل الله الأدب في كل حال آمين[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەتی ئەبو قاسم (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر یەكێكتان لەبن سێبەرێكا بوون، بەرە بەرە سێبەرەكە كشایەوەو هەندێ لە لەشتان لە سێبەرەكەدا مایەوەو هەندێكی تری كەوتە بەر خۆر ئیتر لەو شوێنە بگوێزنەوە! (د– س/ صالح).

### ٥٦) سرتە: چپە: قسەی پەنهانی : (التناجي)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ – سورة موجادلة – ٩/٥٨}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! كاتێ گوفتوگۆی نهێنیو قسەی پەنامەكی دەكەن خۆتان بپارێزن لە سرتەو چپەی پڕ لە دوشمنایەتیو تاوانو، بە قسەی وا دوژمنایەتیو بێ فەرمانی حەزرەتو یارانی مەكەن، هەروا لە كاتی گوفتوگۆی ئاشكراش دا، بەڵكوو هەمیشە قسەی باش بكەنو باسی تەقواو بەگوێ كردنی خودا بكەنو، باسی شتی باش بكەن، لە هەمان كاتدا لە خودا

---

(١) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(٢) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

بترسن كە ڕۆژێ دەبێ بە دەسەوسانی دەچنەوە بەردەستی و، زوو یادرەنگ دەگەڕێنەوە بۆ لای ئەوو لە دیوانی ئەودا گرد دەگرێنەوە.

٥٣٧٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كُنْتُمْ ثَلاَثَةً فَلاَ يَتَنَاجَى رَجُلاَنِ دُونَ صَاحِبِهِمَا، حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ، فَإِنَّ ذٰلِكَ يُحْزِنَهُ. رواه الأربعة[١]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە سێ كەس بوون، دوانتان پێكەوە بەبێ ئەویترتان چپە مەكەن، چونكە ئەو چپەیە پەستی دەكا (ش/د/ت).

٥٣٧٦- ← (ب – ٥ ز – ٥٤ ل – ١٨٦ ط/١ ف – ٤ + ٥)[٢].

وەلێ لەگرەدا ئاوایە: ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قسەیەكی پەنامەكی بۆم كرد، هێشتائەو قسەیەم لای كەس نەدركاندووە، تەنانەت ئوممو سولەیمی دایكیشم داوای لێ كردم كە پێلی بڵێم بەویشم نەگوت (ش).

## ٥٧) پژمین و نزای باش بۆ پژمیو : (العطاس وتشميت العاطس)

٥٣٧٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: عَطَسَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاَنِ فَشَمَّتَ أَحَدَهُمَا وَلَمْ يُشَمِّتِ الآخَرَ، فَقَالَ: الآخَرُ الَّذِي لَمْ يُشَمِّتْهُ عَطَسَ فُلاَنٌ فَشَمَّتَّهُ وَعَطَسْتُ أَنَا فَلَمْ تُشَمِّتْنِي؟ قَالَ: إِنَّ هٰذَا حَمِدَ اللّٰهَ وَإِنَّكَ لَمْ تَحْمَدِ اللّٰهَ. رواه الخمسة[١]:

---

[١] بخاری. استئذان: ٦٢٩٠ تجرید/٢٣٦/٥ رقم/ ١٩٧٢. مسلم. سلام: ٥٦٦٠، ٥٦٦١. أبو داود. أدب: ٤٨٥١. ترمذي. أدب: ٢٨٢٥. ابن ماجه. أدب: ٣٧٧٥. تحفة/ ٩٢٥٣.

[٢] تقدم فی المجلد الخامس. تسلسل/ ٥٤ رقم/ ٣٤٨٨/٤ و ٣٤٨٩/٥.

[١] تجرید البخاری/٢٢٦/٥ رقم١٩٦٢ = ٦٢٢١، ٦٢٢٥ فتح الباری. مسلم. زهد: ٧٤١١ – ٤١٣. أبو داود. أدب: ٥٠٣٩ترمذی. أدب: ٢٧٤٢. ابن ماجه. أدب: ٣١٣. تحفة الأشراف/ ٨٧٢.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەردا دوو پیاو پژمین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نزای بۆ یەکێکیان کردو پێی فەرموو: رەحمەتی خودات لێ بێ، بەڵام نزای بۆ ئەویتریان نەکرد، جا ئەوەیان کە نزای بۆی نەکرد گوتی: قوربان! فیسارە کەس پژمی نزات بۆیکرد، کەچی من پژمیم دووعات بۆ نەکردم ئەوە بۆ؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): چونکە ئەو لە پاش پژمینەکە سوپاسی خودای کرد، بەڵام تۆ سوپاسی خودات نەکرد! (ش/د/ت/ن).

٥٣٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا عَطَسَ غَطَّى وَجْهَهُ بِيَدِهِ أَوْ بِثَوْبِهِ وَغَضَّ بِهَا صَوْتَهُ. رواه الترمذي وأبو داود[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەستووری وابوو کە دەپژمی دەمو لووتی بە دەستی یابە چڵەکەی دادەپۆشی و دەنگی خۆی پێ کپ دەکرد (ت/د – س/ص).

٥٣٧٩- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ وَلْيَقُلِ الَّذِي يَرُدُّ عَلَيْهِ يَرْحَمُكَ اللّٰهُ وَلْيَقُلْ هُوَ يَهْدِيكُمُ اللّٰهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ. رواه الترمذي والبخاري وأبو داود[٣]:

ئەبو ئەییوب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کەسێکتان دەپژمێ بابڵێ: الحمد لله على كل حال: سوپاس بۆ خودا لەسەر هەموو بارو دۆخێ. ئەو کەسەیشی کە وەڵامی دەداتەوە بابڵێ: يرحمك الله: رەحمەتی خودات لێ بێ: خودا رەحمت پێ بکا، با پژمیوەکەیش بەو بڵێتەوە: يهديكم الله ويصلح بالكم:خودا شارەزای ڕێگەی راستتان بکاو هیدایەتتان بداو کارتان بسازێنێ! (ت/ب/د)

---

[٢] بسند صحيح (شرحه)

[٣] (رياض/٢ ل- ٣٣٠ ز- ١٤٢. رقم/٢/٨٧٩- بخاري/٦٢٢٤).

٥٣٨٠- وَعَطَسَ عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) رَجُلَ فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ. قَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَأَنَا أَقُولُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ وَالسَّلَامُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ وَلَيْسَ هَكَذَا عَلَّمَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَل عَلَّمَنَا أَنْ نَقُولَ الْحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ. رواه الترمذي[٤]:

لە كۆڕی دانیشتنی ئیبنو عومەردا (خودای لێ ڕازی بێ) پیاوێ پژمی و گوتی: الحمد لله والسلام علی رسول الله: سوپاس بۆ خوداو دروود لەسەر پێغەمبەری خودا، ئیبنو عومەریش فەرمووی: منیش دەڵێم: سوپاس بۆ خوداو دروود لەسەر پێغەمبەری خودا، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ ئەمە ئاوای فێرنەکردووین، ئاوای فێر کردووین کە بڵێین: سوپاس بۆ خودا لەسەر هەموو بارێ: الحمد لله علی کل حال (ت - س/ض).

٥٣٨١- عَنْ سَالِمِ بْنِ عُبَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: عَطَسَ رَجُلٌ عِنْد النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْكَ وَعَلَى أُمِّكَ. إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ وَلْيَقُلْ لَهُ مَنْ يَرُدُّ عَلَيْهِ يَرْحَمُكَ اللَّهُ وَلْيَقُلْ يَغْفِرُ اللَّهُ لَنَا وَلَكُمْ. رواه أصحاب السنن[٥]:

سالیمی کوڕی عوبەیدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) پیاوێ پژمی و گوتی: السلام علیکم: سڵاوتان لێ بێ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سڵاو لە خۆتو لە دایکت، وامەڵێن، کاتێ یەکێکتان دەپژمێ بابڵێ: الحمد لله رب العالمین: سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری هەموو جیهانیان.ئەو کەسەیشی کە وەرامی دەداتەوە پێی بڵێ: یرحمك الله، پژمیوەکەیش بەو بڵێتەوە: یغفر الله لنا ولکم: خودا لە ئێمەیشو لە ئێوەیش خۆش بێ (د - س/ صالح - ت/ ن).

---

[٤] بسند ضعيف ولكنه مؤيد بالصحاح هنا (شرحه).

[٥] بسند صالح لأبي داود.

## ٥٨) تاچەن جار پژمین نزا بۆ پژمیو دەكریْ : (عدد التشميت)

٥٣٨٢- عَنْ سَلَمَةَ ابْنِ الأَكْوَعِ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: عَطَسَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ. ثُمَّ عَطَسَ أُخْرَى فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): الرَّجُلُ مَزْكُومٌ. رواه الخمسة الا البخاري[1]:

سەلەمەی كوڕی ئەكوەع (خودای لیْ رازی بیْ) دەفەرمویْ: پیاویْ لە لای پیْغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربیْ) پـژمی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیْ) پیْی فەرموو: يرحمك الله: بەر رەحمەتی خودا كەوی، دیسان جاریْكی تریش پژمییەوە، ئەمجارەیان پیْغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیْ) پیْی فەرموو:ئەم پیاوە هەلاْمەتیەتی! (م/دت/ن- خودایان لیْ رازی بیْ).

٥٣٨٣- وَعَنْهُ قَالَ: عَطَسَ رَجُلٌ عِنْد رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا شَاهِدٌ فَقَالَ: يَرْحَمُكَ اللَّهُ. ثُمَّ عَطَسَ الثَّانِيَةَ وَالثَّالِثَةَ فَقَالَ: هَذَا رَجُلٌ مَزْكُومٌ. رواه الترمذي[2]:

دیسان دەفەرمویْ: خۆم بە دیارەوە بووم، جاریْ پیاویْ لە خزمەتی پیْغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربیْ) پـژمی، پیْغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیْ) پیْی فەرموو: يرحمك الله:خودا بەزەیی پیْتابیْتەوە. پیاوەكە دوا ئەوە دوو جاری تریش پژمییەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیْ) فەرمووی: ئەم پیاوە هەلاْمەتدارە! (ت – س/ص).

٥٣٨٤- عَنْ رِفَاعَةَ الزُّرَقِيِّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَشْمِيتُ الْعَاطِسِ ثَلاَثٌ فَإِنْ شِئْتَ أَنْ تُشَمِّتَهُ فَشَمِّتْهُ وَإِنْ شِئْتَ فَكُفَّ. رواه أبو داود والترمذي[3]:

لەریفاعەی زورقی یەوە (خودای لیْ رازی بیْ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربیْ) دەفەرمویْ: دووعای خیْر كردن بۆ پژمیو هەتا سیْ جارە، لەوە زیاتر بوو ئارەزووی خۆتە، دەیكەی بیكە، نایكەی مەیكە (د/ت – س/ص).

---

[1] مسلم.زهد/ ٧٤١٤. أبو داود. أدب: ٥٠٣٧. ترمذي. إساتئذان: ٢٧٤٣. ابن ماجه. أدب: ٣٧١٤ تحفة الأشراف: ٤٥١٣.

[2] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[3] بسند صالح (شرحه).

٥٣٨٥- وقال أبو هريرة (رَضِي اللهُ عَنْهُ): شمت أخاك ثلاثا فما زاد فهو زكام. رواه أبو داود. والله أعلى وأعلم[٤]:

ئەبو هورەیرەش (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: هەتا سێ جار بە کردنی دووعای خێر بۆ برای موسوڵمانی خۆت لە کاتی پژمیندا دوژمنی کوێربکە، کەلەسێ جار هەڵی بوارد ئەوە پژمە نییە، ئەوە هەلاّمەتو پەسیوە. ئەبو داود. لەبەرگی چوارەمی مەجمەعول بەحرەیندا لەلاپەڕە – ٥٤٥ – دا، ماموّستا ڕەشید بابان – بەڕەحمەت بێ – دەفەرموێ: تەشمیت لە (شماتە)یە، یەعنی دوشمن پێ خۆش بوون.

نەقڵی بۆ بایی (تەفعیل) بۆ ئیزالەیە، وەك (جلدت البعير) یەعنی پێستم گوروو تەشمیتیش بە مەعنا دووعاکردنە بۆ لابردنی ئەو شتە کە دوشمن پێی دڵخۆش ببێ. (وەرگێڕ)

## ٥٩) نزای پژمین کردن بۆ خاوەن پەیمانەکان، واتە ئەو ناموسوڵمانانەی کەلە پەنای ئیسلامدا دەژین: (أهل الذمة) : (تشميت الذمي)

٥٣٨٦- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ الْيَهُودُ يَتَعَاطَسُونَ عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَرْجُونَ أَنْ يَقُولَ لَهُمْ يَرْحَمُكُمُ اللَّهُ. فَيَقُولُ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ. رواه الترمذي وأبو داود والحاكم[١]:

ئەبو مووسا (خۆشنوودیی خودای لێبێ) دەفەرموێ: گەلێ جار وا دەبوو جوولەکەکان لە کن پێغەمبەر (سرووی خودای لەسەربێ) کە دەپژمین بە تەمای ئەوە بوون کە پێغەمبەر (سرووی خودای لەسەربێ) پێیان بفەرموێ: یرحمكم الله: خودا ڕەحمتان پێ بکا، بەلاّم پێغەمبەر (سرووی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو پێیان لە دوا پژمەکە: یهدیکم الله ویصلح بالكم: خودا شارەزای ڕێگەی هەقتان بکاو دڵتان ساز بکا (ت/د/حاکم – س/ص).

---

[٤] سكت عنه الشارح.

[١] بسند صحيح (شرحه).

## ٦٠) خودا پژمەی پێ خۆشە، وەلێ خۆشی نایێ لە باوێشك: أن الله يحب العُطاسَ ويكره التثاؤب

٥٣٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْعُطَاسَ وَيَكْرَهُ التَّثَاؤُبَ، فَإِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ وَحَمِدَ اللَّهَ كَانَ حَقًّا عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ سَمِعَهُ أَنْ يَقُولَ لَهُ يَرْحَمُكَ اللَّهُ.وَأَمَّا التَّثَاؤُبُ فَإِنَّمَا هُوَ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاوَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَا اسْتَطَاعَ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا تَثَاءَبَ ضَحِكَ مِنْهُ الشَّيْطَانُ. رواه البخاري وأبو داود والترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا پژمەی خۆش دەوێ، بەڵام باوێشکی پێ خۆش نییە، دەی لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر یەکێکتان پژمی و، سوپاسی خودای کرد ئیتر دەبێ بە ماف و بەهەق لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە ئەو پژمەو سوپاسەی گوێ لێ بێ پێی بڵێ: یرحمك الله، بەڵام باوێشك لە شەیتانەوەیە، جا ئەگەر کەسێکتان باوێشکی هات با هەتا دەتوانێ بیگێڕێتە دواوەو بەری بگرێ، چونکە ئێوە کە باوێشك دەدەن شەیتان لە خۆشی یاندا پێتان پێ دەکەنێ، کەوا مایەی سستی و خاوی و لەش داهەزاویی بۆ فەراهەم هێناون. (ب/د/ت).

٥٣٨٨- ← (ب - ١ ز - ١٠٠ ل - ٣٠٣ ط/١ ف - ١)[2].

٥٣٨٩- عَنْ عَدِيِّ بْنِ ثَابِتٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِي اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعُطَاسُ وَالنُّعَاسُ وَالتَّثَاؤُبُ فِي الصَّلاَةِ وَالْحَيْضُ وَالْقَيْءُ وَالرُّعَافُ مِنَ الشَّيْطَانِ. رواه الترمذي بسند غريب. والله أعلم[3]:

لە عەدی کوڕی ثابیتەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە (خودای گەورە لێیان خۆش نوودبێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: پژمەو

---

[1] (ریاض/٢ ل- ٣٢٩ ز- ١٤٢ رقم/١/٨٧٨. بخاری/٦٢٢٣). تەماشای ئەم شوێنە بکە لە ریاضدا، بۆ باسی پژمین.

[2] تقدم فی مجلد/١ تسلسل/١٠٠ صحيفة/٣٠٣ طبعة أول. رقم/١/٥٩٠.

[3] رواه الترمذي بسند غريب.

وەنەوزو باوێشك – لەناو نوێژدا – لە شەیتانەوەن، هەروا بێ نوێژی (حەین) و رشانەوەو لووت پژانیش (ت – س/ غەریب: نابلاو).

## بەشی پێنجەم باسی ناوەکان:

## ٦١) باشترین ناو بەلای خودای گەورەوە

### الفصل الخامس: في الأسماء: أحب الأسماء الى الله تعالى

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ – سورة الأحزاب}.

راڤەو واتای ئەم ئایەتە پیرۆزەیە لەم دوو شوێنەدا رابورد: ← (ب – ٥ ز ٢٣ ل – ١٢٤ چاپی یەکەم. ف/٢ + ب/٧ ز/١٦ ل/٩٣ چ/١ ف/١٠).

٥٣٩٠– عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رضي الله عنه) قَالَ: إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَسْمَائِكُمْ وَأَسْمَاءِ آبَائِكُمْ فَأَحْسِنُوا أَسْمَاءَكُمْ. رواه أبو داود[١]:

ئەبو دەرداو (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە – لە ڕۆژی ژینەوەدا – بە ناوی خۆتانو بە ناوی باوکتانەوە بانگتان دەکەن، کەواتە ناوی جوان لە خۆتانو لە کەسوکارتان بنێن! (د– س/منقطع).

٥٣٩١– وَقَالَ ابن عَبَاسٍ (رضي الله عنهما): إِنَّ اللَّهَ يَدْعُو النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأمهاتهم ستِرا مِنهُ عَلَى عبادهِ. رواه الطبراني[٢]:

ئیبنو عەبباسیش (خودا لێیان خۆش نوودبێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا خودا ئەم خەڵکە بە ناوی دایکیانەوە بانگ دەکا، هەتا نهێنی بەندەکانی خۆی بپۆشێو، سەر پۆشو پەردەی سەر عەیبو نەنگیان هەڵ نەداتەوە (طەبەرانی – خودای لێ رازی بێ).

---

[١] بسند فيه انقطاع ولكن تؤيده الأية (شرحه).

[٢] سكت عنه الشارح

٣- عَنْ بْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ عِنْدَ اللّٰهِ عَبْدُ اللّٰهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ. رواه مسلم والترمذي وأبو داود[٣]:

ئیبنو عومەر (خودا لێیان خۆش نوودبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆشەویسترینی ناوتان لەلای خودا عەبدوڵلاو عەبدولرەحمانە! (م/ت/د).

٤- عَنْ أَبِي وَهْبٍ الْجُشَمِيِّ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَسَمَّوْا بِأَسْمَاءِ الأَنْبِيَاءِ وَأَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللّٰهِ عَبْدُ اللّٰهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ وَأَصْدَقُهَا حَارِثٌ وَهَمَّامٌ وَأَقْبَحُهَا حَرْبٌ وَمُرَّةُ. رواه أبو داود والنسائي. والله وأعلى أعلم[٤]:

ئەبو وەهبی جوشەمی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە ناوی پێغەمبەرەكانەوە خۆتان ناوبنێن‌و، ناوی پێغەمبەرەكان بكەن بەناو بۆ خۆتان، باشترین ناویش لەلای خودا عەبدوڵلاو عەبدورەحمانە، راستترین ناویش ( كە دەق رێكی سروشت‌و مەشرەبی ئادەمیزادبێ) حاریث و هەممامە، دزێوترین ناویش حەرب‌و موررەیە. (د - س/ صالح - ن - س/ص).

## ٦٢) دروست نییە كەس ئەبولقاسم - كە كەسناوی پێغەمبەرە (درووودی خودای لەسەر) - بكا بە كەسناو - واتە بە كونیە - بۆ خۆی

## لايجوز الكنية بأبي القاسم

٥٣٩٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمِ. فَقَالُوا: لا نكنيه حتى نسأل النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: سَمُّوا بِاسْمِي، وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي. رواه الأربعة[١]:

---

[٣] مسلم. آداب: ٥٥٥٢. أبو داود. أدب: ٤٩٤٩. ترمذي أدب: ٢٨٣٤. ابن ماجه. أدب: ٣٧٢٨. تحفة: ٧٧٢١.

[٤] رواه أبو داود بسند صالح والنسائي بسند صحيح (شرحه).

[١] مسلم. آداب: ٥٥٥١

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ لە ئێمە کوڕێکی بوو، ناوی نا قاسم، یارانیش فەرموویان: تا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەپرسین کە سناوی ئەبو لقاسمی لێ نانێین و پێی ناڵێین ئەبو لقاسم ( چونکە ئەبو لقاسم کەسناوی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) تا نەبێ بەهۆی ئیلتیباس و لێگۆڕان لەگەڵ پێغەمبەردا) جا کە بۆ ئەمە پرسیاریان لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کرد فەرمووی: ناوەکەم بکەن بە ناو بۆ خۆتان، بەڵام کونیەکەم مەکەن بە کونیە بۆ خۆتان (ش/د/ت).

٥٣٩٥- وَقَالَ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ): نَادَى رَجُلٌ (رجلا بالبقيع) فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ. فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ إِنِي لَمْ أَعْنِكَ إِنَّمَا دَعَوْتُ فُلاَناً. فَقَالَ نَبِي اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) تَسَمَّوْا بِاسْمِي وَلاَ تَكَنَّوْا بِكُنْيَتِي. رواه الشيخان والترمذي[٢]:

ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لە بەقیع پیاوێ گازی پیاوێکی تری دەکرد گوتی: ئەی ئەبو لقاسم! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوڕی لێ دایەوە، وایزانی کە بانگی ئەو دەکا، پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەگەڵ تۆم نەبوو، بانگی ئەو پیاوەی تر دەکەم، بەویش هەر دەڵێن: ئەبو لقاسم. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ناوی من بکەن بەناو بۆ خۆتان بەڵام کەسناوەکەم مەکەن بە کەسناو بۆ خۆتان. (ش/ت - ڕەزای خودایان لێبێ).

٥٣٩٦- عَنْ جَابِرَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: وُلِدَ لِرَجُلٍ مِنَّا غُلاَمٌ فَسَمَّاهُ الْقَاسِمَ فَقَالُوا: لاَ نَكْنِيكَ بِأَبِي الْقَاسِمِ، وَلاَ نُنعِمُكَ عَيْنًا.فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: أَسْمِ ابْنَكَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ. رواه الشيخان[٣]:

جابیر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ لە ئێمە ( واتە: لە ئەنصارەکان: لە یاریدەدەرەکان) کوڕێکی دەبێ، ناوی نا قاسم. یاران پێیان فەرموو: نەپێت

---

[٢] تجريد البخاری/٣٨٧/٣ رقم/ ١٢٦٢ = ٣١١٤، ٣١١٥، ٣٥٣٨، ٦١٨٦، ٦١٨٧، ٦١٨٩، ٦١٩٦. مسلم. آداب: ٥٥٥١.

[٣] بخاری. أدب: ٦١٨٤، ٦١٨٩. مسلم. آداب: ٥٥٦٠.

دەڵێین ئەبو لقاسمو نەبەم كەسناوە چاوو دڵت ڕۆشن دەكەینەوە ( چونكە ئەبو لقاسم كەسناوی پێغەمبەرەو هەر قابیل بەخۆیەتی!) پیاوەكەیش (خودای لێ ڕازی بێ) ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) و ئەم باسەی بۆی باس كرد، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): كوڕەكەت ناوبنێ عەبدولڕەحمان (ش – خودا لێیان خۆشنوود بێ).

٥٣٩٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَسَمَّى بِاسْمِي فَلاَ يَتَكَنَّى بِكُنْيَتِي وَمَنِ اكْتَنَى بِكُنْيَتِي فَلاَ يَتَسَمَّى بِاسْمِي[٤]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمووێ: ئەوەی ناوی من دەكا بەناو بۆ خۆی با كونیەی من نەكا بە كونیە بۆ خۆی، هەر وا ئەوەی كونیەی من دەكا بە كونیە بۆ خۆی باناوی من نەكا بە ناو بۆ خۆی (د/ت – س/ص).

٥٣٩٨- وَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ إِنْ وُلِدَ لِي بَعْدَكَ أُسَمِّيهِ مُحَمَّدًا وَأُكْنِيهِ بِكُنْيَتِكَ؟ قَالَ: نَعَمْ. قَالَ فَكَانَتْ رُخْصَةً لِي. رواهما أبو داود والترمذي[٥]:

عەلی (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر لە دوا ژیانی تۆ كوڕێكم بوو ناوی دەنێم موحەممەدو كونیەكەی تۆیش دەكەم بە كونیەی و پێی دەڵێم: ئەبو لقاسم، ئایا ڕێگەی ئەمەم دددەی؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): بەڵێ باشە. عەلی دەیفەرموو: ئەمە بوو بەمۆڵەتو ڕوخسەت بۆ من. (د/ت –س/ص).

## ٦٣) ناوە ناپەسەندەكان : (الأسماء المنهى عنها)

٥٣٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَخْنَى الأَسْمَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عِنْدَ اللّٰهِ رَجُلٌ تَسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ. رواه الأربعة وزاد مسلم: لا مالك الا الله تعالى[١]:

---

[٤] بسند صحيح (شرحه).

[٥] بسند صحيح (شرحه).

ئـەبو هـورەیرە (خـودای لێ ڕازی بـێ) لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خـودای لەسـەربێ) دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا خوێریترین ناو لای خودا ناوی ئەو پیاوەیە کە خۆی ناو ناوە مەلیکول ئەملاك (واتە: شاهە نشاه: شای شایان). (ش/د/ت) موسـلیم ئەمـەی پـترە: خـاوەنی ڕاسـتەقینەی هـەموو شـتێ هـەر خـودای گەورەیەو بەس.

٥٤٠٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَغْـيَظُ رَجُـلٍ عَلَـى اللَّـهِ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَخْبَثُهُ وَأَغْيَظُهُ عَلَيْهِ رَجُلٌ كَانَ يُسَمَّى مَلِكَ الأَمْلاَكِ لاَ مَلِكَ إِلاَّ اللَّـهُ تَعَالَى. رواه مسلم[2]:

دیـسان لـەوەوە لـە پێغەمبـەرەوە (درووودی خودای لەسەربێ) دەفـەرموێ: لـە ڕۆژی ژینـەوەدا خـودای گـەورە لەهـەموو کەسێ زیاتر ڕقی لـەو پیاوەیـە کە نـاو نرابـێ: شای شایان مەلیکول ئەملاك: شاهە نشاه، خودای گەورە لە هەموو ناوێ پتر ڕقی لـە خـاوەنی ئـەم ناوەیـە، ئـەم نـاوە لـە لای خـودا لـە هـەموو نـاوێ چـەپەڵترە، شـای ڕاستەقینە (کە خۆی شای گشت شایان بێ) تەنیا خودای گەورەیەو بەس (م).

٥٤٠١- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللَّهِ أَرْبَعٌ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَاللَّـهُ أَكْبَـرُ. لاَ يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ. وَلاَ تُسَمِّيَنَّ غُلاَمَكَ يَسَارًا وَلاَ رَبَاحًا وَلاَ نَجِيحًا وَلاَ أَفْلَحَ فَإِنَّـكَ تَقُولُ أَثَمَّ هُوَ فَلاَ يَكُونُ فَيَقُولُ لاَ. إِنَّمَا هُنَّ أَرْبَعٌ فَلاَ تَزِيدُنَّ عَلَـيَّ. رواه مـسلم وأبـو داود والترمذي[3]:

سەمووورەی کوڕی جوندب (خودای لێ ڕازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: (درووودی خودای لەسەربێ) خۆشەویسترین ووتار- لای خودا - ئـەم چوار وشـەیەیە:

---

[1] تجریـد البخـاری/٥/٢٢٥ رقـم/١٩٦١ = ٦٢٠٥، ٦٢٠٦. مـسلم. آداب: ٥٥٧٥. أبـو داود. أدب: ٤٩٦١. ترمذی. أدب: ٢٨٣٧.

[2] مسلم. آداب: ٥٥٧٦.

[3] مـسلم. آداب: ٥٥٦٤، ٥٥٦٥. أبـو داود. أدب: ٤٩٥٨، ٤٩٥٩. ترمـذي. أدب: ٢٨٣٤. ابـن ماجـه. أدب: ٣٧٢٩ تحفة/ ٤٦١٢.

سُبْحَانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ: پاكیو پیرۆزیی هەر بۆ خودایە، سوپاس هەر بۆ خودایە، هەر خودا خودایەو بەس، خودا لە هەموو شتیّ گەورەترە، بەهەر كامیّ ئەم چوار وشەیە دەست پیّ بكەی قەیدی نییە، بۆ تۆ، كوڕی خۆشت ناومەنیّ یەسار، یا ڕەباح، یا نەجیج، یا ئەفلەح، چونكە وا دەبیّ تۆ دەپرسیتو دەڵێیت: ئەریّ هین لەویّیە؟ جا ئەگەر لەویّ نەبوو دەڵێن: نەو لێرە نییە. قسەبێژ دەفەرمویّ: ئەم ناوانە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) جڵەو گیریی لیّ كردوون تەنیا چوار ناونو بەس، بەدەم منەوە زیاتریان مەكەن (م/د/ت).

٥٤٠٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَرَادَ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَنْهَى عَنْ أَنْ يُسَمَّى بِيَعْلَى وَبِبَرَكَةَ وَبِأَفْلَحَ وَبِيَسَارٍ وَبِنَافِعٍ وَبِنَحْوِ ذَلِكَ ثُمَّ رَأَيْتُهُ سَكَتَ بَعْدُ عَنْهَا فَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا ثُمَّ قُبِضَ وَأَرَادَ عُمَرُ أَنْ يَنْهَى عَنْ ذَلِكَ ثُمَّ تَرَكَهُ. واه مسلم وابو داود ولفظه: إِنْ عِشْتُ إِنْ شَاءَ اللّٰهُ أَنْهَى أُمَّتِي أَنْ يُسَمُّوا نَافِعًا وَأَفْلَحَ وَبَرَكَةَ فَإِنَّ الرَّجُلَ يَقُولُ إِذَا جَاءَ أَثَمَّ بَرَكَةٌ فَيَقُولُونَ: لاَ[٤]:

جابیر (خودای لیّ ڕازی بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خودای لەسەربیّ) ویستی كە ناوی یەعلاو بەرەكەتو ئەفلەحو یەسارو نافیعو ئەم جۆرە ناوانە یاساخ بكا، بەڵاّم وەك سەرنجم دا لە پاشا لێیان بیّ دەنگ بوو، هەتا گیانی پاكی سپارد هیچی وای لە بارەیانەوە نەفەرموو. عومەریش (خودای لیّ ڕازی بیّ) ویستی كە ئەم جۆرە ناوانە قەدەغە بكا، بەڵاّم لە پاش دا وازی لەوە هێنا. (م/د/ت) گفتەی ئەبو داوود (خودای لیّ ڕازی بیّ) فەرمووی (دروودی خودای لەسەربیّ): ئەگەر مامو نەمردم - خودا یاربیّ - نایەڵم گەلی من خۆیان ناو بنێن: نافیع و ئەفلەحو بەرەكەت چونكە واڕیّ دەكەویّ پیاویّ دەپرسیّ: دەڵیّ: ئەریّ بەرەكەت لێرەیە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئەو لێرە نییە! ئەوەیش لە لای هەندیّ كەس دەبیّ بە هۆی ڕەشبینیو بەد بینیّ.

---

[٤] مسلم. آداب: تقدم تخريجه (الحديث ٣).

## ٦٤) ناونانی منداڵی تازە بوو، گۆشکردنی و شیرین کردنی مەلاشووی بە خورما، یا بەشیرینی تر : (تسمية المولود وتحنيكه بتمر)

٥٤٠٣- ← (ب – ٤ ز – ١١ ل – ٣٣ ف – ٥)[١].

٥٤٠٤- ← (ب – ٤ ز – ١١ ل – ٣٣ ف – ٣)[٢].

٥٤٠٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: ذَهَبْتُ بِعَبْدِ اللّٰهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ الأَنْصَارِيِّ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ وُلِدَ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي عَبَاءَةٍ يَهْنَأُ بَعِيرًا لَهُ فَقَالَ: هَلْ مَعَكَ تَمْرٌ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَنَاوَلْتُهُ تَمَرَاتٍ فَأَلْقَاهُنَّ فِي فِيهِ فَلاَكَهُنَّ، ثُمَّ فَغَرَ فَا الصَّبِيِّ فَمَجَّهُ فِي فِيهِ فَجَعَلَ الصَّبِيُّ يَتَلَمَّظُهُ فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حُبُّ الأَنْصَارِ التَّمْرَ. وَسَمَّاهُ عَبْدَ اللّٰهِ. رواه الثلاثة[٣].

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کە عەبدوڵلای کوڕی ئەبو طەلحە لە دایك بوو، خۆم بردم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کە چووم لەو کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) باڵا پۆشێکی لەبەردا بوو، قەترانی دەدا لەوشترێکی خۆی، فەرمووی: خورمات لەگەڵ خۆت هێناوە بۆ مەلاشوو شیرین کردنی؟ گوتم: ئا هێناومە، چەند دەنك، خورمام پێ بوو دامن پێی، ئەویش هەڵی دانە ناو دەمی خۆیەوەو جوێنی و ئینجا دەمی منداڵەکەی دا چەقەندو ماجوومی خورماکەی تفاندە ناوێ، منداڵەکەیش دەستی کرد بە مڵچاندنی و زمانی بۆ دەگێڕا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خورما دۆستی یاریدەدەرانە: خورما یاری یاریدەدەرانە! ئەوەتا ساواکە گورج دەستی کرد بە قۆستنەوەی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ناویشی نا عەبدوڵلا (ش/د – خودا خۆش نوودبێ لێیان).

---

[١] تقدم في مجلد رابع. تسلسل/ ١١ رقم/٢٦٠٨/٥.

[٢] تقدم في مجلد رابع. تسلسيل/ ١١ رقم/٢٦٠٦/٣.

[٣] مسلم. آداب: ٥٥٧٧. أبو داود. أدب: ٤٩٥١. تحفة الأشراف: ٣٢٥ (بڕوانە: تەجريد/١٠٠/٥ هەتا لاپەڕە/ ١١٥ بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە – وەرگێڕ ٢٠٠٨/٥/١٩).

٥٤٠٦- وَكَانَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُؤْتَى بِالصِّبْيَانِ فَيُبَرِّكُ عَلَيْهِمْ وَيُحَنِّكُهُمْ. رواه مسلم والله أعلى وأعلم[٤]:

فەرمووی: گەلێ جار منداڵی تازە بوویان دەهێنا بۆ خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) نزای پیرۆزی و موبارەكی بۆ دەركردنو بە شیرینی گۆشی دەكردنو بە خورماو شتی وا مەلاشووی شیرین دەكردن! (م).

## ٦٥) گۆڕینی ناوی ناشیرین بە ناوێكی جوان
## تغيير الأسم القبيح بأسم حسن

٥٤٠٧- عَنْ سَعِيد بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُمْ) أَنَهُ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا اسْمُكَ؟ قَالَ: حَزْنٌ. قَالَ: أَنْتَ سَهْلٌ، قَالَ لاَ أُغَيِّرُ اسْمًا سَمَّانِيهِ أَبِى. قَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ، فَمَا زَالَتِ الْحُزُونَةُ فِينَا بَعْدُ. رواه البخاري وأحمد وأبو داود[١]:

لە سەعیدی كوڕی موسەییبەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوە (خودایان لێ خۆشنوودبێ) فەرمووی: چوومە خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ناوت چیە! گوتم: ناوم حەزنە ( واتە: هەر دەوهەڵەتو رەقەن) حەزرەت فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): نا، تۆ ناوت سەهلە (واتە: نەرمانیو دەشتو خۆشو ئاسان) منیش بە گوێم نەكردو عەرزیم كرد ناوێ ناگۆڕم كە باوكم لە منی ناوە!

ئیبنو لموسەییب دەیفەرموو: ئیتر لەو ساكەوە كە باپیرم ئەم قسە رەقەی لە رووی پێغەمبەردا كردووەو بە گوێی نەكردووە كە خۆی ناوبنێ سەهل، سەر رەقیو توندیو تیژیمان هەتا ئێستایش لە ناو داماوەو لێمان نابڕێ (ب /ئە/د).

---

[٤] مسلم. آداب: ٥٥٨٤، ٦٦٠، تحفة الأشراف: ١٩٧٧٥.

[١] بخاری. أدب: ٦١٩٠، ٦١٩٣.

٥٤٠٨- عن ابن عمر (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: ان إبْنَةً لعمر كانت تسمى عاصية فسمَّاها رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جميلة. رواه مسلم وابو داود[٢]:

ئیبنو عومەر (خودا لێیان خۆش نوودبێ) فەرمووی: كچێكی عومەر ناوی عاصیە بوو (واتە: یاخی) پێغەمبەر (دروودو سڵاوی خودای لەسەربێ) ناوی نا جەمیلە (واتە: جوان) (م/د/ت).

٥٤٠٩- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَطَاءٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمْ) قَالَ: سَمَّيْتُ ابْنَتِي بَرَّةَ، فَقَالَتْ لِي زَيْنَبُ بِنْتُ أَبِي سَلَمَةَ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): نَهَى عَنْ هَذَا الاِسْمِ وَسُمِّيتُ بَرَّةَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمُ اللَّهُ أَعْلَمُ بِأَهْلِ الْبِرِّ مِنكُمْ، فَقَالُوا: بِمَ نُسَمِّيهَا؟ قَالَ: سَمُّوهَا زَيْنَبَ[٣]:

محەمەدی كوڕی عەمری كوڕی عەطاء (خودایان لێ خۆش نوودبێ) فەرمووی: كچێكم بوو ناوم نا بەڕە (واتە: باش: چاك: خاس)زەینەبی كچی ئەبو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) پێی فەرمووم: پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەربێ) ئەم ناوەی یاساخ كردووە، منیش كاتی خۆی ناوم بەڕە بوو، پێغەمبەر (درוودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خۆتان بە پاكو پاكیزە دامەنێنو تەزكییەی خۆتان مەكەن، هەر خودا بۆ خۆی باش دەزانێ كە كێتان باشە، یا خراپە. جا دەڵێن: قوربان! ئەی ناوی بنێین چی؟ فەرمووی: ناوی بنێن زەینەب ( واتە: نەرمولێ. ئیتر ناویان نام زەینەب. (ش/د- خودا لێیان خۆشنوودبێ).

٥٤١٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَتْ جُوَيْرِيَةُ اسْمُهَا بَرَّةَ، فَسَمَّاهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جُوَيْرِيَةَ وَكَانَ يَكْرَهُ أَنْ يُقَالَ: خَرَجَ مِنْ عِنْدِ بَرَّةَ. رواهما الثلاثة[٤]:

---

[٢] مسلم. آداب: ٥٥٦٩. أبو داود. أدب: ٤٩٥٢. ترمذي. أدب: ٢٨٣٨ تحفة/ ٨١٥٥.

[٣] مسلم. آداب: ٥٥٧٣، ٥٥٧٤. أبو داود. أدب: ٤٩٥٣ تحفة الأشراف: ١٥٨٨٤.

[٤] مسلم. ذكر ودعا: ٦٨٥١، ٥٥٧١. أبو داود. صلاة: ١٥٠٣ تحفة الأشراف: ٦٣٥٨. تجريد/٥/٢٢٤ رقم/ ١٩٥٩ = ٦١٩٢ فتح.

**ئیبنو عەبباس** (ڕەزای خودایان لێبێ) **فەرمووی: لە پێش دا جوبرییە ناوی بەڕە بوو (واتە: چاك) پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **كە مارەی كرد بۆ خۆی ناوی نا جویرییە. چونكە پێی ناخۆش بوو بگوترێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەلای بەڕەوە دەرچووە دەرێ، چونكی ئەم قسەیە بۆنی ئەوەی لێ دێ كە چاكەی بەجێ هێشتبێ. (ش/د).**

**٥٤١١- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ أَخْدَرِيِّ** (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَجُلاً يَسمی أَصْرَمُ كَانَ فِي النَّفَرِ الَّذِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّی اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّی اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **مَا اسْمُكَ؟ قَالَ: أَنَا أَصْرَمُ. قَالَ: بَلْ أَنْتَ زُرْعَةُ**[٥]**:**

**ئوسامەی كوڕی ئەخدەری** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: پیاوێ ناوی ئەصرەم بوو ( واتە: گوێكرتاوگوێپڕاو) لەو دەستەیەدا بوو كە هاتن بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێی فەرمووی: ناوت چییە؟ گوتی: ناوم ئەصرەمە، فەرمووی: خەیر، بەڵكوو تۆ لە ئێستا بەدواوە ناوت زورعەیە ( واتە: مەزراو شینایی) (د-س/صالح).**

**٥٤١٢- عَنْ شُرَيْحِ بنِ هَانِئٍ عَنِ أَبِيه** (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) **أَنَّهُ لَمَّا وَفَدَ إِلَی رَسُولِ اللّٰهِ** (صَلَّی اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **مَعَ قَوْمِهِ سَمِعَهُمْ يَكْنُونَهُ بِأَبِي الْحَكَمِ فَدَعَاهُ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّی اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَقَالَ: إِنَّ اللّٰهَ هُوَ الْحَكَمُ وَإِلَيْهِ الْحُكْمُ فَلِمَ تُكْنَی أَبَا الْحَكَمِ. فَقَالَ: إِنَّ قَوْمِي إِذَا اخْتَلَفُوا فِي شَيْءٍ أَتَوْنِي فَحَكَمْتُ بَيْنَهُمْ فَرَضِيَ كِلاَ الْفَرِيقَيْنِ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّی اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)**: مَا أَحْسَنَ هَذَا فَمَا لَكَ مِنَ الْوَلَدِ؟ قَالَ: لِي شُرَيْحٌ وَمُسْلِمٌ وَعَبْدُ اللّٰهِ. قَالَ: فَمَنْ أَكْبَرُهُمْ؟ قَالَ: قُلْتُ شُرَيْحٌ. قَالَ: فَأَنْتَ أَبُو شُرَيْحٍ**[٦]**:**

**شوورەیحی كوڕی هانی فەرمووی: باوكم فەرمووی: ئەو كاتە كە لەگەڵ دەستەی نوێنەری گەلەكەما چووین بۆ لای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **بەر گوێی دەكەوێ كە بەمن دەڵێن: ئەبولحەكەم (**

---

[٥] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٦] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

واتە: حوكم بەدەست: حوكمدار: فەرماندار) جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بانگی كردمو فەرمووی: تەنیا هەر خودا خۆی حەكەمەو حاكمی ڕاستو دروست هەر خۆیەتی و حوكمو فەرمانڕەوایی و بڕیاری كۆتایی هەر بە دەست خۆیەتی، جا كەواتە بۆ پێت دەڵێن ئەبو لحەكەمو ئەم كەسناوو كونیەیەت لە چییەوە هاتووە (ئەمە بۆنی خودایەتی لێ دێ). منیش عەرزیم كرد: هۆی ئەوەیە كەوام پێ دەڵێن چونكە هۆزەكەم لەناو خۆیاندا ئەگەر لەسەر شتێ تێكچوونو ڕێك نەكەوتن دێنە لای من، منیش فەرمانێ دەردەكەمو بڕیارێ دەدەم لە نێوانیاندا، هەر دوو لاپەسەندی دەكەنو پێی ڕازی دەبن، لەبەر ئەمە پێم دەگوترێ ئەبول حەكەم. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە شتێكی گەلێ جوانە، باشە ئەدی كوڕەكانت ناو یان چییە؟ گوتم: شورەیحو موسلیمو عەبدوڵڵام هەیە: فەرمووی: كامەیان گەورەیانن؟ گوتم: شورەیح، فەرمووی: كەواتە تۆ ناوت ئەبو شورەیحە، واتە: باوكی شورەیح. (د-س/ صالح-ن).

٥٤١٣- وَقَالَ مَسْرُوق: لَقِيتُ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) فَقَالَ: مَنْ أَنْتَ؟ قُلْتُ: مَسْرُوقُ بْنُ الأَجْدَعِ. قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: الأَجْدَعُ شَيْطَانٌ. روى هذه الثلاثة أبو داود[٧]:

مەسرووقیش دەڵێ: تووشی عومەر بووم، فەرمووی: تۆ كێیت گوتم: مەسرووقی كوڕی ئەجدەعم، عومەر فەرمووی: بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ) ئەجدەع ناوی شەیتانێكە كەواتە نابێ بكرێ بەناوی موسوڵمانو ئادەمیزاد (د-س/صالح).

٥٤١٤- وَغَيَّرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْمَ الْعَاصِ وَعَزِيزٍ وَعَتَلَةَ وَشَيْطَانٍ وَالْحَكَمِ وَغُرَابٍ وَحُبَابٍ وَشِهَابٍ فَسَمَّاهُ هِشَامًا وَسَمَّى حَرْبًا سَلْمًا وَسَمَّى الْمُضْطَجِعَ الْمُنْبَعِثَ وَأَرْضًا تُسَمَّى عَفِرَةَ سَمَّاهَا خَضِرَةَ وَشِعْبَ الضَّلَالَةِ سَمَّاهُ شِعْبَ الْهُدَى وَبَنِي الزِّنْيَةِ سَمَّاهُمْ بَنِي الرِّشْدَةِ وَسَمَّى بَنِي مُغْوِيَةَ بَنِي رِشْدَةَ. رواه أبو داود[٨]:

---

[٧] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[٨] رواه أبو داود وقال تركت أسانيدها للاختصار (شرحه).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئەم ناوانەی گۆڕی: عاصی و عەزیزو عەتەلەو شەیتانو حەکەمو غورا بو حوباب، شیهابیشی گۆڕیو ناوی هیشام، حەربی ناونا سەلم، موزتەجیعی ناونا مونبەعیث، زەوی یەك ناوی عەفیرە بوو ناوی نا خەزیرە، شوعەبول ضەلالەتی ناو نا شوعەبولهودا، بەنی زینیەو بەنی موغوییەی ناونا بەنی ریشدە بەنی زینیەو بەنی موغوییە، واتە: نەوەی خێز، بەنی ریشدە واتە: نەوەی مەرد. (د)

٦٦) ناز ناوو کەسناو (واتە: لەقەبو کونیە) : (اللقب والكنية)

٥٤١٥- ← (ب - ٧ ز - ٣٢ ل - ١٥٤ ف - ٧)[١].

٥٤١٦- ← (ب - ٥ ز - ٩ ل - ٦٣ ف - ٥)[٢].

٥٤١٧- ← لەباسی (گاڵتەکردن دروستە) دا رابورد. حەدیثی (یا أبا عمیر مافعل النغیر)[٣].

٥٤١٨- وَقَالَتْ: عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها): يَا رَسُولَ اللَّهِ كُلُّ صَوَاحِبِى لَهُنَّ كُنًى، قَالَ: فَاكْتَنِي بِابْنِكِ عَبْدِ اللَّهِ فَكَانَتْ تُكَنَّى بِأُمِّ عَبْدِ اللَّهِ. رواه أبو داود بسند صالح[٤]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: قوربان! ئەی رەوانە کراوی خودا! هەویو هاوڕێکانم هەموو کەسناویان هەیە من نەبێ، هەر کەسەیان بەناوی منداڵێکەوە ناوو شۆرەتی دەرکردووە، وەك ئوممو سەلەمەو ئەوانی تر؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): دەی تۆیش بەناوی عەبدوڵڵای کوڕی ئەسمائی خوشکتەوە کەسناو بۆ خۆت دابنێو خۆت ناوبنێ: ئوممو عەبدوڵڵا: دایکی عەبدوڵڵا، خۆ ئەوەندەت خۆش دەوێ بۆنی کوڕی خۆتت پێیەوە ناوە! فەرمووی: ئیتر لەوە دوا ئوممو عەبدوڵڵا: دایکی عەبدوڵڵا بوو بە کەسناوی

---

(١) تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/ ٣٢ رقم/٧/٤١١٣.

(٢) تقدم فی مجلد خامس. تسلسل/٩ رقم/٥/٣٢٩٢.

(٣) تقدم فی مجلد تاسع. تسلسل/٣٥ رقم/٣ ل- ٩١ ج/١/٤٨٦٠.

(٤) بسند صالح لأبی داود.

عائیشەو پێیان دەگەت: ئوممو عەبدوڵلاٚ. واتە: دایکی عەبدوڵلاٚ (د-س/صالح). شێخی عەینی- رەحمەتی خودای لێبێ و لە پیت و بەرەکەت و هیممەتی رۆحانییەتی بێ بەش نەبین) لە شەرحی صەحیحی بوخاریدا لەبەرگی بیست و دوودا لەلاپەرە (١٤٢) دا دەفەرموێ: لەدوا پێغەمبەرو ئەبو بەکر خۆشەویستترین کەس لەکن عائیشە عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر بوو، عائیشە پووری بوو، زۆرتر خۆی بە خێوی دەکردو هەر خۆشی پەروەردەی دەکرد، جا بۆیە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دایدەنێ بە کوڕی، وە منیش بەو شێوەی سەرەوە تەرجەمەم کرد. ئەم جۆرە تەعبیرو نیسبەتە دوورن لەتەبەننی، ئەمە ئەو فەرموودەیە دەسەلمێنێ کە دەفەرموێ: الخالە بمنزلة الأم. پوور لە جێی دایکە. (وەرگێڕ)

## ٦٧) لەکاتی بانگ کردندا دروستە دوایی ناو بکرتێنرێ، یاهەندێ پیت لە ناو فڕە بدرێ : (یجوز النداء بالترخیم)

٥٤١٩- ←(ب – ٥ ز – ٣٧ ل – ١٥٤ ف – ٤)[١].

٥٤٢٠- وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا أَبَا هُرٍ. رواهما البخاري[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی ئەبو هیر! (ب).

٥٤٢١- ← (ب – ٤ ز – ٩٠ ل – ٢٣٧ ف – ١٢)[٣].

لێرەدا ئاوایە: ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئوممو سولەیم لە ناو بارگەو بنەکەدا بوو، ئەنجەشە- کە نۆکەرێکی رەشکەلەی پێغەمبەر بوو وشترەکانی لێ دەخوڕی، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی

---

(١) تقدم فی مجلد/٥ تسلسل/ ٣٧ رقم/٤/٣٤٣٣

(٢) سبق فی مجلد/١٠ تسلسل/١ رقم/١/٥١٢٦.

(٣) تقدم فی مجلد/٤ تسلسل/٩٠ رقم/١٢/٣١٢٧.

ئەنجەش! هێواش لە سەرەخۆ ولاَخەكان لێخورە، چونكە با ریان ئافرەتە كە وەك شووشە ناسكن! (ش).

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بۆ روون كردنەوەی ئەم باسە دەڵێین: گەرچی ناو تەرجەمە ناكرێ بەلاَم تێگەیشتنی تەواو لەم باسە بەسراوە بە واتاو مەبەستی ناوەكانەوە، بگرە پەیوەندی بە رێزمانیشەوە هەیە، ئایا (تەرخیم) یا پاشكرتاندی ناو لە كوردیدا هەیە یانا، ئەگەر هەیە دەق وەك پاشكرتەی عەرەبی وایە.ئەوەی كە پەیوەندی بە مەبەستی ئێمەوە هەیە ئەم پرسیارە گرنگەیە: ئایا حوكمێكی شەرعی كە بۆ واژە عەرەبی یەكە ئیسپات دەبێ، بە هۆی هەر هۆیەكەوە ئەو حوكمەی بۆ ئیسپات دەبێ، وەك جوانی مەعناكەی، یا ناشیرینی لە فظەكەی، یا هۆیەكی رِێزمانی، ئایا هەمان حوكم بۆ تەرجەمەی ئەو لە فظەش ئیسپات دەبێ یانا؟

كەسێ بەوردی سەرەنجی ئەم ناوەو تەفسیرەكەی بدا لەم باسەی ژێر دەستماندا، بەباشی تێ دەگا، لە بوخاری شەریف و لە صەحیحی موسلیمی پیرۆزدا دەفەرموێ: أخنع الأسماء عند الله رجل تسمى بملك الأملاك، قال سفیان یقول غیره: تفسیره شاهان شاه. یاسەرنجی ئەم فەرمایشتەی شێخی نەوەوی (رەزای خودای لێبێ) بدا هەمان مەبەست بەباشی تێ دەگا، نەوەوی دەفەرموێ:

{وأما قولة فلا تزيدن على – هو بضم الدال – ومعناه: الذى سمعته أربع كلمات وكذا روايتهن لكم فلا تزيدوا على في الرواية ولاتنقلوا عنى غير الأربع وليس فيه منع القياس على الأربع وأن يلحق بها ما في معناها قال أصحابنا يكره التسمية بهذه الأسماء المذكورة في الحديث وما في معناها}.

تەماشای عەینی بەرگی ٢٢ لاپەرە (٢١٥) بكە هەروەها تەماشای شەرحی صەحیحی موسلیم بەرگی ١ ل –١١٨بكە.

جاوا بە پێی تەوانا بۆ ئەم مەبەستە مەعنای ناوەکان بە کوردی دەنووسینو دەڵێین: عەبدوڵلا واتە: بەندەی خودا: عەبدی خودا: خودا پەرست عەبدوڕەحمان: بەندەی خودای میهرەبان حاریث: کاسب: فرمانکەر. هەممام: مشوور خۆر: دەربایست، یاخود: خەمخۆر: خەمخوار. حەرب: شەڕ، جەنگ: جەنگی موڕە: تاڵ: تاڵێ: قاسم: دابەشکەر، قاسم ناوی کوڕە گەورەی پێغەمبەر بوو، لەبەر ئەوە ئەبولقاسم بوو بە کەسناوو کونیەی حەزرەت (دروودو سڵاوی خودای لەسەربێ) ئەم کەسناوەی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هێمایە بۆ ئەوە کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بەفەرمانی خودا ئەو خێرو خۆشیو بەشو بارەیەی کەلە خوداوە دانراوە بۆ بەندەگان بە پێی شانی خۆیان دابەشی دەکا بەسەریاندا، جا تائیشتیباه لەزاتو صیفەتو ناوو نیشانی تایبەتی حەزرەتدا پەیدا نەبێ لە ژیانی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم کەسناوی ئەبو لقاسمە بۆ کەسی تر دەستی نەدەدا، یەسار: ئاسان. یاخود: دەوڵەمەندیی: دارایی. رەباح: قازانج: سوود. نەجاح: سەرکەوتن: سەرکەوت. ئەفلەح: ڕزگار نافع: سوود بەخش. یەعلا: بەرزە: سەربەرز. بەرەکە: پیتو فەڕو بەرەکەت. زەینەب: نەرمۆڵ: گۆشتنە. جوویرییە: کەنیز. یا کەنیشك: کەنی: کچکە: کچۆڵە. عاصی: یاخی عەزیز: تەواناو زاڵ، یەکێکە لەناوە جوانەکانی خودا. عەتەلە: نوێڵ. غوراب: قەلە ڕەش.

حوباب: ناوی شەیتانێکە. شیهاب: نەیزەك: شووڵە ئاگر: ئەستێرە کشان. هیشام: داربڕ. حەربو سەلم: جەنگو ئاشتی موزتەجیع: پالکەوتوو. مونبەعیث: راپەڕیو. عەفیرە: شۆڕەکات. خەضیرە: سەوزەلانی. شوعەبول ضەلالە: هەردەی سەرلێشێوان. یاخود دەرەی گومڕایی شوعەبولهودا: ڕێگەی ڕاست. یا ڕێگەی ڕزگاری. بەنی زنیە: نەوەی حیز. بەنی موغوییە: خێلی سۆزانی. بەنی ریشدە: نەوەی مەرد.

جالێرەدا دەڵێین: ناو چ بە عەرەبی بێ وە چ بە کوردی یابە هەرزمانێکی تربێ دەبێ ئەم مەرجانەی تیا بێتەجێ:

١- ناوێکی ڕێك‌و پێك كە لەفظو مەعنای وەك یەك جوان‌و پەسەندبن.

٢- نەبێ بەهۆی لێگۆڕان‌و ڕەشبینی‌و شتی وا، بەڵكوو ببێ بە هۆی وریایی‌و چالاكی‌و نوقلانەی خێرو فاڵی باش‌و ببێ بەنیشانەی بەندایەتی خودا.

٣- نەبێ بەهۆی خۆ بە پاك زانین‌و بایی بوون‌و خود پەسەندیی (تەزكییە) و هاوبەشی و موشارەكە لە زات‌و صیفاتی (خودای گەورەدا). ئەمە لەلایێ.

داخەكەم لێرەدا دوو خاڵ هەیە هەردوكیان دڵ تەزێنن:

أ- ناوی ناشیرین - هەتا ئێستایش - لە ناو عەرەبە دەشتەكی- یەكاندا زۆر زۆرە. بگرە لە ناو كوردەواریشدا هەر ماوە.

ب- لەناو كوردەواریشدا ناوی پەیوەندو موسنەد بۆ لای ناوە جوانەكانی خودا زۆر كەمن، وەك: خوا كەرەم، خوا داد، خودا بەخش، خودیدە. چونكە تا ئێستایش ناوە جوانەكانی خودا لە كوردیدا كۆنە كراونەتەوە، یاخود لە عەرەبی‌یەوە تەرجەمەیەكی جوان نەكراون. ئیتر پەنا بە خودا تەماشای باسی ناوە جوانەكانی خودا بكە.

(وەرگێڕ - ١٩٨٦/٧/١٤)

## بەشی شەشەم: باسی هەڵبەست‌و هۆنراوەو گۆرانی‌و شتی وا كەلەم بابەتەبن

### ٦٨) هەڵبەست لە خودی خۆیدا باش نییە

### الفصل السادس: في الشعر والغناء ونحوهما

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُّبِينٌ - سورة يس - ٦٩/٣٦}.

واتە: ئێمە (بەناردنی قورئان بۆ سەر دڵی موحەممەدی كوڕی عەبدوڵڵا كە پێغەمبەری خودایە) ئەو زاتەمان فێری هونەری هەڵبەست‌و هۆنینەوەی

شیعرو، یاسای دانانی هۆنراوە نەکردووە، ئەوە لەو ناوە شێتەوەو کاری وا شیاوی پایەو شانی ئەو نییە، پایەی پێغەمبەری جیایە لە پلەی شاعیری،پێغەمبەریی پایەیەکی پیرۆزە، خەڵاتی خودایییە وەلێ شاعیری سۆزی دەروونی ئادەمیزادە، ئەم قورئان و فەرمایشتانەی کە ئێمە ناردوومانە بۆ موحەممەد شیعرو شتی وانییە وەك ناموسوڵمانەکان دەڵێن، چونکە شیعر دەستوور و یاسای تایبەتی خۆی هەیە، کێشی هەیە، سەروای هەیە، مەعناکەشی برێتی یە لە خەیاڵو ئەندێشەو ئاوات و خۆزگەو پڕو پاگەندەو فیشاڵو سۆزی دەروونی شاعیران، وەلێ ئەمە برێتی یە لە یادو ذیکری خودا، ڕابەری و ڕێنمایی هۆشیاران دەکا بۆ ڕێگەی پیرۆزیی هەر دوو جیهان و نامەیەکی نوسراوی پیرۆزی ئاسمانی یە، ناوی خۆی بە خۆیەوەیە کە قورئانێکی ئاشکراو ڕووناکەو پڕە لە دانایی و بڕیاری خوداو، مەسئەلەکانی شەرعی شەریف.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَالشُّعَرَاء يَتَّبِعُهُمُ الْغَاوُونَ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ، وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لَا يَفْعَلُونَ، إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِن بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ - سورة الشعراء - ٢٦/ ٢٢٤ - ٢٢٧}.

واتە: قورئان کلامو فەرمودەی خودایە، نە هێنراوی شەیاتین و نە داهێنراوی جنۆکەو نەهۆنراوەی هەستیارو هۆنەرەو نە هونەری شاعیرانە، فەرمایشتی پڕ لە نووررو ڕەحمەت و حیکمەت وەك ئەم قورئانە دەبێ، ئەمە لە کوێ و قسەو ها شەو هووشەی هۆنەران و شاعیران لە کوێ؟ بە پێچەوانەوە شاعیران پێشەوای کۆمەڵی سەرکەش و دەستەی گومڕایانن، مامۆستای درۆن، پەیڕەوەکانیان کە سانێکی بێ ئیلتیزامن وەك خۆیان، تەماشا دەکەی لە هەموو ئاشێ لێ دەکەن! لە هەموو مەنجەڵێکا ئەسکوێن! وەك دێوانەی سەرگەردان لە هەموو شیوو دۆڵو دەرەیەکا مێشە کزەیانە، بەڕاست و بە درۆ دەم لە هەموو باس و خواسێ دەکوتن، بەڕێ و بەبێ ڕێ هەر سەر دەنێنەوە، قسەی دەم و

دڵیان یەك نییە، ڕەفتارو كرداریان لەیەك جیایە، دیمەنو ناو دڵیان ئاسمانو ڕیسمانە ئەمە ڕێڕەوی سەرەكی شاعیرانە بە گشتی، وەلێ خوا هەقە كۆمەڵێ لە شاعیران لەم قاعیدەیە موستەسنان، لەگەڵ ئەوەشا كە شاعیرن بەڵام موسوڵمانی چاكن خاوەنی دەمو زمانی پاكن، خاوەن باوەڕو مەبدەئن، كارو كردەوەیان جوانو باشە، ڕەفتارو كرداریان جوانە، باوەڕیان بە دینی خودا هەیە، لە سەری دەكەنەوە، یادو ذیكری خودا بەزۆری دەكەن، سەر بۆ زوڵمو زۆرو ناهەقی شۆڕ ناكەن، بە هۆنراوەی ناسكو ڕاستو دروستو بە شیعری جوانو دڵگیر باسی ئیسلام دەكەنو لەسەر موسوڵمانان دەكەنەوە، هەقی خۆیان لە ناحەزو لەو كەسانە دەستێنن كە ستەمیان لێ كردوون!

٥٤٢٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ أَحَدِكُمْ قَيْحًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا. رواه الأربعة[1]:

ئیبنو عومەر (خۆشنوودیی خودایان لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودو ڕەحمەتو سڵاوو پیرۆزیی خودای گەورەی لە سەربێو سەرو ماڵو ڕۆحو هەستو نەست بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزیبێ.. ئامین) دەفەرموێ: ناوسكتان پڕبێ لە كێمو زووخاو گەلێ لەوە چاكترە بۆ ئێوە كە پڕبێ لە شیعرو هۆنراو! (ش/د/ت).

٥٤٢٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ نَسِيرُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْعَرْجِ إِذْ عَرَضَ شَاعِرٌ يُنْشِدُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُذُوا الشَّيْطَانَ أَوْ أَمْسِكُوا الشَّيْطَانَ لأَنْ يَمْتَلِئَ جَوْفُ رَجُلٍ قَيْحًا خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمْتَلِئَ شِعْرًا. رواه مسلم[2]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ (لە عەرج) لە خزمەت حەزرەتدا بووین، بەڕێوە بووین دەڕۆیشتین، لە ناكاو بوێژ (شاعیر) ێ سەری هەڵ دا، بە نقام هەڵبەستی دەخوێندەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ)

---

(١) تجريد البخاري/٥/٢٢٣ رقم/ ١٩٥٥ = ٦١٥٤ فتح مسلم. شعر: ٥٨٥٣، ٥٨٥٤. ترمذي. ادب: ٢٨٥٢. ابن ماجه/ أدب: ٣٧٦٠ تحفة الأشراف/ ٣٩١٩.

(٢) مسلم. شعر: ٥٨٥٥. ترمذي. أدب: ٢٨٥٢. ابن ماجه/ أدب: ٣٧٦٠تحفة/ ٣٩١٩.

فەرمووی: ئەو شەیتانە بگرن، یا فەرمووی: ئەم شەیتانە ڕابگرن، لە ڕاستی دا ناو دڵی پیاو پڕ بێ لە کێمو زووخاو هێشتا ئەوەی باشترە لەوە کە ناو دڵی پڕبێ لە هەڵبەستو هۆنراو! (م – خودای لێ ڕازی بێ).

**٦٩) پێغەمبەر** درووودی خودای لەسەر **شیعری خەڵکی دەخوێندەوە** : (**النبي ﷺ قاله متمثلا**)

٥٤٢٤- → (ب – ٧ ز – ٧٦ ل – ٢٥٥ ف – ٢)[1].

٥٤٢٥- وَسُئِلَتْ عَائِشَةُ (رَضِي اللهُ عَنْهَا): هَلْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَمَثَّلُ بِشَيْءٍ مِنَ الشِّعْرِ؟ قَالَتْ: كَانَ يَتَمَثَّلُ بشعر ابن رواحع ويتمثل ويقول: ويأتيك بالاخبار من لم تزود. رواه الترمذي[2]:

لە عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) پرسیار کرا: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) ئیستیشهادی بە شیعر دەکردو، هەڵبەستی کەسێکی تری بە نموونە دەهێنایەوە؟ فەرمووی: ئا، هەڵبەستی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی بە بۆنەی هەندێ شتەوە دەخوێندەوە، وەك ئەوە ئەم هەڵبەستەی طەرەفەی بۆ بەڵگەو ئیستیشهاد دەخوێندەوەو دەیفەرموو:

ستبدی لک الأیام ما کنت جاهلا

(ویأتیک بالأخبار من لم تزود)

واتە:

زەمان مامۆستای بێ مامۆستایە

بەپێی خۆی هەواڵ دێنێ بابایە!

بەپەخشانیش واتە: ئەوەی نایزانی زەمانەو ڕۆژگار پێتی دەزانێ، گەلێ جاریش کابرایێ لە لابەلاوە بە بێ پێ گوتنو ڕاسپاردن بە پێی خۆی هەواڵو دەنگوباست بۆ دێنێ (ت – س/ص).

---

[1] تقدم فی مجلد سابع تسلسل/٧٦ ل/٢٥٥ ج/١ رقم/٢/٤٢١٧.

[2] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٥٤٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَصْدَقُ كَلِمَةٍ قَالَهَا الشَّاعِرُ كَلِمَةُ لَبِيدٍ أَلاَ كُلُّ شَيْءٍ مَا خَلاَ اللَّـهَ بَاطِـلٌ وَكَـادَ أُمَيَّـةُ بْـنُ أَبِـي الصَّلْتِ أَنْ يُسْلِمَ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

ئـەبو هـورەيرە (ڕەزای خـودای لێبـێ) فـەرمووی: خۆشەویـست (دروودی خـودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕاستترین گوتەیێ کە هۆنەر گوتبێتی ئەم گوتەیەی لە بیدە کە دەڵێ:

ألا كل شئ ما خلا الله باطل

(وكـل نعيم لا محلة زائـل)

واتە:

ئــــەم دنیایــــە كــــاوو بایــــە

هــــیچو پــــووچو بــــێ نەوایــــە

نــــازو بــــەهرەی بــــێ بەقایــــە

ئــەوەی ڕاســت بــێ بــەس خوایــە

بەپەخشانیش واتە: دنیاو نازو نیعمەتو خۆشی دنیا هەمووی هیچو پووچو کاو بایە، ئەوەی ڕاست بێو تاسەربمێنێ هەر خودایەو بەس.حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووشی: ئومەییەی کوڕی صەلتیش لە شیعرەکانیەوە وا دەردەکەوێ خەریك بووە ئیسلام ببێ (ش/ت).

## ٧٠) هەڵبەستی وا هەیە پڕە لە حیکمەتو دانایی : (أن من الشعر حكمة)

٥٤٢٧- عَنْ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكْمَةً. رواه البخاري وأبو داود والترمذي[١]:

---

[٣] تجريد البخاري/ ١٩١/٤ رقم/ ١٥٠٤ = ٣٨٤١، ٦١٤٧، ٦٤٨٩. مسلم. سعر: ٥٨٤٨ – ٥٨٥٢. ترمذي. أدب: ٢٨٥٠. ابن ماجه/ أدب: ٣٧٥٧ تحفة الأشراف: ١٤٩٧٦.

[١] تجريد/٥/٢٢٢ رقم/١٩٥٤ = ٦١٤٥ فتح.

ئوبەیی کوڕی کەعب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڕاستی بازێ لە شیعر حیکمەتە، هەندێ لە هەڵبەست دانایییەکی شیرینی واتیادا (ب/د/ت).

٥٤٢٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَعَلَ يَتَكَلَّمُ بِكَلَامٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا وَإِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حِكَماً[٢]:

ئیبنو عەبباس (خۆشنوودیی خودایان لێبێ) فەرمووی: جارێ عارەبێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی جەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) شانی کرد بە قسە کردندا، کابرا قسەی لە قسەی نەستەقترو جوانتر بوو، جا بەم بۆنەیەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەڕاستیدا هەندێ قسەی رەوان وەك سیحرو جادوو وایە، هەروەها هەندێ هۆنراو زانستی بەرزو دانایی یەکی شیرینی تیایە (د- س/صالح).

٥٤٢٩- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا وَإِنَّ مِنَ الْعِلْمِ جَهْلاً وَإِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حُكْمًا وَإِنَّ مِنَ الْقَوْلِ عِيَالاً. قَالَ: صَعْصَعَةُ أَمَّا قَوْلُهُ: إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا. فَالرَّجُلُ يَكُونُ عَلَيْهِ الْحَقُّ وَهُوَ ب مِنْ صَاحِبِ الْحَقِّ فَيَسْحَرُ الْقَوْمَ بِبَيَانِهِ فَيَذْهَبُ بِالْحَقِّ وَأَمَّا قَوْلُهُ: إِنَّ مِنَ الْعِلْمِ جَهْلاً. فَيَتَكَلَّفُ الْعَالِمُ إِلَى عِلْمِهِ مَا لاَ يَعْلَمُ فَيُجَهِّلُهُ ذَلِكَ وَأَمَّا قَوْلُهُ: إِنَّ مِنَ الشِّعْرِ حُكْمًا. فَهِيَ هَذِهِ الْمَوَاعِظُ وَالأَمْثَالُ الَّتِي يَتَّعِظُ بِهَا النَّاسُ وَأَمَّا قَوْلُهُ: إِنَّ مِنَ الْقَوْلِ عِيَالاً. فَعَرْضُكَ كَلاَمَكَ وَحَدِيثَكَ عَلَى مَنْ لَيْسَ مِنْ شَأْنِهِ أَوَلاَ يُرِيدُهُ. رواهما أبو داود. نسأل الله التوفيق. آمين[٣]:

بورەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغومبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڕاستی هەندێ پەخشانو قسەی نەستەقو رەوان هەیە وەك

---

(٢) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(٣) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

جادوو کار لە دڵو مێشکی گوێگر دەکا، هەروەها هەندێ لەزانست نەفامیو نەزانیینە، وەبازێ لە شیعر پڕە لە پەندو ئامۆژگاریو دانایی، وەبازە قسەیێ هەیە بێجاکردنە. صەعصەعە کەلە زانایانی چینی دوەمی موسوڵمانانە دەفەرموێ: ئەوەی کە دەفەرموێ: بەڕاستی هەندێ پەخشانی ڕەوانو قسەی ڕەوانو گوفتوگۆی بەرز هەیە وەك جادوو کار لە دڵو هۆشی گوێگر دەکا، ئەمە وەك ئەوە پیاوی وا هەیە هەقی کەسێکی تری لە سەرە، وەلێ ئەم لە خاوەن هەقەکە بە دەمو پلترەو قسە زانترە، جا بەقسەی قوتو بە پەخشانی ڕەوانو ڕێكو جوان چاو بەست لە خەڵکەکە دەکاو گوێگرەکان لاس دەداو، مافی کابرا دەفەوتێنێو بە ناڕەوا دەیبا بۆ خۆی!

ئەوەیشی کە دەفەرموێ: زانستی واهەیە زانست نییە، بەڵکوو نەفامیو نەزانیینە. ئەمەیش وەك ئەوە کە هەندێ لە زاناکان – بە زۆرە ملێ (بەتەکەللوف) – زانستو عیلمەکەیان تێکەڵو پێکەڵ بە هەندێ شتی تر دەکەن کە نایانزانن، ئیتر ئەوە دەبێ بە هۆی ئەوە کەلە پایەی زانایان دابەزنو بچنە ریزی نەزانو نەفامان!

ئەوەیشی دەفەرموێ: بازێ لە شیعر پڕە لە پەندو ئامۆژگاریو دانایی، ئەمەیش وەك ئەو پەندو ئامۆژگاری و داستانو قسە نەستەقو بە توێکلانە کە خەڵکیان پێ تەمێ دەبێ، ئەوەیشی کە دەفەرموێ: بازە قسەیێ هەیە بێجاکردنە، ئەمەیش وەك ئەوە کە تۆ قسەیێ بۆ کەسێ بکەی کە ئەو کەسەیە سەر لەو قسەیە دەرنەکاو پەیوەندی بە شتی واوە نەبێ، یا ئەو کەسە حەزی لەو قسەیەو باسە نەبێ (د–س/ص).

## ٧١) لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر) هەڵبەست دەخوێندرایەوە بۆی، ئەویش گوێی لێ دەگرت

## أنشاد الشعر بحضور النبيِّ ﷺ

٥٤٣٠- عن أبي هريرة (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قـال: ان أخـا لكم لايقول الرفث وهو أبن رواحة قال (رَضِي اللهُ عَنهُ)(١):

وفينـــا رســـول الله يتلـــو كتابـــهُ

إذا انـــشق معـــروف مـــن الفجـــر ســـاطع

ارانـــا الهـــدى بعـــد العمـــى فقلوبنـــا

بـــه موقنـــات أن ماقـــال واقـــع

يبيـــت يجـــافي جنبـــهُ عـــن فراشـــه

إذا اســـتثلقت بالكـــافرين المـــضاجع

رواه البخاري:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیبنو رەواحەی براتان - کە قسەی هیچو پووچ ناکا - گوتوویەتی:

وفينـــا رســـول الله يتلـــو كتابـــةُ

إذا انـــشق معـــروف مـــن الفجـــر ســـاطع

ارانـــا الهـــدى بعـــد العمـــى فقلوبنـــا

بـــه موقنـــات أن ماقـــال واقـــع

يبيـــت يجـــافي جنبـــةُ عـــن فراشـــه

إذا اســـتثلقت بالكـــافرين المـــضاجع

---

(١) بخارى. أدب: ٦١٥٠.

واتە: پێغەمبەری خودا (درودو سڵاوی خودای گەورەی لێبێ) وا لە ناو ماندا، لەگەڵ شەبەقی بەیاندا بەرنوێژیمان بۆ دەكاو قورئانمان بۆ دەخوێنێ كە نامەی پیرۆزی (خودای گەورەو مەزنە)، ڕێگەی ڕاستی پێ نیشان داوینو لە ڕێگەی چەوت رزگاری كردووینو لە كوێرەوەری كوێریو لەچەرمە سەریی سەرگەردانیو لە كوێرە ریی سەر كوێری قوتاری كردوین، ئێمە بە دڵ باوەڕمان هەیە كە هەرچی ئەو پێغەمبەرە دەفەرموێ ڕاستو دروستو رەوانەو زوو یا درەنگ دێتە دیو روودەدات، نیشانەیەكی بەرزی تری ئەو پێغەمبەرە نازدارە ئەوەیە: كاتێ كە خەڵكو بێ باوەڕو ناموسوڵمانەكان تێر خەو دەبنو لە شەودا لاڵو پاڵ دەكەونو لە گەرمەی خەودا خرپەی خەویان دێو پرخو هوڕیانە ئەو زاتە پیرۆزە لەو كاتەدا لە باتی خەوتنو پاڵ كەوتن سەر گەرمی شەو نوێژكردنەو گەرمەی عیبادەتو خودا پەرستی یەتی! بەهەڵبەستیش واتە:

وا لـــە ناومانــــدا رەهبــــەری خـــــودا
نوێــژمان بــۆ دەكـــا لەگـــەڵ شـــەبەقدا
قورئــــانی نامــــەی خـــــودا دەخوێنــــێ
چـاو (بەنــەمری گــوێ) گـوڵاو دەپــژێنێ
كوێر بووین، قوتاری كـردین لە كـوێری
چـەن خۆشـە خۆشـی، پـاش تـاڵیو سـوێری
دڵنیــــاین هەرچــــی دەفـــــەرموێ وایــــە
دێتـــە جـــێ چــونكە وەحــی خودایـــە!
بەشــــەو بێـــــدارە لــــە خــــەوگا دوورە
ســەر گــەرمی نوێــژی سەرچـاوەی نـــوورە
بەتایبەت كاتێ كە خۆش دەبێ خەو
بـــۆ ناموســـوڵمان لـــە پـــاش نیوەشـــەو

(بوخاری – خودای لێ رازی بێ).

٥٤٣١- ← (ب – ٥ ز – ٥٧ ل – ١٩٠ ف – ١)[٢].

٥٤٣٢- ← (ب – ٥ ز – ٥٧ ل – ١٩٢ ف – ٤)[٣].

٥٤٣٣- ← (ب – ٥ ز – ٥٧ ل – ١٩١ ف – ٣)[٤].

**بەڵام لەم شوێنەدا ئاوایە: عوروە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە خزمەت عائیشەدا خەریك بووم جمێن بە حەسسان بدەم. عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جنێوی پێ مەدە، چونكە ئەو پیاوە لە كاتی خۆیدا لەسەر پێغەمبەری دەكردەوە (ش).**

**٥٤٣٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنها) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَضَعُ لِحَسَّانَ مِنْبَرًا فِي الْمَسْجِدِ يَقُومُ عَلَيْهِ قَائِمًا يُفَاخِرُ أَوْ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَيَقُولُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اللّٰهَ يُؤَيِّدُ حَسَّانَ بِرُوحِ الْقُدُسِ مَا يُفَاخِرُ أَوْ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه الترمذي وابو داود[٥]:**

**عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە ناو مزگەوتدا مینبەرێكی دانا بوو بۆ حەسسان، هەموو جارێ حەسسان دەچوو لەسەری رادەوەستاو شانازی بە مەدحی پێغەمبەرەوە دەكرد، یا فەرمووی: لەسەر پێغەمبەری دەكردەوەو بە شیعر هەجوی ناحەزەكانی حەزرەتی دەكرد. حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: تا حەسسان ئاوا لەسەر من بكاتەوە كە پێغەمبەری خودامو شانازی بە مەدحی منەوە بكا خودای گەورە بە هۆی جوبرائیلەوە دەست بە پشتی دەگرێو پشتیوانی لێ دەكا (ت / د – س/ص). (ب – ٥ ز – ٥٧ ل – ١٩٤ ج/١ ف – ٥).**

---

(٢) تقدم فی مجلد خامس. تسلسل/ ٥٧ رقم/ ٣٤٩٥/١.

(٣) تقدم فی مجلد خامس. تسلسل/ ٥٧ رقم/ ٤٤٩٨/٤.

(٤) تقدم فی مجلد خامس. تسلسل/ ٥٧ رقم/ ٤٤٩٧/٣.

(٥) بسند صحيح (شرحه).

٥٤٣٥- عن أنس (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أنَّ النبيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دخل مكة في عمرة القضاء وعبدالله بن رواحة بين يدية يمشي ويقول[٦]:

خلُّوا بني الكُفَّار عن سبيله
اليوم نضربكم على تنزيله
ضَرْباً يُزِيلُ الهام عن مقيله
ويُذهل الخليل عن خليله

فقال له عمر: يا أبن رواحة بين يدي رسول الله (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وفي حرم الله تقول الشعر، فقال له النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم): خلِّ عنه يا عمر فلهي أسرع فيهم من نضح النَّبل:

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لە عەمرەتول قەضادا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کە هاتە ناو مەککەوە، عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە لە بەردەمیەوە دەڕۆیشت و دەیگوت:

خلوا بنى الكفار عن سبيله    أليوم نضربكم على تنزيله
ضربا يزيل الهام عن مقيله    ويذهل الخليل عن خليله

واتە: ئەی نەوەی کافران! ڕێگەی حەزرەت چۆڵ کەن و ڕێگەی ئایینە پاکەکەی بەردەن، ئەگینا ئەمڕۆ بێ و سبەینێ بێ - لەسەر هاتنی ئەم قورئانە بۆ سەر دڵی موحەممەد لە لایەن خوداوە - بە زەبری شیرو تیر کەللەتان لەلەشتان جیا دەکەینەوە، وە خودا یاربێ وا شپرزەتان دەکەین کە برا نەیپەرژێتە سەر برا، وە دۆست و برادەرتان دۆست و برادەری خۆی نەناسێتەوە.

جا عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) پێی فەرموو: ئەی کوڕی ڕەواحە! ئەوە چۆن لە خزمەتی حەزرەتداو، لە ناو بەست و حەرەمی مەککەدا، کە قەدەغەی

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح

خودایە، ئاوا شیعرو هەڵبەست دەڵێی؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: ئەی عومەر! وازی لێ بێنەو لێی گەڕێ، بێ گومان کە ئەم شیعرانە لە تیر باران باشتر کاریان لێ دەکا! (ت - س/ص).

٥٤٣٦- وَقَالَ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) جَالَسْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ مَرَّةٍ فَكَانَ أَصْحَابُهُ يَتَنَاشَدُونَ الشِّعْرَ وَيَتَذَاكَرُونَ أَشْيَاءَ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ وَهُوَ سَاكِتٌ فَرُبَّمَا تَبَسَّمَ مَعَهُمْ. رواهما الترمذي[٧]:

جابیری کوڕی سەموورە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەسەد جار زیاتر کە لە کوڕ (مەجلیس) ی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتووم‌و بە چاوی خۆم دیومە کە یارانی هەڵبەستیان بۆ یەکتری دەخوێندەوەو داستان‌و سەرگوزەشتەو باس‌و خواسی سەردەمی نەزانی یان لە ناو خۆیاندا دەگێڕایەوە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) ئاگای لێ بوو، هیچ دەنگی نەدەکرد،بگرە گەلێ جاریش لە گەڵیان پێ دەکەنی‌و ڕەزامەندی خۆی - لە گوفتوگۆکەیان - بە زەردەخەنەیێ دەردەبڕی (ت - س/ص).

٥٤٣٧- عَنْ عَمْرِو بْنِ الشَّرِيدِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَدِفْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: هَلْ مَعَكَ مِنْ شِعْرِ أُمَيَّةَ بْنِ أَبِي الصَّلْتِ شَيْئًا؟. قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: هِيهِ. فَأَنْشَدْتُهُ بَيْتًا فَقَالَ: هِيهِ. ثُمَّ أَنْشَدْتُهُ بَيْتًا فَقَالَ: هِيهِ. حَتَّى أَنْشَدْتُهُ مِائَةَ بَيْتٍ. رواه مسلم[٨]:

عەمری کوڕی شەرید (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە باوکیەوە فەرمووی: جارێ لە پاشکۆی پێغەمبەرەوە سوار بوو بووم فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ) ئایا هیچ هەڵبەستی ئومەییەی کوڕی ئەبو صەلتت لەبەرە! گوتم: ئا لەبەرمە، فەرمووی: ئادەی بڵێ، منیش دوو خشتەکی (بەیت) یێکم بۆی خوێندەوە، فەرمووی: بابێ، ئیتر چەن شیعرێکم بۆی خوێندەوە هەر دەیفەرموو: بابێ، هەتا سەد بەیتم بۆی خوێندەوە. (موسلیم - پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خوابێ).

---

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٨] مسلم. شعر: ٥٨٤٦، ٥٨٤٦م.

## ٧٢) قسه قووڵ كردنەوەو هاشەو هووشە ناپەسەندە، بەڵام قسەی كورتو پوختو بەسوود زۆر پەسەندە
## التشدق بالكلام مذموم والتجوز فيه ممدوح

٥٤٣٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنُ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُبْغِضُ الْبَلِيغَ مِنَ الرِّجَالِ الَّذِى يَتَخَلَّلُ بِلِسَانِهِ تَخَلُّلَ الْبَاقِرَةِ بِلِسَانِهَا. رواه أبو داود والترمذي[١]:

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا گەلێ رقی لەو پیاوە دەمەوەرەیە كەلە كاتی قسە كردندا زمانی بە كونو قوژبنی دەمیا دەگێڕێ بۆ قسەی زل، وەك چۆن مانگا لەكاتی لەوەڕدا بە زمانی لەوەڕوشت دەماشێتەوە ئاوا! (د/ت-س/ح).

٥٤٣٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَعَلَّمَ صَرْفَ الْكَلَامِ لِيَسْبِىَ بِهِ قُلُوبَ الرِّجَالِ أَوِ النَّاسِ لَمْ يَقْبَلِ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً. رواه أبو داود[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: كەسێ فێری دەمەوەری و قسە زلی ببێ، بۆ ئەوەی كە دڵی خەڵكی پێ بكاتە خۆی لە ڕۆژی قیامەتدا خودا نەسوننەتو نەفەرزی لێ قبوڵ ناكا. (د-س/صالح).

٣- وَقَالَ بْنِ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) قَدِمَ رَجُلاَنِ مِنَ الْمَشْرِقِ، فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ لِبَيَانِهِمَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ مِنَ الْبَيَانِ لَسِحْرًا. أَوْ إِنَّ بَعْضَ الْبَيَانِ لَسِحْرٌ. رواه أبو داود والبخاري[٣]:

---

[١] بسند حسن (شرحه).

[٢] بسند صالح (شرحه).

[٣] بخاری. طب: ٥٧٦٧.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: دوو پیاو لەلای خۆرهەلاتەوە هاتن، خۆتبەیان دا، خەڵکەکەیان سەرسام کرد، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڕاستی بازە قسەیێ رەوانی جوانی وا هەیە وەك سیحرو جادوو کار لە مێشكو دڵی بیسەر دەکا (د/ب).

٥٤٤١- وَقَامَ رَجُلٌ فَأَكْثَرَ الْقَوْلَ فَقَالَ عَمْرُو بْنَ الْعَاصِ: لَوْ قَصَدَ فِي قَوْلِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَهُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لَقَدْ رَأَيْتُ أَوْ أُمِرْتُ أَنْ أَتَجَوَّزَ فِي الْقَوْلِ فَإِنَّ الْجَوَازَ هُوَ خَيْرٌ. رواه أبو داود بسند صحيح[٤]:

پیاوێ هەستایەوە قسەیەکی زۆری کرد، عەمری کوڕی عاصیش فەرمووی: ئەگەر قسەکەی کورتو بەتامو کەمو جەم بوایە گەلێ باشتر بوو، لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەربێ) وابە باشی دەزانم، یا دەیفەرموو: فەرمانم واپێکراوە کە قسەی کورتو پوختو بە سوود بکەم، چونکە بەڕاستی قسەی کورتی پوختی بە دەمو جەم زۆر باشە! (د-س/صالح).

### ٧٣) هۆرەو گۆرانی : (الحداء والغناء)

٥٤٤٢- (ب - ٤ ز - ٩٠ ل - ٢٧٣ ف - ٢)[١].

٥٤٤٣- (ب - ٣ ز - ٣٧ ل - ٨٥ ف - ١)[٢].

٥٤٤٤- عن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: إِنَّ الغناء يُنبت النفاق في القلب. رواه أبو دود وإبن أبي الدنيا[٣]:

---

[٤] بسند صحيح عند ابی داود.

[١] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/ ٩٠ رقم/ ٣١١٨/٢.

[٢] تقدم فی مجلد ثالث. تسلسل/ ٣٧ رقم/١/٢١٠٥.

[٣] سكت عنه الشارح.

لە عەبدوڵڵاوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەربێ): بە ڕاستی گۆرانی ناپاكیو نیفاق لە دڵدا دەڕوێنێ (د/ ئیبنو ئەبی دونیا) گفتەی ئیبنو ئەبی دونیا، لەسەر فەرمایشتی شەرحەكە ئاوایە: گۆرانی تۆوی ناپاكی لە ناو دڵدا دەڕوێنێ هەروەك چۆن بە ئاو شینایی سەوز دەبێ، یادو ذیكری خودایش ئیمانو باوەڕ لەناو دڵدا دەڕوێنێ هەر وەك چۆن بە ئاو شینایی سەوز دەبێ.

٥٤٤٥- ← (ب- ٢ ز - ١٥٢ ل - ٣٢٢ ف - ١٩)+ ( ب-١ ز - ١٦٣ ل - ٤٥٨ ف - ١ )[٤].

## ٧٤) نەردێن (تاوڵەكردن)و كۆتربازی حەرامە

## اللعب بالنرد والحمام حرام

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأَنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ - صدق الله العظيم - ← (ب - ٦ ز ٣ ل - ٤٠ ج/١ ف - ٤٣).

٥٤٤٦- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ. رواه مسلم وابو داود[١]:

بورەیدە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ وازی بە تاوڵە بكا وەك دەستی بە گۆشتو خوێنی بەراز ڕەنگ بكا ئاوایە (واتە: وەك پارووی لێ دابگرێو بیخوات ئاوایە) (م/د).

٥٤٤٧- عن أبي موسى (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أن رسول الله (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: من لعب النرد فقد عصى الله ورسوله (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٢]:

---

[٤] سبق فى مجلد/٢ تسلسل/١٥٢ رقم/١٨٢٢/١٩ + مجلد اول. تسلسل/١٦٣ رقم/٩١٥/١.

[١] مسلم. شعر: ٥٨٥٩. أبو داود. أدب: ٤٩٣٩. ابن ماجه. أدب: ٣٧٦٣. تحفة الأشراف: ١٩٣٥.

[٢] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

ئـەبو مووسـا (خـوداى لێ رازى بێ) فـەرمووى: حـەزرەت (دروودى خـوداى لەسـەربێ) فـەرمووى: ئـەوەى نـەردێنو یـارى بـە تاوڵـە بكـا بـە ڕاسـتى لـە خـوداو لـە پێغەمبـەرى خـودا یـاخى بـووە بەڕاسـتى بـێ گـوێیى و نافـەرمانى خـوداو پێغەمبەرى خوداى كردووە! (د- س/ صالح)- ئیبنو ماجە).

٥٤٤٨- عن أبي هريرة (رَضِي اللهُ عَنهُ) أن رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رأى رجلا يتبع حمامة فقال: شيطانٌ يتبع شيطانةً. رواهما أبو داود وابن ماجة[٣]:

ئەبو هـورەیرە (خوداى لێ رازى بێ) فـەرمووى: پێغەمبـەر (دروودى خوداى لەسەربێ) پیـاوێكى دى. شـوێن كـۆترێ كـەوتبوو، فـەرمووى: ئەمـە شـەیتانەو شـوێنى شەیتان كەوتووە! (د- س/صالح – ئیبنو ماجە).

## ٧٥) یارى ڕەوا: وازى دروست: (اللعب المباح)

٥٤٤٩- (ب – ١ ز – ١٦٣ ل – ٤٦٠ ف – ٢)[١].

٥٤٥٠- (ب – ١ ز – ١٦٣ ل – ٤٦٠ ف – ٣)[٢].

بەڵام گێڕانەوەى ئێرە ئاوایە كە بۆ مەبەستى ئێرە دەست دەدا: ئەنـەس (خوداى لێ رازى بێ) گـوتى: كاتـێ حـەزرەت (دروودى خوداى لەسەربێ) تەشـریفى هێنـا بـۆ مەدینـە، بـە بۆنـەى تەشـریف هێنـانى ئـەوەوە قولـە ڕەشـەكانى حەبەشـە ئاهەنگێكى نێزە بازى یان گێڕا (د- س/صالح).

٥٤٥١- عن عائشة (رَضِي اللهُ عَنهُ) قالت: كنت ألعب بالبنات فربَّما دخل عليَّ رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وعندي الجواري فإذا دخل خرجن وإذا خرج دخلن. رواه أبو داود والبخاري[٣]:

---

[٢] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

[١] تقدم فى مجلد أول. تسلسل/ ١٦٣ رقم/ ٩١٦/٢.

[٢] تقدم فى مجلد أول. تسلسل/ ١٦٣ رقم/٩١٧/٣.

[٣] مسلم. فضائل: ٦٢٣٧، ٦٢٣٨.

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران بووكبووكێنم دەكرد، گەلێ جار وادەبوو كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەهاتەوە لەو حەلەدا كچان لەلای من بوون، بەبووكڵەكان یاریمان دەكرد.جا كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەهاتە ژوورەوە ئیتر كچەكان دەڕۆیشتن، كە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) دەڕۆیشت كچەكان دەهاتنەوە بۆ لامو دیسان دەستمان دەكردەوە بە وازی كردن بە بووكە شوشەكان (د/ب –خودایان لێ رازی بێ).

→ (ب – ٥ ز – ٣٧ ل – ١٥٧ ف – ٨).

٥٤٥٢– وَعَنْهَا أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدِمَ عَلَيْهَا مِنْ غَزْوَةِ تَبُوكَ أَوْ خَيْبَرَ وَفِي سَهْوَتِهَا سِتْرٌ فَهَبَّتْ رِيحٌ فَكَشَفَتْ نَاحِيَةَ السِّتْرِ عَنْ بَنَاتٍ لِعَائِشَةَ لُعَبٍ فَقَالَ: مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ؟ قَالَتْ: بَنَاتِي. وَرَأَى بَيْنَهُنَّ فَرَسًا لَهُ جَنَاحَانِ مِنْ رِقَاعٍ فَقَالَ: مَا هَذَا الَّذِي أَرَى وَسْطَهُنَّ؟ قَالَتْ: فَرَسٌ. قَالَ: وَمَا هَذَا الَّذِي عَلَيْهِ؟ قَالَتْ: جَنَاحَانِ! قَالَ: فَرَسٌ لَهُ جَنَاحَانِ. قَالَتْ: أَمَا سَمِعْتَ أَنَّ لِسُلَيْمَانَ خَيْلاً لَهَا أَجْنِحَةٌ قَالَتْ فَضَحِكَ حَتَّى رَأَيْتُ نَوَاجِذَهُ. رواه أبو داود والنسائي[٤]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودو سڵاوی خودای گەورەو مەزنی لەسەر بێ) كاتێ لە غەزای تەبووك – یافەرمووی: لە غەزای خەیبەر – گەڕایەوە هات بۆ لام، لەماڵەوە كولێنێكم هەبوو، پەردەیەكی پێوە بوو، بایێ هەڵی كرد پەردەكەی لادا، هەندێ بووكڵەی منی تیادا بوون بووكڵەكان دەركەوتن، فەرمووێ (درودی خودای لەسەربێ) (: ئەمە چییە؟ ئەرێ عائیشە! گوتم: بووكڵەی منن، لەناو بووكڵەكاندا ئەسپێكیان تیادا بوو، دوو باڵی پەڕۆینی هەبوو، فەرمووی: ئەی ئەوەی كەلە ناوەڕاستیاندا، دەیبینم چییە؟ گوتم: ئەسپە، فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): ئەی ئەوە چییە بەسەر پشتیەوە؟ گوتم: ئەوە دووباڵەكانیەتی! فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ) ئەسپو دوو باڵی هەبێ! گوتم: ئەی بۆ، ئەدی بۆچی نەتبیستووە كە سولەیمان پێغەمبەر ماینو

---

[٤] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

ڕەوگی باڵداری بوون! عائیشە فەرمووی: کەوام گوت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) وادای لە قاقای پێکەنین نەبێتەوە تەنانەت کاکیلەکانی وە دەرکەوتن. (د/ن – س/ صالح).

٥٤٥٣- ← (ب – ٥ ز – ٣٧ ل – ١٥٣ ف – ٣)[٥].

## بەشی حەوتەم: باسی چەن ڕستەیێ کە بوون بە باوو عادەت لە ئەدەبیاتو وێژەی عەرەبی دا

### ٧٦) یەکێ لەوانە گوتەی (أما بعد)وە، واتە: لەپاش ئەمە:

### الفصل السابع: في الفاظ من الأدب : منها قولهم أما بعد

٥٤٥٤- ← (ب – ٢ ز – ٣٧ ل – ٩٥ ف – ٢)[١].

٥٤٥٥- ← (ب – ٥ ز – ١٦ ل – ٩٩ ف – ٣)[٢].

٥٤٥٦- ← (ب – ٣ ز – ١٨ ل – ٣٨ ف – ١)[٣].

### ٧٧) یەکێ تریان گوتەی (زعموا) وە، واتە: بەقسەی گوتووان گوایە واوا دەڵێن ومنها قولهم زعموا

٥٤٥٧- ← (ب – ٨ ز – ٧٧ ل – ١٨٤ چ/١ ف – ١)[١].

٥٤٥٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: بِئْسَ مَطِيَّةُ الرَّجُلِ زَعَمُوا. واه أبو داود والإمام أحمد[٢].

---

[٥] تقدم في مجلد خامس تسلسل/ ٣٧ رقم/٣/٣٤٣٢.

[١] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/ ٣٧ رقم/٢/١٣٤٨.

[٢] تقدم في مجلد خامس. تسلسل/١٦ رقم/٣/٣٣٤٣.

[٣] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/١٨ رقم/١/٢٠١٩.

[١] تقدم في مجلد ثامن. تسلسل/ ٧٧ رقم/١/٤٥٥٧.

[٢] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

ئەبو مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: قسەیەکی زۆر نابەجێ یە کە پیاو بۆ کارێ کە هێشتا لێی روون نەبێ لە خۆیەوە بۆ مەهانە سازی بڵێ: بەقسەی گوتووان گوایە واوا دەڵێن (د-س/صالح - ئەحمەد).

٧٨) یەکێ تریان گوتەی (ویلك)ەو (ویحك)ەیە وەیلەکە واتە: ماڵ وێران: خانە خراپ، وەیحەکە واتە: هەیرۆ نەیرۆ: وەیش: هاوار بۆ تۆ: هاوار لە من
ومنها قولهم ویلك أو ویحك

٥٤٥٩- ← (ب - ٢ ز - ١٢٨ ل - ٢٥٨ ف - ١)[١]:

لێرەدا دەفەرموێ: ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دی وا پیاوێ وشترێکی دیاری بەیت لێ دەخوڕێ فەرمووی: سواری بە گوتی: چۆن سواری بم ئەمە وشتری دیاریی مەککەیە فەرموویەوە: سواری بە، گوتیەوە: ئاخر چۆن سواری بم ئەمە وشتری دیاریی مەککەیە شتی وا چۆن دروستە؟ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ارکبها ویلك: سواری بە ئەی خانە خراپ! شتی وا من دەیزانم نەك تۆ (ب).

٥٤٦٠- ← (ب - ٤ ز ٩٠ ل - ٢٧٣ ف - ١٢)[٢]:

لە گێڕانەوەی ئێرەدا کە بۆ ئێرە دەست دەدا دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەئەنجەشە کە بە دەنگە خۆشەکەی، بە هۆرە، وشترەکانی ژێر هاوسەرە پاکیزەکانی پێغەمبەری لێ دەخوڕی: ویحك یا انجەشە رویدك بالقواریر: هەیرۆ! ئەی ئەنجەشە! هێواش لە سەرە خۆبە ولاخەکان بە هێواش لێ خوڕە، چونکە باریان ئافرەتە کە وەك شووشەو مینا ناسکن.

---

[١] تقدم فی مجلد ثانی. تسلسل/١٢٨ رقم/ ١٦٥٩/١.
[٢] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/٩٠ رقم/٣١٢٧/١٢.

**٧٩) یەکێ تریان گوتەی (تربت یمینك)ەیە: واتە: دەستت بە قوڕداچێت: هەژارکەویت**

**ومنها قولهم: تربت یمینك**

٥٤٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهَا) قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ عَلَيَّ عَمي مِنْ الرِّضاعِ بَعْدَ مَا نَزَلَ الْحِجَابُ فَقُلْتُ وَاللَّهِ لاَ آذَنُ لَهُ حَتَّى أَسْتَأْذِنَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِنَّهُ لَمْ يُرْضِعْنِي وَلَكِنْ أَرْضَعَتْنِي امْرَأَةُ اَخِيهِ فَسَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ائْذَنِي لَهُ، فَإِنَّهُ عَمُّكِ، تَرِبَتْ يَمِينُكِ. رواه البخاري[1]:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: مامێکی شیریم هەبوو، لە پاش فەرماندانی خودا بە حیجابگرتنەوەی هاوسەرەکانی حەزرەت لە پیاوی ناخۆیی، ئەو مامەم ویستی بێ بۆ لام.منیش گوتم: بە خودا هەتا لە پێش دا لە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) نەپرسم رێگەی پێ نادەم کە بێ بۆ دێنیم، چونکە خۆ من مەمکی ژنی ئەوم نەخوازدووە، بەڵکوو مەمکی براژنی ئەوم خواردووە! جا کە بۆ ئەمە لە حەزرەتم پرسیا ر کرد فەرمووی:رێگەی بدە کە بێ بۆ لات بۆ دێنی، چونکە ئەو پیاوە مامەی شیریتە. (تَرِبَتْ يَمِينُكِ): ئەی دەستت بە خاكو خۆڵ. (ب).

**٨٠) یەکێ تریان وتەی (أخسا)ی، واتە: چغە: چغ: چغ: هەیدێ**

**ومنها قول الإنسان لآخر أخسا**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: لِأَهَل النَار: {قَالَ اخْسَؤُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ – سورة المؤمنون – ١٠٨/٢٣}.

واتە: چغەتان لێبێ، بێ دەنگ بنو فزەو نقە نەکەن، لە ناو ئەو ئاگرەدا سەر حیزکەن، ئیتر لەگەڵ من قسە مەکەن.

[1] بخاری. نکاح: ٥١٠٢.

٥٤٦٢- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِابْنِ صَائِدٍ: قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا فَمَا هُوَ؟ قَالَ: الدُّخُّ.قَالَ: اخسأْ. رواه البخاري والإمام أحمد[1].

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودا لە خۆیو بابی) فەرمووی: جا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) بە ئیبنو صەییادی فەرموو: من شتێكم گرتۆتە دڵم، ئایا ئەوە چییە دەتوانی هەڵی بێنی؟ ئیبنو صەییادیش گوتی: ئەوە دوخخە. حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: چخە! هەیدێت لێ بێ (ب/ئە).حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) ئایەتی: یوم تأتی السماو بدخان مبین، دەگرێتە دڵو، مەبەستی ئەوە دەبێ ئەگەر ئیبنو صەییاد هەڵیهێنا تەلەففوڤ بە وشەی دوخان بكاو، بڵێ: مەتەڵەكەت دوخانە، بەڵام ئیبنو صەییاد بۆ یهەڵنەهات، هەرچەند تۆزێ بۆیدەچێ، چونكە دوخخو دوخان لە یەكەوە نزیكن:

باسێكی سەیرە وەك مەتەڵ وایە
واتە: مەتەڵی ناوا ڕەوایە!
دەزانی نازیز! نوری پێی وایە:
ژین مەتەڵێكە بەنەو هەڵنایە

(وەرگێڕ – ١٤١٣/١/٢ – ١٩٩٢/٧/٢)

## ٨١) ئاغا بەبەندەی خۆی نەڵێ: (عبدی) واتە: عەبدی من: بەندەی من، بەندەیش بە خاوەنی خۆی نەڵێ: (ربی) واتە: خاوەنی من
## لایقل السید عبدي ولایقل المملوك ربي

٥٤٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَأَمَتِي. كُلُّكُمْ عَبِيدُ اللَّهِ وَكُلُّ نِسَائِكُمْ إِمَاءُ اللَّهِ وَلَكِنْ لِيَقُلْ غُلاَمِي وَجَارِيَتِي وَفَتَايَ وَفَتَاتِي. رواه مسلم وابو داود.وَلفظهُ: لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ عَبْدِي وَأَمَتِي

---

[1] بخاری. أحاديث الأنبياء: ١٣٥٤، ٣٠٥٥، ٦١٧٣، ٦٦١٨. مسلم. فتن: ٧٢٨٣. ترمذي. فتن: ٢٢٣٥. تحفة الأشراف: ٦٨٥٩، ٦٩٩٠، ١٥٦٤٩.

وَلاَ يَقُولَنَّ الْمَمْلُوكُ رَبِّى وَرَبَّتِى وَلْيَقُلِ الْمَالِكُ فَتَاىَ وَفَتَاتِي وَلْيَقُلِ الْمَمْلُوكُ سَيِّدِى وَسَيِّدَتِي فَإِنَّكُمُ الْمَمْلُوكُونَ وَالرَّبُّ اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کەستان بەبەندەی خۆتان مەڵێن: (عبدی) هەروەها بە کارەکەرو کەنیزەکی خۆشتان مەڵێن: (امتی: ئەمەتەی من) چونکە ئێوە پیاوەکانتان هەموو عەبدی خودان، ژنەکانیشتان هەموو ئەمەتەی خودان، بەلاّم پێیان بڵێن: (غلامی و جاریتی: نۆکەرو خولاّمەکەم، یاکەنی و کەنین) یا پێیان بڵێن: ( فتای و فتاتی: پیاوو کارەکەر (م/د). گفتەی ئەلو داود: فەرمووی: (درودی خودای لەسەربێ): کەستان مەڵێن: (عبدی) یامەڵێن: (امتی) هەروا مەملووك و کویلەکانیش بە پیاوانی ئێوە نەڵێن: رَبّی: (خاوەنی من: پەروەردەکەری من) یا بەژنانی ئێوە نەڵێن: (ربتی: خاتوونەی من، خاوەنی من: خانمەی پەروەردەکەری من) با خاوەن بەندە پێی بڵێ: (فتای: پیاوەکەم) وەخاوەن ئەمەتە پێی بڵێ: (فتاتی: کارەکەرەکەم) ئەوانیش کە موڵك و زەڕخرپیدەی ئێوەن بە پیاوانی ئێوە بڵێن: (سیدی: ئاغام) وە بە ژنانی ئێوە بڵێن: (سیدتی: خاتوون: خانم: ئاغاژن) چونکە ئێوە هەردوو لاتان: (چ ئێوەی ئازادو چ ئەوانی بەندەو ئەمەتە) هەموو یەك خاوەنتان هەیە، ئەویش خوداوەندی گەورەیە کە خاوەن و پەروەردگاری هەموانە! (ش).

٥٤٦٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ اسْقِ رَبَّكَ، أَطْعِمْ رَبَّكَ، وَضِّئْ رَبَّكَ، وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ رَبِيّ، وَلْيَقُلْ سَيِّدِى مَوْلاَىَ. وَلاَ يَقُلْ أَحَدُكُمْ عَبْدِى أَمَتِي. وَلْيَقُلْ فَتَاىَ وَفَتَاتِي وَغُلاَمِي. رواه الشيخان[٢]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەکاتی گوفتوگۆدا بە کارەکەرو خزمەتکارەکانتان مەڵێن: ئاو بدەبە خاوەنەکەت، یا

---

[١] مسلم. ألفاظ: ٥٨٣٦.

[٢] مسلم. ألفاظ = تجريد/٢/١٨١ رقم/١٠٩١.

نان بدە بە خاوەنەکەت، یا ئاوی دەسنوێژ بکە بە دەستی خاوەنەکەتا، هەروا بەیەکتریش مەڵێن: (ربی: خاوەنم) بەلاّم بڵێن: (سیدی: گەورەم، مولای: سەروەرم) وەیا مەڵێن: (عبدی: عەبدەکەم، امتی: ئوممەتەکەم) بەلاّم بڵێن: (فتای: پیاوەکەم، فتاتی: کارەکەرەکەم: کەنیشکەی من، غلامی: خولاّمەکەم.(ش).

٥٤٦٥- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُولُوا لِلْمُنَافِقِ سَيِّدٌ فَإِنَّهُ إِنْ يَكُ سَيِّدًا فَقَدْ أَسْخَطْتُمْ رَبَّكُمْ عَزَّ وَجَلَّ. واه أبو داود والنسائي. والله أعلى وأعلم[٣]:

بورەیدە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بە پیاوی ناپاك مەڵێن: (سید: گەورە: ئاغا: سەروەر) چونکە ئەگەر پیاوی ناپاك سەروەرو گەورەتان بێ ئەوە دەگەیەنێ کە لەراستیدا خودای گەورەو سەروەرتان عاجز کردووەو خوداتان لە خۆتان رەنجاندووە (د/ن).

## ٨٢) جنێو مەدەن بەچەرخو ڕۆژگار (دەهر) : (لاتسبوا الدهر)

٥٤٦٦- ← (ب - ٧ ز - ٢٨ ل - ١٣٦ ف - ١)[١]:

لێرەدا دەفەرموێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودای گەورەو مەزن دەفەرموێ: ئادەمیزاد لەکاتی هاتنی دەردو بەلاّو ناخۆشیدا دەچێ جنێو بەچەرخو ڕۆژگار دەدا ( گوایە: ئەو دەردو بەلاّیە لە چاوی چەرخو ڕۆژگاری دەزانێ، چەرخو ڕۆژگاری هەژار چییان بەدەستە) من خۆم خاوەنی چەرخو ڕۆژگارم، گەردشی چەرخو سووڕانەوەی شەوو ڕۆژ بە دەستی منە ( کەواتە: ئەوەی دەچێ جنێو بەرۆژگا ر دەدا لە ڕاستیدا جنێو بە من دەدا (ش/د).

---

[٣] سکت عن درجته الشارح.

[١] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٢٨ رقم/٤٠٩١/١.

٥٤٦٧- ← (ب – ٧ ز – ٢٨ ل – ١٣٦ ف – ١)[٢].

٥٤٦٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ يَقُولُ يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ. فَلاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ. فَإِنِّي أَنَا الدَّهْرُ أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا. رواه مسلم والإمام أحمد. نسأل الله حسن القول والفعل آمين[٣]:

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (سڵاوو دروودی خودای لێبێ) فەرمووی: خودای گەورەو سەروەرو مەزن دەفەرموێ: ئادەمیزاد ئازاری من دەدا کە دەڵێ: کۆستی گەردوون کەوێ: یا خیبە الدهر: ڕۆژگار ڕەنجەڕۆبێ (بۆ ئەمە دەکاو بۆ ئەوە ناکا، وەك لە کوردیدا دەڵێن: چی بکەم لە دە ست چەرخی کەچ ڕەفتار؟) کەواتە:ئێوە کەستان ئەم قسەیە مەکەنو مەڵێن: کۆستی گەردوون کەوێ (یاڕووی ڕۆژ ڕەش بێ!)چونکە من خۆم خاوەنی گەردوونمو لە ڕا ستیدا گەردوون هیچی بە دەست نییە، وە ئەوە منم کە گەردش بە شەوو ڕۆژی گەردوون دەکەم وەشەوو ڕۆژ دێنمو دەبەم، کەییش ئارەزووم بوو لە ناویان دەبەمو ئەم ڕووپەڕەی ڕۆژگارە وەك تۆمار دەپێچمەوە (م/ ئەحمەد).

**٨٣) مەڵێ: (خبثت نفسي: دڵم هەڵ دەشێوێ: دڵم تێك هەڵ دێ، بەڵام لە جیاتی ئەوە بڵێن: لقست نفسي: دڵم تێك دەچێ: دڵم بەیەکادێ، بە مێویش مەڵێن: کەرم: داری مێو):**

**لاتقل: خبثت نفسي ولاتسموا العنب كرما**

٥٤٦٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ خَبُثَتْ نَفْسِي. وَلَكِنْ لِيَقُلْ لَقِسَتْ نَفْسِي[١]:

---

[٢] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٢٨ رقم/١/٤٠٥٤.

[٣] مسلم. ألفاظ: ٥٨٢٥.

[١] مسلم. ألفاظ: ٥٨٣٩. بخاری. أدب: ٦١٨٠. أبو داود. أدب: ٤٩٧٨

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی سڵاوی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەڵێن: خبثت نفسی: دڵم هەڵ دەشێوێ، بەڵام لە جیاتی ئەوە بڵێن: لقست نفسی: دڵم تێك دەچێ: دڵم تێك هەڵ دێ: دڵم بەیەكادێ (ش/د).

٥٤٧٠- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِیِّ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ، فَإِنَّ الْكَرْمَ المسلم[٢]:

ئەبو هورەیره (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەترێو داری مێو مەڵێن (كەرم) چونكه (كەرم) كه بەمەعنا رێزدارو نازدارە سیفەرتو ناوو نیشانی پیاوی موسوڵمانه.

٥٤٧١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِیِّ (صَلَّى اللهُ عَلَیْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ یَقُولَنَّ أَحَدُكُمُ الْكَرْمُ. فَإِنَّمَا الْكَرْمُ قَلْبُ الْمُؤْمِنِ. روی هذه الثلاثة الاصول الثلاثة[٣]:

دیسان فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (دروودی سڵاوی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەترێو داری مێو مەڵێن: (كەرم) چونكه دڵی موسوڵمان شایستەی ئەم ناوە جوانەیە.(ش/د).

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِیمِ

كەرم بەمەعنا كەریمی عەرەبییە، كەریمیش بە مەعنا جوامێرو جوانمەردی كوردییە. جا لە كۆندا ئارەقخۆرەكانی عەرەب بەترێو درەختی ترێیان دەگوت: كەرم، چونكه مەیو ئارەقی لێ دروست دەكرێ، گوایه مەیو ئارەق دەبن بە هۆی بە خشندەییو سەخاوەتو جوامێری. جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ ئەوەی موسوڵمانان دووربخاتەوە لە ئارەقو مەیو كۆڕی ئارەقخۆران و ئەم ناوە جوانە نەبێ بە هۆی جوولانی مەیلی كۆنیان،

---

[٢] تجرید البخاری/٥/٢٢٤ رقم/ ١٩٥٨ = ٦١٨٢، ٦١٨٣. مسلم. الفاظ/ ٥٨٣٢ — ٥٨٣٤.

[٣] مسلم. ألفاظ/٥٨٢٩. بخاری (تجرید): ١٩٥٨ = ٦١٨٣.

لەرووی نەزاکەتەوە بە موسوڵمانانی فەرموو بە مێو مەڵێن کەرم، لە هەمان کاتدا هەتا فێریان بکا کە دەبێ شێوازو دەستووری قسەو گوفتوگۆ چۆن بێ، هەتا ناوو خاوەن ناو (أسم ومسمى) شایانو شیاوی یەکتری بن، نەك زیدو دژی یەکتری بن، بەم پێیە ناوی جوان بۆ شتی جوانو ناوی پیس بۆ شتی پیس! هەروەها موسوڵمان دەشێ زمان پاك بێ، زمان شیرین بێ، قسەی ناشیرین نەکاو خۆی لە وشەی ناشیرین بپارێزێ. وەك رستەی (خبثت نفسي) لەزمانی عەرەبیدا، کە بە مەعنا دڵم تێکچووەیە، بەڵام بۆنی خوبثی نەفسو دەروون پیسی لێ دێ، ئەم وشانەیش لە کوردیدا دەق وان: دڵپیس، زمانپیس، پیسکە، سەرحین، نەوس حیز!داخەکەم ئەم خووەپیسو عادەتە کۆنە خراپە هەتا ئێستاکەش هەرماوە، بگرە زیادی کردووە، کەسێ تەماشای رەفتارو نازناوی ئافرەتە گۆرانی بێژو سەماکەرەکانی ئەم رۆژگارە بکا راستو دروستی ئەم قسەیەی بۆ دەردەکەوێ، سەماکەرێکی گۆرانی بێژی بەرەڵڵا هەبوو، لە فیلمی سینەمادا سەمای دەکردو گۆرانی دەگوتو رۆڵی پیس پیسی دەبینی کەچی ناوە هونەرییەکەی نورلهودا بوو! یەکێ تریان ناوی شەریفە فاضل بوو، هەیانە ناوی عەفافە! یازەهرەتولعولایە!

بەچاوی خۆم وێنەی کۆمەڵێ ئافرەتی سەماکەرم دی لە روسیای ئەوسا سەمای باڵی یان دەکرد، لەبەرگی گۆڤارێکی عەرەبی چاپ کرابوو، بە خەتێکی گەورە لە ژێر وێنەکەدا بە عەرەبی نووسرابوو: هولاء هن اللواتي رفعن رؤس العرب في بلاد الأجانب!. یەکوو!!

سەری گەلی عەرەب بە شتی وا بەرز نابێ، شتی وا سەری گشت مەردێکی پێ شۆڕ دەبێ، سەری نەتەوەی عەرەب بە نووری قورئان بەرز دەبێ، بە دەنگی ئەڵڵاهو ئەکبەری بانگ بەرزو بڵند دەبێ، کە هەموو گەلێ لە سەراسەری جیهاندا پڕ بەدڵ و پڕ بەدەم هاوار دەکەن (الله أكبر). بەعەدالەتی عومەرو بەشجاعەتی عەلی بە تەقوای رابیعەی عەدەوییە بەرز دەبێ، بە جامیعەی ئەزهەرو بە ئیستگەکانی قورئانی کەریم بەرز دەبێ!

بەگوێی خۆم لە مەینۆشەكانی ئەم سەردەمەم بیستووە بە ئارەق دەڵێن: (حليب السباع: شیری شێران!).

لە ڕاستیدا فەلسەفەی ئەم بەر بەرەڵڵای یە ئەم نیازو مەبەستە پیسەیە كە ئەم ئایەتە پیرۆزە پەردەی لە ڕوو هەڵ دەماڵێ كە دەفەرموێ:

{وَدُّواْ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَاء – سورة النساء – ٨٩/٤}.

واتە: بەدڵ حەزدەكەن كە ئێوەیش ڕێك وەك ئەوان بی دینو لە خودا دووربن، لە پایەی بەرزی بەڕێزی خۆتان دابەزنو بێنەڕێزی نزمی ئەوان، هەتا بەرابەر ئێوە هەست بە پەستیو بێ نرخیو خراپیی خۆیان نەكەنو زمانی حاڵیان ئەم پەندە كوردی یەیە كە دەڵێ: هەموو لە كین چون یەكین.

(وەرگێڕ)

### ٨٤) مەڵێ: (ماشاء الله وشاء فلان: خوداو فیسارەكەس حەزكا) لاتقل: ماشاء الله وشاء فلان

٥٤٧٢- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُولُوا مَا شَاءَ اللَّهُ وَشَاءَ فُلاَنٌ وَلَكِنْ قُولُوا مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ شَاءَ فُلاَنٌ[1].

ئەبو حوزەیفە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی سڵاوی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەڵێن ماشاء الله وشاء فلان: خوداو فیسارەكەس حەزكەن ئەوشتە دەكەم، وا مەڵێن بەلأم بڵێن: ما شاء الله ثم شاء فلان: یەكەم خودا حەز كات دووەم مەیلی فیسارە كەسی لێ بێ ئەوشتە دەكەم. (م/ن) چونكە تەعبیری یەكەم بۆنی هاوبەشیو شەراكەتی لێ دا، بەلأم تەعبیری دووەم ئەوە دەگەیەنێ كە خواستو ویستی بەندە لەدوا خواست و ویستی خودای گەورەیە. (وەرگێڕ)

---

[1] سكت عن درجته الشارح.

٥٤٧٣- عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَجُلٍ قَالَ: كُنْتُ رَدِيفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَعَثَرَتْ دَابَّتُهُ فَقُلْتُ: تَعِسَ الشَّيْطَانُ. فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لاَ تَقُلْ تَعِسَ الشَّيْطَانُ فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ تَعَاظَمَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الْبَيْتِ وَيَقُولَ بِقُوَّتِي وَلَكِنْ قُلْ بِسْمِ اللَّهِ فَإِنَّكَ إِذَا قُلْتَ ذَلِكَ تَصَاغَرَ حَتَّى يَكُونَ مِثْلَ الذُّبَابِ. رواهما أبـو داود والنسائي[٢]:

ئەبو مەلیح (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پیاوێ بۆ یگێڕامەوە گوتی: جارێ لـە پاشـکۆی پێغەمبـەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) سـوار بـوو بـووم، ولاخەکـەی سەرسمێکی دا منیش گوتم: تعـس الـشیطان: ملـی شـەیتان وردبێ، فـەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): وا مـەڵێ و مـەڵێ: تعـــس الـــشیطان: ئەسـتۆی شـەیتان بشکێ،چونکە شەیتان بەوە فش دەبێتـەوە تا ئەوەنـدەی خانوویـەکی لێ دێ، دەیشڵێ: دیارە ئەمە بە هێزی من رووی دا، بەڵام لە کاتی روودانی شتی وادا بڵێ: بسم الله: بەناوی خودا، ئیتر بە گوتنی ناوی خودا شەیتان تـەواو داماوو کز دەبێ و وا بچووك دەبێتەوە بە قەی مێشێکی دەمێنێ! (د/ن).

## ٨٥) پایانێ. باسی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر
## خاتمة في خلق الأشياء

٥٤٧٤- ← (ب - ١ ز - ٦ ل - ٤٣ ف - ١٠)[١].

تەماشـای باسـی خـودا کـردو چـارەنووس لـە نامـەی زوهـد بکـە، فەرموودەی شەشەم.

٥٤٧٥- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَقَلْتُ نَاقَتِي بِالْبَابِ، فَأَتَاهُ نَاسٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ فَقَالَ: اقْبَلُوا الْبُشْرَى يَا بَنِي تَمِيمٍ. قَالُوا: قَدْ بَشَّرْتَنَا فَأَعْطِنَا.مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيْهِ نَـاسٌ مِـنْ أَهْـلِ الْـيَمَنِ فَقَـالَ: اقْبَلُـوا

---

[٢] سكت عن درجته الشارح.

[١] سبق في مجلد أول. تسلسل/٦ رقم/١٠/ ٤٦.

الْبُشْرَى يَا أَهْلَ الْيَمَنِ، إِذْ لَمْ يَقْبَلْهَا بَنُو تَمِيمٍ. قَالُوا: قَدْ قَبِلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالُوا: جِئْنَاكَ نَسْأَلُكَ عَنْ هَذَا الأَمْرِ قَالَ: كَانَ اللَّهُ وَلَمْ يَكُنْ شَيْءٌ غَيْرُهُ، وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ، وَكَتَبَ فِي الذِّكْرِ كُلَّ شَيْءٍ، وَخَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ. فَنَادَى مُنَادٍ: ذَهَبَتْ نَاقَتُكَ يَا ابْنَ الْحُصَيْنِ. فَانْطَلَقْتُ فَإِذَا هِيَ يَقْطَعُ دُونَهَا السَّرَابُ[٢]:

عیمرانی کوڕی حوصەین (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: چوومە خزمەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەر دەرگی مزگەوتەکەدا وشترەکەمم ئەشکێل کرد، کە سانێ لە بەنی تەمیم هاتن بۆ خزمەتی، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموون: ئەی بەنی تەمیم! لە پیتو فەڕی ئیسلامەوە موژدەی بە هەشتو پایەی بەرزتان دەدەمێ! بە شارەتو مزگێنی وەربگرن. گوتیان: مژدەت داوینێ مژدە پێدراوە کە چییە بمان دەرێ! دووجار حەزرەت ئاوای پێ فەرموون، ئەوانیش لە مەبەستەکەی حەزرەت تێ نەگەیشتنو ئاوایان وەڵام دایەوە.لەوەڵامەکەیان رووی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) تێکچوو، لە پا شا کەسانێ لە خەڵکی یەمەن هاتنە خزمەتی، کە ئەبو مووسای ئەشعەریو هاوڕێکانی بوون، پێی فەرموون: ئەی خەڵکی یەمەن! کە بەنی تەمیم موژدەیان قەبووڵ نەکرد ئێوە قەبووڵی بکەن. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمە قەبووڵمانەو وا وەرمان گرت. عەرزیان کرد: قوربان! بۆیە هاتووینەتە خزمەتت کە بارو دۆخی ئەم جیهانەمان تێ بگەیەنی کە چۆن دروست بووە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): لە پێش پێش دا هەر تەنیا خودا خۆی بووەو هیچی تر نەبووە، لە پاشا لە پێش دروست کردنی ئاسمانەکانو زەوی دا خودا ئاوو عەرشی دروست کرد، عەرشی خودا لەسەر ئاو بوو، ( واتە: بێجگە لە عەرشو ماددەی ئاو هیچی تر نەبوو) هەروا خودا لە تابلۆی پارێزراودا، (واتە: لەوحولمەحفوظ)دا هەموو شتێ کە دروست دەکرێ هەمووی نووسی، وە خودا ئاسمانەکانو زەوی لە نەبوون لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد. لەم وەختەدا بانگکەرێ بانگی کردم: ئەی

---

[٢] تجريد/٣/٤١٩ رقم/١٢٨٧ م = ٣١٩١، ٣١٩٠ = فتح الباري. راجع رقم/ ١٢٨٧ من التجريد.

عیمرانی کوڕی حوصەین! وشترەکەت ڕۆیی، ئیتر منیش بەشوێنیا چووم، کە تەماشام کرد ڕای کردووەوەو تەواو دوور کەوتۆتەوە.(ب). ← (ب – ٦ ز – ١٢ ل – ٢٤٠ ف – ٢/٣٩٢٠).

٥٤٧٦- وَقَالَ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُ): قَامَ فِينَا النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) مَقَامًا، فَأَخْبَرَنَا عَنْ بَدْءِ الْخَلْقِ حَتَّى دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنَازِلَهُمْ، وَأَهْلُ النَّارِ مَنَازِلَهُمْ، حَفِظَ ذَلِكَ مَنْ حَفِظَهُ، وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ. رواهما البخاري في بدء الخلق[٣]:

عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەڵسایەوە خوتبەیەکی دا بۆمان، لە سەرەتای دروست کردنی جیهانەوە هێنای هەتا ئەو کاتەی کەوا جیهان دوایی دێو حەشرو نەشرو حیساب و کیتاب تەواودەبێ و ئەوجا بەهەشتیی دەچنە جێگەی خۆیان لە بەهەشتاو دۆزەخیی دەچنە جێگەی خۆیان لە دۆزەخدا، ئیتر ئەوەی لە بیری مابێ والەبیری ماوەو، ئەوەی لەبیری چووبێتەوە وا لەبیری چۆتەوە! (ب – خودای لێ ڕازی بێ).

٥٤٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللّهُ عَنهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: خُلِقَتِ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ. فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ. رواه مسلم والإمام أحمد[٤]:

عائیشە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە فەرمووی: (درودی خودای لەسەربێ): فریشتە لە نوور دروست کراون، وەجان کە باوکی نەوعی جنۆکەیەو ناوی ئیبلیسە لە گڕی ئاگری بێ دووکەڵ دروست کراوە، ئادەمیش کە بابا گەورەی ئێوەیە لەوە دروست کراوە کەلە قورئان دا باس کراوە بۆتان لە چەن ئایەتێکا، وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ – سورة المؤمنون – ١٢/٢٣}. واتە: بەڵێ لەکاتی خۆیدا ئادەممان دروست کرد لە ئەندازەیێ گڵی پوختەی تەڕکراو بە ئاو (م/د).

---

[٣] بخاری. بدء الخلق: ٣١٩٢.

[٤] مسلم. زهد/٧٤٢٠.

٥٤٧٨- ← (ب – ٦ ز – ٣ ل – ٥ ف – ٢)[٥]:

لەم شوێنەدا ئەم پتری یەی هەیە كە هی ریوایەتی تیرمیذی یە، دەفەرموێ!... هەر ئەو كاتە هەموو كەسێ تەمەنی خۆی چەندە لە نێوانی هەردوو چاوی نووسرابوو، جا ئادەم تەماشای كرد وا پیاوێكی زۆر نوورانی لە ناویاندا دیارە، عەرزی بینایی چاوانی كرد: ئەی پەروەردگارم! ئەمە كێیە؟ فەرمووی: ئەمە داوودی كوڕی تۆیە، چل ساڵ تەمەنم بۆ ینووسیوە، ئادەم عەرزی كرد: قوربان! تەمەنی پتر كە خودا فەرمووی: هەر ئەوەیە كە بۆیم نووسیوە، ئادەم عەرزی كرد: ئەی پەروەردگارم! ئەوا من لە تەمەنی خۆم شەست ساڵم دابەو، خودا فەرمووی:باشە ئەوا منیش لەسەر ئەوە بڕیارم دا، جا چەندەی خواستی خودای لەسەر بوو ئادەم ئەوەندە لە بەهەشتا مایەوە، لە پاشا لە بەهەشتەوە داپەڕێنرا بۆ سەرزەوی ئیتر ئادەم دەستی كرد بە ژماردنی سالآنی تەمەنی خۆی، فەرمووی: تا كاتێكی زانی فریشتەی گیانكێشان هات بۆ لای تا گیانی بكێشێ، ئادەم پێی دەفەرموێ: تۆ پەلەت كرد، زوو هاتووی من هەزار ساڵ تەمەنم بۆ نووسراوە هێشتا شەست ساڵم ماوە! فەرمووی: تۆ ڕاست دەكەی ئەمەی دەیڵێی وایە بەلآم تۆ بۆ خۆت لەو هەزارە شەست ساڵیت بەخشیوە، بە داوودی كوڕت، كەچی ئادەم حاشای كردو نەچووە ژێری، ئادەم لە یادی چوو بۆیە تەوەكەیشی گەلێ جاران شتیان لە یاد دەچێ! فەرمووی: ئیتر هەر لەو ڕۆژەوە خودا فەرمانی دەركرد كە لە مامەڵەو سەودادا نووسینو قەواڵەو شایەتو بەڵگە هەبێ! (ت- س/ح).

## ٨٦) چینەكانی ئادەمیزاد : (طبقات بني آدم)

٥٤٧٩- (ب – ٦ ز – ٣ ل – ٨ ف – ٣)[١].

لە گرەدا ئەمەی لە دواوە پترە: هەیانە لەمانە تێكەڵە.

---

[٥] تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/٣ رقم/٢/٣٦٩١.

[١] تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/ ٣ رقم/٢/ ٣٦٩٢.

٥٤٨٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا صَلاَةَ الْعَصْرِ بِنَهَارٍ ثُمَّ قَامَ خَطِيبًا فَلَمْ يَدَعْ شَيْئًا يَكُونُ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ أَخْبَرَنَا بِهِ حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ وَكَانَ فِيمَا قَالَ: أَلاَ إِنَّ بَنِي آدَمَ خُلِقُوا عَلَى طَبَقَاتٍ شَتَّى فَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ مُؤْمِنًا وَيَحْيَا مُؤْمِنًا وَيَمُوتُ مُؤْمِنًا وَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ كَافِرًا وَيَحْيَا كَافِرًا وَيَمُوتُ كَافِرًا وَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ مُؤْمِنًا وَيَحْيَا مُؤْمِنًا وَيَمُوتُ كَافِرًا وَمِنْهُمْ مَنْ يُولَدُ كَافِرًا وَيَحْيَا كَافِرًا وَيَمُوتُ مُؤْمِنًا أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمُ الْبَطِيءَ الْغَضَبِ سَرِيعَ الْفَيْءِ وَمِنْهُمْ سَرِيعُ الْغَضَبِ سَرِيعُ الْفَيْءِ فَتِلْكَ بِتِلْكَ أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمْ سَرِيعَ الْغَضَبِ بَطِيءَ الْفَيْءِ أَلاَ وَخَيْرُهُمْ بَطِيءُ الْغَضَبِ سَرِيعُ الْفَيْءِ أَلاَ وَشَرُّهُمْ سَرِيعُ الْغَضَبِ بَطِيءُ الْفَيْءِ أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمْ حَسَنَ الْقَضَاءِ حَسَنَ الطَّلَبِ وَمِنْهُمْ سَيِّئُ الْقَضَاءِ حَسَنُ الطَّلَبِ فَتِلْكَ بِتِلْكَ أَلاَ وَإِنَّ مِنْهُمُ السَّيِّئَ الْقَضَاءِ السَّيِّئَ الطَّلَبِ أَلاَ وَخَيْرُهُمُ الْحَسَنُ الْقَضَاءِ الْحَسَنُ الطَّلَبِ وَمِنْهُمْ حَسَنُ الْقَضَاءِ سَيِّئُ الطَّلَبِ فَتِلْكَ بِتِلْكَ أَلاَ. وَشَرُّهُمْ سَيِّئُ الْقَضَاءِ سَيِّئُ الطَّلَبِ أَلاَ وَإِنَّ الْغَضَبَ جَمْرَةٌ فِي قَلْبِ ابْنِ آدَمَ أَمَا رَأَيْتُمْ إِلَى حُمْرَةِ عَيْنَيْهِ وَانْتِفَاخِ أَوْدَاجِهِ فَمَنْ أَحَسَّ بِشَيْءٍ مِنْ ذَلِكَ فَلْيَلْصَقْ بِالأَرْضِ، قَالَ: وَجَعَلْنَا نَلْتَفِتُ إِلَى الشَّمْسِ هَلْ بَقِيَ مِنْهَا شَيْءٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلاَ إِنَّهُ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا فِيمَا مَضَى مِنْهَا إِلاَّ كَمَا بَقِيَ مِنْ يَوْمِكُمْ هَذَا فِيمَا مَضَى مِنْهُ. رواه الترمذي في الفِتَنِ بسند صحيح[٢]:

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: ڕۆژیٚ پیٚغەمبەر (درוودی خودای لەسەربیٚ) بەر نویٚژیی نویٚژی عەصری بۆ كردین، ئەوجا هەڵسایەوە زۆر بە دوورو دریٚژی دوانیٚكی بۆ داین، هەرچی روودەدا - تا ئەو كاتەی كە قیامەت هەڵ دەستیٚ - گشتی باس كرد بۆمان، ئیتر ئەوەی لە بیری ما لەبیری ما، وە ئەوەی لە بیری چوو لە بیری چوو، یەكیٚ لەو فەرمایشتانە ئەوەبوو فەرمووی (سڵاوو دروودو پیتو بەرەكەتو رەحمەتی خودای گەورەی لە سەربیٚو سەروماڵو حاڵو ڕۆحو گیانو دڵو چاوو ماڵو منداڵو باوكو دایكو هەست

---

[٢] رواه الترمذي في السنن بسند صحيح.

و نەست هەمووی بە قوربانی گەردی بەرئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ، ئامین. خودایە!): هۆشیاربن! کەوا نەوەی ئادەم لە سەر چین چینی جوێ جوێ دروست کراون، وەك ئەوە هەیانە بە موسوڵمانی لە دایك دەبنو بە موسوڵمانی دەژینو بە موسوڵمانیش دەمرن، یا وەك ئەوە هەیانە بە ناموسوڵمانی لەدایك دەبنو بە ناموسوڵمانی دەژینو بە ناموسوڵمانیش دەمرن، یا وەك ئەوە هەیانە بەموسوڵمانی لەدایك دەبنو بە موسوڵمانی دەژین بەلاّم بە ناموسوڵمانی دەمرن، یا وەك ئەوە هەیانە بەناموسوڵمانی لە دایك دەبنو بە ناموسوڵمانی دەژین بەلاّم بە موسوڵمانی دەمرن، دیسان هوشیاربن! کەوا مرۆڤی وا هەیە درەنگ تووڕە دەبێو زوو ئاشت دەبێتەوە، بەڕاستی ئەم چینەیان باشترین چینیانە، هەیشە زوو توروڕە دەبێو زوو ئاشت دەبێتەوە، ئەم چینەشیان پاك لە پاكن، هەیشە زوو تووڕە دەبێو درەنگ ئاشت دەبێتەوە، بزانن کە ئەم چینەیان خراپترین چینیانە، بزانن هەیانە هەم سەر ڕاستو هەم سەودا خۆشنو بە ئاسانی مافی خەڵکی تر دەدەنو بە جوانی داوای هەقی خۆیان دەکەن، بزانن کە ئەم جۆرە کەسانە چاکترین کەسانن، بزانن هەیانە سەرچەوتن بەلاّم سەودا خۆشن، ئەم جۆرە کەسانەیش پاك لە پاکن، بزانن هەیانەهەم سەر چەوتنو هەم سەوداناخۆشن، بزانن کە ئەمانەیش خراپترین کەسانن، بزانن هە یانە سەوداراستن بەلاّم سەودا ناخۆشن، ئەم جۆرە کەسانەیش دیاسن پاك لە پاکن، هۆشیاربن کەوا رقو تووڕەیی وەك پشکۆی ئاگر وایە لە ناو دڵی ئادەمیزاددا، ئەدیی نابینن کە کا برای تووڕە بوو چۆن چاوەکانی وەك ڕەنگی پشکۆ سوور دەبنو رەگی لاملی هەڵ دەئاوسێ، جا ئەگەر دنیا بوو کە سێکتان هەستی بەشتێکی ئاواکرد با خۆی بدا بە زەویدا. ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: تەماشای خۆرمان کرد تابزانین هیچی وای ماوە بۆ ئاوابوون پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هۆشیاربن! ئەوەی کە ماوە لە دنیا لە چاو ئەوەیدا کە لێی ڕۆیشتووە وەك ئەوەی کە ماوە لە مرۆ لە چاو ئەوەیدا کە لێی ڕۆیشتووە. (ت — س/ص).

عدد أحاديث كتاب الأديب ١٩٧ سبعة وتسعون ومائة فقط.

مامۆستای دانەر شێخ مەنصوور علی ناصیف (ڕەحمەتی خودایان لێبێ) دەفەرموێ: ژمارەی فەرموودەکانی نامەی ئەدب ١٩٧ تەنیا سەدو نەوەدو حەوت فەرموودەن.

## (سێ کەس لەم دنیا)

هەرکەس لەم دنیا ئەدەب پەروەربێ

لە هەردوو دنیا خوایە! سەروەربێ!

هەرکەس لەم دنیا سڕێ بپۆشێ

بە بەرگی ڕەحمەت خودا دەیپۆشێ

دوو دڵدار بە شەرع بەیەک کەیەنێ

کونجێ لە بەهەشت بۆ خۆت دەستێنێ!

(وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحیم

# نامەی فەرتەنەگەل‌و نیشانەکانی هاتنی قیامەت

(ئەم نامەیە حەوت باس‌و پاپانێکە)

## ٨٧) باسی یەکەم: ترساندن لە فیتنە گەل

## کتاب الفتن وعلاماتَ الساعة: (وفيه سبعة أبواب وخاتمة)

## الباب الأول: في التحذير من الفتن

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاتَّقُواْ فِتْنَةً لاَّ تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمْ خَآصَّةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ - سورة الأنفال - ٨/٢٥}.

واتە: خودای گەورەو مەزن لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: خۆتان بپارێزن لەو موصیبەت‌و ئاژاوانەی کە تاوانبارو بێ تاوان وەك یەك دەگرێتەوەو تەڕو وشك پێکەوە دەسوتێنن، ئەوانەیش وەك چەسپاندنی خراپە لەناو خۆتاندا، وەك کەمتەر خەمی لە ئامۆژگاری خێردا، وەك دووبەرەکی و سەرهەڵدانی کارگەلی ناشایستەو نوێ باو. بزانن کەخودا بێ باکە، ئەگەر خواستی لەسەربێ گەلێ سەختگیرەو تۆڵەی گەلێ توندی لەلایە.

٥٤٨١- عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتِ: اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ النَّوْمِ مُحْمَرًّا وَجْهُهُ يَقُولُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍّ قَدِ اقْتَرَبَ، فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَاجُوجَ وَمَاجُوجَ مِثْلُ هَذِهِ. وَعَقَدَ سُفْيَانُ تِسْعِينَ أَوْ مِائَةً. قِيلَ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ. رواه الأربعة[1].

زەینەبی کچی جەحش (خودای لێ رازی بێ) کە هاوسەری پێغەمبەر بوو، فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە خەو ڕاپەڕی و هات بۆ لام، رووی سوور هەڵگەڕابوو، فەرمووی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ): هەر خودا خودایەو بەس، هاوار لە عەرەب بۆ ئەم شەڕەی کەوا رووی تێ کردوون، ئەمڕۆکە ئەوەندەی

---

[1] بخاری. أحاديث الأنبياء: ٣٣٤٦، ٣٥٩٨، ٧٠٥٩، ٧١٣٥. = تجريد/١٧/٣ رقم/١٣٤١. مسلم. فتن: ٧١٦٤. ترمذي. فتن: ٢١٨٧. ابن ماجه/ فتن: ٣٩٥٣.

ئەمە لە سەددی یەئجووج و مەئجووج کون بوو! سوفیانی فەرموودەوان ( راوی: موحەدیث) سەری پەنجەی شایەتمانی خۆیی نووساند بە بنی پەنجەکەڵەیەوەو کردی بە ئەڵقەیەکی بچکۆلەو نیشانی دا کە مەبەستی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) شتێکی کەم بووە وەك ئەم ئەڵقە بچکۆلەیە، زەینەب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: منیش عەرزیم کرد: قوربان! ئەگەر پیاو چاکانیشمان لە ناودابن هەر دەفەوتێین؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): بەڵێ کە پیسی و گەندیی پەرەی سەند! (ش/د/ت).

٥٤٨٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) قَالَتِ: اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةً فَزِعًا يَقُولُ: سُبْحَانَ اللّٰهِ مَاذَا أَنْزَلَ اللّٰهُ مِنَ الْخَزَائِنِ وَمَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الْفِتَنِ، مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ، فَرُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الآخِرَةِ. رواه البخاري والترمذي[٢]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە شەڵەژاوی لە خەو راپەڕی، فەرمووی: سوبحانەڵلاً! چەن سەیرە! ئیمشەو خودا دەرگای گەلێ گەنجینەی بۆ ئوممەتم خستە سەر پشت ( وەك گەنجی گەنجینەکانی فارس و رووم کەلەوە دوا موسوڵمانان بە تالآنی بردیان) هەروەها خودا گەلێ فیتنەو ئاشووبیشی نارد! ئەی بۆ مو سوڵمانێکی خاس دایکانی موسوڵمانان (واتە: خێزانەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) کە پێشیان دەگوترێ ئوممەهاتولموئمینین) خەبەر بکاتەوە، هەتا هەستن بۆ شەو نوێژو خودا پەرستی. ئای گەلێ ژن هەن لە جیهاندا پۆشتەو پەرداخن، وەلێ لە قیامەتدا رووت و قووتن (بەخوا ئێستا هەر زۆر زۆرن – وەرگێڕ). (ب/ت).

٥٤٨٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِي اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: عَبِثَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَنَامِهِ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: الْعَجَبُ إِنَّ نَاسًا مِنْ أُمَّتِي يَؤُمُّونَ هَذَا الْبَيْتِ بِرَجُلٍ مِنْ قُرَيْشٍ قَدْ لَجَأَ بِالْبَيْتِ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْبَيْدَاءِ خُسِفَ بِهِمْ. فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ الطَّرِيقَ قَدْ

---

[٢] تجريد/١/١١٨ قم/٩٤ = ١١٥، ١١٢٦، ٣٥٩٩، ٥٨٤٤، ٦٢١٨، ٧٠٦٩.

يَجْمَعُ النَّاسَ. فَقَالَ: نَعَمْ فِيهِمُ الْمُسْتَبْصِرُ وَالْمَجْبُورُ وَابْنُ السَّبِيلِ يَهْلِكُونَ مَهْلَكًا وَاحِدًا وَيَصْدُرُونَ مَصَادِرَ شَتَّى يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ عَلَى نِيَّاتِهِمْ. رواه الأربعة[٣]:

عائیشه (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەدەم خەوەوە سەخڵەت بوو پەله بچوڕكێی دەكرد، كه هەڵسا لێیمان پرسی، فەرمووی: چەن سەیره! پیاوێكی قورەیشی پەنا دەباتە بەر كەعبە، دەستەیەكیش بە سوپایەكەوە لە ئومەتی من دێن بۆی، دێن تا دەگەنە بیابانی بەیدا كە ناوی شوێنێكی تایبەتییە لە ناوەندی مەككەو مەدینەدا، جا لەوێ هەموویان رۆدەچن بەناخی زەویدا. عەرزیمان كرد: قوربان! ئەی رەوانە كراوی خودا! گەلێ جار خاس و خراپ لە رێگە بەرێكەوت یەك دەگرن ئەدیی ئەو لەشكرەیش بەڵكو پیاوی خاسیان تیابێ ئەی ئەوە چۆن؟ فەرمووی: بەڵێ وایە هەیانە سوور دەزانێ بۆچی هاتووەو خۆی باش دەزانێ كە بۆ گیانی ئەو پیاوە پەناهێنەرە هاتووە، هەشیانە ناچارەو بەزۆر هێنراوە، هەیشیانە رێبوارەو لەوان نییەو تەنیا ئەوەندەیە لەرێ تووشیان دەبێ، بەلام هەموو پێكەوە بەیەكجار لە ناو دەچن، لە دوا رۆژدا هەر كەسەیان خودا بە پێی نیازو كردەوەی خۆی پاداش یا تۆڵەی دەداتەوە. (ش/د/ت). ← (ب/٢ ز/١٣٧ ل/٢٧٥ چاپی یەكەم ف-٢/١٧٢٤).

٥٤٨٤- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَنْزَلَ اللَّهُ بِقَوْمٍ عَذَابًا، أَصَابَ الْعَذَابُ مَنْ كَانَ فِيهِمْ، ثُمَّ بُعِثُوا عَلَى أَعْمَالِهِمْ. رواه الشيخان[٤]:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ خۆشنوود بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ خودا سزایەكی ناردە سەر هۆزێ، ئیتر ئەو سزایە پاك و پیسیان وەك یەك دەگرێتەوە، بەلام لە پاشا خودا كە زیندوویان دەكاتەوە

---

[٣] مسلم. فتن: ٧١٧٣. راجع مجلد/٢ تسلسل/ ١٣٧ رقم/١/١٧٢٣.

[٤] بخاری فتن: ٧١٠٩ = ٢٠٩٩ تجريد/٥ ل- ٣٥٧. أخرجه مسلم في الجنة وصفة نعيمها، باب: الأمرل بحسن الظن بالله تعالى رقم/٢٨٧٩ هامش تجريد/٥ ل- ٣٥٧ = ٧١٦٣ تحقيق الشيخ خليل مأمون شيحا. طبعة/١٢/٢٠٠٦م.

هەرکەسەیان بە پێی کردەوەی تۆڵەی لێ دەستێنێ، یا پاداشی باشی دەداتەوە! (ش).

٥٤٨٥- تەماشای فەرموودەی یەتەقارەبوززەمانو بکە، لە باسی (ومنة البخل وسوء الخلق) لە نامەی چاکەو رەوشت(٥).

٥٤٨٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَتَكُونُ فِتَنٌ، الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي، وَمَنْ يُشْرِفْ لَهَا تَسْتَشْرِفْهُ، وَمَنْ وَجَدَ مَلْجَأً أَوْ مَعَاذًا فَلْيَعُذْ بِهِ. رواهما الأربعة(٦):

دیسان ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: فیتنەو فەرتەنە گەلێ دەقەومێن هەتا لێیان دووربیو دووریان لێ بگری کەمە، ئەوەی بچێ بە پیریانەوە دێن بە پیریەوەو بەرۆکی پێ دەگرن! دەی هەرکەسێ لەو دەمەدا پەناو پاسارێکی دەست کەوت باخۆی لەوێ قایم بکاو خۆی قوتاربکا (ش/د/ت).

٥٤٨٧- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ أَلاَ ثُمَّ تَكُونُ فِتْنَةٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا أَلاَ فَإِذَا نَزَلَتْ أَوْ وَقَعَتْ فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ. فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ مَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ إِبِلٌ وَلاَ غَنَمٌ وَلاَ أَرْضٌ قَالَ: يَعْمِدُ إِلَى سَيْفِهِ فَيَدُقُّ عَلَى حَدِّهِ بِحَجَرٍ ثُمَّ لْيَنْجُ إِنِ اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ اللَّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ. فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ أُكْرِهْتُ حَتَّى يُنْطَلَقَ بِي إِلَى أَحَدِ الصَّفَّيْنِ أَوْ إِحْدَى الْفِئَتَيْنِ فَضَرَبَنِي رَجُلٌ بِسَيْفِهِ أَوْ يَجِيءُ سَهْمٌ فَيَقْتُلُنِي، قَالَ: يَبُوءُ بِإِثْمِهِ وَإِثْمِكَ وَيَكُونُ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ. رواه مسلم وابو داود(٧):

---

(٥) راجع مجلد تاسع. تسلسل/٢٤ رقم/٤/٤٨١٧.

(٦) بخارى. مناقب: ٣٦٠١. تجريد/٣٥٦/٥ رقم/ ٢٠٩٧ = ٧٠٨٢ فتح. مسلم. فتن: ٧١٧٦، ٧١٧٨.

(٧) مسلم. فتن: ٧١٧٩. أبو داود. فتن: ٤٢٥٦.

ئەبو بەکرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستو نازدار (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بەڵێ فیتنەو ئاشووبو ئاژاوە گەلێ بەرودوا دەقەومێن، ئاگادارین لە پاشدا فەرتەنەیەکی گەلێ گەورە بەرپا دەبێ، یەخەی موسوڵمانان بەگشتی دەگرێ، پیاو هەتا لێیان دووربێو دووریان لێ بگرێ هێشتا هەر کەمە، بە تایبەتی فەرتەنە گشتییەکە، چونکە ئەوەی دەستی ئەوی تیانەبێ چاکترە لەوەی دەستی ئەوی تیابێ، ئەوەی کە دەستی ئەوی تیایە هێشتا باشترە لەوەی کە بەفیتی ئەو بەرپابووە. هۆشیاربن! کە ئەو فەرتەنەیە رووی دا یا فەرمووی: قەوما ئێوە پەرێ لێ بگرنو، هەر کەسێ بچێ بەلای کاروباری تایبەتیی خۆیەوەو توخنی ئەو فەرتەنەیە نەکەوێو هەر چۆن بووە لە دەستەی ئەو فەرتەنەیە خۆی بدزێتەوە، بەم رەنگە ئەوی وشتری هەیە بچێ بەسەرەو کاریی وشترەکانیەوەو، ئەوی رانی بزنو مەڕی هەیە بچێ بەلای رانەکەیەوەو، ئەوەی زەویو زاری هەیە بچێ بەسەرەوکاریی زەویو زارەکەیەوە، ئیتر هەتا بۆیدەکرێ تێکەڵ بەئەهلی ئەو فەرتەنەیە نەبێ.

پیاوێ عەرزی کرد: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئەی ئەگەر کەسێ وشترو رانو زەویو زارو شتی وای نەبوو چی بکا؟ فەرمووی: شمشێرەکەی بێنێو بە بەردێ دەمە تیژەکەی بشکێنێو ئینجا تادەتوانێ هەڵبێو خۆی دەرباز بکا! خودایە! تۆ ئاگات لێیە ئەوا من پێم گوتنو پێیانم راگەیاند، خودایە! تۆ ئاگات لێیە ئەوا من پێم گوتنو پێیانم راگەیاند، خودایە! تۆ ئاگات لێیە ئەوا من پێم گوتنو پێم راگەیاندن. پیاوێکی تریش عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەی ئەگەر بە زۆر بردمیان بۆ شەڕی براکوژیو لەریزی شەڕدا کابرایەك لە تاقمەکەی تر بەشیر یا بەتیر لێی دامو کوشتمی، یا تیرێ هاتو کوشتمی ئەوە چۆن؟ فەرمووی: ئەوە زۆردارەکەی کە تۆ بەزۆر دەبا بۆ ئەو شەڕە تاوانی خۆیو تاوانی کوژرانی تۆی بەئەستۆ دەبێ، وە بەهۆی ئەوەوە شایانی ئاگری دۆزەخ دەبێ (م/د).

٥٤٨٨- قَالَ سَعِيدِ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ (رضي الله عنه): يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَرَأَيْتَ إِنْ دَخَلَ عَلَيَّ بَيْتِي وَبَسَطَ يَدَهُ لِيَقْتُلَنِي قَالَ: كُنْ كَابْنِ آدَمَ. القائل: (وَتَلاَ يَزِيدُ (لَئِنْ بَسَطْتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَا بباسط يدي اليك لأقتلك). رواه أبو داود والترمذي[٨]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر یەکێ لەناو ماڵی خۆما شالاوی بۆ هێنام‌و پەلاماری دام کە بمکوژێ من چیبکەم؟ فەرمووی: تۆیش وەك هابیلی کوڕی باوە ئادەم بڵێ:

{لَئِن بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي مَا أَنَاْ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لَأَقْتُلَكَ إِنِّي أَخَافُ اللّٰهَ رَبَّ الْعَالَمِينَ —سورة مائده — ٥/٢٨}.

واتە: بەزاتێ کە زاتی خودایە ئەگەر تۆ بەناهەق دەست درێژی بکەی بۆ گیانی من‌و بتەوێ بەدەستی خۆت بمکوژی من رەق بۆت رادەوەستم‌و بەرگری لە خۆم ناکەم، چونکە من لەوانەنیم کە لەکاتی وادا دەست درێژبکەم بۆ گیانی تۆو بەدەستی خۆم بتکوژم، شتی وا زوشت‌و ناشیرین لە من ناوەشێتەوە، تاوانی وامویارەکی تۆیێ (د/ت).

٥٤٨٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعَتْ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُول: إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَكِلاَهُمَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ. قِيلَ: فَهَذَا الْقَاتِلُ؟ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ. رَوَاهُ الثلاثة[٩]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی خۆشەویستم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): هەر کاتێ دوو موسوڵمان بەشمشێرەوە روو بەرووی یەکتری وەستان‌و لە یەکترییان دا ئەوا هەردووکیان دەبن بە دۆزەخی، عەرزی کرا: قوربان! ئەوا بکوژەکە باشە کە دۆزەخییە چونکە پیاو کوژە، ئەی کوژراوەکە بۆچی؟ فەرمووی: چونکە

---

[٨] سکت عن درجته الشارح.

[٩] بخاری. ایمان: ٣١، ٦٨٧٥، ٧٠٨٣ = تجرید/١/٥٠ رقم/٢٩=٣١، ٦٨٧٥، ٧٠٨٣. مسلم. فتن: ٧١٨١. ابو داود. فتن: ٤٢٦٨، ٤٢٦٩. نسائی. تحریم الدم: ٤١٣٣، ٤١٣٤. تحفة: ١١٦٥.

ئەویش سوور ویستوویەتی کە برادەرەکەی بکوژێ‌و لە دڵەوە سوورو مجێز بووە لەسەر کوشتنی هاوڕێ موسوڵمانەکەی (ش/د).

٥٨٩٠- وَلِمُسْلِمٍ: إِذَا الْمُسْلِمَانِ حَمَلَ أَحَدُهُمَا عَلَى أَخِيهِ السِّلَاحَ فَهُمَا فِي جُرُفِ جَهَنَّمَ فَإِذَا قَتَلَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ دَخَلَاهَا جَمِيعًا[١٠]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: کاتێ دوو موسوڵمان (کە برای ئایینی یەکترن) چەك لەیەکتری هەڵبگرن‌و پەلاماری یەکتری بدەن ئەوا هەدووکیان بەسەر لێواری دۆزەخەوە ئەنجەل مۆڵەق ڕاوەستاون، ها ئێستا بەرببنەوە ناوی هاتۆزێکی تر، تایەکێکیان ئەوی تریان دەکوژێ ئەوسا هەردووکیان پێکەوە تلۆر دەبنە ناو دۆزەخەوە! (م).

٥٤٩١- ولأبي داود والترمذي: إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ تَسْتَنْظِفُ الْعَرَبَ قَتْلَاهَا فِي النَّارِ اللِّسَانُ فِيهَا أَشَدُّ مِنْ وَقْعِ السَّيْفِ[١١]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: فەرتەنەیێ دەقەومێ عەرەب پاکو دەدا، ئەوەی لەم فەرتەنەیەدا دەکوژرێ دۆزەخییە، لەو فەرتەنەیەدا زمان بەکارترو کاریگەرترە هەتا وەشاندنی شیر! (د/ت).

٥٤٩٢- ولأبي داود: إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ إِنَّ السَّعِيدَ لَمَنْ جُنِّبَ الْفِتَنَ وَلَمَنِ ابْتُلِيَ فَصَبَرَ فَوَاهًا[١٢]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار لەسەر یەك فەرمووی: بەختیار ئەو کەسەیە کە لە فەرتەنەکان بەدوورە ئەنجا فەرمووی: بەڵام ئافەریم بۆ ئەو کەسەی کە گیرۆدەی بەڵایێ دەبێ‌و ئارامی لەسەر دەگرێ. (د- ڕەزای خودای لێبێ).

٥٤٩٣- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ إِنَّ اللَّهَ زَوَى لِيَ الْأَرْضَ فَرَأَيْتُ مَشَارِقَهَا وَمَغَارِبَهَا وَإِنَّ أُمَّتِي سَيَبْلُغُ مُلْكُهَا مَا زُوِيَ لِي مِنْهَا وَأُعْطِيتُ

---

(١٠) بخاى. فتن: ٧٠٨٣م تعليقاً. مسلم. فتن: ٧١٨٤. نسائى. تحريم الدم: ٤١٢٧، ٤١٢٨. موقوفاً. ابن ماجه. فتن: ٣٩٦٥. تحفة: ١١٦٧٢.

(١١) سكت عن درجته الشارح.

(١٢) سكت عن درجته الشارح.

الْكَنْزَيْنِ الأَحْمَرَ وَالأَبْيَضَ وَإِنِّى سَأَلْتُ رَبِّى لأُمَّتِى أَنْ لاَ يُهْلِكَهَا بِسَنَةٍ بِعَامَّةٍ وَأَنْ لاَ يُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ فَيَسْتَبِيحَ بَيْضَتَهُمْ وَإِنَّ رَبِّى قَالَ يَا مُحَمَّدُ إِنِّى إِذَا قَضَيْتُ قَضَاءً فَإِنَّهُ لاَ يُرَدُّ وَإِنِّى أَعْطَيْتُكَ لأُمَّتِكَ أَنْ لاَ أُهْلِكَهُمْ بِسَنَةٍ بِعَامَّةٍ وَأَنْ لاَ أُسَلِّطَ عَلَيْهِمْ عَدُوًّا مِنْ سِوَى أَنْفُسِهِمْ يَسْتَبِيحُ بَيْضَتَهُمْ وَلَوِ اجْتَمَعَ عَلَيْهِمْ مَنْ بِأَقْطَارِهَا - أَوْ قَالَ مَنْ بَيْنَ أَقْطَارِهَا - حَتَّى يَكُونَ بَعْضُهُمْ يُهْلِكُ بَعْضًا وَيَسْبِى بَعْضُهُمْ بَعْضًا. رواه مسلم والترمذي وأبو داود وزادا: وَإِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِى الأَئِمَّةَ الْمُضِلِّينَ وَإِذَا وُضِعَ السَّيْفُ فِى أُمَّتِى لَمْ يُرْفَعْ عَنْهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَلْحَقَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِى بِالْمُشْرِكِينَ وَحَتَّى تَعْبُدَ قَبَائِلُ مِنْ أُمَّتِى الأَوْثَانَ وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِى أُمَّتِى كَذَّابُونَ ثَلاَثُونَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِىٌّ وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ لاَ نَبِىَّ بَعْدِى وَلاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِى عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ. لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِىَ أَمْرُ اللَّهِ[١٣].

ثەوبان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازدار فەرمووی: خودا تەنگی زەوی بۆ کێشام‌و پێچایەوەو هێنایەوەیەك بۆ بەرچاوم، ولآتی زۆرم دی لە ڕۆژهەلآت‌و ڕۆژ ئاوا، بێگومان قەلَەمڕەوی دەوڵەتی ئوممەتی من دەگاتە ئەو شوێنانەی کە دیانم.

خودا ولآتی ڕۆم بە خۆی‌و گەنجی زێڕینیەوە لەگەڵ ولآتی فارسدا بەخۆی‌و گەنجی زیوینیەوە بەخشیوە پێم، من داوام لە پەروەردگاری خۆم کرد کە ئەم چاکەیەیش لەگەڵ گەلی من بکا: کە بە قاتوقڕی‌و گرانی گشتی تێکرا بەجارێ نەیان فەوتێنێ، دوژمنێکی واشیان (لە غەیری خۆیان) بە سەردا زاڵ نەکا کە بەرەچەڵەکیا نابچێتە خوارەوەو لەرەگ‌و ریشە دەریان بێنێ‌و شان‌و شکۆی ئیسلام نەهێڵێ، کەچی پەروەردگارم فەرمووی: ئەی موحەممەد! بڕیاری من ڕەدبوونەوەی بۆ نییە، جاوا لە بەرخاتری تۆ بەڵێن دەدەم بە ئۆمەتت کە بە قاتوقڕی‌و گرانی گشتی تێکرا بەجاری نەیان فەوتێنم، هەروا دوژمێنکی واشیان (لە ناموسوڵمانان) بەسەردا زاڵ نەکەم کە لە ڕەگ‌و ریشە دەریان بێنێ،

---

[١٣] مسلم. فتن: ٧١٨٧. أبو داود. فتن: ٤٢٥٢. ترمذي. فتن: ٢١٧٦. ابن ماجه. فتن: ٣٩٥٢. تحفة الأشراف: ٢١٠٠.

گریمان سەر تۆپ خەڵکی سەر رووی زەوی سەرانسەر هەموویان گەلەکۆمەیان لێبکەن هێشتا دەرەقەتیان نایەن بەڵام ئەمەیان بەمەرجی ئەوە کە لەناو خۆیانا نەبن بەگەلی خۆ خۆرو سەرو نامووسی یەکتری بەتاڵان نەبەن! (م/ت/د). ئیمامی ئەبو داوودو ئیمامی تیرمزی (خۆشنوودیی خودایان لێبێ) ئەمەشیان لێ پتر کردووە: لە راستیدا مەترسیَ هەرە گەورەم (لەبارەی گەلی خۆشەویستی خۆمەوە) لە سەرۆکە سەرکەش‌و گێرەشێوێن‌و ملهوڕەکانیەتی، کە بە پێچەوانەی پێشەوا باشەکانیەوە خەڵك لەرێ دەردەکەن‌و دەبن بەسەر مەشقی گومڕاکردن، هەرکاتێکیش شمشێر نرایە ملی گەلی من‌و کوشت‌و کوشتاری تێکەوت ئیتر هەتا رۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ و رۆژێ لێرەو رۆژێ لەوێ کوشت‌و کوشتاری لێ نابڕێ، قیامەتیش هەڵناسێ تاچەن هۆزو تیرەیێ لە گەلی من دیسانەوە دەچنەوە ریزی بتپەرست‌و فرە خواکانەوەو هەندێ هۆزیان دیسان بتان دەپەرستنەوە. نیشانەیەکی بێگومانی تری نزیکبوونەوەی قیامەت ئەوەیە کە چەن هەلاتبارزێ، کەسیی کەسێ دەبن، لەناو گەلی مندا سەر هەڵدەدەن‌و پەیدا دەبن، هەموویان بەدرۆ لافی پێغەمبەری لێ دەدەن، وەلحاڵ داوای وادرۆیە چونکە من پایان‌و دواترینی پێغەمبەرانم‌و لەپاش هاتنی من پێغەمبەری تر هەتا هەتایە نایێ.

کۆمەڵێکیش (لەم گەلی منە) هەردەڕۆن لەسەر ئەم دینە هەقە هەتا نزیکی قیامەت، ئەوەی لە دژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ!.

٥٤٩٤- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ فِي الْفِتْنَةِ: كَسِّرُوا فِيهَا قِسِيَّكُمْ وَقَطِّعُوا فِيهَا أَوْتَارَكُمْ وَالْزَمُوا فِيهَا أَجْوَافَ بُيُوتِكُمْ وَكُونُوا كَابْنِ آدَمَ. رواه الترمذي وأبو داود[١٤]:

ئەبو مووسا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی فەرتەنەو ئاشووبی نێوانی موسوڵمانانەوە فەرمووی: لەکاتی

[١٤] رواه الترمذي بسند صحيحي (شرحه).

بەرپابوونی ئاشووربدا تیرو کەوانەکانتان بشکێنن‌و ژێی کەوانەکانتان بپسێنن‌و لە کونی ماڵەوەتان ئۆقرە بگرن‌و وەکوو هابیلی کوڕی ئادەم، کە قابیلی برای کوشتی، ئێوەیش وەك ئەو لە ئاژاوە بەدووربن‌و بەهیچ جۆرێ هاوبەشی تیا مەکەن. (ت-س/ص-د).

٥٤٩٥- وَقِيْل: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ خَيْرُ النَّاسِ فِي الفتنة؟ قَالَ: رَجُلٌ فِي مَاشِيَتِهِ يُؤَدِّى حَقَّهَا وَيَعْبُدُ رَبَّهُ وَرَجُلٌ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ يُخِيفُ الْعَدُوَّ وَيُخِيفُونَهُ[١٥]:

گوترا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! لەکاتی قەومانی ئاژاوەدا باشترین کەس کێیە؟ فەرمووی: ئەو کەسەیە کە گوریز لە ئاشووبەکە دەکاو دەچێ بەلای ماڵیاتی خۆیەوە سەرەو کارییان دەکاو مافیان بەجێ دێنێ‌و خودای خۆی بەجوانی لە پەنایەکەوە دەپەرستێ، هەروا ئەو پیاوەیشە کە دەستەجڵەوی ئەسپەکەی دەگرێ‌و لەسەر سنوور بەرەنگاری دوژمنی ئیسلام رادەوەستێ‌و دوژمن دەترسێنێ‌و دوژمنیش ئەو دەترسێنێ! (ت-س/ح).

٥٤٩٦- وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يُذِلَّ نَفْسَهُ. قَالُوا: وَكَيْفَ يُذِلُّ نَفْسَهُ. قَالَ: يَتَعَرَّضُ مِنَ الْبَلاَءِ لِمَا لاَ يُطِيقُ[١٦].

پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بۆ پیاوی موسوڵمان نەهاتووە کە خۆی سووك‌و ترۆکا بکات. گوترا: قوربان! چۆن چۆنی خۆی سووك‌و ترۆ دەکا؟ فەرمووی: وەك ئەوە بچێ بە بەرەو پیریی ئەو دەردو بالآیانەوە کە بەرگەیان ناگرێ! (ت-س/ح).

٥٤٩٧- وَلَمَّا طلب علي مَنْ أَهْبَانَ بْنِ صَيْفِيٍّ الْغِفَارِيِّ أَنْ يَخرُجَ مَعَهُ قَالَ: إِنَّ خَلِيلِي وَابْنَ عَمِّكَ عَهِدَ إِلَيَّ إِذَا اخْتَلَفَ النَّاسُ أَنْ أَتَّخِذَ سَيْفًا مِنْ خَشَبٍ فَقَدِ اتَّخَذْتُهُ فَإِنْ شِئْتَ خَرَجْتُ بِهِ مَعَكَ فَتَرَكَهُ علي. روى هذه الثلاثة الترمذي. نسأل الله السلامة آمين[١٧].

---

[١٥] رواه الترمذي بسند صحيحي (شرحه).

[١٦] رواه الترمذي بسند حسن.

[١٧] رواه الترمذي بسند حسن.

عەلی (رەزای خودای لێبێ) داوای لە ئەهبانی کوڕی سەیفی غیفاری کرد کە لەگەڵیا بچێ بۆ شەڕ، ئەهبانیش (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: من پەیمانم داوە بە دۆستی ئازیزی خۆم (کە پێغەمبەری ئامۆزای تۆیە) کاتێ کە ئەم خەڵکی ئیسلامە بوو بە هەراو ناخۆشییان‌و چوون بەگژی یەکتردا وەك ئێستا، من لەو دەمەدا شمشێرێکی دار هەڵبگرم، جا ئێستاکەیش وا ئەو شمشێرە دارینەیەم دروست کردووە بۆ خۆم! ئەگەر حەز دەکەی ئەوا هەڵی دەگرم‌و بەوشمشێرە دارینەوە دێم لەگەڵتا، ئیتر عەلی وازی لێهێنا (ت-س/ح).

## ٨٨) خەبەردان لە فیتنە گەل‌و جۆرەکانی : (الإخبار بالفتن وأنواعها)

٥٤٩٨- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَقَامًا فَمَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلاَّ حَدَّثَ بِهِ حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابِي هَؤُلاَءِ وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ قَدْ نَسِيتُهُ فَأَرَاهُ فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ. رواه الثلاثة[1]:

حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵسایەوە لەسەر مینبەر دوانێکی بۆمان خوێندەوە، لەناو ئەو دوانەدا هەرچی روویدابێ‌و هەرچی روودەدا هەتا هەڵسانی قیامەت حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی کرد بۆمان، ئیتر ئەوی لەیادی مابێ لەیادی ماوە و (گەنجینەی رازو نهێنییەکان بوو بەماڵی) ئەویشی لەیادی چووبێتەوە لەیادی چۆتەوە و (ئەو گەنجی گەنجینەیەی بەفیڕۆ داناوە). ئەم برادەرانەی من ئەم باسە زۆر باش دەزانن، من بەش بەحاڵی خۆم جاری وادەبێ شتێ لەو بابەتە روودەدا، من لەبیرم نەماوە بەڵام کە روودەدات‌و دەیبینم ئەوجا یادم دەکەوێتەوەو لەدڵی خۆما دەڵێم ئەمە ئەوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی کرد بۆمان وەکوو چۆن پیاوێ لەپاش ماوەیێ چاوی بەچارەی

---

[1] بخاری. قدر: ٦٦٠٤ = تجرید/٥ ل- ٣٠٠ رقم/ ٢٠٤٤. مسلم. فتن: ٧١٩٢. ابو داود. فتن: ٤٢٤٠ تحفة الأشراف: ٣٣٤٠.

**پیاوێکی ناسیاوی خۆی بکەوێتەوە، کە لەیادی نەمابێ، بەڵام کە دەیبینێ دیسانەوە دەیناسێتەوە! (ب/م/د).**

**٥٤٩٩- وَعَنْهُ قَالَ: وَاللَّهِ إِنِّي لأَعْلَمُ النَّاسِ بِكُلِّ فِتْنَةٍ هِيَ كَائِنَةٌ فِيمَا بَيْنِي وَبَيْنَ السَّاعَةِ وَمَا بِي إِلاَّ أَنْ يَكُونَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَسَرَّ إِلَيَّ فِي ذَلِكَ شَيْئًا لَمْ يُحَدِّثْهُ غَيْرِي وَلَكِنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّثَنا فِي مَجْلِسٍ أَنَا فِيهِ عَنِ الْفِتَنِ فَعَدَّهَا فَقَالَ: مِنْهُنَّ ثَلاَثٌ لاَ يَكَدْنَ يَذَرْنَ شَيْئًا وَمِنْهُنَّ فِتَنٌ كَرِيَاحِ الصَّيْفِ مِنْهَا صِغَارٌ وَمِنْهَا كِبَارٌ. قَالَ حُذَيْفَةُ: فَذَهَبَ أُولَئِكَ الرَّهْطُ كُلُّهُمْ غَيْرِي[٢].**

**دیسان فەرمووی: بەزاتێ کە زاتی خودایە لەمڕۆوە هەتا ڕۆژی قیامەت هەرچی فیتنەو فەرتەنەیێ روو دەدات من لە هەموو کەسێکی تر باشتری لێ دەزانم، ئەمەیش تەنیا لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بابەتەوە بەنهێنی قسەی بۆ من کردووەو قسەی ئەوەی بۆ کەسی تر نەکردووە، هەر لەبەر ئەمەیشە کە لەلای کەس نایلێم، بەڵام جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو کۆڕێکی دانیشتندا باسی گەلێ فیتنەی بۆ کردین، دەستی کرد بە ژماردنیان‌و فەرمووی: (دروودی خودای لەسەر بێ) سێیان لەوانە کەم شت لێیان زرگار دەبێ، هەندێکیشیان وەك بای هاوین وان، وردو درشتیان هەیە. حوزەیفە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: ئەو دەستەیە کە لەو کۆڕەدا بوون من نەبێ کەسیان نەماون. (موسلیم- پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنووری خودابێ).**

**٥٥٠٠- وَعَنْهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمَا هُوَ كَائِنٌ إِلَى أَنْ تَقُومَ السَّاعَةُ فَمَا مِنْهُ شَيْءٌ إِلاَّ قَدْ سَأَلْتُهُ إِلاَّ أَنِّي لَمْ أَسْأَلْهُ مَا يُخْرِجُ أَهْلَ الْمَدِينَةِ مِنَ الْمَدِينَةِ[٣]:**

**دیسان فەرمووی: (خودای لێ ڕازی بێ) هەتا ڕۆژی هەستانەوە (قیامەت) دێت هەرچی کارەساتێ ڕوودەدا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمنی گوتووە،**

---

[٢] مسلم. فتن: ٧١٩١.

[٣] مسلم. فتن: ٧١٩٤.

شتێ نییە کە نەیم پرسیبێ لێی، بەڵام ئەوەم لێی نەپرسی کەچی خەڵکی مەدینە لە مەدینە دەردەکات (م).

٥٥٠١- عَنْ عَمْرِو بْنَ أَخْطَبَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْفَجْرَ وَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الظُّهْرُ فَنَزَلَ فَصَلَّى ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى حَضَرَتِ الْعَصْرُ ثُمَّ نَزَلَ فَصَلَّى ثُمَّ صَعِدَ الْمِنْبَرَ فَخَطَبَنَا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ فَأَخْبَرَنَا بِمَا كَانَ وَبِمَا هُوَ كَائِنٌ فَأَعْلَمُنَا أَحْفَظُنَا[٤]:

عەمری کوڕی ئەختەب (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودو سڵاوو رەحمەت‌و صەلات‌و پیت‌و فەڕو بەرەکەتی خوداو بەندەی لەسەربێ‌و، سەرو ماڵ‌و مناڵ‌و باوك‌و دایك بەقوربانی خاکی بەردەم ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) رۆژێ پێغەمبەر بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ کردین، ئەوجا سەرکەوتە سە دوانگەکەو دەستی کرد بە دوانـدان بۆمان‌و خوتبەی بۆ خوێندین تا نوێژی نیوەڕۆ داهات، ئەوجا لە دوانگەکە دابەزی‌و نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین‌و، دیسان سەرکەوتەوە سەر مینبەرەکەو دەستی کردەوە بە خوتبەدان بۆمان تا نوێژی عەسر داهات، ئەنجا هاتەوە خوارێ‌و نوێژی عەسری بۆ کردین‌و دیسانەوە چووەوە سە مینبەرەکەو دەستی کردەوە بە وتاردان بۆمان تا خۆر ئاوابوو، ئەوەی لەمەوپێش رووی داوەو ئەوەی لەمەو دوا روودەدا هەواڵی گشتی پێگوتین، جا لەسەر ئەم بنیاتە زانا ترینی ئێمە ئەو کەسەمانە کە زۆرتری لەو فەرمایشتانەی حەزەت لەبەرماوەو رەوانی کردوون (م).

٥٥٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنْ النَّبِي (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَأْتِيَ عَلَى النَّاسِ يَوْمٌ لاَ يَدْرِي الْقَاتِلُ فِيمَ قَتَلَ وَلاَ الْمَقْتُولُ فِيمَ قُتِلَ. فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ كَيْفَ يَكُونُ ذَلِكَ قَالَ: الْهَرْجُ. الْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ[٥]:

---

[٤] مسلم. فتن: ٧١٩٦.

[٥] مسلم. فتن: ٧٢٣٣.

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێبـێ) فـەرمووی: حـەزرەتی پێغەمبـەری خشەویست (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: بـەو کەسـە کـە گیـانی مـن وا لەدەستی تەوانایی ئەودا، دیارە کە یەزدانی پاکە، دنیا ئاخر نابێ تا مـەردوم دەکەونـە رۆژێکـی رەشـی واوە پیـاو کـوژ بـۆ خۆشـی نازانـێ لەسـەر چـیو لەبەرچی پیاوی کوشتووەو هەر وا کوژراو نازانێ بۆچی دەیکوژن!. گوترا: قوربان! ئەوە چۆن وای لێدێ؟ فەرمووی: دەبێ بە تالانو بڕۆو بگرەو بەردەو ئاخۆرانو بخۆران، لەو رۆژەدا بکوژوکوژراو هـەردوو لایان دۆزەخین! (م- پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووربێ).

خودا لێخۆشبوو مامۆستا مەلا رەشید بەگی بابان - خـودا لێـی خـۆش بێ - لێرەدا دەفەرموێ: (لەم نەوعە زۆرمان دیوەو ئەیشی بینین، چۆن ئەبێ پێغەمبەر (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خەبەری لێ داونەبێ؟ (صدق -صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ - روحی واهلی ومالی فداه) مەجمەعولبەرحرەین بەرگی سێیەم لاپەڕە (٧٩).

بەندەیش دەڵێم:

ئـای چـەندەم دیـوە کـەللـەی مـۆخ پـژاو
تـــەرمی جـــەهێڵی لـــەخوێنا گـــەوزاو
جەسـتەی بـێ تـاوان بـە گوللـە بێـژراو
لەچـارەی شـــەهید پرســـیاری چـــاشماو!
ئاشــــکرا دەڵـــێ بـــەزمانی حـــاڵ
نـــەک بـــە ئامـــاژە وەکـــوو کـــەڕو لاڵ!
منـی بـێ تـاوان، منـی خێـر نـەدیو
منـی تاقانـەی حـەوت خوشـکی هـەتیو!
کـێ مـن دەکـوژێ؟ ئـاخر لەسەرچـی
منـی بێـوەیی، جوانکـەی بـێ سووچـی!
چـۆن بـەد بـەختێ بـێ نـەوەی دەمکـوژێ
بـە نـەمری زاڵـم خـوێنم دەڕێـژێ

قــەت بــاوەڕ ناکــەم ئــەوە بــە شــەربێ

ڕەنــگ بــێ ڕۆبــۆتی دەســکردی کــەربێ

ئــووری! بەســیەتی، ئــەم لافــاوەی ئــووح

بــەری نــاگیرێ بــە شــیعری بــێ ڕووح

مــەر خــودا رەحمــێ بکــا بــە حاڵمــان

ئــەمین بــین ئەوســا لەســەرو ماڵمــان

دەنــا ئــەم داســەی نــاو دەســتی زەمــان

پاکۆمـــان دەدا وەک پاڵــــەو ســــەپان

مــــاڵی وا هەیــــە خــــاوو خێزانــــی

هەریــــەک بــــەجۆرێ بــــوون بــــەقوربانی

بــاوک بــەخنکان، دایــک لــە زینــدان

کــوڕ بەشەســتیرو کــچ بەتێهەڵــدان

بــاپیرو داپــیر لــە ڕۆڵــەو نــەوە

نائومێــد مــردن بەســوێ بوونــەوە

٥٥٠٣- أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَتِ السَّنَةُ بِأَنْ لاَ تُمْطَرُوا وَلَكِنِ السَّنَةُ أَنْ تُمْطَرُوا وَتُمْطَرُوا وَلاَ تُنْبِتُ الأَرْضُ شَيْئًا. روى هذه الخمسة مسلم[٦].

دیسان فـەرمووی: حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: گرانـی و ساڵی نەهاتی بەبێ بارانی نییە، بەڵام نەهاتە ساڵی ڕاستی ئەوەیە کە پەستا پەستا بارانتان بۆ بباریێ کەچی زەوی هیچ شینایی سەوز نەکا! (م).

٥٥٠٤- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: وَاللَّهِ مَا أَدْرِى أَنَسِىَ أَصْحَابِى أَمْ تَنَاسَوْا وَاللَّهِ مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ قَائِدِ فِتْنَةٍ إِلَى أَنْ تَنْقَضِىَ الدُّنْيَا يَبْلُغُ مَنْ مَعَهُ ثَلاَثَمِائَةٍ فَصَاعِدًا إِلاَّ قَدْ سَمَّاهُ لَنَا بِاسْمِهِ وَاسْمِ أَبِيهِ وَاسْمِ قَبِيلَتِهِ[٧].

---

[٦] مسلم. فتن: ٧٢٢٠.

[٧] سكت عن درجته الشارح.

**حوزەیفە** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: بە خودا نازانم ئایا هاوڕێکانم لە یادیان نەماوە یا خۆیانی لێ وێڵ دەکەن، بەو خودایەی هەر هۆی خودای بەهەقە هەر ئاژاوە گێڕێ کە دەستوپێوەندەکەی بگەنە سێ سەد کەس یا زیاتر لە ئێستاوە تا جیهان کۆتایی دێ، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **ناوی خۆی‌و باوکی‌و هۆزەکەیی یەك بە یەك پێ گوتووین! ئەبو داود.**

**٥٥٠٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: يَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ أَرْبَعُ فِتَنٍ فِي آخِرِهَا الْفَنَاءُ. رواهما أبو داود[٨]:**

**عەبدوڵڵا** (ڕەزای خودای لێبێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: چوار فەرتەنەی هەرە گەورە لەناو ئەم میللەتی ئیسلامەدا بەرپا دەبێ، لە چوارەمیاندا لە ناوچوون‌و نەمانە! ئەبو داود.**

**٥٥٠٦- عَنْ بْنَ عُمَرَ** (رَضِي اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُمَا) **قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَذَكَرَ الْفِتَنَ فَأَكْثَرَ فِي ذِكْرِهَا حَتَّى ذَكَرَ فِتْنَةَ الأَحْلاَسِ فَقَالَ قَائِلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا فِتْنَةُ الأَحْلاَسِ؟ قَالَ: هِيَ هَرَبٌ وَحَرْبٌ ثُمَّ فِتْنَةُ السَّرَّاءِ دَخَنُهَا مِنْ تَحْتِ قَدَمَيْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَزْعُمُ أَنَّهُ مِنِّي وَلَيْسَ مِنِّي وَإِنَّمَا أَوْلِيَائِيَ الْمُتَّقُونَ ثُمَّ يَصْطَلِحُ النَّاسُ عَلَى رَجُلٍ كَوَرِكٍ عَلَى ضِلَعٍ ثُمَّ فِتْنَةُ الدُّهَيْمَاءِ لاَ تَدَعُ أَحَدًا مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ إِلاَّ لَطَمَتْهُ لَطْمَةً فَإِذَا قِيلَ انْقَضَتْ تَمَادَتْ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا حَتَّى يَصِيرَ النَّاسُ إِلَى فُسْطَاطَيْنِ فُسْطَاطِ إِيمَانٍ لاَ نِفَاقَ فِيهِ وَفُسْطَاطِ نِفَاقٍ لاَ إِيمَانَ فِيهِ فَإِذَا كَانَ ذَاكُمْ فَانْتَظِرُوا الدَّجَّالَ مِنْ يَوْمِهِ أَوْ مِنْ غَدِهِ. رواه أبو داود والحاكم (بسند صحيح)[٩]:**

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: جارێ لە خزمەتی حەزرەتدا بووین** (درودی خودای لەسەر بێ) **بە دوورو درێژی باسی فەرتەنەو ئاشووبەکانی بۆکردین، تا هاتە سەر باسی فەرتەنەی ئەحلاس (ئەحلاس واتە: ژێر زین‌و**

---

[٨] رواه أبو داود وسكت عن درجته الشارح.

[٩] بسند صحيح.

ژێر کورتان، بۆیە وای پێ دەڵێن چونکە وەك چۆن ژێر زین بەبێ پەردەی تر دەلکێ بە پشتی وڵاخەوە ئەمیش ئاوا دەلکێ بە کوڵکی ئادەمیزادەوەو ئیتر بەرۆکی بەرنادات، واتە: وەك قیرو بنێشت دەیگرێ).

پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرتەنەی ئەحلاس چییەو چۆنە؟ فەرمووی: قوشقی بوون‌و گوریزکردن‌و فەرهوودەو شڕە خۆری‌و رووتاندنەوەیە، دەی لە پاش ئەویش سەرەی فەرتەنەی سەررایە[1] ئاگری ئەم فەرتەنەیە پیاوێ لە کەسوکاری من هەڵی دەگیرسێنێ گوایە دەڵێ: ئەو لە نەوەی منە، بەڵام ئەو لە من نییەو لەسەر رەفتارو رەوشتی من نییە (لەبەر ئەوە من لەوو لە هەموو بەدکارێ بەریم) چونکە تەنیا پیاو چاکان‌و لەخودا ترسان دۆست‌و پشتیوانی منن. جا لە پاشدا مەردوومەکە لەسەر سەرۆکایەتیی پیاوێکی بێ باری نالەبار رێك دەکەون کە ئەو کابرایە بۆ ئەو جێگایە وەك ئاسمان‌و رێسمان وایە، لەبەر ئەوە کارەکە سەر ناگرێ، ئینجا سەرەی فەرتەنەی رۆژی رەشی وەی باران‌و ئاگر بارانە، کەس نامێنێ لەم گەلی ئیسلامە کە ئەم فەرتەنەیە کەتنێکی پێنەکا، جار لەگەڵ جاردا کە دێتە سەر ئەوەی کە بکوژێتەوە کەچی دیسانەوە سەر لەنوێ هەڵ دەگیرسێتەوە! لە کاتی روودانی ئەو فەرتەنەیەدا شیرازەی کۆمەڵ وا تێك دەچێ پیاو بەیانی موسوڵمانە کەچی ئێوارە بێ بڕوایە، تا بەرە بەرە خەڵك دەبن بە دوو بەرەوە: بەرەی موسوڵمانەتی ساغی پەتی کەچی پێی بڵێی ناپاکییە تیادانییە، وە بەرەی ناموسوڵمانەتی پەتی کە زەررە موسوڵمانەتی تیادانییە، جا کە حاڵ‌و بارو دۆخ گەیشتە ئەم رادەیە ئیتر بۆ سبەی‌و ئەدووی چاوەڕوانی سەرهەڵدانی ججاڵ بکەن! (د/حاکم-س/ص).

---

[1] السراء: البطحاء. النهایة بین غریب الحدیث والاثر. دیارە بەتحائیش سارایە وەك دوو رشتەی ماموستا مەلا عەبدولکەریم دەفەرموێ. کەواتە ئەم قسەیەوایە:

کەردەلوولەکەی بیابان وەک خەو

رۆژی رووناکی لێ کردین بەشەو

(وەرگێر -١٤/٧/١٩٩٢)

٥٥٠٧- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتُلُوا إِمَامَكُمْ وَتَجْتَلِدُوا بِأَسْيَافِكُمْ وَيَرِثَ دُنْيَاكُمْ شِرَارُكُمْ.رواه الترمذي بسند حسن[١٠]:

**حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە قیامەت هەڵ ناسێ تاپێشەوای خۆتان دەکوژن‌و بەشمشێر بەردەبنە سەرو گوێلاکی یەکتریی، ئەوجا بەدکارو پیاو خراپەکان دەبن بە خاوەنی جیهان! پاش ئەمە قیامەت هەڵ ئەستێ. (ت-س/ح).**

## ٨٩) باسی دووەم: لەبابەت لایەنگرتنی کۆمەڵەی موسوڵمانانەوە

## الباب الثاني: في الإنضمام إلى الجماعة

١- (ب/٣ ز- ١٠٥ ل- ٢٨٠ چاپی/١ ز- ٢٤٢٦/٧)[١].

**ئەم فەرموودە پیرۆزەیە لەپێشەوە لەم شوێنەدا رابوورد بەرگی سێیەم لاپەڕە (٢٨٠) چاپی یەکەم. فەرموودەی حەوتەم. لە چاپی دووەمدا یەکسانە بە ژمارە/٢٤٢٦/٧. گێڕانەوەی ئێرە پتریی بەسوودی هەیە. دەفەرموێ: حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خەڵکانی تر لەبارەی خێرەوە لە حەزرەتیان دەپرسی، وەك باسی زەکات‌و نوێژو رۆژوو ئەمانە، بەڵام من لەبارەی سەڕەوە لێیم دەپرسی، مەبادا تووشم ببێ، تا خۆمی لێ بپارێزم، جارێ عەرزیم کرد: قوربان! ئاشکرایە کە ئێمە لە پێش هاتنی ئیسلامدا نوقمی نەزانی‌و نەفامی بووین، ئێستاکەیش ئەوەتانێ خودا لێی بەزیادبێ ئەم خێرو بێرەی هێناوە بۆمان، جا لەپاش ئەم سەردەمەی خێرەی ئێستایە خوانە خواستە شەڕ دەوری دێتەوە یانا؟ فەرمووی: (ئا) عەرزیم کرد: باشە لە دوا ئەو شەڕەوە سەرەی خێر دێتەوە؟ فەرمووی: ئا، بەڵام ئەمجارەیان لێڵ‌و**

---

[١٠] رواه الترمذي بسند حسن.

[١] تقدم فی مجلد ثالث. تسلسل/ ١٠٥ ط/١، ٢٩٠ ط/٢ رقم ٢٤٢٦/٧.

دووکەڵاوییە! عەرزیم کرد: لیڵییەکەی چییە؟ فەرمووی: کۆمەڵێ لەناو گەلی ئیسلامدا پەیدا دەبن خۆیان ناشارەزاو نابەڵەدن، کەچی دەچن چاو ساخی خەڵکی تر دەکەن، چاکەو خراپە تێکەڵ‌و پێکەڵ دەکەن، چاکەکەیان پەسەند دەکەی‌و خراپەکەیان بەگەند ناکەی.

گوتم: ئەی باشە لەدوا ئەم خێرەیشەوە نۆرەی شەڕ دێتەوە؟ فەرمووی: بەڵێ کۆمەڵێ سەرکردەی بەد پەیدا دەبن لە درەگای دۆزەخا رادەوەستن، مەردوم گاز دەکەن بۆ سەر گومڕایی، ئەوەی بچێ بە دەنگیانەوە بۆ ئەوێ برکی دەدەنە ناویەوە! عەرزیم کرد: قوربان! نیشانەی ئەوانەمان بۆ باس بفەرموو؟ فەرمووی: ئەوانیش لە رەگەزی خۆمانن‌و بەزمانی ئێمە قسە دەکەن. گوتم: ئەی باشە ئەگەر نەمردم‌و مام تا ئەو سەردەمە فەرمانت بەچییە پێم، موسوڵمان لە رۆژی ئاوادا چی بکا؟ فەرمووی: لایەنی کۆمەڵەی موسوڵمانان بگرەو لە پێشەوای ئەوان جیا مەبەرەوەو، لەگەڵ کۆمەڵەی زوربەی موسوڵمانان‌و سەرۆکی ئەوانبە. گوتم: ئەی ئەگەر موسوڵمانان نەکۆمەڵەیان هەبوو نە پێشەوا ئەوە چۆن؟ فەرمووی: لەوەها بارو دۆخێکا لەو تاقمە جوێ جوێیانە لە هەموویان کە ناربگرە، ئەگەر هەر چارت نەبوو لەبن شێخەڵێکا ستار بگرەو مەچۆرە ناو کۆمەڵیان تا لەسەر ئەو شێوەیە مردن دەگاتە سەرت دوور لەوان! (ت/د).

٥٥٠٩- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ لَنَا: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ بَعْدِي أَثَرَةً وَأُمُورًا تُنْكِرُونَهَا.قَالُوا فَمَا تَأْمُرُنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: أَدُّوا إِلَيْهِمْ حَقَّهُمْ وَسَلُوا اللَّهَ حَقَّكُمْ[٢].

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: گومانی تیادا نییە کە ئێوە لەدوا مەرگی من تووشی هەندێ خۆ خۆیی‌و خود بینی دەبن‌و فەرمانڕەواکانتان نازی ئەم‌و

---

[٢] بخاري. مناقب: ٣٦٠٣، ٧٠٥٢. مسلم. مغازي: ٤٧٥٢. ترمذي. فتن: ٢١٩٠ تحفة الأشراف: ٩٢٢٩.

ئەو بە ناڕەوا دەدەن بەسەر ئێوەدا، هەروا گەلێ کارو باری ناپەسەند بەچاوی خۆتان لە فەرمانڕەواکانتان دەبینن. یاران فەرموویان: قوربان! فەرمانمان بەچی پێدەکەی لەو کاتەدا؟ فەرمووی: مافی خۆیانیان بدەنێ‌و مافی خۆشتان لە خودا بوێ (ب/ت).

٥٥١٠- قَالَ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): شَكَوْنَا إِلَى أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ مَا نَلْقَى مِنَ الْحَجَّاجِ فَقَالَ: اصْبِرُوا، فَإِنَّهُ لاَ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ إِلاَّ الَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ، حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ. سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّكُمْ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواهما البخاري والترمذي[٣]:

زوبەیری کوڕی عەدیی (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لەدەست زۆرو ستەمی حەججاج هاوارمان بردە لای ئەنەس، فەرمووی: ددان بەخۆتاندا بگرن، صەبر بکەن، چونکە زەمانە رۆژ بەرۆژ خراپتر دەبێ (کورد گوتنی: ئەمرۆ خۆزگە بەدوێنێیە) هەتا رۆژی قیامەت کە دەچنەوە دیوانی خودای پەروەردگاری خۆتان ئەم قسەیەشم لە پێغەمبەری خۆشەویستی ئێوە بیستووە (دروودی خودای لەسەر بێ). (ب/ت).

٥٥١١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَدُورُ رَحَى الإِسْلاَمِ لِخَمْسٍ وَثَلاَثِينَ أَوْ سِتٍّ وَثَلاَثِينَ أَوْ سَبْعٍ وَثَلاَثِينَ فَإِنْ يَهْلِكُوا فَسَبِيلُ مَنْ هَلَكَ وَإِنْ يَقُمْ لَهُمْ دِينُهُمْ يَقُمْ لَهُمْ سَبْعِينَ عَامًا. قُلْتُ أَمِمَّا بَقِيَ أَوْ مِمَّا مَضَى؟ قَالَ: مِمَّا مَضَى[٤]:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: تاسیی‌و پێنج – یان سیی‌و شەش یا سیی‌و حەوت – ساڵ ئاشی فەرمانڕەوایی ئیسلام بەرێك‌و پێکی دەگەڕێ‌و دەچێ بەڕێوە، جا لەپاش ئەوەندە ئەگەر لەناو چوون ئەوا حاڵی ئەوانیش وەك حاڵی ئەو میللەتانەی کە لە پێش ئەوانەوە لەناو چوون، بەڵام ئەگەر لەپاش ئەوەندەیش ئایینەکەیان بەرێك‌و پێکی بۆیان چوو بەڕێوە ئەوا تا حەفتا ساڵ

---

[٣] تجريد/٥ ل- ٣٥٥ رقم/ ٢٠٩٥ = ٧٠٦٨ فتح البار.

[٤] رواه أبو داود وسكت عن درجته الشارح.

پایەدار دەبێ. گوتم: ئایا حەفتا ساڵی تریش، یا بە سیی‌و پێنج ساڵەکەوە تا حەفتا ساڵ؟ فەرمووی: بەسیی‌و پێنج ساڵەکەوە هەتا هەفتا ساڵ (ئەبو داود — رەزای خوای لێبێ).

٥٥١٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ قِيدَ شِبْرٍ فَقَدْ خَلَعَ رِبْقَةَ الإِسْلاَمِ مِنْ عُنُقِهِ[٥]:

ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێبێ) لە خۆشەویستەوە (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: هەر کەسێ بەبست لەگەڵ ئیسلام جوێ ببێتەوەو لە جەماوەری کۆمەڵەی هەرە گەورەی موسوڵمانان دابڕێ ئەوە سەر روشتەی ئیسلام لەملی خۆی‌دا دەماڵێ. ئەبو داود.

٥٥١٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَيْفَ أَنْتُمْ وَأَئِمَّةٌ مِنْ بَعْدِي يَسْتَأْثِرُونَ بِهَذَا الْفَيْءِ. قُلْتُ: أَمَا وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ أَضَعُ سَيْفِي عَلَى عَاتِقِي ثُمَّ أَضْرِبُ بِهِ حَتَّى أَلْقَاكَ. قَالَ: أَوَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى خَيْرٍ مِنْ ذَلِكَ؟ تَصْبِرُ حَتَّى تَلْقَانِي. روى هذه الثلاثة أبو داود[٦]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لە دوای من هەندێ پێشەوا پەیدا دەبن، ماڵی بەیتولمال دەبەن بۆ خۆیان‌و کەمتر بەشی ئێوەی لێ دەدەن، جا دەبێ ئەو دەمە ئێوە حاڵتان چۆن بێ، گوتم: بەو خودایەی کە ئەم ئایینە راست‌و دروستەی بەتۆدا رەوانە کردووە تاوی شمشێری خۆمی لێ دەدەم‌و دەینێمە سەر نەڕەی شانم‌و لەسەر هەقی خۆم لەو ماڵە دەیوەشێنم تا دەمرم‌و دەگەمەوە بە خزمەتی تۆ، فەرمووی: نا، وانا، بەڵام با رێگەیەکت پێ نیشان بدەم کە گەلێ لەوە باشتربێ کە تۆ دەیڵێیت: خۆت رادەگری‌و ددان بەخۆتدا دەگری هەتا بە رووسووری دەگەیتەوە بەخۆم! (ئەبو داوود — رەزای خودای لێبێ).

---

[٥] رواه أبو داود وسكت عن درجته الشارح.

[٦] رواه أبو داود وسكت عن درجته الشارح.

٥٥١٤- خَطَبَنَا عُمَرُ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) بِالْجَابِيَةِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي قُمْتُ فِيكُمْ كَمَقَامِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِينَا فَقَالَ: أُوصِيكُمْ بِأَصْحَابِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ يَفْشُو الْكَذِبُ حَتَّى يَحْلِفَ الرَّجُلُ وَلاَ يُسْتَحْلَفُ وَيَشْهَدَ الشَّاهِدُ وَلاَ يُسْتَشْهَدُ أَلاَ لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الاِثْنَيْنِ أَبْعَدُ مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمِ الْجَمَاعَةَ مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ وَسَاءَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَذَلِكَ الْمُؤْمِنُ[٧]:

عومەر (رەزای خودای لێبێ) لە جابییە گوتارێکی خوێندەوە، فەرمووی: موسوڵمانینە! ئەو خوتبەیەتان بۆ دەخوێنمەوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتی خۆی خوێندوویەتیەوە بۆ ئێمە، فەرمووی: راسپێری بێ لێتان ئاگاداری هاوڕێیانم بن‌و چاوی خێرتان لێیان بێ، هەروەها چینی دوا ئەوانیش، ئیتر لەوە بەدوا درۆزنی بڵاو دەبێتەوە، بەرەنگێکی وا پیاو لە خۆیەوە (بەبێ ئەوەی کە کەسێ داوای سوێندی لێ بکا) لە خۆیەوە سوێند دەخوا، یا شایەت لەخۆیەوە (بەبێ ئەوەی کە کەسێ داوای شایەتیی لێ بکا) لە خۆیەوە شایەتی دەدا، هۆشیاربن! هەر پیاوو ژنێکی بیانی دوو بەدوو پێکەوە بن‌و کۆببنەوە مسۆگەر کە شەیتان کەسی سێیەمیانەو دەبێ بە بەربووکی شەڕو خەلخەیان دەدا کە هەڵیان فریوێنێ، هۆشیاربن! هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵی هەرە گەورەی موسوڵمانان بن‌و، دوور بن لە دووبەرەکی نانەوە، چونکە شەیتان هەمیشە لە بنکڵێشەی تاک‌و تەرادایە، بگرە لە دوان دوورترە تا لە یەکێ! هەر کەسێ دەیەوێ خۆی بگەیەنێتە ناو کورۆکی بەهەشت با بلکێ بە کۆمەڵەی هەرە گەورەی موسوڵمانانەوەو لە سەوادی ئەعزەمیان جیانەبێتەوە. بزانن موسوڵمانی ساخ‌و بڕواداری تەواویش ئەوەیە بە کردەوەی خاس دڵخۆش بێ‌و، بەکردەوەی خراپ پەست‌و زویربێ (ت- س/ص).

---

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٥٥١٥- وَقِيلَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَيْنَا أُمَرَاءُ يَمْنَعُونَا حَقَّنَا وَيَسْأَلُونَا حَقَّهُمْ فَقَالَ: اسْمَعُوا وَأَطِيعُوا فَإِنَّمَا عَلَيْهِمْ مَا حُمِّلُوا وَعَلَيْكُمْ مَا حُمِّلْتُمْ. رواهما الترمذي[٨]:

گوترا بە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ): قوربان! پێمان بفەرموو ئەگەر فەرمانڕەوای وامان بوو مافی ئێمەیان نەدەدا کەچی داوای مافی خۆشیانیان لێدەکردین، لەم حاڵەتەدا ئەرکی سەرشانی ئێمە چییە؟ فەرمووی: ئێوە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرداربن، چونکە چ ئێوەو چ ئەوان هەر کەسەتان بەپێی ئەرکی سەرشانی خۆتان بەرپرسیارن! (ت-س/ص).

## ٩٠) سەرەتای بەرپابوونی فەرتەنەکان کەیەو لەکوێوە هەڵدەگیرسێن
## متى أبتدأت الفتنة ومن أين تأتي

٥٥١٦- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) فَقَالَ: أَيُّكُمْ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَذْكُرُ الْفِتَنَ فَقَالَ قَوْمٌ: نَحْنُ سَمِعْنَاهُ. فَقَالَ: لَعَلَّكُمْ تَعْنُونَ فِتْنَةَ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَجَارِهِ قَالُوا: أَجَلْ قَالَ: تِلْكَ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصِّيَامُ وَالصَّدَقَةُ وَلَكِنْ أَيُّكُمْ سَمِعَ الَّتِي تَمُوجُ مَوْجَ الْبَحْرِ؟ قَالَ حُذَيْفَةُ: فَأَسْكَتَ الْقَوْمُ فَقُلْتُ: أَنَا. قَالَ: أَنْتَ لِلَّهِ أَبُوكَ. قُلْت: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: تُعْرَضُ الْفِتَنُ عَلَى الْقُلُوبِ كَالْحَصِيرِ عُودًا عُودًا فَأَيُّ قَلْبٍ أُشْرِبَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ وَأَيُّ قَلْبٍ أَنْكَرَهَا نُكِتَ فِيهِ نُكْتَةٌ بَيْضَاءُ حَتَّى تَصِيرَ عَلَى قَلْبَيْنِ عَلَى أَبْيَضَ مِثْلِ الصَّفَا فَلاَ تَضُرُّهُ فِتْنَةٌ مَا دَامَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ وَالآخَرُ أَسْوَدُ مُرْبَادًّا كَالْكُوزِ مُجَخِّيًا لاَ يَعْرِفُ مَعْرُوفًا وَلاَ يُنْكِرُ مُنْكَرًا إِلاَّ مَا أُشْرِبَ مِنْ هَوَاهُ. قَالَ حُذَيْفَةُ وَحَدَّثْتُهُ أَنَّ بَيْنَكَ وَبَيْنَهَا بَابًا مُغْلَقًا يُوشِكُ أَنْ يُكْسَرَ. قَالَ عُمَرُ أَكَسْرًا لاَ أَبَا لَكَ فَلَوْ أَنَّهُ فُتِحَ لَعَلَّهُ كَانَ يُعَادُ. قُلْتُ لاَ بَلْ يُكْسَرُ. وَحَدَّثْتُهُ أَنَّ ذَلِكَ الْبَابَ رَجُلٌ يُقْتَلُ أَوْ يَمُوتُ. حَدِيثًا لَيْسَ بِالأَغَالِيطِ. رواه الشيخان والترمذي[١]:

---

[٨] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/٢٦ رقم/٥/١٣٠٢. بخاريز مواقيت الصلاة: ٥٢٥، ١٤٣٥، ١٤٣٥، ١٨٩٥، ٣٥٨٦، ١٩٦. مسلم. فتن: ٧١٩٧. ترمذي. فتن: ٢٢٥٨. ابن ماجه. فتن: ٣٩٥٥ تحفة/ ٣٣٣٧.

ئەم فەرموودەیەیش لەم شوێنەدا رابوورد: ← (ب – ٢ ز – ٢٦ ل – ٧٢ چ/١ ف – ژمارە/٥/ ١٣٠٢) بەرگی دووەم، زنجیرەی (٢٦) لاپەڕە (٧٢)، فەرموودەی پێنجەم. بەڵام لێرەدا گەلێ سوودی تری تیادایە، دەفەرموێ: حوزەیفە (خشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: لە خزمەت عومەردا بووین (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: کامتان بەگوێی خۆی باسو خواسی فەرتەنەکانی لەزاری حەزرەت خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە؟ پیاو گەلێ فەرموویان: ئێمە لێمان بیستووە.

عومەر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: رەنگ بێ ئێوە وابزانن کە مەبەستم فیتنەو ئاژاوەی ئەو جۆرە پیاوانە بێ کە بەدەست خاوو خێزانو هاوسای خۆیانەوە گرفتار دەبن گوتیان: بەڵێ. فەرمووی: نەء، مەبەستم ئەوە نییە، ئەوە نوێژو رۆژوو خێرکردن پاکی دەکاتەوە، بەڵام کامتان باسو خواسی ئەو فیتنەو فەرتەنەیەتان لە حەزرەت ژنەوتووە کە وەك شەپۆلی دەریا شەپۆل دەدا؟ حوزەیفە فەرمووی: خەڵکەکە کشو مات بوون، من گوتم: من لێیم بیستووە، فەرمووی: کورە! تۆ باوکیشت مەردی خودا بوو بۆیە رۆڵەی وەك تۆی لێکەوتۆتەوە گوتم: بە گوێی خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست فەرووی (دروودی خودای لەسەر بێ): وەك چۆن حەسیر تاڵ تاڵ دەچنرێو قامیشو تەڵی چینەکانی دەچەقێنە لاتەنشتیَ خەوتوو چاڵو چوێڵی دەکا ئاشووبو فەرتەنەیش ئاوەها چین لە دوای چین دەچەقنە تەنشتی دڵ! جا هەر دڵێ بە ئاشووبو فەرتەنە گۆش بکرێ نوختەیەکی رەشی لێ هەڵ دەکەنرێ، ئەو دڵەشی ئاشووبوفەرتەنەی نەوێ خاڵێکی سپیی لێ دەنەخشێنرێ، تا سەرەنجام دڵان دەبن بەدوو بەشەوە: جۆرێکیان پاكو سپییە وەك بەردی مەڕ مەڕی ساخی ساف وایە، قایمو مەحکەمەو هەمیشە پاکەو چڵك هەڵناگرێ، تا جیهان جیهانە ئاژاوە زیانی پێناگەیەنێ. جۆرەکەی تریشیان رەشباوێکی رەشدێزی رەشبۆرە وەك گۆزەو دێزەی دەمەو نخوون وایە، هەواڵی چاکەو خراپە نازانێ، هەر خەریکی کەیفو هەوەسو ئارەزوو بازیی خۆیەتی!.

حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گوتم: بە عومەر (خودای لێ رازی بێ): کە لە نێوانی تۆو ئەو فەرتەنەیەدا دەرگایێ هەیە هێشتا داخراوە، وەلێ هاکاشکاندیان، عومەر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لەبابی خۆت کەوێ، دەشکێنرێ؟ بریا هەر هیچ نەبێ بکرایە تەوە، چونکە ئومێد هەبوو کە پێکەوە بدرێتەوە؟ گوتم خەیر بەڵکوو دەشکێنرێ، ئەوەیشم پێی گوت کە مەبەست لەو دەرگایە پیاوێکە یا دەکوژرێ یا دەمرێ (ئەو پیاوەیش عومەر خۆی بوو، کە بەشەهید بوونی ئەو دەرگای فەرتەنەو ئاشووب‌و ئاژاوە شکاو ئیتر لەو ساکەوە هەتا ئێستا فەرتەنەو ئاژاوە هەر رۆژەی لە شێوەیەکا لەگەڵ ئیسلام نەبڕاوە – وەرگێڕ).

حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: قسەی راست‌و دروست‌و دۆغریم بۆ عومەر کرد، نەك قسەی بێ سەرو بن‌و هەڵەشەو پەڵەشە!.(ش/ت–رمزای خوایان لێبێ).

٥٥١٧– عَنْ سَعِيدِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَنَا مَرْوَانُ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: سَمِعْتُ الصَّادِقَ الْمَصْدُوقَ يَقُولُ: هَلَكَةُ أُمَّتِي عَلَى يَدَيْ غِلْمَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ. فَقَالَ مَرْوَانُ لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَيْهِمْ غِلْمَةً. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ لَوْ شِئْتُ أَنْ أَقُولَ بَنِي فُلَانٍ وَبَنِي فُلَانٍ لَفَعَلْتُ. قَالَ عمرو بن يَحْيى: فَكُنْتُ أَخْرُجُ مَعَ جَدِّي إِلَى بَنِي مَرْوَانَ حِينَ مَلَكُوا بِالشَّأْمِ، فَإِذَا رَآهُمْ غِلْمَانًا أَحْدَاثًا قَالَ لَنَا عَسَى هَؤُلَاءِ أَنْ يَكُونُوا مِنْهُمْ قُلْنَا أَنْتَ أَعْلَمُ. رواه الشيخان وأحمد[٢]:

سەعیدی کوڕی عەمر (خودالێ رازی بێ) فەرمووی: جارێکیان لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا لە خزمەتی ئەبو هورەیرەدا دانیشتبووم، مەڕوانی کوڕی حەکەمیشمان لەگەڵا بوو، ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەری راستگۆم بیستووە، کە فەرمایشتی جێگەی باوەرە، دەیفەرموو: گەلی من بەدەستی دەستەیەکی دەمرووتی هەرزەکاری هەرزەو پەتەڕی لە ناو

---

[٢] تجريد/٤ ل- ١١٥ رقم/١٤٣٣ = ٣٦٠٤، ٣٦٠٥، ٧٠٥٨ فتح الباري. مسلم. فتن: ٧٢٥٤.

دەچن، کە لە هۆزی قورەیشن!. مەڕوانیش گوتی: بە لەعنەتی خودابن چۆن هەرزەکارێکن! ئەبو هورەیرەیش (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەگەر بمەوێ دەتوانم ناو نووسیان بکەمو بڵێم: لەفیسارە هۆزو فلانە هۆزن. عەمری کوڕی یەحیای کوڕی سەعیدی کوڕی عەمر دەڵێ: لەو سەردەمەدا کە نەوەی مەروان حوکمی شاریان دەکرد، گەلێ جار کە لەگەڵ باپیرەمدا دەچووم بۆ لایان، باپیرم کە دەیدین هەموویان ئاوا هەرزەو دەمڕووتو منداڵکارن دەیفەرموو: رەنگە ئەمانەیش لەو دەمڕووتانەبن! ئێمەیش دەمانگوت خۆت باشتری لێ دەزانی! (ش/ئە– رەزای خودایان لێبێ).

٥٥١٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللّهُ عَنهُمَا) أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُسْتَقْبِلٌ الْمَشْرِقَ يَقُولُ: أَلاَ إِنَّ الْفِتْنَةَ هَا هُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رووی لە خۆرهەڵات بوو ژنەوتم لێی دەیفەرموو: هۆشیاربن! ئاژاوەو فەرتەنە لێرەوە لەخاوەر زەمینەوە سەر هەڵ دەدا! لەو جێگەوە کە شاخی شەیتانی لێ هەڵدێ (ش/ت).

٥٥١٩- ⟵ (ب – ٥ ز – ٧٣ ل – ٢٥٥ ف – ١)[٤].

٥٥٢٠- وَعَنْهُ قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ بَيْتِ عَائِشَةَ فَقَالَ: رَأْسُ الْكُفْرِ مِنْ هَا هُنَا مِنْ حَيْثُ يَطْلُعُ قَرْنُ الشَّيْطَانِ. يَعْنِي الْمَشْرِقَ. رواه مسلم[٥]:

دیسان ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەماڵی عائیشەی هاوسەری هاتە دەرەوەو فەرمووی: لەمۆزی بێ بڕوایی و ناموسوڵمانەتی لێرەوە سەر هەڵ دەدا، لەم شوێنەوە کە شاخی شەیتانی لێوە هەڵ دێ واتە: لە خۆرهەڵاتەوە! (م).

---

[٣] بخاری. فتن: ٧٠٩٧، ٧٠٩٣، ٧٠٩٠. مسلم. فتن: ٧٢٢١ – ٧٢٢٦.

[٤] سبق فی مجلد/٥ تسلسل/ ٧٣ رقم/٣٥٧٦/١/.

[٥] مسلم. فتن: ٧٢٢٤.

## ٩١) باسی سێهەم: باسی خەواریجەکان‌و لە ئایین بەلەسەبووەکان، خەواریج: دەرەکییەکان

## الباب الثالث: في الخوارج والمارقة من الدين

٥٥٢١- (ب/٨ ر/١٠٥ ف/٢) ئاخر حەدیسی بەرگی هەشتەم[1].

٥٥٢٢- وَعَنْهُ (أي عَنْ أَبِى سَعِيدٍ) قَالَ: بَعَثَ عَلِيٌّ وَهُوَ بِالْيَمَنِ بِذَهَبَةٍ فِى تُرْبَتِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةٍ: عُيَيْنَةُ والأَقْرَعُ وَزَيْد الخَيل وَعَلْقَمَةَ فَغَضِبَتْ قُرَيْشٍ فَقَالُوا: أَيُعْطِى صَنَادِيدَ نَجْدٍ وَيَدَعُنَا فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنِّى إِنَّمَا فَعَلْتُ ذَلِكَ لأَتَأَلَّفهُمْ، فَجَاءَ رَجُلٌ كَثُّ اللِّحْيَةِ مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ نَاتِئُ الْجَبِينِ مَحْلُوقُ الرَّأْسِ فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ يَا مُحَمَّدُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ إِنْ عَصَيْتُهُ يَأْمَنُنِى عَلَى أَهْلِ الأَرْضِ وَلاَ تَأْمَنُونِى. ثُمَّ أَدْبَرَ الرَّجُلُ فَاسْتَأْذَنَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ فِى قَتْلِهِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمًا يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ يَقْتُلُونَ أَهْلَ الإِسْلاَمِ وَيَدَعُونَ أَهْلَ الأَوْثَانِ يَمْرُقُونَ مِنَ الإسلامِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ عَادٍ. رَوَاهُمَا الشيخان والترمذي[2]:

دیسان ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: عەلی – لەیەمەن بوو – لەوێوە پارەچەیێ زێڕی پوختە نەکراوی بۆ پێغەمبەر نارد، پارچە زێڕەکە لەناو کەوڵێکا بوو، بەگڵای دار شیلان خۆشەکرابوو، هێشتا خۆڵی ناو کانەکەی هەر پێوە بوو، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کرد بەسەر ئەم چوار کەسەدا: بەسەر عویەینەو ئەقرەع‌و زەیدول خەیل‌و عەلقەمەدا، قورەیشیش زیز بوون‌و گوتیان: ئای! پێغەمبەر بەشی گەورە گەورەکانی

---

[1] تقدم فی مجلد ثامن. تسلسل/١٠٥ رقم/٢/٤٦٤٩.

[2] تجرید البخاری/٤/٣٥٠ رقم/ ١٦٠٢ = ٤٣٥١، ٣٣٤٤، ٣٦١٠، ٤٦٦٧، ٥٠٥٨، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٢، ٧٥٦٢. مسلم. زکاة: ٢٤٤٨. أبو داود. السنة: ٤٧٦٤. نسائی. زکاة: ٢٥٧٧، ٤١١٢ تحفة/ ٤١٣٢ تقدم فی مجلد/ خامس. تسلسل/٧٨ رقم/٨.

نەجد دەدا، کەچی بەشی ئێمە نادا! پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: من بۆیە وا دەکەم هەتا دڵیان هۆگری ئیسلام بکەم.

کابرایەکی ریش پڕی، سەر کولم دەرپەڕیوی، چاو بەقوڵا چووی، ناوچاوان قۆقزی، سەرتاشراویش هات گوتی: ئەی موحەممەد! لەخودا بترسە ناهەقی مەکە! حەزرەتیش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر من بەگوێی خودا نەکەم ئەی کێ بەگوێی دەکا! من خودا کردوومی بە ئەمیندار لەسەر دانیشتوانی زەمین کەچی ئێوە هێشتا متمانەم پێناکەن بە قاتان پێم نییە). ئینجا کابراکە رۆیشت، جا یەکێ لە پیاو گەل داوای لە حەزرەت کرد کە رێگەی بدا هەتا بیکوژێ، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لە نەوەی ئەمە وەچەیێ دەکەونەوە، قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەروویان ناچێتە خوارێ، ئەوەی سەر بە ئیسلامە دەیکوژن‌و ئەوەی سەر بەبت‌و شتی وایە وازی لێ دێنن، ئەوانە وا بە پەلە لە ئیسلامەتی دەردەچن وەك چۆن تیرکە دەدا لە نێچیر گورج لێی دەردەپەڕێ ئاوا، ئەگەر خۆم فریای ئەمانە بکەوم‌و لە چەرخی مندا کەسێ لەمانە پەیدا ببێ وەك چۆن خودا یافتی هۆزی عادی بڕییەوە ئاوا یا فتیان دەبڕمەوەو هەموویان بە کوشتن دەکوژم!). (ش/ت).

(ب – ٥ ز – ٧٨ ل – ٣٨٧ ف – ٨).

٥٥٢٣– وَعَنْهُ قَالَ: بَيْنَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَقْسِمُ قَسْمًا أَتَاهُ ذُو الْخُوَيْصِرَةِ – وَهُوَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ – فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اعْدِلْ. فَقَالَ: رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَيْلَكَ، وَمَنْ يَعْدِلُ إِذَا لَمْ أَعْدِلْ قَدْ خِبْتَ وَخَسِرْتَ إِنْ لَمْ أَكُنْ أَعْدِلُ.فَقَالَ عُمَرُ بن الخطاب يَا رَسُولَ اللَّهِ ائْذَنْ لِي فِيهِ، فَأَضْرِبَ عُنُقَهُ.فَقَالَ دَعْهُ فَإِنَّ لَهُ أَصْحَابًا، يَحْقِرُ أَحَدُكُمْ صَلاَتَهُ مَعَ صَلاَتِهِمْ وَصِيَامَهُ مَعَ صِيَامِهِمْ، يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ، يُنْظَرُ إِلَى نَصْلِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى رِصَافِهِ فَمَا يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى نَضِيِّهِ – وَهُوَ قِدْحُهُ – فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ، ثُمَّ يُنْظَرُ إِلَى قُذَذِهِ فَلاَ يُوجَدُ فِيهِ شَىْءٌ، قَدْ سَبَقَ الْفَرْثَ وَالدَّمَ، آيَتُهُمْ رَجُلٌ أَسْوَدُ إِحْدَى عَضُدَيْهِ مِثْلُ ثَدْىِ الْمَرْأَةِ، أَوْ مِثْلُ الْبَضْعَةِ تَدَرْدَرُ

وَيَخْرُجُونَ عَلَى حِينِ فُرْقَةٍ مِنَ النَّاسِ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَشْهَدُ أَنَّ عَلِيا (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَاتَلَهُمْ وَأَنَا مَعَهُ، فَأَمَرَ بِذَلِكَ الرَّجُلِ، فَالْتُمِسَ فَأُتِيَ بِهِ حَتَّى نَظَرْتُ إِلَيْهِ عَلَى نَعْتِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي نَعَتَهُ. رواه الشيخان والترمذي[٣]:

دیسان فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (دروودی خودای لەسەر بێ) خەریك بوو ماڵی تالانی دابەش دەکرد، زول خوویصرە (کە کابرایەکی تەمیمی بوو) هاتە خزمەتی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! شتەکە بە عەدالەت بکە، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەد بەخت خۆت ئەی ماڵ وێران! ئەگەر من شت بە عەداڵەت نەکەم ئیتر کێی ترشت بە عەداڵەت دەکا! بەراستی ماڵ وێران‌و زیانکردو خۆمم ئەگەر شت بە عەداڵەت نەکەم.

عومەری کوڕی خەتابیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ڕێگەم بدە بابدەم لە گەردنی، فەرمووی: (وازی لێبێنە چونکە ئەمە چەند دۆست‌و برادەرێکی وای هەیە نوێژو ڕۆژووی خۆتان لەچاو هیئەوانا بەهیچ دادەنێن، قورئان دەخوێنن، وەلێ لە گەروویان ڕەت نابێ‌و ناچێتە ناو دڵیانەوە، ئەوانە وا بەپەلە لە ئیسلامەتی دەردەچن وەك چۆن تیرکە دەدا لەنەچیر گورج لێی دەردەپەڕێ ئاوا، بەڕەنگێکی وا تیرهاوێژەکە سەیری پەیکانەکە دەکا هیچ خوێن‌و ئەتەری پێکانی پێوە نابینێ، سەیری کووپی پەیکانەکە دەکا هیچی پێوە نابینێ سەیری کلکی تیرەکە دەکا هیچی پێوە نابینێ، سەیری پەڕە پەڕەی تیرەکە دەکا هیچی پێوە نابینێ، تیرەکە وا بە حوججەت بەناو خوێن‌و سەخوڕەکەدا فڕکە دەکا هیچ لەگەڵ خۆی نابا، ئەمانەیش ئاوا کە لە ئایین دەردەچن هیچ لەگەڵ خۆیان نابەن، نیشانەی ئەم لەدین دەرچووانە ئەوەیە: پیاوێکی ڕەشیان تیادایە قۆڵێکی وەکوو مەمکی ژن وایە، یا وەکوو گولەنگی گۆشتین وایە، گولمە گۆشتێکی شلکە، شەلە پەتەیە لە خۆیەوە دێ‌و دەچێ‌و

---

[٣] تجريد البخاری٤/٥٤٥ رقم/ ١٧٤٠ = ٥٠٥٨، ٣٣٤٤، ٤٣٥١، ٤٦٦٧، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٢، ٧٥٦٢. مسلم. زکاة: ٢٤٥٢.

دەلەرێتەوە، ئەم هۆزە کاتێ سەر هەڵ دەدەن و لە فەرمانی ئیسلام دەردەچن کە موسوڵمانان لەناو خۆیانا بوون بەدوو بەرەوەو دوو بەرەکی و ناکۆکییان تێ دەکەوێ). ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: گەواهو شایەتی دەدەم کە بۆ خۆم ئەمەم لەزاری پیرۆزی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە، هەروەها شایەتی دەدەم کە عەلی (رەزای خودای لێبێ) لەگەڵ ئەمانەدا جەنگاو چوو بە گژیانا، وە لەو کاتەدا من خۆم لەگەڵ لەشکری عەلی‌دا بووم، عەلی (خودای لێ رازی بێ) دەستووری دەرکرد، گەڕان بە شوێن ئەو پیاوە ڕەشەدا، جا لەناو کوژراوەکاندا بۆی گەڕان بە کوژراوی دۆزییانەوەو هێنایان، بە چاوی خۆم تەماشای لاشەکەیم کرد، رێك لەسەر ئەو ناوو نیشانەیە بوو کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) کاتی خۆی باسی کرد بۆمان!. (ش/ت) (ب/٥ ز/٧٨ ل/٢٧٨ ف/٨).

## ٩٢) کوشتاری دەرەکییەکان (الخوارج) فەرزی عەینە. واتە: ئەرکە سەرشانی هەموو کەسێکە : (قتال الخوارج فرض عين)

٥٥٢٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنْ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قال: إنَّ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي أَوْ سَيَكُونُ بَعْدِي مِنْ أُمَّتِي قَوْمٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ حَلاَقِيمَهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَخْرُجُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ ثُمَّ لاَ يَعُودُونَ فِيهِ هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ. رواه مسلم وأبو داود والفظه: سَيَكُونُ فِي أُمَّتِي اخْتِلاَفٌ وَفُرْقَةٌ قَوْمٌ يُحْسِنُونَ الْقِيلَ وَيُسِيئُونَ الْفِعْلَ وَيَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لاَ يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ مُرُوقَ السَّهْمِ مِنَ الرَّمِيَّةِ لاَ يَرْجِعُونَ حَتَّى يَرْتَدَّ عَلَى فُوقِهِ هُمْ شَرُّ الْخَلْقِ وَالْخَلِيقَةِ طُوبَى لِمَنْ قَتَلَهُمْ وَقَتَلُوهُ يَدْعُونَ إِلَى كِتَابِ اللَّهِ وَلَيْسُوا مِنْهُ فِي شَيْءٍ مَنْ قَاتَلَهُمْ كَانَ أَوْلَى بِاللَّهِ مِنْهُمْ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا سِيمَاهُمْ؟ قَالَ: التَّحْلِيقُ[1].

ئەبو زەڕ (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەدوا خۆم تاقمەیێ پەیدا دەبن، بەناو لە ئۆمەتی منن، قورئان

---

[1] بخاری. استتابة المرتدین: ٦٩٣٤. مسلم. زکاة: ٢٤٦٧.

دەور دەکەنەوە بەڵان لە گەروویان تێپەڕ نابێ‌و ناگاتە ناو دڵیان، ئەوانە چۆن تیرێ نەچیرێ بەفڕکە بسمێ ئاوا بەپەلە لە ئیسلامەتی دەردەچن‌و جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ سەری، سەرجەم دروسکراوانی خودا زماندارو بێ زمانی لەمانەی بەدتر تیادا نییە!. (م/د) گفتەی (د): (لەناو میللەتی منیشدا دوو بەرەکی‌و ناکۆکی روو دەدا، هۆز گەلێ پەیدا دەبن وەستای قسەن، قسەی جوان دەکەن‌و کردەوەی خراپ! قورئانیش دەخوێنن بەڵان لە بینیان ناچێتە خوارێ وەك تیرێ نێچیرێ بسمێ ئاوا خێرا لە ئیسلامەتی دەردەچن، چۆن ئەو تیرە جارێکی تر پاشەو پاش ناگەڕێتەوە بۆناو ماڵی کەوانەکە ئەوانیش ئاوا جارێکی تر ناگەڕێنەوە سەر ئیسلامەتی، ئەوانە گەندترین‌و بەدترینی دروستکاوانی خودان لە زماندارو بێزمان، بەخ بەخ لەو کەسەی کە دەیان کوژێ یا ئەوان ئەو دەکوژن، خەڵك بانگ دەکەن بۆ بەگوێ کردنی قورئان بەڵام خۆیان فریان بەسەر قورئانەوە نییە، ئەوەی بچێ بە گژیاناو هەر کەسێ بەهەر جۆرێ شەڕیان لەگەڵدا بکا، ئیتر هەرکێ بێ، ئەوە ئەو باشترە لەوان لەلای خودا!). گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! نیشانەیان چییە؟ فەرمووی: (سەریان دەتاشن).

٥٥٢٥- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ (رضي الله عنه) أَنَّ الْحَرُورِيَّةَ لَمَّا خَرَجَتْ عَلَيٌّ عَلِيٍ (رضي الله عنه) قَالُوا: لاَ حُكْمَ إِلاَّ لِلَّهِ. قَالَ عَلِيٌّ: كَلِمَةُ حَقٍّ أُرِيدَ بِهَا بَاطِلٌ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَصَفَ نَاسًا إِنِّي لأَعْرِفُ صِفَتَهُمْ فِي هَؤُلاَءِ يَقُولُونَ الْحَقَّ بِأَلْسِنَتِهِمْ لاَ يَجُوزُ حَلْقَهُمْ مِنْ أَبْغَضِ خَلْقِ اللَّهِ إِلَيْهِ مِنْهُمْ أَسْوَدُ إِحْدَى يَدَيْهِ طُبْىُ شَاةٍ أَوْ حَلَمَةُ ثَدْيٍ فَلَمَّا قَتَلَهُمْ عَلِيٌّ وَجدوه. رواه مسلم[٢]:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو رافع (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: کە حەرورییەکان لە عەلی هەڵگەڕانەوە دەیان گوت: حوکم‌و بڕیار هەر بۆ خودایە، عەلیش فەرمووی: قسەیەکی راستە بەڵام ئەوان بەنیازی پاك نایڵێن. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نیشانەی هەندێ کەسی خراپی بۆ باس کردووین، نیشانەو

---

[٢] مسلم. زكاة: ٢٤٦٥.

دیمانەی ئەوانە لەمانەدا بەدی دەکەم، بەزار قسەی هەق دەکەن، وەلێ لە گەروویان تێپەڕ ناکا، لەو جۆرە کەسانەن کە خودا زۆر زۆر رقی لێیانە، یەکێکی رەشیان تیادایە دەستێکی لووە لە چەشنی گوانی مەڕ یا گۆی مەمك وایە، جا کاتێ لەشکرەکەی عەلی (خودای لێ رازی بێ) کوشتنی ئەو کابرا رەشەیان تیادا بوو (م).

٥٥٢٦- عَنْ زَيْدُ بْنُ وَهْبِ الْجُهَنِيُّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) وَكَانَ فِي الْجَيْشِ الَّذِينَ كَانُوا مَعَ عَلِيّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) إِلَى الْخَوَارِجِ فَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ): أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يَخْرُجُ قَوْمٌ مِنْ أُمَّتِي يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ لَيْسَ قِرَاءَتُكُمْ إِلَى قِرَاءَتِهِمْ بِشَيْءٍ وَلاَ صَلاَتُكُمْ إِلَى صَلاَتِهِمْ بِشَيْءٍ وَلاَ صِيَامُكُمْ إِلَى صِيَامِهِمْ بِشَيْءٍ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ يَحْسِبُونَ أَنَّهُ لَهُمْ وَهُوَ عَلَيْهِمْ لاَ تُجَاوِزُ صَلاَتُهُمْ تَرَاقِيَهُمْ يَمْرُقُونَ مِنَ الإِسْلاَمِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ. لَوْ يَعْلَمُ الْجَيْشُ الَّذِينَ يُصِيبُونَهُمْ مَا قُضِيَ لَهُمْ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِمْ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَتَّكَلُوا عَنِ الْعَمَلِ وَآيَةُ ذَلِكَ أَنَّ فِيهِمْ رَجُلاً لَهُ عَضُدٌ وَلَيْسَ لَهُ ذِرَاعٌ عَلَى رَأْسِ عَضُدِهِ مِثْلُ حَلَمَةِ الثَّدْيِ عَلَيْهِ شَعَرَاتٌ بِيضٌ فَتَذْهَبُونَ إِلَى مُعَاوِيَةَ وَأَهْلِ الشَّامِ وَتَتْرُكُونَ هَؤُلاَءِ يَخْلُفُونَكُمْ فِي ذَرَارِيِّكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ يَكُونُوا هَؤُلاَءِ الْقَوْمَ فَإِنَّهُمْ قَدْ سَفَكُوا الدَّمَ الْحَرَامَ وَأَغَارُوا فِي سَرْحِ النَّاسِ فَسِيرُوا عَلَى اسْمِ اللَّهِ. قَالَ سَلَمَةُ بْنُ كُهَيْلٍ فَنَزَّلَنِي زَيْدُ بْنُ وَهْبٍ مَنْزِلاً حَتَّى قَالَ مَرَرْنَا عَلَى قَنْطَرَةٍ فَلَمَّا الْتَقَيْنَا وَعَلَى الْخَوَارِجِ يَوْمَئِذٍ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ وَهْبٍ الرَّاسِبِيُّ فَقَالَ لَهُمْ أَلْقُوا الرِّمَاحَ وَسُلُّوا سُيُوفَكُمْ مِنْ جُفُونِهَا فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يُنَاشِدُوكُمْ كَمَا نَاشَدُوكُمْ يَوْمَ حَرُورَاءَ. فَرَجَعُوا فَوَحَّشُوا بِرِمَاحِهِمْ وَسَلُّوا السُّيُوفَ وَشَجَرَهُمُ النَّاسُ بِرِمَاحِهِمْ وَقُتِلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَمَا أُصِيبَ مِنَ النَّاسِ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ رَجُلاَنِ فَقَالَ عَلِيٌّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) الْتَمِسُوا فِيهِمُ الْمُخْدَجَ. فَالْتَمَسُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ فَقَامَ عَلِيٌّ بِنَفْسِهِ حَتَّى أَتَى نَاسًا قَدْ قُتِلَ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ قَالَ أَخِّرُوهُمْ. فَوَجَدُوهُ مِمَّا يَلِي الأَرْضَ فَكَبَّرَ ثُمَّ قَالَ: صَدَقَ اللَّهُ وَبَلَّغَ رَسُولُهُ فَقَامَ إِلَيْهِ عَبِيدَةُ السَّلْمَانِيُّ فَقَالَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ اللَّهَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ لَسَمِعْتَ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ

وَسَلَّمَ)؟ فَقَالَ: إِى وَاللَّهِ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ. حَتَّى اسْتَحْلَفَهُ ثَلاَثًا وَهُوَ يَحْلِفُ لَهُ. رواه مسلم وأبو داود[٣]:

زەیدی کوڕی وەهبی جوهەنی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: من خۆم یەکێ بووم لەو لەشکرەدا کە لەگەڵ عەلی‌دا دەرچوونو چوون بۆ سەر دەرەکییەکان. عەلی (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: موسوڵمانینە! لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: تاقمەیێ لە ئۆمەتم لە کۆمەڵەی ئۆمەتم هەڵ دەگەڕێنەوەو چەکیان لێهەڵدەگرن، بەبێ پێویست لە ئاییندا پێی لێ دادەگرن، بەرەنگێکی وا قورئانخوێندنو قورئان رەوانخوێندنو نوێژو رۆژووی ئێوە لە چاو هی ئەوانا هیچ نییە، قورئان دەور دەکەنەوەو بەخەیاڵی خاوی خۆیان وا دەزانن کە قورئان لە پشتیانە، بەڵام قورئان لە دژیانە، وەك ئەوە دەڵێن: لا حكم الا لله: حوکم هەر بۆ خودایە، فەرمان هەر بەدەستی خودایەو بەس گوایە ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەن بە بەڵگەو نیشانو شایەت کە دەفەرموێ:

{ان الحكم الا لله – ئەنعام – ٦ / ٥٧.یوسف – ٦٧/١٢}.

واتە حوکمو بڕیار هەر بۆ خودایە.

نوێژەکەیان لە گەروویان تێپەڕناکا، وەك چۆن تیرێ خێرا نێچیرێ بسمێو لێی دەرپەڕێ ئەوانیش ئاوا خێرا لە ئیسلامەتی دەردەچن، ئەو لەشکرەی کە ئەو قەدیان دەبنو دەچن بەگژیانا ئەگەر بێتو بزانن کە خودای گەورە چی خێرو بێرێکی زۆری بۆ بڕیارداونو لەسەر زمانی موحەممەدی پێغەمبەریانا (درودی خودای لەسەر بێ) رایگەیاندووە، ئیتر پشتیان لێ دەدایەوەو هیچی تر هەوڵی کردەوەی چاکەیان نەدەداو هەر ئەوەیان بەس بوو! نیشانەی ئەمانەیش ئەوەیە کە زەلامێکیان تیادایە، قۆڵێکی تائانیشکە، بازووی نییە، بەسەری قۆڵە کۆڵەکەیەوە لەباتی باسك لوویێ هەیە، وەك گۆی مەمك وایە، گوڵێ مووی سپی لەسەرە.

[٣] مسلم. زكاة: ٢٤٦٤. أبو داود. قتال الخوارج: ٤٧٦٨ تحفة الأشراف: ١٠١٠٠.

ئەنجا عەلی (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: جا کە حاڵ وابێ ئیتر چۆن ئەم دەرەکییانە لێرە لەناو دەست‌و پێی ماڵ‌و منداڵی خۆتانا بەجێ دەهێڵن‌و دەچن بۆ شەڕ بۆ سەر موعاوییەو خەڵکی وڵاتی شام، شتی وا چۆن دەبێ، بەخودا من بەش بەحاڵی خۆم ئومێد دەکەم کە ئەم خەواریج‌و دەرەکییانە ئەو دەستەیە بن کە پێغەمبەر فەرمووی: لە ڕێگەی ئیسلامەتی دەردەچن، چونکە ئەوەتانێ ئەمانە خوێنی ناڕەوا دەڕێژن‌و ئاژەڵ‌و ماڵیاتی خەڵك لەسەر لەوەڕەوە دەرفێنن، کەواتە ناوی خودای لێبهێنن‌و بکەونەڕێ‌و بڕۆن بۆ کوشتاریان.

سەلەمەی کوڕی کوهەیل فەرمووی: ئەوجا زەیدی کوڕی وەهب قۆناغ بە قۆاغ قسەو باسی لەڕێ ڕۆیینی لەشکرەکەی هێنا هەتا ئەوێ کە فەرمووی: ئنجا کەوتینەڕێ هەتا لەهەواری لاماندا، لەپاشا لە پردی دەبەرجان پەڕینەوە، ئەو سەردەمە سەرکردەی خەواریجەکان عەبدوڵڵای کوڕی وەهبی ئەل – ڕاسیبی بوو، کاتێ هەردوو لەشکرەکە بەرامبەری یەکتری ڕاوەستان، لەکن پردەکە عەلی ئەم وتارەی بۆ لەشکرەکەی خۆیدا، فەرمووی: ئادەی دوورە هاوێژ ڕمەکانتان بهاوێژن بۆیان‌و شیر لەکالان دەرکێشن‌و بەشمشێری ڕووتەوە پەلاماریان بدەن‌و مەودای فڕوفێڵ‌و شیلەو بیلەیان مەدەن، چونکە دەترسم دیسانەوە وەك ڕۆژەکەی حەرەو راء داواتان لێبکەن کە لەبەر خاتری خودا ڕێك بکەون لەگەڵیاناو بەم بەهانەیە دیسانەوە تەفرەتان بدەنەوە. ئیتر ئەوانیش لە دوورەوە بەرم دایان گرتن‌و شمشێریان هەڵکێشاو بەرمەوە هەڵیان کوتایە سەریان‌و بوو بە تێکبەربوون‌و شەڕی دەستەیەخەو شەڕەنێزە، تا لەئەنجاما بەسەریەکا گزرەیان خستن‌و هەموویان کوشتن، لە سوپای ئێمە ئەو ڕۆژە تەنیا دوو کەس پێکران‌و بەس.

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئادەی بگەڕێن بۆ بێباڵەکەی ناویان، کە گەڕان بۆی نەیاندۆزییەوە، عەلی خۆی هەڵساو چوو بۆشەڕگاکە، سەیری کرد وا چەن کەسێ بەسەریەکا ترشاون، فەرمووی: ئادەی ئەمانە جیاکەنەوە، ئەوجا ئەو کابرا گۆجەیان لەبن بنەوە دۆزییەوە، جا عەلی (خودای لێ ڕازی بێ)

ئەڵڵاهو ئەکبەری کردو فەرمووی: فەرموودەی خودا راستەو پێغەمبەری خودا رایگەیاندووە بە ئێمەو ئەوە بوو منیش ئەو فەرموودەیەم گێڕایەوە بۆ ئێوە عەبیدەی سەلمانی هەڵسا چوو بۆ لای‌و گوتی: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! تووئەو خودایەی کە هەر خۆی خودایە ئایا تۆ بۆ خۆت ئەمەت لە زاری پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ژنەوتووە؟ فەرمووی: ئەرێ بەو خودایەی کە کەسی لە رەنگ نییە، تا سێ جار ئاوا سوێندی داو ئەویش هەرسێ جارەکە ئاوا سوێندی بۆ خوارد. (م/ د- غەریقی رەحمەتی خودای گەورەبن).

## ٩٣) وشەیێ لەبارەی رووداوەکەی ئەلجەمەلەوە : (كلمة عن وقعة الجمل)

٥٥٢٧- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ زِيَادٍ الأَسَدِيُّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا سَارَ طَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ وَعَائِشَةُ إِلَى الْبَصْرَةِ بَعَثَ عَلِيٌّ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ وَحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ، إِلَى الْكُوفَةِ يستنفران الناس فَصَعِدَ الْحَسَنُ فَوْقَ الْمِنْبَرِ فِي أَعْلاَهُ، وَقَامَ عَمَّارٌ أَسْفَلَ مِنَ الْحَسَنِ، فَاجْتَمَعْنَا إِلَيْهِ فَسَمِعْتُ عَمَّارًا يَقُولُ: إِنَّ عَائِشَةَ قَدْ سَارَتْ إِلَى الْبَصْرَةِ، وَوَاللَّهِ إِنَّهَا لَزَوْجَةُ نَبِيِّكُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَلَكِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى ابْتَلاَكُمْ بِهَا، لِيَعْلَمَ إِيَّاهُ تُطِيعُونَ أَمْ هِيَ. رواه البخاري[1]:

عەبدوڵلای کوڕی زیادی ئەسەدی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کاتێ تەلحەو زوبەیرو عائیشە چوون بۆ بەصرە، تا لە دژی عەلی شۆڕش بەرپا بکەن، گوایە تۆڵەی خوێنی عوسمان دەستێنن، عەلیش عەمماری کوڕی یاسیرو حەسەنی کوڕی عەلیی نارد بۆ کووفە، تاکوو خەڵك تێز بکەن بۆ یارمەتی عەلی، حەسەن سەرکەوتە سەر تەوقەسەری مینبەرەکەو عەمماریش لەخوار ئەوەوە راوەستاو ئێمەیش کۆبووینەوە، گوێم لێبوو عەممار (خودای لێ رازی بێ) دەیفەرموو: عائیشە چووە بۆ بەصرە، بۆ شەڕ لەگەڵ عەلی‌دا، بەخودا ئەم عائیشەیە لە هەردوو جیهاندا هاوسەرو هاوجووتی پێغەمبەری ئێوەیە، ئێمە لەمە لاریمان نییەو بەم

---

[1] بخاری. فتن: ٧١٠٠.

هەڵوێستەی لەگەڵ عەلیدا لە ژنێتیی پێغەمبەر ناکەوێ، بەڵام کەس نابێ بەمە تەفرە بخوا، چونکە ئەمە ئەزموونە، خودا دەیەوێ بەهۆی ئەوەوە تاقیتان بکاتەوە، هەتا بزانێ کە ئێوە بەگوێی خودا دەکەن یا بە گوێی عائیشە (واتە: دەشێ لەکاتی ئاژاوەدا مرۆی موسوڵمان باش باش وردببێتەوە، تا هەق‌و ناهەقی بۆ روون دەبێتەوە، ئەوسا لایەنی هەق بگرێ‌و لایەنی ناهەق بەربدا، وە نابێ کە کوێرانە دوای کەسبکەوێ). (ب-خ)

٥٥٢٨-⟵ (ب - ٣ ز - ١١٠ ل - ٣٠١ ف - ٣)[٢].

٥٥٢٩- قال امرؤ القيس[٣]:

الحـــرب أول مـــا تكـــون فتيـــةً
تـــسعى بزينتهـــا لكـــل جهـــول
حتـــى اذا اشـــتعلت وشـــب ضـــرامها
ولـــت عجـــوزا غـــير ذات حليـــل
شمطـــاء يُنكـــر لونُهـــا وتغيَّـــرت
مكروهـــة للـــشّم والتَّقبيـــل

واتە: ئیمرۆئولقەیس گوتوویەتی:

شـــەڕ لـــە ســـەرەتاوە دەڵێـــی ســـەیرانە
بـــووکی رازاوەی دەســـتەی نەزانـــە
کاتـــێ گـــەرم بـــوو وەک پیرەژنـــە
هـــەتا دەمـــرێ هـــەر بێوەژنـــە!
ســـەری بـــۆز دەبـــێ، رەنگـــی دەکـــۆڕێ
ماچـــی دەبێـــزرێ، بێنـــی بۆگەنـــە(*)

---

[٢] تقدم في مجلد ثالث. تسلسل/ ١١٠ رقم/٢٤٦١/٣/٢.

[٣] رواه البخاري تعليقاً في صحيحه بين الرقمين: ٩٥٠، ٩٦٠. في باب الفتة التي تمَوج كمَوجش البَحر.

## ٩٤) باسی چوارەم: باسی ئەو کەسانەی کە بەدرۆ لافی پێغەمبەرایەتییان لێداوە

## الباب الرابع: في الذين إدعوا النبوة

٥٥٣٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبًا مِنْ ثَلاَثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ. رواه الأربعة[1]:

ئەبو هوەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا نزیکەی سیی پێغەمبەرە درۆزنەی تەفرەدەری هەلاتبازی لاسدەر پەیدا دەبن، هەموویان بەدرۆ خۆیان بە پێغەمبەری خودا دەزانن. (ش/د/ت).

٥٥٣١- لەم بەرگەدا لەباسی ترساندن لە فیتنەگەلدا رابورد، فەرموودەی سێزدەهەم: فەرموودەکەی سەوبان: ان الله زوى لي ألارض[2]:

## ٩٥) باسی دوو درۆزنەکە: موسەیلەمەو عەنەسی

## مسيلمة والعنسي الكذاب

٥٥٣٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَدِمَ مُسَيْلِمَةُ الْكَذَّابُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَجَعَلَ يَقُولُ: إِنْ جَعَلَ لِي مُحَمَّدٌ الأَمْرَ مِنْ بَعْدِهِ تَبِعْتُهُ. فَقَدِمَهَا فِي بَشَرٍ كَثِيرٍ مِنْ قَوْمِهِ فَأَقْبَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَمَعَهُ ثَابِتُ بْنُ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ وَفِي يَدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قِطْعَةُ جَرِيدَةٍ حَتَّى وَقَفَ عَلَى مُسَيْلِمَةَ فِي

---

(*) صالح مەهدی عەمماش – کە وەزیری بەرگری عێراق بوو – لە پاش إنقلابەکەی (١٩٦٣) کە شەڕی لەگەڵ شۆڕشی کورد دەست پێ کردەوە، ناوی نا (نزهة وطنية ربيعية - سەیرانی نیشتمانیی بەهارانە) ڕەنگ بێ ئەمجارە ناوبنرێ (نزهة مَهدَويّة سيستانيّة!!).
(٢٠٠٨/٥/٢٨ - وەرگێڕ)

[1] مسلم. فتن: ٢٢٧١. بخاري. مناقب: ٣٦٠٩. ترمذي. فتن: ٢٢١٨. تحفة الأشراف: ١٤٧١٩.

[2] تقدم فی مجلد عاشر. تسلسل/٨٧ رقم/٥٤٩٣/١٣.

أَصْحَابِهِ قَالَ لَوْ سَأَلْتَنِي هَذِهِ الْقِطْعَةَ مَا أَعْطَيْتُكَهَا وَلَنْ أَتَعَدَّى أَمْرَ اللَّهِ فِيكَ وَلَئِنْ أَدْبَرْتَ لَيَعْقِرَنَّكَ اللَّهُ وَإِنِّي لأُرَاكَ الَّذِي أُرِيتُ فِيهِ مَا أُرِيتُ وَهَذَا ثَابِتٌ يُجِيبُكَ عَنِّي. ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ. قَالَ ابْنِ عَبَّاسٍ فَسَأَلْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنْ قَوْلِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَإِنِّي لأُرَاكَ الَّذِي أُرِيتُ فِيهِ مَا رَأَيْتُ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ فِي يَدَيَّ سِوَارَيْنِ مِنْ ذَهَبٍ، فَأَهَمَّنِي شَأْنُهُمَا، فَأُوحِيَ إِلَيَّ فِي الْمَنَامِ أَنِ انْفُخْهُمَا، فَنَفَخْتُهُمَا فَطَارَا فَأَوَّلْتُهُمَا كَذَّابَيْنِ يَخْرُجَانِ مِنْ بَعْدِي، أَحَدُهُمَا الْعَنْسِيُّ، وَالآخَرُ مُسَيْلِمَةُ.وفي رواية: فَأَوَّلْتُهُمَا الْكَذَّابَيْنِ اللَّذَيْنِ أَنَا بَيْنَهُمَا صَاحِبَ صَنْعَاءَ، وَصَاحِبَ الْيَمَامَةِ: رواه الشيخان[1].

**ئیبنو عەبباس** (خودایان لێ ڕازوی بێ) **فەرمووی: بە سەرینیی پێغەمبەر خۆی** (درودو سڵاوی خودای لەسەربێ) **موسەیلەمەی درۆزن (کە ناوبانگی دەکردووە بە کذاب) هات بۆ مەدینە، عەشاماتێکی زۆری لە هۆزەکەی خۆی لەگەڵدا بوو، دەیگوت: ئەگەر موحەممەد لە دوای خۆی کارو بار بسپێرێ بەمنو بمکات بە جێگەداری خۆی دێمە سەر دینەکەیو پەیڕەوی ئەو دەکەم، پێغەمبەریش** (درودی خودای لێبێ) **سابیتی کوڕی قەیسی کوڕی شەمماسی لەگەڵ خۆی بردو چوو بۆ لای، سابیت خەتیبی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **پارچە چیلکەیەکی پەلکە خورمای بە دەستەوە بوو، کە گەیشتە لای موسەیلەمە لەناو هۆزەکەیا بوو لە دیاری ڕاوەستا، فەرمووی: ئەگەر داوای ئەم پارچە چیلکەیەشم لێ بکەی ناتدەمێ! (چ جای ئەوەی کە بتکەم بە جێنشینی خۆم لە دوای خۆم) تۆ ناتوانی فەرمانی خودا بشکێنیو ئەو فەرمانەی خودا لە بارەی تۆوە بڕیاری داوە بەتۆ ڕەت نابێتەوە، خۆ ئەگەر لەمن هەڵگەڕێیتەوە خودا لە گلوگۆت دەخات، وات دەبینم کە تۆ ئەو کابرایەیت کە بەخەو حاڵی بەدی ئەوم پێ نیشان دراوە، ئەوا من دەڕۆم ئەمە سابیتە چی قسەیەکت هەیە ئەو لەباتی من وەڵامت دەداتەوە. پێغەمبەر**

---

[1] تجريد البخاريم ٤ ل- ٣٦٢ رقم/١٦٠٨ = ٤٣٧٣، ٣٦٢٠، ٤٣٧٨، ٧٠٣٣، ٧٤٦١ + ٤٣٧٤، ٣٦٢١، ٤٣٥، ٤٣٧٩، ٧٠٣٤، ٧٠٣٧. مسلم. رؤيا: ٥٨٩٤. ترمذي. رؤيا: ٢٢٩٢ تحفة/٦٥١٨، ١٣٥٧٤.

(دروودی خودای لەسەربێ) بەجێی هێشت‌و ڕۆیشت ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لەبارەی ئەم خەونەی پێغەمبەرەوە کە فەرمووی، لە ئەبو هورەیرەم پرسی فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: نووستبووم لە خەوما دیم کە لە هەردوو دەستمدا دوو بازنی زێڕم دی، ئەوە خەمگینی کردم، لە خەوەکەما سرووشم بۆ کرا: ئادەی فوویان لێ بکە، منیش فووم لێکردن، جا هەردووکیان فڕین، ئەو بازنانەم بە دوو درۆزن لێك دایەوە کە لە دوای من شۆڕەتیان بڵاو دەبێتەوەو ناویان دەزڕێ ئەو دوو فرە درۆزنە یەکێکیان ئەسوەدی عەنسی بوو، یەکێکیان موسەیلەمەی کذاب بوو. لە گێڕانەوەیەکا: بەم دوو درۆزنەم لێکدانەوە، کە خۆم وام لە نێوانیاندا: بە کابرای صەنعاو بە کابرای یەمامە. (ش– ڕەزای خودایان لێبێ).

## ٩٦) سەرگوزەشتەی ئیبنو صەییاد : (ذكر إبن صياد)

٥٥٣٣– عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) انْطَلَقَ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَهْطٍ قِبَلَ ابْنِ صَيَّادٍ حَتَّى وَجَدَهُ يَلْعَبُ مَعَ الصِّبْيَانِ عِنْدَ أُطُمِ بَنِي مَغَالَةَ وَقَدْ قَارَبَ ابْنُ صَيَّادٍ يَوْمَئِذٍ الْحُلُمَ فَلَمْ يَشْعُرْ حَتَّى ضَرَبَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ظَهْرَهُ بِيَدِهِ ثُمَّ قَالَ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللّٰهِ؟ فَنَظَرَ إِلَيْهِ ابْنُ صَيَّادٍ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ الأُمِّيِّينَ. فَقَالَ: ابْنُ صَيَّادٍ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللّٰهِ؟ فَرَفَضَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَالَ: آمَنْتُ بِاللّٰهِ وَبِرُسُلِهِ. ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَاذَا تَرَى؟ قَالَ: ابْنُ صَيَّادٍ يَأْتِينِي صَادِقٌ وَكَاذِبٌ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُلِّطَ عَلَيْكَ الأَمْرُ. ثُمَّ قَالَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي قَدْ خَبَأْتُ لَكَ خَبِيئًا. فَقَالَ: ابْنُ صَيَّادٍ، هُوَ الدُّخُّ. فَقَالَ: لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اخْسَأْ فَلَنْ تَعْدُوَ قَدْرَكَ. فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ ذَرْنِي يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَضْرِبْ عُنُقَهُ. فَقَالَ لَهُ: إِنْ يَكُنْهُ فَلَنْ تُسَلَّطَ عَلَيْهِ وَإِنْ لَمْ يَكُنْهُ فَلاَ خَيْرَ لَكَ فِي قَتْلِهِ. رواه الاربعة وزاد مسلم: وَانْطَلَقَ بَعْدَ ذَلِكَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ الأَنْصَارِيُّ يَؤُمَّانِ النَّخْلَ الَّتِي فِيهَا ابْنُ صَيَّادٍ، طَفِقَ رَسُولُ اللّٰهِ

(صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، وَهْوَ يَخْتِلُ أَنْ يَسْمَعَ مِنِ ابْنِ صَيَّادٍ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ يَرَاهُ ابْنُ صَيَّادٍ، وَابْنُ صَيَّادٍ مُضْطَجِعٌ عَلَى فِرَاشِهِ فِي قَطِيفَةٍ لَهُ فِيهَا رَمْرَمَةٌ أَوْ زَمْزَمَةٌ، فَرَأَتْ أُمُّ ابْنِ صَيَّادٍ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهْوَ يَتَّقِي بِجُذُوعِ النَّخْلِ، فَقَالَتْ لابْنِ صَيَّادٍ أَيْ صَافِ – وَهْوَ اسْمُهُ – هَذَا مُحَمَّدٌ. فَثَارَ ابْنُ صَيَّادٍ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَوْ تَرَكَتْهُ بَيَّنَ[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: عومەری کوڕی خەتاب (خودای لێ ڕازی بێ) لەگەڵ دەستەیێ لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) دەرچوون بۆ سووسەکردنی باسی ئیبنو صەییاد، کە دەیدۆزنەوە دەڕوانن وا لە ناو دەستەیێ منالاّ یاری دەکا، لەلای قەلاّی بەنی مەغالە، ئەو کاتە ئیبنو صەییاد نزیکی ڕەسیدە بوونی بوو، ئیبنو صەییاد بەخۆی نازانێ تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە پشتەوە دەستێ دەماڵێ بە پشتیا، لەپاشا فەرمووی: (ئایا شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟) ئیبنو صەییاد تەماشای پێغەمبەری کردو گوتی: شایەتی دەدەم کە تۆ پێغەمبەری عەرەبە نەخوێندەوارە بێسەوا دەکانی. ئەنجا گوتی: ئەی تۆ شایەتی دەدەی کە من پێغەمبەری خودام؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) شتی وای نەسەلماندو فەرمووی: (باوەڕم بەخوداو بە پێغەمبەرانی خودا هەیە). ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی پێی: (لە هەواڵە نهێنییەکان، لە دەنگ‌و باسی غەیب چی لێ دەزانی؟) گوتی: ڕاستیشم بۆ دێ‌و درۆیشم بۆ دێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: (سەریان لێ شێواندوویت) لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: (من شتێکم بۆ تۆ گرتۆتە دڵم ئایا دەتوانی کە هەڵی بهێنی). گوتی: ئەوە دوخخە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: (چغە! ڕادەت ناکەوێ لە پلەو پایەی خۆت (کە کوڵەنانییە) سەرکەویت).

---

[1] تجريد البخاري/٢ ل- ٦٢ رقم/ ٦٤٢ = ١٣٥٤، ٣٠٥٥، ٦١٧٣، ٦٦١٨. مسلم. فتنك ٧٢٨٣. ترمذي. فتن: ٢٢٣٥. تحفة الأشراف: ١٨٥٩، ٦٩٩٠، ١٥٦٤٩.

عومەری کوڕی خەتاب (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! لێم گەڕێ با لەگەردنی بدەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ئەو بێ (واتە: ئەگەر ججاڵ بێ) تۆ دەرەقەتی نایەی، ئەگەر ئەویش نەبێ خێر لە کوشتنیدا نییە بۆ تۆ). (ش.د.ت). ئیمامی موسلیم (غەرقی بەحری ڕەحمەتی خودای گەورەبێ) ئەمەی پتر کردووە: لە پاشا جارێکی تریش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی‌و ئوبەییی کوڕی کەعب چوون بۆ ناو ئەو باخە خورمایەی کە ئیبنو صەییاد لەوێ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی دەدایە پەنا بنکی دارە خورماکان‌و لەپاڵ ئەوانەوە بە ماتە مات بە ئاسپایی لێی دەچووە پێشەوە، پێش ئەوەی کە لە ئیبنو صەییاد ئاشکرابێ بە دزکە شتێکی لێ ببیستێ‌ئیبنو صەییاد لەسەر ڕایەخێ پاڵکەوتبوو، لەناو پارچەیێ قەیفەدا بوو، لەبەر خۆیەوە لەناو قەدیفەکەدا ورتە ورتی بوو، دایکی، ئیبنو صەییاد پێغەمبەری دی، کەوا خۆی دەداتە پەنا قەدی دارخورماکان، بانگی کوڕەکەی دەکا: صافی! ئەوە موحەممەدە، ئیبنو صەییاد ڕادەپەڕێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: (ئەگەر دایکی لێی بگەڕایێ ئاشکرای دەکرد).

٥٥٣٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقِيَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فِي بَعْضِ طُرُقِ الْمَدِينَةِ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ فَقَالَ هُوَ: أَتَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) آمَنْتُ بِاللَّهِ وَمَلاَئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ مَا تَرَى؟ قَالَ: أَرَى عَرْشًا عَلَى الْمَاءِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَرَى عَرْشَ إِبْلِيسَ عَلَى الْبَحْرِ وَمَا تَرَى؟ قَالَ: أَرَى صَادِقَيْنِ وَكَاذِبًا أَوْ كَاذِبَيْنِ وَصَادِقًا. فَقَالَ: لُبِسَ عَلَيْهِ دَعُوهُ[٢].

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: لە مەدینە جارێ پێغەمبەرو ئەبو بەکرو عومەر لە ڕێگە دەگەن بە ئیبنو صەییاد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: شایەتی دەدەی کەوا من پێغەمبەری خودام؟ کەچی ئەویش

---

[٢] مسلم. فتن: ٧٢٧٥. ترمذي. فتن: ٢٢٤٧ تحفة الأشراف: ٣٤٢٩.

**گوتی: ئەی تۆ شایەتی دەدەی کەوا من پێغەمبەری خودام؟ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: من باوەڕو ئیمانم هەیە بە خوداو بە فریشتەکانی خوداو بەنامەکانی خودا، باشە واز لەم لایەنە بێنە، تۆچی دەبینی؟ گوتی: تەخت‌و بارەگایێ دەبینم وا بەسەر ئاوەوە! پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوە تەخت‌و بارەگای ئیبلیسە کە لەسەر رووی دەریا هەڵی دەدا، ئەی چی تر دەبینی؟ گوتی: ئەو هەواڵانەی کە بۆم دێن جاری وا هەیە دوانیان راستەو یەکێکیان درۆیە، جاری وایش هەیە دوانیان درۆیەو یەکێکیان راستە. فەرمووی: سەری لێ شێواوە وازی لێ بێنن. (م/ت- رەزای خودایان لێبێ).**

**٥٥٣٥- وَعَنْهُ قَالَ: خَرَجْنَا حُجَّاجًا أَوْ عُمَّارًا وَمَعَنَا ابْنُ صَائِدٍ فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فَتَفَرَّقَ النَّاسُ وَبَقِيتُ أَنَا وَهُوَ فَاسْتَوْحَشْتُ مِنْهُ وَحْشَةً شَدِيدَةً مِمَّا يُقَالُ عَلَيْهِ. قَالَ: وَجَاءَ بِمَتَاعِهِ فَوَضَعَهُ مَعَ مَتَاعِي. فَقُلْتُ: إِنَّ الْحَرَّ شَدِيدٌ فَلَوْ وَضَعْتَهُ تَحْتَ تِلْكَ الشَّجَرَةِ فَفَعَلَ قَالَ: فَرُفِعَتْ لَنَا غَنَمٌ فَانْطَلَقَ فَجَاءَ بِعُسٍّ فَقَالَ: اشْرَبْ أَبَا سَعِيدٍ. فَقُلْتُ إِنَّ الْحَرَّ شَدِيدٌ وَاللَّبَنُ حَارٌّ. مَا بِي إِلاَّ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أَشْرَبَ عَنْ يَدِهِ - أَوْ قَالَ آخُذَ عَنْ يَدِهِ - فَقَالَ يَا أَبَا سَعِيدٍ لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آخُذَ حَبْلاً فَأُعَلِّقَهُ بِشَجَرَةٍ ثُمَّ أَخْتَنِقَ مِمَّا يَقُولُ لِيَ النَّاسُ يَا أَبَا سَعِيدٍ مَنْ خَفِيَ عَلَيْهِ حَدِيثُ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **مَا خَفِيَ عَلَيْكُمْ مَعْشَرَ الأَنْصَارِ أَلَسْتَ مِنْ أَعْلَمِ النَّاسِ بِحَدِيثِ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَلَيْسَ قَدْ قَالَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **(في الدجال) هُوَ كَافِرٌ. وَأَنَا مُسْلِمٌ أَوَلَيْسَ قَدْ قَالَ هُوَ عَقِيمٌ لاَ يُولَدُ لَهُ. وَقَدْ تَرَكْتُ وَلَدِي بِالْمَدِينَةِ أَوَ لَيْسَ قَدْ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **لاَ يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ وَلاَ مَكَّةَ. وَقَدْ أَقْبَلْتُ مِنَ الْمَدِينَةِ وَأَنَا أُرِيدُ مَكَّةَ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ حَتَّى كِدْتُ أَنْ أَعْذِرَهُ. ثُمَّ قَالَ أَمَا وَاللَّهِ إِنِّي لأَعْرِفُهُ وَأَعْرِفُ مَوْلِدَهُ وَأَيْنَ هُوَ الآنَ. قَالَ قُلْتُ لَهُ تَبًّا لَكَ سَائِرَ الْيَوْمِ. رواهما مسلم والترمذي[٣]:**

---

[٣] مسلم. فتن: ٧٢٧٩. ترمذي. فتن: ٢٢٤٦ تحفة الأشراف: ٤٣٢٨.

دیسان فەرمووی: ساڵێ کەوتینە رێ لە مەدینەوە بۆ مەککە، بۆ حەج یا فەرمووی: بۆ عەمرە دەچووین، ئیبنو صەیادیشمان لەگەڵ بوو، لە قۆناغێ لاماندا، مەردوو مەکە هەریەکە بەلایەکا بلاوەیان لێکرد، من‌و ئەو ماینەوە، ترس‌و سامێکی تەواوم لێ نیشت، لەبەر ئەو قسانەی کە لەبارەی ئەوەوە دەکرێت، کە دەڵێن ججاڵە، فەرمووی: جا کەلوپەلەکەی خۆی هێنایە لای کەلوپەلەکەی من، منیش گوتم: خۆت دەزانی زۆر گەرمەو گەرماکەی سەختە ئەوە بۆ شت‌و مەکەکانت لەبن ئەو شێخەڵەی تردا دانانێیت، ئەویش لەوێ داینا، فەرمووی: لە دوورەوە رانێ پەزمان بەدیی کرد، چوو پڕکاسەیێ شیری هێناو گوتی: ئەبو سەعید! شیر بخۆرەوە، منیش راستێکەی نەم ویست کە شیری دەستی ئەو بخۆمەوە بەڵام لەبەر ئەو گوتم: زۆر گەرمایەو شیریش خۆی گەرمە ناخۆمەوە ئەویش وەك هەست بەوە بکا گوتی: ئەی ئەبو سەعید! لەتاو قسەو پرتە پرتی ئەم خەڵکە دەمەوێ پەتێ لە دارێ هەڵخەم‌و خۆم بخنکێنم. ئەی ئەبو سەعید! گشت کەسێ فەرموودەو فەرمایشتەکانی پێغەمبەری لێ ون بێ بەڵام لە ئێوە ون نابێ کە کۆمەڵەو گەلی ئەنصارو یاریدەدەرانن، تۆ خۆت یەکێکی لەو کەسانەی کە زۆر باش شارەزای فەرموودەکانی پێغەمبەرن (دروودی خودای لەسەربێ) باشە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەیفەرمووە: کە ججاڵ کافرە وەلحاڵ، من موسوڵمانم، ئەدیی ئەو نەیفەرمووە: کە ججاڵ نەزۆکەو منالی نابێ، بەڵام ئەوەتانێ من منالم هەیەو منالەکانم ئێستا کە وان لە مەدینە، ئەدیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە بارەی ججاڵەوە نەیفەرمووە: کە ناچێتە مەککەو مەدینە، کەچی من ئەوەتام لە مەدینەوە هاتووم‌و دەیشچم بۆ مەککە. ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەوەندە بە کەساسی سکاڵای حاڵی خۆی کرد تا خەریکبووم دڵم پێی بسووتێ. کەچی ئەنجا ئیبنو صەییاد گوتی: وەڵێ بەخودا من چاك ئەو (واتە: ججاڵ) دەناسم‌و دەزانم کە کێیەو لەکوێ لەدایك دەبێ‌و ئێستاکەیش لەکوێیە.

فەرمووی: منیش پێیم گوت: هەتا ماوی هەر ڕەنجەڕۆ بی‌و ببی بە پەندی پساتێ! (م/ت).

٥٥٣٦- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) يَمْشِي فَلَقِي ابْنَ صَائِدٍ فِي بَعْضِ طُرُقِ الْمَدِينَةِ فَقَالَ: لَهُ قَوْلاً أَغْضَبَهُ فَانْتَفَخَ حَتَّى مَلأَ السِّكَّةَ فَدَخَلَ ابْنُ عُمَرَ عَلَى حَفْصَةَ وَقَدْ بَلَغَهَا فَقَالَتْ لَهُ: رَحِمَكَ اللَّهُ مَا أَرَدْتَ مِنِ ابْنِ صَائِدٍ أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا يَخْرُجُ مِنْ غَضْبَةٍ يَغْضَبُهَا[٤]:

نافیع (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: جارێ ئیبنو عومەر (خودایان لێ ڕازی بێ) لە کۆڵانێ لە کۆڵانەکانی مەدینەدا تووشی ئیبنو صەییاد دەبێ، قسەیەکی پێ دەڵێ پێی توورە دەبێ، جا ئیبنو صەییاد وەها هەڵ دەئاوسێ تا پڕ کۆڵانەکە دەکا، ئەمە دەگاتەوە بە دایکە حەفصەی هاوسەری حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کە خوشکی ئیبنو عومەر بوو، جا کاتێ ئیبنو عومەر دەچێ بۆ لای دایکە حەپسە، حەپسە پێی دەڵێ: بەرمیهرەبانی خودا کەوی، چیت دەوێ لە ئیبنو صەییاد، ئەدیی نازانی کەوا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: جاجاڵ کە یەکەم جار هەڵ دەستێ بەهۆی ئەوەوە دەبێ کە لە شتێکەوە توورە دەبێ، کەواتە تۆ مەبە بە هۆی هەڵسانی جاجاڵ (م).

٥٥٣٧- وَعَنْهُ قَالَ: لَقِيتُهُ مَرَّةً أُخْرَى وَقَدْ نَفَرَتْ عَيْنُهُ فَقُلْتُ: مَتَى فَعَلَتْ عَيْنُكَ مَا أَرَى؟ قَالَ لاَ أَدْرِي، قُلْتُ: لاَ تَدْرِي وَهِيَ فِي رَأْسِكَ قَالَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ خَلَقَهَا فِي عَصَاكَ هَذِهِ. قَالَ: فَنَخَرَ كَأَشَدِّ نَخِيرِ حِمَارٍ سَمِعْتُ، قَالَ: فَزَعَمَ بَعْضُ أَصْحَابِي أَنِّي ضَرَبْتُهُ بِعَصًا كَانَتْ مَعِيَ حَتَّى تَكَسَّرَتْ وَأَمَّا أَنَا فَوَاللَّهِ مَا شَعَرْتُ ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ فَحَدَّثْتُهَا فَقَالَتْ مَا تُرِيدُ إِلَيْهِ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّهُ قَدْ قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يَبْعَثُهُ عَلَى النَّاسِ غَضَبٌ يَغْضَبُهُ. رواهما مسلم[٥]:

---

[٤] مسلم. فتن: ٧٢٨٦.

[٥] مسلم. فتن: ٧٢٨٧.

**دیسان ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ)**فەرمووی: جارێکی تریش تووشی بووم، چاوی هەڵ ئاوسابوو، بەرزەوە بوو بوو، پێم گوت: کەی چاوت وای لێهاتووە؟ گوتی: نازانم، گوتم: چاوت وا بەسەرتەوەو کەچی نازانی چی لێهاتووە! گوتی: خودای دەکرد خودا بەم دار دەستەی تۆوە دروستی دەکرد! فەرمووی: ئەوجا وەك کەر پرمەیەکی زۆر توندی کرد، کە هەرگیز پرمەی وام نەبیستووە. فەرمووی: بەقسەی هەندێ لە هاورێکانم ئەوەندەم لێ دابوو، دار دەستەکەی خۆمم تیادا شکاند بوو، بەڵام بەخوا من ئاگام لە خۆم نەمابوو، جا کە چووم بۆ لای دایکی موسوڵمانان ئەمەم باس کرد بۆی، فەرمووی: چیتە بەسەریەوە، ئاخر ئاگات لێنییە کە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: یەکەم جار ججاڵ کە هەڵدەستێ و دێ بۆ گیانی خەڵك لە شتێکەوە تووڕە دەبێ کەواتە شتی وامەکە تاتۆ نەبی بەهۆی هەڵسانی ججاڵ! (م).**

**٥٥٣٨- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: رَأَيْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ** (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) **يَحْلِفُ بِاللَّهِ أَنَّ ابْنَ الصَّائِدِ هُوَ الدَّجَّالُ قُلْتُ أَتَحْلِفُ بِاللَّهِ.قَالَ إِنِّي سَمِعْتُ عُمَرَ يَحْلِفُ عَلَى ذَلِكَ عِنْدَ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَلَمْ يُنْكِرْهُ. رواه مسلم وأبو داود. نسأل الله السلامة والتوفيق آمين[٦]:**

**موحەممەدی کوڕی مونکەدیر فەرمووی: دیومە کە جابیری کوڕی عەبدوڵڵا سوێندی بەخودا دەخوارد کە ئیبنو صائید ججاڵە، منیش گوتم: چۆن بەخودا سوێند دەخۆی لەسەر ئەوە، لەسەرچی بنیاتێ سوێند دەخۆی؟ فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لە عومەر بوو لە خزمەت پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەسەر ئەمە سوێندی دەخوارد کەچی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لێی نەدەگرت (م/د).**

---

[٦] تجريد/٥ ل- ٣٧٨ رقم/٢١٢٤ = ٧٣٥٥ فتح الباري شرح صحيح البخاري. مسلم. فتن: ٧٢٨٢. ابو داود. ملاحم وفتن: ٤٣٣١ تحفة الأشراف: ٣٠١٩.

## ٩٧) لە هۆزی سەقیف هەلاتبازێك‌و خوێنمژێك هەڵ دەكەون:
## في ثقيف كذاب ومبير

**٥٥٣٩-** عَنْ أَبِي نَوْفَلٍ (رضي الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ (رضي الله تعالى عنهما) مَصلوبا عَلَى عَقَبَةِ الْمَدِينَةِ فَجَعَلَتْ قُرَيْشٌ تَمُرُّ عَلَيْهِ وَالنَّاسُ حَتَّى مَرَّ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ فَوَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَبَا خُبَيْبٍ أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا أَمَا وَاللَّهِ لَقَدْ كُنْتُ أَنْهَاكَ عَنْ هَذَا أَمَا وَاللَّهِ إِنْ كُنْتَ مَا عَلِمْتُ صَوَّامًا قَوَّامًا وَصُولاً لِلرَّحِمِ أَمَا وَاللَّهِ لأُمَّةٌ أَنْتَ أَشَرُّهَا لأُمَّةٌ خَيْرٌ. ثُمَّ نَفَذَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ فَبَلَغَ الْحَجَّاجَ مَوْقِفُ عَبْدِ اللَّهِ وَقَوْلُهُ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ فَأُنْزِلَ عَنْ جِذْعِهِ فَأُلْقِيَ فِي قُبُورِ الْيَهُودِ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَى أُمِّهِ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رضي الله عنهما) فَأَبَتْ أَنْ تَأْتِيَهُ فَأَعَادَ عَلَيْهَا الرَّسُولَ لَتَأْتِيَنِّي أَوْ لأَبْعَثَنَّ إِلَيْكِ مَنْ يَسْحَبُكِ بِقُرُونِكِ - قَالَ - فَأَبَتْ وَقَالَتْ: وَاللَّهِ لاَ آتِيكَ حَتَّى تَبْعَثَ إِلَيَّ مَنْ يَسْحَبُنِي بِقُرُونِي - قَالَ - فَقَالَ: أَرُونِي سِبْتَيَّ. فَأَخَذَ نَعْلَيْهِ ثُمَّ انْطَلَقَ يَتَوَذَّفُ حَتَّى دَخَلَ عَلَيْهَا فَقَالَ: كَيْفَ رَأَيْتِنِي صَنَعْتُ بِعَدُوِّ اللَّهِ؟ قَالَتْ رَأَيْتُكَ أَفْسَدْتَ عَلَيْهِ دُنْيَاهُ وَأَفْسَدَ عَلَيْكَ آخِرَتَكَ بَلَغَنِي أَنَّكَ تَقُولُ لَهُ يَا ابْنَ ذَاتِ النِّطَاقَيْنِ أَنَا وَاللَّهِ ذَاتُ النِّطَاقَيْنِ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكُنْتُ أَرْفَعُ بِهِ طَعَامَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَطَعَامَ أَبِي بَكْرٍ مِنَ الدَّوَابِّ وَأَمَّا الآخَرُ فَنِطَاقُ الْمَرْأَةِ الَّتِي لاَ تَسْتَغْنِي عَنْهُ أَمَا إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدَّثَنَا أَنَّ فِي ثَقِيفٍ كَذَّابًا وَمُبِيرًا. فَأَمَّا الْكَذَّابُ فَرَأَيْنَاهُ وَأَمَّا الْمُبِيرُ فَلاَ إِخَالُكَ إِلاَّ إِيَّاهُ - قَالَ - فَقَامَ عَنْهَا وَلَمْ يُرَاجِعْهَا. رواه مسلم والترمذي[1]:

**ئەبو نەوفەل (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لاشەی عەبدوڵڵای كوڕی زوبەیرم دی، لە هەورازەكەی مەدینە بە دارا كرابوو، واتە لەو هەورازە كەوا لە مەككە، بەڵام ناوی هەورازی مەدینەیە، چونكە لەسەر ئەو رێگەیەیە كە لە مەككەوە دەچێ بۆ مەدینە، لاشەكەی لەوێدا لە سێدارە درابوو، هەر پیاوانی قورەیش‌و**

---

[1] مسلم. فضائل: ٦٤٤٣.

خەڵکانی تر بوون بەلایا بە خامۆشی رادەبووردن، لە ترسی حەججاج نەیان دەوێرا قسە بکەن، بەڵام کاتێ عەبدوڵڵای کوڕی عومەر گەیشتە لای، لە دیاری راوەستاو سێ جار فەرمووی: السلام عليك أبا خبيب: سڵاو لە تۆ ئەی باوکی خوبەیب! ئەوجا سێ جاریش فەرمووی: ئەدیی بەخودا گەلێ پێتم گوت کە داکەوەو شتی وامەکە، سەرێ خۆت دامەنێ. ئینجا کە فەرمووی: ئەدیی بەخودا (بەپێی ئاگا لێ بوونی من) تۆ رۆژوو گرێکی زۆر باش بووی‌و رۆژووی سوننەتت زۆر دەگرت‌و، شەو نوێژکەرێکی زۆر چاك‌و خزم دۆستێکی فرە خاس بووی، ئەدی بەزاتێ کە زاتی خودایە گەل‌و میللەتی کە پیاو خاسی وەك تۆ ئایەخی بێ بە راستی گەلی چاکە.

ئینجا ئیبنو عومەر تێ پەڕی‌و رۆیشت، کاتێ کە ئەم هەڵوێست‌و فەرمایشتانەی ئیبنو عومەر گەیشتەوە بە حەججاج ناردی لاشەکەیان لە قەدی دار خورماکە داگرت‌و لەناو گۆڕستانی جوولەکەکانا برکیاندا، لە پاشا حەججاج ناردی بەشوێن ئەسمای کچی ئەبو بەکری صەدیقدا، کە دایکی عەبدوڵڵای شەهید کراو بوو، ناردی بە دوایا کە بچێ بۆ لای، بەڵام ئەسما رازی نەبوو کە بچێ بۆ لای، حەججاجیش کزیرەکەی ناردەوە بۆ سەری: کەوا یا بە پێی خۆت دێیت بۆ کنم، یا کەسێکی وا دەنێرم کە هەتا ئێرە بە پەلك کێشت بکا! فەرمووی: دیسان ئەسما مەردانە گوێی پێ نەداو گوتی: بەخودا تا نەنێری بە پرچەکانم بەکێشم بکەن ناییێم بۆ لات!.

فەرمووی: جا حەججاج گوتی: کوا پێڵاوەکانم لە کوێیە؟ سۆڵەکانی کردە پێ‌و بە کەش‌و فشێکەوە بە پرتاو چوو بۆ لای ئەسماء کە گەیشتە کنی پێی گوت: خۆ دیت کەچیم لەو دوشمنی خودایە کرد! ئەسماء (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: ئەوەی من دیم ئەمەیە: کە راستە تۆ ئەم جیهانەت لەو تێکدا، بەڵام ئەویش ئەو جیهانی لە تۆ تێك دا، وەك بیستوومەتەوە گوایە تۆ بە تانەو تەڵفیسییەوە پێی دەڵێی: کوڕەکەی ژنە دووپشتێن! بەڵێ بەخودا راستە وایە کە من دوو پشتێنم هەبوو، بە یەکێکیان نان‌و خواردەمەنی پێغەمبەرو ئەبو بەکرم پێ هەڵ دەبەست لە لاقەدی وڵاخ‌و ئەوی تریشیان وەك هەموو ئافرەتێ

بۆ کارو فرمان دەم بەستە پشتم، ئەمە هیچ عەیب و عارو نەنگی تیادا نییە، بەڵام بزانە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بۆ خۆی پێمانی فەرموو: کە لەناو هۆزی بەنی سەقیفا هەم پێغەمبەرە درۆزنەیێ پەیدا دەبێ، هەم زیانە خورۆیەکی خوێنمژ! ئەوە بوو پێغەمبەرە درۆزنەکەمان بەچاوی خۆمان دی کە موختاری کوڕی ئەبو عوبەیدی سەقەفی بوو، وەمن بەش بەحاڵی خۆم وادەزانم کە زیانە خورۆو خوێنمژەکەیش تۆیت! فەرمووی: ئیتر حەججاج بەسەر شۆڕی و لووت شکاوی ملی خۆی شکاندو لەکن ئەسماء هەستاو وەڵامی پێ نەدرایەوە (م/ت)⊗.

### ٩٨) باسی پێنجەم: باسی غەزاو کوشتارە هەرە گەورەکان (واتە: ئەل-مەلاحیم). غەزاکردن لەگەڵ تورك و حەبەشەدا:

### الباب الخامس: في الملاحم. غزو الترك والحبشة

٥٥٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا التُّرْكَ، صِغَارَ الأَعْيُنِ، حُمْرَ الْوُجُوهِ، ذُلْفَ الأُنُوفِ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ. رواه الخمسة في الجهاد[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): (قیامەت هەڵ ناسێ هەتا جەنگ لەگەڵ تورکا دەکەن، نیشانەی ئەم هۆزەی توورك ئەوەیە چاو بچکولەن، رەنگ سوورو سپین، لووت کورت و داتەپیون، روویان لەبەر خڕی و قەڵەوی دەڵێی قەڵخانەو بە سیرمەی زۆر

---

⊗ بروانە: تەجریدی صەریح بەکوردی، بەرگی پێنجەم، لاپەڕە (١٢٥) فەرموودەی ژمارە (١٨٣٢) هەتا لەگەڵ ڕاڤەکەیدا تەواو دەبێ. هەتا بزانی کە حەجاج چۆن خودا هەر لەدنیادا تۆڵەی سەختی لێ سەند. (وەرگێڕ – ٢٠٠٨/٩/٤)

[١] تجريد/ ٣ ل- ٣٢٥ رقم/ ١٢٠٣ = ٢٩٢٨، ٢٩٢٩، ٣٥٨٧، ٣٥٩٠، ٣٥٩١. مسلم. فتن: ٧٢٣٩. ترمذي. فتن: ٢٢١٥. ابن ماجه. فتن: ٤٠٩٦. تحفة الأشراف/ ١٣١٢٥.

دەورە گیراوە، قیامەت هەڵناسێ هەتا لەگەڵ هۆزێکی تردا دەجەنگن‌و شەڕ دەکەن پێڵاوی موولەیێ دەکەن! (ش/د/ت/ن).

٥٥٤١- ولأبي داود هنا والنسائي في الجهاد: دَعُوا الْحَبَشَةَ مَا وَدَعُوكُمْ وَاتْرُكُوا التُّرْكَ مَا تَرَكُوكُمْ[٢]:

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (هەتا حەبەشییەکان واز لە ئێوە بێنن ئێوەیش واز لەوان بێنن، هەروەها تورکانیش ئەگەر ئەوان هەقیان نەبوو بەسە ئێوەوە ئێوەیش هەقتان نەبێ بەسەر ئەوانەوە) (د/ن).

٥٥٤٢- ←(ب - ٢ ز - ١٣٧ ل - ٢٧٦ ف - ٢)[٣]:

لێرەدا دەفەرموێ: (هەتا حەبەشییەکان هەقیان نەبوو بەسەر ئێوەوە ئێوەش هەقتان نەبێ بەسەر ئەوانەوە، چونکە کابەی شەریف کابرایەکی دوو لاق باریکی حەبەشەیی دەیڕووخێنێ‌و گەنجەکەی ناوی دەردێنێ) ئەبوداوود. ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خودای گەورەی لێبێ) دەفەرموێ: ئەم هەواڵ‌و ناونیشانانە گشتی دادەنرێن بە موعجیزە بۆ حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) وە گشتی لە زەمانی ئێمەدا هەیەو هاتۆتە دی، بە تایبەتی ئەم جۆرە تورکانەی کە پێغەمبەر باسی لێ کردوون لەسەر هەمان شێوەو ناونیشان وەك حەزرەت فەرموویەتی ئێستا لە زەمانی ئێمەدا هەن، وە هەتا ئێستا چەندین جار لەگەڵ گەلی ئیسلامدا شەڕیان کردووە، ئەم تورکانە چاویان بچووکە، ڕەوویان سوورە، لووتیان فسە، دەموچاویان پانە دەق وەك قەڵغانی بەسیرمە دەورەتێگیراو. فەرمایشتی نەوەوی تەواو. (وەرگێڕ)

## ٩٩) غەزاکردن لەگەڵ هیندو عەجەمدا : (غز والهند والعجم)

٥٥٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: وَعَدَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غَزْوَةَ الْهِنْدِ فَإِنْ أَدْرَكْتُهَا أُنْفِقْ فِيهَا نَفْسِي وَمَالِي فَإِنْ أُقْتَلْ كُنْتُ مِنْ أَفْضَلِ الشُّهَدَاءِ

---

[٢] سكت عن درجته الشارح

[٣] تقدم في مجلد/ ثاني/ تسلسل/١٣٧ رقم/٢/١٧٢٤.

وَإِنْ أَرْجِعْ فَأَنَا أَبُو هُرَيْرَةَ الْمُحَرَّرُ. وفي رواية: عِصَابَتَانِ مِنْ أُمَّتِي أَحْرَزَهُمَا اللَّهُ مِنَ النَّارِ عِصَابَةٌ تَغْزُو الْهِنْدَ وَعِصَابَةٌ تَكُونُ مَعَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ. رواهما النسائي في الجهاد[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: پیٚغەمبەر (درودی خودای لەسەربیٚ) **مژدەی گرتنی ولاتی هیندی داپیٚمان، من بەش بە حالی خوٚم ئەگەر فریای ئەوە کەوتم سەرو مالی خوٚمی تیا بەخت دەکەم، ئەگەر کوژرام ئەوا گەورەترین شەهید خوٚمم، ئەگەر گەڕایشمە دواوە ئەوا ئەبو هورەیرەی ئازاد کراو لە ئاگری دوٚزەخ خوٚمم) (ن) لە گیٚڕانەوەیەکی تری نەسائیدا دەفەرمویٚ: (دوو کوٚمەڵ لەگەلی من خودا پەنایان دەدا لە ئاووری دوٚزەخ:کوٚمەڵیٚکیان ئەوانەن کە ولاتی هیند بەشەڕ دەگرن، کوٚمەڵەکەی تریشیان ئەوانەن کە لەگەڵ عیسای کوڕی مەریەمدا دەبن‌و لە ئاخر زەمانا لەگەڵ ئەودا شەڕ لەگەڵ جەجاڵ دەکەن).**

٥٥٤٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُقَاتِلُوا خُوزًا وَكَرْمَانَ مِنَ الأَعَاجِمِ، حُمْرَ الْوُجُوهِ، فُطْسَ الأُنُوفِ، صِغَارَ الأَعْيُنِ، كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ، نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ. رواه البخاري في النبوة[2]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: **(قیامەت هەڵناسیٚ تا کوشتاری خوزستان‌و ولاتی کرمان نەکەن کە دوو ولاتن لە خاکی عەجەم، دانیشتووەکانیان دەموچاویان سوورو لووت فس‌و چاو وردیلەن‌و روویان خرپن‌و گوٚشتنە، ریٚك وەك قەڵغانیٚ بە سیرمەی ژیٚ، سیرمە ریٚژ کرابیٚ‌و قات لە بان قات جووت بەقیٚ کرابیٚ، کەوشیان لە مووە!). (ب)**

---

[1] سکت عن درجته الشارح.

[2] تجريد/٤ ل- ١١٤ رقم/ ١٤٣٢ = ٣٥٩٠ + تجريد/٣ ل-٣٢٥ رقم/ ١٢٠٣ = ٢٩٢٨، ٢٩٢٩، ٣٥٨٧، ٣٥٩٠، ٣٥٩١.

## ١٠٠) کوشتاری رووم، قەڵاو پەناگەی موسوڵمانان لەو رۆژگارەدا غووتەو بەصرەیە

## قتال الروم وملجأ المسلمين الغوطة والبصرة

٥٥٤٥- عَنْ ذِي مِخْبَرٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وَقَدْ سُئِلَ عَنِ الْهُدْنَةِ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: سَتُصَالِحُونَ الرُّومَ صُلْحًا آمِنًا فَتَغْزُونَ أَنْتُمْ وَهُمْ عَدُوًّا مِنْ وَرَائِكُمْ فَتُنْصَرُونَ وَتَغْنَمُونَ وَتَسْلَمُونَ ثُمَّ تَرْجِعُونَ حَتَّى تَنْزِلُوا بِمَرْجٍ ذِي تُلُولٍ فَيَرْفَعُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ النَّصْرَانِيَّةِ الصَّلِيبَ فَيَقُولُ غَلَبَ الصَّلِيبُ فَيَغْضَبُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ فَيَدُقُّهُ فَعِنْدَ ذَلِكَ تَغْدِرُ الرُّومُ وَتَجْمَعُ لِلْمَلْحَمَةِ وَيَثُورُ الْمُسْلِمُونَ إِلَى أَسْلِحَتِهِمْ فَيَقْتَتِلُونَ فَيُكْرِمُ اللَّهُ تِلْكَ الْعِصَابَةَ بِالشَّهَادَةِ. رواه أبو داود والحاكم[1].

لە بارەی پێکهاتنی شەڕ وەستانەکەوە، کە لە نێوانی موسوڵمانەکان‌و رووم‌دا روو دەدات پرسیار لە زومیخبەر کرا فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): (لەمەولا لەگەڵ روومدا پەیمانێکی ئاشتی دەبەستن‌و لە یەکتری دڵنیا دەبن‌و پێکەوە بە دوو قۆڵی دەچن بەگژ دوشمنێکی هەر دوو لاتاندا، لە ئەنجامدا ئێوە سەردەکەون‌و تالانێکی زۆر دەگرن‌و بەسەلامەتی دەگەڕێنەوە، تا دەگەنە مێرگێکی گرداوی، جا لەوێ کابرایێ لە نەصرانییەکان خاچ (صەلیب) هەڵ دەبڕێ‌و دەڵێ: خاچ سەرکەوت‌و ئێمە بردمانەوە! پیاوێکیش - لە موسوڵمانەکان - لەم قسەیە تووڕە دەبێ‌و خاچەکە وردو خاش دەکا ئیتر روومەکان ئەمە دەکەن بە مەهانەو پەیمانەکە دەشکێنن‌و خۆیان گرد دەکەنەوەو خۆیان رێك دەخەن بۆ کوشتارە هەرە گەورەکە، موسوڵمانەکانیش مەردانە پەلاماری چەکەکانیان دەدەن‌و دەبێ بە جەنگ‌و کوشتار، جا خودای گەورە - بە خەڵاتی شەهیدیی ئەم لەشکری ئیسلامە سەر بەرزو روو سوور دەکا). (د/حاکم-س/ص).

---

[1] رواه ابو داود والحاكم بسند صحيح (شرحه).

٥٥٤٦- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ بِالْغُوطَةِ إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا دِمَشْقُ مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ[٢]:

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕۆژی کوشتارە گەورەکە (کە گۆشت لەسەر گۆشت دەکەوێ‌و وەك تان‌و پۆی تەون لاشە لاشە دەتەنێ ئەو ڕۆژە بنکەی پتەوو قەڵای قایمی موسوڵمانان لە غووتە دەبێ، لە تەنیشت شارێکەوە ناوی دیمەشقە، کە یەکێکە لە شارە هەرە باشەکانی وڵاتی شام). (د- سند صالح).

٥٥٤٧- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَنْزِلُ نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي بِغَائِطٍ يُسَمُّونَهُ الْبَصْرَةَ عِنْدَ نَهْرٍ يُقَالُ لَهُ دِجْلَةُ يَكُونُ عَلَيْهِ جِسْرٌ يَكْثُرُ أَهْلُهَا وَتَكُونُ مِنْ أَمْصَارِ الْمُسْلِمِينَ فَإِذَا كَانَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ جَاءَ بَنُو قَنْطُورَاءَ عِرَاضُ الْوُجُوهِ صِغَارُ الأَعْيُنِ حَتَّى يَنْزِلُوا عَلَى شَطِّ النَّهْرِ فَيَتَفَرَّقُ أَهْلُهَا ثَلاَثَ فِرَقٍ فِرْقَةٌ يَأْخُذُونَ أَذْنَابَ الْبَقَرِ وَالْبَرِّيَّةِ وَهَلَكُوا وَفِرْقَةٌ يَأْخُذُونَ لأَنْفُسِهِمْ وَكَفَرُوا وَفِرْقَةٌ يَجْعَلُونَ ذَرَارِيَّهُمْ خَلْفَ ظُهُورِهِمْ وَيُقَاتِلُونَهُمْ وَهُمُ الشُّهَدَاءُ[٣]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: (کەسانێ لە ئۆمەتی من لە خاکێ هەڵ دەدەن‌و سەر زەمینێ ئاوەدان دەکەنەوە نشێوو نەوییە، پێی دەڵێن بەصرە، لەلای ڕوبارێکدایە پێی دەگوترێ دەجلە، پردێکی لەسەر دروست دەکرێ، بەرە بەرە خەڵکی ئەو شارە زۆر دەبن‌و دەبێ بە یەکێ لە گەورە شارەکانی موسوڵمانان، جا لەکاتی ئاخر زەمانا نەوەی قەنتووراء (نەوەی قەنتووراء: تورکان) دێن بۆ سەریان‌و شەڕیان تێ دەبەستن، ئەم تورکانە دەموچاو پان‌و چاو وردیلەن، کاتێ دێن دەگەنە پێشەوە تا لەسەر کەناری ڕوبارەکە بارو بنەیانی لێ دەخەن، خەڵکی

[٢] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

[٣] رواه ابو داود بسند صالح (شرحه).

شـارەکەیش دەبـن بـە سـێ تاقمـەوە: تاقمێکیـان دوای کلکـی گـاو گۆتـاڵ دەکـەون‌و دەکەونـە ئـەو هەردەیـەو لـە نـاو دەچـن، تاقمێکیـشیان ئامانیـان لێ وەردەگـرن‌و بـە حـوکمی ئـەوان رازی دەبـن‌و کـافر دەبـن! تاقمەکـەی تریـشیان خێزان‌و منداڵی خۆیان لە پشت خۆیانەوە دادەنێن‌و دەجەنگێن لـە گەڵیانداو دەچن بەگژیاندا، ئەمانەیش شەهیدانی بەهەق خۆیانن!) (د- سەند صالح).

٥٥٤٨- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُوشِكُ الأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا. فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّـةٍ نَحْـنُ يَوْمَئِـذٍ يَـا رَسُولُ اللّٰهِ؟ قَالَ: بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ وَلَيَنْزِعَنَّ اللّٰهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ وَلَيَقْذِفَنَّ اللّٰهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهَنَ. فَقَالَ: قَائِلٌ يَا رَسُـولَ اللّٰـهِ وَمَـا الْوَهَنُ؟ قَالَ: حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ. روى هذه الثلاثة أبو داود[٤].

سـەوبان (خـودای لێ رازی بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) فـەرمووی: (هاکـا نەتـەوەکانی تـر، گەلـە کۆمـەیان لێ کـردن‌و لەهـەر چوارلاوە تێتان وروو‌کان‌و سەریان تێکردن، وەکوو چۆن چەن خۆرایێ (چەن بخورێ) دەوری لەگـەنێ چێـشت بـدەن‌و تێـی ورووژێـن ئـاوا!) گۆیایـەك گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئایـا لەبـەر کەمیمانـە کـەوا مرخمـان لێخـۆش دەکـەن؟ فەرمووی: (نەء لەبەر کەمی نییە، بەڵکوو ئەو سەردەمە ئێوە زۆر زۆرن، بـەڵام وەك پڵ‌و پووشـی سـەر لافـاو وان‌و زۆرو بـۆرن نـەك کـەم‌و پوخـت! خودایش لەبەر بێ تەقواییتان لەبەر چاوی دوشمنی خۆتان بێ بایەختان دەکاو ترسـی ئێوەیـان لـە دڵا نامێنـێ، سـەرەڕای ئـەوەیش ورەیـشتان دەبـا) بێـژەرێ گـوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! هۆی ئەو ورە بەردانە چییە؟ فـەرمووی: (حـەز لە دنیا دەکەن‌و لەمردن دەترسن).

---

[٤] رواه أبو داود بسند صالح.

**١٠١) مزگەوتەكەی عەششار كە لە ئەبوللەیە : (مسجد العَشَّار في الأبلة)**

**٥٥٤٩- عَنِ صَالِحِ بْنِ دِرْهَمٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: انْطَلَقْنَا حَاجِّينَ فَقَا بَلَنَا رَجُلٌ فَقَالَ: لَنَا إِلَى جَنْبِكُمْ قَرْيَةٌ يُقَالُ لَهَا الأُبُلَّةُ؟ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ: مَنْ يَضْمَنُ لِي مِنْكُمْ أَنْ يُصَلِّيَ لِي فِي مَسْجِدِ الْعَشَّارِ رَكْعَتَيْنِ أَوْ أَرْبَعًا وَيَقُولَ هَذِهِ لأَبِي هُرَيْرَةَ سَمِعْتُ خَلِيلِي أَبَا الْقَاسِمِ (صَلَّى اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ مِنْ مَسْجِدِ الْعَشَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُهَدَاءَ لاَ يَقُومُ مَعَ شُهَدَاءِ بَدْرٍ غَيْرُهُمْ. رواه أبو داود بسند صالح. نسأل الله أن يحشرنا معهم آمين[1]:**

**صاڵحی كوڕی دیرهەم (خۆشنوودیی خودای مەزنی لێبێ) فەرمووی: دەچووین بۆ حەج، پیاوێكمان تووش بوو فەرمووی: لە تەنشتی ئێوەوە گوندێ هەیە ناوی ئوبولەبێ؟ گوتیان: ئا هەیە، فەرمووی: كامتان گفتم دەدەنێ كە لە مزگەوتەكەی عەششاردا دوو ركات نوێژ یا چوار ركات، یا زیاترم بۆ بكەن‌و لەپاشا بڵێ: خێرو پاداشی ئەم نوێژە بۆ ئەبو هورەیرە. چونكە من لە ئەبو قاسمی دۆستی خۆشەیوستی خۆمم بیست - كە حەزرەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: (لە رۆژی قیامەتدا خودای گەورە شەهید گەلێ لە مزگەوتەكەی عەششارەوە حەشر دەكا، تەنیا ئەوانە لەگەڵ شەهیدانی بەدردا حەشر دەكرێن، ئەو پیاوە ئەبو هورەیرەی فەقێی پێغەمبەر بوو)[1]. (د-سند صالح).**

---

[1] رواه أبو داود بسند صالح.

[1] ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەكی چاكە بۆ ئەم مەبەستە: موسوڵمان بۆی هەیە، خێری بەدەنی، یا ماڵی، یا قەولی ئەنجام بدا، وەك نوێژو رۆژووو قورئان خوێندن‌و خێركردن، دوایی پاداشتەكەی ببەخشێ بە هەر موسوڵمانێكی تر كە خۆی بیەوێ، بەڵكو دروستە كە زیندوو خەڵك راسپێری كە لە ژیانی خۆیدا، یا لەپاش مردنی خۆی، ئەم جۆرە خێرانەی بۆ بكرێ، دەرووی رەحمەتی خودا زۆرە داخستنی نەزانییە. (وەرگێڕ)

## ١٠٢) ئاوەدان بوونەوەی بەیتولمەقدیس نیشانەی ویران بوونی مەدینەی درەخشانە: (عمران بَيْتِ المقدس خراب يثرب)

**٥٥٥٠- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ** (رَضِي اللهُ عَنْهُ) **أنْ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) **قَالَ: عُمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ قُسْطَنْطِينِيَّةَ وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ. ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى فَخِذِ الَّذِي حَدَّثَهُ - أَوْ مَنْكِبِهِ - ثُمَّ قَالَ إِنَّ هَذَا لَحَقٌّ كَمَا أَنَّكَ هَا هُنَا أَوْ كَمَا أَنَّكَ قَاعِدٌ. رواه أبو داود**[1]:

**لە موعازی کوڕی جەبەلەوە** (خودای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (درودی خودای لەسەربێ)**: ئاوەدان بوون‌و گەشە کردنی بەیتولمەقدیس نیشانەیکاولبوونی مەدینەیە، ویرانبوونی مەدینەیش سەرەتای بەرپابوونی گوشتارە هەرە گەورەکەیە ٠ئەل-مەلحەمە) بەرپابوونی کوشتارە گەورەکەیش کاتی گرتن‌و ئازادکردن فەتحکردنی قوسطەنطینیەیە، کە قوسطەنطنییەیش گیراو فەتح کرا ئیتر ججاڵ هەڵ دەستێ. ئەنجا دەستی ماڵی بەڕانی ئەو کەسەدا کە قسەکەی بۆ دەکرد (یا دەستی کێشا بەسەر شانی دا)‌و فەرمووی: هەر وەك چۆن بوونی تۆ لێرەدا هیچ گومانێکی تیادا نییە ئەم باس‌و خواسەیش ئاوا راست‌و دروستەو گومانی تیادا نییە. یا فەرمووی: هەر وەك چۆن تۆ لێرەدا دانیشتویت‌و ئەوە گومانی تیانییە ئەم باسەیش ئاوا. (د-سند صالح).**

**٥٥٥١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) **قَالَ: الْمَلْحَمَةُ الْكُبْرَى وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ وَخُرُوجُ الدَّجَّالِ فِي سَبْعَةِ أَشْهُرٍ. رواه أبو داود والترمذي**[2]:

**دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ:** (درودی خودای لەسەربێ)**:کوشتارە هەرە گەورەکەو ئازادکردن‌و گرتنی شاری قوستەنتەنییەو پەیدابوونی ججال لە ماوەی حەوت مانگدا روو دەدەن. (د/ت-س/ح).**

---

[1] بسند صالح (شرحه).

[2] بسند حسن (شرحه).

**٥٥٥٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ بُسْرٍ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: بَيْنَ الْمَلْحَمَةِ – أى العُظمى – وَفَتْحِ الْمَدِينَةِ سِتُّ سِنِينَ وَيَخْرُجُ الْمَسِيحُ الدَّجَّالُ فِي السَّابِعَةِ. رواه أبو داود بسند صالح[٣]:**

**لە عەبدوڵڵای کوڕی بوسرەوە** (رەزای خودای لێبێ) **حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: لە ناوەندی کوشتارە هەرە گەورەکەدا (واتە: شەڕی کوشتاری هەرە گەورە) و گرتنی شاری قوستەنتەنییەدا شەش ساڵە، جا لە ساڵی حەوتەمدا جەجاڵە کۆرە سەر هەڵ دەدا. (د-سند صالح).**

### ١٠٣) گرتنەوەی قوستەنتەنییە: (فتح القسطنطنية)

**٥٥٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْزِلَ الرُّومُ بِالأَعْمَاقِ أَوْ بِدَابِقَ فَيَخْرُجُ إِلَيْهِمْ جَيْشٌ مِنَ الْمَدِينَةِ مِنْ خِيَارِ أَهْلِ الأَرْضِ يَوْمَئِذٍ فَإِذَا تَصَافُّوا قَالَتِ الرُّومُ: خَلُّوا بَيْنَنَا وَبَيْنَ الَّذِينَ سَبَوْا مِنَّا نُقَاتِلْهُمْ. فَيَقُولُ الْمُسْلِمُونَ لاَ وَاللّٰهِ لاَ نُخَلِّى بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ إِخْوَانِنَا. فَيُقَاتِلُونَهُمْ فَيَنْهَزِمُ ثُلُثٌ لاَ يَتُوبُ اللّٰهُ عَلَيْهِمْ أَبَدًا وَيُقْتَلُ ثُلُثُهُمْ أَفْضَلُ الشُّهَدَاءِ عِنْدَ اللّٰهِ وَيَفْتَتِحُ الثُّلُثُ لاَ يُفْتَنُونَ أَبَدًا فَيَفْتَتِحُونَ قُسْطُنْطِينِيَّةَ فَبَيْنَمَا هُمْ يَقْتَسِمُونَ الْغَنَائِمَ قَدْ عَلَّقُوا سُيُوفَهُمْ بِالزَّيْتُونِ إِذْ صَاحَ فِيهِمُ الشَّيْطَانُ: إِنَّ الْمَسِيحَ قَدْ خَلَفَكُمْ فِي أَهْلِيكُمْ. فَيَخْرُجُونَ وَذَلِكَ بَاطِلٌ فَإِذَا جَاءُوا الشَّأْمَ خَرَجَ فَبَيْنَمَا هُمْ يُعِدُّونَ لِلْقِتَالِ يُسَوُّونَ الصُّفُوفَ إِذْ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَأَمَّهُمْ فَإِذَا رَآهُ عَدُوُّ اللّٰهِ ذَابَ كَمَا يَذُوبُ الْمِلْحُ فِي الْمَاءِ فَلَوْ تَرَكَهُ لاَنْذَابَ حَتَّى يَهْلِكَ وَلَكِنْ يَقْتُلُهُ اللّٰهُ بِيَدِهِ فَيُرِيهِمْ دَمَهُ فِي حَرْبَتِهِ[١]:**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: قیامەت هەڵناسێ تا رۆم لە ئەعماق هۆردو بەزدەکەن. یا فەرمووی: لەشکری رۆم لە**

---

[٣] بسند صالح.

[١] مسم. فتن: ٧٢٠٧.

دابیق بارو بنەی لێ دەخەن‌و دەگەنە دەوروپشتی مەدینەی درەخشان، جا لەشکرێ لە مەدینەوە بۆیان دەردەچن، لەو سەردەمەدا باشترینی دانیشتوانی سەر رووی زەوی خۆیانن، کاتێ بەرابەری یەکتری ریز دەبەستن بۆ شەڕ رۆم بە موسوڵمانەکان دەڵێن: ئێوە رێمان بۆ چۆڵ کەن، ئێمە بەس لەگەڵ ئەوانەدا جەنگ دەکەین کە دیلیان لە ئێمە گرتووە، موسوڵمانەکانیش دەفەرموون: نا بەخودا شتی وا ناکەین‌و رێگەتان نادەین‌و نایەڵین پەنجەیان بۆ ببەن، چۆن شتی وا دەکەین ئەوانە برای ئایینی ئێمەن، چۆن پشتیان بەردەدەین، ئیتر دەچن بەگژیاندا، جا سێیەکی لەشکری موسوڵمانەکان دەشکێن‌و هەڵدێن، ئەوانە هەتایە خودا تەوبەو پاشیمانییان لێ گیرا ناکا، سێیەکێکیشیان لێ دەکوژرێن‌و دەبن بە باشترین شەهیدان لەلای خودا، سێیەکەکەی تریشیان شەڕ دەبەنەوەو سەر دەکەون، ئەمانەیش هەرگیزاو هەرگیز تووشی ئاشووب‌و دووچاری فیتنە نابن، جا لەشکری رۆم دەشکێنن‌و بەشەڕ شوێنیان دەکەون تا دەیانکەنەوە بەناو قوستەنتەنییەداو قوستەنتەنییە دەگرن، جا لە پاش گرتنی قوستەنتەنییە پشوویێ دەدەن‌و شیرەکانیان بەداری زەیتوونا هەڵ دەواسن‌و جەنگ تەواو دەبێ‌و، خەریك دەبن ماڵی تالانی دابەش دەکەن لەو دەمەدا لەناکاو شەیتان دەقرشکێنێ بەناویانداو دەڵێ: جەجاڵە کۆرە مووشی هەلاتباز لەشوێنی ئێوە شاد بووە بە کەس‌و کارو ماڵ‌و منداڵتان! ئەم قەسەیەش لە خۆیا درۆیە چونکە جەجاڵ ناچێتە مەدینەو هێشتایش هەڵ نەساوە، بەڵام ئەوان لەشار دەردەچن‌و دەڕۆن تا دەگەنە شام، ئەوسا جەجاڵ پەیدا دەبێ، جا وا ئەوان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ شەڕ، ریزەکانیان رێك دەخەن، رۆژێ قامەت بۆ نوێژ دەکرێ لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەم (دروودو سڵاوی خودای لێبێ، لەخۆی‌و لە دایکی) لە ئاسمانەوە دادەبەزێ‌و بەرنوێژیی ئەو نوێژەیان بۆ دەکا جا کە جەجاڵ ئەو دوشمنی خودایە هەر کە چاوی بە عیسا دەکەوێ ئیتر وەك خوێی ناو ئاو چۆن دەتوێتەوە ئەویش ئاوا دەتوێتەوە، گریمان ئەگەر عیسا وازیشی لێ بێنێ‌و نەیکوژێ خۆی لە خۆیەوە هەر لەناو دەچێ‌و دەتلیسێتەوە، بەڵام

خـودا بـە دەسـتی عیـسا دەیکـوژێ، وە عیـسا خـوێنی جـەجاڵیان بـە سـەری نێزەکەیەوە پێ نیشان دەدا تا خەڵك باش باوەڕ بکـەن کـەوا جـەجاڵ تۆپیـوە! (موسلیم – هەزار رەحمەتی لێبێ).

٥٥٥٤– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَمِعْتُمْ بِمَدِينَةٍ جَانِبٌ مِنْهَا فِـي الْبَرِّ وَجَانِبٌ مِنْهَا فِي الْبَحْرِ. قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَـالَ: لاَ تَقُـومُ الـسَّاعَةُ حَتَّـى يَغْزُوَهَا سَبْعُونَ أَلْفًا مِنْ بَنِي إِسْحَاقَ (مِنْ أَكْرَادِ الشَّام المسلمين – غاية المأمول شـرح تاج الأصُول). فَإِذَا جَاءُوهَا نَزَلُوا فَلَمْ يُقَاتِلُوا بِسِلاَحٍ وَلَمْ يَرْمُوا بِسَهْمٍ قَالُوا لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيَسْقُطُ أَحَدُ جَانِبَيْهَا. قَالَ ثَوْرٌ لاَ أَعْلَمُهُ إِلاَّ قَالَ: الَّذِي فِي الْبَحْرِ ثُـمَّ يَقُولُوا الثَّانِيَةَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيَسْقُطُ جَانِبُهَا الآخَرُ ثُمَّ يَقُولُوا الثَّالِثَةَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ. فَيُفَرَّجُ لَهُمْ فَيَدْخُلُوهَا فَيَغْنَمُوا فَبَيْنَمَـا هُـمْ يَقْتَـسِمُونَ الْمَغَـانِمَ إِذْ جَاءَهُمُ الصَّرِيخُ فَقَالَ إِنَّ الدَّجَّالَ قَدْ خَرَجَ. فَيَتْرُكُونَ كُلَّ شَـيْءٍ وَيَرْجِعُـونَ. رواهمـا مسلم[٢].

دیـسان فـەرمووی: پێغـەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: ئایـا نـاوی ئـەو شـارەتان بیـستووە کـە لایـەکی لـە وشـکایی دایـەو لایـەکی لـە دەریـادایـە؟ فـەرموویان: بـەڵێ، ئـەی پێغـەمبـەری خـودا! فـەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ): قیامەت هەڵناسێ هەتا حەفتا هەزارِ کەس لە بەنی ئیسحاق (واتـە: لـە کـوردە موسـوڵمانەکانی شـام) ئـەو شـارە غـەزا دەکـەن، جـا کـە دەگـەنـە ئـەوێ (واتـە: کوردە موسوڵمانەکان کە دەگەنە قوستەنتەنییە) لـەوێ بارو بنـەی خـۆیـانی لێ دەخـەن و لـە دەورو بـەری شـارەکە هـەڵ دەدەن، ئـیتر نـە بەچـەك شـەڕ دەکـەن و نەتیر دەهاوێژن، بەڵکوو دەڵێن: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَـرُ: هـەر خـودا خودایـەو خـودا لـە هـەموان گـەورەترە). جـا بـە فـەرمانی خـودا بـە بەرەکـەتی ئـەم وشەپیرۆزەیە لەسەر دەستی ئەو پاڵـەوان و دلێـر مەردانـەدا خـۆیـان دەدەن بـە دەستەوە، جا دیسان دووبارە دەڵێن (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) ئیتر ئـەو لاکـەی

---

[٢] مسلم. فتن: ٧٢٦٢.

تریشی تەسلیم دەبنو خۆیان دەدەن بە دەستەوە، ئەوجا سێبارە دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) ئیتر دەرووی تەواویان بۆ دەکرێتەوەو دەرژێنە ناو شارەکەوە، دەست دەکەن بە تالآنی گرتن. لە کاتێکدا کە خەریك دەبن لەناو خۆیاندا تالآنی دابەش دەکەن لەقڕ قیژەکەرێ دەقریشکێنێو دێ بۆ لایانو دەڵێ: جەجاڵ هەڵساوە، ئیتر ئەوانیش هەموو شتێ بەجێ دەهێڵنو دەگەڕێنەوە) (موسلیم – پڕ گۆڕە پیرۆزەکەی لە نووری خودای گەورەبێ).

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ئەم حەدیسە پیرۆزە کە ئیمامی موسلیم (رەزای خودای لێبێ) لە صەحیحی موسلیمدا ریوایەتی کردووە مژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ هەموو کوردێ، وە بەهرەیەکی گەلێ گەورەیە بۆ گەلی کورد، چونکە مزگێنی ئەوەی تیادایە کە لە سایەی خوداوە گەلی کورد تا نزیکەی قیامەت بەسەر بەرزیو دلێری دەمێننو، لەسەر ئایینی ئیسلام بەردەوام دەبن، وە بەشداریی زۆر باش لە جەنگە هەرە گەورەکانی ئیسلامدا دەکەن، تەناەت لەئاخر زەمانیشدا ئەوەندە موسوڵمانێکی پاكو جەنگ کەرێکی چاكو هۆزێکی ئازاو دلێرن سوپای مەزنی وایان هەیە کە گەورە شارێکی وەك قوستەنتەنییە (کە ئێستا پێی دەڵێن: ئەستەنبووڵ) بە نەڕەی شێرانەیان، بە نەعرەتەی پڕ لە سامو شکۆیان کە دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ) زەندەقی دەچێو خۆی بەدەستەوە دەدا. ئەوەی کە ئێستا لەبەر چاوە ئەمەیە: سەردەمدارەکانی ئەم چەرخە، جەجاڵەکانی زەمانە، فیرعەونەکانی سەدەی بیستەم، هەوڵێکی شەیتانانە دەدەن بۆ قەلاچۆکردنی کوردانو بۆ تالآنکردنی سەروماڵیان، بەڵام بێگومان لەم تەقەلا پیسەیاندا ژێر دەکەونو سەرناکەون، بەڵگەی روونو ئاشکرایش ئەم حەدیسەیەو گەلێ ئیشاراتو ئاسارو ئەخباری ترە، وەك ئەم حەدیسەی بوخاریو موسلیم (رەزای خودای لێبێ) لە بەرگی سێیەمی مەجمەعو لبەحرەیندا لە لاپەڕە (٩٨)دا ئاوا نەقلی دەکا:

أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ تَعَالَى عَنهُ) قَالَ: صَحِبْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) ثَلاَثَ سِنِينَ (وفي أخرى أربع سنين. والكلُّ صحيح، بحذف الشهور في الاولى وإدخالها في الثانية) لَمْ أَكُنْ فِي سِنِيَّ أَحْرَصَ عَلَى أَنْ أَعِيَ الْحَدِيثَ مِنِّي فِيهِنَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ وَقَالَ هَكَذَا بِيَدِهِ: بَيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ تُقَاتِلُونَ قَوْمًا نِعَالُهُمُ الشَّعَرُ، وَهُوَ هَذَا الْبَارِزُ (الظاهر أنَّ برزان الذى بموصل وَهُم الأكراد الساكنون هناك)خ/٦/٤٦). م-١٠/٣٧٠ لَيْسَ فِيهِ (أي في مسلم) لا أوَّلَهُ ولا آخِرُهُ. عەللامەی.

عەینیش (ڕەزای خودای لێبێ) دەڵێی ڕانك‌و چۆغەو کلاشی پەڕۆینی بە بەن چنراوی کوردانی بە چاوی خۆی دیوە، بۆیە ئاماژە بۆ ئەو فەرمایشت‌و قەولە دەکا کە دەفەرموێ: المراد من القوم الاكراد، چونکە وەك عەینی دەفەرموێ: لە ڕیوایەتێکی موسلیما دەفەرموێ: (يلبسون الشعر ويمشون في الشعر).

موقاتەلەیش لەبابی موفاعەلەیە، بۆ موشارەکەیە، لە مەتنی حەدییسەکەدا: کێ سەر دەکەوێ کێ ژێر دەکەوێ ئەوەی تیادا نییە، مەبەستی سەرەکی فەرموودەکە ئەوەیە شەڕی کوردو عەرەب (بە تایبەتی کوردە بەرزانییەکان) نیشانەی نزیکبوونەوەی قیامەتە، هەروەها لە مەتنی حەدیسەکەدا ئەوەی تیادا نییە کە شەڕە کە غەزایەو بۆ خوایە، یا هەرایەو بۆ دنیایە، هونەری گوفتوگۆ ئارایی جاری وا هەیە وا پێویست دەکا: ئەنجامی کار، ئەگەر بە دڵی گوێگر نەبوو خامۆشی لێ بکرێ چاکترە. فتأمل. لە خودا بەزیادبێ ئەم فەرموودانە بەڵگەی ئەوەیشن کە کوردان بەر ئەم فەرموودەیە دەکەون کە دەفەرموێ:

لاَ تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَذَلَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللّٰهِ وَهُمْ كَذَلِكَ.

خودا یاربێ ئەوەی پاشقول لە گەلی کوردی موسوڵمان دەدا سەری خۆی لە بەردی ڕەق‌و تەقی چیای هەندرین ەدا، چونکە ئەوەی دەست لە کاری خودا بدا خۆی زیان دەکا، نابینیت کاتێ عومەری کوڕی خەتاب (خودای لێ ڕازی بێ) ویستی کە ئیبنو صەییاد بکوژێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) پێی

فەرموو: (ئەگەر ئەمە ئەوبێ‌و ئیبنو صەییاد ججاڵ بێ تۆ دەرەقەتی نایەیت‌و بە تۆ ناکوژرێ)! مەبەستی حەزرەت ئەوە بووە کە بڕیاری خودا لەسەر ئەوەیە کە لە ئاخرزەمانا ججاڵ هەڵ دەستێ، کەوا بێ بڕیاری خودا بەکەس هەڵناوەشێ، بەپێی ئەم فەرموودە پیرۆزەیش بڕیاری خودا لە سەر ئەوەیە کە لە ئاخر زەماندا کوردان گەشە دەکەن‌و لە ریزی لەشکرە سەرکەوتووەکانی ئیسلامدا فەتحی گەورە گەورە دەکەن‌و، دوروشمی هەرە گەورەیان وشەی یەکتا پەرستیی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ).

جا لە شوێنێ کە حەزرەتی ئیمامی عومەر (خودای لێ رازی بێ) نەتوانێ دوژمنی خودا ججاڵە کۆرەی نەحلەتی بتۆپێنێ، لەبەر ئەوەی کە بڕیارو فەرمانی خودا لەسەر ئەوەیە کە ججاڵ لە ئاخر زەماندا هەڵ دەستێ، ئیتر چۆن چۆنی نەمرووەدەکانی ئەم سەردەمە، دوژمنەکانی خودا دەتوانن گەلی لەشکرەکانی خودا لەناو ببەن‌و بڕیاری خودای تەواناو مەزن پووچەڵ بکەنەوە!

وەکی تریش لە خودا بەزیادبێ رووی رەحمەتی هەتا سەر لەگەڵماندابێ، هەتا ئەم چەرخەیش (لەگەڵ ئەو حەمکە تەقەلا پیسەیشدا) کورد هەر لە زیادی‌و گەشە کردندان‌و، هەموو موسوڵمانی پاك‌و چاكن‌و، زوربەیان بێوەین‌و دەروێشی ماڵی خۆیانن‌و (مەلاو فەقێ‌و حاجی‌و دەروێش‌و صوفی‌و پیرو شێخ‌و مەشایەخ‌و تەکیەو مزگەوت‌و خاناقاو حوجرەی فەقێ‌و خوێندنگای ئایینی) زیاد لە خۆیانیان هەیە، ماڵیان نییە کە قورئان‌و بەرماڵی تیادا نەبێ، گەڕەك‌و گوندیان نییە کە مەلاو فەقێ‌و مزگەوتی تیادا نەبێ، قەدری پیاوانی ئایینی‌و رێزی ئەهلی دین لەناویاندا زۆر باشە، بیرو باوەڕێکی موسوڵمانانەی ساخی باشی زۆر جوانیان هەیە،لە بتپەرستی‌و نەفامیی ئایینی‌و ئاقیەی خراپ‌و بیری پڕو پووچ‌و ئەفسانەو شتی وا زۆر بەدوورن، جەژن‌و جومعەو رەمەزان‌و تەراویح‌و مەولوودی‌و نوێژو جەماعەت‌و ئەڵقەی زیکرو گشت رەوشتە جوانەکان لەناویاندا لە باوو برەودان. خودا ئەم بەهرانەیان پێ بهێڵێ‌و بەزۆری نەزانێ ئامین.

خوێنەری ئازیزم! من لەبەر ئەوە ئاشقی کوردانم چونکە کوردان ئاشقی ئەمانەن، ئاشقی قورئانن، ئاشقی موحەممەدو حەسەن‌و حوسێن‌و عەلی‌و عومەرو شافیعی‌و شێخ عەبدول قادری گەیلانی‌و مەولانا خالیدو کاکە ئەحمەدی شێخ‌و پیرانی تەریقەت‌و زانایانی شەریعەتن، میلەتێکی خودا پەرستی راست‌و دروستن، خۆ خوانە خواستە من دروشمی نەزانیم بەرز نەکردۆتەوە کە دەڵێ (أنصر أخاك ظالما أو مظلوما: بە هەق‌و ناهەق لەسەر برای خۆت بکەرەوە). ئەوەندە هەیە چەم بێ چەقەڵ نابێ، لەبەر ئەوە نابێ ئێمە بەهۆی چەن تاقمەیەکی لەرێ دەرچووە حوکمی هەموو میللەتی کورد بە خراپە بدەین. بەڵکوو بە پێچەوانەوە ئێمە دەبێ چاو پووشی بکەین، نەرمونیان بین، هاتو هاواری زۆر نەکەین‌و دەم بە هاوار نەبین. ئیتر پەنا بەخودا.

(وەرگێڕ) – ١٩٨٧/٦/١٥

### ١٠٤) ئەو حەلە رۆم زۆرن بەڵام سەرکەوتن بۆ موسوڵمانانە: الروم حينذاك كثير ولكن الغلبة للمسلمين

٥٥٥٥- عَنْ الْمُسْتَوْرِدُ الْقُرَشِيُّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ عِنْدَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: تَقُومُ السَّاعَةُ وَالرُّومُ أَكْثَرُ النَّاسِ. فَقَالَ: لَهُ عَمْرٌو أَبْصِرْ مَا تَقُولُ. قَالَ أَقُولُ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَئِنْ قُلْتَ ذَلِكَ إِنَّ فِيهِمْ لَخِصَالاً أَرْبَعًا إِنَّهُمْ لأَحْلَمُ النَّاسِ عِنْدَ فِتْنَةٍ وَأَسْرَعُهُمْ إِفَاقَةً بَعْدَ مُصِيبَةٍ وَأَوْشَكُهُمْ كَرَّةً بَعْدَ فَرَّةٍ وَخَيْرُهُمْ لِمِسْكِينٍ وَيَتِيمٍ وَضَعِيفٍ وَخَامِسَةٌ حَسَنَةٌ جَمِيلَةٌ وَأَمْنَعُهُمْ مِنْ ظُلْمِ الْمُلُوكِ[1]:

موستەوریدی قورەیشی (رەزای خودای گەورەی لێبێ) لای عەمری کوڕی عاص فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ):

---

[1] مسلم. فتن: ٧٢٠٨.

کاتێ کە قیامەت بەرپا دەبێ رۆم لە هەموو کەسێ زۆرترن. عەمریش پێی فەرموو: لە قسەکەت ورد بەرەوە بزانە دەڵێی چیو ئەم قسەیە کوێ دەگرێتەوە! فەرمووی: چیم لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بیستووە ئەوە دەڵێم، زیاتر ناڵێم! عەمریش فەرمووی: لەسەر ئەم قسەیەی تۆدا دەسا ئەم میللەتانی رۆمە چوار رەوشتیَ چاکیان تیادا هەیە:

یەکەم: لەکاتی ئاژاوەو ئاشووبدا زۆر بەحەوسەڵەو هێمنو لەسەر خۆن.

دووەم: لە پاش قۆرتو چورتمو گرفتاری زوو دێنەوە سەر خۆیان.

سێیەم: لەکاتی هەرادا لەپاش کشانەوە گورج هەڵمەت دەبەنەوە سەر دوژمنی خۆیان.

چوارەم: بۆ هەژارو بێ نەواو هەتیوانیش زۆر باشن، سەرەرای ئەم چوار رەوشە باشانەیش رەفتارێکی شیرینی جوانی تریشیان هەیە، کە لەگەڵ ئەم چوارەدا دەکەنە پێنج بەهرەی گەورە، کە ئەویش ئەمەیە: کە نایەڵن سەرۆكو پادشاکانیان زۆرو ستەمو ناهەقی بکەن! (م - خودای لێ رازی بێ).

٥٥٥٦- عَنْ نَافِعِ بْنِ عُتْبَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةٍ فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْمٌ مِنْ قِبَلِ الْمَغْرِبِ عَلَيْهِمْ ثِيَابُ الصُّوفِ فَوَافَقُوهُ عِنْدَ أَكَمَةٍ فَإِنَّهُمْ لَقِيَامٌ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَاعِدٌ، قَالَ: فَقُلْتُ فِي نَفْسِي ائْتِهِمْ فَقُمْ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ لاَ يَغْتَالُونَهُ، ثُمَّ قُلْتُ لَعَلَّهُ نَجِيٌّ مَعَهُمْ. فَأَتَيْتُهُمْ فَقُمْتُ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَهُ قَالَ: فَحَفِظْتُ مِنْهُ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ أَعُدُّهُنَّ فِي يَدِي قَالَ: تَغْزُونَ جَزِيرَةَ الْعَرَبِ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ ثُمَّ فَارِسَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ ثُمَّ تَغْزُونَ الرُّومَ فَيَفْتَحُهَا اللَّهُ ثُمَّ تَغْزُونَ الدَّجَّالَ فَيَفْتَحُهُ اللَّهُ. قَالَ: فَقَالَ نَافِعٌ يَا جَابِرُ لاَ نَرَى الدَّجَّالَ يَخْرُجُ حَتَّى تُفْتَحَ الرُّومُ. رواهما مسلم[٢]:

نافیعی کوڕی عوتبە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە غەزایەکا لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، لەلای رۆژاوای مەدینەوە دەستەیێ پیاو هاتنە خزمەتی،

---

(٢) مسلم. فتن: ٧٢١٣. ابن ماجه: فتن: ٤٠٩١. تحفة الأشراف: ١١٥٨٤.

بەرگی خورییان لەبەردابوو، کە کەیشتنە کن حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەلای تەپۆڵکەیەکا بوو، ئەوان بە پێوە بوون، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دانیشتبوو، لەدڵی خۆما گوتم: بابچم بۆ لایان، بکەومە نێوانی ئەوان‌و نێوانی پێغەمبەرەوە نەبادا بەهەڵی بزانن‌و بیکوژن، لەپاشا گوتم: بەشکوو رازو قسەی نهینی خۆی هەبێ لەگەڵیان، ئاخری خۆم پێ نەگیراو چووم‌و لەنێوانی ئەوان‌و لە نێوانی ئەوا وەستام‌و، ئیتر ئەم چوار وتەیەم لەفەرمایشتەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەر کرد، بە پەنجەکانم دەمژماردن، فەرمووی: لە پێشا جەزیرەتولعەرەب غەزا دەکەن‌و خودا فەتحی دەکا بۆتان، لەپاش ئەو وڵاتی فارس غەزا دەکەن‌و خودا فەتحی دەکا بۆتان، لەپاش ئەویش وڵاتی رۆم غەزا دەکەن‌و خودا ئازادی دەکا بۆتان. لەپاشدا دەچن بەگژ ججاڵ‌و ئەویش خودا لەناوی دەبا بۆتان. عەبدولمەلیکی راوی فەرمووی: جا نافیع (خودای لێ رازی بێ) بە جابیری کوڕی سەموورەی فەرموو: ئەی جابیر! وا دەزانین هەتا وڵاتی رۆم نەگیرێ جەجاڵ هەڵناسێ! (م- رەزای خودای لێبێ).

## ١٠٥) باسی شەشەم: باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت

## الباب السادس: في علامات الساعة

٥٥٥٧- عَنْ سَهْلٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ هَكَذَا. وَيُشِيرُ بِإِصْبَعَيْهِ فَيَمُدُّ بِهِمَا. وفِي رواية: بعثت أنا والساعة كهاتين وَضَمَّ السبابة والوسطى. رواه الشيخان والترمذي[1]:

سەهل (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دوو پەنجەی خۆی درێژ کردو ئاماژەی پێکردن‌و فەرمووی: من‌و قیامەت خودا ئاوا بەرو دوا ناردووینی. لە گێڕانەوەیەکا: پەنجەی شایەتمان‌و پەنجەی ناوەڕاستی جووت کردو فەرمووی: من‌و قیامەت وەك ئەم دووە بەرو دوا هاتین (ش/ت). واتە: لە سەرەتای دروستبوونی دنیاوە هەتا ئێستا ئەگەر

[1] تجرید/٤ ل- ٥١٠ رقم/١١٢ = ٦٥٠٢ فتح. مسلم. فتن: ٧٣٢٩ — ٧٣٤٣.

بەقەد پەنجەی شایەتمان بێ، لە ئێستا شەوە هەتا قیامەت بەقەد زیادەی پەنجەی ناوەڕاستە بەسەر پەنجەی شایەتمانا. تەماشای بەرگی سێیەم مەجمەعول بەحرین لاپەڕە (١٣٤) بفەرموو. (وەرگێڕ).

٥٥٥٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَتَى تَقُومُ السَّاعَةُ؟ وَعِنْدَهُ غُلاَمٌ مِنَ الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ مُحَمَّدٌ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنْ يَعِشْ هَذَا الْغُلاَمُ فَعَسَى أَنْ لاَ يُدْرِكَهُ الْهَرَمُ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ. رواه مسلم[٢]:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پیاوێ لە پێغەمبەری پرسی: قیامەت کەی هەڵ دەستێ؟ لەو کاتەدا کوڕێکی مناڵکاری ئەنصاری لەلای پێغەمبەر بوو، ناوی موحەممەد بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ئەم کوڕە بژی لەوانەیە نەگاتە پیربوون قیامەت هەڵ بستێ. (م).

٥٥٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ. رواه الشيخان[٣]:

ئەبو هورەیرە(خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: قیامەت هەڵناسێ تاوای لێدێ پیاو دەدا بە لای گۆڕی پیاوداو پێی دەڵێ: خۆزگەم بەخۆت؟ خۆزگە من بوومایە لە شوێنی تۆ! (ش) لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا وەك لە شەرحەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ): بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە کە یەزادنی پاکە، دنیا تەواو نابێ تاوای لێدێ پیاو دەدات بەلای گۆڕداو خۆی دەپلیکێنێتە لەسەری‌و دەڵێ: خۆزگەم بەخۆی، کاشکی من دەبووم لە شوێنی خاوەنی ئەم گۆڕە! کەواش دەڵێ ئەوە نەبێ لەبەر بێ دینی خۆی وابڵێ، نەء، بەڵام ئەوەندە دەردو بەڵای زۆرە.

---

[٢] مسلم. فتن: ٧٣٣٦.

[٣] تجريد البخاری/٣٥٩/٥/ ترجمة كردية. رقم/٢١٠٣ = ٧١٢١ فتح الباری شرح صحيح البخاری. مسلم. فتن: ٧٢٣٠ — ٧٢٣١.

٥٥٦٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الْحِجَازِ، تُضِيءُ أَعْنَاقَ الإِبِلِ بِبُصْرَى. رواه الشيخان والترمذي[٤].

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا ئاگرێ لەخاکی حیجاز دەردەچێ، گەردنی وشتر لە شاری بوصرا رووناك دەکاتەوە. (ش/ت) بوصرا شاری حۆرانە سێ رۆژە رێ لە دیمەشقەوە دووە (شرحەکە).

٥٥٦١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَضْطَرِبَ أَلَيَاتُ نِسَاءِ دَوْسٍ حَوْلَ ذِي الْخَلَصَةِ. وَكَانَتْ صَنَمًا تَعْبُدُهَا دَوْسٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ بِتَبَالَةَ. رواه الشيخان[٥].

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا دووبارە ژنانی هۆزی دەوس بە دەوری زیلخەلەصەدا سمت با دەدەنەوە. زیلخەلەصە ناوی بتێ بوو لە تەبالەی یەمەن بوو، لەسەر دەمی نەزانیدا هۆزی دەوس دەیان پەرست (ش).

٥٥٦٢- ولمسلم: لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى تُعْبَدَ اللاَّتُ وَالْعُزَّى. فَقَالَتْ عَائشة: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأَظُنُّ حِينَ أَنْزَلَ اللَّهُ (هُوَ الَّذِى أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) أَنَّ ذَلِكَ تَامًّا قَالَ: إِنَّهُ سَيَكُونُ مِنْ ذَلِكَ مَا شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً فَتَوَفَّى كُلَّ مَنْ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَيَبْقَى مَنْ لاَ خَيْرَ فِيهِ فَيَرْجِعُونَ إِلَى دِينِ آبَائِهِمْ[٦].

عائیشە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لە حەزرەتم ژنەوت (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەم شەوو رۆژە لاناچن تا دیسانەوە خەڵك سەر لەنوێ لات‌و عوززا دەپەرستنەوە منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ من وام دەزانی ئەم ئایەتە کە خودا ناردوویەتی مژدەکەی تا سەردەبێ‌و ئایینی

---

[٤] مسلم. فتن: ٧٢١٨. بخاری فتن: ٧١١٨ = تجرید/٥/٣٨٥ رقم/٢١٠١.

[٥] مسلم. فتن: ٧٢٢٧. بخاری. فتن: ٧١١٦.

[٦] مسلم. فتن: ٧٢٢٨.

ئیسلام هەتا هەتایە زاڵ و سەرکەوتوو دەبێ بەسەر ئایینەکانی تردا، واتە: ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ:

{هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ – ٩ / ٣٣}.

واتە: خودا ئەو خودایەیە کە موحەممەدی پێغەمبەری خۆیی لەگەڵ هیدایەت و دینی ئیسلامدا کە ئایینێکی راست و دروستە ناردووە، بۆ ئەوە ئەو پێغەمبەرە زاڵ بکا بەسەر هەموو ئەهلی دینەکانی تردا، یاخود بۆ ئەوە دینەکەی دەربخا بۆ گشت گێتی و رۆژێ لە رۆژان – وەك سەدەمی موحەممەدی مەهدی بێ – گشتیان ببەزێنێ و خۆی ببێ بە تاقە دینی سەر رووی زەوی، هەرچەند فرە خواکان ئەمەیان پێ خۆش نەبێ. ئەدی ئەی پێغەمبەری خودا! من وام دەزانی کە ئەم مژدەیەی وا لەم ئایەتەدا هەتا سەر دەبێ، کەچی تۆیش وا دەفەرووی؟! حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە راستیدا لەمەولا ئەوەی لەم ئایەتەدا باس کراوە چەندەی حەزی خودای لەسەر بێ وا دەبێ و ئەمە روودەدا، بەڵام لەپاشا خودا بایەکی خۆش هەڵ دەکاو دەینێرێ، ئیتر ئەوەی کە تۆسقاڵێ ئیمان و باوەڕ لە دڵیا بێ گیانی دەکێشێ، ئەوانە دەمێننەوە کە بێ فەڕو بێ خێرن، ئەوانە دەگەڕێنەوە سەر ئایینە کۆنە پووچەکەی باوو باپیریان. (م – رەزای خودای لێبێ).

٥٥٦٣– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلاَ يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا. رواه الأربعة[٧]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) لەخۆشەویستەوە فەرمووی (درودی خودای لەسەربێ): هاکا گەنجێ لە زێڕ لەبن رووباری فوراتەوە دەرکەوت، هەر کەسێ پیادا گەیشت باهیچی لێ نەباو هیچی لێ هەڵنەگرێ. (ش/د/ت).

---

[٧] تجريد/٥ ل- ٣٥٨ رقم/ ٢١٠٢ = ٧١١٩ فتح. مسلم. فتن: ٧٢٠٣، ٧٢٠٤. أبو داود. فتن: ٤٣١٣. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٦٩٠ تحفة الأشراف: ١٢٢٦٣، ١٣٧٩٥.

لەگێڕانەوەیەکی موسلیمدا. لەسەر فەرمایشتی شەرحەکە دەفەرموێ (درودی خودای لەسەربێ): قیامەت هەڵناسێ هەتا چۆمی فورات وشك دەکاو کێوێ زێڕ لە بنیەوە دەردەکەوێ، خەڵکان لەسەری دەبێ بەشەڕ یان، لە هەموو سەد کەسێ نەوەدو نۆی دەکوژرێ، هەموو پیاوێکیان لە دڵی خۆیدا دەڵێ: سا بەشکوو من ئەو کەسەبم کە قوتارم دەبێ لەم شەڕەو شاد ببم بەم خەزنەیە!.

٥٥٦٤- ئەم فەرموودەیە لە باسی گەورەیی بەخشش‌و خێرکدندا لە نامەی زوهدو ریقاقدا رابوورد، فەرمووەدەی شەشەم کە دەفەرموێ: تقيء الارض أفلاذ كبدها[٨]:

٥٥٦٥- عَنْ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، وَهُوَ فِي قُبَّةٍ مِنْ أَدَمٍ فَقَالَ اعْدُدْ سِتًّا بَيْنَ يَدَىِ السَّاعَةِ، مَوْتِى، ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ، ثُمَّ مُوتَانٌ يَأْخُذُ فِيكُمْ كَقُعَاصِ الْغَنَمِ، ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ الْمَالِ حَتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِائَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا، ثُمَّ فِتْنَةٌ لاَ يَبْقَى بَيْتٌ مِنَ الْعَرَبِ إِلاَّ دَخَلَتْهُ، ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ بَنِى الأَصْفَرِ فَيَغْدِرُونَ، فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً، تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا. رواه البخاري في الغزو[٩]:

عەوفی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە غەزای تەبووکا چوومە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەناو چاتۆڵێکی چەرمدا بوو، فەرمووی: لەبەر دەمی قیامەتەوە ئەم شەش نیشانەیە بژمێرە:

یەکەم: مردنی من.

دووەم: گرتنی بەیتولمەقدیس (خانەی خاوێن: خانەی پیرۆز) ئینجا قڕە مردنێکتان تێ دەکەوێ وەك رانێ پزوو بگرێ ئاوا، یا گەلەیێ مافەتە لێی بدا ئاوا، ئەوجا ماڵ بە جۆرێکی وا دەبێ بە لێشاو، پیاوی وا دەبێ سەد لیرەی زێڕی دەدرێتێ کەچی هێشتا هەر ناڕازییەو لێی دەتۆرێ، ئەنجا کە

---

[٨] تقدم فى هذا المجلد (مجلد عاشر) تسلسل/١٩ رقم/٦/٥٢٢٣.

[٩] تجريد/٣ ل- ٤١٤ رقم/١٢٨٤ = ٣١٧١ فتح.

**فەرتەنەیێ بەرپا دەبێ، ماڵی عەرەب نامێنێ کە سەری پیادانەکا، ئەوجاکە لە نێوانی ئێوەو رۆمدا پێکهاتن‌و شەڕ وەستانێ دەبێ، بەڵام ئەوان ناپاك دەردەچن‌و پەیمان دەشکێنن‌و بەهەشتا لەشکرەوە دێن بۆ سەرتان، کە هەر لەشکرەی ئالای تایبەتی خۆی هەیەو، هەموو ئالایەکیش دەوانزە هەزار کەسی لەژێر فەرمان دایە (ب – بوخاری. رەحمەت لەخۆی‌و کەسوکاری).**

**٥٥٦٦– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ. رواه الشيخان[10].**

**ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **لە خۆشەویستەوە** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: قیامەت هەڵناسێ تا پیاوێ لەهۆزی قەحطان هەڵ دەکەوێ، مەردوم وەك ران بە گۆچان لێ دەخوڕێ‌و دەبێ بە پادشایان. (ش).**

**٥٥٦٧– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَذْهَبُ الأَيَّامُ وَاللَّيَالِي حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ الْجَهْجَاهُ. رواه مُسْلِمٌ والترمذي ولفظه: لاَ يَذْهَبُ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ مِنَ الْمَوَالِي يُقَالُ لَهُ جَهْجَاهُ[11].**

**دیسان فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: شەوو رۆژ هەر وادەمێنێ تا پیاوێکی نارەسەن لە مەوالییەکان دەبێ بە پادشای ئیسلام، ناوی جەهجاه دەبێ. (م/ت) گفتەی (ت): دنیا هەروا وەك خۆی دەمێنێ‌و ئەم شەوو رۆژە هەروا بە ئاسایی دێن‌و دەچن هەتا پیاوێ لە کۆنە نۆکەرەکان. (واتە: لە مەوالییەکان) دەبێ بەسەر دار ناوی جەهجاه دەبێ[1].**

---

[10] تجريد/٨٩/٤ رقم/١٤٠٠ = ٣٥١٧، ٧١١٧. مسلم. فتن: ٧٢٣٧.

[11] مسلم. فتن: ٧٢٣٨. ترمذي. فتن: ٢٢٢٨. تحفة الأشراف/١٤٦٧.

[1] دەقی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەی لێبێ) ئاوایە: (حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ الْعَبْدِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْكَبِيرِ بْنُ عَبْدِ الْمَجِيدِ أَبُو بَكْرٍ الْحَنَفِيُّ حَدَّثَنَا عَبْدُ الْحَمِيدِ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْحَكَمِ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَذْهَبُ الأَيَّامُ وَاللَّيَالِي حَتَّى يَمْلِكَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ الْجَهْجَاهُ. قَالَ: مُسْلِمٌ هُمْ أَرْبَعَةُ إِخْوَةٍ شَرِيكٌ وَعُبَيْدُ اللهِ وَعُمَيْرٌ وَعَبْدُ الْكَبِيرِ بَنُو عَبْدِ الْمَجِيدِ.

٥٥٦٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَقْتَتِلَ فِئَتَانِ عَظِيمَتَانِ تَكُونُ بَيْنَهُمَا مَقْتَلَةٌ عَظِيمَةٌ وَدَعْوَاهُمَا وَاحِدَةٌ وَحَتَّى يُبْعَثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ، قَرِيبٌ مِنْ ثَلاَثِينَ، كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ، وَحَتَّى يُقْبَضَ الْعِلْمُ، وَتَكْثُرَ الزَّلاَزِلُ، وَيَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، وَتَظْهَرَ الْفِتَنُ، وَيَكْثُرَ الْهَرْجُ وَهُوَ الْقَتْلُ، وَحَتَّى يَكْثُرَ فِيكُمُ الْمَالُ فَيَفِيضَ، حَتَّى يُهِمَّ رَبَّ الْمَالِ مَنْ يَقْبَلُ صَدَقَتَهُ، وَحَتَّى يَعْرِضَهُ فَيَقُولَ الَّذِي يَعْرِضُهُ عَلَيْهِ لاَ أَرَبَ لِي بِهِ.وَحَتَّى يَتَطَاوَلَ النَّاسُ فِي الْبُنْيَانِ، وَحَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ.وَحَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنُوا أَجْمَعُونَ، فَذَلِكَ حِينَ لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ، أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ نَشَرَ الرَّجُلاَنِ ثَوْبَهُمَا بَيْنَهُمَا، فَلاَ يَتَبَايَعَانِهِ وَلاَ يَطْوِيَانِهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدِ انْصَرَفَ الرَّجُلُ بِلَبَنِ لِقْحَتِهِ فَلاَ يَطْعَمُهُ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَهْوَ يُلِيطُ حَوْضَهُ فَلاَ يَسْقِي فِيهِ، وَلَتَقُومَنَّ السَّاعَةُ وَقَدْ رَفَعَ أُكْلَتَهُ إِلَى فِيهِ فَلاَ يَطْعَمُهَا. رواه الأربعة:

**دیسان فەرمووی: حەزرەت (درووددو سڵاوو پیتو فەڕو میهرەبانی خودای گەورەی لەسەربێو، سەرو ماڵو ڕۆحو هەستو نەست بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ تا دوو بەرەی**

---

مەبەستی ئیمامی موسلیم (خودای لێ رازی بێ) ئەوەیە: کە شێخی شێخەکەی (کە عەبدولکەبیری کوڕی عەبدولەجیدە) سێ برای تری هەیە ناویان (شەریكو عوبەیدوڵلاو عومەیرە) کە هەر چواریان کوڕی عەبدولەجیدن، ئەم جۆرە ڕوونکردنەوەی موسلیم (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووربێ) بۆ ڕافەو شەرحی حاڵی ڕاوییەکانە، لێرەدا مامۆستای گەورەو سەر مەشقو پێشەوام ڕەشید بابان بەسەر چوون (اشتباه)ێکی کردووە کە دەفەرموێ: موسلیم ئەفەرموێ ئەوانە چوار برا بوون،( شورەیك، عوبەیدوڵلا، عومەیر، عەبدولکەریم (؟!) کوڕی عەبدولەجید). ئەو جەهجاهە کامیانە؟ یەکێکیانە؟ یا هەموویانە یەك لە دوای یەك ئەبن بە پادشاه؟ ئەوەوی هیچ ئیضاحی ناکا. بەسەر چوونەکە هاتە کۆتایی، ڕاستکردنەوەکەیشی لە پێشەوە ڕابوورد.

(وەرگێڕ)

سلێمانی — مامۆستایان - ١٩٩٥/٨/٥

زۆر گەورە دەچن بەگژیەکا، کوشتارێکی فرە گەورەو سامناك لە نێوانیاندا روو دەدا، داوای هەردوو لاشیان هەریەك داوایە[1] وەهەتا نزیکەی سیی پێغەمبەرە درۆزنەی جادووگەری لاسدەری هەلاتبازی فریودەر پەیدادەن، کە هومووریان بە درۆ خۆیان بە پێغەمبەری خودا دەزانن‌و لافی پێغەمبەرایەتی لێ

---

(1) دێتە گوێم وەك خەو دەنگی زەنگی جەنگ

جەنگێ بێ ئامان، بێ رەزا، بێ رەنگ

ئاگری قینی دەسوو تێنێ سەنگ

لەبۆ قیامەت دەبێ بە پێشەنگ

مووشك و فڕۆك وەك دێوو نەهەنگ

رووی ئاسمان دەگرن وەكوو پوورە هەنگ

بە ئاورو دووكەڵ، هەم بە دەنگە دەنگ

نیوەڕۆ دەكەن بە قووی شەوە زەنگ

هەر گەورە شارە بە وزەی ئەتۆم

وزەی لێ دەبڕێ، دەسووتێ وەك مۆم

هەرلا سەیردەكەی وەك خوڵخوڵەی رۆم

رێچكەی جەنگ زەدە پەنگە، وەكوو گۆم

بەیەكتر دەڵێن: منیش وەكوو تۆم

لەشاری ئێمەش هەر من ماوم خۆم!

لافاوی خوێناو، ئەشكی سووری چەم

لاشە هەڵ دەكرن لە چەشنی بەلەم

ئاهی ستەمبار، دووكەڵی ستەم

تان و پۆ دەچنن لە بۆ كفنێ تەم

بەڵكوو رووی زەوی داپۆشێ سەرجەم

نەك كفن نەبێ لە جەنگی سێهەم!!

نزایێ دەكەم گشت بڵێن ئامین:

لەشەڕ بەدووربین هەتاكوو ماوین!

- وەرگێڕ -

دەدەن، وەهەتا بەرە بەرە زانا ئایینییەکان دەمرن و بەنەمانی ئەوان عیلم و زانین هەڵ دەگیرێ و شوێنەواری کوێر دەبێتەوەو نامێنێ، وە بوومەلەرزەش زۆر دەبێ، وە کات و وەخت بەری کورت دەبێ (چونکە پیت و فەڕ نامێنێ، خراپە پەرە دەستێنێ، تەمەن کورت دەبێ) وەفەرتەنەو ئاژاوە سەر هەڵ دەدەن و فیتنە لەدوا فیتنە روو دەدەن، وە کوشت و بڕین زۆر دەبێ، وە هەتا بەشێوەیەکی وا ماڵ زۆر دەبێ و دەبێ بە لێشاو تەنانەت خاوەن ماڵ دەکەوێتە مشووری ئەوەوە کە یەکێ بدۆزێتەوە خێرو زەکاتی لێ وەربگرێ! بگرە وارێ دەکەوێ خاوەن ماڵ ماڵەکەی پێشکەشی کەسێ دەکا کەچی دەڵێ نامەوێ و هیچ کارم پێی نییە، وە هەتا وای لێدێ مەردوم خان و بەرەو کۆشك و تەلاری لێ رادەکێشن و فیزو دەعیەی پێوە دەکەن، وە هەتا وای لێدێ پیاو دەدا بەلای گۆڕی پیاوداو دەڵێ: خۆزگەم بەخۆی کە لە کێشەو بەرەی دنیا رزگاری بوو، وە هەتا رۆژ دەگەڕێتەوەو خۆر لە خۆرئاواوە هەڵ دێ! جاکە خۆر لەوێوە هەڵهات و خەڵك بەچاوی خۆیان دییان ئەو حەلە هەموو ئیمان و باوەڕ دەهێنن، بەلام ئەو کاتە ئەو رۆژەیە کە ئیمان و باوەڕ هێنان تیادا هیچ سوودێ نابەخشێ، ئەگەر لەوەپێش ئیمانی نەبووبێ، وەك لەم ئایەتەدا باسی ئەو کاتە دەکاو دەفەرموێ:

{يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا – ٦ / ١٥٨ ⇀ (ب – ٦ ز – ٧ ل – ١٦٥ چاپی یەکەم - ف – ١٣).

قیامەت لەپڕ روودەدا، هەیە دوو پیاو کەل و پەل و تۆپە کووتاڵی خۆیانیان بلاو کردۆتەوە لە بەینی خۆیانا، بەلام فریای ئەوە ناکەون کە سەوداکەی ببڕنەوە، یا دیسانەوە بیپێچنەوە کوتو پڕ قیامەت هەڵ دەستێ، هەیە پیاو شیری وشترەکەی دەدۆشێ و دەیباتەوە بەلام فریای ئەوە ناکەوێ کە بیخواتەوە لەو ماوەیەدا قیامەت هەڵ دەستێ، هەیە ئەستێڵەکەی قوڕ

دەداو بەری ئەستێڵەکەی دەگرێ وەلێ فریای ئەوە ناکەوێ کە ئاژەڵی لێ ئاو بدا، هەیە تێکەکەی دەبا بۆ دەمی کەچی فریا ناکەوێ کە بیخوا (ش/د/ت).

١٣- عَنْ حُذَيْفَةَ الغفاري (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اطَّلَعَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْنَا وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ السَّاعَةَ فَقَالَ: مَا تَذْكُرُونَ؟ قَالُوا: نَذْكُرُ السَّاعَةَ. فَقَالَ: إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ فَذكرا لدُّخَانُ وَالدَّجَّالُ وَالدَّابَّةُ وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَنُزُولُ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَيَأْجُوجُ وَمَأْجُوجُ وَثَلاَثُ خُسُوفٍ خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنْ اليَمِنَ تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ. رواه مسلم والترمذي وأبو داود[١٣]:

حوزەیفەی غیفاری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جارێ لەناو خۆماندا گوفت‌و گۆمان دەکرد، ئێمە لەژێر خانێکا بووین، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەسەرمانەوە لەسەر خانەکەدا بوو، لەو کاتەدا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) هات بەسەرمانا فەرمووی: ئەوە باسی چی دەکەن؟. گوتمان: باسی قیامەت دەکەین، فەرمووی: قیامەت بەرپا نابێ تا دە نیشانە لە پێشیەوە نەبینن. ئینجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) باسی ئەم نیشانانەی کرد: دووکەڵەکە (کە پێشی دەڵێن: ئایەتی دوخان، کە چل رۆژ دەخایەنێ، بەری هەناسەی کافران دەگرێ، بۆ موسوڵمانیش لە چەشنی هەڵامەتە)و جەجاڵ‌و داببەتول ئەرز (دەعبابن عەردیلە)و دەرچوونی خۆر لە خۆر ئاواوەو هاتنە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم (درودی خودای لەسەربێ)و یەئجووج‌و مەئجووج‌و سێ رۆچوون (خەسف): رۆچوونێ لە رۆژهەلات، رۆچوونێ لە رۆژئاوا، رۆچوونێ لە دورگەی عەرەب، لە دوا ئەمانە ئاگرێ لە ولاتی یەمەنەوە دەردەچێ خەڵك بەرەو خاکی مەحشەر رادەپێچێ! (م/ت/د).

[١٣] مسلم. فتن: ٧٢١٤. أبو داود. ملاحم/ ٤٣١١. ترمذي. فتن: ٢١٨٣ أو ٢١٨٣، ب و ٢١٨٣ ج ء ٢١٨٣د. ابن ماجه. فتن: ٤٠٤١، ٤٠٥٥ تحفة الأشراف: ٣٢٩٧.

**٥٥٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يُقَاتِلَ الْمُسْلِمُونَ الْيَهُودَ فَيَقْتُلُهُمُ الْمُسْلِمُونَ حَتَّى يَخْتَبِئَ الْيَهُودِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْحَجَرِ وَالشَّجَرِ فَيَقُولُ الْحَجَرُ أَوِ الشَّجَرُ يَا مُسْلِمُ يَا عَبْدَ اللّٰهِ هَذَا يَهُودِيٌّ خَلْفِي فَتَعَالَ فَاقْتُلْهُ. إِلاَّ الْغَرْقَدَ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرِ الْيَهُودِ. رواه مسلم والترمذي (والبخاري – المترجم)[١٤]:**

**ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودو ڕەحمەتی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا موسوڵمانان دەچن بەگژ جوولەکەدا، جوولەکە شەڕتان لەگەڵ دەکەن، تا لە ئەنجامدا خودا ئێوە زاڵ دەکا بەسەر ئەواندا، کاتێ موسوڵمانەکان دەست دەکەن بە کوشتاریان جوولەکەکان وا دەشکێن لەبن بەردو دارو بنچگ‌و دەوەندا خۆیان پەنا دەدەن‌و خۆیان دەشارنەوە، بەردو دارو درەخت‌و دەوەنەکە دەڵێن: ئەی کاکەی موسوڵمان! ئەی عەبدی باشی خودا! ئەی بەندەی خاسی خودا! ئەمە جوولەکەیەکە لە پشتمەوە خۆی حەشارداوە، وەرە ئەو دوژمنی خودایە بکوژە، تەنیا داری دڕکەزی واناڵێ، چونکە ئەو لە درەختی جوولەکەیە ڕاستییان لێ ناڵێ. (ش/ت).**

**٥٥٧١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَبْلُغُ الْمَسَاكِنُ إِهَابَ أَوْ يَهَابَ. رواه مسلم وأبو داود ولفظه: يُوشِكُ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يُحَاصَرُوا إِلَى الْمَدِينَةِ حَتَّى يَكُونَ أَبْعَدُ مَسَالِحِهِمْ سَلاَحَ[١٥]:**

**دیسان فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خانوو بەرە دەگاتە ئیهاب، یا فەرمووی: دەگاتە یەهاب (کە ناوی شوێنێکە چەند میلێ لە مەدینەی درەخشانەوە دوورە) (م/د) گفتەی (د): هاکا دوژمن موسوڵمانانی**

---

[١٤] مسلم. فتن: ٧٢٦٨. تجريد/٣ ل- ٣٢٣ رقم/ ١٢٠١ = ٢٩٢٥، ٣٥٩٣، + رقم/١٢٠٢ تجريد = ٢٩٢٦ فتح مسلم. فتن: ٧٢٦٨، ٧٢٦٧، ٧٢٦٦، ٧٢٦٥، ٧٢٦٤.

[١٥] مسلم. فتن: ٧٢١٩.

بەرەو مەدینە گرتە ناوو لەهەر چوارلاوە بەرەو ئەوێ تەنگیان پێ هەڵچنین، بەرادەیەکی وا دوورترین سەنگەریان لە سەلاح دەبێ (کە شوێنێکە لە خوار خەیبەرەوە).

٥٥٧٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَدَأَ الإِسْلَامُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ. رواه مسلم والترمذي[١٦]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئیسلام لە سەرەتاوە غەریب‌و بێ کەس بوو، دیسانەوە غەریب‌و بێ کەس دەبێتەوە خۆشی لە غەریبان‌و بێ کەسان! (م/ت).

٥٥٧٣- وَقَالَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الدِّينَ لَيَأْرِزُ إِلَى الْحِجَازِ كَمَا تَأْرِزُ الْحَيَّةُ إِلَى جُحْرِهَا وَلَيَعْقِلَنَّ الدِّينُ مِنَ الْحِجَازِ مَعْقِلَ الأُرْوِيَّةِ مِنْ رَأْسِ الْجَبَلِ إِنَّ الدِّينَ بَدَأَ غَرِيبًا وَيَرْجِعُ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ الَّذِينَ يُصْلِحُونَ مَا أَفْسَدَ النَّاسُ مِنْ بَعْدِي مِنْ سُنَّتِي[١٧]:

حەزرەت (دروودو رەحمەت‌و فەڕی خودای لێبێ) فەرمووی: ئایینی ئیسلام دیسان دەکشێتەوە بۆ ناو ولاتی حیجازو لەوێ پەپکە دەخواتەوە، هەر وەکوو چۆن مار لەناو کونی خۆیا پەپکە دەدا ئاوا! ئیسلام خۆی قایم دەکاتەوە لەناو ولاتی حیجازداو حیجاز دەبێتەوە بە تاقە قەلاو پەناگای ئیسلام، هەروەك چۆن بزنە کێوی لەتاو دوژمنی خۆی، خۆی لە لوتکە شاخەکان قایم دەکا ئاوا، ئەم دینە لە سەرەتاوە غەریب‌و بێ کەس بوو، سەر لەنوێ غەریب‌و بێکەس دەکەوێتەوە، چاوو دڵی ئەو غەریب‌و تەنهاو تەنیا بالانە رۆشن بێ، کە ئەوەی ئەو خەڵکەی تر - لە پاش من - لە رێبازی من تێکی دەدەن‌و دەسکاری دەکەن ئەوان سەر لەنوێ بەپێی دەقی ئایەتەکانی قورئان‌و فەرموودەکانی سوننەت، رێکی دەخەنەوەو دیسانەوە چاکی

[١٦] مسلم. إيمان: ٣٧٠.

[١٧] بخاری. فضائل المدينة: ١٨٧٦ = تجريد/٢/٢٥٦ رقم/٨٦١. مسلم. فتن: ٣٧٢.

دەکەنەوە! وەك جاری جاران سوننەتو شەریعەتی من زیندوو دەکەنەوە! (ش/ت).

٥٥٧٤- ⟵ (ب – ٣ ز – ٩٢ ل – ٢٣٧ ف – ١)[١٨].

٥٥٧٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا أَحْدَثَ أَهْلُهُ مِنْ بَعْدِهِ. روى هذه الثلاثة الترمذي[١٩]:

ئەبو سەعید (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەو خوایەی کە گیانی من وا لەناو دەستی دەستەڵاتی ئەودا قیامەت هەڵناسێ تا دڕندەو دەعبا قسەو گوفتوگۆ لەگەڵ ئادەمیزاددا دەکەن، وەهەتا ریشوو قوڵفی قەمچیو قەیتانی پێڵاو لەگەڵ خاوەنیاندا قسە دەکەن، وە هەتا خێزانی پیاو لە نەدیوییو لە پاشملە هەرچی بکا رانی پیاوەکە خۆی، یا ئەندامێکی تری، ژنەکەی چی کردووە بۆی دەگێڕێتەوە (ت-س/ح).

ئەمە موعجیزەیەکی زۆر گەورەیە، ئێستا ئێمە بە چاوی خۆمان ئەمە دەبینین، سەعات، چەرخی جگەرە، قەڵەم، تەپڵەکی جگەرە، دوگمەی جلو بەرگ، چاوێلکە، بووکە شووشە، سویچی کارەبا، چاوی شوشە، رەشمەی وڵاخو شتی وا، دار دەست، عەسا، قاپو قاجاخو تڕو تفاقی تری ناو ماڵ، شمەکی تری لەم بابەتە، کامێرەی شاراوەی تیادایە، دەنگو رەنگ تۆماردەکا، بەبێ ئەوەی کە کەس پێی بزانێ، بۆ نموونە مێرد دەتوانێ تۆمارکەرێکی شاراوە لەسەر خەتی تەلەفوونەکەیماڵەوەی رەبت بکا، هەرچی قسەو قسەی نهێنی ژنەکەیەتی بۆی تۆمار بکا (وەرگێڕ).

---

[١٨] تقدم فی مجلد ثالث. تسلسل/٩٢ رقم/١/٢٣٥١.

[١٩] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

**٥٥٧٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: يَوْمًا: أَتَدْرُونَ أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ الشَّمْسُ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: إِنَّ هَذِهِ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا ارْتَفِعِي ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا ثُمَّ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ فَتَخِرُّ سَاجِدَةً وَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا ارْتَفِعِي ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَرْجِعُ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا ثُمَّ تَجْرِي لاَ يَسْتَنْكِرُ النَّاسُ مِنْهَا شَيْئًا حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا ذَاكَ تَحْتَ الْعَرْشِ فَيُقَالُ لَهَا ارْتَفِعِي أَصْبِحِي طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِكِ فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِهَا. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **أَتَدْرُونَ مَتَى ذَاكُمْ ذَاكَ حِينَ لاَ يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا. رواه الشيخان والترمذي**[٢٠]:

**ئەبو زەڕ** (خودای لێ ڕازی بێ) **فەرمووی: ڕۆژێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: ئایا دەزانن ئەم خۆرە بۆ کوێ دەچێ؟ عەرزیان کرد: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باشی دەزانن، فەرمووی: گشت ڕۆژێ ئەم خۆرە چەرخەی خۆی دەکاو دەڕوا هەتا دەگاتە ئارامگای ڕۆژانەی خۆی، کەوا لەژێر تەخت‌و بارەگاو عەرشی خودادا، جا لەوێ دەکەوێ بە ڕووداو کوڕنووش دەباو لە کوڕنووشا دەمێنێتەوەو لەسەر ئەو حاڵە زیکری خودای خۆی دەکا، تاپێی دەگوترێ هەڵسەرەوە لە شوێنی ڕۆژانی خۆتەوە دیسانەوە هەڵبێرەوە، جا ئەویش دەگەڕێتەوە لە جێگەی هەڵهاتنی جارانی خۆیەوە وەك جاری جارانی هەڵ دێتەوە، ئیتر هەموو جارێ ئەمە کاریەتی‌و شتێکی وای لێ ڕوو نادا کە خەڵك نەیان دیبێ، تا ڕۆژێ بە ئاسایی دەڕواو کەس هەست بە هیچی ناکا، دەڕوا تا دەگاتەوە ئارامگاکەی بن عەرشی‌و، لەوێ جاران ئاسایی دەچێتەوە کوڕنووش‌و چاوەڕوان دەکاتەوە کە وەك جاری**

---

[٢٠] تجريد البخاري/٣/ ٤٢٣ رقم/ ١٢٩١ = ٣١٩٩، ٤٨٠٢، ٤٨٠٣، ٧٤٢٤، ٧٤٣٣. مسلم. إيمان: ٣٩٧، ٣٩٤ – ٣٩٩. أبو داود. حروف وقراءات ٤٠٠٢. ترمذي فتن: ٢١٨٦، ٣٢٢٧.

جارانی ڕێگەی پێ بدرێ‌و پێی بگوترێ لە شوێنی ڕژانی خۆتەوە هەڵبێرەوە، بەڵام ئەم جارە پێی دەگوترێ: هەڵسەرەوە بەڵام لە خۆرئاواوە هەڵبێ، ئەویش لە خۆرئاواوە هەڵدێ!. ئەوجا حەزرەت (سەلام‌و صەڵات‌و دروودو ڕەحمەت‌و فەڕو بەرەكەتی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ‌و، بە پیرۆزیی‌و بەرەكەتی صەڵاواتدان لە سەری، خودا هەموو خەم‌و پەژارەیەكمان بڕەوێنێتەوەو لە هەموو لایەكەوە دەرووی ڕەحمەتی خۆیمان لێ بكاتە) ئەوجا حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەزانن ئەمە كەیە؟ ئەمە ئەو كاتایە كە خودا لە بارەیەوە فەرموویەتی:

{يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا – ٦ / ١٥٨} ←(ب – ٦ ل – ١٦٥)

داخەكەم جار جارە هەڵەی چاپی سەیر ڕوودەدا، مەبەستی ڕستەو فەرموودە كە لەسەدا سەدی چەواشە دەكا، وەك تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە كەوا لە بەرگی شەشەمدا لە لاپەڕە سەدو پەنجاو هەشتدا، دێڕی هەرە دواوەی بەهەڵە ئاوا نووسراوە: موسوڵمان بووبێ. وەلێ ڕاستەكەی ئاوایە: موسوڵمان نەبووبێ. خودا یاربێ لە كۆتایی ئەم دەفتەرەوە گەلێ لەم هەڵە زۆر زەقانە ڕاست دەكەمەوە، وەك ئەم هەڵەیە لە بەرگی چوارەمدا لە لاپەڕە (١٦٦)دا لەسەری دێڕی شازدەهەمدا: هەڵە: حەرام، ڕاست: حرام نییە، هەروا: ب–١ ل–٤٥ دێڕی هەشت: هەڵە: قسەو باسیان بۆ دامەزرێنن. ڕاست: قسەو باسیان بۆ دامە مەزرێنن. (وەرگێڕ)

٥٥٧٧– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: حفظت من رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حديثا لم أنسه بعد، سمعته يَقُولُ: إِنَّ أَوَّلَ الآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَخروجُ الدَّابَّةُ عَلَى النَّاسِ ضُحًى فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا

فَالأُخْرَى عَلَى أَثرِهَا قَرِيباً. رواه مسلم وأبو داود، وزاد: قَالَ عَبْدُ اللَّـهِ وَكَـانَ يَقْـرَأُ الْكُتُبَ الْمُنَزَّلَةَ وَأَظُنُّ أَوَّلَهُمَا خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا[٢١]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خودایان لێ ڕازی بێ) فەرمووی: ئەم فەرموودەیەم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەربێ) بیستووە، هێشتا لەبەرم ماوەو لەیادم نەچۆتەوە، بە گوێی خۆم گوێم لێی بوو فەرمووی: یەکەم نیشانەی هەرە گەورەی هاتنی ڕۆژی ڕەستاخێز کە ڕوودەدا یەکێکە لەم دوو ڕووداوە گەورەیە: یا دەرچوون و هەڵهاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، یا پەیدا بوونی دەعبا بن عەردیلەیە کە مەشهوورە بە دابەتول ئەرز، کە لەکاتی چێشتەنگاودا لە زەوی صەفا دەردەچێ و دەدا بەسەر مەردوومدا، جا ئەم دوو نیشانەیە هەر کامێکیان لە پێش ئەوی تریانەوە ڕووی‌دا ئیتر ئەوی تریشیان دوا بەدوای ئەو بە زوویی ڕوودەدا. (م/د).

ئەبو داود (ڕەحمەتی خودای لێبێ) ئەمەی پتر کردووە: عەبدوڵڵا – کە خۆی نامە ناردراو (کتێبە مونەززەلە)کانی خوێند بوو – دەیگوت: من وادەزانم کە دەرچوونی خۆر لە خۆرئاواوە وە پێش دەرچوونی دەعبا بن عەردیلە دەکەوێ. تەماشای ئەم شوێنە بکە، بۆ زانیاری پتر ←(ب–٧ز– ١٠ ل – ٧٦).

٥٥٧٨– ولمسلم في الإيمان: إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ رِيحًا مِنَ الْيَمَنِ أَلْيَنَ مِنَ الْحَرِيرِ فَلاَ تَدَعُ أَحَدًا فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ إِلاَّ قَبَضَتْهُ[٢٢]:

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا لە یەمەنەوە کزە بایێ هەڵدەکا، لە ئاورێشم نەمتر دەبێ، ئەو کەسەی تۆسقاڵێ ئیمان و باوەڕ لە دڵیدابێ ئەو کزەبایە گیانی دەکێشێ! (م).

٥٥٧٩– وللشيخين: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ ألا عَلَى شِرَارَ النَّاس[٢٣]:

---

[٢١] مسلم. فتن: ٧٣٠٩. ابو داود. ملاحم وفتن: ٤٣١٠. ابن ماجه. فتن: ٤٠٦٩. تحفة الأشراف/ ٨٩٥٩.

[٢٢] مسلم. إيمان: ٣٠٨.

[٢٣] مسلم. فتن: ٧٣٢٨.

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەتا مەردوم هەموو گەندو بەد نەبن قیامەت هەڵناسێ (ش).

٥٥٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى لاَ يُقَالَ فِي الأَرْضِ اللَّهُ اللَّهُ. رواه مسلم والترمذي[٢٤]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا وای لێدێ کەس نابێ لەسەر رووی زەوی ناوی خودابێنێ و بڵێ: الله، الله! (م/ت).

٥٥٨١- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ أَسْعَدَ النَّاسِ بِالدُّنْيَا لُكَعُ ابْنُ لُكَعٍ. رواه الترمذي بسند حسن[٢٥]:

حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ هەتا وای لێدێ نامەردی کوڕی نامەرد شادمانترین کەس دەبێ بەخۆشیی دنیا: (ت-س/ح).

## ١٠٦) خێروگەورەیی بەندەیی و خودا پەرستی لە ئاخر زەمانا
## فضل العبادة في آخر الزمان

٥٥٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَفَ عَلَى أُنَاسٍ جُلُوسٍ. فَقَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِكُمْ مِنْ شَرِّكُمْ؟ قَالَ: فَسَكَتُوا فَقَالَ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَقَالَ رَجُلٌ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنَا بِخَيْرِنَا مِنْ شَرِّنَا. قَالَ: خَيْرُكُمْ مَنْ يُرْجَى خَيْرُهُ وَيُؤْمَنُ شَرُّهُ وَشَرُّكُمْ مَنْ لاَ يُرْجَى خَيْرُهُ وَلاَ يُؤْمَنُ شَرُّهُ[١]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: چەن کەسێ دانیشتبوون پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە دیاریان راوەستاو فەرمووی: هۆشیار بن با

---

[٢٤] مسلم. إيمان: ٣٤، ٣٧٣.

[٢٥] رواه الترمذي بسند حسن.

[١] رواه الترمذي بسند صحيح «شرحه».

پێتان بڵێم کە کامانەتان باشن‌و کامانەتان خراپن گوتی: کەس قسەی نەکرد، هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سێ جار وای فەرموو، ئەوسا پیاوێ گوتی: ئادەی فەرموو پێمان بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! کە باش‌و خراپمان دەبێ چۆن بێ، فەرمووی: باشەکانتان ئەو کەسانەتانن کە هومێدی خێریان لێ دەکرێ‌و مەردوم لە زیان‌و شەڕیان دڵنیان، خراپەکانیشتان ئەو کەسانەتانن کە نەئومێدی چاکەیان لێ دەکرێ‌و نە خەڵك لە زیان‌و شەڕیان دڵ نیادەبن!. (ت– س/ ص).

٥٥٨٣– عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ الصَّابِرُ فِيهِمْ عَلَى دِينِهِ كَالْقَابِضِ عَلَى الْجَمْرِ. رواهما الترمذي[٢]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەردوم دەکەونە رۆژێکەوە پیاوی ئاییندای خۆگر لە ناویاندا وەك کەسێ وایە کە پشکۆیێ ئاگری سوور لەناو لەپیدابێ!. (ت – س / غریب).

٥٥٨٤– عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعِبَادَةُ فِي الْهَرْجِ كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ. رواه مسلم والترمذي[٣]:

لە مەعقیلی کوڕی یەسارەوە (رەزای خودای لێبێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەکاتی بشێویی‌و کوشت‌و بڕیندا خودا پەرستی وەك هیجرەت‌و کۆچ کردن بۆ لای من وایە. (م/ت).

٥٥٨٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّكُمْ فِي زَمَانٍ مَنْ تَرَكَ مِنْكُمْ عُشْرَ مَا أُمِرَ بِهِ هَلَكَ ثُمَّ يَأْتِي زَمَانٌ مَنْ عَمِلَ مِنْهُمْ بِعُشْرِ مَا أُمِرَ بِهِ نَجَا. رواه الترمذي بسند غريب. نسأل الله الامن في الغربة آمين[٤]:

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٣] مسلم. فتن: ٧٣٢٦. ترمذي. فتن: ٢٢٠١. ابن ماجه. فتن/٣٩٨٥.

[٤] رواه الترمذي بسند غريب.

ئەبو هورەیرە (خۆشنوویی خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە ئێستا لە چەرخێکی وادان ئەوەی لە ئێوە (واتە: لە یارانی حەزرەت) دەیەکی ئەوەی داوای لێ دەکرێ نەیکا دەفەوتێ، بەڵام رۆژێ دەبێ ئەوەی لە ئێوە (واتە: لە موسوڵمانان) دەیەکی ئەرکی سەرشانی خۆی جێبەجێ بکا رزگاری دەبێ!. (ت - سەنەدەکەی غەریبە، بەڵام وەك دانەر لە شەرحەکەدا دەفەرموێ: (رەزای خودای لێبێ): ئەم فەرموودەیەی تر لەم شوێنەدا پشتیوانی دەکا، تەماشای بەرگی شەشەم چاپی یەکەم/ لاپەڕە (١٤٢) بفەرموو، فەرموودەی بیست‌و یەك‌و بیست‌و دوو = ژمارە/٢١/٣٨٤٦ و ٣٨٤٧/٢٢ لە چاپی دووەم. وەرگێڕ

## ١٠٧) بەهۆی زۆربوونی تاوان‌و گوناەو نافەرمانی خوداوە رۆچوون بەناخی زەویدا روو دەداو دێ‌و شارو وڵات بە دانیشتووەکانیانەوە لەپڕ رۆدەچن‌و، گەلێ مرۆڤو ئادەمیزاد دەبن بە مەیموون‌و بەرازو دەعباو دەعەجانی
## حلول الخسف والمسخ وأنواع البلاء بكثرة العصيان

٥٥٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: نَعَمْ إِذَا ظَهَرَ الْخَبَثُ[1].

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەچینەکانی دوایی ئەم ئۆمەتەدا ئەم بەڵایانە روو دەدەن: رۆچوون بە ناخی زەویداو، بوون بە بەرازو مەیموون‌و دەعباو، بەردە باران‌و ئاگر باران‌و شتی وا. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باشە ئەگەر پیاو چاکانیشمان لەناو دابن هەر لەناو دەچین؟ فەرمووی: بەڵێ کە دەغەڵی‌و گەندی‌و چەپەڵی پەرەی سەند!. (ت- س/ غەریب).

---

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

٥٥٨٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَتَى ذَاكَ؟ قَالَ: إِذَا ظَهَرَتِ الْقَيْنَاتُ وَالْمَعَازِفُ وَشُرِبَتِ الْخُمُورُ[٢]:

**عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودا لەخۆی‌و لە حوصەینی باوکی) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەناو ئەم گەلی ئیسلامەدا ئەم موصیبەتانە ڕوو دەدەن: ڕۆچوون بە ناخی زەویداو، بوون بە مەیموون‌و بەرازو دەعباو دەعەجانی، هەروا سەنگە باران‌و شتی وایش ڕوو دەدەن جا پیاوێ – لە موسوڵمانان. عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە کەی دەبێ؟ فەرمووی: کاتێ ژنی گۆرانی بێژو دەهۆڵ‌و زوڕنا و مۆزیقە لێدان‌و بلوێرو تەمووره ژەندن زۆر بوون، وە بەئاشکرا لەبەر چاوی خەڵك بەبێ ترسی تۆڵە لێ سەندن مەی‌و ئارەق خورایەوە ئەم بەڵایانە ڕوو دەدەن!. (ت – س/ غەریب).**

٥٥٨٨- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا فَعَلَتْ أُمَّتِي خَمْسَ عَشْرَةَ خَصْلَةً حَلَّ بِهَا الْبَلاَءُ. فَقِيلَ: وَمَا هُنَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِذَا كَانَ الْمَغْنَمُ دُوَلاً وَالأَمَانَةُ مَغْنَمًا وَالزَّكَاةُ مَغْرَمًا وَأَطَاعَ الرَّجُلُ زَوْجَتَهُ وَعَقَّ أُمَّهُ وَبَرَّ صَدِيقَهُ وَجَفَا أَبَاهُ وَارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ فِي الْمَسَاجِدِ وَكَانَ زَعِيمُ الْقَوْمِ أَرْذَلَهُمْ وَأُكْرِمَ الرَّجُلُ مَخَافَةَ شَرِّهِ وَشُرِبَتِ الْخُمُورُ وَلُبِسَ الْحَرِيرُ وَاتُّخِذَتِ الْقَيْنَاتُ وَالْمَعَازِفُ وَلَعَنَ آخِرُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَوَّلَهَا فَلْيَرْتَقِبُوا عِنْدَ ذَلِكَ رِيحًا حَمْرَاءَ أَوْ خَسْفًا وَمَسْخًا[٣]:

**عەلی (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ گەلی من ئەم پازدە ڕەوشە بە دەیان کرد، ئیتر دەردو بەڵاو وەی‌و دووچار بوون سەریان تێ دەکا. گوترا: ئەی ڕەوانە کراوی خودا! ئەو ڕەوشانە چین؟ فەرمووی: کاتێ وای لێهات:**

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

١. ماڵی دەوڵەت‌و سامانی میللەت لەناو چەند کەسێکا دەستاو دەستی پێ بکرێ. (وەك ئێستا - ٢٠٠٨/٥/٢٩). (وەرگێڕ)
٢. وەسپاردەو ئەمانەت بە چاوی تاڵانی تەماشا بکرێ.
٣. وەزەکات بە جەریمەو باج‌و سەرانە دابنرێ.
٤. وە پیاو لە هەموو شتێکا بەگوێی ژنی خۆی بکا وەبێ گوێی‌و بێ دڵی دایکی خۆی بکا.
٥. وە بۆ برادەری باش بێ.
٦. وە بۆ باوکی خراپ.
٧. وە هەراو زەناو دەنگە دەنگ لەناو مزگەوتا بکرێ.
٨. وە خۆێریترینی گەل‌و میللەت ببێ بە سەرۆك‌و سەردارِیان!
٩. وە پیاوی خراپ (لە ترسی زیان‌و وەزەن‌و شەڕی) قەدرو ڕێزی لێ بگیرێ!.
١٠. وە مەی‌و ئارەق‌و شەراب بە ئاشکرا بخورێتەوە.
١١. وە ئاوریشم لەبەر بکرێ.
١٢. وە ژنی گۆرانی بێژ - وەك شوان‌و گاوان‌و ڕەنجبەر - رابگیرێ‌و بۆ ئەوەی گۆرانی بڵێ‌و ئاهەنگ بگێڕێ مووچەو بەراتی بۆ ببڕێتەوە.
١٣. وە ئامێری بەزم‌و ڕەزم‌و زوڕنا ژەندەن زۆر ببێ.
١٤. وە چینی پاشینی ئەم میللەتی ئیسلامەیش نەفرەت‌و لەعنەت لە چینی پێشینی خۆیان بکەن، گوایە ئەمانە پێشکەوتن خوازن‌و ئەوان کۆنەپەرست بوون. کاتێ وای لێهات‌و ئەم ڕەوش‌و ڕەفتارە خراپانە ڕوویاندا ئەو حەلە با ئەو خەڵکە چاوەڕوانی بایەکی سوور بکەن، یا چاوەنواڕی ڕۆچوون بە ناخی زەویدا بکەن، بەهۆی بوومەلەرزەو تەقینەوەی بورکان‌و شتی تری واوە، یا چاوەڕوانی بوون بە دەعباو دەعەجانی بکەن! (ت - سەند غەریب).

٥٥٨٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا مَشَتْ أُمَّتِي الْمُطَيْطِيَاءَ وَخَدَمَهَا أَبْنَاءُ الْمُلُوكِ أَبْنَاءُ فَارِسَ وَالرُّومِ سُلِّطَ شِرَارُهَا عَلَى خِيَارِهَا. رواى هذه الأربعة الترمذي[٤]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ ئۆمەتی من بە کەش‌و فش‌و لەنجەولار ڕۆیشتن، وە نەوەی فارس‌و ڕۆم – کە خۆیان نەوەی پادشایانن – ڕاژەو خزمەتیان کردن، ئەو کاتە خودا گەندو بەدو خراپەکانیان زاڵ دەکا بەسەر باشەکانیاندا (ت- سەند غەریب).

٥٥٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهُ: يَا أَنَسُ إِنَّ النَّاسَ يُمَصِّرُونَ أَمْصَارًا وَإِنَّ مِصْرًا مِنْهَا يُقَالُ لَهُ الْبَصْرَةُ أَوِ الْبُصَيْرَةُ فَإِنْ أَنْتَ مَرَرْتَ بِهَا أَوْ دَخَلْتَهَا فَإِيَّاكَ وَسِبَاخَهَا وَكِلاَءَهَا وَسُوقَهَا وَبَابَ أُمَرَائِهَا وَعَلَيْكَ بِضَوَاحِيهَا فَإِنَّهُ يَكُونُ بِهَا خَسْفٌ وَقَذْفٌ وَرَجْفٌ وَقَوْمٌ يَبِيتُونَ يُصْبِحُونَ قِرَدَةً وَخَنَازِيرَ. رواه أبو داود في الملاحم[٥]:

ئەنەس (خۆشنوودی لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی ئەنەس! خەڵك چەن گەورە شارێ دروست دەکەن، شارێ لەو شارانە یا ناوی بەصرە دەبێ یا ناوی بوصەیرە دەبێ، جا ئەگەر دنیا بوو ڕێت کەوتە ئەوێ، یاخود چوویتە ناوی ئەوا خۆت لەم شوێنانەی دووربگرە: لە شۆرەکاتەکەی‌و لە میناو بەندەرەکەی‌و لە بازاڕەکەی‌و لە سەراکەی، چونکە لەم شوێنانەی ڕۆچوون‌و بەردو ئاسن بارین‌و گەردە لوول‌و بوومەلەرزەو شتی وا ڕوو دەدەن، هۆزێکیش کەشەو دەخەون ئادەمیزادن، بەڵام کە بەیانی هەڵدەستن بوون بە مەیموون‌و بەراز، وەڵێ قەیناکا ئەگەر لە دەورو بەرەکەی بیت. (د – س/ص).

---

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٥] بسند رجاله رجال الصيحيح (شرحه).

## ١٠٨) باسی حەوتەم: باسی خەلیفە مەهدی (خودای لێ رازی بێ)

## الباب السابع: في الخليفة المهدي (رَضِي اللّهُ عَنهُ)

٥٥٩١- عَنْ عُبَيْدِ اللّٰهِ ابْنِ الْقِبْطِيَّةِ قَالَ: دَخَلَ الْحَارِثُ بْنُ أَبِي رَبِيعَةَ وَعَبْدُ اللّٰهِ بْنُ صَفْوَانَ (رَضِي اللّهُ عَنهُم) وَأَنَا مَعَهُمَا عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رَضِي اللّهُ تَعَالَى عَنهَا) فَسَأَلَاهَا عَنِ الْجَيْشِ الَّذِي يُخْسَفُ بِهِ وَكَانَ ذَلِكَ فِي أَيَّامِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فَقَالَتْ قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّم): يَعُوذُ عَائِذٌ بِالْبَيْتِ فَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ فَإِذَا كَانُوا بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِهِمْ. فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَكَيْفَ بِمَنْ كَانَ كَارِهًا قَالَ يُخْسَفُ بِهِ مَعَهُمْ وَلَكِنَّهُ يُبْعَثُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى نِيَّتِهِ. وفي رواية: قَالَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ صَفْوَانَ: أَمَا وَاللّٰهِ مَا هُوَ بِهَذَا الْجَيْشِ الآتي لقتال ابن الزبير. رواه الأربعة[1]:

عەبدوڵڵای کوڕی قیبتییە فەرمووی: حاریسی کوڕی ربیعەو عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان (ڕەزای خودایان لێ بێ) چوون بۆ لای ئومم‌و سەلەمە (ڕەزای خودای لێبێ) منیش لەگەڵیاندا چووم، لە بارەی ئەو لەشکرەوە کە زەوی قوتیان دەدا لە ئومم‌و سەلەمەیان پرسیار کرد، ئەم پرسیارو وەڵامەیش لە ڕۆژانی شۆڕشەکەی ئیبنو زەوبەیردا بوو، ئومم‌و سەلەمە لە وەڵاما فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پەنابەرێ پەنا دەباتە بەر کابەتوڵڵاو لەشکرێ دەنێرن بۆ سەری، کە ئەو لەشکرە دەگەنە بیابانێ لەوێ زەوی قوتیان دەداو بەناخی عەردا دەچنە خوارێ‌و نوقم دەبن! منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! باشە ئەدیی ئەو کەسەی کە حەزی لێ نەبێ بەڵام بەزۆر هێنرابێ بۆ ئەو پەلامارە ئەوە حاڵی چۆن دەبێ، فەرمووی: ئەویش لەگەڵ ئەواندا زەوی هەڵی دەلووشێ بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا خودا بەپێی نیازی دڵی خۆی زیندووی دەکاتەوە. لە گێڕانەوەیەکا: عەبدوڵڵای کوڕی صەفوان فەرمووی: ئەدی بەخودا ئەو لەشکرەکە زەوی لووشیان دەدا ئەم لەشکرە نییە کە ئێستا لە شامەوە هاتوون بۆ کوشتاری عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر. (ش/د/ت).

---

[1] مسلم. فتن: ٧١٦٩. أبو داود. المهدي: ٤٢٨٩.

٥٥٩٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَكُونُ اخْتِلاَفٌ عِنْدَ مَوْتِ خَلِيفَةٍ فَيَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ هَارِبًا إِلَى مَكَّةَ فَيَأْتِيهِ نَاسٌ مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ فَيُخْرِجُونَهُ وَهُوَ كَارِهٌ فَيُبَايِعُونَهُ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ وَيُبْعَثُ إِلَيْهِ بَعْثٌ مِنَ الشَّامِ فَيُخْسَفُ بِهِمْ بِالْبَيْدَاءِ بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ فَإِذَا رَأَى النَّاسُ ذَلِكَ أَتَاهُ أَبْدَالُ الشَّامِ وَعَصَائِبُ أَهْلِ الْعِرَاقِ فَيُبَايِعُونَهُ بَيْنَ الرُّكْنِ وَالْمَقَامِ ثُمَّ يَنْشَأُ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ أَخْوَالُهُ كَلْبٌ فَيَبْعَثُ إِلَيْهِمْ بَعْثًا فَيَظْهَرُونَ عَلَيْهِمْ وَذَلِكَ بَعْثُ كَلْبٍ وَالْخَيْبَةُ لِمَنْ لَمْ يَشْهَدْ غَنِيمَةَ كَلْبٍ فَيَقْسِمُ الْمَالَ وَيَعْمَلُ فِي النَّاسِ بِسُنَّةِ نَبِيِّهِمْ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَيُلْقِي الإِسْلاَمُ بِجِرَانِهِ إِلَى الأَرْضِ فَيَلْبَثُ سَبْعَ سِنِينَ ثُمَّ يُتَوَفَّى وَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ. رواه أبو داود[٢]:

ئوممو سەلەمە (خودای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەکاتی مردنی جێنشینێکدا دەبێ بە کێشەو بەرەو دووبەرەکی، پیاوێکیش (واتە: مەهدی) لە خەڵکی مەدینە هەڵدێو دەڕوا بۆ مەککە، خەڵکی مەدینەیش شوێنی دەکەونو هەرچەن خۆی حەزی لێ نابێ بەڵام ئەوان دەیهێننە دەرەوەو لە نێوانی روکنو مەقام پەیمانی دەدەنێو دەیکەن بە (خەلیفە - جێنشین) ئەوجا لە شامەوە لەشکرێ دەنێرن بۆ سەری، کە دەگەنە بیابانەکەی نێوانی مەککەو مەدینە لەوێ رۆدەچن بەناخی زەویداو زەوی قوتیان دەدا، کاتێ کە مەردوم ئەمە دەبینن ئیتر پیاوچاکانی شام (کە پێیان دەگوترێ: ئەبدالی شام: هاو گۆڕانی شام)و پیاو ماقوڵانی عێراق دەچن بۆ خزمەتیو پەیمانی لەگەڵ دەبەستن، لە پاشا کابرایەکی قوڕەیشی پەیدا دەبێ، وە بە پشتی هۆزی کەلبی خاڵوانی لەشکر رێك دەخا، هەتا بچێت بەگژ مەهدیدا، مەهدیش لەشکرێ دەنێرێتە سەریانو لەشکرەکەی مەهدی سەردەکەون بەسەر لەشکری کابراداو لەشکرەکەی کەلب پیس تێك دەشکێنو ماڵو سامانێکی بێدادیان بە تالانی لێ دەگرن، مەهدی بۆ خۆی ئەو ماڵی تالانییە بە عەدالەت دابەش دەکاو لەناو خەڵکا بەسوننەتو شەریعەتی

---

[٢] بسند رجاله رجال الصحيح (شرحه).

پێغەمبەری موسوڵمانان (درودی خودای لەسەربێ) ڕەفتارو کردار دەکا، وە ئایینی ئیسلام لە وڵاتدا پەلوپۆ دادەکوتێو دادەمەزرێ، ئەوجا ئەم جێنشینە حەوت ساڵ ئاوا دەمێنێتەوە، لە پاشا دەمرێو موسوڵمانان نوێژی مردووی لەسەر دەکەن! (د- ح/ص).

٥٥٩٣- عَنْ أَبِي نَضْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) فَقَالَ: يُوشِكُ أَهْلُ الْعِرَاقِ أَنْ لاَ يُجْبَى إِلَيْهِمْ قَفِيزٌ وَلاَ دِرْهَمٌ. قُلْنَا مِنْ أَيْنَ ذَاكَ قَالَ مِنْ قِبَلِ الْعَجَمِ يَمْنَعُونَ ذَاكَ؟ ثُمَّ قَالَ: يُوشِكُ أَهْلُ الشَّأْمِ أَنْ لاَ يُجْبَى إِلَيْهِمْ دِينَارٌ وَلاَ مُدْىٌ. قُلْنَا مِنْ أَيْنَ ذَاكَ قَالَ مِنْ قِبَلِ الرُّومِ. ثُمَّ سَكَتَ هُنَيَّةً ثُمَّ قَالَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَكُونُ فِي آخِرِ أُمَّتِي خَلِيفَةٌ يَحْثِي الْمَالَ حَثْيًا لاَ يَعُدُّهُ عَدَدًا. قَالَ قُلْتُ لأَبِي نَضْرَةَ أَتَرى أَنَّهُ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَقَالَ: لاَ[٣].

ئەبو نەضرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: جارێ لەلای جابیر بووین فەرمووی: هاکا خەڵکی عێراق خەرجی خەڵەو خەرمانو، مەکاتو باجی ماڵو خەرجی پوولو پارەیان نەدا! گوتمان: ئەوە لەبەرچی؟ فەرمووی: عەجەم ئەم وڵاتە داگیر دەکەنو قەدەغەی ئەوەیان لێ دەکەن، لە پاشا فەرمووی: هاکا خەڵکی شام سەرانەو باجو خەرجی خەڵەو پوولیان نەدا! گوتمان: ئەی ئەوە لەبەرچی؟ فەرمووی: بەهۆی ڕۆمەوە، لە پاشا جابیر تۆزێ ڕاماو فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەچینی پاشینی ئۆمەتی مندا جێنشینێ دەبێ بە گوێلو مشت پارەو ماڵ دەبەخشێتەوەو بە ژماردن نایژمێرێ. جەریری قسەبەر (ڕاوی) دەفەرموێ: گوتم بە ئەبو نەضرە: ئایا تۆ لەو باوەڕەدای کە ئەوە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بێ؟ فەرمووی: نەء. (م).

٥٥٩٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مِنْ خُلَفَائِكُمْ خَلِيفَةٌ يَحْثُو الْمَالَ حَثْيًا لاَ يَعُدُّهُ عَدَدًا. رواهما مسلم[٤].

---

[٣] مسلم. فتن: ٧٢٤٤.

[٤] مسلم. فتن: ٧٢٤٦

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) لە خۆشەویستەوە فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): جێنشینێ لە جێنشینەکانتان ماڵ بەچنگو مست – بەبێ شومار – بە خەڵك دەبەخشێ! (م – رەحمەتی خودای لێبێ).

٥٥٩٥– وَعَنْهُ قَالَ: خَشِينَا أَنْ يَكُونَ بَعْدَ نَبِيِّنَا حَدَثٌ فَسَأَلْنَا نَبِيَّ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ فِي أُمَّتِي الْمَهْدِيَّ يَخْرُجُ يَعِيشُ خَمْسًا أَوْ سَبْعًا أَوْ تِسْعًا. قَالَ قُلْنَا وَمَا ذَاكَ؟ قَالَ: سِنِينَ. قَالَ: فَيَجِيءُ إِلَيْهِ رَجُلٌ فَيَقُولُ يَا مَهْدِيُّ أَعْطِنِي أَعْطِنِي. قَالَ: فَيَحْثِي لَهُ فِي ثَوْبِهِ مَا اسْتَطَاعَ أَنْ يَحْمِلَهُ. رواه الترمذي[٥]:

دیسان فەرمووی: مەترسیمان هەبوو کە لە پاشی مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شتێ رووبدا، لەبەر ئەوە لە پێغەمبەرمان پرسی، فەرمووی: مەهدی لەناو ئۆمەتما هەڵ دەستێ، پێنج یا فەرمووی: حەوت، یا فەرمووی: نۆ دەژی، گوتی: گوتمان پێنجو حەوتو نۆی چی؟ فەرمووی: ساڵ فەرمووی: هەیە پیاوێ دێ بۆ لای دەڵێ: ئەی مەهدی! بەشم بدە، ئەی مەهدی بەشم بدە، ئەویش پیاوەکە چەندی بۆ هەڵبگیرێ بە لامشت دەیکاتە کۆشی! (ت – س/ح).

٥٥٩٦– عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ يَوْمٌ لَطَوَّلَ اللّٰهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ حَتَّى يَبْعَثَ فِيهِ رَجُلاً مِنِّي أَوْ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي وَاسْمُ أَبِيهِ اسْمَ أَبِي يَمْلأُ الأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلاً كَمَا مُلِئَتْ ظُلْمًا وَجَوْرًا. رواه أبو داود والترمذي:

عەبدوڵلا (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەرەکوو جیهان تاقە یەك رۆژی مابێ خودا ئەو رۆژە درێژ دەکاتەوەو قیامەت هەڵناسێ تا خودا پیاوێ لە نەوەی من دەنێرێ، یا فەرمووی: پیاوێ لە کەسو کاری من دەنێرێ، سەر رووی زەوی پڕ دەکا لە دادو عەدالەت، وەکوو پڕبووە لە زۆرو ستەم لە پێش هاتنی ئەودا، ئەو پیاوە

---

[٥] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

خـۆی هاونـاوی خۆمـەو بـاوکی هاونـاوی باوکمـە (واتـە: مەهـدی نـاوی موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلایەو لە نەوەی پێغەمبەر خۆیەتی (د/ت-س/ص).

٥٥٩٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: الْمَهْـدِيُّ مِنِّي أَجْلَى الْجَبْهَةِ أَقْنَى الأَنْفِ يَمْلأُ الأَرْضَ قِسْطًا وَعَدْلاً كَمَـا مُلِئَـتْ جَـوْرًا وَظُلْمًـا يَمْلِكُ سَبْعَ سِنِينَ[٧]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەهدی لـە خۆمـە، پێشە سـەری رووتـە، لـووتی درێـژو کەوانەییـەو سەری لووتی باریکە، سەر رووی زەوی پڕ دەکا لە دادو عەدالەت وەکوو چۆن لە پێش هاتنی ئەودا پڕ بووە لە زۆرو ستەم، وە حەوت ساڵیش حوکم دەکا. (د/حاکم-س/ص).

٥٥٩٨- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمَهْدِيُّ مِنْ عِتْرَتِي مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ. رواهما أبو داود والحاكم[٨]:

ئوموو سەلەمە (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: مەهدی لـە نـەوەی خۆمـە، لـە نەتـەوەی فاتیمـەی کچمە. (د/حـاکم-س/ص).

٥٥٩٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللَّهُ عَنْـهُ) قَالَ: وَقَد نَظَرَ إِلَى ابْنِهِ الْحَسَنِ: إِنَّ ابْنِـي هَـذَا سَيِّدٌ كَمَا سَمَّاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَسَيَخْرُجُ مِنْ صُلْبِهِ رَجُلٌ يُـسَمَّى بِاسْـمِ نَبِـيِّكُمْ يُشْبِهُهُ فِي الْخُلُقِ وَلاَ يُشْبِهُهُ فِي الْخَلْقِ[٩]:

عەلی (رەزای خودای لێبێ) سەرنجی حەسەنی کوڕی خـۆی داو فـەرمووی: ئـەم کـوڕەی مـن گـەورەو سـەروەرو سـەردارە، وەك پێغەمبـەر خـۆی (دروودی خـودای لەسەربێ) وای ناو ناوە، لە پشتی ئەم پیاوێ هـەڵ دەکـەوێ، نـاوی موحـەممـەدی

---

[٧] بسند صحيح (شرحه).

[٨] بسند صحيح (شرحه).

[٩] سكت عن درجته الشارح.

**کوڕی عەبدوڵلا دەبێ، وەك ناوی من کە پێغەمبەری ئێوەم، بە رەفتاری شیرینی‌و خووی جوانی لە پێغەمبەری ئێوە دەکا، بەڵام بە شەکڵ‌و شێوە بە تەواوی لەو ناچێ‌و لەم لایەنەوە هەندێ جیاوازی هەیە! (د= ئەبو داود).**

**٥٦٠٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ وَرَاءِ النَّهْرِ يُقَالُ لَهُ الْحَارِثُ بْنُ حَرَّاثٍ عَلَى مُقَدِّمَتِهِ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ مَنْصُورٌ يُوَطِّئُ أَوْ يُمَكِّنُ لآلِ مُحَمَّدٍ كَمَا مَكَّنَتْ قُرَيْشٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَبَ عَلَى كُلِّ مُؤْمِنٍ نَصْرُهُ أَوْ إِجَابَتُهُ. رواهما أبو داود[10]:**

**دیسان عەلی (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پیاوێ لە ماوەرائوننەهر پەیدا دەبێ، ناوی حاریسی کوڕی حەرراس دەبێ، سەرکردەی لەشکرەکەی ناوی مەنصوور دەبێ، وەك چۆن قوڕەیش بوون بەهۆی سەرکەوتنی موحەممەدو دامەزاندنی ئایینەکەی ئەو پیاوەیش ئاوا دەبێ بەهۆی سەرکەوتنی نەوەی موحەممەدو دامەزاندنی دینی موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) واجب‌و پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانێ کۆمەکی ئەو پیاوە بکا وەبچێ بە دەنگیەوە (دروودی خودای لەسەربێ).**

**٥٦٠١- لە شەرحەکەدا نەقڵ دەکا دەڵێ: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرموویەتی: مەهدی پیاوێکە لە نەوەی من، رووی گەش‌و پاك، وەك ئەستێرەی درەخشان‌و ورشە داری ئاسمان، بە رەنگ‌و روخسارو رواڵەت لە عەرەب دەچێ، بە لەشولار لە ئیسرائیلی دەچێ (واتە: کەمێ کەڵەگەتە) زەوی پڕدەکا لە دادو عەدالەت، وەکوو چۆن لە پێش چەرخی ئەودا پڕ دەبێ لە زۆرو ستەم‌و ناهەقی دانیشتوانی ئاسمان‌و زەوی بە خەلافەتی ئەو خۆشنوودو رازین! (رویانی/ أبو نعیم/دیلمی/تبرانی).**

---

[10] سكت عن درجته الشارح.

**١٠٩) کۆمەڵێ لە موسوڵمانان هەر لەسەر هەق دەوام دەکەن هەتا قیامەت تەواو نزیک دەبێتەوە : (لا تزال طائفة على الحق إلى قرب الساعة)**

**٥٦٠٢– ئەم فەرموودەیە لە بەرگی هەشتەمدا لەسەر باسی (الجهاد فرض کفایة)دا رابورد، فەرموودەی چوارەم. لە گرەدا ئاوایە: گرۆیێ لە ئۆمەتی من دەست لە هەق هەڵناگرن، بە ئاشکرا پەیڕەوی لێ دەکەن، ئەوەی پشتیان لەزەوی بداو پاشقولیان لێ دا زیان لەوان نادا، ئەمانە چین لەدوا چین هەروا لەسەر هەق دەمێنن تا نزیکی قیامەت تا ئەوحەلە کە خودا لە یەمەنەوە کزە بایێ دەنێرێ‌و گیانی هەموو موسوڵمانێ دەکێشێ. (ت/د/م) لێرەدا ئەمەی پترە:**

وزاد مسلم: فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ تَعَالَ صَلِّ لَنَا. فَيَقُولُ لاَ. إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ. تَكْرِمَةَ اللَّهِ هَذِهِ الأُمَّةَ[1]:

**موسلیم (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نوورو بۆن‌و بەرامەی خۆشی بەهەشت بێ) ئەمەی پترە: کاتێ عیسای کوڕی مەریەم (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئاسمان دێتە خوارێ فەرمانڕەوای ئەو کاتەی موسوڵمانان عەرزی دەکا: وەرە تۆ بەرنوێژیەکەمان بۆ بکە، عیسایش (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: نا من بەرنوێژیتان بۆ ناکەم، خۆت بیکە بۆیان، چونکە ئێوە کە ئۆممەتی موحەممەدن خۆتان لەناو خۆتاندا فەرمانبەرو فەرمانڕەوای یەکترین‌و دەشێ ئیمام‌و بەرنوێژو پێشەواو ئەمانەتان لە خۆتان بێ، ئەمە بڕیاری خودایەو کردوویەتی بە دەستی ڕێزو قەدرو لەم ئۆمەتەی ناوە!**

**٥٦٠٣–** عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّكُمْ مَنْصُورُونَ وَمُصِيبُونَ وَمَفْتُوحٌ لَكُمْ فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلْيَتَّقِ اللَّهَ وَلْيَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَلْيَنْهَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ[2]:

---

[1] تقدم في مجلد ثامن. تسلسل/١٩ رقم/٤/٤٣٥٩. مسلم. جهاد: ٤٩٢٧ – ٤٩٣٥. إيمان: ٣٩٣، ٣٩٠ – ٣٩٣. تجريد/ ٤ ل- ٦٠ رقم/ ١٣٧٤ = ٣٤٤٩، ٣٤٤٨، ٢٤٧٦.

[2] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

عەبدوڵلا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە لە سایەی خوداوە هەر سەرکەوتوو دەبنو تالانو ماڵی زۆر دەگرنو وڵاتێکی زۆر فەتح دەکەنو خەڵکەکەی لەسەر دەستی ئێوەدا موسوڵمان دەبن، دەی ئامۆژگاریم ئەوەیە بۆ ئێوە: هەر کامێ لە ئێوە کەوتە ئەو رۆژە، با خودا لە یاد نەکاو هەتا دەتوانێ لە خودا بترسێ، لە هەمانکاتدا با فەرمان بە کاری پەسەند بکاو جلۆگیری لە کاری ناپەسەند بکا، ئاگاداربن هەر کەسێ بە قەستی درۆ هەڵبەستێو سوور بزانێ ئەوە درۆی پەتییەو بینێ بە دەم منەوە ئەوە باشوێنی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکا. (ت-س/ر/ص).

٥٦٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَانَ أُمَرَاؤُكُمْ خِيَارَكُمْ وَأَغْنِيَاؤُكُمْ سُمَحَاءَكُمْ وَأُمُورُكُمْ شُورَى بَيْنَكُمْ فَظَهْرُ الأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ بَطْنِهَا وَإِذَا كَانَ أُمَرَاؤُكُمْ شِرَارَكُمْ وَأَغْنِيَاؤُكُمْ بُخَلاَءَكُمْ وَأُمُورُكُمْ إِلَى نِسَائِكُمْ فَبَطْنُ الأَرْضِ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ ظَهْرِهَا. رواهما الترمذي[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کاتێ فەرمانداڕو کارگێڕەکانتان پیاوی باش بوونو داراو دەوڵەمەندەکانتان بەخشندەو جوامێر بوونو لەناو خۆتاندا کارو بارتان بەراوێژو راو تەگبیر بوو، ئەوە لەم حاڵەدا ژیانتان مایەی باشییە بۆتان، بەڵام ئەگەر فەرماندارەکانتان پیاو خراپو بەد بوونو داراو دەوڵەمەندەکانتان رژدو پیسکەو چرووك بوونو کاروباری گرنگتان لە دەستی ژنەکانتاندا بوو ئەوە لەم حاڵەدا مردنتان مایەی خێرە بۆتان! (ت- سند غریب).

لە پێڕستی سوورەتەکانی قورئاندا ئەم دوو شیعرەم نوسیبوو:

شـوورا بـە زووخـرووف رووکـەش کـراوە

داخـم لـە ناوەـان بـەس نـاوی مـاوە

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

زۆر شـت لـەم دینـە لـەکار خـراوە

وەک گورگـانخواردوو قـوڵاخی مـاوە!

### ١١٠) ئێستا جەجاڵ وا لەناو دوورگەیەکا کۆتو زنجیر کراوە، تا ئەو کاتەی هەڵ دەستێ : (الدجال الآن في جزيرة موثق بالحديد)

٥٦٠٥- عَنْ فَاطِمة بنت قيس (رَضِي اللّهُ عَنهَا) قَالَتْ: صليت مع رسول الله (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَكُنْتُ فِي صَفِّ النِّسَاءِ الَّتِي تَلِي ظُهُورَ الْقَوْمِ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) صَلاَتَهُ جَلَسَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقَالَ: لِيَلْزَمْ كُلُّ إِنْسَانٍ مُصَلاَّهُ. ثُمَّ قَالَ: أَتَدْرُونَ لِمَ جَمَعْتُكُمْ. قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: إِنِّى وَاللَّهِ مَا جَمَعْتُكُمْ لِرَغْبَةٍ وَلاَ لِرَهْبَةٍ وَلَكِنْ جَمَعْتُكُمْ لأَنَّ تَمِيمًا الدَّارِيَّ كَانَ رَجُلاً نَصْرَانِيًّا فَجَاءَ فَبَايَعَ وَأَسْلَمَ وَحَدَّثَنِى حَدِيثًا وَافَقَ الَّذِى كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْ مَسِيحِ الدَّجَّالِ حَدَّثَنِى أَنَّهُ رَكِبَ فِى سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ مَعَ ثَلاَثِينَ رَجُلاً مِنْ لَخْمٍ وَجُذَامَ فَلَعِبَ بِهِمُ الْمَوْجُ شَهْرًا فِى الْبَحْرِ ثُمَّ أَرْفَئُوا إِلَى جَزِيرَةٍ فِى الْبَحْرِ حِينَ مَغْرِبِ الشَّمْسِ فَجَلَسُوا فِى أَقْرُبِ السَّفِينَةِ فَدَخَلُوا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْهُمْ دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ لاَ يَدْرُونَ مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ فَقَالُوا وَيْلَكِ مَا أَنْتِ؟ فَقَالَتْ أَنَا الْجَسَّاسَةُ. قَالُوا وَمَا الْجَسَّاسَةُ قَالَتْ أَيُّهَا الْقَوْمُ انْطَلِقُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِى الدَّيْرِ فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ. قَالَ: لَمَّا سَمَّتْ لَنَا رَجُلاً فَرِقْنَا مِنْهَا أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً قَالَ: فَانْطَلَقْنَا سِرَاعًا حَتَّى دَخَلْنَا الدَّيْرَ فَإِذَا فِيهِ أَعْظَمُ إِنْسَانٍ رَأَيْنَاهُ قَطُّ خَلْقًا وَأَشَدُّهُ وِثَاقًا مَجْمُوعَةٌ يَدَاهُ إِلَى عُنُقِهِ مَا بَيْنَ رُكْبَتَيْهِ إِلَى كَعْبَيْهِ بِالْحَدِيدِ قُلْنَا وَيْلَكَ مَا أَنْتَ؟ قَالَ قَدْ قَدَرْتُمْ عَلَى خَبَرِى فَأَخْبِرُونِى مَا أَنْتُمْ قَالُوا نَحْنُ أُنَاسٌ مِنَ الْعَرَبِ رَكِبْنَا فِى سَفِينَةٍ بَحْرِيَّةٍ فَصَادَفْنَا الْبَحْرَ حِينَ اغْتَلَمَ فَلَعِبَ بِنَا الْمَوْجُ شَهْرًا ثُمَّ أَرْفَأْنَا إِلَى جَزِيرَتِكَ هَذِهِ فَجَلَسْنَا فِى أَقْرُبِهَا فَدَخَلْنَا الْجَزِيرَةَ فَلَقِيَتْنَا دَابَّةٌ أَهْلَبُ كَثِيرُ الشَّعَرِ لاَ يُدْرَى مَا قُبُلُهُ مِنْ دُبُرِهِ مِنْ كَثْرَةِ الشَّعَرِ فَقُلْنَا وَيْلَكِ مَا أَنْتِ فَقَالَتْ أَنَا الْجَسَّاسَةُ. قُلْنَا وَمَا الْجَسَّاسَةُ قَالَتِ اعْمِدُوا إِلَى هَذَا الرَّجُلِ فِى الدَّيْرِ فَإِنَّهُ إِلَى خَبَرِكُمْ بِالأَشْوَاقِ فَأَقْبَلْنَا إِلَيْكَ سِرَاعًا وَفَزِعْنَا مِنْهَا وَلَمْ نَأْمَنْ أَنْ تَكُونَ شَيْطَانَةً

فَقَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ قُلْنَا عَنْ أَىِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ أَسْأَلُكُمْ عَنْ نَخْلِهَا هَلْ يُثْمِرُ قُلْنَا لَهُ نَعَمْ. قَالَ أَمَا إِنَّهُ يُوشِكُ أَنْ لاَ تُثْمِرَ قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ بُحَيْرَةِ الطَّبَرِيَّةِ. قُلْنَا عَنْ أَىِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ؟ قَالَ هَلْ فِيهَا مَاءٌ قَالُوا هِىَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ. قَالَ أَمَا إِنَّ مَاءَهَا يُوشِكُ أَنْ يَذْهَبَ. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ عَيْنِ زُغَرَ. قَالُوا عَنْ أَىِّ شَأْنِهَا تَسْتَخْبِرُ قَالَ هَلْ فِى الْعَيْنِ مَاءٌ وَهَلْ يَزْرَعُ أَهْلُهَا بِمَاءِ الْعَيْنِ قُلْنَا لَهُ نَعَمْ هِىَ كَثِيرَةُ الْمَاءِ وَأَهْلُهَا يَزْرَعُونَ مِنْ مَائِهَا. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ نَبِىِّ الأُمِّيِّينَ مَا فَعَلَ؟ قَالُوا قَدْ خَرَجَ مِنْ مَكَّةَ وَنَزَلَ يَثْرِبَ. قَالَ أَقَاتَلَهُ الْعَرَبُ؟ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ كَيْفَ صَنَعَ بِهِمْ؟ فَأَخْبَرْنَاهُ أَنَّهُ قَدْ ظَهَرَ عَلَى مَنْ يَلِيهِ مِنَ الْعَرَبِ وَأَطَاعُوهُ قَالَ لَهُمْ قَدْ كَانَ ذَلِكَ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ أَمَا إِنَّ ذَاكَ خَيْرٌ لَهُمْ أَنْ يُطِيعُوهُ وَإِنِّى مُخْبِرُكُمْ عَنِّى إِنِّى أَنَا الْمَسِيحُ وَإِنِّى أُوشِكُ أَنْ يُؤْذَنَ لِى فِى الْخُرُوجِ فَأَخْرُجَ فَأَسِيرَ فِى الأَرْضِ فَلاَ أَدَعَ قَرْيَةً إِلاَّ هَبَطْتُهَا فِى أَرْبَعِينَ لَيْلَةً غَيْرَ مَكَّةَ وَطَيْبَةَ فَهُمَا مُحَرَّمَتَانِ عَلَىَّ كِلْتَاهُمَا كُلَّمَا أَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ وَاحِدَةً أَوْ وَاحِدًا مِنْهُمَا اسْتَقْبَلَنِى مَلَكٌ بِيَدِهِ السَّيْفُ صَلْتًا يَصُدُّنِى عَنْهَا وَإِنَّ عَلَى كُلِّ نَقْبٍ مِنْهَا مَلاَئِكَةً يَحْرُسُونَهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَطَعَنَ بِمِخْصَرَتِهِ فِى الْمِنْبَرِ: هَذِهِ طَيْبَةُ هَذِهِ طَيْبَةُ هَذِهِ طَيْبَةُ. يَعْنِى الْمَدِينَةَ أَلاَ هَلْ كُنْتُ حَدَّثْتُكُمْ ذَلِكَ. فَقَالَ: النَّاسُ نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ أَعْجَبَنِى حَدِيثُ تَمِيمٍ أَنَّهُ وَافَقَ الَّذِى كُنْتُ أُحَدِّثُكُمْ عَنْهُ وَعَنِ الْمَدِينَةِ وَمَكَّةَ ثُمَّ قَالَ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَلاَ إِنَّهُ فِى بَحْرِ الشَّامِ أَوْ بَحْرِ الْيَمَنِ لاَ بَلْ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ ما هُوَ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ مِنْ قِبَلِ الْمَشْرِقِ مَا هُوَ. وَأَوْمَأَ بِيَدِهِ إِلَى الْمَشْرِقِ. قَالَتْ فَحَفِظْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه مسلم وأبو داود والترمذي ولفظه: حَدَّثَنِي تَمِيم الدَّارِىُّ (رَضِي اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ نَاسًا مِنْ أَهْلِ فِلَسْطِينَ رَكِبُوا سَفِينَةً فِى الْبَحْرِ فَجَالَتْ بِهِمْ حَتَّى قَذَفَتْهُمْ فِى جَزِيرَةٍ مِنْ جَزَائِرِ الْبَحْرِ فَإِذَا هُمْ بِدَابَّةٍ لَبَّاسَةٍ نَاشِرَةٍ شَعْرَهَا فَقَالُوا: مَا أَنْتِ قَالَتْ أَنَا الْجَسَّاسَةُ. قَالُوا فَأَخْبِرِينَا. قَالَتْ: لاَ أُخْبِرُكُمْ وَلاَ أَسْتَخْبِرُكُمْ وَلَكِنِ ائْتُوا أَقْصَى الْقَرْيَةِ فَإِنَّ ثَمَّ مَنْ يُخْبِرُكُمْ وَيَسْتَخْبِرُكُمْ. فَأَتَيْنَا أَقْصَى الْقَرْيَةِ فَإِذَا رَجُلٌ مُوثَقٌ بِسِلْسِلَةٍ فَقَالَ: أَخْبِرُونِى عَنْ عَيْنِ زُغَرَ. قُلْنَا مَلأَى تَدْفُقُ. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنِ الْبُحَيْرَةِ قُلْنَا مَلأَى تَدْفُقُ. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنْ نَخْلِ بَيْسَانَ الَّذِى بَيْنَ

الأُرْدُنِّ وَفِلَسْطِينَ هَلْ أَطْعَمَ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ أَخْبِرُونِى عَنِ النَّبِىِّ هَلْ بُعِثَ قُلْنَا نَعَمْ. قَالَ أَخْبِرُونِى كَيْفَ النَّاسُ إِلَيْهِ قُلْنَا سِرَاعٌ. قَالَ فَنَزَا نَزْوَةً حَتَّى كَادَ. قُلْنَا فَمَا أَنْتَ قَالَ إِنَّهُ الدَّجَّالُ وَإِنَّهُ يَدْخُلُ الأَمْصَارَ كُلَّهَا إِلاَّ طَيْبَةَ. وَطَيْبَةُ الْمَدِينَةُ. (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَى سَاكِنِهَا وَسَلَّمَ)[1]:

فاتیمەی کچی قەیس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لە ریزی ئافرەتدا (کە لە پشت ریزی پیاوانەوەیە) لە پشت پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەربێ) نوێژم بە جەماعەت کرد، حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) کە لە نوێژەکە بۆوە چووە سەر دوانگەکەو لە سەری دانیشت، پێدەکەنی، فەرمووی: با کەس لە جێگەی خۆی نەبزوێ ئینجا فەرمووی: ئایا دەزانن کە من لەبەر چی ئێوەم کۆکردۆتەوە؟؟ فەرموویان: خوداو پێغەمبەری خودا دەزانن! فەرمووی: بەخودا بۆ ئەوەم کۆنەکردوونەتەوە کە بەتەمای شتێ بم یا مەترسیم لە شتێ بێ بەڵام بۆ یەکەم کۆ کردوونەتەوە تا ئەم داستانە خۆش‌و سەیرو پڕ سوودەتان بۆ باس بکەم: تەمیمی داری کە جاران کابرایەکی نەصرانی بوو ئێستا هاتووەو پەیمانی بەمن داوەو موسوڵمان بووە، دلستانێکی لە بابەت جەجاڵەوە بۆم گێڕایەوە، رێکی ئەو قەسەیەی کە من دەربارەی جەجاڵ بۆ ئێوەم کرد.

تەمیم قسەی بۆ کردم کە جارێ خۆی‌و سیی پیاو لە هۆزی لەخم‌و هۆزی جوزام سواری پاپۆڕێکی گەورەی دەریایی دەبن، تامانگێکی رەبەق شەپۆلی دەریا یارییان پێ دەکا، لەپاشا لەناو دەریادا لەپەنا دوورگەیەکا لەکاتی خۆرئاوا بووندا لەنگەر دەگرن، ئەوجا لەناو بەلەمەکانی گەمێکەدا دادەنیشن‌و دەڕۆن بۆ وشکانی‌و دەچنە ناو ئەو دوورگەوە کە لەناو دەریاکەدا بوو، دەعبایەکی تووکنەی کوڵکنەی تیسکنەیان تووش دەبێ، لەبەر تیسک‌و کوڵک‌و مووی زۆر سەرو قنگی لەیەک جیانەدەکرایەوە! پێی

---

[1] مسلم. فتن: ٧٣١٢. أبو داود. ملاحم فتن/٤٣٢٦، ٤٣٢٧، ترمذي. فتن: ٢٢٥٣. ابن ماجه. فتن: ٤٠٧٤ تحفة الأشراف: ١٨٠٢٤.

دەڵێن: خانە خراپ! تۆ چیت‌و چی نیت؟ دەڵێ: من جەسساسەم، دەڵێن: ئەی جەسساسە چییە؟ (جەسساسە واتە: سووسەکەرو پێشقەرەوڵی جەجاڵ) دەعباکە دەڵێ: ئەی پیاو گەلینە! بڕۆن بۆ لای ئەو پیاوە کە لەناو ئەو دێرەدایە، چونکە بەراستی ئەو ئەڵهای دەنگو باسی ئێوەیەتی.

تەمیم گوتی: جا کە ناوی پیاوی بۆمان هێنا، لەم جێگە پەڕو چۆڵ‌و هۆڵەدا مەترسیمان لێ نیشت کە ئەم دەعبایە شەیاتینی بێ، گوتی: ئینجا بەپەلە تێمان قوچان تاکوو چووینە ناو دێرەکەوە، لەوێ زەلامێکی فیلەتەنی زەبەللاحمان بینی، هەرگیزاو هەرگیز مرۆڤی کەتەی زلی وامان نەدیوە، زۆر توند پێوەند کرابوو، هەردوو دەستی کەلەپچە کرابوون بە ملیەوە، لە ئەژنۆیەوە تا قولە پێی بە کۆت‌و زنجیر شەتەك درابوو، پێمان گوت: نەگبەت! تۆ چیت؟ گوتی: من ئەوەم کەوام لەبەر چاوتان‌و زوو یا درەنگ دەزانن من کێم، بەڵام پێم بڵێن کە ئێوە کێن‌و چین؟ گوتمان: ئێمە کاسانێکین لە عەرەب، سواری کەشتییەك بووین واڕێکەوت دەریا ئاڵۆزا، ئیتر هەتا مانگێ شەپۆل بەملاولادا دەیهێناین‌و دەیبردین، تا لە ئەنجاما پەنامان هێنا بۆ ئەم دوورگەی تۆیەو لەنگەرمان گرت‌و بە قایەخ دابەزین بۆ ناو دوورگەکەو تووشی دەعبایەکی تیسکنی مموودار بووین لەبەر تووك‌و موو سەرو قنگی لەیەك جیا ناکرێتەوە، پێمان گوت: نەگبەت! تۆ چیت؟ گوتی: من قەرەوولم: گوتمان: قەرەوولی چیت؟ گوتی: بچن بۆ لای ئەو کابرایە کەوا لەناو ئەو دێرەدا، چونکە ئەو ئەلهای باس‌و خواسی ئێوەیەتی، ئیتر ئێمەیش بە پەلە هاتین بۆ لای تۆو لەو دەعبایەیش ترساین نەبادا شەیاتینی بێ جازەبەللاحەکە گوتی: باسی باخە خورماکانی بەیسانم بۆ بکەن، گوتمان: مەبەستت لە چییەتی، لەچیی ئەو باخە دەپرسیت؟ گوتی: ئایا دارە خورماکان بەردەگرن؟ گوتمان: ئا بەردەگرن گوتی: ئەدیی زۆری نەماوە کە بەر نەگرن، گوتی: باسی دەریاچەکەی تەبەرییەم بۆ بکەن. گوتمان مەبەستت لە چییەتی؟ گوتی: ئایا ئاوی تیایە یان نا؟ گوتمان: پڕە لە ئاو، گوتی: هاکا وشکی کرد، گوتی: باسی کانیاوەکەی شاری زوغەری شامم بۆ بکەن، گوتمان: مەبەستت لە

چییەتی، لە چەشتێکی دەپرسی؟ گوتی: ئایا کانیاوەکە ئاوەکەی وشکی نەکردووە؟ ئایا خەڵکەکەی شینایی‌و بەراو لەبەر ئاوەکەیدا دەکەن؟ گوتمان: ئا، پڕە لە ئاوو خەڵکەکەیشی بەراوی لەبەردا دەکەن، گوتی: ئەی دەنگ‌و باسی پێغەمبەری عەرەبە بێ سەوا دەکان چییەو چی نییە، چی بەسەر هات‌و بوو بەچی؟ گوتمان لە مەککە دەرچووە، ئێستا وا لە مەدینە، گوتی: پێم بڵێن ئایا عەرەبەکان شەڕیان لەگەڵیدا کرد یانا؟ گوتمان: بەڵێ، گوتی: ئەنجامەکەی چی بوو؟ گوتمان: پێغەمبەرەکەیان سەرکەوت‌و ئێستا عەرەبەکانی دەورو بەری هەموو بەگوێی دەکەن‌و وان لەژێر رکێف‌و فەرمانی ئەودا، گوتی: ئاوای لێ هات؟ گوتمان: بەڵێ، گوتی: ئەدیی ئەگەر بەگوێی بکەن ئەوە بۆ خۆیان باشە، با پێشتان بڵێم کە من کێم، من جەجالم، زۆری نەماوە کە رێگەم بدرێ بۆ دەرچوون‌و بکەومە گەڕو چەرخە[1] کاتێ پەیدا دەبم دەکەومە چەرخە، بەوڵاتدا دەسووڕێمەوە، لە ماوەی چل شەودا هەموو شارو گوندێ دەچم، مەککەو تەیبەی لێ دەرچێ، بەڵام ئەم دوو شوێنەیە لە من قەدەغەیە هەرچەند کە بمەوێ بچمە ناو یەکێ لەم دوو شارەوە،

---

[1] مامۆستارەشید بابان لێرەدا دەفەرموێ: بەتەمابێ! با هەر لە زنجیرابێ، تا چەند هەزار ساڵی تر! ئەمما لە زنجیرامانی بۆی بە فایدەترە لە خورووجی، چونکی ساڵێك‌و چەند مانگێ دەوام ئەکاو حەزرەتی مەسیح عیسا (علیه الصلاة والسلام) بە جەهەننەمی موشەررەف ئەکا. سەرم لە بلیمەتی ئەم پیاوە دەرناچێ، ئەم زمانە پاراوە کوردییە رەسەنەی لەکوێ هێناوە، ئەوە پتر لە پەنجا ساڵە بە کوردی دەخوێنم‌و دەنووسم‌و گەلێ فەرهەنگ‌و کتێب‌و سەرچاوەی کوردیم لەبەر دەستدایە کەچی هەتا دوو دێڕی کوردی دەنووسم خەباتێکی زۆری گەرەکە دەڵێی شیعری موعەللەقات دادەنێم. (وەرگێڕ - ١٩٩٢/٨/٢٤).

چەند رۆژێ لەمەوبەر، من ئەندام بووم، لەو لیژنەیەدا کە مخطوطاتەکانی مەکتەبەی شێخ محمدی خاڵمان لەبنەماڵەکەی وەرگرت، بۆ حکومەتی هەرێم، لە لیستەکەدا دەسنووسێکی تیادا بوو بەناوی (قواعد نحو وصرف)ی زمانی کوردی بە پێنووسی خوالێخۆشبوو (مامۆستا رشید بەگی بابان) بەڵام داخەکەم ئەمان دۆزییەوە، ئەمەیش بەڵگەیەکی ترە لەسەر بلیمەتی ئەو پیاوە، رەحمەت لەوکەسە زانیاری زیاتری هەیە لەبابەت ئەم کتێبی نحوو صرفی مەلای بابانەوە، بەزوویی ئەو زانیارییە بگەیەنێ بەجێگەی خۆی. (وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٩/٥)

فریشتەیێ شیری رووت بە دەستەوە بەرم لێ دەبڕێتەوەو نایەڵێ کە بڕۆمە ناوی، سەرەڕای ئەویش هەموو رێگەو بان‌و کەلەبەرێکیان قۆڵێ فریشتەی لەسەرە ئێشکی دەگرن!.

فاتیمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) داردەستەکەی دەستی ژەند لە مینبەرەکەوەو فەرمووی: ئەم خاکە تەیبەیە، ئەم خاکە تەیبەیە، ئەم خاکە تەیبەیەیە، واتە: مەدینەیە. ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): ئەوە بوو منیش لەم بابەتەوە قسەم بۆ کردن خەڵکەکەیش گوتیان: بەڵێ قسەت کرد، فەرمووی: بە راستی ئەم قسەیەی تەمیمم بەدڵ بوو، چونکە دەق رێکی ئەو قسەیەیە کە من کردم بۆ ئێوە لە بابەت جەجاڵ‌و مەدینەو مەککەوە. ئینجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): دوورگەکە لە دەریای شام یا لە دەریای یەمەندا نییە، کە دەکەونە لای خۆرئاواوە، وەك تەمیم‌و هاوڕێکانی وا تێ گەیشتوون، بەڵام بێ سوو (شەك)و گومان ئەو دوورگەیە لەلای خۆرهەڵاتەوەیە! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی ئاماژەی بۆ خۆرهەڵات کرد کە لێرەوەیە.

فاتیمە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەم فەرمایشتەم لە زاری حەزرەت خۆیەوە (دروودی خودای لەسەربێ) لەبەر کردووە. (م/د/ت) بێژەی تیرمزی (رەحمەتی خودای لێبێ) ئاوایە: تەمیمی داری بۆی گێڕامەوە کە چەن کەسێ – لە خەڵکی فەلەستین – لە دەریادا سواری گەمێ دەبن، گەمێکە گرپیان دەدا تا دەیان کا بەناو دوورگەیەکدا، لەوێ تووشی دەعبایەك دەبن، دەعباکە واخۆی گۆڕیوەو تووکی خۆی واگیف کردۆتەوە کەس نایناسێتەوە، دەڵێن: تۆ چیت؟ دەڵێ: من جەسساسم، دەڵێن: دەنگوباس چییە؟ دەڵێ: من نەهیچتان پێ دەڵێم‌و نەهیچتان لێ دەپرسم بەڵام بڕۆن بۆ ئەو پەڕی ئەم دێیە، لەوێ یەکێ هەیە، هەم دەنگوباستان لێ دەپرسێ‌و هەم دەنگوباستان پێ دەڵێ، جا کە گەیشتینە ئەوپەڕ گوندەکە پیاوێکمان دی بە زنجیرو کۆت‌و پێوەند کرابوو، گوتی: هەواڵی کانی‌و سەرچاوەکەی شاری زوغەرم پێ بڵێن، گوتمان پڕە لە ئاوو ئاوی لێ هەڵ دەقوڵێ، گوتی: هەواڵی دەریاچەکەم پێ بڵێن، گوتمان پڕە

لەئاو، ئاوی لەبەر دەڕوا، گوتی: ئەی پێم بڵێن باخە خورماکانی بەیسان – کەوا لە نێوانی فەلەستین و ئوردندا – بەردەگرن یانا؟ گوتمان ئا بەردەگرن. گوتی: ئەی پێم بڵێن پێغەمبەری ئیسلام هاتووە یانا؟ گوتمان: بەڵێ، گوتی: پێم بڵێن خەڵك و مەردوم لەگەڵی‌دا چۆنن؟ گوتمان زۆ خێرا دەچن بە دەنگیەوە، گوتی: جا لە داحا وا خۆی راپسکان و واتەنگە گرتی خەریك بوو خۆی قورتاربکا، گوتمان: ئەی تۆ چیت؟ گوتی: من جەجاڵم، کاتێ کاتم دێ دەچمە هەموو شارێ، تەیبەو مەککەی لێ دەرچێ، تەیبەش واتە: مەدینە. (دروودی خودا لەو پێغەمبەرە نازدارەبێ کە نیشتەجێی ئەوێیە)!.

## ١١١) جەجاڵ لەخۆر هەڵاتەوە سەر هەڵ دەدا وە عەشاماتێکی گەلێ زۆر شوێنی دەکەون : (يظهر الدجال من المشرق فيتبعه ناس كثيرون)

٥٦٠٦– عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَتْبَعُ الدَّجَّالَ مِنْ يَهُودِ أَصْبَهَانَ سَبْعُونَ أَلْفًا عَلَيْهِمُ الطَّيَالِسَةُ. رواه مسلم[١]:

ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەفتا هەزار کەس لە جوولەکەی ئەسپەهان دوای جەجاڵ دەکەون، هەموو تەیلەسانیان لەبەر دایە (م).

٥٦٠٧– عَنْ أَبِي بَكْرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الدَّجَّالُ يَخْرُجُ مِنْ أَرْضٍ بِالْمَشْرِقِ يُقَالُ لَهَا خُرَاسَانُ يَتْبَعُهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ الْمَجَانُّ الْمُطْرَقَةُ[٢]:

ئەبو بەکرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەجاڵ لە وڵاتێکەوە سەر هەڵدەدا، پێی دەگوترێ خۆراسان،

---

[١] مسلم. فتن: ٧٣١٨.

[٢] رواه الترمذي. بسند حسن (شرحه).

دەکەوێتە خۆرهەڵاتەوە، کەسانێ شوێنی دەکەون روویان خرپنەو گۆشتنە، دەڵێی قەڵغانی جووت بەقێ کراوەو قات لەسەر قات چەرمی تێگیراوە (ت-س/ح).

٥٦٠٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَخْرُجُ مِنْ خُرَاسَانَ رَايَاتٌ سُودٌ لاَ يَرُدُّهَا شَيْءٌ حَتَّى تُنْصَبَ بِإِيلِيَاءَ. رواهما الترمذي[٣]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ خۆشنوود بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: چەن ئالآیەکی رەش - لە خۆراسانەوە - دەردەچن، هیچ شتێ بەریان ناگرێ تا لە قودس هەڵ دەکرێن. (ت- سند غەریب)[١].

٥٦٠٩- ← (ب - ٥ ز - ٧٠ ل - ٢٤٨ ف - ٢)[٤].

## ١١٢) نیشانەکانی جەجاڵە کۆرە کە خۆی بریتییە لە گەورەترین فەرتەنە
## أوصاف المسيح الدجال الذي هو أكبر فتنة

٥٦١٠- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي النَّاسِ فَأَثْنَى عَلَى اللَّهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ ذَكَرَ الدَّجَّالَ فَقَالَ: إِنِّي أُنْذِرُكُمُوهُ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ قَدْ أَنْذَرَهُ قَوْمَهُ، لَقَدْ أَنْذَرَهُ نُوحٌ قَوْمَهُ، وَلَكِنْ سَأَقُولُ لَكُمْ فِيهِ قَوْلاً لَمْ يَقُلْهُ نَبِيٌّ لِقَوْمِهِ، تَعْلَمُونَ أَنَّهُ أَعْوَرُ وَأَنَّ اللَّهَ لَيْسَ بِأَعْوَرَ[١]:

---

[٣] رواه الترمذي. بسند غريب (شرحه).

[١] هەندێ کەس گلەیی لە بەندە دەکەن کە تاج حەدیسی زەعیفی تیادایە ئەوانە لە حاڵەکە حاڵی نین، من تەرجەمە دەکەم، نەك پەڕاو دادەنێم من گومانم نییە لەوەدا کە ئەم تاجە بەراستی تاجە، وە من بەتەوفیقی خودا لە تەرجەمەی ئەم کتێبە پیرۆزەدا حوسنی ئیختیارم بە نصیب بووە. بەخودا خۆ ئەم رەخنە گرانە ئەوەنین کە پیاو خۆی بەڕەد دانەوەیانەوە خەریك بکا، بەڵام بەهەندێ فرت‌و فێڵ موسوڵمانان تەفرە دەدەن‌و سەر لە خوێنەران دەشێوێنن. بەهەرحاڵ. سوپاس‌و ستایش بۆ خودا، خودا إصلاحی حاڵی هەموو لایێ بکا.

(وەرگێڕ)

[٤] تقدم فى مجلد خامس. تسلسل/٧٠ رقم/٢/٣٥٥٩.

[١] تجريد/٣ ل- ٣٦٩ رقم/ ١٤٤٦ = ٣٠٥٧، ٣٣٣٧، ٣٤٣٩، ٤٤٠٢، ٦١٧٥، ٧١٢٣، ٧١٢٧، ٧٤٠٧، ٧١٣١. مسلم. فتن: ٧٢٩٠، ٧٢٨٨ — ٧٢٩٣.

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێبێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **هەڵسایەوە دوانێکی بۆ مەردوومەکە دا، سوپاسێ کە شایستەی خودابێ کردی‌و ئینجا هاتە سەرباسی جەجاڵ‌و فەرمووی: من هۆشیارتان دەکەمەوەو مەترسیتان دەخەمەبەر لە جەجاڵ، هەموو پێغەمبەرەکانی تریش لە پێش مندا گەلەکانی خۆیانیان ئاگادار کردۆتەوەو مەترسی ئەویان خستوونەتە بەر، بەڵام من قسەیەکتان بۆ دەکەم لە بابەت ئەو نەحلەتییەوە، کە هیچ پێغەمبەرێ ئەم قسەیەی نەکردووە بۆ گەلی خۆی، ئەویش ئەمەیە جەجاڵ یەکڵەچاوە، دیارە کە خودای گەورە یەکڵەچاو نییە!** (ش/د/ت).

**٥٦١١- عَنْ أَنَسَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَا مِنْ نَبِيٍّ إِلاَّ وَقَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الأَعْوَرَ الْكَذَّابَ أَلاَ إِنَّهُ أَعْوَرُ وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ وَمَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ ك ف ر أي كافر يقرأه كل مسلم. رواهما الأربعة**[٢]:

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێبێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: گشت پێغەمبەرەکانی تریش گەلەکانی خۆیانیان لە بارەی فەرتەنەی جەجاڵی هەلاتبازی کوێرە مووشەوە ئاگادار کردۆتەوە، هۆشیاربن کە جەجاڵ یەکڵەچاوەو چاوەکەی تریشی زەدەدارە، دیارە کە خودای پەروەردگاری ئێوە خودایەکی پاکی پیرۆزی بێگەردی بێنەنگە، لەبەر ئەوە نە یەکڵەچاوەو نەچاوی زەدەدارە! لەناو چاوانی جەجاڵ ئەم پیتانە نووسراون: (ك ف ر) واتە: کافر، هەموو موسڵمانی دەیخوێنێتەوە!** (ش/د/ت).

**٥٦١٢- عَنِ ابْنَ عُمَرَ** (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُنِي أَطُوفُ بِالْكَعْبَةِ فَإِذَا رَجُلٌ آدَمُ سَبْطُ الشَّعَرِ أَوْ يُهْرَاقُ يَنْطِفُ رَأْسُهُ مَاءً، فَقُلْتُ مَنْ هَذَا؟ قَالُوا ابْنُ مَرْيَمَ. فَذَهَبْتُ أَلْتَفِتُ فَإِذَا رَجُلٌ أَحْمَرُ جَسِيمٌ جَعْدُ الرَّأْسِ أَعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُمْنَى، كَأَنَّ عَيْنَهُ عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ، قُلْتُ مَنْ هَذَا قَالُوا هَذَا الدَّجَّالُ. أَقْرَبُ النَّاسِ بِهِ شَبَهًا ابْنُ قَطَنٍ. وَابْنُ قَطَنٍ رَجُلٌ مِنْ بَنِي الْمُصْطَلِقِ مِنْ خُزَاعَةَ. رواه الشيخان**[٣]:

---

[٢] بخاري. فتن: ٧١٣١. مسلم. فتن: ٧٢٩٠. أبو داود. ملاحم وفتن:٤٣١٦ و٤٣١٧. ترمذي. فتن: ٢٢٤٥.

[٣] تقدم في مجلد رابع تسلسل/١١ رقم/١/٣١٧٢.

ئەم فەرموودەیە لەم شوێنەدا رابورد: ( ب – ٤ ز – ١١ ل – ٣٨٣ ف – ١). لێرەدا دەفەرموێ: لە ئیبنو عومەرەوە (رەزای خودایان لێبێ) پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ نوستبووم لە خەوما تەماشام کرد وا تەوافی کا بەتوڵڵا دەکەم، تەماشام کرد وا پیاوێکی سەوزەی گەنم رەنگ وا لەوێ قژێکی خاوی هەبوو، سەری ئاوی لێ دەتکایەوە، وتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە عیسای کوڕی مەریەمە، لەپاشا کە ئاوڕم دایەوە وا پیاوێکی سوور فلی فیلەتەنی زەبەلاحی کەتەی قژلوولی قژ کرژی یەکچاو وا لەوێ، چاوی راستی کوێرە بوو، وەك دەنکە تریێ زەقی قۆقزی لە بۆڵ دەرپەڕیو وابوو،گوتیان: ئەمە جەجاڵی جادووگەرە، لە هەموو کەسێ پتر شێوەی لە ئیبنو قەتەن دەچێ! کە پیاوێ بوو لە هۆزی خوزاعە. (شەیخان – بوخاریو موسلم – ئەم حەدیسەیان گێڕاوەتەوە).

٥٦١٣– ولمسلم: الدَّجَّالُ أَعْوَرُ الْعَيْنِ الْيُسْرَى جُفَالُ الشَّعَرِ مَعَهُ جَنَّةٌ وَنَارٌ فَنَارُهُ جَنَّةٌ وَجَنَّتُهُ نَارٌ[٤]:

حوزەیفە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەجاڵ چاوی چەپیشی زەدەدارەو کوێرە مووشە، لەشی کوڵکنو تیسکنە، بەهەشتو دۆزەخی لەگەڵە،بەڵام لە راستیدا بە پێچەوانەوەیە، چونکە دۆزەخەکەی بەهەشتەو بەهەشتەکەی دۆزەخە! (م/ رەزای خودای لێبێ).

٥٦١٤– ولأبي داود: إِنَّ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ رَجُلٌ قَصِيرٌ أَفْحَجُ جَعْدٌ أَعْوَرُ مَطْمُوسُ الْعَيْنِ لَيْسَ بِنَاتِئَةٍ وَلاَ جَحْرَاءَ فَإِنْ أُلْبِسَ عَلَيْكُمْ فَاعْلَمُوا أَنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ[٥]:

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەجاڵە کوێری هەلاتباز کابرایەکی کەتەی کورتە بنەی گەلاو گەلی قژ کرژی یەکڵەچاوی کوێرە مووشە، چاوی سافە لەگەڵ گۆشتی رووومەتیدا، بەرەنگێکی وا نەزەقەو

---

[٤] مسلم. فتن: ٧٢٩٣.

[٥] سكت عن درجته الشارح.

نەچووە بە قوولا، ئەگەر لێتان گۆڕاو شتەکەتان لێ تێکچوو بەم نیشانە روون و ئاشکرایە بیناسن، جەجاڵ یەکلەچاوە، بزانن کە خودا کوێر نییەو بە دوورەلە گشت نەنگێ. (ئەبو داود – رەحمەتی خودای لێبێ).

٥٦١٥– عَنْ الْمُغِيرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قال: مَا سَأَلَ أَحَدٌ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الدَّجَّالِ مَا سَأَلْتُهُ وَإِنَّهُ قَالَ لِي: مَا يَضُرُّكَ مِنْهُ. قُلْتُ: لأَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّ مَعَهُ جَبَلَ خُبْزٍ وَنَهَرَ مَاءٍ. قَالَ: هُوَ أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ ذَلِكَ. رواه الشيخان[٦]:

موغیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: کەس ئەوەندەی من لە بابەت جەجاڵەوە پرسیاری لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نەدەکرد، جارێکیان پێی فەرمووم: رۆڵەکەم! چییە وا لێی خەجلی؟ زیانی بۆ تۆ نابێ گوتم: بۆیە ئەوەندە دەترسم چونکە دەڵێن: کێوێ نان و چەمێ ئاوی لەگەڵە. فەرمووی (دروودی خودای لەسەربێ): با ئەوانەیشی لەگەڵ بێ، ئەو لەلای خودا سووك و ترۆیەو رادەی ئەوەی ناکەوێ کە بەهۆی ئەم جۆرە چاو بەست و چاوو ڕاوەوە سەر لە موسوڵمانی پاك بشێوێنێ، بەڵکوو ئەوە دەبێ بەهۆی بەهێز بوونی باوەڕی باوەڕدارو دەبێ بەهۆی راستکردنەوەی بەڵگەی رۆشن لەسەر ناموسوڵمانان و ناپاکان!. (ش = شەیخان = شەیخان بوخاری و موسلیم – خودایان لێ رازی بێ).

٥٦١٦– عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لأَنَا أَعْلَمُ بِمَا مَعَ الدَّجَّالِ مِنْهُ مَعَهُ نَهْرَانِ يَجْرِيَانِ أَحَدُهُمَا رَأْيَ الْعَيْنِ مَاءٌ أَبْيَضُ وَالآخَرُ رَأْيَ الْعَيْنِ نَارٌ تَأَجَّجُ فَإِمَّا أَدْرَكَنَّ أَحَدٌ فَلْيَأْتِ النَّهْرَ الَّذِي يَرَاهُ نَارًا وَلْيُغَمِّضْ ثُمَّ لْيُطَأْطِئْ رَأْسَهُ فَيَشْرَبَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مَاءٌ بَارِدٌ وَإِنَّ الدَّجَّالَ مَمْسُوحُ الْعَيْنِ عَلَيْهَا ظَفَرَةٌ غَلِيظَةٌ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ كَافِرٌ يَقْرَؤُهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ كَاتِبٍ وَغَيْرِ كَاتِبٍ[٧]:

حوزەیفە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەخودا من لە جەجاڵ خۆی باشتر دەزانم کە کاتێ هەڵ دەستێ

---

[٦] مسلم. فتن: ٧٣٠٤، ٥٥٨٩. بخارى. فتن: ٧١٢٢.

[٧] تجريد البخارى/ ٤ ل- ٦١ رقم/ ١٣٧٥ = ٣٤٥٠، ٧١٣٠. مسلم. فتن: ٧٢٩٤.

چی پێیە، دوو رووباری لەتەکە، خۆی بۆ هەر کوێ بچێ ئەو دوو روبارە لەگەڵیا دەڕۆن، یەکێکیان لەبەر چاو ئاوێکی روونەو ئەوی تریشیان لەبەرچاو ئاگرێکی سووری بڵێسەدارە، هەر کەسێ تووشی جەجاڵ بوو بابچێتە سەر ئەو رووبارەیان کە بە ئاگری دەزانێ‌و با چاوی خۆی بقووچێنێ‌و سەری خۆی دانەوێنێ بە بێ ترس‌و بیم ئاوی لێ بخواتەوە، دەبینێ کە ئەوەیان کە ئەو بە ئاگری دەبینێ ئاوێکی ساردی فێنکە، لە راستیدا جەجاڵ کە لافی خوایەتی لێ دەدا داواکەی درۆیەکی ئاشکرایە، چونکە خودا دەبێ بێگەردو بێنەنگ بێ، بەڵام جەجاڵ چاوێکی سافۆ لووسە وەك بەری دەست، تانەیەکی ئەستووری وەك تەختە پەردە وا لەسەر چاوی، لە نێوانی هەردوو چاوی نووسراوە: (کافر) هەموو موسوڵمانێ دەیخوێنێتەوە، چ خوێنەواربێ، چ نەخوێنەوار بێ دەیخوێنێتەوە! (ش/د).

٥٦١٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الدَّجَّالَ يَخْرُجُ وَإِنَّ مَعَهُ مَاءً وَنَارًا فَأَمَّا الَّذِي يَرَاهُ النَّاسُ مَاءً فَنَارٌ تُحْرِقُ وَأَمَّا الَّذِي يَرَاهُ النَّاسُ نَارًا فَمَاءٌ بَارِدٌ عَذْبٌ فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَلْيَقَعْ فِي الَّذِي يَرَاهُ نَارًا فَإِنَّهُ مَاءٌ عَذْبٌ طَيِّبٌ. رواهما الثلاثة[٨]:

دیسان لەوەوە لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: (دروودی خودای لەسەربێ) جەجاڵ کاتێ هەڵ دەستێ ئاوو ئاگری لەگەڵە، وەلێ ئەوەی کە خەڵك بە ئاوی دەزانن ئەوە ئاگرێکی سووری سووتێنەرە، وە ئەوەی کە خەڵك بە ئاگری دەزانن ئەوە ئاوێکی ساردی فێنکی شیرینی زوڵاڵە، دەی هەرکامێ لە ئێوە – واتە: لەگەڵی ئیسلام – فریای ئەو رۆژە کەوت با خۆی بخاتە ناو ئەوەیانەوە کە ئەو بە ئاگری دەزانێ چونکە ئەوەیان ئاوێکی شیرین‌و زوڵاڵ‌و خۆشە! (ش/د).

٥٦١٨- عَنْ أَبِي عُبَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ:. وَصَفَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الدَّجَّالَ ثُمَ قَالَ: لَعَلَّهُ سَيُدْرِكُهُ مَنْ قَدْ رَآنِي وَسَمِعَ كَلَامِي. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ قُلُوبُنَا يَوْمَئِذٍ أَمِثْلُهَا الْيَوْمَ؟ قَالَ: أَوْ خَيْرٌ.رواه أبو داود والترمذي[٩]:

---

[٨] تقدم تخريجه بمثل الديث الذي قبله.

ئەبو عوبەیدە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەربیٚ) باسی نیشانەکانی جەجالی بۆ کردین، لە دوایدا فەرمووی: دەگونجیٚ بازیٚ کەس لەوانەی کە من دەبینن (یا خود قسەکانی من دەبیستن) لە ئایندەدا بە جەجالدا بگەن! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو رۆژە دلمان چۆن دەبیٚ، ئایا وەك ئەمرۆمان وا دەبیٚ‌و پڕ لە نووری ئیمان دەبیٚ یانا؟ فەرمووی: (درووودی خودای لەسەربیٚ) ئومێد دەکەم کە گەلیٚ باشتر بیٚ لە ئێستا! (د/ت).

٥٦١٩- وللترمذي ومسلم: تَعْلَمُونَ أَنَّهُ لَنْ يَرَى أَحَدٌ مِنكُمْ رَبَّهُ حَتَّى يَمُوتَ وَإِنَّ الدَّجَّالَ مَكْتُوبٌ بَيْنَ عَيْنَيْهِ ك ف ر يَقْرَأُهُ مَنْ كَرِهَ عَمَلَهُ[١٠]:

حەزرەت (درووودی خودای گەورەی لەسەربیٚ) دەفەرمویٚ: خۆتان زۆر باش دەزانن کە هیچ کەسیٚ لە ئێوە تا نەمریٚ بەچاوی سەر خودای خۆی نابینیٚ، بەلام جەجالٚ کە بە درۆ لاف‌و گەزافی خودایەتی لیٚ دەدا زۆر باش دەبینریٚ، بە ئاشکرایش لە نێوانی هەر دوو چاوی نووسراوە: (کافر) ئەو کەسەی کە حەز لە کرداری نەکا دەیخوێنێتەوە! (ت/م).

٥٦٢٠- ولأبي داود: مَنْ سَمِعَ بِالدَّجَّالِ فَلْيَنْأَ عَنْهُ فَوَاللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَأْتِيهِ وَهُوَ يَحْسِبُ أَنَّهُ مُؤْمِنٌ فَيَتَّبِعُهُ مِمَّا يُبْعَثُ بِهِ مِنَ الشُّبُهَاتِ أَوْ لِمَا يُبْعَثُ بِهِ مِنَ الشُّبُهَاتِ[١١]:

حەزرەت (درووودی خودای لەسەربیٚ) دەفەرمویٚ: ئەوەی بیستی کەوا جەجالٚ هەلساوەو ئەوەتا لە فیسارە شوێن با خۆی لیٚ دوور بخاتەوەو نەچیٚ بۆ لای، چونکە بەخودا پیاوی وا هەیە کە دەچیٚ بۆ لای خۆی بە خاوەن باوەڕو ئیمان دەزانیٚ، بەلام کە دەگاتە لای شوێنی دەکەویٚ، بەهۆی ئەو هەموو چاو بەست‌و جادوو تەلەسمانەی کە پێی دراون (ئەبوداوود).

---

[٩] سكت عن درجته الشارح.

[١٠] مسلم. فتن: ٧٢٩١.

[١١] سكت عن درجته الشارح.

٥٦٢١- عَنْ أَبِي الدَّهْمَاءِ وَأَبِي قَتَادَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) قَالُوا: كُنَّا نَمُرُّ عَلَى هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ فَنَأْتِي عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ فَقَالَ ذَاتَ يَوْمٍ إِنَّكُمْ لَتُجَاوِزُونِي إِلَى رِجَالٍ مَا كَانُوا بِأَحْضَرَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنِّي وَلاَ أَعْلَمَ بِحَدِيثِهِ مِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا بَيْنَ خَلْقِ آدَمَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ خَلْقٌ أَكْبَرُ مِنَ الدَّجَّالِ. رواه مسلم[١٢]:

کۆمەڵێ لە تابیعین کە ئەبو دەهماو ئەبو قەتادەیان تیادا بوو (رەزای خودایان لێبێ) فەرموویان: بەسەر هیشامی کوڕی عامیردا تێ دەپەڕینو دەچووین بۆ لای عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودایان لێبێ) ڕۆژێ لە ڕۆژان هیشام فەرمووی: ئێوە بەسەرمندا ڕەت دەبنو دەچن بۆلای بازێ پیاو کە نە لە من زیاتر لە خزمەتی حەزرەتدا بوونو نە لە منیش زیاتر ئاگایان لە فەرموودەی ئەو زاتەیە (دروودی خودای لەسەربێ) لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): لەو حەلەوە کە خودا ئادەمی دروست کردووە تا ئەو دەمە کە قیامەت هەڵ دەستێ فەرتەنەو ئاژاوەی گەورەی وەك جەجاڵ نەبووەو نەدەبێ! (موسلیم – پڕ ئارامگای لە نووربێ).

٥٦٢٢- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَمْكُثُ أَبُو الدَّجَّالِ وَأُمُّهُ ثَلاَثِينَ عَامًا لاَ يُولَدُ لَهُمَا وَلَدٌ ثُمَّ يُولَدُ لَهُمَا غُلاَمٌ أَعْوَرُ أَضَرُّ شَيْءٍ وَأَقَلُّهُ مَنْفَعَةً تَنَامُ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ. ثُمَّ نَعَتَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبَوَيْهِ فَقَالَ: أَبُوهُ طِوَالٌ ضَرْبُ اللَّحْمِ كَأَنَّ أَنْفَهُ مِنْقَارٌ وَأُمُّهُ امْرَأَةٌ فِرْضَاخِيَّةٌ طَوِيلَةُ الْيَدَيْنِ، فَقَالَ: أَبُو بَكْرَةَ فَسَمِعْنَا بِمَوْلُودٍ فِي الْيَهُودِ بِالْمَدِينَةِ فَذَهَبْتُ أَنَا وَالزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَّامِ حَتَّى دَخَلْنَا عَلَى أَبَوَيْهِ فَإِذَا نَعْتُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيهِمَا فَقُلْنَا هَلْ لَكُمَا وَلَدٌ فَقَالاَ مَكَثْنَا ثَلاَثِينَ عَامًا لاَ يُولَدُ لَنَا وَلَدٌ ثُمَّ وُلِدَ لَنَا غُلاَمٌ أَعْوَرُ أَضَرُّ شَيْءٍ وَأَقَلُّهُ مَنْفَعَةً تَنَامُ عَيْنَاهُ وَلاَ يَنَامُ قَلْبُهُ. قَالَ فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِمَا فَإِذَا هُوَ مُنْجَدِلٌ فِي الشَّمْسِ فِي قَطِيفَةٍ

[١٢] مسلم. فتن: ٧٣٢١.

لَهُ وَلَهُ هَمْهَمَةٌ فَكَشَفَ عَنْ رَأْسِهِ فَقَالَ مَا قُلْتُمَا قُلْنَا وَهَلْ سَمِعْتَ مَا قُلْنَا قَالَ نَعَمْ تَنَامُ عَيْنَايَ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي. رواه الترمذي. نسأل الله السلامة آمين[١٣].

ئەبو بەکرە (خوشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: باوك‌و دایکی جەجاڵ سیی ساڵ دەمێننەوە، منداڵیان نابێ، لە پاشا کوڕێکی یەکڵەچاویان دەبێ، تابڵێی بەزیان‌و بێ سوودو بێ فەڕ دەبێ، بەچاو دەنوێ وەلێ بە دڵ وریایە. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نیشانەی باوك‌و دایکی ئەوی بۆ هەڵداین فەرمووی: باوکیشی قووچێکی تێکسمڕاوە، لووتی لە بەرزی‌و درێژیی دەڵێی دەنووکە، دایکیشی کەتەیەکی دوو دەست درێژە. ئەبو بەکرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: بیستمان کە لە مەدینە منداڵێکی جوولەکەی لەم چەشنەیە هەیە، لەبەر ئەوە من‌و زوبەیری کوڕی عەوام چووینە لای باوك‌و دایکەکەی، کە تەماشامان کرد وەك پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) نیشانەیانی هەڵدا هەردووکیان دەق ئاوا بوون، گوتمان: ئایا منداڵتان هەیە؟ گوتیان: سیی ساڵی رەبەق ماینەوە منداڵمان نەدەبوو، لە پاشا کوڕێکمان بوو، تا بڵێی زیانبەخش‌و بێ فەڕ، بەچاو دەنوێ کەچی بە دڵ بەخەبەرە، فەرمووی: کە لەلای ئەوان دەرچووین کوڕەکەمان دی لەبەر هەتاوەکە تووڕ درابوو پارچەیێ قەیفەی لەبەردابوو، لەبەر خۆیەوە ورتە ورتی بوو، ئەوجا سەری خۆی هەڵدایەوەو گوتی: ئەوە گوتتان چی؟ گوتمان: بۆ گوێت لە قسەکانمان بوو، گوتی: ئا، چاوەکانم دەخەون وەلێ دڵم ناخەوێ (ت-س/ح).

### ١١٣) جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو شارێ، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ
### الدجال يدخل كل بلد إلاّ مكة والمدينة

٥٦٢٣- ← (ب - ٢ ز - ١٤١ ل - ٢٨٢ ف - ٢ + ٣)[١].

---

(١٣) في ذكر ابن صياد بسند حسن (شرحه).

(١) تقدم فی مجلد ثانی. تسلسل/١٤١ رقم/١٧٣٨/٢ و ١٧٣٩/٣.

٥٦٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا حَدِيثًا طَوِيلاً عَنِ الدَّجَّالِ، فَكَانَ فِيمَا يُحَدِّثُنَا بِهِ أَنَّهُ قَالَ: يَأْتِي الدَّجَّالُ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ، فَيَنْتَهِي إِلَى بَعْضِ السِّبَاخِ الَّتِي تَلِي الْمَدِينَةَ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ وَهُوَ خَيْرُ النَّاسِ أَوْ مِنْ خِيَارِ النَّاسِ، فَيَقُولُ لَهُ: أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ الَّذِي حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدِيثَهُ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ: أَرَأَيْتُمْ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، هَلْ تَشُكُّونَ فِي الأَمْرِ فَيَقُولُونَ لاَ.قَالَ: فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يُحْيِيهِ فَيَقُولُ حِينَ يُحْيِيهِ وَاللّٰهِ مَا كُنْتُ فِيكَ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّي الآنَ. قال: فَيُرِيدُ الدَّجَّالُ أَنْ يَقْتُلَهُ فَلاَ يُسَلَّطُ عَلَيْهِ. رواهما الشيخان[2]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە درێژیی باسی جەجاڵی بۆ کردین، لەناو باسەکەدا فەرمووی: جەجاڵ کە دێ قەدەغە کراوە لێی کە لە دەربەندەکەی مەدینەوە رەت بێ‌و بچێتە ناو شاری مەدینەوە، جادێ کە بێ بۆ مەدینە، دێ تا دەگاتە لای شۆرەکاتەکانی دەرەوەی مەدینە، لەوێ بارو بنەی لێ دەخا، جا ئەو رۆژە پیاوێ بۆی دەردەچێ، ئەو پیاوە باشترین کەسە لەو رۆژەدا. یا فەرمووی: لە چاترینی ئادەمیزادی ئەو رۆژەیە، پێی دەڵێ: گەواهو شایەتی دەدەم کە تۆ ئەو جەجاڵەی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) باسی ئەوی پێکوتوین، جا جەجاڵ دەڵێ: ئایا پێم بڵێن ئەگەر ئەم پیاوە بکوژم‌و لە پاشا زیندووی بکەمەوە ئیتر هیچ سوودو گومانێکتان دەمێنێ لە کاروباری مندا، وە ئەوکاتە زۆر باش دەیسەلمێنن کە من خودای ئێوەم؟ دەڵێن: گومانمان نامێنێ‌و دەیسەلمێنین. فەرمووی: جا دەیکوژێ‌و لەپاشا زیندووشی دەکاتەوە، پیاوەکەیش کە جەجاڵ زیندووی دەکاتەوە پێی دەڵێ: بەخودا هەرگیز وەك ئێستا بە تەواوی لێم روون نەبووە کە تۆ ئەوی، جا جاری دووهەم دەیەوێ بیکوژێتەوە بەڵام لە خوداوە دەستەڵاتی ناشکێ بەسەریدا (ش).

---

[2] مسلم. فتن: ٧٣٠٣.

٥٦٢٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخْرُجُ الدَّجَّالُ فَيَتَوَجَّهُ قِبَلَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فَتَلْقَاهُ الْمَسَالِحُ مَسَالِحُ الدَّجَّالِ فَيَقُولُونَ لَهُ: أَيْنَ تَعْمِدُ فَيَقُولُ أَعْمِدُ إِلَى هَذَا الَّذِي خَرَجَ فَيَقُولُونَ لَهُ: أَوَمَا تُؤْمِنُ بِرَبِّنَا؟ فَيَقُولُ: مَا بِرَبِّنَا خَفَاءٌ. فَيَقُولُونَ اقْتُلُوهُ.فَيَقُولُ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ أَلَيْسَ قَدْ نَهَاكُمْ رَبُّكُمْ أَنْ تَقْتُلُوا أَحَدًا دُونَهُ، قَالَ: فَيَنْطَلِقُونَ بِهِ إِلَى الدَّجَّالِ فَإِذَا رَآهُ الْمُؤْمِنُ قَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَذَا الدَّجَّالُ الَّذِي ذَكَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَيَأْمُرُ الدَّجَّالُ بِهِ فَيُشَبَّحُ فَيَقُولُ خُذُوهُ وَشُجُّوهُ. فَيُوسَعُ ظَهْرُهُ وَبَطْنُهُ ضَرْبًا فَيَقُولُ: أَوَمَا تُؤْمِنُ بِي قَالَ فَيَقُولُ أَنْتَ الْمَسِيحُ الْكَذَّابُ قَالَ: فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُؤْشَرُ بِالْمِئْشَارِ مِنْ مَفْرِقِهِ حَتَّى يُفَرَّقَ بَيْنَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ يَمْشِي الدَّجَّالُ بَيْنَ الْقِطْعَتَيْنِ ثُمَّ يَقُولُ لَهُ قُمْ. فَيَسْتَوِي قَائِمًا ثُمَّ يَقُولُ لَهُ: أَتُؤْمِنُ بِي فَيَقُولُ مَا ازْدَدْتُ فِيكَ إِلاَّ بَصِيرَةً، ثُمَّ يَقُولُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهُ لاَ يَفْعَلُ بَعْدِي بِأَحَدٍ مِنَ النَّاسِ قَالَ: فَيَأْخُذُهُ الدَّجَّالُ لِيَذْبَحَهُ فَيُجْعَلَ مَا بَيْنَ رَقَبَتِهِ إِلَى تَرْقُوَتِهِ نُحَاسًا فَلاَ يَسْتَطِيعُ إِلَيْهِ سَبِيلاً، قَالَ: فَيَأْخُذُ بِيَدَيْهِ وَرِجْلَيْهِ فَيَقْذِفُ بِهِ فَيَحْسِبُ النَّاسُ أَنَّمَا قَذَفَهُ إِلَى النَّارِ وَإِنَّمَا أُلْقِيَ فِي الْجَنَّةِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَذَا أَعْظَمُ النَّاسِ شَهَادَةً عِنْدَ رَبِّ الْعَالَمِينَ.
رواه مسلم والله أعلم[٣]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ جەجاڵ هەڵ دەستێ، پیاوێ (لە ئیمانداره‌کان) رووەو لای ئەو دەکەوێتەرێ، چەتەو چەکدارەکانی جەجاڵ بەری لێ دەبڕنەوەو پێی دەڵێن: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ دەفەرموێ: دەچم بۆ لای ئەم کابرایەی کە پەیدا بووە، دەڵێن: دیارە کەوا دەڵێی بڕوا ناکەی بە خودای ئێمە؟ دەفەرموێ: خودای ئێمە دیارو ئاشکراو نومایانەو شاراوەو پەنهان نییە دەڵێن: ئادەی بیکوژن، لەناو خۆیاندا دەڵێن: نابێ چونکە خوداکەمان رێگەی نەداوین کەس بەبێ فەرمانی خۆی بکوژین. فەرمووی: ئەوجا دەیبەن بۆ لای جەجاڵ، کە موسوڵمانەکە چاوی پێی دەکەوێ دەفەرموێ: ئەی خەڵکینە! ئەمە ئەو جەجاڵەیە کە

---

[٣] تجريد البخاى/٢ ل-٢٥٩ رقم/٨٦٧ =١٨٨٢،٧١٣٢ فتح الباري شرح صحيح البخاى.مسلم.فتن: ٧٣٠١.

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) باسی ئەوی بۆ کردووین. فەرمووی: ئەنجا جەجاڵ دەستوور دەدا پیاوە موسوڵمانەکە لەسەر دەم رادەخەن و چوار مێخەی دەکێشن و ئنجا دەڵێ: ئادەی دارگارییەکی باشی بکەن، ئیتر دارکارییەکی زۆر باشی بە روپشتی دەکەن.

جەجاڵ دەڵێ: ئایا هێشتا باوەڕم پێ ناهێنی؟ فەرمووی: ئەویش دەفەرموێ: تۆ جەجاڵە کۆری هەلاتبازی گەڕۆکی. فەرمووی: ئیتر جەجاڵ دەستور دەدا لە تەوقە سەریەوە بە مشار وەك تەختەدار دایدەهێنن هەتا نافەکی، جا جەجاڵ خۆی بەنێوانی هەردوو کەرتەکەیدا دەڕوا، لەپاشا پێی دەڵێ: هەڵسە! ئەویش راست دەبێتەوە سەرپێ، جا پێی دەڵێ: ها باوەڕم پێ دەهێنی؟ ئەویش دەڵێ: ئەوەندەی تر بۆم روون بۆوە کە تۆ چیت و چی نیت، ئەوجا دەڵێ: ئەی خەڵکینە! ئیتر لەپاش من ناتوانێ کەسی تر وای بکا.. فەرمووی: ئەوجا جەجاڵ دەیگرێ تا سەری ببڕێ بەڵام بە فەرمانی خودا بەربینی لەغەو غەوەیەوە هەتا چەڵەمەی سینگی دەبێ بەیەك پارچە مس! ئیتر رێگەی ئەوەی نابێ! فەرمووی: ئەوسا هەر چوار پەلی دەگرێ و فڕەی دەدا، لە خەڵك وایە کە ئەوە فڕەی داوەتە ناو دۆزەخەوە، بەڵام لە راستیدا دەبرێ بۆ ناو بەهەشت. پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەلای خودای پەروەردگاری هەر دوو جیهان گەورەترین شەهید ئەم پیاوەیە. (مسلیم - رەزای خودای لێبێ). سبحان الله! سەرنج بدەن تەنانەت جەجاڵ - بە جەجاڵی خۆی - قایل نییە کە کەسێ لە دەستوپێوەندەکەی خۆی بەبێ ئاگاداریی خۆێ کەسێ تر لە نەیارەکانی بکوژێ! کەچی ئێستا لە هەندێ وڵات کوشتن و برین ئەوەندە ئاسان بووە وای لێ هاتووە هەموو کوێخا گوندێ، یا گزیرێ، یا کاربەدەسێ، بەبێ پرس و راکردن بە کەس مافی ئەوەی پێ دراوە کە خەڵکی بێ تاوان بە بڕوبیانووی پڕو پووچ لە سێدارە بدا کەسێکی بە ئینصاف چاوێ بە نەخشەی جیهانی ئیسلامی ئەمڕۆدا بخشێنێ دەبینێ بەناو موسوڵمانەکان بەگشت بڕوبیانویێ ملی موسوڵمانە راستەقینەکان دەکەن بە پەتەوە!

سبحان الله! لەئێمە وابوو کە هەر صەدام‌و رژێمەکەی ئەو وایە، بەڵام ئێستا دەرکەوت کە رژێم هەر رژێمە، هەمیشە دەستدار دەیباو بێ دەست تەماشا دەکات. (وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٥/٢٨)

### ١١٤) جەجاڵ چل رۆژ دەمێنێتەوە لە وڵاتدا، لەپاشا عیسا (درودی خوای لەسەر) لە ئاسمان دێتە خوارێ‌و لەشام دەیکوژێ

### يمكث الدجال فى الأرض أربعين يوما ثم ينزل عيسى ﷺ فيقتله بالشام

٥٦٢٦- عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الدَّجَّالَ ذَاتَ غَدَاةٍ فَخَفَّضَ فِيهِ وَرَفَّعَ حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ فَلَمَّا رُحْنَا إِلَيْهِ عَرَفَ ذَلِكَ فِينَا فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ. قُلْنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ ذَكَرْتَ الدَّجَّالَ غَدَاةً فَخَفَّضْتَ فِيهِ وَرَفَّعْتَ حَتَّى ظَنَنَّاهُ فِي طَائِفَةِ النَّخْلِ. فَقَالَ: غَيْرُ الدَّجَّالِ أَخْوَفُنِي عَلَيْكُمْ إِنْ يَخْرُجْ وَأَنَا فِيكُمْ فَأَنَا حَجِيجُهُ دُونَكُمْ وَإِنْ يَخْرُجْ وَلَسْتُ فِيكُمْ فَامْرُؤٌ حَجِيجُ نَفْسِهِ وَاللّٰهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ إِنَّهُ شَابٌّ قَطَطٌ عَيْنُهُ طَافِئَةٌ كَأَنِّي أُشَبِّهُهُ بِعَبْدِ الْعُزَّى بْنِ قَطَنٍ فَمَنْ أَدْرَكَهُ مِنْكُمْ فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الْكَهْفِ إِنَّهُ خَارِجٌ خَلَّةً بَيْنَ الشَّأْمِ وَالْعِرَاقِ فَعَاثَ يَمِينًا وَعَاثَ شِمَالاً يَا عِبَادَ اللّٰهِ فَاثْبُتُوا. قُلْنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَمَا لَبْثُهُ فِي الأَرْضِ قَالَ: أَرْبَعُونَ يَوْمًا يَوْمٌ كَسَنَةٍ وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسَائِرُ أَيَّامِهِ كَأَيَّامِكُمْ. قُلْنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِى كَسَنَةٍ أَتَكْفِينَا فِيهِ صَلاَةُ يَوْمٍ قَالَ: لاَ اقْدُرُوا لَهُ قَدْرَهُ. قُلْنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ وَمَا إِسْرَاعُهُ فِي الأَرْضِ قَالَ: كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الرِّيحُ فَيَأْتِي عَلَى الْقَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ فَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَجِيبُونَ لَهُ فَيَأْمُرُ السَّمَاءَ فَتُمْطِرُ وَالأَرْضَ فَتُنْبِتُ فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُرًا وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا وَأَمَدَّهُ خَوَاصِرَ ثُمَّ يَأْتِي الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَرُدُّونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ فَيُصْبِحُونَ مُمْحِلِينَ لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ مِنْ أَمْوَالِهِمْ وَيَمُرُّ بِالْخَرِبَةِ فَيَقُولُ لَهَا أَخْرِجِي كُنُوزَكِ. فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النَّحْلِ ثُمَّ يَدْعُو رَجُلاً مُمْتَلِئًا شَبَابًا فَيَضْرِبُهُ بِالسَّيْفِ فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الْغَرَضِ ثُمَّ يَدْعُوهُ فَيُقْبِلُ وَيَتَهَلَّلُ وَجْهُهُ يَضْحَكُ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللّٰهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ (عليه السلام) فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنَارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِيَّ دِمَشْقَ بَيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ وَاضِعًا كَفَّيْهِ

عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ وَإِذَا رَفَعَهُ تَحَدَّرَ مِنْهُ جُمَانٌ كَاللُّؤْلُؤِ فَلاَ يَحِلُّ لِكَافِرٍ يَجِدُ رِيحَ نَفَسِهِ إِلاَّ مَاتَ وَنَفَسُهُ يَنْتَهِي حَيْثُ يَنْتَهِي طَرْفُهُ فَيَطْلُبُهُ حَتَّى يُدْرِكَهُ بِبَابِ لُدٍّ فَيَقْتُلُهُ ثُمَّ يَأْتِي عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ قَوْمٌ قَدْ عَصَمَهُمُ اللَّهُ مِنْهُ فَيَمْسَحُ عَنْ وُجُوهِهِمْ وَيُحَدِّثُهُمْ بِدَرَجَاتِهِمْ فِي الْجَنَّةِ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ أَوْحَى اللَّهُ إِلَى عِيسَى إِنِّي قَدْ أَخْرَجْتُ عِبَادًا لِي لاَ يَدَانِ لأَحَدٍ بِقِتَالِهِمْ فَحَرِّزْ عِبَادِي إِلَى الطُّورِ. وَيَبْعَثُ اللَّهُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَهُمْ مِنْ كُلِّ حَدَبٍ يَنْسِلُونَ فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ. وَيُحْصَرُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ حَتَّى يَكُونَ رَأْسُ الثَّوْرِ لأَحَدِهِمْ خَيْرًا مِنْ مِائَةِ دِينَارٍ لأَحَدِكُمُ الْيَوْمَ فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ فَيُرْسِلُ اللَّهُ عَلَيْهِمُ النَّغَفَ فِي رِقَابِهِمْ فَيُصْبِحُونَ فَرْسَى كَمَوْتِ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ يَهْبِطُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى الأَرْضِ فَلاَ يَجِدُونَ فِي الأَرْضِ مَوْضِعَ شِبْرٍ إِلاَّ مَلأَهُ زَهَمُهُمْ وَنَتْنُهُمْ فَيَرْغَبُ نَبِيُّ اللَّهِ عِيسَى وَأَصْحَابُهُ إِلَى اللَّهِ فَيُرْسِلُ اللَّهُ طَيْرًا كَأَعْنَاقِ الْبُخْتِ فَتَحْمِلُهُمْ فَتَطْرَحُهُمْ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ مَطَرًا لاَ يَكُنُّ مِنْهُ بَيْتُ مَدَرٍ وَلاَ وَبَرٍ فَيَغْسِلُ الأَرْضَ حَتَّى يَتْرُكَهَا كَالزَّلَفَةِ ثُمَّ يُقَالُ لِلأَرْضِ أَنْبِتِي ثَمَرَتَكِ وَرُدِّي بَرَكَتَكِ. فَيَوْمَئِذٍ تَأْكُلُ الْعِصَابَةُ مِنَ الرُّمَّانَةِ وَيَسْتَظِلُّونَ بِقِحْفِهَا وَيُبَارَكُ فِي الرِّسْلِ حَتَّى أَنَّ اللِّقْحَةَ مِنَ الإِبِلِ لَتَكْفِي الْفِئَامَ مِنَ النَّاسِ وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْبَقَرِ لَتَكْفِي الْقَبِيلَةَ مِنَ النَّاسِ وَاللِّقْحَةَ مِنَ الْغَنَمِ لَتَكْفِي الْفَخِذَ مِنَ النَّاسِ فَبَيْنَمَا هُمْ كَذَلِكَ إِذْ بَعَثَ اللَّهُ رِيحًا طَيِّبَةً فَتَأْخُذُهُمْ تَحْتَ آبَاطِهِمْ فَتَقْبِضُ رُوحَ كُلِّ مُؤْمِنٍ وَكُلِّ مُسْلِمٍ وَيَبْقَى شِرَارُ النَّاسِ يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ. رواه مسلم والترمذي وأبو داود[١]:

**نەوواسی کوڕی سەممان** (ڕەزای خودای لێبێ) **فەرمووی: سەر لەبەیانییەك پێغەمبەر** (درودو سڵاوو صەڵاتو سەلامی خودای لەسەربێ) **بە دوورو درێژی باسی چەتوونیو هارو هاجیو سووكو ترۆیی جەجاڵی بۆ كردین، تەنانەت وامانزانی كە ئێستا وا لەناو باخە خورماكاندا، جا سەر لەئێوارێ كە**

---

[١] مسلم. فتن: ٧٢٩٩. ترمذي. فتن: ٢٢٤٠.

چووینەوە بۆ خزمەتی هەستی کرد کە پەستی ئەو باس‌و خواسەین، فەرمووی: ئەوە چیتانە کەوا پەست‌و خەمبارن؟ عەرزیمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ سەر لەبەیانی بە دوورو درێژی باسی سووك‌و تڕۆیی‌و هارو هاجی‌و چەتوونی جەجاڵت بۆ کردین، تەنانەت لە ئێمە وابوو کە هاتووەو وا لەناو باخە خورماکاندا، فەرمووی: من لەشتێ تر دەترسم کە زیانی هەبێ بۆ ئێوە هەتا لە جەجاڵ[1] ئەگەر جەجاڵ هەڵسا وە خۆم مابووم لەناوتانا ئەوا من لە جیاتی ئێوە چاری دەکەم، ئەگەر لەپاش منیش هەڵسا ئەوا هەر کەسە چارە سەری خۆی بکا، سەرەڕای ئەمەیشە خودا بۆ خۆی لەپاش من سەرەوکاریی هەموو موسوڵمانێ لە جیاتی من دەکا، بزانن کە جەجاڵ لاوێکی موو کرژی سەر ئاڵۆسکاوییە، چاوێکی تروسکەناکا، بەلای منەوە شێوەی لە عەبدولعوززای کوڕی قەتەن دەچێ، جا هەرکەسێ لە ئێوە تووشی ئەو بوو با دە ئایەتەکەی سەرەتای سوورەتی کەهفی بەسەردا بخوێنێ، لە ڕێگەیەکەوە کە دەکەوێتە میانی شام‌و عێراقەوە جەجاڵ پەیدا دەبێ‌و دێ بۆ گیانی ئێوە گەل، وە بەراست‌و بە چەپا ئاژاوە دەنێتەوەو خراپە بەرپا دەکا، ئەی بەندەکانی خودا! خۆ ڕاگرن لەبەر باری خودادا گوتمان: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! چەندە لە وڵاتدا دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: چل ڕۆژ، ڕۆژێکی بەقەد ساڵێکە، ڕۆژێکی بەقەد مانگێکە، ڕۆژێکی بەقەد هەفتەیەکە، ڕۆژەکانی تریشی وەك ئەم ڕۆژە ئاساییانەی ئێستای ئێوە گەل وان، ئاوا ڕۆژێکی ئاساییْن گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو ڕۆژەی کە ساڵێکە یا ئەو ڕۆژەی کە بەقەی مانگێکە یا بەقەد هەفتەیەکە ئایا نوێژی یەك ڕۆژی ئاسایی بە سی دەکا یانا؟ فەرمووی: نەء، بەڵکوو دەبێ بە

---

[1] يقول الشيخ رشيد بيك البانى (رحمه الله) معلقا على مدة بَقاء الدَّجَّالِ وَمَكْثِهِ فِى الأرض: (سنة وأربع وسبعون يوما، ولا شك أن ضرره أقل من الرؤساء الظالمبن الضالين المضلين، كما قاله عليه الصلاة والسلام. اللهم احفظنا من شرورهم انتهى). أقول: أعوذ بالله من الائمة المضلين. (المترجم)

ئەندازەی خۆی ئەندازەی بگرن‌و گشت بیست‌و چوار سەعاتێ پێنج نوێژی ئاسایی تیا بکەن[(١)] وە هەر نوێژەی لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا بیکەن گوتمان: قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! خێراییی‌و سستی لە کاتی گەڕانی دا بەناو وڵاتدا چۆنە؟ فەرمووی: زۆر خێرایە، وەك بارانی دەم با وایە، دەچێتە سەر هەندێ هۆزو بانگیان لێ دەکا کە ئیمانی پێ بهێنن، ئەوانیش باوەڕی پێدەکەن‌و بەگوێی دەکەن، ئەویش فەرمان بە ئاسمان دەکا باران دەبارێنێ، وە بە زەوی دەڵێ شینایی دەڕوێنێ، جا ئاژاڵ‌و ماڵاتیان تابڵێی بە شەوق‌و بەشیرو تیرو تەسەل دەبێ، بەڵام دەچێتە سەر هەندێ هۆزی تر، داوایان لێ دەکا کە بە خودای خۆیانی بزانن، ئەوانیش بەرپەرچی دەدەنەوە، ئەویش بە جێیان دێڵێ، کەچی لە پاش ئەو دەکەونە سەخڵەتی‌و قات‌و قڕی‌و گرانییەکی واوە کە هیچ ماڵ‌و سامانیان بە دەستەوە نامێنێ. جەجاڵ بەلای کاولەدا رادەبووری‌و پێی دەڵێ: ئەی کەلاوە کۆن! هەرچی گەنج‌و خەزنەیەك وا لەناوتا یەقی کەرەوەو فڕەی دە دەرەوە ئەویش وا دەکاو، ئیتر هەرچی خەزنەو گەنجی ناو ئەو کەلاوەیە هەیە هەمووی وەك پوورەی هەنگ چۆن

---

[(١)] بەزەینم نوێژی هەینی‌و جەژنەکان‌و وەترو چێشتەناوو شەونوێژو سوننەتە دامەزراوەکانی نوێژە فەرزەکان‌و باقی مەندەی نوێژە سوننەتەکانی تریش هەروایە، وەك تەراویح‌و صەلات‌و تەسبیح، هەروا رۆژووی رەمەزان‌و رۆژووی سوننەت‌و ناوەدان کردنەوەی شەوی لەیلەتولقەدر، هەروا حەج‌و زەکات‌و سەرفیترە، بە کورتی هەموو فەرزو سوننەتێ لە شەریعەتدا ئەندازەی خۆی بۆ دەگیرێ‌و دەکرێ هەتا ژنی بێنوێژی بێ وەخت (موستەحازە) ئەندازە بۆ کاتی پاکی‌و کاتی بێنوێژیی خۆی رادەگرێ. وەلێ ئەم سێ رۆژە درێژانە بەرو دوان یا جیاجیان، وە ساڵی کۆچی پێشوو تەواو بووە یانا، ئەوەیش لێکۆڵینەوەیەکی خەست‌و چڕی دەوێ، وە گەلێ حوکمی شەرعی لێ پەیدا دەبێ، مەسەلا ئەگەر ساڵی پێشوو تەواو نەبوو بوو ئایا لەو رۆژەدا مانگ چەند جار هەڵ دێ‌و ئاوا دەبێ گەرچی رواڵەتی فەرموودەکە وا دەگەیەنێ کە خول‌و سووڕانەوەی مانگیش وەك هی خۆر لە ماوەی ئەو رۆژە درێژانەدا بەگردی گۆی زەویدا یەك جارە. واتە: ئەو رۆژەی کە بەقەد ساڵێکە مانگیش وەك خۆر لەو رۆژەدا یەك جار هەڵ دێ‌و یەك جار ئاوا دەبێ، هەر وا ئەو رۆژەی کە بەقەد مانگێکە یا بە قەد حەفتەیەکە. (وەرگێڕ)

شوێنی شاکەیان دەکەون ئەویش ئاوا شوێنی ئەو دەکەوێ، لە پاشدا پیاوێکی جەهێڵ (کە لە هەڕەتی لاویدا دەبێ) جەجاڵ گازی دەکا بۆ لای خۆی‌و بە قەمە دوو لەتی دەکاو، بەقەد تیراوێژێ دوو کەرتەکەی لە یەکتری دوور دەکەنەوە، ئەوجا بانگی دەکاتەوە بۆ لای خۆی‌و پیاوەکە زیندوو دەبێتەوەو بە روویەکی گەش‌و دەم بە زەردەخەنەوە دێتەوە بۆ لای، ئیتر جەجاڵ خەریکی ئەم کەین‌و بەینەی خۆی دەبێ‌و سەر قاڵ‌و سەر جەنجاڵی فێڵ‌و فەرەجی خۆی دەبێ لەناکاو خودا عیسای کوڕی مەریەم (درووددو صەلات‌و سڵاوی خودای لێبێ) دەنێرێ، جا لەکن منارە سپییەکە دادەبەزێ، کە دەکەوێتە لای خۆرهەڵاتی دیمەشقەوە، دوو دەست جلی لەبەردایە، بەوەرس‌و بەزعفەران رەنگ کراون، هەر دوو لەپی خۆی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە، ئەوەندە پاک‌و خاوێنە دەڵێی تازە لە گەرماو خۆی شۆردووە، کە سەر دادەنەوێنێ ئاوی لێ دەتکێ، هەر کافرو ناموسوڵمانێ بۆنی هەناسەی بکا کوتوپڕ دەمرێ، تا چاویشی بڕ بکا بۆنی هەناسەی دەڕوا، جا عیسا (دروودی خودای لەسەربێ) منەیی جەجاڵ دەکاو دەگەڕێ بە دوایدا تا لە دەرگای لوودپێێ دەگاو لەوێ دەیکوژێ، ئنجا گرۆیێ دێنە خزمەتی عیسای کوڕی مەریەم، ئەوانە خودا لە شەڕی جەجاڵ پاراستوویانی، عیسا دەیانحەوێنێتەوەو خەمیان دەرەوێنێتەوەو، پایەو پلەی خۆیانیان لە بەهەشتدا پێ دەفەرموێ: ئیتر ئەوا عیسا سەرگەرمی ئەم کاروبارەی خۆیەتی لەناکاو خودا نیگای بۆ دەنێرێ: ئەی عیسا! ئەوا من چینێکم لە بەندەکانی خۆم بەرەڵا کردووە، کەس بە شەڕو هەرا دەرەقەتیان نایێ، جا تۆ بەندە موسوڵمانەکانم دەرکەو بیانبە بۆ کێوی توور لەوێ قایمیان بکە، ئەوجا خودا یەئجووج‌و ماجووج بەرەڵا دەکا، ئیتر لە هەموو قوتکەو یاڵ‌و بەرزاییەکەوە بەتەکان دین‌و جم دەدەن! کە بەراییان دەگەنە سەر دەریاچەی تەبەرییە هەمووی دەخۆنەوەو چۆڕی لێ دەبڕن، جا کاتێ دواییەکەیان دێن دەڵێن: جارێ لە جاران لەم شوێنەدا ئاو هەبووە، ئیتر عیسای پێغەمبەری خوداو هاوڕێکانی واگیر دەخۆن‌و واتە

نگاودەبن تەنانەت سەرەگایێ بۆ یەکێکیان لەو رۆژەدا لە سەد لیرەی زەردی یەکێکی ئەمڕۆی ئێوە باشترە بۆی، عیساو هاوڕێکانی بە کوڵو بە سۆزی دڵ لە خودا دەپاڕێنەوە کە لەناویان بەرێو بیان فەوتێنێ، جا خودا مافەتەیان تێ دەخاو کرمێ دەداتە گەردنیانو سەرجەم بەیەك دەم هەموو دەتۆپن، لە پاشا عیساو هاوڕێیانی دادەپەڕنە خوارەوە بۆ ناو ولات، دەڕوانن شوێنی بستێ لەسەر زەوی نەماوە کە پڕی نەبووبێ لە بۆردڕنو بۆگەنی ئەوان، جا عیسای پێغەمبەری خوداو هاوڕێکانی بە دڵێکی پاك لە خودا داوا دەکەنو دەپاڕێنەوە، خودایش پاڕانەوەکەیان گیرا دەکاو باڵندەیەکی گەورە دەنێرێ وەك گەردنی وشتری ملدرێژ، ئەو مەلانە کە لاکەکەیان هەڵ دەگرنو لەکوێ خودا ئارەزووی هەبێ لەوێ تووڕیان دەدەن، ئەوسا خودای گەورە بارانێکی سەقامگیر دەنێرێ، چ خانوو بەرەو ماڵ، چ دەوارو رەشماڵ گشتی دەگرێتەوەو، سەر رووی گۆی زەوی گشتی وەك ئاوێنەی ساف پاك پاك دەشواتەوە، ئەوسا بەزەوی دەگوترێ، بیرەوە بەرو دەست بکەرەوە بە پیتو فەڕ خستنەوە وەك جاری جارانت، جا لەو رۆژەدایە کە دەستەیێ لە یەك هەنار تێر دەخۆن، لەبن سێبەری قاوغەکەشیدا وچان دەگرنو دەحەسێنەوە، ئاژەڵی لەوەڕخۆریش پیتو فەڕێکی وای تێ دەکەوێ شیری ژەمی وشترێکی تازەزاو بەشی عەشاماتێ دەکا، ژەکی ژەمێ مانگایەکی تازەزاو بەشی خێڵێ دەکا، فرۆی ژەمێ مەڕێ یا بزنێکی دۆشەنی بەشی تیرەیەك لە ئێڵێ دەکا، ئیتر تاماوەیێ ئاوا بەم چەشنە لەم خێرو خۆشییەدا دەمێننەوە، تا ناگاه خودا کزە باییکی خۆش هەڵ دەکاو، دەدا لەبن باخەڵیانو گیانی هەموو خاوەن باوەڕو هەموو موسوڵمانێ دەکێشێ، دەمێنێتەوە خەڵکە خراپو گەندەکەو بەد کارانی مەردومەکە، وەك کەرگەلو دێڵە بە بابە بە بەرچاوی یەکترییەوە بەبێ شەرمو شکۆ لەیەك هەڵدێنو لەیەك دەپەڕن، ئیتر لەسەر ئەو بەدکارانە قیامەت هەڵ دەستێ! (م/ت/د).

## ١١٥) پاشەکی (پایانیّ: خاتیمەییّ)

## عیسا (دروودی خوای لەسەر) کە لە ئاسمان دیّتە خوارەوە تا ماوەییّ لەسەر زەمین دەمیّنیّتەوە، لە پاشا بەرەو سۆزو میهرەبانی‌و رەزامەندیی خودای گەورەو سەروەر سەردەنیّتەوەو دەمریّ (درووی خوای لەسەر)

## خاتمة - ينزل عيسى ﷺ فيمكث في الأرض زمنا ثم يتوفى إلى رحمة الله ورضوانه

٥٦٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ (عَلَيْهِ السَّلَام) حَكَمًا مُقْسِطًا فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ، وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ، وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ الْمَالُ حَتَّى لاَ يَقْبَلَهُ أَحَدٌ حَتَّى تكون السجدة الواحدة خيرا من الدنيا وما فيها ثم قالَ: أبو هريرة: واقرؤوا إن شئتم: وإن من أهل الكتاب الا ليؤمنن به قبل موته ويوم القيامة يكون عليهم شهيدا. رواه الشيخان والترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیّ خۆش نوودبیّ) فەرمووی: پیّغەمبەر (دروودی خودای لەسەربیّ) فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، دیارە کە یەزدانی پاکە، هاکا عیسای کوڕی مەریەم (دروودی خودای لەسەربیّ) لە ئاسمانەوە هاتە خوارەوە بۆ ناوتان‌و بوو بە دادپرسیّکی دادپەروەر بە سەرتانەوە، ئەو حەلە خاچ (صەلیب) دەشکیّنیّ‌و بەراز دەکوژیّ‌و سەرانە هەڵ دەگریّ (چونکە بەس ئایینی ئیسلام قەبووڵ دەکا) سامان‌و ماڵیش وازۆر دەبیّ‌و، دەبیّ بە لیّشاو بە شیّوەیەکی وا کەس وەری ناگریّ لە کەس، هەتا دەگاتە ئەو رادەیە (کەس تاقەتی ماڵداری نامیّنیّ‌و مەردوم دەزانن کە واقیامەت نزیك بۆتەوە لەبەر ئەوە دڵیان بە دنیا خۆش نابیّ‌و هەموو سەردەکەنە بەندەیی‌و خودا پەرستی‌و تاعات‌و نویّژو رۆژوو، تاوای لیّ دیّ) تاقە یەك سەجدە باشتر دەبیّ لە جیهان‌و هەرچی وا لە جیهان دا.

---

[1] تجريد البخاری/٣ ل- ٦٢ رقم/٩٩٣ = ٢٢٢٢، ٢٤٧٦، ٣٤٤٨، ٣٤٤٩. مسلم. إيمان: ٢٨٧. ترمذي. فتن: ٢٢٣٣. تحفة الأشراف: ١٣٢٢٨.

ئەوجا ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەگەر حەزیش دەکەن بۆ پشتوانی راست و دروستی ئەم باسە ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرموێ:
{وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا – ١٥٩/٤}.

واتە: گشت کەسێ لە ئەهلی کیتاب (خاوەن نامەکان) لە جوولەکەو لە فەلە لە پێش مردنی عیسادا باوەڕو ئیمانی پێ دێنێ، لەو چەرخەدا کە دێتە خوارەوە لە ئاسمان و شەڕ دەکا لەگەڵ جەجاڵداو جەجاڵ دەکوژرێ و رەفتار دەکا بە ئایینی ئیسلام وەکوو موجتەهیدێ لە موجتەهیدانی دین، نەك وەکوو پێغەمبەرێ کە نەسخی دینی موحەممەد بکا، جوولەکە بەوە کە باوەڕیان بە زۆر لە پێغەمبەرەکان نەبووەو قسەیان بە درۆ زانیون، شایەتی دەدا لەسەر مەسیحییەکان کە لەپاش بەرزەوەبوونی خۆی بۆ ئاسمان یاسای تاکپەرستی خودایان گۆڕیوەو لەباتی ئەوە یاسای سێ خوداییان داهێنا، وە شایەتی لەسەر خاوەن نامەی پاش هاتنە خوارەوەیشی بەوە دەدا کە ئیمان و باوەڕیان هێناوە (ش/ئەحمەد).

٥٦٢٨– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَيْفَ أَنْتُمْ إِذَا نَزَلَ ابْنُ مَرْيَمَ فِيكُمْ وَإِمَامُكُمْ مِنكُمْ. رواه الشيخان وأحمد[٢]:

دیسان ئەو فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کاتەی کە عیسا لە ئاسمانەوە دێتە خوارێ بۆ ناوتان پێشەواکەتان کە موحەممەدی مەهدییە لە خۆتانە، دەشێ ئەو چەرخە ئێوە حاڵتان چۆن بێ! (ش/ئەحمەد).

٣– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَاللّٰهِ لَيَنْزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلاً فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلاَصُ فَلاَ يُسْعَى عَلَيْهَا وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلاَ يَقْبَلُهُ أَحَدٌ[٣]:

---

[٢] تجرید/٤ ل- ٦٠ رقم/١٣٧٤ = ٣٤٤٩، ٢٤٧٦، ٣٤٤٨، ٣٤٤٩. مسلم. إیمان: ٣٩٠، ٣٩١.

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەخودا گومانی نییە کە کوڕەکەی مەریەم (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئاسمان دێتە خوارێ‌و دەبێ بە دادپرسێکی دادپەروەر لەناوتاناو بەپێی شەریعەتی ئیسلام لەنگەری حەق‌و عەدالەت رادەگرێ، بەلام وەك فەرمانداریێ لە فەرماندارانی ئەم گەلی ئیسلامە، نەك وەك پێغەمبەرێ کە دینی ئیسلام نەسخ بکاتەوە، بەلکوو بەس ئایینی پیرۆزی ئیسلام قەبوول دەکا، لەبەر ئەوە خاچ (صەلیب) دەشکێنێ‌و خاچپەرستی قەدەغە دەکاو، سەرانە هەڵ دەگرێ‌و، لەبەر زۆری‌و مشەیی سامان‌و لەبەر ئەوە کە کەس دڵی بە دنیا خۆش نابێ لەبەر نزیکەوە بوونی قیامەت لەبەر ئەم هۆیانە ماڵ وادەبێزرێ کەس لێی ناپرسێ، وشتری گەنج بەرەڵلا دەکرێ‌و کەس ئاوی پێ ناکێشێ، لەلایەکی تریشەوە قینە بەری‌و رقە بەری‌و بەخیلی نامێنێ‌و دژمنایەتی‌و حەسوودی نامێنێ، عیسا (دروودی خودای لەسەربێ) خەڵك گاز دەکا کە ماڵیان پێ بدا، بەلام ماڵ ئەوەندە زۆرو بێ ناز دەبێ کەس نایەوێ! (موسلیم – رەزای خودای لێبێ).

٥٦٢٩– عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخرُجُ الدَّجَّالُ فِي أُمَّتِي فَيَمْكُثُ أَرْبَعِينَ – لاَ أَدْرِى أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ أَرْبَعِينَ شَهْرًا أَوْ أَرْبَعِينَ عَامًا – فَيَبْعَثُ اللَّهُ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ كَأَنَّهُ عُرْوَةُ بْنُ مَسْعُودٍ فَيَطْلُبُهُ فَيُهْلِكُهُ ثُمَّ يَمْكُثُ النَّاسُ سَبْعَ سِنِينَ لَيْسَ بَيْنَ اثْنَيْنِ عَدَاوَةٌ. رواهما مسلم[٤]:

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەجاڵ کە پەیدا دەبێ لە ئۆمەتما. عەبدوڵلا فەرمووی: نازانم حەزرەت فەرمووی: چل رۆژ. یا فەرمووی: چل مانگ. یا فەرمووی: چل ساڵ دەمێنێتەوە، جا خودا عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێ، عیسا بەشێوەی شیرینی‌و بە ئێسکی سووکی‌و، لەشولاری پاك‌و تەمیزی لەعوروەی کوڕی مەسعوود دەکا، کە نموونەی شێوە شیرینی‌و پاك‌و خاوێنی بووە، جا عیسا

---

[٢] مسلم. إيمان: ٣٨٩.

[٤] مسلم. فتن: ٧٣٠٧.

دەگەڕێ بەشوێن جەجالا هەتا پەیدای دەکاو دەیکوژێ، ئیتر تا حەوت ساڵ خەڵك بە شادیی‌و خۆشی‌و بەبێ شەڕو شۆڕو دوژمنایەتی دەمێننەوەو کەس لە کەس ناکەوێ. (م — ڕەحمەتی خودای لێبێ).

٥٦٣١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ – يَعْنِي عِيسَى (عَلَيه السلام) وَإِنَّهُ نَازِلٌ فَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَاعْرِفُوهُ رَجُلٌ مَرْبُوعٌ إِلَى الْحُمْرَةِ وَالْبَيَاضِ بَيْنَ مُمَصَّرَتَيْنِ كَأَنَّ رَأْسَهُ يَقْطُرُ وَإِنْ لَمْ يُصِبْهُ بَلَلٌ فَيُقَاتِلُ النَّاسَ عَلَى الإِسْلاَمِ فَيَدُقُّ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلُ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعُ الْجِزْيَةَ وَيُهْلِكُ اللّٰهُ فِي زَمَانِهِ الْمِلَلَ كُلَّهَا إِلاَّ الإِسْلاَمَ وَيُهْلِكُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ ( ثم تقع الامنة على الأرض حتى ترتع الأسد مع الابل والنمار مع البقر والذئاب مع الغنم وتلعب الصبيان بالحيات) فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ أَرْبَعِينَ سَنَةً ثُمَّ يُتَوَفَّى فَيُصَلِّي عَلَيْهِ الْمُسْلِمُونَ. رواه أبو داود والحاكم والامام أحمد[5]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێغەمبەرێکی تر لە نێوانی من‌و لە نێوانی عیسادا نەهاتووەو نەبووە، دڵنیام کە عیسا (درووودی خودای لەسەربێ) لە ئاسمان دێتە خوارێ بۆ ناو ئێوە، جا کاتێ کە دیتان وا عیسا هاتە خوارەوە بەم نیشانانەدا بیناسن (عیسا پیاوێکی دەستەی بالاّمیانەی سپی‌و سوورە، دوو دەست جلی زەردباوی لەبەردایە، لەبەر پاك‌و تەمیزی هەمیشە دەڵێی تازە لە گەرماو خۆی شۆردووە، تەنانەت بەبێ تەڕبوونیش دەڵێی سەری ئاوی لێ دەتکێ، لەسەر ئیسلامەتی دەجەنگێ لەگەڵ خەڵکا، خاچ ورد دەکاو بەراز دەکوژێ‌و سەرانە هەڵ دەگرێ، خودا لە سەردەمی ئەودا هەموو میللەتەکانی تر لەناو دەبا، جگە لە میللەتی ئیسلام، لە ئەنجاما عیسا جەجاڵە کۆرەمووش دەکوژێ (و لە پاشا ئاشتی‌و ئاسایش باڵ دەکێشێ بەسەر هەموو ولاّتدا، بە شێوەیەکی سەیری بێ وێنەی وا شێر لەگەڵ وشترداو، پڵنگ لەگەڵ گایەلداو،

---

[5] بسند صحيح (شرحه).

گورگ لەگەڵ مەڕو بزندا لە پووش‌و گیا بەیەکەوە دەلەوەڕێن! مندالان بەبێ ترس‌و مەترسی یاری‌و گەمە بە مارو حەفیان دەکەن وەك پەت). عیسا (درودی خودای لەسەربێ) چل ساڵ لەسەر زەوی دەژی، لە پاشا فەوت دەکا، موسوڵمانان نوێـژی مـردووی لەسـەر دەکـەن‌و کفـن‌و دفنـی دەکـەن. (ئـەبو داود/ حـاکم / ئەحمەد – س/ص).

٥٦٣٢– وَقَالَ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ سَلَامَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) مَكْتُوبٌ فِي التَّوْرَاةِ صِفَةُ مُحَمَّدٍ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِمَا وَسَلَّمَ) يُدْفَنُ مَعَ محمد (صَلَّى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِمَا وَسَلَّمَ). رواه الترمذي بسند حسن[٦]:

عەبدوڵلای کوڕی سەلام (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: لە تەوراتا سیفەت‌و نیشانەی موحەممـەدو سیفەت‌و نیشانەی عیسای کوڕی مەریـەم (درودی خودایان لەسەربێ) نووسراوە، عیسایش (درودی خودای لەسەربێ) کە دەمرێ لە شاری مەدینەی درەخشان لـە پـاڵ گـۆڕی حـەزرەتی موحەممـەددا دەنێـژرێ. (درودو صـەلات‌و سەلامی خودا لە سەرگیانی پاکی هەردوو لایان بێ) (ت–س/ح).

عدد أحاديث كتاب الفتن (١٧٠) سبعون ومائة فقط. نسأل الله أن تكون خالصة لوجهه الكريم آمين، والحمد لله رب العالمين:

مامۆسـتای دانـەر (پـڕ گـۆڕی پـیرۆزی لـەنووربێ) دەفـەرموێ: ژمـارەی فـەرموودەکانی نامـەی فیتنەگـەل (١٧٠) تـەنیا سـەدو حـەفتا فەرموودەیـەو بەس. لە خودای گەورە داواکارین کە ئەم کارەمان ساخ بۆ رەزامەندیی خـودا بێ ئامین خودایە.

بەندەیش دەڵێم: بە راستی من ئەم زاتە پیرۆزەم زۆر خۆش دەوێ واتـە: مامۆستای دانەری ئەم تاجە پیرۆزە داوا لـە خـودای گـەورەو میهرەبان دەکـەم کە حەشرم لەگەڵ حەشری بێ، لەژێر ئاڵا سەربەرزەکەی حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستدا. ئامین خودایە!.

وەرگـێڕ – ١٩٨٧/٧/٧

---

[٦] بسند حسن.

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

نامەی فیتنەگەل هاتە کۆتایی
لەگەڵ نیشانەی رۆژانی دوایی
نامەی دوارۆژو بەهەشت و دۆزەخ
وا هات، بەخێربێ، لەو گوڵە بەخ بەخ!!
گەر خودا ویستی ماڵی ئەو دنیات
وەک ماڵی ئێرەت شارەزات بکات
دەیکا بە نصیب ئەم باسە خاسە
کە بۆ قیامەت بۆتە پێناسە!
ئەم تاجەش کەوا تاجول نوصووله
مایەی نزیکبوون لە خواو رەسووله
لە هەر ماڵێ بێ نومێدت وابێ
بەخێرو خۆشی تاسەر ناوابێ،،
وەرە بۆت بکەم باسی رازی دڵ
لە هەزار یەک دڵ دەردەچێ لە کڵ!!
دڵیش وێنەی گوڵ بە ئاوو بەگڵ
پەروەردە دەبێ بۆ دەستی بولبوول:
بەهۆی گوڵاوی بەحری شەریعەت
گیراو بە دەستی ئەهلی تەریقەت
بە گەردی پاکی ئاستانەی حەزرەت
لەگەڵ چاکانی ئوممەتی رەحمەت
دڵت نازاوکەو، برێژە چاوت
لەناو عیلینا دەنووسرێ ناوت
رووت دەبێ بە مانگ هەڵ دێ لە شاران
دەبێ بە گوڵی مەجلیسی یاران
چاو بە پلووسکی رێژنەی رەحمەت
لەدڵ دەشۆرێ ژەنگاری زەحمەت

دەروێشێکم دی، جەز بە لێ هاتوو
بێوەی بە وێنەی کەروێشکی خەوتوو
دەسنوێژی دەگرت بە فرمێسکی سوور
دەیگوت: خودایە! هاتووم بۆ حوزوور!
داوات لێ دەکەم هەتاکوو ماوم
دەرۆێشی بێوەی بکەی بەناوم!
چەن خشە ژینی دەروێشی بێوەی
خۆزگەی پێ دەبا گەر تێی بگا کەی!
بەدڵ دەرۆێشی یاسای دڵنەرمی
پشت لە تاوان بێ‌و دوور لە بێ شەرمی
پەپوولەی بێوەی دەکا چڵاو چڵ
دەمژێ بە لێو شیلەی لێوی گوڵ!
چاتر لەو شێرەی دەکا تلاوتل
لەناو خوێناوی ئاسکی چاو بەکل
دەروێشم هاتووم گوفتوگ دەکەم
لە خزمەت خوادا تەوبە نۆ دەکەم
بەندەم، زەبوونم، خودام دەدوێنم
نەفخەی رەحمەتی وا لەناو خوێنم!
سەری بەندەیی دادەنەوێنم
بۆ خوداوەندی بێجێگەو شوێنم!
بە هەزار زمان شایەتمان دێنم
هونەر بۆ ئەوە من باڵ نوێنم!
(نفخت فیه: من روحی[1]) دێنم
بەو باڵ نوێنە خۆم دەنوێنم:
بۆقوولی ئاخی بەحری قەزوێنم
بۆ بەرزی لووتکەی شاخی پێنجوێنم

---

[1] سوورەتی حیجر: ١٥ — ٢٩.

بزوێنەر ئەوە، من باوەشێنم
شوکری بەهرەی وا چۆن بەجێ بێنم!

بەستە بە جەستەم: خەستەی ناو نوێنم
دەنا من پەری بێ لانەو شوێنم!!

من حولوولی نیم، وەلێ هەوێنم
لەناسووت جیایە، بەخودا سوێنم

لەسەر ئەشقی تۆ تانە لە شوێنم
وەک حەللاج منیش پڕ لە جوێنم

هەر تۆ رازی بێ چاو دەقووچێنم
نە دەربەست تانەم، نەهی جمێنم!

فریشتەو پەری لەکوێ بهێنم
دەرسی ئەشقی تۆی لەلا بخوێنم

کوشتەی بادەی ئەشق شەهیدی قەبرە
هەر شەوێ تۆ شێت لەیلە تلقەدرە

بەبۆی ئەشقی تۆ هەر کەسێ مەست بوو
کاری نە بەهۆ، نە بە پاو دەست بوو!

بادەی ئەشقی تۆ هەر کەسی مەست کرد
خەڵاتی گەورەی هەردوو دنیای برد

کارو بار هەمووی بە دەست یەزدانە
مۆمی شەو ئەوە، عالەم پەروانە

ئەنجامی ئێمەش هەر لای یەزدانە
گەرچی سەرتاپا لەشمان تاوانە

کوێرە باوانە، شەلە باوانە
قسەی ئەستەقی کۆنی کوردانە

ئافەریم دەروێش! خاوەن گۆش‌و هۆش
قسەی ئەستەقت ئەڵقەیە بۆ گۆش

نووری! چیت داوە لەم دانەو داوە
ئەم جۆرە باسە کەی باوی ماوە؟!

باسی حوولوولو فەلسەفەی لاهووت
چۆنیی فریشتەو جنۆکەو ناسووت
هووەو لاهووەو، حەقیقەتی رووت
باسی واو عەوام: ئاگرو بارووت!
ئەم جۆرە باسە پیاوی کەهنووت
شێت دەکا، چ جای پیاوی رەشو رووت
بەرنامەی ئایین خۆشو ئاسانن
باسی مافی تۆو ئەرکی سەرشانن
بۆ پەرستنی زاتی یەزدانن
بۆ پاراستنی سەرو سامانن!
بە کوێرەی پلەی ژیریی هەموان
نەک بۆ کوشینی مێشکی ئینسان!
لێ ورد بوونەوە لە کارت خودا
کەشە بە دڵی موسوڵمان دەدا
دڵنیام کەشتێ بەناو کەردوونا
باوەڕ چەسپ دەکا لەناو دەروونا
بەوردی نامەی سرووشت سەرنجدە
بۆ چاوی دڵت دەرمانی دەردە
کشت شتێ پڕە لە وردەکاری
هیچ فەرقی نییە کارو شاکاری
تأمَّل تَرَ خطوط الكون
رغم ما فيها من بعد البون
اليك من الملأ الاعلى
رسائل في تقديس المولى
تأمل تر كونا هائلا
خلقا الله تاما كاملا
قد خط فيه: أيا عاقلا
لم يخلق ربي هذا باطلا!!

ففي اختلاف الليل والنهار
ترى آيات لكون جبار
بلاد الكرد زوروا يا زوار
اقرأوا فيها رموز الاقدار
خودا خودایی داناو زانایە
شەقڵی توانایی لەگشت شت دایە:
هەرچی بە وردی سەرنجی دەدەی
قەڵای تەلیسمەو، گەردوونی بێپەی
گەردێ بە وردی سەرنجی دەدەی
وا لە ناویدا گەردوونی بێپەی
ئەفسووناوییە، دەریا لە چاویا
تنۆکێ ناوە، و وەها لە ناویا!!
چاوێ هەڵبڕە، بگێڕە چاوێ
بەناو گەردوونا، زۆری پێ ناوێ:
دیمەنی دڵگیر، دەسکردی یەزدان
یەخسیرت دەکەن وەک نێچیرەوان!
سرووشتی رەنگین، گوڵی رەنگاو رەنگ
مەلی هەمە رەنگ، خنجیلەو خۆش دەنگ
لەحەوا دەفڕن پۆلە مەلی زۆر
بەری رۆژ دەگرن وەک هەوری بەر خۆر
نەرم نەرم دەفڕن بای باڵیان دەدەن
دەڵێی رووی زەوی باوەشێن دەکەن
بە هەودای غەیبی دەسکردی یەزدان
لەحەوا بەندن وەک ئەستێرەکان!
ئەستێرەی ئاسمان ئەوەندە زۆرن
وەک تۆزو گەردی ناو تیشکی خۆرن
لەبەر چاو خۆمان بە چەندان چۆرن
لە شوێنی خۆیان هەموویان خۆرن

تابلۆی زەردو سوور، خولی مانگو خۆر
ڕەنگی ڕەشو بۆر، ڕەنگی ئاڵو مۆر

پێنج هەستەی مرۆڤ، دەزگای چاوو دڵ
ڕەگو لاسکو گڵاو گوڵو چڵ

گرانیو سووکی، یا ساردیو گەرمی
جووڵەو ئارامی، یا زیزیو نەرمی

هاژەی بای قەڵبەز، قەڵبەزەی شەتاو
خورزەی باران، سێڵاوی بەفراو

خۆری زەردەپەڕ، شنەی بای شەماڵ
گزنگی هەتاو، ئاوازەی شمشاڵ

لەرە لەری نەی، کەروێشکەی قەرسیل
چووزەرەی ناسک، خنجیلەو نەشمیل

هەزارەی کەروێشک ڕۆژی بەفرە ڕۆژ
لەتاو برسێتی دەکا لۆژە لۆژ!

باخو بۆڵاخو خاکی ڕەنگاو ڕەنگ
سرووشتی شیرین، دیمەنی قەشەنگ

گوڵو گوڵزارو گژو گیاو چەمەن
سەوزە گیاو دارو شێخەڵو دەوەن

ئاوو ئەستێڵو چەمو دۆڵو شیو
چیای لوتکە بەرز، ئزارو نشیو!!

قاسپە قاسپی کەو لەسەر ماهی زەرد
دەخەنە سەما دڵی دارو بەرد!

ئاشکرا دەڵێن بە ئێمەی بەشەر
سەرنجدەن ئایەی (فارجع البصر)!

هل من تفاوت، في خلق الرحمن
ترى، أو فطور، أيها الانسان

ألم يأن أن، تخشع القلوب
للمؤمنين، لذكر المحبوب

أما آن أن، يعرف المؤمن

من خلقه من ماء مهين

گەرچی دڵنیام لە دەستەو سانیم

وەک چۆن دەزانم لە سلێمانیم

ئاواش دەزانم ئەم باسە وایە:

مەبەس لە بوونمان ناسینی خوایە

کە خودات ناسی باش دەپەستی

لە بەندەیی ئەو قەت ناکەی سستی

بە لاوی بە بۆی ڕەحمەتی مەستی

بە پیری لە بۆ تاعەتی چوستی

بێرە کوردستان ببینە چیا

زەردو سوورو شین، ڕەشێکی سیا

کێوی وا هەیە سەوزە وەک گیا

دەیان شاخی تر وەها لە بنیا

لوتکەی کێوە ڕەش ها لەناو هەورا

هەتا پشتێنەی نوقمە لە بەورا!!

میوەی جۆراو جۆر، تامو ڕەنگ جیا

پەروەردەی کردوون یەک ناو بە تەنیا

مرۆڤو ئاژەڵ، هەریەک لە ڕەنگێ

هەریەک شێوەیێ، هەرەیەکەی دەنگێ

هەموو پەیدا بوون لەیەک خاکی پاک

هەیانە خراپ، هەیانە زۆر چاک

ئەمانە دەبن بۆ زانای دانا

بە مایەی ترسی خودای تەوانا

ئایەی (جدد بیض) لە فاطیر

ئەم جۆرە باسە باش دەکا ظاهیر

وەرە کوردستان بەهەشت ببینە

(جەهەننەمی)شی وەک خۆی شیرینە[1]

جنات تجري تحتها الانهار

جبال تسري فوقها الانوار

بين ذي وتي حقول الازهار

نعم الموطن، ونعمت الدار

اجعلها ربي عرين الاحرار

وصنها (خدا) من شر الاشرار

وأسكن بها من كرد أخيار

وارزقهم جما من خير الاثمار

أفض عليهم من رزق الابرار

وامنن عليهم بطول الاعمار

واجعل دارهم قبلة الانظار

يشيع فيها دوام الاعمار

بكن فيكون، فأمر يا غفار

(بلاد الكرد كوني في ازدهار)

وضع عن ظهري، أنقاض الاوزار

واشرح لي صدري لفهم الاسرار!

بمحمّدٍ سيد الابرار

أقبل دعائي هذا يا جبار![1]

صن وطننا من كل أكدار

واحفظ شعبنا من كل أضرار

کوردستانی خوا کردێ جوانە

دەسڕەنگینی خوای تیا نمایانە

---

[1] جەهەننەمی ناوی گوڵێکی زۆر جوانی گەرمیانییە، لە کەرکووک زۆرە، ئاماژەیشە بۆ باسی بەهەشت‌و جەهەننەم کەوا لە دواوە دێن، لەم چامەیەدا شیعرە عەرەبییەکانیش لە سەرکێشی دەبڕگەیی پەنجەیە. (وەرگێڕ)

[1] الجبار من الاسماء الله الحسنى: هو المصلح لامور عباده المتكفل بمصالحهم. (المترجم)

نـــای بـــۆ کـــوردێ مـــەرد لـــەم لانـــە جوانـــە
خانـــەی خـــۆی بکـــا بـــە خەڵوەخانـــە
نـــانێکی حـــەڵاڵ بەرەنجـــە شـــانی
فەراهـــەم بێنـــێ لـــە بـــۆ خێزانـــی
بـــە بـــۆی کاکـــە حمـــەد لـــە سلێمانی
بـــژیو، بمـــرێ بـــە موســـوڵمانی!
گەرچـــی بـــێ فـــەرم، بـــەدو بـــەد نـــاوم
لێ حوببـــت زۆری لـــە بـــۆ هێنـــاوم
بـــە گـــەردی گـــۆڕت دەرێـــژم چـــاوم
بـــەڵکوو بینابـــێ هـــەتاکوو مـــاوم!
ئەمـــەی مـــن دەیڵـــێم موســـوڵمانی خـــوا!
پـــێم بڵـــێ نوخـــوا عـــەیبو عـــاری کـــوا؟!
بـــە شـــایەتی تـــۆ، خـــودای بـــانی ســـەر!
قەبووڵمـــە دینـــی خـــوداو پێغەمبـــەر
حـــوبی ئـــەولیاو پیـــاو چـــاکانی تـــۆ
دەکـــەم بەکەمەنـــد، دەیکەمـــە ئەســـتۆ!
بـــن عەردیلەکـــەی بـــە عەســـاکەی خـــاڵ
دادەنـــێ لـــەجێ ســـەجدەی پـــڕ جـــەماڵ*
یـــا لەســـەر لـــووتی گـــەوری بـــەد فەســـاڵ
مـــۆری رەش دەنـــێ لـــە چەشـــنی زووخـــاڵ
یـــەئجووجو مـــەئجووج، جەساســـەو جـــەجاڵ
داســـتانی پـــڕن لـــە ســـیحری حـــەڵاڵ
دەدەن بـــای بـــاڵ بـــە مـــەلی خـــەیاڵ
پـــەیکا بـــە ساتێ رێـــی چـــەن هـــەزار ســـاڵ
ئاشـــکرا دەڵـــێن بـــە ئـــەهلی رەحمـــەت
خۆتـــان جیاوەکـــەن لـــە ئـــەهلی زەحمـــەت

---

* بن عەردیلە: دابة الأرض. (المترجم)

**قیامـــەت واهـــات خەڵکـــە ! وریـــابن**

**بــۆ یــەک فریـــشتەی گیـــانی فریـــابن !**

**لاوی‌و ســـامان‌و لـــەش ســـاغی‌و شـــانی**

**بکـــەن بـــە مایـــەی ڕەزای یـــەزدانی**

**تـــان‌و پـــۆی تـــابلۆی نەخـــشەی قیامـــەت**

**دەکێـــشن لـــە بـــۆ ســـەرتاپای نومـــەت[1]**

**وەرگێڕ. نوری فارس حەمە خان حەسەن قەرەداغی**

**سلێمانی/مامۆستایان/دور الضباط ١٩٩٢/٩/٥**

---

[1] بسم الله الرحمن الرحيم. برای ئازیزم موسوڵمانی پاك! لە خودای گەورەو مەزنی خۆم داوا دەکەم کە یاریدەمان بداو، لەناو ئەم نامە پیرۆزەدا نووکی قەڵەم هەمیشە ساخ بۆ رەزای خودا بخەینە سەر کاغەز. دەمەوێ عەرزی ئێوەی بەرێزی بەرز بکەم کە مەبەستم لە پەسنی جوانی کوردستان ئەم خاڵانەیە:- ١- کوردستان خاکێکی پیرۆزە، پڕە لە شوێنی پیرۆزو مووفەڕك، هەروەها بەپێی رووبەری لەناو (نیشتمانی ئیسلامی = الوطن الاسلامي)دا، پتر لە شوێنانی تر پڕە لە زاناو موسوڵمانی پاك‌و چاك، هەروا زانای گەورە گەورەی چاکی تیا هەڵکەتووە کە خزمەتی گەورە گەورەی ئیسلامیان کردووە کەواتە، مافی خۆیەتی کە دووعای خێری بۆ بکەین‌و، بە پەسنی جوان لەبەر چاوی خەڵکەکەی شیرینتری بکەین، تا بەجێی نەهێڵین‌و پەردەوازە نەبن بۆ هەندەران‌و، لەم لاولا مێشەکزێ بکەن، وە بەرە بەرە لە ئیسلام دوور بکەونەوەو ببن بە تەڵەو زیتەو فاقەو داوو تۆڕی رێکخراوە دژە ئیسلامییەکانەوە، کە بە هەزارو یەك ناوی جوان — جوان خۆیان رازاندۆتەوە، لە لایەکی تریشەوە تا دەمکوتی ئەو لایەنە دەغەز لە دڵانە بکەین، چ لە خۆمان بن چ لە بیانی بن، کە بە ناڕەوا دەڵێن: مەلاکان بێگانە پەرستن‌و، فڕیان بەسەر کوردو کوردستان‌و کوردایەتی‌و نیشتیمانپەروەرییەوە نییە، بەڵێ ئەمڕۆ ئەگەر ئێمە خانەو لانەی خۆمان هەبوایەو، سەرو ماڵ‌و ناموس‌و نیشتمان‌و هەست‌و نەستمان لەبەر شاڵاوی ئەم‌و ئەودا نەبوایە، رەنگە منیش ئەم قسانەم لە شوێنێکی تردا بکردایە. ٢- ئەمڕۆ ئەو کوردە بەهۆی ستەمی رۆژگارەوە لە هەندێ مەلایان‌و پیرو مشایەخان دڵگیر بوون‌و هەیانە قیاسی غاییبیش لەحازر دەکاو، دەڵێ: کۆنەکانیش وەك نوێکان بوون، ئەوەندە هەیە ئەوان لەبەر چاو نەماون‌و مردن شیرینی کردوون لەبەر چاو مان! بەڵام بەخودا وانییە بەڵکوو زوربەی ئەهلی دین لە کۆن‌و نوێدا، باشیان لە باشی خەڵك‌و خراپیان لە خراپی خەڵکی تر باشترن‌و، هەر چۆنێ بێ گەڵێ گەڵێ لە رەشە خەڵکەکەی ناو بازاڕ چاکترن. لە لایەکی تریشەوە سەرنجدان لە بوونەوەر تاعەت‌و عیبادەتە. خودا لە قورئانا دەفەرموێ:

(إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الألْبَابِ. الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذا بَاطِلاً — ٣ / ١٩٠ — ١٩١}.

(وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحیم

# ١١٦) نامەی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ

## فووكردن بە كەرِەنادا (نەفخی صوور)

## كتاب القيامة والجنة والنار. النفخ في الصور

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاء اللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ} صدق الله العظـيم- ←(ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٥ چ/١).

واتـە: بڕیـاری خودایـە فریـشتە ئیـسرافیل فـوو دەكـا بـە صـووردا، ئیـتر كۆتـایی بـە جیهـانی یەكـەم دێنـێ و جیهـان سەراسـە خـاپوور دەبـێ، هـەرچی گیانلەبەرە لە ئاسمانو لە زەویدا هەموو بێهۆش دەكەون، یا دەمرن، كەسانێ نەبێ كە خودا خواستی لەسەر ئەوەبێ كە بمێننەوە، ئیتر تا ماوەی چل ساڵ جیهان چۆڵو وێرانە دەبـێ، ئینجا دووبارە فوو دەكرێتـەوە بـەو كەرِەنایـەدا، ئیتر هەموو گیانداران زیندوو دەبنەوەو كوتوپڕ هـەموویان بـە سەرسامی رەق رادەوەسـتنو وەك سـەرگەردان تەماشـای ئـەم لاو لای خۆیـان دەكـەن، چاوەنواڕی ئەوەن كە دەبێ چییان لێ بكرێ.

٥٦٣٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَال رَسُولِ اللّٰهِ مَا الصُّورُ؟ قَالَ: قَرْنٌ يُنْفَخُ فِيهِ. رواه الترمذي وأبـو داود[1]:

عەبدوڵلای كوڕی عەمر (خودای لێ رازی بێ) فـەرمووی: عـارەبێكی دەشـتەكی هاتە لای حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! صـوور چییە؟ فەرمووی: (دروودی خودای لەسەربێ) سوور شاخێكە فووی پیادا دەكرێ. (ت/ د/س/ص).

٥٦٣٤- ←(ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٦ ف – ٩)[2].

---

[1] بسند حسن (شرحه).

٥٦٣٥- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أنه ذكر الدجال إلى أن قال: ثُمَّ يُنفَخُ فِي الصُّورِ فَلاَ يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إلاَّ أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ فَيَصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللّٰهُ - أَوْ قَالَ يُنْزِلُ اللّٰهُ - مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ أَوِ الظِّلُّ فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ثُمَّ يُقَالُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ. وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ، ثُمَّ يُقَالُ: أَخرِجُوا بَعْثَ النَّارِ فَيُقَالُ مِنْ كَمْ فَيُقَالُ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَمِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ قَالَ: فَذَاكَ يَوْمَ يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا وَذَلِكَ يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ. رواه مسلم[٣]:

دەقی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا (ڕەزای خودای لێبێ) ئاوایە: یەعقووبی کوڕی عاصیمی کوڕی مەسعوودی ئەل - سەقەفی فەرمووی: بۆ خۆم گوێم لێ بوو پیاوێ هاتە خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: ئەم جۆرە فەرموودەیە چییە کە دەیگێڕیتەوەو دەڵێی: قیامەت لە ئەوەندەو لە ئەوەندەدا هەڵ دەستێ؟ ئەویش فەرمووی: (سبحان الله) یان فەرمووی: (لا اله الا الله) من چۆن قسەی وا دەکەم بەس خودا دەزانێ قیامەت کەی هەڵ دەستێ، یا وشەیەکی زیکری تری وای فەموو، ئەوجا فەرمووی: بەراستی نیازم وایە کە لە مەولا بۆ هیچ کەسێ هیچ فەرموودەیێ نەگێڕمەوە هەتا هەتایە، من وام نەگوتووە، بەڵکوو گوتوومە: دڵنیا بن کە ئەوەندەی پێ ناچێ تەڕنێکی گەورە دەبینن، خانەی خودا دەسووتێ (حەجاج سووتاندی)، ئەوەو ئەوە دەبێ، ئینجا عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ)فەرمووی: جەجاڵ کە پەیدا دەبێ لەناو ئۆمەتما فەرمووی: نازانم فەرمووی: چل ڕۆژ یا چل مانگ، یا چل ساڵ. لە دوایی‌دا خودای گەورەو سەروەر عیسای کوڕی مەریم دەنێرێ، عیسا (درودی خودای

---

[٢] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/٢٢ رقم/٩/٤٠٧٧.

[٣] مسلم. فتن: ٧٣٠٧.

لەسەربێ) بەشێوەی شیرینی و بە ئێسکی سووکی و بە لەشولاری پاك و خاوێنی دەق لە عورووەی کوڕی مەسعوود دەکا، کە نموونەی شێوە شیرینی و پاك و تەمیزی بووە، جا عیسا (دروودی خودای لەسەربێ) دەگەڕێ بەشوێن جەجالا هەتا پەیدای دەکاو دەیکوژێ، ئیتر تا حەوت ساڵ خەڵك بە شادیی و خۆشی و بێ شەڕو شۆڕو دوژمنایەتی دەمێننەوە کەس لە کەس ناکەوێ و هەموو وەك برای خۆشەویست دەژین، ئەوجا خودا لەلای شامەوە شەماڵێکی خۆش و فێنك دەنێرێ، جا هەر کەسێ لەسەر رووی زەوی بەقەد تۆسقاڵێ خێرو چاکە یا باوەڕو ئیمان لەناو دڵیابێ ئەو بایە گیانی دەسەنێ، تەنانەت ئەگەر بێتو یەکێ لە ئێوە خۆی بکا بەناو جەرگەی کێوێکا باکە دوای دەکەوێ بۆ ئەوێ و لەوێ گیانی دەکێشێ.

عەبدوڵڵا (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئا ئەمەم بەگوێی خۆم لە زاری پیرۆزی پێغەمبەر ژنەوتووە دەیفەرموو: جا دەمێنێتەوە خەڵکە بەدڕەفتارو بەدکردارەکان، وا بە خێرایی پەلاماری خراپە دەدەن و دەم دەژەندنە ئارەزووبازی دەڵێی مەلی سووك فڕن، خووی بە دورەفتاری ناهەمواریان لە خوو رەفتاری درندەی خوێنخۆر دەکا، نەچاکە بە چاکە دەزانن و نە خراپە بەخراپە دادەنێن، جا شەیتان دێتە بەر چاویان و لە روو پێیان دەڵێ: ئەرێ بە گوێم دەکەن یا نا؟ دەڵێن: ئادەی بفەرموو، فەرمانمان بەچی پێ دەکەی ئەویش فەرمانیان پێ دەکا بە پەرستنی، کەچی لەگەڵ ئەو حاڵەیشا رزق و رۆژییان زۆر مشەیە، وە رابواردن و ژیواریان تا بڵێی خۆشە، لەدواییدا فوودەکرێ بە صووردا، ئیتر ئەوەی کە گوێی لێبێ، دەسبەجێ ملی لاردەبێتەوەو دەمرێ، یەکەم کەس کە گوێی لێ دەبێ پیاوێ دەبێ لەوکاتەدا خەریکە ئەستێڵی وشترەکانی سواخ دەدا، کە ئەو دەمرێ خەڵکیش بەدوا ئەوا دەست دەکەن بە مردن، پاشان خودا بارانێ دەنێرێ. یا فەرمووی: بارانێ دەبارێنێ وەك رنەباران یا فەرمووی: وەك سێبەر، ئیتر بەو پڕووشەبارانە جەستەی مەردوم سەر لەنوێ هەموو دەڕوێتەوە، تا ماوەی چل ساڵ لە نێوانی دوو فووەکەدا جیهان چۆڵ و هۆڵ دەبێ، لە دوایی‌دا جارێکی

تریش فوو دەکرێتەوە بە صووردا و کوتوپڕ مردووەکان هەموو راست دەبنەوەو تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکەن، ئینجا دەگوترێ: ئەی بەرەی ئادەمیزاد! وەرن کۆببنەوە لە حوزووری خودای خۆتاندا، وەك خودای گەورەو مەزن لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

{وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ – ٣٧ / ٢٤}.

واتە: ئادەی رایان بگرن لە ئێستگای لێپرسینەوەدا، چونکە ئەوانە بەرپرسیارنو پرسیاریان لێ دەکرێ لە کردەوەو بیرو باوەڕیان پاشان دەگوترێ: ئادەی نێردەی دۆزەخ جیاوەکەن با بڕۆن بۆ ناو ئاگر! دەگوترێ: بەشی دۆزەخ چەند لە چەندە؟ دەفەرموێ: لە هەموو هەزارێ نۆسەدو نەوەدو نۆی! فەرمووی: ئەمەیە ئەو رۆژەی کە لەبەرسامو بیمی سەری لاوو منداڵ سپی دەبێ، وە قورئان دەفەرموێ:

{فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا – سورة المزمل – ١٧/٧٣}.

واتە: ئەگەر هەروا لەسەر بێ بڕوایی بمێننەوە چۆن خۆتان دەپارێزن لە سزای ئەو رۆژەی کە بەسامو ترسو بیمی خۆی منالان پیر دەکات. هەروەها ئەوە ئەو رۆژەیە کە خودای گەورە لە بارەیەوە فەرموویەتی:

{يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ – سورة القلم – ٦٨ / ٤١}.

واتە: ئەی پێغەمبەری نازدار! باسی ئەو رۆژە سەختە بکە کە بەراستی کاتی تەنگو چەڵەمەیە، کە داوێنی تیا دەکرێ بەلاداو، لەبەر پەرێشانی خەڵك قاچو قول هەڵدەکرێو لە مەیدانا قولی رەشو سپی دەر دەکەوێ. (م- پڕگۆڕی پیرۆزی لەنوور بێ). (ب – ٧ ز – ٥١ ل – ٢١٢ ف – ٣).

٥٦٣٦–→(ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٥ ف – ٨)[٤].

لە گێڕانەوەی ئێرەدا پاش رستەی: مەبەست چل مانگە ئاوایە: فەرمووی: نازانم، ئینجا خودا لە ئاسمانەوە بارانێ دەبارێنێ وەك تۆماوی

---

[٤] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٢٢ رقم/٨/٤٠٧٦.

پیاو، ئیتر هەموو مردووەکان وەك چۆن گیاو شینایی بەباران دەڕوێن ئەوانیش ئاوا بەو بارانە دەڕوێنەوەو زیندوو دەبنەوە، هەموو شتێ لە لەشی ئادەمی، دەڕزێ، تەنیا یەك ئێسك نەبێ، کە بێخی جوجکەی سمتیەتی، کە بەقەی زەڕەیەك دەبێ، وا لە کۆتایی زنجیرەی پشتی ئادەمیزادا، جا لەو تۆسقاڵە ئێسکەوە کەوا لە کۆتایی بڕبڕەی پشتدا خودا سەر لەنوێ ئادەمیزاد لە ڕۆژی قیامەتدا دروست دەکاتەوە (ش).

٥٦٣٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ إِلاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ. رواه مسلمٌ وأبو داود[٥]:

دیسان ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جەستەی ئادەمیزاد هەمووی دەبێتەوە بە خاك و خۆڵ، تەنیا سەری نووکی گرێی قنگ نەبێ، لە سەرەتاوە لەو دروستکراوەو، دیسان لەوێشەوە لێك دەدرێتەوەو سەرلەنوێ لەوەوە درووست دەکرێتەوە. (م/د).

## ١١٧) زیندوو بوونەوەو کۆمەڵبوون بۆ لێپرسینەوە (واتە: بەعس و حەشر: البعث والحشر

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ – سورة المجادلة – ٥٨/٦}.

واتە: هەیە بۆ بێ بڕوایان سزای ڕیسواکەر لە ڕۆژێکا کە خودا هەموولایەکیان سەرپاك زیندوو دەکاتەوە، ئینجا خودا ئاگاداریان دەکاتەوە بەوەی کە کردوویانە لە جیهاندا، خودا هەمووی نووسیوەو هەڵژماردووە، بەڵام ئەوان لە بیریان چۆتەوە، خودا یەك بەیەك دەیداتەوە بە چاویانا لە ڕۆژی خۆیدا، خودای گەورە ئاگاداری هەموو شتێکە.

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ؟ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ – سورة يس – ٣٦ / ٧٨}.

---

[٥] مسلم. فتن: ٧٣٤١. أبو داود. سنة: ٤٧٤٣. نسائي. جنائز: ٢٠٧٦ تحفة الأشراف: ١٣٨٨٤.

واتە:مرۆڤی بێ بڕوا دەڵێ: ئەوە کێیە ئێسکی ڕزیو زیندوو دەکاتەوە، ئێسکی ڕزیو بەکێ زیندوو دەکرێتەوە، ئەی موحەممەد! ئەی خۆشەویست! تۆ بفەرموو: ئەو پەروەردگارە زانای دانای تەوانایە زیندووی دەکاتەوە کە یەکەم جار لە نەبوون، یا لە مایەی بێ گیانی زەبوون دروستی کردووە، ئەو خودایە زانایە بە هەموو دروست کردنێ!.

وَقَالَ تَعَالَى: {مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ – سورة لقمان – ٣١ / ٢٨}.

واتە: دروستکردنی یەک بەیەکتان و مراندنی یەک بەیەکتان و زیندووکردنەوەی یەک بەیەکتان دەق وەك ئەوە وایە کە خودا یەك کەس دروست بکاو لەپاشا بیمرێنێ و لەپاش مردن زیندووی بکاتەوە!.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَأَقْسَمُواْ بِاللّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لاَ يَبْعَثُ اللّهُ مَن يَمُوتُ بَلَى وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ – سورة النحل – ١٦ / ٣٨}.

واتە: ئەو خودا نەناسانە لە بەرنەدانی و کەودەنی خۆیان سوێندی گەورە گەورە دەخۆن و دەڵێن: خودا هیچ مردوویێ زیندوو ناکاتەوە، نە، نە، وا نییە، بە پێچەوانەوە لە کارەکە حاڵی نەبوون خودا بەڵێنی داوە کە هەموو گیانلەبەرە مردووەکان زیندوو دەکاتەوە، بەڵێنی خودایش هەقەو راستەو دروستەو پاشگەز بوونەوەی تیا نییە، دڵنیابن کە خودا بەڵێنی خۆی دەباتە سەر، بەڵام زوربەی ئادەمیزاد ئەمە نازانن.

وَقَالَ تَعَالَى: {يَوْمَ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ سِرَاعًا كَأَنَّهُمْ إِلَى نُصُبٍ يُوفِضُونَ خَاشِعَةً أَبْصَارُهُمْ تَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ ذَلِكَ الْيَوْمُ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ – سورة المعارج – ٧٠ / ٤٣ – ٤٤}.

واتە: ئەی خۆشەویست! واز لەو بێ بڕوایانە بێنە، با خەریکی گەمەو گەپ و گاڵتەی خۆیان بن، تا لووتیان دەتەقێ بە لووتی ڕۆژی رەشی خۆیانا، کە خودا بۆیبڕیونەتەوە، لەو ڕۆژەدا کە لە گۆڕ دەردەچن بەپەلە دەڕۆن، وەك چۆن لە جیهاندا بە هەڵەداوان دەچوون بۆ لای بت و بەردەبتینەکانیان ئاوا، لە

هەمان کاتدا چاوحیزو سەرشۆڕن، داماوو کەساس و بێکەس و ریسوان، بەڵێ ئەو بەدبەختانە رۆژێکی رەشی ئاوایان لە پێشە، خودا بۆیبڕیونەتەوە.

٥٦٣٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ. رواه مسلم[١]:

جابیر (خۆشنوودی خودای لێبێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ) هەموو بەندەیێ لەسەرچی حاڵێ دەمرێ، لە قیامەتدا لەسەر ئەو حاڵە زیندوو دەکرێتەوە! (م- رەزای خودای لێبێ).

٥٦٣٩- ←(ب - ٦ ز - ٦ ل - ١٤٨ ف - ٢٦)[٢].

واتە: ئەم فەرموودەیە لەم شوێنەدا لە پێشەوە رابورد: لە بەرگی شەشەما، لە زنجیرە شەشدا، لە لاپەڕە ١٤٨دا. چاپی یەکەم ژمارەی فەرموودەکە لەوێ (٢٦)ە. بەڵام لە چاپی دووەمدا ژمارەکەی/٣٨٥١/٢٦.

٥٦٤٠- ←(ب - ٧ ز - ٦٣ ل - ١٤٨ چ/١ ف - ٣)[٣].

٥٦٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى ثَلَاثِ طَرَائِقَ، رَاغِبِينَ رَاهِبِينَ وَاثْنَانِ عَلَى بَعِيرٍ، وَثَلَاثَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَأَرْبَعَةٌ عَلَى بَعِيرٍ، وَعَشَرَةٌ عَلَى بَعِيرٍ وَيَحْشُرُ بَقِيَّتَهُمُ النَّارُ، تَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا، وَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتُصْبِحُ مَعَهُمْ حَيْثُ أَصْبَحُوا، وَتُمْسِي مَعَهُمْ حَيْثُ أَمْسَوْا. رواه الشيخان[٤]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تۆزێ لەپێش بەرپابوونی قیامەتا حەشرێ لە جیهاندا دەبێ، لەو

---

(١) مسلم. الجنة ونعيمها: ٧١٦١. ابن ماجه: زهد/٤٢٣٠.

(٢) تقدم فى مجلد سادس. تسلسل/٦ رقم/٣٨٥١/٢٦.

(٣) تقدم فى مجلد سابع. تسلسل:٦٣ رقم/٤٢٠٣/٣.

(٤) تجريد البخارى/٥ ل- ٢٨٤ رقم/ ٢٠٢٨ = ٦٥٢٢ فتح البارى مسلم. جنة ونعميها: ٧١٣١. نسائى. جنائز: ٢٠٤٨ تحفة الأشراف: ١٣٥٢١.

حەشــرەدا مــەردوم بــە ســێ دەســتە کــۆ دەکرێنــەوە، دەســتەی یەکــەم پێــشەنگەکانن، ئارەزوومەنــدیی دیــداری خــودانو لــەرابووردوویان بێــزارن، چونکە ئەوەندە تامەزرۆی دیداری خودان، دەستەی دووەم: ئەوانەن کە دوو کەس، یا سێ کەس، یا چوار کەس، یا پێنج کەس، یا شەش کەس، یا حەوت کەس، یا هەشت کەس، یا نۆ کەس، یا دە کەس، بەرودوا سواری یەك وشتر دەبن، یاخود دوو کەس دوو کەس یا سێ کەس سێ کەس پێکەوە لە پاشکۆی یەکترەوە سواری یەك وشتر دەبن.. تاد. وە هەرچی لەمانە مایەوە دەســتەی ســێیەمن، ئەمانــە پیــادەنو بــەپێ دەڕۆن، ئــاگر حەشــریان دەکــاو دەیانداتــە بــەرو لێیــان دەخــوڕێ ئیتر چەند رۆژ بــەڕێوەبن ئاگرەکە لەگەڵیانــە، شــەو لــەکوێ شــەو بکەنــەوە ئاگرەکــەش بەدیارنــەوە شــەو دەکاتــەوە، نیوەڕۆ لــەکوێ وچان بگــرن ئــەویش لەوێدا وچانیان لەگەڵدا دەگــرێ، لــەکوێ بــەیان بکەنەوە هەروەها، لە کوێ ئێوارە بکەنەوە هەروا! (ش).

٥٦٤٢- عَنْ بَهْزُ بْنُ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمْ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ رِجَالاً وَرُكْبَانًا وَتُجَرُّونَ عَلَى وُجُوهِكُمْ. رواه الترمذي بسند صحيح[٥]: ←( ب – ٦ ز – ١٧ ل – ٢٧٨ ج/١ ف – ٢١).

**١١٨) حەشر لەسەر زەوییەکی نوێ دەکرێ : (الحشر على أرض جديدة)**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُواْ للّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ– سورة إبراهيم – ٤٥/١٤←}.

٥٦٤٣- ←( ب – ٦ ز – ١٥ ل – ٢٥٤ ف – ٤)[١].

٥٦٤٤- عَنْ سَهْلَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى أَرْضٍ بَيْضَاءَ عَفْرَاءَ كَقُرْصَةِ نَقِيٍّ.:قَالَ سَهْلٌ أَوْ غَيْرُهُ لَيْسَ فِيهَا مَعْلَمٌ لأَحَدٍ[٢]:

---

[٥] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/ ١٧ رقم/٢١/٢٩٧١.

[١] تقدم في مجلد سادس. تسلسل/١٥ رقم/٤/٣٩٣٦.

سەهل (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕۆژی قیامەت مەردوم هەموو لەسەر زەمینێکی سپی مەیلەو سوور حەشر دەکرێن، کە وەك کولێرەی باراشی پاککراوی بێژراوەی بێ کەپەك وایە. سەهل (یا راوییەکی تر – فەرمووی): ئەو زەوییە زەوییەکی نوێیە، جیایە لەو عەردەی خۆمان، لەبەر ئەوە نیشانەی خاوەندیو پەیوەندیی کەسی پێوە نییە. (ش).

٥٦٤٥– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَكُونُ الأَرْضُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ خُبْزَةً وَاحِدَةً، يَتَكَفَّؤُهَا الْجَبَّارُ بِيَدِهِ، كَمَا يَكْفَأُ أَحَدُكُمْ خُبْزَتَهُ فِي السَّفَرِ، نُزُلاً لأَهْلِ الْجَنَّةِ. فَأَتَى رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ فَقَالَ بَارَكَ الرَّحْمَنُ عَلَيْكَ يَا أَبَا الْقَاسِمِ، أَلاَ أُخْبِرُكَ بِنُزُلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ: بَلَى. قَالَ: تَكُونُ الأَرْضُ خُبْزَةً وَاحِدَةً كَمَا قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَظَرَ إِلَيْنَا، ثُمَّ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ ثُمَّ قَالَ: أَلاَ أُخْبِرُكَ بِإِدَامِهِمْ؟ قَالَ: إِدَامُهُمْ بَالاَمٌ وَنُونٌ.قَالُوا وَمَا هَذَا؟ قَالَ: ثَوْرٌ وَنُونٌ يَأْكُلُ مِنْ زَائِدَةِ كَبِدِهِمَا سَبْعُونَ أَلْفًا. رواهما الشيخان. نسأل الله رضاه والجنة آمين[٣]:

ئەبو سەعید (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕۆژی ڕەستاخێز گۆی زەوی دەبێ بەیەك کولێرە، خوداوەندی بەزەبرو زەنگ بە دەستی خۆی ئەم دەستاو ئەو دەستی پێ دەکا، وەکوو چۆن یەکێ لە ئێوە لە سەفەردا کولێرە بنئاگرە لەناو ئاگردا دروست دەکاو ئەم دەستو ئەو دەستی پێ دەکا تا تۆزێ پان ببێتەوە ئاوا، خودا دەیکا بە نانی میوانداریی بۆ بەهەشتییەکان، لە ئیستگای حەشردا بەر لە چوونە بەهەشت دەیخۆن!. لەو کاتەدا پیاوێکی جوولەکە هات گوتی: ئەی باوکی قاسم! خودا پیت و فەڕت بەسەردا بڕێژێ، با عەرزت بکەم کە لە ڕۆژی قیامەت

---

[٢] تجريد البخارى/٥ ل- ٢٨٣ رقم/ ٢٠٢٧ رقم/ ٦٥٢١ فتح البارى. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٨٦.

[٣] تجيد البخارى/٥ ل- ٢٨١ رقم/ ٢٠٢٦ = ٦٥٢٠. مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٨٨.

دا یەکەم زیافەتی بەهەشتییەکان چییە؟ فەرمووی: ئادەی بڵێ گوتی: گۆی زەوی دەبێ بە تافە کولێرەیەك. وەك پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) تەماشای ئێمەی کردو تەواو پێکەنی، تا خرێ پاشینەکانی دەرکەوتن، چونکە قسەی جوولەکەکە هی تەورات بوو، رێکی فەرمایشتەکەی حەزرەت بوو، پاشان جوولەکەکە گوتی: با پێشت بڵێمو عەرزت بکەم کە پێخۆرەکەشیان چییە؟ گوتی: بالاّمو نوونە، یاران فەرموویان: بالام چییەو نوون چییە؟ گوتی: بالام جوانەگاو گاجووتەو نوون ماسیو نەهەنگە. لە پارچە زیادە گۆشتەکەی جگەریان حەفتا هەزار بەهەشتی لەوە دەخۆن (ش – رەزای خودایان لێبێ). (ب/٦ ز/٣ ل/١١ فەرموودەی ژمارە/٣٦٩٦/٧).

## ١١٩) فەرمایشتی خودای گەورەو مەزن لە رۆژی قیامەتدا:
## كلام الله جل شأنه يوم القيامة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ الْيَوْمَ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ – سورة غافر – ٤٠ / ١٧}.

واتە: ئەو رۆژە ئەو رۆژە پڕ لەسامو بیمەیە کە هەموو لە گۆڕ دێنە دەرێو لە سارای مەحشەردا خۆیان دەردەخەن، خۆیانو کارو کردەوەیان هیچی لە خودای گەورە ون نابێ، جا لەو رۆژەو پڕ لە سامو بیمەدا خودای گەورە دەفەرموێ: ئەمڕۆ پادشایی وا بە دەست کێوە؟ ئەوجا لەبەر ئەوەی کە کەسێ نییە وەلاّم بداتەوە خودا بۆ خۆی وەلاّم دەداتەوەو دەفەرموێ: ئەمڕۆ یەزدانی پاکی تاکی تەنیا کەسەراسەر بوونەوەر وا لە چنگی تەوانایی ئەودا خۆی تاقە پادشایەو بەس فەرمانی ئەو رەوایە، لەم رۆژەدا هەموو کەسێ بەپێی کردەوەی خۆی پاداشی دەدرێتەوەو، کەس ستەمی لێ ناکرێ، رۆژ رۆژی دادو عەدالەتە، دڵنیابن کە لێپرسینەوەی خودا زۆر خێرایە.

٥٦٤٦- ← (ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٥ ف – ٦)[١].

٥٦٤٧- وَعَنْهُ (اي عن ابن عمر) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَطْوِى اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ السَّمٰوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ الْجَبَّارُونَ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟[٢]:

ئیبنو عومەر (رزای خودایان لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا خودای بالا دەستو خاوەن شکۆ ئاسمانەکان وەك تۆمار دەپێچێتەوە ئەنجا بە دەستی ڕاستی هەڵیان دەگرێو دەفەرموێ: پادشای تاقو تەنیای بێ هاوشان هەرخۆمم، پادشا زەبردارەکانی سەرزەوی لە کوێن؟ پادشا ملهوڕو خۆ بە زلزانەکان کوان لە کوێن؟ (م- ڕەزای خودای لێبێ).

٥٦٤٨- ← (ب – ٧ ز – ٢٢ ل – ١٢٣ ف – ٤ + ٥)[٣].

لێرەدا ئاوایە: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودا لە خۆیو لە باوکی) بە دەستی لاسایی جووڵەی دەستی حەزرەتی دەکرد چۆن بە ئاماژە خەڵکەکەی حاڵی دەکردو فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای بالادەستو خاوەن شکۆ بەهەر دوو دەستی ئاسمانەکان کە خۆی لە نەبوون دروستی کردوون، هەروا زەوییەکانیش، دەگرێو دەفەرموێ: خودا هەرمنم، هەر خۆم خودامو بەس. پادشا هەرمنم، پادشا هەرخۆمم، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) هەموو جارێ بە دەستی خۆی نیشانی دەدا کە خودا ئاوا پەنجەکانی دەنووقێنێو ئاوا دەیانکاتەوە، عەبدوڵلا فەرمووی: کە سەرنجی مینبەرەکەم دا سەرو بنی لە ژێر پێی حەزرەتدا دەلەرییەوەو دەهاتو دەچوو، یا لە بەرسامو شکۆ لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) یا بە نهێمی هێماکەی، وا بەتوندی دوانگەکە دەهەژا مەترسی ئەوەم هەموو کە لەژێرپێی حەزرەتدا بڕۆخێ!.

---

(١) تقدم فى مجلد سابع. تسلسل/٢٢/٦/٤٠٧٤م.

(٢) مسلم. صفات المنافقين: ٦٩٨٢. بخارى. توحيد/٧٤٣٢.

(٣) تقدم فى مجلد/٧ تسلسل/ ٢٢ رقم/٤/٤٠٧٢.

## ١٢٠) سامناکی ڕۆژی قیامەت : (أهوال القيامة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ – سورة الحج}.

→ (ب – ٧ ز – ٥ ل – ٣٠ ف – ١).

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {سَأَلَ سَائِلٌ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ. لِّلْكَافِرِينَ لَيْسَ لَهُ دَافِعٌ. مِّنَ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ. تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ. فَاصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا – سورة المعارج – ٧٠ / ١ – ٥}.

**واتە: سزایەکی سەختی خودایی وا بەڕێوە، چارەسەری نییە، کەس ناتوانێ بەری بگرێ، چونکە خودا بڕیویەتەوە بۆ ناموسوڵمانەکان، ئەو خودایەکی وایە کە خاوەنی دەزگای بڵندکردنەوەی زۆری فرە ڕێکوپێکو سەیرو بەڕێزو پیرۆزە، فریشتەکانو جوبرائیل کە ناسراوە بە گیانی پاك لە نێوانی زەویو ئاسمانو عەرشو بارەگای خوداداو لە نێوان پارچەکانی جیهاندا بەو دەزگایانەدا هاتوچۆ دەکەن، بەرزیو درێژیی ئەو نەردەوانو پێپلەکانانە بە ڕۆیشتنی ئاسایی ئادەمیزاد پەنجا هەزار ساڵە، کەواتە ئەی خۆشەویست! بە پشووبە، بەحەوسەڵەبە، لە کارا پەلە پەل مەکە، کاری خودا هەمووی حیکمەتو دانایییە ئەمە ئەو سزا سەختو توندو تیژەیە کەوا بەڕێوە، کەچی گەوجی وا هەیە، کافری سەرکەشی وا هەیە، بەتەوسەوە لە خودا داوا دەکاو دەڵێ: ئەم قورئانە ڕاستو دروستیش بێ هەر نامانەوێ، دەی ئەی خودایە! ئەگەر ئەم قورئانە ڕاستە، ئەوا ئێمە باوەڕی پێ ناکەین، کەواتە تازووە بەردە بارانمان بکە.**

٥٦٤٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَعْرَقُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يَذْهَبَ عَرَقُهُمْ فِي الأَرْضِ سَبْعِينَ ذِرَاعًا، وَيُلْجِمُهُمْ حَتَّى يَبْلُغَ آذَانَهُمْ. رواه الشيخان[1]:

---

[1] تجريد/٢٨٦/٥ رقم/٢٠٣٠ = ٦٥٣٢ فتح. مسلم. جنة ونعيمها: ٧١٣٤.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رۆژی قیامەت مەردوم ئەوەندە ئارەق دەکەن، بەهۆی مەینەتی زۆرەوە، ئارەقیان حەفتا گەز بەناخی زەویدا دەچێتە خوارەوە، لافاوی ئارەقیان هەڵ دەستێ تا دەگاتە لالغاوەو بناگوێیان! (ش).

٥٦٥٠- ← (ب – ٧ ز – ٦٦ ل – ٢٣٨ ف – ١)[٢].

٥٦٥١- عَنْ الْمِقْدَادُ بْنُ الأَسْوَدِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: تُدْنَى الشَّمْسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ الْخَلْقِ حَتَّى تَكُونَ مِنْهُمْ كَمِقْدَارِ مِيلٍ. فَيَكُونُ النَّاسُ عَلَى قَدْرِ أَعْمَالِهِمْ فِي الْعَرَقِ فَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى كَعْبَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى رُكْبَتَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَكُونُ إِلَى حَقْوَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يُلْجِمُهُ الْعَرَقُ إِلْجَامًا. وَأَشَارَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ إِلَى فِيهِ. رواه مسلم والترمذي[٣].

میقدادی کوڕی ئەسوەد (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەیفەرموو: رۆژی قیامەت خۆر وا لە دروسکراوان نزیك دەبێتەوە، بە ئەندازەی میلێکی دەمێنێ لێیانەوە، ئیتر ئەو خەڵکە بەپێی کردەوەی خۆیان لە ئارەقدا دەچەقن بازێکیان تا قولەپێی، بازێکیان تا ئەژنۆی، بازێکیان تا کەلەکەی دێ، هەندێکیان ئارەق وەك لغاو هەتا لالغاویان دێ! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بە دەستی پیرۆزی ئاماژەی بۆ دەمی خۆی کرد، نیشانی دا کە ئارەق تا ئێرەی دێ. (م/ت).

## ١٢١) لێپرسینەوەی بەندەکان لەلایەنی خوداوە : (محاسبة الله لعباده)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ. فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا. وَيَنقَلِبُ إِلَى أَهْلِهِ مَسْرُورًا – سورة الإنشقاق – ٨٤ / ٧-٩}.

---

[٢] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٦٦ رقم/٤٢٠٥/١.

[٣] مسلم. جنه وصفة نعميها: ٧١٣٥. ترمذي. زهد/٢٤٢١.

واتە: جا کاتێ دادگایی خودایی دەست دەکا بە لێپریسنەوەو مەیدانی پرسینەوە گیرا هەر کەسێ نامەی کردەوەی بدرێ بە دەستی راستیەوە ئەوە لەکاتی لێپرسینەوەدا بە ئاسانی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ، لەپاش تەواو بوونی لێپرسینەوەکەی بەشادی و بەخۆشی دەگەرێتەوە بۆ ناو دۆست و کەسوکاری.

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ. ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ - سورة الغاشية – ٨٨ / ٢٥ -٢٦}.

واتە: ئەمانە هەرچی بکەن و هەرچی بڵێن و هەزارو یەك پەلە قاژە بکەن، بۆ کوێ دەچن، لە چنگمان دەرناچن، سەرەنجام بە کەساسی و بێ کەسی دێنەوە بەردەستی خۆمان، ئەوسا لێپرسینەوەیەکی وردی دوورو درێژی سەختیان لەگەڵ دەکەم.

٥٦٥٢- ← (ب – ٤ ز – ١١٢ ل – ٣٦٢ ف – ١)[١].

٥٦٥٣- ← (ب – ٦ ز – ١٣ ل – ٢٤١ ف – ٣)[٢].

٥٦٥٤- ← (ب – ٧ ز – ٦٧ ل – ٢٤٠ ف – ١)[٣].

٥٦٥٥- ← (ب – ٦ ز – ٦ ل – ١٢٦ ف – ٥)[٤].

٥٦٥٦- ← (ب – ٧ ز – ٥ ل – ٣٠ ف – ١)[٥].

٥٦٥٧- ← (ب – ٧ ز – ٥ ل – ٣٠ ف – ١). (ب –٦ ز – ١٨ ل – ٢٦٦ ف – ٧)[٦].

---

[١] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/١١٢ رقم/٣١٨٧/١.

[٢] تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/١٣ رقم/٢٩٢١/٣.

[٣] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٦٧ رقم/٤٢٠٧/١.

[٤] تقدم فی مجلد سادس. تسلسل/٦ رقم/٣٨٢٩/٥.

[٥] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٥ رقم/٣٩٩٥/١.

[٦] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٥ رقم/٣٩٩٥/١ + مجلد سادس. تسلسل/١٨ رقم/٣٩٥٧.

٥٦٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُمْ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ فِي الظَّهِيرَةِ لَيْسَتْ فِي سَحَابَةٍ قَالُوا: لاَ. قَالَ: فَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْسَ فِي سَحَابَةٍ قَالُوا: لاَ. قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ إِلاَّ كَمَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا، قَالَ: فَيَلْقَى اللهُ الْعَبْدَ فَيَقُولُ: أَىْ فُلْ أَلَمْ أُكْرِمْكَ وَأُسَوِّدْكَ وَأُزَوِّجْكَ وَأُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَالإِبِلَ وَأَذَرْكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ فَيَقُولُ بَلَى. قَالَ فَيَقُولُ: أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلاَقِيَّ فَيَقُولُ: لاَ. فَيَقُولُ: فَإِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي. ثُمَّ يَلْقَى الثَّانِيَ فَيَقُولُ أَىْ فُلْ أَلَمْ أُكْرِمْكَ وَأُسَوِّدْكَ وَأُزَوِّجْكَ وَأُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَالإِبِلَ وَأَذَرْكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ فَيَقُولُ بَلَى أَىْ رَبِّ. فَيَقُولُ أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلاَقِيَّ فَيَقُولُ لاَ. فَيَقُولُ فَإِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي. ثُمَّ يَلْقَى الثَّالِثَ فَيَقُولُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ آمَنْتُ بِكَ وَبِكِتَابِكَ وَبِرُسُلِكَ وَصَلَّيْتُ وَصُمْتُ وَتَصَدَّقْتُ. وَيُثْنِي بِخَيْرٍ مَا اسْتَطَاعَ فَيَقُولُ هَا هُنَا إِذًا - قَالَ - ثُمَّ يُقَالُ لَهُ الآنَ نَبْعَثُ شَاهِدَنَا عَلَيْكَ. وَيَتَفَكَّرُ فِي نَفْسِهِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْهَدُ عَلَيَّ فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ وَيُقَالُ لِفَخِذِهِ وَلَحْمِهِ وَعِظَامِهِ انْطِقِي فَتَنْطِقُ فَخِذُهُ وَلَحْمُهُ وَعِظَامُهُ بِعَمَلِهِ وَذَلِكَ لِيُعْذِرَ مِنْ نَفْسِهِ. وَذَلِكَ الْمُنَافِقُ وَذَلِكَ الَّذِي يَسْخَطُ اللَّهُ عَلَيْهِ. رواه مسلم[٧].

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: یاران (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا خودای خۆمان بەچاوی سەر دەبینین؟ فەرمووی: ئەگەر كات نیوەڕۆ بێ و ئاسمانیش ساماڵ بێ بۆ دیتنی خۆر هیچ ئەركێ، زەحمەتێ، دەكێشن؟ گوتیان: خەیر، فەرمووی: ئەی ئەگەر ئاسمان سایەقە بێ بۆ دیتنی مانگی شەوی چواردە هیچ زەحمەتێ دەبینن؟ فەرموویان: نەخەیر، فەرمووی: دەسا بەو كەسە كە گیانی منی بەدەسە وەك چۆن بە ئاسانی لەم دووكاتەدا ئەم دوو شتە بەچاوی سەر دەبینن لە قیامەتیشا ئاوا بەبێ ئەرك و سەراسێ خودای خۆتان دەبینن. فەرمووی: كاتێ بەندە دەگاتەوە بە خودا پێی دەفەرموێ: ئەی فیسار! من ڕێزی تۆم نەگرتبوو؟ نەمكردبووی بە سەرگەورەو سەردار؟ ژنم نەدابوو پێت؟ ڕەوگ و

---

(٧) مسلم. زهد: ٧٣٦٤. أبو داود. سنة: ٤٧٣٠ تحفة الأشراف: ١٣٦٦٦.

رانە وشترم نەدابوو پێت؟ نەمکردی بە گەورەو سەرۆكو بەسەرداری نەمهێشتیتەوە؟ مڵکانەو چواریەکت وەرنەدەگرت لە مسکێنەکانت؟ ئەویش دەڵێ: با، چۆن دەفەرمووی وایە، فەرمووی: خودایش دەفەرموێ: ئەی باوەڕت بەوە هەبوو کە ئاوا دێیتەوە بەردەستی من؟ دەڵێ: خەیر: خودایش دەفەرموێ: دەوامنیش تۆ لە بیرخۆم دەبەمەوە وەك چۆن تۆ منت لەبیری خۆت بردبۆوە ئیتر ئاوا لەبەینی خوداو ئەم جۆرە بەندانەدا - کە ئەمانە کافرنو بێ بڕوان - ئەم جۆرە پرسیارو وەڵامانە روودەدا، سێیەم کەس کە خودا هەمان پرسیاری لێ دەکا دەڵێ: ئەی پەروەردگاری خۆم! باوەڕم بەتۆو بەنامەی پیرۆزی تۆو بە پێغەمبەرانی تۆ هەبوو، وەکی تریش نوێژم دەکردو رۆژووم دەگرتو خێرم دەکرد، ئیتر تا دەتوانێ لەم وەسپە شیرینە دەڵێ خودایش دەفەرموێ: کەوابێ تۆ لێرەبە هەر ئێستا شایەتی خۆت لێ راست دەکەمەوە. ئەویش لەدڵی خۆیدا بیر دەکاتەوەو دەڵێ: دەبێ کێبێ کە شایەتیم لێ بدا، ئەوجا دەمی مۆر دەکرێ، بەڕانیو گۆشتیو ئێسکی دەگوترێ: ئادەی ئێوە قسە بکەن، جا ئەوان دێنە قسەو کابرا هەرچی کردووە دەیگێڕنەوەو شایەتی لێ دەدەن، بۆیە خودا ئەندامی خۆیی لێ دەکا بە شایەت تا هیچ قسەی نەمێنێو بیانووی بڕێ، ئەم جۆرە کەسانەیش ئەو دوو رووە ناپاکانەن کە خودا لێیان رەنجاوەو رقی لێ گرتوون. (م - خودای لێ رازی بێ).

٥٦٥٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَضَحِكَ فَقَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مِمَّ أَضْحَكُ؟ قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: مِنْ مُخَاطَبَةِ الْعَبْدِ رَبَّهُ يَقُولُ يَا رَبِّ أَلَمْ تُجِرْنِي مِنَ الظُّلْمِ قَالَ يَقُولُ بَلَى. قَالَ فَيَقُولُ فَإِنِّي لاَ أُجِيزُ عَلَى نَفْسِي إِلاَّ شَاهِدًا مِنِّي قَالَ فَيَقُولُ كَفَى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ شَهِيدًا وَبِالْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ شُهُودًا - قَالَ - فَيُخْتَمُ عَلَى فِيهِ فَيُقَالُ لأَرْكَانِهِ انْطِقِي. قَالَ فَتَنْطِقُ بِأَعْمَالِهِ - قَالَ - ثُمَّ يُخَلَّى بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْكَلاَمِ - قَالَ - فَيَقُولُ بُعْدًا لَكُنَّ وَسُحْقًا. فَعَنْكُنَّ كُنْتُ أُنَاضِلُ. رواه مسلم[8].

---

[8] مسلم. زهد: ٧٣٦٥.

ئەنەس (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەت حەزرەتدا بووین (درودی خودای لەسەربێ) پێکەنی‌و فەرمووی: دەزانن لەبەرچی پێکەنیم؟ عەرزیمان کرد: خوداو پێغەمبەری خودا زۆر باش دەزانن. فەرمووی: لەو گوفتوگۆیەی کە بەندە لەگەڵ خودای خۆیدا دەیکا، کە دەڵێ: ئەی خودایە! دیارە تۆ پەنای منت داوە لە زۆرو ستەم؟ دەفەرموێ: ئاپەنام داوی. دەڵێ: کەوابێ ئەو شایەتەی کە یارچەبێ لەخۆم نەبێ شایەتی ئەو قەبووڵ ناکەم. خودایش دەفەرموێ: ئەمڕۆ خۆت بەسیت کە ببی بەشایەت لەسەر خۆت لەگەڵ شایەتی فریشتە نووسەرە بەڕێزەکان، یانی شایەتی تری پێ ناوێ. فەرمووی: ئەوساکە مۆر دەنرێ بەسەر دەمیاو بە ئەندامەکانی تری دەگوترێ: ئادەی ئێوە قسە بکەن فەرمووێ: جا ئەوانیش هەرچی کردووە بە قسە دەیگێڕنەوە فەرمووی: ئەنجا خودا ڕێگەی قسەکردنی دەدا، دەمی دەکرێتەوەو دەڵێ: قڕتان تێکەوێ، من بۆ کێمە، خۆمن بۆ ئێوەم بوو. (م- ڕەزای خودای لێبێ).

٥٦٦٠- وَعَنهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: يُجَاءُ بِابْنِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ بَذَجٌ فَيُوقَفُ بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ أَعْطَيْتُكَ وَخَوَّلْتُكَ وَأَنْعَمْتُ عَلَيْكَ فَمَاذَا صَنَعْتَ. فَيَقُولُ يَا رَبِّ جَمَعْتُهُ وَثَمَّرْتُهُ فَتَرَكْتُهُ أَكْثَرَ مَا كَانَ فَارْجِعْنِي آتِكَ بِهِ. فَيَقُولُ لَهُ أَرِنِي مَا قَدَّمْتَ. فَيَقُولُ يَا رَبِّ جَمَعْتُهُ وَثَمَّرْتُهُ فَتَرَكْتُهُ أَكْثَرَ مَا كَانَ فَارْجِعْنِي آتِكَ بِهِ. فَإِذَا عَبْدٌ لَمْ يُقَدِّمْ خَيْرًا فَيُمْضَى بِهِ إِلَى النَّارِ[٩]:

دیسان فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە دوا ڕۆژدا ئادەمیزاد دەهێنرێ بۆ لێپرسینەوە، دەڵێی بەرخی ساوایە ئەوەندە بێ دەستەڵاتە، لەبەردەم دادگای خودادا ڕادەگیرێ، خودا پێی دەفەرموێ: خۆت دەزانی کە لە جیهاندا بەشی باشم پێت داو تۆم کرد بە خاوەن سامان‌و ماڵ‌و منداڵ‌و بەخاوەن خاترو بەخاوەن دەستوپێوەندو، گەلێ چاکەی تری لەم

[٩] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

بابەتەم لەگەڵدا کردی! دەی باشە ئەی تۆ چیت کرد؟ دەڵێ: خودایە! منیش کۆم کردەوەو لەسەر یەك کەڵەکەم کردو بەرهەمم هێناو بەڵام کە تەواو زۆر بوو بەجێم هێشت، مۆڵەتم بدە با بچمەوە بۆ دنیا تا گشتی بهێنم بۆ خزمەتی تۆو بەختی بکەم لە ڕێگەی تۆدا! جا یەزدان پێی دەفەرموێ: ئەمە بە دادت ناخوا پێم نیشان بدە کە لە پێش خۆتەوە چیت ناردووە بۆ ئێرە. دیسان هەمان قسەی پێشوو دووبارە دەکاتەوە، جا کاتێ کە دەردەکەوێ ئەو بەندەیە چاکەی لە پێش خۆیەوە ڕەوانە نەکردووە بۆ دوارۆژی لێی دەخوڕن بۆ ناو دۆزەخ! (ت- س/غەریب).

٦٥٦١- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمْرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَا فَعَلَ وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ. رواهما الترمذي[١٠].

ئەبو بەرزە (خۆشنوودی خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا بەندە ڕەق ڕادەوەستێنرێو ناهێڵن پێ لەبەر پێ بنێ تا ئەم پرسیارانەی لێ دەکرێ: تەمەنی خۆتت لە چیدا بەسەربرد، کردەوەت چیبوو، ماڵت چۆن پەیدا دەکردو لە چیدا خەرجت دەکرد، لەشی خۆتت لە چیدا پوانو ڕزان (ت- س/ص).

٦٥٦٢- عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الْخُشَنِيِّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَنْ يَعْجِزَ اللّٰهُ هَذِهِ الأُمَّةَ مِنْ نِصْفِ يَوْمٍ[١١].

ئەبو سەعلەبەی ئەل-خوشەنی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودا بەرەحمە لەگەڵ ئەم ئۆمەتەی مندا لەبەر ئەوە خوایاربێ لەسەر نیورۆژ پەکیان ناخات (د-س/صالح).

---

[١٠] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[١١] رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

٥٦٦٣- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي لأَرْجُو أَنْ لاَ تُعْجِزَ أُمَّتِي عِنْدَ رَبِّهَا أَنْ يُؤَخِّرَهُمْ نِصْفَ يَوْمٍ. قِيلَ لِسَعْدٍ: وَكَمْ نِصْفُ ذَلِكَ الْيَوْمِ؟ قَالَ: خَمْسُمِائَةِ سَنَةٍ. رواهما أبو داود[١٢]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (خۆشنوودیی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئومێد دەکەم کە ئەم ئۆمەتەی من بەهۆی نیورۆژەوە لەلای خودا دانەمێنن و لە دوا رۆژدا، لەکاتی چوون بۆ بەهەشتدا، لە نەتەوەکانی پێش خۆیان دوانەکەون لە سەعدیان پرسی ئەو نیورۆژە چەندە؟ فەرمووی: پێنج سەد ساڵە (د- س/ح).

٥٦٦٤- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَعَدَنِي رَبِّي أَنْ يُدْخِلَ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعِينَ أَلْفًا لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ وَلاَ عَذَابَ مَعَ كُلِّ أَلْفٍ سَبْعُونَ أَلْفًا وَثَلاَثُ حَثَيَاتٍ مِنْ حَثَيَاتِهِ. رواه الترمذي بسند حسن[١٣]:

ئەبو ئومامە (خۆشنوودیی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: پەروەردگارم گفتی پێم داوە کە حەفتا هەزار کەس لە ئۆمەتم، بەبێ پرسینەوەو سزادان بباتە بەهەشت، هەر هەزارەی حەفتا هەزار کەسی تریان لەگەڵ دایە، هەروا سێ لامشتیش بە لامشتی خۆی. (ت-س/ح).

## ١٢٢) تۆڵە لێ ساندن : (القصاص)

٥٦٦٥- ئەم فەرموودەیە لە نامەی چاکەو رەوشتدا رابورد، لە سەرباسی گەورەترین تاوان زۆرو ستەم و زیاندان لە خەڵك فەرموودەی سێیەم. لێرە دەفەرموێ شەیخان و تیرمذی (رەزای خودایان لێبێ) گێڕاویانەتەوە، بێژەی (ت) ئاوایە: رەحمەتی خودا لەو بەندەیە بێ، کە هەقی برایەکی موسوڵمانی لەسەربێ، خواهی ناموس بێ، خواهی ماڵ بێ، بەپێی خۆی

---

[١٢] رواه أبو داود بسند جيد (شرحه).

[١٣] رواه الترمذي بسند حسن.

بچێ بۆ لای و داوای لێ بکا کە بەهەر شێوەیێ بووە گەردنی ئازاد بکاو، بەپێی شەرع رازی بکا لەخۆی بەر لەوەی کە بمرێ و بچێ بۆ ئەو دنیاو حەقەکە بکەوێتە رۆژێکەوە کە لەو رۆژەدا دینارو درەم و پارەو پوول نامێنێ و بە دادی ناخوا، ئەگینا ئەگەر وانەکا ئەوە حاڵ لەم دوو خاڵە بەدەر نییە: ئەگەر کردەوەی باشی هەبێ بە قەد ئەو هەقە لە کردەوە باشەکەی دەدرێ بە خاوەن هەقەکە، خۆ ئەگەر گریمان هیچ کردەوەی باشی نەبوو ئەوا خراپتر چونکە لە خراپەی برادەرەکەی کە هەقەکەی لەسەریەتی هەڵ دەگیرێ و فڕە دەدرێتە سەر ئەو[1].

٥٦٦٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخْلُصُ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَيُحْبَسُونَ عَلَى قَنْطَرَةٍ بَيْنَ الْجَنَّةِ وَالنَّارِ، فَيُقَصُّ لِبَعْضِهِمْ مِنْ بَعْضٍ، مَظَالِمُ كَانَتْ بَيْنَهُمْ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا هُذِّبُوا وَنُقُّوا أُذِنَ لَهُمْ فِي دُخُولِ الْجَنَّةِ، فَوَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لأَحَدُهُمْ أَهْدَى بِمَنْزِلِهِ فِي الْجَنَّةِ مِنْهُ بِمَنْزِلِهِ كَانَ فِي الدُّنْيَا. رواه البخاري في الرقائق[2]:

ئەبو سەعید (خۆشنوودی لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بڕوادارەکان کاتێ قوتاریان دەبێ لە ئاگر، لەسەر پردێ - کە لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخدایە- حەپس دەکرێن، تاکوو تۆڵەی ئەو ناهەقییانەی کە لە جیهاندا لەیەکتریان کردووە لێیان دەستێنرێ، تا بە تەواوی پاك و خاوێن دەکرێنەوە هەقی کەسیان لەسەر کەسیان نامێنێ ئەوجا رێگەیان پێ دەدرێ کە بچنە ناو بەهەشت، دەسا بەو کەسە کە گیانی موحەممەدی بەدەسە، دیارە کە یەزادنی پاکە، یەك یەکیان لە ماڵەکانی ناوجیهانیان باشتر شارەزای ماڵەکانی خۆیانن لەناو بەهەشتدا: (ب- رەزای خودای لێبێ).

---

[1] تقدم فی مجلد تاسع. تسلسل/١٠ رقم/٤٧٢٨/٣.

[2] تجرید البخاری = مختصر صحیح البخاری/٣ ل- ١٥١ رقم/ ١٠٥٧ = ٢٤٤٠، ٦٥٣٥ فتح الباری شرح صحیح البخاری.

## ١٢٣) وەرگرتنی نامەی کردار : (إستلام صحف ألاعمال)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيهْ، إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيهْ، فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ، فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ، قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ، كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئًا بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ، وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيهْ، وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيهْ، يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ، مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيهْ، هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيهْ، خُذُوهُ فَغُلُّوهُ، ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ، ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعًا فَاسْلُكُوهُ، إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ – صدق الله العظيم – سورة الحاقة – ٦٩ / ١٩ – ٣٣}.

واته:

بەفووی یەکەمی ئیسرافیل جیهان
تێک دەچێ‌و دەڕمێ زەمین‌و ئاسمان
بوونەوەر هەمووی ئوغرۆو خاپوورە
وەلێ عەرشی خوا لەم حاڵە دوورە
بەفووی دووەمی مردوو بە گشتی
لەگۆڕ دەردەچن، دەچن بۆ دەشتی
دەچن بۆ دەشتی مەحشەر بۆ حیساب
لەوێ وەردەگرن گش سەرو کیتاب
خۆشی لەو کەسەی بە دەستی ڕاستی
نامەی کرداری دەدەنە دەستی
پڕ بەدەم دەڵێ: ئەی دۆستو یارم
وەرن بخوێنن نامەی کردارم!
ئەمە ئەو ڕۆیە من بەهیوای بووم
ئەو حیسابەیە من بەتەمای بووم!!
ئیتر هەتا سەر بەخێرو خۆشی
لەناو بەهەشتی باڵادا دەژی

ئاواتی سەرجەم هەموو دێنە دی

نەخەم دەمێنێ، نە ناموڕادی!

نازو نیعمەت و میوەی جۆراو جۆر

وان لەبەر دەستیا، نزیکن زۆر زۆر!

فریشتەی بەهەشت پێیان دەفەرموون:

لەم نان و ئاوە فەرموون بفەرموون!

نۆشی گیانتان بێ بەری ڕەنجەشان

پیرۆز بێ لێتان هەوڵ و تێکۆشان

وەی لەو بەدبەختەی نامەی کرداری

دەدەنە دەستی چەپی بەدکاری

لە تاوا دەڵێ ئای قوڕ بە سەرم

لەم قورتە گەورەی واهات بەسەرم

کاشکی ئەم نامەم وەرنەگرتایە

ئاگام لەم کەینو بەینە نەبوایە

خۆزگەم بەوانەی کە مردن ئیتر

زیندوو نابنۆ هەرگیز جارێ تر

ماڵ و منداڵم لێم بوون بە دوشمن

بوون بە شایەتی ئیسپات لەسەر من

کەساس و داماو بێ حاڵ و ماڵم

ڕووڕەش و ڕوو زەرد، ڕووت و ڕجاڵم

لەسەر فەرمانی پیرۆزی یەزدان

سەرۆکی دۆزەخ دەردەکا فەرمان

ئادەی بیگرن بەکۆت و زنجیر

دەست و پای بەستن بە وێنەی یەخسیر

پێی داخەن دۆزەخ لە چەشنی تەنور

تـــووڕی بدەنــــە نـــاو نـــاگری ســـوور!

حــەفتا گـــەز زنجـــیر بکـــەن بـــە کـــۆتی

لـــووتی بـــشکێنن، بـــشکێنن پـــۆتی

چـــونکە بـــاوەڕی بـــە خـــودای گـــەورە

نـــەبوو بۆیـــە وا حـــاڵی بـــەو تـــەورە!

مەبـــەس حـــاڵیبوون لـــە دۆخو بـــارە

نـــەک گێڕانـــەوەی دەقـــی گوتـــارە!

٥٦٦٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُعْرَضُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلاَثَ عَرَضَاتٍ فَأَمَّا عَرْضَتَانِ فَجِدَالٌ وَمَعَاذِيرُ وَأَمَّا الْعَرْضَةُ الثَّالِثَةُ فَعِنْدَ ذَلِكَ تَطِيرُ الصُّحُفُ فِي الأَيْدِي فَآخِذٌ بِيَمِينِهِ وَآخِذٌ بِشِمَالِهِ. رواه الترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ڕۆژی دوا ڕۆژ مەردوم سێ جار نمایشت دەکرێنو ڕادەنوێنرێن، بۆ خودا، بەڵام دوو جاریان هەربرێتین لە مشتو مڕو مەهانەو بیانوو هێنانەوە، بەڵام، لە دواجاردا کە سێیەم جارە، نامەی کردار دەدرێتە دەستیان، ئیتر هەیە دەدرێتە دەستی ڕاستیو هەیە دەردێتە دەستی چەپی. (ت – خودای لێ ڕازی بێ).

## ١٢٤) تەرازووی کێشانی کردەوەی خێرو شەڕ : (الميزان)

٥٦٦٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّهَا ذَكَرَتِ النَّارَ فَبَكَتْ فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا يُبْكِيكِ؟ قَالَتْ: ذَكَرْتُ النَّارَ فَبَكَيْتُ فَهَلْ تَذْكُرُونَ أَهْلِيكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَقَالَ: أَمَّا فِي ثَلاَثَةِ مَوَاطِنَ فَلاَ يَذْكُرُ أَحَدٌ أَحَدًا: عِنْدَ الْمِيزَانِ حَتَّى يَعْلَمَ أَيَخِفُّ مِيزَانُهُ أَوْ يَثْقُلُ وَعِنْدَ الْكِتَابِ حِينَ يُقَالُ (هَاؤُمُ اقْرَءُوا كِتَابِيَهْ) حَتَّى يَعْلَمَ أَيْنَ يَقَعُ كِتَابُهُ أَفِي يَمِينِهِ أَمْ فِي شِمَالِهِ أَمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِهِ وَعِنْدَ الصِّرَاطِ إِذَا وُضِعَ بَيْنَ ظَهْرَىْ جَهَنَّمَ. رواه أبو داود[1]:

---

[1] سكت عن درجته الشارح.

[1] بسند صالح (شرحه).

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) بیر لە ئاگری دۆزەخ دەکاتەوەو دەست دەکا بە گریان، پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەربێ) پێی دەفەرموێ: ئەوە بۆچی دەگری؟ دەفەرموێ: بیرم لە دۆزەخ کردەوەو گریانم هات، ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێوە لە رۆژی دوا رۆژدا بیری کەسوکاری خۆتانتان دەبێ؟ دەفەرموێ: ئەوەی راست بێ لەم سێ جێگەدا کەس بیری کەسی نییە:

یەکەم: لەکاتی تەرازووی کێشانی چاکەو خراپەدا، تابۆی روون دەبێتەوە کە کێشەکەی سووکە یا قورسە.

دووەم: لەکاتی وەرگرتنی نامەی کرداردا، لەو کاتەدا کە موسڵمان نامەی کرداری بە دەستی راستی وەردەگرێ‌و لە خۆشیاندا دەڵێ (هاؤم اقرءوا کتابیە) لەم کاتەیشدا لە پێش وەرگرتنی نامەکەیدا کەس نایپەرژێتە سەرکەس، تابۆی دەردەکەوێ کە بە دەستی راستی یا بە دەستی چەپی، یا لە پشتیەوە نامەکەی دەدەنە دەستێ.

سێیەم: لەوکاتەدا کە پردی سیراط لەسەر پشتی دۆزەخ دادەنرێ. (د- س/ صالح).

٥٦٦٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَشْفَعَ لِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَقَالَ: أَنَا فَاعِلٌ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَأَيْنَ أَطْلُبُكَ؟ قَالَ: اطْلُبْنِي أَوَّلَ مَا تَطْلُبُنِي عَلَى الصِّرَاطِ. قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلْقَكَ عَلَى الصِّرَاطِ؟ قَالَ: فَاطْلُبْنِي عِنْدَ الْمِيزَانِ. قُلْتُ: فَإِنْ لَمْ أَلْقَكَ عِنْدَ الْمِيزَانِ قَالَ: فَاطْلُبْنِي عِنْدَ الْحَوْضِ فَإِنِّي لاَ أُخْطِئُ هَذِهِ الثَّلاَثَ الْمَوَاطِنَ[٢]:

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: داوام لە پێغەمبەر کرد (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە رۆژی دوا رۆژدا تکام بۆ بکا، فەرمووی: تکات بۆ دەکەم. گوتم ئەی پێغەمبەری خودا! کوێت بۆ بگەڕێم؟ فەرمووی: یەکەمجار لەسەر پردی سیرات بۆم بگەڕێ. گوتم: ئەگەر لەسەر پردی سیرات بە خزمەتت نەگەیشتم؟

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

فەرمووی: لەلای تەرازووی کێشانی کردار بۆم بگەڕێ. گوتم: ئەگەر لەوێش تووشت نەبووم؟ فەرمووی: لەلای حەوزی کەوسەر بۆم بگەڕێ، چونکە من لەم سێ شوێنە بەدەر نیم. (ت–س/ح).

٥٦٧٠– عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضِي اللّٰهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلاً مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلاَئِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلاًّ كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ اللهِ: أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ؟ فَيَقُولُ: لاَ يَا رَبِّ. فَيَقُولُ: أَفَلَكَ عُذْرٌ فَيَقُولُ: لاَ يَا رَبِّ. فَيَقُولُ بَلَى إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً فَإِنَّهُ لاَ ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ فَيَقُولُ احْضُرْ وَزْنَكَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلاَّتِ فَقَالَ إِنَّكَ لاَ تُظْلَمُ. قَالَ فَتُوضَعُ السِّجِلاَّتُ فِي كِفَّةٍ وَالْبِطَاقَةُ فِي كِفَّةٍ فَطَاشَتِ السِّجِلاَّتُ وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ فَلاَ يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللّٰهِ شَيْءٌ. رواهما الترمذي[٣]:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا خودا پیاوێ لە ئۆمەتم جیا دەکاتەوەو، لەبەر چاوی خەڵکی هەموو جیهان ڕەپ‌و ڕاست رایدەگری‌و، نەوەدو نۆ دەفتەری پڕ لە گوناحی بۆ دەوردەکاتەوە، هەر دەفتەرەی تا چاو بڕ بکا زلە، ئەنجا خودا دەفەرموێ: ئایا حاشا دەکەی لە شتێ لەمانەی کە لەناو ئەم تۆمارانەدا نووسراوە؟ یا ئایا فریشتە نووسەرە ئاگادارەکانی من کە بەسەر ئێوەوە چاودێرن، هیچ زۆرو ستەم‌و ناهەقییەکیان لێ کردووی‌و، شت هەیە کە بە ناڕەوا لەسەریان نووسیبێت؟ دەڵێ: خەیر، ئەی خودایە! خودایش دەفەرموێ: ئەی باشە هیچ مەهانەیێ. بەهانەیەکت هەیە؟ دەڵێ خەیر، ئەی پەروەردگارم! خودا دەفەرموێ: بەڵام یەك چاکەی تۆ لە لای ئێمە هەیە، ئەمڕۆ زۆرو ستەم لەتۆ ناکرێ، ئەوجا پسووڵەیەك دەردەهێنن، ئەمەی تیادا نووسراوە: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ

[٣] رواه الترمذي بسند حسن فی کتاب الإیمان

إِلاَّ اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ): شایەتی دەدەم کەوا لە خودا بەولاوە خودایەکی بەهەقی ترنییەو، موحەممەدیش هەم بەندەو هەم رەوانەکراوی خودایە. ئەوجا خودا دەفەرموێ: خۆت ئامادەی کێشانی ئەم کردەوەی خۆت بە، دەڵێ: ئەی خودایە! ئەم پسووڵە بچکۆلەیە لەگەڵ ئەو گشت تۆمارە گەورانەدا دەبێ چی پێ بکرێ؟ دەفەرموێ: زۆروستەم لەتۆ ناکرێ. فەرمووی: جا تۆمارەکان دەچن بەحەواداو پسووڵەکەش قورس دەبێ. بە تیشکی وشەی یەکتایی خودا خەرمانی تاوان بوو بە کاوبا لە راستیدا هیچ شتێ لەگەڵ ناوی خودادا قورس نابێ. (ت- س/ح).

دوور نییە ئەم پیاوە لە پێش مردنیدا بە ماوەیەکی زۆر کەم، موسوڵمان بووبێ، جگە لەسەرمایەی ئیمانو باوەڕ فریای کردەوەی چاکەی تر نەکەوتبێ، لە کاتی وادا لە گوناهی پێشوو پاك دەبێتەوە، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: الإسلام يهدم ما كان قبله ← (ب – ٥ ز – ٢١ ل – ١٤١ ج/١ ف – ٤). (وەرگێڕ)

## ١٢٥) پردی سیرات کەوا بەسەرپشتی دۆزەخەوە : (الصراط جسر على النار)

٥٦٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثُمَّ يُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَىْ جَهَنَّمَ، فَأَكُونُ أَوَّلَ مَنْ يَجُوزُ مِنَ الرُّسُلِ بِأُمَّتِهِ. هذا جزء من الحديث الطويل الآتي في إِخْرَاجِ الْمُوَحِّدِينَ مِنَ النَّارِ. ستأتي ترجمته هناك إن شاء الله تعالى[1]:

٥٦٧٢- وسيأتي في حديث الشفاعة: وَنَبِيُّكُمْ قَائِمٌ عَلَى الصِّرَاطِ يَقُولُ: رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ وَفِي حَافَتَيِ الصِّرَاطِ كَلاَلِيبُ مُعَلَّقَةٌ – الى آخر الحديث – ستأتي ترجمته هناك إن شاء الله تعالى[2]:

---

[1] رقاق. بخاری: ٦٥٧٣.

[2] رقاق. بخاری: ٦٥٧٣.

٥٦٧٣- وسيأتي في شَفَاعَةِ غير الرسل: (في عنوان: يشفع النبيون والمؤمنون باذن الله تعالى): فَيَمُرُّ الْمُؤْمِنُونَ كَطَرْفِ الْعَيْنِ وَكَالْبَرْقِ.. الى آخر الحديث، ستأتي ترجمته هناك إن شاء الله تعالى[3]:

٥٦٧٤- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: شِعَارُ الْمُؤْمِنِ عَلَى الصِّرَاطِ: رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ. رواه الترمذي[4]:

لە موغیرەی کوڕی کوڕی شوعبەوە (خودای لێ ڕازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەسەر پردی سیرات دروشمی موسوڵمان ئەمەیە: خودایە! بە خۆشی، خودایە! بەبێوەی، خودایە! بەبێوەی (ت- س/غەریب).

## ١٢٦) ئەستێری ژوانگە : (الحوض المورود)

٥٦٧٥- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوْضًا وَإِنَّهُمْ يَتَبَاهَوْنَ أَيُّهُمْ أَكْثَرُ وَارِدَةً وَإِنِّي أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَكْثَرَهُمْ وَارِدَةً. رواه الترمذي[1]:

سەمووره (خودای لێ ڕازی بێ) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: گشت پێغەمبەرێ ئەستێرێکی سازگاری هەیە، لە ئێستگادا گەلەکانیان ئاوی لێ دەخۆنەوە، پێغەمبەرەکان لەناو خۆیاندا شانازی بەوەوە دەکەن کە ئەستێڵی کامیان عەشامات پتر دێنە سەری بۆ ئاو خواردنەوە، من بەش بەحاڵی خۆم ئومێد دەکەم کەوا من لە گشتیان زیاتر عەشامات بێنە سەر ئەستێڵەکەم! (ت- س/غ).

٥٦٧٦- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمِنْبَرِ فَقَالَ: إِنِّي فَرَطٌ لَكُمْ، وَأَنَا شَهِيدٌ عَلَيْكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ لأَنْظُرُ إِلَى حَوْضِي الآنَ، وَإِنِّي أُعْطِيتُ مَفَاتِيحَ

---

[3] بخاری. توحید: ٧٤٣٩.

[4] رواه الترمذي بسند غريب ولكنه مؤيد بالصحاح الآتية، فإنه مذكور فيها (شرحه).

[1] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

خَزَائِنِ الأَرْضِ - أَوْ مَفَاتِيحَ الأَرْضِ - وَإِنِّي وَاللَّهِ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تُشْرِكُوا بَعْدِي، وَلَكِنْ أَخَافُ عَلَيْكُمْ أَنْ تَنَافَسُوا فِيهَا. رواه البخاري ومسلم وزاد: وَتَقْتَتِلُوا فَتَهْلِكُوا كَمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ. قَالَ عُقْبَةُ: فَكَانَتْ آخِرَ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْمِنْبَرِ[٢]:

**عوقبەی کوڕی عامیر** (خۆشنوودیی خودای لێبێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەربێ) **رۆژێ تەشریفی چوو نوێژی مردووی لەسەر شەهیدانی غەزای ئوحود کرد، لە پاشا چووە سەر دوانگەو فەرمووی: من پێشڕەوی ئێوەم بۆ سەر حەوزەکە، خۆم شایەت‌و ئاگادارم بەسەرتانەوەو، لە هەردوو جیهاندا کردەوەکانی ئێوەم پێ نیشان دەدرێ، سوێندم بەخودا ئا ئێستا لەم دەمەدا چاوم لە حەوزەکەمە، بێگومان کلیلەکانی گەنجینەکانی زەوی هەموو خەڵاتکراوە بەمن، یا فەرمووی: کلیلەکانی زەوی دراون بە من، بەخودا تازە من مەترسیم لەوە نەماوە کە ئێوە لە پاش من بچنەوە سەربتپەرستی‌و فرەخوایی، کە گوتت موسوڵمان یانی یەزدانپەرست، واتە: دوور لە فرەخوایی، بەڵام مەترسی ئەوەم لێتان هەیە کە لەسەر پڕوپیتی دنیا بەربەرەکانێ بکەن (ب/م). موسلیم** (رەزای خودای لێبێ) **ئەمەی پترکردووە: وە بچن بە گژیەکاو تێکبەربێن‌و لەناو بچن، وەك چۆن نەتەوەکانی پێش ئێوە بەهۆی شتی واوە لەناو چوون. عوقبە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: ئەو جارە دواجار بوو کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەسەر دوانگە ببینم.**

٥٦٧٧- عَنْ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا فَرَطُكُمْ عَلَى الْحَوْضِ مَنْ وَرَدَ شَرِبَ وَمَنْ شَرِبَ لَمْ يَظْمَأْ أَبَدًا وَلَيَرِدَنَّ عَلَيَّ أَقْوَامٌ أَعْرِفُهُمْ وَيَعْرِفُونِي ثُمَّ يُحَالُ بَيْنِي وَبَيْنَهُمْ. فأقول أنهم مني فيقال: لا تدري ما أحدثوا بعدك فأقول: سحقا سحقا لمن غير بعدي. رواه الشيخان[٣]:

---

[٢] تجريد/٢ ل- ٦١ رقم/٦٤١ = ١٣٤٤، ٣٥٩٦، ٤٠٤٢، ٤٠٨٥، ٦٤٢٦، ٦٥٩٠. مسلم. فضائل: ٥٩٣٢.

[٣] بخاري. فتن: ٧٠٥٠، ٧٠٥١. مسلم. فضائل: ٥٩٣٦. تحفة الأشراف: ٤٧٨٢.

**سەهلی کوڕی سەعد** (خۆشنوودیی خودای لێبێ) **فەرموی: پێغەمبەر** (درودو صەلاتو سەلامی خودای گەورەی لەسەربێ) **فەرمووی: خۆم پێشڕەوی ئێوەم لەسەر حەوزەکە، لە پێش ئێوەوە دەچم لەگوێ حەوزەکە جێ و ڕێتان بۆ ئامادەکەم، ئەوانەی کە دێن بۆ ئەوێ لە ئاوەکەی دەخونەوە، هەرکەسێش لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێ، گەلێ کەس دێن بۆلام بۆ ئاوخواردنەوە، من باش باش ئەوان دەناسمو ئەوانیش باش باش من دەناسن، کەچی ڕێگەیان پێ نادرێ کە بگەنە لای من، دەڵێم: ئەوە بۆ؟ خۆ ئەمانە لەکن خۆی لە ئۆمەتی من بوون؟ پێم دەگوترێ: تۆ نازانی کە لەپاش تۆ چی خراپەیەکیان بەرپاکردبوو، منیش دەڵێم: دەی قڕ لەوانە کەوێ کە لەپاش مەرگی من دینەکەیان دەستکاری کردووە!** (ش).

→ (ب – ١ ز – ٩ ل – ٥٦ ف – ٧٠/٩).

**٥٦٧٨– وللبخاري:** بَيْنَا أَنَا قَائِمٌ إِذَا زُمْرَةٌ، حَتَّى إِذَا عَرَفْتُهُمْ خَرَجَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِي وَبَيْنِهِمْ فَقَالَ: هَلُمَّ.فَقُلْتُ أَيْنَ؟ قَالَ: إِلَى النَّارِ وَاللَّهِ.قُلْتُ: وَمَا شَأْنُهُمْ؟ قَالَ: إِنَّهُمُ ارْتَدُّوا بَعْدَكَ عَلَى أَدْبَارِهِمُ الْقَهْقَرَى.فَلاَ أُرَاهُ يَخْلُصُ مِنْهُمْ إِلاَّ مِثْلُ هَمَلِ النَّعَمِ[٤]:

**پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: جارێ ڕاوەستابووم لەسەر سەرچاوەکەی خۆم ئەوەندەم زانی کۆمەڵێ خەڵك هاتن، کە هاتنە پێشەوە ناسیمنەوە، کەچی فریشتەیێ لە شێوەی پیاوێکدا کەوتە نێوانی منو ئەوانەوەو، نەیهێشت پتر بێنە بەرەوە، ئەوجا فەرمووی: دەی وەرن، گوتم: دیانبێری بۆ کوێ؟ فەرمووی: بەخودا دەیانبێرم بۆ دۆزەخ، گوتم: بۆ چییان کردووە؟ فەرمووی: ئەمانە لەدوای تۆ پاشەو پاش لە دین وەرگەڕابوونو لەتۆ هەڵگەڕابوونەوە، جاوابزانم زۆر کەم لەم کۆمەڵانە قورتاریان دەبێ، وەك چۆن وشترێ بەرەڵا کرابێ و پشت گوێ خرابێ کەم وا دەبێ ئەو وشترە لەناو نەچێ.** (ب – خودای لێ ڕازی بێ).

---

[٤] تجريد/٢٩٥/٥ رقم/٢٠٤١ = ٦٥٨٧ فتح الباري.

٥٦٧٩- قَالَ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فَقَالَ: مَا أَنْتُمْ جُزْءٌ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ جُزْءٍ مِمَّنْ يَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ. قَالَ قُلْتُ: كَمْ كُنْتُمْ يَوْمَئِذٍ قَالَ: سَبْعَمِائَةٍ أَوْ ثَمَانِمِائَةٍ. رواه أبو داود. نسأل الله الشرب من الحوض. آمين[٥]:

**زەیدی کوڕی ئەرقەم (خودای لێ خۆش نوودبێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) بووین، لە هەوارێ لاماندا، حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە بەیەك بەش لەسەد هەزار بەشی ئەوانەیش نابن کە دێن بۆلام بۆ سەر حەوزی کەوسەر. گوتم: بە زەید: ئەو حەلە ئێوە چەندکەس دەبوون؟ فەرمووی: حەوت سەد کەس تا هەشت سەدکەس دەبووین (د = ئەبو داود).**

## ١٢٧) چۆنیتی ئەو حەوزەو ئاوەکەی : (صفة الحوض وشرابه)

٥٦٨٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَمَامَكُمْ حَوْضًا مَا بَيْنَ نَاحِيَتَيْهِ كَمَا بَيْنَ جَرْبَاءَ وَأَذْرُحَ. رواه الثلاثة[١]:

**ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەوزێ لە دەرگای بەهەشتا وا لە پێشتانەوە، لە جەرباوە تا ئەزروح دەبێ (ش).**

٥٦٨١- عَنْ حَارِثَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْحَوْضَ كَمَا بَيْنَ الْمَدِينَةِ وَصَنْعَاءَ[٢]:

**حاریسە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: حەوزەکەم لە مەدینەوە تا صەنعاء دەبێ. (ش).**

---

[٥] سکت عن درجته الشارح.

[١] تجريد البخاری/٥/٢٩٤ رقم/ ٢٠٣٩ = ٦٥٧٧. مسلم. فضائل: ٥٩٤١، ٥٩٤٠. أبو داود. سنة: ٤٧٤٥.

[٢] تجريد/٥/٢٩٦ رقم/٢٠٤٢ = ٦٥٩١. مسلم. فضائل/٥٩٣٨، ٥٩٥٣.

٥٦٨٢- عَنْ أَنَسُ (رَضِي اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ قَدْرَ حَوْضِي كَمَا بَيْنَ أَيْلَةَ وَصَنْعَاءَ مِنَ الْيَمَنِ، وَإِنَّ فِيهِ مِنَ الأَبَارِيقِ كَعَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ. رواهما الشيخان (رضوان الله تعالى عليها)[٣]:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەندازەی حەوزەکەی من لە هەندێ شوێنیا لە ئەیلەوە کەوا لەشام تا صەنعا دەبێ کەوا لەیەمەن (ئێستا پێتەختی یەمەنە) وەك ژمارەی ئەستێرەی ئاسمانیش سوراحی لێیە (ش).

٥٦٨٣- وللبخاري: حَوْضِي مَسِيرَةُ شَهْرٍ، مَاؤُهُ أَبْيَضُ مِنَ اللَّبَنِ، وَرِيحُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَكِيزَانُهُ كَنُجُومِ السَّمَاءِ، مَنْ شَرِبَ مِنْهَا فَلاَ يَظْمَأُ أَبَدًا[٤]:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەندازەی حەوزەکەی من ڕێی مانگەڕێیەکە، ئاوەکەی لەچڕی شیر سپی ترە، بۆنی لە بۆنی مسك خۆشترە، گۆزەڵەو شەربەکانی دەوری ئەوەندە زۆرن، بەقەد ئەستێرەی ئاسمان دەبن، ئەوەی لێی بخواتەوە ئیتر هەرگیزاو هەرگیز تینووی نابێ (ب).

٥٦٨٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَا آنِيَةُ الْحَوْضِ؟ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لآنِيَتُهُ أَكْثَرُ مِنْ عَدَدِ نُجُومِ السَّمَاءِ وَكَوَاكِبِهَا، أَلاَ فِي اللَّيْلَةِ الْمُظْلِمَةِ الْمُصْحِيَةِ آنِيَةُ الْجَنَّةِ مَنْ شَرِبَ مِنْهَا لَمْ يَظْمَأْ آخِرَ مَا عَلَيْهِ يَشْخُبُ فِيهِ مِيزَابَانِ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْ شَرِبَ مِنْهُ لَمْ يَظْمَأْ عَرْضُهُ مِثْلُ طُولِهِ مَا بَيْنَ عَمَّانَ إِلَى أَيْلَةَ مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ. رواه مسلم والترمذي[٥]:

ئەبو زەڕ (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا! قاپ و قاجاخی سەر حەوزەکەی تۆ چییە؟ فەرمووی: سوێندم بەو کەسەی گیانی موحەممەدی بەدەستە ژمارەی ئەو قاپ و قاجاخ و سوراحی و پیاڵەو

---

[٣] تجريد/٥/٢٩٤ رقم/٢٠٤٠ = ٦٥٨٠ فتح البارى مسلم. فضائل: ٥٩٥٠.

[٤] تجريد/٥/٢٩٣ رقم/٢٠٣٨ = ٦٥٧٩. مسلم. فضائل: ٥٩٤٤.

[٥] مسلم. فضائل: ٥٩٤٥

پەرداخانەی کەوان لەسەری لە ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان زیاترە، لە تاریکە شەودا کە ئاسمان سایەقەی سامالْ بێ، هەموو حاجەتی بەهەشتن — لەبەر ئەوە هەرکەسێ پێیان بخواتەوە ئیتر هەتا هەتایە جارێکی تر تینووی نابێ، لە بەهەشتەوە دوو پلووسك دەڕژێتە ناوی، پانییەکەی دەق بەقەد درێژییەکەیەتی، لە عەممانەوە تا ئەیلە دەبێ، ئاوەکەی لەشیر سپی ترەو لە هەنگوین شیرینترە (م — خودای لێ رازی بێ).

٥٦٨٥- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي لَبِعُقْرِ حَوْضِي أَذُودُ النَّاسَ لأَهْلِ الْيَمَنِ أَضْرِبُ بِعَصَايَ حَتَّى يَرْفَضَّ عَلَيْهِمْ. فَسُئِلَ عَنْ عَرْضِهِ فَقَالَ: مِنْ مَقَامِي إِلَى عَمَّانَ. وَسُئِلَ عَنْ شَرَابِهِ فَقَالَ: أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ يَغُتُّ فِيهِ مِيزَابَانِ يَمُدَّانِهِ مِنَ الْجَنَّةِ أَحَدُهُمَا مِنْ ذَهَبٍ وَالآخَرُ مِنْ وَرِقٍ. (رواه مسلم في مبحث حوض نبينا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) المترجم)[٦]:

سەوبان (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەخودی خۆم لەبەریانی حەوزەکەمدا رادەوەستم، گورێ گورێ لەو خەڵکە دەکەم‌و بەدار دووریان دەخەمەوە لەبەر خاتری خەڵکی یەمەن، تا ئاوەکەی بچێ بۆ ئەوان لێی پرسیاکرا کە چەندە پانە؟ فەرمووی: لێرەوە تا عەممان دەبێ لە بارەی چۆنی ئاوەکەشیەوە لێیان پرسی فەرمووی: لەشیر سپیی ترە، لە هەنگوین شیرینترە، دوو پلوسکی لەبەهەشتەوە تێ دەڕژێ، یەکێکیان لە زێڕە، یەکێکیان لە زیوە، لە ئاوی بەهەشت ئاوی بۆ دێنن.

٥٦٨٦- عَنْ أَبِي سَلاَّمٍ الْحَبَشِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ إِلَيَّ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ الْعَزِيزِ فَحُمِلْتُ عَلَى الْبَرِيدِ. قَالَ فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ قَالَ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ لَقَدْ شَقَّ عَلَى مَرْكَبِي الْبَرِيدُ. فَقَالَ يَا أَبَا سَلاَّمٍ مَا أَرَدْتُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ وَلَكِنْ بَلَغَنِي عَنْكَ حَدِيثٌ فِي شَأْنِ الْحَوْضِ فَأَحْبَبْتُ أَنْ تُشَافِهَنِي بِهِ. قَالَ أَبُو سَلاَّمٍ: حَدَّثَنِي ثَوْبَانُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حَوْضِي مِنْ عَدَنَ إِلَى عَمَّانَ الْبَلْقَاءِ مَاؤُهُ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى

---

[٦] مسلم. فضائل: ٥٩٤٦.

مِنَ الْعَسَلِ وَأَكَاوِيبُهُ عَدَدُ نُجُومِ السَّمَاءِ مَنْ شَرِبَ مِنْهُ شَرْبَةً لَمْ يَظْمَأْ بَعْدَهَا أَبَدًا أَوَّلُ النَّاسِ وُرُودًا عَلَيْهِ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ الشُّعْثُ رُءُوسًا الدُّنْسُ ثِيَابًا الَّذِينَ لاَ يَنْكِحُونَ الْمُتَنَعِّمَاتِ وَلاَ تُفْتَحُ لَهُمُ السُّدَدُ. قَالَ عُمَرُ: لَكِنِّي نَكَحْتُ الْمُتَنَعِّمَاتِ وَفُتِحَ لِيَ السُّدَدُ وَنَكَحْتُ فَاطِمَةَ بِنْتَ عَبْدِ الْمَلِكِ لاَ جَرَمَ أَنِّي لاَ أَغْسِلُ رَأْسِي حَتَّى يَشْعَثَ وَلاَ أَغْسِلُ ثَوْبِي الَّذِي يَلِي جَسَدِي حَتَّى يَتَّسِخَ. رواه الترمذي. نسأل الله التوفيق آمين[٧].

ئەبو سەللامی حەبەشی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ناردی بەشوێنما، بە سوارییی هێستر چووم بۆ لای، کە چوومە لای گوتم: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! تاقەتی سوارییو سەفەرم نەماوە، فەرمووی: ئەی باوکی سەللام! مەبەستم ئەوە نەبوو کە تووشی مەینەتت بکەین، بەڵام بیستوومە کە لە بارەی حەوزەکەی پێغەمبەرەوە فەرموودەیەکت لەلا هەیە، حەزدەکەم کە ئەو فەرموودە پیرۆزەیە بەگوێی خۆم لە دەمی خۆتی ببیستم. ئەبو سەللام فەرمووی: سەوبان بۆیگێڕامەوە فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەندازەی حەوزەکەم لە عەدەنەوە تاعەممانی بەلقاء دەبێ، کە شوێنێکە لە شام، ئاوەکەی لە شیر سپیترەو، لە هەنگوین شیرینترە، پیاڵەو فنجانەکانی سەری بەقەد ژمارەی ئەستێرەی ئاسمانن، هەرکەسەی یەکجار لێی بخواتەوە ئیتر لەوە دوا هەرگیز تینووی نابێ، یەکەم دەستە کە دەچنە سەری هەژارانی کۆچەرانن، کە سەرکوڵکنو جل چڵکنو ژنی ناسکو نازدار مارەناکەنو، فەرموو فەرموویان لێ ناکرێ بۆ چوون بۆ ماڵی گەورە پیاوان.

عومەری کوڕی عەبدول عەزیز فەرمووی: بەڵام من ئافرەتی ناسکو نازدارم هێناوە فاتیمەی کچی عەبدولمەلیك خێزانی منە کە باوكو باپیری خەلیفەبوون، ماڵی گەورە پیاوانیش دەچم کەوابوو دەبێ سەرم نەشۆرم تا کوڵکنو گیف دەبێو، جلەکانی بەریشم نابێ بشۆرم تا چڵکن دەبن. (ت- س / غەریب).

---

[٧] بسند غريب ولكنه مؤيد بالصحاح التى قبله (شرحه).

لە دینی پیرۆزی ئیسلامدا پاكو پوختیو تەمیزی زۆر پەسەندە، بە تایبەتی پاكی زبانو دەمو دامەنو جلو بەرگو مالّو دەرمالّ. سەرباسی پاكیو خاوێنی لە پەڕاوی شەریعەتدا هەمیشە دەكەوێتە پێش پێشەوە. ئەمە هێلّی سەرەكی ئیسلامە، یاسایەكی دامەزراوی چەسپاوە لە ئاییندا، وەلێ هەموو یاسایێ ناوازەو شازێكی هەیە، وەك حالّی ئەم چلّكنو كولّكنو مرۆخاكییانە، وەلێ هەموو كەس باش باش بزانێ مەبەست لەم چلّكنیو كولّكنییە پیسیو پۆخلّیو قیزەونی نییە. من خۆم بە چاوی خۆم لەم (چلّكنو پلّكنانەم) دیوە، هەموو ئێسك سووكی رەنگ نوورانین، لەشو جلو بەرگیان نوێژین!

وەلێ ئەوەندە هەیە گوێ بە لەش پەروەری نادەن، دەربەستی كەشخەیی نین خۆیان تاسولووس نادەن، نە تەرپۆشن، نە لەشپەروەرن، لە ترسیخودا ئاگایان لە خزمەتی خۆیان نییە، لەتاو مردن ئاگایان لە ژیان نییە. (وەرگێڕ)

## ١٢٨) حەوزی كەوسەر : (الكوثر)

٥٦٨٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: أَغْفَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِغْفَاءَةً فَرَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا فَإِمَّا قَالَ لَهُمْ وَإِمَّا قَالُوا لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ ضَحِكْتَ فَقَالَ: إِنَّهُ أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ. فَقَرَأَ (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ) حَتَّى خَتَمَهَا فَلَمَّا قَرَأَهَا قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ. قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ فِي الْجَنَّةِ وَعَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ عَلَيْهِ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ آنِيَتُهُ عَدَدُ الْكَوَاكِبِ. رواه أبو داود[1]:

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) سەرخەوێكی شكاندو سەری هەلّبڕیو زەردەخەنەیەكی كرد، یا خۆی

[1] بسند صحيح (شرحه).

فەرمووی: بەوان، یا ئەوان فەرموویان بەو: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی پێکەنی؟ فەرمووی: تۆزێ لەمەو بەر سوورەتێکم بۆ هات. ئەوجا خوێندیەوە:
{بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ} تا کۆتایی هێنا.

کاتێ لە خوێندنەوەکەی بۆوە فەرمووی: ئایا دەزانن کەوسەر کەوا لە {إِنَّـا أَعْطَيْنَـاكَ الْكَـوْثَرَ}دا چییە؟ فەرموویان: خوداو پێغەمبەری خودا باشی دەزانن، فەرمووی: کەوسەر چۆمێکە وا لەناو بەهەشتا، خودای بالا دەست‌و خاوەن شکۆ گفتی ئەو سەرچاوەیەی بەمن داوە، خێرو بێرێکی گەلێ زۆری لەسەرە، حەوزێکی لەسەرە لە رۆژی قیامەتدا ئۆمەتم دەچنە سەر ئەو حەوزو ئاوە، بە ژمارەی ئەستێرەی ئاسمان جام‌و پیاڵەو سوراحی لەسەرە. (د- س/ص) ← ب – ٧ ز – ٨٦ ل – ٢٦٤ ف – ١ +٣).

٥٦٨٨- ← (ب – ٧ ز – ٨٦ ل – ٢٦٥ ف – ٣)[٢].

٥٦٨٩- ← ب – ٧ ز – ٨٦ ل – ٢٦٦ ف – ٤)[٣].

## ١٢٩) تکاکردن هەیەو هەقە : (الشفاعة ثابتة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ – سورة البقرة}.
← ( ب – ٥ ز – ٨٢ ل –٢٩٨ ف – ١).

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى عَلَى لسَان بعض الكفار: {فَمَا لَنَا مِن شَافِعِينَ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٍ – سورة الشعراء – ٢٦ / ١٠٠ – ١٠١}.

واتە: کافرەکان لە دۆزەخا لەناو خۆیاناو لەگەڵ بتەکانیاندا دەیکەن بە مشت‌و مڕو قڕە قڕو هاوردو برد، بە بتەکان دەڵێن: بەخودا بەراستی ئێمە گومڕاو سەرلێشێواو بووین، کە لە دنیادا شتی هیچ‌و پووچی وەك ئێوەمان

---

[٢] تقدم فی مجلد سابع تسلسل/٨٦ رقم/٣/٤٢٣٠.

[٣] تقدم فی مجلد سابع تسلسل/٨٦ رقم/٤/٤٢٣١.

دەکرد بە هاوتاو هاوشانی خودای پەروەردگاری جیهانیان، لەراستیدا ئێمە تاوانبارە گەورەکان دەستەشکێنیان کردین‌و دەستیان بڕین‌و ئاوا گومڕاو ماڵوێرانیان کردین، بۆیە وا لەم ڕۆژەدا ئاوا بێکەس کەوتووین، نە کەسێ هەیە تکایەکمان بۆ بکا، نە دۆستێکی دڵسۆزمان هەیە کە لەم ڕۆژە ڕەشەدا چارێکمان بکات.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَلَا يَشْفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ارْتَضَى وَهُم مِّنْ خَشْيَتِهِ مُشْفِقُونَ – صدق الله العظيم – سورة الأنبياء – ٢١/٢٨}.

کەس بۆ کەس نابێ بە تکاکەرێ
مەر خودا بۆ خۆی ڕەزای لەسەربێ
هەتا تکاکار لە ترسی خودا
دەلەرزێ نەکا عەزابی بدا

## ١٣٠) باسی تکاکردنی پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی موحەممەدی خۆشەویست‌و نازدار (درووودی خودای لەسەربێ بە هەزاران هەزار) شفاعة نبينا محمد (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

٥٦٩٠– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: شَفَاعَتِي لأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي. قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيٍّ فَقَالَ لِي جَابِرٌ: يَا مُحَمَّدُ مَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْ أَهْلِ الْكَبَائِرِ فَمَا لَهُ وَلِلشَّفَاعَةِ. رواه الترمذيُّ وَأبو داود[1]:

جابیر (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەتا خاوەنی گوناهە هەرە گەورەکانیش لە ئۆمەتی من هەیانە بەر شەفاعەت‌و تکای من دەکەون! موحەممەدی کوڕی عەلی فەرمووی: جابیر پێی گوتم: ئەی موحەممەد! کەسێ کە خاوەنی گوناهی هەرە گەورە نەبێ چ کارێکی بە شەفاعەت هەیە! (ت/د–س/ح).

---

[1] بسند حسن (شرحه).

٥٦٩١- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يُدْخِلَ نِصْفَ أُمَّتِي الْجَنَّةَ وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ وَهِيَ لِمَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللّٰهِ شَيْئًا. رواه الترمذي[٢]:

عەوفی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: فریشتەیەکی ڕاسپاردە لە لایەن خوداوە هات بۆلام و خۆمی کرد بە سەرپشك کەیەکی لەم دوو خەڵاتە هەڵبژێرم: یا لەبڕ نیوەی ئۆمەتم بچنە بەهەشت، یاخود لە قیامەتدا خۆم شەفاعەتیان بۆ بکەم، منیش ئەوەم هەڵبژارد کە لە قیامەتدا شەفاعەتیان بۆ بکەم، ئەم تکاو شەفاعەتەیش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە لە سەرئیمان دەمرن و ئیمان دەردەبەن (ت).

٥٦٩٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) اَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا أَوَّلُ النَّاسِ يَشْفَعُ فِي الْجَنَّةِ وَأَنَا أَكْثَرُ الأَنْبِيَاءِ تَبَعًا[٣]:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: من یەکەم کەسم کە لە بەهەشتا تکا دەکەم لەناو پێغەمبەرەکانیشدا کەس نییە کە بەقەد من پەیڕەوانی زۆر بن. (م- ڕەزای خودای لێبێ).

٥٦٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وحذيفة (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَجْمَعُ اللّٰهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى النَّاسَ يوم القِيامَة فَيَقُومُ الْمُؤْمِنُونَ حَتَّى تُزْلَفَ لَهُمُ الْجَنَّةُ فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ يَا أَبَانَا اسْتَفْتِحْ لَنَا الْجَنَّةَ. فَيَقُولُ: وَهَلْ أَخْرَجَكُمْ مِنَ الْجَنَّةِ إِلاَّ خَطِيئَةُ أَبِيكُمْ آدَمَ لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ اذْهَبُوا إِلَى ابْنِي إِبْرَاهِيمَ خَلِيلِ اللّٰهِ قَالَ: فَيَقُولُ إِبْرَاهِيمُ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ إِنَّمَا كُنْتُ خَلِيلاً مِنْ وَرَاءَ وَرَاءَ اعْمِدُوا إِلَى مُوسَى (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي كَلَّمَهُ اللّٰهُ تَكْلِيمًا. فَيَأْتُونَ مُوسَى (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُ: لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى كَلِمَةِ اللّٰهِ وَرُوحِهِ. فَيَقُولُ

---

[٢] بسند لامطعن فيه (شرحه).

[٣] مسلم. إيمان: ٤٨٢، ٤٨٣.

عِيسَى: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَسْتُ بِصَاحِبِ ذَلِكَ. فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُومُ فَيُؤْذَنُ لَهُ وَتُرْسَلُ الأَمَانَةُ وَالرَّحِمُ فَتَقُومَانِ جَنَبَتَيِ الصِّرَاطِ يَمِينًا وَشِمَالاً فَيَمُرُّ أَوَّلُكُمْ كَالْبَرْقِ. قَالَ قُلْتُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي أَيُّ شَيْءٍ كَمَرِّ الْبَرْقِ قَالَ: أَلَمْ تَرَوْا إِلَى الْبَرْقِ كَيْفَ يَمُرُّ وَيَرْجِعُ فِي طَرْفَةِ عَيْنٍ ثُمَّ كَمَرِّ الرِّيحِ ثُمَّ كَمَرِّ الطَّيْرِ وَشَدِّ الرِّجَالِ تَجْرِي بِهِمْ أَعْمَالُهُمْ وَنَبِيُّكُمْ قَائِمٌ عَلَى الصِّرَاطِ يَقُولُ رَبِّ سَلِّمْ سَلِّمْ حَتَّى تَعْجِزَ أَعْمَالُ الْعِبَادِ حَتَّى يَجِيءَ الرَّجُلُ فَلاَ يَسْتَطِيعُ السَّيْرَ إِلاَّ زَحْفًا - قَالَ - وَفِي حَافَتَيِ الصِّرَاطِ كَلاَلِيبُ مُعَلَّقَةٌ مَأْمُورَةٌ بِأَخْذِ مَنْ أُمِرَتْ بِهِ فَمَخْدُوشٌ نَاجٍ وَمَكْدُوسٌ فِي النَّارِ. وَالَّذِي نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ إِنَّ قَعْرَ جَهَنَّمَ لَسَبْعُونَ خَرِيفًا. رواهما مسلم في الإيمان[٤].

ئەبو هورەیرەو حوزەیفە (رەزای خودایان لێبێ) فەرموویان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای پیرۆزو گەورە، لە رۆژی دوا رۆژدا، مەردوم کۆ دەکاتەوە، موسوڵمانەکان رادەوەستن، بەهەشت تەواو لێیان نزیک دەبێتەوەو بەچاو دەیبینن، دەچنە لای باوە ئادەم عەرزی دەکەن: ئەی باوکی ئێمە! داوا بفەرموو با دەرگای بەهەشتمان لێ بکەنەوە، با بۆن و بەرامەو شنەی رەحمەتی بێ بەسەرماندا، دەفەرموێ: من یارای ئەوەم نییە، ئەدی چی ئێوەی لە بەهەشت کردۆتە دەرێ جگە لە تاوانەکەی باوکتان، بەهۆی گوناهەکەی منەوە ئێوە کە نەوەی منن لە بەهەشت دەرکران، کەواتە ئەوە بەمن ناکرێ، بچنە لای ئیبراهیمی کوڕم کە دۆستی خۆشەویستی خودایە. فەرمووی ئیبراهیمیش دیسان دەفەرموێ: من یارای ئەوەم نییە، من دۆستی دووراو دوور بووم، من دۆستی پشت پەردەبووم، لەمنیش نزیکتر هەیە، بچنە لای مووسا، (دروودی خودای لەسەربێ) کە خودا بەخودی خۆی، بەبێ میانگەرو ناوەندیارو واسیتە، قسەو گوفتوگۆی لەگەڵ کردووە، کە دەڕۆنە خزمەتی، مووسایش دەفەرموێ: من یارای ئەوەم نییە، بڕۆن بۆ لای عیسا، کە لەسەر فەرموودەی خودا بەوشەی (کن فیکون: ببەئیتر دەبێ) لەدایک بووە، وە گیانێکی پاکە لە تەرەف خوداوە، عیساش دەفەرموێ: من یارای ئەوەم نییە، سەرەنجام دەچنە خزمەتی موحەممەد (دروودی

[٤] مسلم. إيمان: ٤٨١.

خودای لەسەربێ) جا حەزرەت دەکەوێتە خۆی، ڕێگەی پێ دەدرێ کە تکا بکا، ئەوجا دەسپاکی‌و خزمایەتی لە شێوەی دوو کەسدا دێن، لەلای ڕاست‌و لەلای چەپی پردی سیراتەوە، لەهەردوو بەرەوە ڕادەوەستن، دەبن بە شایەت‌و داوا کار لە تێپەڕبووەکان، یەکەمەکانتان بە سەرپشتی پردی سیراتدا وەك برووسکە تێ دەپەڕن. گوتی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باوك‌و دایکم بەسەر گەردانت بن، چۆن چۆنی وەکوو بروسکە تێ دەپەڕن، ئەمە واتای چی؟ فەرمووی: ئەدی نەتان دیوە کە برووسکە بە چاوتروکاندنێ دێت‌و دەڕوا، ئەوانیش ئاوا بەچاو لێکنانێ بە سەرپردی سیراتدا تێ دەپەڕن، ئەوجا وەکوو مەل‌و باڵندەی خێرا تیدەپەڕن، ئەوجا وەك هەڕاکردنی پیاوێ بەحوججەت ڕابکا ئاوا ڕادەبوورن، خێرایی‌و سستییان بەپێی کردەوەیانە، واتە: خێرایی‌و سستی هەرکەس بەپێی باشی‌و خراپی کردەوەکەیەتی.

پێغەمبەری ئێوەش (درووودو سەلام‌و سڵاوو درووودو صەڵەوات‌و ڕەحمەتی خودای گەورەو مەزنی لەسەربێ‌و سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و هەست‌و نەست هەمووی بەقوربانی گەردی سەرگۆڕی پیرۆزی بێ) لەوکاتەدا لەسەرپردی سیرات ڕاوەستاوەو بۆتان دەپاڕێتەوەو بە پەرۆشەوە خۆش خۆش هەر دەفەرموێ: خودایە! بەخۆشی، خودایە! بەبێوەی، خودایە! لەبەر بوونەوە ڕزگاریان بفەرموو، تا بەرە بەرە ئەوانە دێنە پێشەوە کە کردەوەکانیان لەبارەیاندا نییە کە بیان پەڕێنێتەوە، تاوای لێ دێ بەندەگەل دەکەونە چنگە پڕووزەو بە چنگە کرێ‌و بەقنگەخشکێ دەپەڕنەوە، بەهەردوو لێواری پردی سیراتەوە قولاپ هەڵاواسراوە، کاریان ئەوەیە کێیان پێ بگوترێ ئادەی بیگرن دەیگرن، ئیتر هەمو کەسێ بەهەر پەلەقاژەیێ بووە دەیەوێ خۆی قوتار بکا، هەندێ بە ڕووشاوی وورووکاوی ڕزگاریان دەبێ، هەندێکیش دەپەستێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە! ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: بەو کەسە کە گیانی ئەبو هورەیرەی بەدەسە، دیارە کە یەزدانی پاکە، ناخی قووڵایی دۆزەخ حەفتا ساڵە ڕێگەیە. ← (ب – ٤ ز ٨١ ل – ٢٤٦ ف – ٢/٣٠٣٠). (م – ڕەزای خودای لێبێ).

٥٦٩٤- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلاَ فَخْرَ وَبِيَدِى لِوَاءُ الْحَمْدِ وَلاَ فَخْرَ وَمَا مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِوَاهُ إِلاَّ تَحْتَ لِوَائِى وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ وَلاَ فَخْرَ قَالَ فَيَفْزَعُ النَّاسُ ثَلاَثَ فَزَعَاتٍ فَيَأْتُونَ آدَمَ – عليه السلام – فَيَقُولُونَ: أَنْتَ أَبُونَا آدَمُ فَاشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ. فَيَقُولُ: إِنِّى أَذْنَبْتُ ذَنْبًا أُهْبِطْتُ مِنْهُ إِلَى الأَرْضِ وَلَكِنِ ائْتُوا نُوحًا. فَيَأْتُونَ نُوحًا – عليه السلام – فَيَقُولُ إِنِّى دَعَوْتُ عَلَى أَهْلِ الأَرْضِ دَعْوَةً فَأُهْلِكُوا وَلَكِنِ اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ – عليه السلام – فَيَقُولُ: إِنِّى كَذَبْتُ ثَلاَثَ كَذَبَاتٍ. ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا مِنْهَا كَذْبَةٌ إِلاَّ مَاحَلَ بِهَا عَنْ دِينِ اللَّهِ وَلَكِنِ ائْتُوا مُوسَى. فَيَأْتُونَ مُوسَى – عليه السلام – فَيَقُولُ: إِنِّى قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا وَلَكِنِ ائْتُوا عِيسَى. فَيَأْتُونَ عِيسَى – عليه السلام – فَيَقُولُ: إِنِّى عُبِدْتُ مِنْ دُونِ اللَّهِ وَلَكِنِ ائْتُوا مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَأْتُونَنِى فَأَنْطَلِقُ مَعَهُمْ. قَالَ أَنَسٌ فَكَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فَآخُذُ بِحَلْقَةِ بَابِ الْجَنَّةِ فَأُقَعْقِعُهَا فَيُقَالُ مَنْ هَذَا؟ فَيُقَالُ: مُحَمَّدٌ. فَيَفْتَحُونَ لِى وَيُرَحِّبُونَ فَيَقُولُونَ مَرْحَبًا فَأَخِرُّ سَاجِدًا فَيُلْهِمُنِى اللَّهُ مِنَ الثَّنَاءِ وَالْحَمْدِ فَيُقَالُ لِى ارْفَعْ رَأْسَكَ سَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ وَقُلْ يُسْمَعْ لِقَوْلِكَ وَهُوَ الْمَقَامُ الْمَحْمُودُ الَّذِى قَالَ اللَّهُ (عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا). رواه الترمذي[٥]:

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا من سەرگەورەی سەرجەم نەوەی ئادەمم، ئاڵای سوپاس‌و ستایش‌و سەروەریم بە دەستەوەیەو پێشینان‌و پاشینان سوپاسم دەکەن، مەبەستم لە کردنی ئەم قسەیە شانازیی‌و خۆهەڵکێشان نییە، بەڵکوو مەبەستم لەمە بەیانی حاڵە، لەو ڕۆژەدا هەموو پێغەمبەرەکان لە ئادەمەوە بیگرە هەتا ئەوانی تریان هەموویان سەرجەم لەژێر ئاڵای مندان، وە من یەکەم کەس دەبم کە خاك (گۆڕ) دەم دەکاتەوە بۆم‌و لە گۆڕ دەردەچم، وە مەبەستم لەم

---

[٥] رواه الترمذي بسند حسن فى التفسير (شرحه). راجع مسلم. إيمان ٤٧٨ – ٤٨١ و راجع: بخارى. توحيد/٧٢١٠.

قسەیەش باسکردنی چاکەی خودایە بەسەر منەوەو بەیانی حاڵە، ئەگینا مەبەستم بەخۆوە نازین نییە. فەرمووی: جا خەڵکەکە سێ جار رادەچەنو هانا دەبەنە بەر ئادەم (درودی خودای لەسەربێ) عەرزی دەکەن: تۆ باوکمانی، کەواتە لەلای خودای خۆت تکامان بۆ بکە، دەفەرموێ: راستە کە من باوکی ئێوەم، بەڵام من لە بەهەشتا بووم، گوناهێکم لە دەست دەرچوو، بەهۆی ئەوەوە داپەڕیم بۆ سەر زەوی، وەلێ بڕۆن بۆلای نووح (درودی خودای لەسەربێ) کە دەچنە خزمەتی، دەفەرموێ: من تووکو نزای خراپم لەسەر تاپا خەڵکی زەوی کردو گوتم:

وَقَالَ نُوحٌ {رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا - سورة نوح - ٧١/٢٦}.

پەروەردگار! ئەی خودای من! قڕ بخەرە کافرانو تاقیان لێ ببڕەو سەری رووی زەوییان لێ پاك بکەرەوە. ئەوە بوو لەسەر داوای من خودا قڕی تێ خستنو تاقیان لێ دەرنەچوو، کەواتە بڕۆن بۆ خزمەتی حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خودای لەسەربێ) کە دەچنە خزمەتی، دەفەرموێ: من سێ درۆم کردووە ← (ب - ٤ ز - ١١٥ ل - ٣٧٦ ف - ٣/٣١٦٧).

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەر سێ درۆکەش بۆ رەزای خودا بووەو بۆ بەرگری لە ئایینی خودای گەورە بووە. فەرمووی: بچنە لای مووسا، کە دەچنە خزمەتی، دەفەرموێ: من پیاوێکم کوشتووە، بڕۆن بۆ خزمەت عیسا، عیسایش (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە ناهەق لە جیاتی خودا هەندێ منیان پەرستووە، بچن بۆ خزمەتی موحەممەد، دەڵێی لە بەرچاومە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جا ئاوا ئەڵقەڕێزی دەرگای بەهەشت دەگرمو تەقەی لێ هەڵدەستێنمو دەرگای بەهەشتی پێ دەکوتم، تا دەڵێن: ئەوە کێیە؟ دەڵێن: ئەوە موحەممەدە. ئیتر دەرگاکە دەکەنەوە بۆمو خۆشهاتنو خێرهاتنم لێ دەکەنو دەفەرموون: خۆش هاتی. ئەوجا منیش لەپەروو کوڕنووشێ بۆ خودا دەبەم، جا خودا بۆ خۆی ستایشو سوپاسێ کە شایانی ئەوجێو مەقامە بێ دەیخاتە ناو دڵمو دەیکەم، جا پێم دەگوترێ: ئەی خۆشەویست! سەرت لە کوڕنووش هەڵبڕە،

داوات چییە بیکە، هەرچی داوا بکەی دەیدەم پێت، تکا بکە تکات دەگیرێ، فەرمووبفەرموو قسەبکە گوێمان لە قسەتەو قسەت نادرێتە دواوە، ئەمە ئەو پایەو بارەگا پەسەندەیە کە خودا لە شانیا فەرموویەتی
{عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا – سورة الإسراء – ١٧٧٩}. (ت–س/ح).
→ (ب – ١ ز – ١٨١ ل – ٤٩١ پێش ژمارە/٩٧٣/١) + ( ب – ٦ ز – ١٨ ل – ٢٧٣ ف – ٣٩٦٦/١٦).

٥٦٩٥– عَنْ مَعْبَدُ بْنُ هِلاَلِ (رضي الله عنه) قَالَ: انْطَلَقْنَا وَمَعْنَا ثَابت البُنَانِي شَفِيعاً إِلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضي الله عنهم) فَانْتَهَيْنَا إِلَيْهِ وَهُوَ يُصَلِّى الضُّحَى فَاسْتَأْذَنَ لَنَا ثَابِتٌ فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ وَأَجْلَسَ ثَابِتًا مَعَهُ عَلَى سَرِيرِهِ فَقَالَ لَهُ: يَا أَبَا حَمْزَةَ إِنَّ إِخْوَانَكَ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ يَسْأَلُونَكَ أَنْ تُحَدِّثَهُمْ حَدِيثَ الشَّفَاعَةِ. قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ مَاجَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ فَيَأْتُونَ آدَمَ فَيَقُولُونَ لَهُ اشْفَعْ لِذُرِّيَّتِكَ. فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِإِبْرَاهِيمَ – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَإِنَّهُ خَلِيلُ اللَّهِ. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُوسَى – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَإِنَّهُ كَلِيمُ اللَّهِ. فَيُؤْتَى مُوسَى فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِعِيسَى – عَلَيْهِ السَّلاَمُ – فَإِنَّهُ رُوحُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ. فَيُؤْتَى عِيسَى فَيَقُولُ لَسْتُ لَهَا وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأُوتَى فَأَقُولُ أَنَا لَهَا. فَأَنْطَلِقُ فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّى فَيُؤْذَنُ لِى فَأَقُومُ بَيْنَ يَدَيْهِ فَأَحْمَدُهُ بِمَحَامِدَ لاَ أَقْدِرُ عَلَيْهِ الآنَ يُلْهِمُنِيهِ اللَّهُ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِى يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ رَبِّ أُمَّتِى أُمَّتِى. فَيُقَالُ انْطَلِقْ فَمَنْ كَانَ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ بُرَّةٍ أَوْ شَعِيرَةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنْهَا. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَرْجِعُ إِلَى رَبِّى فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِى يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ أُمَّتِى أُمَّتِى. فَيُقَالُ لِى انْطَلِقْ فَمَنْ كَانَ فِى قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنْهَا. فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ إِلَى رَبِّى فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِى يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَهْ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُمَّتِى أُمَّتِى. فَيُقَالُ لِى

انْطَلِقْ فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى أَدْنَى أَدْنَى مِنْ مِثْقَالِ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ. هَذَا حَدِيثُ أَنَسٍ الَّذِي أَنْبَأَنَا بِهِ فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِ فَلَمَّا كُنَّا بِظَهْرِ الْجَبَّانِ قُلْنَا لَوْ مِلْنَا إِلَى الْحَسَنِ فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ وَهُوَ مُسْتَخْفٍ فِي دَارِ أَبِي خَلِيفَةَ - قَالَ - فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ فَسَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَقُلْنَا يَا أَبَا سَعِيدٍ جِئْنَا مِنْ عِنْدِ أَخِيكَ أَبِي حَمْزَةَ فَلَمْ نَسْمَعْ مِثْلَ حَدِيثٍ حَدَّثَنَاهُ فِي الشَّفَاعَةِ قَالَ هِيهِ. فَحَدَّثْنَاهُ الْحَدِيثَ. فَقَالَ هِيهِ. قُلْنَا مَا زَادَنَا. قَالَ قَدْ حَدَّثَنَا بِهِ مُنْذُ عِشْرِينَ سَنَةً وَهُوَ يَوْمَئِذٍ جَمِيعٌ وَلَقَدْ تَرَكَ شَيْئًا مَا أَدْرِي أَنَسِيَ الشَّيْخُ أَوْ كَرِهَ أَنْ يُحَدِّثَكُمْ بِهِ فَتَتَّكِلُوا. قُلْنَا لَهُ حَدِّثْنَا. فَضَحِكَ وَقَالَ: خُلِقَ الإِنْسَانُ مِنْ عَجَلٍ مَا ذَكَرْتُ لَكُمْ هَذَا إِلاَّ وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُحَدِّثَكُمُوهُ. قال: ثُمَّ أَرْجِعُ إِلَى رَبِّي فِي الرَّابِعَةِ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ لِي يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ يَا رَبِّ ائْذَنْ لِي فِيمَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. قَالَ لَيْسَ ذَاكَ لَكَ - أَوْ قَالَ لَيْسَ ذَاكَ إِلَيْكَ - وَلَكِنْ وَعِزَّتِي وَكِبْرِيَائِي وَعَظَمَتِي وَجِبْرِيَائِي لأُخْرِجَنَّ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. رواه مسلم في الإيمان والبخاري في التوحيد[٦]:

مەعبەدی کوڕی هیلال (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: سابیتی بونانیمان کرد بە تکاکارو چووین بۆلای ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودا لە هەموو لایان بێ) کە گەیشتینە خزمەتی نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، سابیت روخسەتی بۆ خواستین، چووینە ژوورەوە بۆ خزمەتی، سابیت لەلای خۆیدا لەسەر کورسییەکەی جێکردەوەو دانیشتین. سابیت عەرزی کرد: ئەی باوکی حەمزە! ئەم برادەرە بەصرەییانە کە هاتوون بۆ لای تۆ دەیانەوێ فەرموودەکەی تکاو شەفاعەتیان بۆ بگێڕیتەوە.

ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کە رۆژی قیامەت بوو خەڵك دەورووژێن بەناویەکاو تاس دەیانباتەوەو دەشەڵەژێن و هاوار دەبەن بۆ ئادەم و پێی دەڵێن: تکا بکە بۆ

---

[٦] مسلم. إيمان: ٤٧٨. بخاری. توحيد: ٧٥١٠.

نەوەکەت، دەفەرموێ: ئەوە بۆ من دەست نادا، بڕۆن بۆ لای ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەربێ) چونکە ئەو دۆستی ئازیزی خودایە، کە دەچنە خزمەتی دەفەرموێ: ئەوە بۆ من دەست نادا بڕۆن بۆ لای مووسا کەهاوڕازی خودایە، کە دەچنە لای مووسا دەفەرموێ: ئەوە بۆ من دەست نادا، بڕۆن بۆ لای عیسا (دروودی لەسەر) کە گیانێکی پیرۆزە لەلایەنی خوداوەو بەفەرموودەی (كُنْ فَيَكُون)ی خۆی بووە، کەدەچنە لای عیسا (دروودی لەسەر) دەفەرموێ: ئەوە بۆ من دەست نادا، بەڵام بڕۆن بۆلای موحەممەد (دروودی خودای لەسەربێ) کە هاتنە لای من، دەڵێم: ئەمە بۆ من باشە، جا دەڕۆم‌و داوای ڕێگا دەکەم بۆ لای پەروەردگارم، ڕێگەم پێ دەدەن، لە خزمەتی خودادا رادەوەستم، بە جۆرێکی تایبەتی کە خودا دەیخاتە ناو دڵمەوە سوپاس‌و ستایشێکی وای دەکەم کە ئێستا یارای ئەوەم نییە، لە دواییدا لەپەرروو کوڕنووشی بۆ دەبەم، پێم دەبێژرێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە قسە بکە، قسەت ڕەوایە، گوێ بۆ قسەت شل دەکرێ، فەرموو داوا بکە، هەموو داوایەکت دەدرێ پێت، فەرموو تکا بکە تکای تۆ قەبووڵ دەکرێ. ئەو حەلە منیش دەڵێم: خودایە! بەزەییت بە ئومەتی مندا بێتەوە، خودایە! بەزەییت بە ئۆمەتی مندا بێتەوە، جا دەبێژرێ: بچۆ هەر کەسێ بەقەد سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ باوەڕو ئیمان لە دڵیا بێ لە دۆزەخ دەری بێنە. منیش دەچم ئەوانە گشت لەئاگر دەردەهێنم، دیسانەوە دەگەڕێمەوە بۆ خزمەتی پەروەردگارم‌و، بە دەستووری جارەکانی پێشوو سوپاس‌و ستایش‌و کوڕنووش‌و گوفتوگۆو داوای ڕەحمەت بۆ ئۆمەتم لە نێوانماندا دەبێ، ئەمجارە دەبێژرێ، بچۆ هەر کەسێ بەقەد گەڵێ گەڵێ کەمتر لە سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ باوەڕو ئیمان لەناو دڵیا بێ لە دۆزەخ دەری بێنە. جا دەچم ئەوانەیش دەردەهێنم.

مەعبەد دەڵێ ئەمە دەقی ئەو فەرموودەیە، کە ئەنەس بۆ ئێمەی گێڕایەوە. بەڵام کە لەلای ئەو چووینە دەرێ‌و گەیشتینە لای سەرووی قۆقزایی دەشتەکە، گوتمان: با سەرێ لە حەسەنی بەصریش بدەین، ئەوکاتە حەسەنی بەصری لە ترسی حەججاجی خوێنڕێژ خۆی شاردبۆوە، لەماڵی

ئەبو خەلیفەدا خۆی حەشار دابوو، فەرمووی: ئەی باوکی سەعید! ئەی شێخی بەصری! لە خزمەت ئەبو حەمزەی برادەری ئازیزی تۆوە هاتووین، فەرموودەیەکی لەبابەت تکاکارییەوە بۆ گێڕاینەوە هێشتا شتی وامان نەبیستووە، فەرمووی: ئادەی بیگێڕنەوە بۆم، با بزانم چییە، ئێمەیش فەرموودەکەمان بۆ گێڕاوە، فەرمووی: ئێی! عەرزیمان کرد: هەر ئەوەندەیە لەوە پتری بۆ نەگێڕاوینەوە، حەسەنی بەصری (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: بیست ساڵ لەمەوپێش ئەم فەرموودەیەی بۆ ئێمە گێڕاوەتەوە، ئەو حەلە ئیمامی ئەنەس (خودای لێ ڕازی بێ) هەرەتی هێزو جۆشی زرنگیو زەینرۆشنی بوو، وەڵێ دیارە ئێستا پیرەمێرد شتێکی لە فەرموودەکە پەڕاندووە، جا نازانم خۆشی – لەبەر ئیختیاریی – ئەوەی لەبیر چۆتەوە، یاخود حەزی نەکردووە کە ئەوەتان بۆ بگێڕێتەوە نەبادا بە ئومێدی ئەو مژدەیە لە خودا پەرستیو تاعەت ساردببنەوەو پشتی لێ بدەنەوە. عەرزیمان کرد: قوربان! دەی تۆ ئەو زیادەیەمان بۆ بگێڕەوە، ئەویش پێکەنیو فەرمووی: وەك خودا دەفەرموێ:

{خُلِقَ الْإِنسَانُ مِنْ عَجَلٍ – سورة الأنبياء – ٢١ / ٣٧}.

ئادەمیزاد ئەوەندەبێ حەوسەڵەو نەسرەوتە، ئەوەندە بێ ئارامە دەڵێی لە پەلەپەل دروست کراوە، هەر بۆیە من ئەمەم بۆ گێڕانەوە تا ئەوی تریشیان بۆ ڕیوایەت بکەم. حەسەن فەرمووی: ئەمە تەواوی ئەو فەرموودەیەیە کە ئەنەس بۆ ئێوەی گێڕاوەتەوە: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووشیەتی: لە جاری چواردەمدا کە دەگەڕێمەوە بۆ حوزووری پەروەدگارمو بە دەستووری جارەکانی پێشین سوپاسو ستایشی دەکەمو کوڕنووشی بەندەیی بۆ دەبەم پێم دەبێژرێ: ئەی موحەممەد! سەرهەڵبڕە لە سەجدە، فەرموو قسە بکە بە قسەت دەکەین، داواو داخوازیت چییە فەرموو عەرزی بارەگای پەروەردگارتی بکە هەتا بیدا بە تۆ، تکا بکە هەر تکایێ تۆ بیکەی پەسەندە، تکای تۆ گیرایە، منیش دەڵێم: ئەی پەروەدگارم! ڕێگەم پێ بدە ئەوانەیشی کە گوتوویانە لا اله الا الله: تەنیا یەزدانی پاك خودای بەهەقەو بەس. ئەوانەیش

لەسەر فەرمانی تۆ لە ئاگر دەربهێنم؟ خودا دەفەرموێ: ئەوە هی تۆ نییە، یا فەرمووی: دەفەرموێ: ئەوە بۆ تۆ نابێ، بەلام بەخششی تایبەتی خۆمە، بە گەورەیی و شان و شکۆو مەزناهی و یارایی خۆم سوێند دەخۆم، هەر کەسێ بە سینەی ساف، بەراستی گوتبێتی: لا الـه الا الله: هەر خودا خودایەو خودای تر نییە، بۆ خۆم لە دۆزەخ دەری دەهێنم! (ش = مسلیم و بوخاری (رەزای خودایان لێبێ).

٥٦٩٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَهْتَمُّونَ لِذَلِكَ فَيَقُولُونَ: لَوِ اسْتَشْفَعْنَا عَلَى رَبِّنَا حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا قَالَ: فَيَأْتُونَ آدَمَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُونَ أَنْتَ آدَمُ أَبُو الْخَلْقِ خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ اشْفَعْ لَنَا عِنْدَ رَبِّكَ حَتَّى يُرِيحَنَا مِنْ مَكَانِنَا هَذَا. فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - فَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ فَيَسْتَحْيِي رَبَّهُ مِنْهَا - وَلَكِنِ ائْتُوا نُوحًا أَوَّلَ رَسُولٍ بَعَثَهُ اللَّهُ - قَالَ - فَيَأْتُونَ نُوحًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ - فَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ فَيَسْتَحْيِي رَبَّهُ مِنْهَا - وَلَكِنِ ائْتُوا إِبْرَاهِيمَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي اتَّخَذَهُ اللَّهُ خَلِيلاً. فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُ: لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ فَيَسْتَحْيِي رَبَّهُ مِنْهَا - وَلَكِنِ ائْتُوا مُوسَى (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي كَلَّمَهُ اللَّهُ وَأَعْطَاهُ التَّوْرَاةَ. قَالَ فَيَأْتُونَ مُوسَى - عَلَيْهِ السَّلاَمُ - فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ - وَيَذْكُرُ خَطِيئَتَهُ الَّتِي أَصَابَ فَيَسْتَحْيِي رَبَّهُ مِنْهَا - وَلَكِنِ ائْتُوا عِيسَى رُوحَ اللَّهِ وَكَلِمَتَهُ. فَيَأْتُونَ عِيسَى رُوحَ اللَّهِ وَكَلِمَتَهُ فَيَقُولُ لَسْتُ هُنَاكُمْ. وَلَكِنِ ائْتُوا مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَبْدًا قَدْ غُفِرَ اللهُ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ. قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَأْتُونِي فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فَيُؤْذَنُ لِي فَإِذَا أَنَا رَأَيْتُهُ وَقَعْتُ سَاجِدًا فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ فَيُقَالُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ قُلْ تُسْمَعْ سَلْ تُعْطَهْ اشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَرْفَعُ رَأْسِي فَأَحْمَدُ رَبِّي بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ رَبِّي ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ ثُمَّ أَعُودُ فَأَقَعُ سَاجِدًا فَيَدَعُنِي مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدَعَنِي ثُمَّ يُقَالُ لِي: ارْفَعْ رَأْسَكَ يَا مُحَمَّدُ قُلْ تُسْمَعْ سَلْ تُعْطَهْ اشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَرْفَعُ

رَأْسِي فَأَحْمَدُ رَبِّي بِتَحْمِيدٍ يُعَلِّمُنِيهِ ثُمَّ أَشْفَعُ فَيَحُدُّ لِي حَدًّا فَأُخْرِجُهُمْ مِنَ النَّارِ وَأُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ – قَالَ فَلاَ أَدْرِي فِي الثَّالِثَةِ أَوْ فِي الرَّابِعَةِ قَالَ – فَأَقُولُ يَا رَبِّ مَا بَقِيَ فِي النَّارِ إِلاَّ مَنْ حَبَسَهُ الْقُرْآنُ أَيْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْخُلُودُ. رواه الأربعة[٧].

ئەنەس (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رۆژی دوا رۆژ خودا ئەو خەڵکە هەموویان کۆ دەکاتەوە، ئەنجا دەکەونە مشووری ئەوەو دەڵێن: ئادەی با کەسێ بکەین بە تکاکار هەتا لای پەروەردگارمان تکامان بۆ بکا کە لەم سەخڵەتیو شوێنە ناخۆشە بمانحەوێنێتەوە. فەرمووی: جا دەچنە خزمەت حەزرەتی ئادەم (دروودی خودای لەسەربێ) عەرزی دەکەن: تۆ ئەی ئادەم! تۆ باوکی هەموو ئادەمیزادی، خودا بە دەستی خۆی دروستی کردووی، لە گیانی خۆی گیانی کردووە بە بەرتا، فەرمانی بەفریشتەکان فەرموو کوڕنووشیان بۆ بردیت، کەوابوو تۆ لەلای خودا خاترداری کەواتە لەلای خودای خۆت تکامان بۆ بکە تاکوو لەم شوێنە پڕ لە سەخڵەتیو مەینەتییەمان رزگارمان ببێ. ئادەم دەفەرموێ: ئەوە بەمن ناکرێ، یادی گوناهەکەی خۆی دەکاتەوە کە لە بەری دەرەختی گەندمی خواردو لە بەهەشت دەرکرا، لەبەر ئەوە شەرم لە خودا دەکاو دەفەرموێ: بەڵام بچنە لای حەزرەتی نووح (دروودی خودای لەسەربێ) کە یەکەم پێغەمبەر بووە کە خودا رەوانەی کردووە بۆ سەر ئادەمیزاد فەرمووی: کە دەچنە لای نووحیش (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوە بەمن ناکرێ، ئەویش یادی گوناهەکەی خۆی دەکاتەوەو لەبەر ئەوە شەرم لەخودا دەکاو دەفەرموێ: بەڵام بچنە لای ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەربێ) کە خودا کردوویەتی بە دۆستی ئازیزی خۆی. کە دەچنە خزمەتی حەزرەتی ئیبراهیم (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوە بەمن ناکرێ، ئەویش یادی گوناهەکەی خۆی دەکاتەوەو دەفەرموێ: من ئەو گوناهەم کردووە، لەبەر ئەوە شەرم لە خودا دەکاو روو لە خودا نانێو دەفەرموێ: بەڵام بچن بۆ خزمەت مووسا (دروودی

[٧] بخاری. رقاق: ٦٥٦٥. مسلم. إيمان: ٤٧٤.

خودای لەسەربێ) کە خودا بەبێ ناوەندیار قسەو گوفتوگۆی لەگەڵدا کردووەو مووساش دەفەرموێ: ئەوە بەمن ناکرێ ئەویش باسی گوناهەکەی خۆی دەکاو لەبەر ئەوە شەرم لەخودا دەکاو دەفەرموێ: بەلام برۆن بۆ لای عیسا (درودی خودای لەسەربێ) کە گیانو فەرموودەی خودایە، کە دەڕۆنە خزمەتی، دەفەرموێ: ئەوە بەمن ناکرێ، بەلام بچن بۆ خزمەت موحەممەد (درودی خودای لەسەربێ) کە بەندەیەکی ئازیزی خودایە، خودا لە گوناهی بەرو دوای خۆش بووە فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوجا دێن بۆ کن من، رێگە دەخوازم بۆ خزمەتی خودا، رێگەم پێ دەدرێ، جا کە لەوێدا پەروەردگاری خۆم بەچاوی سەر دەبینم لەپەرروو کوڕنووشی بەندەیی بۆ دەبەم، ئیتر ئەوەندەی خودا خۆی حەزبکا ئەوەندە لە کوڕنووشدا لێم دەگەڕێ، تا دەبێژرێ: ئەی موحەممەد! بڵێ گوێم لێتە، داوابکە تا بتدەمێ، تک بکە تکای تۆ دەگیرێ، ئەوکاتە سەرم بەرز دەکەمەوە، بە جۆرە سوپاسو ستایشێکی شیرین کە شایانی ئەو پایەیە بێ سوپاسی خودا دەکەم، کە ئەوستایشە خودا خۆی فێرم دەکا، کە تکای خۆم عەرزی خودا دەکەم، خودا سنوورێکم بۆ دیاری دەکا، ئەوانەی بەر ئەو سنووە بکەون لە دۆزەخ دەریان دەهێنمو دەیانخەمە بەهەشتەوە، دیسان دەچمەوە بۆ حوزوورو بە دەستووری جاری پێشوو دەکەمو خودایش بەهەمان شێوەم لەگەڵ دەکاتەوەو سنوورێکی ترم بۆ دیاری دەکا، وەك ئەوە هەرکەسێ حەجی نەکردبێ، یا رۆژووی نەگرتبێ، وە بەم جۆرە، جا ئەوانیش لە دۆزەخ دەردەهێنمو دەیانخەمە بەهەشتەوە. فەرمووی: ئەدی نازانم لەجاری سێیەمدا، یا لەجاری چوارەمدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوجا دەڵێم: ئەی پەروەدگارم! کەس لە دۆزەخدا نەماوە، ئەوانە نەبێ کە قورئان گلی داونەتەوە واتە: ئەو گاورو ناموسوڵمانانەی کە بەپێی دەقی ئایەتەکانی قورئان بە ئێجگاری هەتا هەتایە لەناو دۆزەخدا دەمێننەوە! (ب/م/د/ت).

٥٦٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا أُتِيَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِلَحْمٍ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الذِّرَاعُ، وَكَانَتْ تُعْجِبُهُ، فَنَهَسَ مِنْهَا نَهْسَةً ثُمَّ قَالَ أَنَا سَيِّدُ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَهَلْ تَدْرُونَ مِمَّ ذَلِكَ يُجْمَعُ اللهُ يَومْ القِيَامَةِ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ، يُسْمِعُهُمُ الدَّاعِي، وَيَنْفُذُهُمُ الْبَصَرُ، وَتَدْنُو الشَّمْسُ، فَيَبْلُغُ النَّاسَ مِنَ الْغَمِّ وَالْكَرْبِ مَا لاَ يُطِيقُونَ وَلاَ يَحْتَمِلُونَ فَيَقُولُ بَعْضَ النَّاسُ لِبَعْضٍ: ائْتُوا آدَمَ فَيَأْتُونَ آدَمَ – عليه السلام – فَيَقُولُونَ: يا آدم أَنْتَ أَبُو الْبَشَرِ خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ. وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ، وَأَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ فَسَجَدُوا لَكَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا قَدْ بَلَغَنَا فَيَقُولُ آدَمُ إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ نَهَانِي عَنِ الشَّجَرَةِ فَعَصَيْتُهُ، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِى، اذْهَبُوا إِلَى نُوحٍ، فَيَأْتُونَ نُوحًا فَيَقُولُونَ يَا نُوحُ إِنَّكَ أَنْتَ أَوَّلُ الرُّسُلِ إِلَى أَهْلِ الأَرْضِ، وَقَدْ سَمَّاكَ اللَّهُ عَبْدًا شَكُورًا اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ، أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ، أَلاَ ترى مَا قَدْ بَلَغَنَا فيقولُ لَهُمْ: إِنَّ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنَّهُ قَدْ كَانَتْ لِي دَعْوَةٌ دَعَوْتُهَا عَلَى قَوْمِي نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِى، اذْهَبُوا إِلَى إِبْرَاهِيمَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُونَ يَا إِبْرَاهِيمُ، أَنْتَ نَبِيُّ اللَّهِ وَخَلِيلُهُ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ أَلاَ تَرَى مَاقَدْ بَلَغَنَا فَيَقُولُ لَهُمْ إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَذَكَرَ كَذِبَاتِهِ نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِى اذْهَبُوا إِلَى مُوسَى، فَيَأْتُونَ مُوسَى (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُونَ: يَا مُوسَى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَضَّلَكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ عَلَى النَّاسِ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ فَيَقُولُ إِنَّ رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ، وَإِنِّي قَدْ قَتَلْتُ نَفْسًا لَمْ أُومَرْ بِقَتْلِهَا، نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِى، اذْهَبُوا إِلَى عِيسَى (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَأْتُونَ عِيسَى فَيَقُولُونَ يَا عِيسَى أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَكَلَّمْتَ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ صَبِيًّا اشْفَعْ لَنَا أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ فَيَقُولُ عِيسَى إِنَّ

رَبِّي قَدْ غَضِبَ الْيَوْمَ غَضَبًا لَمْ يَغْضَبْ قَبْلَهُ مِثْلَهُ، وَلَنْ يَغْضَبَ بَعْدَهُ مِثْلَهُ – وَلَمْ يَذْكُرْ لَهُ ذَنْبًا – نَفْسِي نَفْسِي نَفْسِي، اذْهَبُوا إِلَى غَيْرِي اذْهَبُوا إِلَى مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَأْتُونَ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَقُولُونَ يَا مُحَمَّدُ أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَخَاتَمُ الأَنْبِيَاءِ، وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، اشْفَعْ لَنَا إِلَى رَبِّكَ أَلاَ تَرَى إِلَى مَا نَحْنُ فِيهِ فَأَنْطَلِقُ فَآتِي تَحْتَ الْعَرْشِ، فَأَقَعُ سَاجِدًا لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ ثُمَّ يَفْتَحُ اللَّهُ عَلَيَّ مِنْ مَحَامِدِهِ وَحُسْنِ الثَّنَاءِ عَلَيْهِ شَيْئًا لَمْ يَفْتَحْهُ عَلَى أَحَدٍ قَبْلِي ثُمَّ يُقَالُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، سَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَرْفَعُ رَأْسِي، فَأَقُولُ أُمَّتِي يَا رَبِّ، أُمَّتِي يَا رَبِّ فَيُقَالُ يَا مُحَمَّدُ أَدْخِلْ مِنْ أُمَّتِكَ مَنْ لاَ حِسَابَ عَلَيْهِمْ مِنَ الْبَابِ الأَيْمَنِ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ وَهُمْ شُرَكَاءُ النَّاسِ فِيمَا سِوَى ذَلِكَ مِنَ الأَبْوَابِ، ثُمَّ قَالَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّ مَا بَيْنَ الْمِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَحِمْيَرَ، أَوْ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَبُصْرَى. رواه مسلم والترمذي[٨]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: ڕۆژێك مەرگەی گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) حەزی لە گۆشتی دەست بوو، لەبەر ئەوە دەستێکیان بۆ دانا، قەپاڵێکی لێ گرتو فەرمووی: لە دوا ڕۆژدا خۆم سەروەری بەرەی ئادەمیزادم، ئایا دەزانن ئەوە بۆ؟ ڕۆژی دوا ۆژ خودا پێشینانو پاشینان لەیەك دەشتی تەختی پاندا کۆ دەکاتەوە، بانگکەرێ بانگیان بکا هەموویان گوێیان لێیەتیو دەنگی یەك کەس بەهەموویان دەگا، کەسێکیش تەماشایان بکا هەموویان دەبینێ، خۆریان لێ نزیك دەبێتەوە تەواو تەواو، مەردوم دەکەونە خەمو پەژارەو تەنگانەیەکی واوە، نە وزەیان لە بەردا دەمێنێو نە بەرگە دەگرن. لەناو خۆیانا بە یەکتری دەڵێن: با بچین بۆ خزمەت باوە ئادەم، دەچنە خزمەتی، دەڵێن: ئەی ئادەم! تۆ باوکی هەموو ئادەمیزادیی، خودا بەدەستی خۆی

---

[٨] بخاری. أحاديث الأنبياء: ٣٣٦١. مسلم. إيمان: ٤٩ = تجريد البخاری = مختصر صحيح البخاری/٤ ل- ٤٥٣ رقم/ ١٦٧٠ = ٤٧١٢، ٣٣٤٠، ٣٣٦١.

دروستی کردوویت، لەگیانی خۆی کردووە بە بەرتا، فەرمانی بە فریشتەکان کرد کوڕنووشیان بۆ بردیت، کەوابوو تۆ لەلای خودا خاترت هەیە، لەبەر ئەوە لە خزمەت خودادا تکامان بۆ بکە، نابینی کە چیمان بەسەر هاتووە، سەیرناکەی تووشی چی رۆژێکی رەش بووین، ئادەم (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەدگارم رقێکی ئەو تۆی گرتووە، نە لەمەو بەرو نە لەمەودوا نەرقی وای هەڵساوەو نە رقی وای هەڵ دەستێ، کاتی خۆی خودا قەدەغەی لێکردم کە لەو درەختە نەخۆم، بەڵام من بە گوێم نەکردو بێ فەرمانی ئەومکرد، من بەتەنیا خەمی خۆمەو بەس (نفسی نفسی: خۆم خۆم) بچنە لای کەسێکی تر: بڕۆنە خزمەت نووح پێغەمبەر، ئەوجا دەچنە خزمەت نووح و عەزی دەکەن: ئەی نووح! تۆ یەکەم پێغەمبەری رەوانەکراوی خودای بۆ سەر خەڵکی سەر رووی زەوی، خودا لە قورئانا ناوی بەندەی سوپاسگوزار وەك دەفەرموێ:

{ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا - سورة الإسراء - ٣/١٧}.

کەواتە لە خزمەت پەروەردگارتا تکامان بۆ بکە، خۆ دەبینیت حاڵمان چەن پەرێشانەو چیمان بەسەر هاتووە، نووح پێیان دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی سەختی وای هەڵساوە، کە نە لەمەوپێش و نە لەمەوپاش نە ڕقی وای هەڵساوەو نە ڕقی وای هەڵ دەستێ، وەکی تریش من خودا نزایەکی گیرای پێ خەڵاتکردم، بەڵام لە جیهانا ئەو نزایەمم لەگەلەکەی خۆمکرد، ئیتر رووی ئەوەم نەماوە، نەفسی نەفسی، خۆم خۆم، بچن بۆ خزمەتی ئیبراهیم (درووودی خودای لەسەربێ) دەچنە خزمەت ئەویش دەڵێن: لە خەڵکی سەرزەوی خودا تۆی هەڵبژاردووەو کردوویتی بە دۆستی ئازیزی خۆی، لە خزمەت خودا تا تکامان بۆ بفەرموو، خۆ دەبینیت کە چۆن تووشی ئەم هەمکە خەمو ناخۆشییە بووین، دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی تەواوی هەڵساوە، بۆ عوزرخوایی باسی درۆکانی خۆی دەکا، دەفەرموێ: نەفسی نەفسی: خەمی خۆمەو بەس خەمی خۆمەو بەس! بچن بۆ خزمەت

مووسا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەچن دەڵێن ئەی مووسا! تۆ فرستادەی نازداری یەزدانی پاکی، خودا بە پەیامو نامەی گوفتوگۆ لەگەڵتا باوی تۆی داوە بەسەر هەموو مەردومدا، دەی لە خزمەت خودادا تکامان بۆ بکە، خۆ خۆت چاوت لە حاڵمانە کە توشی چی گۆبەندێ بووین، پێیان دەفەرموێ: ئەوە راستەو وەك دەڵێن هەمووی وایە، بەڵام ئەمڕۆ تکای وا گەوەو گشتی بە هەموو کەس ناکرێ، چونکە ئەمڕۆ خودا رقێکی وەهای هەڵساوە، سەرەڕای ئەوەیش من کاتی خۆی پیاوێکم لە خۆمەوە کوشت، خودا فەرمانی پێ نەکرد بووم کە بیکوژم، ئاوا عوزرخوایی کردو فەرمووی: نەفسی نەفسی، من تەنیا مشووری خۆم دەخۆمو بەس، بچن بۆ خزمەت عیسا (درودی خودای لەسەربێ) دەچن عەرزی دەکەن. ئەی عیسا! تۆ هەم پێغەمبەری خودای، هەم بە ساوایی لە بێشکەدا قسەو گوفتوگۆت لەگەڵ مەردومدا دەکرد، هەم ئەو وشە پیرۆزە یەزدانییەی کە خودا بۆ خۆی گەیاندی بە مەریەمی دایکی تۆ، کەوا بوو ئادەی بفەرموو لە خزمەت خودای خۆتا تکامان بۆ بکەو لەم سەخڵەتییە رزگارمان بکە، خۆ خۆت چاوت لەبارو دۆخمانە کە چیمان بەسەر هاتووە، دەفەرموێ: ئەمڕۆ پەروەردگارم رقێکی گەورەی واوای هەڵساوە، نەفسی نەفسی: خۆم خۆم، بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر، بڕۆن بۆ خزمەت موحەممەد! جا ئەوجا دێنە لای من، دەڵێن: ئەی موحەممەد! تۆ خاوەنی گەلێ بەهرەی گەورە گەورەی، وەك ئەوە پێغەمبەری خودای، دواهێنەری پێغەمبەرانیو دوا پێغەمبەری، خودا لە گوناهیی بەرو دوات خۆش بووە، کەواتە فەرموو بفەرموو تکاو شەفاعەتمان بۆ بکە لەلای خودای خۆت، خۆ خۆت دەبینی کەواین لەچی گۆبەندێکا. ئیتر منیش دەردەچمو خۆم دەگەیەنمە ژێر تەختو بارەگای خوداو لەوێ کوڕنووشێکی دوورو درێژی پڕ لەستایشی جوان دەبەم بۆ خودای خۆم، خودا زەینم دەکاتەوە، جۆرە ستایشێکی زۆر نایابو سوپاسێکی جوان جوانی خۆییم فێر دەکاو دەیخاتە ناو دڵمەوە، کەلەوە بەر فێری کەسی تری نەکردبێ، لەپاشدا دەفەرموێ: ئەی موحەممەد! سەرت هەڵبڕە، داوا بکە، هەرچی داوا بکەی دەیدەم بەتۆ، تکا بکە هەر تکایە بکەی،

گەورە بێ یا بچووك، گیرای دەكەم ئیتر منیش سەرم بەرز دەكەمەوەو دەڵێم: ئەی خودایە! بەزەییت بێتەوە بەگەڵی مندا، ئەی خودایە بەزەییت بەگەڵی مندا بێتەوە، جا دەگوترێ: ئەی موحەممەد! ئەو حەفتا هەزار كەسانەی كە پرسینەوەیان لەسەر نییە، لە گەڵی خۆت، ئەوانە لە دەرگای لای راستی دەرگاكانی بەهەشتەوە ببەرە ناو بەهەشتەوە، ئۆمەتەكەشت لە هەموو دەرگاكانی تریشدا بۆچوونە ژوورەوە هاوبەشی خەڵكەكەی تریش بن، بەو كەسە كە گیانی موحەممەدی بە دەسە، كە دیارە خودای گەورەیە، بەینی دوو لاشیپان لە لاشیپانی دەرگای بەهەشت بەقەد بەینی مەككەو هەجەر دەبێ. یا فەرمووی: بەقەد مابەینی مەككەو بوصرا دەبێ! (م/ت).

## ١٣١) پێغەمبەرانو باوەڕدارانیش (بە فەرمانی خودا) تكادەكەن بۆ كەسێكی تر
## يشفع النبيون والمؤمنون بإذن الله تعالى

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ الشَّفَاعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَنُ وَرَضِيَ لَهُ قَوْلًا – سورة طـه – ٢٠ / ١٠٩).

لەو رۆژەدا كە ئەو كارەساتە روو دەدا شەفاعەتو تكاكاریی كەس سوودی نییە، مەگەر تكای كەسێ كە خودای میهرەبان خۆی رێگەی بداو قسەو تكاكەی ئەوی لە لاپەسەند بێ.

٥٦٩٨– عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَهْطٍ بِإِيلِيَاءَ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: يَدْخُلُ الْجَنَّةَ بِشَفَاعَةِ رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَكْثَرُ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ سِوَاكَ قَالَ: سِوَايَ. فَلَمَّا قَامَ قُلْتُ مَنْ هَذَا قَالُوا هَذَا ابْنُ أَبِي الْجَذْعَاءِ[1]:

عەبدوڵڵای كوڕی شەقیق (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لە شاری قودس چوومە ناو تاقمەیێ، پیاوێكیان تیابوو فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەربێ): بەهۆی تکای پیاوێ لە ئۆمەتی من پتر لە هۆزی بەنی تەمیم دەچنە بەهەشت. گوترا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەو پیاوە خۆت نیت؟ فەرمووی: من نیم یەکێکی ترە، جاکە پیاوەکەی ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە کۆڕەکەی چۆڵ کردو رۆیشت پرسیم ئەمە کێبوو؟ گوتیان: ئەمە ئیبنو ئەبولجەدعاء بوو! (ت- س/ص).

٥٦٩٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَشْفَعُ لِلْفِئَامِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلْقَبِيلَةِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلْعُصْبَةِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَشْفَعُ لِلرَّجُلِ حَتَّى يَدْخُلُوا الْجَنَّةَ[٢]:

ئەبو سەعید (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: تکاکاری وا لە ناوگەلی مندا هەڵ دەکەوێ، بۆ چەن کۆمەڵی گەورە گەورە تکا دەکا، هی وایان هەیە بۆ هۆزێ تکا دەکا، هی وایان هەیە بۆ دەستەیێ تکا دەکا، هی واشیان هەیە بۆ یەك پیاو تکا دەکا، هەر کەسەیان بەپێی پایەی خۆی لەلای خودا تکا دەکا، بە زۆری تکاکەیان گیرادەبێ و ئەوانەی کە تکایان بۆ دەکەن بەهۆی تکای ئەوانەوە دەچنە بەهەشت. (ت- س/ح).

٥٧٠٠- عَنِ الْحَسَنِ الْبَصْرِيِّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَشْفَعُ عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِي مِثْلِ رَبِيعَةَ وَمُضَرَ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٣]:

حەسەنی بەصری (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: بیستوومە لە کەسێکی باوەڕپێکراو کە حەزرەتی پێغەمبەری خەشویستە (درووودو رەحمەتو سەلامو صەلاواتی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرموویەتی: لە رۆژی دوا رۆژدا عوسمان کوڕی عەففان تکا دەکا بۆ خەڵکانێ کە ژمارەیان ئەوەندەی ژمارەی هۆزی رەبیعەو هۆزی موزەر دەبێ. (ت).

---

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٣] سكت عن درجته الشارح.

٥٧٠١- فەرموودەیی (يشفع الشهيد في سبعين من أهل بيتـه) لـه جيهاددا رابورد، لەسەر باسی (شەهيد تكا بۆ خەڵكێكی زۆر دەكا)[٤].

٥٧٠٢- فەرموودەی (يشفع يوم القيامة ثلاثة: الانبياء..) ئەميش هەروەها لە هەمان شوێنی فەرموودەی پێشوودا ڕابورد[٥].

٥٧٠٣- عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ نَاسًا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَعَمْ. قَالَ: هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ بِالظَّهِيرَةِ صَحْوًا لَيْسَ مَعَهَا سَحَابٌ وَهَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ صَحْوًا لَيْسَ فِيهَا سَحَابٌ. قَالُوا لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: مَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ اللَّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ كَمَا تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ أَحَدِهِمَا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ لِيَتَّبِعْ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ. فَلاَ يَبْقَى أَحَدٌ كَانَ يَعْبُدُ غَيْرَ اللَّهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى مِنَ الأَصْنَامِ وَالأَنْصَابِ إِلاَّ يَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلاَّ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ وَفَاجِرٍ وَغُبَّرِ أَهْلِ الْكِتَابِ فَيُدْعَى الْيَهُودُ فَيُقَالُ لَهُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ كَذَبْتُمْ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلاَ وَلَدٍ فَمَاذَا تَبْغُونَ قَالُوا عَطِشْنَا يَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا. فَيُشَارُ إِلَيْهِمْ أَلاَ تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ إِلَى النَّارِ كَأَنَّهَا سَرَابٌ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ. ثُمَّ يُدْعَى النَّصَارَى فَيُقَالُ لَهُمْ مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ لَهُمْ كَذَبْتُمْ. مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِنْ صَاحِبَةٍ وَلاَ وَلَدٍ. فَيُقَالُ لَهُمْ مَاذَا تَبْغُونَ فَيَقُولُونَ عَطِشْنَا يَا رَبَّنَا فَاسْقِنَا. قَالَ: فَيُشَارُ إِلَيْهِمْ أَلاَ تَرِدُونَ فَيُحْشَرُونَ إِلَى جَهَنَّمَ كَأَنَّهَا سَرَابٌ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَيَتَسَاقَطُونَ فِي النَّارِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ إِلاَّ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ تَعَالَى مِنْ بَرٍّ وَفَاجِرٍ أَتَاهُمْ رَبُّ الْعَالَمِينَ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى فِي أَدْنَى صُورَةٍ مِنَ الَّتِي رَأَوْهُ فِيهَا. قَالَ فَمَا تَنْتَظِرُونَ تَتْبَعُ كُلُّ أُمَّةٍ مَا كَانَتْ تَعْبُدُ. قَالُوا يَا رَبَّنَا فَارَقْنَا النَّاسَ فِي الدُّنْيَا أَفْقَرَ مَا كُنَّا إِلَيْهِمْ وَلَمْ نُصَاحِبْهُمْ. فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ لاَ نُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا - مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا - حَتَّى إِنَّ

---

[٤] تقدم فى مجلد ثامن. تسلسل/١٣ رقم/٤٣٣٤/١.

[٥] تقدم فى مجلد ثامن. تسلسل/١٣ رقم/٤٣٣٥/٢.

بَعْضُهُمْ لَيَكَادُ أَنْ يَنْقَلِبَ. فَيَقُولُ هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ فَتَعْرِفُونَهُ بِهَا فَيَقُولُونَ نَعَمْ. فَيُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ فَلاَ يَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لِلَّهِ مِنْ تِلْقَاءِ نَفْسِهِ إِلاَّ أَذِنَ اللَّهُ لَهُ بِالسُّجُودِ وَلاَ يَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ اتِّقَاءً وَرِيَاءً إِلاَّ جَعَلَ اللَّهُ ظَهْرَهُ طَبَقَةً وَاحِدَةً كُلَّمَا أَرَادَ أَنْ يَسْجُدَ خَرَّ عَلَى قَفَاهُ. ثُمَّ يَرْفَعُونَ رُءُوسَهُمْ وَقَدْ تَحَوَّلَ فِي صُورَتِهِ الَّتِي رَأَوْهُ فِيهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ أَنْتَ رَبُّنَا. ثُمَّ يُضْرَبُ الْجِسْرُ عَلَى جَهَنَّمَ وَتَحِلُّ الشَّفَاعَةُ وَيَقُولُونَ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. قِيلَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْجِسْرُ قَالَ: دَحْضٌ مَزِلَّةٌ. فِيهِ خَطَاطِيفُ وَكَلاَلِيبُ وَحَسَكٌ تَكُونُ بِنَجْدٍ فِيهَا شُوَيْكَةٌ يُقَالُ لَهَا السَّعْدَانُ فَيَمُرُّ الْمُؤْمِنُونَ كَطَرْفِ الْعَيْنِ وَكَالْبَرْقِ وَكَالرِّيحِ وَكَالطَّيْرِ وَكَأَجَاوِيدِ الْخَيْلِ وَالرِّكَابِ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَمَخْدُوشٌ مُرْسَلٌ وَمَكْدُوسٌ فِي نَارِ جَهَنَّمَ. حَتَّى إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ بِأَشَدَّ مُنَاشَدَةً لِلَّهِ فِي اسْتِقْصَاءِ الْحَقِّ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِلَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ فِي النَّارِ يَقُولُونَ رَبَّنَا كَانُوا يَصُومُونَ مَعَنَا وَيُصَلُّونَ وَيَحُجُّونَ. فَيُقَالُ لَهُمْ أَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ. فَتُحَرَّمُ صُوَرُهُمْ عَلَى النَّارِ فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا قَدْ أَخَذَتِ النَّارُ إِلَى نِصْفِ سَاقَيْهِ وَإِلَى رُكْبَتَيْهِ ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا مَا بَقِيَ فِيهَا أَحَدٌ مِمَّنْ أَمَرْتَنَا بِهِ. فَيَقُولُ ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا أَحَدًا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا. ثُمَّ يَقُولُ ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ نِصْفِ دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا أَحَدًا. ثُمَّ يَقُولُ ارْجِعُوا فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا ثُمَّ يَقُولُونَ رَبَّنَا لَمْ نَذَرْ فِيهَا خَيْرًا. وَكَانَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ يَقُولُ إِنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي بِهَذَا الْحَدِيثِ فَاقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ (إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِنْ تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِنْ لَدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا) فَيَقُولُ: اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ شَفَعَتِ الْمَلاَئِكَةُ وَشَفَعَ النَّبِيُّونَ وَشَفَعَ الْمُؤْمِنُونَ وَلَمْ يَبْقَ إِلاَّ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ قَدْ عَادُوا حُمَمًا فَيُلْقِيهِمْ فِي نَهْرٍ فِي أَفْوَاهِ الْجَنَّةِ يُقَالُ لَهُ نَهْرُ الْحَيَاةِ فَيَخْرُجُونَ كَمَا تَخْرُجُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ أَلاَ تَرَوْنَهَا تَكُونُ إِلَى الْحَجَرِ أَوْ إِلَى الشَّجَرِ مَا

يَكُونُ إِلَي الشَّمْسِ أُصَيْفِرُ وَأُخَيْضِرُ وَمَا يَكُونُ مِنْهَا إِلَى الظِّلِّ يَكُونُ أَبْيَضَ. فَقَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ كَأَنَّكَ كُنْتَ تَرْعَى بِالْبَادِيَةِ قَالَ: فَيَخْرُجُونَ كَاللُّؤْلُؤِ فِي رِقَابِهِمُ الْخَوَاتِمُ يَعْرِفُهُمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ هَؤُلاَءِ عُتَقَاءُ اللَّهِ الَّذِينَ أَدْخَلَهُمُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ وَلاَ خَيْرٍ قَدَّمُوهُ ثُمَّ يَقُولُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ فَمَا رَأَيْتُمُوهُ فَهُوَ لَكُمْ. فَيَقُولُونَ رَبَّنَا أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ. فَيَقُولُ لَكُمْ عِنْدِي أَفْضَلُ مِنْ هَذَا فَيَقُولُونَ يَا رَبَّنَا أَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ هَذَا. فَيَقُولُ رِضَايَ فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا. رواه الشيخان والترمذي. فلله مزيد الحمد ووافر الشكر[٦]:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: چەند کەسێ عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا لە ڕۆژی دوارۆژدا خودای خۆمان دەبینین؟ فەرمووی: بەڵێ دەیبینن لە پاشدا فەرمووی: ئایا بە ڕۆژی نیوەڕۆ ئاسمان سایەقەی سامالْ بێ و دەنك هەوری پێوە نەبێ، لە دیتنی خۆردا هیچ ئەرکێ، زەحمەتێ، دەبینن، یاخود ئایا شەوی چواردەی مانگ کە ئاسمان سایەقەی ساف بێ، هیچ هەوری نەبێ، بۆ چاوپێکەوتنی مانگ هیچ ئەرك دەکێشن؟ گوتیان: نەخەیر ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەی بەبێ ئەرکو کێشەو بەرە وەك بینینی ئەم دوانە لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا بەچاوی سەر بەخۆشیو ئاسانی خودای خۆتان دەبینن، کە خودایەکی پیرۆزو گەورەیە. کە ڕۆژی دوا ڕۆژ بوو، بانگکەرێ بانگەواز دەکا. هەموو میلەتێ لە جیهاندا چی پەرستووە با شوێنی ئەوە بکەوێ، ئیتر ئەوانەی کە بتو ئەم جۆرە شتانەیان پەرستووەو غەیری خودایان پەرستووەو پەیکەری بەردو داریان کردووە بە خوداو پەرستوویانە هەموو دەکەونە ناو دۆزەخەوە، هەتا دەمێنێتەوە ئەوانەی کە خودایان پەرستووە: لە چاكو لە خراپو لە پاشماوەی خاوەن نامەکان، ئەوجا بانگی جوولەکە دەکەنو پێیان دەڵێن: ئێوە کێتان دەپەرست؟ دەڵێن: عوزەیری کوڕی خودامان دەپەرست. پێیان

---

[٦] تجريد/٤/٤٣١ رقم/١٦٥١ = ٤٥٨١ + تجريد. رقم/٢١ = ٢٢ فتح - بەرگی یەکەم لاپەڕە/٤١. مسلم. إيمان: ٤٥٣.

دەڵێن: درۆ دەکەن خودا نەهاوسەی بووەو نە منداڵ، دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: خودایە! توونیمانە ئاومان بدەرێ بیخۆینەوە، پێیان دەفەرموون: بچن بۆ ئەوێوە ئاو بخۆنەوە، جا بەرەو ئاگر خڕیان دەکەنەوەو دەیانتە پێننەناوی، ئاگرەکە لە دوورەوە دەڵێی بەردەخۆێیەو لەوان وایە کە ئەوە ئاوە بەڵام ئاونییە، ئاگرە، بڵێسەو نێڵەنێڵو کڵپەی لەگەڵ خۆیدا شەڕ دەکا، ئیتر هەموویان دەکەونە ناوی، ئەمجا بانگی فەلەکان دەکەنو پێیان دەڵێن: ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: مەسیحی کوڕی خودامان دەپەرست، پێیان دەفەرموون: درۆ دەکەن خودا نەهاو سەری هەیەو نە منداڵ، وەك لە قورئاندا فەرموویەتی:

{وَأَنَّهُ تَعَالَى جَدُّ رَبِّنَا مَا اتَّخَذَ صَاحِبَةً وَلَا وَلَدًا - سورة الجن - ٣/٧٢}.

دەی چیتان دەوێ؟ دەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە! تینوومانە ئاومان بدەرێ بیخۆینەوە، پێیان دەڵێن: بڕۆن بۆ ئەوێوە لەوێ ئاو بخۆننەوە، ئەوجا مۆڵیان دەدەن بەرەو دۆزەخ، ئاگرەکە لەلای ئەوانەوە دەڵێی بەردەتراویلکەیە لەبەر ئەوە لەوان وایە ئاوە، بڵێسەکەی لەگەڵ خۆیدا کوڵەکە دەدا! دەتەپێنە ناو ئاگرەکەوە، هەتا بەس ئەوانە دەمێننەوە کە هەر خودای گەورەیان پەرستووە بە چاكو بە خراپیانەوە، ئەوجا پەروەردگاری هەر دوو جیهان - کە پاكو پیرۆزو بێ خەوشو بێگەردو گەورەیە - لەسەر شێوەیێ دێ بۆلایان، کە لەو شێوایەدا نایناسنەوە، دەفەرموێ: ئەوە چاوەڕوانی چی دەکەن؟ ئەوەتانێ هەموو میللەتێ چی پەرستووە شوێنی ئەوە کەوتووە، جا دەڵێن: ئەی خودایە! خۆت ئاگات لێیە کە ئێمە لە جیهاندا لە بەرخاتری تۆ دەستمان لە کەسوکارو ئازیزی خۆمانو خەڵکانی تریش هەڵگرتو هاوڕێتیمان نەکردن، لە کاتێکدا کە زۆر کارمان پێیان هەبوو، کەوابوو فریامان کەوە، لەم سەخڵەتییە رزگارمان کە، خودایش دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: پەنا دەگرین بەخودا لە تۆ، ئێمە هیچ هاوبەش دانانێین بۆ یەزدانی پاك. تا دووجار یا سێ جار، ئەم گفتوگۆیە دووبارە دەکەنەوە،

تەنانەت هەندێکیان خەریك دەبن لە ئایین وەربگەڕێن، چونکە هەڵوێست ئەوەندە شڵۆق دەبێ. جا خودا دەفەرموێ: ئایا لە نێوانی ئێوەو ئەوا هیچ نیشانەیەك هەیە کە بەو نیشانەیە بیناسنەوە؟ دەڵێن: ئا، هەیە، ئەوکاتە خودا دەروویان لێ دەکاتەوە، ئەنجا هەموو موسوڵمانێ کوڕنووشی بۆ دەبا، وەلێ ئەوانەی کە لە جیهاندا بۆ خۆپەڕاندنەوەو بۆ چاوەو رووپامایی و ناوبانگ کوڕنووشیان بردووە دەمێننەوەو لەپاش ئەوان دەچن کە کوڕنووش ببەن بۆ خودا، بەڵام لە خوداوە پشتیان رەق دەبێ و دەبێ بە یەك پارچە تەختەو هەرچی هەوڵ دەدەن ناتوانن سەجدە ببەن، لە پاشا موسوڵمانەکان سەر لە کوڕنووش هەڵ دەبڕن، دەبینن خودا چووەتەوە سەر شێوە راستەقینەکەی خۆی و دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: بەڵێ تۆ خودای ئێمەی، جا شوێنی دەکەون، ئەوجا پردی سیرات بە سەر پشتی دۆزەخدا هەڵ دەدرێ، ئەمجا کاتی تکاکردن دادێ، ئەوانەیشی کە تکا دەکەن ئەوکاتە خۆش خۆش هەر دەڵێن: خودایە! بەخۆشی خودایە! بەبێوەی، خودایە! بەسەلامەتی. گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! دەبێ ئەو پردە چۆن پردێ بێ؟ فەرمووی: پردێکی خزو خلیسکانە، چنگاڵ و قولاپ و دڕکە ئاسنینەی زۆری پێوەیە، ئەو جۆرە دڕکە لە نەجد زۆرە پێی دەڵێن: حوشترخوار (ئەبو سەعید دەفەرموێ: ژنەوتوومە کە ئەو پردە لەموو باریکترە، لە شمشێر تیژترە) حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: جا دەست دەکرێ بە گوزەرکردن، موسوڵمانی وا هەیە تیژ تێ دەپەڕێ بە چاوترووکانێ بەسەریا دەپەڕێتەوە، هەیە وەك برووسکە، هەیە وەك بای تیژ، هەیە وەك مەل فڕکەی لێ دەکا، هەیە وەك ماینی رەسەنی چاك بەسەریدا تێی دەتەقێنێ، هەیە وەك سواری وشتری باش تێ دەپەڕێ. جا هەیە بە ساخ و سەلامەتی قوتاری دەبێ، هەیە بە زاماری و رووشاوی بەرەڵای دەکەن، هەیشە دەتەپێتە ناو دۆزەخەوە، موسوڵمانان ئەم سێ چەشنەیان هەیە، جا جۆری یەکەم و جۆری دووەمیان کە خۆیان لە ئاگری دۆزەخ دەرباز دەبن و لە رزگاربوونی خۆیان دڵنیا دەبن، ئەو حەڵە بیری برادەرە موسوڵمانەکانیان دەکەنەوە کە وان لەناو دۆزەخدا،

بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای تاقو تەنیای بێ کەسە، وەك چۆن ئێوە لە جیهاندا ئەگەر کارێکی ئاڵۆزاوتان هەبێ سەری لێ دەرنەکەن، بە کوڵو بەدڵ لە خودا دەپاڕێنەوە کە رووی راستیتان لەو کارەدا بۆ دەربخات، ئەوانیش لەو رۆژەدا ئاوا پڕ بە دڵ لە خودا داوا دەکەن کە رەحم بە حاڵی پەرێشانی ئەو برادەرانەیان بکا کەوان لەناو دۆزەخدا، تکایان بۆ دەکەن، باسی چاکەکانیان دەکەن، تا خودا بەهۆی ئەو چاکانەیانەوە رەحمیان پێ بکا، دەفەرموون: ئەی پەروەدگاری ئێمە! خۆت ئاگاداری کە ئەوانیش وەك ئێمە رۆژوویان دەگرت، نوێژیان دەکرد، حەجیان دەکرد، ئەم چاکەیان دەکردو ئەو چەکەیان دەکرد، هەتا خودا تکاکەیان گیرا دەکاو پێیان دەفەرموون: کێ دەناسن برۆن لە دۆزەخ دەریان بێنن، جا لەبەر ئەوەی ئەوان یەزدانپەرست بوونو شێوەی یەزدانپەرستیش خودا بۆ خۆی قەدەغەیکردووە لە ئاگری دۆزەخ کە بیخواتو شێوەیان تێك بدا، کە دەچن بۆ لایان بە شێوەیاندا باش دەیانناسنەوەو خەڵکێکی زۆر لە دۆزەخ دەردەهێنن، هی وایان هەیە تا نیوەی پووزی ئاگر گرتوویەتیەوە، هەیانە تا هەردوو ئەژنۆی دەگرێ، ئەوجا دەچنەوە خزمەتی خودا عەرزی دەکەن: ئەی خودایە! ئەوانەی کە تۆ فەرمووت پێمان دەرمان هێنان لەئاگر، دەفەرموێ: برۆنەوە لە دڵی هەر کەسێکا بەقەد سەنگی دینارێ چاکەتان بینی دەری هێنن، دەچنەوە خەڵکێکی گەلێ زۆری تر دەردەهێننو دیسان دەچنەوە خزمەتیو عەرزی دەکەنەوە: ئەوانەی تریشمان لەسەر فەرمانی تۆ لە ئاگردەرهێنا، دەفەرموێ: دیسانەوە بگەڕێنەوە ئەوەی سەنگی نیودینار خێرتان لەناو دڵیدا بینی دەری بهێنن، هەمدیسان خەڵکێکی زۆری تر دەردەهێننو دەڵێن: خودایە وەك تۆ فەرمووت پێمان ئەوانەی تریشمان هێنایەدەرێ، دەفەرموێ: هەمدیسانەوە بگەڕێنەوە ئەوەی بەقەد تۆزقاڵێ، بەقەد ئەو تۆزو گەردەی کە لەناو تیشکی خۆری ناو دەلاقەدا هەیە خێرتان لەناو دڵیدا دۆزییەوە زیاد لە ئیمان دەری بهێنن،، هەمدیس دەچنەوە خەڵکێکی زۆری تر دەردەهێننو دەڵێن: خودایە!

هیچمان تێدا نەهێشت، دوزەخمان لەوانە پاك كردەوە كە بەقەد تۆزقاڵێ چاكە لەناو دڵیدابێ.

ئەبو سەعید خودری (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: ئەگەر بۆ راست و دروستی ئەم فەرموودەیە بەمن باوەڕناكەن حەز دەكەن فەرموون ئەم ئایەتە بخوێننەوە كە دەفەرموێ:

{إِنَّ اللَّهَ لاَ يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا – سورة النساء – ٤/٤٠}.

واتە: لە راستیدا خودا بەقەد مسقاڵە زەڕرەیێ زۆرو ستەم لە كەس ناكا، سەنگی گەردێ، بەقەد باڵی مێشوولەیێ ناهەقی، ناڕەوایی، بێ دادی، لە هیچ شتێ ناكا، گریمان كەسێ بەقەد سەنگی گەردو تەپۆتۆزێ چاكەی هەبێ خودا بۆی دەكا بە چەندقات و، بە میهرەبانی خۆی پاداشی باشی گەورەی خاوەنەكەی دەداتەوە!.

ئەوجا كوورەی رەحمەتی خودا بە جارێ دەجۆشێ، ئەو زاتە باڵادەست و شكۆمەندە دەفەرموێ: فریشتەكان تكای خۆیان كرد، موسوڵمانان و بڕواداران – هەر كەسەیان بەپێی پایەو پلەی خۆیان – تكای خۆیان كرد، مایەوە سەر خۆم، مایەوە سەر خەڵاتی هەرە مەزنی خودا خۆی كە لە هەموو بەرەحمێ بەرەحمترە، دیارە خەڵاتەكەشی لە هی هەموان گەورەترو زۆرترە! جا خودا چنگێ لە دانیشتوانی ناو دۆزەخ دەگرێ، كۆمەڵێكی زۆر زۆری لێ دەردێنێ، كە جگە لە باوەڕ بەخودا ئەوەی پێی بڵێی چاكە قەت نەیان كردووە، لەناو دۆزەخا بوون، بەكڵۆی خەڵووز، ئەوجا هەڵیان دەداتە ناو روباری ژیانەوە، كەوا لەناو دەرووی بەهەشتا، ئیتر وەك چۆن تۆمەی ناو لیوەی بارانا و، كە لافاو هەڵی دەگرێ و دەیهێنێ، تا لە گوێ ئاوەكە، لە پاڵ بەردێكا، یا لە پاڵ دارێكا دەگیرسێتەوەو خێرا سەوز دەبێ ئەوانیش ئاوا بەو رەنگە زوو بە زوو لەم بەرو ئەوبەری رووباری ژیانەوە

دەڕوێنەوەو گورج سەردەردەهێنن! دەق ئاوا بەبێ کەمو زیاد، خۆ ڕەنگی سپیواشە بەڵام هی بەرخۆر زەردباوو سەوزکەلەو بەشەوقە!.

یاران (خودایان لێ خۆشنوود بێ، سەرو سامان بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزیان بێ) عەرزیان کرد: قوربان! دیارە لە دەشت شوانیت کردووە، بۆیە وا شارەزای لەم جۆرە دیاردەیانە! خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوجا وەك چۆن مرواری لە سەدەف دێتە دەرەوە ئەوانیش ئاوا پاكو بێگەرد لە چۆمەکە دێنە دەرێ، پارچەخشڵێ، وەك نیشانە، وا لەگەردنیاندا، نیشانەو مۆری یەکتایی خودایە، خەڵکی ناو بەهەشت بەو ناونیشانەیە دەیان ناسنەوەو پێیان دەڵێن: ئەمانە ئازاد کراوەکانی خودان، ئەوانەن کە خودا خستوونیەتە بەهەشتەوە، بەبێ ئەوەی کە کردەوەیەکی باشیان کردبێ، یا چاکەیەکیان لە پێش خۆیانەوە ڕەوانەکردبێ. لە دواییدا خودا دەفەرموێ: بچنە ناو بەهەشت، هەرچیتان بەرچاو کەوت بۆ خۆتان، دەڵێن: ئەی خودایە! ئای لەم بەشە باشە، شتی وا نایابت بە کەسی تر نەداوە، دەفەرموێ: لەمەیش باشترم لە لایە بۆ ئێوە، دەڵێن: ئەی خودایە! دەبێ لەمە باشتر چیبێ! دەفەرموێ: ڕەزامەندی خۆمە، ئیتر هەتا هەتایە لێتان عاجز نابم. (ش/ت).

## ١٣٢) بەخشندەیی خودا گەلێ گەورەیە، دەرهێنانی یەزدانپەرستەکان لە دۆزەخ : (سعة الكرم الإلهي وإخراج الموحدين من النار)

٥٧٠٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ نَاسًا قَالُوا لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا رَسُولَ اللَّهِ هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ. قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: هَلْ تُضَارُّونَ فِي الشَّمْسِ لَيْسَ دُونَهَا سَحَابٌ. قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَإِنَّكُمْ تَرَوْنَهُ كَذَلِكَ يَجْمَعُ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْهُ. فَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ الشَّمْسَ وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ الْقَمَرَ وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ

وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ - تَبَارَكَ وَتَعَالَى - فِي صُورَةٍ غَيْرِ صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْكَ هَذَا مَكَانُنَا حَتَّى يَأْتِيَنَا رَبُّنَا فَإِذَا جَاءَ رَبُّنَا عَرَفْنَاهُ. فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ تَعَالَى فِي صُورَتِهِ الَّتِي يَعْرِفُونَ فَيَقُولُ أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ أَنْتَ رَبُّنَا. فَيَتَّبِعُونَهُ وَيُضْرَبُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَىْ جَهَنَّمَ فَأَكُونُ أَنَا وَأُمَّتِي أَوَّلَ مَنْ يُجِيزُ وَلاَ يَتَكَلَّمُ يَوْمَئِذٍ إِلاَّ الرُّسُلُ وَدَعْوَى الرُّسُلِ يَوْمَئِذٍ اللَّهُمَّ سَلِّمْ سَلِّمْ. وَفِي جَهَنَّمَ كَلاَلِيبُ مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ هَلْ رَأَيْتُمُ السَّعْدَانَ. قَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: فَإِنَّهَا مِثْلُ شَوْكِ السَّعْدَانِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَعْلَمُ مَا قَدْرُ عِظَمِهَا إِلاَّ اللَّهُ تَخْطَفُ النَّاسَ بِأَعْمَالِهِمْ فَمِنْهُمُ الْمُوبَقُ بِعَمَلِهِ وَمِنْهُمُ الْمُجَازَى حَتَّى يُنَجَّى حَتَّى إِذَا فَرَغَ اللَّهُ مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ وَأَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ بِرَحْمَتِهِ مَنْ أَرَادَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ أَمَرَ الْمَلاَئِكَةَ أَنْ يُخْرِجُوا مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا مِمَّنْ أَرَادَ اللَّهُ تَعَالَى أَنْ يَرْحَمَهُ مِمَّنْ يَقُولُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. فَيَعْرِفُونَهُمْ فِي النَّارِ يَعْرِفُونَهُمْ بِأَثَرِ السُّجُودِ تَأْكُلُ النَّارُ مِنِ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ أَثَرَ السُّجُودِ حَرَّمَ اللَّهُ عَلَى النَّارِ أَنْ تَأْكُلَ أَثَرَ السُّجُودِ. فَيُخْرَجُونَ مِنَ النَّارِ وَقَدِ امْتَحَشُوا فَيُصَبُّ عَلَيْهِمْ مَاءُ الْحَيَاةِ فَيَنْبُتُونَ مِنْهُ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ ثُمَّ يَفْرُغُ اللَّهُ تَعَالَى مِنَ الْقَضَاءِ بَيْنَ الْعِبَادِ وَيَبْقَى رَجُلٌ مُقْبِلٌ بِوَجْهِهِ عَلَى النَّارِ وَهُوَ آخِرُ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ فَيَقُولُ أَىْ رَبِّ اصْرِفْ وَجْهِي عَنِ النَّارِ فَإِنَّهُ قَدْ قَشَبَنِي رِيحُهَا وَأَحْرَقَنِي ذَكَاؤُهَا فَيَدْعُو اللَّهَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَدْعُوَهُ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى هَلْ عَسَيْتَ إِنْ فَعَلْتُ ذَلِكَ بِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ. فَيَقُولُ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهُ. وَيُعْطِي رَبَّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ مَا شَاءَ اللَّهُ فَيَصْرِفُ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ فَإِذَا أَقْبَلَ عَلَى الْجَنَّةِ وَرَآهَا سَكَتَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ ثُمَّ يَقُولُ أَىْ رَبِّ قَدِّمْنِي إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ. فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ أَلَيْسَ قَدْ أَعْطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ لاَ تَسْأَلُنِي غَيْرَ الَّذِي أَعْطَيْتُكَ وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ. فَيَقُولُ أَىْ رَبِّ وَيَدْعُو اللَّهَ حَتَّى يَقُولَ لَهُ فَهَلْ عَسَيْتَ إِنْ أَعْطَيْتُكَ ذَلِكَ أَنْ تَسْأَلَ غَيْرَهُ. فَيَقُولُ لاَ وَعِزَّتِكَ. فَيُعْطِي رَبَّهُ مَا شَاءَ اللَّهُ مِنْ عُهُودٍ وَمَوَاثِيقَ فَيُقَدِّمُهُ إِلَى بَابِ الْجَنَّةِ فَإِذَا قَامَ عَلَى بَابِ الْجَنَّةِ انْفَهَقَتْ لَهُ الْجَنَّةُ فَرَأَى مَا فِيهَا مِنَ الْخَيْرِ وَالسُّرُورِ فَيَسْكُتُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَسْكُتَ ثُمَّ يَقُولُ أَىْ رَبِّ أَدْخِلْنِي الْجَنَّةَ. فَيَقُولُ

اللّٰهُ تَبارَكَ وَتَعالَى لَهُ أَلَيسَ قَدْ أَعطَيْتَ عُهُودَكَ وَمَوَاثِيقَكَ أَنْ لاَ تَسْأَلَ غَيْرَ مَا أُعْطِيتَ وَيْلَكَ يَا ابْنَ آدَمَ مَا أَغْدَرَكَ. فَيَقُولُ أَيْ رَبِّ لاَ أَكُونُ أَشْقَى خَلْقِكَ. فَلاَ يَزَالُ يَدْعُو اللّٰهَ حَتَّى يَضْحَكَ اللّٰهُ تَبارَكَ وَتَعالَى مِنْهُ فَإِذَا ضَحِكَ اللّٰهُ مِنْهُ قَالَ ادْخُلِ الْجَنَّةَ. فَإِذَا دَخَلَهَا قَالَ اللّٰهُ لَهُ تَمَنَّهْ. فَيَسْأَلُ رَبَّهُ وَيَتَمَنَّى حَتَّى إِنَّ اللّٰهَ لَيُذَكِّرُهُ مِنْ كَذَا وَكَذَا حَتَّى إِذَا انْقَطَعَتْ بِهِ الأَمَانِيُّ قَالَ اللهُ تَعَالَى ذَلِكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ. قَالَ: عَطَاءُ بْنُ يَزِيدَ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ لاَ يَرُدُّ عَلَيْهِ مِنْ حَدِيثِهِ شَيْئًا. حَتَّى إِذَا حَدَّثَ أَبُو هُرَيْرَةَ أَنَّ اللّٰهَ قَالَ لِذَلِكَ الرَّجُلِ وَمِثْلُهُ مَعَهُ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ مَعَهُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ. قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ مَا حَفِظْتُ إِلاَّ قَوْلَهُ ذَلِكَ لَكَ وَمِثْلُهُ مَعَهُ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ أَشْهَدُ أَنِّي حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَوْلَهُ: ذَلِكَ لَكَ وَعَشَرَةُ أَمْثَالِهِ. فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: ما حفظت الا قوله: ذَلِكَ لَكَ ومِثْلَهُ مَعَهُ. رواه مسلم والبخاري[1]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی یەزدانی مەزنی لێبێ) فەرمووی: چەند کەسێ عەرزی حەزرەتیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا ئێمە لە رۆژی دوا رۆژدا خودای خۆمان بە چاوی سەر دەبینین؟ خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: شەوی چواردەی مانگ کە هیچ هەوری نەبێ بۆ دیتنی مانگ هیچ کەڵەکە لە یەکتر دەکەن وەك سەری مانگ کە بۆ دیتنی مانگی یەکشەوە دەگەڕێن، فەرموویان: خەیر، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: ئەی بۆ خۆر بە رۆژی نیوەڕۆ ئەگەر سایەقەی ساف بێ لە دیتنیا هیچ ئەرکێ، زەحمەتێ دەبینن یاناه، نۆرەبڕی یەك لەیەك تر دەکەن؟ فەرموویان: خەیر، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەئێوە بەو چەشنە خودا دەبینن، لە رۆژی دوا رۆژدا خودا ئەو خەڵکە هەموو گرد دەکاتەوە، دەفەرموێ: هەر کەسێ لە جیهاندا بۆکێ بەندەیی و پەرستشی کردووە با شوێنی ئەو بکەوێ، ئیتر ئەوی خۆری پەرستووە شوێن خۆر دەکەوێ، ئەوەی مانگی پەرستبێ شوێن مانگ دەکەوێ، ئەوەی بتی پەرستبێ شوێن بت دەکەوێ، ئەوەی هەر شتێکی

---

[1] بخاری. توحید: ٧٤٣٧. مسلم. إیمان: ٤٥٠.

پەرستبێ جگە لە خودا شوێن ئەو شتە ناهەقە دەکەوێ، ئەم گەلی ئیسلامە دەمێنێتەوە، بە پاك‌و ناپاکییەوە، ئەو ناپاکانەی کە بەدەم موسوڵمانن‌و بە دڵ گاورن ئەوانەیشیان لەناودایە، ئەو حەلە خودا لەسەر شێوەیێ دێ بۆ لایان کە ئەوان لە شەرعا شتی وایان نەبیستووە لەبەر ئەوە نایناسن، خودا دەفەرموێ: من خودای ئێوەم. دەڵێن: نەء، تۆ خودای ئێمە نیت، پەنا دەگرین بە خودا لە تۆ، کە لەم دوا تاقی کردنەوەماندا زەفەرمان پێ نەبینی!

ئەمە جێگەمانە تا خودای خۆمان دێ بۆ لامان، هەر کاتێ خودای خۆمان هات دیناسین، ئیتر خودای گەورەو بێچوون لەسەر ئەو شێوەیەی کە لە شەریعەتا بۆیان روون کراوەتەوە دێ بۆ لایان‌و دەیناسنەوە، دەفەرموێ: من خودای ئێوەم، دەڵێن: بەڵێ تۆ خودای ئێمەی، ئەوجا شوێنی دەکەون. جا پردی سیرات بە سەرپەرشتی دۆزەخدا رادەکێشرێ، من‌و ئۆمەتم یەکەم کەس دەبین کە بەسەریا دەپەڕینەوە، لە بەرسام‌و ترس‌و بیم ئەو خەڵکە وەك زمانیان بەسترابێ وایە، زمانیان گۆ ناکا، بەس پێغەمبەرەکان (درودو رەحمەت‌و سەلام‌و صەلات‌و بەرەکاتی خودای گەورەی مەزنیان لێبێ) بەس ئەوان زات دەکەن کە قسە بکەن، داوای ئەو رۆژەی پێغەمبەرانیش هەر ئەوەیە، خۆش خۆش دەفەرموون خودایە! بەخۆشی، خودایە! بەبێوەی، خودایە! بە سەلامەتی، خودایە! نەگلێن. لە جەهەننەمدا جۆرە قولاپ‌و قەڵەنگێ هەیە، قەڵبەدارن، قەڵبەکانیان وەك دڕکەکەڵەوێ وایە، خۆ بەچاوی خۆتان دڕکە کەڵەوێتان دیوە فەرموویان: ئا، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەڕێك وەك دڕکی دڕکە کەڵەوێ وان، وەلێ خودا بۆ خۆی نەبێ کەسی تر نازانێ کە ئەو قەڵبانە چەندە گەورەو زل‌و قەبەن، جا ئەو قەڵبانە خەڵك دەڕفێنن بەپێی خراپی کردەوەیان، ئیتر بازێکیان بەهۆی کردەوەی بەدی خۆیانەوە بە فەتارەت دەچن، بازێکیشیان بە چنگەکرێ‌و پەلە پرووزە هەرچۆنێ بێ خۆیان دەرباز دەکەن‌و خودا لەو مەینەتە قوتاریان دەکا، تا کاتێ خودا مەحکەمەی بەندەکان تەواو دەکا، بەهەشتی بۆجێی خۆی‌و دۆزەخی بۆ جێی خۆی دەچێ، وەکاتی ئەوە دێ کە یەزدان دەیەوێ بە میهرەبانیی خۆی زۆر کەسان لە دۆزەخ دەربێنێ،

فەرمان بە فریشتەگەل دەدا: کە ئەوانەی هیچ هاوبەشیان بۆ خودا دانەناوەو لەو دەستەیەن کە دەڵێن: لا الـه إلا الله و خودا بەمەرحەمەتی خۆی ویستی خێری پێیان هەیە، فەرمان دەدا بە فریشتەگەل کە ئەوانە لەئاگر دەربێنن، فریشتەکان بە شوێنەواری کوڕنووشدا لەناو ئاگردا دەیان ناسنەوە، چونکە هەموو ئەندامێکی مرۆڤ ئاگری دزەخ دیخوا بێجگە لەو ئەندامانەی کە لەکاتی سەجدەدا دەکەونە سەرزەوی، ئەو حەوت ئەندامە خودا قەدەغەی کردوون لە سەر ئاگر، کاتێ لە دۆزەخ دەردەچن بوون بە سووتەمەڕۆ، ئەوجا ئاوی ژیانیان پیا دەکرێ، جا بەو ئاوە وەك تۆمەی ناو لیوەی لافاو سەوز دەبنەوە، ئیتر خودا بە تەواوی لە دادپرسی بەندەکان لێ دەبێتەوە، تەنها پیاوێ دەمێنێتەوە کە دواترین بەهەشتییە کە دەچێتە ناو بەهەشت، رووی لەئاگری دۆزەخە، دەڵێ: خودایە! رووم لەم ئاگرە وەرگێڕە، بەراستی هەوا بۆگەنەکەی پڕووکاندوومی و تینەکەی سووتاندوومی، چەندە خودا حەز دەکا ئەوەندە لە خودا دەپاڕێتەوە، ئەوجا خودای گەورەو پیرۆز دەفەرموێ: خۆ ئەگەر ئەمەت لەگەڵ بکەم بە تەمانیت داوای شتی ترم لێ بکەی؟ دەڵێ جگە لەوە داوای هیچی ترت لێ ناکەم، ئەوەندەی خودا مەیلی لەسەری بێ بەڵێن و پەیمان بە خودا دەدا، کە لەوە پتر داوای شتی تر نەکا، ئەو حەلە خودا رووی لە ئاگرەکە دوور دەخاتەوەو روو دەکاتە بەهەشت و خۆشی و گەشی و ناسك و نازداری ناو بەهەشت لە دوورەوە دەبینێ، چەندە خودا مەیلی لەسەربێ ئەوەندە بێ دەنگ دەبێ، لە پاشدا دەڵێ: خودایە! ئەی خودای من بمبەرە بەردەگاری بەهەشت، خودایش پێی دەفەرموێ: خانە خراپ! ئەی تۆ بەڵێن و پەیمانت بەمن نەدا کە لەوە زیاتر داوای هیچی ترم لێ نەکەی، ئەی ئادەمیزاد! چەندە بێ پەیمانی، دەڵێ: ئەی خودایە! واو ئەی خودایە وا! وە زۆر دەپاڕێتەوە، تا خودا دەفەرموێ: پێی: خۆ بەتەمانیت کە ئەوەم پێ بەخشیت داوای شتی تر بکەی، دەڵێ: خەیر بەگەورەیی تۆ، ئەوەندەی خودا ویستی لەسەربێ بەڵێن و پەیمان بەخودا دەدا، کە لەمە زیاتر داوای هیچی تر ناکا. خودا دەیباتە بەردەم دەرگای بەهەشت، کاتێ لەبەر دەرگای بەهەشتا

راوەستا نازداری و خۆشی و باشی و گەشی بەهەشتی بۆ دەردەکەوێ، دیسان ئەوەندەی خودا مەیلی لێبێ ئەوەندە بێ دەنگ دەبێ، پاشان دەڵێ: ئەی خودایە! بمبەرە ناو بەهەشت[1] خودای گەورەو پیرۆزیش پێی دەفەرموێ: ئەرێ تۆ ئەو هەمکە بەڵێن و پەیمانت بەمن نەدا کە لەوە پتر داوای هیچی تر نەکەی؟ خانە خراپ! مرۆڤێکی چەند پەیمانشکێنی! دەڵێ: ئەی خودای من! بانەبم بە بەدبەخت ترینی دروستکراوانی تۆ، ئیتر ئەوەندە لە خودا دەپاڕێتەوە تا خودای پیرۆزو گەورە پێی پێ دەکەنێ و رقەکەی دەنیشێتەوەو بەزەیی پیادا دێتەوەو پێی دەفەرموێ: حەزت لەچییە بەبێ قەیدو شەرت داوای بکە، داوایەکی زۆر لە خودا دەکاو دڵی بۆ هەرچی بچێ ئاواتی بۆ دەخوازێ، خودا خۆشی ماموستایی دەکاو دیخاتە سەر دەمی کە داوای ئەوەو ئەوە بکە لەو بەهرەو نازو نیعمەتانەی کە خۆی نایانزانێ، هەتا هیچ تەمنناو خۆزگەو ئاواتێکی نامێنێ، ئەو حەلە خودای گەورە دەفەرموێ: ئەوەی داوات کردووەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ!

کە ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) ئەم فەرموودەیەی گێڕایەوە ئەبو سەعیدی خودری لەوێ دانیشتبوو، تا ئێرە هیچ قسەیەکی نەبوو، بەڵام لێرەدا فەرمووی: شایەتی دەدەمو خودا دەکەم بە شایەت کە من ئەم وتەیەی دواوەم لە دەمی پێغەمبەر خۆیەوە ئاوا لەبەر کردووە، ئەوەو دە ئەوندەی تر بۆ تۆ.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: من هەر ئەوەم لەبەر کردووە کە حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی داوات کردووەو ئەوەندەی تریش بۆ تۆ.

---

[1] لە بەهەشت خۆشتر ئەم گوفتوگۆیە

تەنزیل ڕوتبەیە ئەم داوای تۆیە!

بابەس بێ نازیز! وەکی منالێ

بۆ تەتەی بەهەشت تاکەی دەنالێ! (وەرگێڕ)

سلێمانی/ مامۆستایان — ١٩٩٢/٩/٢٨

٥٧٠٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُدْخِلُ اللَّهُ أَهْلَ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ يُدْخِلُ مَنْ يَشَاءُ بِرَحْمَتِهِ وَيُدْخِلُ أَهْلَ النَّارِ النَّارَ ثُمَّ يَقُولُ: انْظُرُوا مَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا حُمَمًا قَدِ امْتَحَشُوا. فَيُلْقَوْنَ فِي نَهْرِ الْحَيَاةِ أَوِ الْحَيَا فَيَنْبُتُونَ فِيهِ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ إِلَى جَانِبِ السَّيْلِ أَلَمْ تَرَوْهَا كَيْفَ تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً. رواه مسلم والبخاري في الرقائق[٢]:

ئەبو سەعیدی خوردی (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی بەهەشتی بێ خودا بە رەحمەتی خۆی کێ ئارەزوو بکا دەیخاتە بەهەشت، دۆزەخییەکانیش دەخاتە دۆزەخەوە پاشان دەفەرموێ: چاوبگێڕن بەناو دۆزەخا هەر کەسێکتان چاو پێ کەوت کە لەناو دڵیدا بەقەد سەنگی دەنکە خەرتەلەیێ ئیمانو باوەڕ هەبێ لە دۆزەخ دەری بهێنن، لەسەر ئەم فەرمانە مەزنەی خودا خەڵکێکی زۆر لە دۆزەخ دەردەهێنن، وەك سووتەمەڕۆ بوون بەقەرەبرووت، ئەوجا هەڵیان دەدەنە ناو چۆمی ژیانەوە یا فەرمووی: هەڵیان دەدەنە ناو رووباری بارانەوەوە، جا لەناو ئەوچەمەدا سەر لەنوێ وەك تۆمەی کەنار ئاو دەڕوێنەوە، خۆ دیوتانە دانەوێڵەی دەم لافاو چۆن لە قەراخەوە لەناو ئاوماڵەکەدا دەگیرسێتەوەو سەوزوشین دەبێتەوە، لە سەرەتاوە چووزەرەکەی زەردباوێکی بێ هێزی لاوازی نووشتاوەیە، بەڵام لەپڕ دەکەوێتە خۆیو گەورەو بۆشناخ دەبێ ئەوانیش ئاوا. (م/ت).

٥٧٠٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَمَّا أَهْلُ النَّارِ الَّذِينَ هُمْ أَهْلُهَا فَإِنَّهُمْ لاَ يَمُوتُونَ فِيهَا وَلاَ يَحْيَوْنَ وَلَكِنْ نَاسٌ أَصَابَتْهُمُ النَّارُ بِذُنُوبِهِمْ - أَوْ قَالَ بِخَطَايَاهُمْ - فَأَمَاتَهُمْ إِمَاتَةً حَتَّى إِذَا كَانُوا فَحْمًا أُذِنَ بِالشَّفَاعَةِ فَجِيءَ بِهِمْ ضَبَائِرَ ضَبَائِرَ فَبُثُّوا عَلَى

[٢] تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى/١ ل- ٤١ رقم/٢١ = ٢٢، ٤٥٨١، ٤٩١٩، ٦٥٦٠، ٦٥٧٤، ٧٤٣٨، ٧٤٣٩. مسلم. إيمان: ٤٥٦.

أَنْهَارِ الْجَنَّةِ ثُمَّ قِيلَ: يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ أَفِيضُوا عَلَيْهِمْ. فَيَنْبُتُونَ نَبَاتَ الْحِبَّةِ تَكُونُ فِي حَمِيلِ السَّيْلِ. فَقَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ كَأَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ كَانَ بِالْبَادِيَةِ[٣]:

دیسان فەرمووی: خۆشەویست (دروودو سڵاوی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو دۆزەخییانەی کە بە ئێجگاری دۆزەخین ئەوانە هەتا هەتایە لەسەر ئەم حاڵە دەمێننەوە نە ئەوەتە بۆ خۆیان بمرن‌و بەمردن لە ئێش‌و ئازاری دۆزەخ قورتاریان ببێ، نە ئەوەتە بەخۆشی‌و ئاسوودەیی بۆ خۆیان بژین. بەڵام ئەو دۆزەخییانەی کە خاوەن باوەڕن‌و بەهۆی تاوانەوە. یا فەرمووی: بەهۆی گوناهەوە دووچاری ئاگربوون ئەوانە لەپاش ماوەیێ لەسەر فەرمانی خودا ئاگرەکە بە مراندن دەیان مرێنێ، هەتا دەبن بە خەڵوون، تا ماوەی ناو دۆزەخیان تەواو دەبێ، بۆیە ئەیانمرێنێ تا هەست بە ئێش‌و ئازاری زۆری دوورو درێژ نەکەن، ئەوکاتە ڕێگای تکاو تکاکاری دەدرێ، لاشەکانیان لێرەو لەوێ وەك پارچە گەمرە سەپاون بە سەریەکاو، کۆمەڵ کۆمەڵ بوون بەسرەو پەستراون بەسەریەکا، لەسەر ئەو حاڵە تەختە تەختەو کۆمەڵ کۆمەڵ دەیان هێنن‌و، لە گوێ جۆگا ئاوەکانی بەهەشت وەك شمەك هەڵیان دەڕێژن دەڵێن: ئادەی ئەی بەهەشتییەکان! ئاو بکەن بەسەریاندا، ئتر بەو ئاوە وەك تۆمەی ناو ئاوماڵك دەژێنەوەو بەرە بەرە شین دەبنەوەو زیندوو زیت دەبنەوە. هەندێ لە ئامادە بوانی ناو کۆڕەکە فەرمووی: دەڵێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) زۆر لە دەشت‌و دەر ژیاوە بۆیە وا بەم شێوەیە شارەزایی چاکی لە چۆنێتی حاڵی کەژو کێو هەیە! (م= ئیمامی موسلیم – ڕەزای خودای لێبێ).

٥٧٠٧– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ شَعِيرَةً ثُمَّ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ بُرَّةً، ثُمَّ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَكَانَ فِي قَلْبِهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا يَزِنُ ذَرَّةً. رواهما مسلم والترمذي. فلربنا كل حمد وكل شكر[٤]:

---

[٣] مسلم. إيمان: ٤٥٨. ابن ماجه. زهد/ ٤٣٠٩ تحفة الأشراف/٤٣٤٦.

[٤] مسلم. إيمان: ٤٧٧. بخاری. إيمان: ٤٤ = تجريد/١ ل- ٦٣ رقم/٤١ = ٤٤٧٦، ٦٥٦٥، ٧٤١٠، ٧٤٤٠، ٧٥٠٩، ٧٥١٠، ٧٥١٦.

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودو سەلامی خودای گەورەی لەسەر بێ) دەفەرموێ: ئەوی بڵێ: لا اله الا الله: هەر یەزدانی پاك خودای راست و درووستەو بەس، لە هەمان کاتدا بەقەد سەنگی دەنکە جۆیێ چاکە لەناو دڵیا هەبێ لە دوا رۆژدا زوو یا دەرنگ لە ئاگری دۆزەخ دەردەچێ هەروا ئەوەی کێشی دەنکە گەنمێ، یا سەنگی بچووکترین میروو لە خێرو چاکە لەناو دڵیابێ لە ئاگری دۆزەخ دەردەچێ! (م/ت).

## ١٣٣) چۆنێتیی بەهەشت و باسی کارگوزارانی بەهەشت:
## صفة الجنة و (ذكر) خدمها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ، بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ، لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ، وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ، وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ، وَحُورٌ عِينٌ، كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ، جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ -سورة الواقعة-٥٦/١٧ -٢٤}.

نۆکەری هەمیشە جەهێڵی بۆشناخ کە هەوڵی دەمیان بێ، کە نەمرو پایەداربن، بەسەریاندا دەگەڕێن، کە مەربەستەن بۆ خزمەتیان، سینی پڕسەر لە پیاڵەو فنجان و کووبی پڕ شەرابیان پێیە، جۆرەها سوراحی و مەسینەی جوان جوانیان پێیە، کە پڕن لە جۆرەها خواردنەوەی خۆش و پاك و نایاب، دەیگێڕن بەسەریاندا، بە تایبەت مەی و بادەیێ لەو پیاڵانەدا دەگێڕن بەسەریاندا کە لەسەر چەشمەیێ هەڵ دەقوڵێ کە قەت وشك ناکاو هەمیشە لەبەری دەڕوا، مەی و بادەی بەهەشت مەینۆش مەست و سەرخۆش ناکا، وەك عەرەقی دنیا نابێ بەهۆی سەر ئێشەوە خۆشی و بێ رێزی و سووك و ترۆیی، هەروەها ئەو خزمەتچییانە، میوەی نایابی هەڵبژاردە، گۆشتی ناسکی مەل و پەلەوەر بەدڵی خۆیان هەڵدەبژێرن و حەزیان لەچی بێ پێشکەشیان دەکەن، هەروەها پەری سوورو سپی، چاورەشی، چاوقەوی، چاو جوان کە لە سافی و ئاوداری و ناسك و نازداریدا دەڵێی پەڕەی گوڵن، یا دەڵێی مرواری بێ گەردی بێ تۆزو گەردن، هەروەها ئەم پەری یانەیش دێن بە دەوریانداو دەبن بە هاودەم و هاوسەریان، ئاوا ئەو بەختەوەرانە لە ئەنجاما لەپاش هەوڵ و

تێکۆشانو رەنجێکی جوانو صەبرو ئارام گرتن لەبەر باری خودادا، لەسەر رەحمەتی ژین، لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانی دین، شاد دەبن بە مرازی خۆیانو دەگەن بە بەشی باشی خۆیانو پاداشی چاك لەسەر چاکەکانیان وەردەرگنو لە سێبەرو بەری باخی رەنجەشانی خۆیاندا دەحەسێنەوە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيْتَهُمْ حَسِبْتَهُمْ لُؤْلُؤًا مَّنثُورًا، وَإِذَا رَأَيْتَ ثَمَّ رَأَيْتَ نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا، عَالِيَهُمْ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضْرٌ وَإِسْتَبْرَقٌ وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا، إِنَّ هَذَا كَانَ لَكُمْ جَزَاء وَكَانَ سَعْيُكُم مَّشْكُورًا - سورة الإنسان - ٧٦ / ١٩ - ٢٢}.

واتە: نۆکەر هەوەڵی دەمیان بێ، ئەمرو جاوید بن، لە دەوریان دەگەڕێن، کەمەر بەستەن بۆ خزمەت، لە بەرچاو دەڵێی دوڕو گەوهەرن، ئەوەندە پاكو ناوچاوان رووناكو ئیسك سووكو رووخۆشو رەفتار بەرزن، وا بەچۆستو چالاکیو چابووکی دێنو دەچن بەناو مەجلیسدا دەڵێی ترشو خوێن، یا دەڵێی گۆی ملوێنکەی مرواری پچڕاوەن. لە هەرلاسەیر دەکەی هەر نازو نیعمەتو موڵكو سامانو بەهرەیە، جلو بەرگی ئاورێشمی سەوزی ناسكو نەرمو ئەستوورو تەنکیان لە بەردایە، بازنی زێڕو زیوینیان لە دەستدایە، خودا بۆ زێدە رێزو قەدرگرتن بە دەستی خۆی بادەیەکی پاکی پاکەوەکەریان دەرخوارد دەدا، ئیتر ئەوەی دەیخواتەوە ناودڵو دەروونی دەشواتەوە، لە خۆشیی هەستیو لەززەتی حیسسی مەیل بڕی دەکاو، دڵ دەداتە تەماشای جەماڵی یەزدانی، لەززەتو چێژو خۆشی لە شادبوون بە دیداری خودای میهرەبان وەردەگرێو لەغەیری خودا مەیل بڕ دەبێو مانی بە مانیی یەزدان دەبێ، یەك دەم لێی بێ ئاگابێ وەك ماسی لەئاو دابڕاو دەخنکێ! مژدەیان دەدەنێو پێیان دەڵێن:

ئەمەیە پاداشی باشی کردەوەی چاکەی ئێوە، هەوڵو کۆششی ئێوە بەزایە نەچوو، ئەوەتانێ خودا لێی قەبووڵ کردن، پاداشی باشی لەسەری

دانەوە، بۆتان بوو بە مایەی سوپاسو ستایشو شۆرەتو ناوی جوانو سەربەرزیو رووسووریی هەردوو جیهان[١].

٥٧٠٨- فەرموودەی (أعددت لعبادي الصالحين مالا عين رأت..) لەم شوێنەدا رابورد ← (ب – ٧ ز – ١٥ ل – ٨٤ ف – ٢)[١].

٥٧٠٩- لە کیتابی جیهاددا لەسەر باسی (في فضل الجهاد)دا رابورد فەرموودەی (لقاب قوس أحدكم في الجنة..) تاد[٢].

٥٧١٠- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَوْضِعُ سَوْطٍ فِي الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا. رواه البخاري في بدء الخلق. نسأل الله رضاه والجنة آمين[٣]:

سەهل (خۆشنوودیی خودای لێبێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درووودو سڵاوی خودای لێبێ) فەرمووی: بەقەد جێگەی قەمچییەك لە بەهەشتا چاکترە لە هەموو جیهانو لە هەرچی لەناو جیهاندا هەیە (بوخاری – رەزای خودای لێبێ).

---

[١] تەماشای بەهەشتنامەکەی کۆتایی ئەم باسی بەهەشتەو پێشەکییەکەی بفەرموو. خوێنەری ئازیز! گوێگری خۆشەویست! حەزدەکەم ئەمە بزانی. لە راڤەی ئایەتەکان، لەشی کردنەوەی فەرموودەکانو لە لێك دانەوەیان دڵنیابە، سوێندم بە زاتێ کە زاتی خودایە شك نابەم کە بۆ هەواو هەوەس لە خۆمەوە بەبێ پشت بەستن بەسەرچاوەیەکی روون تەفسیری ئایەتێ، یا تەرجەمەی حەدیسێکم نووسیبێ، لەسەرانسەری ئەم کتێبە پیرۆزەدا بەهەموو بەرگەکانیەوە. کەسێ بە وردی سەرنجی سەرچاوەکانی ئەم تەرجەمەیە بدا، کە تا ئێستا چەند جار باسیانم کردوە، ئەوسا دەزانێ کە بەندە بە باشی لەوسەرچاوانە حاڵی بووم و گەلێ لە هێماو رەمزیانم روون کردۆتەوە. وەڵێ ئەوەندە هەیە رای ئەو سەرچاوانەش لەناو خۆیاندا یەك نییە، گەلێ جار رای جەلالەین لەرای بەیزاوی جیایە، رای ئەوەوی لە رای عەینی یا عەسقەلانی جیایە، گرنگ ئەوەیە واتاکەی من لێکم داوەتەوە لە یەکێ لەو رایانە بەدەر نییە. (وەرگێڕ)

[١] تقدم مجلد سابع. تسلسل/١٥ رقم/٢/٤٠٣٣.

[٢] تقدم مجلد ثامن. تسلسل/١٥ رقم/٤/٤٣٠٠.

[٣] تجريد البخاري = التجريد الصريح = مختصر صحيح البخاري/٣ ل- ٣١٧ رقم/١١٩١ = ٢٨٩٢، ٢٧٩٤، ٣٢٥٠، ٦٤١٥، ٢٧٩٢، ٢٧٩٦، ٦٥٦٨. راجع تجريد رقم/١١٥٠ = ٢٧٩٢ فتح. مسلم. إيمان: ٤٨٥٤.

## ١٣٤) باسی خانووی بەهەشتو خاكو زیخو چەوی
## بناء الجنة وحصاؤها وترابها

٥٧١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مِمَّ خُلِقَ الْخَلْقُ؟ قَالَ: مِنَ الْمَاءِ. قُلْنَا الْجَنَّةُ مَا بِنَاؤُهَا قَالَ: لَبِنَةٌ مِنْ فِضَّةٍ وَلَبِنَةٌ مِنْ ذَهَبٍ وَمِلاَطُهَا الْمِسْكُ الأَذْفَرُ وَحَصْبَاؤُهَا اللُّؤْلُؤُ وَالْيَاقُوتُ وَتُرْبَتُهَا الزَّعْفَرَانُ مَنْ يَدْخُلْهَا يَنْعَمْ وَلاَ يَبْأَسْ وَيُخَلَّدْ وَلاَ يَمُوتْ لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُمْ وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُمْ. ثُمَّ قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ تُرَدُّ دَعْوَتُهُمُ الإِمَامُ الْعَادِلُ وَالصَّائِمُ حِينَ يُفْطِرُ وَدَعْوَةُ الْمَظْلُومِ يَرْفَعُهَا فَوْقَ الْغَمَامِ وَتُفَتَّحُ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَيَقُولُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ وَعِزَّتِي لأَنْصُرَنَّكِ وَلَوْ بَعْدَ حِينٍ. رواه الترمذي[1]:

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم كرد: قوربان! دروسكراوان لەچی دروست كراون؟ فەرمووی: لەئاو. گوتمان: خانووی بەهەشتت لەچی دروست كراوە؟ فەرمووی: خشتیٚ لە زیوو خشتیٚ لە زیٚڕ، ناواخنو ناوچینەكەی میسكی فرە بۆن خۆشە، چەوزیخەكەی مرواریو یاقووتە، خاكو خۆڵەكەی زەعفەرانە، ئەوەی تیٚی بچیٚ دەكەویٚ بەسەر خۆشیو نازو نیعمەتدا، هەتا هەتایە ناخۆشی نابینیٚ، هەتا هەتایە بەخۆشی دەژی قەت نامریٚ، جلیان نەكۆن دەبیٚو نە دەدڕیٚ، قەت پیر نابن، هەمیشە لاوو جەهیٚڵ دەبن. ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: ئەم بەشەیەی ئەم فەرموودەیە لەسەر باسی – الدعاء المقبول–دا رابورد. (ت).

## ١٣٥) چینەكانی بەهەشتو دەركاكانیو پایەكانی
## طبقات الجنة وأبوابها ودرجاتها

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الأَنْهَارُ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ – سورة يونس – ٩/١٥}.

---

[1] سكت عن درجته الشارح.

وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَاللَّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلَامِ وَيَهْدِي مَن يَشَاء إِلَى صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ – سورة يونس – ١٠ / ٢٥}.

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا، خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا – سورة الكهف – ١٨ / ١٠٧ – ١٠٨}. ← ( ب – ٧ ز – ١ ل – ١٦).

وَقَالَ تَعَالَى: {عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَى، عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى – سورة النجم – ٥٣ / ١٤ – ١٥}.

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُوْلَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ، {جَزَاؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّاتُ عَدْنٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا رَّضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ ذَلِكَ لِمَنْ خَشِيَ رَبَّهُ –صدق الله العظيم– سورة البينة– ٩٨/٧–٨}.

لەم ئایەتە پیرۆزانەدا ئەم زانیاریانەمان بۆ روون دەبێتەوە: کە موسوڵمانانی خاوەن باوەڕی ساخی تەواو، خاوەنی چەندین کردەوەی باش، خودا بەهۆی پیرۆزیی نووری ئیمانەوە دەیانخاتە سەر رێگەی بەهەشت، لەدوا رۆژدا دەیانباتە ناو بەهەشتانی نازو نیعمەت، کە قورئان ناوی ناون: جەنناتی نەعیم، ئاو کە سەرچاوەی هەموو جۆرە ژیانێکە لە هەموو لایەکیانەوە کفارەی دێ، بەبن باخەکانیاندا، لەناو کۆشكو حەوشەو تەلارو ماڵەکانیاندا، خودا هەمیشە بانگەوازی ئاگاداری کردنەوە لە ئێوە دەکا کە بەهۆی باوەڕی ساخو کاری باشەوە خۆتان بگەیەننە ئەو بەهەشتەی کە خانەی بێوەیی و خۆشی و سەلامەتی و ئاشتییەو قورئان پێی دەفەرموێ: (دار السلام). بزانن تەوفیق بە دەست خودایە، هەرکەسێ خۆی مەیلی هەبێ رێگەی راستی پێ نیشان دەدا، ئیتر بە کوردیو کورتی، کورتو پوخت پیاوی خاوەن باوەڕی ساخ، خاوەنی کردەوەی باش لە بەهەشتی بەریندا دەژی، بە ژیانێکی زۆر خۆش، بەبێوەی، بەبێ ئێشو ئازار، خودا لێی رازییە، ئەویش لەخودای خۆی زۆر مەمنوونە، بە ژیانێکی نەبڕاوەی جاویدان، چێنو پایەی بەهەشت زۆر مەمنوونە، بە ژیانێکەی نەبڕاوەی

جاویدان، چینو پایەی بەهەشت زۆر زۆرنو کۆمەڵ کۆمەڵن، وەك کۆمەڵەی جەنناتی نەعیم، وەك داری سەلام، وەك کۆمەڵەی جنناتی فیردەوس، وەك جەننەتی مەئوا، وەك کۆمەڵەی جەنناتی عەدن، لە راستیدا ئیمانو باوەڕی ساخو کردەوەی باشو ترسی خوداو ئومێدی قەوی بەرەحمەتی خودا مایەو سەرچاوەی هەموو بەهرەیەکی هەردوو جیهانە.

٥٧١٢- ← (ب - ٢ ز - ٢٦ ل - ٧٢ ف - ١٣٠١/٤) لێرەدا ئەم پترییە هەیە: (في الجنة ثمانية أبواب: لە بەهەشتا هەشت دەرگا هەیە) ← (ب - ٢ ز - ٢٦ ل - ٧١ ف - ٢ + ٧ = ژمارە /١٢٩٩/٢ وە ژمارە/ ١٣٠٤/٧)[١].

٥٧١٣- عَنْ ابن عمر (رَضِي اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَابُ أُمَّتِي الَّذِي يَدْخُلُونَ مِنْهُ الْجَنَّةَ عَرْضُهُ مَسِيرَةُ الرَّاكِبِ الْجَوَادَ ثَلاثًا ثُمَّ إِنَّهُمْ لَيُضْغَطُونَ عَلَيْهِ حَتَّى تَكَادُ مَنَاكِبُهُمْ تَزُولُ. رواه الترمذي[٢]:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دەرگای تۆمەتم کە لێوەی دەچنە ناو بەهەشت سێ ڕۆژە ڕێیە، بەڕۆیینی سواری ئەسپی ڕەسەنی چاك، لەگەڵ ئەوەشا هێشتا بەپاڵە پەستۆیەکی وا دەچنە ژوورەوە خەریکە شانیان لەجێ بچێ (ت).

٥٧١٤- لە سەرەتای نامەی خەباتو تێکۆشاندا رابورد، یەکەم فەرموودە[٣]:

٥٧١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي الْجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ مَا بَيْنَ كُلِّ دَرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ[٤]:

لە ئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خودای لێبێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە بەهەشتا سەدپایە هەیە، لە نێوانی هەموو دوو پایەیەکا سەد ساڵە ڕێیە (ت- س/ح).

---

[١] تقدم في مجلد ثاني. تسلسل/٢٦ رقم/١٣٠١/٤ + مجلد/٢ تسلسل/٢٦ رقم/١٢٩٩/٢ و رقم/١٣٠٤/٧.
[٢] سكت عن درجته الشارح.
[٣] تقدم مجلد ثامن. تسلسل/١١ رقم/٤٢٩٧/١.
[٤] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥٧١٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ لَوْ أَنَّ الْعَالَمِينَ اجْتَمَعُوا فِي إِحْدَاهُنَّ لَوَسِعَتْهُمْ[٥].

ئەبو سەعید (رەزای خودای لێبێ) لە حەزرەتەوە (درووودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە بەهەشتا سەد پایە هەیە، ئەگەر هەرچی خەڵك هەیە لە یەکێکیاندا کۆببنەوە دەیانگرێ‌و بەشیان دەکا. (ت- س/ غەریب)

٥٧١٧- وعنه عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في قوله تَعَالَى: (وفرش مرفوعة..) ← (ب - ٧ ز - ٣٩ ل - ١٧٦ ف - ٢)[٦].

## ١٣٦) سەرچاوەو رووبارەکانی بەهەشت : (أنهار الجنة وعيونها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {مَّثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَآئِمٌ وِظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَواْ وَّعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ - سورة الرعد - ١٣ / ٣٥}.

واتە: چۆنێتیی ئەنتیکەیی‌و نەستەقی ئەو بەهەشتە نازدارە کە بەڵێنی پێ دراوە لە لایەنی خوداوە بۆ خاوەن تەقواکان، کە خۆیان دەپارێزن لە کاری بێ شەرعی‌و ناڕەوا ئاوایە: جۆبارانی زۆری جوان جوان بە بن دارو درەخت‌و مێرگ‌و باخ‌و چەمەن‌و گوڵ‌و گوڵزارەکانیا، بەناو تەلارو کۆشك‌و هۆدەو باڵەخانەو خان‌و ژێر خانەکانیا، زۆر بەجوانی دەخولێتەوە، هەیە جۆباری ئاوی سازگاری شیرینە، هەیە جۆگەی پاڵفتەی هەنگوینە، هەیە روباری مەی‌و شەراب‌و بادەی پاکی رەنگینە، هەیە چەمی شیری سافە، لە گەروودا گەوارایە، بەری دارەبەرییەکانی، میوەی درەخت‌و باخەکانی هەمیشەیین‌و هەموو کاتێ بەردەوامن، سێبەری خەست‌و فێنك‌و خۆشیشی هەروا بەردەوامە، ئەم بەهەشتە ناسك‌و نازدارە ئەنجامی رەنجەشانی ئەو زاتە خودا پێداوانەیە کە لە خودا دەترسن، کە پارێز لە گوناه دەکەن، کە شەرم‌و شکۆ لە هەق دەکەن. ئەنجامی ژیانی کافرەکانیش ئاگری دۆزەخە.

---

[٥] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٦] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/٣٩ رقم/٢/٤١٤٧.

وَقَالَ تَعَالَى: {فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ - سورة الرحمن - ٥٥ / ٥٠}.

واتە: هەیە لە هەریەکێ لەو بەهەشتانەدا دوو کاریز هەمیشە ئاویان لەبەر دەڕوا.

وَقَالَ تَعَالَى: {فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ - سورة الرحمن - ٥٥ / ٦٦}.

واتە: لەو بەهەشتانەدا دوو سەرچاوە هەیە فوارە دەکەن.

وَقَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى - سورة محمد - ٤٧ / ١٥}.

واتە: شێوەی شیرینی بەهەشت‌و حاڵی غەریبی ئاوایە، لەسەر گفت‌و بەڵێنی خودا تاپۆ دەکرێ لەسەر ئەهلی تەقوا، پڕە لە چەم‌و روباری ئاوی پاکی شیرینی بۆنخۆشی سازگار، هەروا پڕە لە چەم‌و روباری مەی‌و بادەو شەراب، تام‌و بۆنێکی زۆر خۆش‌و بەلەزەتی هەیە لە دەمی ئەوانەدا کە دەیخۆنەوە، پڕە لە چۆمی هەنگوینی پاڵفتە.

٥٧١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَيْحَانُ وَجَيْحَانُ وَالْفُرَاتُ وَالنِّيلُ كُلٌّ مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ. رواه مسلم[١]:

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سەیحان‌و، جەیحان‌و، فورات‌و، نیل هەموویان لە رووبارەکانی بەهەشتن (م).

٥٧١٩- عَنْ أَنَس (رَضِي اللّٰهُ عَنهُ) قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْكَوْثَرُ فَقَالَ: ذَاكَ نَهْرٌ أَعْطَانِيهِ اللّٰهُ يَعْنِي فِي الْجَنَّةِ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ وَأَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ فِيهَا طَيْرٌ أَعْنَاقُهَا كَأَعْنَاقِ الْجُزُرِ. قَالَ عُمَرُ إِنَّ هَذِهِ لَنَاعِمَةٌ. قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكَلَتُهَا أَنْعَمُ مِنْهَا[٢]:

---

[١] مسلم. جنه ونعيمها: ٧٠٩٠.

[٢] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

ئەنەس (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: لە بارەی کەوسەرەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) کرد، فەرمووی: ئەوە رووبارێکە وا لە بەهەشتا، خودای گەورەو سەروەر داوێتی بەمن، لەشیر سپیترەو لە هەنگوین شیرینترە، جۆرە مەلێکی وای وا تیادا گەردنیان وەك گەردنی وشتر وایە.

عومەر فەرمووی: بەراستی ئەو مەلانە ناسكو نازدارن. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کەسانەی کە دەیانخۆن گەلێ لەوان ناسكو نازدارترن. (ت-س/ح).

٥٧٢٠- عَنْ حَكِيمِ بْنِ مُعَاوِيَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَحْرَ الْمَاءِ وَبَحْرَ الْعَسَلِ وَبَحْرَ اللَّبَنِ وَبَحْرَ الْخَمْرِ ثُمَّ تُشَقَّقُ الأَنْهَارُ بَعْدُ. رواهما الترمذي[٣]:

حەکیمی کوڕی موعاوییە لە باوکییەوە (رەزای خودایان لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە بەهەشتا دەریای ئاوو، دەریای هەنگوینو، دەریای شیرو، دەریای مەی هەیە، ئەوجا هەموو رووبارەکانی تری بەهەشت لەم چوار رووبارە گەورەیەوە هەڵدەگیرین، وەك ماکاوو جۆگەکانی سەری! (ت-س/ص).

## ١٣٧) دارو درەختو میوەی بەهەشت : (أشجار الجنة وفاكهتها)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ جَنَّتَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، ذَوَاتَا أَفْنَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، فِيهِمَا عَيْنَان تَجْرِيَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، فِيهِمَا مِن كُلِّ فَاكِهَةٍ زَوْجَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، مُتَّكِئِينَ عَلَى فُرُشٍ بَطَائِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَق وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، هَلْ جَزَاء الْإِحْسَان إِلَّا الْإِحْسَانُ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ، وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ،

---

[٣] رواه الترمذي بسند صحيح.

مُدْهَامَّتَان، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، فِيهِمَا عَيْنَان نَضَّاخَتَان فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، فِيهِمَا فَاكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، فِيهِنَّ خَيْرَاتٌ حِسَانٌ فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَان، مُتَّكِئِينَ عَلَى رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسَانٍ، فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ، تَبَارَكَ اسْمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ – سورة الرحمن – ٥٥ / ٤٦ –٧٨}.

واتە: هەیە بۆ کەسێ کە بەراستی لە گەورەیی و پایەو شانو شکۆی خودای گەورە بترسێ دوو بەهەشت، دووباخو سەرا، کە پڕن لە کۆشكو تەلارو باڵەخانەو ژێرخانو خانووبەرەی رازاوە، هەروا پڕن لە پەریو هاوسەری حەلاڵو کەنیزو کارەکەرو نۆکەرو خزمەتکار، پڕن لە داری بەریو رەزو داری گوڵو گژو گیاو گوڵو گوڵزار دوو سەرچەشمەی گەورە وەك ماكاو بەناویانا، بە هەموو کونو قوژبنێکیاندا بە ئارەزووی دڵی دانیشتووەکانیان وەك بۆری ساردو گەرمی ئەم چەرخە، لەسەرو لە خوار، دەخولێنەوە لە هەموو میوەیێ دوو جۆر هەیە، وەك تەڕو وشك، کۆنو تازە، فەریكو گەییوو، بەڕوولەو کاملّ، ناسراوو نەناسراو، ئەو لە خودا ترسانە لەناو ئەو بەهەشتە ناسكو نازارانەدا تەواو بێ ترسو دڵنیا دەبنو، وەك ئاغای ماڵی خۆیان پشتی لێ دەدەنەو راحەتی خۆیان وەردەگرنو، لەسەر نوێنو فەرشو دۆشەكو رایەخی چاکی نایابی وا کە ناوەخنو بەرەکەشیان لە باشترین قورماش بێ، وەك ئاورێشمی ساخو، دێباجی ئەستوورو رەقی بێ مامەند لە نایابیدا، ئەو ئاغایانە لەسەر ئەمانە پاڵ دەدەنەوەو هەست بە حەوانەوەو حەسانەوە دەکەن. سەرین، پشتی، بالیف، دۆشەك، قاڵی، هەرچی دڵ دەیخوازێ لە بەهەشتا هەیە، ئیتر لە هەموو لایەکەوە مایەی حەوانەوەو بەختیارییان بۆ ئامادەکراوە، لە لایەکەوە خانوبەرەی رێکوپێکی جوان، باخو بۆلاخی جوانی کەس نەدیو، پڕ گوڵو رێحانەو گوڵزارو لالەزار، دیمەنی رەنگینی شیرینی دڵگیری دڵڕفێن، قاپو قاچاخی زێڕو زیوین، جلو بەرگو خشڵی جوانی گەوهەرو یاقوتو

زومڕووت و مرواری و مەرجان و ئەڵماس و شتی لەمانەیش چاکتر، لە هەمووی سەیرتر بەری باخەکانیان هەمیشەیە دەسبەرەو بەبێ هیچ ئەرگ و زەحمەتێ بێ رنەو بیخۆ، لەلایەکی تروە پەری و حۆری ناسك و نازداری چاوقەوی، چاو جوان، چاورەشی برۆقەیتانی، رەنگی سپی و سوور وەك یاقووت و مەرجان، ساف و ئاودارو لووس و پووس وەك گۆی مرواری، تا بڵێی رەفتار جوان، شێوە شیرین، خوو بەرز، دەنگو رووخۆش، مێردپەروەر، چاویان بڕیوەتە هاوسەرەکانی خۆیان و بەس، بەکچی کەوتوونەتە لایان، لە پێش ئەواندا کەس دەستی بۆ نەبردوون، نەمرۆڤو نە پەری. بەڵێ ئەمە پاداشی ئەو لە خودا ترسانەیە، چونکە پاداش لە چەشنی کردارە، پاداشی چاکە هەرچاکەیەو پاداشی خراپەیش هەر خراپەیە.

پاداشیش بەپێی چاکی و چۆنێتی و چەندێتی و خراپی کردارە، لەبەر ئەوە ئەوانەی کەوان لە پایەی دووەمدا، بۆ ئەوانیش سەرو دوو بەهەشت هەیە، بەڵام بۆ خۆشی ناگەنە دوو بەهەشتەکەی پێشوو، وەلێ ئەم دوو بەهەشتەی ئەمانیش لەبەر زۆری و چڕی و پڕی دارو درەخت و سەوزایی و شینایی و سێبەری دارو درەخت و گوڵ و ڕێحانە لە دوورەوە رەش دەکەنەوەو رەشباو دەنوێنن، ئەمانیش دوو کارێزیان تیادایە، وەك فوارە لەسەرچاوەکەیانەوە هەمیشە هەڵ دەقوڵێن و، ئەوجا بەناویانا شوێن بە شوێن و باخ بە باخ و هۆدە بە هۆدە دەخولێنەوە، میوەیەکی چاکی نایابی زۆرو مشەیان تیادایە، لە هەموو جۆرێ، وەك خورماو ترێ و هەنارو هەنجیرو زەیتوون و مۆزو گوێزو خەیارو کاڵەك، لەناو ئەو دوو بەهەشتەو هۆدەو سابات و دەوارو شوێنەکانی تریدا پەری نازدارو جوان و پاکیزەو سەلارو داوێنپاك و خوو بەرز هەن، کە کەس دەستی بۆ نەبردوون، بە کچی چوونەتە لای مێردەکانیان و هەموو جارێکیش کە دەچنە لایان دەبنەوە بە کچ، پاڵ دەدەنەوە لەسەر چەن پشتی سەوزی نایاب، کە لەبەر نایابی و دەگمەنی و فرەناسکی و نازداری و جوانی و بێ وێنەیی دەڵێی لەشاری عەبقەرەوە هاتوون، کە شاری جنۆکەکانەو لە باوەڕی ئێوەدا هەرچی شتی چاك بێ و عەجیب و عەنتیکەبێ هی ئەو شارەیە، دەی ئەی بەرەی ئادەم! ئەی نەوەی

ئادەم! هەروا ئەی بەرەی پەری و جنۆکە ئیتر بۆ پێ لە نازو نیعمەتەکانی خودا نانێن، دەی ئەمانە هەموویان چاکەو بەهرەو نازو نیعمەتی خودان کە لەگەڵ ئێوەدا دەیکا، دەی کامیان بە نیعمەت نازانن و باوەڕتان پێی نییە، بەراستی دەرکەوت و هەمیشە دیارو نمایانە کە ناوی خودا زۆر پیرۆزوموبارەکە، هەروا دەرکەوت کە پەروەردگاری تۆ پاك و پیرۆزو بێ نەنگەو خاوەنی چاکەو خەڵاتی گەورەیە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ، فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ، {وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ، وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ، وَمَاءٍ مَّسْكُوبٍ، وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ، لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ – سورة الواقعة – ٥٦ / ٢٧ – ٣٣}.

٥٧٢١– ← (ب – ٧ ز – ٣٩ ل – ١٧٥ ف – ١)[١].

٥٧٢٢– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ الْجَوَادَ الْمُضَمَّرَ السَّرِيعَ مِائَةَ عَامٍ، مَا يَقْطَعُهَا[٢]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەربێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: درەختێ هەیە لە بەهەشتا سواری ئەسپی خێرای زۆر چاك کە ئامادە کرابێ بۆ قۆچ و تەراتێن، سەدساڵ بە غار بە بن لقەکانیدا دەڕوا ناگاتە ئەو پەڕی (ش/ت).

٥٧٢٣– عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ وَذُكِرَ لَهُ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّ الْفَنَنِ مِنْهَا مِائَةَ سَنَةٍ أَوْ يَسْتَظِلُّ بِظِلِّهَا مِائَةُ رَاكِبٍ فِيهَا فَرَاشُ الذَّهَبِ كَأَنَّ ثَمَرَهَا الْقِلَالُ. رواه الترمذي بسند حسن. اللهم حسن لنا الحال وأسعدنا في الدارين يا رحمن آمين[٣]:

---

[١] تقدم فى مجلد سابع. تسلسل/٣٩ رقم/١/٤١٤٦.

[٢] تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى/٣ لـ ٤٤٥ رقم/١٣١٥ = ٣٢٥١ فتح البارى. راجع فتح رقم/٣٢٥٢ = تجريد/١٣١٦ = ٣٢٥٢، ٤٨٨١، ٣٢٥٣ + تجريد رقم/١١٥١ = ٢٧٩٣ فتح. مسلم. جنه ونعيمها: ٧٠٦٩. بخارى. رقاقك ٦٥٥٢، ٦٥٥٣.

[٣] رواه الترمذي بسند حسن.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر (رەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لێبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەبارەی سیدرەتولمونتەهاوە دەیفەرموو: سەد ساڵ سوار بە سێبەری وردەلقەکانیدا دەڕوا. یا فەرمووی: سەد سوار لە سێبەریاندا دەحەوێنەوە، پەپولەی زێڕینیان پێوەیە، بەدەوری سیدرەدا دەخولێنەوەو لەسەر لقەکانی دەنیشنەوە، ئەوەندە عەنتیکەو سەیرن نەبێتەوە، بەرەکەی دەڵێی کووپەڵەی هەجەرە (ت- س/ح).

## ١٣٨) هۆدەو ماڵی بەهەشتییەکان : (غرف أهل الجنة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ - سورة الزمر - ٣٩/٢٠}.

حاڵی دۆزەخییەکان ئەوە بوو باس کرا، بەڵام کەسانێ کە لە خودای خۆیان دەترسن و باوەڕی ساخ و کردەوەی باشیان هەیە کۆشکی چەن نهۆم و باڵەخانەی بڵندو بەرزیان بۆ هەیە، هۆدە لە بان هۆدە، قات لە بان قات دروست کراون، ئاو جۆگە جۆگە بە ناویاندا لە سەرو لە خوار، دەخولێتەوە، ئەم بەڵێنانە گفتی خودایە، گفت و بەڵێنی خودایش هەقەو راستەو پاشگەزبوونەوەی تیادا نییە.

٥٧٢٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ لَيَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا تَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدُّرِّيَّ الْغَابِرَ مِنَ الْأُفُقِ مِنَ الْمَشْرِقِ أَوِ الْمَغْرِبِ لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ. قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ تِلْكَ مَنَازِلُ الْأَنْبِيَاءِ لاَ يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ. قَالَ: بَلَى وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ رِجَالٌ آمَنُوا بِاللَّهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ. رواه الشيخان والترمذي[1]:

---

[1] تجريد البخاري = مختصر صحيح البخاري/٣ ل- ٤٤٦ رقم/ ١٣١٧ -، ٣٢٥٦، ٦٥٥٦ فتح الباري شرح صحيح البخاري. مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٧٣.

ئەبو سەعیدی خودی (خۆشنوودیی خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەهەشتییەکان کە تەماشای خەڵکی باڵەخانەکان دەکەن کەوان لە سەرووبانەوە، وەها پیایاندا هەڵ دەڕوانن وەك چاو بۆ ئەستێرە بگێڕن ئاوا، دەق وەك چۆن ئێوە چاو دەگێڕن بۆ ئەو ئەستێرە گەشانەی کە تەواو تەواو دوور کەوتوونەتەوەو لە کەناری ئاسمان نزیکبوونەتەوەو لە خۆر هەڵاتەوە یا لە خۆرئاواوە خەریکن ئاوا دەبن! دیارە کە ئەم بەرزیو نزمییەیش لەبەر جیاوازیی پلەو پایەی نێوانیانە. یاران فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خودا! دیارە ئەو جێگە بەرزانە هەوارو بارەگای پێغەمبەرانن، پێغەمبەران نەبێ کێ دەگاتە ئەوێ؟ فەرمووی: وانیە، بەو خودایە کە هەرخۆی خودایە کە گیانی هەموومان وا لە دەستی تەوانایی ئەودا، زۆرکەسی تریش دەگەنە ئەوپایە بەرزانە، کە خۆیان پێغەمبەر نەبوون بەڵام باوەڕی ساخیان بە خودا هەبووەو بەدەم و بەدڵ و بە کردوەی باش باوەڕیان بە پێغەمبەران بووە (ش/ت).

٥٧٢٥- عَنْ عَلِيّ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَغُرَفًا يُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا. فَقَامَ إِلَيْهِ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: هِيَ لِمَنْ أَطَابَ الْكَلَامَ وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ وَأَدَامَ الصِّيَامَ وَصَلَّى لِلّٰهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. رواه الترمذي بسند غريب. نسأل الله تمام الانس في الوحدة والغربة. آمين[٢]:

عەلی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خانووی جوانی وا لە بەهەشتا هەیە وەك مینابەند دەرەوەی لە ناوەوەو ناوەوەی لە دەرەوە جوان جوان دیارە. عارەبێکی دەشتەکی فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو جۆرە خانووە هی کێیە؟ فەرمووی: هی ئەو کەسانەیە کە گفت و لفتیان شیرین بێ و، قسەیان خۆش بێ و نانبدەبن و، هەمیشە بەرۆژووبن، کە خەڵکیش دەخەون ئەوان هەڵ دەستن شەو نوێژ دەکەن بۆ خودا (ت- سند غريب).

---

(٢) رواه الترمذي بسند غريب.

## ١٣٩) خێوەتگاکانی بەهەشت: (خيام الجنة)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {حُورٌ مَّقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ، فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ – سورة الرحمن – ٥٥/٧٢ – ٧٣} لەباسی (أشجار الجنة وفاكهتها) رابوورد.

٥٧٢٦- ← (ب – ٧ ز – ٣٨ ل – ١٧٤ ف – ٣)[١].

٥٧٢٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِلْمُؤْمِنِ فِي الْجَنَّةِ لَخَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ وَاحِدَةٍ مُجَوَّفَةٍ طُولُهَا سِتُّونَ مِيلاً لِلْمُؤْمِنِ فِيهَا أَهْلُونَ يَطُوفُ عَلَيْهِمُ الْمُؤْمِنُ فَلاَ يَرَى بَعْضُهُمْ بَعْضًا. رواهما الشيخان والترمذي. نسأل الله أن نكون من أهلها. آمين[٢]:

ئەم فەرموودەیەیش ریوایەتو گێڕانەوەیەکی ترە لە هەمان فەرموودەی پێشوو کە لەم شوێنەدا رابورد: (ب/٧ ز/٣٨ ل/١٧٤ ف/٣). جیاوازییەکی کەمی هەیە لەوێ دەفەرموێ: درێژاییەکەی شەست میلە، لە گێڕانەوەیەکی تری موسلیمدا (رەزای خودای لێبێو پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) دەفەرموێ: بەرزاییەکەی شەست میلە. واتە: ئەم چادرە شەشگۆشەیە. (وەرگێڕ)

## ١٤٠) بازاڕەکانی بەهەشت : (أسواق الجنة)

٥٧٢٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَسُوقًا يَأْتُونَهَا كُلَّ جُمُعَةٍ فَتَهُبُّ رِيحُ الشَّمَالِ فَتَحْثُو فِي وُجُوهِهِمْ وَثِيَابِهِمْ فَيَزْدَادُونَ حُسْنًا وَجَمَالاً فَيَرْجِعُونَ إِلَى أَهْلِيهِمْ وَقَدِ ازْدَادُوا حُسْنًا وَجَمَالاً فَيَقُولُ لَهُمْ أَهْلُوهُمْ وَاللّٰهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالاً. فَيَقُولُونَ وَأَنْتُمْ وَاللّٰهِ لَقَدِ ازْدَدْتُمْ بَعْدَنَا حُسْنًا وَجَمَالاً. رواه مسلم (رضوان الله تعالى عليه ونور ضريحه – المترجم)[١].

---

(١) تجريد/٤ ل- ٤٩٨ رقم/١٧٠٣ = ٤٨٧٩، ٣٢٤٣، ٤٨٨٠، ٤٨٧٨. مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٨٧، ٧٠٨٠٠

(٢) تقدم تخريجه فى الحديث السابق.

(١) مسلم. جنة وصفة نعيمها: ٧٠٧٥.

ئەنەس (ڕەزای خودای گەورەی پیرۆزی لێبێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست‌و نازدار (درودو سلاوو ڕەحمەت‌و بەرەکەت‌و پیرۆزیی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ‌و، سەرو ماڵ‌و منداڵ‌و باوك‌و دایك‌و كەسوكار‌و هەمووی بە قوربانی خاكی بەر ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ – ئامین– ٢٠٠٨/٥/٣٠) فەرمووی: لە بەهەشتا بازاڕێ هەیە، دەبێ بە سەیرانگای خەڵكەكەی، هەموو ڕۆژی هەینییەك بەهەشتییەكان بۆ گەشت‌و گوزار دەچن بۆ ئەوێ، جابای شەماڵ هەڵدەكا، دەموچاوو جل‌و بەرگەكانیان گوڵاو پەرژێن دەكا، ئیتر ئەوەندەی تر جوانترو نازدارتر دەبن جا لەسەر ئەم حاڵە تازەیە كە دەچنەوە بۆ ماڵەوەیان خێزانەكانیان پێیان دەفەرموون: بەخودا لەم ماوەیەدا كە چوونەتە دەرەوە ئەوەندەی تر شەوق‌و ڕەونەقتان هەڵهێناوە، ئەوانیش وەڵامیان دەدەنەوە بەخودا ئێوەیش هەروا جونترو نازدار تر بوون. (موسلیم – ڕەحمەتی خودای لێبێ)[1].

٥٧٢٩– عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ لَقِيَ أَبَا هُرَيْرَةَ فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَسْأَلُ اللَّهَ أَنْ يَجْمَعَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ فِي سُوقِ الْجَنَّةِ. فَقَالَ سَعِيدٌ أَفِيهَا سُوقٌ؟ قَالَ: نَعَمْ أَخْبَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ إِذَا دَخَلُوهَا نَزَلُوا فِيهَا بِفَضْلِ أَعْمَالِهِمْ ثُمَّ يُؤْذَنُ فِي مِقْدَارِ يَوْمِ الْجُمُعَةِ مِنْ أَيَّامِ الدُّنْيَا فَيَزُورُونَ رَبَّهُمْ وَيُبْرِزُ لَهُمْ عَرْشَهُ وَيَتَبَدَّى لَهُمْ فِي رَوْضَةٍ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ فَتُوضَعُ لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ وَمَنَابِرُ مِنْ لُؤْلُؤٍ وَمَنَابِرُ مِنْ يَاقُوتٍ وَمَنَابِرُ مِنْ زَبَرْجَدٍ وَمَنَابِرُ مِنْ ذَهَبٍ وَمَنَابِرُ مِنْ فِضَّةٍ. وَيَجْلِسُ أَدْنَاهُمْ – وَمَا فِيهِمْ مِنْ دَنِيٍّ – عَلَى كُثْبَانِ الْمِسْكِ وَالْكَافُورِ وَمَا يُرَوْنَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَرَاسِيِّ بِأَفْضَلَ مِنْهُمْ مَجْلِسًا، قَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَهَلْ نَرَى رَبَّنَا؟ قَالَ: نَعَمْ قَالَ هَلْ تَتَمَارَوْنَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ. قُلْنَا لاَ. قَالَ: كَذَلِكَ لاَ تَتَمَارَوْنَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ وَلاَ يَبْقَى فِي ذَلِكَ الْمَجْلِسِ رَجُلٌ إِلاَّ حَاضَرَهُ اللَّهُ مُحَاضَرَةً

---

[1] قوربان! هیممەتێ، نوری فیدات بێ
چاوێكی خێرت لەمنی كەدات بێ
بە دووعای خێرت نیعمەت لەیادبێ
بۆ منت نەبێ، لە بۆ خۆدات بێ! (وەرگێڕ)

حَتَّى يَقُولَ لِلرَّجُلِ مِنهُمْ يَا فُلاَنُ ابْنَ فُلاَنٍ أَتَذْكُرُ يَوْمَ قُلْتَ كَذَا وَكَذَا فَيُذَكِّرُهُ بِبَعْضِ غَدَرَاتِهِ فِي الدُّنْيَا فَيَقُولُ يَا رَبِّ أَفَلَمْ تَغْفِرْ لِي؟ فَيَقُولُ: بَلَى فَبِسِعَةِ مَغْفِرَتِي بَلَغْتَ مَنْزِلَتَكَ هَذِهِ. فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى ذَلِكَ غَشِيَتْهُمْ سَحَابَةٌ مِنْ فَوْقِهِمْ فَأَمْطَرَتْ عَلَيْهِمْ طِيبًا لَمْ يَجِدُوا مِثْلَ رِيحِهِ شَيْئًا قَطُّ وَيَقُولُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى قُومُوا إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لَكُمْ مِنَ الْكَرَامَةِ فَخُذُوا مَا اشْتَهَيْتُمْ. قَالَ فَنَأْتِي سُوقًا قَدْ حَفَّتْ بِهِ الْمَلاَئِكَةُ فِيهِ مَا لَمْ تَنْظُرِ الْعُيُونُ إِلَى مِثْلِهِ وَلَمْ تَسْمَعِ الآذَانُ وَلَمْ يَخْطُرْ عَلَى الْقُلُوبِ فَيُحْمَلُ لَنَا مَا اشْتَهَيْنَا لَيْسَ يُبَاعُ فِيهَا وَلاَ يُشْتَرَى وَفِي ذَلِكَ السُّوقِ يَلْقَى أَهْلُ الْجَنَّةِ بَعْضُهُمْ بَعْضًا قَالَ فَيُقْبِلُ الرَّجُلُ ذُو الْمَنْزِلَةِ الْمُرْتَفِعَةِ فَيَلْقَى مَنْ هُوَ دُونَهُ - وَمَا فِيهِمْ دَنِيٌّ - فَيَرُوعُهُ مَا يَرَى عَلَيْهِ مِنَ اللِّبَاسِ فَمَا يَنْقَضِي آخِرُ حَدِيثِهِ حَتَّى يَتَخَيَّلَ إِلَيْهِ مَا هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ وَذَلِكَ أَنَّهُ لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ أَنْ يَحْزَنَ فِيهَا، ثُمَّ نَنْصَرِفُ إِلَى مَنَازِلِنَا فَتَتَلَقَّانَا أَزْوَاجُنَا فَيَقُلْنَ مَرْحَبًا وَأَهْلاً لَقَدْ جِئْتَ وَإِنَّ بِكَ مِنَ الْجَمَالِ أَفْضَلَ مِمَّا فَارَقْتَنَا عَلَيْهِ. فَنَقُولُ: إِنَّا جَالَسْنَا الْيَوْمَ رَبَّنَا الْجَبَّارَ وَيَحِقُّنَا أَنْ نَنْقَلِبَ بِمِثْلِ مَا انْقَلَبْنَا[٢]:

سەعیدی کوڕی موسەییب (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: بە ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) گەیشتم فەرمووی: لەخودا داوا دەکەم کە منو تۆ لە بازاڕەکەی بەهەشتا کۆبکاتەوە، منیش گوتم: بۆچی بەهەشت بازاڕی تیادا هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ، لەم بارەیەوە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) هەواڵی داوە بەمن کە: کاتێ خەڵکی بەهەشت دەچنە ناو بەهەشت چوونە ناو بەهەشتەکەیان لە سایەی خوداوەیە، بەڵام بەپێی زۆریو کەمیی کردەوەکانیان پایەی بەرز یا پلەی نزم وەردەگرن، ئەوجا لە بەهەشتا هەموو سەری حەفتەیێ لە رۆژی هەینی (جومعە)دا خودا رێگەیان پێ دەدا دەچن بۆ سەردانو دیێنی پەروەدگاریان، واتە: هەمووکاتێ کە بە ئەندازەی حەوت رۆژ لە رۆژەکانی جیهان لێیان دەڕوا لە رۆژی حەوتەمیاندا دەچن بۆ دیێنیی خودا، لە باخێ لە باخەکانی بەهەشت دا خۆی یان پێ نیشان دەداو، بەبێ پەردەو رووپۆش

---

[٢] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

دەیبینن جا لە دیوانی خودادا بازێکیان لەسەر مەشخەڵی نوور دادەنیشن، بازێکی تریان لەسەر مینبەرو مەشخەڵی مرواری دادەنیشن، بازێکی تریان لەسەر مەشخەڵی یاقوت دادەنیشن، هەندێکی تریان لەسەر مەشخەڵی زوبەرد دادەنیشتن، یا لەسەر مەشخەڵی زێڕ، یا لەسەر مەشخەڵی زیو، هەرە خوارووەکەیان کە پایەی بەپێی کردەوەی لە گشتیان نزمتربێ لەسەر تەپۆڵکەی میسكو کافوور دادەنیشن، لە بەهەشتا پایەبەرزو پایە نزم هەیە، بەڵام خوێڕیو ناکەسی تیادا نییە، تەپۆڵکە نشینەکان هەست بە هاوسەرکەمی ناکەنو کینەو دەغەز لە مەشخەڵ نشینەکان ناکێشن بەباشو بارەی خۆیان لەلای خودا زۆرزۆر رازینو شوکرانەی لەسەر دەبژێرن.

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) فەرموویٚ: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! کەوابێ دیارە لەو جیهان بە چاوی سەر پەروەردگاری خۆمان دەبینین! فەرمووی: ئەدیی! ئایا لە دیتنی خۆری نیوەڕۆو لە دیتنی مانگی شەوی چواردەدا هیچ شەكو گۆمانێکتان هەیە؟ عەرزیمان کرد: نەء، ئەگەر شتی وا روونو ئاشکرا گومانی تیادابێ، ئیتر هیچ شتێ بە بەڵگەو شایەت ئیسپات نابێ، فەرمووی: دەی بە هەمان رەنگ ئاوا بە ئاشکراو بە ئاسانی خودا دەبیننو هەر کەسێ لە شوێنی خۆیەوە چاوی بە خودا دەکەوێو لە دیتنی ئەوزاتە پیرۆزەدا هیچ شەكو گومانێکتان نامێنێ، یەك بە یەکیش خودا خەڵکی ئەو کۆڕی دانیشتنە دێنێتە گیروگاز، یەکە بە یەکە پێیان دەفەرموێ: ئەی فیساری کوڕی فیسار! فیسارە رۆژت لە بیرە، کەواوات دەگوت؟ هەندێ لە بێپەیمانیو تاوانو گوناهی خۆیی وەبیر دەخاتەوە، هینی کاتی جیهانی، بەندەکەیش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەی تۆ لەمانە لێم خۆش نەبووی؟ دەفەرموێ: با، دەنا ئەگەر بەهۆی لێبووردنو بێ سنووریی چاو پۆشیی منەوە نەبوایە تۆ نە دەگەیشتیتە ئەم پایە مەزنە کە لە خزمەت خودادا دابنیشیو تەماشای جەماڵی بکەی، ئیتر ئەوا لەم خۆشیو نازو نیعمەتەدان لە پڕ پەڵە هەورێ لە سەرەوە دەیانگرێتە ناوو، دایان دەپۆشێو، بۆنو بەرامەیەکی واخۆش بەسەریاندا دەبارێنێ کە هەرگیز بۆنی وا خۆشیان نەدیبێ، ئەوجا

خودای گەورەو پیرۆزمان دەفەرموێ: ئادەی فەرموون هەستن بچن بەلای ئەو نازو نەوازوشەی کە بۆم ئامادەکردوون، هەرچی ئارەزوو دەکەن بیبەن بۆ خۆتان، جا ئەوجا دەچین بۆ ناو بازاڕێ فریشتە لە هەموو لایەکەوە دەورەیان داوە، ئەو بەهرەو خۆشییەی لەو بازاڕەدایە نە کەس بەچاو دیویەتی، نە بەگوێ باسی شتی وای بیستووە، نە بە خەیاڵیش بە دڵیدا رابووردووە، ئیتر بە کەیفی خۆمان دەکەوینە ناو ئەو بازاڕەوە، حەزمان لە هەرچی هەبێ هەڵی دەگرن بۆمانو دەیبەنەوە بۆمان بۆ ناو کۆشكو تەلارەکانمان، شتی ئەو بازاڕە بەلاشە بە خۆڕاییە، بەبێ کڕینو فرۆشتنە. لەناو ئەو بازاڕەدا خەڵکی بەهەشت دەگەن بە یەکتری. فەرمووی: واڕێ دەکەوێ کە پیاوی خاوەن پایەی بەرز دەگا بە پیاوێ لەخۆی خوارتر - گەرچی بەهەشتییەکان هەموویان سەردەستەو بەقەدرو بەڕێزنو، خوێڕیو خوارو خێچییان تیادا نییە - کە چاویان بەیەك دەکەوێ لە قۆزیو کەشخەیی جلو بەرگەکەی تاس دەیباتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵی لەخۆی دانەمێنێ، بەر لەوەی کە خەیاڵەکەی تەواو ببێ تەماشا دەکا کە لە دڵی خۆیدا جلو بەرگەکەی خۆی لە هینی هاوڕێکەی باشترە، ئەمەیش بۆیە وایە چونکە نابێ کەس لە بەهەشتا خەمو پەژارەی هەبێ، یا هەست بە هاوسەرکەمیی بکا، پاشان دەچینەوە بۆ ماڵەوەمان ژنەکانمان دێن بە پیرمانەوەو دەڵێن: خۆش هاتیتەوە سەر چاوان، دەزانی تۆ گەلێ لە جاران جوانتربووی، کە لەکن ئێمە بووی ئاوا جوان نەبووی، ئەویش دەفەرموێ: ئەمڕۆ هاونشینی خودای دڵنەواییکەر بووین، کەوابوو جێگەی خۆیەتی بەم شێوە شیرینە بگەڕێینەوە بۆ ماڵەوە! (ت- سەند غەریب).

٥٧٣٠- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَسُوقًا مَا فِيهَا شِرَاءٌ وَلاَ بَيْعٌ إِلاَّ الصُّوَرَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ فَإِذَا اشْتَهَى الرَّجُلُ صُورَةً دَخَلَ فِيهَا. رواهما الترمذي- نسأل الله رضاه والجنة آمين[٣].

---

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

ئیمامی عەلی (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە بەهەشتدا بازاڕێ هەیە، کڕینو فرۆشتنی تێدا نییە، بەس وێنەو پەیکەری پیاوو ژنی تێدایە، هەر پیاوێ یا هەر ژنێ حەزی لەهەر کامێ لەو وێنەو پەیکەرە جوانانە هەبێ دەچێتە ناویو ئیتر ڕەنگو ڕواڵەتو شێوەی دەق وەك هی ئەو پەیکەرە وا دەبێ، بەڵام جەوهەرەکەی ناگۆڕێو خۆی هەر خۆی دەبێ! (ت- سەند غەریب)

## ١٤١) لە بەهەشتدا هەر کەسێ ئارەزوو بکا کەشتوکاڵ دەکا، یا ڕەوگداری دەکا : (الزَّرْعُ وَالخَيْلُ في الجنة لمن يشاء)

٥٧٣١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَوْمًا يُحَدِّثُ وَعِنْدَهُ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْبَادِيَةِ. أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اسْتَأْذَنَ رَبَّهُ فِي الزَّرْعِ فَقَالَ: اللهُ لَهُ أَلَسْتَ فِيمَا شِئْتَ قَالَ: بَلَى وَلَكِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَزْرَعَ.فَأَسْرَعَ وَبَذَرَ فَبَادَرَ الطَّرْفَ نَبَاتُهُ وَاسْتِوَاؤُهُ وَاسْتِحْصَادُهُ وتكويرُهُ، فَكَانَ أَمْثَالَ الْجِبَالِ فَيَقُولُ اللّٰهُ دُونَكَ يَا ابْنَ آدَمَ، فَإِنَّهُ لاَ يُشْبِعُكَ شَيْءٌ، فَقَالَ الأَعْرَابِيُّ: يَا رَسُولَ اللهِ لاَ تَجِدُهُ إِلاَّ قُرَشِيًّا أَوْ أَنْصَارِيًّا، فَإِنَّهُمْ أَصْحَابُ زَرْعٍ، وَأَمَّا نَحْنُ فَلَسْنَا بِأَصْحَابِ زَرْعٍ.فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رواه البخاري في التوحيد[1]:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) ڕۆژێکیان فەرمایشتی دەفەرموو، پیاوێکی دەشتەکیش لە خزمەتیدا بوو، فەرمووی: لە بەهەشتا پیاوێ لە خودا داوا دەکا کە ڕێگەی بدا کە کەشتوکاڵ بکا، خودایش پێی دەفەرموێ: لە چیت کەمە وا حەز لە چاندن دەکەی، دەڵێ: لە هیچم کەم نییە ئەوەی پێم خۆش بێ هەمە، بەڵام وەك خولیایێ مەراقم پەڕیوەتە سەر ئەوە کشتوکاڵ بکەم! جا خودا ڕێگەی پێ دەدا، گورج تۆو دەوەشێنێ، بە چاوترووکانێ سەوز دەبێو نێر دەبێو ڕاست دەبێتەوەو

[1] تجرید البخاری/٣ ل- ١٢٠ رقم/١٠٣٢ = ٢٣٤٨، ٢٥١٩ فتح الباری شرح صحیح البخاری.

پێ دەگاو وەختی دروێنەی دیو دەدوورێتەوەو وەك كێو كۆمەڵ كۆكەڵ خڕ هەڵ دەدرێ و دەبێ بە شاراو خەرمان و جۆخێن و شتی وا، خودای گەورە لە رووی نازگرتنەوە پێی دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزادی چاو برسی! بە هیچ تێر ناخۆی، دەها ئەمیش هەمووی بۆ تۆ! عارەبە دەشتنشینەكەیش قسەیەكی خۆشی كرد، فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەو خودایە ببێ و نەبێ ئەو پیاوە كشتیارە لە خۆتانە لە ئێمە نییە، جایان قوڕەیشییە یان ئەنصارییە، چونكە ئەوان فەلان و فێری كەشتوكاڵن، بەڵام ئێمە فێری ئەوەنین ئێمە خاوەن ئاژەڵین، بەدوای لەوەڕدا دەگەڕێین! لەبەر ئەوە پێمان ناكرێ بە دیار كەشتوكاڵەوە ببەسترێینەوە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) لەخۆشی ئەم حاڵە پێكەنی. (بوخاری – رەحمەت لە گۆڕی نازداری).

٥٧٣٢– عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ هَلْ فِي الْجَنَّةِ مِنْ خَيْلٍ؟ قَالَ: إِنِ اللّٰهُ أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ فَلاَ تَشَاءُ أَنْ تُحْمَلَ فِيهَا عَلَى فَرَسٍ مِنْ يَاقُوتَةٍ حَمْرَاءَ لَهُ جَنَاحَانِ يَطِيرُ بِكَ فِي الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْتَ إِلاَّ فَعَلْتَ، قَالَ: وَسَأَلَهُ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ هَلْ فِي الْجَنَّةِ مِنْ إِبِلٍ؟ قَالَ: فَلَمْ يَقُلْ لَهُ مِثْلَ مَا قَالَ لِصَاحِبِهِ قَالَ: إِنْ يُدْخِلْكَ اللّٰهُ الْجَنَّةَ يَكُنْ لَكَ فِيهَا مَا اشْتَهَتْ نَفْسُكَ وَلَذَّتْ عَيْنُكَ[٢].

بورەیدە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پیاوێ پرسی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) قوربان! ئایا بەهەشت وڵاخی بەرزەی تیادایە؟ فەرمووی: ئەگەر خودا تۆی بردە ناو بەهەشت، ئەگەر ئارەزوو بكەی سواری ئەسپێكی باڵداری شێ دەبیت، كە دوو باڵی هەبێ، كە لەیەك یاقووتی ئاڵ دروست كراوە، بە ئارەزووی خۆت لە بەهەشتا هەرلایەكت بوێ باڵ دەگرێتەوەو دەتبا بۆ ئەوێ! فەرمووی: پیاوێكی تریش لێی پرسی: قوربان! ئەی لە بەهەشتا وشتر هەیە! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەك پیاوەكەی تری پێ نەفەرموو، بەڵام وەڵامێكی

---

[٢] بسند مسكوت عنه.

گشتیی دایەوە فەرمووی: ئەگەر خودا دەتباتە بەهەشت ئیتر هەموو شتێ بە دڵی تۆیە، هەرچی بەدڵ حەزی لێ بکەی، یا لەبەر چاوت خۆش و شیرین بێ هی خۆتە. (تیرمزی – پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودابێ).

دانەری ئەم تاجە پیرۆزە (رەحمەتی خودای گەورەی لێبێ) لە شەرحەکەیدا دەفەرموێ: ترمیزی (رەزای خودای لێبێ) ئەم حەدیسەی بە سەنەدێکی مەسکووتوعەنهو ریوایەت کردووە، واتە: لێی بێ دەنگ بووە، بە چاک و خراپ لێی نەدواوە، بەڵام ئیمامی تیرمزی لە حەدیسەکەی دوای ئەم حەدیسەوە دەفەرموێ: ئەم حەدیسە گەرچی مورسەلیشە بەڵام لە حەدیسەکەی پێش خۆی کە مەسعوومە ریوایەتی کردووەو کە حەدیسێکی موتتەصیلە ئەم مورسەلە لەو موتتەصیلە ئەصەحح ترە! تەماشای شەرحی تحفە الاحوزی لەسەر جامع الترمزی بفەرموو. کەواتە: سەنەدەکەی مەسکووتەعونهوی تەواو نییە.

واتە: رشتەکەی قسە لێ نەکراوی تەواو نییە داخەکەم کەم دەرفەتی و کەم رەواجی کتێبی کوردی گەلێ لەم فەوائیدوزەوائیدانەی لە کیسماندا خۆزگەم خودا بە بەخششی خۆی بەرەکەتی دەخستە تەمەنمان و سەرکەوتووی دەکردین لە دەرفەتێکا باسێکی تێرو تەسەلم لەسەر فەرموودەو زانستی فەرموودە لەسەر شێوەیەکی نوێ دەنووسی[1].

---

[1] سوپاس بۆ خودا پوختەیەکی باشم لەم بابەتە گەلاڵە کردووە، بەپێی توانای خۆم، بەرەبەرەو کەمە کەمە، بەپێی بوار لە تەرجەمەی تەجریدی بوخاریدا، پیادە دەکەم، کە لەسایەی خوداوە ئێستا بەرگی یەکەمی تەجریدە کە والەژێر چاپا. کاتی هەڵەبژێری چاپی یەکەمی ئەم بەرگە ٣/١٠/ ١٩٩٨. بەڵام سوپاس بۆ خودا ئێستا تەجریدی بوخاری بەپێنج بەرگ چاپ بووە، خودا یاربێ لەبەرگەکانی مختصری صحیحی موسلیم دا، لەمەودوا، ئەوەندەی بتوانم لەم جۆرە زانست و زنیارییانە پیادە دەکەم. ئیتر پەنا بەرەحمەتی خودا.

(وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٩/٨)

سوپاس بۆ خودا تەجریدی بوخاری بە پێنج بەرگ تەواو بوو، وە هەر پێنجی ئێستا چاپکراوە.

(وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٥/٣٠).

لەراستی دا نرخ و گرنگیی فەرموودە لەم سێ شتە دایە: مەتن، سەنەد، موحەددیس (مەنن: دەق، سەنەد: رشتە). متن دەبێ چۆن بێ؟ مەتن، واتە: دەقی وشەو رستەکانی فەرمایشتەکە لەسەر ئەو شێوەیەی کە لەزاری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یا لە زاری چینی دوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وەگێراوەو ریوایەت کراوە، کەرچی جاروبار لەبەر هۆی هونەری کەم یا زۆر قسەی راوییەکانیشی تێکەڵ دەبێ، تا دەق دەبەستێ و دەبێ بە متن و قاڵبی نەگۆڕی خۆی وەردەگرێ – متن کە ئەمە واتاکەی بوو دەبێ ئەم مەرجانەی تیادا هەبێ:

١- هەڵەی زمانەوانی و مێژوویی و هونەری تێدانەبێ، هەرچۆن بێ دەبێ رێك بێ لەگەڵ وەجهێ لە وجووهی قەواعیدی لۆغەی عەرەبیدا ئەمە لە کۆندا پاکژکراوە.

٢- بەلیغ و فەصیح و رەوان و رەوانبێژو نەستەق و رەسەن بێ و نارێك و نارەسەن و رەمەکی و رەشۆکی نەبێ. ئەمیش هەروا لە مێژەوە ساخ بۆتەوە.

٣-مەبست و واتاکەیشی بە پێچەوانەی دەقی ئایەتی قورئان ئەبێ هەروا بە پێچەوانەی خووی بەرزو پاڵفتەی بیرو باوەڕی ساغی رەسای دامەزراوی تێکڕای موسوڵمانان نەبێ. بەڵکوو مەبەستێکی جوانی کۆمەڵایەتی یا ئایینی تێدا بێ.

٤- پشێویی و ئاڵۆزی و شێواوو تیادانەبێ و قسەی بێ سەرو بەر نەبێ.

٥- بە پێچەوانەی حەقائیقی تەبیعی و راستەقینە سروشتییەکان نەبێ، ئەگەر بە تەئویلێکی دووریش بووە دەبێ لەگەڵ ئەم مەرجانەدا بسازێ، گەرچی مەرجی ترێش زۆرماوە.

سەنەدیش دەبێ بێ گەرد بێ، واتە: ئەو پیاوانەی کە ئەو فەرموودەیەیان بەریز لە دەمی یەکتری تا سەر حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) گێڕاوەتەوە دەشێ ئاوابن: هاو چەرخ بووبن، بە خزمەت یەکتری گەیشتبن، موسوڵمانی ساخ بن، نیازیان پاك بێ، زیرەك و بەزەین و زەین رۆشن و زاناو

داناو لێزان بن، بەپێی شوێنو حاڵو جێگەو ڕێگە ئەهل بن بۆ گێڕانەوەی ئەو حەدیسە. بە هیچ جۆرێ جێگەی گومان نەبن، لە هەمان کاتدا ڕاستگۆو ڕاستاڵو بەدینو خودا ناسی خاس بن، لەناو زانا فەرمووده زانەکاندا ناسراوبن.

موحەدیسەکانیش – گەرچی خۆشیان یەکێکن لە پیاوانی ڕشتەو زنجیرەی فەرموودەکەو دەبێ گشت مەرجەکانی ئەوانیان تیادا بێ، بەڵام جیاوازییەکیان هەیە لەبەر ئەوە – دەبێ شارەزاییەکی تەواویان لە زانستی فەرموودەدا هەبێ، ئاگایان لە کونو قوژبنی زانستی فەرووده شوناسی هەبێ، کورتو پوخت دەبێ موحەددیس – یا بە کوردییەکەی خۆمان بڵێن فەرموودەزان – مامۆستای مامۆستایان بێو لە ڕجالی جەرحو تەعدیل بێ وەك ئیمامی بوخاریو ئیمامی موسلیم (ڕەزای خودایان لێبێ).

جا ئەم کۆمەڵە مەرجەی سەرەوە لەهەر فەرموودەیەکا هاتە دی ئەوا ئەو حەدیسە صەحیحەو ڕاستو دروستو فەرموودەیەکی ساخەو، بەپێی پایەو پلەی خۆی، کە موتەواوتەرە، یا ئاحادە، کارو ڕەفتو عەمەلی پێ دەکرێ، ئیتر خودا بۆ بیرو باوەڕو تاعەتو بەندەگی کردن بێ، خودا بۆ کردارو ڕەفتارو گوتارو مامەڵەو ڕەوشتو مەبەستەکانی تری کۆمەڵایەتی بێ. بەڵام ئەگەر ڕەخنەو خراپەیێ لەیەکێ لەم مەرجانەدا ڕوویدا ئەوا بەپێی بەهێزیو لاوازی ئەو قەدحو ڕەخنەو زەدەدارییە پایەو پلەی ئەو حەدیسە دادەبەزێو بەپێی یاساو دەستوورەکانی زانستی فەرموودەناسی تەصنیفو تەبویبو ڕیز بەندیی دەکرێ. جا مەبەستم لەم قسیە ئەم ئەنجامەیە: ئەم شەنو کەوو گێڕەو کێشەیە بە هەموو کەس ناکرێ، ئەمە پیاوی خۆی دەوێ، لە پێش هەموو مەرجێکا ئەم جۆرە زاتانە دەبێ دارای تەقواو ناوو شورەتی جوان بنو جێگەی متمانەو باوەڕی جەماوەری موسوڵمان بن. وەکی تریش بلیمەتو زاناو داناو لێزانو شارەزاو پسپۆڕ بنو شارەزاییەکی تەواوی دینو دنیایان لە مەیدانی ئەو بابەتەدا هەبێ کە فەرموودە باس لێکراوەکە پەیوەندی پێوەی هەیە، جا گەرچی زانا پێشینەکان (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێبێ) لەم بوارەدا کۆتاییان نەکردووە،

بەڵام لەبەر هەندێ هۆی نوێ، ئەگەر دیسان لەسەر ئەم بیاناتە کۆمەڵێ زانای گەورە گەورەی لەخودا ترسی پسپۆڕی خاوەن تەقواو وەرع‌و ناوو شۆرەتی ئایینی جوان، دڵسۆزی گەلی ئیسلام، دوور لە هەوەسپەرستی‌و ئارەزوو بازی‌و رەچاوکردنی بەرژەوەندی دنیایی تەسك‌و ترووسك، لەبەر رۆشنایی دەقی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان‌و حەدیسە ساغ‌و دروستەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ)و تیشکی حەقائیقی عیلمی – ئەو حەقائیقانەی کە گەیشتوونەتە پلەی یەقین‌و بتمانە پێکردن – ئەگەر کۆمەڵێ زانای ئاوا سەر لەنوێ بەزانستی فەرموودە دابچنەوەو بۆ بەرژەوەندی ئیسلام‌و بەتایبەتی بۆ بەرژەوەندی گشتیی فەرموودە شەن‌و کەوێکی دڵسۆزانەی خەرمانی سامانی بەپیت‌و فەڕی سوننەت‌و فەرمایشتەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) بکەنەوەو، بە یاریدەی عیلمی حەدیسی کۆن، تەتویری شێوازی تەعن‌و جرح‌و تەعدیل، سەر لەنوێ، لەسەر رێبازو شێوازێکی نوێ بکەن‌و تەصنیف‌و تەبویب‌و ریزبەندیی‌و پلە بەندیی فەرموودەکان بکەنەوەو، پلەی بەهێزی‌و لاوازییان – لەبەر رۆشنایی ئەم هەوڵە نوێیە – بۆ دابنێنەوە، ئەگەر کاێکی پیرۆزی ئاوا ئەنجام بدرێ، بەراستی دەبێ بەمایەی خێرو بێرو خۆشی‌و بەهرەیەکی زۆر زۆر بۆ گەلی ئیسلام دەبێ بە تیرێکی کاریگەرو دەدرێ لە توێی دڵی ئەو دوژمنانەی ئیسلام کە هەمیشە لە کەمیندا خۆیان مەڵاس داوەو بۆ کەلێن‌و هەل دەگەڕێن، تا خەنجەری زەهراوی خۆیان تامشتووەکەی لە کۆڵەی ئیسلام بدەن!

وەلێ کارێکی وا گران‌و گرنگ بە هەموو کەس ناکرێ، مەگەر بەلیژنەیەکی پسپۆڕی هەڵبژاردەی نێو دەوڵەتی ئیسلامی، یا بەزانکۆیەکی گەورەی وەك جامیعولئەزهەری پیرۆز بکرێ، چونکە شتی وا سەرەڕای شارەزایی‌و پسپۆڕیی هونەریی،، تەوانایی سامانیشی گەرەکە، موختەبەرو ئەزمونگەو تاقیگەو روانگەی گەرەکە، کۆمەکی‌و راوێژو هاریکاریی سەدان پزیشك‌و زانای ئاسمانی‌و زەویناس‌و دەریاشوناس‌و دەروونناس‌و فەلاو کشتیاری پسپۆڕی دەوێ. هەوڵ‌و کۆششی نیازپاکی تاکە کەسیش بێ سوودو بەهرە نابێ، ئەویش وەلێ بەپێی خۆی هەر باشە. ئەوەی من ئاگام

لێبێ ئێستا هەوڵی وا پیرۆز لەسەر زۆر ئاست هەیە، حەدیس و علمی حەدیس لە زانکۆو فێرگاو پەیمانگا ئیسلامییەکاندا بایەخێکی گرنگی پێ دەدرێ، خوا یاربێ لە ئاییندەیەکی نزیکدا کتێبە سەرەکییەکانی حەدیس بە حاسیبەو کۆمپوتەر بەرمەجە دەکرێن!!

ئیسلام ئەمڕۆ لەسایەی خوداوە هێزێکی گەورەیە، لەسەر رووی زەوی، رۆڵێکی گەلێ گەورە دەبینێ لەسەر هەموو ئاستێ، دۆست و دوژمن ئەمڕۆ ئەوە باش دەزانن، خۆزگا ئێمەی کوردیش لەم قوناغە ناسکەی ئەمڕۆدا لەم بارو دۆخە حاڵی دەبووین و برایەتیی پتر لە ملیارێ موسوڵمانمان نەدەگۆڕییەوە بە زەردەخەنەی درۆی لایەنە رامیارییە بێ بارەکان[*]!

گەرچی کار بەدەستانی موسوڵمانەکانی دەورو بەریشمان ئەو موسوڵمانە ساغەنین کە لە زۆرو ستەم و چەوسانەوەی نەتەوایەتییان ئەمین بین، چونکە رەگەز پەرستی و عیلمانییەت و بەرژەوەندیی میللی خۆیان کوێری کردوون، گوێ بە هەق و ناهەق نادەن!

وەلێ ئەم قسە هەڵەق و مەلەقانەی کە ئێستا باوە، کە هەر کۆلکە مەلاو کۆلکە ئەفەندییەك هەڵ دەستێ دەم لە تەعدیل و تەجریحی حەدیس دەداو، بەبێ لە بارابوونی تەواو دەم لە هەڵسەنگاندنی حەدیسی صەحیحی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەکوتێ ئەمە سەرەتای دەم بردنە بۆ قودسییەتی قورئانی پیرۆزیش، ئەمە دەبێ بە بەرایی هێرشێکی گەورە بۆ هەڵتەکاندنی بەردی بنچینەی ئایینی ئیسلام، کە لە مێژەوە صەلیبییەت و سەهیونییەت رەنگرێژی بۆ دەکەن! گەرچی چرای خودا بە فووی دەستەی شەیتان ناکوژێتەوەو دەریا بە دەمی سەگ گلاو نابێ، بەڵام بەتەنگەوە نەبوونی خۆیشمان سەراسێی زۆرمان بۆ دەسازێنێ[*].

---

(*) اللهم هل بلغت. (وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٥/٣٠)

(*) ئەمە ئێستا وایە. پەنا بەخودا. (وەرگێڕ - ٢٠٠٨/٥/٣٠)

جا لە دوا ئەم توێژینەوەیە رێگە چارەی زۆر هەیە بۆ تەئویلی حەدیس، وەك ئەوە لە موتەشابیهات بێ، یا هەڵەو بەسەرچوونی فەرموو دەگێڕەوە (راوی)بێ، یا ئەو مەرجانەی کە فەرموودە زانە گەورەکان دایان ناوە تێیدا نییە، یا بە پێچەوانەی حەدیسێ لە خۆی ساخترە، گەلێ سازاندن (تەئویل)ی تری ئاوا جوانو ناسكو دوور لە بێرێزی کردن، بە قودسییەتی کتێبە عومدەکانی حەدیس هەیە.

ئەوەی کە جێی گومانو رەخنە نییە ئەم راستەقینەیەیە: کە بیروباوەڕو ئاقیدەو شێوەی عیبادەتو چۆنێتیی تاعەتو خودا پەرستی لە ئیسلامدا زۆ زۆر رەساو سازو شیرینو دامەزراوو رێكو پێكو ناسكو نازدارە، ئەوەیش لە سایەی ئەو هەموو حەدیسە ساخو پیرۆزانەوەیە کە بوون بەسەرچاوەی ئەو ئاقیدە ساخەو ئەو عیباداتە جوانو هەقانە، کەواتە فەرموودەی لەم بابەتە پێداویستیی بە پیادا چوونەوە نییە بگرە بۆ چۆنێتیی عیبادەتو تاعەتو شێوەی خودا ناسین باشترین سەرچاوەو سەر چەشمە کتێبە کۆنەکانی فیقهی ئیسلامییە، زاناکان (رەزای خودایان لێبێ) لەم لایەنەوە هیچیان بۆ دوا خۆیان نەهێشتۆتەوە. زاناکانی ئەم چەرخە دەتوانن بە تەوفیق لە نێوانی راجوانەکانی ئەواندا چارەسەری گەلێ لە کێشەکانی ئەمڕۆمان بکەن، وەلێ بە هیچ جۆر نابێ تەوفیق سازاندن لە نێوانی ئەو راجوێ جوێیانەدا بگاتە رادەی تێکەڵیو پێکەڵیو تەلفیق!. (وەرگێڕ)

٥٧٣٣- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللَّهُ تَعَالَى عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤْمِنُ إِذَا اشْتَهَى الْوَلَدَ فِي الْجَنَّةِ كَانَ حَمْلُهُ وَوَضْعُهُ فِي سَاعَةٍ وَاحِدَةٍ كَمَا يَشْتَهِي.رواهما الترمذي[٣]:

ئەبو سەعید خودری (رەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ موسوڵمان لە بەهەشتا ئارەزووی منداڵ دەکا، مانەوەی منداڵەکە لەناو سکی دایکیداو لە دایکبوونیو گەورەبوونیو تەمەنی هەمووی بەیەك کاژێر تەواو دەبێ، خۆی چۆن حەزدەکا منداڵەکە ئاوادەبێ (ت-س/ح).

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

## ١٤٢) چۆنێتی‌و شێوەی دانیشتوانی بەهەشت : (أوصاف أهل الجنة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ، وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُّتَقَابِلِينَ، لاَ يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ - سورة الحجر - ١٥/٤٥}.

دیارو ئاشکرایە کە لە خودا ترسەکان لە دوا رۆژدا وان لەناو نازو نیعمەتی نەبڕاوەی بەهەشتا، کە پڕە لە باخچەو باخ‌و بۆلاخ‌و رەزی جۆراو جۆر، باخەکانی بەهەشت ئەوەندە ناسك‌و نازدارن‌و جوانن دەق دەڵێی نەفسی بەهەشت خۆین، خۆ ئاوو کانیاوو سەرچاوەو رووبار لە بەهەشتا بەبێ شومارە، لەبەر ئەوە لە کەسێ وایە کە بەهەشتییەکان وەك مەلی ئاوی لەناو ئاودا دەژین! بە نازەوە، بەرێزەوە پێیان دەفەرموون: فەرموون: بە خێرو خۆشی بەبێوەی بە ئاشتی بڕۆنە ناو ئەم بەهەشتەوە، بۆ خۆتان بە ئاسوودەیی، بەبێ دەردو بەلا هەتا هەتایە لە ناویدا بژین، دڵیان لە ئاستی یەك ساف دەکەین، کینەو دەغەزی ناو دڵیان وەك موو لە ماست بکێشیت ئاوا رادەکیشین‌و دڵیان بەرابەریەکتری پڕ دەکەین لە دۆستی‌و خۆشەویستی‌و برایەتی، وەکوو برای دایکی‌و باوکی لەناو خۆیاندا تەبا لەسەر کورسی‌و تەخت‌و قەنەفەی جوانی کەشخە بەرابەر یەکتری دادەنیشن‌و کۆڕی قسەو گوفتوگۆی لێ گەرم دەکەن‌و بەزم‌و رەزم‌و ئاهەنگی خۆش دەگێڕن، قەت نەماندوو دەبن، نە نەخۆش دەکەون، نە رەنج دەکێشن، نەتووشی ناخۆشی‌و مەینەت دەبن، لەو بەهەشتانەدا لەسەر ئەم حاڵە خۆشە جاویدانن‌و هەرگیز لەوێ بارو کۆچ ناکەن‌و ناچن بۆ وڵاتێ تر.

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ، {هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ، {لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ، سَلَامٌ قَوْلًا مِن رَّبٍّ رَّحِيمٍ - سورة یس - ٣٦/٥٥-٥٨}.

واتە: بەڕاستی بەهەشتییەکان، کە خۆیان لە سایەی خوداوە بوون بە خاوەن‌و خێوی بەشی خۆیان لە بەهەشتاو، جێگەو شوێنی خۆیانیان لە

بەهەشتا هەتا هەتایە لەسەر تاپۆ کراوە بەراستی ئەم خودا پیداوانە وان لەناو خۆشی و کەیف و سەفاداو، کارو پیشەیان هەر رابواردنی خۆش و عەیش و نۆشە خۆیان و هاوسەرەکانیان وان لە بن سێبەری خەست و خۆڵی خۆشدا، لەسەر کورسی و قەنەفەی کەشخە پاڵی لیٚ دەدەنەوە، میوەی خۆشی زۆر لەبەر دەستیان دایە، هەرچی تریش داوابکەن لە خزمەتیان دایە، ئاواتی هەرە گەورەشیان بەوە دێتەدی کە خودا بەخودی خۆی سلاویان لیٚ دەکا یا بەهۆی فریشتەکانیەوە سلاویان پیٚ دەگەیەنیٚ و فریشتەکان پێیان دەفەرموون: خودای میهرەبان دەفەرمویٚ: سلاو بۆ ئێوەبیٚ، دروودتتان لێبیٚ.

٥٧٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: أَهْلُ الْجَنَّةِ جُرْدٌ مُرْدٌ كُحْلٌ لاَ يَفْنَى شَبَابُهُمْ وَلاَ تَبْلَى ثِيَابُهُمْ(١):

ئەبو هورەیرە (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربیٚ) دەفەرمویٚ: بەهەشتییەکان بیٚ موو بیٚ ریش و سمێڵن، لەش ساف و لووسن، چاورەش و چاوبەکلن، هەمیشە هەرلاوو گەنجن، هەرگیز پیرو ئیختیار نابن، جل و بەرگیشیان کۆن نابیٚ. (ت-س/ح).

٥٧٣٥- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِي اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ جُرْدًا مُرْدًا مُكَحَّلِينَ أَبْنَاءَ ثَلاَثِينَ أَوْ ثَلاَثٍ وَثَلاَثِينَ سَنَةً(٢):

موعازی کوڕی جەبەل (خودای لیٚ رازی بیٚ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربیٚ) فەرمووی: بەهەشتی کە دەچنە بەهەشت لەناو بەهەشتا لەش بیٚ موون، بیٚ ریش و سمێڵن، چاوڕەش و چاو بەکلن، تەمەنیان سیی ساڵە. یا فەرمووی: تەمەنیان سیی و سیٚ ساڵە. (ت-س/ح).

---

(١) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(٢) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

٥٧٣٦- عَنْ اَبِی سَعِید (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنْ صَغِيرٍ أَوْ كَبِيرٍ يُرَدُّونَ بَنِی ثَلاَثِينَ فِی الْجَنَّةِ لاَ يَزِيدُونَ عَلَيْهَا أَبَدًا وَكَذَلِكَ أَهْلُ النَّارِ. روى هذه الثلاثة الترمذي[٣]:

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرمویێ: ئەوەی بە منداڵی بمرێ، یا بە گەورەیی بمرێ، کاتێ دەچێتە ناو بەهەشت لە تەمەنی سیی ساڵی دایە، ئیتر هەرگیز لەوە زیاتر نابێ، تەمەنی دۆزەخیش هەروایە. (ت- سند غریب).

٥٧٣٧- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ عَلَى أَشَدِّ كَوْكَبٍ دُرِّيٍّ فِی السَّمَاءِ إِضَاءَةً، لاَ يَبُولُونَ وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ وَلاَ يَتْفِلُونَ وَلاَ يَمْتَخِطُونَ، أَمْشَاطُهُمُ الذَّهَبُ، وَرَشْحُهُمُ الْمِسْكُ، وَمَجَامِرُهُمُ الأَلُوَّةُ، وَأَزْوَاجُهُمُ الْحُورُ الْعِينُ، أَخْلاَقُهُمْ عَلَى خَلْقِ رَجُلٍ وَاحِدٍ عَلَى صُورَةِ أَبِيهِمْ آدَمَ، سِتُّونَ ذِرَاعًا فِی السَّمَاءِ. زاد في رواية: وَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمْ زَوْجَتَان يُرَى مُخُّ سَاقِهِمَا مِنْ وَرَاءِ اللَّحْمِ مِنَ الْحُسْنِ لاَ اخْتِلاَفَ بَيْنَهُمْ وَلاَ تَبَاغُضَ قُلُوبُهُمْ قَلْبٌ وَاحِدٌ يُسَبِّحُونَ اللّهَ بُكْرَةً وَعَشِيًّا. رواه الشيخان والترمذي[٤]:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: یەکەم دەستەیێ کە دەچنە ناو بەهەشت لەسەر شێوەی مانگی شەوی چواردەن ئاوا جوانو ناسکو نازدارن، لەناو ریزی بەهەشتییەکانی تردا دیارین، دەستەی دوای ئەوان وەك گەشترین ئەستێرەی ئاسمان وان، خەڵکی بەهەشت نە گمێز دەکەن، نە سەراو دەکەن، نەچڵم دەسرن، نە تفو بەڵغەم رۆدەکەن (نەقرخنو لرخنن) شانەکانیان زێرە، ئارەقیان میسکە، بخووریان عوودە، ژنەکانیان پەرییە چاو جوانەکانی

---

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٤] مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٧٦، ٧٠٧٧، ٧٠٧٨. تجريد/٣/ ل- ٤٤٢ رقم/١٣١٢ = ٣٢٤٥، ٣٢٤٦، ٣٢٥٤، ٣٣٢٧.

بەهەشتە، رەفتارو رەوشتیان وەك یەك جوانە، لەسەر شێوەو قەڵافەتی ئادەمی باوكیانن، باڵایان شەست باڵ درێژە. لە گێڕانەوەیەكا ئەمەی پترە: هەر پیاوەیان دووژنی هەیە لە بەهەشتا پیاوی رەبەن نییە، هەموو ژندارن، ژنەكانیان، لەبەر جوانی‌و ناسكی‌و نازداری مۆخی ناو لوولاقیان لە ژێر چەرم‌و گۆشتەوە دیارە، وەك لەناو مینادابێ ئاوا، جیاوازیی‌و دژایەتی‌و ناخۆشی‌و ناكۆكیان لە نێواندا نییەو رق‌و دەغەزو كینە لە یەكتری ناكێشن، لەناو خۆیانا زۆر تەبان‌و رێكن‌و هەموویان یەك دڵن‌و دڵیان لە ئاستی یەك پاكە، بەیانی‌و ئێوارە یادو تەسبیحاتی خودا دەكەن. (ش/ت) ← (ب ٦ ز – ٣ ل – ٥ ف –٢/٣٦٩١).

٥٧٣٨– عَنْ جَابِرٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ وَلاَ يَتْفُلُونَ وَلاَ يَبُولُونَ وَلاَ يَتَغَوَّطُونَ وَلاَ يَمْتَخِطُونَ. قَالُوا: فَمَا بَالُ الطَّعَامِ قَالَ: جُشَاءٌ وَرَشْحٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالتَّحْمِيدَ كَمَا يُلْهَمُونَ النَّفَسَ. رواه مسلم[٥]:

جابیر (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: لە بەهەشتا بەهەشتییەكان دەخۆن‌و دەخۆنەوە، بەلام تف‌و گمێزو پێشاوو پیسایی ناكەن، چڵم‌و بەڵغەمیان نییە تا بیسڕن، دەم‌و لووت‌و سنگیان پاكەو چڵم‌و تف‌و بەڵغەم‌و كڵم‌و شتی وایان نییە.

یاران فەرموویان: قوربان! ئەی ئەو خۆراكەی كە دەیخۆن چی لێدێ؟ فەرمووی: دەبێ بە قڕقێنەو ئارەق لە چەشنی گولاوی میسك، وەك چۆن ئێستا ئێوە لە سایەی خوداوە رێی هەناسەدانتان بۆ ئاسایی‌و سانایی كراوە ئاوا لە خوداوە بە ئاسانی‌و سانایی هەمیشە خوو دەگرن بە تەسبیحات‌و یادو ستایشكردنی خوداوە (م– رەحمەتی خودای لێبێ).

٥٧٣٩– عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُعْطَى الْمُؤْمِنُ فِي الْجَنَّةِ قُوَّةَ كَذَا وَكَذَا مِنَ الْجِمَاعِ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللّهِ أَوَيُطِيقُ ذَلِكَ؟ قَالَ: يُعْطَى قُوَّةَ مِائَةٍ:

---

[٥] مسلم. جنة ونهيمها: ٧٠٨١. أبو داود. سنة: ٤٧٤١. تحفة الأشراف: ٢٣٠٠

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە بەهەشتا وەها وەها موسوڵمان تەوانای سەرجێی هەیە! گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! جا توانای ئەوەندە زۆری هەیە وەك تۆ دەفەرمووی؟ فەرمووی: هێزی سەد مێردی ئێستای ئێوەی پێ دەدرێ، کەواتە تەوانایی ئەوەی هەیە (ت-س/ص).

٥٧٤٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ أَنَّ مَا يُقِلُّ ظُفُرٌ مِمَّا فِي الْجَنَّةِ بَدَا لَتَزَخْرَفَتْ لَهُ مَا بَيْنَ خَوَافِقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَلَوْ أَنَّ رَجُلاً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَ فَبَدَا أَسَاوِرُهُ لَطَمَسَ ضَوْءَ الشَّمْسِ كَمَا تَطْمِسُ الشَّمْسُ ضَوْءَ النُّجُومِ. رواهما الترمذي. نسأل الله رضاه والجنة آمين[٧]:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (رەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ: حەزرەت پێغەمبەری خۆشەویستو نازدارو گەورەو سەروەر (درووددو سڵاوو رەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو هەستو نەست بەقوربانی گەردی سەر ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بێ) دەفەرموێ: نینۆکێ چەندێ هەڵ دەگرێ ئەگەر ئەوەندە لەشتی ناو بەهەشت لە دنیادا دەربکەوێ کونو قوژبنی ئاسمانو زەوی دەرازێتەوەو شەوق دەداتەوەو پڕ دەبێ لە نوورو لە بۆنو بەرامەی خۆش، ئەگەر گریمان پیاوێکی بەهەشتی سەربکێشێتە ناو جیهانو خشڵەکانی دەربکەون شەوقی خۆر دادەپۆشێو لەبەر شەوقی ئەو خۆر شەوقی نامێنێ، هەروەك چۆن لەبەر شەوقی خۆر ئەستێرەو مانگ شەوقیان نامێنێ! (ت- سەند غەریب).

## ١٤٣) شێوەی شیرینی ژنی بەهەشت : (صفة نساء الجنة)

قَالَ اللَّهُ تَعَالَى: {فِيهِنَّ قَاصِرَاتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَانٌّ - سورة الرحمن}.

ئەم ئایەتە بە تەواوی لەسەر باسی (دارو درەختو میوەی بەهەشت)دا رابورد.

---

[٧] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاء، فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا، عُرُبًا أَتْرَابًا، لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ - سورة الواقعة - ٥٦/ ٣٥ - ٣٨}.

**واتە: پەری بەهەشت بۆ‌و خودا بە دەستی رەنگینی قوردرەتی خۆی بۆ دۆست‌و خۆشەویست‌و ئازیزانی خۆی دروستیان بکا دەبێ چۆن نازەنینانێ بن، لە پێش هەموو شتێکا ئەو بەهرە خۆشەی کە لە جیهاندا ژن شانازی پێوە دەکاو پێوەی دەنازێ‌و، پیاویش زۆر حەزی لێ دەکا لەو پەرییانەدا هەیە، کە برێتیە لە کچێنی‌و کچێتی، ئەو پەرییانە هەمیشە کچن، گشت جارێ کە مێردەکانیان دەچنە لایان، دەبنەوە بەکچ، هەموو مێرد پەروەرن‌و نازی مێردەکانیان دەگرن، هەموو هاوتەمەنن، لە سێرەی مێردەکانیانان، لە عەمرو نوێییەکان، دەبن بە ژن‌و هاوسەری ئەسحابول یەمین.**

٥٧٤١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَغَدْوَةٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ رَوْحَةٌ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا وَلَقَابُ قَوْسِ أَحَدِكُمْ أَوْ مَوْضِعُ قَدَمِهِ مِنَ الْجَنَّةِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا وَلَوْ أَنَّ امْرَأَةً مِنْ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ اطَّلَعَتْ إِلَى الأَرْضِ لأَضَاءَتْ مَا بَيْنَهُمَا وَلَمَلأَتْ مَا بَيْنَهُمَا رِيحاً وَلَنَصِيفُهَا عَلَى رَأْسِهَا خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا. رواه البخاري والترمذي[1]:

**ئەنەس** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بەقەد جێگەی کەوانێ، یا بەقەد شوێن پێی یەکێکتان لە بەهەشت چاکترە لە گشت جیهان‌و ئەوەی لە جیهاندا هەیە. گریمان ژنێ لە ئافرەتانی دانیشتوانی بەهەشت سەر بکێشێ بۆ سەرزەوی لەم پەڕی زەوییەوە هەتا ئەوپەڕی زەوی پڕدەکات لە بۆنی خۆش، ئەو سەر پۆشەی کەوا بەسەریەوە لە سەراسەری جیهان بەخۆی‌و نازو نیعمەتیەوە چاکترە. (ب/ت).**

٥٧٤٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْمَرْأَةَ مِنْ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ لَيُرَى بَيَاضُ سَاقِهَا مِنْ وَرَاءِ سَبْعِينَ حُلَّةً حَتَّى يُرَى مُخُّهَا وَذَلِكَ

---

[1] تجريد/٣ ل- ٢٨٣ رقم/١١٥٢ = ٢٧٩٦ فتح.

بِأَنَّ اللَّهَ يَقُولُ (كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ) فَأَمَّا الْيَاقُوتُ فَإِنَّهُ حَجَرٌ لَوْ أَدْخَلْتَ فِيهِ سِلْكًا ثُمَّ اسْتَصْفَيْتَهُ لأُرِيتَهُ مِنْ وَرَائِهِ[٢]:

عەبدوڵڵا (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سپێتیی پووزی ژنی بەهەشتی لەسەر حەفتا دەست جلەوە دیارە، تەنانەت ئەوەندە جوان و ناسك و نازدارو ساف و لووسە مۆخی ناو لوولاقیشی دیارە، ئەمەیە کە خودا لەوەسپیاندا دەفەرموێ: كانهن الياقوت والمرجان: ئەو ژنانە ئەوەندە ناسك و نازدارو ساف و لووس و بێگەردو سوورو سپین دەڵێی یاقووت و مەرجانن. چونکە یاقووت بەردێکی بەنرخە لەبەر روونی و بێگەردی ئەگەر هەودایەکی پێوە بکەی لە دیوی دەرەوە دیارە (تیرمیزی – رەزای خودای لێبێ).

٥٧٤٣- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ فِي الْجَنَّةِ لَمُجْتَمَعًا لِلْحُورِ الْعِينِ يُرَفِّعْنَ بِأَصْوَاتٍ لَمْ يَسْمَعِ الْخَلاَئِقُ مِثْلَهَا يَقُلْنَ نَحْنُ الْخَالِدَاتُ فَلاَ نَبِيدُ وَنَحْنُ النَّاعِمَاتُ فَلاَ نَبْأَسُ وَنَحْنُ الرَّاضِيَاتُ فَلاَ نَسْخَطُ طُوبَى لِمَنْ كَانَ لَنَا وَكُنَّا لَهُ. رواهما الترمذي. نسأل الله رضاه والجنة آمين[٣]:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە بەهەشتا پەرییە چاو جوانەکان کۆڕ دەبەستن و لە باخچەیەکا کۆ دەبنەوە، بە ئاوازێکی زۆر خۆش نقامێك دەڵێن و دەیکەن بە چریکەیەکی وا خۆش کەس نەیبیستبێ: دەچڕن: ئێمە نەمرین، هەتا هەتایە دەژین، هەرگیز نامرین، لەناو ناچین، ئێمە نازدارین، قەد بێ ناز ناکەوین، ئێمە لە خودای خۆمان رازین، بە بەشی خۆمان دەنازین، لە مێردەکانمان خۆش نوودین، لە دەستە خۆشکەکانمان بێ گلەیین، قەت لێیان بێزار نابین، خۆشی لەو کەسە کە مێردی ئێمەیەو ئێمە هاوسەری ئەوین! (ت- سند غەیب).

---

[٢] بسند مسكوت عنه.

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ١٤٤) یەکەم کەس کە دەچنە بەهەشتەوە موحەممەدو ئۆمەتەکەیەتی
## أول من یدخل الجنة النبي محمد ﷺ وأمته

٥٧٤٤- لە سەەتای باسی شەفاعەتەوە رابورد، فەرموودەی: (أنا أول الناس يشفع في الجنة وأنا أكثر الأببياء تبعاً)[1].

٥٧٤٥- ← (ب – ٤ ز – ٨١ ل – ٢٤٩ ف – ٣٠٧٦/١٠) حديثي: (أنا أكثر الانبياء تبعا بوم القيامة وأنا أول من يقرع باب الجنة)[2].

٥٧٤٦- وَعَنْهُ (أَي عَنْ أَنَسُ – المترجم) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَا أَوَّلُ شَفِيعٍ فِي الْجَنَّةِ لَمْ يُصَدَّقْ نَبِيٌّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ مَا صُدِّقْتُ وَإِنَّ مِنَ الأَنْبِيَاءِ نَبِيًّا مَا يُصَدِّقُهُ مِنْ أُمَّتِهِ إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ[3]:

دیسان ئیمامی ئەنەس (ڕەزای خودای لێبێ) دەفەرموێ: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویستی خوداو خۆشەویستی گەلی ئیسلام (درودو صەلاتو سەلامو ڕەحمەتو بەرەکاتی خودای گەورەی لەسەربێ و سەرو ماڵو منداڵو دایكو باوكو کەسوکارو هەستو نەست گشتی بە یەك جار بە قوربانی گەردی ژێر پێی دینیکەدانی گۆڕی پیرۆزی بێ) ئەنەس فەرمووی: ئەو حەزرەتە نازدارە فەرمووی: لە بەهەشتا من یەکەم تکاکارم، کەس لە پێغەمبەرەکانی تر ئەوەندەی من خەڵك ئیمانی لەسەر شێوەیەکی هەق پێ نەهێناوە، بزانن کە پێغەمبەری وابووە لەپێش منەوە یەك پیاو لە ئومەتی دەعوەتی باوەڕی پێ کردووەو ئومەتی ئیجابەی برێتی بووە لەیەك کەسو بەس. (م- ڕەزای خودای لێبێ).

٥٧٤٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: آتِي بَابَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَسْتَفْتِحُ فَيَقُولُ الْخَازِنُ مَنْ أَنْتَ فَأَقُولُ مُحَمَّدٌ. فَيَقُولُ بِكَ أُمِرْتُ لاَ أَفْتَحُ لأَحَدٍ قَبْلَكَ. روى هذه الأربعة مسلم[4]:

---

[1] تقدم فی المجلد العاش. تسلسل/١٣٠ مبحث (شفاعة نبینا محمد (ص) رقم الحدیث/٥٦٩٢/٣.

[2] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/٨١ رقم/٣٠٧٦/١٠.

[3] مسلم. إیمان: ٤٨٤.

[4] مسلم. إیمان: ٤٨٥

دیسانەوە ئەنەس (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: رۆژی دوارۆژ دەڕۆمە بەردەگاری بەهەشتو لە درەگا دەدەم، دەرکەوانی بەهەشت دەفەرموێ: تۆ کێیت؟ دەڵێم: منم موحەممەدم، دەفەرموێ: خۆشم فەرمانم پێ کراوە کە لە پێشا بۆ تۆی بکەمەوە، وە لە پێش هاتنی تۆدا بۆ کەسی تری نەکەمەوە، کەواتە باشە بفەرموو وا بۆت دەکەمەوە. (م- رەزای خودای لێبێ).

٥٧٤٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيَدْخُلَنَّ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِي سَبْعُونَ أَلْفًا أَوْ سَبْعُمِائَةِ أَلْفٍ مُتَمَاسِكِينَ، آخِذٌ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ، لا يَدخُلُ أَوَّلُهُمْ حَتَّى يَدْخُلَ آخِرُهُمُ الْجَنَّةَ، وَوُجُوهُهُمْ عَلَى ضَوْءِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ. رواه الشيخان[٥]:

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە ئۆمەتی من حەفتا هەزار کەس. یا فەرمووی: حەوت سەد هەزار کەس بە یەك ریز بە یەکجار دەچنە ناو بەهەشت، بەریز دەستی یەکتریان گرتووە، وەك لە ریزی نوێژدا راوەستابن ئاوا، لەسەر ئەم حاڵە هەموویان پێکەوە لەیەك کاتا دەچنە ژوورەوە، دیارە دەرگای بەهەشت زۆرپانە، دەموو چاویان ئەوەندە جوانو بە شەوقە وەك مانگی شەوی چواردە دەدرەوشێتەوە (ش) شەیخان = ئیمامی بوخاریو ئیمامی موسلیم، کە دادەنرێن بەریشسپیی و مامۆستای هەموو فەرموودە زانەکانی تر - رەزای خودا لە هەموویان بێ).

[٥] بخاری. رقاق: ٦٥٥٤. مسلم. إیمان: ٥٢٥.

## ١٤٥) كەسانێ بەبێ لێپرسینەوە دەچنە ناو بەهەشت
## الذین یدخلون الجنة بغیر حساب

٥٧٤٩- ← (ب – ٤ ز – ٨٠ ل – ٢٤٠ ف – ١)[١].

لێرە ئەم چەند پتری یە بەسوودانەی هەیە: حەفتا هەزار كەس لە پێشیانەوەیە، بەبێ لێپرسینەوەو سزادان دەچنە بەهەشت لێرەدا دەفەرموێ: عوككاشەی كوڕی میحصەن عەرزی حەزرەتی كرد: قوربان نزام بۆ بكە كە خودا بمكا بە یەكێ لەوانە؟ فەرمووی: اللهم أجعله منهم: خودایە! بیكەی بە كەسێ لەم خودا پێداوانە.

حەدیس – با مەئالو ئەنجامی ریوایەتە جیا جیاكانیشی یەك بێ بەڵام – لە زوربەی گێڕانەوەكانیدا زیادەی بەسوود زۆرە. كەواتە: بۆیە ئێمە تابۆمان دەكرێ هەموو ریوایەتێ تەرجەمە بكەین باشترە. (وەرگێڕ)

## ١٤٦) زوربەی خەڵكی بەهەشت لە ئوممەتی موحەممەدن
## الأمة المحمدیة أكثر أهل الجنة

٥٧٥٠- ← ( ب/٧ ز/٥ ل/٣٠ ف/١) + (ب/٦ ز/١٨ ل/٢٦٦)[١].

٥٧٥١- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَهْلُ الْجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفّ ثَمَانُونَ مِنْهَا مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ وَأَرْبَعُونَ مِنْ سَائِرِ الأُمَمِ. رواه الترمذي بسند حسن. نسأل الله التوفيق آمین[٢]:

ئیبنو بورەیدە فەرمووی: باوكم فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خەڵكی بەهەشت سەدوبیست ریزن. هەشتا ریزیان لەم ئوممەتی ئیسلامەن، چل ریزیشیان لە نەتەوەككانی ترن (ت– س/ح).

---

[١] تقدم فی مجلد رابع. تسلسل/ ٨٠ رقم/١/٣٠٦٣.

[١] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٥ رقم/١ + مجلد سادس. تسلسل/١٨ رقم/٧/٣٩٧٥.

[٢] رواه الترمذي بسند حسن.

## ١٤٧) یەكەم خۆراكو یەكەم خواردنەوەی خەڵكی بەهەشت چییە
## ما أول طعام أهل الجنة وما شرابهم عليه

٥٧٥٢- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) مَوْلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُنْتُ قَائِمًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَاءَ حَبْرٌ مِنْ أَحْبَارِ الْيَهُودِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكَ يَا مُحَمَّدُ. فَدَفَعْتُهُ دَفْعَةً كَادَ يُصْرَعُ مِنْهَا فَقَالَ: لِمَ تَدْفَعُنِى فَقُلْتُ أَلاَ تَقُولُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَالَ الْيَهُودِىُّ: إِنَّمَا نَدْعُوهُ بِاسْمِهِ الَّذِى سَمَّاهُ بِهِ أَهْلُهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اسْمِى مُحَمَّدٌ الَّذِى سَمَّانِى بِهِ أَهْلِى. فَقَالَ الْيَهُودِىُّ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيَنْفَعُكَ شَىْءٌ إِنْ حَدَّثْتُكَ. قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَىَّ فَنَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِعُودٍ مَعَهُ. فَقَالَ: سَلْ. فَقَالَ الْيَهُودِىُّ: أَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ وَالسَّمَوَاتُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هُمْ فِى الظُّلْمَةِ دُونَ الْجِسْرِ، قَالَ: فَمَنْ أَوَّلُ النَّاسِ إِجَازَةً؟ قَالَ: فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ؟ قَالَ الْيَهُودِىُّ: فَمَا تُحْفَتُهُمْ حِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ؟ قَالَ: زِيَادَةُ كَبِدِ النُّونِ، قَالَ: فَمَا غِذَاؤُهُمْ عَلَى إِثْرِهَا؟ قَالَ: يُنْحَرُ لَهُمْ ثَوْرُ الْجَنَّةِ الَّذِى كَانَ يَأْكُلُ مِنْ أَطْرَافِهَا، قَالَ: فَمَا شَرَابُهُمْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: مِنْ عَيْنٍ فِيهَا تُسَمَّى سَلْسَبِيلاً، قَالَ: صَدَقْتَ، وَجِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنْ شَىْءٍ لاَ يَعْلَمُهُ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ إِلاَّ نَبِىٌّ أَوْ رَجُلٌ أَوْ رَجُلاَنِ، قَالَ: يَنْفَعُكَ إِنْ حَدَّثْتُكَ، قَالَ: أَسْمَعُ بِأُذُنَىَّ. قَالَ: جِئْتُ أَسْأَلُكَ عَنِ الْوَلَدِ قَالَ: مَاءُ الرَّجُلِ أَبْيَضُ وَمَاءُ الْمَرْأَةِ أَصْفَرُ فَإِذَا اجْتَمَعَا فَعَلاَ مَنِىُّ الرَّجُلِ مَنِىَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَرَا بِإِذْنِ اللَّهِ وَإِذَا عَلاَ مَنِىُّ الْمَرْأَةِ مَنِىَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللَّهِ. قَالَ الْيَهُودِىُّ: لَقَدْ صَدَقْتَ وَإِنَّكَ لَنَبِىٌّ ثُمَّ انْصَرَفَ فَذَهَبَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَقَدْ سَأَلَنِى هَذَا عَنِ الَّذِى سَأَلَنِى عَنْهُ وَمَا لِى عِلْمٌ بِشَىْءٍ مِنْهُ حَتَّى أَتَانِىَ اللَّهُ بِهِ. رواه مسلم في الغُسل في كتاب الطهارة. نسأل الله تمام الطهارة آمين[1]:

سەوبان (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: لە خزمەت حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەربێ) ڕاوەستا بووم، مالوومێ هات گوتی: سلاو لەتۆ ئەی موحەممەد! السلام عليك يا محمد. منیش پاڵێکی وا توندم پیوەی نا خەریک بوو پێی

---

[1] مسلم. طهارة/٧١٤

بکەوێ، گوتی: بۆچی پاڵم پێوە دەنێی؟! گوتم: ئەی بۆچی ناڵێیت ئەی پێغەمبەری خودا! گوتی: بەوناوەوە بانگی دەکەین کە کەسوکاری لێی ناوە! حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەڵێ من ناوم موحەممەدەو کەسوکارم بەو ناوە منیان ناوناوە، مالوومەکە گوتی: هاتووم پرسیارت لێ بکەم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر قسەی هەقت بۆ بکەم موسوڵمان دەبێت؟ گوتی: بە گوێی خۆم دەبیستم حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دارێکی بە دەستەوە بوو، دەیژەند لە زەوییەکەوە فەرمووی: ئادەی پرسیارت چییە بپرسە گوتی: ئەو رۆژەی کە ئەم زەوی‌و ئاسمانە دەگۆڕێن بە زەوی‌و ئاسمانێکی تر ئەم خەڵکە لە کوێ دەبن؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لەسەر پردی سیرات دەبن گوتی: ئەی کێ یەکەم کەس دەبێ کە لێی دەپەڕێتەوە؟ فەرمووی: هەژارانی کۆچکاران ئەو هەژارانەی کە لە مەککەوە لەتاو کافرەکان کۆچیان کرد بۆ مەدینە گوتی: کاتێ دەچنە بەهەشت یەکەم خواردنیان چییە؟ فەرمووی: پارچە زیادە گۆشتەکەی جەرگی نەهەنگە گوتی: ئەی گەرماو گەرم لە دوا ئەو چی تر دەخۆن؟ فەرمووی: جوانەگاکەی بەهەشتیان بۆ سەر دەبڕن، کە لە دەورو بەری بەهەشتا بۆ خۆی دەلەوەڕا!.

گوتی: ئەی چی بەسەردا دەخۆنەوە؟ فەرمووی: لەئاوی ئەو سەرچەشمەیەی بەهەشت کە ناوی سەلسەبیلە. گوتی: راست دەکەی، هاتویشم شتێکی ترت لێ دەپرسم کە کەس نایزانێ جگە لە پێغەمبەران، مەگەر پیاوێ یا دوانی تریش بیزانن، فەرمووی: ئەگەر من پێت بڵێم‌و بیزانم تۆ ئیسلام دەبی‌و – لەئیسلامبوونت قازانج بە خۆت دەگەیەنێ؟ گوتی: جارێ با گوێم لە قسەکانت بێ. مالوومە کە گوتی: هاتووم لە بارەی منداڵەوە لێت دەپرسم، فەرمووی: ئاوی پیاو سپییە، ئاوی ژن زەردە، کە لەگەڵ یەکا دروست بوون‌و ئاوی پیاو سەر ئاوی ژن کەوت بە فەرمانی خودا نێرینەیان دەبێ، بەڵام ئەگەر ئاوی ژن سەر ئاوی پیاو کەوت ئیتر بە فەرمانی خودا مێیینەیان دەبێ.

مالوومەکە گوتی: راستت فەرموو: بەراستی تۆ هەق پێغەمبەریت، ئەوجا گەڕایەوەو رۆیشت. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ ئەم پرسیارانەی لێ دەکردم تا ئەو چرکەیە ئاگام لە وەلامی هیچیان نەبوو، وەلێ خودا بەسرووش یەك بەیەك وەلامەکانی بۆم نارد. (م- رەحمەتی خودای لێبێ) ← (ب/٦ ز/٣ ل/١١ ف/٣٦٩٦/٧) + (ب/١ ز/٣٠ ل/١٤٦ ف/٢٦٣/٦).

## ١٤٨) دانیشتوانی بەهەشت لە بەهەشتا نەمرو جاویدانن‌و هەتا هەتایە لە بەهەشتا دەبن: (أهل الجنة مخلدون فيها ابدا)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَأَمَّا الَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ إِلاَّ مَا شَاء رَبُّكَ عَطَاء غَيْرَ مَجْذُوذٍ - سورة هود - ١٠٨/١١}.

واتە: ئەو کەسانەیش کە خودا پێداون‌و بەختەوەرن ئەوە وان لەناو بەهەشتا، هەتا هەتایە بە ئێجگاری بەبێ پسان ئەم خەلاتی خودایە بۆ ئەوان بەردەوام دەبێ‌و بڕانەوەی نابێ، مەگەر ئەو ماوە نەبێ کە پەروەردگاری تۆ بەدانایی خۆی، بۆ زیادە خۆش نوودی ئەوان ویستی لەسەر ئەوەبێ کە بیانیات بۆ جێگەیێ لە بەهەشت خۆشتریش، گەرچی ئەوان ئەگەر بە خۆیان بێ وەك قورئان دەفەرموێ: {خَالِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا} وەلێ خودا مەسلەحەت‌و قازانجی بەندە باشتر دەزانێ تا خۆی لەبەر ئەوە جارو بار کەمە کەمە بۆجێ گۆڕکێ‌و ئاوو هەوا گۆڕین دەیانبات بۆ شوێنی خۆشترا (ئەم تەفسیرەم لە شوێنی تر نەدیوە، ئەمە بۆ چوون‌و دیدی خۆمە - وەرگێڕ. ←(ب - ٧ ز - ١٠ ف - ١٦).

٥٧٥٣- ← (ب - ٧ ز - ٢ ل - ١٩ ف - ٢)[1].

لێرە ئەم زیادە سوودەی هەیە: جاڕچی جاڕەدەدا: ئەی خەلکی بەهەشت! گوێ بگرن، ئەوانیش گوێ قوڵاخ دەکەن‌و لە دڵیشەوە دەترسن

[1] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٢ رقم/٢٩٨٤/٢.

ئەوجا بانگەواز دەکرێ: ئەی دانیشتوانی دۆزەخ! گوێ بگرن ئەوانیش هەموو گوێ قۆڵاخ دەکەن، لە دڵیشەوە دڵیان خۆش دەبێو دەڵێن دەی بەڵکوو بەر تکاکاری بکەوینو لە دۆزەخ رزگارمان بێ.

٥٧٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ يَنْعَمُ لاَ يَبْأَسُ لاَ تَبْلَى ثِيَابُهُ وَلاَ يَفْنَى شَبَابُهُ[٢]:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ رازی بێ) دەفەرموێ: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوی بچێتە بەهەشت دەکەوێ بەسەر خێرو خۆشیداو دەکەوێتە ناو نازو نیعمەتەوە، ئیتر هەتا هەتایە رەنجو ناخۆشیو نارەحەتی نابینێ، جلو بەرگی نەدە درێو نەکۆن دەبێ، چونکە هەمیشە جلی نوێ لەبەر دەکەن، هەمیشەیش گەنجو جەهێڵو لاو دەبێ. قەت قەت پیر نابێ.

٥٧٥٥- ← (ب – ٦ ز – ٨ ل – ١٦٩ ف – ٣)[٣].

## ١٤٩) پەردە لادەدرێو بەهەشتییەکان پەروەردگاری گەورەو هێژای خۆیان بەچاوی سەر دەبینن : (كشف الحجاب عن أهل الجنة فيرون ربهم جل شأنه)

قَالَ اللّٰهُ تَعَالَى: {وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌإِلَى رَبِّهَا نَاظِرَةٌ} سورة القيامة-٧٥/٢٢-٢٣} ← (ب – ٧ ز – ٥٨ ل – ٢٣٠ ف – ٢).

٥٧٥٦- ← (ب – ١ ز – ٤٤ ل – ١٩٠ ف – ٢)[١].

٥٧٥٧- ← (ب – ٧ ز – ٣٨ ل – ١٧٤ ف – ٢)[٢].

٥٧٥٨- ← (ب – ٦ ز – ١١ ل – ٢٣٥ ف – ٣٩١٦/١)[٣].

---

[٢] مسلم. جنة ونعيمها: ٨٥.

[٣] تقدم فى مجلد سادس. تسلسل/٨ رقم٣/٣٨٦٨.

[١] تقدم فى مجلد أول. تسلسل/٤٤ رقم/٢/٣٣٨.

[٢] تقدم فى مجلد سابع. تسلسل/٣٨ رقم/٢/٤١٤٤.

## ١٥٠) خودا میهرەبانیو نەوازشت لەگەڵ خەڵکی بەهەشتا دەنوێنیو کاڵای ڕەزامەندی خۆییان بە باڵا دەبڕێ

## ملاطفة الله لأهل الجنة وإحلال الرضوان عليهم

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ – سورة التوبة – ٧٢/٩}.

خودای میهرەبان بە بەخشندەیی خۆی بەڵێنو وادەی داوە بە موسوڵمانە ساغەکان، چ پیاو بن چ ژن، کە چەن بەهەشتێکیان پێ خەڵات دەفەرموێ، کە چەن چەماوێ بەناویاندا زۆر بە جوانی دێتو دەڕواو، بە ناو باخو بۆلاخو شوێنەکانی تریشیدا دەخولێنەوە. هەروەها بەڵێنی ئەوەیشی پێ داون کە خانەی جوان جوانی پاکو تەمیزیشیان پێ دەدا، کە وان لە جەنناتی عەدندا، کە بەراستی ئەو بەهەشتانە جێگەی حەوانەوەو نیشتەجێ بوونن، جێگەی ئێجگاری ئێوەن، هەروەها وادەی ئەوەیشی پێ داون کە کاڵای ڕەزامەندیی خۆی بە باڵایان ببڕێ، کە ئەم خەڵاتی ڕەزامەندیی خودایە گەلێ لەو شتانە گەورەترو، بەهرەمەندترو بەنرخترە، بەراستی بەشی گەورەو هاتنەدی ئاواتی هەرە گەورە ئەمەیە.

٥٧٥٩– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لأَهْلِ الْجَنَّةِ يَا أَهْلَ الْجَنَّةِ.يَقُولُونَ لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ.والخير فِي يَدَيْكَ فَيَقُولُ هَلْ رَضِيتُمْ فَيَقُولُونَ وَمَا لَنَا لاَ نَرْضَى وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ.فَيَقُولُ أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ.قَالُوا يَا رَبِّ وَأَىُّ شَىْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ فَيَقُولُ أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلاَ أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا. رواه الشيخان والترمذي[١].

---

[٢] تقدم فى مجلد سادس. تسلسل/١١ رقم/١/٣٩١٦.

[١] تجريد البخارى = مختصر صحيح البخارى/٥ ل/٢٨٧ رقم/٢٠٣٣ = ٦٥٤٩، ٧٥١٨. مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٧٠. ترمذي. صفة الجنة: ٢٥٥٥. تحفة الأشراف: ٤١٦٢.

ئەبو سەعید (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورە بە خەڵکی بەهەشت دەفەرموێ: ئەی خەڵکی بەهەشت! دەڵێن: فەرموو بفەرموو ئەی پەروەردگارمان! سەرمان لە رێتایەو چاکەو خێر هەمووی بە دەس تۆیەو بەس. دەفەرموێ: ئایا رازیی بوون؟ دەڵێن: بۆ رازیی نابین، سەرە رای ئەم هەموو بەشە باشەی کە تۆ داوتە بە ئێمە هێشتا خوانەخواستە لووتە لابین! دەفەرموێ: لەوە چاکترتان دەدەمێ دەڵێن: خودایە! دەبێ چی لەمە جاتربێو چی تر لەم نازو نیعمەتەی بەهەشتە باشتربێ؟ دەفەرموێ: بەهرەی رەزامەندیی خۆمتان خەڵات دەکەم، ئیتر هەتا هەتایە لە ئێوە رازی دەبمو قەت لێتان نارەنجێم. (ش/ت).

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

ئیمامی بوخاری (رەزای خودای لێبێ) لە حەزرەتەوە دەگێرێتەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ان من الشعر حكمة: بازە شیعرێ حیکمەتە: واتە: قسەی نەستەقی راستی هەقە، سوودو قازانجی دینو دنیای تیادایە جا لەم روانگەوە دەمەوێ باسی بەهەشتتان بۆ بکەم بە شیعر، لە چارچێوەی ئایەتو فەرموودەکانی ئەم باسەدا کە لە پێشەوە رابووردن، وشە بە وشە ئەم شیعرانەم بەپێی تەفسیری بەیزاویو تەفسیری نامیو مواهب الرحمنو جەلالەینو، بەپێی شەرحی ئیمامی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیمو عەینیو تحفة الاحوذیو وغایەتولمەئموولو النهایە فی غریب الحدیث ولأثرو تەفسیری خاڵو تەفسیری شوببەرو دەلیلولفالحینو قەستەلانی راست کردۆتەوە، مەگەر شیعرێ کە پەیوەندی بە باسەکەوە نەبێو بە بۆنەی هاو چۆنییەوە گوترابێ، تەنانەت زۆر گەڕام بۆ حەدیسێ کە بیکەم بە بەڵگەی بوونی کارەکەرو کەنیزەك لە بەهەشتا، تا لەسایەی خوداوە لەعەیذیدا ئەم حەدیسەو چەن ئەسەرێکی ترم دەست کەوت حەدیسەکە دەفەرموێ:

**وقال أبو هريرة: أن في الجنة حوراء يقال لها العيناء اذا مشت مشى حولها سبعون ألف وصيفة عن يمينها وعن يسارها كذلك، وهي تقول: أين الامرون بالمعروف والناهون عن المنكر.**

**واتە: لە بەهەشتا پەرییەکی سوورو سپی هەیە، ناوی عەینایە: ناوی چاو جوانە، کاتێ دەکەوێتە رێ حەفتا هەزار کارەکەر لەلای راستیەوەو حەفتا هەزار کەنیزەك لەلای چەپیەوە لە خزمەتیدا دەڕۆن، دەڵێ: کەسانێ کە لە جیهاندا کارو پیشەیان ئەوە بووە فەرمانیان کردووە بە چاکەو رێگەی خراپەیان نەداوەو مامۆستای خێربوونو پاسەوانی رەفتاری جوان بوون لە کوێن، منو وێنەی من بۆ ئەو جۆرە کەسانەین!**

**وەکی تریش شیعر بۆ منالْ، بۆ قوتابیو فەقێ، بۆ نیمچە خوێنەوارو نەخوێدەوار دەورێکی بالاّ دەبینێو، ئیمانو بیرو باوەڕی ساخ وەك نەخشی بەرد، هەر لە سەرەتاوە لەناو دڵو دەروونیانا دەڕوێنێ.**

**من بەش بە حاڵی خۆم ئەوەندەی سوودو بەهرەی کردەیی (فیملی)م لە شیعرەکانی عەقیدەی کوردی شێخ سەمیع (رەزای خودای لێبێ) وە شیعرەکانی ئیقباڵنامە وەرگرتووە قەت ئەوەندەم سوودو قازانج لە خوێندنی شەرحە عاقائیدو تەهزیبولکەلام وەرنەگرتووە!ئەوەندە هەیە شیعرەکانی بەندەهەر چۆن بنو لایەنی هونەریو وێژەییەکان هەر کەمو کوورییەکی هەبێ، ناوەرۆكو مەبەستو مەعناکانیان راستو دروستو ساغنو سەرچاوەی کۆمەڵێ زانیاری جوانن لە بابەتی خۆیاندا، با بڵێین ئەگەر شیعریش نەبن قسەی راستو دروستو هەقو جوانن، تا بڵێی رێكو پێكو رەوانن، هەتا رەنگ بێ بۆ ئەوەیش دەست بدەن کە سەربەخۆ لە نامیلکەیەکا چاپ بکرێن، ئەگەر هەندێ لە شیعرەکانی بەرگەکانی تری تاجیشیان بخرێتە پاڵ هەر دەبێ، ئەوکاتە دەبێ بەپێی پارچە هەڵبەستەکان عینوانو سەرباسیان بۆ دابنرێ وەك: گەڵی پەروانە. پەسنی وەیسی قەرەنی. پەسنی ئیمامی ئەنەس.**

بەقەرە پەسنی سوورەتی پێڕستی سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز، لاواندنەوەی خوبەیبی شەهید. نزای نیوە شەوی نۆزدەی پێنج. سەرنجێ لە دەوروبەر. بەهەشتنامە! کەمەبەست ئەم پارچە شیعرەی دواوەیە، من ئەم تێبینییەم لەسەر شیعرەکانی خۆم نوسی، خودا یاربێ بێ سوودنابێ. پەنا بەپەنای بێ پانایان. بەهەشتنامە. بڕوانە: (زنجیرە/١٣٧ ل/٤٣٩ چ/١) لەم بەرگە باسی: دارود ردخت‌و میوەی بەهەشت:

بِسْمِ اللّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بەناوی خودای پادشای بێچوون
ئەم نامە دەکەم بەو ناوە گوڵگوون!
سوپاس بۆ خودا، درووود لە حەزرەت
ڕەزا لە یاران، ڕەحمەت لە ئوممەت
درووود پەیاپەی وەک شەستەباران
لەسەر سەرجەمی گش پێغەمبەران!
ئەوجا وادێمە سەرباسی بەهەشت
ژمارەی دەرگای دەق دەکاتە هەشت
چەندین چینی هەس، بە پایەش سەدە
ئەم لانە خۆشە لە کیس خۆت مەدە
چین تەبەقەیە، دەرەجەش پایە
فیردەوس لە ئەعلاتەبەقە دایە
خشتێ لە زێڕو، خشتێ لە زیون
بەناواخنی، میسک چەسپیون!
دوڕو یاقووتە زیخو چەوییان
زەعفەرانی ساغ خاکو خۆڵی یان

موسولمان! بەهەشت خۆشو نازدارە

مالی دوا رۆژی تۆی باوەڕدارە!

ئامان بە قسەی ئەمو ئەو نەکەی

بۆ کەلاوە کۆن بەهەشت لەدەست دەی!

دنیا مەزرایە، بەکردەوەی چاک

ئاوەدانی کە، وەک دڵی رووناک

من نالێم کاکە! تەرکی دنیاکە

کۆشکت برمێنەو قولخی پەیاکە

بەلام من دەڵێم روو لە خوداکە

دنیا باوەژن، قیامەت داکە!

بە چاکە دەیکەی بە دایکێ دڵسۆز

دەتکا بە کوڕێ، ببیە ئاغای هۆز

سەرتاپای بەهەشت گوڵو گوڵزارە

هەر لاسەیر دەکەی کۆشکو تەلارە

ئاوو هەواکەی چەشنی بەهارە

نازو نیعمەتی بەبێ شومارە!

نەگەرمەو نە سارد، فێنکو خۆشە

نەجێگەی نووستوو، نەجێی سەرخۆشە

جێگەی دانیشتووی بەهۆشو کۆشە

نە جێگەی نوستوو، نەجێی نەخۆشە

هەر سەیر دەکەی باخو بۆلاخە

سێبەری خەستو تەلارو باخە!!

دانیشتووی ساخە، زۆر بە دەماخە

نە جێگەی خەفەت، نە شوێنی داخە!

لەسەر مەشخەڵو مینەبەری نوورن

لەخودا نزیک، لە مردن دوورن!!

هەموویان لاون، جوانن، رووسوورن

نە تانە لە شوێن، نە شەلو کوورن!

هەمیشە وریان، گشت هاوتەمەنن

بۆنخۆشو رووخۆش، چون یاسەمەنن!

پیریو نەخۆشیو مردن نامێنن

کە بۆ تێکدانی ژینمان هەوێنن

نە شەکرە هەیە، نە هەس زەختی خوێن

نە کەفتەکاری، نە کەوتووی ناو نوێن

نازیزم! بەهەشت لەسەر هەتا خوار

(جنات تجری تحتها الانهار)!

جۆگەی بن درەختکانی ناو تەلار

لە گشت لا پەخشن وەک گوڵی بەهار

هەنگوینو شیرو ناوێکی سازگار

بادەیەکی پاک، ئەوە چوار رووبار!

لەناو بەهەشتا دەکەن سەرو خوار

بە یەکەیەکەو، بە چوار چوار

دیمەنی شیرین، مێرگو مێرغوزار

روبەری بەهەشت دەکەن بە گوڵزار

جۆری مەلو مۆر، چەشنی گوڵو دار

من دەڵێم: ملیۆن، تۆ بڵێ ملیار!

فەرشو رایەخی بە سەدان هەزار

تیا ڕاخراوە لەسەرو لەخوار

پەری چاو جوان، ناسکو نازدار

وەک گۆی مرواری سافێکی ناودار

دەم نوقڵو نەبات، روومەت گوڵ هەنار
خۆشڕوو، خۆش ڕەفتار، سەنگینو سەلار
تازە مەمکردوو، دێن بە لەنجەو لار
دڵداری دەکەن لەگەڵ دۆستو یار!
خوا خەلقی کردوون بەبێ عەیبو عار
دەبن بە هاوسەر بۆ پیاوی دیندار
لە بەهەشت هەیە رەشماڵو دەوار
بۆ بووکو زاوا دەبنە نۆ هەوار
سەیرانو ساباط، رنەی بن دەوار
دەخاتە یادیان رۆژی کۆچو بار!
هەر لەناو بەهەشت کۆرەوەکەی پار
لە یادمان بچێ، ئەی خودا، هاوار!
هەر بەهەشت وێنەی پەری جوان بێ
خۆشی لەو کەسەی لەلای میوان بێ
هەمیشە کچن، گشت هاوتەمەنن
رووخۆشو بۆنخۆش وەک یاسەمەنن!
چاو ڕەشو قەوی، روومەت سپیو سوور
ددان مرواری، گەردن چون بلوور
دەمو چەمو مەم، کفتو لفتو لێو:
خونچەو نێرگسو، بەهێو شەکرە سێو!!
دەنگخۆشن، جوانن، مەردن، نەمرن
بۆ مێردی خواناس ژنو هاوسەرن!
رەبەنو بێ ژن لە بەهەشت نییە
ژن هەیە مرۆڤ، هەیە پەرییە
پەری! تۆ لەگوڵ گلەیی دەکەی:

دەفەرمووی: ئەی گوڵ! تۆران هەتاکەی؟!

بووی بە بایەقوش لەناو کەلاوە
تازە هەواری تازەت هەڵ داوە!

گوڵیش گلەیی ئەوەی بوو لە تۆ
ئیتر لەبەر تۆ، کەس ئەو ناکا بۆ!!

بەهەشتی ناغای ماڵی خۆیانن
دارای باشترین گەنجو سامانن

نۆکەری ئەمر، هەمیشە جەهێڵ
سەلارو بۆشناخ، دڵسۆزو بەوێڵ!

چابوکو چالاک، دەڵێی ترشو خوێن
بۆ ڕاژەو خزمەت، تاقم تاقم دێن

خزمەتیان دەکەن بەدڵو بەگیان
بە دەوریانا دێن بە قوربان قوربان!

پیاڵە پڕدەکەن لە بادەی نایاب
لەسەرچاوەیێ کانە بۆ شەاب!

پێشکەشی دەکەن بە پیاوو ژنان
لەگەڵ میوە جات، لەگەڵ گۆشتو نان!

ئازیز! لە بەهەشت مەینۆشی خۆشە
هەتا دەتوانی پتر بنۆشە!!

نەشەیێ دەدا بەهەستی مەینۆش
هەتا هەتایە قەت نابێ سەرخۆش

دەبێ بەمایەی مانو هۆشی ساغ
تامو بۆی خۆشە چەشنی سێوی باغ!

خشڵی زێڕو زیو، مرواریو یاقووت
گەوهەرو ئەڵماس، هاورێشمو زومرووت

ئەوەندە زۆرن بەبێ شومارن

لەبەر کەنیزو خزمەتگوزارن!

تا ئەچییە بەهەشت نازانی چییە

قسەی هیچو پووچ لە بەهەشت نییە

دەچن بۆ سەیران، دەچن بۆ بازاڕ

بەڵام ڕەوناکەن وەک ڕەوەکەی پار!

مەر لەناو بەهەشت زامی ڕەوی پار

ئەوجا ساریژبێ، ئەی خودا! هاوار!

خاوێنە بەهەشت، پاکو تەمیزە

دوور لە پیسایی و ئازارو میزە!!

بەقڕقێنەیێ بۆنخۆش وەک کوڵاو

خۆراکیان هەموو دەبێ بە هەڵاو!

بەهرەی زۆرگەورە کە بێ مانەندە

ئەوەیە کە خوا لێت ڕەزا مەندە!

لە هەموو خۆشتر خودا بینینە

بەچاوی سەری ئەم ئەهلی دینە!

گەر ڕشێنەی نوور سەربەستی کردی

کفت و لفتی خۆش سەرمەستی کردی

ئیتر بەبۆنی بەهەشت دەمردی

دەبوو بە بەندت بەهەشت بە کوردی! [1]

لە دەستی پەری و خزم و کەسوکار

ڕات دەکرد بۆ لای خودای کردکار!

ئەگەر تێ بگەی ئەوسا دەزانی

---

[1] بەند: حەپس و زیندان. (هەمبانە بۆرینەی هەژار (ڕەحمەتی خودای لێبێ). (وەرگێڕ)

کە تۆ لەکن خوا ڕاستە میوانی!
کاتێ لە بادەی شەرابەن تەهوور
مەست دەبن، دەبن بە پارچەیێ نوور
لە تەڵخی خاکی سەرچاوەی نەهات
پاک دەبنەوەو، دەگەن بە ئاوات!!
جا نەرادەبن لە بەهەشت‌و حوور
پەروانە ئاسا، دەچن بۆ حوزوور!
بەدیداری حەق شادمان دەبن
بە مانی یەزدان خاوەن مان دەبن!

| | |
|---|---|
| لما استقر في قنانه | ضمن النَّجا من فنَانه |
| ويلتذون بلقائه | كما يبقون ببقائه |
| وقع الصادي على مائه | يروي ظمأه من سقائه |
| لقد ظفر بنجانه... | كما قد نجا من شقائه |

شێخی قازی بەیزاوی (ڕەزای خودای لێبێ) لەڕاڤەکردنی: (وسقاهم ربهم شرابا طهورا)دا دەفەرموێ: يريد به نوعا آخر يفوق النوعين المتقدمين، ولذلك اسند سقيه الى الله عز وجل ووصفه بالطهورية فإنه يطهر شاربه عن الميل إلى اللذات الحسية والركون إلى ما سوى الحق فيتجرد لمطالعة جماله ملتذا بلقائه باقيا ببقائه وهي منتهى درجات الصديقين ولذلك ختم بها ثواب الابرار).

واتە: مەبەست لەم (شەرابەن تەهوورە) جۆرێکی تری بادەیە، کە لە دووجۆرەکەی پێشوو نایابترە، کە یەکەمیان کافووری تێ دەکرێ‌و دووەمیان زەنجەفیل، ئەم جۆرە نایابترە بۆیە دەفەرموێ: خودا بۆ خۆی دەیگێڕێ بەسەر بادەنووشەکانداو، دەینۆشێ پێیان! هەر لەبەر ئەوەشە کە پەسنی دەکاو دەفەرموێ: نۆشکراوێکی پاک‌و پاکە وەکەرە، چونکە مەینۆشە کە پاک

دەکاتەوەو، لە خۆشی هەستی مەیل بڕی دەکاو، لە کەمترین مەیلو ئارەزوو بۆلای غەیری خودای راستو دروستی گەورەو شکۆمەند، ئیتر لێ دەبڕێ بۆ موتالاکردنی جەماڵی خوداوەندیو واز لە غەیری ئەو دێنێو، خۆشیو چێژ لە دیداری پەروەردگار وەردەگرێ، تاوای لێدێ بەبێ ئەو هەڵناکاو دەگاتە پایەی پیاو چاکانی خودا، مانی بە مانی خودا دەبێو، خۆشنوودیی لە دیداری ئەو وەردەگرێو پایەداریی بە پایەداریی ئەو دەبێ، هەر لەبەر ئەم مەبەستەیە کە خوداوەند بەم پایەیە کۆتایی بە پاداشی باشی چاکە خوازان دێنێ.

بۆیە ئەم دەقەم راگواستەوە بۆ ئێرە تا خوێنەرو گوێگری بەڕێز لە دروستیی کارەکە دڵنیابنو، نەڵێن: ئەم جۆرە قسەیە لافو گەزافی دەروێشو سۆفییانەو، زاناگەورەکان شتی وایان نەفەرمووە.

خۆزگەم بەرە بەرە مەلاو مامۆستاکانمان ئەم کتێبە گەورانەیان تەرجەمە دەکردو، دەیانکرد بە کوردی، دنیا زۆری بە بەرەوە ماوە، تەفسیری بەیزاوی یا مەداریك یا جەلالەین، یا کەششاف، یا مینهاجی نەوەوی، یا شەرحی عەقائیدی نەسەفی، ئەمانە گەنجینەیەکی گەورەن، وردەکاریو رەنگرێژییەکی جوانیان تیادا کراوە.

مەبەست لە گلەیی پەری لەگوڵ کینایییە لە گلەیی لە پیاوی پیری خوداناس کە تەمەن لەگەڵ پرو پیرەژنی ناو کەلاوە کۆنی دنیادا خەرج دەکاو کۆچ ناکا بۆلای خێزانی بەهەشتی، ئەویش وەڵامی دەداتەوە: چۆن دەبێ من لەبەر ژنێ واز لە هەموو کەسو کار بێنمو بێم بۆ لای تۆ. (وەرگێڕ)

**١٥١) باسو خواسی دۆزەخو دەرگاکانی** : (**النار وابوابها وأوصافها**)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا – سورة النساء – ١٤٥/٤}

لەسەر باسی (ومنه النفاق)دا لە کیتابی ئەخلاقدا رابورد. ← (ب/٩ ز/٢٦ ل/٧٤).

وَقَالَ تَعَالَى: {وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ، لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ - سورة الحجر - ١٥/٤٣-٤٤}.

دڵنیابن کە دۆزەخ مۆڵگەی هەموو ئەوانەیە کە سەر بەشەیتانن، دۆزەخ حەوت قاتە، لەبەر ئەوە حەوت دەرگای هەیە، گشت دەرگایێ بۆ بەشێ لەو گومڕایانە دیاری کراوە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ}.

وَقَالَ تَعَالَى: {كَلَّا إِنَّهَا لَظَى، نَزَّاعَةً لِّلشَّوَى، تَدْعُو مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّى، وَجَمَعَ فَأَوْعَى - سورة المعارج - ٧٠/١٥-١٨}.

کەس لەبەر دەردی خۆی سەرکەسی تری ناپەرژێ، حاڵی شڕیان وا بە بەرچاوەوە وەلێ لەبەر شپەرزەیی نایانپەرژێتە سەریەکتری، نەك لەبەر ئەوە کە یەکتری نابینن، تاوانبارەکان لەو رۆژە سەختەدا وەك پیشەی هەمیشەیان هەر خەمی خۆیانە، لەبەر ئەوە حەز دەکەن بەهەر نرخێ بێ خۆیان رزگار بکەن، ئەگەر بۆیان دەست بدا کوڕو براوژن‌و هۆزو خزم‌و گشت خەڵکانی ترو هەموو جیهان بەگیانداری بێ گیانیەوە دەدەن بە تۆڵەی خۆیاندا، بەڵکوو رزگاریان ببێ لەو سزایە! بەڵام خەیاڵیان خاوە بە دەستی خۆیان ئاگریان ناوە بە ماڵی خۆیانەوە، ئاگریان بەر داوەتە گیانی خۆیان، چۆن ئاگرێ، ئاگرێکی بڵێسەدارە، بڵێسەی بەهەر چوارلادا هەڵپە دەکاو پەلاماری کافرەکان دەداو، نێڵەنێڵ دەکاو گرپەگرپ بەرز دەبێتەوە، بەرهەر کوێیان دەکەوێ دایدەپلۆخێنێ‌و پێستەکەی لێ دادەڕنێ، بە تایبەت چەرمی دەموچاوو پێستی سەریان دادەماڵێ. بەزمانێکی پاراوی رەوان دەخوڕێتە ئەو کەسانەی کە لە دنیادا پشتیان لە هەق‌و لە ئیمان کردبوو، کە هەر خەریکی کەڵەکە کردنی پارەو پوول بوون، بانگیان دەکاو دەڵێ وەرن بۆ لای من.

وَقَالَ تَعَالَى: {سَأُصْلِيهِ سَقَرَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا سَقَرُ، لَا تُبْقِي وَلَا تَذَرُ، لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ، عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ - سورة المدثر - ٢٦/٧٤-٣٠}.

لە ئاییندەی نزیکدا ئەو بەدبەختە، ئەو کابرا نەگبەتە بە دەستی خۆم لەناو ئاگری سەقەردا سووری دەکەمەوە، مەگەر هەر خودا بۆ خۆی بزانێ سەقەر چۆنەو چییە! هەرچی بەرهەوێڵ بکەوێ سەرنگوونی دەکا، قولاخیشی ناهێڵێتەوە، ئادەمیزاد دەکا بە سووتەمەرۆ، نۆزدە فریشتە، یاخود نۆزدە چەشن فریشتە سەر پەرشتی دەکەن.

وَقَالَ تَعَالَى: {إِنَّ الْأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ، وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ، يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ - سورة الإنفطار - ١٣/٧٢-١٥}.

دڵنیابن کە لە رۆژی قیامەتدا خێرەو مەندان وان لەناو نازو نیعمەتدا، کافرەکانیش - کە بەسروشت بە درەوشتن - وان لەناو نێرینەی ئاگری جەحیمدا، لە رۆژی تۆڵەسەندندا لەناویدا وەك گۆزەو دیزەی ناو کڵی ئاگر سوور دەکرێنەوە.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ، فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ، نَارٌ حَامِيَةٌ - سورة القارعة - ١٠١/٨-١١}.

واتە: وە ئەو کەسانەیش کێشانەو تای ترازوو چاکەیان سووکە وان لەناو هاوییەدا، هەر خودا بۆ خۆی دەزانێ کە هاوییە چییەو چی نییە، ئەوە ئێستا بە تۆ نازانرێ، بەراستی ئاگرێکی سووری بەجۆشو تاوە، گەرمە بەلام گەرم.

وَقَالَ تَعَالَى: {كَلَّا لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ، نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ، الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ، إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ، فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ - سورة الهمزة - ١٠٤/٤-٩}.

نەء، نەء، وانییە وەك بەتەمایە:

ماڵی بیهێڵێ هەتا هەتایە

هاکـــا تـــووڕدرا بۆنـــاو حوتەمـــە
کـــە لـــە دۆزەخـــا قـــاتی دوو هەمـــە
هـــەر خـــوا دەزانـــێ حوتەمـــە چـــییە
نـــاوی خودایـــە لەوێنـــەی نییـــە
هـــورووژم دەبـــا هـــەتا نـــاخی دڵ
کـــۆی دڵ دەکاتـــە پارچـــەیێ ســـکڵ!
دەورەیـــان دەدات وەک هـــۆدەی قـــەپات
کۆتـــێ وێنـــەی ڕک پێیـــان کـــۆت دەکـــات

سەرچاوەی ئەم ڕاڤەیە تەفسیری بەیزاوی‌و نامی‌و خاڵ‌و جەلالەین‌و شوببەرو غایەتولمەئموولە (ڕەزای خودا لە دانەرەکانیان بێ) ڕك گوریسێکی درێژە، لەهەر دوو سەرەوە بەستراوە بە دوو مێخەوە، قوڵفێکی زۆری پێوەیە، کارو بەرخ بەو قوڵفانە جەلە دەکرێن، لە داوی ڕاوەسوێسکە دەچێ.

بەیزاوی (ڕەزای خودای لێبێ) لە ڕاڤەی (في عمد ممدده)دا دەفەرموێ: أی موثقين في أعمدة ممدودة مثل المقاطر التى تقطر فيها اللصوص!

مونجید دەڵێ: المقطرة: خشبة فيها خروق يدخل فيها أرجل المسجونين وهى خشبة من قطار الابل لان المحبوسين فيها على قطار واحد مضموم بعضهم الى بعض، أرجلهم في خروق خشبة مغلوقة على قدر سعة سوقهم.

هەنبانە بۆرینە دەفەرموێ: کۆت: داری ئەستووری قاچی زیندانی. مامۆستا مەلا عەبدولکریم (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: واتە: ئەو ئادەمیزادە تانەدەری ناوو ناتۆرە دەروستکەرانە ئەخرێنە ناو هۆدەیەکی قەپاتی دەرگا داخراوەوەو پێکانیان ئەخرێتە ناو کۆتەوەو، ئەو کۆتە درێژەو، بەشی زۆر کەس ئەکا شێخی خاڵ – پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نووری خودا بێ) ئاوا ئەم چەن ئایەتانە ڕاڤە دەفەرموێ: باوانە زانێ، بەراستیی فڕێ ئەدرێتە ناو ئاگرێکی

بەتینی تێ شکێنەرەوە، تۆ چووزانیت کە ئەو ئاگرە چۆنە؟... ئاگرێکی هەڵگیرسێنراوی خواییە، کە هووژم دەباتە سەر دڵان.. بێگومان ئەو ئاگرە دەورەیان ئەداو دایان ئەگرێ لە هەموو لایەکەوە بە رەنگێکی وا، کەرێی دەرچوونیان نەبێ، لەگەڵ ئەمیشە کە هەموو ئەبەسترێنەوە لەناو چەند کۆتێکی قورسی درێژی راکشاوا.

بەیزاوی لە سوورەتی حیجردا، لە ئایەتی چل‌و چواردا دەفەرموێ:.. {طبقات ینزلونها بحسب مراتبهم في المتابعة وهي جهنم ثم لَظَى ثُمَّ الحطمة ثم السعير ثم سقر ثم الجحيم ثم الهاوية.

بەڵام غایەتولمەئموول (لە سوورەتی موئمینـدا، لە بەرگی چوارەمدا) تەبەقەو قاتەکانی دۆزەخ ئاوا ریز دەفەرموێ: جەهەنم، حوتەمە، لەظا، سەعیر، سەقەر، هاوییە، جەحیم، کتێبەکە ئاخرو ئوخریەتی، حەزدەکەم بۆ گوێگرو خوێنەری روون بکەمەوە کە بەندە لەسەرچی شێوەیێ بەهرەم لەسەر چاوەکانی وەرگێڕانەکەم وەرگرتووەو چۆن چۆنی لە بەرگی نوێباودا پێشکەشی دەکەم‌و مامەڵەو رەفتار لەگەڵ دەقە سەرچاوەکاندا دەکەم. ئەوەتا دەبینین ئەم تەفسیرە کە بەشیعرە، شیعریش تۆزێ بەری تەعبیری تەسکە، وەك پەخشان نییە، لەگەڵ ئەوەیشا دەبینین ئەم تەفسیرە وەك جۆگەلەیەکی ئاوی روونی جوان، وشەبەو شەلەو سەرچەشمە سازگارانە هەڵقولاوەو هیچ تەحریف‌و دەستکارییەکی ناحەزانەی تیادا نییە، وەلێ ئەوەندە هەیە ئەم جۆرە تەفسیرە مەبەست زوو دەدا بە دەستەوە، لە رۆحی قورئانەکەوە نزیکترە، هەتا وەرگەڕانی پیتاوپیتی، مەعناو مەبەست چەند رۆڵ دەبینن لەفزو گوتەیش ئاوا دەوری کاریگەر لە ناخی دەووندا دەبینن، بە تایبەت سەجع‌و سەرواو کێشی سفت‌و سۆڵ. ئیتر پەنا بەخودا. (وەرگێڕ)

٥٧٦٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ. قَالُوا: وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً

يَا رَسُولَ اللّٰهِ. قَالَ: فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهَا مِثْلُ حَرِّهَا. رواه الشيخان والترمذي[1]:

**ئەبو هورەیرە** (خۆشنوودیی خودای لێبێ) **فەرمووی: حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەم ئاگرەی ئێوە کە ئادەمیزاد دەیکاتەوە یەك بەش لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ گەرمە یاران** (رەزای خودایان لێبێ) **فەرموویان قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! بەخودا، ئەگەر ئاگری دۆزەخ بە ئەندازەی ئەمیش گەرم بێ هەر سەرو زیادە، فەرمووی: دەسا شەست‌و نۆ جار لەم ئاگرە گەرمترە، دەق حەفتا ئەوەندەی ئەم گەرمە. (ش/ت).**

٥٧٦١- ← ( ب/١ ز/٤٧ ل/١٩٧ ف/٨)[2].

٥٧٦٢- ولمسلم والترمذي: يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لَهَا سَبْعُونَ أَلْفَ زِمَامٍ مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ يَجُرُّونَهَا[3]:

**موسلیم‌و تیرمیزی (خودایان لێ خۆش نوودبێ) دەگێڕنەوە کە حەزرەت** (درودی خودای لەسەربێ) **فەرموویەتی: ئەو رۆژە کە دۆزەخ دەهێنن، دۆزەخ واتە: جەهەننەم، بە حەفتا هەزار فریشتە بە حەفتا هەزار هەوسار بەکێشی دەکەن.**

٥٧٦٣- وَعَنْهُ قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ سَمِعَ وَجْبَةً فَقَالَ: تَدْرُونَ مَا هَذَا؟ قُلْنَا: اللّٰهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ. قَالَ: هَذَا حَجَرٌ رُمِيَ بِهِ فِي النَّارِ مُنْذُ سَبْعِينَ خَرِيفًا فَهُوَ يَهْوِي فِي النَّارِ الآنَ حَتَّى انْتَهَى إِلَى قَعْرِهَا. رواه مسلم[4]:

**دیسان ئەبو هورەیرە** (خودای لێ رازی بێ) **فەرمووی: لە خزمەتی حەزرەتدا بووین** (درودی خودای لەسەربێ) **رمبەیەکی بەرگوێ کەوت فەرمووی: دەزانن ئەم گرمەیە چی بوو؟ گوتمان: قوربان خوداو پێغەمبەر باشی دەزانن. فەرمووی:**

---

[1] مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٩٤.

[2] تقدم في مجلد اول. تسلسل/٤٧ رقم/٨/٣٥٤.

[3] مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٩٣. ترمذي. صفة جهنم: ٢٥٧٣ و ٢٥٧٣م. تحفة الأشراف: ٩٢٩٠.

[4] مسلم. جنة ونعيمها: ٧٠٩٦.

ئەوە بەردێك بوو حەفتا ساڵە لە لێواری دۆزەخەوە بەردراوەتەوە، لەو ساوە هەر بەردەبێتەوە تا ئێستا گەیشتە بنیو ئەوە بوو ئێوە گوێتان لە گرمەکەی بوو. (م = موسلیم. (رەزای خودای لێبێ)).

٥٧٦٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَخْرُجُ عُنُقٌ مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ تُبْصِرَانِ وَأُذُنَانِ تَسْمَعَانِ وَلِسَانٌ يَنْطِقُ يَقُولُ إِنِّي وُكِّلْتُ بِثَلاثَةٍ بِكُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ وَبِكُلِّ مَنْ دَعَا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَبِالْمُصَوِّرِينَ[٥].

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای مەزنی لەسەربێ) دەفەرمویێ: لە رۆژی قیامەتدا گەردنێك وەك گەردنی حوشتر، لەناو ئاگری دۆزەخەوە دێتە دەرەوە، گەرچی پارچەیێ ئاگری ساخە، بەلاّم دوو چاوی هەیە پێیان دەبینێ، دوو گوێی هەیە پێیان دەبیستێ، زمانی هەیە قسەی پێدەکا، بە زمانێکی رەوان دەلێ: ئەم سێ نەگبەتە دراونەتە دەست خۆم:

یەکەم: زۆرداری زەبرداری بەزەبرو زەنگی ملهوڕی سەرکەش.

دووەم: فرە خوا، واتە: کەسێ کە لەگەڵ خودای گەورەدا خودایەکی تر بپەرستێ. سێیەم: وێنە گرەکان (ت-س/ص).

٥٧٦٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ أَنَّ رُصَاصَةً مِثْلَ هَذِهِ وَأَشَارَ إِلَى مِثْلِ الْجُمْجُمَةِ أُرْسِلَتْ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ وَهِيَ مَسِيرَةُ خَمْسِمِائَةِ سَنَةٍ لَبَلَغَتِ الأَرْضَ قَبْلَ اللَّيْلِ وَلَوْ أَنَّهَا أُرْسِلَتْ مِنْ رَأْسِ السِّلْسِلَةِ لَسَارَتْ أَرْبَعِينَ خَرِيفًا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ قَبْلَ أَنْ تَبْلُغَ أَصْلَهَا أَوْ قَعْرَهَا[٦].

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (رەزای خودایان لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر پارچە بەردێ بەقەد ئەمە، کە بەقەد کەللە سەرێ دەبوو، لە ئاسمانەوە بەر بدرێتەوە بۆ سەر زەوی کە ماوەی پێنج سەد ساڵە رێیە، بەر لەوەی شەو دابێت دەگاتە سەر زەوی، بەلاّم ئەگەر ئەو بەردە

---

[٥] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

[٦] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

لەسەری زنجیرێ لە زنجیرەکانی دۆزەخەوە بەهەمان خێرایی بەر بدرێتەوە حەفتا ساڵ بەشەوو بە ڕۆژ هەر بڕوا نەوەستێ هێشتا ناگاتە ئەو پەڕی. یا فەرمووی: ناگاتە بن بنی! (ت-س/ص).

٥٧٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُوقِدَ عَلَى النَّارِ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى احْمَرَّتْ ثُمَّ أُوقِدَ عَلَيْهَا أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى ابْيَضَّتْ ثُمَّ أُوقِدَ عَلَيْهَا أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى اسْوَدَّتْ فَهِيَ سَوْدَاءُ مُظْلِمَةٌ[٧]:

ئەبو هورەیەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەزار ساڵ ئاگری دۆزەخ خۆش کرا تا سوور سوور بوو، ئەنجا هەزار ساڵی تر خۆش کرا تا سپی بوو، ئەوجا هەزار ساڵی تر خۆش کرا تا ڕەش ڕەش بوو ئێستاکە لەم دەمەدا ڕەش‌و تاریکە. (ت- ڕشتەکەی بێ دەنگی لێ کراوە).

٥٦٧- عَنْ أَبِي سَعِيد (رَضِي اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِسُرَادِقِ النَّارِ أَرْبَعَةُ جُدُرٍ كِثَفُ كُلِّ جِدَارٍ مِثْلُ مَسِيرَةِ أَرْبَعِينَ سَنَةً[٨]:

ئەبو سەعید (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سورادیقەکەی دۆزەخ، کە ناوی لەم ئایەتەدایە کە دەفەرموێ:

{وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءتْ مُرْتَفَقًا - سورة الكهف - ٢٩/١٨}.

واتە: ئەی خۆشەویست! تۆ بەو کەسانە بفەرموو، کە دەیانەوێ تۆ ڕوو نەدەی بە موسوڵمانە هەژارەکان‌و ڕووبکەیتە ئەوان، پێیان بفەرموو: هەق -واتە- شتی ڕاست‌و دروست بەس ئەوەیە کە لەلای خودای ئێوەوە بێ، نەك ئەوە بێ کە لەسەر هەواو ئارەزووی دەروون بێ، بێ باکیی خودایان پێ ڕابگەیەنە، ئێمە

---

[٧] مسكوت عنه (شرحه).

[٨] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

هەق‌و راستی‌و ناهەقی‌و ناراستیمان بۆ روون کردوونەتەوە، ئیتر ئەو خەڵکە ئارەزووی خۆیانە رێی هەق هەڵ دەبژێرن‌و باوەڕ بە دینی خودا دەکەن‌و پاداشی باشی خۆیان وەردەگرن ئەوا لێیان پیرۆز بێ، یاخود رێی ناهەق دەگرن‌و کافر دەبن‌و تۆڵەو سزای سەخت‌و ئاوری دۆزەخ بۆ خۆیان مسۆگەر دەکەن ئەوا چش، چاویان دەردەهات، جاڕ بدە کە خودا بۆ کافرەکان - کە بەهۆی بێ باوەڕییەوە بوون بەستەمکار - ئاورێکی ئیجگار سامناکی بۆ ئامادە کردوون، کە بڵێسەو زبانەی ئاگرە کە وەکوو سورادیق - واتە: وەکوو ئاخڵەو دیوار - گەمارۆیان دەدا،کاتێ دۆزەخییەکان لەناویدا لە توونیاندا هاواردەکەن بۆ ئاو، ئاوێکی لە کوڵی وایان دەدەنێ، وەکوو خڵتەی زەیت‌و دۆوکی رۆنی داخکراو وایە، کاتێ نزیکی دەموچاویان دەکرێتەوە، هەر هالاوی تینەکەی دەموچاویان دادە پڵۆخێنێ‌و، چەرمی دەموچاویان دادەماڵێتە ناوی! بەراستی خواردنەوەی وا داخی لەکوڵ بەدترین خواردنەوەیە، بەراستی ئاگری وا خراپترین پشتی‌و سەرینە. بچینەوە سەر باسی فەرموودەکە:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: سورادیقەکەی دۆزەخ، بریتییە لە چوار لادیواری ئەستور، هەریەکی چڵ ساڵ رێ ئەستوورە! (ت- بەرشتەیەکی بێ هێز).

٥٧٦٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الصَّعُودُ جَبَلٌ مِنْ نَارٍ يُتَصَعَّدُ فِيهِ الْكَافِرُ سَبْعِينَ خَرِيفًا وَيَهْوِي فِيهِ كَذَلِكَ مِنْهُ أَبَدًا... ← (ب - ٧ ز - ٥٧ ل - ٢٦٦ ف - ٢)[٩].

٥٧٦٩- عَنْ عُتْبَةَ بْنِ غَزْوَانَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الصَّخْرَةَ الْعَظِيمَةَ لَتُلْقَى مِنْ شَفِيرِ جَهَنَّمَ فَتَهْوِي فِيهَا سَبْعِينَ عَامًا وَمَا تُفْضِي إِلَى قَرَارِهَا. قَالَ: وَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ أَكْثِرُوا ذِكْرَ النَّارِ فَإِنَّ حَرَّهَا شَدِيدٌ وَإِنَّ قَعْرَهَا بَعِيدٌ وَإِنَّ مَقَامِعَهَا حَدِيدٌ[١٠]:

---

[٩] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٥٧ رقم/٢/٤١٩٢.

[١٠] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

عوقبەی کوڕی غەزوان (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووری خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە لێواری دۆزەخەوە تاوێری گەورە گلۆر دەکرێتەوە حەفتا ساڵ بەناویدا هەر تلۆر دەبێتەوە، یەك دەم چییە لە خولۆربوونەوە ناکەوێ، کەچی هێشتا هەر ناگاتە ناخی بنی. گوتی: جاران عومەر (خودای لێ رازی بێ) دەیفەرموو: لە یاد کردنەوەی ئاگری دۆزەخ دریغی مەکەن، هەمیشە لە یادتان بێ، چونکە بەراستی گەرمییەکەی بەتینە، ناخی بنەکەی زۆر قووڵو بەرینە، گورزو کوتەکەکانیشی ئاسنینە! (ت- سەند زەعیف).

٥٧٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ مِثْلَ النَّارِ نَامَ هَارِبُهَا وَلاَ مِثْلَ الْجَنَّةِ نَامَ طَالِبُهَا. وى هذه السبعة الترمذي[11]:

ئەبو هورەیە (خودای لێ رازی بێ) دەگێڕێتەوە لە حەزرەتەوە (درووری خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: چی هەیە کە وەك ئاگری دۆزەخ ئاوا سامناكو بەردەوامو بە ئازاربێ، کەچی خەڵك لە جیاتی ئەوەی لەبەری رابکەنو بە هەموو شێوەیێ وریابنو خۆیانی لێ دووربخەنەوە، کەچی دەچن خۆیانی لێ گێل دەکەن وەك نووستبن ئاوا، چیش هەیە کە وەك بەهەشت ئاوا خۆشو باشو بێ پایان بێ، کەچی ئەوەی بەتەمایەتی لەباتی خۆیی بۆ بکوتێ تا خۆی بگەیەنێتی، کەچی دەچێ دەنوێو گوێی پێ نادا (ت- بەرشتەیەکی لاواز ئەم فەروودەیەی گێڕاوەتەوە).

## ١٥٢) چۆنێتی دۆزەخی : (صفة أهل النار)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُمْ بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ الْعَذَابَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا - سورة النساء - ٥٦/٤}.

---

[11] رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

دڵنیابن لەوە کە ئەو کەسانەی باوەڕ بەو بەڵگەو نیشانانە ناکەن، کە خودا کردوونی بە بەڵگە لەسەر ڕاستیی ئایینی خودا، دڵنیابن ئەم کافرانە لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا لەناو نێرینەی ئاگری دۆزەخدا دەیانگەوزێنم، ئەمە حاڵی شریانە: هەموو جارێ کە چەرمو پێستی لەشیان وەك چێشت تەواو کوڵاو داڕزیو، ڕەگو ریشەو دەماری گشت بوو بە قەرەبرووت، کە ئەو وردە دەمارانە جێگەو سەر چاوەی سەرەکی هەست کردنن بە ئێشو ئازار، هەروا لەناو چەرمی جەستەدا لەگشت شوێنێکی تری لەش پترن، هەموو جارێ کە پێستیان ئاوا بە تەواوەتی کوڵا بەسەر یەکاو تەواو تەواو سووتا ئەوسا سەر لەنوێ پێستەکەیان گۆشتەوزوون دەهێنێتەوەو دەبێتەوە بە چەرمێکی ساخی نەسووتاو، بۆیەیش ئاوا گشت جارێ پێستەکەیان دەگۆڕین، هەتا جار لەگەڵ جاردا پتر هەست بە ئێشەکە بکەن، خودا باڵا دەستەو هیچی لە دەست دەرناچێ، لە هەمان کاتدا کارجوانو دانایەو ناهەقی لەکەس ناکا.

٥٧٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا بَيْنَ مَنْكِبَيِ الْكَافِرِ فِي النَّارِ مَسِيرَةُ ثَلاثَةِ أَيَّامٍ لِلرَّاكِبِ الْمُسْرِعِ. رواه الشيخان[1]:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: بەینی هەردوو شانی نامۆسوڵمان، لە دۆزەخدا، سێ ڕۆژە ڕێگەیە، بۆ سوای خێرا. (ش = ب + م: بوخاریو موسلیم).

٥٧٧٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ضِرْسُ الْكَافِرِ أَوْ نَابُ الْكَافِرِ مِثْلُ أُحُدٍ وَغِلَظُ جِلْدِهِ مَسِيرَةُ ثَلاثٍ. رواه مسلم والترمذي ولفظه: إِنَّ غِلَظَ جِلْدِ الْكَافِرِ اثْنَانِ وَأَرْبَعُونَ ذِرَاعًا وَإِنَّ ضِرْسَهُ مِثْلُ أُحُدٍ وَإِنَّ مَجْلِسَهُ مِنْ جَهَنَّمَ كَمَا بَيْنَ مَكَّةَ وَالْمَدِينَةِ[2]:

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاکیلەو کەڵبەی ناموسوڵمان، لەناو دۆزەخدا، بەقەد کێوی ئوحود دەبێ، ئەستووریی

---

[1] تجريد/٢٨٩/٥ رقم/٢٠٣٤ = ٦٥٥١. مسلم جنة ونعيمها: ٧١١٥.

[2] مسلم جنة ونعيمها: ٧١١٤.

**پێستیشی سێ رۆژە رێیە. (م/ت) بێژەی (ت) ئاوایە: ئەستوورایی پێستی ناموسوڵان لەناو دۆزەخدا چل و دوو باڵە، خریە (کاکیلە)شی بەقەد چیای ئوحودە، جێگەی دانیشتنیشی بەقەد نێوانی مەککەو مەدینە دەبێ.**

**٥٧٧٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ضِرْسُ الْكَافِرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِثْلُ أُحُدٍ وَفَخِذُهُ مِثْلُ الْبَيْضَاءِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ مَسِيرَةَ ثَلَاثٍ مِثْلُ الرَّبَذَةِ[٣]:**

**دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە رۆژی دوارۆژدا کاکیلەی بێ بڕوا بەقەد چیای ئوحود دەبێ، رانیشی بەقەد کێوی بەیزاء دەبێ، شوێن قنگیشی کە لەناو ئاگرەکەدا دادەنیشێ سێ قۆناغە وەك ئێرەو رەبەزە (ت-س/ح).**

**٥٧٧٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْكَافِرَ لَيُسْحَبُ لِسَانُهُ الْفَرْسَخَ وَالْفَرْسَخَيْنِ يَتَوَطَّؤُهُ النَّاسُ[٤]:**

**ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: لە دۆزەخا، هەروا لە مەڵبەندەکانی حەشرو ئیستگاکاندا زمانی بێ بڕوا فرسەقێ - دوو فرسەق درێژ دەبێ و وەك رایەخ لەسەر زەوی و لەبەر پێی خەڵکا رادەخرێ و خەڵك پێشیلی دەکەن. (ت- سند غريب).**

**٥٧٧٥- ← (ب - ٧ ز - ٦ ل - ٤٢ ف - ٥)[٥].**

## ١٥٣) خواردن و خواردنەوەی دۆزەخی : (شراب أهل النار وطعامهم)

**١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْحَمِيمَ لَيُصَبُّ عَلَى رُءُوسِهِمْ فَيَنْفُذُ الْحَمِيمُ حَتَّى يَخْلُصَ إِلَى جَوْفِهِ فَيَسْلِتَ مَا فِي جَوْفِهِ حَتَّى يَمْرُقَ مِنْ قَدَمَيْهِ وَهُوَ الصَّهْرُ ثُمَّ يُعَادُ كَمَا كَانَ[١]:**

---

[٣] رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

[٥] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/٦ رقم/٥/٥/٤٠٠٥.

ئەبو هورەیەر (خۆشنوودیی یەزدانی لەسەر بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئاوی داخی لەکوڵ دەکرێ بەسەر سەری دۆزەخییەکاندا، لەشی دەیدەڵێنێ تا دەگاتە ناوسکی، ئەوسا ریخۆڵەکانی دادەپلۆخێنێو جەرگو هەناوی پارچە پارچە وەك تیرێ فڕکەی لێ بکا ئاوا لەناو لنگیەوە فڕکە دەکاو وەك فیرکە دەیفیڕێنێ، ئەوجا دووبارە وەك جاری جاران چاك دەکرێتەوەو سەر لەنوێ وای لێ دەکەنەوە، ئیتر هەموو جارێ هەروا، ئەمە ئەو (صەهر)و تواندنەوەیە کە ئەم ئایەتە باسی دەفەرموێ:

{هَذَانِ خَصْمَانِ اخْتَصَمُوا فِي رَبِّهِمْ فَالَّذِينَ كَفَرُوا قُطِّعَتْ لَهُمْ ثِيَابٌ مِّن نَّارٍ يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ، يُصْهَرُ بِهِ مَا فِي بُطُونِهِمْ وَالْجُلُودُ، وَلَهُم مَّقَامِعُ مِنْ حَدِيدٍ، كُلَّمَا أَرَادُوا أَن يَخْرُجُوا مِنْهَا مِنْ غَمٍّ أُعِيدُوا فِيهَا وَذُوقُوا عَذَابَ الْحَرِيقِ – سورة الحجةجالأ – ٢٢/١٩-٢٢}.

واتە: کۆمەڵەی موسوڵمانانو کۆمەڵەی ناموسوڵمانان، لە هەموو سەر دەمێکا، لە چەرخی گشت پێغەمبەرێکا، دووگرۆی ناحەزی یەکترن، لەسەر دینی دروستی خودا شەڕو هەرایانەو کێشەو بەرەیانە، موسوڵمانەکان چونکە لەسەر هەقن بەکامی خۆیان بە مرازی خۆیان دەگەن، بەڵام کافرەکان – واتە: ناموسوڵمانەکان – لەسەر ناهەقن، لەبەر ئەوە لەدوا رۆژدا کاڵای ئاگرین بە باڵایان دەبڕدرێ، ئاوێکی داخی لەکوڵ کە چەپۆکان هکا، دەکرێ بەسەر تەوقە سەریاندا ئەو ئاوە ئەوەندە گەرمو لەکوڵە وەکوو یەك دیوی ناوەوەو دیوی دەرەوەیان دا دەپلۆخێنێ، جەرگو هەناویان لەگەڵ چەرمو پێستیان وەك مۆم دەتوێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەیشە هەموو جارێ بە کوتەکی پۆڵایینو بەگورزو چەکوشو قەمچی ئاسنین کوتەك کاریو میرازێکی چاك چاکیان دەکەن، خەمو پەرێشانی وا بەربینیان دەگرێ دەکەونە هەوڵی دەرچوون، جا تین دەدەنە خۆیانو خۆیان دەگەیەننە سەر لێواری دۆزەخ،

---

[1] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

بەڵام هەموو جارێ لەوێوە بە زەبری کوتەک دەیانبەنەوە بۆ ناونێرینەی ئاگرەکە، ئەوجا بەتەوسەوە بۆ ئازاردانی گیانیان و بۆ سزای دەروونی پێیان دەبێژرێ: زووکەن بنۆشن ئازاری سووتانی زۆر بە سوێ. ئیتر هەتا هەتایە هەروەها (ت- س/ص).

٥٧٧٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَرَأَ هَـذِهِ الآيَةَ: (اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) ثُمَّ قَالَ: لَـوْ أَنَّ قَطْـرَةً مِـنَ الزَّقُّومِ قُطِرَتْ فِي دَارِ الدُّنْيَا لأَفْسَدَتْ عَلَى أَهْلِ الدُّنْيَا مَعَايِشَهُمْ فَكَيْـفَ بِمَـنْ يَكُـونُ طَعَامَهُ[٢]:

ئیبنو عەبباس (خۆشنوودیی خودایان لێبێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە کە دەفەرموێ:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ – سورة آل عمران – ٣/١٠٢}.

راڤەکەی لە پێشەوە لەم شوێنەدا رابورد (ب – ١ ز – ١٤٧ ل – ٤٢٧ ف – ٥). لە دوایىدا حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر یەک تنۆک لەو زەقومەی کە لەم ئایەتەدا یادکراوە بتکێتە ناو خانەی جیهان، ژیان و گوزەران بە هەموو خەڵکی جیهان تاڵ دەکات، دەی دەبێ گوزەرانی ئەو کەسەی کە خۆراکی ئەوە بێ چۆن بێ و، لەچی دەردو مەینەتێکا بێ، واتە: تنۆکێ لەو ژەقنەمووتەی کە لەم ئایەتەدا هەیە کە دەفەرموێ:

{إِنَّ شَجَرَةَ الزَّقُّومِ، طَعَامُ الْأَثِيمِ – سورة الدخان – ٤٣/٤٤}.

واتە: لە راستیدا بەری داری زەقنەمووت خواردەمەنی ناو دۆزەخی تاونبارانە. (ت-س/ص).

---

[٢] رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه) راجع في مجلد أول. تسلسل/١٤٧ رقم/٨٤٨/٥ تفسير الآية.

٥٧٧٨- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِي اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: (وَيُسْقَى مِنْ مَاءٍ صَدِيدٍ يَتَجَرَّعُهُ وَلاَيَكَادُ يَسِيغُهُ) قَالَ: يُقَرَّبُ إِلَى فِيهِ فَيَكْرَهُهُ فَإِذَا أُدْنِيَ مِنْهُ شَوَى وَجْهَهُ وَوَقَعَتْ فَرْوَةُ رَأْسِهِ فَإِذَا شَرِبَهُ قَطَّعَ أَمْعَاءَهُ حَتَّى يَخْرُجَ مِنْ دُبُرِهِ يَقُولُ اللَّهُ (وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ) وَيَقُولُ: ( وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ)[٣]:

ئەبو ئومامە (رەزای خودای لێبێ) لە حەزرەتەوە (درودی خودای لەسەربێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورەوە:

{مِّن وَرَآئِهِ جَهَنَّمُ وَيُسْقَى مِن مَّاء صَدِيدٍ، يَتَجَرَّعُهُ وَلاَ يَكَادُ يُسِيغُهُ وَيَأْتِيهِ الْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ وَمِن وَرَآئِهِ عَذَابٌ غَلِيظٌ - سورة إبراهيم - ١٤/ ١٦-١٧}.

واتە: ئەم جۆرە لەخودا یاخییانە بۆ کوێ دەچن، لە چنگی خودا چۆن قوتار دەبن، مردن لە پێشیانە، لەپاش مردنیش دۆزەخ بەری لێ بڕیونەتەوە، دەیانقۆزێتەوە بۆ ناو خۆی، سزای ناهەمواری بەئێشو ئازاری واوایان بۆ ئامادەکراوە هەرگیز نەبێتەوەو بە خەیاڵی کەسدا نەیێ: لە جۆگەلەی کێمو زووخو خوێنو خوڕ، کە لە لەشی سوتاوی زاماری بیماری دۆزەخییەکان چۆڕاوگەی هەڵ دەنیشێ ئائەلەو جەراتاوە ئاویان دەرخوارد دەدرێ، هەرچەندە دەکا بۆی قووت ناچێ، جار لەگەڵ جارا بەزۆرمژی لێ دەدا لە بینی دەگیرێ، حاڵی واشڕ دەبێ هەر ساتێکی بەمردنێکە، وەلێ تا مردن نەبێ بەهۆی رزگاری بۆی قەت نامرێ، ئیتر هەتا دێ جار لەدوا جار سزای قورستر دەبێ، لە سزایێ قوتاری نابێ سزایێ سەختتر پێشی لێ دەبڕێتەوەو بەرۆکی پێ دەگرێ.

---

[٣] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

ئەبو ئەمامە فەرمووی: حەزرەت لە بارەی ئەم ئایەتەوە فەرمووی: کە ئاوەکە دەبەن بەلای دەمیەوە پێی ناخۆشە، هەر کەنزیکی دەبێتەوە گورج دەموچاوی دەبرژێنێ، چەرمی کاسەی سەری وەك توێکڵی مۆز دادەماڵێ و بەردەبێتەوەو دەمێنێتەوە کەللەسەرە رووتەکە، جا کاتێ بەنا بەدڵی بەزور دەیخواتەوە ریخۆڵەکانی هەلا هەلا دەکاو کوتەکوتە لە کۆمیەوە دێنە دەرەوە! وەك خودا دەفەرموێ:

{وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ - سورة محمد - ١٥/٤٧}.

واتە: ئەوانەی کە لە دۆزەخا بە ئێجگارین ئاوێکی گەرمی وایان دەرخوارد دەدرێ ریخۆڵەکانیان پارچە پاچە دەکا. هەروەها دەفەرموێ:

{وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ -سورة الكهف- ٢٩/١٨}.

تەفسیری ئەم ئایەتە چەند پەرەیێ لەمەوپێش رابورد (ت- سەند غەیب).

٥٧٧٩- عَنْ أَبِي سَعِيد (رَضِي اللّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلّم) قَالَ: كَالمهل كعكر الزيت فإذا قرب اليه سقطت فروة وجهه فيه وَلَوْ أَنَّ دَلْوًا مِنْ غَسَّاقٍ يُهَرَاقُ فِي الدُّنْيَا لأَنْتَنَ أَهْلَ الدُّنْيَا. روى هذه الأربعة الترمذي[٤]:

ئەم فەرموودەیە لەم شوێنەدا رابورد: (ب/٧ ز/٥٣ ل/٢١٩ ف/١). لێرەدا ئەمەی پترە: ئەگەر پڕ سەتڵێ لەغەسساق لەسەر رووی زەوی برژێ خەڵکی جیهان هەموو بۆگەن دەبن. (ت- س/غ) مەبەست لەم غەسساقە ئەم غەسساقەیە کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

{هَذَا فَلْيَذُوقُوهُ حَمِيمٌ وَغَسَّاقٌ - سورة ص - ٥٧/٣٨}.

واتە: ئەمە حاڵی بەدی دۆزەخییانە، خواردنەوەشیان ئاوی داخی لەکوڵە، لە گەرمانا چەپۆکان دەکا، هەروەها لە جەرەتاوی ناوسك و لەشی دۆزەخییان ئاویان دەرخوارد دەدرێ. (وەرگێڕ)

---

[٤] رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ١٥٤) دادو فریادی دۆزەخیان لەتاو ترسناکی دۆزەخ
## أهوال أهل النار واستغاثتهم

٥٧٨٠- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُلْقَى عَلَى أَهْلِ النَّارِ الْجُوعُ فَيَعْدِلُ مَا هُمْ فِيهِ مِنَ الْعَذَابِ فَيَسْتَغِيثُونَ فَيُغَاثُونَ بِطَعَامٍ مِنْ ضَرِيعٍ لاَ يُسْمِنُ وَلاَ يُغْنِى مِنْ جُوعٍ فَيَسْتَغِيثُونَ بِالطَّعَامِ فَيُغَاثُونَ بِطَعَامٍ ذِى غُصَّةٍ فَيَذْكُرُونَ أَنَّهُمْ كَانُوا يُجِيزُونَ الْغُصَصَ فِى الدُّنْيَا بِالشَّرَابِ فَيَسْتَغِيثُونَ بِالشَّرَابِ فَيُرْفَعُ إِلَيْهِمُ الْحَمِيمُ بِكَلاَلِيبِ الْحَدِيدِ فَإِذَا دَنَتْ مِنْ وُجُوهِهِمْ شَوَتْ وُجُوهَهُمْ فَإِذَا دَخَلَتْ بُطُونَهُمْ قَطَّعَتْ مَا فِى بُطُونِهِمْ فَيَقُولُونَ: ادْعُوا خَزَنَةَ جَهَنَّمَ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا: بَلَى. قَالُوا: فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلاَّ فِى ضَلاَلٍ. قَالَ: فَيَقُولُونَ: ادْعُوا مَالِكًا فَيَقُولُونَ: (يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ):قَالَ فَيُجِيبُهُمْ (إِنَّكُمْ مَاكِثُونَ) قَالَ: فَيَقُولُونَ: ادْعُوا رَبَّكُمْ فَلاَ أَحَدَ خَيْرٌ مِنْ رَبِّكُمْ فَيَقُولُونَ: (رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ) قَالَ: فَيُجِيبُهُمْ (اخْسَئُوا فِيهَا وَلاَ تُكَلِّمُونِ) قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ يَئِسُوا مِنْ كُلِّ خَيْرٍ وَعِنْدَ ذَلِكَ يَأْخُذُونَ فِى الزَّفِيرِ وَالْحَسْرَةِ وَالْوَيْلِ. رواه الترمذي والله أعلم[1]:

ئەبو دەرداء (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: برسێتییەکی سەختی وا تووشی دۆزەخییەکان دەبێ هاوتای ئەو ئێش و ئازارە دەکا کەوان لەناویدا، ئەوسا دەست دەکەن بە دادو فەریاد، جا بە خۆراکی ئاگرینەوە کە لە وێنەی دڕکی وشتر خۆرە، دەچن بەهاواریانەوە، بەڵام هیچ دادێکیان نادا، نەپێی قەڵەو دەبن، نە گۆشتی پێ دەگرن، نە برسێتییان دەشکێنێ، وەك لە قورئاندا ئاماژە بۆ ئەمە دەکاو دەفەرموێ: {لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٍ، لَا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِي مِن جُوعٍ - سورة الغاشية - ٨٨/٦-٧}.

---

[1] رواه الترمذي. وهو مؤيد بالقرآن (شرحه).

دیسان دەست دەکەن بەهاتو هاوارو دەڵێن: هاوار خۆراکمان فریاخەن، ئەنجا خۆراکێکیان دەدەنێ، خۆش خۆش لە گەروویان دەگیرێ، ئەوجا بیردەکەنەوە کە لە دنیادا کە تیکە لە قوڕگیان دەگیرا بەئاو دەیان بردە خوارەوە، لەبەر ئەوە هاور دەکەن ئاومان فریاخەن، جا بە قولاپی ئاسنین ئاوی لە کوڵیان بۆ درێژ دەکەن، کە قاپە ئاوەکە لە دەموچاویان نزیك دەبێتەوە یەکسەر دەموچاویان دادەپڵۆخێنێ، هەر کە دەگاتە ناوسکیان هەرچی لەناو سکیاندا هەیە پارە پارەی دەکا. ئەمەش وەك لە قورئاندا ئاماژە بۆ ئەم دوو حاڵە دەکا کە دەفەرموێ:

{إِنَّ لَدَيْنَا أَنكَالًا وَجَحِيمًا، وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا - سورة المزمل - ١٢/٧٣-١٣}.

واتە: دڵنیابن کە خودا لەناو گەنجینەی قاری خۆیدا چەندان سزای سەختی بۆ هەڵگرتوون، وەك پێوەندو کۆتو زنجیرو ئاگری سوور، وەك خواردەمەنی وا کە لە گەروو دەگیرێ، نەقووت دەچێ، نە دەتفێتەوە، وەك سزای سەختی تایبەتی زۆر بەئێشو ئازارو سوێ. یا دەفەرموێ:

{ وَإِن يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ}.... یا دەفەرموێ: {وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ...} راڤەی ئەم دوو ئایەتە تۆزی لەمەوپێش رابورد.

ئەنجا لەناو خۆیانا بە یەکتر دەڵێن: لەوەردیانەکانی دۆزەخ بپاڕێنەوە، ئەوجا ئەم گفتوگۆیە لە نێوانی ئەوانو لە نێوانی ئەوانو پێشخزمەتەکانی دۆزەخدا روودەدا، کە قورئانی پیرۆز ئاوا دەیگێڕێتەوە:

{وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ الْعَذَابِ، قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَاتِ؟ قَالُوا بَلَى قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاء الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ - سورة غافر - ٤٩/٥٠}.

واتە: دۆزەخییەکان لەناو ئاگرەکەدا بە دەرگاوانو بەر پرسیارەکانی دۆزەخ دەڵێن: داوا لە خودا بکەن بەڵکوو رۆژێ سزامان لەسەر لاببا، ئەوانیش لەوەڵاما پێیان دەڵێن: ئەوە نەبوو پێغەمبەرەکانتان هاتن بۆ

ناوتانو بەڵگەی رۆشن رۆشنو موعجیزەی گەورە گەورەیان نیشان دانو ئێوە لەبەر لاساریو سەرکەشیی خۆتان باوەڕتان پێ نەکردنو رۆژی رەشی وەك ئەم رۆژەی خۆتانتان بە درۆ دەزانی؟ دەڵێن: بەرێ بەخودا راست وابوو، جا دەرگاوانەکان پێیان دەڵێن: دە هەرهاتوو هاوار بکەنو بپاڕێنەوە، دادنادا، هەر بۆ خۆتان بکەڤن گەڤینی کافران بێ سوودە.

حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوجا بەیەکتر دەڵێن: با لە مالیك بپارێینەوە، جا لەسەر ئەم شێوەیە ئەم پرسیارو وەڵامە لە نێوانی ئەوانو مالیکی سەرگەورەی کاربەدەستانی دۆزەخدا روودەدا کە قورئان دەیفەرمووێ:

{وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ - سورة الزخرف - ٤٣/٧٧}.

واتە: بانگ دەکەن: ئەی مالیك! داوا لە خودای خۆت بکە با لە ناومان بباو هەتا هەتایە لە کۆڵمان بکاتەوە، هەتا لەم سزایە رزگار ببین، مالیکیش لە پاش هەزار ساڵ ئەم وەڵامەیان دەداتەوە: ئەمە جێگەتانەو لێرە نابزوون هەتا هەتایە، دۆزەخ جێگەی ئێجگاریتانە. حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوجا لەناو خۆیانا دەڵێن: لە خودای خۆتان بپاڕێنەوە، خودا لە هەموو کەسێ باشترە، ئەو لە هەموو کەس بەرەحمترە، بەڵکوو لێمان خۆش بێ، ئەوجا وەك قورئان دەفەرموێ: دەڵێن:

{قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ، رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ، قَالَ اخْسَؤُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ - سورة المؤمنون - ٢٣/١٠٦-١٠٧-١٠٨}.

واتە: ئەی پەروەردگاری ئێمە، چارەڕەشی خۆمان زۆری بۆ هێنابووینو لای لێ بڕیبووینەوەو خۆشمان هۆزێکی سەر لێشێواو بووین، وا ئێستا هەستمان بە هەڵەی خۆمان کردووەو پێ لەتاوانەکانی خۆمان دەنێین، ئەمجارە بە رەحمەتی خۆت لەم ئاگرە دەرمان بکەو بمان بەرەوە بۆ جیهان،

جا ئەگەر ئێمە سەر لەنوێ وەك جاری پێشوو لە تاوانو گوناه تێ هەڵچووینەوە ئیتر بیانوومان نامێنێو دەبین بە تاوانبارو ستەمكاری ئێجگاریو مافی قسەو پاڕانەوەو تكامان نامێنێ. جا خودا لەپاش تێپەڕبوونی دوو ئەوەندەی ماوەی دنیا بەسەر پاڕانەوەیاندا - ئاوا وەڵامیان دەداتەوە دەفەرموێ: چڕەتان لێبێ) هەتا هەتایە لەناو ئەم ئاگرەدا ئاوا بە داماویو سەر شۆڕی دەژین، ئیتر نەخەڵەتێن نقەتان لێوە بێ یا فزە بكەن. فەرمووی: ئیتر ئەوكاتە لە هەموو خێرێ نائومێد دەبنو دەست لە خۆیان دەشۆنو دەست دەكەن بە هانكە هانگو ئاخو داخو دادو هاوار. (ت).

## ١٥٥) ئەو كەسەی لە دۆزەخا سزای لەهەموان سووكترە: (أهون أهل النار)

٥٧٨١- عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضِي اللهُ عَنهُمَا) أَنَّهُ قَالَ: وَهُوَ يَخطب سمعت رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَرَجُلٌ تُوضَعُ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتَانِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ. رواه الشيخان والترمذي[١]:

نوعمانی كوڕی بەشیر (ڕەزای خودای لێبێ) خوتبەی دەدا فەرمووی: لە خۆشەویستم بیست دەیفەموو (درودی خودای لەسەربێ): لە ڕۆژی دوا ڕۆژدا خاوەنی سووكترین سزا لەناو دۆزەخا كابرایەكە دوو سكڵ دەخەنە سەر هەردوو بەری پێی، مێشكی پێیان دێتە كوڵ وەك مەنجەڵی سەر ئاگر (ش/ت).

٥٧٨٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا مَنْ لَهُ نَعْلَانِ وَشِرَاكَانِ مِنْ نَارٍ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ كَمَا يَغْلِي الْمِرْجَلُ مَا يَرَى أَنَّ أَحَدًا أَشَدُّ مِنْهُ عَذَابًا وَإِنَّهُ لَأَهْوَنُهُمْ عَذَابًا[٢]:

---

[١] تجريد البخاری - مختصر صحيح البخاری باكوردی/٢٩٢/٥ رقم/٢٠٣٦ = ٦٥٦٢. مسلم. إيمان: ٥١٥. ترمذي صفة جهنم: ٢٦٠٤.

[٢] مسل. إيمان: ٥١٦.

دیسان فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو دۆزەخییەی کە ئێش و ئازاری لە هەموو کەس سووکترە کابرایەکە جووتێ پێڵاوی ئاگرینی لەپێدایە، جووتێ قەیتانی ئاگرینی پێوەیە، مۆخی ناوکاسەی سەری وەك دیزەی سەر ئاگر پێیان دەکوڵێ، لە خۆی وایە کەس لەو ئازاری گرانتر نییە، بەڵام ئەو لە چاو خەڵکی تردا لە هەموو کەسێ ئازاری هێواشترە (م/ئەحمەد).

٥٧٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَهْوَنُ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا أَبُو طَالِبٍ وَهُوَ مُنْتَعِلٌ بِنَعْلَيْنِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُه. رواهما مسلم والإمام أحمد. نسأل الله واسع الرحمة. آمين[٣]:

ئیبنو عەبباس (خۆشنوودیی خودای گەورەی لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەر، باوکی ئیمامی عەلی، لە دۆزەخا سزای لە گشت کەسێ سووکترە، سزاکەی ئەوەیە: جووتێ پێڵاوی ئاگرینی وا لە پێدا، مێشکی پێیان دەکوڵێ وەك ئاوی لەکوڵی سەرئاگر. (م/ئەحمەد).

## ١٥٦) گوفتوگۆی خودا لەگەڵ هەندێ دۆزەخی: (تكليم الله لبعض أهل النار)

٥٧٨٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِي اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ رَجُلَيْنِ مِمَّنْ دَخَلَ النَّارَ اشْتَدَّ صِيَاحُهُمَا فَقَالَ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ أَخْرِجُوهُمَا. فَلَمَّا أُخْرِجَا قَالَ لَهُمَا: لأَيِّ شَيْءٍ اشْتَدَّ صِيَاحُكُمَا قَالاَ فَعَلْنَا ذَلِكَ لِتَرْحَمَنَا. قَالَ: إِنَّ رَحْمَتِي لَكُمَا أَنْ تَنْطَلِقَا فَتُلْقِيَا أَنْفُسَكُمَا حَيْثُ كُنْتُمَا مِنَ النَّارِ. فَيَنْطَلِقَانِ فَيُلْقِي أَحَدُهُمَا نَفْسَهُ فَيَجْعَلُهَا عَلَيْهِ بَرْدًا وَسَلاَمًا وَيَقُومُ الآخَرُ فَلاَ يُلْقِي نَفْسَهُ فَيَقُولُ لَهُ الرَّبُّ عَزَّ وَجَلَّ: مَا مَنَعَكَ أَنْ تُلْقِيَ نَفْسَكَ كَمَا أَلْقَى صَاحِبُكَ؟ فَيَقُولُ: يَا رَبِّ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ لاَ تُعِيدَنِي فِيهَا بَعْدَ مَا أَخْرَجْتَنِي. فَيَقُولُ لَهُ الرَّبُّ: لَكَ رَجَاؤُكَ. فَيَدْخُلاَنِ جَمِيعًا الْجَنَّةَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ تَعَالَى. رواه الترمذي بسند ضعيف[١]:

---

[٣] مسلم. إيمان: ٥١٤.

[١] رواه الترمذي بسند ضعيف.

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: دوو پیاوی دۆزەخی دەست دەکەن بە دادو فوغانو هاتو هاوارو دادو فەریادو کورووزانەوە. خودای بالا دەستو شکۆمەندیش دەفەرموێ: ئادەی دەریان بێنن، کە دەریان دێنن خودای گەورە پێیان دەفەرموێ: ئەم هاتو هاورەتان لەچییە؟ دەڵێن: بۆیە وامان کرد تا تۆ بەزەییت پیاماندا بێتەوە خودا دەفەرموێ: رەحمەتی من بۆ ئێوە ئەوەیە کە بچن خۆتان فڕەبدەنەوە ناو جێگەکەی خۆتان لەناو ئاگردا، ئەوانیش دەڕۆنو یەکێکیان خۆی دەهاوێتە ناو ئاگرەکەوەو خودا ناو ئاگرەکەی بۆ دەکا بە جێگەیەکی فێنكو خۆش، ئەویتریان لە دیاری لێواری ئاگرەکە رادەوەستێو خۆی فڕێ ناداتە ناوی، خودای گەورەو سەروەر پێی دەفەرموێ: بۆچی وەکی هاوراکەی خۆت خۆتت نەهاویشتە خوارێ؟ دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئومێد دەکەم کە جارێکی تر نەمخەیتەوە ناو ئاگر، خودایش دەفەرموێ: نائومێدت ناکەم، ئەوجا بەمیهرەبانی خوداوەندی گەورە هەردووکیان پێکەوە دەچنە بەهەشت. (ت-سند زەعیف).

## ١٥٧) ئەوشتانەی بەهەشتو دۆزەخ تێیاندا هاوبەشن
## ما إشترك فیه الجنة والنار

٥٧٨٥- ← (ب - ٧ ز - ٣٣ ل - ١٥٧ ف - ٢)[١].

واتە: ئەم فەرموودەیەی کەوا لەم شوێنەدا لە پێشەوە لە بەرگی حەوتدا لە زنجیرە سییو سێدا لە لاپەڕە سەدو پەنجاو حەوتدا لە چاپی یەکەم رابورد، ژمارەی فەرموودەکە لەوێ دووە.

٥٧٨٦- ← (ب - ٧ ز - ٣٣ ل - ١٥٦ ف - ١)[٢].

---

[١] تقدم فی مجلد سابع. تسلسل/٣٣ رقم/٢/٤١١٧.

[٢] تقدم فی مجلد سابع. تسلتل/٣٣ رقم/١/٤١١٦.

٥٧٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَدْخُلُ أَحَدٌ الْجَنَّةَ إِلاَّ أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ، لَوْ أَسَاءَ، لِيَزْدَادَ شُكْرًا، وَلاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ إِلاَّ أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنَ الْجَنَّةِ، لَوْ أَحْسَنَ، لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً. رواه البخاري:

**ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو کەسێ لە بەهەشتا بە چاوی خۆی جێگەی خۆی لەناو دۆزەخا دەبینێ، پێی دەڵێن: ئەمە جێگەت بوو ئەگەر خراپەکاربوویتایە، هەتا پتر سوپاسی خودا بکا، هەروەها گشت دۆزەخییەکیش لەناو دۆزەخا جێگەی خۆی لە بەهەشتدا دەبینێ، پێی دەڵێن: ئەمە جێگەی تۆ بوو ئەگەر رێگەی راستت بگرتایەو کاری باشت بکردایە، بەڵام بەکردنی خراپە ئەم شوێنە خۆش و باشەت لە کیس خۆت دا، بۆیەش نیشانی دەدەن هەتا زیاتر داخ و خەفەت بخوات و ئاهی سەرد هەڵکێشێ. (بوخاری. رەحمەت لە گۆڕی نازداری).**

٥٧٨٨- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَمَّا خَلَقَ اللّٰهُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ أَرْسَلَ جِبْرِيلَ إِلَى الْجَنَّةِ فَقَالَ انْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا قَالَ: فَجَاءَهَا وَنَظَرَ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعَدَّ اللّٰهُ لأَهْلِهَا فِيهَا قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهِ قَالَ: فَوَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا. فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالْمَكَارِهِ فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا فَانْظُرْ إِلَى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا قَالَ: فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَإِذَا هِيَ قَدْ حُفَّتْ بِالْمَكَارِهِ فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خِفْتُ أَنْ لاَ يَدْخُلَهَا أَحَدٌ. قَالَ: اذْهَبْ إِلَى النَّارِ فَانْظُرْ إِلَيْهَا وَإِلَى مَا أَعْدَدْتُ لأَهْلِهَا فِيهَا. فَإِذَا هِيَ يَرْكَبُ بَعْضُهَا بَعْضًا فَرَجَعَ إِلَيْهِ فَقَالَ وَعِزَّتِكَ لاَ يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدْخُلُهَا. فَأَمَرَ بِهَا فَحُفَّتْ بِالشَّهَوَاتِ فَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهَا. فَرَجَعَ إِلَيْهَا فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لَقَدْ خَشِيتُ أَنْ لاَ يَنْجُوَ مِنْهَا أَحَدٌ إِلاَّ دَخَلَهَا. رواه الترمذي وصاحباه بسند صحيح.
نسأل الله التوفيق لنا وللمسلمين آمين والحمد لله رب العالمين[٤]:

**دیسان ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ خودا بەهەشت و**

---

[٤] رواه الترمذي وصاحباه بسند صحيح.

دۆزەخ دروست دەکا، حەزرەتی جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) دەنێرێ بۆ سەیری و پێی دەفەرموێ: بڕۆ تەماشای بکە، بڕوانە چی نازو نیعمەت و چاکەو بەهرەیەکم تیادا رازاندۆتەوە بۆ بەهەشتییان! فەرمووی: جوبرائیلیش دەچێ و تەماشای خۆی و نازو بەهرەی ناوی دەکاو، ئەوجا دەگەڕێتەوە بۆ خزمەتی خوداو دەفەرموێ: بەگەورەیی تۆ، ئەوەندە خۆش و نازدارو دڵگیرە، ئەو کەسەی بەس ناوەکەی ببیستێ خۆی دەگەیەنێتێ، ئەوجا خودا فەرمان دەکا بە ناخۆشی پەرژین دەکرێ. واتە: بە ئەرکە ئایینییەکان و بەبێ دڵیی نەفس پەرژین کراوە، گشت جارێ کە موسوڵمان ئەرکێکی ئایینی سەرشانی خۆی بەجێ دێنێ، یا بێ دڵییەکی دەروونی خۆی دەکا تەڵێ لەو پەرژینە لا دەباو رێ بۆ خۆی خۆش دەکا کە بچێتە ناو بەهەشت ئەوجا خودا بە جوبرائیل (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئێستا بڕۆرەوە تەماشای بکەرەوە، فەرمووی: کە دەچێ سەیری دەکا دەڕوانێ بە ئەرکی ئایینی و بێ دڵی دەروون دەوری گیراوە، دیارە کردنی ئەوەیش نەفس پێی ناخۆشە، جا دەچێتەوە بۆ لای خوداوەندو عەرزی دەکا: بە گەورەیی تۆ دەترسم کەس تێی نەچێ. دەفەرموێ: بچۆ بۆ سەیری دۆزەخ، تەماشای خۆی و تەماشای ئەو سزایەی ئامادەم کردووە بۆ دانیشتوەکانی بکە، کە دەچێ سەرنج دەدا وا ئاگری دۆزەخ لەگەڵ خۆیدا کوڵەکەی داوەو چین لەبان چین سواری یەك بووەو شەپۆل دەدا، دەگەڕێتەوە بۆ خزمەتی و دەفەرموێ: سوێندم بە گەورەیی تۆ ئەوەی بەس ناوی ببیستێ ئیتر توخنی ناکەوێ، ئەوجا خودا فەرمان دەدا بە ئارەزووبازی و هەوەس دەوری دەگرن و دەفەرموێ: ئەمجار بچۆرەوە بۆ لای، ئەویش دەچێتەوەو تەماشای دەکاتەوەو دەفەرموێ: سوێندم بە گەورەیی تۆ مەترسی ئەوەم هەیە کە کەس لێی قوتار نەبێ و هەموو کەسێکی تێ بچێ (ت/د/ن–س/ص).

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە تەماشای ریاض الصالحین بکە، بەرگی یەکەم لاپەڕە – ١٣٥ ف – ٧ تەرجەمە کوردییەکەی. (وەرگێڕ)

**١٥٨) پایانی ئەم باسە - لە خودا داوا دەکەین کە ئەنجاممان باش بێ.**

**دواترین کەس کە لە دۆزەخ دەردەچێ‌و دەچێتە بەهەشت**

**الخاتمة. نسأل الله حسنها**

**آخر مَنْ يخرج من النار ويدخل الجنة**

٥٧٨٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِي اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنهَا، وَآخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ. دُخُولاً رَجُلٌ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ كَبْوًا، فَيَقُولُ اللَّهُ تَبَارَك وَتَعَالَى لَهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ. فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى، فَيَرْجِعُ فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى؟ فَيَقُولُ اللهُ لَهُ: اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ. فَيَأْتِيهَا فَيُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهَا مَلأَى. فَيَقُولُ يَا رَبِّ وَجَدْتُهَا مَلأَى، فَيَقُولُ اذْهَبْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ، فَإِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنْيَا وَعَشَرَةَ أَمْثَالِهَا أَوْ إِنَّ لَكَ مِثْلَ عَشَرَةِ أَمْثَالِ الدُّنْيَا.فَيَقُولُ: تَسْخَرُ مِنِّي، أَوْ تَضْحَكُ مِنِّي وَأَنْتَ الْمَلِكُ. قَالَ لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ. قَالَ: وَكَانَ يُقَالُ ذَلِكَ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً. رواه الشيخان[1]:

**عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: ئەو کەسەی کە لەدوا هەموو کەسێ لە دۆزەخ دەردەچێ و لەدوا هەموو کەسێکیش دەچێتە بەهەشت دەزانم کێیەو حاڵی چۆنە. پیاوێکە بە کاگۆڵکە لە دۆزەخ دەردەچێ، خودای پیرۆزو گەورە دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە، ئەویش دەچێ بەلام بە خەیاڵ وا دەزانێ کە لە بەهەشتا جێگە نەماوەو هەمووی پڕ بووە جێگەی ئەو نابێتەوە، لەبەر ئەوە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: پەروەردگارم! چووم جێگەم دەست نەکەوت، هەمووی پڕبوو، خودای پیرۆزو گەورەیش دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشت، ئەویش دیسان دەچێتەوە، بەلام دیسان وا بە خەیاڵی دا دێ کە بەهەشت پڕە، دیسانەوە دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ئەی خودایە! دەبینم هەمووی پڕبووە. خودا پێی**

---

[1] بخاری. رقاق: ٦٥٧١. مسلم. إيمان/٤٦٠.

دەفەرموێ: من پێت دەڵێم بڕۆ بچۆرە بەهەشت، بەقەد دنیاو دە ئەوەندەی تریش بۆ تۆ. یا دەفەرموێ: دە ئەوەندەی جیهان بۆ تۆ، پیاوەکەیش – لە دڵی خۆیدا دەڵێ: من چەند جار چووم جێگەنەماوە ئەمیش هەروا دەفەرموێ: وادیارە گاڵتەم پێ دەکا بۆیە – عەرزی خودا دەکا: تۆ پادشای هەموانی بۆ گاڵتە بەداماوێکی وەك من دەکەی. یا فەرمووی: دەڵێ کە تۆ پادشای بۆ تەڵفیسی بەمن دەکەی!. عەبدوڵڵای راوی ئەم فەرموودەیە فەرمووی: سەیرم کرد پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە عەنتیکەیی قسەی ئەو پیاوە وا پێکەنی ددانە پێشینەکانی وەدەرکەوتن، چونکە خودا ئەو هەموو خەڵاتەی دەکا کەچی ئەویش ئاوا قسەی لە رووە! فەرموودەگێڕەوە دەفەرموێ: جاران وا باو بوو: دەیانگوت: کە ئەم پیاوە لەناو بەهەشتییەکاندا پایەی لە هەموان کەمترە!. (ش= بوخاری و موسلیم – رەزای خودایان لێبێ).

٥٧٩٠– وَعَنْهُ عَنِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي لأَعْرِفُ آخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنَ النَّارِ. رَجُلٌ يَخرُجُ مِنهَا زَحْفًا فَيُقَالُ لَهُ: انْطَلِقْ فَادْخُلِ الْجَنَّةَ فَيَذْهَبُ فَيَدْخُلُ الْجَنَّةَ فَيَجِدُ النَّاسَ قَدْ أَخَذُوا الْمَنَازِلَ فَيُقَالُ لَهُ: أَتَذْكُرُ الزَّمَانَ الَّذِى كُنْتَ فِيهِ فَيَقُولُ: نَعَمْ. فَيُقَالُ لَهُ: تَمَنَّ. فَيَتَمَنَّى فَيُقَالُ لَهُ: لَكَ الَّذِى تَمَنَّيْتَ وَعَشَرَةُ أَضْعَافِ الدُّنْيَا – قَالَ – فَيَقُولُ: أَتَسْخَرُ بِى وَأَنْتَ الْمَلِكُ؟ قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ[٢].

دیسان فەرمووی: حەزرەت (دروودو سڵاوو رەحمەت و پیت و فەڕو پیرۆزیی خودای گەورەو سەروەری لەسەربێ) فەرمووی: من دەزانم کێ لە دوای هەموو کەسێ لە دۆزەخ دەردەچێ و، دەچێتە بەهەشتەوە، پیاوێکە بە چنگە کڕێ دێتە دەرەوە، لە دۆزەخ، خودای پیرۆزو گەوە پێی دەفەرموێ: بڕۆ بچۆرە بەهەشتەوە، ئەویش دەڕواو دەچێتەوەو دەڕوانێ وا خەڵك هەموو جێگەی خۆیان گرتووە، جا پێی دەبێژرێ: ئایا سەردەمی رابووردووی خۆتت لە یادە؟ دەڵێ: ئا، پێی

---

[٢] مسلم. ایمان: ٤٦١. بخاری. رقاق: ٦٥٧١، ٧٥١١.

دەبێژرێ: دەبە ئارەزووی خۆت ئاوات بخوازە، ئەویش وا دەکا، ئەوجا پێی دەبێژرێ: هەرچیت داواکردووە لەگەڵ دە ئەوەندەی جیهاندا هەمووی بۆ تۆبێ. فەرمووی: ئەویش دەڵێ: تۆ لای خۆت پادشایت کەچی گاڵتە بەبێ نەوایەکی وەکی من دەکەی. فەرمووی: بە چاوی خۆم چاوم لێ بوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) وا پێکەنی دندانە پێشینەکانی دەرکەوتن (م/ت).

٥٧٩١- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِي اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولاً الْجَنَّةَ وَآخِرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا؟ رَجُلٌ يُؤْتَى بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُقَالُ: اعْرِضُوا عَلَيْهِ صِغَارَ ذُنُوبِهِ وَارْفَعُوا عَنْهُ كِبَارَهَا. فَتُعْرَضُ عَلَيْهِ صِغَارُ ذُنُوبِهِ فَيُقَالُ: عَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، كَذَا وَكَذَا وَعَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا، كَذَا وَكَذَا. فَيَقُولُ: نَعَمْ. لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يُنْكِرَ وَهُوَ مُشْفِقٌ مِنْ كِبَارِ ذُنُوبِهِ أَنْ تُعْرَضَ عَلَيْهِ. فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ حَسَنَةً. فَيَقُولُ: رَبِّ قَدْ عَمِلْتُ أَشْيَاءَ لاَ أَرَاهَا هَا هُنَا، فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَضْحَكُ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ. رواهما مسلم والترمذي[٣].

ئەبو زەڕ (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: ئەو دۆزەخییەی لەدوا هەموان لە دۆزەخ دەردەچێ و لەدوا هەموانیش دەچێتە ناو بەهەشت دەزانم کێیە: پیاوێکە، لە رۆژی قیامەتدا دەیهێنن بۆ دیوانی خودا، دەبێژرێ: ئادەی وردەتاوانەکانی خۆیی بۆ دەوربکەنەوە، بەڵام تاوانە گەورەکانی بسڕنەوە، جا گوناهە بچکۆلەکانی پێ نیشان دەدرێ و پێی دەبێژرێ: فیسارە رۆژ ئەوەو ئەوەت کردووە، فیساە رۆژ ئەوەو ئەوەت کردووە، ئەویش بە ناچاری دەڵێ: بەڵێ هەمووم کردوون، ناتوانێ کە حاشایان لێبکا، بەڵام لە دڵەوە هەر دەترسێ کەتاوانە گەورەکانیشی بۆ دەوربکەنەوە، کەچی پێی دەگوترێ: لە جیاتی هەریەکێ لە خراپەکانت یەك چاکەت بۆ هەیە! کەوا دەزانێ ترسەکەی دەڕەوێتەوەو تەماع دەیگرێ و دەڵێ: پەروەدگارم! گەلێ تاوانی تریشم کردووە، بۆچی لێرەدا نایانبینم و دەوریان ناکەنەوە بۆم، تا بکرێن بە چاکە

---

[٣] مسلم. إيمان: ٤٦٦. ترمذي. صفة جهنم/٢٥٩٦.

بۆم!. جا ئەبو زەڕ فەرمووی: پێغەمبەرم دی، بەم رووداوە خۆشە، وا پێکەنی ددانەپێشینەکانی وەدەرکەوتن! (م/ت — رەزای خودایان لێبێ).

٥٧٩٢- عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: آخِرُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ رَجُلٌ، فَهُوَ يَمْشِي مَرَّةً وَيَكْبُو مَرَّةً وَتَسْفَعُهُ النَّارُ مَرَّةً، فَإِذَا مَا جَاوَزَهَا الْتَفَتَ إِلَيْهَا فَقَالَ: تَبَارَكَ الَّذِي نَجَّانِي مِنْكِ لَقَدْ أَعْطَانِيَ اللَّهُ شَيْئًا مَا أَعْطَاهُ أَحَدًا مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ. فَتُرْفَعُ لَهُ شَجَرَةٌ فَيَقُولُ: أَىْ رَبِّ أَدْنِنِي مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلأَسْتَظِلَّ بِظِلِّهَا وَأَشْرَبَ مِنْ مَائِهَا. فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا ابْنَ آدَمَ لَعَلِّي إِنْ أَعْطَيْتُكَهَا سَأَلْتَنِي غَيْرَهَا. فَيَقُولُ: لاَ يَا رَبِّ. وَيُعَاهِدُهُ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهَا وَرَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأَنَّهُ يَرَى مَا لاَ صَبْرَ لَهُ عَلَيْهِ فَيُدْنِيهِ مِنْهَا فَيَسْتَظِلُّ بِظِلِّهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَائِهَا، ثُمَّ تُرْفَعُ لَهُ شَجَرَةٌ هِيَ أَحْسَنُ مِنَ الأُولَى فَيَقُولُ: أَىْ رَبِّ أَدْنِنِي مِنْ هَذِهِ لأَشْرَبَ مِنْ مَائِهَا وَأَسْتَظِلَّ بِظِلِّهَا لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا.:فَيَقُولُ يَا ابْنَ آدَمَ أَلَمْ تُعَاهِدْنِي أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهَا فَيَقُولُ: لَعَلِّي إِنْ أَدْنَيْتُكَ مِنْهَا تَسْأَلُنِي غَيْرَهَا. فَيُعَاهِدُهُ أَنْ لاَ يَسْأَلَهُ غَيْرَهَا وَرَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأَنَّهُ يَرَى مَا لاَ صَبْرَ لَهُ عَلَيْهِ فَيُدْنِيهِ مِنْهَا فَيَسْتَظِلُّ بِظِلِّهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَائِهَا. ثُمَّ تُرْفَعُ لَهُ شَجَرَةٌ عِنْدَ بَابِ الْجَنَّةِ هِيَ أَحْسَنُ مِنَ الأُولَيَيْنِ. فَيَقُولُ: أَىْ رَبِّ أَدْنِنِي مِنْ هَذِهِ لأَسْتَظِلَّ بِظِلِّهَا وَأَشْرَبَ مِنْ مَائِهَا لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا. فَيَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ أَلَمْ تُعَاهِدْنِي أَنْ لاَ تَسْأَلَنِي غَيْرَهَا قَالَ: بَلَى يَا رَبِّ هَذِهِ لاَ أَسْأَلُكَ غَيْرَهَا. وَرَبُّهُ يَعْذِرُهُ لأَنَّهُ يَرَى مَا لاَ صَبْرَ لَهُ عَلَيْهَا فَيُدْنِيهِ مِنْهَا فَإِذَا أَدْنَاهُ مِنْهَا فَيَسْمَعُ أَصْوَاتَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَقُولُ: أَىْ رَبِّ أَدْخِلْنِيهَا. فَيَقُولُ: يَا ابْنَ آدَمَ مَا يَصْرِينِي مِنْكَ أَيُرْضِيكَ أَنْ أُعْطِيَكَ الدُّنْيَا وَمِثْلَهَا مَعَهَا؟ قَالَ: يَا رَبِّ أَتَسْتَهْزِئُ مِنِّي وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ؟ فَضَحِكَ ابْنُ مَسْعُودٍ فَقَالَ: أَلاَ تَسْأَلُونِّي مِمَّ أَضْحَكُ فَقَالُوا: مِمَّ تَضْحَكُ قَالَ هَكَذَا ضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: مِمَّ تَضْحَكُ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: مِنْ ضَحِكِ رَبِّ الْعَالَمِينَ حِينَ قَالَ أَتَسْتَهْزِئُ مِنِّي وَأَنْتَ رَبُّ الْعَالَمِينَ فَيَقُولُ: إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ مِنْكَ وَلَكِنِّي عَلَى مَا أَشَاءُ قَادِرٌ. رواه مسلم[٤].

---

[٤] مسلم. إيمان: ٤٦٢.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (ڕەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست (درودو سڵاوی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: دواترین کەسێ کە دەچێتە بەهەشتەوە پیاوێکە بە هەڵسوکەوت و پەلە پڕوسکێ دەڕوا، بە دەم ڕێگەوە ئاگرەکە شاڵاو دەبا بۆ دەموچاوی و دەموچاوی هەڵ دەکوڕووزێنێ، ڕووی دەبێ بە سووتەمەڕۆ، کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری دەبێ خێسەیەکی لێ دەکاو دەڵێ: پیرۆزو بەفەڕە ئەو خودایەی کە منی لە چنگی تۆ قوتارکرد، ئای لەم بەشە باشەی کە خودا بەمنی داوە، لە پێشیننان و لە پاشینان بەکەسی تری نەداوە، ئەوجا دەڕوانێ وا شێخەڵێ لە دوورەوە دیارە دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! لەو درەختەوە نزیکم بکەروە، تا لەبن سێبەرەکەیدا وچانێ بگرم و لە ئاوی کانیاوەکەی بنی نۆش بکەم! خودای باڵا دەست و شکۆمەندیش دەفەرموێ: ئەی نەوەی ئادەم! ڕەنگە ئەگەر ئەوەت پێ بدەم داوای شتی ترم لێ بکەی! دەڵێ خەیر ئەی پەروەردگاری من! بەڵێن و پەیمانی دەداتێ کە داوای هیچی تری لێ نەکا، خودایش بەزەوی پێدا دێتەوە، چونکە دەیبینێ ئوقرەی لێ هەڵگیراوە بۆ سێبەرو بەهرەی ئەو شێخەڵە. ئەوجا دەیباتە بنی و لە سێبەرەکەیدا دادەنیشێ و لە کانیاوەکەی بنی دەخواتەوە، ئەوجا درەختێکی جوانتر لە درەحتی پێشوو دەبینێ، لەپاش هەمان گفتوگۆو بەڵێن و پەیمانێ ئەویشی دەداتێ، دیسان درەختێکی جوانتر لە دوو درەختەکەی پێشوو لە بەردەم دەرگای بەهەشتدا دەبینێ و داوای دەکاو، لەدوا هەمان ڕازو گلەیی و پەیمانی پێشوو ئەویشی دەداتێ، کە دەچێتە ئەوێ گوێی لە دەنگی بەهەشتییەکان دەبێ، دەڵێ: ئەی پەروەدگاری من! توخوا بمبەرە ژوورەوە! خودایش دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! چەندە ووڕکن و پەڵپگرو بێ بارو بێ پەیمانیت، بەچی لە کۆڵم دەبیتەوە، ئەرێ بەوە ڕازی دەبیت و کۆتایی بەداوات دێنی ئەگەر دوو ئەوەندەی جیهانت لەناو بەهەشتدا بدەمێ! ئەویش شتی وا بە زۆر دەزانێ بۆیە دەڵێ: ئەی خودایە! خۆتۆ لای خۆت خوداوەندی هەر دوو جیهانی کەچی مەزاق بە هەژارێکی وەك من دەکەی! ئیبنو مەسعوود پێکەنی و فەرمووی: بۆ لێم ناپرسن کە بۆچی پێ دەکەنم؟ گوتیان: بۆ پێ دەکەنی؟ فەرمووی: پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەربێ) ئاوا پێکەنی، یارانیش (خۆشنوودیی

خودایان لێبێ) فەرموویان ئەی پێغەمبەری خودا! بەچی پێ دەکەنی؟ فەرمووی: بەوە پێ دەکەنم کە پیاوەکە عەرزی خودا دەکا: خۆ تۆ لای خۆت خوداوەندی هەردوو جیهانی کەچی مەزاق بە داماوێکی وەك من دەکەی، خوداوەند سەیری لە قسەکەی دێ و لە قسەکەی پێ دەکەنێ! خودایش دەفەرموێ پێی: من مەزاق بە تۆ ناکەم و مەبەستم راستەقینەیە نەك گاڵتە، بەڵام کەس باڵا دەستی من نییە ئەوەی ئارەزووی بکەم دەیکەم! (م).

## ١٥٩) ئەو بەهەشتییانەی کە کەمترین بەشیان هەیە ئەو بەهەشتییانیش کە لەلای خودا نازدارترین کەسن

## أقل أهل الجنة منزلة وأكرمهم على الله تعالى

٥٧٩٣- ← (ب – ٧ ز – ١٥ ل – ٨٥ چاپی/١ ف – ٣)[1].

واتە: ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە رابورد، لە بەرگی حەوتەمدا، لە زنجیرە پازدەدا، لە لاپەڕە هەشتاو پێنجدا چاپی/١ ژمارەکەی لەوێ ژمارە سێیە. بەڵام لێرە ئەم پترییەی هەیە.

قَالَ رَبِّ فَأَعْلاَهُمْ مَنْزِلَةً قَالَ أُولَئِكَ الَّذِينَ أَرَدْتُ غَرَسْتُ كَرَامَتَهُمْ بِيَدِي وَخَتَمْتُ عَلَيْهَا فَلَمْ تَرَ عَيْنٌ وَلَمْ تَسْمَعْ أُذُنٌ وَلَمْ يَخطُرْ عَلَى قَلْبِ بَشَرٍ. قَالَ: وَمِصْدَاقُهُ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ (فَلاَ تَعْلَمُ نَفْسٌ مَا أُخفِيَ لَهُمْ مِنْ قُرَّةِ أَعْيُنٍ الآيَةَ. جزاءا بما كانوا يعملون):

مووسا (درودو سڵاوی خودای لێبێ) فەرمووی: ئەی خودایە! ئەی ئەو بەهەشتییانەی کە لە بەرزترین پایەدان چۆنن؟ فەرمووی: ئەوانە خۆم هەڵم بژاردوون و بە دەستی خۆم درەختی سەر بەرزیی ئەوانم ناشتووە و مۆرم کردووە، بەهرەی وانایاب نە بەچاو بینراوە و نە بەگوێ بیسراوە و نە بەدڵی کەسدا هاتووە و نە بە خەیاڵیدا رابووردووە. حەزرەت (درودی خودای لەسەربێ)

---

[1] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/١٥ رقم/٣/٤٠٣٨.

فەرمووی: بەڵگەی راستو دروستیی ئەم فەرمایشتەیش لەنامەی خودادا هەیە، کە لە سوورەتی سەجدەدا دەفەرموێ:

{فَلَا تَعْلَمُ نَفسٌ مَّا أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَاء بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ – سورة السجدة – ١٧/٣٢}. واتاکەی لەم شوێنەدا رابورد: (ب/٢ ز/٢٦ ل/٧٣ ف/٧).

٥٧٩٤– عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ مَنْزِلَةً لَمَنْ يَنظُرُ إِلَى جِنَانِهِ.... لەم شوێنەدا رابورد: (ب – ٧ ز – ٥٨ ل – ٢٣٠ ف – ٢)[٢].

٥٧٩٥– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَدْنَى أَهْلِ الْجَنَّةِ الَّذِي لَهُ ثَمَانُونَ أَلْفَ خَادِمٍ وَاثْنَتَانِ وَسَبْعُونَ زَوْجَةً وَتُنْصَبُ لَهُ قُبَّةٌ مِنْ لُؤْلُؤٍ وَزَبَرْجَدٍ وَيَاقُوتٍ كَمَا بَيْنَ الْجَابِيَةِ إِلَى صَنْعَاءَ، إِنَّ عَلَيْهِمُ التِّيجَانَ إِنَّ أَدْنَى لُؤْلُؤَةٍ مِنْهَا لَتُضِيءُ مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ. رواهما الترمذي:

ئەبو سەعید (رەزای خودای لێبێ) لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە (درودو سڵاوو رەحمەتو بەرەکەتو پیرۆزیی خودای گەورەی لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو باوکو دایکو کەسوکارو هەستو نەست گشتی بە قوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) دەفەرموێ: ئەو بەهەشتییانەی کە نزمترین پایەیان هەیە یەکی هەشتا هەزار نۆکەرو حەفتاو دوو ژنی هەیە، گومەزێکی بۆ هەڵ دەدەن، هەر هۆدەیەکی لە یەکێ لەم گوهەرانەیە: لە مرواریو زومڕووتو، یاقووت، ئەو گومەزە لە جابییەوە هەتا صەنعا پانە، جابییە لە پەنا دیمەشقدایە لەشام، صەنعایش لە یەمەنە، تاجی وایان لەسەردایە، ئایەخی دەنکە مرواییەکانی نێوانی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا رۆشن دەکاتەوە! (ت– بەسەندێکی غەریب گێڕاویەتیەووە).

٥٧٩٦– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ تَعَالَى عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الْجَنَّةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ. وَمَنِ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَالَتِ النَّارُ اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ. رواه الترمذي والنسائي. والله تعالى أعلم[٤]:

---

[٢] تقدم في مجلد سابع. تسلسل/٥٨ رقم/٢/٤١٩٦.

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) فەرمووی: حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (درودو سلاوو رەحمەتی خودای گەورەی لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ سێ جار داوای بەهەشت لە خودا بکا، وەك ئەوە بڵێ: خودایە! داوای بەهەشتت لێ دەکەم، بەهەشت لەلای خۆیەوە دەڵێ: خودایە! بیخەرە ناو بەهەشتەوە، هەر کەسێکیش سێ جار پەنا بگرێ بەخودا لە دەستی دۆزەخ، دۆزەخ دەڵێ: خودایە! پەنای بدە لە دۆزەخ. (ت/ن-س/ص).

عدد أحاديث كتاب القيامة والجنة والنار (١٧٧) سبعة وسبعون ومائة فقط، فصار جميع مافي الجزء الخامس (١٢٤٢) مضموما إلى ما في الاجزاء الأربعة السابقة فيكون عدد أحاديث الكتاب كله (٥٨٨٧) سبعة وثمانون وثمانمائه وخمسة آلاف. اسأل الله أن تكون خالصة لوجهه الكريم. آمين والحمد لله رب العالمين:

مامۆستای دانەری ئەم تاجول ئوصووله پیرۆزە مەلا شیخ مەنصوور عەلی ناصیف (رەزاو رەحمەتی خودای گەورەیان لێبێ) دەفەرموێ: ژمارەی سەرجەمی فەرموودەکانی نامەی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ (١٧٧) تەنیا سەدو حەفتاو حەوت فەرموودەن و بەس، کەوابوو سەرجەمی فەرموودەکانی بەرگی پێجەم دەکەنە (١٢٤٢) تەنیا هەزارو دوو سەدو چلو دوو فەرموودەو بەس، لەگەڵ هەموو فەرموودەکانی گشت بەرگەکانی تریدا، لە سەرەتای کتێبکەوە هەتا کۆتایی، ژمارەی سەرجەمی فەرموودەکان دەکاتە (٥٨٨٧) تەنیا پێنج هەزارو هەشت سەدو هەشتاو حەوت فەرموودە، لە خودا داوا دەکەم کە ئەم کارە پیرۆزەمان ساغ لەبەر رەزامەندی زاتی پیرۆزی خۆی بێ. ئامین والحمد لله رب العالمين.

---

(٤) رواه النسائي بسند صحيح (شرحه).

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

لە ٢٠/ ٩/ ١٩٧٨دا لە کۆتایی ئەم تەرجەمەیەدا لە کۆتایی ڕەشنووس (موسوەددە)ی تەرجەمەی بەرگی پێنجەمی ئەصڵە عەرەبییەکەدا ئەمەم بە بێ زیادو کەم نووسیوە:

من کە وەرگێڕی ئەم نامە پیرۆزەم بە شانازییەوە دەڵێم: لە خودا بەزیادبێ کە ئەم خزمەتە گەورەیەم بە ئەنجام گەیاند، بەرامبەر بە ئایین‌و گەل‌و نیشتمان. لە سایەی خوداوە لێ بوومەوە لە وەرگێڕانی ئەم نامە پیرۆزە (التاج الجامع للأصول في أحاديث الرسول) لە هۆدەکەی دائیرەی خۆمدا، لە خەستەخانەی سەربازیی کەرکوك، لەشاری کەرکووکی نازدارو خۆشەویست، خودابێ چاوێنی کا، لە سەعات حەوت‌و چارەك، ڕۆژی سێشەممە، حەڤدەی شەشەلان (شەووال)ی سالّی ١٣٩٨ی کۆچی. ڕێکەوتی سەعات یەك‌و نیوی پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ١٩٧٨/٩/١٩ی زایینی.

سوپاس‌و ستایش بۆ خودای گەورەو سەروەرو سەردار، دروودو ڕەحمەت لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرو کەس‌و کارو یارانی.

ئەمڕۆکەیش کە شەممەیە (١٨)ی جیمادو سانی سالّی ١٤١٣ کۆچییە، بە ڕێکەوتی ١٩٩٢/١٢/١٢ بە دەستی خۆم لە نووسینی پاکنووسی ئەم بەرگە بوومەوە، کە ئەمە دوا بەرگە لە ١٩٧٤/١/٢٠دا دەستم کردووە بە وەرگێڕانی تاجی پیرۆز، کەواتە بە نزیکەی نۆزدە سالّ ئەوسا بە تەواوی تەواوم کردووە، لەم ماوەدا سەرومڕ سەرگەرمی ساخکردنەوەی مەبەستەکانی ئەم فەرموودە پیرۆزانە بووم، کە زۆربەیان تا بلێی قورس‌و گران‌و پڕواتان، هەروا بە ئاسانی نازانرێن‌و فامی تەواویان گڕخواردن‌و لێکۆڵینەویەکی چڕو خەستی گەرەکە.

لە ڕاستیدا ئەم وەرگێڕانە هەر وەرگێڕانێکی ڕووت نییە، بەڵکوو شەرحێکی ساخکەرەوەی کورت‌و پوخت‌و ڕاست‌و ڕەوانیشە بۆ تێگەیشتنی تەواو لە زوربەی واتای فەرموودە قورسەکان، دەق لە شێوەی تەفسیری جەلالەینی پیرۆز بۆ فامی مەبەستەکانی قورئانی پیرۆز هەردوولا زوو مەبەست‌و واتای فرە مەبەست دەدەن بە دەستەوە، ئەمەیش لە سایەی خودای گەورەو مەزنەوەیە لە خودا بەزیاد بێ.

مەبەستم لەم قسەیە بە خۆوە نازین نییە، مەبەستم وەسپ و مەدحی بە حەقی ئەم تاجە پیرۆزەیە، بگرە لەم جۆرە مەدحانەم لە زاری گەلێ پیاوی زانای دانای کوردی مەردی موسوڵمانی چاکی پاك بە گوێی خۆم ژنەوتووە، یەکێ لەو زاتە بەڕێزانە جانابی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسە، کە لە سایەی خوداوە زۆر زۆر لە تەرجەمەکەی بەندە رازییە، لە مانگی دەی ئەمساڵدا کە لە مزگەوتی شێخ عەبدولقادری گەیلانی – قدس الله سره العزیز – بە خزمەتی گەیشتم زۆر زۆر لە حاڵەکە رازی بوو، تا هاتە سەر ئەوە فەرمووی: نوری برام! بەراستی کاك محموود ناشری خێرە کەبووە بەهۆی بڵاوکردنەوەی ئەم تاجەی کە تۆ وەرت گێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی!

مامۆستای مامۆستایان، داناو زانای فەرە هێژا جەنابی خوالێخۆشبوو (مامۆستا شێخ عەدبورەئووفی نەقشبەندی) کە کوڕەزای شێخ ئەمینی پیژوەیەو ئیجازەی عیلمی مەلایانەی لای مامۆستا مەلا مەحەممەدی رەئیس وەرگرتووە. کە کەسایەتییەکی کوردی رۆشنبیری زانستی و ئایینی ناسراوی هەڵکەوتووە، بە زمانی عەرەبی و فارسی و کوردی بە شیعرو پەخشان نووسینی بە پێزی هەیە.

ئەم چامە شیرینەی بە خامەی رەنگینی لە پەسنی تاج و ریاض الصالحیندا نووسیوە، وا لێرەدا پەخشی دەکەینەوە، خودا لە هەردوو جیهاندا پاداشی زۆر گەورەی بداتەوەو ئاواتی بهێنێتەدی و پڕگۆڕی پیرۆزی لەڕحمەت و بەرەکەت بێ.

بسمه تعالی هاؤم اقرؤوا کتابیه

تقدیما لفضیلة مولانا وأستاذنا نوری فارس دام ظله:

أزهـر روض أم الریحـان أم عطـر
کتـابکم، أم سـرور النفس أم وطـر

قرنتُـهُ فجـری فی کـل جارحـة
کأنمـا أنـا وهـو المـاء والشجر

تلـوت أبیاتـك السحر الحلال فقـد

يعطـر الكـون ريـا نـشرها العطـر

بـالنور كـالورد والنـور كـشمس ضـحى

تجلـو وتحلـو، تقـول: كلـها سـكر

أهـدي سـلاما دواما نحـو مـن قـد غـدا

مـن تاجـه تـاج شاهنـشاه يـستتر!؟

أينكـر الـشعراء النـور؟ فرقـان ذا

بـين المـسعى وأسمـاء لهـا أثـر

لابـد للمبتـدا في الفـضل مـن خـبر

فنـوري (نـور علـي نـور) لـه خـبر

أنـت المـشار اليـه بالـضمير فـلا

خفـضت يـا علمـا حاشـاك تنكـسر!

يـا حبـذا قـائلا قـد قـال فيـك لنـا

لـه المحاسـن في الـدارين والظفـر

مـولاي كـلُّ لـساني عـن جوابـك وال

مـأمول تأييـد عـذري حـين أعتـذر

يومـا بجـزوي ويومـا بـالعقيق وبـال

سـياومه زرتكمـو ويـا لهـا أثـر

قـد استلبتم بوصـل عـن جفـوني كـرى

وهـل تـرى عالمـا يجبـى ولا يـذر؟!

مـا حـق طـرفي هـداني نحـو حـسنكم

الا أعذبـه وهـا هـو الـسهر

كأسـا دهاقـا يريـق العـين مـن أسـف

مـاذا الخيـال ببـالي يبعـث الـصور

لـو حـط رحلـي علـى فـوق نجـوم الـسما

ألفيـت ثمـة خيـالا منـك ينتظـر

ليــل المحــبين مبــسوط جوانبــه

والنــوم لا تــألف العينــان والبــصر

وانمــا أنــا شـخص مــن محبيــك مــن

دأبــي ابتــداء دعــاء صــدقه الخــبر

لطفــا دعــاء لنــا في حــسن خاتمــة

لا ســيما بطــن ليــل أو بــدا الــسحر

فقــم بنــا نــصطبح صــهباء صــافية

عــن خــوان مكتــوب مولانــا، لــه النــشر

لله ألفاظــه الغــر العــذوب فقــد

علــت علــى الــدر والــدر لهــا درر

فمــن يقــول هــي الــدر الــثمين فقــل:

أخطــأت ان لم تقــل عنهــا ولا صــغر

لكــم يــراع بفــضل الله ماضــية

مهمــا غــدا يــنظم أو راح ينتثــر

كلتــا يديــه غيــاث حــال ترجمــة

يزهــو بكــرد وبــالاعراب يعتــبر

لله درك يــا كــردي فارســنا

لا زال ريَّــا عــبير منــك ينتثــر

أنــت المــشار اليــه بالبنــان فــلا

تبلــى بنانــك دومــا كنــت تــستطر

يــا خــادم العلــم فــوزا بــالفلاح فقــد

تجــرت ربحــا نفــى عــن كلــه الخــسر

قــد شــرف الله مــصرا أنــت ســاكنه

وزاد فخــرا بــك الكتــاب والزبــر

ســناك يــا بــن كــرام الكــاتبين ســبى

قريحتـــى فلـــذا مـــدحي لكـــم عـــسر
أرى رياضــــكم للـــصالحين كتـــا
ج بـــالجواهر زينـــت طافهـــا ثمـــر
وقلـــة البـــاع في نظلمـــي لمـــدحكمو
هـــي اقتـــضت أنـــني في القـــول اختـــصر
قـــد احتللـــت فـــؤاد النقـــشبندي فكـــن
فيـــه مكينـــا رنوفـــا ذا لكـــم وزر
لا زلـــت تحـــبر قلبـــا أنـــت ســـاكنه
ولا تـــزال بـــك العليـــاء يفتخـــر
وهـــذه ســـلوة العـــشاق قـــد ختمـــت
فـــرج بهـــا كربنـــا يـــا مـــن لـــه القـــدر
وزد فراســـة مولانـــا ونـــوره في
كـــلام مـــن في يديـــه ســـبح الحجـــر
أتم نظمـــي بحمـــدي للحميـــد ولـــي
أمنيـــة الخـــير في الخـــتم لـــك الـــشكر

عبدالرؤوف النقشبندي

# فهرس المواضیع


| زنجیرە | پێڕستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١ | **نامەی ڕەوشتو کردەوەی چاکە** | ٣ |
| ٢ | **باسی یەکەم: باسی جۆرەکانی کردەوەی چاکە** | ٣ |
| ٣ | گەورەترین چاکە چاکە کردنە لەگەڵ بابو داك | ٣ |
| ٤ | چاکە کردن لەگەڵ منداڵدا | ٩ |
| ٥ | بەسەرکردنەوەی خزمو کەسوکار پێویستە دەنگ دابڕینو پێ لێدابڕین لەگەڵ خزما ناڕەوایە | ١٣ |
| ٦ | چاکە کردن لەگەڵ دەستو پێوەندا | ١٨ |
| ٧ | بەزەوی هاتنەوەو دڵسووتان بە هەتیوو بێوەژنو نافرەتی بێ دەرەتان | ٢١ |
| ٨ | مافەکانی هاوسێ | ٢٤ |
| ٩ | مافەکانی موسوڵمان لەسەر برای موسوڵمانی | ٢٧ |
| ١٠ | میهرەبانیو بەزەیی دەربارەی دروسکراوانی خودای گەورە پێویستە | ٣٣ |
| ١١ | **باسی دووەم: باسی جۆرەکانی کردەوەی خراپە خراپترین خراپە زۆرو ستەمو زیاندانە لە مەخلووق** | ٤١ |
| ١٢ | ستەمکار ترین کەس ئەو کەسەیە کە خۆی زۆرو ستەم لەخۆی بکا | ٤١ |
| ١٣ | باسی دوو زمانی | ٤٤ |
| ١٤ | غەیبەتو لەپاش ملە باسی خەڵك کردن بەخراپە | ٤٤ |
| ١٥ | غەیبەتی بەدکار (فاسق) دروستە | ٤٧ |
| ١٦ | نامووس کردن بەخێر خێرە | ٤٩ |
| ١٧ | باسی دڵپیسیو بەدگومانیو کینە کێشانو حەسوودیو بەخیلی بەیەکتری بردن | ٥٠ |
| ١٨ | باسی شوێنکەوتنی عەیبەی مەردوم | ٥٢ |
| ١٩ | باسی فیزو دەعیەو لەخۆبایی بوون | ٥٥ |
| ٢٠ | باسی زمان لووسیو دەمتەڕیو هەڵنانی زۆر | ٥٨ |
| ٢١ | باسی جمێنو جنێو | ٦٠ |
| ٢٢ | باسی نەحلەتکردنو زمان پیسی | ٦٣ |
| ٢٣ | باسی قسە دابڕین لە موسوڵمانو بەچاوی سووك تەماشا کردنی موسوڵمان | ٦٦ |
| ٢٤ | باسی دەمبازیو مشتومڕ | ٧٠ |
| ٢٥ | باسی پیسکەییو بەدخوویی | ٧٢ |
| ٢٦ | تەنیا لە سێ شتدا درۆ دروستە | ٧٣ |
| ٢٧ | باسی دوو روویيو ناپاکی | ٧٦ |

| زنجیرە | پێرستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٢٨ | ڕەگەز پەرستی ڕەوشتێکی سەردەمی نەزانییە | ٧٨ |
| ٢٩ | **باسی سێیەم: باسی ڕەوشتی بەرز** | ٨٠ |
| ٣٠ | بەرزترین ڕەووشتی بەرز ڕق خواردنەوەو تووڕە نەبوونو حەوسەڵەیە | ٨٠ |
| ٣١ | باسی صەبرو ئارامو لێبوردنو بە حەوسەڵەییو ئازار کێشی | ٨٣ |
| ٣٢ | چارەی ڕق هەڵسان | ٨٦ |
| ٣٣ | باسی یاریدەدانی موسوڵمانو داپۆشینی عەیبەو سڕیو لەسەر کردنەوەی بەهەق | ٨٧ |
| ٣٤ | گەورەیی تکاکاری (شەفاعەت) | ٨٩ |
| ٣٥ | باسی ڕاستگۆیی | ٩٠ |
| ٣٦ | سوعبەت دروستە | ٩٣ |
| ٣٧ | باسی پەیمان بەجێ هێنان | ٩٥ |
| ٣٨ | باسی نەرمو نیانیو هێمنیو شێنەیی | ٩٦ |
| ٣٩ | باسی شەرمو شکۆ | ٩٨ |
| ٤٠ | باسی خۆ بەکەم گرتن (تەواضوع) | ١٠٠ |
| ٤١ | ڕەوشی جوان ڕەوشە گەورەکەی خودا خۆیەتی | ١٠٢ |
| ٤٢ | بەشێ لە ڕەوشتە جوانەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) | ١٠٨ |
| ٤٣ | باسی ڕێنموونی باش | ١١٠ |
| ٤٤ | باسی صەخاوەتو بەخشندەییو پیاوەتی | ١١٠ |
| ٤٥ | باسی سوپاسکردن لە سەرچاکەو پیاوەتی | ١١٣ |
| ٤٦ | خۆپاراستنو پارێز لە قاری خوداو لە ئازاری خەڵك | ١١٤ |
| ٤٧ | گومانی باش هەم بەخوداو هەم بە خەڵك پەسەندە | ١١٦ |
| ٤٨ | ئایین برێتییە لە تەمێو ئامۆژگاری باش | ١١٧ |
| ٤٩ | ڕاوێژکەر ئەمیندارە | ١١٧ |
| ٥٠ | کەسێ خێرێ نیشانی کەسێ بدا وەك خۆی ئەو خێرە بکات وایە | ١١٨ |
| ٥١ | شادبوون بە پایە هەرە بڵندەکان بەوە دەبێ کە مرۆڤ کاروباری موسوڵمانان ڕایی بکاو.. | ١١٨ |
| ٥٢ | عەداڵەتو داد بناغەی پاشایەتیو دەوڵەتە | ١١٩ |
| ٥٣ | پایانێ (خاتمەیێ) باسی خۆشەویستی شیرازەی ئایینداری خۆشەویستیی خوداو.... | ١٢٢ |
| ٥٤ | کەسێ بەڕاستی خودای خۆش بوێ خودا ڕەزای سووك دەکاو خوداو بەندەکانیش.... | ١٢٢ |
| ٥٥ | کەسێ کەسێکی خۆش بوێ ساخ بۆ ڕەزای خودا حەشری لەگەڵ حەشەری ئەودا دەبێ | ١٢٣ |

| زنجیرە | پێرستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| ٥٦ | خۆشەویستی پیاو چاکان‌و دێنی‌و دیداریان‌و دانیشتن لەگەڵیاندا بەهرەیەکی زۆر .... | ١٢٦ |
| ٥٧ | دۆست‌و ناشناو دەستەبراکان لە ڕۆژی قیامەتا لە سێبەری بارەگای خودادا دەبن | ١٢٩ |
| ٥٨ | خۆشەویستی دەبێ مامناوەندی بێ | ١٣٠ |
| ٥٩ | **نامەی زیکرو یادی خودای گەورەو دوعاو نزاو پاڕانەوەو تەوبەکردن‌و..** | ١٣٦ |
| ٦٠ | **باسی یەکەم: باسی گەورەیی یادو زیکری خوداو پایەبەرزیی زیکرکارانی خودای گەورە** | ١٣٦ |
| ٦١ | ناوە جوانەکانی خودا | ١٥٣ |
| ٦٢ | ناوە هەرە گەورەکەی خودا (ئیسمی ئەعظەم) | ١٥٨ |
| ٦٣ | **باسی دووەم: باسی گەورەیی (سبحان الله)و (الحمد لله)و (الله أكبر)و (لا اله الا الله)کردن** | ١٦٠ |
| ٦٤ | ژماردنی تەسبیحات‌و ویردو سەرچاوەی تەزبیح لە چییەوەو چۆن پەیدابووە | ١٦٣ |
| ٦٥ | زیکری (لا حول ولا قوه الا بالله) گەنجیکە لە گەنجینەکانی بەهەشت | ١٦٥ |
| ٦٦ | ویردی پاش نوێژ | ١٦٧ |
| ٦٧ | یادخوێندن‌و ویردخوێندنی بەیانیان‌و ئێواران | ١٧٠ |
| ٦٨ | **باسی سێیەم: باسی دووعاو نزایە گەوریی نزاو دووعا** | ١٨٠ |
| ٦٩ | دەستوورو یاسای نزاو پاڕانەوە | ١٨٣ |
| ٧٠ | نزای گیراو نزای پەسەند | ١٨٩ |
| ٧١ | پاڕانەوەی پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەربێ) بۆ ئۆمەتی | ١٩٣ |
| ٧٢ | نزایێ کە خێرو خۆشی هەردوو جیهانی تیا بێ نزای پڕ واتا | ١٩٤ |
| ٧٣ | ئەو گوتە حەدیسییانەی کە بەکار دەهێنرین بە پەناگرتن بەخودای گەورە | ٢٠٦ |
| ٧٤ | **باسی چوارەم: باسی چەند نزایەکی تایبەتی** | ٢١٤ |
| ٧٥ | نزاکانی مەینەتبار (دعوات المكروب) | ٢١٤ |
| ٧٦ | نزای سەفەرو هاتنەوە لە سەفەر | ٢١٧ |
| ٧٧ | نزای ڕێبوار بەڕێکردن | ٢٢١ |
| ٧٨ | نزای چوونە هەواری نوێ | ٢٢٢ |
| ٧٩ | نزای هەستان لە کۆڕی دانیشتن | ٢٢٤ |
| ٨٠ | گوتەی کاتی خوێندنی کەڵەباب‌و کاتی زەڕینی گوێدرێژ | ٢٢٥ |
| ٨١ | نزای هاتوچۆ بۆ ماڵ | ٢٢٦ |
| ٨٢ | نزای کاتی باران‌و باو هەورەگرمە | ٢٢٧ |
| ٨٣ | نزای کاتی دیتنی مانگی نوێ | ٢٢٩ |

| زنجیره | پێڕستی سەرەباسەکان | لاپەرە |
|---|---|---|
| ٨٤ | نزای چاوپێکەوتنی نۆبەرەی میوەهات | ٢٣٠ |
| ٨٥ | نزای ترس شکاندنو خەوزڕان | ٢٣١ |
| ٨٦ | نزای قەرزدانەوە | ٢٣٤ |
| ٨٧ | نزای کاتی دیتنی گرفتارێ بە دەردێ | ٢٣٦ |
| ٨٨ | نزای نەخۆش | ٢٣٦ |
| ٨٩ | یادو زیکری کاتی چوونە بازاڕ | ٢٣٧ |
| ٩٠ | نزای کاتی شت لەبەرکردن (دووعای حیفف) | ٢٣٨ |
| ٩١ | صەڵاواتدان لە دیاری پێغەمبەر (درووودی خودای گەورەی لەسەربێ) | ٢٤٢ |
| ٩٢ | **باسی پێنجەم: باسی پاڕانەوەو پەشیمانی واتە: ئیستغفارو تەوبە** | ٢٥٠ |
| ٩٣ | گەورەیی تەوبەو پەشیمانی | ٢٥٥ |
| ٩٤ | کاتی تەوبەکردن | ٢٥٧ |
| ٩٥ | هەر چەندێ بەندە لە رادە بەدەر تاوانی هەبێ وەلێ هەرکاتێ تەوبەی بەڕاستی بکا .... | ٢٦٥ |
| ٩٦ | پایانێ: باسی گوشادیو بێ سنووریی رەحمەتو میهرەبانی خودای گەورە | ٢٧٠ |
| ١ | **نامەی زوهدو دنیا نەویستیو گوێ بەدنیا نەدانو دڵ لاوێنەکان** | ٢٨١ |
| ٢ | **بەشی یەکەم: باسی هەڕەشەکردن لە دەستەشکێنبوون بەخۆشی جیهانەوە** | ٢٨١ |
| ٣ | پتر لە پێویست خانوبەرە دروستکردن ناپەسەندە | ٢٩١ |
| ٤ | دەوڵەمەندی لە قنیات دایە | ٢٩٤ |
| ٥ | زینهار خۆتان بپارێزن لەچاو برسێتی (حیرص)و هیوای دوورو درێژ | ٢٩٧ |
| ٦ | **بەشی دووەم: باسی بەهرەو گەورەیی هەژاریو هەژاران** | ٣٠١ |
| ٧ | **بەشی سێیەم: باسی گوزەرانی پێغەمبەر** (درووودی خودای لەسەربێ) | ٣٠٨ |
| ٨ | کۆمەڵەکەی صوففە | ٣٣٢ |
| ٩ | پاراستنی زمان گەرەکە | ٣٣٦ |
| ١٠ | بێ وەیی لە گۆشەگیریدایە | ٣٤٠ |
| ١١ | باوەڕی تەواو بەوە دەبێ کە ئەوەی بەدەردت ناخواتو کارت پێی نییە وازی لێ بێنی | ٣٤٠ |
| ١٢ | پاداشی هەرە گەورە لەوەدایە کە صەبرو ئارام بگری لەسەر بڕیارو بەشی خودای.... | ٣٤١ |
| ١٣ | **بەشی چوارەم: لەنامەی زوهد باسی خواکردو چارەنووس (قەزاو قەدەر)** | ٣٤٨ |
| ١٤ | ناشێ ویرەویر لەسەر مەسەلەی خوا خواستو سەر نفیشتو قەزاو قەدەر بکرێ | ٣٥٧ |
| ١٥ | ئاکامو رزقو رۆزیی هەر لە سەرەتاوە دیاری کراونو سنووریان بۆ دانراوە | ٣٥٩ |

| زنجیرە | پێرستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ١٦ | جڵەوی دڵ لە دەستی خودا دایە | ٣٦١ |
| ١٧ | ئەوەی لە بارەی منداڵی ناموسوڵمانەکانەوە لە ئاییندا روون کراوەتەوە | ٣٦٢ |
| ١٨ | ئەوەی لە بارەی خەڵکانی سەردەمی پێغەمبەر گەردانیەوە هاتووە | ٣٦٤ |
| ١٩ | کردەوە بەپێی سەرئەنجامیەتی | ٣٧٠ |
| ٢٠ | گەرەکە کاری چاك زوو بەزوو بکرێ | ٣٧٢ |
| ٢١ | ترسی خودای گەورە پیرۆزییە | ٣٧٣ |
| ٢٢ | پشت بەخودا بەستن | ٣٧٧ |
| ٢٣ | **بەشی پێنجەم: باسی ئەو شتانەی کە دەبن بەهۆی دڵنەرم بوون و دڵسۆزیی** | ٣٨٠ |
| ٢٤ | چوونە بەهەشت لە سایەی خودای گەورەوەیە | ٣٩٣ |
| ٢٥ | سپاردە هەڵ دەگیرێ (ئەمانەت نامێنێ) | ٣٩٤ |
| ٢٦ | **بەشی شەشەم: باسی گەورەیی بەخشش و خێرکردن** | ٣٩٦ |
| ٢٧ | **بەشی حەوتەم: باسی فەرمانکردن بە چاکەو چڵەو گیریی لە خراپە** | ٤٠٣ |
| ٢٨ | پایانێ (خاتیمەیێ) هەندێ دەنگوباس و باس و خواسی کۆمەڵێ لە پێشینان | ٤٠٧ |
| ٢٩ | داستانی بەڵەکێك و کەچەڵێك و کوێرێك | ٤٠٧ |
| ٣٠ | ئەو منداڵانەی کە لەناو بیشکەدا قسەیان کردووە | ٤١١ |
| ٣١ | باسی شەیتان و سوپای شەیتان | ٤١٦ |
| ٣٢ | باسی فریشتە کە هەموویان نازدارن | ٤١٨ |
| ٣٣ | **نامەی وێڵ و ئەدەب** | ٤٢٥ |
| ٣٤ | **بەشی یەکەم: داوای رێپێدان (استئزان)** | ٤٢٥ |
| ٣٥ | رێخوازیی لەبەر تەماشای چاو دانراوە | ٤٢٩ |
| ٣٦ | ئەوەی کە بەبێ رێدانی خاوەن ماڵ تەماشای ناو ماڵی کەسێ بکا چاوی خوێنی نییە | ٤٣٢ |
| ٣٧ | تەماشاکردنی بیانی لەبەر پێداویستی – بەقەی پێداویستی – دروستە | ٤٣٣ |
| ٣٨ | فەرموودەیێ لە بابەتی گەرماو (حەمام)ەوە | ٤٣٥ |
| ٣٩ | **بەشی دووەم: باسی سڵاو (سەلام)** | ٤٣٦ |
| ٤٠ | لە پێشدا سڵاوکردن ئنجا قسەکردن | ٤٣٨ |
| ٤١ | سڵاو لە کەسوکار | ٤٣٩ |
| ٤٢ | سڵاوکردن لە منداڵان و لە ژنان سوننەتە | ٤٤٠ |
| ٤٣ | راگەیاندنی سڵاو | ٤٤١ |

| زنجیرە | پێڕستی سەرەباسەکان | لاپەرە |
|---|---|---|
| ٤٤ | ئەوەی لەسڵاوکردندا ناپەسەندە | ٤٤١ |
| ٤٥ | سڵاوکردن لەخاوەن نامەکان (أهل الكتاب) | ٤٤٣ |
| ٤٦ | حوکمی سڵاوکردنو حوکمی وەڵامی سڵاو | ٤٤٥ |
| ٤٧ | سڵاو ناکرێ لە دەستەی ئارەزوو پەرست | ٤٤٦ |
| ٤٨ | نووسینو دەستوورەکانی نووسین | ٤٤٧ |
| ٤٩ | ئەوەی زمانی کەڵێ فێربێ لە شەڕیان دڵنیا دەبێ | ٤٤٨ |
| ٥٠ | **بەشی سێیەم: رۆژباش کردنو چاكو چۆنی گەلێ جۆری هەیە.....** | ٤٤٩ |
| ٥١ | یەکێکیان هەڵسانە لەبەر پیاوی باشو خاوەن پایە | ٤٤٩ |
| ٥٢ | یەکێکی تریان: هەموو کەسێ بەپێی پایەوپلەی خۆی قەدرو رێزی لێ دەگیرێ | ٤٥١ |
| ٥٣ | یەکێ تریان: دەست لەناو دەست نانو تەوقە کردنە | ٤٥٢ |
| ٥٤ | یەکێ تریان: دەست لەگەردن کردنە | ٤٥٥ |
| ٥٥ | یەکێ تریان: دەستو پێ ماچکردنە | ٤٥٦ |
| ٥٦ | یەکێ تریان: ماچکردنی لەشو نێو چاوانە | ٤٥٧ |
| ٥٧ | یەکێ تریان: مەرحەبا لێکردنو بەخێر هاتنە | ٤٥٨ |
| ٥٨ | یەکێ تریان: گوتنی (لبيك وسعديك)یە | ٤٥٨ |
| ٥٩ | یەکێ تریان: گوتنی (باوكو دایکم بە قوربانت) بێیە | ٤٦٠ |
| ٦٠ | یەکێ تریان: (حفظك الله: خودا ئاگادارت بێ)یە | ٤٦٠ |
| ٦١ | یەکێ تریان: (یاخوا هەمیشە پێکەنینی خێرت بێ)یە | ٤٦١ |
| ٦٢ | **بەشی چوارەم: باسی ئەرێتو دەستووری کۆڕی دانیشتن** | ٤٦١ |
| ٦٣ | ئەڵقەدانو گەورەیی کۆڕی دانیشتن | ٤٦٤ |
| ٦٤ | جۆرە دانیشتنێکی ناشیرین | ٤٦٥ |
| ٦٥ | سرتە: چپە: قسەی پەنهانی | ٤٦٦ |
| ٦٦ | پژمینو نزای باش بۆ پژمیو | ٤٦٧ |
| ٦٧ | تا چەن جار پژمین نزا بۆ پژمیو دەکرێ | ٤٧٠ |
| ٦٨ | نزای پژمین کردن بۆ خاوەن پەیمانەکان، واتە ئەو ناموسوڵمانانەی کەلە پەنای.... | ٤٧١ |
| ٦٩ | خودا پژمەی پێ خۆشە، وەڵێ خۆشی نایێ لە باوێشك | ٤٧٢ |
| ٧٠ | **بەشی پێنجەم: باسی ناوەکان: باشترین ناو بەلای خودای گەورەوە** | ٤٧٣ |
| ٧١ | دروست نییە کەس ئەبو لقاسم — کە کەسناوی پێغەمبەرە (درودی خودای لەسەربێ) — بکا بە.... | ٤٧٤ |

| زنجیرە | پێڕستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٧٢ | ناوە ناپەسەندەکان | ٤٧٦ |
| ٧٣ | ناونانی منداڵی تازە بوو، گۆشکردنیو شیرین کردنی مەلاشووی بە خورما، یا.... | ٤٧٩ |
| ٧٤ | گۆڕینی ناوی ناشیرین بە ناوێکی جوان | ٤٨٠ |
| ٧٥ | نازناوو کەسناو (واتە: لەقەبو کونیە) | ٤٨٤ |
| ٧٦ | لەکاتی بانگکردندا دروستە دوایی ناو بکرتێنرێ، یا هەندێ پیت لەناو فڕە بدرێ | ٤٨٥ |
| ٧٧ | **بەشی شەشەم: باسی هەڵبەستو هۆنراوەو گۆرانیو شتی وا کەلەم بابەتەبن** | ٤٨٨ |
| ٧٨ | هەڵبەست لەخودی خۆیدا باش نییە | ٤٨٨ |
| ٧٩ | پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) شیعری خەڵکی دەخوێندەوە | ٤٩١ |
| ٨٠ | هەڵبەستی وا هەیە پڕە لە حیکمەتو دانایی | ٤٩٢ |
| ٨١ | لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ هەڵبەست دەخوێندرایەوە بۆی، ئەویش .... | ٤٩٥ |
| ٨٢ | قسە قووڵ کردنەوەو هاشەو هووشە ناپەسەندە، بەڵام قسەی کورتو پوختو.... | ٥٠٠ |
| ٨٣ | هۆرەو گۆرانی | ٥٠١ |
| ٨٤ | نەردێن (تاوڵەکردن)و کۆتربازی حەرامە | ٥٠٢ |
| ٨٥ | یاری رەوا: وازی دروست | ٥٠٣ |
| ٨٦ | **بەشی حەوتەم: باسی چەن رستەیێ کە بوون بەباوو عادەت لەئەدەبیاتو وێژەی عەرەبی** | ٥٠٥ |
| ٨٧ | یەکێ لەوانە گوتەی (أما بعد)وە، واتە: لەپاش ئەمە | ٥٠٥ |
| ٨٨ | یەکێ تریان گوتەی (زعموا)وە، واتە: بەقسەی گوتوان گوایە واوا دەڵێن | ٥٠٥ |
| ٨٩ | یەکێ تریان گوتەی (ویلك)ەو (ویحك)ەیە وەیلەکە واتە: ماڵ وێران: خانە خراپ،.... | ٥٠٦ |
| ٩٠ | یەکێ تریان گوتەی (تربت یمینك)ەیە: واتە: دەستت بە قوڕداچێت: هەژارکەویت | ٥٠٧ |
| ٩١ | یەکێ تریان: گوتەی (أخسا)ە، واتە: چەخە: چغ: چخ: هەیدێ | ٥٠٧ |
| ٩٢ | ئاغا بە بەندەی خۆی نەڵێ: (عبدی) واتە: عەبدی من: بەندەی من، بەندەیش بە... | ٥٠٨ |
| ٩٣ | جنێوەدەن بە چەرخو رۆژگار (دەهر) | ٥١٠ |
| ٩٤ | مەڵێ: (خبيث نفسی، دڵم هەڵ دەشێوێ: دڵم تێك هەڵ دێ، بەڵام لە جیاتی ئەوە.... | ٥١١ |
| ٩٥ | مەڵێ: (ما شاء الله وشاء فلان: خوداو فیسارەکەس حەزکا) | ٥١٤ |
| ٩٦ | پایانێ: باسی سەرەتای دروستبوونی بوونەوەر | ٥١٥ |
| ١ | چینەکانی ئادەمیزاد | ٥١٨ |
| ٢ | **نامەی فەرتەنەگەلو نیشانەکانی هانی قیامەت** | ٥٢٢ |
| ٣ | **باسی یەکەم: ترساندن لە فیتنە گەل** | ٥٢٢ |

| زنجیره | پێرستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٤ | خەبەردان لە فیتنەگەلو جۆرەکانی | ٥٣٢ |
| ٥ | **باسی دووەم: لەبابەت لایەنگرتنی کۆمەڵەی موسوڵمانانەوە** | ٥٣٩ |
| ٦ | سەرەتای بەرپابوونی فەرتەنەکان کەیەو لەکوێوە هەڵدەگیرسێن | ٥٤٤ |
| ٧ | **باسی سێهەم: باسی خەواریجەکانو لە ئایین بەلەسەبووەکان، خەواریج: دەرەکی** | ٥٤٨ |
| ٨ | کوشتاری دەرەکییەکان (الخوارج) فەرزی عەینە. واتە: ئەرکە سەرشانی هەموو.... | ٥٥١ |
| ٩ | وشەیێ لەبارەی ڕووداوەکەی ئەلجەمەلەوە | ٥٥٦ |
| ١٠ | **باسی چوارەم: باسی ئەو کەسانەی کە بەدرۆ لافی پێغەمبەرایەتییان لێداوە** | ٥٥٨ |
| ١١ | باسی دوو درۆزنەکە: موسەیلەمەو عەنەسی | ٥٥٨ |
| ١٢ | سەرگوزەشتەی ئیبنو صەییاد | ٥٦٠ |
| ١٣ | لە هۆزی سەقیف هەلاتبازێكو خوێنمژێك هەڵ دەکەون | ٥٦٧ |
| ١٤ | **باسی پێنجەم: باسی غەزاو کوشتارە هەرە گەورەکان (واتە: ئەل-مەلاحیم). غەزاکردن..** | ٥٦٩ |
| ١٥ | غەزاکردن لەگەڵ هیندو عەجەم دا | ٥٧٠ |
| ١٦ | کوشتاری ڕووم، قەڵاوپەناگەی موسوڵمانان لەو ڕۆژگارەدا غووتەو بەصرەیە | ٥٧٢ |
| ١٧ | مزگەوتەکەی عەشار کە لە ئەبوللەیە | ٥٧٥ |
| ١٨ | ئاوەدان بوونەوەی بەیتولەقدیس نیشانەی وێران بوونی مەدینەی درەخشانە | ٥٧٦ |
| ١٩ | گرتنەوەی قوستەنتەنییە | ٥٧٧ |
| ٢٠ | ئەو حەلە ڕۆم زۆرن بەڵام سەرکەوتن بۆ موسوڵمانانە | ٥٨٣ |
| ٢١ | **باسی شەشەم: باسی نیشانەی داهاتنی قیامەت** | ٥٨٥ |
| ٢٢ | خێرو گەورەیی بەندەیی‌و خودا پەرستی لە ئاخر زەمانا | ٦٠١ |
| ٢٣ | بەهۆی زۆربوونی تاوانو گوناەو نافەرمانی خوداوە ڕۆچوون بەناخی زەویدا.... | ٦٠٣ |
| ٢٤ | **باسی حەوتەم: باسی خەلیفە مەهدی** (خودای لێ ڕازی بێ) | ٦٠٧ |
| ٢٥ | کۆمەڵێ لە موسوڵمانان هەر لەسەر هەق دەوام دەکەن هەتا قیامەت تەواو.... | ٦١٣ |
| ٢٦ | ئێستا جەجاڵ وا لەناو دوورگەیەکا کۆتو زنجیر کراوە، تا ئەو کاتەی هەڵ دەستێ | ٦١٥ |
| ٢٧ | جەجاڵ لەخۆر هەڵاتەوە سەر هەڵ دەدا وە عەشاماتێکی گەلێ زۆر شوێنی دەکەون | ٦٢١ |
| ٢٨ | نیشانەکانی جەجاڵە کۆرە کە خۆی بریتییە لە گەورەترین فەرتەنە | ٦٢٢ |
| ٢٩ | جەجاڵ دەچێتە ناو هەموو شارێ، مەککەو مەدینەی لێ دەرچێ | ٦٢٩ |
| ٣٠ | جەجاڵ چل ڕۆژ دەمێنێتەوە لە وڵاتدا، لەپاشا عیسا (دروودی خودای لەسەربێ) لە ئاسمان .... | ٦٣٣ |
| ٣١ | پاشەکی: عیسا (دروودی خودای لەسەربێ) کە لە ئاسمان دێتە خوارەوە تا ماوەیێ لەسەر زەمین... | ٦٣٩ |

| زنجیره | پێرستی سەرەباسەکان | لاپەڕە |
|---|---|---|
| ٣٢ | **نامەی قیامەتو بەهەشتو دۆزەخ**. فووکردن بە کەڕەنادا (نەفخی صوور) | ٦٥٤ |
| ٣٣ | زیندوو بوونەوەو کۆمەڵبوون بۆ لێپرسینەوە (واتە: بەعسو حەشر): | ٦٥٨ |
| ٣٤ | حەشر لەسەر زەوییەکی نوێ دەکرێ | ٦٦١ |
| ٣٥ | فەرمایشتی خودای گەورەو مەزن لە ڕۆژی قیامەتدا | ٦٦٣ |
| ٣٦ | سامناکی ڕۆژی قیامەت | ٦٦٥ |
| ٣٧ | لێپرسینەوەی بەندەکانی لەلایەنی خوداوە | ٦٦٦ |
| ٣٨ | تۆڵە لێ ساندن | ٦٧٢ |
| ٣٩ | وەرگرتنی نامەی کردار | ٦٧٤ |
| ٤٠ | تەرازووی کێشانی کردەوەی خێرو شەڕ | ٦٧٦ |
| ٤١ | پردی سیرات کەوا بەسەرپشتی دۆزەخەوە | ٦٧٩ |
| ٤٢ | ئەستێڵی ژوانگە | ٦٨٠ |
| ٤٣ | چۆنێتی ئەو حەوزەو ئاوەکەی | ٦٨٣ |
| ٤٤ | حەوزی کەوسەر | ٦٨٧ |
| ٤٥ | تکاکردن هەیەو هەقە | ٦٨٨ |
| ٤٦ | باسی تکاکردنی پێغەمبەری خۆمان حەزرەتی موحەممەدی خرشەویستو نازادار-د.خ | ٦٨٩ |
| ٤٧ | پێغەمبەرانو باوەڕدارانیش – بە فەرمانی خودا – تکا دەکەن بۆ کەسێکی تر | ٧٠٦ |
| ٤٨ | بەخشندەیی خودا گەلێ گەورەیە، دەرهێنانی یەزدانپەرستەکان لە دۆزەخ | ٧١٥ |
| ٤٩ | چۆنێتیی بەهەشتو باسی کار گوزارانی بەهەشت | ٧٢٣ |
| ٥٠ | باسی خانووی بەهەشتو خاكو زیخو چەوی | ٧٢٦ |
| ٥١ | چینەکانی بەهەشتو دەرگاکانیو پایەکانی | ٧٢٦ |
| ٥٢ | سەرچاوەو ڕووبارەکانی بەهەشت | ٧٢٩ |
| ٥٣ | دارو درەختو میوەی بەهەشت | ٧٣١ |
| ٥٤ | هۆدەو ماڵی بەهەشتییەکان | ٧٣٥ |
| ٥٥ | خێوەتگاکانی بەهەشت | ٧٣٧ |
| ٥٦ | بازاڕەکانی بەهەشت | ٧٣٧ |
| ٥٧ | لە بەهەشتدا هەر کەسێ ئارەزوو بکا کەشتوکاڵ دەکا، یا ڕەوگەداری دەکا | ٧٤٢ |
| ٥٨ | چۆنێتیو شێوەی دانیشتوانی بەهەشت | ٧٥٠ |
| ٥٩ | شێوەی شیرینی ژنی بەهەشت | ٧٥٤ |

